# پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ کردن



هەزاران
دراوسێکانی
خێزانەکانی
نەخۆشان
خزمەکانی
دەوڵەمەندان
منداڵەکانی
خاوەن
تایبەت
پێداویستی
بەهرەداران
ئافرەتان
منداڵان
ئاژەڵان
پرسیارکەران
جنۆکەکان
بێ باوەڕان

دانەر : محمد صالح المنجد

وەرگێڕانی

إبراهیم حسن سعید    ئالان عمر سلێمان

چاپی یەکەم
1442-2021

# پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم چۆن مامەڵەی لەگەڵ کردن

دانەر: محمد صالح المنجد

وەرگێڕانی

ابراهيم حسن سعيد ئالان عمر سليمان

چاپی یەکەم

٢٠٢١

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ کردن؟

ناوی دانەر : موحەممەد صالح المنجد.

وەرگێڕانی بۆ کوردی : ابراهیم حسن سعید، ئالان عمر سلێمان.

خەتی بەرگ: کارزان ئەفەندی.

دیزاینی بەرگ: نصرت عثمان طه.

دیزاینی ناوەوە: وەرگێر

پەر: شامۆ

ژمارەی لاپەرە: ٧٩٢

ساڵی چاپ : ٢٠٢١

نۆرەی چاپ: یەکەم.

تیراژ: ١٠٠٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٨٧٠) ساڵی (٢٠٢٠) دراوەتێ

# وتـــەی بڵاوکار

**چیرۆکی کتێبی (پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ کردن؟)**

هەموو کتێبێك چیرۆکێکی هەیە، چیرۆکی ئـەم کتێبـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ چـەند سـاڵێکی پێشوو، کاتێك شێخ موحەممەد صالح المنجد چەند وانەیەکی لە مزگەوتی (عمر بن عبدالعزیز) لە شەوانی رەمەزان دوای نوێژی تـەراویح بـە ناونیشـانی (مامەڵـەکردنی پێغەمبەرانـە لەگـەڵ کەسە جۆراوجۆرەکان) پێشکەش دەکرد. ئەمە لە ساڵانی ١٤٢٧-١٤٢٨ کۆچی بوو، دواتر لە ساڵی ١٤٢٩ لە مزگەوتی الحرمین الشریفین لە جدە تەواوی کرد.

پاشان بابەتێکی لە چەند کەناڵێکی تەلەفەزیۆنی بە ناونیشانی (لە ژیانی پێغەمبەر چـەند وانە و لایەنێکی هەرە گەورە و گرینگ هەیە) پێشکەش کرد، لـە بەشـی دووەمـدا ناونیشـانی گۆڕی بە (چەند لایەنێکی کۆمەڵایەتی لە ژیانی باشترین کەس).

هەروەها شێخ موحەممەد هەمان بابەتی لە بەرنامەیەکی رەمەزانی بە ناوی (هدی وبینات) لە میانەی ساڵی ١٤٣٢- ١٤٣٣ ك پێشکەش کرد.

ئینجا بە تەواو بوونی ئەم پرۆژەیە و هەروەها بە هۆی ئەو رووتێکردنەی خـەڵکی هـەیبوو بۆ ئەو بابەتە گرینگە ئـەویش سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ چـۆن بـووە لـە مامەڵـەکردنی لەگـەڵ کەسە جۆراوجۆرەکاندا. بۆیە ستافی زانستی لە کۆمەڵەی (زاد) هەستان بە داڕشـتنەوەی ئـەو بابەتە بە شێوەیەکی زانستی و رێکخستنەوەی، هەرەوەها نوسینەوەی بە شێوەی هـۆنراوە، کە لە کۆتایی هـەر بابەتێکدا ئـەم هۆنراوەیـە دانـدراوە و بابەتەکـەی تیـادا پوخـت و کـورت کراوەتەوە.

هەوڵمانداوە ریوایەتێکی ڕاست و دروست کۆبکەینەوە لە فەرمودەی پێغەمبەر و ژیانە پـڕ خێرەکەی، هەوڵیشمانداوە ئەوەی شێخ موحەممەد پێشکەشی کردووە لەو بابەتانەدا ئەوا بە شـێوازێکی سـانا و کـورت بینوسـین دوور لـە درێژەیـەکی بێزارکـەر، لەگـەڵ تـەحقیق کردنـی دەقەکان و ئەسەرەکان و دابەشکردنی کتێبەکە بۆ چەند بەش و باسێك.

هیوامـان وایـە ئـەو پرۆژەیـە یارمەتیـدانێك و بەشـداریکردنێك بێـت بـۆ نیشـاندانی ژیـانی پێغەمبەر ﷺ بەشێوەیەکی سەردەمیانە ئەویش لە میانی نیشـاندانی لایـەنی کۆمەڵایـەتی لـە ژیانی پێغەمبەر ﷺ و شێواز و سوننەتی لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکدا.

سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکـەین کـە بەشـداریان کـردووە لـەو پـرۆژە گەورەیـە، کـە هیواخوازین چەند پرۆژەیەکی تری لێ لـە دایـك بێـت، سـوپاس بـۆ خـوا کۆتاییمـان هێنـا بـۆ

نوسینەوەی بە دوو کتێب، کتێبی یەکەمیان نوسینەکە هەموو بابەتەکانی لە خۆ گرتووە و بۆ موسڵمانان ئاراستە کراوە، دووەمیش بە کورتکراوەیی ئاراستەی ناموسڵمانان کراوە.

گروپی (زاد) بۆ بڵاوکردنەوە پێخۆشحاڵە کە بوار برەخسێنی بۆ ئەوەی بابەتەکانی ئەم کتێبە بەش بەش بکرێ لە بواری پەروەردەیی و کۆمەڵایەتیەکان بەکاربهێندرێ و بڵاو بکرێتەوە.

بەڕاستی ئەوکارە کە تەواوبوونەکەی چەند ساڵێکی خایاندووە، کە شێخ موحەممەد لەگەڵ قوتابییەکان و شوێنکەوتووانی بردویتەسەر، ئێستا بەروبوومەکەی ئەم کتێبە خنجیلانە بەردەستە و پێشکەشی خوێنەر ئازیزەکانمان دەکەین، جا ئەگەر کارەکە چاك و پوخت بێت ئەوا (الله) ی کاربەجێ سەر ڕاستی کردووین و رێنمایی کردووین، هیچ کارێکیش بەدرە نییە لە کەموکوڕی، (الله) پاداشتی بەخێری هەر کەسێك بداتەوە لە هەر کەموکوڕییەك ئاگادارمان دەکاتەوە.

داو لە (الله)ی بەبەزەیی و بەخشندەی میهرەبان دەکەین کە ئیخلاسمان پێ ببەخشێ لە وتە و کارەکانمان و لێمان وەربگرێ، سەر ڕاستمان بکات بۆ ئەو شتانەی خۆشی دەوێن، چونکە (الله) گوێ بیست و وەڵامدەرەوەیە.

گروپی زاد ١٤٣٥/٤/١٤

# بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی وەرگێڕ

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على افضل الخلق محمد ﷺ وعلى آله وأصحابه ومن تبعهم باحسان الى يوم الدين، أما بعد:

پێغەمبەر ﷺ بۆ موسڵمانان پێشەنگ و سەرمەشقە، چرا و ڕووناکییە، پێشەوا و سەرکردەیە، نور و هیدایەتە، بەڵکو نمونەی هەرە باڵا و پیرۆزییە، هەر بۆیە بە بێ گومان پێویستە ئەم پێشەنگایەتییەش لە ژیانی موسڵمان ڕەنگ بداتەوە، ئەمەش فەرمانی پەروەردگارە بۆ شوێنکەوتنی ئەم پێغەمبەرە: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ﴾

شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ بە جۆرێك دەبێتە کردار و لە واقیع جێبەجێ دەبێت، گەر موسڵمان لە ژیاننامەی ئەم سەروەرە شارەزا بێت، بۆیە شارەزابوونی ژیاننامەی پێغەمبەری مەزن بە پێویست دادەندرێت، سەرچاوەکانیش بۆ ئەم کارە جیاواز و جۆراوجۆرن –بەتایبەت لەسەردەمی ئێستادا– ئاسان دەکەونە بەردەست، سوپاس بۆ خوا ژیاننامەی ئەم خۆشەویستە بە هەموو زمانێك و بەشێوەی کتێب و ڤیدیۆ و دەنگ و وانە (مەلتی میدیا) بەردەستە، خوای پەروەردگار کۆمەڵە خەڵکانێکی بۆ گەیاندنی پەیامەکەی ئامادەکردووە، لێرەدا ئێمە کتێبی (کیف عاملهم ﷺ) بە یەکێك لەو سەرچاوە گرینگ و پڕ بەهایانە دادەنێین بۆ شارەزابوون لە ژیاننامەی پێغەمبەری سەروەر ﷺ، جیاوازی ئەم کتێبە لەچاو کتێبەکانی تری ئەم بوارەدا خۆی لەمەدا دەبینێتەوە، کە بە شێوازێکی نوێ ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ باس دەکات، تیایدا زۆر بەجوانی مامەڵەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگای خۆی ڕوون دەکاتەوە، سەرباری هەڵسوکەوتی تایبەتی پێغەمبەر لەگەڵ گیاندار و پەرییەکان، بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە زۆر بەڕوونی لایەنی ڕەحمەت و سۆز لە ژیانی خۆشەویستمان دەردەکەوێت لە چوارچێوەی وێنەیەکی پڕشنگداری لێوانلێو لە دانایی و میهرەبانی.

ئیمڕۆ چینە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگای موسڵمان بە تایبەت گەنجان تووشی سەر لێشێواوی و سەرگەردانی بوونە و لاسایی هەنەرمەند و یاریزان و یاریە ئەلیکترۆنیەکان و بەڵکو لاسایی گیانداران دەکەنەوە و! شێوازی مامەڵە و هەڵسوکەوت لەوانەوە فێر دەبن! لەبیریان چۆتەوە یان لەبیریان براوەتەوە، کە ژیانە پڕ خێرەکەی سەرداری مرۆڤایەتی

موحەممەد ﷺ جێگای متمانە پێکردن و جێگای تێرامان و جێگای ئەوەیە بکرێتە پێشەنگ و لەهەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی جۆراو جۆر لاسایی بکرێتەوە، ئەو ئوممەتە بەتێکرای چینەکانی رزگاری نابێت لەو نەهامەتی و قوربەسەریەی کەوتۆتە ناوی هەتا نەگەڕێتەوە بۆ کتێبی خوا و سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی دەستی پێوەبگرێت و جێبەجێی بکات ئەوکات سەرکەوتنی خوای گەورە نزیکە بێتە دی ئومەتیش ئەوکات بەتایبەتی –گەنجان– وشیار دەبنەوە و چیتر لاسایی کەسی نادیارو کەم و بەد رەوشت ناکەنەوەو دەردەچن لەو نەفامییە تەواوەی بالّی ڕەشی بەسەردا کێشاون و چیتر بە فرو فێل و حیلەی دوژمنەکانی هەڵناخەلەتێن.

کاتێك هەندێکمان لەو کتێبە ناوازەیەمان خوێندەوەو سودمان لێبینی و سەرنجی راکێشاین، بە پێویستمان زانی خوێنەری سەنگینی کورد بەشدار پێبکەین لەو سود و قازانجە پڕ بەهایە، ئەمەش وەك کار کردنێك بەفەرموودەی راستی پێغەمبەری خوا،کە فەرمویەتی: **"ئەو کەسە باوەڕی تەواو نییە هەتا ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەی پێی خۆش نەبێت**[1]" جاب بیرمان کردەوە وەربیگێرینە سەر زمانی شیرینی کوردی، بەڵام وەکو ئەمانەتی زانستی دەبا پەیوەندی بە دانەری کتێبەکە بکەین بۆ ئەوەی مۆڵەتی وەرگێرانی لێوەربگرین، جا سوپاس بۆ خودا بەر لە بەندکردنی لەساڵی ٢٠١٧ توانیمان لەرێگای بەرنامەی –واتس ئاب– پەیوەندی بە شێخ موحەممەد صالح المنجد بکەین و مۆلەتی لێوەربگرین، کە زۆر بە خۆشحالیەوە مۆلەتی پێداین و زۆری پیّ خۆش بوو، بەڵام فەرمووی: وەرگێرانێکی باشی بۆ بکەن و دوور بێت لەهەڵەی زەق، ئێمەش بەو راسپاردەیەی بەرێزیانەوە هەڵساین ئەوەندەی پێمان کرابێت، خوای گەورە پاداشتی بەخێری شێخ موحەممەد صالح المنجد بداتەوە و خۆی و هاوەڵەکانی و سەرجەم بندکراوە موسڵمانەکان لە بەندیخانە ئازاد بکات و بە سەلامەتی بیانگەڕێنێتەوە ناو مالّ و مندالّی خۆیان.

هەڵبەتە شێوازی نوسینی ئەم کتێبە لەلایەن زانا و بانگخواز د.موحەممەد صالح المنجد –خوا بیپارێزێت– بیرۆکەیەکی تازەیە و سەرنجراکێشە، نیشاندانی ژیانی پێغەمبەری خوا بەم شێوەیە شتێکی نوێیە و لە سنووری شارەزاییی خۆمان کەس کتێبێکی وەکو ئەمەی تاوەکو ئێستا نەنوسیووە تیایدا بەم شێوەیە لایەنی کۆمەڵایەتی پێغەمبەر نیشان بدات لەمەڕ مامەڵە کردنی لەگەل چین و توێژە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگاکەی خۆی، هەر لە هەڵبژاردنی ناونیشانی کتێبەکە (**پێغەمبەر ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ کردن؟**) تا دەگاتە دابەشکردنی

---

١ أخرجه البخاري (١٣)، ومسلم (٤٥)، والترمذي (٢٥١٥)، والنسائي (٥٠١٦)، وابن ماجة (٦٦)، وأحمد (١٣٨٧٤) واللفظ له.

ناوەرۆکی کتێبەکە لە هەڵسوکەوتی جوانی پێغەمبەر لەگەڵ خزم و کەسەکانی، پەیوەندی خۆشەویستی لەگەڵ خزمەکانەکانی، رەوشتبەرزی لەگەڵ ئافرەتان، بە ئەمەکی و وەفایی لەگەڵ هاوەڵان، رێزگرتن و پێدانی ماف لەگەڵ دراوسێکان، نەرمونیانی لەگەڵ نەفامان و دەشتەکییەکان، شێوازی فێرکردن و پەروەردەکردن لەگەڵ نەزان و ناشارەزاکان، رەحم و بەزەیی لەگەڵ نەخۆش و خاوەن بەڵاکان، هەڵسوکەتی ژیرانەی لەگەڵ هەژار و دەوڵەمەندان، حیکمەت و دانایی لەگەڵ دووڕوو و کافرەکان، میهرەبانی و سۆزی لەگەڵ پەری و گیاندارەکان، هەموو ئەمانە و چەندانی تر بە شێوازێکی زۆر وردەکاری و یەکجار جوان دەرخستووە، ژیانی ئەم سەروەرەی وەك رۆژ روناکردۆتەوە لە مەڕ مامەڵەکردنی حەکیمانەی لەگەڵ چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگاکەی خۆی، کە وەك ئەمە وایە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: "**تركتُم على المَحَجَّةِ البَيضَاء ليلُها كَنَهارِها لايَزيغُ عَنها إلاّ هَالِك**"[١]

بەڕاستی سوننەتی سەروەرمان وەك راستە شەقامێکی روون و ئاشکرایە، شەوەکەی وەك رۆژ رووناکە، هیچ کەسێك لێی لانادا مەگەر خەسارەتمەند و هیوابڕوا نەبێت.

لەبەر گرنگی و پڕبایەخی ئەم کتێبە و سوود وەرگرتنمان لە ناوەرۆکەکەی و سەرسامبوون بە شێوازی نوسینەکەی و دەوڵەمەندی لە سەرچاوەی باوەڕپێکراو پڕ زانیاری، پێمان باش بوو بەو توانایە سادەیەی هەمانە و خوای گەورە پێی بەخشیووین، وەری بگێڕینە سەر زمانی شیرینی کوردی، بۆ ئەوەی خوێنەری کورد لە پاداشت و

سوودی ئەم کتێبە بێ بەش نەبێت، کە ئێمە پێمان وایە گەر خوای گەورە لەو هەوڵەدا سەرکەوتووی کردبین، سەرچاوەکانی زانینی سوننەتی پێغەمبەر و ژیاننامەکەی لە کتێبخانەی کوردیدا بەم هەوڵە دەوڵەمەندتر دەبێت، چونکە سروشتی ئەم کتێبە وەهایە دەکرێ وەك سەرچاوەی زانیاری لە رووی سوونەت و مامەڵەکردن و ژیانی سەروەرمان سوودی لێ وەبگیرێت.. جا ئەگەر پێکابێتمان ئەوا الله رێنموێی و سەر ڕاستی کردووین، ئەگەریش کەموکوڕیمان هەبێت ئەوا تەنها لە خۆمان و شەیتانەوەیە، ئومێدمان وایە پەروەردگار لێمان خۆش بێت، ئێوەی خوێنەریش سوودی لێ ببینن و لە هەڵە و کەم و کوڕییەکانیشمان ببورن، نێوانی ئێمە و خوێنەریش وتەی شاعیرە :

إن تَجِدْ عَيبَاً فَسدْ الخَلا     جلّ من عيب فِيه وَعلا

---

[١] ئەحمەد و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع/ ٤٣٦٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

# پێشەکی دانەر

الحمد لله رب العالمين، وأشهد أن لا إله الا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله ﷺ

بەراستی و بێگومان پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ و نمونەیەکی باڵایە، ئەو ڕەوشتە بەرز و ئەدەبە جوانانەی پێغەمبەر ﷺ کە خوای گەورە وەکو نیعمەتێك پێی بەخشیوە ئەوا وای کردوە هەر کەسێك ئەو بکاتە پێشەنگ بێگومان لە خوای گەورە نزیك دەبێتەوە و ئەو ڕێگەیە دەگرێت کە بەرەو لای خوای پەروەردگار دەبیات.

بۆیە لەسەرمان پێویستە ژیانی پڕخێری پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیکی ورد بخوێنین لە چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ کەسە جۆراوجۆرکاندا، بۆئەوەی بتوانین بە شێوەیەکەی ڕاست و دروست بیکەینە پێشەنگ.

بەراستی کەسانێکی زۆر دەیانەوێ پێغەمبەر ﷺ بکەنە پێشەنگی خۆیان، بەڵام بە شێوەیەکی هەڵە و چەوت و بێ زانست، ئینجا ئەوانە زیاتر خراپەکاری دەکەن لەوەی چاکسازی بکەن.

لەم کتێبە هەوڵمانداوە بە دوای مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ بکەوین لەگەڵ چین و توێژی خەڵکدا، لەو بارەیەوە فەرموودەکان کۆ بکەینەوە، بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە و چرایەکی پڕشنگدار بۆ ئەوانەی دەیکەنە پێشەنگ.

ئەم کتێبەمان دابەش کردووە بۆ شەش بەش:

## بەشی یەکەم: پێشەنگی جیهانیان.

ئەمە بەشە مانای پێشەنگی لەخۆگرتووە، ئەوەی روونکردۆتەوە کە پێغەمبەران ﷩شایانی ئەوەن بکرێنە پێشەنگ و هەروا لایەنەکانی پێشەنگایەتی بە پێغەمبەران بە شێوەکی گشتی و بە بەتایبەت پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ .

بەشی یەکەممان دابەشکردوو بۆ دوو باس:

باسی یەکەم: پێغەمبەر ﷺ وەك پێشەنگێکی چاك.

باسی دووەم: لایەنەکانی پێشەنگایەتی بە پێغەمبەر ﷺ.

## بەشی دووەم: مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاوخێزان و خزم و دەوروبەری.

ئەم بەشە ئەوە لە خۆ دەگرێ: کە چۆن پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکان و منداڵ و نەوەو خزم و کەس و دراوسێکانی دەورەبەی خۆیدا کردووە.

ئەم بەشەم بۆ هەشت باس دابەشكردووە:
باسی یەكەم: مامەڵەكردنی پێغەمبەر لەگەڵ خێزانە بەڕێزەكانی.
باسی دووەم: ئەم باسەش چەند لایەنێك لە خۆ دەگرێت:
لایەنی یەكەم: هەڵسوكەوتی پێغەمبەر لەگەڵ خێزانەكانی.
لایەنی دووەم: پەروەردەكردنی پێغەمبەر بۆ خێزانەكانی، بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگ بۆ ئافرەتانی باوەڕدار.
لایەنی سێیەم: چارەسەكردنی گرفت و كێشەكان لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ .
باسی سێیەم: مامەڵكردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نەوەكانی.
باسی چوارەم: مامەڵەكردنی پێغەمبەر لەگەڵ خزمەكانی.
باسی پێنجەم: مامەڵەكردنی پێغەمبەر لەگەڵ دراوسێكانی.
باسی شەشەم: مامەڵەكردنی پێغەمبەر لەگەڵ ﷺ میوان و میوانداری.
باسی حەوتەم: مامەڵەكردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هاوەڵە تایبەتەكان.
باسی هەشتەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خزمەتكار و كەنیزەكان.

**بەشی سێیەم: مامەڵەكردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چینە تایبەتەكانی كۆمەڵگا.**

ئەم بەشە مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لە خۆ دەگرێت لەگەڵ هەندێك چین و توێژی تایبەتی كۆمەڵگا، كە مامەڵەیەكی تایبەتیان دەوێت، چونكە خاوەن سیفاتێكی تایبەتن بۆیە دەبێت مامەڵەكە بگونجێت لەگەڵ سیفەتە تایبەتەكانیان.
ئەم بەشەم دابەشكردووە بۆ هەشت باس:
باسی یەكەم: مامەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ خاوەن پێداویستی ﷺ تایبەت.
باسی دووەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نەخۆشەكان.
باسی سێیەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوانەی خوای پەروەردگار بە بەلا و ناخۆشی تاقیكردوونەتەوە.
باسی چوارەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەژاران.
باسی پێنجەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دەوڵەمەندان.
باسی شەشەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خانەدانەكان.
باسی حەوتەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پێگەیشتووان.
باسی هەشتەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ناكۆكیكاران.

**بەشی چوارەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو چین و توێژەی مامەڵەیەکی تایبەتیان پێویست بووە :**

ئەم بەشە مامەڵەی پێغەمبەر لەخۆ دەگرێ لەگەڵ هەندێك كەس، كە زیاتر لە خەڵكیتر پێویستیان بە بانگەوازو زیاتر پێویستیان بە سەرپەرشتی كردن هەیە.

ئەم بەشەم دابەشكردووە بۆ پێنج باس:

باسی یەكەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ تازە موسڵمان بووەكان.

باسی دووەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پرسیاركەرەكان.

باسی سێیەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عەرەبە دەشتەكییەكان.

باسی چوارەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ گوناهبار و سەرپێچی كاران.

باسی پێنجەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دووڕووەكان.

**بەشی پێنجەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چەند چینێكی تایبەت.**

باسی یەكەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئافرەتان بە گشتی.

باسی دووەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بەساڵاچووان.

باسی سێیەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منداڵان و بچكۆڵەكان.

**بەشی شەشەم: مامەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ جگە لە مرۆڤ:**

ئەم بەشەم دابەشكردووە بۆ سێ باس:

باسی یەكەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جنۆكەكان.

باسی دووەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ گیانداران.

باسی سێیەم: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ڕووەكەكان.

لە كۆتاییدا داوا لە خوای پەروەردگار دەكەین سەر ڕاستمان بكات بۆ ئەوەی ڕاستی بپێكین و كاروكردەوەكانمان لێ وەربگرێت.

# بەشی یەکەم:

# پێغەمبەرﷺ پێشەنگی هەموو جیهانیان

## پەیامبەر موحەممەد ﷺ وەك پێشەنگێکی چاك

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب:21

واتە : بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێك و پێك هەیە تاچاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفەرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

ابن کثیر دەفەرموێت: ئەم ئایەتە بنچینەیەکی گەورەیە بۆ بە پێشەوایەتیکردن و شوێنکەوتنی پێغەمبەر خوا ﷺ لە وتە و کردار و هەموو بارەکانی.[١]

خوای پەروەردگار کاتێك ئەو پێغەمبەرەی نارد، بۆ ئەوەی ببێتە ڕەحمەت و خێر بۆ هەموو جیهانیان، جا بوو بە نمونەیەکی ناوازە و جوان و بوو بە پێشەنگێکی چاك بۆ ئەوانەی ئاواتیان گەیشتنە بە پەروەردگار و ڕۆژی دوایی و هەرگیز خۆبەزلزان نین و نایانەوێت خراپەکاری لەسەر زەوی بکەن.

## مەبەست لە پێشەنگ چییە؟

**پێشەنگ** : مانای ئەوەیە خەڵك شوێن هەنگاوەکانی بکەون و ڕێگای ئەو بگرنەبەر.

ئەمڕۆ بۆ موسڵمانان شوێنەکەوتنی پێغەمبەر زۆر پێویستە، بەتایبەت کە ئەمڕۆ دوژمنانی ئیسلام گومان گەلێکیان ناوەتە ناو ئیسلام، موسڵمانانیان بە ئارەزووبازی تەفرەداوە بۆ ئەوەی ڕێگری بکەن لە ئایینی خوا.

بۆیە لەم کتێبەدا ویستومانە لەبارەی پێغەمبەرەوە بدوێین، لەمەڕ پێشەوایەتی و دادوەریی و چاکسازی و مامۆستایەتی و پەروەردەکەیەوە، هەروەها وەك باوکێك و بەڕێوەبەرێك و پێشەوایەك و سەرکردەیەك و کرێکارێك.. ئەمەو جگە لەمانەش

---

[١] تفسیر ابن کثیر٦/٣٩١

لەلایەنەکانی کەسایەتییەکەی، کە لەمەدا پشتمان بەستووە بەفەرمودە راستەقینەکانی پێغەمبەرو بەرچاومان بەو فەرمودانە روناك کرۆدتەوە.

پێغەمبەر رابەرێکی بێ وێنەیە کە پێویستە لەسەر موسڵمانان شوێنی بکەون و شوێن پێی هەنگاوەکانی بگرنەبەر، ئەو هەرچی دەیکات و هەرچی دەفەرموێت ئەوە بۆ ئێمە جێگەی پەیڕەوی کردنە کە شایەنی ئەوەیە بیکەینە پێشەنگی ژیانی خۆمان.

## شوێنی هیدایەتیان بکەوە:

شوێن پێی رێنموێنی و هیدایەتی ئەوان بکەوە (فبداهم اقتده)، پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات، کە پێغەمبەران بکاتە پێشەنگ و شوێن پێی ئەوان هەڵبگرێت، کە دەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ ﴾

واتە: ئەو کەسانەن کە خوا (بەتایبەت) هیدایەت و رێنمویی کردوون، تۆش ئەی موحەممەد ﷺ شوێن هیدایەت و رێنمویی ئەوانە بکەوە.

(فبداهم اقتده) ابن کثیر دەفەرموێ: واتە شوێنینان بکە و بیانکە پێشەنگ، جا ئەگەر ئەوە فەرمانێك بێت بۆ پێغەمبەرەکەی ئەوا ئۆمەتەکەی پاشکۆی ئەون و لە پیشترن بۆ ئەو ئەحکامانەی بۆیان دادەنێت و فەرمانیان پێ دەکات جێبەجێی بکەن [١].

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە ﷬ دەفەرموێت: لە چیرۆکی پێغەمبەراندا زۆرپەند و ئامۆژگاری هەنە بۆ باوەڕداران، لەوانەیە خوای گەورە توشی زۆر دەرد و بەلا و نەهامەتیان بکات، ناشبێ بێ ئومێدبن لەوەی کە بەسەریاندا هاتووە، چونکە لەوان چاکتر و باشتر بەم شتانە تاقیکراونەتەوە و سەرەنجامیان هەر خێر بووە، جا با ئەو کەسەی بە گومانە با دڵنیا بێت و تاوانباریش با بگەڕێتەوە، با باوەڕداران باوەڕی خۆیان پتەو بکەن بەوەی پێغەمبەر بکەنە پێشەنگ و رابەری خۆیان [٢].

لەو کاروبارانەی فەرمانمان پێکراوە پێغەمبەران بکەینە پێشەنگ و رابەر:

## یەکەم : گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار و پەرستنی بە شێوەیکی ڕاست و دروست:

ئەم سیفەتە گەورەیە دیارترین و زەقترین سیفەتە لە ژیانی پێغەمبەران ﷵ ئەوان لە هەموو کەس زیاتر پەرستنیان بۆ خوای گەورە هەبووەو کردەوەو ملکەچیان بۆ خوای

---

[١] تفسیر ابن کثیر ٢/١٩٠

[٢] مجموع الفتاوى ١٥/١٧٨

گەورە نواندووە. ئەوەش مانای فەرمایشتی پەروەردگارە کە دەفەرموێت ﴿ وَٱذْكُرْ عِبَٰدَنَآ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ ﴾ ص:٤٥

عطاء الخرساني رحمه الله لەبارەی ئەو ئایەتە فەرمویەتی ﴿أُو۟لِى ٱلْأَيْدِى وَٱلْأَبْصَٰرِ﴾ واتە: بە زانست و جۆش و خرۆش و بەهێزەوە خوای گەورەیان پەرستووە و بە زانستەوە خوای گەورەیان ناسیووە.

قەتادە رحمه الله وتویەتی: لە پەرستنی پەروەردگار هێزیان پێدراوە و لەبەرچاو رۆشنی و بیرتیژی ئاینیش بەهرەمەند کراون [1].

شاهێدەکانیش زۆرن لەمەڕ باسکردنی پەرستنی پێغەمبەران عليهم السلام بۆ خوای گەورە، لەوانە:

فەرمایشتی پەروەردگار لەسەر زاری ئیبراهیم عليه السلام: ﴿ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴾ إبراهيم: ٤٠

هەروەها فەرمایشتی پەروەردگار لە ستایشکردنی پێغەمبەر ئیسماعیل عليه السلام: ﴿ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴾ مريم: ٥٥

هەروەها فەرمایشتی پەروەردگار لە ستایشی پێغەمبەران ئیبراهیم و ئیسحاق و یەعقوب عليهم السلام ﴿ وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴾ الأنبياء: ٧٣

سەبارەت بە پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ ئەوا شاهێد و بەڵگەکان یەکجار زۆرن لەسەر عیبادەت کردن و مل کەچی بۆ خوای پەروەردگار، سەرباری ئەوەی پەروەردگار لە گوناهی رابردوو و داهاتووی ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴾ الإنسان: ٢٦

هەروەها پێی فەرمووە: ﴿ فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ۚ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴾ مريم: ٦٥

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴾

**دووەم : یادکردن و ملکەچبوون و پاڕانەوە و بەندایەتیکردنی زۆریان بۆ خوای پەروەردگار:**

پێغەمبەران عليهم السلام هەموو کات یادی خوای گەورەیان کردووە، بەردەوام زمانیان بە زیکر و یادی الله تەڕ بووە، ئەوان هەردەم ملکەچ و دڵسۆز بوونە بۆ ئەو زاتە، هەروەها پاڕانەوەی بەردەوام و رێگای جۆراوجۆریان لە بەندایەتی کردن بەکارهێناوە.

[1] مجموع الفتاوى ١٧٠/١٩

خوای پەروەردگار باسی کردوون، کە چۆن ئەوان لە کاروبارەکانیان بەملکەچییەوە داوایان هەر لەو کردەوە و تەنها و تەنها هەر لەو پاڕاونەتەوە. دانیان ناوە بە بێ دەسەڵاتی و هەژاری خۆیان بەرامبەر ئەو زاتە پیرۆزە. خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّى مَسَّنِىَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرْحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ فَكَشَفْنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرٍّ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ أَهْلَهُۥ وَمِثْلَهُم مَّعَهُمْ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَذِكْرَىٰ لِلْعَٰبِدِينَ ﴾الأنبياء: ٨٣-٨٤

واتەی ئایەتەکە: یادی ئەیوب یش بکە کاتێك هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری برد وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی من ئازار و ناخۆشیم تووش بووە، تۆش لە هەموو کەس میهرەبانترو دلۆڤانتریت. (٨٣) جا ئێمەش نزامان گیراکرد و بەهاواریەوە چووین و هەموو ناخۆشی و نەخۆشیەکمان لەکۆڵ کردەوە، هەموو ماڵ و منداڵیمان پێبەخشیەوە و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا، ئەوە رەحمەتێکی تایبەتی بوو لەلایەن ئێمەوە، یاداوەریشە بۆ بەندە خواپەرستەکان.

هەروەها فەرمویەتی: ﴿ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَنَجَّيْنَٰهُ مِنَ ٱلْغَمِّ ۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرْنِى فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسْتَجَبْنَا لَهُۥ وَوَهَبْنَا لَهُۥ يَحْيَىٰ وَأَصْلَحْنَا لَهُۥ زَوْجَهُۥٓ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴾الأنبياء: ٨٧-٩٠

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پەناگر بوو بە پەروەردگار و زۆر پاڕاوە و ملکەچ بووە بۆی، بە تایبەتی لە کات و ساتە ناهەموارەکاندا، لە جەنگی بەدر زۆر بە دڵەوە لە پەروەردگار پاڕایەوە موسڵمانان سەربخات، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە جەنگی بەدر روویکردە قیبلە و هەردوو دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی: **"خودایە ئەوەی بەڵێنت پێ داوم بۆم بێنەدی، ئەوەی بەڵێنت پێداوم بۆ جێبەجێ بکە، خودایە، ئەگەر ئەم تاخمە لە ئەهلی ئیسلام لەناوچوون، ئەوا لەسەر زەویدا کەس ناتپەرستێت"**.

ئیتر بەردەوام بوو لە پاڕانە و بەرزکردنەوەی دەستەکانی بەرامبەر قیبلە تا چاکەتەکەی لەسەر شانی کەوتە خوارەوە، ئەبوبەکر ﷺ چاکەتەکەی بۆ هەڵگرتەوە و

لەسەر شانەکانی دانایەوە، ئینجا پێ گوت: ئەی پێغەمبەر زیاتر مەپاڕێوە، پەروەردگارت ئەوەی بەڵێنەی پێداویت بۆت دێنێتە دی[١].

**سێیەم: ملکەچی و گریانیان لە کاتی یادکردنەوەی پەروەردگار:**

خوای گەورە ستایشی ئەو پێغەمبەرانەی کردووە کە ناویان لە سورەتی (مریم) هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا ﴾ مريم: ٥٨

واتای ئایەتەکە: (ئا ئەوانە کەسانێکن کە خوای گەورە ناز و نیعمەتی بەسەردا رشتوون لە پێغەمبەران، لە نەوەی ئادەم و ئەوانەش (کە لە کەشتیەکەدا) لەگەڵ نوحدا سوارمان کردن و لە نەوەی ئیبراهیم و یەعقوب و لەوانەی کە هیدایەتمان داون و هەڵمان بژاردوون، ئەوانە، هەرکاتێك ئایەتەکانی خوای میهرەبانیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، بە پەلە سوژدە دەبەن و ئەسرین لە دیدەیان دەبارێت و دەگرین.

پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس زیاتر لە خواترس بووە، دەیفەرموو: **"من هیوام وایە لە هەمووتان زیاتر لە خوا ترستر بم و لە هەمووتان زیاتر شارەزاتر بم لەوەی تەقوای پێ دەکەم[٢]"**.

هەروەها دەیفەرموو: **"ئەی ئەو کەسەی دڵەکان دەگۆڕی، دڵم لەسەر ئاینەکەت جێگیر بکە[٣]"**.

**چوارەم : لاسایی کردنەوەیان لە خوا ناسینیان بە زانستەوە :**

پێغەمبەران عليهم السلام ئەو زانستەیان کە بە میرات بۆ ماوەتەوە ئەوا بە هۆی ئەو باوەڕەیتەوە و ئەو دڵنیایەیان بووە بە خوای پەروەردگار، ئەوان زاناترین کەس بوونە بە خواناسی، بەندەش چەندە خوای گەورە بناسێ ئەوەندە ملکەچی و ترس و پەرستش و دڵسۆزی بۆ خوای پەروەردگار زیاتر دەبێت.

ابن القيم رحمه الله فەرمویەتی: هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ بەختەوەری نە لە دونیا نە لە قیامەت، تەنیا لەسەر دەستی پێغەمبەران نەبێت عليهم السلام هیچ ڕێگەکیش بۆ زانینی شتە باشەکان و شتە خراپەکان نییە، تەنیا لە ڕێگەی ئەوانەوە نەبێت، رازی بوونی خوای گەورەش بە دەست نایەت تەنیا لەسەر دەستی ئەوان نەبێت. کردارە باشەکان و وتە جوانەکان و ئەخلاقە بەرزەکانیش تەنیا ئەوان هێناویانە.

---

[١] موسلیم گێراوەتیەوە(١٧٦٣).

[٢] بوخاری (٢٢) و موسلیم (١١١٠) گێڕاوەتیانەوە. بێژەکە هی عائیشەیە.

[٣] ترمذي لە سەلمە گێراوەتیەوە (٣٥٢٢)، ئەلبانی لە صحيح الجامع (٤٨٩١) بە سەحیحی داناوە.

ئەوان ئەو تەرازووە ڕاستەنە، کە لەسەر وتە و کردەوەو ڕەوشتی ئەوان، وتەو کردەوەو ڕەوشتی خەڵکی دەپێورێت، بە شوێنکەوتنیشیان ئەهلی هیدایەت و ئەهلی گومڕایی لێك جیادەکرێنەوە.

بوونی ئەوان زۆر گرینگترە لە پێداویستی جەستە بۆ گیان و پێداویستی چاو بۆ ڕووناکی و پێداویستی گیان بۆ ژیان، هەر پێداویستییەك هەبێت و فەرزکرابێت، ئەوا پێداوییستی بەندە بۆ پێغەمبەران چەندەها جار زیاترە.

گومانت چییە بەرامبەر ئەو کەسەی ڕێنوێنی پێغەمبەری ﷺ لێ بزربێت؟ ئەو کەسەی شوێن پێغەمبەری خوا نەکەوێت، وەکو ماسی لێدێت کە لەئاو دەهێندرێتە دەرەوە و دەکەوێتە ناو تاوە.

ئینجا ئەگەر بەندە پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەران و ئەوەی هێناویانە پچڕا، حاڵی وەکو حاڵی ماسی لێ دێت، کە لە ئاو دابڕێت، بەڵکو خراپتریش، بەلام ئەوەی هەست بەمە دەکات تەنیا خاوەن دڵێکی زیندووە، کەسێکیش دڵی مردبێت ئەگەر برینداریشکرا هەستی پێ ناکات.

ئینجا ئەگەر بەختەوەری لە هەردوو دونیا بەستراوەبێت بە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوا پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە خەمی خۆیەتی و ئارەزووی هەیە بەختەوەر بێت، ئەوا دەبێت شوێن سوننەت و ژیان و ڕێنمویی پێغەمبەر ﷺ بکەوێت. بۆ ئەوەی لە دەستەی نەفامان ئەژمار نەکرێت و بچێتە ناو دەستەی شوێنکەوتوان و حیزبەکەی پێغەمبەر ﷺ . خەڵکیش لەمەدا هەیانە کەم و هەیانە زۆرو هەشیانە بێ بەشن، پێدانی ئەو نیعمەتەش هەر بەدەستی پەروەردگارە، دەیداتە کەسێك کە خۆی بەوێ، خوای گەورە خاوەنی فەزڵ و چاکەی زۆر گەورەیە [1].

## بۆ چی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەینە پێشەنگ؟

### یەکەم : چونکە ژیانە پڕخێرەکەی ژیانی کەسێکی بێ کەم و کوڕی بووە:

خوای گەورە بە عیلم و دانایی خۆی هەڵیبژاردووە و لەناو هەموو مرۆڤەکان دەستنیاشانی کردووە، کە وابوو هەردەبێت ئەم ژیانە پیرۆز و پڕ خێرە شارەزابین بۆ ئەوەی ببێتە چرایەك بۆ ژیانمان و ببێتە ڕزگارکەرێك بۆ ئوممەتەکەمان.

[1] زاد المعاد(١/٦٩).

**دووەم: جێبەجێکردنی فەرمانی خوای کاربەجێ:**

خوای باڵادەست لە قورئانی پیرۆز فەرمانی کردووە ئەو پێغەمبەرە ﷺ بکەینە پێشەوا و پێشەنگ و سەرکردەی خۆمان: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب:٢١ واتای ئایەتەکە: (سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە تاچاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفەرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

﴿ فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ النور: ٦٣

واتای ئایاتەکە: (دەبا ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقی کردنەوەیەکی سەخت، یان تووشی سزایەکی بە ئێش ببن)

**سێیەم: خوای کاربەجێ پاراستویەتی لە هەڵە و چەوتی:**

ئەگەر ئەنجامیشی دابێت ئەوا ئاگاداری کردۆتەوە بۆ ئەوەی ڕاستی بکاتەوەو بەردەوام نەبێت لەسەری، جا بەراستی ئەو کەسەی بەو شێوەیە بێت شایەنە بۆ ئەوەی بکرێتە پێشەنگ و لاسایی بکرێتەوەو لێکۆڵینەوە لە ژیانە پڕ خێرەکەی بکرێت و سوننەتەکەی بزاندرێت.

**چوارەم: لە ژیانە پڕ بەرەکەتەکەیدا پەند و وانە و ئامۆژگاری هەیە:**

هەموو ژیانی ئەو نازدارە پڕە لە وانە و ئامۆژگاری، هەر لە مەسائیلی بیروباوەڕەوە بگرە هەتا دەگاتە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و ڕێباز و سوننەت و ئارامگرتنی لە بانگەواز و کێشە و کێشمەکێشی لەگەڵ ئەهلی گومڕادا.

**پێنجەم: شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ مەرجی سەفرازی و سەرکەوتنە:**

ئەگەر شوێن ئەو نازدارە نەکەوین لە وتە و کردار و هەڵسوکەوت و ڕەوشت و سوننەتی، ئەوا هەرگیز سەرفراز نابین و سەرناکەوین.

**شەشەم: پێغەمبەری نازدار ﷺ لە هەموو حاڵەتەکانیدا پێشەنگ و نمونەیە:**

ئایا خوای پەروەردگار ﷻ لە پێغەمبەری پیاو، لە پێغەمبەری هاوسەر، لە پێغەمبەری برا، لە پێغەمبەری راستگۆ، لە پێغەمبەری دادوەر، لە پێغەمبەری سەرکردە، ئایا خوای گەورە لەو پێغەمبەرە کەسایەتییەکی بۆ نیشان نەداوین تا ببێتە پێشەنگ و سەرمەشق بۆمان لە هەموو حاڵ و بارودۆخێکدا؟

## زانینی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ، پێویستە بۆ شوێنکەوتنی:

بەراستی دەبێت بە تێرامانێك و روانینێکی ورد سەرنجی هەموو ژیانی ئەو نازدارە بدەین، بۆ ئەوەی بتوانین چۆن لاسایی بکەینەوە؟

چۆن دەست بە سوننەتەکانی بگرین؟

چۆن بیکەینە پێشەنگ؟

بۆیە پێویستە بە دوور و درێژی شارەزابین لە هەموو کاروبارەکانیدا، بە تایبەتی لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خەڵکە جۆربەجۆرەکاندا.

## لایەنەکانی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

ئەوەی لە ژیانی پێغەمبەر وردبێتەوە، دەبینێت کە هەرچی رەوشتی بەرز و بەهادار و جوان هەیە گرتویەتیەخۆ.

پێغەمبەر ﷺ سەرمەشقە لە رەوشت جوانی، خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤

پێغەمبەر ﷺ رەوشتی قورئان بووە [١]، رازی بووە بە رازیبوونی قورئان و بە تورەبوونی قورئانیش تورە بووە، هەرگیز ئەو نازدارە شتی خراپی نەکردووە [٢]، دەنگیشی لە بازاڕ بەرز نەکردۆتەوە، پاداشتی خراپەی هەرگیز بە خراپە نەداوەتەوە، بەڵکو هەر چاوپۆشی کردووە و لێبوردەیی نواندووە [٣].

صفیە ﷺ دەفەرموێت: کەس وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ رەوشتی جوان نەبووە [٤].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (نۆ ساڵ خزمەتم کرد، تەنها جارێك نەیفەرموو بۆ ئەو کارەت ئەوها کرد و بۆچی واتکرد و بۆچی وات نەکرد [٥]).

هەر لە ئەنەسەوە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا لە هەموو کەسێك رەوشتی بەرزتر و جوانتربووە، جارێك ناردمی بۆ کارێك، منیش گوتم: سوێند بە الله ناچم، لە دەرونیشمدا نیەتم هەبوو بچم بۆ ئەو شتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردبووم، ئینجا رۆشتم تا لە بازاڕ بەلای هەندێ منداڵ تێپەریم یاریان دەکرد، پێغەمبەریش لەناکاو پشتی ملی

---

[١] موسلیم لە عائیشە گێراوەتیەوە(٧٤٦).

[٢] بوخاری (٣٥٥٩) و موسلیم (٢٣٢١) گێڕاوەتیانەوە. لە عەبدوڵلای کوڕی عمر .

[٣] ترمذي لە عائیشە گێراوەتیەوە(٢٠١٦).

[٤] الطبراني لە (الاوسط ٦٥٧٨) گێڕاوەتیەوە، بەسەنەدی (حسن) لە فتح الباری (٦/٥٧٥).

[٥] بوخاری (٢٧٦٨) و موسلیم (٢٣١٠) گێڕاوەتیانەوە.

گرتم، منیش تەماشای دواوەی خۆم کرد بینیم ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ و پێدەکەنیّ و فەرمووی: **"ئەی ئونەیس ئایە چووی بۆ ئەو کارەی پێم گوتبووی؟"**، منیش گوتم: بەڵێ ئەوە دەچم[1].

## پێغەمبەر سەرمەشقە لە نەرمی و لێبوردەیی:

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ﴾ آل عمران: ١٥٩

واتای ئایەتەکە: ئەی موحەممەد ﷺ بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر توڕە و قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: (لەگەڵ پێغەمبەری خواوە ﷺ دەڕۆیشتم، کە عەبایەکی نەجرانی ئەستوری لەبەر بوو، ئەعرابیەك لەولا هات و یەخەی ملی پێغەمبەری زۆر بە توندی ڕاکێشا، تا من تەماشای سەرشان و ملیم کرد بینیم لەبەر توند ڕاکێشانی لێواری عەبایەکە ملی پێغەمبەری خوای سورکردەوە، پاشان ئەعرابیەکە پێی گوت: ئەو ماڵ و سامانەی کە هی خوای گەورەیە و لەلاتە هەندێکم بدەرێ، پێغەمبەریش ﷺ ئاوڕێکی لێدایە و پێکەنی، پاشان فەرمانی کرد شتێکی بدەنێ[2].

## پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەنگ بووە لە شەرم کردندا:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ بەشەرمتر بووە لەو کچەی هێشتا مێردی نەکردووە، ئەگەر شتێکی بەدڵنەبوایە لە دەم و چاوی هەستمان پێ دەکرد)[3].

## پێغەمبەری خوا ﷺ پێشەنگ بووە لە بەزەیی پێهاتنەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧

ئەبو زەر ﷺ دەفەرموێت: شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی کرد، یەك ئایەتی لە هەموو ڕکاتەکان دووبارە دەکردەوە ئەویش ئایەتی ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ

---

[1] موسلیم گێراوەتیەوە(٢٣١٠).

[2] بوخاری (٣١٤٩) و موسلیم (١٠٥٧) گێڕاوەتیانەوە.

[3] بوخاری (٦١٠٢) و موسلیم (٢٣٢٠) گێڕاوەتیانەوە.

﴿فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ المائدة: ١١٨، کە بەیانی کردەوە پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئەمشەو هەر یەك ئایەتت دووبارە دەکردووە، فەرمووی: **"من داوای شەفاعەتم کرد بۆ ئوممەتەکەم، ئەویش پێی دام، ئەو شەفاعەتەش إن شاء الله بۆ ئەوانەیە کە هیچ هاوبەشێکیان بۆ خوا دانەناوە**[1]".

مالیکی کوڕی حویرث ﷺ دەفەرموێت: لەگەڵ چەند کەسێك لە خزمانی خۆم هاتمە خزمەت پێغەمبەر خوا ﷺ، بیست شەو لەلای ماینەوە، پێغەمبەر ﷺ زۆر زۆر بە بەزەیی و نەرم بوو، کە زانی ئێمە غەریبی ماڵ و منداڵمان دەکەین، فەرمووی: **"بگەڕێنە بۆ لایان و فێرە زانست و نوێژیان بکەن، کاتێك کاتی نوێژ هات با یەکێکتان بانگ بدات و گەورەشتان با پێش نوێژیتان بۆ بکات**[2]".

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە وەفاداری و پاراستنی پەیمان:

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت لە هەموو ئافرەتەکانی پێغەمبەری خوا زیاتر غیرەم دەکرد لە خەدیجە ﷺ کە نەمدیتبوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر باسی دەکرد، جارجار بەرخێکی سەردەبڕی و پارچە پارچەی دەکرد و پاشان دەینارد بۆ دەستە خوشەکەکانی خەدیجە، منیش دەمگوت: هیچ ئافرەتێك نییە لە دونیا تەنیا خەدیجە نەبێت. ئەویش دەیفەرموو: **"ئەو واو وا بووە، منداڵەکانم لەو بوونە**[3]".

## پێغەمبەری ﷺ پێشەنگ بووە لە مل کەچی:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ الشعراء: ٢١٥واتای ئایەتەکە: باڵی بەزەیی و میهرەبانی خۆت نەوی بکە بۆ ئەو ئیماندارانەی کە شوێنت کەوتوون.

خوای پەروەردگار فەرمانی نەرمی نواندن و مل کەچی لەگەڵ موسڵمانە هەژارەکان پێکردووە تەنانەت بەرامبەر موسڵمانەکان.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای منداڵاندا برویشتبا سەلامی لێدەکردن[4]، جاری وا هەبووە کچێکی بچکۆلانە دەستی دەگرت و دەیبرد بۆ هەر شوێنێك بیویستبا[5].

---

[1] ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٠٨٢١)، شعیب الأرنوط بە (حسن)ی داناوە.

[2] بوخاری (٦٢٨) و موسلیم (٦٧٤) گێڕاوەتیانەوە.

[3] بوخاری (٣٨١٨) و موسلیم (٢٤٣٥) گێڕاوەتیانەوە.

[4] بوخاری (٦٢٤٧) و موسلیم (٢١٦٨) لە ئەنەسەوە گێراوەتیانەوە.

[5] ئەحمەد گێراوەتیەوە(١١٥٣٠)، بوخاری لە بەشی (الادب) لە سەحیحەکەی باسی کردووە، ئەلبانی لە= =(تحقیق المشکاة ٥٨٠٩) بە سەحیحی داناوە.

ئەو بە خۆی نەعلی خۆی چادەکردەوە و جلی خۆی پینە دەکرد [١] و هەر بەخۆی مەڕەکەی دەدۆشی [٢]، لەگەڵ هەژاران دادەنیشت [٣].

بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییەکانیان لەگەڵ بێوەژن و بێ باوکان دەڕۆیشت [٤]، وەڵامی ئەو کەسەی دەدایەوە کە بانگهێشتی دەکرد بۆ دەعوەت، تەنانەت ئەگەر بۆ شتێکی بچوکیش بوایە، ئامادەی مەراسیمی ناشتنی مردووی موسڵمانان دەبوو، سواری پشتی گوێدرێژ دەبوو، وەڵامی داوای بەندەکانی دەدایەوە [٥].

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە ئازایەتی:

عەلی کوڕی ئەبوتالیب ﷺ دەفەرموێت: لە ناخۆشی شەڕی بەدر خۆمان لە پشت پێغەمبەر دەنا، پێغەمبەر ﷺ لە هەموومان ئازاتر و نزیکتر بوو لە موشریکەکان [٦].

لە گێڕاونەوەیەکی موسلیم (١٧٧١) هاتووە، کە بەڕائی کوڕی عازیب دەڵێت: سوێند بەخوا کاتێك تەنگاوی دەهات، هانامان بۆ پێغەمبەری خوا دەبرد، کەس وەکو پێغەمبەر ﷺ نەبەرد و ئازانەبوو.

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر باشترین کەس بوو، لە هەموو کەس دەست بڵاوتربوو، لەهەمووان ئازاتر بوو، شەوێك خەڵکی مەدینە بەهۆی گوێبیستبوونیان لە دەنگێك پەشۆکان، خەڵك بەرەو ڕووی دەنگەکە هاتن، دەبینن پێغەمبەری خوا لەسەر پشتی ئەسپی ئەبوتەڵحە کە زین نەکرابوو، لەلای دەنگەکەوە دەگەڕایەوە. لە گەردەنی ئەسپەکە شمشێرك هەڵواسرابوو، فەرمووی: **"مەترسن، مەترسن"**، ئەم ئەسپە کە ئەسپێکی لەسەرخۆ بوو لە ژێر پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خێرا رایدەکرد.

ئەمەش یەکێکە لە کۆی موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ئەم ئەسپە لە سروشتی خۆیدا لەسەرەخۆ دەڕۆیی، پاشان وایلێهات خێرا بڕوات و کەس نەتوانێ پێشی بکەوێت.

---

[١] ئەحمەد لە عائیشەوە گێڕاوەتیەوە(٢٥٦٦٢)، ئەلبانی لە (التعلقيات الحسان ٥٦٤٧) بە سەحیحی داناوە.
[٢] ئەحمد لە عائیشەوە گێڕاوەتیەوە(٢٥٦٦٢)، ئەلبانی لە (التعلقيات الحسان ٥٦٤٦) بە سەحیحی داناوە.
[٣] سەحیحی موسلیم (٢٤١٣).
[٤] النسائی لە عەبدولای کوڕی ئەبی أوفی گێڕاوەتیەوە(١٤١٤)، ئەلبانی لە (التعلقيات الحسان ٦٣٩٠) بە سەحیحی داناوە.
[٥] مدراج السالكين (٢/٣٢٨).
[٦] ئەحمەد گێڕاوەتیەوە(١٠٤٥)، شعیب الارنؤوط بە سەحیحی داناوە.

## پێغەمبەری ﷺ پێشەنگ بووە لە دەستکراوەیی و سەخاوەت:

ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: پێغەمبەر لە هەموو کەس سەختی تر و باشتر بووە، بەڵام لە مانگی رەمەزاناندا سەخاوەتی زیاتر دەبوو، کاتێك کە چاوی بە جبریل ﷺ دەکەوت، شەوانی رەمەزان دیداری لەگەڵ هەبوو و قورئانی پێ دەگووت، بەڕاستی پێغەمبەر بۆ ئەنجامدانی خێر، خێراتربوو لە بای شەماڵ[1].

جابر ﷺ دەفەرموێت: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ گەر داوای شتێکی لێبکرابایە نەیدەفەرموو: نا[2].

ئەنەس ﷺ دەفەرموێت: هەر کەسێك داوای لە پێغەمبەری خوا بکردبایە ئەوا پێی دەبەخشی دەڵێت: رۆژێکیان پیاوێك هاتە خزمەتی، ئەویش مێگەلە مەڕێکی زۆری پێ بەخشی کە نێوان دوو چیای پڕی دەکرد، جا پیاوەکە چووە لای قەومەکی خۆی و گوتی: گەلۆ موسڵمان بن، چونکە موحەممەد ﷺ بە جۆرێك شت دەبەخشێت کە بێ وێنەیە و قەتیش لە هەژاری ناترسێت[3].

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە ملکەچی و ترسان لە پەروەردگار:

مطرف ﷺ لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ دیت نوێژی دەکرد، لە ناو سینگی دەنگێك دەهات کە دەنگی گریان بوو وەك دەنگی بەرداشی دەستاڕ وابوو[4].

ئیبن عەباس دەڵێت: ئەبوبەکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مووەکانت سپی بوون، فەرمووی: **"سورەتی هود و واقیعە و مورسەلات و عم یتسائلون واذا الشمس کورت مووەکانمی سپی کرد"[5].**

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە دونیا نەویستی:

جارێك عومەر ﷺ چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بینی لەسەر حەسیرێکی رەق خەوتووە، بالیفێکیشی لەبن سەرە، عومەر دەڵێت: بینیم کە حەسیرە رەقەکە شوێنەواری لەسەر جەستەی پیرۆزی پێغەمبەر دروست کردووە، منیش گریام، فەرموو: **"بۆچی**

---

[1] بوخاری (٦) و موسلیم (٢٣٢٠٨) گێڕاوەتیانەوە.

[2] بوخاری (٦٠٣١) و موسلیم (٢٣١١٢) گێڕاوەتیانەوە.

[3] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٣٣١٢)

[4] ئەبو داود گێڕاوەتیەوە(٩٠٤)، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[5] ترمذي گێڕاوەتیەوە(٣٢١٩)، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٣٧٢٣) بە سەحیحی داناوە.

**دەگری؟**"، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، کیسرا و قەیسەر لە چ خۆشییەکی دونیا دان و تۆش پێغەمبەری خوایت و حاڵت ئەو هایە، فەرمووی: "**ئایا رازی نابیت ئەو خۆشیە لە دونیا بۆ ئەوان بێت و لە ئاخیرەتیش بۆ ئێمە بێت**"[1].

لەو کاتەی هاوەڵە بەڕێزەکانی هاندەدا بۆ ئەوەی دونیا نەویست بن و زۆر لە خەمی دوارۆژیاندا بن، هەر لەو کاتەدا حەجی ئەنجامدا لەسەر پشتی سواریەکی شپرێو و پۆشاکێك کە هەر بایی چوار درهەم دەبوو[2].

## پێغەمبەرﷺ پێشەنگ بووە لە دڵنیابوون بە بەڵێنەکانی پەروەردگار:

لە بوخاری (٢٨٦٤) و موسلیم (١٧٧٦) دا هاتوو، باوکی براء ﷺ دەفەرموێت پیاوێك پێی گوتم: ئەی باوکی عەممارە لە رۆژی حونەین راتان کرد! گوتم سوێند بە الله پێغەمبەری خوا ﷺ رای نەکرد، بەڵکو ئەو خەڵکەی لە پێشەوە بوون رایانکرد، قەومی هۆزانیش تیر بارانیان کردن، پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەسپە سپییەکەی بوو، ئەبو سوفیانی کوڕی حارس جڵەوی گرتبوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: "**من ئەو پێغەمبەرەم کە درۆ ناکەم من کوڕی عەبدولموتەڵیبم** ".

## پێغەمبەرﷺ پێشەنگ بووە لە لێبوردەیی بەرامبەر ئەو کەسەی خراپەی لەگەڵیدا کردووە:

پێغەمبەر ﷺ لە تەورات وسفی کراوە بەوەی کە (توند و تیژ نییە، لە بازارەکان دەنگی بەرز ناکاتەوە و پاداشتی خراپە بە خراپە ناداتەوە، بەڵکو لێبوردەیە و لێخۆشبوونی هەیە)[3].

## پێغەمبەرﷺ پێشەنگ بووە لە تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆلای پەروەردگار:

ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**سوێند بەخوا من لە رۆژێکدا زیاتر لە حەفتا جار دەڵێم استغفر الله وأتوب اليه**"[4].

## پێغەمبەرﷺ پێشەنگ بووە لە پەرستنی خوای پەروەردگار:

عائیشەخان ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا شەو هەڵدەستایە و نوێژی دەکرد، تاوەکو پێیەکانی ئەستور دەبوو، گوتم بۆچی وادەکەی ئەی پێغەمبەری

---

[1] بوخاری (٥٨٤٣) و موسلیم (١٤٧٩) گێڕاوەتیانەوە.
[2] ابن ماجة (٢٨٩٠) لە انس کوڕی مالیك گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحه) بە سەحیحی داناوە.
[3] بوخاری لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص گێڕاوەتیەوە(٢١٢٥).
[4] بوخاری گێڕاوەتیەوە(٦٣٠٧).

خوا لە كاتێكدا خوای گەورە لە گوناهی رابردوو و داهاتووت خۆش بووە؟ فەرمووی **"ئەی نابێت بەندەیەكی سوپاسگوزار بم"**[(١)].

عوبەیدی كوڕی عومەیر ﷺ دەڵێت: بە عائیشەم گوت: ﷺ سەیرترین شتمان پێ بڵێ كە لە پێغەمبەری خوا بینی بێتت، كەمێك بێ دەنگ بوو، ئینجا گوتی: شەوێك لە شەوەكان فەرمووی: **"عائیشە لێم گەڕێ با عیبادەتی خوای گەورە بكەم"**، گوتم: من حەزم لێیە لێت نزیك بم، حەزم لە هەر شتێكە تۆ دڵخۆش بكات. ئینجا دەڵێت: هەستایەوە دەستنوێژێكی هەڵگرت و نوێژی كرد، گوتی: بەردەوام دەگریا تاوەكو بەردەكانی بەردەمی تەڕكرد هەر بەردەوام بوو لە گریان تاوەكو ریشی تەڕ بوو، هەر بەردەوام بوو لە گریان هەتاوەكو زەویشی تەڕكرد، پاشان بیلال هات بۆ ئەوەی ئاگاداری بكات كە كاتی بانگە، ئینجا كە بینی وا دەگرێی گوتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆچی دەگرێی لە كاتێكدا خوای گەورە لە گوناهی رابردوو و داهاتووت خۆش بووە؟ فەرمووی: **"ئەی نابێ بەندەیەكی سوپاسگوزار بم، ئەم شەو ئەم ئایەتم بۆ دابەزیووە، وەیل بۆ ئەو كەسەی لێی تێنگات و ورد نابێتەوە لێی** ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[(٢)] آل عمران: ١٩٠

واتای ئایەتەكە: بەڕاستی لە دروستكردنی ئاسمانەكان و زەویدا و لە ئاڵوگۆڕی شەو و رۆژدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن بۆ كەسانی ژیر و هۆشمەند.

لە مانگی رەمەزاندا پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو عیبادەتە جۆراوجۆرەكان زۆر بكات لە نوێژ و رۆژو و خوێندنەوەی قورئان و یادی خوداو مانەوە لە مزگەوت و خێرو چاكەكردن.

لە عیبادە سوننەتەكانیش: بە رۆژوو دەبوو، تا دەگوترا قەت ناوەسیتێت لە رۆژووگرتن، جاریواش هەبوو بە رۆژوو نەدەبوو هەتا دەگوترا قەت بە رۆژوو نابێت، هەرگیزیش مانگێك بە تەواوی بە رۆژوو نەبووە جگە لە مانگی رەمەزان نەبێت، زۆرینەی زۆری هیچ مانگێكیش بە رۆژوو نەدەبوو جگە لە شەعبان نەبێت[(٣)]، رۆژی دووشەم و پێنج شەمانیش بە رۆژوو دەبوو[(٤)].

خوێندنەوەی بۆ قورئانیش بە تەرتیل بوو، نە زۆر لەسەرەخۆ و نەزۆر بە پەلە، بەڵكو خوێندنەوەی زۆر دیار و ئاشكرا بوو، مافی هەموو پیتەكانی دەدا، خوێندنەوەی ئایەتێكی بە ئایەتێكی دیكە نەدەلكاند،

---

(١) بوخاری (٤٨٣٧) و موسلیم (٢٨٢٠) گێڕاوەتیانەوە.

(٢) ابن حبان گێڕاوەتیەوە(٦٢٠) ئەلبانی بە سەحیحی داناوە (٦٨)

(٣) بوخاری (١٩٦٩) و موسلیم (١١٥٦) گێڕاوەتیانەوە.

(٤) ترمذي (٧٤٥) و النسائي (٢٣٦١) و ابن ماجة (١٧٣٩) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

**بەڵكو لە نێوان ئایەتەكان دەوەستا و ئینجا ئایەتی دواتری دەخوێندەوە، پیتە مەددەكانی درێژ دەكردەوە وەك ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾و﴿ٱلرَّحِيمِ﴾[(١)] لەسەرەتای خوێندنی قورئان دەیفەرموو:** أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ‌یان دەیفەرموو: **"اللهم إني أعوذ بك من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه"[(٢)]**. بەرنامەیەكی بۆ قورئان خوێندن هەبوو كە رۆژانە هەرگیز فەرامۆشی نەدەكرد.

لە هەموو بارەكانیدا قورئانی دەخوێندەوە، بە راوەستان، بە دانیشتن و پاڵدانەوە، هەروەها بە دەستنوێژ و بێ دەستنوێژ، هیچ شتێك رێگری لە قورئان خوێندنی نەدەگرت تەنیا لەشگرانی[(٣)] نەبێت[(٤)].

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە یادكردنەوەی خوای گەورە:

پێغەمبەر ﷺ كامڵترین كەس بووە لە یادكردنەوەی خوای گەورە، لە هەموو بارێكدا یادی خوای گەورەی دەكرد، بە ڕاوەستان، بە دانیشتن، بە رۆیشتن و هەموو بارەكانی تر.

## پێغەمبەر ﷺ داوای كردووە لە نوێژكردن و رۆژگرتن و ژنهێنان تەماشی ئەو بكەن:

ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: سێ كەس هاتنە خزمەت خێزانەكانی پێغەمبەر، پرسیاریان لە عیبادەتی پێغەمبەر ﷺ دەكرد، كاتێك پێی راگەیاندن ئەوان پێیان زۆر نەبوو، بۆیە گوتیان ئێمە لە كوێ و پێغەمبەر ﷺ لە كوێ؟ ئەو خوای گەورە لە گوناهی پێشوو و داهاتووی خۆشبووە.

یەكێكیان گوتی: من شەو هەر شەو نوێژ دەكەم و ناخەوم، یەكێكی تریش گوتی: منیش رۆژ بە رۆژوو دەبم و ناوەستم، سێیەمیش گوتی: منیش ژن ناهێنم.

پێغەمبەر ﷺ بە مەی زانی و فەرمووی: **"ئێوەن كە ئەوها و ئەوها دەڵێن؟ سوێند بە خوا من لە هەمووتان لە خواترسترم، بەڵام بە رۆژوو دەبم و جاریواش هەیە بە رۆژوو نابم، شەونوێژ دەكەم و دەشخەوم، ژنیش دەهێنم، هەر كەسێك لە سوننەتی من لابدات ئەوە لە من نییە"[(٥)]**.

---

(١) سەیری سەحیحی بوخاری بكە (٥٠٤٦).

(٢) ابوداود (٧٧٥) و ترمذي (١٢٤٦) و النسائي (٨٩٩) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

(٣) لەشگرانی واتە جەنابەت. (و)

(٤) سەیری كتێبی زاد المعاد بكە (٤٨٢/١).

(٥) بوخاری (٥٠٦٣) و موسلیم (١٤٠١) گێڕاوەتیانەوە.

ئیبن حەجەر ﷺ سەبارەت بەوەی کە پێغەمبەر فەرموویەتی ئەوەی لە سوننەتی من لابدات لە من نییە دەڵێت واتە: ئەوەی ڕێگەی جگە لە من بگرێتەبەر ئەوا لەسەر سوننەت و هیدایەتی من لای داوە.

ڕێگەی پێغەمبەر ڕێگەیەکی ئاسان و ڕوونە، ئەو بەڕۆژوو دەبوو، بەڕۆژووش نەدەبوو بۆ ئەوەی توانای ڕۆژووگرتنی هەبێت، دەخەوت بۆ ئەوەی بتوانێت شەو نوێژ بکات، ژنیشی دەهێنا بۆ ئەوەی شەهوەتەکەی کەم بێتەوە و دەروونی خۆی بپارێزت و منداڵ زۆر بکات.

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە حەجکردن:

حەج لە هەموو عیبادەتەکانی ئیسلام دیارترە و زۆر بە ئاشکرایی شوێنکەوتن و پێشەنگیەتی پێغەمبەری پێوە دیارە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە لە حەجکردن شوێن پێی ئەو هەڵبگرین، هەروەکو فەرموویەتی **"مەناسیکەکانی حەج لەمن وەربگرن، چونکە من نازانم لە پاش ئەو حەجە حەجی تر دەکەم یان نا؟"**[1].

بە ڕاستی شوێنکەوتنی پێغەمبەر ﷺ هەر لەسیفاتە مەعنەویەکاندا نییە، بەڵکو لەمە گشتگیرترە و دەپەڕێتەوە بۆ لایەنکانی ژیانی کرداری، ڕێگە و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەمەدا تەواترین ڕێگایە بۆ ئەوەی موسڵمانان بیکەنە پێشەنگی خۆیان.

ئەگەر شتێك ئامادەبووایە لە خواردن و خواردنە ئەوا ڕەتی نەدەکردەوە، شتێکیش کە نەبوایە ئەوا داوای نەدەکرد.

هەر خواردنێکی حەڵاڵ و پاکی پێشکەش بکرابایە دەیخوارد، هیچ خواردنێکی عەیبدار نەدەکرد، ئەگەر ئارەزووی بکردبایە دەیخوارد، ئەگەریش ئارەزووی لێنەبایە وازی لێ دەهێنا.

سێ مانگیش لەسەریەك لە ماڵەکانیدا ئاگر نەکراوەتەوە [2]..

ئەگەر خواردنێکی لە پێش دابندرایە دەیفەرموو **"بسم الله"** ئەگەر تەواو بوبایە دەیفەرموو **"اللهم أطعمتَ، وسقيتَ، وأغنيتَ وأقنيت، وهديتَ، وأحييتَ فلك الحمد على ما أعطيت"**[3].

---

[1] موسلیم گێراوەتیەوە(١٢٩٧).

[2] بوخاری (٢٥٦٧) و موسلیم (٢٩٧٢) گێڕاوەتیانەوە.

[3] ئەحمەد گێراوەتیەوە(١٦١٥٩) ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٤٧٦٨) بە سەحیحی داناوە.

گەر لای قەومێك نانی بخواردبایە، ئەوا بەجێی نەدەهێشتن تاوەکو دوعای بۆ نەکردبان[١].

چی هەبوایە ئەوەی دەخوارد، ئەگەریش نەبوایە ئارامگربوو، هەتا لە برسان جاری وا هەبوو سێ بەردی دەبەستا لەسەر سکی، هیچ شتێکیش رێگر نەبوو لەوەی کە لەگەڵ منداڵ و گەورە و ئازاد و بەندە و ئەعرابی و موهاجیرەکان نان بخوات[٢].

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە شێوازی نوستن و هەڵسانەوە:

پێغەمبەر ﷺ لەسەر لای راستی دەنوست، گەر پێویستی بە نوستن هەبووایە یادی خوای گەورەی دەرکرد، لەسەر سکی تێر هەرگیز نەدەنوست.

ئەگەر بیویستبایە بخەوێت دەستی لەژێر سەری دادەنا و دەیفەرموو: **"اللهم قني عذابك يوم تبعث عبادك"[٣]**.

گەر کەسێك بانگی بکردبایە، هەڵدەستا، ئینجا سوپاسی خوای گەورەی دەکرد و سیواکی دەکرد، پاشان بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن دەرۆیشت ئینجا بۆ نوێژکردن بەرامبەر پەروەردگاری دەوەستا و دوعای دەکرد.

جاری وا هەبوو لەسەر دۆشەك دەخەوت و جاری واش هەبوو لەسەر حەسیر، هەندێك جاریش لەسەر زەوی یان لەسەر قەرەوێڵە دەخەوت.

## پێغەمبەر ﷺ لە قسەکردن و بێ دەنگ بوون و گریان و پێکەنین پێشەنگ بووە:

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر قسەی بکردبایە، زۆر بە روونی و لەسەرخۆ قسەی دەکرد، کەسێك ویستبای قسەکانی بژمێرێت ئەوا دەیتوانی، قسەکانی پچڕ پچڕ نەبوون، بەڵکو هەمووی لە دوای یەك و روون ئاشکرا بوون.

زۆر جار قسەکانی سێ جار دووبارە دەکردەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی لێی تێبگەن، ئەگەریش سەلامی بکردبایە ئەوا سێ جار دووبارەی دەکردەوە[٤]. زۆر کەمدوو بوو، لە کاتی پێویست نەبایە قسەی نەدەکرد، ئەگەریش قسەی بکردبایە ئەوا قسەی کورت و حەکیمانەی دەکرد، نە کورت و نەدرێژ. قسەی لە شتێکدا نەدەکرد پەیوەندی بەو نەبایە،

---

[١] بڕوانە فەرمودەی عەبدوڵلای کوڕی بسر لە سەحیحی موسلیم (٢٠٤٢)

[٢] سەیری زاد المعاد بکە (١٤٧/١).

[٣] ترمذي لە حوزیفەی کوڕی یەمان گێراوەتیەوە(٣٣٩٨) ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[٤] بوخاری لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە گێراوەتیەوە(٩٤).

قسەیەکی نەدەکرد گەر کەڵکی قیامەتی نەبووایە، ئەگەر حەزی لە شتێك نەبووایە لە دەموچاویدا هەستمان پێ دەکرد.

زۆربەی پێکەنینی بریتی بوو لە گرژینەوە، بەڵکو هەمووی گرژینەوە بووە، ئەگەریش پێکەنین زۆری بۆ هێنابا ئەوا تەنیا ددانەکانی دەردەکەوتن.

سەبارەت بە گریانیشی وەکو پێکەنینی بوو، وەك چۆن پێکەنینی بە دەنگی بەرز و قاقا نەبوو، بە هەمان شێوە گریانیشی بەرز نەبوو، بەڵکو چاوەکانی پڕ فرمێسك دەبوون و دەنگی هنسك لە سینگییەوە دەهات.

هەندێکجار گریانی رەحمەت بوو بۆ مردوو، جاریش هەبوو لە ترسی ئوممەتەکەی کە چی بەسەر دێ دەگریا، جاری واش هەبوو لە ترسی پەروەردگار، هەروەها لە کاتی خوێندنەوەی قورئانیش دەگریا، گریانی سۆز و خۆشەویستی و بەگەورەزانینی خوا بوو، لەگەڵیشدا ترسی هەبوو.

کاتێك ئیبراهیمی کوڕی مرد، وەك سۆزێك بۆی گریا، هەروەها بۆ کچێکیشی گریا، کە لەسەرەمەرگدا بوو[1].

گریا کاتێك ئیبن مەسعود سورەتی (النساء ) ی بەسەردا خوێندەوە[2].

گریا کاتێك عوسمانی کوڕی مضغون مرد، هەروەها لە کاتی خۆرگیراندا، کە نوێژی خۆرگیرانی کرد زۆر گریا. کاتێکیش لەسەر قەبری یەکێك لەکچەکانی دانیشت گریا، جاری واش هەبوو لەشەو نوێژدا دەگریا[3].

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە وتاردانداا:

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر وتاری بخوێندبایەوە چاوەکانی سوور هەڵدەگەڕان و دەنگی بەرز دەبۆوە، زۆر توڕە دەبوو، وەك بڵێی هۆشداری دەداتە سوپایەك، هیچ وتارێکیشی بێ (الحمدلله) دەست پێنەدکرد.

بنچینەی وتارەکانی لەسەر سوپاسی خوای گەورە و دانپێدانان بە نیعمەتەکانی و پیاهەڵگوتن بە سیفەتە جوان و ناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار بوو. هەروەها ڕوونکردنەوەی بنەماکانی ئیسلام و باسکردنی بە هەشت و دۆزەخ و ڕۆژی قیامەت و فەرمانکردن بە ترسان لە خوای گەورەو باسکردنی ئەو شتانەی دەبنە هۆی توڕەیی خوای

[1] سەیری موسنەدی احمد بکە (٢١٢٧٢).
[2] بوخاری (٤٥٨٢) و موسلیم (٨٠٠) گێڕاوەتیانەوە. لە فەرمودەی ئیبن مەسعودەوە ﷺ
[3] سەیری زاد المعاد بکە (١٨٣/١).

گەورە، لەگەڵ ئەو شتانەی مایەی ڕەزامەندی بوونی ئەون، جا ئەم خاڵانە بوون کە وتارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ جەختیان لەسەر دەکردەو بازنەی وتارەکانی پێك دەهێنا. هەر کاتێك بەرژەوەندی پێداویستی خەڵکی وتاری گەرەك بووایە، ئەوا وتاری دەدا، هەندێکجار وتارەکانی کورت بوون هەندێکجاریش درێژ، ئەمەش بە گوێرە پێداویستی خەڵك بووە [1].

**پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە مامەڵەکردندا:**

پێغەمبەر ﷺ لە هەموو خەڵك مامەڵەی جوانتربووە.

پێغەمبەر شتی کڕیووە و فرۆشتووە، و شتی بەکرێ داوە و شتی بە کرێ گرتووە، شەریکایەتی کردووە، کاتێك شەریکەکەی هات بۆ لای گوتی: ئایا نامناسی؟ فەرمووی: **"ئەی تۆ شەریك نەبووی؟ تۆ باشترین شەریك بووی، کە منجەمنجت نەدەکرد و حەق و ڕاستگۆ بووی [2]"**.

ئەگەر پێغەمبەر شتێکی بە قەرز وەربگرتبایە ئەوا زۆر بە چاکتر و باشتر قەرزەکەی دەدایەوە، جارێك لە پیاوێك شتێکی وەرگرت و دوایی کە کاتی خۆی هات دایەوەو دوعای بۆ کردوو فەرمووی: **"بارك الله لك في أهلك ومالك، إنما جزاء السلف الحمد والاداء [3]"**.

واتە: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کەسوکارو سامانت، پاداشتی قەرزدانەوە بریتییە لە سوپاسکردن و دانەوەی بە جوانترین شێواز.

پێغەمبەری خوا ﷺ زەویەکی هەبوو، کردیە وەقف و لە پێناو خوای گەورە بەخشی.

شەفاعەتی کردووە و شەفاعەتیشی ڕەتکراوەتەوە، وەك چۆن (بەریرە) تکای پێغەمبەری لە گەڕانەوەی بۆلای (مغیث)ی مێردی ڕەت کردەوە، لەبەرامبەردا لێی تووڕە نەبوو و لۆمەی نەکرد، چونکە ئەو پێشەنگ و نمونەیەکی جوانە.

زیاتر لە هەشتا شوێن سوێندی خواردووە و خوای گەرەش فەرمانی پێکردووە لە سێ جێگادا سوێند بخوات، هەندێکجار هەڵوێری لە سوێندەکانی بەکار دەهێنا، هەندێکجار سوێندەکەی بە جێ دەگەیاند و هەنێکجاریش کەفارەتی دەدا.

جاروبار گاڵتەی دەکرد، بەڵام لە گاڵتەکردنیشدا هەر ڕاستی دەفەرموو، هەندێکجار (تەوریە [4])ی بەکار دەهێنا، لەوێشدا هەر ڕاستی مەبەست بووە، پێغەمبەر ﷺ بە پێیەکانی کێبڕکێی کردووە و هەروەها زۆرانبازیشی کردووە.

---

[1] سەیری زاد المعاد بکە (١/١٩١).

[2] ئەبو داود (٤٨٣٦) و ابن ماجة (٢٢٨٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح ابن داود ٤٨٣٨) بە سەحیحی داناوە.

[3] نسائی (٤٦٨٣) و ابن ماجة (٤٢٤٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢٣٥٣) سەحیحی داناوە.

[4] (توریة) واتە وشەیەك دوو مانا یان زیاتری هەبێت مانایەکیان دوور کە قسەکەر مەبەستی ئەوە، مانایەکیشیان نزیك کە گوێگر وادەزانی مەبەستی ئەوەیە(و).

پێغەمبـــەر ﷺ نەعلـــەکانی بـــە خـــۆی چـــاك کردۆتـــەوە، جلـــەکانی پینـــەکردووە و دووریونیەتەوە، بە خۆی مەڕەکەی دۆشیووە، خزمـەتی خـۆی و بەردەسـتی خێزانەکـەی کـردووە، بـۆ دروسـتکردنی مزگـەوت خشـتی لەگـەڵ هاوەڵـەکانی هـەڵگرتووە، میوانـداری کردووە و بۆتە میوانی خەڵکیش.

پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشی دەکرد و ئامـادەی ناشـتنی مـردووان دەبـوو، وەڵامـی بانگهێشتی دەعوەتکردنی دەدایەوە، بۆ جێبەجێکردنی کاروبارەکانیـان لەگـەڵ بێـوەژن و هەژار و بێ هێزەکان دەڕۆیشت، گوێی لە مەدحی شیعر گرتووەو پاداشتیشی کردووە [١].

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لەسەردانیکردنی نەخۆش:

گـــەر هاوەڵـــەکانی نەخۆشـــبکەوتبان، پێغەمبـــەر ﷺ ســـەردانی دەکـــردن، ســـەردانی نێوجەوانێکی کرد، کە ئـەهلی کیتـاب بـوو، سـەردانی مـاڵی کـردووە داوای ئیسـلام بـوونی لێکردووە، نێوجەوانە جولەکەکە موسڵمان بوو، بەڵام کەس و کاری موسڵمان نەبوون.

لە نەخۆش نزیك دەبۆوە لەلای سەری دادەنیشت و ئەحواڵی دەپرسی و دەیفەرموو: **"حاڵت چۆنە؟"**.

دەستی بەسەر نەخۆش دەهێناو دەیفەرموو: **"ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵك... ئەم دەرد و بەڵایە لاببە، شیفای بدە، چونکە هەر تۆ دەتوانی شـیفای نـەخۆش بـدەی، هـیچ شیفایەك نییە جگە لە شیفای تۆ نەبێت، شیفایەك هەموو نەخۆشییەکان لابدات [٢]"**.

## پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە سوننەتی فیترە:

پێغەمبەر ﷺ حەزی لێبوو یەکەمجار تاکە نـەعلی راسـت لەبـەربکات، پرچـی شـانەدەکرد بـۆ لای راسـتی، دەسـتی راسـتی بـۆ خـواردن و خواردنـەوە و دەسـتنوێژ هـەڵگرتن و خۆشـۆردن بـەکاردەهێنا، چەپیشـی بـۆ پاکردنـەوە لـە پیساسـییەکان بـەکاردەهێنا. نـەریتی لەسەرتاشـین ئەوەبوو یان هەمووی دەتاشی یان هـەمووی دەهێشـتەوە، نـەوەك هەنـدێکی بهێڵێتـەوە هەنـدێك بتاشێ، حەزی لە سیواکردن بوو، سـیواکی لـە کـاتی ڕۆژوو بـوون بـێ ڕۆژووبـوون بـەکاردەهێنا، هەروەها سیواکی بەکار دەهێنا لە کاتی هەڵسـان لـە خـەو و دەسـتنوێژ هـەڵگرتن و نوێـژکردن و چوونە ژوورە.

زۆر خۆی بۆنخۆش دەکرد و بۆنخۆشی خۆشدەویست و قەت ڕەتی نەدەکردەوە.

---

[١] سەیری زاد المعاد بکە (١/١٦٥).

[٢] سەیری زاد المعاد بکە (١/٤٩٤).

زۆر حەزیشی لەسەر شانەکردن بوو، جاری وا هەبوو بە خۆی سەری شانە دەکرد، جاری واش هەبوو عائیشە خان بۆ شانەدەکرد [1].

ئینجا ئەمڕۆ با موسڵمانان سەیر حاڵی خۆیان و پێغەمبەر و هاوەڵەکانی بکەن، لە جیاتی ئەوەی هونەرمەند و بیرمەندەجیهانییەکان پیاوانی رۆژئاوا بکەنە رابەر و پێشەنگ، با پێغەمبەر و هاوەڵانی بکەنە نمونەی هەرە بەرز و سەرمەشق و رابەری خۆیان.

## کردەوەکانی پێغەمبەر ﷺ دەبنە چوار بەش:

**بەشی یەکەم:** کردەوە سروشتییەکان، ئەو کردەوانانەن کە پێغەمبەر وەك مرۆڤێکی ئاسایی ئەنجامی داون، نەوەك بە پێی پەیامی خوایی، ئەویش جوڵە و هەڵسان و دانیشتن و رۆیشتن و نوستن و خواردن و خواردنەوە لە خۆ دەگرێت، ئینجا ئەمانە پەیوەندیان بە ئەمرو نەهییەوە نییە.

بەڵام کاری سروشتی، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەکی دیاریکراو ئەنجامی دابێت، وەك نوستن لەسەر لای راست، ئەو کات ئەم کارە لە حوکمی ئیباحەوە دەردەچێت بۆ حوکمی سوننەت. هەروەها ئەگەر وتەیەکیش هەبێت هانی ئەو کارە بدات ئەو کات دەبێتە سوننەت، وەك خواردنەوەی ئاو بە سێ هەناسە و خواردن بە دەستی راست.

**بەشی دووەم:** ئەنجامدانی هەندێك کار بە پێی نەریتی قەومەکەی، کە هیچ پەیوەندی بە شەرعەوە نییە، ئەمەش لە کاتێکدا ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نەبێت بە شەرع بیبەستێتەوە.

وەکو جلوبەرگ چونکە ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ عادەت، کە خەڵکی ناوچەیەك لەسەری راهاتوون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کاتێك بووە پێغەمبەر جلوبەرگی خۆی نەگۆڕی، بەڵکو چەند مەرجێکی رێکخەری بۆ جلوبەرگی ژن و پیاوان دانا. یاخود سەبارەت بە درێژکردنی قژ.

جا بەم کارانە ناوترێ شوێنەکەوتنی سوننەت پێغەمبەر ﷺ . چونکە مەبەست لەمەدا تەشریع و پەرستن نەبووە. بەڵام ئەگەر وتەیەك هەبوو فەرمانی بە یەکێك لەو شتانە دەکرد یان هاندانی تێدابوو، یان نیشانەیەك هەبوو لەسەر ئەوەی کە ئەمە پەیوەندەی بەشەرعەوە هەیە، ئەو کات لەوە دەچێتە دەرەوە، وەك لەبەرکردنی جل و بەرگی سپی و هەڵکردنی شەرواڵ هەتا نیوەی قاچ و شتی تریش.

---

[1] سەیری زاد المعاد بکە (١٧٦/١).

**بەشی سێیەم:** کردەوە تایبەتییەکانی، ئەمەش پێشەنگایەتی و رابەرایەتی تێدا نییە، وەکو بەردەوامبوون لەسەر ڕۆژووگرتنی (وصال) [1]. یان هەبوونی زیاتر لە پێنج خێزان، یان هێنانی ئافرەتێك کە خۆی پێشکەش دەکات بە بێ مارەیی.

**بەشی چوارەم:** کرداری پەرستش، کە کردەوەیەکە بە نیەتی پەرستنی پەروەردگار ئەنجامی داوە. جا ئەم کردارانەن کە پێویستە پێغەمبەر ﷺ تێیدا بکرێتە پێشەنگ و لاسایی بکرێتەوە، ئەو کارەش جار هەیە واجبە و جاریش وایە سوننەت.

## هەر لە پاڵ لاسایی کردنەوەی پێغەمبەر ﷺ مەسەلەی نەکردنەکانە (التروك).

مەبەست لە نەکردنەکان: نەکردنی شتێك و وازهێنانییەتی، ئەویش بە دوو جۆر دەبێت:

**یەکەم:** ئاشکرا بێت، وەك وازهێنانی لە شتێك بە ئاشکرایی، نمونەی ئەمە وتەی یەکێك لە هاوەڵانە لەبارە نوێژی جەژن کە پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنی کردووە و بێ بانگدان و قامەت [2].

**دووەم:** نەگواستنەوەی کارەکە بۆ هاوەڵان، چونکە ئەگەر بیکردبایە ئەوا هاوەڵان بە پەرۆشبوون بۆ باسکردنی هەر شتێك کە پێغەمبەر ﷺ بیکردبایە، وەکو مەسەلەی وتنی نیەت بە دەنگ لە کاتی نوێژ، بەڵام جاری وا هەیە کارێکی نەکردووە لەبەر بوونی ڕێگرێك، وەکو وازهێنانی لە نوێژی تەراویح بە جەماعەت لە ڕەمەزان بە هۆی ترسانی لەوەی کە نەوەك ببێتە فەرز لەسەریان، بەڵام ئێستا ڕێگرییەکە نەماوە بۆیە نەکردنی سوننەت نییە، بەڵکو ئەنجامدانی سوننەتە.

---

[1] (وصال) واتە بەردەوام بوون لەسەر ڕۆژوو بە بێ شکان بۆ ماوەی سێ ڕۆژ.(و)

[2] بوخاری (٩٥٩) و موسلیم (٨٨٦) و ئەبو داود (١١٤٧) گێڕاوەتیانەوە.

# بەشی دووەم:

## مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاو و خێزان و خزم و کەس و دەوروبەری

## بەشی دووەم:

## مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاوخێزان و خزم و کەس و دەوروبەری:

### مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی:

خوای گەورە فەرمانی پێکردووین کە پێغەمبەر ﷺ بکەینە پێشەنگ و شوێن ڕێگەکەی بکەوین:
﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴾ الأحزاب: ٢١

واتەی ئایەتەکە: سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێکوپێك هەیە تاچاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفەرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بەزۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

لێرەدا پێویستە لەسەر هەمووان هەر کەسێك بە پێی شوێنی خۆی پێغەمبەری ﷺ بناسێت. پیاوی خێزاندار دەبێت بزانێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ خێزاندار بووە و چۆن مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکانی کردووە، بۆ ئەوەی ئەویش بیکاتە پێشەنگ. کەسی دادوەریش دەبێت بزانێت کە پێغەمبەر ﷺ وەك دادوەرێك چۆن دادگەر بووە و حوکمی کردووە، سەرکردەش دەبێت بزانێ کە پێغەمبەر ﷺ وەك سەردکردەیەك چۆن سەرکردایەتی کردووە.

پێغەمبەر ﷺ پێشەنگ بووە لە هونەری مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکانی، بەڵکەو ئەستێرەیەکی پڕشنگداربووە بۆ ئامۆژگاریکردنی خەڵك و ڕێنیشاندانیان بۆ باشترین مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکانیان، مامەڵەیەك کە کاریگەرە باشەکەی دەربکەوێت لە ژیانی هاوسەرایەتی و کۆمەڵایەتی.

قسەکردن لەو باسەدا چەند لایەنێك دەگرێتەوە:

**لایەنی یەکەم:** مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی.

**لایەنی دووەم:** پەروەردەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئافرەتەکانی، ئەمەش بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگ بۆ ئافرەتانی موسڵمان.

**لایەنی سێیەم:** چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ

ئینجا ئەی برا و خوشکی بەڕێزم، درێژەی ئەم باسە لە خوارەوە ڕوون دەکەینەوە و باسی لێوەدەکەین.

## مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی:

پێغەمبەر ﷺ یازدە خێزانی هەبووە، ئەوانیش: خەدیجەی کچی خوەیلید– عائیشەی کچی ئەبوبەکر – حەفصەی کچی عومەر – سەودەی کچی زەمعەی عامیری– زەینەبی کچی جەحشی ئەسەدی– زینەبی کچی خوزەیمەی هیلالی– هیندی کچی ئەبو ئومەییەی مەخزومی کە ناسراوە بە (ام سلمة)– أم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیانی ئەمەوی – مەیمونەی کچی حارسی هیلالی – جویریەی کچی حارسی مصطلقی – صەفییەی کچی حویەی نضیری،خودای گەورە لە هەموویان رازی بێت.

پێغەمبەر ﷺ کاتێك وەفاتی کرد نۆ خێزانی لە پاش خۆی بە جێهێشت، خەدیجە و زەینەبی کچی خوزەیمە خوایان لیّ رازی بێت، پێش پێغەمبەر ﷺ وەفاتیان کرد.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانە پاکەکانی بە ژیانێکی پڕ کامەرانی و خۆشیدا گوزەرانی دەکرد، کە نمونەیەکی کرداری ورد بوو بۆ جێبەجێ فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێت ﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ النساء: ١٩ چونکە وشەی (معروف) وشەیەکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو وتەو کردارو رەوشتێکی بەرز.

پێغەمبەر ﷺ باشترین کەس بووە لە مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکانی، چۆن وانابێت لە کاتێکدا خۆی فەرموویەتی "**باشترینتان، باشترینتانە بۆ خێزانەکانی، منیش باشترینتانم بۆ خێزانەکانم**[(١)]". مامەڵەی ئەو مامەڵەیەکی جوان و شیرین بووە، ئەمە زۆر بە ڕوونی لە ژیاننامە پاکەکەی دەردەکەوێت.

گەر خەڵکی وەك پێغەمبەر ﷺ مامەڵە لەگەڵ ئافرەتەکانیان بکەن، ئەو کات زۆربەی گیروگرفتە خێزانییەکان کە لەم رۆژگارەدا بوونیان هەیە چارەسەر دەبن.

بە راستی مرۆڤ سەری سوڕ دەمێنێت کاتێك دەبینی و گوێی لە کێشەکان دەبێت کە خێزان و ماڵەکان پێیەوە دەناڵێنن، ئامارەکان ئاماژە بەوە دەکان کە تێکڕایی تەڵاق لە جیهانی ئیسلامی گەیشتۆتە سنورێکی مەترسیدار و بەردەوامیش لە زیادبووندایە، ئامارێکی نوێ دەریخستووە لە (ساڵی ١٤١٠ ك) کە لە وەزارەتی دادی سعودی دەرچووە، ئاماژە بەو دەکات کە تەڵاقدان بە رێژەی ٢١٪ لە سعودیە زیادی کردووە، لە شاری ریازیش حاڵەتەکە لە هەموو شوێنێکی تر زیاترە.

---

(١) ترمذی لە عائیشە گێراوەتیەوە(٣٨٩٥)، ئەلبانی لە (صحیحی الجامع ٣٣١٤) بە سەحیحی داناوە.

بۆیە لەگەڵ ئەو هەموو گیروگرفت و کێشە خێزانیانەی ئەمڕۆ هەن لە زۆر بوونی حاڵەتەکانی تەڵاقدان، لە هەموو کات زیاتر پێویستمان بەوەیە بزانین ژیان لە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ چۆن بووە، چۆن مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکانی کردووە، چۆن ئارامی لەسەریان دەگرت، چۆن چاوپۆشی دەکرد لە هەندێك لە کەموکوڕییەکانیان، بۆیە پێویستە ئێمە ئەوە بزانین چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمە پێشەنگە.

## پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕۆژ لەگەڵ خێزانەکانی دادەنیشت و قسەی بۆ دەکردن:

ئیبن عەباس ﵄ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نوێژی بەیانی بکردبایە، ئەوا لە جێگای نوێژکردنەکەی دادەنیشت و خەڵکیش لە دەوری کۆ دەبوونەوە هەتا ڕۆژ هەڵدەهات، پاشان دەچووە لای خێزانەکانی، یەك یەك سەلامی لێدەکردن و دوعای بۆ دەکردن جا ئەگەر نۆرەی کێ بایە لەلای ئەو دەمایەوە [1].

جا لە هەر ڕۆژێکی نوێ، پێغەمبەر ﷺ سەردانی هەموو خێزانەکانی دەکرد و دوعای بۆ دەکردن. لە کۆتایی ڕۆژیش پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەڵ هەموان دەکرد و لەگەڵیان دادەنیشت، عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە نوێژی عەسر بهاتبایەوە دەچووە لای خێزانەکانی و لێیان نزیك دەبووە [2]. مەبەست لە وتەی عائیشەخان کە دەڵێت لێیان نزیك دەبووە، ئەوا ماچکردن و جەستە بە جەستە کەوتنە بێ جیماع کردن [3].

ئیبن حجر ﷫ دەڵێت: لەسەرەتای ڕۆژ سڵاو و دوعای بۆ دەکردن، لە کۆتایی ڕۆژیش قسەو دانیشتن و نزیکبوونەوە بوو لێیان [4].

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (هەموو ڕۆژ سەردانی هەموومانی دەکرد و لە هەموویان نزیك دەبۆوە، بێ ئەوەی جیماعیان لەگەڵ بکات، هەتا دەچووە لای ئەوەی کە نۆرەی بوو جا لە لای دەمایەوە).

کە ئەوەشی دەکرد بۆ ئەوە بوو دڵیان خۆش بکات، جا کاتێك دەچووە لای ئەوەی کە نۆرەیەتی، ئەوانی تر هەموو دڵیان ئۆقرەی دەگرت و هۆگر و ئارام دەبوو. [5]

---

[1] الطبراني لە (المعجم الاوسط ٨٧٦٤) گێڕاوەتیەوە، الحافظ لێی بێ دەنگ بووە.
[2] بوخاری (٥٢١٦) و موسلیم (١٤٧٤) گێڕاوەتیانەوە.
[3] عمدة القاري (٩٢/٣٠).
[4] فتح الباری (٣٧٩/٩).
[5] المفهم للقرطبي (٩٠/١٣).

ئافرەتەکان هەستیان بە غەریبی نەدەکرد، چونکە هەموو ڕۆژ چاویان بەدیدەنی ڕۆشن دەبوو ، ئەم هەڵوێستە لە کوێ، لەگەڵ ئەو کەسەی سەردانی ئافرەتانی ناکات و بە ڕۆژ و بە مانگ نایانبینێت؟! خەڵکانێك هەنە هەموو ڕۆژ چاوی بە برادەرەکانی دەکەوێت و تا درەنگانی شەو کات لەگەڵیان بەسەر دەبات، کاتێکیش دەگەڕێتەوە ماڵەوە هەموو وزەی سەرف کردوەو ماڵ و مناڵەکەی نوستوونە، ئەویش ڕاستەوخۆ دەچێت دەخەوێت!

فەرموودەکەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی پیاو دەتوانێ لە نۆرەی یەکێك لە خێزانەکانی بچێتە سەردانی ئەوانی تر و ماچیان بکات و لێیان نزیك ببێتەوە.

هەوەها فەرموودەکە وەکو خۆر لە ئاسمانی سامانڵ، چاکەی پێغەمبەر ﷺ نیشان دەدا، کە باشترین کەسە لە مامەڵەکردنی لەگەڵ خێزانەکانی [١].

سەبارەت بە شەو، ئەو کات لەوانەیە لە ماڵی یەکێکیان هەموو کۆببنەوە، پاشان دەهات و قسەی بۆ دەکردن، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ نۆ خێزانی هەبوو، ئەگەر نۆبەتەکانی دابەش بکردبایە، ئەوا نەدەهاتەوە لای یەکەم ئافرەت تاوەکو نۆ ڕۆژ، هەموانیشی بە شەو لە نۆبەتی یەکێکیان کۆ دەبوونەوە [٢].

لەم فەرمووودەیەدا سوننەت وایە پیاو سەردانی یەکە یەکەی ئافرەتەکان بکات لە ماڵەکانی خۆیان، نەوەك بۆ ماڵەکەی خۆی بانگیان بکات [٣]. پێغەمبەر ﷺ سەرباری ئەوەی زۆر سەرقاڵ بوو باری گرانی لەسەر شان بوو، وێڕای ئەمەش لەگەڵ خێزانەکانی دادەنیشت و لەلایان دەمایەوە و گفتوگۆی شیرینی لەگەڵ دەکردن و گوێی لە قسەکانیان دەگرت.

عائیشە ﵂ فەرمودەی دایکی زەرعی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، کە یازدە ئافرەت ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی هەریەکە باسی مێردەکەی خۆی بکات بێ ئەوەی هیچ شتێك لە بارەیەوە بشارێتەوە، جا هەریەکێکیان باسی مێردەکەی خۆی کرد. ئینجا لە هەموویان باشتر کە باسی مێردەکەی خۆی کرد خێزانی باوکی زەرع بوو، جا عائیشە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم: **"من بۆ تۆ وەکو باوکی زەرعم بۆ دایکی زەرع"** [٤]

---

[١] عون المعبود (١٢٢/٦).

[٢] موسلیم گێراوەتیەوە(١٤٦٢).

[٣] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٤٧/١٠).

[٤] بوخاری (٥١٨٩) و موسلیم (٢٤٤٨) گێڕاوەتیانەوە.

بۆیە پێویستە پیاو بەشێك لە کاتی خۆی تەرخان بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانەکەی دابنیشێت و گوێی لە قسەکانی بگرێت، ئەمڕۆ زۆربەی ئافرەتان گلەیی ئەوە دەکەن کە مێردەکانیان بە درێژایی ڕۆژ گارکار دەکەن، کاتێکیش دەگەڕێنەوە ماڵەوە ئەوا لەبەرامبەر تەلەفزیۆن دادەنیشن هەتا نیوەی شەو، خێزانەکەشی چاوەڕێی دەکات، پاشان بە ماندوویی و شەکەتی دەچێتە سەر جێگاکەی، وەك جەستەیەکی مردوو، لەوانەشە کاتێك دەخەوێ کۆنترۆلی تەلەفزیۆنەکەی هەر لە دەست بێت بێ ئەوەی گوێ بداتە خێزانە داماوەکەی.

هەندێك لە پیاوەکان کاتێك دەوامی تەواو دەبێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە، ئەوا کارەکانی فەرمانگەکەی یان کۆمپانیاکەی لەگەڵ خۆی دێنێتەوە و لە ماڵەوە تەواویان دەکات، جا دەوامێکی تر بۆ خۆی لە ماڵەوە دادەنێت، ماڵ و منداڵەکەشی چاوەڕێی دەکەن.

تەنانەت بە ڕێگا نوێیەکانی پەیوەندیکردن، پیاو دەتوانێ بەردەوام خێزانەکەی بەسەر بکاتەوە، بە ناردنی کورتە نامە و قسەکردن، بە مەبەستی ئەحواڵ پرسینی کە تەنیا یەك خولەکی لێ دەگرێت، بەڵام لەلای ئافرەتەکە ئەمە جێگای بایەخێکی زۆرە و منەتی پێیەتی.

## پێغەمبەر ﷺ لە دانیشتن و قسەکردن لەگەڵیان مافی خێزانەکانی دەدا:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەك شەودا دەچووە لای هەر نۆ خێزانی، ئەو کات نۆ خێزانی هەبوو، قەتادە ﷺ دەڵێت: گوتم ئەی ئەنەس ئایا پێغەمبەر ئەو توانایەی هەبوو؟ گوتی: ئەو هێزی ٣٠ پیاوی پێ درا بوو[(١)].

ئیبن حەجەر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەی لە هەموو کەس لە خوا ترستر و خواناس تر بوو، ژنی زۆری هێناوە، ئەمەش لەپێناو بەرژەوەندی گەیاندنی ئەو ئەحکامانەی کە پیاوان ناتوانن بیزانن و تەماشای بکەن. هەروەها بۆ پیشان دانی موعجیزەی سنور بەزاندن، سەرباری ئەوەی هەندێك جار خواردنی لە ماڵەوە نەبووە خۆی پێ تێر بکات، گەر هەشی بوایە دەیبەخشی، هەروەها زۆریش بە ڕۆژوو دەبوو، سەرباری ئەمە لە یەك شەودا دەچووە لای هەموو خێزانەکانی، هیچ کەسێك ئەمەی پێ ناکرێت گەر هێزی نەبێت، عەرەبیش مەدحی ئەو جۆرە کەسانەی کردووە کە ژنی زۆری هێناوە، وێڕای ئەوەی خێزانی زۆر هەبووە، ئەوا ڕێگری لە پەرستنی پەروەردگاری لێ نەکردووە[(٢)].

---

(١) بوخاری گێراوەتیەوە(٢٦٨).
(٢) فتح الباری (١١٥/٩).

پێغەمبەر ﷺ عیبادەت کردنی رێگری نەکردووە لەوەی لەگەڵ خێزانەکانی دابنیشێت و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات، خاتوو عائیشە ؓ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژی بکردبایە و تەواو بووبایە، ئەو کات گەر من بەخەبەر بووومایە قسەی لەگەڵ دەکردم، ئەگەر نا ئەوا پاڵدەکەوت هەتاوەکو بانگی نوێژی بەیانی دەدا [1].

لەکاتی گەشت کردنیشدا لەگەڵ خێزانەکانی دەرۆیشت و قسەی لەگەڵ دەکردن، خاتوو عائیشە ؓ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بۆ سەفەرێك بچووبایە ئەوا تیروپشکی لە نێوان خێزانەکانی دەکرد، ئینجا تیروپشکەکە بۆ عائیشە و حەفصە ؓ پێغەمبەر لە شەودا لەگەڵ عائیشە دەرچوو قسەی لەگەڵ دەکرد... [2]

لە خورەوشتی جوانی پێغەمبەر ﷺ: ئەنەسی کوڕی مالیك ؓ دەڵێت: لە زەماوەندی زەینەبی کچی جەحش نان و گۆشتێکی کرد بۆ ئەوەی بیخۆن، جا پۆل پۆل دەهاتن و دەرۆیشتن، هەتا کەس نەما بانگی بکەم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کەس نەما بانگی نەکەم، فەرمووی خواردنەکە هەڵگرن.. ئەو کات بە خۆی بردی بۆ لای عائیشە و فەرمووی: **السلام علیکم أهل البیت و رحمة الله وبرکاته**، عائیشەش گوتی: وعلیکم السلام و رحمة الله، تەندروستی خێزانەکەت چۆن بوو؟ بەرەکەتی خوای گەورەت لێ بێت.

جا بۆ خێزانەکانی تریش هەر وای دەکرد، سەلامی لێ دەکردن، وەك چۆن سەلامی لە عائیشە خان کرد، ئەوانیش بە هەمان شێوە وەڵامیان دەدایەوە [3].

(سوڕانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر خێزانەکانی و دڵنیا بوون لێیان و ئەحواڵ پرسینیان، رازی کردنی دڵیان و ئارام کردنەوەیان، وای کردبوو ئەوانیش لەگەڵ یەکتری یان لەگەڵ ئەو خێزانە نوێیانەی تازە هێنابووی، قسەی نەرمی لەگەڵ بکەن و ئەحواڵی بپرسن، وەك ئەو وتەیەی خاتوو عائیشە: لەگەڵ خێزانەکەت چۆنی ئەی پێغەمبەری خوا؟

لە راستیدا گوتنی ئەم قسەیە لە کاتی هاتنی هەوێ بەسەریاندا بەڵگەی هۆشیاری و هۆشمەندی و ئارام گرتنیان و باش مامەڵەکردنیانە، چونکە ئەم کەش و هەوایە زۆر جار کەشوهەوای تورەبوونە، بەڵام ئەوان پاکن و خێزانی پاکانن) [4].

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ **بەلای ماڵی خێزانەکانی دەڕویشت و دەیفەرموو –سلام علیکم ئەی خاوەن ماڵ، داخوە ساغ و سەلامەتن؟ ئەوانیش وەڵامیان**

---

[1] بوخاری گێراوەتیەوە(١١٦١).

[2] بوخاری (٥٢١١) و موسلیم (٢٤٤٥) گێراوەتیانەوە.

[3] بوخاری (٤٧٩٢) و موسلیم (١٤٢٨) گێراوەتیانەوە.

[4] المفهم للقرطبي (١٣/١٥).

**دەدایەوە دەیانگوت: زۆر باشین سوپاس بۆ خوا، ئەی تۆ و خێزانە نوێیەکەت چۆنن؟ ئەویش دەیفەرموو: زۆر باشین....**[1]

ئەوەوی دەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر هەر یەکێك چووە ماڵەکەی خۆی سوننەتە سەلام لە خێزانەکەی بکات، ئەوەش ئەمڕۆ، کە نەفام و خۆ بەگەورە زانەکان جێبەجێی ناکەن. هەروەها سوننەتە پیاو لە ئەحواڵی خێزان و منداڵەکانی بپرسێت چونکە لەوانەیە پێویستی بە شتێك هەبێت بەڵام شەرم بکات بیدرکێنێت، بەڵام کە پێی وترا، ئەو کات دەبێتە رێ خۆش کردنێك بۆ ئەوەی بیڵێت[2].

**پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر خێزانەکانی بە ئەمەك بووە، مافی دەپاراستن و چاکەی لە بیرنەدەکردن:**

پێغەمبەر ﷺ مەدحی خەدیجەی خێزانی دەکرد لەو کاتەی لە ژیان دابوو هەروەها ئەو کاتەی وەفاتیشی کرد، ئەمەی بۆ کەسی تر نەکردووە، موکڕیش بوو لەسەر ئاشکراکردن و باسکردنی پلەوپایە و قەدری تەنانەت پاش وەفاتیشی.

عائیشە ﵂دەڵێت: "هەرگیز ئەوەندە غیرەم نەکردووە بۆ هیچ خێزانێکی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی بۆ خەدیجە کردوومە، کە نەشم بینیوە، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی دەکرد، لەوانە جاری واهەبوو بەرخێکی سەردەبڕی پاشان پەل پەلی دەکرد و دەینارد بۆ دەستە خوشکەکانی خەدیجە، منیش دەمگوت: دەڵێی ئافرەت لە دونیادا نەبووە تەنیا خەدیجە نەبێت!! ئەویش دەیفەرموو: **ئەو وەها و وەها بوو، دایکی منداڵەکانم بوو**[3]". مەبەست لە فەرمودەکەی، کە دەفەرموێت (وەها و وەها بوو) واتە ئافرەتێکی عاقڵ و خانەدان بوو.

پێغەمبەر ﷺ، کە خەدیجەی خێزانی وەفاتی کرد، پەیوەندییەکەی نەپچڕاند، تەنانەت دوای وەفاتیشی هەر بەردەوام بوو.

هەموو منداڵەکانی لە خەدیجە بوون، تەنیا ئیبراهیم نەبێت، کە لە ماریە بوو، جا زانایان یەکڕان لەسەر منداڵەکانی پێغەمبەر ﷺ قاسم و هەر چوار کچەکە (زینب، رقیة، ام کلثوم و فاطمة) لەگەڵ عەبدوڵلا کە دوای بوونی بە پێغەمبەر لە دایك بووە، کە پێشی دەوترا (الطاهر والطیب)[4].

---

[1] موسلیم گێراوەتیەوە(١٤٢٨).

[2] موسلیم گێڕاوەتیەوە (٩/٢٢٥).

[3] بوخاری (٣٨١٨) و موسلیم (٢٤٣٥) گێراوەتیانەوە.

[4] فتح الباری (١٣٧/٧).

پێغەمبەر ﷺ هەر کە باسی خەدیجەی بکردبایە یەکسەر بە مەدحکردن باسی دەکرد و لە خوای گەورە بۆی دەپاڕایەوە، عائیشە ﵂دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر باسی خەدیجەی بکردبایە هەرگیز بێزار نەدەبوو لە باسکردن و دوعا بۆکردن بۆی [(١)].

ئەمڕۆش ئەگەر چاوێك بخشێنیت بە حاڵ و گوزەرانی خەڵكانی ئێستا، ئەوا شتی زۆر سەیر و سەمەرە دەبینیت و دەبیستیت.

دەبینین ئەگەر پیاوێك خێزانەکەی مردبێت و یەکێکی تری هێنابێت، ئەوا دەست دەکاتە مەدحکردنی ژنە تازەکەی و زەم کردنی مردووەکە.

پاشان ئەگەر یەکێکی تەڵاقدابێت، لە هەر دانیشتنێك بێت زەمی دەکات و دەڵێت کە ئارامم زۆر گرت لەسەری، کاتێك ئارامیم تەوابوو ئینجا تەڵاقمدا، جا ئەگەر باسی بکات ئەو هەر زەمی دەکات، کەسانێکی تریش هەن هەرگیز بە بەباشە باسی خێزانەکانیان ناکەن کە زیندوشە.

پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك بیبستبایە یان بینیبای یەکێك باسی خەدیجە دەکات ڕووی پیرۆزی ڕووناك دەبۆوە. عائیشە ﵂ دەفەرموێت: هالەی کچی خوەیلد ئیزنی خواست بۆ ئەوی بێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ بەمە خەدیجەی بە بیرهاتەوە و دڵی خۆش بوو، بەرلەوەی بێتە ژوورەوە فەرمووی: **"خودایە ئەمە هالە بێت"**، دەڵێت: جا توڕە بووم و گوتم: چیتە ئەوەندە باسی ئەو پیرەژنە قوڕەیشیە دەکەی کە دەمێکە مردووە و لە پیریان ددانەکانی کەوتبوون، خوای گەورە لەو باشتری پێداوی، پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی سوور هەڵگەرا بە شێوەیەك کە تەنیا لە کاتی دابەزینی وەحی یان لە کاتی هاتنی هەورێك کە گومان دەکرا بارانی پێوەبێت بەو شێوەیە سوور هەڵدەگەڕا، ئینجا فەرمووی: **"هەرگیز خوای گەورە لەو باشتری بەمن نەبەخشیووە، ئەو باوەڕی بە من هێنا لە کاتێك خەڵکی کافربوون پێم، بەراستی زانیم و خەڵکیش بە درۆیان خستەمەوە، ئەو بەماڵی خۆی یارمەتی دام، لە کاتێکدا خەڵکی بێ بەشیان کردم و خوای گەورە منداڵەکانی لەو پێبەخشیم لە کاتێك بێ بەشی کردم لە خێزانەکانی ترم"**. عائیشە دەڵێت: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە جارێکی تر باسی ناکەم تەنیا بە خێر نەبێت [(٢)].

ئەو چاکەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خەدیجەی کرد ئەوە بوو کە ژنی تری بەسەر نەهێنا، عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ژنی بەسەر خەدیجە نەهێنا هەتا وەفاتی کرد [(٣)].

---

(١) الطبراني لە المعجم الكبير (٣١٩/١٦) گێڕاوەتیەوە، مجمع الزوائد (٣٦٠/٩).

(٢) ئەحمەد (٢٤٣٤٣) و الطبراني لە (المعجم الكبير ١٤/٢٣) گێڕاوەتیانەوە. شعيب الارنؤط دەڵێت: سەندەکەی سەحیحە.

(٣) موسلیم گێڕاوەتیەوە(٢٤٣٦).

زانایان لەسەر ئەمە هیچ خیلافێکیان نییە، لەلایەکی ترەوە ئەمە بەڵگەیە لەسەر قەدرگرانی خەدیجە لەلای پێغەمبەر ﷺ، چونکە لەبەر چاکی خۆی ئەوی رازی کردبوو، کە پێویستی بە کەسی تر نەبێت و خۆی بۆیەکلایی کردبۆوە، پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی خەدیجەی هێنا سی و هەشتساڵ ژیا، خەدیجە لە کۆی گشتی تەمەنی هاوسەرگیری پێغەمبەر ٢٥ ساڵی بەبەردەکەوێت، ١٠ ساڵیش بۆ هەموو خێزانەکانی تر، کە دەکاتە ٣\٢ ژیانی هاوسەریەتی پێغەمبەر لەگەڵ کۆی هاوسەرەکانی.

لەگەڵ ئەو ماوە دووروو درێژەدا پێغەمبەر ﷺ دڵی ڕاگرت لەوەی توشی چەرمەسەری هەوێداری بکات... ئەمەش گەورەییەکە کەسی تر تیایدا بەشداری نەکردووە [١].

لەبەر ئەمەکی پێغەمبەر ﷺ بۆ خەدیجە، لە دوای وەفاتیشی ئاگای لە دەستەخوشکەکانی بوو. عائیشە ﵂ دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی خەدیجەی دەکرد، هەر، کە بەرخێکی سەربڕیبایە، پارچە پارچەی دەکرد و دەینارد بۆ دەستە خوشکەکانی خەدیجە) [٢].

ئەمەش هەمووی بەڵگەیە لەسەر بە وەفابوون و ڕاگرتنی ئەمەك و پاراستنی خۆشەویستی لە مردنی و ژیانی و ڕێز لێنان لە دەستە خوشکەکانی [٣].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ئەگەر شتێکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنابایە دەیفەرموو: **"بڕۆن بیبەن بۆ فلانەکەس چونکە هاوڕێی خەدیجەیە، بڕۆن بیبەن بۆ ماڵی فلانەکەس چونکە خەدیجەی خۆش دەویست"** [٤].

پێغەمبەر ﷺ زۆرگرینگی بە دەستە خوشکەکانی خەدیجە دەدا، عائیشە دەڵێت: پیرەژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەتوو کێی؟ گوتی: من جوثامەی موزەنیمە، فەرمووی: **"بەڵکو تۆ حەسسانەی موزەنی، حاڵ و گوزەرانتان چۆنە، تەندروستیتان باشە؟"** گوتی: دایکم و باوکم فیدات بێت زۆر باشین، کە ڕۆیشت گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن وا پێشوازیت لەو پیرەژنە کرد و ڕووت پێدا؟ فەرمووی: **"ئەی عائیشە ئەو لەسەر دەمی خەدیجە دەهاتە لامان، ڕێزلێنان و بە ئەمەکیش لە باوەڕەوەیە"** [٥].

---

[١] فتح الباری (١٣٧/٧).
[٢] بوخاری (٣٥٣٤) و موسلیم (٢٤٣٥) گێراوەتیانەوە.
[٣] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٠٢/١٥).
[٤] بوخاری لە (الادب المفرد ٣٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الادب المفرد ١٧٢) بە حەسەنی داناوە.
[٥] حاکم لە مستدرك (١٧/١). ئەلبانی لە (الصحیحة ٢١٦) بە سەحیحی داناوە.

**سوودێك لەم فەرموودەیە:**

لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ئافرەتە پیرەژن بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەکەی گۆڕی بۆ ناوێکی جوانتر و سوکتر، چونکە (جوثامە) بە واتای تەمبەڵی دێت: (حەسسانە)ش واتە زۆر جوان، ئەو ناوە قەشەنگە، کەم کەس هەیە ئەمڕۆ کچەکەی بەم ناوە ناو نابنێت[1].

بە ئەمەك بوون خورەوشتی ئەهلی ئیمانە، ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەری خوا ﷺ چاکە بە چاکەیە، وەڵامدانەوەیەکی جوان و خۆشەویستانە و بە ئەمەکییەکی بەرزە بۆ خەدیجەی خێزانی، کە ئەو هەردەم پاڵپشتی دەکرد و دڵی دەدایە و ئازارو مەینەتییەکانی لەسەر سوك دەکرد.

ئەمڕۆش زۆر لە مێردەکان چاکەی خێزانەکەی لەبەرچاو نییە کە لە سەرەتای پێکهێنانی ژیانی هاوسەریان لەگەڵیدا بووە و لە دروستکردنی ماڵەکەی هاوکاری کردووە. لە ڕاستیدا ئەمەش بێ ئەمەکیی و بێ وەفایی و دوورە لە خورەوشتی جوان.

پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێك ڕێگری لێ نەدەگرت خۆشەویستی بۆ خەدیجەی ئاشکرا بکات، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی خەدیجەوە فەرموویەتی: "**خۆشەویستی خەدیجە لە ناخ و دڵمدا ڕوواوە**[2]".

خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆ خاتوو عائیشە ﵂ باوترە لەوەی باس بکرێت، پێغەمبەر ﷺ هیچ ئافرەتێکی وەك ئەو خۆش نەویستووە و هیچ ئافرەتێکی نەهێناوە کچ بێت تەنیا ئەو نەبێت.

پێغەمبەر ﷺ ئەو خۆشەویستییەی ئاشکرا دەکرد و نەیدەشاردەوە، هەتا کە عەمری کوڕی عاص پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە خۆشەویسترین کەس لەلای ئەو کێیە؟ فەرمووی: "**عائیشە**" گوتی ئەی لە پیاوان کێ؟ فەرمووی: "**باوکی**[3]".

بەڵام ئەمڕۆش دەبینین کە پیاوی وا هەیە چەند ساڵە هیچ خۆشەویستییەکی بۆ خێزانەکەی دەرنەبڕیووە، بەڵکو پیاوی وا هەیە ئەو کارە بە لاوازی کەسیەتی لە قەڵەم دەدات، ئیواش هەیە شەرم دەکات ئەو کارە بکات..!!

---

[1] شێخ ئەلبانی یەکێك لە کچەکانی بەم ناوە ناو ناوە، ئەمەش وەکو شوێنکەوتنێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری (السلسلة الصحيحة ١/٢١٥) بکە.

[2] موسلیم لە عائیشە گێراوەتیەوە(٢٤٣٥).

[3] بوخاری (٣٦٦٢) و موسلیم (٢٣٨٤) گێراوەتیانەوە.

ئەمڕۆ زۆربەی خەڵك نازانێت کە دەربڕینی خۆشەویستی بۆ خێزانەکەی باشترین یارمەتیدەرە بۆ پتەوکردنی پەیوەندییەکان و بەردەوام بوونی ژیانێکی پڕ لە کامەرانی و زیاد بوونی متمانە لە نێوانیاندا.

لە ڕاستیدا ئافرەت دەیەوێت پیاوەکەی زۆر خۆشەویستی خۆی بۆ دەربڕێت و ئاشکرای بکات.

زۆر ئافرەت توشی گوناه بوون بە هۆی ئەوەی یەکێکی تری دۆزیوەتەوە و قسەی لەگەڵ بکات و پێی بڵێ خۆشم دەوێی، چونکە ئەم هەڵوێستە لە پیاوەکەی نابینێت.

**پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی بچێتە دەرەوە لە ماڵ، خێزانەکەی ماچ دەکرد:**

عوروە لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك لە خێزانەکانی ماچ کردووە، پاشان بۆ نوێژکردن چووە و دەست نوێژیشی هەڵنەگرتۆتەوە، گوتی: ئەو ئافرەتە تۆ بوویت؟ ئەویش پێکەنی [1].

بەڵکو هەتا کە بە ڕۆژووش بووایە ئەوا هەندێك لە ئافرەتەکانی ماچ دەکرد، عائیشە دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوەی بە ڕۆژوو بوو، ماچی دەکرد و لەگەڵ خێزانەکانی پاڵیدەدایەوە، لە هەموو کەسیش زیاتر خۆی ڕادەگرت و خۆی کۆنترۆڵ دەکرد [2].

**لەو شوێنە ئاوی دەخواردەوە کە خێزانەکەی ئاوی لێدەخواردووە:**

عائیشە دەفەرموێت: کاتێك نەخۆشبووم ئاوم دەخواردەوە پاشان دەمدایە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دەمی لەو شوێنە دادەنا بۆ ئاوخواردنەوە کەمن لێیم خواردبۆوە، ئەو ئێسکەی من گۆشتم لێکردبووە دەمدایە پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەمی لەسەر ئەو شوێنە دادەنا کە دەمی منی پێکەوتبوو. [3]

(ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی خۆشەویستی بۆ خێزانەکەی) . [4]

بە دڵنیایەوە ئەم کردارە شوێنەوارێکی زۆر باش لە دەروونی ئافرەت بەجێدەهێڵێت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پێناو دەرخستنی سۆز و خۆشەویستی بۆ خێزانەکەی دەمی لە جێگای دەمی عائیشە دادەنا لە خواردن و خواردنەوە.

---

[1] ترمذي (٧٩) و ئەبو داود (١٧٨) نسائی (١٧٠) و ابن ماجة (٥٠٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبی داود ١٧٢) بە سەحیحی داناوە.

[2] بوخاری (١٩٢٧) و موسلیم (١١٠٦) گێراوەتیانەوە.

[3] موسلیم گێراوەتیەوە(٣٠٠).

[4] مرقاه المفاتيح (٢/٤٨٧).

## کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، سەری لەسەر سینەی عائیشە بوو:

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی من و لە نۆبەتی من و لە نێو باوەشی مندا گیانی سپارد ).[1]

مەبەست لەمە ئەوەیە کاتێك گیانی پیرۆزی سپارد لەسەر سینگ و باوەشی پاڵیدابووەو ماڵئاوایی لە دونیا کرد.[2]

## بەو سیواکەی خێزانەکەی سیواکی پێکردبوو، سیواکی دەکرد:

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: (لە نیعمەتەکانی خوای گەورە، کە لەگەڵ منی کرد، ئەوەبوو کە پێغەمبەر ﷺ لە ماڵی من و لە نۆبەتی من وەفاتی کرد، خوای گەورە وای کرد لیکی من و پێغەمبەر لە کاتی وەفاتیدا تێکەڵی یەکتر ببێ. عەبدولرەحمان هاتە لام سیواکێکی بە دەستەوە بوو، پێغەمبەریش ﷺ لەناو باوەشم بوو، بینیم وا سەیری سیواکەکە دەکات، زانیم کە حەزی لە سیواکە، گوتم وەریبگرم بۆت؟ ئەویش بە لەقاندنی سەری ئاماژەی کرد بەڵێ، منیش پێمدا، بەڵام کەمێك بەلای وشك بوو، گوتم بۆتی نەرم کەمەوە؟ ئەویش بەسەر ئاماژەی کرد بەڵێ، منیش لەناو دەمی خۆم ناو بۆم نەرمکردەوە دامە پێغەمبەر ﷺ سیواکی پێکرد، لە کاتێك کە سەری هەر لەسەر سینگم بوو) .[3]

ئەمە چ گەورەییەکە بۆ خاتوو عائشە ﷺ کە پەروەردگار وایکرد لیکی هەردووکیان لە کۆتا رۆژی دونیا و یەکەم رۆژی قیامەت تێکەڵی یەکتر بێت، لە ڕاستیدا ئەمە فەزڵ و گەورەییەکە بە دەست کەم کەس دەکەوێت.

## لەوانەیە جاروبار لەسەر ڕانی نوستبێت:

کاتێك لە گەشتێك بە هۆی بزربوونی ملوانکەیەکی خاتوو عائیشە دواکەوتن، خەڵکیش ئاویان نەمابوو، عائیشە دەفەرموێت: ئەبوبەکر ﷺ لەو دەمە هات و سەرزەنشتی کردم و نوقرچکەی لێ دەدام، منیش لەبەر ئەوەی چونکە سەری پێغەمبەر ﷺ لەسەر رانم بوو، جوڵەم نەدەکرد.)[4]

هەر خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بە کۆشم دەکرد، لە کاتێکدا من نەخۆشم بووم پاشان قورئانی دەخوێند[5].

---

[1] بوخاری (١٣٨٩) و موسلیم (٤٤٧٤) گێراوەتیانەوە.
[2] فتح الباری (١/١٣٠).
[3] بوخاری گێراوەتیەوە(٤٤٣٨).
[4] بوخاری (٤٦٠٧) و موسلیم (٥٥٠) گێراوەتیانەوە.
[5] بوخاری (٣٦٧٢) و موسلیم (٢٦٧) گێراوەتیانەوە.

## لەگەڵ خێزانەکانی لەناو یەك تەشتدا خۆیان دەشوشت:

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئاوی یەك تەشتدا، کە لە نێوان من و ئەو دابوو، خۆمان دەشوت، ئەو جار جار پێشە من دەستی بۆ ئاوەکە دەبرد و منیش جارجار دەستم پێش ئەو دەکەوت، هەتا دەیفەرموو: **"وازی لێبێنە بۆم"** منیش دەمگوت: وازی لێبێنە بۆم) [١].

ئیبن عەباس ﵄ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ مەیمونەی خێزانی ﵂ لە ئاوی یەك تەشدا خۆیان دەشوشت [٢].

دایکی سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە غوسلی جەنابەتدا لە ئاوی یەك تەشتدا خۆمان دەشوشت [٣].

لە رۆژگاری ئێستاشدا پیاو پێی شورەییە لەگەڵ ئافرەتەکەی لەژێر پێخەفدا بخەوێت، ئەمەش بە هۆی چەند خوو نەریتێکی خراپ و نەفامی کە رەگ و ریشاڵی داکوتاوە.

## خێزانەکانی دەلاواندنەوە:

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك بە منی فەرموو: **"ئەی عائیش، ئەوە جوبریلە سەلامتت لێ دەکات"**، گوتم: وعلیه السلام و رحمة الله وبرکاته [٤].

یان پێی دەفەرموو: ئەی حومەیرا [٥]، هەروەکو دەڵێت: حەبەشییەکان چوونە ناو مزگەوت و یاریان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: **"ئەی حومەیرا، حەز دەکەی تەماشایان بکەی؟"**، گوتم: بەڵێ [٦].

قازی عیاض دەڵێت: بچوککردنەوەی ناوی بۆ دڵ پێسوتان و بەزەیی و خۆشەویستییە.

هەندێکجار بە دایکی عەبدوڵڵا بانگی دەکرد، هەروەکو دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر لە دایك بوو، هێنامە لای پێغەمبەر، ئەویش تفی لەناو دەمی کرد، ئەمەش یەکەم

---

(١) بوخاری (٢٥٠) و موسلیم (٣٢١) و النسائی (٢٣٩) گێڕاوەتیانەوە.
(٢) بوخاری (٢٥٣) و موسلیم (٣٢٢) گێڕاوەتیانەوە.
(٣) بوخاری (٣٢٢) و موسلیم (٣٢٢) گێڕاوەتیانەوە.
(٤) بوخاری (٣٢١٧) و موسلیم (٢٤٤٧) گێڕاوەتیانەوە.
(٥) حومەیرا: بچوکردنەوەی حەمرائە: واتا ئەو سپییەی تێکەڵ بە رەنگی سوور بووە.
(٦) نسائی گێڕاوەتیەوە(٨٩٥١)، ئەلبانی لە (السلسة الصحیحة٣٢٧٧) بە سەحیحی دناوە، ئەلبانی دەڵێت: "سەنەدەکەی سەحیحە، وشەی حەمیرام لە هیچ فەرموودەیەکی سەحیحدا نەبینووە، تەنیا لەمە نەبێت"، فتح الباری (٢/٤٤٤).

شت بوو چووە ناو هەناوی ئەو منداڵە، فەرمووی: **"ئەوە عەبدوڵڵایە و تۆش دایکی عەبدوڵڵای"**، جا بەردەوام ئەمە نازناوم بووە لە کاتێکدا منداڵیشم نەبووە [1].

ئەمڕۆش دەبینی هەندێك پیاو لە تەلەفۆن بانگی ئافرەتەکانیان دەکەن بەناو و نازناوی زۆر ناشیرن وەکو: کچەتیم، کچێ، بەڵای سەر... هتد. بەڵام هەندێکی تریش لە تەلەفۆن بە ناوی زۆر جوان وەڵامی ئافرەتەکانیان دەدەنەوە و بانگیان دەکەن، وەك خێزانەکەم، نازدارەکەم، خاتوون، دایکی فلان... جا پاك و بێگەردی بۆ خوای پەروەردگار، کە رەوشتی وەك رزق و رۆزی بەسەر پیاوەکان دابەش کردووە.

**لە مامەڵە باشەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی ئەوەبوو لەگەڵ خۆیدا دەیبردن بۆ دەعوەت:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: هاوڕێیەکی پێغەمبەر ﷺ کە فارس بوو، دەستاوی لە خواردنی مەرگە لێناندا زۆر خۆش بوو، جارێکیان مەرەگەیەکی دروستکرد و پێغەمبەری ﷺ بانگکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی **"ئەی ئەمە"**، –مەبەستی خاتوو عائیشە بوو– کابرا گوتی: نا. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"منیش نایەم"** جارێکی دی بانگی کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"ئەی ئەمە"**، کابرا دیسان گوتی: نا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"منیش نایەم"**. جارێکی تر بانگی کردەوە: ئەویش فەرمووی: **"ئەی ئەمە"**، کابرا بۆ جاری سێیەم گوتی: با ئەویش بێت. جا هەردووکیان یەکتریان پاڵپێوەدنا هەتا هاتنە ماڵەکەی [2].

نەوەوی دەفەرموێت:پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشبوو بە تەنیا و بێ خاتوو عائیشە ئەم خواردنە بخوات، ئەمەش لە باش ماڵەکردن و ڕەچاوکردنی مافی هاوسەر و ئادابی خێزانە [3].

**گەر یەکێك لە خێزانەکانی سەردانی بکردایە، لە کاتی گەڕانەوەیدا لەگەڵی دەگەڕایەوە و بەڕێی دەکرد، تەنانەت گەر لە ئیعتیکافیش بایە:**

صەفییەی کچی حویەی ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ لە ئیعتیکافدابوو، منیش بەشەو سەردانم کرد، قسەم لەگەڵی کرد، پاشان هەستام بۆ ئەوەی بڕۆم ئەویش هەستا و لەگەڵم بۆ ئەوەی بەڕێم بکات، دوو پیاوی ئەنساری بەو شوێنە تێپەڕین، کاتێك پێغەمبەریان بینی پەلەیان لە رۆیشتن کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لەسەرخۆ بن، ئەوە صەفییەی کچی**

---

(1) ئیبن حبان گێراوەتیەوە(٧١١٧)، شعیب الارناوط دەڵێت: سەندەکەی بەهێزە

(2) موسلیم گێراوەتیەوە(٢٠٣٧).

(3) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم(٢٠٩/١٣).

**حویەیە**"، گوتیان: سبحان الله ئەی پێغەمبەر خوا، فەرمووی: "**شەیتان وەکو خوێن لە دەماری مرۆڤەکان دەجوڵێتەوە، منیش ترسام لەوەی شتێکی خراپ بخاتە دڵتانەوە**[1]".

جا تێبفکرە لەوەی چۆن پێغەمبەر ﷺ لە ئیعتیکافیشدا بووە، هەستاوە لەگەڵیدا بۆ ئەوەی بەرێی بکات بۆ ماڵەوە، بۆ ئەوەی بیپارێزێت و ئاگای لێ بێت، لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسەی لە ئیعتیکاف کردندابێت نابێت لە مزگەوت بچێتە دەرەوە مەگەر بۆ ئیشێکی زۆر پێویست نەبێت.

بەڕاستی پێغەمبەر ﷺ بە ژیانێکی پڕ لە کامەرانی و بەختەوەری لەگەڵ هاوسەرەکانی ژیا، ئەو زۆر بە وردی کاری بە فەرمایشتی خوای پەروەردگار دەکرد، کە دەفەرموێت:

﴿ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ﴾ النساء: ١٩ واتە: بە جوانی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن.

جا سەیر نییە لە پاش ئەمە پێغەمبەر ﷺ باس لە ژیانی هاوسەرایەتی خۆی بکات، کە دەفەرموێت: "**باشترینتان باشترینتانە بۆ خێزانەکانی، منیش باشترینتانم بۆ خێزانەکانم**[2]". هەروەها فەرمویەتی: "**ئەو کاتە باوەڕدار باوەڕی تەواو دەبێت، کە لە هەموو کەس بەڕەوشتر بێت، باشترینتانیش باشترینتانە بۆ خێزانەکەی**[3]".

هەرگیز نەبیستراوە و نەبینراوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك لە ڕۆژان لە ئافرەتێکی دابێت، یان بە کەم سەیری ئافرەتێکی کردبێت، خاتوو عائیشە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز بە دەستی خۆی لە هیچ کەسێکی نەداوە و لە ئافرەت و خزمەتکاریشی نەداوە، تەنها لە کاتی جیهادکردندا نەبێت لە پێناو خودای پەروەردگار.[4]

ئەمە لە کوێ و حاڵی پیاوی ئەمڕۆ لە کوێ، کە لەسەر شتی زۆر کەم و بێهودە دەستی بەرامبەر خێزانەکەی بەرزدەکاتەوە و لە دەموچاو یان لەسەری یان لە پشتی دەدات، هەندێکجار ئامرازی دار یان پێڵاو یان شتی تر بەکار دەهێنێت.

ریوایەت کراوە لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی :"**لە ئافرەتان مەدەن**". عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ئافرەتەکان بە گوێی پیاوەکانیان ناکەن و لێیان هەڵگەراونەتەوە، جا پێغەمبەری خواش ﷺ مۆڵەتی دا لێیان بدەن، ئەو کات ئافرەتانێکی زۆر هاتنە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ شکاتیان لە مێردەکانیان

---

[1] بوخاری (٢٠٣٨) و موسلیم (٢١٧٥) گێراویانەتەوە.

[2] ترمذي گێراوەتیەوە(٣٨٩٥)، ئەلبانی لە (الصحیح الجامع ٣٣١٤) بە سەحیحی داناوە.

[3] ترمذي گێراوەتیەوە(١٠٨٢)، ئەلبانی لە (الصحیح الجامع ١٢٣٠) بە سەحیحی داناوە.

[4] موسلیم گێراوەتیەوە(٢٣٢٨).

دەکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بە ڕاستی ئافرەتێکی زۆر گلەییان کردوە لە پیاوەکانیان، بە ڕاستی ئەوانە لەپیاوە باشەکانی ناو ئێوە نین[(١)]"**

واتە ئەو پیاوانەی لە ژنەکانیان دەدەن، ئەوانە لە پیاوە باشەکانی ئێوەنین بەڵکو باشەکانتان ئەوانەنە کە لە ژنەکانیان نادەن و ئارام دەگرن لەسەریان[(٢)].

بۆیە عەرەب گوتویانە: کەسێك ڕێز لە ئافرەت دەگرێت، کە بە خۆی ڕێزدار بێت، ئەو کەسەی بە چاوی سوك سەیری دەکات، ئەو خۆی کەسێکی بێ بەها و سوکە.

پێغەمبەر ﷺ وەسیەتی بۆ کردووین کە بە نەرم و نیانی مامەڵە لەگەڵ ئافرەتاندا بکەین، وەك دەفەرموێت: **"زۆر بەباشی لەگەڵ ئافرەتەکان مامەڵە بکەن، چونکە ئەوان لە پەراسوەکی خوار دروست کراون، سەرەوەی پەراسوش لە هەموو شوێنێکی تر خوارترە، گەر ویستت ڕاستی بکەیتەوە ئەوا دەیشکێنی، ئەگەریش لێی گەڕێی هەر بە خواری دەمێنێتەوە، بۆیە زۆر بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن[(٣)]"**.

ئەم فەرمودەیە هاندانی تێدایە سەبارەت بە مامەڵەکردنی باش لەگەڵ ئافرەتەکان، هەروەها بۆ ئارام گرتن لەسەریان و لاواندنەوەیان و چاکە لەگەڵ کرنیان و ئارام گرتن لەسەر ڕەوشتی خواریان[(٤)].

هەروەها فەرموویەتی: **"ئافرەت لە ئێسکی پەراسویەك دروست کراوە، ئەگەر ویستت پەراسو ڕاست بکەیەوە ئەوا دەیشکێنی، جا لەگەڵیدا ڕێبکە و لەگەڵیدا بژی.[(٥)]"**

پێویستە لەسەر پیاو ئارام لەسەر ئافرەتەکەی بگرێت و زۆر گوێ نەداتە ئەو قسانەی دەیکات و بەهەند وەریان نەگرێت.

پێغەمبەر ﷺ بە بەردەوام هەر کاتێك هەلی بۆ برەخسابایە، ئامۆژگاری و وەسیەتی دووبارە و سێ بارەی دەکردنەوە.

---

[(١)] ئەبو داود (٢١٤٦) و ئیبن ماجە (١٩٨) گێراوەتیانەوە.

[(٢)] عون المعبود (١٣٠/٦). بە دەستکاریەوە.

[(٣)] بوخاری (٣٣٣١) و موسلیم (٦٨١٤ ) گێراوەتیانەوە.

[(٤)] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٥٧/١) بە دەستکاریەوە.

[(٥)] ئەحمەد گێراوەتیەوە(١٩٥٨٩)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٩٤٤) بە سەحیحی داناوە.

لە وتاری حەجیماڵئاوایی گۆشەیەکی بۆ بابەتی ئافرەت تەرخان کرد، لە وتارە بەنرخەکەیدا فەرموی "**زۆر بەباشی ئاگاتان لە ئافرەتان بێت، چونکە ئەوان دەست بەسەرن لەلای ئێوە**[1]".

بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئەم وەسیەتەی زۆر دووبارە دەکردەوە بۆ ئافرەتان، چونکە دەیزانی پیاوانێك هەن ناتوانن ئارام بگرن لەسەر ئافرەتەکانیان و ناتوانن لەسەر توڕەبوون خۆراگر بن، جا ئەو خوارییەی کە لە ئافرەتدا هەیە وای لێ دەکات لێی جیا ببێتەوە، بەم شێوەیەش ژیانی هاوسەری لێ تێك دەچێت و ماڵی پەرتەوازە دەبێت.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەکی تر ئامۆژگاری پیاوەکان دەکات بۆ ئەوەی باشبن لەگەڵ خێزانەکانیان، هەروەکو دەفەرموێت: "**با هیچ پیاوێکی باوەڕدار ڕقی لە ئافرەتێکی باوەڕدار نەبێت، ئەگەر ڕەوشتێکی بە دڵ نەبوو، ئەوە ڕەوشتێکی تری بە دڵە**[2]".

. (واتە پێویستە ڕقی لێ نەبێتەوە، چونکە ئەگەر بینی چەند ڕەوشتێکی تێدایە بەدڵی نییە، ئەوە بە دڵنیاییەوە ڕەوشتی تری تێدایە کە بە دڵی بێت، وەکو ئەوەی کە لەوانەیە توڕەو توند بێت، بەڵام دیندارە و دوایێن پاکە و بە سۆزە .....هتد). [3]

پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی زۆر باش بوو لەگەڵ خێزانەکانی و بەردەوام موژدەدەر بوو، لەسەر دڵخۆشکردنیان و لەگەڵیان دادەنیشت و لەگەڵیان نانی دەخواردو گفتوگۆی لەگەڵ دەکردن، جاروبار گاڵتە و سوعبەتی لەگەڵ دەکردن، لە هەندێك کاروباردا راوێژی پێ دەکردن، گوێ بۆ قسەکانیان دەگرت، دڵیانی دەدایەوەو لە کەموکوڕی و کەمتەرخەمییەکانیان چاوپۆشی دەکرد.

## بەڵکو وەسیەتی دەکرد لەگەڵ خزم و کەسی خێزانەکانیان باش بن.

ئەبو زەری غەفاری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "**ئێوە بە دڵنیاییەوە میسر رزگار دەکەن، زەویەکی تێدایە پێ دەگوترێت قیرات، ئەگەر رزگارتان کرد ئەوا لەگەڵ خەڵکەکەی زۆر باش بن، چونکە ئەوان ئەهلی زیمەتن و ئەهلی رەحمن**"، یان فەرمووی: "**ئەوان ئەهلی زیمەت و خەزورایەتین**" .[4]

[1] ترمذي (١٠٨٣) و ئیبن ماجە (١٨٥١) لە عومەری کوڕی ئەحوەصەوە گێڕاوەتیانە. ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٧٨٨٠) بە سەحیحی داناوە.
[2] موسلیم لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێراوەتیەوە(٢٦٧٣).
[3] شەرحی نەوەوی لەسەر سەحیحی موسلیم (١٠/٥٨).
[4] موسلیم گێراوەتیەوە(٢٥٤٣).

زیمه (الذمّة): واتـه حورمـەت و مافیـان هەیـه، سـەباره بـه رەحمـیش چـونکه خـاتوو هاجەر دایکـی ئیسـماعیل ﷺ لـەوان بـوو، سـەبارەت بـه خەزوورایـەتیش چـونکه خـاتوو ماریەی دایکی ئیبراهیمی خێزانی پێغەمبەر خەڵکی ئەوێ بوو لەوان بوو[1].

## ڕەچاوی هەست و سۆزی خێزانەکەی دەکرد:

پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی بەسەر دەکردەوە، دەیویست بزانێت ئایا لێی رازین یاخود نا؟ خاتوو عائیشه ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"من دەزانم گەر تۆ لە من رازی بیت یان لە من توڕە بیت"**، فەرمووی: **"ئەگەر لە من رازی بی ئەوا دەڵێی نەخێر بە پەروەردگاری موحەممەد، ئەگەر لێشم رازی نەبی دەڵێیت، نەخێر بە پەروەردگاری ئیبراهیم"**، خاتوو عائیشەش گوتی: بەڵێ وایە ئەی پێغەمبەری خوا لە کاتی توڕەبوون ناوت ناهێنم[2].

پێغەمبەر ﷺ لەو کەسانە نەبوو کە گرنگی بە خێزانەکانی نەدات و باکی بەوە نەبێت کە ئایا رازین لەو یان لێ توڕەن.

ئەو پێغەمبەرە گەورەیە، خەمەکانی دەوڵەتداری و جیهادکردن و ئامادەکردنی لەشکر و بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام لە جیهان و ناردنی نامە بۆ کیسرا و قەیسەر و هاوشێوەی ئەم کارانە، هەرگیز ئەمانە بەرامبەر ئافرەتەکانی سەرقاڵی نەدەکرد و هەست و سۆزی فەرامۆش نەدەکرن. ئەمە لە کوێ، لەگەڵ ئەو پیاوەی ئاگای لە هەست و سۆزی ئافرەتەکەی نییە و گرنگی پێ نادات، کە ئایا لێی رازییە یان نا، یاخود دڵخۆشە یان دڵتەنگە؟

لەو نمونانەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕەچاوی هەستی ئافرەتەکانی دەکرد ئەوەیە کە کاتێك خاتوو حەفصە، خاتوو صەفییەی عەیبدار کرد بەوەی کچی جولەکەیە، کە هەردووکیشیان خێزانی بوون، ئەو کات پێغەمبەر ﷺ بەرگری لە خاتوو صەفییە کردو بە چەند قسەیەکی خۆش دڵی دایەوە و ئارامی کردەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: خاتوو صەفییە ئەو هەواڵەی پێگەیشت کەوا حەفصە پێی گوتووە کچی جولەکە، ئینجا گریا، پێغەمبەر ﷺ هاتە لای بینی دەگری، فەرمووی: **"چی دەتگرێنێت؟"**، گوتی: حەفصە پێی گوتوومە کچی جولەکە، پێغەمبەریش ﷺ

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩٧/١٦).

[2] بوخاری (٥٢٢٨) و موسلیم (٢٤٣٩) گێراوەتیانەوە.

فەرمووی: **"تۆ کچی پێغەمبەرێکی و مامیشت پێغەمبەر بووە و خێزانی پێغەمبەرێکی، ئەو بە چی شانازی بەسەر تۆوە دەکات [١]"**.

مەبەست لە **"کچی پێغەمبەرێکی"** واتە هارونی کوڕی عیمران عليه السلام، **"مامیشت پێغەمبەرە"** واتە موسای کوڕی عیمران عليه السلام [٢].

## دڵی دەدانەوە ئەگەر بیزانیبایە خەمبارن یان نەخۆشن:

کاتێك خاتوو عائیشە رضي الله عنها لە حەجدا نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ چووە لای بینی دەگریێ، فەرمووی: **"ئەوە چیتە توشی حەیز بوویت؟"**، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: **"ئەوە شتێکە خوای پەروەردگار لەسەر کچەکانی ئادەمی نوسیوە، ئەو کارانەی حاجی دەیکات تۆش بیکە، تەنها تەوافکردن نەبێت بە دەوری بەیت..."**.

جا کاتێك لە کارەکانی حەج بوومەوە، فەرمانی بە عەبدولرەحمان کرد، کە لەگەڵم بێت لە تەنعیم عەمرە ببەستم لە جیاتی عەمرەی حەج [٣].

لەو شتانەی پێویستە لەسەر پیاوەکان بەرامبەر خێزانەکانیان ئاگایان لێبێت، ئەوەیە کاتێك بە هۆی توشبوونیان بە حەیز و نیفاس، ئەوا گۆڕانکاری بەسەر سروشتیاندا دێت و ئازار دەکێشن و توشی دڵتەنگی دێن، کە پیاو لەم حاڵەتەدا خاتری دەگرێت و ئاگای لێیەتی، ئەو کات ئافرەت تێ دەگات و زۆر منەتی پێیەتی و خۆی بەقەرزدار دەزانێت.

## ئەگەر خێزانەکانی نەخۆش بکەوتبان، پێغەمبەر ﷺ دوعای لەسەر دەخوێندن و بەدەستە بەسۆزەکەی دەستی بەسەردا دەهێنان:

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دوعای لەسەر هەندێك لە خێزانەکانی دەخوێند و بە دەستی ڕاستیش دەستی بەسەردا دەهێنان و دەیفەرموو: **"اللهم ربَّ الناس، أذهب البأسَ، اشفه وأنتَ الشافي، لا شفاءَ إلا شفاؤك، شفاءً لا يغادرُ سقماً. [٤]"**

ئەگەر پیاو دەستی دایە جێگای ئەو ئێشەی ئافرەت دەیچێژێت و سۆزی بۆ دەربڕی، ئەوا شوێنەوارێکی زۆر ئیجابی لەسەر دەروونی ئافرەت جێدەهێڵێت، ئەگەر چی با ئێشکەش لانەبات و دەردەکەش هەر بمێنێتەوە، بەڵام ئەو وا هەست دەکات کە پیاوەکەی هاوخەمیەتی و هەستی پێدەکات.

---

[١] ترمذي گێڕاوەتیەوە (٣٨٢٩)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٣٠٥٥) بە سەحیحی داناوە.

[٢] تحفة الاحوذي (١٠/٢٦٨).

[٣] بوخاری (٣١٦) و موسلیم (١٢١١) گێڕاوەتیانەوە.

[٤] بوخاری (٥٧٤٣) و موسلیم (٢١٩١) گێڕاوەتیانەوە.

یەکێك لە ئافرەتەکان کە سەرزەنشتی پیاوەکەی دەکات، وەکو لە فەرمودەی دایکی زرعدا هاتووە، بەوەی لە ئافرەتەکەی ناپرسێت، کە ئایە نەخۆشە و ئازاری هەیە یان نا؟ دەستی لەسەر جێگای ئێشەکەی دانانێت.

ئەو ئافرەتە پیاوەکەی عەیبدار دەکات بەوەی ئەم کارە ناکات، بۆیە دڵدانەوەی ئافرەت لە کاتی نەخۆشی کارێکی زۆر باش و پێویستە.

بەڵام هەندێك لە پیاوان هیچ ڕەچاوی ئەم حاڵەتانە ناکەن و دەیەوێت بەردەوام ئافرەتەکەی ساغ و سەلامەت بێت، ئەگەریش نەخۆش کەوت ئەوا دەیباتە ماڵی باوکی و بەجێی دەهێڵێت، هەتاوەکو چاك دەبێتەوە، چونکە کاتێك وای لێ دێت ناتوانێت لەگەڵیدا بێت و لەگەڵیدا دابنیشێت.

## چەند نمونەیەك لەسەر دڵدانەوەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ خێزانەکانی:

دەستهێنانی پێغەمبەر ﷺ بەسەر ڕومەتی خاتوو صەفییە ﵂ کاتێك وشترەکەی لە سەفەردا نەخۆش دەکەوێت.

خاتوو صەفییەی کچی حویەی ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ حەجی بە خێزانەکانی خۆی کرد، لە ڕێگادا پیاوێك هاتەخوارەوە، جڵەوی وشترەکانی خێزانەکانی پێغەمبەری ﷺ گرت و ویستی بە خێرایی بڕۆن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لەسەرخۆ ئەم شوشانە رابکێشە "**.

جا کاتێك ئەوان دەڕۆیشتن، وشترەکەی خاتوو صەفییە دانیشت، کە لە هەموو وشترەکانی تر بۆ سوار بوون چاکتر بوو، خاتوو صەفییە دەستی کردە گریان، پێغەمبەری خوا ﷺ هات و فرمێسکەکانی بە دەست دەسڕیەوە [1].

لەراستیدا سڕینەوەی فرمێکسی ئافرەت بە دەستی پیاوەکەی، دڵدانەوەیکەی زۆر باشە بۆی و ڕێزگرتنە لە هەست و سۆزی، لەگەڵ ئەوەی کە هۆکاری گریانەکە شتێکی ئەوەندە گرینگ نییە، ئەو بەهۆی ئەوەی وشترەکەی دانیشت گریا، کە یەکێك بوو لە باشترین وشترەکان، بەڵام لەگەڵ ئەمەدا پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بە کەم نەزانی و ڕێزی لەو هەست و سۆزی خاتوو صەفییە گرت و دڵی دایەوە.

ئافرەت جاروبار تووشی چەند کێشە و گرفتێك دەبێت، پێیوستی بە لاواندنەوە هەیە و پێویستی بەوە هەیە یەکێك ئەم شتانەی لەسەر سوك بکات و دڵی بداتەوە بۆ ئەوەی هەست نەکات بە تەنیایە و بە تەنیا ڕووبەرووی ئەم گیروگرفتانە بووەتەوە و کە سیش نییە یارمەتی بدات.

---

[1] ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٦٣٢٥)، ئەلبانی لە (الصحیحة ٣٢٠٥) بە سەحیحی داناوە.

بەڵکو پیاوی وا هەیە کاتێك خێزانەکەی توشی گرفتێك یان بەڵایەك دێت، سوکایەتی پێ دەکات.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی: **اللهم إني أُحرِّجُ حقَ الضعيفين: اليتيم والمرأة** .[1]

واتە: بە توندی هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەم کە مافی ئافرەت و هەتیوو دەخۆن، مەبەستیش لەمەدا خوا کردنە شاهێدە لە گەیاندنی ئەو حوکمە بۆیان[2].

**نەرمی نواندنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی، ئەگەر یەکێکیان دەنگی لەسەر بەرز بکاتەوە ئارام بگرێت و کاردانەوەی نەبێت:**

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێت: ئەبو بەکر ﷺ هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و مۆڵەتی لێ خواست بێتە ژوورەوە، گوێ لێ بوو عائیشە دەنگی لەسەر پێغەمبەر ﷺ بەرز دەکاتەوە، جا کە مۆڵەتی وەرگرت هاتە ژوورەوە گوتی: ئەی کچی دایکی ڕوممان ئەوە دەنگ لەسەر پێغەمبەری خوا بەرز دەکەیتەوە؟ پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا هاتە نێوانیان، کاتێك ئەبوبەکر چووە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ دەستی کرد بە ڕازیکردنی خاتوو عائیشە و قسەی خۆشی لەگەڵ کرد و فەرمووی: "**ئایە نابینی من هاتمە نێوانتان**"، پاشان ئەبو بەکر هاتەوەو مۆڵەتی خواست بینی وا پێغەمبەر ﷺ وا دەکات خاتوو عائیشە پێ بکەنێت، کە مۆڵەتی وەرگرت و هاتە ژووەرەوە ئەبوبەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە ئاشتەوایتان بەشداریم پێ بکەن، وەك چۆن لە جەنگەکەتان بەشداریتان پێ کردم[3].

بەڵکو جاری وا هەبووە یەکێکیان قسەی لەگەڵ نەکردووە، تاوەکو شەویش ئارامی گرتووە، هەورەکو عومەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئێمە تاقمی قوڕەیشی بەسەر خێزانەکانمان زاڵ بووین، جا کاتێك ڕۆیشتین بۆ لای ئەنسارییەکان ئەوان تاقمێك بوون ئافرەتەکانیان بەسەریاندا زاڵ بوون، جا ئافرەتەکانی ئێمەش تێکەیشتن و بە ئاگا هاتنەوە و ئەو ئەدەبە لە ئافرەتی ئەنسارییەکان فێر بوون. جارێکیان خێزانم دەنگی لەسەرم بەرز کردەوە دواتر هات بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکەین، منیش ڕەتم کردەوە، گوتی: تۆ ڕەتی دەکەیەوە قسەم لەگەڵ بکەی، سوێند بە خوا خێزانەکانی پێغەمبەر بەو شێوەیە دەکەن و جاری وا هەیە یەکێکیان هەتا شەو قسەی لەگەڵ ناکەن، عومەر دەڵێت: منیش

---

[1] ئیبن ماجە گێڕاوەتیەوە(٣٦٧٨)، ئەلبانی لە (الصحيحة ١٠١٥) بە سەحیحی داناوە.

[2] حاشية السندي على سنن ابن ماجة (٨٣/٧).

[3] ئەحمەد گێڕاوەتیەوە(١٧٩٢٧)، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٩٠١) بە سەحیحی داناوە.

دەرچووم و چومە لای حەفصە و گوتم: تۆ وا دەکەی؟ گوتی: بەڵێ، گوتم ئایە کەستان هەیە تاوەکو شەو قسەی لەگەڵدا نەکات؟ گوتی: بەڵێ[1].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە توندوتیژی لەگەڵ ئافرەت شتێکی خراپ و ڕەوشتێکی ناڕەوایە، چونکە پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی ئەنسارییەکانی لەگەڵ ئافرەتەکاینان پێ باشتر بوو، بۆیە قبوڵی کردووە و نەریتی قەومەکەی خۆی واز لێ هێناوە.

هەروەها ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئارامگرتن بەرامبەر ئافرەتان و چاپۆشی کردن لە هەڵەکانیان و لێخۆشبوونیان لەو هەڵانەی بەرامبەر مافی پیاو دەیکەن، نەوەك لەو هەڵانەی لە مافی پەروەردگار دەیکەن[2].

## مامەڵەی باشی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی گەیشتە ئەو سنورەی لە کاروباری ماڵەوە یارمەتیان بدات:

ئەسوەد ؓ دەڵێت: پرسیارم لە خاتوو عائیشە کرد ؓ کە پێغەمبەر ﷺ چی دەکرد لە ماڵەوە؟ گوتی: خزمەتی ماڵ و مناڵەکەی دەکرد و یارمەتی دەدان لە کاروباری ماڵەوە، ئەگەر کاتی نوێژیش هاتبایە دەچووە دەرەوە بۆ نوێژ[3].

ئەم جۆرە ڕەوشتەی پێغەمبەر ﷺ لە خزمەتکردن بە ریواتێکی تر هاتووە: (ئەو هەر مرۆڤێك بووە لە مرۆڤەکان، سەیری جلوبەرگی خۆی دەکرد کە ئایا خاوێنە یان پیسە و مەڕەکەی خۆی دەدۆشی و خۆی خزمەتی خۆی دەکرد)[4].

هەروەها پێشەوا ئەحمەد ؒ ئەم فەرمودەیەی گێراوەتەوە بە بێژەی "ئەو جلوبەرگی خۆی دەدوری و نەعلەکانی خۆی ریزدەکرد و ئەوەی دەکرد کە پیاوەکان لە ماڵەکانیان دەیکەن"[5].

ئەمرۆ کەسانێك هەنە کاروباری زۆر قورس دەخەنە سەر شانی خێزانەکانیان لە تاقەتیدا نییە هەڵیبگرێت، لەوانەیە بیبینێت ماندووە و نەخۆشە بەڵام هەر بە خەیاڵیشدا

---

(1) بوخاری (٨٩) و موسلیم (١٤٧٩) گێراوەتیانەوە.

(2) فتح الباری (٩/٢٩١).

(3) طرح التشریب (٩/٥٣)

(4) بوخاری لە (الادب المفرد ٥٤١) و ترمذي لە (الشمائل ٣٤٣) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحیح الجامع ٤٩٩٦) بە سەحیحی داناوە.

(4) رواه الامام احمد (٢٤٣٨٢) وصححه الالبانی في صحیح الجامع (٤٩٣٧).

نایەت و یارمەتی نادات لە کاروباری ماڵەوە، ئەمەش لە ڕاستیدا مامەڵەیەکی باش نییە لەگەڵ ئافرەت، بە باشە لە قەڵەم نادرێت.

## پێغەمبەر ﷺ بۆ سواربوونی پشتی وڵاخ یارمەتی خێزانەکانی دەدا:

کاتێك خاتوو صەفییە ویستی سواری وشتر بێت، ئەنەس دەڵێت: بینیم پێغەمبەر ﷺ بە عەباکەی پەنای لێ دەکات و دایدەپۆشێت، پاشان چۆکی خۆی بۆ بڵند کرد، صەفییەش پێیەکانی لەسەر چۆکی دانا و تا سەرکەوتە سەر پشتی وشترەکە [1].

ئەوە پێغەمبەری خوایە،کە چۆکی ئامادەکات و ڕادەخات بۆ ئەوەی ئافرەتەکەی پێی لەسەر دابنێت و سواری وشتر بێت ئەمەش لە ڕاستیدا ئەوپەڕی ملکەچی و بەزەیی و چاکەیە لە جوڵانە و مامەڵەی باش لەگەڵ ئافرەتدا.

## پێغەمبەر ﷺ گرنگی بە پاك و خاوێنی خۆیی و بۆنخۆشی خۆی دەدا:

پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بهاتبایەوە ماڵەوە ئەوا یەکەم جار سیواکی دەکرد، تاوەکو خێزانەکەی بۆنی ناخۆشی لێ نەکات.

شورەیحی کوڕی هانی دەڵێت: پرسیارم لە خاتوو عائیشە کرد، کە پێغەمبەر ﷺ بهاتبایەوە ماڵەوە یەکەم جار چی دەکرد؟ گوتی: سیواکی دەکرد [2].

حیکمەتیش لەمەدا ئەوەیە، کە لەوانەیە بۆنی دەمی مرۆڤ لە کاتی گفتوگۆکردن لەگەڵ خەڵکی ناخۆش بێت جا لە مامەڵەی باشی لەگەڵ ئافرەتان ئەوەیە کاتێك گەڕایەوە ماڵەوە ئەو بۆنە ناخۆشە لابەی [3].

زۆریش موکڕبوو لەسەر پاك و خاوێنی دەم و ددانی کە لە خەو هەڵدەستا، خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە خەوی ڕۆژ یا شەو بە ئاگا بهاتبایەوە ئەوا پێش ئەوی دەستنوێژ بشوات سیواکی دەکرد [4].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەردەوام بوونی لەسەر سیواکردن، چونکە بەردەوام دەم بە هۆی هەڵمی ناخۆش و خواردن و خواردنەوە بۆنی دەگۆڕی و ناخۆش دەبێت [5].

---

[1] بوخاری (٢٨٩٣) و موسلیم (١٣٦٥) گێڕاوەتیانەوە.
[2] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٢٥٣).
[3] حاشیة السیوطي علی سنن النسائي (١٠/١).
[4] ئەبو داود گێڕاوەتیەوە(٥٧) ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٤٨٥٣) بە حەسەنی داناوە.
[5] المفهم (١٣٦/٣).

ابن القيم رحمه الله دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ زۆر حەزی لە سیواك کردن بوو، سیواکی دەکرد لە کاتێك بە ڕۆژوو بوو یاخود بە ڕۆژوو نەبوو، هەروەها لە کاتی هەڵسان لە خەوو دەستنوێژگرتن و چوونە ماڵ، بە داری ئاراکیش سیواکی دەکرد ).[1]

بە ڕاستی ڕاگرتنی پاك و خاوێنی کارێکی گرینگە لە ژیانی هاوسەرایەتی، ئەمڕۆش دەبی ئەوە بزانین کە یەکێك لە هۆیەکانی تەڵاقدان لەدادگاکانی ئەمڕۆ کە بەرز دەکرێتەوە : گرینگی نەدانی یەکێکە لە هاوسەرەکان بە پاك و خاوێنی دەم و ددانی خۆی.

## پێغەمبەر ﷺ موکڕ بوو لەسەر ئەوەی کە تەنیا بۆنی خۆشی لێوەبێت:

ئیبن عەبباس رضي الله عنه دەڵێت: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆری پێ ناخۆش بووبێت، ئەوە بوو کە بۆنێکی ناخۆشی لێوە بهاتبایە [2].

یەکێك لە ڕەوشتە بەرزەکانی خۆ بۆن خۆشکردن بووە، کە ئەم کارەی خۆش دەویست و زۆر ئەنجام دەدا، بەڵکو یەکێك بووە لە کارە خۆشەویستەکانی، هەروەکو فەرموویەتی: "**لە دونیادا ئەوەی خۆشم بوێت ئەوا ئافرەت و خۆ بۆن خۆشکردن و نوێژە، کە گلێنەی چاومە** ".[3]

بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لە شتە حەڵاڵەکانی واز لێهێناوە لەبەر بۆنە ناخۆشەکەی.

ئەمە لە کوێ، لەگەڵ ئەو کەسەی دەچێتە لای ئافرەتەکی و بۆنی جگەرەی لێدێت، ئافرەتەکەش لەوانەیە بە باشترین بۆن خۆی بۆن خۆشکردبێت، لە کاتێکدا پیاوەکەی بۆنی ناخۆشی لێدێت!

## پێغەمبەر ﷺ خۆی بۆ ئافرەتەکانی دەڕازاندنەوە و خۆی جوان دەکرد و پرچی شانەدەکرد:

بەوەش فەرمانی بە هاوڵەکانی دەکرد و دەیفەرموو: "**ئەوەی پرچی هەیە با گرینگی پێ بدات**[4]".

واتە (باجوانی بکات، پاکی بکات: بە شوشتن و چەورکردن و داهێنان، لێنەگەڕێت ئاڵۆز بێت، چونکە پاك و خاوێنی ڕووجوانی کارێکی خۆشەویستە...).[5]

---

[1] زاد المعاد (١/١٦٧).

[2] بوخاری (٦٩٧٢) و موسلیم (١٤٧٤) گێراوەتیانەوە.

[3] نسائی گێراوەتیەوە(٣٩٣٩)، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٣١٢٤) بە سەحیحی داناوە.

[4] ئەبو داود گێراوەتیەوە(٤١٦٣)، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٦٤٩٣) بە سەحیحی داناوە.

[5] عون المعبود (٩/١١٨٣).

پێویستە پیاو بۆ خێزانەکەی خۆی جوان بکات و پاك و خاوێن بێت، ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت"من حەزم لێیە بۆ ئافرەتەکەم خۆم جوان بکەم، وەك چۆن حەزم لێیە ئافرەتەکەم خۆم بۆ جوان بکات، چونکە پەروەدگار دەفەرموێت ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ﴾ البقرة: ٢٢٨

**پرچی شانەدەکرد و دایدەهێنا:**

سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ﷺ دەڵێت: پیاوێك بینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵدا شتێکی لە دەستە وەك شانە پرچی خۆی پێ شانە دەکا..[1]

جاروباریش دەیفەرمووە خێزانەکانی بۆ ئەوەی پرچی بۆ شانە بکەن، خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئیعتیکافی بکردبایە ئەوا سەری خۆی نزم دەکرەوە بۆ ئەوەی شانەی بکەم[2].

هەروەها سەریشی دەشوشت، هەروەکو دەڵێت: کاتێك من زەیستانی بووم سەری پێغەمبەری خوام دەشوشت[3].

گرینگی دانی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەموو هۆکارەکانی پاك و خاوێنی، زۆر دیارو ئاشکران و هەموو ئوممەتیشی لەسەر ئەمە هانداوە و بۆ ئەوەی مرۆۀ لەسەر بارێکی باش و جوان و رێکوپێك دەربکەوێت.

**پێغەمبەر ﷺ زۆر بە نەرمونیان و لەسەرخۆیی مامەڵەی لەگەڵ خێزانەکانی دەکرد:**

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی نەرم و لەسەر خۆبوو....

ئەگەر ئەمڕۆ بڕوانین، دەبینین کە نێوانی ژن و مێرد بریتییە لە کێشە و ڕقەبەرایەتی و ململانێ لەسەر هەموو شتێك.

**پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بە خێزانەکانی دەدا سەیری یاری حەلاڵ بکەن:**

عائیشە ﷺ دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، ناکاوێك گوێمان لە غەڵبەغەڵبی منداڵان بوو، پێغەمبەر ﷺ هەستایەوە و بینی حەبەشیەکان بە ڕمەکانیان یاری دەکەن، فەرمووی: **"عائیشە وەرە تەماشا بکە"**، منیش هەڵسام چەناگەم لەسەر شانی پێغەمبەر ﷺ دانا، لە نێوان شان و سەری پێغەمبەر سەیرم دەکرد، تا فەرمووی:

---

(١) بوخاری (٥٩٢٤) و موسلیم (٢١٥٦) گێڕاوەتیانەوە.

(٢) بوخاری (٢٠٢٩) و موسلیم (٢٩٧) گێڕاوەتیانەوە.

(٣) بوخاری (٣٠١) و موسلیم (٢٩٧) گێڕاوەتیانەوە.

**"ئایا تێر نەبووی؟ ئایا تێر نەبووی؟"**، منیش دەمگوت: نەخێر، دەمویست ئەوە بزانم کە پلەوپایەم لەلای ئەو چەندە [١].

هەر ئەو فەرمودەیە لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە کە خاتوو عائیشە دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا پەلە مەکە، پێغەمبەریش ﷺ دووبارە منی بڵندکردەوە بۆ ئەوەی سەیریان بکەم، پاشان پێی گوتم: **"بەسە"**، گوتم: پەلە مەکە، مەبەستیشم زۆر ئەوە نەبوو تەماشایان بکەم، بەڵام حەزم دەکرد ئافرەتان بزانن کە پلەوپایەی من لەلای پێغەمبەر ﷺ چەندە [٢].

مامەڵەی باش ئەوەیە، کە مرۆڤ لە شتی حەڵاڵ و پەسەند رێگە بە خێزانەکەی بدات نەوەك لە شتی حەرام، هەروەها ئارامگرتن لەسەر ڕەوشتی ئافرەتان لەو یاریانەی حەرام نین، ئەگەر چی با خۆی حەزی لەوە نەبێت کە خێزانەکەی حەزی لێیەتی [٣].

## پێغەمبەر ﷺ ڕێگر نەبووە لەوەی خێزانەکەی گوێ لە گۆرانی حەلاڵ بگرێت:

خاتوو عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە ودوو جارییە لەلام بوون گۆرانیان دەگوت، ئەو گۆرانیانەی بۆ رۆژی (بوعاث) گوتراوە، -بوعاث رۆژێکە کە جەنگێك تێیدا لە نێوان ئەوس و خەزرەج ڕوویداوە- جا پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگاکەی پاڵیدایەوە و ڕووی وەرگێڕا، لەو دەمە ئەبوبەکر ﵁ هاتە ژوورەوە و سەرزەنشتی کردم و گوتی: دەنگی شەیتان لەماڵی پێغەمبەری خوایە؟! پێغەمبەریش ﷺ ڕووی لە ئەبوبەکر کرد و فەرمووی: **"لێیان گەڕێ"**، کاتێکیش کە ئاگای لە دەورووبەری نەما ئاماژەم بۆ کردن بۆ ئەوەی بچنە دەرەوە، جا چوونە دەرەوە، ئەو ڕۆژەش جەژن بوو [٤].

**ئیبن حەجەر دەڵێت:** ئەو فەرموودەیە چەند سودێکی تێدایە لەوانە:

ڕێگەپێدانی خێزان لە ڕۆژانی جەژن بۆ ئەو هۆکارانەی دەبێتە مایەی دڵخۆشی و کامەرانیان و حەسانەوی جەستە و گیانیان... هەروەها نەرمی نواندن لەگەڵ ئافرەت و ڕازی کردنیان [٥].

---

[١] ترمذي گێراوەتیەوە(٣٦٩١) ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، ئەسڵی فەرمودەکە لە بوخاری (٤٥٥) و موسلیم (٨٩٢).
[٢] النسائی لە (الكبری ٨٩٥١) گێراوەتەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٣٢٧٧) بە سەحیحی داناوە.
[٣] شەرحی سەحیحی بوخاری ابن بطال (٣/٢٩٨).
[٤] بوخاری (٩٥٠) و موسلیم (٨٩٢) گێراوەتیانەوە.
[٥] فتح الباری (٢/٤٤٣).

پێغەمبەر ﷺ لە کاتی جەژن و خۆشیدا ڕێگەی بە خێزانەکانی دەدا بۆ ئەوەی لە جەژنەکان و ئاهەنگی ژن گواستنەوە دەف لێبدەن و گۆرانی بڵێن.

بەڵام کاتێك وڵاتی فارس و ڕۆم رزگار کران، بۆ هاوەڵان ئاشکرا بوو کە وا ئەهلی فارس و ڕۆم لە چ جۆرە گۆرانییەکی بە مۆسیقا راهاتوون کە وەسفی شتە قەدەغەکراوەکانی دەکرد وەك عەرەق خواردن و هاوشێوەی.. هەروەها ئەو وێنانەی کە ئارەزوو جوڵێنن و ئەو ئامێرە مۆسیقایانەی کە خەڵکی بە لەنجە و لار دەهێنا، لێرەدا هاوەڵان بە توندی ئەوەیان قەدەغەکرد و ڕێگریان کرد لەوەی خەڵك گوێ بۆ ئەو جۆرە گۆرانیانە بگرێت.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان تێگەیشتن لەوەی ئەو گۆرانیانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگەی پێداون ئەو گۆرانیانە نینە و ئامێرەکانیش ئەو ئامێرە نین و جیاوازن، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بەوەدا کە لەو سەردەمە هەبوون لە ناو عەرەب بە کاریان دەهێنا و لەسەری ڕاهاتبوون. بەڵام گۆرانی بێگانە و عەجەم، کە مۆسیقای لەگەڵە ئەوە ڕێگەی پێنەدراوە، ئەگەر چی با ناوی گۆرانیشی لێ بنرێت، چونکە نێوانی ئەو دوو جۆرە گۆرانیە زۆر ڕوون و ئاشکرایە و هەموو کەسێکی ژیر لێکیان جیا دەکاتەوە، چونکە گۆرانی ئەوان شەهوەت بزوێنە و سروشتی مرۆڤ دەگۆڕێت و بانگەشە بۆ گوناه دەکات.

گۆرانی ئەعرابیەکانیش ئەوەی ڕێگەی پێدراوە هیچ کاتێك لەو خراپیانەی تێدانییە.. ئەو کەسەش کە قیاسی ئەو گۆرانیە لەسەر ئەویتر بکات ئەوا زۆر بەهەڵەدا چووە و قیاسەکەی قیاسێکی ناڕەوا و پوچە و دوورە لە ڕاستی [1].

ئەو یاریەی پێغەمبەری خوا ﷺ حەڵاڵی کردووە بۆ خێزانەکەی بۆ ئەوەی گوێی لێبگرێت، ئەوا یارییەکی پاك و چێژێکی حەڵاڵە.

مامەڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خێزانەکەی هەر ئەوە نەبووە، بەڵکو چەند جارییەکی بۆ بانگ دەکرد بۆ ئەوەی یارییان لەگەڵ بکات و هەرگیز ڕقی لەم جۆرە میوانانە نەدەبۆوە.

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: لەلای پێغەمبەر ﷺ یاریم بە بوکەڵە دەکرد، چەند دەستە خوشکێکیشم هەبوون یاریان لەگەڵ دەکردم، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بهاتبایە ژوورەوە، ئەوان خۆیان لە پشت پەردەوە دەشاردەوە و گۆرانیان دەگوت، پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی دەدا کە یاریم لەگەڵ بکەن [2].

---

[1] فتح الباری (٦/٧٨).

[2] بوخاری (٦١٣٠) و موسلیم (٢٤٤٠) گێڕاوەتیانەوە.

پێشەوا نەوەوی دەڵێت: (ئەمەش لە میهرو نەرمی و خۆش مامەڵە کردنی پێغەمبەرە ﷺ).[١]

دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە یاری بەو بوکەڵانە دەکرد کە شێوەیان هەبوو، پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵیدا پێدەکەنی و گاڵتەی لەگەڵ دەکرد. خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبوك یان خەیبەر هاتەوە، لە پێش دەرگا پەردەیەك هەبوو، جا بایەك هەڵیکردوو چەند یارییەکی عائیشە لە بوکەڵە و شتی تر دەرکەوت، فەرمووی: "**عائیشە ئەمە چییە؟**"، گوتم: ئەوانە کچی منن. جا لە نێوان یارییەکان ئەسپێك هەبوو دووباڵی پێوە بوو، فەرمووی: "**ئەی ئەمە چییە لە ناوەڕاستیان دایە؟**"، گوتم: ئەوە ئەسپە، فەرمووی: "**ئەی ئەوە چییە پێیەوە نوساوە؟**"، گوتم: دووباڵن، فەرمووی: "**ئەسپێك دوو باڵی هەیە!**"، گوتم: ئەی گوێت لێ نەبووە کە سولەیمان ئەسپێکی هەبوو خاوەن دووباڵ بووە؟ جا پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تاوەکو ددانەکانی دواوەی دەرکەوت[٢].

ئەم پێکەنینە چەند خۆشی و شادی خستە دڵی خێزانەکەی، چەند ئەو یارییە شوێنەواری باشی لەسەر هەستەکانی جێهێشت.

بەڵکو پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی لەسەر ئەم جۆرە هەڵسوکەوتە هانداوە، چونکە ئەم کارە دەبێتە مایەی خۆشەویستی و دڵخۆشی دەکات، پێغەمبەر ﷺ بە جابری کوڕی عەبدوڵڵای فەرموو کە هاوسەرگیری کرد! "**بۆ کچێکت نەهێنا بۆ ئەوەی یاری لەگەڵ یەکتری بکەن**[٣]".

**هەروەها فەرموویەتی: "هەر شتێك بەدەر بێت لە یادی خوا ئەوە لەهووە، تەنیا ئەو چوار شتانە نەبێت: ڕۆیشتنی پیاو لە نێوان (الغرضين)** – واتە ڕۆیشتنی پیاو لە نێوان ئەو ئامانجەی تیرهاوێژان تیری تێدەگرن– **هەروەها مەشق پێکردنی ئەسپەکەی و یاریکردن لەگەڵ ئافرەتەکەی و مەلەوانی**".[٤]

یاری کردن و پێکەنین، هاوسەران دڵەکان خۆش دەکات و ماڵ پڕدەکات لە خۆشەویسەتی و پەیوەندی هاوسەرگیری پتەو دەکا و سۆز و خۆشەویستی نێوانیان قوڵتر دەکاتەوە.

(لە ڕاستیدا هەر یاریکردن و گاڵتەکردن دڵی ئافرەتان خۆش دەکات)[٥].

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/٢٠٥).

[٢] ئەبو داود گێراوەتیەوە(٤٩٣٢)، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[٣] بوخاری (٢٠٩٧) و موسلیم (٧١٥) گێراوەتیانەوە.

[٤] الطبراني لە (الكبير ١٧٨٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب ١٢٨٢) بە سەحیحی داناوە.

[٥] موعظة المؤمنين (ص ١٦٨).

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەگەڵ ئەوەی کەسێکی توند بووە، دەڵێت: پێویستە پیاو لەگەڵ خێزانەکەی وەك منداڵ بێت، ئەگەر ئەو شتەی لەلا دەستکەوت، ئەوە پیاوی بەدەست کەوتووە [1].

ثابتی کوڕی عەبید دەڵێت: زەیدی کوڕی ثابت ﷺ لە هەموو کەس قسە خۆشتر بووە لە ماڵەوە، ئەگەریش هاتبایە دەرەوە ئەوا پیاوێك بوو لە پیاوەکان.

ژنە ئەعرابیەکیش باسی مێردەکەی دەکات کە مردبوو، بەوەی مێردەکەی کە دەهاتەوە ماڵەوە زۆر دەم بە پێکەنین بوو، کاتێکیش دەچووە دەرەوە زۆر کەم بڵێ بوو، چی هەبووایە دەیخوارد و پرسیاریشی لەو شتە نەدەکرد کە بە دەستی نەدەکەوت [2].

زۆر کەسیش هەنە کاتێك لەگەڵ هاوڕێکانی دایە زۆر پێدەکەنێت و گاڵتە دەکات، بەڵام کە دێتە ماڵەوە ئەم پێکەنین و گاڵتەوگەپە بزر دەبێت و ڕووی گرژ دەبێت و نێوچەوانی لۆچی تێدەکەوێت.

## پێغەمبەر ﷺ پێشبڕکێی غاردانی لەگەڵ خێزانەکانی دەکرد:

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: لە چەند سەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوومە، من ژنێکی جەستە سوکەڵە بووم، هێشتا جەستەم ئەوەندە گۆشتی نەگرتبوو، جا بە خەڵکی فەرموو: **"وەرنە پێشەوە"** پاشان فەرمووی: **"وەرە با پێشبڕکێت لەگەڵ بکەم"**، منیش لەگەڵم کرد و لێم بردەوە، ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشت ئەم قسەیەی نەکرد تا من جەستەم گۆشتن بوو، ئەمەم لەبیرچوو بۆوە، جارێکیتر لەگەڵی دەرچووم بۆ سەفەر، جا بە خەڵکەکەی فەرموو: **"وەرنە پێشەوە"**، ئەوانیش هاتنە پێشەوە، پاشان بە منی فەرموو: **"وەر با پێشبڕکێ بکەین"** منیش پێشبڕکێم لەگەڵ کرد و ئەم جارەیان لێی بردمەوە، جا پێکەنی و فەرمووی **"ئەمە لە جیاتی ئەوەی پێشوو"**.[3]

ماناکەشی ئەوەیە، ئەم نۆرەیە پێش تۆ کەوتم، ئەوە لە جیاتی ئەو نۆرەیە بوو کە پێشم کەوتی.

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سەرقاڵ بوونی بە زۆر کاروبارەوە، ڕەچاوی باری خێزانەکانی دەکرد، ئەم جۆرە کارانەی بۆ دڵخۆشکردنیان دەکرد، ئەمڕۆ زۆرێك لەئێمە ئەمەمان پێ شەرمە، ئەگەرچی با لە بیابانێکی چۆڵ بێت و کەسیش دیار نەبێت!! بەڵکو هەندێك کەس تووشی شەرمەزاری دێت ئەگەر لەگەڵ ئافرەتەکەی بڕوات، ئەمە چ جای پێشبڕکێ کردن لەگەڵی!

---

[1] المجالسة وجواهر العلم (٣/٤٣٠).

[2] موعظة المؤمنين (ص١٥٦).

[3] ئەحمەد (٢٥٧٤٥) و ئەبو داود (٢٥٧٨) و ئیبن ماجە (١٩٧٩) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ١٣١) بە سەحیحی داناوە.

**پێغەمبەر ﷺ ئەگەر خێزانەکانی لەگەڵ خۆیدا ببردبایە سەفەر، تا درەنگانی شەو لەگەڵیاندا شەونخونی دەکرد و قسەیان دەگۆڕیەوە:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر دەرچووبایە ئەوا تیروپشکی لە نێوان خێزانەکانی دەکرد، -جارێك تیروپشکەکە بۆ عائیشە و حەفصە دەرچوو- ئێمە لەگەڵیدا ڕۆیشتن، پێغەمبەر بەشەو لەگەڵ عائیشە پیاسەی دەکرد و قسەی لەگەڵ دەکرد، حەفصەی بە عائیشەی گوت: ئەمشەو وەرە سواری وشترەکەی من بە، منیش سواری وشترەکەی تۆ دەبم و جا بڕوانە و منیش دەڕوانم؟ گوتی: بەڵێ. جا عائیشە سواری وشترەکەی حەفصە بوو، حەفصەش سواری وشترەکەی عائیشە بوو، پێغەمبەریش بۆ لای وشترەکەی عائیشە هات، بەڵام حەفصەی لەسەر بوو، سەلامی لێکردو پاشان لەگەڵیدا ڕۆیی هەتا دابەزی، عائیشە بە دوایاندا ڕۆیشت، غیرە گرتی، جا کە دابەزی قاچەکانی لەناو دڕکوداڵ دانا و دەیگوت: خودایە دوو پشکێك یان مارێك ڕەوانە بکە بۆ ئەوەی پێمەوە بدات و ئەوەش پێغەمبەرەکەتە لەگەڵ حەفصەیە ناشتوانم هیچی بۆ باس بکەم [(١)].

ئەوەی عائیشە گوتی، غیرە لە رادە بەدەرەکەی بووە بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ، مەسەلەی غیرەش شتێکە قەڵەمی لێبوردەیی بەسەردا هاتووە.

**پێغەمبەر ﷺ داوای لەو کەسە دەکرد کە وشترەکانی لێ دەخوڕی، هێواش بێت، نەوەك خێزانەکانی لەبەر خێرا ڕۆیشتنیان ئازار بچێژن:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە سەفەرێکدا بوو، گەنجێکی ڕەشتاڵە پێ دەگوترا (ئەنجەشە) گۆرانی بۆ وشترەکان دەگوت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"ئەنجەشە بە هێواشی وشترەکان لێبخوڕەو ئاگات لەو شوشانە بێت"**.[(٢)]

زانایان دەفەرمون: بۆیە ئافرەتانی ناوناوە شوشە، چونکە عەزیمەتیان لاوازەو وەکو شوشە ناسکن بۆ شکان و زوو دەشکێن. وشترین ئەگەر گوێی لە گۆرانی و حەیران بێت خێرا دەڕوات و چێژ وەردەگرێت، بەمەش سەرنیشینەکەی بێزار دەکات، جا پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کرد ئەوە بکات، چونکە ئافرەتان بە جوڵەیەکی زۆر بێزار دەبن و مەترسی ئەوەی لێدەکرێت بکەونە خوارەوە [(٣)].

---

(١) بوخاری (٥٢١١) و موسلیم (٢٤٤٥) گێڕاوەتیانەوە.

(٢) بوخاری (٦١٦١) و موسلیم (٢٣٢٣) گێڕاوەتیانەوە.

(٣) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٨١/١٥).

**پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی بە یاری و گاڵتەکردن لە نێوان خێزانەکانی دەدا و بە هۆیەوەش پێدەکەنی:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: ڕۆژێك سەودە سەردانی کردین، پێغەمبەریش ﷺ لە نێوان من و ئەو دانیشت و قاچێکی لە کۆشی من بوو، ئەوی تری لە کۆشی سەودە بوو، جا مەرگەیەکم لە ئارد و ڕۆن و ئاو بۆ دروست کرد، پێم گوت: بیخۆ، ئەویش نەیخوارد، گوتم: سوێند بە خوا دەیخۆی، یان لە دەم و چاوت هەڵدەسووم، ئەویش هەرنەیخوارد، منیش لەناو قاپەکە هەندێك لە مەرگەیەکەم دەستدایێ و بەدەم و چاویمدا هێنا. پێغەمبەریش ﷺ پێکەنی و ڕانی بۆ ڕاخست و بە سەودەی فەرمووی: **"تۆش دەموچاوی وا لێ بکە"**، ئەویش دەموچاومی والێکرد، پێغەمبەر ﷺ دووبارە پێکەنی. لەناکاو عومەر گوتی: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، پێغەمبەریش ﷺ بە ئێمەی گوت: **"هەڵسن دەموچاوتان بشۆن، ئەوە عومەرە دەیەوێت بێتە ژوورەوە"**.[1]

ئەگەر ئەمە لە ڕۆژگاری ئێمەدا ڕوویدات، پیاویش لە نێوانیان ئامادە بێت، ئەوا لەوانەیە تەڵاقیان بدات، ئەمەش بە هۆی نەزانینی بە هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی، کە یاری و گاڵتەی لەگەڵ دەکردن و بەوهۆیەوە پێ دەکەنی.

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ عائیشەی لە هەموو ان زیاتر خۆشدەویست، بەڵام لە ڕواڵەتدا و لە پێش چاواندا ئەمەی بە دەرنەدەخست، بەڵکو یارمەتی خێزانەکەی تریدا بۆ ئەوەی دەموچای عائیشە بە خواردنەکە سواق بدات، ئەوەی پێغەمبەریش گەرەکی بوو هاتەدی و دانیشتنەکەش کەشوهەوایەکی خۆش و پڕ پێکەنی بە خۆیەوە بینی.

**گوێی بۆ خێزانەکانی دەگرت، کاتێك قسەی خۆش و گاڵتەیان دەکرد:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، ئەگەر چووی بۆ دۆڵێك، درەختێکی لێ بوو، لێی خورابوو، درەختێکی تریشت بینی لێی نەخورابوو، لە کامەیان وشترەکەت دەلەوەڕێنی؟ فەرمووی: **"لەوەی کە لێ نەخوراوە"**، ئەمەش مانای ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ بێجگە لە عائیشە کچی تری نەهێناوە[2].

---

[1] نسائی لە (سنن الکبری ٨١٩٧) گێراوەتیەوە، ئەبوبەکری الشافعی لە (الفوائد ١١٢)، العراقی لە (تخریج الاحیاء ١٦٨٢/٣) دەڵێت: سەنەدەکەی باشە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٣١٣١) بە سەحیحی داناوە.

[2] بوخاری گێراوەتیەوە(٥٠٧٧).

## لەو نمونانەی، کە یاری و گاڵتەکردنی تێدابوو:

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لە ناشتنی تەرمێك لە بەقیع گەڕایەوە، منیش سەر ئێشەیەکم گرتبوو دەمگوت: وای سەرم، فەرمووی: **"بەڵکو من وای سەرم، تۆ چ زەرەر دەکەی گەر پێش من بمریت، دەتشۆم و کفنت دەکەم، پاشان نوێژت لەسەر دەکەم و دەتنێژم؟"**، گوتم: وا دیارە پێشت خۆشە من بمرم و پاشان لە ماڵەکی من لەگەڵ خێزانەکانی تر رابوێری، جا پێغەمبەر بەم قسەیە پێکەونی و پاشان ئەو نەخۆشییەی دەست پێکرد کە پێی وەفاتی کرد. [1]

**لایەنی دووەم: پەروەردەکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ خێزانەکانی: بۆ ئەوەی ببنە پێشەنگ بۆ ئافرەتانی موسڵمانان:**

لەگەڵ ئەو یاری و گاڵتەنەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی ئەنجامی دەدا، ئەوا لەلایەکی ترەوە پێغەمبەر ﷺ سووربووە لەسەر پەروەردەکردنیان، بۆ ئەوەی ببنە نمونەیەکی باڵا بۆ ئافرەتانی تر، لەو بوارەدا وەك مێردێکی بەرپرسیار بەرامبەر خێزانەکانی ئەم کارەی دەکرد، هەروەکوو فەرموویەتی **"بێگومان الله لە هەموو بەرپرسێك پرسیار دەکات لەوەی لەژێر دەستی داینێاوە، کە ئایا پارستوویەتی یان بە فیرۆی داوە؟ هەتاوەکو پرسیار لە پیاو دەکا لەمەڕ خێزانەکەی"**. [2]

ئیبن عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **"ئێوە هەمووتان بەرپرسن، هەموو بەرپرسێکیش بەرپرسیارە لەوەی لەژێر دەستی دایە، ئەمیر و گەورەی خەڵك بەرپرسیارە لە خەڵك و گەلەکەی، پیاویش بەرپرسیارە لە خێزانەکەی و شوانە بەسەریانەوە"**. [3]

پیاو بەرپرسیارە لە فێرکردنی خێزانەکەی و ئاڕاستەکردنی بەرەو پەروەردەیەکی ڕاست و دروست، زۆربەی ئافرەتان کە تووشی تاوان و سەرپێچی بوون، بەهۆی کەمتەرخەمی پیاوەکانیان بووە لە فێرکردنیان بۆ کاروباری ئایینەکەیان.

---

[1] ئەحمەد (٢٤٧٢٠) و ئیبن ماجە (١٤٦٥) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (سنن ابی ماجە ١٤٦٥) بە سەحیحی داناوە، لە بوخاریدیش هاتووە (٥٦٦٦).

[2] نسائی لە (سنن الکبری ٩٨٧٤) لە ئەنەسی کوڕی مالیك گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٩٦٣٦) بە سەحیحی داناوە.

[3] بوخاری (٨٩٣) و موسلیم (١٨٢٩) گێراوەتیانەوە.

**پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی ڕادەهێنا لەسەر پەرستن و نزیکبوونەوە لە پەروەردگار لە ڕێگەی ئەنجامدانی سوننەتەکانەوە:**

دایکی سەلەمەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: شەوێك پێغەمبەر ﷺ بە پەشۆکاوی لە خەو راپەری و فەرمووی: "**سبحان الله پەروەرگار چ خێر و بەرەکەتێکی دابەزاندووە، هەروەها چ فیتنە و تاقیکردنەوەیەکی دابەزندووە، کێ هەیە خاوەن[1] ماڵەکان بە ئاگا بهێنێتەوە بۆ ئەوەی هەڵسن نوێژ بکەن، لە دونیا زۆر داپۆشراو هەیە بەلام لە دوارۆژدا ڕووتە**".[2]

جا کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی کەوت بەو هەموو خێر و بەرەکەتی خوای گەورە ناردیتیە خورەوە، لەگەڵ ئەو هەموو شەڕ و ئاشوب و فیتنەیە، ئەوا بەسەرسامییەوە لە خەوەکەی ڕاپەڕی و ڕاچڵەکی لەبەر زۆری ئەو هەموو چاکە و خێر و زۆری شەڕ و ئاشوب و فیتنەیە.

سەروسوڕمانی خۆی لە بێ ئاگایی مرۆڤ دەربڕی کە بێئاگایە بەرامبەر کردنەوەی دەرگای خێر و چاکە، هەروەها کردنەوی دەرگای فیتنە و ئاشوب، کە پێویستە مرۆڤ بە حەزو خولیاوە بەرەو چاکە بچێت و ترسیشی بەرامبەر شەڕ و فیتنە هەبێت. هەر بۆیەش فەرمانی کرد خێزانەکانی بۆ نوێژکردن بە ئاگابێن.

ئاماژەی بەوە دا، کە پێویستە خێزانەکانی لە بەندایەتیکردن بێ ئاگا نەبن، پشت بەوە نەبەستن و بڵێن ئێمە خێزانی پێغەمبەرین و تەواو.

لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە: دروستە پیاو شەو خێزانەکەی بۆ عیبادەتکردن هەڵبستێنێت، بەتایبەت لە کاتی ڕوودانی ڕووداوێکی گەورە.

**لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، خێزانەکانی بۆ پەرستن و شەونوێژکردن هەڵدەستاندنەوە:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: ئەگەر دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان بهاتبایە، پێغەمبەر ﷺ خۆی چوست و چالاك دەکرد و شەوەکەی زیندوو دەکردەوە و ماڵ و منداڵەکەی بە ئاگا دەهێنا[3].

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵ و منالەکەی لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان بانگ دەکردوو بە ئاگای دەهێنانەوە[4].

---

[1] مەبەست لێی خێزانەکانیەتی.

[2] بوخاری گێراوەتیەوە(٧٠٦٩).

[3] بوخاری (٢٠٢٤) و موسلیم (١١٧٤) گێراوەتیانەوە.

[4] ترمذي گێراوەتیەوە(٧٢٥)، ئەلبانی لە (صحیح سنن الترمذي ٢/٢٩٦) بە سەحیحی داناوە.

پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان خێزانەکانی بۆ شەونوێژکردن و یادی خوا بە ئاگا دەهێنانەوە، بەڵام لە مانگەکانی تری ساڵدا تەنیا بۆ نوێژی ویتر بە ئاگای دەهێنانەوە، چونکە ویتر لە هەموو سوننەتە ڕەواتیبەکان گرینگترە [(١)].

عائیشە خان ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەشەودا نوێژی دەکرد، جا کە کاتی نوێژی ویتر بهاتبایە، دەیفەرموو: "**عائیشە هەستە نوێژی ویتر بکە**".[(٢)]

## خێزانەکانی لەسەر بەندایەتیکردنێکی پاك و بێگەرد پەروەردە دەکردن:

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کە بیویستبایە ئیعتیکاف بکات، ئەوا نوێژی بەیانی دەکرد و پاشان دەچوو بۆ ئەو شوێنەی ئیعتیکافی تێدا دەکات، ویستی لە دە شەوی کۆتایی مانگی رەمەزان ئیعتیکاف بکات، فەرمانی کرد خێمەیەکی بۆ ساز بکەن، عائیشە مۆڵەتی لێوەرگرت بۆ ئەوەی ئیعتیکاف بکات، ئەویش مۆڵەتی داو خێمەیەکی بۆ خۆی دامەزراند، خاتوو حەفصەش ئەمەی بیست ئەویش خێمەیەکی بۆ خۆی دامەزراند، خاتوو زەینەبیش خێمەیەکی بۆ خۆی دامەزراند، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەیانی چوو، هەر چوار خێمەی بینی، فەرمووی: "**ئەوە چییە؟**" جا هەواڵیان پێدا، فەرمووی: "**ئایا ئێوە بۆ خێر ئەوەتان کردووە؟**"،

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە "**چی وای لێکردن ئەمە بکەن**"؟ **بۆ چاکەیە؟**"، جا فەرمانی کرد خێمەکەی هەڵگرین و لایببەن و فەرمووی: "**هەڵیبگرن و جارێکی تر نەیبینمەوە**"، جا هەڵیان گرت و جارێکی تر لە ڕەمەزان ئیعتیکافی نەکرد، بەڵکو لە دە شەوی یەکەمەی شەوال ئیعتیکافی کرد [(٣)].

پێغەمبەر ﷺ ئەم وتەیەی فەرموو وەك بەرپەرچدانەوەیەك بۆ کارەکەیان، بۆیە ئەوەای کرد چونکە ترسا لەوەی نەوەك ئەوان دڵسۆزی و ئیخلاسیان لە نیەتەکەیان نەبێت، بەڵکو مەبەستیان خۆ نزیکردنەوە بێت لەو.

ئیبن حەجەر ﵀ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ترسا لەوەی کە نەوەك ئەو کارەی ئەوان خۆڵهەکێشان و کێبرکێ بێت بۆ نزیکبوونەوە لە پێغەمبەر لەسەر بنەمای غیرەیان، بەمەش ئیعتیکافەکە لە بابەتی خۆی دەردەچوو [(٤)].

---

(١) فتح الباری (٢٥١/٦) ابن رجب.

(٢) بوخاری (٥١٢) و موسلیم (٧٤٤) گێراوەتیانەوە.

(٣) بوخاری (٢٠٣٣) و موسلیم (١١٧٣) گێراوەتیانەوە.

(٤) فتح الباری (٢٧٦/٤).

## پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی فێردەکرد خۆیان لەشەڕ و خراپە بپارێزن:

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەستی گرتم و پاشان ئاماژەی بۆ مانگ کرد و فەرمووی: **"عائیشە خۆت بەخوای پەروەردگار پەنا بدە لەشەڕی ئەمە، ئەوە تاریکی ئەو شەوەزەنگەیە کە باڵ دەکێشێت"**.[1]

بۆیە فەرمانی پێکرد خۆی بپارێزێت لەشەو، چونکە زۆربەی ئاشوب و فیتنەکان لەشەو بڵاودەبنەوە.

کە (غاسق) بەشەو ڕاڤەکراوە، ئەمە پێچەوانەی فەرمودەکەی نییە، کە دەڵێت مانگە چونکە مانگ نیشانەیەکی دیاری شەوە و لەشەودا هەر ئەو دیاری ناو دیارانە[2].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر بایەخپێدانی پێغەمبەر ﷺ بە فێرکردنی خێزانەکانی، وەك دەستگرتن و پاشان ئاماژەی بۆ مەبەستەکەی کردوو و دواتر فەرمانی پێکرد کاری پێبکات و هۆکارەکەشی بۆ روون کردەوە.

## پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکانی فێری زیکری بە سوود دەکردن، وەك زیکری بەیانیان و ئێواران:

جوەیریە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نوێژی بەیانی لەلام رۆیشت، پاشان لەچێشتەنگاودا هاتەوە من هەر دانیشتبووم، فەرمووی: **"تۆ بەردەوام بووی لەسە ئەو بارەی کە بەجێمهێشتی؟"**، گوتم: بەڵێ: فەرمووی **"لەپاش تۆ سێ جار چوار وشەم گوت، گەر بیخەتە تەرازوو لەگەڵ ئەوانەتی تۆ گوتووتە، ئەوا هەموویان لە تەرازوودا بڵند دەکات: سبحان الله وبحمده، عدد خلقه، ورضا نفسه، وزنة عرشه، ومداد كلماته"**[3].

واتە: ئەگەر سێ جار ئەم وشانە بڵێی، ئەوا بارتەقای ئەو زیکرانەیە، کە لەماوەی ئەم رۆژەدا گوتووتە[4].

لەوانەیە هەندێك زیکر لە هەندێکی تر گەورەتر بێت، ئەمەش لەبەر گشتگیری و هەمەلایەنی و لەخۆگرتنی وەسفی زاتی و کرداری، جا کەمێك لەم جۆرە زیکرە باشترە لە زۆربەی زیکرەکانی تر[5].

## پێغەمبەر ﷺ ڕێگەی پیشان دەدان بۆ ئەوەی باشترین و ساناترین عیبادەت ئەنجام بدەن:

---

[1] ترمذي گێراوەتیەوە(٣٢٨٨)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩١٦) بە سەحیحی داناوە.
[2] تفسير ابن كثير (٥٣٦/٨).
[3] موسلیم گێراوەتیەوە(٢٧٢٦).
[4] شرح أبي داود (٤١٤/٥) للعيني.
[5] حاشية السيوطي والسندي على سنن النسائي (٧٨/٣).

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: دەمویست بچم بۆ کەعبە و لەناوی نوێژ بکەم، پێغەمبەر ﷺ دەستی گرتم و منی بردە ناو حیجری ئیسماعیل، فەرمووی: **"ئەگەر دەتەوێ لەناو کەعبە نوێژ بکەی، ئەوا لەناو حیجر نوێژ بکە، چونکە پارچەیەکە لە کەعبە"**[1].

لە سوودی ئەم فەرموودەیە: پێغەمبەر ﷺ چۆن دەستی خێزانەکەی گرت و فێری کرد کە حیجر بەشێکە لە کەعبە، بۆیە هەر کەسێك بیەوێت نوێژ لەناو کەعبە بکات، با لەناو حیجر بیکات.

## پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەکردن عیبادەتکردن لەسەرخۆیان قورس نەکەن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ناو مزگەوت، بینی پەتێك لە نێوان دوو کۆڵەکە بەستراوەتەوە، فەرمووی: **"ئەمە چییە؟"**، گوتیان: ئەو پەتە هی زەینەبە، نوێژ دەکات گەر بێتاقەت بوو یان بێزار بوو ئەوا خۆی بەو پەتە دەگرێت، فەرمووی **"پەتەکە بکەنەوە، ئەگەر یەکێکتان چالاك بوو با نوێژ بکات، گەر ماندوو بوو یان بێزار بوو با دابنیشێت"**[2].

ئیمامی نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرمودەیە هاندانی تێدایە بۆ ئەنجامدانی پەرستن بە شێوەیەکی سانا بێ قورسکردن، هەر کاتێکیش توانای هەبوو چالاك بوو با ئەنجامی بدات، کاتێکیش بێ تاقەت و ماندوو بوو، با دابنیشێت تاوەکوو ماندووبوونەوەکەی دەڕوا[3].

## پێی ناخۆش بوو کاتێك خاتوو عائیشە باسی ئافرەتێکی بۆ کرد، کە بەشەو خەریکی نوێژکردنە و ناخەوێت!

عوروەی کوڕی زوبەیر دەگێڕێتەوە،کە خاتوو عائیشە هەواڵێ پێداوە، کە جارێکیان حەولائی کچی توەیت بەلایدا تێپەڕی و پێغەمبەریش ﷺ لەلای بوو، گوتی: ئەوە حەولای کچی توەیتە دەڵێن کە شەو ناخەوێت و هەر خەریکی شەونوێژە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەشەو ناخەوێت؟!، چەندی پێتان دەکرێت هەر ئەوەندە بکەن، سوێند بەخوا، خوای گەورە ماندوو بێزار نابێت تاوەکو ئێوە ماندوو بێزار نەبن"**[4].

مەبەست لە فەرمایشتی **"بەشەو ناخەوێت؟!"**، ڕەتکردنەوەی کارەکەیەتی، کە ئەم جۆرەیانی پێ باش نییە[5]

---

[1] ترمذي (٨٠٢) و نسائی (٢٩١٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٣٧٩٢) بە سەحیحی داناوە
[2] بوخاری (١١٥٠) و موسلیم (٧٨٤) گێراوەتیانەوە.
[3] ترمذي (٨٠٢) و النسائی (٢٩١٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٣٧٩٢) بە سەحیحی داناوە.
[4] بوخاری (٤٣) و موسلیم (٧٨٥) گێراوەتیانەوە.
[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧٣/٦).

**پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی لەسەر کردەوەی باش هاندەدا، تەنانەت گەر کەمیش بوایە:**

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خۆشەویسترین کردەوە لەلای خوای پەروەردگار بەردەوام بوونە لەسەری با کەمیش بێت".**

قاسمی کوڕی موحەممەد دەڵێت: عائیشە ئەگەر کردەوەیەکی بکردبایە ئەوا بەردەوام دەبوو لەسەری [1].

ئیبن ئەلجوزی دەڵێت: کردەوەی بەردەوامی خۆشویستووە، ئەویش لەبەر دوو هۆکار:

**یەکەمیان:** ئەو کەسەی کردەوەیەك ئەنجام بدات بەڵام دواتر وازی لێ بێنێت، وەك ئەوەیە پشتی تێکردبێت.

**دووەمیان:** بەردەوامبوون لەسەر خێر پاداشتەکەی بەردەوامە، ئەو کەسەی هەموو رۆژێك کاتژمێرێك خواپەرستی دەکات، باشترە لەوی یەك رۆژ بەتەواوی خواپەرستی بکات و پاشان بیپچڕێنێت [2].

**خێزانەکانی هاندەدا لەسەر بەخشین:**

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم **"ئەی عائیشە خۆت لە ئاگر بپارێزە با بە کەرتە خورمایەکیش بێت، چونکە سکی برسییەك تێردەکات و کەلێنێك پڕ دەکاتەوە [3]".**

پێغەمبەری خوا ﷺ خاتوو عائیشە هاندەدات بۆ ئەوەی لە نێوان خۆی و ئاگری دۆزەخ پەرژینێك دروستبکات، ئەویش بە بەخشیی شتێکی کەم و سادە، چونکە بەخشین تەنانەت گەر بە شتێکی بچوك و سادەش بێت خاوەنەکەی لە ئاگر دەپارێزێت و بۆی دەبێتە پەرژینێك.

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: جارێکیان سواڵکەرێك هاتەلام و پێغەمبەریش ﷺ لەلام بوو منیش فەرمانم کرد شتێکی بدەنێ، پاشان تەماشای ئەو شتەم کرد [4] کە بۆ سواڵکەرەکەیان هێنابوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"عائیشە دەتەوێ شتێك نەیەتە ئەو**

---

[1] بوخاری (٦٤٦٥) و موسلیم (٧٨٣) گێراوەتیانەوە.

[2] فتح الباری (١/١٠٣).

[3] ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٣٩٨٠)، ابن حجر لە (فتح الباری ٣/٣٣٤) و ئەلبانی لە (صحیح الترغیب و الترهیب ٨٦٥) بە حەسنیان داناوە.

[4] واتە سەیری ئەو شتەم کرد کە بەخشیوومە، بزانم چەند کەمی کردووە.

**ماڵە و دەرنەچێت تەنیا بە زانینی تۆ نەبێت؟"**. گوتم: بەڵێ: فەرمووی: **"عائیشە لەسەرخۆت شت ئەژمار مەکە، ئەوەك خوای گەورە لەسەرت ئەژمار بکات "**. [1]

ئەژمارکردن: واتە زانینی ئەندازەی شت، چ بە کێشان بێت یان بە ژمارە، ماناکەشی نەهێکردنە لە بەخشین لەترسی ئەوەی نەمێنێت، چونکە ئەمە گەورەترین هۆکارە بۆ نەمانی بەرەکەت، چونکە پەروەردگار بەبێ حیساب کردن پاداشتی بەخشین دەداتەوە، ئەو حیساب ناکات لەکاتی پاداشت، نابێت لەکاتی بەخشین لەسەری بژمێری، ئەوەی بزانێ، کە خوای پەروەردگار بەبێ حیساب رزق دەبەخشێت، ئەوا دەبێ لەکاتی بەخشین حیساب نەکات [2].

کاتێك خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ بەرخێکیان سەربڕی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئایا چی لێ ماوەتەوە؟"**، عائیشە گوتی: هیچی نەماوەتەوە تەنیا شانی نەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵکو هەمووی ماوەتەوە بۆمان تەنیا شانەکەی نەبێت "**. [3]

واتە: ئەوەی بەخێر بە خەڵکت داوە، لە ئەسڵدا ئەو ماوەتەوە بۆمان ئەوەی لەلاشت ماوە، ئەوە نامێنێتەوە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ فەرمایشی خوای پەروەردگا کە دەفەرموێت:

﴿ مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍ ﴾ النحل: ٩٦

واتەی ئایەتەکە: ( ئەوەی لای ئێوەیە و بەئێوە بەخشراوە، تەواو دەبێت، بەڵام ئەوەی لای خوایە و (لە پێناوی ئەودا دەیبەخشن) هەر دەمێنێتەوە).

## بۆی ڕوون دەکردەوە، کامەیان بەخشینی زۆرتر بێت، زووتر بەو دەگات:

خاتوو عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر خوا ﷺ فەرمووی **"خێراترینتان کە بە من دەگات، ئەو کەسەتانە کە دەستەکانی درێژ بێت"**. دەڵێت: جا دەستەکانیان رادەخست بۆ ئەوەی بزانن هی کامەیان درێژترە، دەڵێت: زەینەب لە هەموومان دەستی درێژتر بوو چونك کاسبی بە دەستەکانی دەکرد و سەدەقەی دەکرد [4].

مانای فەرموودەکەش ئەوەیە: کە ئەوان وایان دەزانی کە مەبەست لە دەستدرێژی مانا ڕاستیەکەیەتی، وەك ئەندامێکی لەش، بۆیە دەستەکانی خۆیان بە قەمیشێك پێوانە دەکرد، سەوده دەستەکانی لەهەموان درێژتربوو زەینەبیش دەستەکانی لە سەدەقەکردن و کاری

---

[1] ابن ماجة (١٧٠) و النسائي (٢٥٤٩) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩٢٣) بە سەحیحی داناوە.

[2] فتح الباري ابن حجر (٣/٣٠٠).

[3] ترمذي گێراوەتیەوە(٢٣٩٤) ئەلبانی لە (الصحيحة٢٥٤٤) بە سەحیحی داناوە.

[4] بوخاری (١٤٢٠) و موسلیم (٢٤٥٢) گێراوەتیانەوە.

چاکە لە هەموویان درێژتربوو. زەینەب لە هەموویان زووتر وەفاتی کرد، ئینجا زانیان مەبەست لە دەستدرێژی، توانای ئەنجامدانی زۆرترین خێر و سەدەقەیە [١].

ئە فەرمودەیە ئەوەی لە خۆ گرتووە ئەو کەسی لەکاتی پێکرانیدا خێر زۆر بکات ئەوا بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگات ئەمەش ئەو پەڕی فەزل و گەورەییە. [٢]

## لەسەر کاری خێر و بە جێگەیاندی پەیوەندی خزمایەتی پەروەردەی دەکردن:

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: دوای دابەزینی حیجاب، ئەفلەحی برای ئەبی ئەلقەعیس داوای ڕوخسەتی لێکردم، منیش گوتم: ڕوخسەتی پێ نادەم تا ڕوخسەت لە پێغەمبەر ﷺ وەرنەگرم، چونکە برای ئەفلەح، کە دەکاتە باوکی ئەلقەعیس ئەو شیری بەمن نەداوە، بەڵکو خێزانی ئەبو ئەلقەعیس شیری پێداوم، پێغەمبەر ﷺ هاتە لام، گوتم: ئەی پێغەمبەر خوا، ئەفلەحی برای ئەبو ئەلقەعیس داوای رووخسەتی لە من کردووە، رێگەم پێنەداوە تا رووخسەت لە تۆ وەرنەگرم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"چ شتێك رێگریت لێ دەكات كە ڕوخسەتی مامت نەدەی"**، گوتم: ئاخر ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو پیاوە شیری بەمن نەداوە، بەڵکو خێزانی ئەبو ئەلقەعیس شیری پێداوم، فەرمووی: **"ڕوخسەتی پێ بدە، ئەو مامتە،ماڵت ئاوا بێت"**. [٣]

## ڕێگەی بە خێزانەکانی نەدەدا بە بێ زانیاری قسە بکەن:

لە ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ بۆ خێزانەکانی ئەوە بوو، ئافرەتەکانی ئاگادار دەکردەوە و هۆشداری پێ دەدان لەوەی لە دینی خوادا شتێك نەڵێن بە بێ عیلم، تاوەکو ئافرەتەکانی لە فەتوادان و حوکم کردندا پەلە نەکەن.

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نوێژکردن لەسەر تەرمی منداڵێکی ئەنساری بانگهێشت کرا، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەختەوەری بۆ خۆی، ئەو بۆتە باڵندەیەك لە باڵندەکانی بەهەشت، بە گوناه نەگەیشتووە تا گوناه بکات. فەرمووی: **"عائیشە چی تریش، بە ڕاستی خوای گەورە خەڵکانێکی بۆ بەهەشت ئامادەکردووە لە کاتێکدا ئەوان لە پشتی باوکایان بوونە، خەڵکانێکیشی بۆ ئاگر ئامادە کردووە کە هێشتا لە پشتی باوکیان بوونە"**. [٤]

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٨/١٦).
[٢] فتح الباری (٣/٢٨٦)
[٣] بوخاری (٤٧٩٦) و موسلیم (١٤٤٥) گێراوەتیانەوە.
[٤] موسلیم گێراوەتیەوە(٢٦٦٢).

پێشەوا نەوەوی ﷺ دەڵێت: ئەوەی لە زانایانی موسڵمانان جێگای متمانەیە و قسەی لێوەردەگیرێت، ئەوەیە کە ئەگەر هەر یەکێك لە منداڵی موسڵمانان بمرێت ئەوا ئەهلی بەهەشتە، چونکە هێشتا نە گەیشتۆتە تەمەنی بلوغ.

سەبارەت بەوەلامدانەوەیان بۆ فەرموودەی عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ رێگەی لێگرت لەوەی بێ ئەوەی بەڵگەیەکی لەلا بێت مەسەلەکە ببڕێنێتەوە [1].

**فەرمانی پێدەکردن تەقوای خوای گەورەیان هەبێت و رەوشتی خۆیان جوان بکەن:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پێی گوتم: **"ئەی عائیشە تەقوای خوا بکە و نەرم و لەسەرەخۆبە، چونکە نەرمونیانی لە هەر شتێك بێت جوانی دەکات، هەر شتێکیش نەرمونیانی لێ دەرهێندرا ناشرینی دەکات"**[2].

**لەسەر بە زەیی و نەرمونیانی پەروەردەی دەکردن:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی عائیشە ئەگەر خوای گەورە خێری بۆ خێزانێك بوێت، ئەوا دەرگای نەرمونیانیان لێدەکاتەوە"**[3].

**لەسەر قسەی باش و جوان پەروەردەی دەکردن و لە قسەی ناشیرین و نابەجێش رێگری لێ دەکردن تەنانەت لەگەڵ کافرانیشدا:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: کۆمەڵێك لە جووەکان مۆڵەتیان خواست بێنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: السّام [4] علیکم، ئەویش فەرمووی: **"وعلیکم"** منیش گوتم: السّام علیکم بەر لەعنەت و تورەیی خوا بکەون، فەرمووی **"عائیشە لەسەرەخۆبە، نەرمونیان بە، خۆت دووربگرە لە توندوتیژی وقسەی نابەجێ"**. گوتم: ئەی گوێت لێ نەبوو چیان گوت،

---

(١) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٠٧/١٦).

(٢) ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٣٧٨٦)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩٢٧) بە سەحیحی داناوە، لە موسلیم (٢٥٩٤).

(٣) ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٣٩٠٦)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥٢٣) بە سەحیحی داناوە.

(٢) السام واتە : مردن

(٤) بوخاری (٢٩٣٥) و موسلیم (٢١٦٥) گێراوەتیانەوە.

فەرمووی: "**ئەی تۆش گوێت لێ نەبوو من چیم پێ گوتن؟ وەڵامم دانەوە، دوعای من لەوان گیرا دەبێت و دوعای ئەوان لەمن گیرا نابێت**"[1].

لە ریوایەتی موسلیمیشدا هاتووە، کە فەرمووی: "**خاتوو عائیشە ئاگادار بە چونکە خوای گەورە قسەی نابەجێ و خراپی خۆشناوێت**".

پێغەمبەر ﷺ بابەتە عەقیدەییەکانی بۆ ئافرەتەکانی روون دەکردەوە، لەسەر تەقوا و ترسان لە خوای گەورە پەروەردەی دەکردن، ئەگەر پەڵە هەورێك بهاتبایە ئاسمان یان بایەك هەڵیبکردیایە، ئەوا پێغەمبەر ﷺ دەهات و دەچوو رەنگی تێکدەچوو.

خاتوو عائیشە دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەر ﷺ تۆز و بایەکی بدتیبایە، ئەوا لە دەموچاوی هەستمان پێ دەکرد، پێمان دەگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر خەڵکی تۆزو با ببینن دڵیان خۆش دەبێت لە تەماحی ئەوەی سەرەتایی باران بارین بێت، لە ڕەنگی دەموچاوت هەستدەکەین پێی هەراسان بوویت؟ فەرمووی: "**ئەی عائیشە، چ شتێك دڵنیام بکات کە سزای تێدا نییە، لە کاتێکدا قەومێك بە با لەناوچوون، کە سەیری بایەکەیان دەکرد وایان دەزانی بارانی لەگەڵە**"[2].

**ئەو هەڵە عەقیدەییانەی خەڵك تێیکەوتوون، بۆ خێزانەکانی ڕوون دەکردەوە:**

خاتوو عائیشە ﵂ هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ باسی کەنیسەیەکیان دەکرد لە حەبەشە، کەناوی ماریە بوو، دایکی سەلەمە و دایکی حەبیبە چووبوونە حەبەشە و باسیان لە جوانی ئەو کەنیسەیە دەکرد، کە وێنەی زۆر جوانی تێدابووە، پێغەمبەر ﷺ سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: "**ئەوانە ئەگەر پیاوێکی چاك بمردبایە، ئەوا لەسەر قەبرەکەی مزگەوتێکیان دروست دەکرد، پاشان وێنەی کەسەکەیان تیادا دادەنا، ئەمانە خراپترینی خەڵکن لەلای خوای گەورە**"[3].

لەمەشدا ئەوپەڕی هۆشداریدان هەیە لە هەڵەی عەقیدەیی و ئاگادارکردنەوەی خێزانەکانی لێیان.

---

[2] بوخاری (٤٨٢٩) و موسلیم (٨٩٩) گێراوەتیانەوە.

[3] بوخاری (٤٢٧) و موسلیم (٥٢٨) گێراوەتیانەوە.

**لە بینینی خراپەیەك گەر لە ماڵەکەی ڕوویدا بایە بێ دەنگ نەدەبوو، بە پەلەش هەوڵی لابردنی دەدا:**

بەراستی پاراستنی ماڵ و منداڵ لە خراپە یەکێکە لەو واجبانەی لەسەر هەموو پیاوێك پێویستە و دەچێتە ژێر حوکمی ئەو ئایەتە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا ﴾ التحریم: ٦ واتە: خۆتان و کەسوکارتان لە ئاگر بپارێزن.

خاتوو عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەلام، لە ماڵیشدا پەردەیەك هەبوو وێنەی لەسەر بوو، جا دەم و چاوی گۆڕا، پاشان پەردەکەی لێکردەوە و پارچە پارچەی کرد و فەرمووی: "**توندترین سزا لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئەو کەسانەیە کە ئەو وێنانە دەکێشن**"[(١)].

ئینجا بە کردار و وتە قەدەغەی کرد.

**قەدەغەی دەکردن لە وتەیەك کە بەکەم سەیرکردنی خەڵکی تێدا بێت:**

عائیشە دەڵێت: لەبەر چاوی پێغەمبەر ﷺ لاسایی کەسێکم کردەوە، پێغەمبەریش فەرمووی: "**من حەزم لێ نییە لاسایی هیچ کەسێك بکەمەوە، هەرچەندە پاداشتی زۆریشم دەستبکەوێت**". [(٢)]

واتە: دڵخۆش نابم بە لاسایی کردنەوەی وتەیەك یان کرداری کەسێك بە مەبەستی بەکەمزانین، تەنانەت گەر لەسەر ئەمە پاداشتێکی زۆری دونیایشم دەست بکەوێت[(٣)].

پێشەوا نەوەوی دەڵێت: لاسایی کردنەوەی خەڵك لەو جۆرە غەیبەتانەیە کە حەرامە، وەك ئەوەی بە شەلەیی بڕوا یان سەری بجوڵێنێت، یان شێوەی تر[(٤)].

**خێزانەکانی لە گوناهە بچووکەکان ئاگادار دەکردەوە چ جای گوناهە گەورەکان:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: پێغەمبەر خوا ﷺ پێی فەرمووم: "**إياك و محقرات الأعمال، (لە گێڕانەوەیەکی تر "إياك ومحقرات الذنوب") فإن لها من الله طالباً**"[(٥)].

**إياك:** ئاگادار بە یان خۆت بپارێزە.

**محقرات الاعمال:** ئەو گوناهانەیە کە بکەرەکەی بەکەم سەیری دەکات و گوێی پێ نادات.

---

(١) بوخاری گێڕاوەتیەوە(٦١٠٩).

(٢) ئەبو داود (٤٨٧٥) و ترمذي (٢٥٠٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥٥١٥) بە سەحیحی داناوە.

(٣) عون المعبود (١٥١/١٣).

(٤) تحفة الاحوذي (١٦٧/٧).

(٥) ابن ماجة (٤٢٤٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح ابن ماجة ٣٤٢١) بە سەحیحی داناوە.

**طالباً**: واتە: دایناوە بۆ ئەوەی بزانێت کێ ئەنجامی دەدات، ئینجا کەئەنجامی دا ئەوا خوای گەورە دەیزانێت و لەلاشی زۆر گەورەیە و فریشتەیەکی بۆ ئەمە تەرخان کردەوە [١].

**خێزانەکانی بۆ هەندێك مەسەلەی نادیار دەگەڕانەوە لای، بە مەبەستی ڕوونکردنەوەیان:**

إبن أبی ملکە دەڵێت خاتوو عائیشە ئەگەر شتێکی نەزانیبایە ئەوا دەچووە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بۆی ڕوون بکاتەوە و بیزانێت، گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو فەرمووی **"ئەوەی پرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت ئەو سزا دەدرێت"**، گوتم: ئەی خوای گەورە نافەرموێت "فسوف يُحاسَبُ حساباً يَسيرا"، الانشقاق:٨ فەرمووی: **"ئەوە پێشاندانە، بەڵام ئەوەی لێرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت بە هیلاك دەچێت"**.[٢]

**پێغەمبەر ﷺ غیرەی لەسەر ئافرەتەکانی هەبوو:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: نێرەموکێك دەهاتە لای خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، لەوانەیان ئەژمار دەکرد کە شەهوەتیان بەرامبەر ئافرەتان ناجوڵێت و هیچ لە کاروباری ئافرەتان نازانێت، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ هات و بینی وا لەلای هەندێك لە خێزانەکانی دانیشتووە و زۆر بە وردی وەسفی ئافرەتێکیان بۆ دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەوە باش لە کاروباری ئافرەتان دەزانێت، با جارێکی تر نەیەتەوە لاتان"**، دەڵێت: جا جارێکی تر نەیانهێشت بێتەوە لایان [٣].

چوونی ئەو نێرەمووکە بۆ لای ئافرەتانی پێغەمبەر ﷺ هۆکارەکەی ئەوە بوو کەوا حیسابیان دەکرد شەهوەتی نییە و لە کاروباری ئافرەتان نازانێت ودروستە بێتە لایان و قسەی لەگەڵ بکەن، بەڵام کە پێغەمبەر ﷺ ئەو قسەیەی گوێ لێ بوو، زانی کە لەو کەسانەیە لە کاروباری ئافرەتان شارەزایە، بۆیە نەیهێشت چتیر بێتەوە لایان.

پێغەمبەر ﷺ بۆیە قەدەغەی ئەو نێرەمووکەی کرد، چونکە بینی وا وەسفی جوانی ئافرەتان دەکات، ئەمەش وا دەکات پیاوان شەهوەتیان بجوڵێت و تووشی فیتنە بن.

---

[١] حاشية السندي على سنن ابن ماجة (٥٩/٨).

[٢] بوخاری (١٠٣) و موسلیم (٢٨٧٦) گێراوەتیانەوە.

[٣] بوخاری (٤٣٢٤) و موسلیم (٢١٨١) گێراوەتیانەوە.: تێبینی: ئەم فەرمودەیە تەنها مانایە گشتییەکەیمان وەرگێراوەتە سەر کوردی، نەوەك دەقەکە هەمووی (و).

ئەم فەرموودەیە بنچینەیەکە بۆ دوورخستنەوەی ئەوانەی گومانیان لێدەکرێت و ئەو سودەشی لێوەردەگیرێت کەوا ئافرەتان رێیان لێبگیرێت لە چوونە لای ئەو کەسانەی شارەزایی جوانی و کاروباری ئافرەتانن [١].

ئا بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ بۆ پاراستنی ئافرەتانی بە غیرەت بووە، بە پێچەوانەی هەندێك کەس لە کۆمەڵگایەکەمان، کە غیرەتیان نەماوە یان لاوازە، دەیانەوێت گوێ بەم جۆرە شتانە نەدەن و لە دەروونیان بەلاوازی بزانن، بۆیە دەبینین پیاوانێك زۆر لایان ئاساییە خێزانەکەیان یان خوشکی یان کچی لەگەڵ پیاوێکی بێگانەدا دابنیشێت.

## لە رێبازە جوانەکەی پێغەمبەر ﷺ گومانی باشە بە خێزانەکانی:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز بەشەو لە دەرگای خێزانەکانی نەدەدا و نەدەچووە لایان، مەگەر بەیانیان و ئێواران نەبێت [٢].

## بەڵکو قەدەغەی دەکرد هاوەڵەکانیش ئەم کارە بکەن:

جابیری کوری عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوانی قەدەغەکرد بەشەو لە دەرگای ماڵەکانیان بدەن، بە مەبەستی زانینی کەموکوڕی خێزانەکانیان یان بە خیانەت تۆمەتبارکردنیان [٣].

پەسەند نییە ئەو کەسەی سەفەرەکەی دوور و درێژە، لەناکاو بەشەو خۆی بکاتەوە ماڵەوە، بەڵام ئەو کەسەی سەفەرەکەی نزیکە و ئافرەتەکەی چاوەڕێی دەکات ئاوا ئاساییە بەشەو بچێتەوە لای.

ابن حجر ﷺ دەڵێت: فەرموودەکە هانی خۆشەویستی دەدات بەتایبەت لە نێوان ژن و مێرد دا، چونکە دانەری شەرع ڕەچاوی ئەمەی کردووە کە لە نێوان ژن و مێرددا هەیە، عادەت وایە ژن و مێرد بەرامبەر یەکتری هەندێك شتی خۆیان بشارنەوە و هەندێك عەیبی یەکتریش شارەزا بن، لەگەڵ ئەوەشدا قەدەغەی کردووە لە شەودا لەناوکا بەسەر ئافرەتەکەی دابدات نەوك دوایی شتێك ببینێت دەروونی پێ تێکبچێت [٤].

---

[١] فتح الباری (٩/٣٣٦).
[٢] بوخاری (١٨٠٠) و موسلیم (١٩٢٨) گێراوەتیانەوە.
[٣] بوخاری (١٨٠١) و موسلیم (٧١٥) گێراوەتیانەوە.
[٤] فتح الباری (٩/٣٤١).

یەکێك لە سوود و حیکمەتەکانی ئەم فەرمودەیە کە ڕێگە نادات شەوان لە ناکاو پیاو بگەڕێتەوە یان بێ لە دەرگا دان، ئەوەیە کە ئافرەت خۆی ئامادە نەکردبێت بۆ هاتنەوەی مێردەکەی.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەگەر بەشەو یەکێکتان هاتەوە ئەوا با لەدەرگایماڵەکەی نەدات تاوەکو ئافرەتەکەی خۆی ئامادە دەکات و خۆی بۆنخۆش و خاوێن دەکاتەوە [١]"**.

ئەو حوکمەش تایبەتە بەو کەسەی کە لەسەفەردا بێت و سەفەرەکەی زۆر بخایەنێت، چونکە هۆکاری حوکمەکە بەستراوەتەوە بە سەفەری درێژ.

ئەو کەسەی بە ڕۆژ بۆ کارێك دەردەچێت و پاشان ئێوارە دەگەڕێتەوە، زۆر حەزەر نایگرێتەوە لە بەرامبەر ئەو کەسەی کە سەفەرەکی زۆری پێ دەچێت و زۆر ون دەبێت، ئەوا تووشی ناخۆشی دەبێت، چونکە لەناکاو دێتە لای خێزانەکەی و ئەویش خۆی ئامادە نەکردووە بەخۆئامادەکردن و خۆجوانکردن، جا ئەمە دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە یەکتری و ناخۆشی لە نێوانیان [٢].

بەڵام ئەو کەسەی ماڵ و منداڵەکەی دەزانن کەی دێتەوە ئەوا ئەو ڕێگرییە نایگرێتەوە.

**پێغەمبەر ﷺ زۆر بە دانایی مامەڵەی لەگەڵ غیرەیی ئافرەتەکانی دەکرد:**

غیرەی ئافرەت لە پیاوەکەی سروشتییە و تەبیعەتێکی ئافرەتانەیە، کە لە سروشتەوە لەگەڵیدایە.

لە هەندێك ئەسەردا هاتووە کە **"خوای گەورە غیرەی لەسەر ئافرەتان نوسیووە [٣]"**.

بۆیە غیرە بە شێکە لە سروشتی ئافرەتان، خێزانەکانی پێغەمبەریش ﷺ غیرەیان هەبووە.

خاتوو عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: شەوێکیان پێغەمبەر ﷺ لەلای من دەرچوو، منیش غیرەم هەستاو پەشۆکام، ئەویش بینی چ دەکەم، فەرمووی: **"عائیشە ئەوە چیتە غیرە دەکەی؟"**، وتم: جا بۆ غیرە نەمگرێ بە تایبەت بۆ یەکێکی وەك تۆ؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"ئایا شەیتانەکەت هاتووە؟ [٤]"**، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا من شەیتانم لەگەڵە؟،

---

[١] بوخاری (٥٢٤٦) و موسلیم (٧١٥) گێراوەتیانەوە.

[٢] فتح الباری (٩/٣٤٠).

[٣] الطبراني (١٠٠٤٠) وئەوانی لە ابن مسعودەوە گێراوەتیانەوە، بەڵام زەعیفە، ئەلبانی لە صحیح الجامع (١٦٢٦) بە زەعیفی داناوە.

[٤] واتە: شەیتان ئەوەی خستیە نێو دڵتەوە کە من دەچم بۆ لای خێزانەکانی ترم، بۆیە ئەوها حەپەساوی.

فەرمووی: **"بەڵێ"**، گوتم: لەگەڵ هەموو مرۆڤەکانیشە؟ فەرمووی: **"بەڵێ"**، گوتم لەگەڵ تۆش؟ فەرمووی: **"بەڵێ بەڵام پەروەردگار یارمەتیدام بۆ ئەوەی لە دەستی سەلامەت بم"**[1][2].

لە گێڕانەوەیەکی تر دەبینین کە غیرە پاڵ بە عائیشەوە دەنێت بۆ ئەوەی بە شەو بەدوای پێغەمبەر بکەوێت، تابزانێت بۆ کوێ دەچێت، خاتوو عائیشە خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە نۆبەتی من پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگا خۆی وەرگێڕاو کراس و نەعلەکانی داکەند و بردیە لای پێیەکانی و لایەکی پۆشاکەکەی ڕاخست و لەسەری پاڵکەوت، هەندەی پێنەچوو هەتا وایزانی من نوستووم جا دەستی درێژکرد و کراس و نەعلەکانی لەبەرکرد و دەرگای کردەوەو ڕۆیشت و دەرگاکەی بە ئەسپایی داخست، منیش لەچکەکەم کردە سەرم و خۆم پێچایەوەو شوێنی کەوتم، هەتاوەکو چووە بەقیع و زۆر ڕاوەستا، پاشان سێ جار دەستی بەرزکردەوە، دواتر خۆی خوارکردەوە و منیش خۆم خوار کردەوە، خێرابوو لە گەڕانەوە، منیش خێرابووم، توند دەڕۆیشت، منیش توند دەڕۆیشتم، دەستیکردە غاردان منیش غارم دا، پێشی کەوتم و چوومە ماڵەوە، هەر کە چوومە سەر جێگا ئەویش هاتە ژوورەوە و فەرمووی: **"ئەی عائیشە ئەوە چیتە بۆ وەها هەناسەت سوار بووە؟"**، گوتم: هیچ نییە، فەرمووی: **"دەبێ پێم بڵێی یان خودای اللطیف الخبیر هەواڵم پێ دەدا؟"**، منیش هەواڵم پێدا، فەرمووی: **"تۆ ئەو پارچە ڕەشایەتییەی بەرامبەرم بووی؟"**، گوتم: بەڵێ، جا مستێکی لە سینگم داو ئێشاندی[3]، پاشان فەرمووی: **"ئایا گومانت برد خوا و پێغەمبەرەکەی زوڵمت لێ بکەن؟ جوبریل هاتەلام، بانگی کردم و منیش وەڵامم دایەوە، ئەویش قەت نایەتە لات ئەگەر تۆ جلەکانت لەبەر نەبێت، جا کاتێك وامزانی نوستی، حەزیشم لێنەبوو بە ئاگات بێنمەوە و ترسام هەست بە تەنیایی بکەی، پێی گوتم: پەروەردگارت فەرمانت پێدەکات بچیتە لای ئەهلی بەقیع داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی، منیش گوتم: ئەی نێردراوی خودا چی بڵێم؟ گوتی: بڵێ السلام علیکم أهل الدیار من المؤمنین والمسلمین ویرحم الله المستقدمین منا والمستأخرین، وإنا إن شاء الله بکم لاحقون "**.[4]

---

[1] لە دەقی عەرەبی فەرموودەکە بەم شێوەیە هاتووە (ربي اعانني عليه حتى أسلم)، ئەگەر (أسلم) فعلێکی ماضي بێت، ئەوا واتای ئەوەیە، شەیتانەکە موسڵمان بووە و ڕێگەی خراپەم پیشان نادات، ئەگەر (أسلم) فعلێکی مضارع بێت: ئەوە واتای ئەوەیە: من لە شەڕ و خراپەی ئەو سەلامەتم. حاشية السندي على النسائي (٧/٧٣).

[2] موسلیم گێڕاوەتیەوە (٢٨١٥).

[3] ئەمە بۆ پەروەردەکردنی بووە، بۆ ئەوەی گومانی خراپ نەبات.

[4] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٩٧٤).

فەرمووی: **"بەڵێ"**، گوتم: لەگەڵ هەموو مرۆڤەکانیشە؟ فەرمووی: **"بەڵێ"**، گوتم لەگەڵ تۆش؟ فەرمووی: **"بەڵێ بەڵام پەروەردگار یارمەتیدام بۆ ئەوەی لە دەستی سەلامەت بم"**[1].[2]

لە گێڕانەوەیەکی تر دەبینین کە غیرە پاڵ بە عائیشەوە دەنێت بۆ ئەوەی بە شەو بەدوای پێغەمبەر بکەوێت، تابزانێت بۆ کوێ دەچێت، خاتوو عائیشە خۆی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە نۆبەتی من پێغەمبەر ﷺ لەسەر جێگا خۆی وەرگێڕاو کراس و نەعلەکانی داکەند و بردیە لای پێیەکانی و لایەکی پۆشاکەکەی ڕاخست و لەسەری پاڵکەوت، هەندەی پێنەچوو هەتا وایزانی من نوستووم جا دەستی درێژکرد و کراس و نەعلەکانی لەبەرکرد و دەرگای کردەوەو ڕۆیشت و دەرگاکەی بە ئەسپایی داخست، منیش لەچکەکەم کردە سەرم و خۆم پێچایەوەو شوێنی کەوتم، هەتاوەکو چووە بەقیع و زۆر ڕاوەستا، پاشان سێ جار دەستی بەرزکردەوە، دواتر خۆی خوارکردەوە و منیش خۆم خوار کردەوە، خێرابوو لە گەڕانەوە، منیش خێرابووم، توند دەڕۆیشت، منیش توند دەڕۆیشتم، دەستیکردە غاردان منیش غارم دا، پێشی کەوتم و چوومە ماڵەوە، هەر کە چوومە سەر جێگا ئەویش هاتە ژوورەوە و فەرمووی: **"ئەی عائیشە ئەوە چیتە بۆ وەها هەناسەت سوار بووە؟"**، گوتم: هیچ نییە، فەرمووی: **"دەبێ پێم بڵێی یان خودای اللطیف الخبیر هەواڵم پێ دەدا؟"**، منیش هەواڵم پێدا، فەرمووی: **"تۆ ئەو پارچە ڕەشایەتییەی بەرامبەرم بووی؟"**، گوتم: بەڵێ، جا مستێکی لە سینگم داو ئێشاندی[3]، پاشان فەرمووی: **"ئایا گومانت برد خوا و پێغەمبەرەکەی زوڵمت لێ بکەن؟ جوبریل هاتەلام، بانگی کردم و منیش وەڵامم دایەوە، ئەویش قەت نایەتە لات ئەگەر تۆ جلەکانت لەبەر نەبێت، جا کاتێك وامزانی نوستی، حەزیشم لێنەبوو بە ئاگات بێنمەوە و ترسام هەست بە تەنیایی بکەی، پێی گوتم: پەروەردگارت فەرمانت پێدەکات بچیتە لای ئەهلی بەقیع داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی، منیش گوتم: ئەی نێردراوی خودا چی بڵێم؟ گوتی: بڵێ السلام علیکم أهل الدیار من المؤمنین والمسلمین ویرحم الله المستقدمین منا والمستأخرین، وإنا إن شاء الله بکم لاحقون "**.[4]

---

[1] لە دەقی عەرەبی فەرموودەکە بەم شێوەیە هاتووە (ربي اعانني علیه حتی أسلم)، ئەگەر (أسلم) فعلێکی ماضي بێت، ئەوا واتای ئەوەیە، شەیتانەکە موسڵمان بووە و ڕیگەی خراپەم پیشان نادات، ئەگەر (أسلم) فعلێکی مضارع بێت: ئەوە واتای ئەوەیە: من لە شەڕ و خراپەی ئەو سەلامەتم. حاشیة السندي علی النسائي (٧٣/٧).

[2] موسلیم گێڕاوەتیەوە (٢٨١٥).

[3] ئەمە بۆ پەروەردەکردنی بووە، بۆ ئەوەی گومانی خراپ نەبات.

[4] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٩٧٤).

دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە جگە لەوەی دەیزانی کە چەندە خۆشەویستە لای پێغەمبەر ﷺ و چەندە پلە و پایەی هەیە لەلای، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەموو خێزانەکانی تر زیاتر غیرەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکرد، بەڵکو غیرەی بەرامبەر ئەو خێزانەشی هەبوو کە وەفاتی کردبوو، دەیگوت: قەت ئەوەندە غیرەم نەکردووە، ئەوەندەی بەرامبەر خەدیجە هەمبووە [1].

پێغەمبەر ﷺ لە مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکانی زۆر دانابوو، کاتێك تێبینی بکردبایە غیرەیان بەرامبەری دەجوڵێت، وەکو هەندێك لە خەڵکی ئەمڕۆی نەدەکرد، ئەوانەی کاردانەوەی توندیان بەرامبەر غیرەی ئافرەتەکانیان هەیە و قسەیان پێ دەڵێن، لە بەرامبەریشدا غیرە و گومانی ئافرەتەکە زیاتر دەبێت، کە ئەمەش بە هۆی خراپ مامەڵەکردن و بێ حیکمەتی پیاوەکەیە، کە پێویستە لەم بوارەدا چاو لە حیکمەتی و دانایی پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات.

پێغەمبەر ﷺ بە زەردەخەنە و جاروباریش بە ئامۆژگاریکردنی نەرم ڕووبەڕووی ئەم غیرەیە دەبوویەوە، هەندێکجار بە گازندەکردن ئەگەر بابەتەکە پەیوەندیدار بوایە بە کەسێکی تر و بریندارکردنی تێدابووایە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەلای یەکێك لە خێزانەکانی بوو [2]، یەکێك لە دایکانی باوەڕداران قاپە خواردنێکی بۆ ناردن [3]، ئەو خێزانەی لە ماڵەکەی پێغەمبەر بووﷺ شەقێکی لە دەستی خزمەتکارە داو قاپەکە کەوتە خوارەوە و بوو بە دوو پارچە، پێغەمبەر ﷺ پارچەی قاپەکانی کۆکردەوە، پاشان خواردنەکە، کە ڕژابووە سەر زەوی، تێی کردەوە و فەرمووی: **"دایکتان غیرە گرتی"**، پاشان لێنەگەڕا خزمەتکارەکە بڕوا هەتا قاپێکی تری هێنا لە ماڵی ئەو ئافرەتەی لێی بوو، قاپە نوێیەکەی دایە دەستی خزمەتکارەکە و قاپە شکاوەکەشی هێشتەوە لە ماڵی ئەو ئافرەتەی قاپەکەی شکاند [4].

لەم ڕووداوەدا دەبینین کە پێغەمبەر ﷺ چەندە نەرم و هێمن بووە بەرامبەر خێزانەکانی، وێڕای ئەوەی قاپەکەی شکاند، کەچی مامەڵەی توند و خراپ نەبوو توڕە نەبوو قسەشی پێ نەگوت، بەڵکو عوزری بۆ هێنایەوە، لەهەمان کاتدا حەقی ئەو

---

[1] بوخاری (٣٨١٦) و موسلیم (٢٤٣٤) گێڕاوەتیانەوە.
[2] ئافرەتەکە خاتوو عائیشە بووە.
[3] ئەو ئافرەتە زەینەبی کچی جەحش بووە، هەندێکیش دەڵێن ام سلمة بووە.
[4] بوخاری گێڕاوەتیەوە(٥٢٣٢).

کەسەشی نەخوارد کە قاپەکەی شکێنرا، بەڵکو قاپەکەی لە هاوشێوەی خۆی بۆ گەڕاندەوە.

ئیبن حەجەر ﷺ دەڵێت: ئەم ڕووداوە ئاماژەی تێدایە بۆ ئەو ئافرەتەی غیرە دەیگرێت، هەرچی بکات لێی ناگیرێت، چونکە ئەو لەو حاڵەتەدا بە هۆی توڕەبوون هۆشی لە دەستداوە [1].

**پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لەو ئافرەتە دەگرت، گەر قسەی نەگونجاوی بە هەوێیەکەی گوتبا:**

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: بەسە، باسی صەفییە مەکە، کە ئەوهاو ئاوهایە، -واتە کورتە باڵایە- پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**بەڕاستی قسەیەکت کرد ئەگەر لەگەڵ ئاوی دەریا تێکەڵی بکەین دەیگۆڕێت و بۆگەنی دەکات**"[2].

مانای فەرموودەکەش ئەوەیە: ئەو غەیبەتە ئەگەر لەگەڵ ئاوی دەریا تێکەڵ بێت، وێڕای زۆری ئاوی دەریاکە کەچی دەیگۆڕێت و بۆگەنی دەکات، ئەی ئەگەر گوناهی گەورەتر تێکەڵی بێت، دەبێت ئاوەکە چی بەسەر بێت [3].

**پێغەمبەر ﷺ بواری دەدا ئافرەتەکانی ماف لە یەکتری بستێننەوە:**

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ دوو کۆمەڵ بوون، کۆمەڵێکیان عائیشە و حەفصە و صەفییە و سەودە بوون، کۆمەڵەکەی تریش: ئافرەتەکانی تر بوون، موسڵمانان دەیانزانی کە پێغەمبەر ﷺ عائیشەی زۆر خۆشدەویست، ئەگەر یەکێك دیارییەکی هەبوایە بیویستبایە بیبات بۆ پێغەمبەری خوا، ئەوا ئەو کەسەی دیارییەکەی بۆ دەهێنا دوای دەخست تاوەکو نۆبەتی عائیشە دەهات، ئینجا بۆی دەبرد. کۆمەڵەی دایکی سەلەمە قسەیان لەگەڵ دایکی سەلەمە کرد و گوتیان بڕۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بە خەڵك بڵێت: ئەوەی دەیەوێت دیارییەك بۆ پێغەمبەر بنێرێت لە هەرماڵێك بوو لە ماڵی خێزانەکانی ئەوا بابینێرت، دایکی سەلەمەش پەیامەکەی بە پێغەمبەر گەیاند، بەڵام وەڵامی نەدایەوە، ئەوانیش پرسیاریان لێکرد، لەوەڵامدا گوتی: هیچی پێ نەفەرمووم: گوتیان: دووبارە قسەی لەگەڵ بکە، جا کە نۆبەتی ئەو هاتەوە قسەی لەگەڵ کرد، بەڵام هەر وەڵامی نەدایەوە، ئەوانیش دووبارە پرسیاریان لێکرد، دیسان گوتی: هیچی پێنە فەرمووم، بۆ جاری سێیەم دیسان لێی پرسیار کرد، ئەمجارە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**سەبارەت بە عائیشە ئازارم مەدە، چونکە هەرگیز وەحیم بۆ نەهاتووە کاتێك من لەگەڵ**

---

[1] فتح الباری (٩/٣٢٥).

[2] ئەبو داود (٤٨٧٥) و ترمذي (٢٥٠٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥١٤١) بە سەحیحی داناوە.

[3] تحفة الاحوذي (٧/١٧٧).

**خێزانەکانم پاڵکەوتبم، تەنیا لەگەڵ عائیشە نەبێت**"، گوتم: تۆبە دەکەم و بۆلای خوای گەورە دەگەڕێمەوە لەوەی تۆم ئازاردا بێت.

هەر لەسەر ئەو بابەتە، ئافرەتەکان فاتیمەیان بانگ کرد، ئەویش کە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و ڕوخسەتی خواست، پێغەمبەر لەگەڵ عائیشە لە ژێر یەك پێخەف پاڵکەوتبوو، فاتیمە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانەکانت منیان بۆ لای تۆ ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی دادگەری بکەیت لەمەڕ کچی ئەبی قوحافە (مەبەستیان: کچی ئەبوبەکری سدیقە)، منیش بێ دەنگ بووم [1]. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"کچەکەم ئایا ئەوەی من خۆشم دەوێت تۆش خۆشت ناوێت؟"**، گوتم: بەڵێ، فەرمووی: **"کەواتە ئەمەت خۆش بووێت"**. [2]

فاتیمە کە ئەمەی گوێ لێبوو، گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکانی پێغەمبەر و هەواڵەکەی بۆ گێڕانەوە کە چی بە پێغەمبەری خوا گوتووە و پێغەمبەریش چی پێ فەرمووە. گوتیان: شتێکی وات بۆ ئێمە نەکرد. دووبارە بڕۆوە لای پێغەمبەر و قسەی لەگەڵ بکە، فاتیمە گوتی: سوێند بەخوا جارێکی تر ناگەڕێمەوە لای.

ئەمجارە زەینەبی کچی جەحشیان نارد، کە ئەو لە پلەوپایەدا لەلای پێغەمبەر هاوشانم بوو [3]، هیچ ئافرەتێکم نەبینیووە وەکو زەینەب دیندار و لەخواترس و ڕاستگۆ و بە خزمایەتی و خێرکەرو خۆماندووکەر و خواپەرست بووبێت، ئەوەندە نەبێت کە زوو تووڕە دەبوو، بەڵام خێراش دەهاتەوە سەرەخۆی، جا زەینەب هاتە خزمەتی و مۆڵەتی وەرگرت، پێغەمبەر ﷺ لەسەر هەمان ئەو حاڵەتەبوو کە فاتیمە جێی هێشتبوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خێزانەکانت منیان بۆی لای تۆ ڕەوانەکردووە، داوای دادگەریت لێدەکەن لە کچی ئەبو قوحافە، عائیشە دەڵێت: پاشان زۆر قسەی پێ گوتم و زیادەڕۆیی کرد لەسەرم، من چاودێری پێغەمبەرم دەکرد کە ئایا مۆڵەتم دەدا بەرپەرچی بدەمەوە. دەڵێت: زەینەب نەڕۆیشت هەتا زانیم کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ناخۆش نییە بەرگری لە

---

[1] مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئەوان داوای یەکسانی و دادپەروەری لە مەڕ پرسی (دیارییەکان) دەکەن، بۆئەوەی تایبەت نەبێت بە ڕۆژی عائیشە، پێغەمبەر لەم بابەتەدا عوزری هەبوو، چونکە ناردنی دیارییەکان کاری ئەو نەبوو، بەڵکو خەڵکەکە دەیانناارد، بۆیە جوان نییە کاتی ناردنی دیارییەکانیان بۆ خەڵك دیاری بکات، باسکردنی ئەم بابەتەش کە لە سیفەتی پێغەمبەر ﷺ دا بووبێت جۆرێکە لە زیادەڕۆیی کردن بەرامبەر ئەو زاتە، بەڵام ئەوانیش عوزریان هەبوو، چونکە لێرەدا غیرە پاڵنەری ئەوان بووە.

[2] ئاماژەیەکە بۆ خاتوو عائیشە.

[3] ئەمە قسەی خاتوو عائیشەیە.

خۆم بکەن. جا عائیشە بەرپەرچی زەینەبی دایەوە هەتا قسەی پێ بڕی و هیچ قسەی نەماو بێدەنگی کرد، عائیشە دەڵێت: تا دەمم بەست و بێدەنگم کرد، پێغەمبەر ﷺ تەماشایەکی عائیشەی کردو پێکەنی و فەرمووی **"ئەوە کچی ئەبوبەکرە"**، ئەمەش وەکو ئاماژەیەك بۆ تێگەیشتنی تەواو هۆشمەندی خاتوو عائیشە، کە ئارامی گرت تا زانی بەرامبەرەکەی زوڵمی لێدەکات، ئینجا بە وەڵامێکی دەمکوتکەر وەڵامی دایەوە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم فەرموودەیە کێبڕکێی هەوێیەکان و غیرەیان بۆ پیاو دەردەخات، پیاویش دەکرێ بێدەنگ بێت کاتێك ئەوان دەمەقاڵێیان کرد، خۆشی ناکاتە لایەنگیری هیچ کامیان [1].

## لایەنی سێیەم: چارەسەی کێشەکان لە ماڵەکانی پێغەمبەرﷺ

بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانیدا لە ژیانێکی پڕ لە کامەرانی و خۆشی دەژیا، کە جێبەجێکردنێکی کرداری تەواوی فەرمایشتی پەروەردگارە ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ﴾ النساء: ١٩ واتە: هاوژینیان بە جوانی لەگەڵدا ببەنەسەر.

بەڵام لەو ماڵە بەڕێزەش هەر کێشە ڕوودەدات، چونکە هیچ ماڵێك بێ کێشە نابێت تەنانەت ماڵی پێغەمبەرانیش. بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ وەکو مێردێك پێشەنگێکە بۆ هەموو مێردێك، لە میانی ئەو کێشانەی لەو ماڵە هەنە، خوای گەورە فێرمان دەکات کە چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکەین.

ئەو بابەتە بۆ هەموو مێردێك گرینگە، ڕوودانی کێشە لە ماڵ ترسناك نییە، چونکە هیچ ماڵێك بە دەر نییە لە کێشە، بەڵام ترسناکی لەوەدایە، کە ئەو کێشانە بە حیکمەت و دانایی چارەسەر نەکرێن، جا بەو هۆیەوە کێشەکان زیاتر تەشەنە دەستێنن و لە دەرەنجامدا دوورکەوتنە و دەستلێك بەردان ڕوودەدات.

### پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەو کێشانەی چارەسەر دەکرد:

بەراستی ماڵی پێغەمبەر ﷺ بە چەند کێشەیەکی زۆر ناخۆش و ئاڵۆز و دژواردا تێپەڕی، وەکوو ڕووداوی (إفك) بوختان و چیرۆکی داواکردی نەفەقە و چیرۆکی مارییە و حەرامکردنی لە خۆی.

ئێمە هەندێك لەو ڕووداوانە باس دەکەین و لێیان ڕادەمێنین کە چۆن پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵدا کردوون. سەبارەت بە چیرۆکی (إفك) بوختان، ئەو بەڵایە گەورەیە بوو

[1] فتح الباری (٥/٢٠٨).

کە توشی دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە بوو ﷺ تاوەکو پەروەردگار پاکانەی ئەو ئافرەتەی لە سەرووی حەوت ئاسمانەوە ڕاگەیاند.

خاتوو عائیشە ﷺ ڕووداوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ بۆ سەرفەرکردن دەرچووبایە، تیروپشکی لە نێوان خێزانەکانی دەکرد، کامیان ناوی دەرچووبایە لەگەڵ خۆی دەیبرد، جا لە غەزای (بني المصطلق) ناوی من دەرچوو، ئەمە دوای دابەزینی ئایەتی حیجاب بوو، بۆیە من هەر لەناو کەژاوەکەمدا هەڵدەگیرام و دادەبەزێنرام. دوای تەوابوونی غەزاکە، گەڕاینەوە تاوەکو لە مەدینە نزیك بووینەوە، لە وەستانێکدا من بۆ هەندێك کاری خۆم لە سوپاکە دوورکەوتمەوە، کە ویستم بگەڕێمە بینیم ملوانەکەکەم لێ وون بووە، ئیتر منیش بە دوایدا دەگەڕام، لەو کاتەدا سوپاکە جوڵەی کرد، ئەوانەی کەژاوەی منیان هەڵدەگرت وایانزانی من هەر لەناو کەژاوەکەدام، چونکە ئافرەت ئەوەندە قورس نەبوو لەو سەردەمە، ئافرەتان لاشەیان لاوازبوو نانیان بە کەمی دەخوارد، بۆیە هەڵگرانی کەژاوەکە سوکی کەژاوەکە سەرنجی ڕانەکێشان و خستیانە سەر وشترەکە و بەڕێکەوتن، منیش ملوانکەکەم دۆزیەوە، بەڵام سوپاکە بەڕێکەوتبوو، کە گەڕامەوە شوێنی خۆم بینیم کەس لەوێ نەماوە، بۆچوونم وابوو ئەوان بە نەبوونی من لە کەژاوکەدا دەزانن و بەدوامدا دەگەڕێنەوە، ئیتر هەر لەو کاتەی دانیشتبووم، خەو بردمیەوە و خەوتم، صەفوانی کوڕی موعەتتەلیش لە دوای سوپاکە ڕێی دەکرد، شەو گەیشتە جێگاکەی من، تارمایی ئادەمیزادێکی بینی خەوتووە، کە نزیکبوویەوە ناسیمی، چونکە پێش دابەزینی حیجاب منی بینی بوو، ئیتر منیش بە دەنگی (إنا لله وإنا إليه راجعون)ی صەفوان بە ئاگا بوومەوە، منیش ڕووخساری خۆمم داپۆشی، سوێند بەخوا گوێم لە وشەیەکی نەبوو، تەنیا کە وتی: (إنا لله وإنا إليه راجعون) ئینجا وشترەکەی یخکرد و منیش سواری بووم. ئەو وشترەکەی رادەکێشا، لە گەرمای نێوەڕۆ گەیشتینە لایان، ئیتر ئەوەی تیاچوو لەو بابەتەدا هەر من بووم کە تیاچووم، سەری ئەو هەموو درۆ و دەلەسەیە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو.

گەڕاینەوە مەدینە و یەك مانگ تەندروستیم باش نەبوو، خەڵکی زۆر باسی قسەی بوختان چییەکانیان دەکرد، منیش لەو باسە بێ ئاگا بووم، ئەوەش دەیخستمە گومانەوە، چونکە ئەو ڕووخۆشییەی پێشووتر لە کاتی بوونی نەخۆشیدا لە ڕووخساری پێغەمبەر ﷺ دەمبینی ئەمجارەیان هەستم پێ نەدەکرد، بەڵکو دەهاتە لام و سەلامی دەکرد و دەیفەرموو: "**چۆن بووی؟**"، ئینجا دەڕۆیشت، ئەوەش دەیخستمە گومانەوە کاتێك لە

نەخۆشییەکە چاك بوومەوە لەگەڵ دایکی موستەح چووینە ئەو جێگایەی کە پێویستی خۆمانمان تیایدا ئەنجام

دەدا، دەریش نەدەچووین تەنیا شەو بۆ شەو نەبێت. ئەمە کاتێك بوو پێش ئەوەی جێگای تایبەت بۆ ئەم مەبەستە لە نزیك ماڵەکانمان دروست بکرێت... کاتێك لەگەڵ دایکی موستەح گەڕاینەوە، پێی نا بە دامێنی کراسەکەی و داو کەوت و گوتی: بەدبەخت بێت موستەحی کوڕم، گوتم: ئایا قسە بە کەسێك دەڵێت کە ئامادەی جەنگی بەدر بووە؟ گوتی: ئەی بێ ئاگا نەتزانیووە چی گوتووە؟ ئیتر ئەویش باسی ئەوانەی کردووە کە هەڵساون بە هەڵبەستنی بوختانەکە، ئیتر ئەوەندی تر نەخۆش کەوتم.

کاتێك گەڕامەوە ماڵەوە، پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەکەم و سەلامی لێکردم، فەرمووی: "**چۆنی؟**" گوتم: ئایا رێگەم دەدەیت بچمە لای باوکم و دایکم؟ مەبەستیشم ئەوە بوو لە رێگەی ئەوانەوە لە هەواڵەکە دڵنیا بم. بە دایکمم گوت: خەڵکی باسی چی دەکەن؟ ئەویش گوتی: کچم دان بەخۆتدا بگرە، سوێند بەخوا کەمجار هەیە، ئافرەتێك جوان بێت و خاوەن هەوێ بێت، قسەی لەسەر نەکرێت، دەڵێت گوتم: پاك و بێگەردی بۆ خوا، کەواتە خەڵکی لەم بارەیەوە قسەیان کردووە. ئیتر ئەو شەوە تاکو رۆژ بوویەوە من هەر دەگریام.

پێغەمبەر ﷺ کە بینی وەحی دواکەوت، بانگی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد، لە بارەی جیابوونەوە لە عائیشە داوای ڕاو بۆچوونی لێکردن، ئوسامە باسی پاك و خاوێنی خاتوو عائیشەی کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خێزانی تۆیە و لە چاکە زیاتر هیچی ترمان لێی نەبینیووە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا رێگەت لەسەر تەسك نەکراوەتەوە و ئافرەتی تریش زۆرن، ئەگەر پرسیار لە کەنیزەکەیشی بکەیت، قسەی راستت بۆ دەکات [1].

دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای بەریرە و فەرمووی: "**ئەی بەریرە، ئایا شتێکت بینیووە بتخاتە گومانەوە؟**"، بەریرە گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە ڕاستی ڕەوانە کردووە هیچ شتێکی خراپم لێ نەبینیووە. پاشان پێغەمبەر ﷺ لەبارەی من پرسیاری لە زەینەبی کچی جەحش کرد، کە ئایا هیچی زانیووە یان هیچی بینیووە؟ ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چاو و گوێی خۆم دەپارێزم، جگە لە خێر هیچی ترم

---

[1] ئەو قسەیەی عەلی کردی، لەسەر بنەمای ئەو بێزاری و دڵەراوکێیە بوو کە پێغەمبەرﷺ توشی بوو، ویستی ئارامی بکاتەوە، چونکە ئەم کارە لە هەموو شتێك گرنگتر بوو.

لێ نەزانیوە. عائیشە دەڵێت: ئەو تاکە خێزانی پێغەمبەر بوو کە خۆی هاوشانی من دەزانی، خوای گەورە بە دینداری خۆی لەم بابەتە پاراستبووی.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر عەبدوڵڵای کوڕی سەلول داوای لە خەڵکەکەی کرد کە کێ لۆمەی دەکات لەسەر ئەو قسەیەی بە خێزانەکانی گوتووە، پاشان چووە سەر مینبەر و فەرمووی: **"ئەی کۆمەڵانی موسڵمانان، کێ لۆمەی ئەو کەسە دەکات لەسەر ئەو کارەی کردوویەتی [1]، سوێند بە خوا جگە لە چاکە هیچم لە خێزانم نەبینیووە، ئەوان باسی پیاوێکیان کردوە، ئەویش جگە لە چاکە هیچم لە بارەیەوە نەزانیوە، هیچ کاتێکیش لەگەڵ خۆم نەبێت نەهاتۆتە لای خێزانم"**، ئیتر سەعدی کوڕی موعازی ئەنساری هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سەرت دەخەم، ئەگەر ئەو کەسە لە هۆزی ئەوسە خۆم لەگەردنی دەدەم، ئەگەر لە برا خەزرەجییەکایشە فەرمانمان پێبکە جێبەجێی دەکەین.

دەڵێت: لەو کاتەدا گەورەی خەزرەج سەعدی کوڕی عوبادە -کە پێشتر پیاوێکی چاکەکاریش بووە بەڵام دەمارگیری پاڵی پێوەنا ئەو قسەیە بکات- هەڵسا و بەسەعدی گوت: درۆت کرد، سوێند بەخوا ناتوانیت بیکوژیت، ئینجا سەعدی کوڕی حەزیر کە ئامۆزای سەعدی کوڕی مەعاز بوو هەڵسا بە سەعدی کوڕی عوبادەی گوت: تۆ درۆ دەکەیت، سوێند بە خوا دەبێت بیکوژین، تۆ پیاوێکی دووڕوویت و بەرگری لە دووڕووەکان دەکەیت.

ئیتر هەردوولا لەبەر یەکتر هەڵسانەوە خەریك بوو شەڕ ڕووبدات، پێغەمبەر ﷺ هەر لەسەر مینبەر بوو، هێوری کردنەوە، ئەوانیش ئارام بوونەوە.

عائیشە دەفەرموێت: منیش هەر دەگریام و خەوم لێ نەدەکەوت، باوکم و دایکم هاتنە لام و دوو ڕۆژ و شەوێك بوو هەر دەگریام و دەخەوتم، فرمێسکم وشك نەدەبوویەوە، ئەوانیش دەترسان گریان بمفەوتێنێ، دەفەرموێت: ئەو کاتەی ئەوان لام بوون ئافرەتێك لە ئەنسارییەکان هاتە لام و ئەویش لەگەڵم دەستی کردە گریان، لەو کاتە پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوەو سەلامی کرد، لەوەتەی ئەو قسە کرابوو لە لام دانەنیشبوو.

یەك مانگ بەسەر ئەم قسە و باسە تێپەڕ بوو، بێ ئەوەی وەحی دابەزێت، دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ کە لامان دانیشت شایەتمانی هێناو فەرمووی: (اما بعد) من هەواڵێکی ئاوهاو ئاوهام پێ گەیشتووە، جا ئەگەر تۆ بێ تاوانی خوای گەورە بە خۆی پاکت دەکاتەوە،

---

[1] لە دەقی فەرموودەکە (من يعذرني) هاتووە: واتە کێ لۆمەی ئەو کەسە دەکات کە ئەو قسانەی کردووە، لۆمەی من ناکات.. یان واتای: کێ پشتیوانیم دەکات و سەرم دەخات.

ئەگەر گوناهێکیشت ئەنجام داوە داوای لێخۆشبوون بکەو بۆ لای پەروەردگار بگەڕێوە، چونکە هەر بەندەیەك دان بە گوناهی خۆیدا بنێت و بگەڕێتەوە خوای گەورە لێی خۆش دەبێت. کاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەکەی تەواو کرد، هەستم کرد یەك دڵۆپە فرمێسکم نەما، بە باوکم گوت: وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بدەرەوە، گوتی: بە خوا نازانم چی وەڵام بدەمەوە؟ بە دایکم گوت: وەڵامی پێغەمبەر ﷺ بدەرەوە ئەویش هەر وای گوت.

دەفەرموێت: منیش هێشتا منداڵ بووم قورئانم زۆر لەبەر نەبوو، پێم گوت: سوێند بە خوا چاك دەزانم ئێوە ئەم قسەتان بیستووە و باوەڕیشتان پێکردووە، ئەگەر بڵێم من بێ تاوانم، خواش دەزانێت من بێ تاوانم، باوەڕم پێ ناکەن، ئەگەر دان بە کارێکیشدا بنێم کە نەمکردووە، خوایش دەزانێت من لەو کارە پاك و خاوێنم، باوەڕم پێ دەکەن، سوێند بەخوا هەر قسەکەی باوکی یوسف دەکەم ﴿ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَٱللَّهُ ٱلْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴾ یوسف: ١٨ واتای ئایەتەکە: چارم تەنها خۆگریی و ئارام گرتنە بەجوانترین شێوە، هەر خواش داوای کۆمەکی لێدەکرێت لەسەر ئەو باسەی ئێوە دەیکەن.

دەفەرموێت: رۆیشتم بۆ سەر جێگاکەم، چاك دەمزانی کە پاك و خاوێنم، خوای گەورە پاك و خاوێنیم ڕا دەگەێنێت، بەڵام سوێند بە خوا هەرگیز وام نەدەزانی وەحی دابەزێت و بخوێنرێتەوە، خۆشم لەوە بێ بایەخ تر بووم خوای گەورە لە بارەی منەوە قسەیەك لە قورئان بکات بخوێنرێتەوە، بەڵکو ئومێدم وابوو پێغەمبەر ﷺ خەونێك ببینێت خوای گەورە تیایدا پاك و خاوێنم ڕابگەێنێت.

دەفەرموێت: سوێند بە خوا پێغەمبەر ﷺ لەو جێگایەی هەڵنەسا، تاوەکو خوای گەورە وەحی بەسەر دابەزاند و بارێکی نا ئاسایی بەسەردا هات و وەکو دنکە مرواری تك تك ئارەقی دەڕژاند، کە ئێمە لە زستانیشدا بووین، دەفەرموێت: کاتێك باری ئاسایی بوویەوە، خەندەیەکی کرد و یەکەمین وشەی ئەوەبوو فەرمووی: **"مژدەت لێ بێت ئەی عائیشە، سوێند بەخوا پەروەردگارت پاکانەی تۆی ڕاگەیاند"**، دایکم گوتی: هەڵسە بۆ لای، گوتم: سوێند بەخوا هەڵناستم بۆ لای و سوپاسی کەس ناکەم جگە لەخوای گەورە نەبێت. ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتانەی دابەزاند......

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ... ﴾ النور: ١١-٢٠

**واتای دوو ئایەتی سەرەتا:** بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (یاخود واخۆیان نیشان دەدا کە لەخۆتانن) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆتان (تا ئیمانداران لە دووڕووەکان جیابێتەوە، ئیماندارانی دڵپاك وریا ببنەوە)، بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچیانە لەگەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش سەرۆك و گەورەو هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورە بۆی ئامادەیە. (١١) دەبوا کاتێك گوێتان لەو بوختانە بوو، بتانوتایە: ئێمە بۆمان نییە قسەی وابکەین، پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئاخر ئەمە بوختانێکی زۆر گەورە و ناقۆڵایە.

کاتێك خوای گەورە پاك و خاوێنی منی دابەزاند، ئەبوبەکر ﷺ کە پێشتر یارمەتی (مستەحی کوڕی ئەثاثە) دەدا بەهۆی هەژاری و خزمایەتیەوە، گوتی سوێند بە خوا هەرگیز لەمە بەدوا یارمەتی موستەح نادەم دوای ئەو قسانەی دەربارەی عائیشە کردی، ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا يَأْتَلِ أُولُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُولِي الْقُرْبَىٰ وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ النور: ٢٢

واتای ئەم ئایەتە: ئەوانەی کەخاوەنی سامان و بەخشندەیین لە ئێوە باسوێند نەخۆن کە یارمەتی خزمان و هەژاران و کۆچبەران لە پێناوی خوادا نەدەن، (لەبەرئەوەی بەشداربوون لە وتنی بوختانەکەدا)، دەبا لێبووردەبن، دەبا چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە.

ئەبوبەکر گوتی: بەڵی سوێند بەخوا حەزدەکەم خوای گەورە لێم خۆش بێت، ئیتر ئەو خەرجییەی گەڕاندەوە بۆ موستەح و گوتی: هەرگیز بیّ بەشی ناکەم[1].

## لە فەرموودەی بوختانکردن، چەند سوودێك هەیە، کە ڕێبازی مامەڵەکردنی پێغەمبەر لەگەڵ خێزانەکانی روون دەکاتەوە، لەوانە:

### ١- شێوازی لەسەرەخۆیی و پەلەنەکردن:

پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر حوکمدان لەسەر ئەو پڕوپاگەندانە شێوازی پەلەنەکردنی گرتەبەر، بەر لەوەی هەر بڕیارێك دەربکات هەڵسا بە لێکۆڵینەوەیەکی ورد، بۆ ئەوەی

[1] بوخاری (٢٦٦١) و موسلیم (٢٧٧٠) گێراوەتیانەوە.

دادگەر بێت لە بڕیاردان. نزیکەی مانگێك لەسەر ڕووداری بوختان کردنەکە تێپەڕی، ئەو هێشتا قسەی لەوبارەیەوە لەگەڵ عائیشە نەکرد، بەڵکو پرسیارو لێکۆڵینەوەی دەکرد.

**٢- گۆڕینی شێوازی مامەڵەکردن:**

ئەوەی لەو چیرۆکە وەردەگیرێت: ئەوەیە، کە پێغەمبەر ﷺ شێوازی خۆی لەمامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکەی گۆڕی، لەلای دانەدەنیشت و ئەو نەرمونیانەی پێشووتر هەیبوو لەگەڵی نەدەنواند، خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: لەو مەینەت و ئازارەی هەمبوو، ئەوەندە نەرمیم لە پێغەمبەر ﷺ نەدەدیت کە پێشتر بەرامبەرم هەیبوو.

ئەو هەڵوێستەش لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵگەیە لەسەر حیکمەتێکی زۆر لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ڕووداوە، ئەو بەیەکجاری پشتی تێنەکرد، چونکە پشت تێکردن خۆی لە خۆیدا سزایە لەسەر سەرپێچییەك یان گوناهێك، لەو هەقەشدا هیچ شتێك لە ئارادانیە تا ئەوەی شایەنی سزا بێت لەسەری، بەڵکو لێی دەپرسی: **"ئایا ئەو چۆنە؟"**، لەبەرامبەریشدا ئەو مامەڵە ئاساییەی لەگەڵ نەدەکرد، کە پێش بوختانەکە دەیکرد، ئەمەش بۆ ئەوەی هەست بکات شتێك ڕوویداوە و بۆ زانینی ڕاستییەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە.

**ابن حجر** دەڵێت: ئەو سوودانەی لەو ڕووداوە وەردەگیرێت، نەرمونیانی و باش مامەڵەکردنی پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی، کەمکردنەوەی ئەو نەرمونیانی و مامەڵە باشەیەش لەکاتی بەرپابوونی پڕوپاگەندەیەك ئەگەر چی هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە، سوودەکەی ئەمەیە، کە بزانێت حاڵەتەکە گۆڕاوە، ئینجا یان داوای لێبوردن بکات یان دانی پێدا بنێت[1].

**نەوەوی** دەڵێت: بزانە فەرموودەی بوختانکردنەکە سوودێکی زۆری لە خۆگرتووە لەوانە: گەر شتێك ڕوویدا یان پڕوپاگاندەیەك دروست بوو، ئەو کات نەرمونیانی لەگەڵ خێزانیدا کەمبکاتەوە، بۆ ئەوەی لە هۆکارەکەی تێبگات و پرسیار بکات و بابەتەکە لاببات[2].

**٣- ڕاوێژکردن و کۆکردنەوەی ڕایەکان:**

پێغەمبەر ﷺ بە نهێنیەکی زۆر دەستی کرد بە وردبوونەوە لەو پڕوپاگەندەیە، لە ڕەوشتی خاتوو عائیشەی دەپرسی: کە ئایا هیچی لێبینراوە؟ پرسیاری لە هەر یەکە لە ئوسامەی کوڕی زەیدو عەلی کوڕی ئەبو تالیب و بەریرەی خزمەتکاری زەینەب کرد.

---

[1] فتح الباری (٤٧٩/٢).

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١٧/١٧).

هەڵبژاردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو چوار کەسە لە خۆڕا نەبووە، عەلی کوڕی ئەبوتالیب خزمیەتی و لە خانەوادەکەیەتی، ئوسامەش یەکێکە لە نزیکەکان لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ کە نهێنی دەپارێزێت.

**ابن حجر** دەڵێت: (حیکمەت لە دیاریکردنی عەلی و ئوسامە بۆ راوێژکردن ئەوەیە کە عەلی وەکو کوڕی خۆی وابوو، چونکە هەر لە منداڵییەوە پەروەردەی کردووە پاشان لێی دانەبڕاوە و پەیوەندی لەگەڵی بەهێزتر بووە، ئەویش بە مارەبڕینی **فاتیمەی کچی**، دەبینین ئەو کەسە تایبەتکراوە بە راوێژکردن سەبارەت بە خێزانەکەی، **چونکە لە خەڵکی** تر زیاتر شارەزاترە لە کاروباری ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە **کاروباری گشتیشدا**، ئەوا ئەهلی راوێژکردنی بریتی بووە لە گەورە هاوەڵەکان وەك ئەبوبەکر و عومەر.

ئوسامەش وەکو عەلییە لە نزیکی لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ، خۆشەویستە لەلای، بۆیە پێیان دەگوت خۆشەویستی پێغەمبەری خوا، کە تایبەتی کرد بە راوێژکردن بێجگە لە دایك و باوکی، چونکە گەنج بوو وەك عەلی، گەرچی عەلی گەورەتر بوو، گەنج هۆشی بۆ وەڵامدانەوە بێگەرد و بەهێز و تواناداترە، وەکو پیر نییە، چونکە کەسی پیر زۆر حیساب بۆ داورۆژ و سەرەنجامی ڕووداوەکان دەکات، لەوانەیە هەندێك شت بشارێتەوە کە بۆی دەردەکەوێت، ئەمەش وەك ڕێزگرتنێك بۆ کەسی پرسیارکەر و کەسی بەرپرسی ڕوداوەکە [1].

لە ئافرەتانیش دوو کەسی هەڵبژارد:

**یەکەم:** زەینەب لەناو خانەوادەی پێغەمبەر کە ئامۆزا و خێزانیشی بوو.

**دووەم:** کە نیزەکەی، چونکە نزیك بوو لێی و شارەزای کاروباری ماڵی پێغەمبەر بوو.

بێگومان، ئەو هەڵبژاردنە بەڵگەیە لەسەر حیکمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و تەواوی زیرەکایەتی لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو کاروبارانەی پەیوەندییان بە شەرەفەوە هەبووە.

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو لێکۆڵینەوە نهێنی و هێواشەی ئەنجامدا، بەسەر مینبەر کەوت و ڕوونی کردەوە،کە ئەو کەسەی لەپشت ئەو فتینەیە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی سەرۆکی دووڕووەکانە، فەرمووی: **"کێ هەقم لەبارەی پیاوێك پێ دەدات، کە لەمەڕ خێزانەکەم ئازاری دام، سوێند بە خوای گەورە هیچ شتێکم لە خێزانەکەم نەبینیووە جگە لە خێر و باشە نەبێت، باسی پیاوێکیان کردووە کە هەر ئەهلی خێرە لە باشە بەولاوە هیچی ترم لێنەبینیوە، هەر جارێك هاتبایە لای خێزانەکەم ئەوا بە یاوەری من دەهات"**.

[1] فتح الباری (٨/٤٦٩).

ئەمەش بەرگریکردنە لە خێزانەکەی چونکە فەرمووی: "**سوێند بە خوای گەورە جگە لە خێرو باشە هیچی دیم لێ بەدی نەکردووە**".

لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا گەیشتە بڕوا لە پاکی و بێگوناهی خاتوو عائیشە، بەڵام هەر چاوەڕێی دابەزینی وەحی دەکرد، بۆ ئەوەی بڕیارەکە یەکلایی کەرەوە بێت.

لە بارەی دواکەوتنی وەحیش حیکمەتێکی زۆر هەیە لە گرنگترینیان: خوای گەورە ویستی لە میانەی ئەو ڕووداوە ئوممەتەکە فێربکات چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو جۆرە بابەتە هەستیارانە بکەن، بۆ پاراستنی خێزانی موسڵمانان لە تێکچوون و هەڵوەشاندنەوە.

**٤- دوای ئەمە، ڕێگایەکی بۆ دیدەنی عائیشە هەڵبژارد:**

بۆ ئەوەی بگاتە چارەسەرێك بۆ ئەو کێشەیە و هەروەها بۆ ئەوی ڕاستییەکان ئاشکرا بن و دڵەکان هیچیان تیادا نەمێنێت و پاك ببنەوە، زۆر بە ڕاشکاوانەوە لەسەر ئەم بابەتە لەگەڵیدا قسەی کرد. بە خاتوو عائیشەی فەرمووی: "**ئەی عائیشە سەبارەت بە تۆ ئاوهاو ئاوا گوتراوە و پێم گەیشتووە، ئەگەر تۆ بێ تاوان بیت ئەوا خوای گەورە پاکی و بێتاوانیت ڕادەگەیێنێت، ئەگەریش گوناهێکت کردبێت ئەوا داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە بکە، چونکە بەندە ئەگەر دانینا بە گوناهەکەی و پاشان تەوبەی کرد ئەوا خوای گەورە تەوبەکەی لێوەردەگرێت**".

**٥- دوای ئاشکرابوونی پاکی خاتوو عائیشە، پێشبینی ئەوەی دەکرد کاردانەوەی هەبێت و توڕەیی بنوێنێت:**

ئەمەش وەك ئەوەی خاتوو عائیشە گوتی: (دایکم پێی گوتم: هەڵسە بۆ لای پێغەمبەر بڕۆ، وتم: سوێند بەخوا ناچم بۆلای، جگە لە پەروەردگار سوپاسی کەسی تر ناکەم).

نەوەوی دەڵێت: (ڕاگەیاندنی پاکییەتی خاتوو عائیشە لەو بوختانەی پێکرا، پاکییەتیەی نەبڕاوەیە بە دەقی قورئانی پیرۆز، بۆیە ئەو کەسەی گومانی هەبێت لەو پاکییە ئەوا — پەنا بەخوا— بە رای ئیجماعی زانایان کافرێکی هەڵگەڕایەوە).

**لەو ڕووداو و گرفتانەی ڕووبەرووی ماڵەکانی پێغەمبەر بوونەتەوە: داواکردنی خێزانەکانی بۆ زیادکردنی خەرجی:**

ئەم چیرۆکە چۆنیەتی مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ گرفتە ئابورییەکان ڕوون دەکاتەوە، گرفتەکەش داواکردنی خێزانەکانییەتی بۆ زیادکردنی خەرجی.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەبو بەکر مۆڵەتی خواست بێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، بینی خەڵك لەلای دەرگای ماڵەکەی کۆبوونەتەوەو کەسیش مۆڵەتی پێنەدراوە.

مۆڵەتدرا ئەبوبەکر چووە ژوورەوە، پاشان عومەر هات داوای مۆڵەتی کردو مۆڵەتی پێدرا. بینی وا پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووە و خێزانەکانی لە دەوری دانیشتوون و ئەویش هیچ قسە ناکات.

گوتی: با شتێك بڵێم بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بخەمە پێکەنین گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر کچی خاریجە داوای خەرجیم لێبکات هەڵدەستم توند ملی دەگرم.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرمووی: "**هەروەکو دەبینی ئەوان وا لە چواردەورمن و داوای خەرجیم لیّ دەکەن**".

ئەبوبەکر بۆ عائیشە هەڵسا و ملی گرت، عومەریش بۆ حەفسە هەڵسا و گەردنی گرت، هەردووکیان دەیانگوت: شتێك داوا لە پێغەمبەری خوا دەکەن کە نیەتی؟

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکردن وازیان لیّ بهێنن. عائیشە و حەفسە گوتیان: سوێند بەخوا جارێکی تر داوای شتێك لە پێغەمبەری خوا ناکەین کە نەیبێت.

پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ الأحزاب: ٢٨-٢٩

واتای ئایەتەکان: (ئەی پێغەمبەر بە هاوسەرانت بڵیّ: ئەگەر ئێوە تەنها ژیانی دنیا و ڕازاوەییەکەتان دەوێت، وەرن با هەندێك شتومەك و پارە و سامانتان پیّ ببەخشم، لەوەودواش بە جوانترین شێوە دەست بەردارتان ببم (٢٨)خۆ ئەگەر ئێوە خواو پێغەمبەرەکەی و پاداشتی ڕۆژی قیامەتان دەوێت، ئەوە دڵنیابن کە خوا بۆ چاکەکارانتان پاداشتی زۆر گەورە و بێئەندازەی ئامادەکردووە)

ئینجا بە خاتوو عائیشە دەستی پێکرد و فەرمووی: "**ئەی عائیشە، دەمەویّ کارێکت پیّ بڵێم، نامەویّ پەلەی تێدابکەی تاوەکو ڕاوێژ لەگەڵ دایکت و باوکت نەکەی**".

گوتی: ئەو کارە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئینجا ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە.

گوتی: ئایە بۆ تۆ بچم ڕاوێژ بە دایکم و باوکم بکەم؟! بەڵکو خودا و پێغەمبەرەکەی و ڕۆژی دوایی هەڵدەبژێرم، داوات لێدەکەم ئەوەی من گوتم بە خێزانەکانی تر نەڵێیت.

فەرمووی: "**هیچ خێزانێکم لەوانە پرسیاری لێنەکردووم، تەنیا هەواڵم پێداوە، خوای گەورە منی نەناردووە کارقورسکەر بم یان خەڵك لەسەر ڕێگا لابدەم، بەڵکو خوای گەورە منی بە مامۆستا و ئاسانکار ناردووە**".

پاشان خێزانەکانی سەرپشك کرد، ئەوانیش هەمان قسەی خاتوو عائیشەیان کرد [1].

لەو چیرۆکەدا مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی ڕوون دەکاتەوە، کە داوای زیادکردنی نەفەقەیان کرد، لەسەرەتادا پێغەمبەر ﷺ بێ دەنگ بوو وەڵامی نەدانەوە، ئەوە شێوازی یەکەم بوو، کە پێغەمبەری خوا بۆ چارەسەری ئەو گرفتە گرتیەبەر، کە بریتییە لە خۆلادان لە کارەکە، چونکە زۆربەی ئەو کێشانەی، کە هەنە لە نێوان ژن و مێرد بە دژایەتی و ڕقبەرایەتی یەکتری چارەسەر نابێت، دەمەقاڵێش هیچ سوودێکی نییە، بەڵکو کێشەکە ئاڵۆزتر دەکات.

کاری دووەم، کە پێغەمبەر ﷺ گرتیەبەر، سەرپشککردنی خێزانەکانی بوو لەمانەوەی لەگەڵی یان دابڕانیان، ئەمەش ئەوەیە،کە شەریعەتی ئیسلامی بڕیاری لەسەر داوە، گەر ئافرەت داوای شتێکی لە پیاوەکەی کرد و لە توانای دانەبوو ئەنجامی بدات، ئەوکات مێرد خێزانەکەی خۆی سەرپشك دەکات لە مانەوە لەگەڵیدا یان لێی جیابێتەوە.

بەڕاستی شێوازی سەرپشککردن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ چارەسەکردنی ئەو گرفتە ماددییە گرتیەبەر، وێنەیەکی ڕووناك و پڕشنگدارە لە شێوازی ڕاوێژکردن لە ژیانی هاوسەرایەتی.

**پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە خێزانەکانی دەکرد، لە کاتی بڕیارداندا پەلەنەکەن و لەسەرخۆ بن:**

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەی ڕابردوو فەرمووی: **"من شتێکت بۆ باس دەکەم بەڵام پەلەی تێدا مەکە"**.

ئەمەش پێچەوانەی زۆرێك لە پیاوانی ئێستایە کە بەردەوام هەڕەشە بە تەڵاق دەکەن، لە کاتی ڕوودانی هەر هەڵەیەك لە خێزانەکەی ئەوا پێی دەڵێت: تەڵاقت دەدەم، تەڵاقت دەدەم، یاخود ئەگەر کەمتەرخەمییەکی هەبوو پێی دەڵێت: تەڵاقت دەدەم. ئەگەر لە ماڵ چووبێتە دەرەوە پێی دەڵێت: تەڵاقت دەدەم. ئەگەر تەلەفۆنی لەسەر هەڵنەگرت پێی دەڵێت: تەڵاقت دەدەم، یان پێی دەڵێت: ئەگەر لەگەڵ فڵانەکەس قسەت کرد تەڵاقت دەدەم.

ئەوەی لە فەرموودەی (نەفەقە) وەردەگیرێت ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خێزانەکانی نەدا و سەرزەنشتی نەکردن، بەڵکو بە شێوازێکی زۆر نەرم و لەسەرەخۆ مامەڵەی لەگەڵ کردن.

---

[1] موسلیم (١٤٧٨) گێڕاوەتیەوە.

کاتێکیش ئەبوبەکر و عومەر هەڵسان لە عائیشە و حەفسە بدەن، ڕێگری لێکردن، چونکە کێشەکان بەلێدان چارەسەر ناکرێن، بەڵکو چارەسەر بەگفتوگۆ و بڕواپێکردنە لە زۆربەی جارەکاندا.

## لەو کاروبارانەی پێویستە ئافرەت ڕەچاوی بکات ئەوەیە:

لەوانەیە ئافرەت لە ماڵێکی دەوڵەمەند و پەروەردەی بەناز و خۆشگوزەران بچێتە ماڵی هاوسەرەکەی، لەوانەیە دەوڵەمەند نەبێت، یان قوتابی بێت یان فەرمانبەرێکی کەمدەرامەت بێت، جا پێویستە ڕەچاوی ئەم جیاوازیە بکات، ئەمەش قەدەری خوای پەروەردگارە: ﴿ أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضًا سُخْرِيًّا ﴾ الزخرف: ٣٢

واتا: (ئایا ئەوانە ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ دابەش دەکەن؟! لە کاتێکدا ئەوە ئێمەین کە رزق و ڕۆزیمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە لەژیانی دنیادا و پلەو پایەی هەندێکمان بەرزکردۆتەوە بەسەر هەندێکیاندا، بۆ ئەوەی هەموان کاروباری یەکتر تەواو بکەن و کەڵك لە توانایی و لێهاتوویی یەکتر وەربگرن).

داواکردنی زیادکردنی نەفەقە و داواکردنی شتی زۆر کارێکی ماندووکەر و ناخۆشە بۆ پیاو، بەتایبەت ئەگەر هەژار بێت، ئەمە وا لە هەندێك پیاو دەکات کە باوەڕیان لاوازە بۆ بە دەستهێنانی ئەو داواکاریانە پەنا بۆ ڕێگای حەرام ببات، جا زیان بە خۆی و خێزانەکەی دەگەێنێت، ڕێگاکانی حەرامیش لە نمونەی وەرگرتنی بەرتیل و دزی و ...هتد، جا لەوانەیە خۆی توشی دابڕان لە وەزیفە یان بەندکردن بکات، ئەمەش دین و دونیای لە دەست دەچێت.

لەبەرامبەریشدا لەسەر پیاو پێوستە ئەوە بە هەند وەربگرێت و بزانێت کە ئەو ئافرەتە لە ماڵێکی دەوڵەمەند و خۆشگوزەرانی هاتۆتە لای، ئەوەندەی پێی دەکرێ لە ڕێگاری حەڵاڵ داواکارییەکانی دابین بکات.

## لەو گرفتانەی لە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕوویاندا، ئەوەبوو هەندێك لە خێزانەکانی ڕێکدەکەوتن بۆ ئەوەی فێڵی لێبکەن:

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە حەلوا و هەنگوین بوو، جا ئەگەر نوێژی عەسری بکردبایە دەچووە لای خێزانەکانی و لێیان نزیك دەبوویەوە.

پێغەمبەری خوا لەلای زەینەبی کچی جەحش هەنگوینی دەخوارد و لەلای دەمایەوە.

گوتم: سوێند بە خوا دەبێ فێڵێکی لێ بکەم.

من و حەفسە ڕێککەوتین ئەگەر هاتەلای هەر کامێکمان، با پێی بڵێت: (مەغافیرت [1] خواردووە).من بۆنی مەغافیرت لێ دەکەم.

پێغەمبەریش ﷺ زۆر لەلای ناخۆش بوو گەر بۆنی ناخۆشی لێبێت.

ئینجا چووە لای یەکێکیان ئەو قسەیەی پێ گوت، ئەویش فەرمووی: **"نەخێر، بەڵکو هەنگوینم لەلای زەینەبی کچی جەحش خواردووە، سوێند بەخوا جارێکی تر ناچمە لای و ئەمەش لای کەس مەگێڕەوە"**.

ئینجا ئەم ئایەتانە دابەزی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ٣ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ٤ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا ﴾ التحريم: ١-٥

﴿وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ﴾ واتە: ئەم دوو ئافرەتە ڕێککەوتن تاوەکو پێغەمبەر هەندێك شت حەرام بکات لەسەرخۆی.

**پێغەمبەر ﷺ شێوازی گۆشەگیری لەگەڵ خێزانەکانی گرتەبەر: دوای هەردوو ڕوداوی زیادکردنی نەفەقە و چیرۆکی هەنگوینەکە یەك مانگ نەچووە لایان:**

**ابن حجر** دەڵێت: (لەوانەیە ئەم کۆمەڵە شتە بەیەکەوە هۆکار بن بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەچێتە لایان، هەر ئەمەشە لە ڕەوشتی بەرزو جوانی پێغەمبەر بوەشێتەوە لە سینگ فراوانی و لێبوردەیی، ئەم کارەی نەدەکرد گەر چەندجارێك ئەم شتەیان ئەنجام نەدابا، خوای گەورە لێیان ڕازی بێت.

عەبدوڵلای کوڕی عەباس ﷺ پرسیاری لە عومەری کوڕی خەتتاب کرد، کە ئایا ئەو ئافرەتانە کامانەن لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم ئایەتەیان لەبارەیەوە دابەزی ﴿ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ ﴾ التحريم: ٤

گوتی: لام سەیرە ئەی کوڕی عەباس، ئەوانە عائیشە و حەفسە بوون.

---

[1] مەغافیر: خواردنێکی شیرینیە، بۆنێکی ناخۆشی لێ دێت، لە داری (عرفط) بەرهەم دێت.

پاشان عومەر دەستیکردە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە و گوتی: ئێمە کۆمەڵی قوڕەیش زاڵبووین بەسەر خێزانەکانمان، کاتێك هاتینە مەدینە بینیمان ئەوان ئافرەتەکانیان بەسەریاندا زاڵن، ئافرەتەکانی ئێمەش لەوان فێربوون.

گوتی: ماڵی من لە ناو بنەماڵەی (ئومەیەی کوڕی زەید) لە (عەوالی) بوو، ڕۆژێك لە خێزانەکەم توڕە بووم، ئەویش هات بۆ ئەوەی ئاشت بینەوە بەڵام من ڕەتم کردەوە.

پێی گوتم: ئایا تۆ ڕەتم دەکەیتەوە، سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا خێزانەکانی خۆی وەردەگرێتەوە، لەگەڵ ئەوەی یەکێکیان شەو و ڕۆژێك پێغەمبەر جێدەهێڵێت و سەرجێی لەگەڵ ناکات (ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەریتی ئەنسارییەکانی وەرگرت و نەریتی خۆی وازلێهێنا).

عومەر دەڵێت: منیش دەرچووم و ڕۆیشتم بۆلای حەفسە و پێم گوت: ئایا تۆ دەگەڕێیتەوە لای پێغەمبەری خوا؟

گوتی: بەڵێ.

گوتم: ئایا هەتانە لە ئێوە شەوو ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ جێبهێڵێت و سەرجێی لەگەڵ نەکات؟

گوتی: بەڵێ.

گوتم: ئایا ئێوە لە توڕەیی خوای گەورە ناترسێن، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرتان توڕەکردووە، لەبەرامبەردا لەناوتان ببات؟ ئازاری پێغەمبەری خوا مەدە و هیچ شتێکی لێ داوامەکە، ئەگەر پێویستیت بە شتێك بوو داوا لەمن بکە، ئەمە فریوت نەدا کە هاوسێکەت جوانتر و خۆشەویستترە لەلای پێغەمبەری خوا (مەبەستی خاتوو عائیشە بوو).

دەڵێت: هاوسێیەکی ئەنساریم هەبوو، ڕۆژانە بە نۆبەت دەچووینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو ڕۆژێك دەچوو منیش ڕۆژێك، هەواڵی وەحی و شتی تری بۆ من دەهێنا و منیش هەروەها، باسی ئەوەمان دەکرد کەهۆزی غەسسان خۆی ئامادەکردووە بۆ ئەوەی لەگەڵمان بجەنگێت.

ڕۆژێك هاوەڵەکەم چووبووە لای پێغەمبەر ﷺ، شەو لە دەرگایماڵیدام و بانگی کردم، منیش دەرگام لێکردەوە و گوتی: شتێکی زۆر گەورە ڕوویداوە.

گوتم: چی قەوماوە، ئایا غەسسان پەلاماری داوین؟

گوتی: نەخێر، شتەکە لەمە گەورەترە، پێغەمبەری خوا ﷺ خێزانەکانی تەڵاق داوە.

گوتم: بەڕاستی حەفسە بەدبەخت و خەسارەتمەند بوو، دەمزانی ئەوە ڕوودەدات.

نوێژی بەیانیم کرد و خۆم پۆشتەکرد و پاشان چوومە لای حەفسە، بینیم دەگریت.

گوتم: ئایا پێغەمبەری خوا ئێوەی تەڵاق داوە؟

گوتی: نازانم، ئەو لەو کولانەیە خۆی گۆشەگیر کردووە.

منیش چووم و بە خزمەتکارە رەشتاڵەکەم گوت: مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە.

ئەویش رۆیشت و گەڕایەوە گوتی: باسی تۆم لەلای کرد، بەڵام هیچ قسەیەکی نەکرد.

چوومە لای مینبەر، بینیم چەند کەسێك کۆبوینەوە و هەندێکیان دەگرین و منیش لەگەڵیان دانیشتم، پاشان خەمەکە زاڵ بوو بەسەرمدا.

پاشان چومە لای خزمەتکارەکەی و پێم گوت: مۆڵەت بۆ عومەر وەربگرە.

چووە ژوورەوە و پاشان هاتە دەرەوەو گوتی: باسی تۆم لەلای کرد، بەڵام هیچ قسەی نەکرد.

منیش گەڕامەوە دواوە و رۆیشتم، خزمەتکارەکە بانگی کردم و گوتی: وەرە پێغەمبەری خوا مۆڵەتی دای.

چوومە ژوورەوە و سەلامم لێکرد، لەسەر حەسیرێکی رەق پاڵی دابۆوە، کە شوێنەواری حەسیرەکە لە جەستەی دەرکەوتبوو.

گوتم: خێزانەکانی خۆت تەڵاقداوە؟

ئەویش سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: "**نەخێر**".

گوتم: الله أکبر

پاشان گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە وەك گەلی قورەیش بەسەر ئافرەتەکانمان زاڵ بووین، کاتێك هاتینە مەدینە بینیمان ئەوان ئافرەتەکانیان زاڵن بەسەریاندا، ئافرەتەکانمان لەوان تێگەیشتن و لێیان فێربوون، رۆژێك لە خێزانکەم تورەبووم، ئەویش هات بۆ ئەوەی ئاشت بینەوە و رازیم بکات، بەڵام نەمهێشت. پێی گوتم: رێگەی ئاشتبوونەوەم لێدەگری، سوێند بەخوا خێزانەکانی پێغەمبەر لەگەڵ ئەوەی یەکێکیان رۆژ تا شەو جێگای خۆی لەگەڵی جیا دەکاتەوە، کەچی دەچنە لای و ئاشت دەبنەوە.

گوتم: ئەوەی لە ئێوە وایکردووە بەراستی بەدبەخت و خەسارەتەمەند بووە، ئایا ئێوە لە تورەیی خوای گەورە ناترسێن، لەبەر ئەوەی پێغەمبەرتان تورەکردووە، لەبەرامبەردا لەناوتان ببات.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی.

من هەر بە پێوە وەستابووم گوتم: ئەگەر منت بینیبا، کاتێك چوومە لای حەفسە و پێم گوت: با ئەوە فریوت نەدا کە هاوسێکەت لە تۆ جوانتر و خۆشەویستر لەلای پێغەمبەر.

جارێکی تریش پێکەنی.

کە بینم پێکەنی ئینجا دانیشتم.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەستم لەم قسانە هەر بۆ دڵخۆشیتە.

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

بەردەوام قسەی خۆشم بۆ دەکرد، هەتا تورەیی لەسەر دەموچاوی نەما و پێکەنی، بەڕاستی جوانترین کەس بوو کاتێك پێدەکەنی.

دانیشتم و چاوێکم بەناوماڵیدا گێڕا، جگە لە سێ پێست هیچی ترم بەدی نەکرد.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا داوا لە خوا بکە رزق و رۆزی ئومەتەکەت فراوان و زۆر بکا، چونکە زۆری ڕژاندۆتە سەر فارس و رۆم لە کاتێکدا ئەوان خوا ناپەرستن.

پێغەمبەری خوا ﷺ کە پاڵیدابۆوە، هەڵسا دانیشت، پاشان فەرمووی: **"ئایا کوڕی خەتتاب گومانت لەوە هەیە؟ ئەوان گەلێکن خوای گەورە خۆشییەکانی دونیای بۆ پێش خستوونە"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی خوارد بۆ ماوەی مانگێك نەچێتە لایان بەهۆی ئەوەی کردیان، تاوەکو خوای گەورە گلەیی لێکرد [١].

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سوێندی لە ئافرەتەکانی خوارد بۆ ماوەی بیست و نۆ رۆژ گۆشەگیری هەڵبژارد، پاشان وازی لێهێنا.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا سوێندەکەت بۆ ماوەی مانگێك خواردبوو.

فەرمووی: **"جاری وا هەیە مانگ بیست و نۆ رۆژە [٢]"**.

**لەو سوود و وانانەی لە چیرۆکی گۆشەگیری و جێهێشتنی پێغەمبەر ﷺ لە خێزانەکانی وەردەگیرێت:**

بەڕاستی شێوازی گۆشەگیری و جێهێشتن لەو شێوازانەیە کە چارەسەری گرفتەکانی نێوان ژن و مێردی پێدەکرێت.

پێغەمبەر ﷺ ئەو شێوازەی بەکارهێنا، بەهۆی تورەیی لە خێزانەکانی سوێندی خوارد بۆ ماوەی مانگێك نەچێتەلایان. گۆشەگیریش سزایەکی دەروونی دژوارە، بەڵکو توندترین سزایە بۆ ئافرەت، کاریگەرترینیان سەرجێی نەکردنە لەگەڵیان، جێهێشتنیش یان لەسەر جێگایە کە ئەمەیان دژوارترە یان لەدەرەوەی ماڵە، یەکێك لە بەزەییەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبووە گۆشەگیر و جێهێشتنەکەی لە دەرەوی ماڵ بوو.

---

[١] بوخاری (٢٤٦٨) و موسلیم (١٤٧٩) گێراوەتیەوە.

[٢] بوخاری (١٩١١) گێراوەتیەوە.

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- دروستە باوك بچێتە ماڵی کچەکەی، ئەگەر چی بەبێ مۆڵەتی مێردی کچەکەش بێت، ئەمەش بۆ ئەوەی لە کاروباری بپرسێت.
- دروستە باوك کچەکەی یان کەسە نزیکەکەی پەروەردە بکات، بۆ ئەوەی لەگەڵ هاوسەرەکەی باش بێت.
- ئارامگرتن لەسەر ئافرەت و تورەنەکردنیان و لێخۆشبوون لەوەی لێیان ڕوودەدات لە ماف مێردەکانیان، بەڵام لە ماف خوای گەورە نا.
- توندوتیژی لەگەڵ ئافرەتان پەسەند نییە، چونکە پێغەمبەری خوا نەریتی ئەنسارییەکانی لەمەڕ مامەڵەکردن لەگەڵ خێزانەکانی وەرگرت و نەریتی خزمەکانی خۆی وازلێهێنا.
- مۆڵەت وەرگرتن بۆ چوونە لای هەر کەسێك، گەر چی بە تەنیاش بێت، چونکە لەوانەیە لەسەر بارێك بێت حەزنەکات کەس لەو حاڵەتەدا ببینێت.
- ئەگەر کەسێك بینی هاوڕێکەی خەمبارە، سوننەتە قسەی خۆشی بۆ بکات، بۆ ئەوەی خەمبارییەکەی لابچێت و دڵدانەوەی بکات و ئارام ببێتەوە، هەروەکو عومەر فەرمووی: (شتێك دەڵێم پێغەمبەری خوا ﷺ پێبکەنێت)[1].

---

[1] فتح الباری (٩/٢٩١).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کوڕ و کچەکانی:

پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین کەس بووە لەگەڵ ماڵ و منداڵی، پەیوەندی لەهەموو کەس زیاتربووە لەگەڵیان، ئەمەش لە سەرپەرشتیکردن و دابینکردنی پێداویستیان و یارمەتیدانیان دەردەکەوێت.

### پێغەمبەر ﷺ چەند کوڕ و کچێکی پێ بەخشرابوو:

سێ کوڕی هەبوو، ئەوانیش قاسم و عەبدوڵڵا و ئیبراهیم.

بەڵام ناوەکانی (طیب و طاهیر) ڕاستر وایە نازناون بۆ عەبدوڵڵا، ئەم سێ کوڕە هەر بە منداڵییەوە کۆچی دواییان کرد.

قاسم لە تەمەنی دووساڵێ و چەند مانگیدا لە مەککە وەفاتی کرد، پێغەمبەر ﷺ هەر بە (باوکی قاسم) بانگ دەکرا، دایکیشی خاتوو خەدیجەی کچی خوەیلد بوو.

عەبدوڵڵا لە مەککە لە دایك بوو هەر لەوێ وەفاتی کرد و ئەویش لە خەدیجە بوو. بەڵام ئیبراهیم لە خاتوو ماریەی قیبتی بوو، لە مەدینە لە مانگی (ذي الحجة) ساڵی هەشتەمی کۆچی لە دایك بوو، لە ساڵی دەیەمی کۆچی وەفاتی کرد، کە تەمەنی ئەو کات هەڤدە یان هەژدە مانگ بووە.

سەبارەت بە کچەکان: خوای گەورە چوار کچی پێبەخشیبوو ئەوانیش: زەینەب، روقەییە، ئوم کەلسوم، فاتیمە –خوای گەورە لێیان رازی بێت– هەموو ئەم کچانە لە خاتوو خەدیجەن.

زەینەب نۆبەرەیە، عاسی کوڕی ڕەبیعە خواستی.

روقەییە، کچی دووەمە، بەر لە هاتنی ئیسلام لە عوتبەی کوڕی ئەبو لەهەب مارەکرا، بەڵام پێش ئەوەی بیگوازێتەوە تەڵاقیدا، پاشان عوسمانی کوڕی عەففان مارەی کرد، لە هەردوو کۆچەکردنەکەدا بۆ حەبەشە لەگەڵیدا بوو. کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بۆ شەڕی بەدر ئامادەکرد، روقەییە نەخۆشکەوت، عوسمانی کوڕی عەففانی لەلای جێهێشت، لە مانگی ڕەمەزان ئەوکاتەی پێغەمبەر سەرگەرمی شەڕی بەدر بوو، کۆچی دوایی کرد.

ئوم کەلسوم: کچی سێیەمی پێغەمبەرە ﷺ، عوسمانی کوڕی عەففان دوای مردنی روقەییە مارەی کرد، هەر لەلای ئەویش کۆچی دوایی کرد.

سەبارەت بە فاتیمە: دوایین و خۆشەویسترین کچیەتی، لە تەمەنی ٤١ ساڵی پێغەمبەردا لە دایك بووە، شەش مانگ لە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد، خێزانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو.

ئەمانە منداڵەکانی پێغەمبەری خوا بوون.

## پێغەمبەر ﷺ ناوی باشی بۆ منداڵەکانی هەڵدەبژارد:

ئەوەی سەرنج لە ناوی منداڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بدا، دەبینی هەموویان ناوی باش و جوانیان لێنراوە، پێغەمبەر ﷺ بەردەوام هانی موسڵمانانی دەدا ناوی باش لە منداڵەکانیان بنێن و ناوی خراپیشی لێ دەگۆڕین.

سوفیانی ثوری دەڵێت: مافی کوڕ لەسەر باوکی ئەوەیە ناوێکی باشی لێ بنێت و ژنی بۆ بهێنێت و پەروەردەیەکی باشی بکات[1].

## هەر لە رۆژی لە دایکبوونەوە، ناوی کوڕەکەی نا ئیبراهیم:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەم شەو کوڕێکم بوو بەناوی ئیبراهیمی باوکمەوە ناونا.**[2]**"**.

## سوننەتی پێغەمبەر ﷺلە مامەڵەکردن لەگەڵ کوڕ و کچەکانی:

خوای گەورە چوار کچی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بەخشی، هەر کچەکانی بوون لەگەڵی ژیان، بەڵام کوڕەکانی بە منداڵی مردن.

پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکانی زۆر خۆشدەویستن و رێزی دەگرتن و شانازی پێوەدەکردن. ئەمەش وانەیەکە بۆ ئەوانەی خوای گەورە کچی زۆری پێداون، لەسەریەتی خۆشی و شادی خۆیانی بۆ دەرببڕێت، سوپاسگوزاری خوای گەورە بکات لەسەر بەخشینی ئەو کچانە، هەوڵبدات بە جوانی و بە باشی پەروەردەیان بکات و فێرە ئەدەب و رەوشتێکی بەرزیان بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەو کەسەی الله بە بەخشینی کچ تاقی کردەوە، ئەویش چاك بوو لەگەڵیان، ئەوا دەبنە پەرژین بۆی لە ئاگر**[3]**"**.

مانای تاقیکردنەوە ئەوەیە: خوای گەورە گەر کچی پێ بەخشی، سەیر دەکرێ، کە ئایا چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دەکات بە باشە یان بەخراپە؟ ئەوەی بە باشە مامەڵەیان لەگەڵدا

---

[1] إبن أبی الدنیا لە کتێبی (العیال ١٧١) گێراوەتیەوە.

[2] موسلیم (٢٣١٥) گێراوەتیەوە.

[3] بوخاری (٥٩٩٥) وموسلیم (٢٦٢٩) لە خاتوو عائیشەوە.

بکات، ئەوان دەبنە پەرژین بۆ پاراستنی لە ئاگر، واتە خوای گەورە بەهۆی ئەو چاکەی دەرهەق بەو کچانەی کردووە، ئەوا ناهێڵێت بچێتە ناو ئاگر، چونکە کچ لاوازە و زیاتر پێویستی بە سەرپەرشتی و یارمەتیدان هەیە، لەسەر باوکیشە کچەکەی بداتە پیاوێکی هاوشانی، خاوەن دین و ڕەوەشتێکی بەرز بێت.

زەینەبی دایە ئەبولعاس کوڕی ڕەبیع، کە دەکاتە کوڕی پوری هالەی کچی خوەیلد، ئەبولعاس لەڕووی ماڵ و دەستپاکی و بازرگانییەوە بە یەکێك لە پیاوانی مەککە ئەژمار دەکرا.

ئیسلام جیاوازی خستە نێوان زەینەب و ئەبولعاس، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ نەیدەتوانی لێکیان جیا بکاتەوە، چونکە زەینەب لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ موسڵمان بوو، بەڵام هاوسەرەکەی هەر لەسەر هاوبەشیدانان مایەوە، تاوەکو پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە کۆچی کرد، کچەکەی هەر لە مەککە مایەوە و نەیدەتوانی ڕزگاری بکات.

کاتێك قورەیش هاتن بۆ شەڕی بەدر، ئەبولعاسی کوڕی ڕەبیعیشیان لەگەڵ بوو، لەو شەڕەدا بەدیل گیرا. خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: کاتێك خەڵکی مەککە هاتن بۆی ئەوەی دیلەکانیان ببەنەوە، زەینەبیش بۆ کڕینەوەی ئەبولعاس پارە و ملوانکەیەکی ناردبوو، کە پێشتر هی خاتوو خەدیجە بوو.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ چاوی بە ملوانکەکە کەوت، سۆزی زۆر بۆ هەڵسا و دڵی نەرم بوو، فەرمووی: **"ئەگەر پێتان باشە دیلەکەی بدەنەوە و ئەوەی ناردوویەتی بۆی بگەڕێننەوە"**.

گوتیان: بەڵێ

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەبولعاس ڕێککەوت زەینەب سەربەست بکات و وازی لێبهێنێت، بۆیە زەیدی کوڕی حاریسە لەگەڵ پیاوێکی ئەنساری نارد و پێی فەرموون: **"بڕۆن بۆ دۆڵی (یەئجوج) کە زەینەب هاتە ئەوێ، بیهێنن بۆلای من"**[(١)].

پێغەمبەری خوا سوپاسی زاواکەی کردو فەرمووی: **"ڕاستگۆ بوو لەگەڵم و ئەو بەڵێنەی پێی دابووم هێنایەی دی"**.[(٢)]

ئەبولعاسی کوڕی ڕەبیع بەڵێنی بە پێغەمبەر ﷺ دا، کە گەڕایەوە مەککە ئەو کات زەینەبی بۆ ڕەوانە دەکات، ئەمە لەگەڵ ئەوەی زۆریشی خۆشدەویست.

---

(١) ئەبو داود (٢٦٩٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبي داود ٢٦٩٢) بە سەحیحی داناوە.

(٢) بوخاری (٣١١٠) و موسلیم (٢٤٤٩) لە مەسوری کوڕی مەخرمە ﵁ گێراوەتیانەوە.

پێغەمبەر ﷺ ڕوقیەی کچی دایە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ کە یەکێك لە دیارترین ڕەوشتەکانی، کە لە ناخی ڕۆچووبوو شەرم بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر زۆری خۆشدەویست و زۆر ڕێزی دەگرت و موژدەی بەهەشتی پێدا. کاتێکیش ڕوقیە ﷺ کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەر ﷺ ئوم کەلسومی لێ مارەکرد، ئەویش هەر لەلای ئەو وەفاتی کرد.

فاتیمەیشی دایە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی ئامۆزای ﷺ، کە یەکەمین کەسە لەو منداڵانەی بڕوای بە پێغەمبەر ﷺ هێنا، بەر لە ئیسلام هەر لەپەنای ئەو پەروەردە بوو، لەگەڵی مایەوە تا سروشی بۆ دابەزی و خوای گەورە کردیە پێغەمبەر. زۆر ڕێزی دەگرت و زۆر خۆشی دەویست و موژدەی بەهەشتیشی پێدا.

## پێغەمبەر ﷺ بۆ بە شوودانیان، ڕاوێژی بە کچەکانی دەکرد:

عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح دەڵێت: کاتێك عەلی هاتە خوازبێنی فاتیمە –خوا لێیان ڕازی بێت– پێغەمبەر ﷺ هاتە لای فاتیمە و پێی فەرموو: "**عەلی داوای تۆی کردووە**"، فاتیمەش هیچ قسەیەکی نەکرد، پێغەمبەر ﷺ چووە دەرەوە، ئینجا لێی مارەکرد [1].

پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگی فاتیمەی بە ڕازی بوون دانا، چونکە فەرموویەتی "**کچ مارە ناکرێ تاوەکو پرسی پێ نەکرێت**"،

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، پرس پێکردنیان چۆنە؟

فەرمووی: "**بێ دەنگبوونیانە** [2]"

کچ سپاردەیە لە ماڵی باوکی، نابێت سەرپەرشتیکار بیداتە پیاوێك، کچەکە بە دڵی نەبێت و نەیەوێت.

## لە مارەیی کچەکانیدا، داوای ماڵی زۆری نەدەکرد:

پێغەمبەر ﷺ لە بەشوودانی کچەکانیدا مارەیی کەمی بۆ داناون.

ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەلی ﷺ گوتی: فاتیمەم مارەکرد.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خو بیگوازمەوە؟

فەرمووی: "**شتێکی بدەرێ**".

گوتم: هیچم نییە.

فەرمووی: "**ئەی قەڵغانە حوتەمیەکەت کوانێ؟**".

گوتم: لەلامە

---

[1] ابن سعد لە (الطبقات ٨/٢٠) دەڵێت : سەنەدی سەحیحە.

[2] بوخاری (٥١٣٦) و موسلیم (١٤١٩) لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاوەتیانەوە.

فەرمووی: "بیدەرێ"[(١)].

ئا ئامە مارەیی کچی بچوکی پێغەمبەر ﷺ و گەورەیی ئافرەتانی بەهەشتە، کە قەڵغانێك بوو.

قەڵغانی (الحطمي): بۆ تیرەیەك کە لە نەوەی عەبدولقەیسە دەگەڕێتەوە پێیان دەگوت (حطمی کوڕی موحاریب) کە قەڵغان و زرێیان دروست دەکرد، هەندێکیش دەڵێن: بەو جۆرە قەڵغانە دەگوترێت کە شمشێر تێك دەشکێنێت [(٢)].

لەم رۆژگارەی ئێستادا هەندێك کەس زۆر زیادەڕۆیی لە داواکردنی مارەیی دەکەن، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، چونکە ئەگەر زیاد داواکردنی مارەیی رێزگرتن بووایە لە ئافرەتان، پێغەمبەری خوا ﷺ پێش ئەوان ئەمەی دەکرد.

## ئەو شتومەکەی وەك دیاری دایە کچەکەی لە کاتی بە شوودانیدا:

عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فاتیمەی لێ مارەکرد، لەگەڵیدا کراسێکی قەدیفە و بالیفێکی دروستکراو لە پێست کە ناوەخنەکەی رووەکێکی بۆنخۆش بوو، هەروەها دوو دەستاڕ و کوندەیەك و دوو جەڕەی ئاوی بۆ ڕەوانەکرد [(٣)].

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- ئاسانکردنی کاروباری ژنهێنان، کە دەبێت بە پێی توانا بێت، پیاو یاخود ژن، نابێت لەسەرووی توانای خۆیان بۆ ئامادەسازی ژیانی هاوسەرایەتی ئەرکبار بکرێن.
- پێغەمبەری خوا ﷺ ژوورێکی لە پشت ماڵی عائیشە لە ئاڕاستەی باکورەوە بەرامبەر دەرگاری جوبریلی بۆ تەرخانکردن، کە سەکۆیەکی بڵند لە بەردەمی ماڵەکەی پێغەمبەر ﷺ هەبوو دەیڕوانیە سەر ماڵی عەلی و فاتیمە.
- هەر لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە، پێویستە لەسەر باوکی بوك بەشداری بکات لە خەرجی و کاروباری هاوسەرگیری، بانەڵێت: هەموو خەرجیەکە دەبێت لەسەر پیاو بێت، پیاویش بە زۆری تازە خوێندنی تەواوکردووە یاخود تازە دامەزراوە و موچەیەکی کەم وەردەگرێت و پێویستی بە یارمەتی دانە، بە زۆریش وایە باوك لە ڕووی وەزیفەداری یان بازرگانییەوە کۆنترە و حاڵی باشترە، بۆیە لەسەری پێویستە یارمەتی

---

(١) ئەبو داود (٢١٢٥) و النسائی (٣٣٧٥) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح أبی داود ١٨٤٩) بە سەحیحی داناوە.

(٢) النهایة (١/٩٩٤).

(٣) ئەحمەد (٨٢١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الترغیب ٣٣٠١)

مێردی کچەکەی بدات لە دابینکردنی کەلوپەل و خەرجی ماڵیان، هەروەك لە فەرموودەکە هاتووە.

## خواردنی زەماوەندی بە شوودانی کچەکەی خواردنێکی سادە بوو:

بوریدە دەڵێت: کاتێك عەلی فاتیمەی مارەکرد ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"هەر دەبێت بۆ زەماوەند خواردنێك ئامادە بکرێت"**.

سەعد گوتی: من بەرانێك دێنم، یەکێکی تریش گوتی: من ئەوەندە گەنمە شامییە دێنم.[1]

باشتر وایە خواردنی زەماوەند دوای گواستنەوە بێت، بەڵام پێش گواستنەوە یان لە کاتی مارەبڕیندا هەر دروستە، مرۆڤ پێویستە لەسەری بە پێی نەریتی شوێنی خۆی هەڵسوکەوت بکات، مادام دەقێکی شەرعی لەسەر واجب بوون یان سوننەت بوونی ئەمە کارە نییە.

## دوعای پێغەمبەر ﷺ بۆ فاتیمەی کچی لە کاتی هاوسەرگیریدا:

لە شەوی زاوایەتیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: **"هەتا من نەبینی هیچ شتێك نەکەی"**، جا پێغەمبەر داوای ئاوی کرد، دەستنوێژیی بە ئاوەکە هەڵگرت و ئاوەکەی بە عەلی داکرد و فەرمووی: **"خودایە بەرەکەت بخەیتە نێوانیان و بەرەکەت بخەیتە هاوسەرگیریان"**.[2]

بە گوێرەی ئەم فەرموودەیە، سوننە دوعای خێر و بەرەکەت بۆ ژن و مێرد بکەی لە کاتی هاوسەرگیریان، پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف کردو فەرمووی: **"خودا بەرەکەتداری بکات بۆت"**[3].

## سەرپەرشتیکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ کچەکانی لە دوای بە شوودانیان:

سەرپەرشتیکردنی پێغەمبەر ﷺ لە دوای بە شوودانی کچەکانی کۆتایی پێ نەهات، بەڵکو تا دوای بە شوودانیش هەر بەردەوام بوو، پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێك لە سەرپەرشتیکردنی کچەکانی سەرقاڵی نەدەکرد، بەڵکو بیری لە گوزەرانیان دەکردەوە تەنانەت گەر خۆی لە خراپترین گوزەران دا بوایە.

---

[1] ئەحمەد (٢٢٥٢٦) گێراوەتیەوە، ابن حجر دەڵێت: "سندە لابأس فیە"، ئەلبانی لە (اداب الزفاف ١/١٧) بە "حەسەنی" داناوە.

[2] الطبراني لە (الکبیر ١١٥٣) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (اداب الزفاف ١/١٠١) بە "حەسەنی" داناوە.

[3] بوخاری (٥١٥٥) و موسلیم (١٤٢٧) لە ئەنەسەوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بۆ شەڕی بەدر بۆ ڕووبەڕوونەوەی قوڕەیش دەربچێت، ئەوکات ڕوقیەی کچی نەخۆش بوو. فەرمانی بە عوسمانی ﷺ هاوسەری ڕوقیە کرد لە مەدینە بمێنێتەوە بۆ شەڕەکە نەیەت، ئەمەش بۆ ئەوەی ئاگای لە ڕوقیە بێت، بەشێکی لە دەسکەوتی شەڕی بۆ دیاری کرد، وێڕای پاداشتی پەروەردگار لە ڕۆژی دوایدا.

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکدا بە عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ فەرموو: **"تۆ پاداشتی پیاوێکت هەیە لەوانەی بەشداری جەنگی بەدریان کردووە، لەگەڵ هەبوونی بەشێك لە دەسکەوتی شەڕ"**[(١)].

**پێغەمبەر ﷺ خۆی نەدەخزاندە ناو کێشەی سادەی نێوان کچەکانی و هاوسەرەکانیان:**

سەهلی کوڕی سەعد دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵی فاتیمە، بینی عەلی لە ماڵ نییە، فەرمووی: **"کوا ئامۆزاکەت؟"**.

فاتیمە گوتی: پێش نیوەڕۆ شتێك لە نێوانمان ڕوویدا، لەیەکتر توڕەبووین بۆیە چووە دەرەوەو لەلام نەمایەوە.

پێغەمبەر ﷺ بە کەسێکی فەرموو: **"بڕۆ بزانە لە کوێیە؟"**.

هاتەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە مزگەوت پاڵکەوتووە.

پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ لای، بینی وا پاڵکەوتووە و لایەکی کراسەکەی کەوتۆتە سەر زەوەی خۆڵاوی، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە داتەکاندنی کراسەکەی و پێی دەفەرموو: **"ئەی باوکی خۆڵ (یان ئەی خۆڵاوی) هەڵسە، ئەی باوکی خۆڵ هەڵسە"**[(٢)].

**ئیبن حەجەر** دەڵێت: (یەکێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە، بە نەرمی مامەڵەکردنە لەگەڵ زاوا و هێورکردنەوەی توڕەییەتی)[(٣)].

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە فاتیمە نەکرد سەبارەت بەو کێشەیەی لە نێوانیان ڕوویداوە، داواشی لێنەکرد هۆکاری ئەو توڕەبوونەی نێوانیانی بۆ بگێڕێتەوە، بەڵکو گوێی بەو بابەتە نەداو ڕۆیشت بۆلای عەلی تاوەکو ڕازی بکات، زۆرجار ئەو کێشانەی ڕوودەدن لە نێوان ژن و مێرد هۆکارەکەی دەستوەردانی خزم و کەسیانە، بەمەش کێشەکە زیاتر ئاڵۆزتر دەبێت.

---

(١) بوخاری (٣١٣٠) گێراوەتیەوە.
(٢) بوخاری (٤٤١) و موسلیم (٢٤٠٩) گێراوەتیەوە.
(٣) فتح الباری (٥٣٦/١).

هەر لە سوودەکانی ئەو فەرموودەیە: ڕەوشتبەرزی پێغەمبەرە ﷺ، چونکە ڕۆیشت بۆ ئەوەی عەلی ئاشت بکاتەوە و خۆڵی لەسەر پشتی تەکاند و گاڵتەی لەگەڵ کرد و بەو نازناوە بانگی کرد، ئەمەش بۆ ئەوەی بە تەنیا نەمێنێتەوە و دڵی ئارام بێت، لەگەڵ ئەوپەڕی خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆ کچەکەی بەڵام گلەیی لێنەکرد بەوەی لە کچەکەی توڕە بووە و ئەمەی بە هەند وەرنەگرت و عەلیشی لەم بوارەوە نەدواند، ئەمەش حیکمەتی بەجێی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

سودێکی تری ئەم فەرموودەیە، نەرمی نواندنە لەگەڵ زاوا و هێورکردنەوەیانە لە توڕە بوونیان و، گلەیی لێنەکردنیان بۆ ئەوەی خۆشەویستی و پەیوندییەکە بەردەوام بێت.

**ئیبن بەتاڵ** دەڵێت: کەسی گەورە و خاوەن ڕێز وەك کەسی ئاسایی لەگەڵ هاوسەرەکانیان لە یەکتری توڕە دەبن، ئەمە سروشتێکی ئاسایی مرۆڤەکانە، لە وانەیە توڕەبوونەکە وایلێبکات لە ماڵ بچێتە دەرەوە، لەسەر ئەمەش لۆمە ناکرێت.

لەوانەشە دەرچوونی عەلی هۆکارەکەی ترسان بێت لەوەی نەوەك لە حاڵەتی توڕەبوون شتێك بڵێت یان بیکات، کە لە خاتوو فاتیمە نەوەشێتەوە. بۆیە توڕەبوونەکەی بە دەرچوون لە ماڵ دامرکاندەوە بۆ ئەوەی هەردووکیان بێنەوە سەرەخۆ [1].

هەروەها دەرچوون لە ماڵ لەو حاڵەتەدا وا لە مرۆڤ دەکات بە خۆدا بچێتەوەو هەڵەکانی بۆ دەربکەون، کە لەوانەیە لە تەڕەفی یەکەم ئەمە ئەستەم بێت.

فاتیمە لە ماڵ نەچووە دەرەوە، بەڵکو لە ماڵی خۆی مایەوە، ئەمەش کێشەکە سوك دەکات و کاریگەری کەم دەبێت، بە پێچەوانەوە ئەگەر بچوبایە ماڵی باوکی، کێشەکە لەسەر کەس و کاری ئافرەتەکە قورستر دەبوو. بۆیە پێویستە لەسەر کەس و کاری ڕۆڵیکی ئەرێنیان هەبێت لە ئامۆژگاریکردنی کچەکەیان بۆ ئەوەی ئارام بگرێت و مامەڵەی باش بکات لەگەڵ مێردەکەی.

## ئەگەر یەکێك لە کچەکانی سەردانی بکردبا، بە گەرمی پێشوازی لیٚ دەکردو خۆشی بۆ دەردەبڕی:

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: کەسم نەبینووە بە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێت هێندەی فاتیمە، لە دانیشتن و هەڵسان و هەڵسوکەوت زۆری پێی دەچوو.

دەڵێت: ئەگەر هاتبایە ماڵی پێغەمبەر ﷺ لەبەری هەڵدەستا و ماچی دەکرد و لە جێگای خۆی دایدەنیشاند [2].

---

[1] فتح الباری (١٠/٥٨٨).

[2] ئەبو داود (٥٢١٧) و ترمذي (٣٨٧٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

لە گێڕانەوەی ئەبو داود داهاتووە: دەستی دەگرت و ماچی دەکرد.

"دەست گرتن" بە واتای ڕێزگرتن لێی دێت.

هەر خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: فاتیمە کە دەهاتە لامان ڕۆیشتنەکەی وەك ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو: **"کچم زۆر بە خێربێی"**[1].

ئەو فەرموودەیە پلەوپایەی فاتیمە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دیاری دەکات کە زۆری خۆشویستووە و زۆری ڕێز لێگرتووە.

ئەو هەستە ناسکە لەکوێ، لەگەڵ هەستی ئەو کەسانەی کە تووڕە و توندن، وادەزانن گرژی دەم و چاو و توندی نواندن لەگەڵ کوڕان بەتایبەت لەگەڵ کچان لە نیشانەکانی پیاوەتین.

**پێغەمبەر ﷺ کچەکانی لەسەر دونیانەویستی پەروەردە دەکردن، هانی کاری خێری دەدان:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای ماڵی فاتیمە، بینی لەسەر دەرگاکە پەردەیەك هەڵواسراوە، نەچووە ژوورەوە.

زۆربەی جار سەردانیکردنی لەو دەست پێدەکرد.

عەلی ﵁ هاتەوە، بینی فاتیمە نیگەرانە، گوتی: ها چیتە؟

گوتی: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لام، بەڵام نەهاتە ژوورەوە.

عەلی چووە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا فاتیمە زۆر نیگەران بووە کە تۆ هاتووی بەڵام نەچوویتە ژوورەوە.

فەرمووی: **"من چیم لە دونیا هەیە، کارم بە نەخش و نیگار چییە؟ من بینیم لەسەر دەرگاکەی پەردەیەکی ڕەنگاوڕەنگ هەڵواسراوە"**.[2]

عەلی چووە لای فاتیمە هەواڵی پێغەمبەری بۆ گێڕایەوە، ئەویش گوتی: بچۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بڵێ بە چ فەرمانم پێبکات لەبارەی ئەو پەردەیەوە، هەر ئەوە دەکەم. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بڕۆ پێی بڵێ با بیداتە فلانە ماڵ، چونکە ئەوان پێویستیان پێی هەیە"**.[3]

**موهەلەب** و جگە لەویش گوتیانە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بۆ خۆی پێی ناخۆش بوو، بۆ کچەکەشی پێی ناخۆش بوو، لە ڕووی پێشخستنی لەزەتەکانی دونیا، نەوەك لەبەر ئەوەی داپۆشینی دەرگا حەرام بێت، ئەمە وەك هەمان ئەو فەرموودەیەیە کاتێك

---

[1] بوخاری (٣٦٢٤) و موسلیم (٢٤٥٠) گێڕاوەتیانەوە.

[2] بوخاری (٣٦٣٤) و موسلیم (٢٤٤).

[3] بوخاری (٢٦٢٣) ئەبو داود (٤١٤٩) گێڕاوەتیانەوە.

فاتیمە داوای خزمەتکارێکی کرد، ئەویش پێی فەرمووی: **"ئایا لەوە باشترت پێ بڵێم"**، ئینجا جۆرە زیکرێکی کاتی نوستنی فێرکرد.

## پێغەمبەر ﷺ ڕێنمویی دەکردن بۆ باشترین کاروبار لە دونیا و دوارۆژ:

عەلی ﷺ دەڵێت: فاتیمە گلەیی لای پێغەمبەری خوا کرد لەبارەی ئەو دەستاڕەی هەیبوو، ئینجا کاتێك چووە لای داوای خزمەتکارێکی لێکرد. لە کاتی سەردانیدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ نەبوو، قسەکەی بۆ خاتوو عائیشە گێڕایەوە.

کە هاتەوە ئەویش پێی ڕاگەیاند.

عەلی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، ئەو کات لەناو جێگابووین، ویستمان هەڵبستینەوە، فەرمووی: **"لە جێگای خۆتان بن"**، هات لەلای خوارەوە لە نێوانمان دانیشت، تا فێنکایی پێیەکانی گەیشتە سینگم [1].

فەرمووی: **"ئایا شتێکتان پێ بڵێم لە خزمەتکار باشتر بێت؟، ئەگەر چوونە سەر جێگا، ئەوا سی و چوار جار بڵێن (الله أكبر) و سی و سێ جار بڵێن (الحمد الله) و سی و سێ جاریش بڵێن (سُبحان الله) ئەوا لە خزمەتکار بۆتان باشترە [2]"**.

هۆکاری ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خزمەتکاری پێ نەدان، ویستی زیاتر هەژارەکانی (صوففە) سوودمەند بن، پێشی باش بوو ئەهلەکەی زیاتر ئارام بگرن، چونکە ئارام گرتن پاداشتێکی ئێجگار زۆر و نەبڕاوەی هەیە.

### سوودی ئەم فەرموودەیە:

ئەم فەرموودەیە ئەو پەڕی سۆز و خۆشەویستی بۆ کچ و زاوا تێدایە، هەروەها ئەو پەڕی پاراستنی شەرمی لە خۆگرتووە بەو پێیەی بێزاری نەکردن کە لەجێگای خۆیان هەڵبستن، بەڵکو لێیان گەڕا هەر لەسەر ئەو بارە بن کە لەسەری بوون، زیاد لە پێویستیش چووە نێوانیان تاوەکو قاچەکانی بردە نێوانیان و ماوەیەك لەلایەن مایەوە، تاوەکو فێری ئەو زیکرەی کردن، ئەمەش قەرەبووکردنەوەیە لەجیاتی داواکردنی خزمەتکار.

ئەم بابەتەش لە ڕوانگەی فێرکردنی شتی گرنگتر و باشترە، وەك ئاگادارکردنەوەیەك بەوەی کە شتە گرنگەکە خۆئامادەکردنە بۆ دوارۆژ و ئارامگرتنە لەسەر مەینەتییەکانی دونیا و گرنگی نەدان بە دونیا [3].

---

[1] فتح الباري (٥/٢٢٩).

[2] بوخاری (٣٧٠٥) و موسلیم (٢٧٢٧) گێڕاوەتیانەوە.

[3] فتح الباري (١١/١٢٤).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: فاتیمە هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای خزمەتکارێکی لێکرد، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "بڵێ: **اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَرَبَّ الْأَرْضِ، وَرَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ، رَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ، فَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى، وَمُنْزِلَ التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ وَالْفُرْقَانِ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ، وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ، اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنَ الْفَقْرِ**".[1]

## پێغەمبەر ﷺ فێری دەکردن چۆن هەست بە بەرپرسیاریەتی بکەن:

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**ئەی فاتیمە خۆت لە ئاگر ڕزگار بکە، چونکە من لەلای خودا هیچم بۆ تۆ پێناکرێت**".[2]

لە گێڕانەوەی بوخاریدا: "**ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد هەرچی داوام لێدەکەی لە ماڵم داوای بکە، چونکە من لەلای خوای گەورەی هیچم بۆ تۆ پێ ناکرێت**".

ماناکەشی ئەوەیە: پشت بە نزیکیم مەبەستە، چونکە من ناتوانم هیچ ناخۆشییەکت لەسەر هەڵبگرم، کە خوای گەورە بۆ دانابێت.[3]

## لەسەر شەو نوێژ هانیدەدان:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێت: شەوێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرگای ماڵی ئێمەی داو فەرمووی: "**ئایا نوێژ ناکەن؟**"،

عەلی دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە لەژێر دەستی خوای گەورەداین، گەر ویستی وابێت کە هەڵبستین ئەوا هەڵدەستین.

کاتێك ئەمەم گوت پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت و نەهاتەوە.

پاشان گوێم لێ بوو کاتێك پشتی لە من کرد، لە ڕانی خۆی دەدا و دەیفەرموو:

﴿ وَكَانَ ٱلْإِنسَـٰنُ أَكْثَرَ شَىْءٍ جَدَلًا ﴾ الكهف: ٥٤

واتەی ئایەتەکە: ( بەڕاستی ئینسان لە هەموو شتێك زیاتر موجادەلە دەکات و لە شت دەکۆڵێتەوە).

ئیبن بطال دەڵێت: ئەم فەرموودەیە فەزڵی شەونوێژی لە خۆگرتووە، هەروەها بە ئاگاهێنانی کەسانی خەوتوو لە خزم و کەسان.

---

[1] موسلیم (٢٧١٣) گێراوەتیەوە.

[2] بوخاری (٢٧٥٣) و موسلیم (٢٠٤) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕاوەتیانەوە

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٣/٨٠).

**ئەگەر پێغەمبەر ﷺ فەزڵ و گەورەیی شەونوێژی نەزانیبایە، کچەکەی خۆی و ئامۆزاکەی لەم کاتەی درەنگانی شەو کە خەڵك نوستوون بە ئاگای نەدەهێنا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە جیاتی ئەوەی پاڵبکەون و بخەون خێری گەورەی بۆ هەڵبژاردوون، ئەمەش وەك نمونە هێنانەوەیە بۆ فەرمایشتی پەروەردەگار کە دەفەرموێت: ﴿ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ ﴾ طه: ١٣٢ واتە: فەرمانی نوێژکردن بە کەسوکارت بکە.**

(پاشان گوێم لێ بوو کاتێك پشتی لە من کرد، لە ڕانی خۆی دا)، لێدان لە ڕانی خۆی، نیشانەی دەربڕینی سەرسامییە بەرامبەر خێرا وەڵامدانەوەی، هەروەها ڕازی نەبوون بەو بیانوویەی هێناویەتیەوە.

بەڵێ داواکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەنجامدانی سوننەتە نەوەك فەرز، بۆیە دەبینی زۆری لێنەکردن و لەلایان ڕۆیشت و ئەو قسەیەی کرد، ئەگەر بۆ فەرز بووایە نەیدەهێشت لەسەر ئەو حاڵەتە بمێننەوە.[1]

## ڕەچاوکردنی هەست و سۆزی کچەکانی و تووڕەبوون بە تووڕەبوونیان:

میسوەری کوڕی مەخرەمە ﷺ دەڵێت: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، کچی ئەبو جەهلی داخواز کرد، لە کاتێکدا فاتیمەی کچی پێغەمبەری ﷺ لەلابوو.

کاتێك فاتیمە بەو هەواڵەی زانی، هاتە لای پێغەمبەر و گوتی: خەڵك باس لەوە دەکەن کە تۆ خەم لە کچەکانت ناخۆی، ئەمەش عەلییە وا داخوازی کچی ئەبو جەهلی کردووە.

میسوەرە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هەڵسا، گوێم لێبوو شایەدمانی هێنا و پاشان فەرمووی: **"من کچێکی خۆم دایە عاسی کوڕی ڕەبیع، ئەو ڕاستگۆ بوو لەگەڵمدا بەڵێنێکی بە مندا و هێنایەجێ، فاتیمەش بەشێکە لە من، ئەو شتەی ئەو ئازاری پێ دەخوات، منیش ئازاری پێ دەخۆم، سوێند بە الله هەرگیز کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا لەلای یەك پیاو کۆنابنەوە".**

ئینجا عەلی دەستی لەو خوازبێنییە هەڵگرت[2].

زانایان هەندێك لەو هۆکارانەیان باس کردووە، کە پێغەمبەرﷺ بۆ نەیهێشت عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ ئەم خوازبێنییە بکات؟ هۆکارەکانیش بە تێکڕایی دەگەڕێنەوە بۆ چوار خاڵ:

---

[1] شەرحی ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (٣/١١٥)، حاشیة السندي علی النسائي (٣/٢٠٥).

[2] بوخاری (٣١١٠) و موسلیم (٢٤٤٩) گێڕاوەتیانەوە.

**یەکەم:** ئەم هاوسەرگیرییە ئازاردانێك بوو بۆ فاتیمە، ئازاردانیشی ئازاردانی پێغەمبەرە ﷺ، ئازاردانی پێغەمبەریش ﷺ لە گوناهە گەورەکانە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەرموودەی خۆی ئەمەی ڕوونکردۆتەوە: "**فاتیمە بەشێکە لە من، ئەوەی پێی دڵگران دەبێت، منیش پێی دڵگران دەبم، ئەو شتەی ئەو ئازاری پێ دەخوات، منیش ئازاری پێ دەخۆم**". ئەمە جێبەجێ نابێت جگە لە کچەکانی پێغەمبەر نەبێت.

**دووەم:** ترسان لەوەی فاتیمە دینەکەی بکەوێتە ژێر مەترسی و لە دینەکەی تاقی بکرێتەوە، هەروەکو لە ریوایەتی بوخاریدا (٣٢١٠) هاتووە: "**من دەترسم لە دینەکەی توشی تاقیکردنەوە بێت**".

غیرە یەکێکە لەو شتانەی ئافرەت خووی پێوە گرتووە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ترسا لەوەی غیرە پاڵی پێوەبنێت بۆ شتانی تر، کە لە پلەوپایەی ئەو نەوەشێتەوە، لە کاتێکدا ئەو گەورەی ئافرەتانی دونیایە، بەتایبەت کە ئەو دایکی وەفاتی کردبوو، خوشکەکانیشی یەك لە دوای یەك وەفاتیان کردبوو، کەس نەمابوو دڵی خۆی لەلا بداتەوە و ئازارەکانی کەم بکاتەوە، سەرەڕای هەموو ئەمانەش هەوێی بەسەر بێت، ئەو کات بە هۆی غیرەوە گوزەرانی خراپتر دەبوو.

**ئیبن حەجەر** دەڵێت: ئەم ڕووداوە دوای ڕزگارکردنی مەککە بوو، ئەو کات هەر فاتیمەی لە ژیاندا مابوو، دوای ئەوەی دایك و خوشکەکانی یەك لە دوای یەك وەفاتیان کرد، جا ژن هێنان بەسەریدا خەمەکانی زیاتر دەکات و زیاتر ئازاری پێدەگەیەنێت [1].

**سێیەم:** وەك دەربڕینی ناڕەزایی لەوەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ و کچی دوژمنی خوا لەژێر چەتری یەك پیاو کۆببنەوە، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**سوێند بە الله هەرگیز کچی پێغەمبەری خوا و کچی دوژمنی خوا لەلای یەك پیاو کۆنابنەوە**".

**چوارەم:** بە گەورەدانانی مافی فاتیمە و نیشاندانی پلەو پایەکەی.

ئەم هۆکارانە چ بەیەکەوە بن، چ بە جیا بن، ئاماژەن بۆ ئەوە دەکەن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەم هۆکارانە نەیهێشت عەلی ژن بەسەر فاتیمەدا بهێنێت.

لەم چیرۆکەدا هیچ بەڵگەیەك نییە بۆ ئەو کەسەی فرەژنی سنوردار دەکات، پێغەمبەر ﷺ هەر لە هەمان ڕووداودا ئەو گومانانەی ڕەتکردۆتەوە و فەرموویەتی: "**من هەرگیز حەڵاڵێك حەرام ناکەم و حەرامێك حەڵاڵ ناکەم**".

---

[1] فتح الباری (٨٦/٧).

**لە نەریتەکانی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر کچەکانی ئەوەبوو، دڵخۆش و شادومانی دەکردن:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: فاتیمە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ڕۆیشتنەکەی وەکو ڕۆیشتنی پێغەمبەر ﷺ بوو.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"کچەکەم زۆر بەخێر بێی"**، پاشان لەلای ڕاست یان لەلای چەپی خۆی داینیشاند.

دواتر پێغەمبەر ﷺ بە نهێنی قسەیەکی پێ گوت، فاتیمە گریا.

پێم گوت: بۆ دەگرییت؟

دواتر قسەیەکی تری پێگوت، ئەمجارەیان پێکەنی.

گوتم: هەرگیز نەمبینووە شادی و نیگەرانییەك هێندە لێك نزیك بن، لەبارەی قسە نهێنیەکە پرسیارم لە فاتیمە کرد.

گوتی: من هەرگیز نهێنی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا ناکەم.

لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکی تر پرسیارم لێکردووە.

گوتی: نهێنییەکی پێگوتم، فەرمووی: **"جوبریل لە هەر ساڵێکدا یەك جار پێداچوونەوەی قورئانی پێدەکردم، بەڵام ئەمساڵ دووجاری پێداچوونەوەی پێکردم، من وادەبینم کە ئەجەلم نزیك بۆتەوە، تۆش یەکەمین کەسی لە ئەهلوبەیتم کە بە من دەگەیت"**. بۆیە گریام. پاشان فەرمووی: **"ئایا ڕازی نابیت بەوەی ببیتە گەورەی ئافرەتانی ئەهلی بەهەشت یان ئافرەتانی باوەڕداران؟"**، بۆیە پێکەنیم.[1]

**لەسەر یادکردنی خوا هانیدەدان:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە فاتیمەی فەرموو: **"ئەی فاتیمە چ شتێك ڕێگریت لێ دەکات لەوەی بۆ تۆی دەڵێم گوێی بۆ نەگریت، ئەگەر بەیانی و ئێوارەت کردەوە بڵێ: یاحَيُّ یاقَیوم بِرحمتِك أستغیث أصلِحْ لي شأني كلَّهُ ولا تَكلْني إلى نفسي طرفةَ عين "**.[2]

(**أصلح لي شأني**): واتە: کاروبارم باش بکە

(**ولا تكلني إلى نفسي طرفة عين**): واتە: بۆ چاوتروکانێکیش مەمدەرە دەست نەفسم.

---

[1] بوخاری (٢٦٢٤) گێڕاوەتیەوە.

[2] ابن السني لە (عمل اليوم والليلة ٤٦) گێڕاوەتەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥٨٢٠) بە سەحیحی داناوە.

## دیاری و بەخششی بۆ دەناردن:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی لە حەریر پێدام، منیش لەبەرمکرد و هاتمە دەرەوە، فەرمووی: **"ئەی عەلی من ئەو پارچە قوماشەم پێنەدای تا لەبەری بکەیت، بەڵکو بیکە سەرپۆش و بەسەر فاتیمەکان دابەشی بکە"**[١].

مەبەست لە (**فاتیمەکان**) فاتیمەی کچی پێغەمبەر و فاتیمەی کچی ئەسەد کە دایکی عەلییە و فاتیمەی کچی حەمزەیە.[٢]

## دڵی کچەکانی دەدایەوە و لەکاتی بەڵا و نەهامەتییەکان فێرە ئارامگرتنی دەکردن:

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێت: کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی نارد بۆلای پێغەمبەر کە پێی بڵێم کوڕێکی وا لەسەرەمەرگ دایە.

ئەویش چووە لای، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو ئەمەی پێ بڵێ: **"إنَّ للهَ ما أخذ، ولَهُ ما أعطىَ وكلّ شيءٍ عندَهُ بأجلٍ مُسمّى، فَلْتَصبِرْ ولْتَحتَسِبْ"**. واتە: هەرچی هەیە هی خوایە، هەر ئەو دەیبات و دەیبەخشێ، هەموو شتێك لەلای ئەو کاتی دیاریکراوە، ئارام بگرە و پاداشتەکەی لە خوا چاوەڕێ بکە.

ئوسامە دەڵێت: کچەکەی پێغەمبەر ﷺ سوێندی خوارد هەر دەبێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خۆی بێنێت، پێغەمبەریش ﷺ هەڵساو لەگەڵیدا سەعدی کوڕی عوبادە و موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابیت و چەند هاوەڵێکی تری لەگەڵ خۆی برد.

منداڵەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزکردەوە، دەنگێکی لە سینەی دەهات، وەکو دەنگی ئاو بوو کاتێك دەکرێتە گۆزەیەکی شکاوە.

چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ پڕ فرمێسك بوون.

سەعد گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"ئەوە بەزەیی و ڕەحمەتە، خوای گەورە لە دڵی بەندەکانی دایناوە، خوای گەورە لەو بەندانە خۆش دەبێت کە بەبەزەیین "**.[٣]

---

[١] بوخاری (٢٥١٤) و موسلیم (٢٠٧١) و ئەحمەد (٧١٢) گێڕاوەتیانەوە.

[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٥١/١٤).

[٣] بوخاری (١٢٣٨) و موسلیم (٩٢٣) گێڕاوەتیانەوە.

**راڤەی فەرموودەکە:**

**(للهَ ما أخذ، ولَهُ ما أعطىَ وكلّ شيءٍ عندَهُ بأجلٍ مُسمّى)**: بە واتای ئارام گرتن و تەسلیم بوون دێت بە قەدەری خوای پەروەردگار.

واتا گشتییەکەی: ئەوەی لێتان وەرگیراوەیە، هی پەروەردگارە، ئەوەك هی ئێوە، پەروەردگاریش شتێك نابات تەنیا هی خۆی نەبێت، بۆیە پێویست ناکات خەفەتبار بن لەسەر ئەوەی کەسێك ئامانەتەکەی خۆی دەباتەوە.

(سەعد گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟) سەعد بۆیە ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر کرد، چونکە وای زانی هەموو گریانێك حەرامە و نابێت مرۆڤ بگرێیت، وا گومانی برد، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبیری چووە و بە بیری دێنێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کرد تەنیا گریان و فرمێسك ڕشتن حەرام نییە، بەڵکو ڕەحمەت و سۆزو بەزەییە، ئەوەی حەرامە جلدڕاندن یاخود لە خۆدان یان سەردولکەی بە گریانە [1].

**بە مردنی یەکێك لە کوڕەکانی یان لە کچەکانی خەمبار دەبوو:**

ئەو کەسەی خوای پەروەردگار بە مردنی منداڵەکانی تاقی کردۆتەوە، با بزانێت پێغەمبەر ﷺ هەموو کوڕ و کچەکانی جگە لە فاتیمە نەبێت، پێش خۆی وەفاتیان کرد.

سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە مردنی یەکێك لە منداڵەکانی ئەوەبوو، خەمبار دەبوو بە لە دەستدانیان، چاوەکانی فرمێسکیان دەباراند، ئەو شتەی دەگوت کە خوای پەروەردگار پێی خۆش بوو.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لەبارەی مردنی ئوم کەلسوم دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ئێمە ئامادەی مەراسیمی ناشتنی تەرمی کچی پێغەمبەر ﷺ بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گۆڕەکەی دانیشتبوو، بینیم چاوەکانی فرمێسکیان لێ دەهاتە خوارەوە [2].

ئەمانە فرمێسکی ناڕەزایی دەربڕین و پێ ناخۆشبوون نییە بە قەزا و قەدەری خوا، بەڵکو فرمێسکی بەزەیی و سۆزە، کە لە چاوی خاوەن بەزەییەکانەوە دێتە خوارەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: چووینە لای ئەبو سەیفی ئاسنگەر، کە هاوسەری دایەنی ئیبراهیم بوو.

پێغەمبەر ﷺ ئیبراهیمی گرتە باوەش و بۆنی کرد و ماچی کرد، جارێکی تر چووینە لای ئیبراهیم کە لە حاڵەتی گیانسپاردن بوو.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦/٢٢٥).

[2] بوخاری (١٢٨٥).

چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ دەستیان بە رژانی فرمێسك کرد، عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف گوتی: هەتا ئەتۆش ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"ئەی کوڕی عەوف، ئەمە ڕەحمەت و بەزەییە"**.

پاشان فرمێسکی تریش لە چاوەکانی هاتنە خوارەوە، ئینجا فەرمووی: **"بەڕاستی چاوەکان فرمێسك دەڕێژن و دڵیش غەمبار دەبێت، بەڵام تەنیا ئەو شتە دەڵێین کە خوای گەورە رازی بکات، ئێمە بە لە دەستدانی تۆ ئەی ئیبراهیم غەمگینین**[1]**"**.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: هەرگیز کەسم وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ نەبینیوە بەرامبەر منداڵەکانی بە بەزەیی بێت.

دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئیبراهیم لەلای دایەنێك بوو لە دەوروبەری مەدینە، پێغەمبەر ﷺ بۆلای دەچوو، ئێمەش لەگەڵی دەچووین، جا کە چووینە ماڵەکە، ژوورەکە پڕ دووکەڵ بوو، خێرا پێش پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتم و گوتم: ئەی ئەبو سەیف وازبێنە، ئەوە پێغەمبەری خوا هات.

ئەبو سەیف هاوسەری دایەنی ئیبراهیم بوو، ئاسنگەر بوو، پێغەمبەر ﷺ دەچوو کوڕەکەی ماچ دەکرد و دەگەڕایەوە.

کاتێکیش ئیبراهیم وەفاتی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئیبراهیم کوڕم بوو، ئەو هێشتا تەمەنی شیرەخۆرەی تەواو نەکردبوو مرد، لە بەهەشت دوو دایەنی هەن کە شیرخواردنەکەی بۆ تەواو دەکەن"**.[2]

واتە: ئەو کە مرد هێشتا تەمەنی شیرەخۆری تەواو نەکردبوو، ئەو دایەنانە لە بەهەشت بۆی تەواو دەکەن، چونکە کە مرد تەمەنی١٦ یان ١٧ مانگ بوو، ئەوان دوو ساڵەکەی بۆ تەواو دەکەن، چونکە تەواوی دایەنی بە دەقی قورئان دوو ساڵە.

هەر لەو فەرموودەیە ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەر ﷺ و ڕەحمەت و سۆزی لەگەڵ منداڵەکانی دەردەکەوێت، هەروەها دەریدەخات کە بەزەیی هاتنەوە بە منداڵ و ماچکردنیان کارێکی گەورە و پڕ لە پاداشتە[3].

یەکێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی مردنی کچەکانی، ئەوەبوو، سەرپەرشتی شوشتن و کفن کردنیانی دەکرد و نوێژی لەسەر دەکردن و پاشان دەیناشتن و لەسەر قەبرەکانیان دەوستا و دوعای بۆ دەکردن.

---

[1] بوخاری (١٣٠٣) و موسلیم (٢٣١٥) گێڕاوەتیانەوە.

[2] موسلیم (٢٣١٦) گێڕاوەتیەوە..

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/٧٦).

دایکی عەتیە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئوم کەلسوم وەفاتی کرد، هاتە لامان. فەرمووی: **"سێ جار یان پێنج جار زیاتر بیشۆن، بە ئاو و سیدر بیشۆن و دواتر کافور بەکاربهێنن، کە تەواوبوون ئاگادارم بکەنەوە"**.

کاتێك تەواو بووین، چاکەتەکەی پێداین و فەرمووی **"لەبەری بکەن"**[1].

دەگوترێت: حیکمەت لە دواخستنی پێدانی کراسەکە تا ئەو کاتەی لە شوشتن بوونەوە، بۆ ئەوەیە کە کراسەکە راستەوخۆ بەر جەستەی بکەوێت، کە راستەوخۆ کراسەکە لە جەستەی ئەو بگوازرێتەوە بۆ جەستەی کچەکەی هیچ رێگرییەك لە نێوانیان نەبێت.

ئەمانە کۆمەڵێك بوون لە مامەڵەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ منداڵەکانی، لە جوان پەروەردکردن و پاراستنیان.

---

[1] بوخاری (١١٧٥) و موسلیم (٩٣٩) گێڕاوەتیانەوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نەوەکانی:

پێغەمبەری خوا ﷺ حەوت نەوەی هەبووە، هەروەکو حەوت منداڵیشی هەبووە، نەوەکانی ئەمانەن:

١. حەسەنی کوڕی عەلی: لە هەموویان زیاتر بە پێغەمبەر ﷺ دەچوو، کوڕی گەورەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب و فاتیمەیە، لە ساڵی سێیەمی کۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی ٤٩ کۆچی وەفاتی کردووە، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد تەمەنی حەوت ساڵان بوو.

٢. حوسەینی کوڕی عەلی: کوڕی دووەمی عەلی و فاتیمەیە، لە ساڵی چوارەمی کۆچی لە دایك بووە، لە ساڵی ٦١ کۆچی وەفاتی کرد.

٣. ئوم کەلسومی کچی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب: پێش وەفاتی پێغەمبەر لە دایك بووە، عومەری کوڕی خەتتاب خوازبێنی کرد، کوڕ و کچێکی لێ بوو، بە ناوی زەیدو روقیە، ئوم کەلسوم و زەیدی کوڕی لە ساڵی ٧٥ کۆچی وەفاتیان کرد.

٤. زەینەبی کچی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندابوو، کە لە دایك بوو، کوڕی مامی خۆی (عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب) خوازبێنی کرد، هەر لەلای ئەو وەفاتی کرد، چەند منداڵێکی لێ هەبوو، منداڵ و وەچەی زینەب لە عبدوڵڵا زۆر زۆرن.

٥. عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانی کوڕی عەففان: کوڕی روقیەی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە وڵاتی حەبەشە لە دایك بوو، تەنیا دوو ساڵ ژیا.

٦. ئومامەی کچی ئەبولعاس: ئەمەیان لە زەینەبی کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ، عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب دوای مردنی فاتیمە خوازبێنی کردو منداڵی لێ نەبوو، عەلی لەلای ئەو وەفاتی کرد، دوای ئەو موغیرەی کوڕی نەوفەل خوازبێنی کرد، هەر لەلای ئەو وەفاتی کرد و منداڵی نەبوو.

٧. عەلی کوڕی ئەبولعاس: برای ئومامەی کچی زەینەب، لە تەمەنی نزیك باڵغ بوون وەفاتی کرد.

بەم شێوەیە نەوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیان نەمان، تەنیا ئەوانەی فاتیمەی کچی نەبێت، لەوەوە وەچە شەریف و پیرۆزەکانی لە ڕێگای هەردوو نەوەی حەسەن و حوسەینەوە بڵاوبوونەوە، ئەوەی لە حەسەن بێت پێی دەگوترێت حەسەنی، ئەوەشی لە حوسەین بێت پێی دەگوترێت حوسەینی.

بەراستی مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ نەوەکانی هەتا پڕی بوو لە خۆشەویستی و بەزەیی و سۆز، ئەو وەك باوکێکی بەخشندە و بە بەزەیی نمونەیەکی ناوازە و دەگمەنە، دیمەنی مامەڵەکردنی لەگەڵ نەوەکانی لە چەند دیاردەیەکی مرۆڤایەتی و بەخشندەیی و بەزەیی پێکهاتووە، لە سەرپەرشتیکردن و ئاگالێبوونیان بە شێوەیەکی ورد و تۆکمە.

ئەگەر منداڵێکی نەوەی بووبایە، بانگی لە گوێی ڕاستی دەدا، ئەمەش بۆ ئەوەی یەکەم شت لە دونیا گوێبیستی بێت ناوی الله و بەرز ڕاگرتنی ئەو ناوە بێت.

ئەبو رافیع دەڵێت: کاتێك فاتیمە حەسەنی بوو لە ناو نوێژدا، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی لە گوێی دا [1].

بۆیە زۆربەی زانایان بە سوننەتیان داناوە، ئەگەر منداڵێك تازە لە دایك بێت، لەبن گوێی بانگ بدرێت، ئەمەش بۆ ئەوەی شەیتانەکان دەربکرێن و یەکەم شتێك گوێبیستی بێت زیکری خوا بێت.

**ابن القیم** دەڵێت: نهێنی بانگدانی (الله أکبر) – خواش زاناترە–، بۆ ئەوەیە یەکەم شت مرۆڤ گوێ بیستی بێت وشەکانی پەروەردگار بێت، کە گەورەیی و شکۆی پەروەردگاری لە خۆگرتووە، هەروەها وشەی شەهادەت، یەکەمین وشەیە مرۆڤ پێی موسڵمان دەبێت، ئەم دوو وشەیە لە کاتی هاتنی بۆ دونیا لەگەڵی دەبێت و لەسەری گۆش دەکرێت تا کاتی دەرچوونیان لە دونیا.

بێگومان بانگدان شوێنەواری خۆی لەسەر دڵی کۆرپەلە جێدەهێڵێت، ئەگەر چی هەستیشی پێ نەکات، لەلایەکی تر سودێکی تری هەیە ئەویش هەڵاتنی شەیتانە لە بیستنی وشەی بانگدان، وادەکات لە یەکەم ئاشنایەتی لەگەڵیدا شەیتانەکەی لاواز بێت [2].

## پاشان پێغەمبەر ﷺ پەنجەی بە مەلاشوویان دەهێنا:

خاتوو عائیشە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: منداڵی تازە لەدایکبوویان دەهێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش پیرۆزی دەکردن و پەنجەی بە مەلاشوویان دەهێنا. [3]

---

[1] ئەم فەرموودەیە ئەگەر سەحیح بێت: ئەبو داود (٥١٠٥) و ترمذي (١٥١٤) گێڕاوەتیانەوە، ترمذي و نەوەوی و ابن الملقن بە "سەحیح"یان داناوە، ابن حبانیش بە "زەعیف"ی داناوە، ئەلبانی سەرەتا بە "حەسەن"ی دانابوو لە کتێبی (الارواء ١١٧٣)، پاشان لە کتێبی (الضعیفة ٦١٢١) بە "زەعیف"ی دانا.. سەیری هەریەکە لە المجروحین (١١٠/٢)، المجموع شرح المهذب (٤٣٤/٨)، البدر المنیر (٢٤٨/٩) و الکلم الطیب (٢١١) بکە.

[2] تحفة المودود (لا ٣١)..

[3] موسلیم (٢٨٦) گێڕاوەتیەوە.

(التحنيك – پەنجەهێنان بە مەڵاشوو): کردارێکە بریتیە لە شل کردنەوەی خورما بەناو لەپی دەست، پاشان شەویلاگ و مەڵاشووی کۆرپەلەی پێ تەڕ دەکرێت، ئەم کارە دروستە بە جگە لە خورماش بکرێت،، بەڵام خورما باشترە [1].

شیرینی خورما باشترینە و گونجاوترین شتە بۆ کۆرپەلە.

دکتۆر موحەممەد عەلی بار ئەندامی دەستەی ئیعجازی زانستی، جەختی لەوە کردۆتەوە، کە زانستی سەردەم کرداری (التحنيك)ی پشتڕاست کردۆتەوە، بەوەی سودی بۆ جەستەی منداڵی تازە لەدایکبوو و گەشەکردنی هەیە، بۆ ئەو مەبەستە هەڵساوە بە راڤەکردنێکی زانستی باوەڕپێکراو.

دەڵێت: ئەو فەرموودانەی لەبارەی (التحنيك– پەنجەهێنان بە مەڵاشوو) هاتوونە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە خواردنی شیرینی یان خورما باشترین شتە بچێتە ناو جەستەی منداڵ.

زانستی نوێش دوای چواردە سەدە حیکمەتی (تحنيك)ی دەرخستووە، دەڵێت: منداڵی تازە لە دایکبوو زۆر مەترسی مردنیان لەسەرە، ئەگەر دوو شت ڕوویدا:

١– کەمبوونی شەکر لە خوێندا.

٢– دابەزینی پلەی گەرمی، کاتێك دەکەوێتە بەر کەش و هەوایەکی سارد.

ڕێژەی شەکر (گلۆکۆز) لە خوێندا لە منداڵی تازە لە دایکبوو بەردەوام نزمە، ئەمەش دەبێتە هۆکارێکە بۆ ئەمانە:

- منداڵەکە شیری دایکی نەخوات.
- خاوبوونەوەی ماسولکەکانی
- وەستانی چەندبارەی کرداری هەناسەدان
- دەرکەوتنی ڕەنگی شین بەلاشەیەوە.

جگە لەمانەش دەبێتە هۆی چەند لاوازییەکەی مەترسیدار وەکو دواکەوتنی گەشە و دەرکەوتنی نیشانەی کەم عەقڵی.

چارەسەریشی ئاسانە، ئەویش بە تواندنەوەی شەکری گلۆکۆز لە ئاودا، ئینجا یان بە ڕێگەی دەم یان بە ڕێگەی دەمار منداڵەکە وەریدەگرێت. هەروەها لێکۆڵینەوە

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٤/١٤)

زانستییەکان دەریانخستووە، کرداری (التحنيك) ماسولکەکانی دەم و شەویلاگ و زمان بە هێز دەکات، ئەمەش وا دەکات منداڵ بتوانێت شیری دایکی بخوات و بیمژێت [١].

لەلایەکی ترەوە خورمای عەجوە پیرۆزە و بنچینەکەی لە بەهەشتەوە هاتۆتە خوارەوە.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"عەجوە لە بەهەشتە و شیفایە بۆ ژەهر"**. [٢]

بەڵام کە دێتە دونیا بێگومان عەجوە دەگۆڕێت، خورمای دونیا ئەو خورمایە نییە کە لە بەهەشتە.

## عەقیقەی بۆ دەکردن:

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دووبەران عەقیقەی بۆ حەسەن کرد و بە دوو بەرانیش بۆ حوسەینی کرد [٣].

عەقیقە: ئەو ئاژەڵە سەربڕاوەیە کە بۆ منداڵ لە دوای لە دایکبوونی سەردەبڕێت. بۆ کوڕ دوو مەڕ، بۆ کچیش یەك دانە.

لەراستیدا عەقیقە سوودێکی گەلێك زۆری هەیە، لەلایەك نزیك کەوتنەوەیە بۆ لای پەروەردگار، لەلایەکی تریش نیشاندانی سەخاوەتییە، هەروەها ئەو کۆت و بەندەی لەسەر منداڵ هەیە دەیشکێنێت. ئەمەش دوور نییە ببێتە هۆی باش بوونی منداڵ و سەلامەتبوونی و پاراستنی لە زیانەکانی شەیتان [٤].

## عەقیقەی دوادەخست بۆ رۆژی حەوتەم:

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی حەوتەم عەقیقەی بۆ حەسەن و حوسەین کرد و ناوی لێنان [٥].

جا سوننەتە لە رۆژی حەوتەم عەقیقەی بۆ بکرێت، ئەگەر لە رۆژی شەممە لە دایك بوو، لە رۆژی هەینی عەقیقەی بۆ بکرێت، واتە رۆژێك بەر لەدایك بوونی کە شەممەیە. ئەگەر لە رۆژی پێنج شەم لە دایك بوو، لە رۆژی چوارشەم بۆی دەکرێت [٦].

---

[١] ماڵپەری (ئیسلام وێب) بە کورتکراوەیی.

[٢] ترمذي (٢٠٦٦) و ابن ماجة (٣٤٥٥) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٤١٣٦) بە سەحیحی داناوە.

[٣] النسائي (٤٢١٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٤/٣٧٩) بە سەحیحی داناوە.

[٤] تحفه المودود بأحكام المولود (لاپەڕە ٦٩).

[٥] ابن حبان (٥٣١١) گێڕاوەتیەوە، فتح الباري (٩/٥٨٩).

[٦] الشرح الممتع (٧/٤٩٣).

هەروەها فەرموویەتی: **"منداڵ بە ستراوەتەوە بە عەقیقەکەی، کە لە ڕۆژی حەوتەم بۆی سەردەبڕێت و ناوی لێ دەنرێ "**.[1] جاری واش هەبووە لە ڕۆژی لە دایك بوونیدا ناوی لێدەنا هەروەکو فەرموویەتی **"ئەم شەو کوڕێکم بوو بە ناوی ئیبراهیمی باوکم ناونا... "**.[2]

**فەرمانی دەکرد مووی سەری منداڵەکە بتاشن، بە ئەندازەی موومکە زیوو بکرێتە خێر:**

ئەبو رافیع خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی لە دلیکبوو، فاتیمەی دایکی ویستی بە سەربڕینی دووبەران عەقیقەی بۆ بکات، فەرمووی: **"عەقیقەی بۆ مەکە، بەڵکو مووی سەری بتاشە و بە ئەندازەی مووەکە زیوو بکە خێر لە پێناوی خوا"**.

پاشان حوسەین لە دایکبوو، هەمان شتی بۆ کرد[3].

کە فەرمووی: **"عەقیقەی بۆ مەکە"**، ویستی عەقیقەکەی بگرێتە ئەستۆی خۆی.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد مووی سەری حەسەن و حوسەین بتاشین و بە ئەندازەی مووەکە زیوو بکرێتە خێر[4].

تاشینی مووی سەری منداڵیش بە سوودە، زانستی پزیشکی نوێ سەلماندوویەتی، کە تاشین مووی سەری منداڵ کونەکانی پێستی سەری دەکاتەوە بۆ ڕواندنی موو یارمەتی دەدات. مەسحکردنی سەری منداڵ دوای تاشینی بە زەعفەران سوننەتێکی لەبیرکراوە و کەم کەس هەیە جێبەجێی بکات.

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: لەسەردەمی نەفایدا ئەگەر عەقیقەیان بۆ منداڵ بکردبایە، پارچە لۆکەیەکیان بە خوێنی عەقیقەکە دەکرد، جا ئەگەر سەریان بتاشیبایە، پارچە لۆکەکەیان لەسەری منداڵەکە دادەنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"لە جیاتی خوێن، -خەلوق- دابنێن[5]"**.

---

[1] ئەبو داود (٢٨٣٨) و ترمذي (١٥٢٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[2] موسلیم (٣١٢٦) گێڕاوەتیەوە.

[3] ئەحمەد (٢٦٦٥٥) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە الارواء (٤٠٣/٤) بە "حەسەن"ی داناوە.

[4] البزار (٦١٩٩) دەگێڕێتەوە، الهیثمي لە (مجمع الزوائد ٨٩/٤) بە "حەسەن"ی داناوە.

[5] ابن حبان لە (الصحیحة ٥٣٠٨) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٤٦٤) بە سەحیحی داناوە.

خەلوق: گوڵاوێکی ناسراوە لە زەعفەران و شتی تر دروست دەکرێت، خۆی بە ڕەنگی سوور یان زەرد نیشان دەدات (النهایة:١٤٤/٢).

## ناوی باشی بۆ هەڵدەبژاردن:

هەڵبژاردنی ناوی باش بۆ منداڵ نەریتی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، هەر ئەمەش نا، بەڵکو ناوی خراپی بۆ ناوێکی باش دەگۆڕێن. یەکێك لە مافەکانی منداڵ لەسەر باوکی ئەوەیە ناوێکی باشی بۆ هەڵبژێرێت، دەبێت لە ناوی بێگانە و ناوی خراپ و قێزەون دووربکەوێتەوە [١].

## یەکێك لە نەوەکانی میزی لەسەر سینگی پیرۆزی کرد، بەلاّم تورە نەبوو:

لوبابەی کچی حاریس دەڵێت: حوسەینی کوڕی عەلی لەسەر سینگی پێغەمبەر ﷺ میزی کرد.

گوتم: پۆشاکێکی تر لەبەر بکە و ئەوەشم بدەرێ بابیشۆم.

فەرمووی: **"ئەو پۆشاکەی مێینە میزی لەسەر دەکات دەبێت بشۆردرێت، بەلاّم بۆ نێرینە تەنیا ئاوی بەسەردا دەپرژێت [٢]"**.

ئەبو سەمح دەڵێت: خزمەتی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، ئەگەر بویستبایە غوسل بکات دەیفەرموو: **"پشتم تێ بکە"**، منیش پشتم تێدەکرد و دەبوومە پەرژین بۆی.

جا حەسەن یان حوسەینیان هێنا، میزی لەسەر سینگی کرد.

منیش هاتم بیشۆم، فەرمووی: **"میزی کچ دەشۆردرێ، بەلاّمیزی کوڕ تەنیا ئاوی بەسەردا دەپرژێندرێت [٣]"**.

ئەبو لەیلا دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوام ﷺ بووم، حەسەن یان حوسەینی لەلابوو، لەسەر سینگ یان لەسەر سکی دانیشتبوو، دەڵێت: بینیم چۆن میزەکە بە خێرایی دەهاتە خوارەوە، ئێمەش هەڵساین بۆی.

---

[١] هەر بۆ خۆشی سەبارەت بەناونان: کارمەندێکی فرۆکەخانە بە پیرەژنێکی گەشتیاری گوت: ناوت چییە؟
گوتی: الصلاة على النبي (سەلاّوات لەسەر پێغەمبەر).
کارمەندەکە گوتی: سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەر، دەڵێم ناوت چییە؟
ئافرەتەکە گوتی: الصلاة على النبي (سەلاّوات لەسەر پێغەمبەر).
کارمەندەکە دیسان گوتی: سەلامی خوا لەسەر پێغەمبەر، دەڵێم ناوت چییە؟
پاشان دەرکەوت ناوی ئافرەتەکە (الصلاة على النبي)یە، واتە سەلاّوات لەسەر پێغەمبەر لێبدە.
بە پیاوێکی تر گوترا: ناوت چییە؟
گوتی: أبو عبدالملك الكريم، الذي يمسك السماء أن تقع على الأرض إلا بإذنه.
پیاوەکە لەبەری هەڵسا و گوتی: مەرحەبات لێ بێ ئەی نیوەی قورئان.

[٢] ئەبو داود (٣٧٤) و ابن ماجة (٥٢٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيح الجامع ٣٨٣) بە سەحیحی داناوە.

[٣] ئەبو داود (٢٧٦) و النسائي (٣٠٤) و ابن ماجة (٥٢٦) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيح الجامع ٨١١٧) بە سەحیحی داناوە.

فەرمووی: **"واز لە کوڕەکەم بێنن، پەشۆکاوی مەکەن تا میزەکەی تەواو دەکات"**. پاشان ئاوی بەسەردا کرد [1].

ئەم فەرموودانە ئەوپەڕی لێبوردەیی و خۆشەویستی و باش سەرپەرشتیکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ نەوەکانی دەردەخەن.

## بە گوتنی چەند زیکرێك نەوەکانی دەپاراست:

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەن و حوسەینی بە زیکر خوێندن لەسەریان دەپاراست و دەیفەرموو: **"أعيذكما بكلمات الله التامة، من كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة"** هەروەها دەیفەرموو: **"بەم شێوەیە ئیبراهیم ئیسحاق و ئیسماعیلی کوڕی دەپاراست"**[2].

واتەی فەرموودەکە:

**"أعيذكما"**، هەردووکتان پەنادەگرم

**"بكلمات الله"**، وتراوە: مەبەست قورئانە یان ناو و سیفەتە بەرزەکانی پەروەردگار.

**"التامة"**، واتە، وشەکانی پەروەردگار بە تەواوی وەسف کراون، هیچ کەموکوڕییەك لە وتەکانیدا نییە. یان واتراوە مەبەست لێی ئەو کەسەی خۆی پێ دەپارێزێت، پەروەردگار لە بەڵایەکان دەیپارێزت و تەنیا ئەو بەسییەتی.

**"من كل شيطان"**، واتە شەیتانی مرۆڤ و جنۆکە.

**"وهامة"**، هەموو شتێکی ژەهراوی دەگرێتەوە، کە ژەهرەکەی بکوژ بێت، بەڵام ئەو ژەهرەی ناکوژێت، پێی دەگوترێت (سامة) وەکو ژەهری زەرگەتە و دوپشك.

**"من كل عين لامة"**، واتە لەو چاوەی زیان دەگەیێنێت [3].

**خەتتابی** دەڵێت: واتە هەموو دەرد و بەڵایەك کە توشی مرۆڤ دەبێت لە شێتی و گێلی. [4]

## هەندێك دوعای فێردەکردن بۆ ئەوەی پێی لە پەروەردگار بپاڕێنەوە:

حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکی فێرکردم کە نوێژی ویتردا بیخۆنم: **"اللهم اهديني فيمن هديت، وعافِني فيمن عافَيت، وتولّني فيمن**

---

[1] ئەحمەد (١٨٥٨٠) گێڕاوەتیەوە، الهيثمي لە (المجمع ٦٣١/١) دەڵێت: "پیاوەکانی جێگای متمانەن"، شعيب الارناؤط بە "سەحیحی"ی داناوە.

[2] بوخاری (٣٣٧١) و ترمذی (٢٠٦٠) گێڕاوەتیانەوە.

[3] تحفة الاحوذي (١٨٤/٦).

[4] فتح الباری (٤١٠/٦).

**تولّيتَ، وبارك لي فيما أعطيتَ، وقني شرَّ ما قَضَيتَ، فإنك تَقضي، ولا يُقضى عليك، وإنّه لايذلّ من والَيتَ، تباركتَ ربّنا وتَعاليت**[1]".

## لەگەڵ خۆیدا دەیبردن بۆ مزگەوت:

ئەبو بەکرە دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ لەسەر مینبەر بینی، حەسەنی کوڕی عەلیشی لە تەنیشت بوو، دەمێك ڕووی لە خەڵکی بوو، دەمێك ڕووی لەو بوو، فەرمووی: "**ئەو کوڕەی من کەسێکی گەورەیە، خوای گەورە وا دەکات ببێتە هۆی ئاشتەوایی نێوان دوو کۆمەڵی گەورە لە موسڵمانان**[2]".

بورەیرەی کوڕی حەسیب دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارێکی بۆ داین لەسەر مینبەر، حەسن و حوسەین هاتن و هەردووکیان دوو کراسی سووریان لەبەربوو، بەردەبوونەوە و هەڵدەستانەوە.

هاتە خوارەوە و لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ سەر مینبەر و پاشان فەرمووی: "**خوای گەورە راستی فەرمووە ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ ﴾ ئەم دووانەم بینی، نەمتوانی خۆم رابگرم**". پاشان دەستیکردەوە بە وتاردان[3].

سەبارەت بە فەرمایشتی پەروەردگار ﴿ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞ ﴾ التغابن: ١٥ واتە: ئەو دووشتانە (ماڵ و منداڵ) مرۆڤ لە بەندایەتیکردنی پەروەردگار سەرقاڵ دەکەن، ڕووالەتی فەرموودەکە وا دەگەیێنێت کە پچڕانی وتارەکەی و هاتنە خوارەوە بۆیان (فیتنە)یە و خۆشەویستی بۆ منداڵ بۆتە هۆکاری/ فیتنەی منداڵیش چەند پلەیەکی هەیە، ئەمە کەمەکەیەتی، هەندێکی تر هەیە مرۆڤ نابێت ئەنجامیان بدات.[4]

## لەناو نوێژدا هەندێکیانی هەڵدەگرت:

ئەبو قەتادەی ئەنساری دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پێشنوێژی بۆ خەڵك دەکرد، ئومامەی کچی ئەبولعاس، کە دەکاتە کچی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا ﷺ،

---

[1] ترمذي (٤٦٤)، ئەلبانی لە (الارواء ٤٢٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] بوخاری (٢٧١٤) گێڕاوەتیەوە.

[3] ئەبو داود (١١٠٩) و ترمذی (٣٧٧٤) و النسائی (١٤١٣) و ابن ماجە (٣٦٠٠) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبی داود ١٠١٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

[4] فتح الباری (١١/٢٥٤).

لەسەر شانی بوو، ئەگەر بچووبایە بۆ رکوع دایدەنا، ئەگەریش لە سوجدە سەری بەرزبکردبایەوە، بەرزی دەکردەوە و دەیهێنایەوە ئامێزی.[1]

## بەرگەی ئەو کارانەی دەگرتن کە لەکاتی نوێژکردندا دەیانکرد:

شەددای کوڕی هاد ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێك لە نوێژەکانی شەو (مەغریب یان عیشا) هات بۆ لامان، حەسەن یان حوسەینی هەڵگرتبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێش کەوت، پاشان منداڵەکەی دانا و (**الله أكبر**)ی نوێژی فەرموو. کاتێك چووە سوژدە، سوژدەکەی زۆر درێژکردەوە.

شەداد دەڵێت: سەرم بەرزکردەوە[2] بینم منداڵەکە لەسەر پشتی پێغەمبەری خوایە، ئەویش لەناو سوژدە دایە، منیش چوومە سوژدە، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆتایی بە نوێژەکەی هێنا، خەڵکی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە نوێژدا سوژدەکەت زۆر درێژکردەوە، تاوا گومانمان برد شتێك روویداوە یان وەحیت بۆ هاتووە.

فەرمووی: "**هیچێك لەمانە ڕوویان نەداوە، بەڵكو كوڕەكەم پشتی منی كردبووە جێگای خۆی، حەزم نەدەكرد پەلەی لێ بكەم، تا لە كارەكەی خۆی تەواو دەبێت**".[3]

## حەسەن و حوسەین بەسەر پشتی دەكەوتن، توڕەش نەدەبوو:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشامان دەکرد، کە دەچووە سوژدە، حەسەن و حوسەین دەچوونە سەرپشتی، ئەگەریش سەری بەرزبکردبایەوە، بە دەستەکانی خۆی بە هێواشی لەسەر زەوی دایدەنان، ئەگەریش دووبارە بچوبایە سوژدە، ئەوانیش دەهاتنەوە، تا لە نوێژەکەی تەواو دەبوو، ئەوکات لەسەر ڕانەکانی خۆی دایدەنان.

ئەبو هورەیرە دەڵێت: هەستام و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەیانگەڕێنمەوە شوێنی خۆیان.

دەڵێت: لەو کاتە هەور بروسکەیەکی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**بڕۆنەوە لای دایكتان**"

---

[1] بوخاری (٥١٦) و موسلیم (٥٤٣) گێڕاوەتیانەوە.

[2] ئەگەر نوێژخوێنێك وا گومانی برد، ئیمام شتێکی لێ بەسەرهاتووە، سەری بەرزکردەوە بۆ ئەوەی بزانێت چی لێهاتووە، پاشان گەڕایەوە بۆ سوژدەکەی ئەوا نوێژەکەی دروستە، هەروەها ئەگەر سەری بەرزکردەوە گومانی برد ئیمام سەری بەرزکردۆتەوە، بۆی دەرکەوت ئیمام هەر لە سوژدە دایە، ئەویش گەڕایەوە سوژدەکەی، نوێژەکەی دروستە.

[3] النسائی (١١٤١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (سنن النسائی ١١٤١) بە "سەحیح"ی داناوە.

دەڵێت: رووناکی هەورە بروسکەکە بەردەوام بوو تا هەردووکیان چونەوە لای دایکیان.[1]

ئەبوبەکر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، ئەگەر سوژدەی ببردبا، حەسەن دەچووە سەرپشتی یان سەر ملی، پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە نەرمی دایدەنا نەوەك بترسێ.

دەڵێت: چەند جارێك ئەمەی کرد.

کاتێك لە نوێژەکەی تەواو بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بینیمان لەگەڵ حەسەن شتێکت کرد، کە پێشتر نەمانبینیوە وا بکەیت.

فەرمووی: **"ئەو رەیحانەی منە لەدونیا، ئەو کورەم کەسێکی گەورەیە -سەیدە-، خوی گەورە دەیکاتە چاکساز، نێوان دوو کۆمەڵەی موسڵمانانی پێ ئاشت دەکاتەوە[2]"**.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ هێنانی منداڵان بۆ مزگەوت، سەبارەت بەو فەرموودەیەش: "مزگەوتەکانتان لە منداڵان و شێتان بپارێزن"، فەرموودەیەکی لاوازە و ئیبن ماجە (٧٥٠) لە وائیلی کوری ئەسقەعەوە گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (ضعيف الجامع ٢٦٣٦) بە "زەعیف"ی داناوە.

مامەڵەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر بنەمای رەحمەت و بەزەیی و نەرمونیانی دامەزراوە، منداڵی بچووك پێویستی بە خۆشەویستی و سۆز و لاواندنەوەی دایك و باوك هەیە، وەك چۆن پێویستی بە خواردن هەیە، لایەنی سۆز و خۆشەویستیش خواردنێکی مەعنەویە و بۆ دورستکردنی کەسایەتییەکی رێك و دروست زۆر پێویستە.

## پێغەمبەر ﷺ نەوەکانی زۆر خۆشدەویستن:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: بە رۆژ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووم، نە ئەو قسەی کرد نە من، تا گەیشتینە بازاڕی (بەنی قەینوقاع)، پاشان رۆیشت تا چووە ماڵی فاتیمە.

فەرمووی: **"ئەو منداڵە کوا، ئەو منداڵە کوا؟"**. مەبەستی حەسەن بوو.

وامەزەندەمان کرد، دایکی شاردبێتیەوە بۆ ئەوەی بیشوات و ملوانکەی لەبەر بکات.

هێندەی پێنەچوو، بە راکردن هات، هەتا هەریەکەیان باوەشی لەویتر دا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"خودایە من خۆشم دەوێت، تۆش خۆشت بوێت، ئەو کەسەی ئەویشی خۆش دەوێت، خۆشتبووێت[3]"**.

ئەبو هوریرەش دەڵێت: پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی فەرموو، کەسی ترم هێندەی حەسەن خۆشنەدەویست.

---

[1] ئەحمەد (١٠٢٨١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٣٣٢٥) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] ئەحمد (١٩٩٩٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الثمر المستطاب ٧٥٧/١) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] بوخاری (٥٨٨٤) و موسلیم (٢٤٢١) گێراوەتیەوە.

ئەوەوی دەڵێت: (**بەڕاکردن هات تا هەریەکەیان باوەشی لەویتر دا**) ئەمە بەڵگەیە لەسەر سوننەت بوونی دواندنی منداڵ و یاری لەگەڵ کردنی، ئەمەش وەك نیشاندانی سۆزو بەزەیی لەگەڵیاندا.

هەروەها فەرموودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە ملوانکە بۆ جوانی لە ملی منداڵ بکرێ، هەروەها سوننەتە شۆردنیان و خاوێنکردنیان بۆ دیدەنی **ئەهلی بەڕێز و باش**[1].

## ئەو دوو نەوەیەی لە دونیادا ڕەیحانەی بوونە:

ئیبن عومەر دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**حەسەن و حوسەین دوو ڕەیحانەی منن لە دونیا**"[2].

ماناکەی ئەوەیە: کە خوای پەروەردگار منی ڕێزدار کردووە بە پێدانی ئەو دووانە، چونکە منداڵ بۆن دەکرێت و ماچ دەکرێت، وەك بڵێی لە بۆن خۆشانن.

کە فەرمووی: "**لە دونیا**"، واتە بەشە ڕەیحانی منن لە دونیا[3].

## منداڵەکانی ماچ دەکردن و دەیگرتنە باوەشی خۆیەوە:

ئەبو هورەیرە ؓ دەڵێت: پێغەمبەری خوا حەسەنی کوڕی ماچ کرد، لەو کاتەدا ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمیش دانیشتبوو.

ئەقرەع گوتی: دە کوڕم هەنە، تاوەکو ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە.

پێغەمبەریش ﷺ تەماشایەکی کرد و فەرمووی: "**ئەوەی بەزەیی بەکەسدا نێتەوە، بەزەیی و ڕەحمی پێناکرێت**".[4]

لەوەڵامدانەوی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەقرەع ئاماژەیەك هەیە ئەویش ئەوەیە کە ماچکردنی منداڵ و بۆن کردنیان لە باوەشکردنیان و دەست لەملکردنیان هەموو ئەمانە خۆشەویستی و سۆزو ڕەحم پێکردنیانە[5].

## منداڵەکانی هەڵدەگرتن و لەسەر شانی خۆی دادەنان:

ئەبو هورەیرە ؓ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، حەسەن و حوسەینیش هەریەکەیان لەسەر شانێکی بوون، جارێك ئەوی ماچ دەکرد، جارێکیش ئەوی دی.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/١٩٣).
[2] بوخرای (٣٧٥٣) و ترمذي (٣٧٧٠) گێڕاوەتەوە.
[3] فتح الباری (١٠/٤٢٧).
[4] بوخاری (٥٩٩٧) و موسلیم (٢٣١٨) گێڕاوەتیانەوە.
[5] فتح الباری (١٠/٤٣٠).

تا گەیشتە لامان، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ ئەوانەت خۆش دەوێت؟

فەرمووی: **"ئەوەی ئەوانەی خۆش بووێت، منی خۆش دەوێت، ئەوەی ڕقیشی لێیان بێتەوە، ئەوا ڕقی لە من دەبێتەوە ".**[1]

ئەگەر ئەمڕۆ حاڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەل حاڵی خۆمان سەبارەت بە مامەڵەکردنمان لەگەڵ منداڵان بەراورد بکەین، شتی زۆر سەیر و سەمەرە دەبینین، زۆربەمان سەرپەرشتیکردنی منداڵ و یاری و گاڵتە لەگەڵ کردنیان بۆ خزمەتکارەکان جێهێشتووە، منداڵ بەیانی تا ئێوارە لە باوەشی ئەو دایکە دەستکردە بەسەردەبات، هیچ ڕێگەیەك بۆ سۆز و خۆشەویستی ڕاستەقینەی دایکی و باوکی نادۆزێتەوە.

تەنانەت دەبینی زمانی دەربڕینی منداڵ لاواز و ناڕێکە، ئەو منداڵانەی لە ژێر دەستی خزمەتکارەکان پەروەردە دەکرێن دەبینی ناتوانن بە تەواوی قسەکانیان دەرببڕن، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری خزمەتکارەکان لەسەریان.

## لیکاوی نەوەکەی دەڕژایە سەر جلوبەرگی، کەچی لای ئاسایی بوو:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حوسەینی کوڕی عەلی لەسەر شانی هەڵگرتبوو، لیکاویشی دەڕژایە سەر پێغەمبەرﷺ.[2]

## بەڵکو لێوی حەسەنی دەمژی:

معاویە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، زمان یان لێوی حەسەنی دەمژی، دەڵێت: هەر زمانێك یان هەر لێوێك پێغەمبەری خوا مژیبێتی، هەرگیز سزا نادرێت[3].

## لەگەڵ خۆی سواری وڵاخی دەکردن:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێك بهاتبایەوە، چاوی بە منداڵی خزمەکانی دەکەوت، دەڵێت: جارێکیان لە گەشتێك هاتەوە، چوومە پێشوازی، منی هەڵگرت و لەبەردەمی خۆی سواری وڵاخی کردم، پاشان یەکێك لە کوڕەکانی فاتیمە هات، لە دوای خۆی سواری کرد[4].

[1] ابن ماجة (١٤٣) و ئەحمەد (٩٣٨١) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٨٩٥) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] ابن ماجه (٦٨٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح ابن ماجة ٥٣٦) بە "سەحیح"ی داناوە.
[3] ئەحمەد (١٦٤٠٦) گێراوەتیەوە، شعيب الارناؤوط بە "سەحیح"ی داناوە.
[4] موسلیم (٢٤٢٨) گێڕاوەتەوە.

ئیاسی کوڕی سەلەمە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من جڵەوی وڵاخی پێغەمبەری خوام گرتبوو ڕام دەکێشا، حەسەن و حوسەینیشی لەگەڵ بوو، تا بردنمەوە ماڵی پێغەمبەر ﷺ، حەسەن لە پێشی سوار بوو بوو، حوسەینیش لە دواوە [١].

## یاری لەگەڵ دەکردن و بە پێکەنینی دەخستن:

سەعیدی کوڕی ئەبو ئەرشەد دەڵێت: یەعلای کوڕی مەررە بۆی گێڕاینەوە، **کە لەگەڵ** پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەعوەتێك دەرچووین، بینیمان حوسەین لەسەر **ڕێگا یاری** دەکات.

پێغەمبەریش ﷺ چووە پێشی و دەستەکانی ڕاخستن منداڵەکان **هەریەکە لەملا و لەملا** ڕایان دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ یاری لەگەڵ کردن، پاشان حوسەینی گرت و دەستێکی لە بن چەناگەی و دەستەکەی تریشی لەسەر سەری دانا و ئینجا ماچی کرد و فەرمووی: "**حوسەین لە منە و منیش لە حوسەینم، خودا ئەو کەسەی خۆشدەوێت کە حوسەینی خۆش دەوێت، حوسەین (سبط)ێکە لە (أسباط)** [٢]".

کە فەرمووی: "**حوسەین لە منە و منیش لە حوسەینم**"، واتە: نێوانمان ئەوەندە پتەوە و یەکگرتووە، دەتوانین بڵێین یەکێکمان بەشێکە لەوی ترمان.

کە فەرمووی: "**حوسەین (سبط)ێکە لە (أسباط)**" واتە ئوممەتێکە لە ئوممەتی خێر، **(أسباط)** بە منداڵەکانی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم و ئەو هۆزانەی لە منداڵەکانی ئیسماعیلن دەگوترێت.

لەوانەشە ماناکەی ئەوەبێت کە هۆزێکی لێ بە پاش دەکەوێت ژمارەیان زۆر دەبێت، وەکو ئاماژەیەك بە زۆربوونی وەچە و نەوەکانی، هەرواش دەرچوو [٣].

دوعای بە ڕەحمەتی بۆ دەکردن:

ئوسامەی کوڕی زەید دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی گرت و لەسەر ڕانی خۆی دانام، حەسەنیشی لەسەر ڕانەکەی تر دانا، پاشان لەباوەشی کردین. فەرمووی: "**خودایە ڕەحمیان پێ بکە، چونکە من ڕەحمیان پێ دەکەم** [٤]".

---

[١] موسلیم (٢٤٢٣) گێڕاوەتیەوە.

[٢] ابن ماجة (١٤٤) و ترمذي (٣٧٧٥) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ١٢٢٧) بە "سەحیح"ی داناوە.

[٣] تحفة الاحوذي (١٠/١٧٨).

[٤] بوخاری (٦٠٠٣) گێڕاوەتیەوە.

### ئەگەر دیارییەکی بۆ بهاتبایە، نەوەکانی لێ بێبەش نەدەکرد:

لەبەر ئەوەی دیاری شوێنەواری باش لە دەروونی مرۆڤەکان بە گشتی و منداڵان بەتایبەت جێدەهێڵێت، بۆیە پێغەمبەری خواش ﷺ دیاری دەدایە منداڵەکانی.

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: نەجاشی هەندێك خشڵ و زیووی بە دیاری بۆ پێغەمبەری خوا نارد لەوانە ئەنگوستیلەیەکی زێڕ بوو، نەخشی حەبەشی لەسەر هەڵکەنرابوو.

دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بە چیلکە دارێك یان بە یەکێك لە پەنجەکانی هەڵیگرتەوە. پاشان بانگی ئومامەی کچی ئەبولعاسی کرد –دەکاتە کچی زەینەب– فەرمووی: **"کچەکەم، ئەمەیان بۆ خۆت، لە پەنجەتی بکە"**[(١)].

### هەر لە منداڵییەوە ڕایدەهێنان بۆ وازهێنان لە حەرامکراوەکان:

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: حەسەنی کوڕی عەلی ﵄ دەنکە خورمایەکی لە خورمای سەدەقە هەڵگرت، بۆ دەمی خۆی برد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"کخ، کخ"**. بۆ ئەوەی فڕێی بدات.

پاشان فەرمووی: **"ئایا نازانیت ئێمە سەدەقە ناخۆین"**.

یەکێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: منداڵانیش وەکو پیاوان لە هەندێك شت قەدەغەدەکرێن و ڕێگریان لێ دەکرێت، ئەم کارەش ئەرکە لەسەر ئەو کەسەی پەروەردەیان دەکات، هەروەها فێرکردنیان لەسەر ئەو شتانەی سوودبەخەشە یان زیانبەخشە، گەرچی منداڵەکە نە گەیشتبێتە تەمەنی تەکەلیف.[(٢)]

### منداڵ وا لەباوکی دەکات لەبەر خاتریان ترسنۆکی و ڕەزیلی بنوێنێت:

یەعلای کوڕی عامیری دەڵێت: حەسەن و حوسەین هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەباوەشی کردن و فەرمووی: **"إن الولد مبخلة ومجبنة"**. واتە: بەڕاستی منداڵ هۆکارێکە بۆ ترسنۆکی و ڕەزیلی.

مەبەست لێی خۆشەویستی مرۆڤ بۆ منداڵەکانی وایلێدەکات ڕەزیل بێت بە ماڵەکەی و لە مردنیش بترسێت[(٣)].

ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ خۆشەویستی زۆری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حەسەن و حوسەین، کە لەباوەشی کردن و ئەم فەرموودەیەشی فەرموو.

ئەمە بوو حاڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ نەوەکانی، کە چۆن بەزەیی پیادا دەهاتنەوە و سۆز و خۆشەویستی خۆی بەسەردا دەڕشتن و سەرپەرشتی و پەروەردەی دەکردن.

---

(١) ئەبو داود (٤٢٣٥) و ترمزی (٣٦٤٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح ابن ماجة ٩٣٩) بە "سەحیح"ی داناوە

(٢) بوخاری (١٤١٩) و موسلیم (١٠٦٩) گێڕاوەتیانەوە.

(٣) شەرحی نەوەوی (١٧٥/٧)، فتح الباری (٣٥٥/٣).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خزمەکانی:

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر ئاگای لە خزمەکانی بوو، خۆشی دەویستن و سەردانی دەکردن و یارمەتی دەدان، ئەوانەی باسی پێغەمبەری خوایان کردووە لەم بارەیەوە گوتوویانە: "لە سەردانیکردنی خزمان و چاکە لەگەڵ کردنیان پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین کەس بووە [١]".

### مامەکانی پێغەمبەر ﷺ

شێری خوا و پێغەمبەر ﷺ، حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب، عەبباس، ئەبوتاڵیب (ناوی عەبدولمەناف بوو)، ئەبولەهەب (ناوی عەبدولعوزا بوو)، زوبەیر، عەبدولکەبعە، موقەویم، ضیرار، قەثم، موغیرە (نازناوی حجیل بوو)، غەیداق (نازناوی موسعەب بوو).. گوتراوە: نۆفل، حارس، هەندێکیان (حارس و موقەویم) بە یەك کەس دادەنێن [٢].

به تەمەنترین مامی (حارس) بووە، بچوکترینیان (عەبباس) بووە.

ئەوانەی گەیشتوونەتە سەردەمی ئیسلام، چوار مامی بوون، ئەوانیش: ئەبوتاڵیب، ئەبولەهەب، حەمزە و عەباس، تەنیا دوویان موسڵمان بوون.

### پورەکانی پێغەمبەر ﷺ

سەفیە دایکی زوبەیری کوڕی عەوام، عاتیکە، بەڕە، ئەروا، ئەمیمە، ئوم حەکیم (البیضاء).

سەفیە موسڵمان بوو، لەسەر موسڵمانبوونی عاتیکە و ئەروا خیلاف هەیە [٣].

### کوڕە مامەکانی پێغەمبەر ﷺ

ژمارەیان گەیشتۆتە ٢٥ کەس، هەمووشیان موسڵمان بوون، تەنیا تاڵیبی کوڕی ئەبوتاڵیب و عوتبەی کوڕی ئەبولەهەب نەبێت.

لە دیارترین ئامۆزاکانی، (عەلی و جەعفەر و عەقیلی) کوڕەکانی ئەبوتاڵیب، (عەبدوڵلا و فەزڵ و عوبەیدوڵلا و قەثم)ی کوڕەکانی عەباس، (ئەبوسوفیان، رەبیعە)ی کوڕەکانی حارس.

---

[١] موسلیم (١٠٧٢) لە عەبدولموتەڵیبی کوڕی رەبیعە گێڕاوەتیەوە.

[٢] زاد المعاد (١/١٠٤).

[٣] زاد المعاد (١/١٠٥).

## کچە مامەکانی پێغەمبەر ﷺ

ئوم هانیئی کچی ئەبوتاڵیب، زەباعەی کچی زوبەید، دورەی کچی ئەبولەهەب، ئومامەی کچی حەمزە.

## منداڵە پورەکانی پێغەمبەر ﷺ

١١ کوڕ و ٣ کچ بوون: لەوانە: عامیری کوڕی البیضاء، عەبدوڵلا و زوهێری کوڕەکانی عاتیکە، عەبدوڵلا و عوبەیدوڵلای کوڕەکانی جەحش، زوبێری کوڕی عەوام، زەینەب و حەمنەی کچەکانی جەحش، هەموویان موسڵمان بوون، تەنیا عەبدوڵلای کوڕی جەحش نەبێت.

## برایانی شیری پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەر چەند برا و خوشکێکی شیری هەبوو، لەوانە: حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیب، ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد، ئەبو سوفیانی کوڕی حاریس، ئاسیا و شەیما.

**پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری موسڵمانانی دەکرد لەگەڵ ماڵ ومنداڵەکانی و خزمەکانی باش بن:**

زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێت: ڕۆژێك لەنزیك ئاوێك بووین پێ دەگوترا (خەم) کە کەوتبۆوە نێوان مەککە و مەدینە، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەناومان هەڵسا و وتارێکی بۆدا ین: سەرەتا سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاری کرد و ئامۆژگاری کردین، پاشان فەرمووی: **"ئەی خەڵکینە منیش مرۆڤم، وانزیکە نێردراوی خوا بێت و منیش وەڵامی بدەمەوە، من دووشتی زۆر تۆکمە و پتەوتان بۆ جێدەهێڵم، یەکەمیان: کتێبی خوای پەروەردگارە، ڕێنوێنی و ڕووناکی تیادایە، ئەوەی دەستی پێوەبگرێت و وەریبگرێت، ئەو کەسە لەسەر هیدایەت و ڕووناکییە، ئەوەشی لەسەری نەڕوات گومڕا دەبێت.**

**ئەهلوبەیتم، زۆر ئاگاداری ئەهلوبەیتم بن، توخوا زۆر ئاگاداری ئەهلوبەیتم بن، توخوا زۆر ئاگاداری ئەهلوبەیتم بن"**.

حەصینی کوڕی سەبرە گوتی: ئەی زەید ئەهلوبەیتی کێنە؟ ئایا خێزانەکانی ئەهلوبەیتی نین؟

زەید گوتی: خێزانەکانی ئەهلوبەیتی ئەون، بەڵام ئەهلوبەیتی ئەوانەن، کە خواردنی سەدەقەیان لەسەر حەرام کراوە.

گوتی: ئەوانە کێن؟

زەید گوتی: خاوخێزانی عەلی و عەقیل و عەباس و جەعفەرن [١].

ئەبوبەکری سدیق ﷺ دەڵێت: خاوخێزان و ئەهلی پێغەمبەر بپارێزن و چاودێرییان بکەن [٢].

چاودێری کردنیان واتە: ئازارنەدانیان و خراپە لەگەڵ نەکردنیان [٣].

خاتوو عائیشە دەڵێت: ئەبوبەکر بە عەلی گوت: سوێند بە خوای گەورە سەردانیکردنی خزمەکانی پێغەمبەری خوام لەلا باشترە لە سەردانی خزمەکانی خۆم [٤].

## پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد و لەلای گریا:

ئەبوهوڕیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد و لەلای گۆڕەکەی گریا، ئەوانەشی لەگەڵی بوون گریان، فەرمووی: **"روخەستم لە پەروەردگار خواست بۆ ئەوەی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم بەڵام روخسەتی نەدام، روخسەتم لێ خواست بۆ سەردانی گۆڕەکەی، رازی بوو، سەردانی گۆڕەکانتان بکەن، چونکە مردنتان بە بیردێنێتەوە"**[٥].

گریانەکەی بۆ ئەوەبوو کە نەگەیشتۆتە پێغەمبەر بۆ ئەوەی باوەڕی پێبهێنێت.

بورەیدە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای نیشانەی گۆڕێك وەستا و پاشان دانیشت، خەڵکیش لە دەوری دانیشتن، سەری دەلەقاند وەك ئەوەی قسە بکات، پاشان گریا.

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ هاتە پێشی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە چییە دەتگرێنێ؟

فەرمووی: **"ئەمە گۆڕی ئامینەی کچی وەهەبە، روخسەتم لە پەروەردگار خواست سەردانی گۆڕەکەی بکەم، رێگەی دام، رووخەستم لێخواست بۆ ئەوەی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەم، رێگەی پێنەدام، پێڕانەگەیشت بە من بگات، بەوام پێ بهێنێت، بۆیە گریام"**.

دەڵێت: هەرگیز پێغەمبەرم پێشتر نەبینیوو هێندەی ئەو کاتە گریابێت [٦].

## پێغەمبەری خوا ﷺ خەمی ئەوەبوو خزمەکانی بانگهێشتی ئیسلام بکات:

ئەبوهوڕەیرە ﷺ دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴾ الشعراء: ٢١٤ پێغەمبەری خوا هەڵسا و فەرمووی: **"ئەی گەلی قورەیش من هیچ شتێکم**

---

[١] موسلیم (٢٤٠٨) گێراوەتیەوە.
[٢] بوخاری (٣٧١٣) گێراوەتیەوە.
[٣] فتح الباری (٧/٧٩).
[٤] بوخاری (٣٧١٢) گێراوەتیەوە.
[٥] موسلیم (٩٧٦) گێراوەتیەوە.
[٦] البیهقی لە (دلائل النبوة ١/١٨٩) گێراوەتیەوە. ئەلبانی لە (صحیح السیرة ص٢٣) بە "سەحیح"ی داناوە.

**لەلایەن خواوە بۆ ئێوە پێناکرێت، ئەی عەبباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب من هیچ شتێکم بۆ تۆ پێ ناکرێت، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد چی لە ماڵ داوام لێ دەکەی دوام لێبکە، چونکە من هیچ شتێکم بۆ تۆ لەلایەن خواوە پێ ناکری"**[1].

واتە: پشت بە نزیکی و خزمایەتی من مەبەستن، چونکە من ناتوام ئەو ناخۆشییە لاببەم گەر خودا بیەوێت بیخاتە سەرتان.

نهێنی ئاگادارکردنەوەی خزمان لەوەدایە، کە ئەگەر لەسەریان کرایە بەڵگە، ئەوکاتە دەپەڕێتەوە بۆ کەسانی تریش[2].

## لە بانگەوازەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ خزمەکانی:

بانگی عەلی کرد بۆ ئیسلام بوون، ئەویش رازی بوو و باوەڕی پێهێنا، بووە یەکەم منداڵ بێتە ناو ئیسلام.

ترمذي دەڵێت: یەکەمین کەس لە پیاوان کە موسڵمانان بوو ئەبوبەکر بوو، لە منداڵانیش عەلی، تەمەنی ئەو کات هەشت ساڵان بوو، لە ئافرەتانیش خاتوو خەدیجە[3].

**خەمخواردنی لەسەر هیدایەتی ئەبوتاڵیبی مامی، سووربوو لەسەر ئەوەی باوەڕی پێبهێنێت:**

سەعیدی کوڕی موسەییب ﷺ، لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك مردن لە ئەبوتاڵیب نزیك بوویەوە، پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای و بینی ئەبوجەهل و عەبدوڵلای کوڕی ئەبو ئومەییەی کوڕی موغیرەش لەوێنە.

فەرمووی: **"ئەی مامە، بڵێ لا إله إلا الله، وشەیەکە دەتوانم لەلای خوای گەورە تکات بۆ بکەم بۆ ئەوەی رزگارت بکات"**.

ئەبوجەهل و عەبدوڵلای کوڕ ئەبو ئومییە گوتیان: ئایا لە میللەتی عەبدولموتەڵیب لادەدەی؟

پێغەمبەر ﷺ بەردەوام بوو لەگەڵی بۆ ئەوەی ئەو وشەیە بڵێت، ئەوانیش هەر ئەو قسەیان پێ دەگوتەوە، تا دواین قسەی ئەبوتاڵیب ئەوەبوو گوتی: ئەو لەسەر میللەتی عەبدولموتەلیبە، رازی نەبوو بڵێت لا اله الا الله .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"سوێند بەخوا بەردەوام داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم، ئەگەر قەدەغە نەکرێم"**.

---

[1] بوخاری (٢٧٥٣) و موسلیم (٢٠٦) گێراوەتیەوە.

[2] فتح الباری (٥٠٣/٨).

[3] سنن ترمذي (٦٤٢/٥).

ئینجا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُمْ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴾ التوبة: ١١٣

واتای ئایەتەکە: (بۆ پێغەمبەر و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، ڕەوا نیە داوای لێ خۆشبوون بۆ موشریك و هاوەڵگەران بکەن هەر چەندە ئەوانە خزمی نزیکیش بن، دوای ئەوەی کە بۆیان ڕوون بۆتەوە کە بەڕاستی ئەوانە نیشتەجێی دۆزەخن).

خوای گەورە لە بارەی ئەبوتاڵیب ئەم ئایەتەی دابەزاند و بە پێغەمبەری خوای فەرموو: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ﴾ [1] القصص: ٥٦

واتای ئایەتەکە: (بەڕاستی ئەی پێغەمبەر تۆ ناتوانیت ئیمان و باوەڕ ببەخشیت بەو کەسەی خۆشت دەوێت، بەڵکو خوا هەر کەسێکی بوێت دەیخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و ئیمانی پێدەبەخشێت).

لە ریوایەتێکی تری سەحیح لەلای ئیمام ئەحمەد (٩٣٢٧)دا هاتووە: ئەبوتاڵیب گوتی: (ئەگەر لەبەر لۆمەی قورەیش نەبێت بڵێن لەبەر ئازاری مردن ئەم قسەیەی گوت، ئەگەرنا دانم بەم وشەیە دا دەنا و چاوم پێ ڕۆشن دەکرد)

**وێڕای ئەوەی مامی لەسەر کوفر مرد، شەفاعەتی بۆ کرد تا سزای لەسەر سووك کرد:**

ئەبو تاڵیبی سوکترین سزای هەیە لە ڕۆژیی قیامەت، ئەمەش بە فەزڵ و گەورەیی تکا و دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی.

ئیبن عەباس رضي الله عنه دەڵێت: سوکترین سزای ئەهلی ئاگر بۆ ئەبوتاڵیبە، کە دوو نەعلەی لەپێ دەکرێت و دەماغی لەگەڵ دەکوڵێت [2].

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب رضي الله عنه دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هیچ سوودێکت بە ئەبوتاڵیب گەیاندووە، چونکە ئەو دەیپاراستی و لەسەر تۆ تووڕە دەبوو؟

فەرمووی: **"بەڵێ، ئەو هەتا گوێزینگی لەناو ئاگردایە، ئەگەر من نەبوومایە ئەوا لە پلەی خوارەوەی ناو ئاگر دەبوو"** [3].

---

[1] بوخاری (٣٨٨٤) و موسلیم (٣٤) گێڕاوەتیانەوە.
[2] موسلیم (٢١١) گێڕاوەتیەوە.
[3] موسلیم (٢٠٩) گێڕاوەتیەوە.

**پێغەمبەر ﷺ ستایشی خزمەکانی دەکرد و دانی بە ماف و پلە و پایەیان دادەنا:**

موتەڵیبی کوڕی وەداعە دەڵێت: عەباس هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو بڵێی شتێکی گوێ لێ بووبێت؟ جا پێغەمبەر ﷺ چوە سەر مینبەر و فەرمووی: **"من کێم؟"**.

گوتیان: تۆ پێغەمبەری خوای، سەلامی خوات لەسەر بێت.

فەرمووی: **"من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەبدولموتەڵیبم، خوای گەورە دروستکراوەکای دروستکردووە و منی لە باشترین بەش داناوە، پاشان ئەوانیشی کرد بە دوو کۆمەڵە، منی لە باشترینیان دانا، پاشان کردنی بە چەند هۆزێك منی لە باشترین هۆز دانا، پاشان کردنی بە خێزان، منی لە باشترین خێزان و لەباشترین رەچەڵەك دانا [١]"**.

(وەك ئەوەی شتێکی گوێ لێ بووبێت): واتە تانە و تەشەر لێدان لە رەچەڵەك

واتە: عەبباس بە هۆی ئەو شتەی گوێبیستی بوو لە تانە و تەشەر لێدان لە رەچەڵەکی پێغەمبەری خوا ﷺ، بە تورەیی هات.

ئەم جۆرە وەسفەش لە باشترین ستایشکردن و پیاهەڵگوتنە بۆ خزمەکانی.

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەباسی فەرموو: **"ئەوە عەبباسە، لە دەستکراوەیی و پەیوەندی خزمایەتی باشترینی خەڵکی قورەیشە [٢]"**.

**پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری عەبباسی مامی وەردەگرت و راوێژی پێدەکرد:**

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: لەساڵی فەتحکردنی شاری مەککە عەباسی کوڕی موتەڵیب، ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی هێنیایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش لە (مر الظهران) موسڵمان بوو [٣].

عەباس پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەبو سوفیان پیاوێکە شانازیی پێ خۆشە، ئەگەر شتێکی بۆ بکەیت. (شانازییەکی پێ بدەیت)

فەرمووی: **"بەڵێ، هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان، پارێزراوە، ئەو کەسەشی دەرگای ماڵی خۆی داخست پارێزراوە [٤]"**.

---

[١] ترمذي (٣٤٥٥)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٤٧٢) بە "سەحیح"ی داناوە.

[٢] ئەحمەد (١٦١٣)، ئەلبانی لە (الصحيحة ٣٣٢٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

[٣] شوێنێکە لە نزیك مەککە.

[٤] ئەبو داود (٣٠٣١) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبي داود٣٠٢١) بە "سەحیح"ی داناوە.

## پەرستنەکانی بۆ راست دەکردنەوە:

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: من لەلای مەیمونەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ مامەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا چووە سەرئاو، پاشان دەستوچاوی شوشت ئینجا خەوت، پاشان هەڵسایەوە چوو سەری گۆزەی ئاوی کردەوە دەستنوێژێکی هەڵگرت و نوێژی کرد.

منیش لە شوێنی خۆم هەڵسام، دەستنوێژێکم هەڵگرت و چووم لەلای چەپی راوەستم، ئەویش گوێچکەی گرتم و منی بردە لای راستی [(١)].

## ئەگەر خرا پەیەکی لە یەکێکیان بدیتبایە، ئاگاداری دەکردنەوە وازی لێبێنێت:

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێت: فضل لە دوای پێغەمبەری خواوە ﷺ بوو ئافرەتێك لە (خثعم)ـەوە هات، فضل تەماشای دەکرد و ئافرەتەکەش تەماشی فضلی دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ رووی فەزڵی بەرەو لایەکی تر وەرگێڕا.

ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باوکێکی پیرم هەیە و ناتوانێ لەسەر پشتی ئەسپ خۆی بگرێت، کاتی حەجیش هاتووە، ئایا لە جیاتی حەج بکەم؟

فەرمووی: "**بەڵێ**"، ئەمەش لە حەجیماڵئاوایی بوو [(٢)].

## لە کارە گرنگەکاندا پشتی پێدەبەستن:

لە بەسەرهاتی پەیمانی (عەقەبە)، کەعبی کوڕی مالیك دەگێڕێتەوە و دەڵێت: چووین بۆ حەج، بەڵێنمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا لە رۆژەکانی (تەشریق) لە عەقەبە یەکتر ببینین.

لە دۆڵەکە کۆبووینەوە و چاوەڕێی پێغەمبەری خوامان دەکرد، تاوەکو هات، عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیبی لەگەڵدابوو، کە ئەوکات لەسەر دینی قەومەکەی خۆی بوو، بەڵام ئەو حەزی لێ بوو لە کۆبوونەوەی برازاکەی ئامادەبێت ویارمەتی بدات.

کاتێك دانیشتین، عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب یەکەمین کەس بوو قسەی کرد و گوتی: ئەی گەلی خەزرەج، دەزانن کە موحەممەد لە ئێمەیە، ئەگەر باوەڕیشمان پێنەهێناوە بەڵام پاراستوومانە و پارێزگاریمان لێکردووە، ئەو لەناو گەلەکەی سەربەرز و قەدرگرانە، ئەو بۆخۆی ئارەزووی هەیە بێتە لای ئێوە، ئەگەر ئێوە دەزانن تواناتان هەیە

---

(١) بوخاری (٦٣١٣) و موسلیم (٧٦٣) گێراوەتیانەوە.

(٢) بوخاری (١٥١٣) و موسلیم (١٣٣٤) گێراوەتیانەوە.

ئەو بەڵێنەی پێتان داوە بیبەنە سەر، لە دوژمنەکانی بیپارێزن، ئەوا فەرموون خۆتان و بەرپرسیارییەکەتان کە لەسەرشانتانە.

ئەگەر دەشزانن، دوای ئەوەی لێرە دەردەچن، تەسلیمی دەکەن و سەرشۆڕی دەکەن، ئەوا هەر لەم ساتەوە وازی لێبهێنن، چونکە لەناو خزم و کەسی خۆیدا قەدرگران و گەورە و پارێزراوە.

وتمان: هەرچیت گوت گوێمان لێ بوو... ئەی پێغەمبەری خوا فەرموو بەڕێزت قسە بکە، بۆ خۆت و خوای خۆت چی پێ خۆشە ئەوە بکە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز بۆ خوێندنەوە و بانگەوازی بۆلای خوای گەورە کرد و بانگەوازی بۆ ئیسلام کرد... هتد [1].

## پێغەمبەر ﷺ چاکەی لەگەڵ خزمەکانی دەکرد:

چاکە و باشییەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ خزمەکانی هەمەجۆر و جۆراوجۆر بوو، گرینگی دەدا بە کاروباریان، هەوڵی دەدا ژن بۆ ئەو کەسانە بێنێت کە هێشتا هاوسەرگیریان نەکردبوو، وەك لە فەرموودەی عەبدولمەتەڵیبی کوڕی رەبیعەی کوڕی حاریسدا هاتووە، کە دەڵێت: رەبیعەی کوڕی حاریس (کە دەکاتە ئامۆزای پێغەمبەر)، و عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب کۆبوونەوە و گوتیان: سوێند بە الله ئەگەر ئەو دوو گەنجە ( کە دەکاتە کوڕەکانیان: موتەڵیبی کوڕی رەبیعە و فەزڵی کوڕی عەباس) بنێرینە لای پێغەمبەر و قسەی لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی وەکو ئەو خەڵکە دایان بنێت لەسەر کۆکردنەوەی زەکات و بەخشین، تا شتێکیان دەست بکەوێت.

کاتێك ئەوان لەو مشتومڕەدا بوون، عەلی کوڕی ئەبو تالیب هات و لەلایان وەستا، ئەوانیش کارەکەیان بۆ باس کرد.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب گوتی: ئەم کارە مەکەن، سوێند بە الله بۆ تان ناکا..

رەبیعەی کوڕی حاریس وەڵامی دایەوە و گوتی: سوێند بە الله حەسادەت پاڵت پێوە دەنێت بۆ ئەوەی ئەو کارەمان بۆ نەبێت، چونکە بویتە زاوای پێغەمبەر و حەسادەتمان پێ دەبەیت.

عەلی گوتی: دەی بیانێرین.. ئەوانیش رۆیشتن.

---

[1] رواه أحمد (١٥٣٧١ ) وصححه الالبانى فى فقه السيرة (١/ ١٤٦ )

عەلی چاکەتەکەی راخست و لەسەری پاڵدایەوە، پاشان گوتی: من باوکی حەسەنم و شارەزاییم هەیە لە کاروبارەکان، سوێند بە الله لەم جێگایە لاناچم تا هەردوو کوڕەکانان بە دەست بە تاڵی نەگەڕێنەوە.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا نوێژی کرد، پێش ئەو چووینە حوجرەکەی و لەوێ وەستاین، کە هات گوێیەکانی ئێمەی گرت و پاشان فەرمووی: **"ئەوەی لە دڵتانە ئاشکرای بکەن"**.

پاشان چووە ژوورەوە ئێمەش دوای کەوتین، کە لەلای زەینەبی کچی جەحش بوو.

هەریەکەمان ویستی پێش ئەوی تر قسە بکات، پاشان یەکێمان قسەی کرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ باشترین کەس و باشترین خزمی، ئێمەش وا کاتی ژن هێنانمان هاتووە، بۆ ئەوە هاتووین تا لەسەر کۆکردنەوی زەکات و بەخشین دامان بنێیت، ئەوەی ئەم خەڵکە دەیکات ئێمەش بیکەین و ئەوەی ئەوان وەری دەگرن ئێمەش وەری بگرین.

جا ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، تا ویستمان قسەی لەگەڵ بکەین، زەینەب لە پشت پەردەوە ئاماژەی بۆ دەکردین کە قسەی لەگەڵ نەکەین.

ئینجا فەرمووی: **"سەدەقە و زەکات بۆ خزمانی پێغەمبەر نابێت**[1]**. بەڵکو ئەمە پیسی مرۆڤەکانە، بۆیە نە بۆ موحەممەد نە بۆ خزمانی موحەممەد نابێت، بڕۆن بۆم بانگی مەحمیەی کوڕی جەم بکەن"** کە پیاوێك بوو لە نەوەی ئەسەد پێغەمبەر ﷺ کردبووی بە بەرپرسیار لەسەر کۆکردنەوەی پێنج یەك، لەگەڵ نەوفەلی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەڵیب.

دەڵێت: جا هەردووکیان هاتن، بە مەحمیەی فەرموو: **"کچەکەی خۆت بدە ئەم کوڕە"** واتە بیدە بە فەزڵی کوڕی عەباس، ئەویش لێی مارەکرد.

بە نەوفەلی کوڕی حاریس فەرمووی: **"تۆش کچەکەی خۆت بدە ئەو کوڕە"**. ئەویش لێی مارەکرد.

ئەم جارە بە مەحمیەی فەرموو: **"لە پێنج یەك ئەوەندە و ئەوەندەیان پێ ببخەشە**[2]**"**.

سەبارەت بەوەی کە فەرمووی: **"لە پێنج یەك پێیان ببەخشە"**، لەوانەیە مەبەستی بەشی خزمان بێت لە پێنج یەك، چونکە لە نزیکەکانن، لەوانەشە مەبەستی بەشی پێغەمبەر بێت لە پێنج یەکەکە[3].

---

[1] خێر بە خزمانی پێغەمبەر حەرامە، جا بە هۆی کارکردن بێت یان بەهۆی هەژاری و نەداری بێت، یان بە هۆکاری ئەو هەشت پلەیەی باسکراون بۆ پێدانی زەکات.

[2] موسلیم (١٠٧٣) گێراویەتیەوە.

[3] سەیری: شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم بکە (١٨٠/٧).

**هەر لە چاکەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ خزمەکانی: کاتێك عەباسی مامیان لە جەنگی بەدر بە دیل هێنا، هیچ پۆشاکێکی لەبەر نەبوو، داوای کرد پۆشاکێکی بۆ بێنن بۆ ئەوەی لەبەری بکات:**

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: لە ڕۆژی بەدر لەگەڵ هێنانی دیلەکان، عەباسیشان هێنا، هیچ پۆشاکێکی لەبەر نەبوو، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد کراسێکی بۆ ببەن، گەڕان بینیان کراسەکەی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی بۆ دەبێت [1]، پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی پێ لەبەر کرد و لەبەرامبەردا کراسەکەی خۆی بۆ عەبدوڵلا لەبەر کرد [2].

ئیبن عویەینە دەڵێت: چونکە چاکەیەکی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردبوو، بۆیە ویستی پاداشتی چاکەکەی بداتەوە [3].

**کاتێك خێر و بێری بەحرێنی بۆ هات، عەباسی مامی لە بیر نەکرد:**

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: هەندێك ماڵ و سامان لە بەحرێن بۆ پێغەمبەر ﷺ هات [4].

فەرمووی: **"لە مزگەوت پەرشوبڵاوی بکەن"**، ئەو ماڵە زۆرترین ماڵ بوو، کە بۆ پێغەمبەر هاتبێت.

پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژ دەرچوو و ئاوڕی لێ نەدایەوە.

کاتێك لە نوێژ تەواو بوو، هاتەلای و دانیشت، هەر کەسێکی بینیبایە هەندێکی پێ دەدا.

لەو دەمە عەباس هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێك لەو ماڵەم بدەرێ، چونکە من خۆم عەقیلم کڕیەوە (کە هەردووکیان لە شەڕی بەدر بەدیل گیرابوون).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بیبە"**.

ئەویش هەندێکی لەناو کۆشی خۆی کرد، پاشان ویستی هەڵیبگرێت بەڵام نەیتوانی.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەرمان بکە یەکێك بۆم بەرز بکاتەوە.

فەرمووی: **"نا"**.

گوتی: کەواتە تۆ یارمەتیم بدە.

فەرمووی: **"نا"**.

---

[1] ئەمە لەبەر ئەوە بوو، کە عەباس زۆر درێژ بوو، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیش وەك ئەو درێژ بوو.

[2] واتە لە کاتی مردنی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی.

[3] بوخاری (٣٠٠٨) گێڕاویەتیەوە.

[4] ئەو ماڵە عەلائی کوڕی حەزرەمی نارد بووی، وەك سەرانەی خەڵکی بەحرێن کە ئاگرپەرستی (هەجەر) بوون.

هەندێکی لێ دەرهێنا، پاشان ویستی هەڵیبگرێت، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا فەرمان بکە یەکێك یارمەتیم بدا.

فەرمووی: **"نا"**.

گوتی: کەواتە تۆ یارمەتیم بدە.

فەرمووی: **"نا"**.

پاشان هەندێکی تری لێ دەرهێنا و ئینجا بەرزی کردەوە سەرشانەکانی و ڕۆیشت.

پێغەمبەر ﷺ نە هەڵسا و نە درهەمێکیشی لێ کەم کرد [1].

لەم فەرموودەیەدا سەخاوەتی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات کە ئاوڕیشی لەو هەموو سەرەوەت و سامانە نەدایەوە.

عەباسیش پیاوێکی بەهێز و چوارشانەبوو، وادیارە ئەو ماڵێکی زۆر هەڵگرت، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگری لێ نەکرد [2].

لەوانەیە کە پێغەمبەر ﷺ یارمەتی نەدا بۆ هەڵگرتنی و فەرمانیشی نەکرد کەس یارمەتی بدا، هەتا هەندێکی کەم بکاتەوە لەوەی بردوویەتی و تەنیا ئەوەندە ببات کە خۆی پێی هەڵدەگیرێت، ئەوەشی بردی پێغەمبەر ﷺ ڕێگری لێ نەکرد.

لە ڕاستی عەباس لە دەوڵەمەندەکانی قورەیش بوو، ماڵێکی زۆری هەبوو، بەڵام بە هۆی قەرزداری لەبەر کڕینەوەی خۆی و عەقیل پێویستی بەو ماڵە هەبوو.

**هەر لە یارمەتییەکانی بۆ خزمەکانی: بانگکردنیان بۆ ئەوەی گەشتی حەجی لەگەڵدا بکەن، ئەوانەشی نیازیان نەبوو بچن، دەیویست ڕازیان بکات:**

هەروەکو لە چیرۆکی -ضباعة- دا هاتووە، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ چوە لای و پێی فەرموو: **"دەتەوێت حەج بکەیت؟"**.

گوتی: هەروەکو دەمبینی، کە نەخۆشم.

پێی فەرموو: **"حەج بکە و مەرج دابنێ و بڵێ: خودایە لە کوێ پێم نەکرا حەجەکە تەولو بکەم، لە ژێر جلی ئیحرام دەچمە دەرێ"** [3].

---

[1] بوخاری (٣١ ٦٥) گێڕاوەتیەوە، أبو النعيم لە (المستخرج)، فتح الباری (١/٥١٦).

[2] فتح الباری (٣/١٧٨)ی ابن رجب

[3] بوخاری (٥٠٨٩) و موسلیم (١٢٠٧) گێڕاوەتیانەوە.

**پێغەمبەرﷺ لە نزیکەوە ئاگاداری کاروباری خزمەکانی بوو، گرینگی بە تەندروستیان دەدا:**

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری موڵەتی بە بنەماڵەی (حەزم) دا بۆ ئەوەی نوشتە بۆ پێوەدانی مار بکەن.

بە ئەسمای کچی عومەیسشی گوت: **"چییە دەبینم جەستەی کوڕەکانی برام ئەوەندە لاواز و بێهێزن؟ پێویستیان بە خواردنە؟"**.

گوتی: نەخێر، بەڵکو زوو چاو زاری لێیان دەدا.

فەرمووی: **"نوشتەیان لەسەر بخوێنە"**.

منیش: پێم نیشاندا.

فەرمووی: **"نوشتەیان لەسەر بخوێنە** [(١)]**"**.

دایکی مونزیری کچی قەیسی ئەنساری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەلام و عەلی لەگەڵدا بوو، عەلی نەخۆشبوو هێشتا بەتەواوەتی چاك نەببۆوە، چەند هێشووە خورمایەکی پێنەگەیشتوومان هەڵواسیبوو.

پێغەمبەر ﷺ هەڵسا لێی خوارد، عەلیش هەڵسا بۆ ئەوەی لێیان بخوات، پێغەمبەریش ﷺ بە عەلی فەرموو: **"نەکەی؟ تۆ هێشتا چاك نەبوویتەوە"**، تا عەلی وازی لێ هێنا.

دەڵێت: خواردنێکم لە جۆ و سلْق دروست کرد و بۆ پێغەمبەری خوام هێنا،

**پێغەمبەر بۆ راپەراندنی کاروبارەکانی پشتی بە خزمەکانی دەبەست و کاری پێ دەسپاردن:**

لەوانە:

- فەرمانی بە عەلی کرد ﷺ لە شەوی کۆچکردندا لە جێگای ئەودا بخەوێت.
- عەلی کردە ئەمیری سوپا لە خەیبەر.
- هەندێك لەو قوربانیانەی لە حەج مابوو، دای بە عەلی بۆ ئەوەی سەریان ببڕێت و گۆشت و پێست و زینی سەرپەشتیان بکاتە خێر و بەسەر خەڵکیدا دابەشیان بکات.

عەلی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر خوا ﷺ سەد وشتری بەخشی، فەرمانی بە من کرد گۆشتەکەیان دابەش بکەم، پاشا فەرمانی کرد زینی سەرپشتیان دابەش بکەم، جا منیش دابەشم کرد، پاشان فەرمانی پێکردم پێستەکەیان دابەش بکەم و منیش وام کرد [(٢)].

---

(١) موسلیم (٢١٩٨) گێڕاوەتیەوە.

(٢) بوخاری (١٧١٨) و موسلیم (٢٣٢١) گێراوەتیانەوە

هەروەها جەعفەری کوڕی مامی دانا بە ئەمیر لەسەر ئەوانەی بۆ حەبەشە کۆچیان کرد، یەکەمین کەس بوو کە نامەی پێغەمبەری ﷺ دایە پادشای حەبەشە، هەر ئەویش بوو لەگەڵ نەجاشی قسەی کرد و بە کورت و پوختی بۆی باسی ئیسلام کرد.

**کاتێك جەعفەر لە حەبەشە گەڕایەوە، پێغەمبەر ﷺ زۆر دڵی پێخۆش بوو:**

دوای فەتحی خەیبەر جەعفەر گەڕایەوە لای پێغەمبەر ﷺ، جا ئەو کاتەی گەیشتەلای لەبەری هەڵسا، باوەشی پێداکرد و نێوچەوانی ماچ کرد و فەرمووی: "**نازانم بە کامەیان دڵخۆش بم، بە هاتنەوەی جەعفەر یان بە فەتحی خەیبەر**"[(١)].

جا پێغەمبەر ﷺ لە تەنیشت مزگەوت جێگایەکی بۆ تەرخان کرد و چەند شتێکی لە دەسکەوتی خەیبەر پێدا.

لە دوای زەیدی کوڕی حاریسە لە جەنگی (موئتە) کردیە ئەمیری سوپا.

**کاتێك جەعفەر لە جەنگی (موئتە) شەهید بوو، پێغەمبەر ﷺ دڵنەوایی خێزانەکەی کرد و کاروبارەکانی گرتە ئەستۆی خۆی:**

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سوپایەکی نارد زەیدی کوڕی حاریسەی کردە ئەمیر بەسەریانەوە، فەرمووی: "**ئەگەر زەید کوژرا یان شەهید بوو ئەوا جەعفەر بکەنە ئەمیر، ئەگەریش ئەو کوژرا یان شەهید بوو ئەوا ئەمیرتان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەیە**".

جا هەواڵیان گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ، هەڵسا چوو بۆ ناو خەڵك و وتاری دا و سوپاسی خوای کرد و فەرمووی: "**براکانتان ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە و زەید ئاڵاکەی هەڵگرت، جەنگا تاوەکو کوژرا یان شەهید بوو، لە دوای ئەو جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب ئاڵاکەی هەڵگرت ئەویش شەڕی کرد تا کوژرا یان شەهید بوو، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەیی هەڵگرت، ئەویش جەنگا تا کوژرا یان شەهید بوو، پاشان شێرێك لە شێرەکانی خودا، کە خالیدی کوڕی وەلیدە، ئاڵاکەی هەڵگرت و خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو سەرکەوتنی بەخشی**".

جا پاش سێ ڕۆژ هاتە لای کەس و کاری جەعفەر فەرمووی: "**چیتر مەگرین بۆ جەعفەری برام، کوڕەکانیم بۆ بانگ بکەن**"[(٢)].

---

[(١)] حاکم لە (المستدرك: ٤٢٤٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الفقه السیرة) بە "حەسەن"ی داناوە (٣٤٧/١).

[(٢)] کوڕەکانی عەبدوڵڵا و عەون و موحەممەد بوون.

دەڵێت: ئێمەیان هێنا کە وەك جوجەی باڵندە وابووین.

فەرمووی: **"سەرتاشم بۆ بانگ بکەن"**.

جا سەرتاش هات و سەری تاشین [(١)].

پاشان فەرمووی: **"سەبارەت بە موحەممەد ئەوا دەڵێی نوسخەی ماممان ئەبو تالیبە، عەبدوڵلاش لە شێوە و روخسار و رەوشت بە من دەچێت"**.

پاشان دەستی منی گرت و فەرمووی **"خودایە کەسێکی باش بکەیە سەرپەرشتی خێزانی جەعفەر و بەرەکەت بخەیتە ماڵی عەبدوڵلا"**. ئەمەی سێ جار فەرموو.

لەو دەمەدا دایکمان هات و باسی هەتیوی ئێمەی کرد، غەمباری بۆ دەربڕین.

فەرمووی: **"ئایا لە هەژاری لێیان دەترسیت، من لە دونیا و دوارۆژ خەمخۆریانم"**[(٢)].

**منداڵە بچوکەکانی لە باوەش دەگرت و دەستی بەسەریدا دەهێنان و دوعای بۆ دەکردن:**

عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر دەڵێت: من و قەثم و عوبەیدوڵلای کوڕی عەبباس یاریمان دەکرد، پێغەمبەر ﷺ بە سواریەك بەلاماندا تێپەڕ بوو، فەرمووی: **"ئەمەیانم بۆ بەرز بکەنەوە"**. جا لە پێشە خۆمی دانام، بە (قەثم)یشی فەرمووی: **"ئەمەشم بۆ بەرز بکەنەوە"** ئەویشی لەپشتە خۆی دانا.

دەڵێت: پاشان سێ جار دەستی بەسەرمدا هێنا و هەرکاتێك دەستی پێدا بهێنایە دەیفەرموو: **"خودایە ئەم کوڕە بکەیە جێنشینی جەعفەر"**[(٣)].

**هەر لەسەرپەرشتی پێغەمبەر ﷺ بۆ خزمەکانی و گرینگی دان پێیان:**

دڵتەنگ دەبوو کاتێك یەکێکیان تووشی ناخۆشییەك بوایە، کاتێك حەمزەی مامی کوژرا و لاشەکەی شێونرا، زۆر زۆر غەمبار بوو بۆ لە دەستدانی ئەوەی بەسەری هاتووە.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: کاتێك حەمزە شەهید بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری وەستا، لاشەکەی شێونرابوو، هەرگیز پێغەمبەر هێندە غەمبار نەبوو بوو وەك غەمباربوونی بەم کارەساتە، فەرمووی: **"رەحمەتی خوات لێ بێت، تۆ سەردانی خزمەکانت دەکرد، خێرخواز بوویت و ئەگەر لەبەر خەمی ئەوە نەبووایە لە دوای خۆت،**

---

(١) بۆیە سەری تاشین چونکە دایکیان لەبەر غەمباری و دڵتەنگی بە هۆی شەهید بوونی مێردەکەی نەدەپرژایە سەر شانەکردنی قژیان، جا بۆیە ویستی لە پیسی ئەسپێکان پاکیان بکاتەوە.

(٢) ئەحمەد (١٧٥٣) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (أحکام الجنائز/ لا ١٦٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٣) ئەحمەد (١٧٦٣) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (أحکام الجنائز/ لا ١٦٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

**خەمت بۆت دەخۆن، ئەوا حەزم لێ بوو لە دەمی چەند درندەیەکدا حەشر بکرێیت، سوێند بە خوا دەبێ لە جیاتی تۆ حەفتا لاشەی ئەوان بشێوێنم"**.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەستابوو، جوبریل ئەو ئایەتەی سورەتی نەحلی دابەزاند ﴿ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴾ النحل: ١٢٦ واتە: (ئەگەر ویستتان تۆڵە بکەنەوە، دەبێت هەر بەقەدەر ئەو ستەمەی کە لێتان کراوە تۆڵە بکەنەوە، خۆ ئەگەر ئارامگر و خۆگر بن، ئەوە چاکترە بۆ ئارامگر و خۆگران).

جا پێغەمبەر ﷺ کەفارەتی سوێندەکی دا و ئەوەی ویستی نەیکرد [1].

**پێغەمبەر ﷺ زۆر دوعای بو خزمەکانی دەکرد، لەوانە:**

دوعاکردنی بۆ عەباس و کوڕەکانی: ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەباسی فەرموو: **"بەرەبەیانی رۆژی دووشەمە خۆت و کوڕەکەت وەرنەلام، تا دوعا بۆ خۆت و کوڕەکەت بکەم و دوعایەك سودی بۆ تۆ و کوڕەکەت هەبێت"**.

جا بەیانی رۆیشت و ئێمەش لەگەڵیدا رۆیشتن، پۆشاکێکی لەبەر ئێمە کرد و پاشان فەرمووی **"خودایە لە عەباس خۆش ببە، لە کوڕەکەشی خۆش ببە، بە لێخۆشبوونێکی دیار و ئاشکرا، بۆ ئەوەی هیچ گوناهێکیان نەمێنێت، خودایە کوڕەکەی بپارێزە [2]"**.

دوعاکردنی بۆ عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب: عەلی ﷺ دەڵێت: کاتێك ئەبو تاڵیب مرد، هاتمە لای پێغەمبەر ﷺ پێم گوت: مامە پیرەکەت مرد.

فەرمووی: **"برۆ ئەسپاردەی بکە، هیچ شتێك دوای ئەو مەکە تا دێیەوە لام"**.

دەڵێت: جا ئەسپاردەمان کرد و پاشان هاتمەوە لای.

فەرمووی: **"برۆ غوسل بکە، هیچ شتێك دوای ئەو مەکە تا دێیەوە لام"**.

دەڵێت: غوسلم کرد و پاشان هاتمەوە لای.

دەڵێت: چەند دوعایەکی بۆ کردم، کە دڵم ئەوەندە پێیان خۆش بوو، زیاتر لەوەی چەند وشترێکی سووریان پێدابام [3].

دوعای بۆ ئیبن عەباس: ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە باوەشی گرتم و فەرمووی **"خودایە دانایی فێر بکە"**.

---

[1] الحاکم (٤٨٩٤) گێڕاوەتیەوە، الطبراني لە (المعجم الکبیر ١٤٣/٣) بە سەنەدی "زەعیف" گێڕاوەتیەوە، الحافظ لە (الفتح) ٣٧١/٧).

[2] ترمذي (٢٥١٦) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

[3] ئەحمەد (٨٠٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (أحکام الجنائز/ لا ١٣٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

لە ریوایەتێكی تردا هاتووە، كە پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەرئاو، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادەكرد.

فەرمووی: "**كێ ئەمەی كرد؟**".

هەواڵیان پێدا.

فەرمووی: "**خودایە لە ئایین شارەزای بكەیت**[1]".

ئەحمەد ئەم فەرموودەیە بە ژمارە (٣٠٢٤) گێڕاوتەوە و ئەمەی زیاد كردووە و"**خودایە لە لێكدانەوە (تأويل) شارەزی بكەی**".

## هەروەها فێرە دوعای بە سوودی دەكردن:

عەباسی كوڕی عەبدولموتەڵیب ﷺ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا شتێكم فێر بكە پێی بپاڕێمەوە لە خوا..

فەرمووی: "**داوای عافیە (سەلامەتی) لە خوا بكە**".

چەند رۆژێكم بەسەر برد، پاشان هاتمەوە گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا شتێكم فێر بكە پێی لە خوا بپاڕێمەوە.

پێی گوتم: "**ئەی عەباس، داوای عافیە بكە لە خوا لە دونیا و دوارۆژ**[2]".

فەرمان كردنی بە عەباس دووجاران، كاتێك داوای لێكرد شتێكی فێر بكات پێی لە خوا بپاڕێتەوە، كە فەرمووی داوای عافیە –سەلامەتی– بكە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی عافیەت و سەلامەتبوون، بەڵگەشە كەهیچ شتێك باشترنییە لە عافیەت، هیچ دوعایەك ناگاتە ئەو دوعایە پڕ سودە بۆ ئەوەی لە خوا داوای بكەن.

پێغەمبەر ﷺ بەم شێوەیە سەیری مامی عەباسی دەكرد، كە لە جێگای باوكیەتی، وای دادەنا وەكو باوكێك كە مافی بەسەر كوڕەكەی هەیە، مافی هەیە.

تایبەتكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو دوعایە لەناو ئەم هەموو دوعایە، بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و سوودی ئەم دوعایە و گشتگیریی و پڕمانابیەكەی، جا پێویستە لەسەر ئەوانەی دەیانەوێ لە خوا بپاڕێنەوە با ئەم دوعایە بكەن و لە هەموو كاروبارەكانیان پشتی پێ ببەستن[3]..

---

[1] بوخاری (١٤٣) و موسلیم (٢٤٧٧) گێراوەتیانەوە.

[2] ترمذي (٣٥١٤) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩٣٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] تحفة الاحوذي (٣٤٨/٩).

## گەر نەخۆش بکەوتنایە سەردانی دەکردن:

دایکی فەزڵ ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای عەباس، لەبەر زۆری ئازارەکەی ئاخ و ئۆفی هەڵدەکێشا و خۆزگەی مردنی دەخواست.

پێغەمبەری ﷺ فەرموی: **"ئەی عەباس ئەی مامی پێغەمبەر، خۆزگەی مردن مەخوازە، ئەگەر چاك بیت، چاکەت زیاد دەبێت و ئەمەش باشترە، ئەگەر خراپ بیت مۆڵەتت پێ دەدرێت بۆ ئەوەی تەوبە بکەت، جا خۆزگە بە مردن مەخوازە [1]"**.

## لەسەر کاری خێر هانیدەدان:

پێغەمبەر ﷺ خزم و کەسەکانی هاندەدا لەسەر کاری خێر و زیادکردنی.

لە فەرموودەی حەجکردنی پێغەمبەر ﷺ، جابر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ تەواف ئیفازەی لەدەوری کەعبە کرد، پاشان نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد، دواتر هاتەی لای کوڕانی عەبدولموتەڵیب، کە خەریکی ئاو هەڵێنجان بوون لەبیر زەمزەم، فەرمووی: **"ئەی کوڕانی عەبدولموتەڵیب ئاو هەڵێنجن، گەر لەبەر جەنجاڵی خەڵك نەبوایە لەسەرتان ئەوا منیش دەهاتم ئاوم لەگەڵتان دەردەهێنا"**.

جا دۆلکەیەکی ئاویان دەرهێنا ئەویش لێی خواردەوە [2].

پێغەمبەر ﷺ ئەوانی لەسەر ئەم کارە چاکە هان دا، کە ئاودانی حاجیانە لەبیری زەمزەم، چونکە خێر و بێرێکی قیامەتی زۆر هەیە، فەرمانەکەشی بۆیان بۆ سوننەتە نەوەك واجب.

نەوەوەی دەڵێت: ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە، کە خەڵك وا تێبگەن ئەوە ڕێوڕەسمی حەجە، جا قەرەباڵغیان لەسەرتان دروست بکردبایە و زاڵ بوونایە بەسەرتان و پاڵیان پێوە نابان و کاری ئاودانیان لێ تێکبدان، ئەوا لەبەر پڕخێری ئەو ئاودانە، لەگەڵتان ئاوم هەڵدەهێنجا [3].

## لەگەڵ ئەوەی خزمی بوون، لە کاروباری ئاییین چاوپۆشی لێ نەدەکردن:

ئەنەس ﵁ دەڵێت: چەند پیاوێك لە ئەنسارییەکان مۆڵەتیان لە پێغەمبەر ﷺ خواست، بۆ ئەوەی فیدیەی عەباسی کوڕی خوشکیان بدەن [4].

پێغەمبەر فەرمووی: **"نەخێر، بەڵکو درهەمێکیش نادەن [5]"**.

---

[1] ئەحمەد (٢٦٣٣٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب ٣٣٦٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] موسلیم (١٢١٨) گێڕاوەتیەوە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٩٤/٨).

[4] چونکە عەباس لە بەدر بە دیل گیرابوو، موشریکەکان بە زۆر لەگەڵ خۆیان هێنابوویان.

[5] بوخاری (٢٥٣٧) گێڕاوەتیەوە.

کە وتیان عەباسی کوڕە خوشکمان، لەبەر ئەوەبوو کە ئەوان خاڵی عەبدولموتەڵیبی باوکی بوون، چونکە دایکی عەبدولموتەڵیب سەلمای کچی عەمری کوڕی ئەحیحە لە نەوەی کوڕانی نەجار بوو لەوان.

بۆیەش گوتیان کوڕە خوشکمان، بۆ ئەوەی منەتەکە بکەوێتە سەر ئەوان لە ئازادکردنی بە پێچەوانەی ئەوەی بیان گوتبایە مامت، ئەو کات منەتەکە دەکەوتە سەر پێغەمبەر ﷺ، ئەمەش ئەوپەڕی زیرەکی و ئەوپەڕی ڕێز و ئەدەبە لە قسەکردندا [1].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئیبن عائیز لە (مەغازی)ـەوە گێڕاویەتیەوە کاتێك عومەر دەستی دیلەکانی توند بەست، هی عەباسیشی توند کرد، پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دەنگی عەباس بوو دەینالاند، جا خەوی لێنەکەوت، ئەمە بە ئەنسارییەکان گەیشت، دەستی عەباسیان کردەوە، ئەنسارییەکان وەك بڵێی کاتێك بینیان پێغەمبەر ﷺ ڕازی بوو بە دەست کردنەوەی، داوایان لێکرد فیدیەکەشی بدەن، بۆ ئەوەی زیاتر دڵی خۆش بێت، بەڵام بۆ ئەمە وەڵامی نەدانەوە [2].

بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو بەم کارەیان، بۆ ئەوەی وانەزانرێ لە دیندا خاتر خاترانێ هەیە [3].

هەر لە هاوشێوەی ئەوە: پێغەمبەر ﷺ یەکەمین تۆڵەسەندنەوەی سەردەمی نەفامی یەکێك لە خزمەکانی بەتاڵ کردەوە، یەکەمین ڕیباشی کە بەتاڵ کردەوە ڕیبای عەباسی مامی بوو.

ئەمەش لەم کاتە بوو، کە لە عەرەفە وتارێکی خوێندەوە و فەرمووی: "**هەموو کاروبارەکانی سەرەمی نەفامی لە ژێر پێیەکانمن، خوێنی نەفامی لە ژێر پێیەکانمە، یەکەمین خوێنیش کە بەتاڵی دەکەمەوە لە خوێنەکانمان، خوێنی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حارسە، کە لەلای بەنی سەعد بە دایەن درابوو بەڵام هوزەیل کوشتیان.**

**ڕیبای نەفامیش هەمووی بە تاڵە، یەکەمین ڕیباش، کە بەتاڵی دەکەمەوە ڕیبای عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیبە، کە هەموو بە تاڵە**" [4].

مانای بە تاڵیش لە خوێندا واتە تۆڵەسەندنەوە و فیدیەی لەسەر نییە، مانای بەتاڵکردنەویە ڕیباش واتە نابێت ئەو شتانەی یان ئەو پارانەی بە ڕیبا دراون سودیان لێ وەربگیرێت، هەر گرێبەستێکیش بە ڕیبا گرێ درابێت، بەتاڵە و کاری پێ ناکرێت.

---

(1) فتح الباري (٥/١٦٨).
(2) فتح الباري (٧/٣٢٢).
(3) فتح الباري (٥/١٦٨).
(4) موسلیم (١٢١٨) گێڕاوەتیەوە.

ناوی ئەو کوڕە کوژراوەش ئیاسی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حارسی عەبدولموتەڵیب بوو، ئەم کوڕە لە نێوانماڵەکان گاگۆڵەی دەکرد، لە شەڕی نێوان بەنی سەعد و بەنی لەیسی کوڕی بەکر بەردی پێکەوت.

ئەمەی لە وەوە وەردەگیرێت ئەوەیە، کە پێشەوا و ئەو کەسانەی فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن، پێویستە سەرەتا لە خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەست پێ بکەن، چونکە ئەمە زیاتر دەبێتە مایەی قەبوڵ بوون لەلای خەڵك و زیاتر دڵی ئەو کەسانە پەیوەست دەکات کە تازە موسوڵمان بوونە [1].

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٢/٨).

## مامەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ دراوسێکانی:

دەقی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ گەلێك زۆرن کە باس لە پاراستنی مافی دراوسێ دەکەن و هەروەها باس لە پاراستنی شەرەف و داپۆشینی عەورەت و بەجێهێنانی پێداویستییەکانی دەکەن، وێڕای سەیرنەکردنی مەحرەمەکانی و دوورکەوتنەوە لە هەموو ئەو شتانەی ئازاری دەدات و گومانی بۆ دروست دەکات.

بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ بە وتار و کردار باشترین دراوسێ بووە، فەرمایشتی دراوسێی هێناوەتە دی، کاتێك مافی دراوسێ بەستاوەتەوە بە مافی خۆی ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ النساء: ٣٦

﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ واتە: ئەو دروساێیەی کە خزمە، دوو مافی هەیە، مافی دراوسێیتی و مافی خزمایەتی، لەسەریەتی بە پێی عورف و عادەت چاکەی لەگەڵ بکات.

﴿وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾ واتە: ئەوانەی، کە خزم نینین هەر کاتێك دروساێیەکە دەرگای نزیکتر بوو، ئەوا مافەکەی گەورەترە، پێویستە لەسەر دراوسێ دیاری و بەخشین پێشکەشی دراوسێیەکی بکات، قسەی نەرمی لەگەڵ بکات و بە هیچ شێوەیەك نە بە زمان نە بە ڕەفتار ئازاری نەدات.

﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ﴾ وتراوە: هاوڕێی سەفەرە، وتراوە، مەبەست لێی خێزانە، وتراوە: هاوڕێیە بە گشتی، لەوانەیە ئەوەیان ڕاستتر بێت، چونکە ئەمە هاوڕێ دەگرێتەوە لە شوێنی نیشتەجێ بوون و گەشت، خێزانیش دەگرێتەوە [1].

پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە دراوسێی هەبوو لە ئەنساڕی و موهاجیرەکان.

ابن حجر باسی لە دراوسێیە ئەنساڕیەکانی پێغەمبەری کردووە، کە سەعدی کوڕی عوباد و عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام (والد جابر) و ئەبو ئەیوبی ئەنساڕی و ئەسعدی کوڕی زرارە.

هەر ابن حجر دەڵێت: ابن سەعد لە (طبقات النساء) لە فەرموودەی دایکی سەلەمەی گێڕاوەتەوە و دەڵێت: ئەنساریەکان زۆر باسی نەرم و نیانی پێغەمبەریان دەکرد لەگەڵ

---

[1] تەفسیری سەعدی (١٧٧/١).

دراوسێکانی، کە پێکهاتبوون لە: سەعدی کوڕی عوبادە و سەعدی کوڕی موعاز و عەمارەی کوڕی حەزم و ئەبو ئەیوب.. چونکە ئەمانە زۆر لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بوون [١].

نەوەکانی (نەجار) لە شیعرەکانیان زۆر شانازیان بەو دراوسێیەتییە دەکرد و کەنیزەکانیان دەفیان لێ دەدا و لە گۆرانییەکانیان باسیان دەکرد.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە چەند کوڵانێکی **مەدینەدا تێپەڕ بوو**، بینی وا چەند کەنیزەیەك دەف لێ دەدەن و گۆرانی دەڵێن، وەك:

نحن جوار من بني النجار یاحبذا محمد من جار

پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: "**خوا دەزانێت، کە منیش ئێوەم خۆش دەوێت**"[٢].

## خاتوو عائیشە ستایشی ئەو دراوسێیانەی کردووە و دەڵێت:

پێغەمبەر ﷺ چەند دراوسێیەکی ئەنساری هەبوو، کە بەڕاستی دراوسێی راستەقینە و راستگۆ بوون، چەند ئاژەڵێکی (مەنیحە)یان هەبوو، کە پێغەمبەریان ﷺ بێ بەش نەدەکرد لە شیرەکانیان، ئەویش بە ئێمەی دەدا [٣].

(منائح) کۆی مەنیحەیە، مەنیحەش ئەوەیە کە کەسێك وشترەکەی یان مەڕەکەی بدات بە یەکێکی تر بۆ ئەوەی سوود لە شیر و خوریەکەی ببینێت تا ماوەیەکی دیاری کراو، پاشان ئەویش بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی [٤].

لە دراوسێیە موهاجیرەکانی پێغەمبەری ﷺ لە مەدینە ئەمانە بوون: ئەبوبەکر، عەلی و عەباس و چەندانی تر.

## بەڵام لە مەککە چەند دراوسێیەکی هەبوو، پێچەوانەی دراوسێکانی مەدینە، ئازاریان دەدا و قسەیان پێ دەگوت:

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: ئەو کەسانەی ئازاری پێغەمبەریان ﷺ دەدا ئەمانە بوون: ئەبو لەهەب، حەکەمی کوڕی عاصی کوڕی ئومەییە، عوتبەی کوڕی ئەبو موعیط، عەدی کوڕی حەمدائی سەقەفی، ابن الاصداء الهذلي... ئەمانە دراوسێی بوون کەسیان لە مانە موسڵمان نەبوون، تەنیا حەکەمی کوڕی عاص نەبێت.

---

[١] طبقات ابن سعد (١٦٣/٨)، فتح الباری (٢٠٦/٥).
[٢] ئیبن ماجە (١٨٨٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح ابن ماجة ١٥٤١) بە "سەحیح"ی داناوە.
[٣] بوخاری (٢٥٦٧) و موسلیم (٢٩٧٢) گێڕاوەتیانەوە.
[٤] عمدة القاری (٦٩/٢٠).

یەکێك لەوانە هەناوی وشتری مردووی لە کاتی نوێژدا بەسەر پێغەمبەردا ﷺ دادا، پێغەمبەریش ﷺ لەبەر دەرگای یەکێکیان دەوەستاو پێی دەگوت: **"ئەی نەوەی عەبدی مەناف.. ئەمە چ دراوسێیەتیەکە؟[1]"**.

**پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەکانی خەڵکی هان دەدا رێز لە دراوسێ بگرن و مافەکانیان بپارێزن:**

**لە گەورەیی مافەکانی دراوسێ، نزیك بووە لەوەی ببێتە میراتگر:**

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"جوبریل عليه السلام ئەوەندە ئامۆژگاری کردم بە چاکەکردن لەگەڵ دراوسێ، تا وام زانی میرات دەگرێت[2]"**.

پیاوێك لە ئەنسارییەکان دەڵێت لە ماڵەوە دەرچووم تا چاوم بکەوێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، بینیم وەستاوە و پیاوێکیش قسەی لەگەڵ دەکات، وامزانی کارێکی هەیە.

ئەوەندەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێوە وەستاند تا بەزەییم بە پێغەمبەر هاتەوە.

جا کاتێك رۆیشت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوە ئەوەندەی تۆ بە پێوە راگت، تا بەزەییم پێتدا هاتەوە.

فەرمووی: **"ئایا بینیت؟"**.

گوتم: بەڵێ

فەرمووی: **"ئایا دەزانی ئەمە کێ بوو؟"**.

گوتم: نەخێر

فەرمووی: **"ئەو جوبریل بوو عليه السلام، بەردەوام ئامۆژگاری دەکردم سەبارەت بە دراوسێ، تا وام زانی میرات دەگرێت[3]"**.

لە حەجی ماڵئاوایدا، پێغەمبەر ﷺ لەبیری نەکرد وەسیەت بۆ هاوەڵەکانی بکات، کە ئاگاداری دراوسێکانیان بن، باوکی ئومامە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر وشتر لە حەجی ماڵئاوایی دەیفەرموو: **"وەسیەت بێت لەگەڵ دراوسێکانتان باش بن"**. تا زۆر ئەمەی دووبارە کردەوە.

گوتم: لەوانەیە دراوسێ میرات ببات[4].

---

[1] تهذيب السيرة ابن هشام (١٢١/١).
[2] بوخاری (٦٠١٤) و موسلیم (٢٦٢٤) گێراوەتیانەوە.
[3] ئەحمەد (١٩٤٥٩) بە سەنەدێکی "سەحیح" گێراوەتیەوە.
[4] الطبراني لە (المعجم الكبير ١١٨/٧) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٢٥٤٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

## ڕێزلێنانی دراوسێی کردۆتە یەکێك لە نیشانەکانی ئیمان:

ئەبو شورەیح العدوی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دوو گوێچکەکانم بیستیان و دوو چاوەکانیشم بینیان کاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەی دەکرد و دەیفەرموو: **"ئەو کەسەی باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە دراوسێکەی بگرێت**[1]**"**:

پرسیار لە راوی فەرموودەکە عەتائی خوراسانی کرا، کە مافی دراوسێ چییە لەسەر دراوسێ؟

گوتی: ئەگەر داوای یارمەتی کرد یارمەتی بدەی، ئەگەر داوای قەرزی لێکردی ئەوا پێی بدەی، ئەگەر پێویستی بە شیتك هەبوو بۆی جێبەجێ بکەی، ئەگەر نەخۆش کەوت بچیتە سەردانی، ئەگەر تووشی خێرێك بوو پیرۆزبایی لێبکەی، ئەگەر توشی نەهامەتییەك بوو دڵی بدەیەوە، ئەگەریش مرد دوای تەرمەکەی بکەویت.

خانووی بەسەردا بەرز مەکەوە، کە هەوای لێ بگرێت، مەگەر بە ڕەزامەندی خۆی نەبێت، بە دووکەڵ و بۆنی چێشتەکەت ئازاری مەدە، مەگەر هەندێکی بۆ بنێریت، گەر میوەکیشت کڕی هەندێکی بە دیاری بۆ بنێرە، ئەگەرنا بە نهێنی بۆ ببە، با کوڕەکەت بۆی نەبات، نەبادا کوڕەکەی ئەو تورە بکات[2].

جا بەڕاستی پارێزگاری کردن لە دراوسێ لە تەواوی ئیمانەوەیە، پێشتریش خەڵکی سەردەمی نەفامی پارێزگاریان لە دراوسێ دەکرد، ئەم پارێزگاریکردنەش بریتییە لە چاکە کردن لەگەڵیدا بە پێی توانا، وەك بەخشینی دیاری و سەلام لێکردن و پێکەنین بەروویدا و هەواڵ پرسینی و یارمەتی دان و ئازارنەدانی، جا چ لەلایەنی ماددی یان لەلایەنی مەعنەوییەوە بێت[3].

## باوەڕی لەو کەسە داماڵیووە کە ئازاری دراوسێکەی دەدات:

ئەبو شورەیح ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"واللە ی باوەڕی نییە، واللە ی باوەڕی نییە، واللە ی باوەڕی نییە"**.

گوتمان: کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"ئەو کەسەی دراوسێکەی دڵنیا نەبێت لە خراپییەکانی**[4]**"**.

---

[1] بوخاری (٦٠١٩) و موسلیم (٤٨) گێڕاوەتیانەوە.

[2] جامع العلوم والحكم (١/٣٥٠).

[3] فتح الباري (١٠/٤٢٢).

[4] بوخاری (٦٠١٦) و ئەحمەد (٧٨١٨) گێڕاوەتیانە.

لەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ جەخت لەسەر مافی دراوسێ دەکاتەوە، چونکە سوێندی بە خوا خوارد و سێ جاریش دووبارەی کردۆتەوە.

باوەڕی تەواویشی لەو کەسە سەندۆتەوە، کە ئازاری دراوسێی دەدات، چ بە قسە چ بە کردار، گومانیش لەمەدا نییە، کە کەسی تاوانبار و گوناهبار، ئیمانی تەواو نییە [1].

نەبوونی باوەڕی تەواو بۆ ئەو کەسەی دراوسێکەی لە خراپەکانی دڵنیا نییە، ئەوا گەورەیی مافی دراوسێ دەردەخات و زیان گەیاندنی پێی یەکێکە لە گوناهە گەورەکان [2].

**بەڵکو هەواڵی داوە کە ئەم جۆرە کەسە بێ بەشە لە چوونە ژوورەوەی بەهەشت:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو کەسە ناچێتە بە هەشت، کە دراوسێکەی دڵنیا نەبێت لەشەڕ و ئاژاوەی"**[3].

**روونی کردۆتەوە کە ئازاردانی دراوسێ حەرامترە لە ئازاردانی خەڵکی تر:**

میقدادی کوڕی ئەسوەد ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵەکانی فەرموو: **"چ دەڵێن دەربارەی زینا؟"**.

گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی هەتا رۆژیی دوایی حەرامیان کردووە.

فەرمووی: **"ئەگەر پیاوێك زینا لەگەڵ دە ئافرەت بکات ساناترە لەوەی زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێکەی بکات"**.

پاشان فەرمووی: **"لەبارەی دزی چی دەڵێن؟"**.

گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی هەتا رۆژی دوایی حەرامیان کردووە.

فەرموویك **"ئەگەر پیاوێك دزی لە دە ماڵان بکات ساناترە لەوەی دزی لە دراوسێکەی بکات"**[4].

ئەمەش ئەوە دەگەێنێت کە مافی دراوسێ لەسەر دراوسێ ئەوەیە خیانەتی ناموسی لێ نەکات، جا ئەگەر وای کرد، ئەوا سزاکەی وەکو ئەوە وایە زینای لەگەڵ دە زیناکەر کردبێت [5].

---

(1) فتح الباری (١٠/٤٤٤).
(2) فتح البای (١٠/٤٤٢).
(3) موسلیم (٤٦) گێڕاوەتیەوە.
(4) ئەحمەد (٢٣٣٤٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة) بە ژمارە (٦٥) بە "سەحیح"ی داناوە.
(5) فیض القدیر (٥/٣٢٩).

**ئازاردانی دراوسێی دەبێتە مایەی نەفرەتی خوا و خەڵکی:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر ﷺ گلەیی لە دراوسێکەی کرد.

ئەویش پێی فەرموو: **"برۆ ئارام بگرە"**. تا دووجار یان سێ جار هاتەوە لای.

لە جاری سێیەم پێی فەرموو: **"برۆ شتومەکەکانت فڕێدە سەر ڕێگا"**.

کابراش شتومەکەکانی فڕێدایە سەر ڕێگا.

جا خەڵکی بەوێدا دەڕۆیشتن و پرسیاریان لێدەکرد، ئەویش بەسەر هاتەکەی بۆ باس دەکردن خەڵکیش نەفرەتیان لێ دەکرد و دەیانوت: خوا ئەوها و ئاوهای لێ بکات.

دراوسێکەی هاتەلای و پێی گوت: کاکە وەرە بگەڕێوە، بەڵێن بێ جارێکی تر شتێك نابینیت لە من کە ناخۆش بێت [(١)].

لە گێڕانەوەیکی تردا هاتووە: کە دراوسێکەی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خەڵك قسەم پێ دەڵێن!!

ئەویش فەرمووی: **"چیت پێ دەڵێن؟"**.

گوتی: نەفرەتم لێ دەکەن.

فەرمووی: **"خوا پێش ئەوان نەفرەتی لێ کردووی"**.

گوتی: جارێکتر واناکەم.

خاون هەقەکە هاتەوە و پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"برۆ شتومەکەکانت هەڵگرەوە، پێویستییەکەت جێبەجێ بوو"**[(٢)].

**ڕوونی کردۆتەوە کە ئەنجامدانی پەرستنی زۆر بە هانای خاوەنەکەی نایێت، کاتێك دراوسێکەی ئازار بدات:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! فلآنە ئافرەت ناسراوە بەوەی نوێژ زۆر دەکات و ڕۆژوو زۆر دەگرێت و خێر و بەخشینی زۆرە، بەڵام بە زمانەکەی دراوسێکەی ئازار دەدات:

فەرمووی: **"ئەو لە دۆزەخە"**.

گوتی: بەڵام فلآنە ئافرەت ناسراو بە کەمی ڕۆژوگرتن و سەدەقە و نوێژ، هەندێکجار چەند پارچە داندۆکێك یان کەشێك دەکاتە خێر، بەڵام دراوسێکانی ئەزیەت نادات؟

فەرمووی: **"ئەو لە بەهەشتە"**[(٣)].

---

(١) ئەبو داود (٥١٥٣) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە "صحيح أبي داود٥١٥٣" بە "سەحیح"ی داناوە.

(٢) الطبراني (٣٥٦) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی دەڵێت "صحيح لغيره"، صحيح الترغيب والترهيب ٢٥٥٨.

(٣) ئەحمەد(٩٢٩٨) گێڕاوەیتەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب ٢٥٦٠) بە "سەحیحی" داناوە.

**وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ باشبوون لەگەڵ دراوسێ، دراوسێی موسڵمان و ناموسڵمان دەگرێتەوە:**

موجاهید گێڕاویەتیەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر کاوڕێکیان لەماڵەوە بوو سەری بڕی.

گوتی: ئایا هیچتان بە دیاری ناردووە بۆ دراوسێیە جولەکەکەمان؟

گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، فەرمووی: "**جوبریل ؈ بەردەوام ئامۆژگاریی دەکردم سەبارەت بە دراوسێ، هەتا وامزانی میرات دەگرێت**[1]".

ئیبن حەجەر دەڵێت: ناوی (دراوسێ) هەریەکە لە موسڵمان و کافر، باش و خراپ، دۆست و دوژمن، غەریبە و شارنشین، سودبەخش و زیانبەخش و نزیك و دوور دەگرێتەوە.

چەند پلەیەکی هەیە، کە هەندێکیان گەورەترن لە هەندێکیان، بەرزترینیان ئەوەیە، کە هەموو سیفەتە یەکەمەکانی لێ بێتە دی، پاشان زۆرترین سیفەتی هەبێت، ئا بەم شێوەیە تا دەگاتە یەك سیفەت.

پێچەوانەکەشی ئەوەیە سیفەتەکانی تری تێدا کۆبێتەوە، جا هەر یەکەیان ماف پێ دەدرێت بە پێی پێگەکەی، هەندێك جاریش دوو سیفەت تێك دەگیرێن، یان زیاتر، جا هەڵدەبژێردرێن یان یەکسان دەکرێن[2].

**پێغەمبەر ﷺ بوونی دراوسێی چاکی کردۆتە بەختەوەری مرۆڤ:**

نافیعی کوڕی حاریش ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**یەکێك لە بەختەوەرییەکانی مرۆڤ دراوسێی چاکە، هەروەها سواریەکی خۆش و خانوویەکی فراوان**[3]".

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**چوار شت مایەی بەختەوەرین: ئافرەتی چاك، ماڵێکی فراوان، دراوسێیەکی باش، سواریەکی خۆش، چوار شتیتش مایەی ناخۆشین: دراوسێی خراپ، ئافرەتی بەد، ماڵێك تەنگەبەر، سواریەکی خراپ**[4]".

لە نزا و پاڕانەوەکانیدا خۆی دەپاراست لە دراوسێی خراپ و دەیفەرموو: "**اللهم إني أعوذك من جار السوء في الدار المقامة، فأن جار البادية يتحول**[5]". واتە: پەروەردگارا

[1] ترمذي (١٩٤٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] فتح الباری (٤٤٢/١٠).

[3] ئەحمەد (١٤٩٤٧) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع/ ٣٠٢٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

[4] ابن حبان (٤٠٣٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة/ ٢٨٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

[5] الحاکم (١٩٥١) گیڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع/ ١٢٩٠) بە "سەحیح"ی داناوە

پەنات پێ دەگرم لە دراوسێی خراپ لە شوێنی نیشتەجێبوون، چونکە دراوسێی گەشت دەگۆڕدرێت.

فەرمانیشی بە هاوەڵەکانی دەکرد دەیفەرموو پەنابگرن بە خوا لە دراوسێی خراپ **"تعوذوا بالله من جار السوء في الدار المقامة، فأنّ جار البادية يتحول عنك"**[1].

**ڕوونی کردۆتەوە باشترین دراوسێ ئەو کەسەیە باش بێت لەگەڵ دراوسێکەی:**

عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"باشترین هاوەڵ لەلای خودا باشترینیانە بۆ هاوەڵەکەی، باشترین دراوسێش لەلای خودا باشترینیانە بۆ دراوسێکەی"**[2].

مافی دراوسێ هەر ئەوە نییە ئازاری نەدەی، بەڵکو دەبێت نەرمونیان بیت لەگەڵیدا و چاکەی لەگەڵ بکەیت، لەوانە دەستپێشخەری بکات لەسەلام کردن لێی و لە کاتی نەخۆشکەوتن سەردانی بکات و لەکاتی ناخۆشی دڵی بداتەوە، لە کاتی خۆشی پیرۆزبایی لێبکات و بەشداری خۆشییەکانی بکات و لە هەڵەکانی ببورێت و چاوی لە ئاست مەحرەمەکانی بپۆشێت، ئەگەر لەوێ نەبوو ماڵەکەی بپارێزێت، ئامۆژگاری و ڕێنمایی منداڵەکانی بکات بۆ ئەو شتانەی نایزانن لە کاروباری دین و دونیایان[3].

**ڕوونی دەکردەوە کە دراوسێ چەندە نزیکتر بێت ئەوەندە مافی گەورەترە:**

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا من دوو دراوسێم هەیە، دیاری بۆ کامەیان ببەم.

فەرمووی: **"ئەوەی دەرگاکەی لە هەمووان نزیکترە"**[4].

حیکمەتیش لەمەدا ئەمەیە، کە دراوسێی نزیك ئاگاداری ماڵی دراوسێکەیەتی کە چی دەچێتە ئەو ماڵە، لە دیاری و خواردن و هەرشتێکی تر، بە پێچەوانەوەی دراوسێی دوور، وێڕای ئەوەی دراوسێی نزیك خێرا بە هانای دروسێکەی دێت، بە تایبەت لەو کاتانەی بێ ئاگان[5].

---

[1] النسائي (٥٥٠٢) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة/ ١٤٤٣) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] ترمذي (١٨٦٧) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٣٢٧٠) بە "سەحیح"ی داناوە.
[3] احياء علوم الدين (٢/٢١٣)
[4] بوخاری (٢٢٥٩) گێڕاوەتیەوە.
[5] فتح الباری (١٠/٤٤٧).

## زانایان سەبارەت بە سنوری دراوسێ رای جیاوازیان هەیە:

شافیعییەکان و حەنابیلییەکان دەڵێن سنوری دراوسێ چل خانوو لە هەموو ئاراستەکانەوە، ئەو فەرموودەیان کردۆتە بەڵگە، کە دەفەرموێت: **"مافی دراوسێ چل خانووە، بەم شێوەیە، بەم شێوەیە و بەم شێوەیە"**[(١)]... بەهەموو ئاراستەکان.

مالیکییەکانیش دەڵێن: دراوسێ ئەوەیە کە خانووی بە خانووتەوە نوسابێت جا لە هەر ئاراستەیەکەوە بێت، یانیش بەرامبەری بێت جا یان شەقامێکی تەسك لە نێوانیان هەبێت، بەڵام بازاڕێکی گەورەیان رووبارێکی فراوان لێکیان جیا نەکاتەوە، یان ئەو کەسە مزگەوتێك یان دوو مزگەوتی بچوك کۆیان بکاتەوە.

بۆچوونی ئەبو حەنیفەش وەهایە، کە دراوسێ ئەوەیە، کە خانووی بە خانوتەوە لکا بێت، چونکە (جیران) لە (مجاورە) هاتووە، کە بە مانای پێوەلکانی حەقیقی دبێت.

ئیبن حەجەر دەڵێت: رای جیاواز هەیە سەبارەت بە سنوری دراوسێ، لە عەلیەوە هاتووە، کە دەڵێت ئەو کەسەی گوێی لە هاواری بێت ئەوا دراوسێیە.

گوتراوە: ئەو کەسەی نوێژی بەیانی لەگەڵت کرد لە مزگەوت ئەو دراوسێتە.

نزیکترین را ئەو رایەیە کە سنوری دراوسێ نەریت و عادەت دیاری بکات، ئەوەی نەریت و عادەت گوتی دراوسێیە، ئەو دراوسێیە.

ئیبن قودامە دەڵێت: "دراوسێ ئەوەی نزیکت بێت، دیاریکردنیش دەگەڕێتەوە بۆ عورف و عادەت"[(٢)]

## هانی داون کە دراوسێکان دیاری بۆ یەکتری ببەن، با شتێکی سادەش بێت:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی ئافرەتانی موسڵمانان، با دراوسێ هیچ شتێك بە کەم نەزانێ بە دیاری بیداتە درلوسێکەی، با ئەم شتە سمی بەرخێکیش بێت"**[(٣)].

ئەو قەدەغەکردنە بۆ ئەو کەسەیە، کە شتێکی سادە لە ماڵەکەی دەبینێتەوە بەڵام لەبەر کەم بەهایی و سادەیی شتەکە، نایکاتە دیاری بۆ دراوسێکەی، بەڵکو دەبێت ئەوەی هەیە و بەردەستە ئەو ببەخشێت با سمی بەرخێکیش بێت، چونکە باشترە لەوەی هیچ نەبێت، کە باسی سمی بەرخیش کردووە ئەمە بۆ (موبالەغە) کردنە.

---

(١) ئەبو یەعلی لە ئەبو هورەیرە گێراوەتیەوە لە (إتحاف المهرة ٥٠٩٨)، ئەلبانی لە (إرواء الغليل/ ١٦٥٩) بە "زەعیف"ی داناوە.

(٢) سەیری: فتح الباری (١٠/٤٤٧)، والمغنی (٦/٥٧٨)، الموسوعة الفقهية الكويتية (١٦/٢١٧).

(٣) بوخاری (٢٥٦٦) و موسلیم (١٠٣٠) گێراوەتیانەوە.

لەوانەشە قەدەغەکردنەکە ئەو کەسە بگرێتەوە، کە دیاریەکەی بۆ دەچێت کە نابێت بە چاوێکی کەم سەیری دیارییە سادەکەی بکات.

فەرموودەکە هاندانی تێدایە لەسەر بەخشینی دیاری با بە شتێکی سادەش بێت، چونکە دیاری گرانبەها هەموو دەم بەردەست نابێت، ئەگەر شتە سادەکان بەردەوامی هەبوو دەبێتە زۆر، هەروەها فەرموودەکە دۆستایەتی و خۆشەویستی بەرقەرار دەکات و بار قورسی رەت دەکات[1].

فەرموودەکە زیاتریش ئافرەتی تایبەت کردووە بەم کارە، چونکە ئەوان زیاتر بە چاوی سوك سەیری شتە بەخشراوەکە دەکەن، یان بەکەم سەیری ئەو شتە نەکەن، کە بۆیان هاتووە، هەروەها بە حوکمی مانەوەیان و جێگیربوونیان لە ماڵ، ئەوان زیاتر پەیوەندیان بە دراوسێ هەیە نەوەك پیاو.

## موسڵمانانی هانداوە خواردن بۆ دراوسێ ببەن:

ئەبو زەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی ئەبو زەر ئەگەر چێشتت لێنا ئاوی زۆر تێ بکە و بۆ دراوسێکانتی ببە"**[2]

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت: **"خۆشەویستەکەم ﷺ رایسپاردم ئەگەر مەرگەیەکم لێنا ئاوی زۆری تێ بکەم، پاشان سەیری دراوسێکانم بکەم و هەریەکەو هەندێکیان بۆ ببەم"**[3].

ئەمڕۆ زۆر لە خەڵکی ئاگای لەمە نییە، خواردن بۆ دراوسێ نابات، لەگەڵ ئەوەی زیاد لە پێویستی خۆیان خواردن ئامادە دەکەن، پاشان پاشماوەکەی دەکاتە ناو سەللەی زبڵ، لەوانەیە دراوسێی وا هەبێت خواردنەکە بە شی خۆیان نەکات.

ئەمەش پێچەوانەی مافی دراوسێیە و پێچەوانەی پیاوەتییە.

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: **"ئەو کەسە باوەڕی بە من نەهێناوە گەر خۆی تێر بێت و بشزانێت دراوسێکەی برسییە"**[4].

---

[1] سەیری: شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧/١٢٠)، فتح الباری (٥/١٩٨)، (١٠/٤٤٥).

[2] موسلیم (٢٦٢٥) گێڕاوەتیەوە.

[3] موسلیم (٤٧٥٩) گێڕاویەتیەوە.

[4] الطبراني لە (٧٥١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥٥٠٥) بە "سەحیح"ی داناوە.

نــاري و نــارُ الجــار واحــدةٌ وإليــه قبلــي ينــزلُ القــدر
ماضــرّ جــاراً لــي أجــاوره أن لا يكــون لبابــه ســتر
أغضــي إذا ماجــارتي بــرزت حتــى يــواري جــارتي الخــدر

واتە:

هەر یەك شتە ئاگری من و ماڵی دراوسێمان
خواردنی ئەو حازر دەبێ بەرلە خواردنمان
هیچ کەسێك زیان ناکا گەر دراوسێم بێ
با حەوشەی ماڵەکەی دەرگاشی نەبێ
گەر ئافرەتیان دەرکەوێ چاوم دادەخەم
تا لە تاریکای شەو ون دەبێ بێ خەم

هەر لەسەر هاندانی پێغەمبەر ﷺ بۆبردنی خواردن بۆ دراوسێ، ئەوەیە کە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دایکی سولەیم گوتی: بڕۆ لای پێغەمبەری خوا پێی بڵێ: ئەگەر دەتەوێ نان لەلای ئێمە بخۆی، ئەوا بفەرموو.

دەڵێت: منیش چووم و پێم راگەیاند.

فەرمووی: "**ئەوانەی لەگەڵ منیشن؟**".

گوتم: بەڵێ

فەرمووی: "**دە هەستە**".

دەڵێت: گەڕامەوە لای دایکی سولەیم، بەڵام زۆر پەشۆکاو بووم لەبەر زۆری ژمارەی ئەو کەسانەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بوون.

دایکی سولەیم گوتی: ئەنەس چیت کرد؟!

لەو دەمە پێغەمبەری خوا هاتە ژوورەوە و فەرمووی: "**ئایا رۆنت هەیە؟**".

گوتی: هەندێکم لایە.

فەرمووی: "**بڕۆ بیهێنە**".

منیش هێنام، ئەویش سەری کردەوە فەرمووی: "**بسم الله، خودایە بەرەکەتی زۆری تێبخەی**".

گوتی: وەری گێڕە، منیش وەرم گێڕا، پێغەمبەریش ﷺ گوشیی و ناوی خوای لەسەر هێنا.

مەنجەڵەکەم هێنا، نزیکەی هەشتا پیاو زیاتر لێیان خوارد.

هەندێکیش ماوە، دای بە دایکی سولەیم و پێی فەرموو: **"تۆش بیخۆ و بیدەرە دراوسێکانیشت"**[1].

## ئەگەر دراوسێکانی داوەتیان بکردیایە، دەچوو و خێزانەکەشی لەگەڵ خۆی دەبرد:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دراوسێیەکی پێغەمبەر ﷺ کە فارس بوو، شلەی زۆر خۆشی لێ دەنا، شلەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا لێنا و دەعوەتی کرد.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەمەش؟"**، واتە عائیشە.

گوتی: نا

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"کەواتە منیش نایەم"**.

دیسان گەڕایەوە لای پێغەمبەر و بانگهێشتی کرد.

دووبارە پێغەمبەر پێی فەرموو: **"ئەمەش؟"**.

کابرا گوتی: نا

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"کەواتە منیش نایەم"**.

بۆ جاری سێیەم هاتەوە و بانگهێشتی کرد.

پێغەمبەریش دیسان پێی فەرموو: **"ئەمەش؟"**.

لە سێیەم جاردا گوتی: بەڵێ..

ئینجا هەڵسان بەدوای یەك ڕۆیشتن تا چوونە ماڵەکە[2].

گوتراوە: پیاوە فارسەکە بۆیە خاتوو عائیشەی بانگهێشت نەکردووە، چونکە خواردنەکە کەم بووە و ویستوویەتی هەر بۆ پێغەمبەری خوا بێت.

نەوەوی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ حەزی نەکرد بێ خاتوو عائیشە بچێت بۆ ئەو دەعوەتە، ئەمەش ئەو پەڕی مامەڵەی باشە لەگەڵ خێزان و یەکێکە لە مافی پێکەوە بوون و ئادابی هاوسەرگیری[3].

## بەرگەی ئازاری دراوسێکانی دەگرت:

دایکی سەلمە ﷺ دەڵێت: کاتێك من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر یەك پێخەف بووین، بەرخێکی دراوسێکەمان هاتە ژوورەوە و پارچە نانێکی لێ بردین.

---

(١) ئەحمەد (١٣١٣٥) گێڕاوەتیەوە، شعیب الارناؤط بە "سەحیح"ی داناوە.

(٢) موسلیم (٢٠٣٧) گێڕاوەتیەوە.

(٣) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣/٢٠٩).

منیش هەڵسام و لەناو دەمم دەرهێنا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"تۆ نەدەبا وا بەتوندی مامەڵەی لەگەڵ بکەی، ئازاردانی دراوسێ با کەمیش بێت هیچ بەهانەیەکی نییە [1]"**.

جا بەرگەگرتنی ئازاری دراوسێ و وەڵام دانەوەی خراپەکانی بە چاکە لە بەرزترین خورەوشت و جوامێرییەکانە.

حەسەن دەڵێت: ماف دراوسێی رەتکردنەوەی ئازار نییە، بەڵکو بەرگەرگرتنی ئازارە [2].

## قسەی دراوسێی کردۆتە پێوەر بۆ زانین و ناسینی پیاوی باش و خراپ:

عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: پیاوێك بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوت: چۆن بزانم، کە چاکەکارم یان خراپەکار؟

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"ئەگەر گوێت لە دراوسێکانت بوو گوتیان چاکەکاری ئەوا چاکەکاری، ئەگەریش گوێت لێبوو گوتیان: خراپەکاری، ئەوا خراپەکاری [3]"**.

**ئامۆژگاری و رێنمایی دراوسێی کردووە، کە رێگە لە دراوسێکەی نەگرێت لەو شتانەی پێویستییەتی:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەو و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەگەر یەکێکتان دراوسێکەی داوای لێکرد دارێك قایم بکات لە دیوارەکەی، با رێگەی لێ نەگرێت"**.

کاتێك ئەبو هورەیرە ئەمەی بۆ باس کردن، سەرەکانیان بۆ لەقاند.

گوتی: ئەوە چییە دەبینم پێ رازی نین؟ وەڵاهی بە دار لە نێو شانتان دەدەم [4].

ئیبن رەجەب دەڵێت: مەزهەبی پێشەوا ئەحمەد ئەوەیە، کە دراوسێ لەسەریەتی رێگە بە دراوسێکەی بدات دارێك لە دیوارەکەی قایم بکات ئەگەر پێویستی پێی هەبوو و زیانیشی بە دیوارەکە نەگەیاند، ئەمەش لەبەر ئەم فەرموودە سەحیحەوەیە.

---

[1] الطبراني لە (المعجم الكبير ٢٥٨/٢٣ ژمارە: ٥٣٥) گێڕاوەتیەوە، ئیبن ئەعرابی لە موعجەمەکەی (٣٥٣)، الهیثمي في المجمع ( ١٧٠/٨): ئەلبانی لە (الجامع ٢٠٧٧) بە "زەعیفی" داناوە.

[2] جامع العلوم والحكم (١٤٠).

[3] ابن ماجة (٤٢٢٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٦١٠) بە "سەحیح"ی داناوە

[4] بوخاری (٢٤٦٣) و موسلیم (١٦٠٩) و ترمذي (١٢٧٣) گێڕاوەتیانەوە.

جمهوری زانایان فەرمانی فەرموودەکەیان بە سوننەت لێکداوەتەوە، قەدەغەکردنەکەش بۆ خۆپارستنە، ئەمەش وەك کۆکردنەوەیەك لە نێوان ئەم فەرموودە و ئەو فەرموودانەی دی کە ماڵی موسڵمان حەرام دەکەن مەگەر بە رەزامەندی خۆی نەبێت[1].

وتەی ئەبو هورەیرە کە دەڵێت: (ئەوە چییە دەبینم پێی رازی نین؟) مەبەستی ئەوەیە، کە بۆچی ئەم سوننەتە یان ئەم گوتارە رەت دەکەنەوە[2].

## تا دراوسێ هەبێت، نابێت موڵکەکە بدات بە کەسێکی تر:

تا دراوسێ هەبێت، نابێت خاوەن ماڵ موڵکەکە بدات بە کەسێکی تر، ئەگەریش پێیدا ئەوا دراوسێکەی مافی ئەوەی هەیە بیگەڕێنێتەوە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ بڕیاری لەسەر داوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"دراوسێ لە پێشترە، بە حوکمی نزیکی و لکانی خانوەکەی بە خانوەکەت"**[3].

جابر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"الجار أحق بشفعة جاره..."**[4].

(شفعة): بریتییە لەوەی: کە هاوبەش یان دراوسێ بۆی هەیە ئەو ماڵەی لە دراوسێیەتی یان لە هاوبەشییەتی فرۆشراوە، دەتوانێت ئەو ماڵە فرۆشراوە لەو کەسە وەربگرێتەوە کە پێی فرۆشراوە، بە قەرەبوونەوەیەك کە لە گرێبەستەکەدا هاتووە.

---

[1] جامع العلوم الحكم (١٤٠).

[2] فتح الباری (١١١/٥).

[3] بوخاری(٢٢٥٨) لە ئەبو رافع ﷺ گێڕاوەتیەوە.

[4] بلوغ المرام، ئەحمەد گێڕاویەتیەوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ میوان و میوانداری:

**یەکەم: پێغەمبەر ﷺ وەك میواندارێك:**

پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس دەستکراوەتر و سەخی تر بووە و لە هەموویان بەخشینی فروانتر بووە، بە تایبەت لە وەرزی خێر کە ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: **"پێغەمەریی خوا ﷺ لە هەموو کەس خێر و بەخشینی زیاتر بووە، لە مانگی رەمەزان زیاتریشی دەکرد"**.

بەڕاستی جوبریل ﷺ لە رەمەزانی هەموو ساڵێك دەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ قورئانی پیرۆزی پێ دەور دەکردەوە، هەرکاتێك جوبریل بهاتبایە لای، پێغەمبەر ﷺ لە هەڵکردنی با خێراتر دەبوو بۆ کاری بەخشین و خێر[1].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باشترینی خەڵك بووە، خێرخوازترین و ئازاترینیان بووە[2].

یەکێك لە هەرە تایبەتمەندی کەسە خێرمەند و بەخشندە و چاوتێرەکان: رێزلێنانی میوانە، عەرەبەکان بەخشندەیی و چاوترێیان تەنیا لە میوانداری و خواردن پێدان دەبینیەوە، کەسی سەخی و چاوتێر ئەگەر ئەم سیفەتەی تێدا نەبایە، ئەوا بەسەخی ئەژمار نەدەکرا، تەنانەت هەندێکیان میلێك یان چەند کیلۆمەترێکی دەبڕی تەنیا بۆ ئەوەی میوانێك لەگەڵ خۆی بێنێتەوە[3].

ئەوەش دایکی باوەڕداران خەدیجەیە، کە لە هەموو کەس شارەزاترە لە رەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وەسفی دەکات و دەڵێت: **"سوێند بە خوا تۆ پەیوەندی خزمایەتی بەجێدەگەیێنیت، قسەی راست دەکەیت، یارمەتی هەژار و هەتیو و بێ نەوایان دەدەیت، رێز لە میوان دەگریت و بە هانای لێقەوماوان دەچیت"**[4].

خەدیجە ﷺ لەنێوان کۆمەڵە رەوشتێکی پێغەمبەر ﷺ باسی (رێزلێنانی میوانی) کردووە.

پێغەمبەر ﷺ باشترینی خەڵك بووە لە رێزلێنانی میوانی خۆیی و باشترین مامەڵەی کردووە لەگەڵ ئەو نێردانەی دەهاتنە لایی.

---

[1] بوخاری (٦) و موسلیم (٢٣٠٨) گێراوەتیانەوە.
[2] بوخاری (٢٨٢٠) و موسلیم (٢٣٠٧) گێراوەتیانەوە.
[3] روضة العقلاء لابن حبان (لا ٢٥٩).
[4] بوخاری (٤) و موسلیم (١٦٠) گێراوەتیانەوە.

**ڕەوشت جوانی پێغەمبەر ﷺ ڕەنگی دەدایەوە لە میوانداری گەر دەعوەت بکرابایە یان خەڵکی دەعوەت بکردبایە:**

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷛ دەڵێت: "پێغەمبەر ﷺ هەر داواکاریەکی لێکرابایە هەرگیز نەیدەگوت: نا [1]".

ماناکەشی ئەوەیە، کە پێغەمبەر هەرچییەکی داوای لێکرابایە لە کاروباری دونیا نەیدەگوت: نا.. ئەمەش ئەوپەڕی دەستکراوەیی و چاوتێری و سەخاوەتی **پێغەمبەر** ﷺ دەردەخا [2].

وإذا سخوتَ بلغتَ بالجودِ المَدى　　　وفَعلتَ ما لا تفعلُ الكرماء

واتە: گەر سەخاوەتت کرد بە بەخشین دەگەیتە لوتکە ، شتێك دەکەی کە بەخشندەکان نەیان کردووە.

**هەواڵی داوە، کە خوای گەورە بەخشەرە و بەخشینی خۆش دەوێت:**

سەهلی کوڕی سەعید ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**بەڕاستی خوای گەورە بەخشەرە و بەخشینی خۆش دەوێت، ڕەوشتە بەرزەکانی خۆش دەوێت و ڕقی لە شتە نزم و بێ بەهاکانە** [3]".

بۆیە عومەری کوڕی حاریس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك وەفاتی کرد، نە درهەمێك و نەدینارێك و نە بەندەیەك و نەکەنیزەیەك و نە هیچ شتێکی لە دوای خۆیدا بەجێنەهێشت، تەنیا ئێسترە سپییەکەی و چەکەکەی و پارچە زەویەك نەبێت، کە بۆ بەخشین تەرخانی کردبوو [4]". بەڵکو، کە وەفاتی کرد قەڵغانەکەی بە ڕەهن لەلای جولەکەیەك بوو لە جیاتی سی ڕوبە جۆ [5].

**پێغەمبەر ﷺ ڕێزلێنانی میوانی کردۆتە یەکێك لە نیشانەکانی باوەڕ:**

دەفەرموێت: "**هەر کەسێك باوەڕی خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێز لە میوان بگرێت** [6]".

ڕێزلێنان: واتە: ڕووخۆشی بەروویدا، پەلەکردن لە پێدانی خواردن و خزمەتکردنی.

---

[1] بوخاری (٦٠٣٤) و موسلیم (٢٣١١) گێڕاوەتیانەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧١/١٥).

[3] الحاكم لە (المستدرك ١٥٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٨٠١) بە "سەحیح"ی داناوە.

[4] بوخاری (٢٧٣٩) گێڕاوەتیەوە.

[5] بوخاری (٢٩١٦) و موسلیم (١٦٠٣) لە خاتو عائیشەوە ﷞ گێڕاوەتیانەوە.

[6] بوخاری (٦٠١٨) و موسلیم (٤٧) لە خاتو عائیشەوە ﷞ گێڕاوەتیانەوە.

**شاعر دەڵێت:**

أضاحكُ ضيفي قبل إنزالِ رحلهِ — فيخصبُ عندي والمحلُّ جديبُ

ومالخصبُ للأضيافِ أن يكثر القرى — ولكنّما وجهُ الكريمِ خصيب

**واتە:**

میوانەکەم دەخەمە پێکەنین بەر لەوەی بێتە ماڵم

لەلام نان دەخوات، ماڵەکەش بەپیت دەبێت لە لام

نانداني میوان دەرناکەوێ بە میوانداری زۆر

بەڵکو رووخۆشی نانداتە بە زەردەخەنەی زۆر.

**پێغەمبەر ﷺ ستایشی ئەو کەسەی کردووە کە رێز لە میوان دەگرێت، کردویەتی بە باشترینی خەڵك:**

ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە رۆژی تەبوك وتارێکی دا و فەرمووی:

**"هیچ کەسێك وەکو ئەو کەسە نییە سەری جڵەوی ئەسپەکەی گرتووە و جیهاد دەکات لە پێناو خوا و خۆی لە شەڕی خەڵك دەپارێزێت، هەروەها لەگەڵ یەکێکی تردا، کە بەتەنیا مەڕوماڵات بە خێو دەکات و رێز لە میوانەکەی دەگرێت و مافەکەی پێ دەدات[1]"**.

**روونی کردۆتەوە کە میواندارێکردن مافێکە لەسەر هەموو کەسێك:**

دەفەرموێت: **"شەوی میوانداری مافە لەسەر هەموو کەسێك، هەر کەسێك میوانێکی هاتە ماڵەوە، ئەم میوانداریە قەرزێکە لەسەر خاوەن ماڵ، جا گەر میوانەکە بیەوێت داوای مافەکەی دەکات و وەری دەگرێتەوە، ئەگەریش نەیەوێت وازی لێدەهێنێ[2]"**.

خطابي دەڵێت: بەردەوام رێزگرتن لە میوان و خزمەتکردنی، لە رەوەشتی پیاوان و نەریتی پیاوچاکانە، لە بەرامبەردا رێزنەگرتنی میوان و خزمەتنەکردنی لەسەر زوبانان زەمکراوە و خاوەنەکەشی لۆمەکراوە[3].

پێغەمبەر ﷺ بە عوسمانی کوڕی مەزعونی گوت: **"بەڕاستی میوانەکەت مافی بەسەرتەوە هەیە[4]"**.

---

[1] ئەحمەد (١٩٨٨) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحه ٢٢٥٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] ئەبو داود (٣٧٥٠) و ابن ماجه (٣٦٧٧گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيحه/ ٢٢٠٤) بە "سەحیح"ی داناوە

[3] عون المعبود (١/١٥٤).

[4] ئەبو داود (١٣٦٩) لە خاتوو عائیشەوە ﷺ گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩٤٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێت: گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ ڕەوانەمان دەکەیت بۆلای کەسانێك، کە میوانداریمان ناکەن، ئایە تۆ چی دەڵێیت؟

پێغەمبەر ﷺ پێمانی فەرموو: **"ئەگەر چوونە لای قەومێك فەرمانیان پێ بکەن ئەو ئەرکەی لەسەریانە بە جوانی جێبەجێی بکەن، ئەگەر ولیان نەکرد، ئەو مافەی کە لەسەریانە لێیان بستێنن"**[1].

ئەو فەرموودەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە ناچارن و میوانداریکردنیان واجبە، ئەگەر میوانداری نەکران، دەتوانن بای پێداویستی خۆیان ببەن.

گوتراویشە: دەتوانن لەلای خەڵکی زەمیان بکەن کە ئەوانە بێ ڕێزن و بێ ئەمەکن[2].

**پێغەمبەر ﷺ ئەندازە و سنوری میوانداری دیاری کردووە:**

ئەبو شورەیح ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو کەسەی باوەڕی بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت و بەخششی پێ بدات"**.

گوتیان: بەخششەکە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟

**فەرمووی: "ڕۆژەکەیەتی، میوانداریش سێ ڕۆژە، زیاتر لەمە بەخشینە (سەدەقەیە)، نابێت یەکێك بمێنێتەوە لەلای براکەی بە جۆرێك گوناهباری بکات"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن گوناهباری دەکا؟

**فەرمووی: "لەلای دەمێنێتەوە، ئەویش هیچی نییە بیداتێ"**[3].

بەراستی میوان مافی لەسەر خاوەن ماڵ هەیە، ئەو مافەش سێ پلەی هەیە، مافێکی واجب، مافێکی سوننەت و مافێکی سەدەقە.

مافی واجب: شەو و ڕۆژێکە، سوننەتیش سێ ڕۆژە، سەدەقەش لەمە زیاترە.

ئەو میوانەی کە دەبێت ڕێزی لێ بگریت و مافی میوانداری هەیە ئەو میوانە ڕێبوارەیە کە لە شارێکی تر هاتووە.

جا کە هاتە لای یەکێك ئەوا واجبە نانی بداتێ و ڕێزی بگرێت، ئەگەر وای نەکرد، میوانەکە بەشی هەیە و مافی هەیە لە ماڵەکەی.

بەڵام میوان لە هەمان شاردا، ئەوا گومانی تێدا نییە کە ناندان و ڕێزگرتنی دەچێتە چوارچێوەی ئەو فەرمانە گشتیەی بۆ نان دان و چاکە لەگەڵ کردنی خەڵك داندراوە، بەڵام

---

[1] بوخاری (٢٤٦١) و موسلیم (١٧٢٧) گێراوەتیانەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٣٢/١٢).

[3] بوخاری (٦٠١٩) و موسلیم (٤٨) گێراوەتیانەوە.

ئەوە ئەو میوانە نییە، کە پێغەمبەر ﷺ واجبی کردووە ڕێزی لێ بگیرێت و ماف لەلای خاوەن ماڵ بۆ داناوە.

ناشبێت باری میواندارەکەی قورس بکات، بەوەی سێ ڕۆژ زیاتر لـەلای بمێنێتـەوە، چـونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "**نابێت (لە سێ ڕۆژ زیاتر بمێنێتەوە) تا بێزاری نەکات**[1]".

**لە ساتەوەختەکانی برسێتی و نەبوونیدا، زیاتر ڕێزگرتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ میوان دەردەکەوێت:**

میقدادی کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: من و دوو هاوەڵ هاتین، برسیەتی تەنگی پێهەلچنیبووین و بینینی چاومان و هێزی بیستنی گوێچکەمانی نەهێشتبوو، دەچوینە میوانداری هەر کەسێك، هیچیان میوانداریان قبوڵ نەدەکردین[2].

چوینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا زۆر زۆر برسیمانە، چوینە میوانی خەڵکی، بەڵام کەس وەڵامی نەداینەوە، بۆیە هاتینە لای تۆ.

ئەویش ئێمەی بردەوە بۆلای ماڵی خۆی، سێ بزنیان لە ماڵ هەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**ئەوانە بدۆشن و شیرەکەی دابەش بکەن لە نێوانمان**".

دەڵێت: هەریەکەمان مەڕێکی دەدۆشی بەشی خۆی دەخواردەوە، بەشی پێغەمبەریشمان دەدا.

جا کە شەو دەهات، سەلامی دەکرد، بە جۆرێك سەلامی دەکرد نوستووی هەڵنەدەستاند و واشی دەکرد بە ئاگا گوێی لێ بێت.

پاشان دەچوو بۆ مزگەوت نوێژی دەکرد، دواتر دەهاتە لای خواردنەوەکەی و بەشی خۆی دەخواردەوە.

شەو کاتێك من بەشەکەی خۆم خواردبۆوە، شەیتان هاتە لام و گوتی: موحەمەد دەچێتە لای ئەنسارییەکان و لەدەوری کۆ دەبنەوە، لەلای ئەوان بەشی خۆی وەردەگرێت، هیچ پێویستی بەو قومە شیرە نییە، منیش بەشەکەی ئەوم خواردەوە.

کاتێك چوە ناوسکم، زانیم کە نەدەبووایە بیخۆمەوە، شەیتان پەشیمانی کردمەوە، گوتی: قوربەسەر ئەوە چیت کرد؟! ئایا بەشی موحەممەدت خواردەوە، کاتێك دێت بەشەکەی خۆی نابینێتەوە، ئینجا دوعات لێ دەکات و دەفەوتێیت و دونیا و قیامەتت لە کیس دەچێت.

---

[1] بوخاری (٦٠٣٥) گێڕاوەتیەوە، لە ئەبو شورەیحەوە ﷺ .

[2] وا بەدەردەکەوێت لەم فەرمودەیە، ئەوانەی چوونە بۆیالان هەژار بوونە و هیچیان نەبووە بیاندەنێ.

منیش پارچە قوماشێکم لەبەر بوو، گەر پێیەکانم پێ داپۆشی بایە، سەرم بە دەردەکەوت، ئەگەریش سەرم پێ داپۆشیبایە، پێیەکانم دەردەکەوتن، وام لێ هات خەوم لێ نەدەکەوت.

بەڵام دوو هاوڵەکەم، نوستن و ئەوەی من کردم ئەوان نەیان کرد.

پێغەمبەر ﷺ هاتەوە وەکو جاران سەلامی کرد، پاشان چووە مزگەوت نوێژی کرد، دواتر هاتەوە لای خواردنەوەکەی و سەری هەڵدایەوە، بەڵام هیچی تێدا نەبینیەوە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە.

گوتم: ئێستا دوعام لێ دەکات و بە هیلاك دەچم.

فەرمووی: **"خودایە نان بدەیە ئەو کەسەی نانی پێدام، خواردنەوە بدەی ئەو کەسەی خواردنەوەی پێدام!"**.

منیش دەستم برد بۆ پارچە قوماشەکە و خۆم پێ داپۆشی، دواتر چەقۆیەکەم هەڵگرت و ڕۆشتم بۆ لای بزنەکان، بۆ ئەوەی بزانم کامەیان قەڵەوترە بۆ ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژمەوە، بینیم هەموویان پڕ شیرین [1]، چووم جامێکم هەڵگرت، کە هی خێزانەکانی پێغەمبەر بوون ئەوان شیریان تێدا نەدەدۆشی، من دەستم بە دۆشین کرد تا کەف کرد، جا هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

فەرمووی: **"ئایە ئەم شەو خواردنەوەکەتان خواردەوە"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بیخۆرەوە، ئەویش خواردەیە و پاشان دایەوە دەستم.

کاتێك زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ تێری خواردەوە و بەبەر دوعاکەی کەوتم، هێندە پێکەنیم تا کەوتمە سەر زەوی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"میقداد تۆ خراپەیەکت کردووە چییە؟"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئاوا و ئاوام بەسەرهات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەمە تەنیا ڕەحمەتێك بووە لەلایەن خوداە ئایا بۆ پێت نەگوتم، بۆ ئەوەی هەردوو هاوەڵەکان ئاگادار بکەینەوە و بۆ ئەوەی بەشداریوونایە لەم ڕەحمەتە"**.

دەڵێت: گوتم: سوێند بەو کەسەی بە حەق تۆی ڕەوانە کردووە، گرینگ نییە لەلام کێ ئەم ڕەحمەتی پێ بگات، مادام تۆ ڕەحمەتەکەت پێ گەیشت و منیش پێم گەیشت [2].

---

[1] واتە شیرێکی زۆر لە گوانی کۆبۆتەوە، ئەویش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر و شوێنەواری بەرەکەتەکەی.

[2] موسلیم (٢٠٥٥) گێڕاوەتیەوە.

**قسەکەی (هێندە پێکەنینم تا کەوتمە سەر زەوی) مانایەکەی ئەوەیە کە ئەو لەناو خەمێکی زۆر دابوو، لە ترسی ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ بکات، چونکە بەشی پێغەمبەری خواردبوو، بووبووە مایەی ئازاردانی.**

**جا کە زانی پێغەمبەری ﷺ تێری خواردەوە، دڵی خۆش بوو، پێکەنی، تا کەوتە سەر زەوی، چونکە خەمەکانی بەمە ڕۆیشت حاڵەتەکەی لە خەمۆکی گۆڕا بۆ دڵخۆشی و بەبەر دوعاکەی پێغەمبەر کەوت و ئەو موعجیزەیە دەرکەوت. هەروەها سەرسوڕمانییەکەی بەهۆی خراپ مامەڵەکردنی خۆی بووە لە یەکەمجاردا و لە کۆتایشدا ئەم خێر و بەرەکەتەی بە نسیبی بوو[1].**

**پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ میوانەکانی دادەنیشت و لەگەڵیان پێدەکەنی و قسە و باسی لەگەڵ دەگۆڕینەوە:**

**ثوبان ﷺ دەڵێت: میوانێکی دەشتەکیمان هات، پێغەمبەر ﷺ لەبەردەمماڵەکانی خۆیدا داینیشاند.**

**پێغەمبەر ﷺ پرسیاری دەکرد سەبارەت بە خەڵکی کە ئایە چەندە دڵخۆشن بە ئیسلام و چەندە متوی نوێژن، ئەویش بەردەوام هەواڵی دڵخۆشکەری پێدەدا، تا بینیم دەم و چاوی پێغەمبەری خوا گەشایەوە.**

**کە خۆر تەواوێك بڵندبوو، کاتی نانخواردن هات، بانگی کردم و بەنهێنی ئاماژەی بۆ کردم و گوتی: "بڕۆ بۆ ماڵی عائیشە و هەواڵی بدەرێ کە پێغەمبەری خوا میوانی هەیە".**

**خاتوو عائیشە گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هیدایەت ڕەوانە کردووە، هیچ شتێکمان لەماڵدا نییە میوان بیخوات.**

**جا منی ناردە لای خێزانەکانی تری، هەموویان ئەم قسەیان کرد کە عائیشە کردی، تا بینم ڕەنگی پێغەمبەری خوا تێکچوو.**

**دەشتەکییەکەش زۆر عاقڵ بوو، لە مەسەلەکە تێگەیشت، هەر قسەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد و مەشغولی دەکرد تا گوتی: ئێمەی خەڵکی دەشت وەك خەڵکی شار نین، مستە خورمایەك و قومە شیرێکمان بەسە، ئەمەش باشترین خواردنە لەلامان، لەو دەمە بزنێکی خۆمان بەلاماندا تێپەڕی، کە دۆشرا بوو، پێمان دەوت (سەمرا) پێغەمبەر ﷺ بەناوی خۆی بانگی کرد و فەرمووی: "سەمرا سەمرا ".**

**ئەویش بە حەمەحم هاتەلای، قاچەکانی گرت و دەستی بە گوانی داهێنا و فەرمووی "بسم الله".**

---

[1] شەحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/١٥).

گوانەکانی شیریان هاتە ناوێ و ئەستووربوون، داوای جامێکی کرد، منیش بۆم هێنا، ئینجا دۆشی و فەرمووی: **"بسم الله"** تا پڕی کرد.

پاشان فەرمووی: **"بەناوی خودا بیدەرێ"**.

منیش بە میوانەکەم دا، ئەویش زۆر بە تۆشەوە قومێکی خواردەوە، پاشان ویستی دایبنێت، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"تەواوی بکە"**.

قومێکی تری لێخواردەوە و پاشان ویستی دایبنێت، پێغەمبەر ﷺ **پێی فەرموو: "تەواوی بکە"**، قومێکی تری لێخواردەوە، هەتا تێربوو، پاشان **جارێکی تر لەناو جامەکە** دۆشیەوە و فەرمووی: **"بسم الله"** تا پڕ بوو، پاشان فەرمووی: **"برۆ ئەمە بدە بە عائیشە با بەکەیفی خۆی لێ بخواتەوە"**.

گەڕامەوە لای، دیسان دەستی بە دۆشین کردەوە و فەرمووی: **"بسم الله"** هەتا پڕی کرد، ناردمی بۆلای خێزانەکانی تری، هەر کاتێك یەکێکیان بیخواردبایەوە دەمنیاردم، بۆلای یەکێکی تر، دەیفەرموو: **"بسم الله"**، هەتا هەموویان جامەکەیان یەك لە دوای یەك دەناردەوە، منیش بۆم دەهێنایەوە.

فەرمووی: **"بەرزی بکەرەوە بۆم"**، منیش بۆم بەرزکردەوە و فەرمووی **"بسم الله"**، خواردیەوە تا خوا بڵێ بەسە، پاشان بەمنی دایەوە، منیش دەمم لەسەر لێوی جامەکە دانا، خواردنەوەیەکم لێ خواردەوە شیرینتر لە هەنگوین و بۆنخۆشتر لە میسك، پاشان فەرمووی: **"خودایە بەرەکەتی تێبخەی"**، واتە لە بزنەکە [1].

**گەر پێغەمبەر ﷺ شتێکی نەبوایە بیداتە میوانەکانی، دەینارده لای هەندێك لە هاوەڵەکانی تا میوانداری بکەن:**

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: من زۆر ماندوو و برسیم.

ئەویش ناردی بۆلای یەکێك لە خێزانەکانی.. لە وەڵامدا گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە، لەئاو زیاتر چیترمان نییە.

پاشان نادری بۆلای یەکێکی تر، هەمان قسەی پێشووی گوتووە، تا هەموویان وەکو ئەویان گوت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ڕەحمەتی خوا لەم کەسەی ئەم شەو ئەم میوانە دەباتەوە ماڵەکەی"**.

---

[1] الأجري لە (کتاب الشریعة ١٠٤٨) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة/١٩٧٧) بە "سەحیح"ی داناوە

پیاوێك لە ئەنسارییەكان گوتی: من دەیبەمەوە.

ڕۆیشت بۆلای خێزانەکەی و پێی گوت: ڕێز لە میوانی پێغەمبەر بگرە و خزمەتی بکە.

ئافرەتەکەش گوتی: تەنیا خواردنی منداڵەکانم هەیە.

پیاوەکە گوتی: خواردنەکە حازر بکە، چرایەك داگیرسێنە، منداڵەکان گەر داوای نانی ئێوارەیان کرد بیانخەوێنە.

کە میوانەکە هاتە ژوورەوە چراکە بکوژێنەوە وا نیشان بدە کە ئێمە لەگەڵی دەخۆن، هەر کە دەستی بۆ خواردن برد برۆ بۆلای چراکە و بیکوژێنەوە.

جا خواردنێکی ئامادەکرد و چراکەی داگیرساند، منداڵەکانی خەواند، پاشان هەڵسا وەکو بڵێی بیەوێت چراکە چاك بکات، تا کوژاندیەوە، وایان نیشان دا لەگەڵ ئەو نان دەخۆن، ئەم شەوەیان بە برسییەتی بردە سەر.

کاتێك بەیانی بووە ڕۆشت بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پێی فەرموو **"خوای گەورە ئەم شەو بە کارەکەتان پێکەنی، یاخود بە کارەکەتان سەرسام بوو"**.

خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾[1] الحشر:٩ واتە: (حەز بە بەخشینی ماڵ و سامانیان دەکەن، فەزڵی بەرامبەریان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە بەخۆیان هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن).

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

● پێغەمبەر ﷺ و خێزانەکانی دونیا نەویست بوونە و لەسەر برسییەتی و تەنگوچەڵەمەی دونیا ئارامگر بوونە.

● هەروەها ئەو سوودەی لێوەردەگیرێت، کە پێویستە گەورەی گەلێك خۆی میوانداری بکات و خزمەتی میوان بکات و نانی بداتێ و ڕێزی بگرێت، ئەگەر خۆشی نەیبوو داوا لە نزیکەکانی و هاوڕێ و هاوەڵانی بکات یارمەتی بدەن.

● هەروەها دەردەکەوێت ئەم ژن و پیاوە ئەنسارییە ﵄ پلەیەکی تایبەتیان لەلای خوای پەروەردگار هەبووە.

---

[1] بوخاری (٣٧٩٩) و موسلیم (٢٠٥٤) گێراوەتیانەوە.

● دەکرێت لە رێزگرتنی میواندا فێڵ بەکاربهێندرێ، گەر میوانەکە نەیدەویست باریان قورس بکا. چونکە ئەگەر ئەوان چراکەیان نەکوژاندبایەوە و ئەویش ئەو خواردنە کەمەکەی بدیتبایە و سەیری بکردبایە ئەوان لەگەڵیدا نان ناخۆن، ئەویش خواردنەکەی نەدەخوارد[1].

## پێغەمبەر ﷺ رێزی میوانی دەگرت تەنانەت گەر کافریش بووایە:

ئەبوهورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ **میوانێکی بێ باوەڕی هات، فەرمانی کرد مەڕێکی بۆ بدۆشن، جا مەڕەکەیان بۆ دۆشی و شیرەکەیان بۆ هێنا و خواردیەوە، پاشان مەڕێکی تریان بۆ دۆشی شیرەکەی ئەویشی خواردەوە، دواتر یەکێکی تریش... تا شیری حەوت مەڕی خواردەوە.**

**پاشان کە بەیانی گزنکی دا، موسڵمان بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد مەڕێکی بۆ بدۆشن، ئەویش شیرەکەی خواردەوە، پاشان فەرمانی کرد یەکێکی تری بۆ بدۆشن، بەڵام نەیتوانی تەواوی بکات.**

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"باوەڕدار لە یەك ریخۆڵە دەخواتەوە، بەڵام بێ باوەڕ لە حەوت ریخۆڵە دەخواتەوە"**[2].

باوەڕدار ئەگەر شتێکی خوارد ناوی خوای لەسەر دەهێنێت، بەمە دووشت بە دەست دێنێت:

**یەکەم:** خواردنەکە بەرەکەتی تێدەکەوێت.

**دووەم:** شەیتان لێی دوور دەکەوێتەوە.

جا با خواردنەکەش کەم بێت، بەڵام بە بەرەکەتە و باوەڕدار لە یەك رێگا و ریخۆڵە خواردن دەخوات.

بەڵام کافر بەرەکەت لە خواردنەکەی نییە، ئەمەش لەبەر ناونەهێنانی خوا لەسەر خواردنەکە و لەبەر بەشداریکردنی شەیتان لەگەڵی، جا خواردنێکی زۆر بە فیرۆ دەچێت، وەکو بڵێی لە حەوت رێگا و ریخۆڵە نان بخوات[3].

مەبەست ئەمەیە کە باوەڕدار بە ئادابی شەرعییەوە نان دەخوات، لە یەك ریخۆڵەوە دەخوات، بەڵام بێ باوەڕ بەوپەڕی حەز و شەهوەت و چڵێسییەوە دەخوات، بۆیە لە حەوت رێخۆڵە دەخوات[4].

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢/١٤).

[2] بوخاری (٥٣٩٧) و موسلیم (٢٠٦٣) گێراوەتیانەوە

[3] كشف المشكل من حديث الصحيحين (١/٢٧١).

[4] جامع العلوم والحكم (لا ٩٢٨).

**دەگوترێ: باوەڕداری راستەقینە گەر برسییەتی نەما لە خواردن دەوەستێت و قەناعەتی بە کەم هەیە، بەشێکی خواردنی دەبەخشێت، بەڵام کافر بە پێچەوانەوەی ئەمەیە، چونکە بە چڵێسییەکەیەوە سوورە لەسەر ئەوەی زۆر بخوات** [١]

## پێغەمبەر ﷺ بە خۆی خزمەتی میوانەکانی دەکرد:

**لە فەرموودەی جابردا ﷺ هاتووە لە رۆژی خەندەق، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەکرد، جابر بە پێغەمبەری گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، خواردنێکم ئامادەکردووە تۆ و چەند پیاوێك وەرن بیخۆن!**

**فەرمووی: "چەندە؟".**

**منیش بۆم باسکرد.**

**فەرمووی: "باش و زۆرە".**

**ئینجا بە هاوەڵانی فەرموو: "هەڵسن".**

**جا موهاجیر و ئەنسارییەکان هەڵسان، کاتێك جابر چووە لای خێزانەکەی**

**پێ گوت: هەستە ئەوە پێغەمبەر هاتووە لەگەڵ موهاجیر و ئەنسارییەکان.**

**گوتی: ئایا پرسیاری لێکردووی؟**

**گوتم: بەڵێ**

**ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "بڕۆنە ژوورەوە و پاڵ بە یەکترەوە مەنێن"، پێغەمبەر ﷺ نانی کەرت دەکرد و گۆشتی لەسەر دادەنا و دەیبردە پێش هاوەڵەکانی، دەگەڕایەوە دیسان نانی کەرت دەکرد و دەستی دەبردە ناو مەنجەڵەکە ئینجا دەیبردە پێشیان، بەم شێوەیە تا هەموویان تێر بوو، هەندێکیشی لێ مایەوە.**

**بە خێزانەکەی جابری فەرموو: "ئەمە بخۆ و بیدەرە کەسانی تریش، چونکە تۆش برسیت بووە"** [٢].

**ئەو میوانانەی کە لە موهاجیر و ئەنسارییەکان پێك هاتبوون، لە راستیدا میوانی پێغەمبەر بوون، گەرچی لەماڵی جابر بوون، زۆربوونی خواردنەکەش موعجیزەیەکی پێغەمبەر ﷺ بووە، چونکە خودی خواردنەکەی جابر تەنیا بەشی چەند پیاوێکی دەکرد، بەڵام بە بەرەکەتی پێغەمبەر بەشی هەموو ئەهلی خەندەقی کرد.**

---

[١] المنتقى شرح الموطأ (٤/٣٢٦).

[٢] بوخاری (٤١٠١) و موسلیم (٢٠٣٩) گێراوەتیانەوە

**جا هەڵسانی پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا بە دابەشکردنی گۆشت و پارچەکردنی نان ئەمە خزمەتکردنی میوانە، بەڵام لە ماڵی جابیردا ﷺ.**

**هەندێکجار لەوانەیە بێزاربووایە لە هەڵسوکەوتی هەندێك لە میوانەکانی، بەڵام شەرمی دەکرد بیانشکێنێتەوە:**

**خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ الأحزاب: ٥٣

**پەروەردگاری مەرزن فەرمان بە بەندە باوەڕدارەکانی دەکات خۆیان بە ڕەوشتی جوان برازێننەوە، لە کاتێك دەچنە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێت** ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ﴾

**واتە: بێ مۆڵەت بۆ نانخواردن وەرگرتن مەچوونە ژوورەوە.**

**ماناکەشی بە ڕوونی ئەوەیە، کە مەچونە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺ مەگەر بە دوو مەرج نەبێت:**

**یەکەم: مۆڵەت پێدانتان بۆ چوونەوە ژوورەوە.**

**دووەم: دانیشتنتان بە گوێرەی پێویست.**

**بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍ﴾ **واتە: بەڵام کاتێك بانگکران، ئەوا بچنە ژوورەوە، جا کاتێك نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن و خۆتان بە گفتوگۆوە سەرقاڵ مەکەن.**

**پاشان حیکمەتی ئەو قەدەغەکراوەی ڕوون کردۆتەوە، کە دەفەرموێت:** ﴿إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ﴾ **واتە چاوەڕێکردنی زیاد لە پێویست ئازاری پێغەمبەر دەدات، دەبێتە هۆی ئەوەی پێغەمبەر لە چەند کارێکی گرنگ بوەستێنی.**

﴿فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ﴾ **واتە شەرم دەکات پێتان بڵێت: بڕۆنە دەرەوە، هەروەك نەریت وایە ئەهلی ناندەر و خاوەن ماڵ شەرم دەکەن خەڵك لەماڵەکانی خۆیان دەربکەنە دەرەوە، بەڵام** ﴿وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ **خوا شەرم لە ڕاگەیاندنی حەق و ڕەوا ناکات**

جا فەرمانی شەرع، گەرچی لەبەر ئەدەب و شەرم وازی لێبهێندریٚ، بەڵام حەزم و جەزم وایە کە شوێن فەرمانی شەرع بکەون، فەرامۆشکردنیشی لەگەڵ ئەدەب تێك ناگیرێن.

خوای گەورە شەرم ناکات فەرمانتان پیٚ بکات بە شتێك خێری بۆتان هەیە [1]، ئەمە چەند وێنەیەك بوو لە رەوشتەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر میوانداری یەکێکی بکردبایە.

## دووەم: پێغەمبەر ﷺ وەك میوان:

سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوبایە میوانداری یەکێك ئەوا زۆر ملکەچ بوو، هەر کەسێك کە بانگهێشتی بکردبایە دەچوو بەدەم داواکەی، گەرچی بە شتێکی سادەش بوایە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"ئەگەر بۆ دەستێك یان قاچێك بانگ بکرێم، دەچم"**[2].

دەست لە ئاژەڵ، مەبەست لێی لە خوار ئەژنۆوە تا دەگاتە پێیەکان [3].

کە باسی دەستی کردووە ناوی قاچیشی لەگەڵ هێناوە بۆ ئەوەی باش و خراپ پێکەوە کۆ بکاتەوە، چونکە لەلای ئەو خواردنی گۆشتی دەست لە هەموو بەشەکانی تر بزن و مەڕ خۆشتر بووە، قاچیش ئەوەندە نرخی نییە [4].

### وەڵامی دەعوەتی دەدایەوە، با منداڵێکیش بانگی بکردبایە:

ئەنەس ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ چووینە لای گەنجێك، کە بەرگدووری دەکرد، جا لەگەنێك خوادنی بۆ هێنا کە شلەی کولەکەی زەرد بوو، گەنجەکە چوو بۆ سەر کارەکەی خۆی، پێغەمبەریش ﷺ لەناو مەرگە بە دوای کولەکە دەگەڕا، منیش بۆم دەردەهێنا و لە پێشم دادەنا، لەپاش ئەمەوە هەر حەزم دەچووە کولەکەی زەرد [5].

### ئەم فەرموودەیە چەند سوودێکی تێدایە:

- حەڵاڵ بوونی کاری بەرگدووری.
- دروستە کەسێك پلەوپای گەورە بێت خواردن لەلای کەسێك بخوات بە پلەوپایە لەو نزمتر بێت، دروستیشە لەگەڵ خزمەتکار نان بخورێت.

---

[1] تفسير السعدي (٦٧/١).
[2] بوخاری (٢٥٦٨) گێراوەتیەوە.
[3] النهاية (٢٩٧/٤).
[4] فتح الباری (١٩٩/٥).
[5] بوخاری (٢٠٩٢) و موسلیم (٢٠٤١) گێراوەتیانەوە.

● دروستە وەڵامی دەعوەت بدرێتەوە، با خواردنەکەش کەم بێت.

● دروستە هەردوو میوان خواردن بدەنە یەکتری، بەڵام ئەوەی نادروستە ئەوەیە خواردن لەپێش یەکتری هەڵبگرن.

● دروستە خاوەن ماڵ خواردن لەگەڵ میوان نەخوا، چونکە بەرگدوورەکە خواردنی هێنا پێشیان، پاشان خۆی چووە سەرکارەکەی خۆی، جا ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دروستبوونی، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەمە رازی بوو، لەوانەشە خواردنەکە کەم بوویێت، بۆیە ئەو بەشداری نەکرد، لەوانەشە برسی نەبوویێت یان بەرۆژوو بێت، یان کارەکەی وا دەخوازێت کە بەشداری نەکات چونکە لەوانەیە کاری زۆری لەسەر کەڵەکە بوو بێت و لەسەریەتی تەواوی بکات [١].

**وەڵامی دەعوەتی جولەکەی داوەتەوە، بۆ دڵ کێشکردنی:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جولەکەیەك پێغەمبەری خوای ﷺ، بانگ کرد بۆ نانخواردنێك، خواردنەکەش بریتی بوو لە نانی جۆ لەگەڵ هەندێك چەوری بۆنگۆڕاو، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی بانگهێشتەکەی دایەوە [٢].

لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێت کە دروستە وەڵامی بانگهێشتی ئەهلی کیتاب بدرێتەوە.

**ئەگەر یەکێك بانگی بکردبا، کەسێکیش دوای بکەوتبایە کە بانگ نەکرابوو، ئەوا مۆڵەتی لە خاوەن ماڵ دەخواست:**

ئەبو مەسعودی ئەنساری ﷺ دەڵێت: پیاوێکی ئەنساری پێیان دەگوت ئەبو شوعەیب، خزمەتکارێکی گۆشتفرۆشی هەبوو، پێغەمبەری خوای بینی زانی برسیەتی.

بە خزمەتکارەکەی گوت: خواردنێکی پێنج کەسیمان بۆ دروست بکە، دەمەوێت پێغەمبەر ﷺ پێنجەمیان بێت. جا خواردنەکەی دروست کرد، پاشان هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و بانگی کرد، پیاوێکیش دوایان کەوت.

کە گەیشتنە بەر دەرگا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەو پیاوە دوامان کەوت، ئەگەر دەتەوێ مۆڵەتی بدە، ئەگەریش ناتەوێ بابگەرێتەوە"**.

گوتی: بەڵکو مۆڵەتی دەدەم بابێت [٣].

---

[١] فتح الباری (٥٢٩/٩)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٢٤/١٣).

[٢] ئەحمەد (١٣٧٨٩) گێڕاوەتیەوە، شعیب الأرناؤوط بە "سەحیح"ی داناوە.

[٣] بوخاری (٢٤٥٦) و موسلیم (٢٠٣٦) گێڕاوەتیانەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ئەوەی خواردنێك بۆ کەسێك دروست بکات، ئەوا سەرپشکە لە نێوان ئەوەی بۆی بنێرێ یان بانگی بکات بۆ ماڵەکەی خۆی.
- ئەو کەسەی یەکێکی بانگ کرد، سوننەتە کەسێکی تر بانگ بکات کە لە برادەرە تایبەتییەکان بێت.
- کەسێك خۆی لەگەڵ دەعوتێك دا، کە بانگ نەکرابوو، ئەوا خاوەن ماڵ سەرپشکە لە مۆڵەت دان و مۆڵەت پێنەدانی [١].

**هەندێکجار چەند هاوەڵێکی دەستنیشان دەکرد بۆ ئەوەی بچێتە میوانداریان:**

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ دەرچوو، ئەبوبەکر و عومەری بینی، فەرموی: **"لەو کاتە چی ئێوەی هێناوەتە دەر؟"**.

گوتیان: برسییەتی ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"منیش سوێند بەخوا، ئەو شتەی ئێوەی وەدەرناوە، منیش وەریناوە، هەڵسن"**.

ئەوانیش لەگەڵیدا هەڵسان، چوون بۆ لای پیاوێکی ئەنساری [٢]، بینیان لە ماڵەوە نییە، کاتێك ئافرەتەکەی ئەوانی بینی، گوتی: زۆر بەخێر بێن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"فلانەکەس لە کوێیە؟"**.

گوتی: چوە بۆ ئەوەی ئاوی خواردنەوەمان بۆ بێنێت.

لەو دەمەدا پیاوە ئەنسارییەکە هاتەوە، پێغەمبەر و دوو هاوەڵەکەی بینی، گوتی: سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ کەس وەکو من میوانی وا بەرێزی نەهاتووە [٣]، پاشان ڕۆشت چەند هێشووە خورمایەکی هێنا و گوتی: لەمانە بخۆن [٤].

دواتر دەستی دایە چەقۆیەك، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"نەکەی مەڕی شیردەر سەر ببڕی"**.

مەڕێکی بۆ سەربڕین، ئەوانیش لە گۆشتی مەڕەکە و خورما و خواردنەوەیەکان خوارد.

---

[١] فتح الباري (٩/٥٦٠).

[٢] ناوی: أبو الهيثم بن التيهان بووە، وەك لە گێڕانەوەی ترمذي هاتووە (٢٣٦٩).

[٣] دەرخستنی ڕووخۆشی و دڵخۆشییە بە هاتنی میوان، سوپاسکردنی خواش لەسەر پێدانی ئەو نیعمەتە.

[٤] سوننەتە دەستپێشخەری بکرێت لە پێدانی خواردنەوە یان میوە لەگەڵ هاتنیدا، تا خواردن ئامادە دەبێت، بەتایبەت گەر بزانێت ئەوان پێویستیان بە خواردن هەیە.

جا کە تێریان خواردن و خواردنەوەکەیان خواردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوبەکر و عومەری فەرموو: **"سوێند بە خوا، لە رۆژی دوایی، پرسیارتان لەو نیعمەتە لێ دەکرێت[(١)] ، برسییەتی ئێوەی لەماڵ وەدەرنا، پاشان نەگەڕانەوە تا ئەو نیعمەتەتان بە قسمەت بوو"[(٢)].**

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی دونیا نەویست بوونە، وێڕای ئەوەی بە دەست هەژاری و برسییەتی و خراپ گوزەرانی ناڵاندوویانە.
- دروستە مرۆڤ باسی ئەو ئێش و ئازارانە بکات کە تووشی دەبێت، نەك وەك گلەیی و رازی نەبوون، بەڵکو بۆ دڵدانەوە و ئارامگرتن، هەروەکو لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ وایکرد، هەروەها بۆ بەدەستهێنانی دوعایەك یان یارمەتییەك بۆ لابردنی ئەم ئێش و ئازارە، ئەمانە هیچیان لۆمەکراو نین.
- سوننەتە رێز لە میوان بگیرێت، بە قسەی خۆش و رەزامەندی بۆ دەربڕین بەخێر هاتنی بکرێت، ئەمانە هەمووی دەچنە چوارچێوەی رێزلێنان.
- دروستە پیاو لە کاتی پێویستدا گوێی لە دەنگی ئافرەتی بێگانە بێت و گفتوگۆی لەگەڵدا بکات.
- دروستە ئافرەت مۆڵەتی کەسانێك بدا بێنە ماڵی مێردەکەی، ئەگەر زانی رقی لێیان نابێتەوە و تەنیایی و خەلوەت لەگەڵیاندا روونادات.
- دروستە قسەی خۆش لەگەڵ میوان بکەیت و دڵی رازی بکەیت.
- کاتێك نیعمەتێکی روون و ئاشکرا رووت تێدەکات، دروستە بڵێی الحمدلله، هەروەها ئەو وشەیە بۆ ئەو بەڵایەش دروستە کە لەسەرت لاچووە، یان بە هەربارێك لە بارەکان.
- رووگەشبوون و پێکەنین بە رووی هاتنی میوان و سوپاسکردنی خوا لەسەری سوننەتە.
- سوونەتە ستایشی میوان بکرێت، گەر لە روودانی فیتنە نەترسا، بەڵام گەر لە فیتنە ترسا ئەوا نابێت لە بەرامبەریدا ستایشی بکات.

---

(١) پرسیارکردن لێرەدا بە مانای ژماردنی نیعمەتەکان و باسکردنیانە، وەك منەتێکی خوا لەسەرمان، نەوەك پرسیارکردنی لۆمەکردن و سەرزەنشتکردن و تەمبێ کردن و لێپرسینەوە بێت (شەرحی نەوەوی ٢١٣٢١٤/١٣).

(٢) موسیلیم (٢٠٣٨) گێڕاوەتیەوە.

- گەورەیی ئەو هاوەڵە ئەنسارییە و زۆرزانی و کارامەیی لە ڕەوانبێژی و قسەزانیدا، چونکە ئەو لەو شوێنەدا چەند وشەیەکی زۆر جوان و پوختی بۆ دەربڕین.
- سوننەتە میوە بەر لە خواردنی نان و گۆشت پێشکەش بکرێت و دابندرێت.
- سوننەت دەستپێشخەری بکرێت لە هێنانی ئەو شتانەی ئامادە و حازرن بۆ بەردەمی میوان، پاشان خواردنێکی بۆ ئامادە بکرێت، بە تایبەت گەر هەستی کرد زۆر پێویستی بە خواردنە، لەوانەیە زۆر پەلەی بێت بۆ ئەو خواردنە و لەسەر گران بێت چاوەڕێی بکات، چونکە پەلەیەتی بۆ ڕۆیشتن.
- تێرخواردن دروستە، سەبارەت بەوەی کە دەگوترێت تێرخواردن پەسەند نییە، ئەمەیان بۆ بەردەوامبوونە لەسەری، چونکە دڵ رەق دەکات و کەسی هەژار و کەم دەرامەت لەبیر دەکات[١].

لەقیتی کوڕی سەبرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: چوینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام لەماڵ نەبوو، خاتوو عائیشە لە ماڵ بوو.

دەڵێت: فەرمانی کرد خواردنی (خەزیرەمان)[٢] بۆ ئامادە بکرێت، ئێمەش قیناعێکمان[٣] هێنا.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوە و فەرمووی: **"ئایا خواردنیان داوە بە ئێوە؟"**.

گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

دەڵێت: لە کاتێکدا ئێمە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، شوانی مەڕەکان، مێگەلە مەڕەکەی بۆ شوێنی حەوانەوە لێدەخوڕی، بەرخێکی لە لابوو دەیباڕاند.

فەرمووی: **"ئەمە چی بووە؟"**.

شوانەکە گوتی: بەرخێکی مێ.

فەرمووی: **"لە شوێنی ئەو مەڕێکمان بۆ سەرببڕە"**..

پاشان فەرمووی: **"وامەزانە، کە ئێمە لەبەر خاتری ئێوە ئەوەمان سەربڕی، ئێمە سەد سەرمان هەیە و نامانەوێت زیاد بکات، ئەگەر شوانەکە گوتی مەڕێکان زیاد بووە، لە جیاتی ئەو مەڕێك سەر دەبڕین"**[٤].

واتاکەشی ئەوەیە، بۆ ئەوەی ئەمە نەکرێتە منەت لەسەر میوان و دوریشە لە ریابازی.

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢١٣/١٣).

[٢] خەزیرە: خواردنێکە لە گۆشت و ئاو دروست دەکرێت، گۆشتەکە پارچە دەکرێت، پاشان ئاوی تێ دەکرێت، دواتر کە کوڵا ئاردی بەسەردا دەکرێت، ئەگەر گۆشتی تێدانەبوو پێی دەگوترێت (عصیدة).

[٣] قیناع: ئەو دەفرەیە کە خورمای تێدەکرێت.

[٤] ئەبو داود (١٤٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ئەگەر پیاوێك وەك میوان چووە لای کەسێك، بەڵام لە ماڵ نەبوو، وا سوننەتە خاو خێزانەکەی خواردنێکی بۆ ئامادە بکەن، رانەوەستن تا خاوەن ماڵ دەگەڕێتەوە.
- سوننەتە باشترین شت کە لە ماڵەوە هەیە پێشکەشی میوان بکرێت[1].

**بە شێوەیەکی گشتی پێغەمبەر ﷺ شوێن پێی ئیبراهیمی باوکی هەڵگرتووە لە ڕێزگرتنی میوان:**

خوای گەورە چیرۆکی ئیبراهیم ﷺ لەگەڵ دوو میوانەکەی بۆمان دەگێڕێتەوە، کە دەفەرموێت: ﴿ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾ إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ ﴾ الذاريات: ٢٤-٢٨

واتای ئایەتەکان: ( ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا هەواڵی میوانە بەڕێزەکانی ئیبراهیمت پێنەگەیشتووە؟ (٢٤) کاتێك چوون بۆ سەردانی و وتیان: سڵاو، ئەویش وتی، سڵاو لە ئێوەش بێت، هەرچەندە ناتانناسم (٢٥) ئەوسا ئیتر خۆی دزیەوە چوو بەهاوکاری خێزانی گوێرەکەیەکی قەڵەوی(سەری بڕی و سووریانکردەوە و) هێنای (٢٦) بردی ولێی نزیك کردنەوە، فەرمووی لێکردن کە بینی ناخۆن، وتی: ئەوە نافەرموون، ئەوە ناخۆن؟! (٢٧) ئیبراهیم ترسێکی لێنیشت (چونکە وای زانی شتێکیان لەژێر سەردایە) بۆیە خێرا وتیان: مەترسە ئێمە فریشتەین، مژدەشیان پێدا کە خوا بەم نزیکانە منداڵێکی زانایان پێدەبەخشێت).

**ئەم چیرۆکە چەند ئادابێکی میوانداری لە خۆگرتووە:**

**یەکەم:** ئیبراهیم ﷺ خواردنەکەی بۆ بردنە پێش، پێی نەوتن هەڵسن با بڕۆین بەرەو خواردنەکە، بۆ ئەوەی ئەزیەتی ڕۆیشتن بەرەو خواردنەکە نەخۆن.

**دووەم:** بە پەلە هێنانی خواردنەکە، کە فەرموویەتی ﴿فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ﴾ نەیگوتووە (ثم جاءَ- پاشان بۆی هێنان) چونکە وشەی (فـ) لە زمانی عەرەبی بە واتای لەدوایەکبوونی دەستبەجێیە، واتە یەکسەر و زۆر بەخێرایی بۆ ئامادەکردنی خوارنەکە ڕۆیشت، بەڵام (ثم) مانای دواکەوتنی تێدایە.

---

[1] شەرحی ئەبو داود (١/٣٣٥)ی العيينی.

**سێیەم:** ئامادەکردنی خواردن بێ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە، نەوەك توشی شپرزەیی ببن، خوای گەورە فەرمووی ﴿فَرَاغَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ﴾ واتە بە نهێنی و سوکەلەیی چووە دەرەوە، خواردنی بۆ هێنان.

**چوارەم:** هەڵبژادرنی باشترین خواردن ﴿فَجَآءَ بِعِجۡلٖ سَمِينٖ﴾ لە شوێنێکی ترد فەرمویەتی ﴿فما لبث أنا جاء بعجل حنيذ﴾، وشەی (حنيذ) واتە: سورکاوە لەسەر بەرد، کە بەتامترین و تەندروسترین خواردنە.

**پێنجەم:** شێوازی بردنە پێشیان ﴿فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيۡهِمۡ﴾ کە نەرمی و لەسەرخۆیی تێدایە لە دانانی خواردنەکە ﴿قَالَ أَلَا تَأۡكُلُونَ﴾ بانگەشەیەکە بۆ میوان بە هێمنی و نەرمترین شێواز.

**شەشەم:** سەبارەت بە وتەی ﴿قَالَ سَلَٰمٞ قَوۡمٞ مُّنكَرُونَ﴾ واتە سەلام لەوانەی نایان ناسم، جا ئەو سەلامی لەوانە دەکات کە دەیاناسێت و نایان ناسێت، ئەمەش یەکێکە لە رێزەکانی، کە رێز لە هەمووان دەگرێت، هێنانی گۆلکێکی قەڵەو بۆ میوانێك کە نایان ناسێت ئەوە کۆتا پلەی رێز و بەخشندەییە.

ئەمە چەپکێك بوو لە گوڵزاری ئادابی میوان لەم چیرۆکەدا، سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ پڕە لەو هەڵوێستانە، کە ئادابی پێغەمبەری تێدا رەنگداوەتەوە، جا لەلای یەکسان بووە میوانداری کەسێکی کردبێت یان بوبێتە میوانی کەسێك.

## مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ هاوەڵە تایبەتەکانی:

**پلە و پایەی هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ئیسلامدا دیار و ئاشکرایە، دڵەکانی ئەوان پاکترینی دڵەکانی ئەو ئوممەتە بوون و شارەزاترینیان بوونە لە زانست، لە هەمووان زیاتر بێ ئەرکتربوون، راسترین رێگایان هەبووە و لەسەر باشترین حاڵەت بوونە، کەسانێك بوونە خوای گەورە بۆ هاوەڵایەتی پێغەمبەری ئازیز ﷺ و دامەزراندنی ئاینەکە هەڵیبژاردوون.**

**خوای گەورە ﷻ لە چەند ئایەتدا مەدح و ستایشی کردوون، وەك دەفەرموێت:** ﴿وَٱلسَّـٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَـٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَـٰنٍ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّـٰتٍ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ﴾ التوبة: ١٠٠

**واتە: (خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەت کردنی ئیسلامدا لەکاروانی کۆچبەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە رێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، رازی بووە و ئەوانیش لەو رازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادە کردوون کە چەندەها رووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیش تیایدا دەمێننەوە، ئەو سەرئەنجامە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە).**

**بە راستی هاوەڵەکان لە هاوەڵەتیدا هەموویان وەك یەك نەبوونە، بەڵکو هەر یەکەیان پلەیەکی جیاوازی هەبووە، شێخی ئیسلام دەڵێت: "هاوەڵێتی ناوی رەگەزە، لەسەر هەر کەسێك جێبەجێ دەبێت کە هاوەڵێتی پێغەمبەری ﷺ کردبێت، جا کەم بێت یان زۆر، بەڵام هەریەکەیان بە پێی ئەو ماوەیەی هاوەڵێتی کردووە، ئەوەی ساڵێك، یان مانگێك، یان رۆژێك، یان کاتژمێرێك، یان بە باوەڕداری بیونیەتی، جا ماوەی هاوەڵێتییەکی بەو ئەندازە بۆ ئەژمار دەکرێت[1]".**

**بابەتەکەشمان لەسەر ئەوە دەبێت مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو هاوەڵە تایبەتیانەی هەردەم لەگەڵیدا بوونە.**

**لە دیارترینیان: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی، زوبەیر، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، حوزەیفەی کوڕی یەمان و عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف.**

**لە هەموویان تایبەتیتر بە پێغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر و عومەرە.**

---

[1] مجموع الفتاوی لابن تیمیه (٤/٤٦٤).

عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب گوتوویەتی: **"زۆرجار گوێم لە پێغەمبەر ﷺ دەبوو دەیفەرموو: من و ئەبوبەکر و عومەر ڕۆیشتین، من و ئەبوبەکر و عومەر هاتینە ژوورەوە، من وئەبوبەکر و عومەر دەرچووین[(١)].."**

## پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستی بۆ دەردەبڕین و لەناو خەڵك ئاشكرای دەكرد:

عەمری کوڕی عاص ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی وەك ئەمیر لە جەنگی (ذات السلاسل) دانا، جا کە هاتمە لای پێم گوت: کێ خۆشەویسترین کەسە لەلات؟

فەرمووی: **"عائیشە"**.

گوتم: لە پیاوان؟

فەرمووی: **"باوکی"**.

گوتی: پاشان کێ؟

فەرمووی: **"عومەری کوڕی خەتتاب[(٢)]"**.

قوڕتوبی دەڵێت: ئەم فەرمودەیە ڕێگە بەوە دەدات کە باسی خۆشەویسترین کەس بکەیت لە پیا و ژنان، لۆمەش ناکرێ لەسەری ئەگەر کەسەکەی پرسیاری لێدەکا لە ئەهلی خێر و دین بێت.

لەبەر ئەوەش یەکەم جار باسی عائیشەی کردووە، چونکە خۆشەویستییەکەی زگماك و دینییە، بەڵام هەر خۆشەویستییەکی تر هەبێت خۆشەویستی دینییە نەك زگماکی، جا ئەسڵەکە پێش فەرع کەوتووە.

کە پێشتر گوترا، ئەی لە پیاوان کێ؟ فەرمووی: **"باوکی"**، ئەمەش لەبەر دەستپێشخەریەتی لە ئیسلام بوون، دڵسۆز بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و ئیسلام و مسوڵمانان، سەرفکردنی ماڵەکەی و گیان فیدایی لەسەر ڕازیکردنیان[(٣)].

## لە کەس ڕازی نەدەبوو بە خراپە باسیان بکات:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: لە نێوان خالیدی کوڕی وەلید و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف گرژیەك دروست بوو، خالید قسەیەکی بە عەبدولڕەحمان گوت[(٤)].

---

(١) بوخاری (٣٦٨٥) و موسلیم (٢٣٨٩) گێراوەتیانەوە.

(٢) بوخاری (٣٦٦٢) و موسلیم (٢٣٨٤) گێراوەتیانەوە.

(٣) المفهم (٧١/٩) فیض القدیر (٢١٨/١).

(٤) لە گێڕانەوەی (ئەحمەد ١٣٤٠٠) هاتووە: لە نێوان خالیدی کوڕی وەلید و عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف گرژیەك هەبوو، خالید بە عەبدولڕەحمانی گوت: زیادەڕۆییمان لەسەر دەکەن بەو ڕۆژانە پێش ئێمە موسڵمان بوون، دواتر ئەم قسەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرا

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"جنێو بە هاوەڵەکانم مەدەن، ئەگەر یەکێکتان بە ئەندازەی کێوی ئوحود زێڕ ببەخشێت، ناگاتە دوو مشت یان مشتێکی ئەوان"**[١].

هۆکاری گەورەیی خێر و بەخششەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە کاتی پێویستی و گوزەران ناخۆشیدا بەخشیویانە، پێچەوانەی ئەوانەی دی، هەروەها بەخشینەکانیان بۆ سەرخستنی پێغەمبەر ﷺ و پارێزگاری کردنی بووە، هەروەها جیهاد و سەرجەم خواپەرستییەکانیان بۆ ئەم ئامانجە بووە، وەك خوای پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ﴾ الحديد: ١٠ واتە: (بێگومان چوونیەك نین ئەوانەتان کە پێش رزگاریی مەککە یاخود پێش سەرکەوتن، ماڵ و سامانی بەخشیووە و جەنگاوە، چونکە ئەوانە پلەو پایەیان زۆر بەرزترە لەوانەی کە دوای رزگاریی مەککە و بەدەست هێنانی سەرکەوتن ماڵ و سامانیان بەخشیووە و جەنگاون، بە هەردوولاشیان خوا بەڵێنی بەهەشتی بەخشیووە)..

ئەمەش لەبەر ئەوەیە بەخشین و جەنگ پێش رزگارکردنی مەککە زۆر پێویست بووە خەڵکیش کەم گرینگی پێداوە، بە پێچەوانەی دوای رزگارکردن، چونکە موسڵمانان ژمارەیان دوای فەتحکردنی مەککە زۆر بوو، خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ناو دینی خودا، بۆیە فەزڵ و گەورەیی بەخشین لە پێش فەتحکردنی مەککە جارێکی دی روونادات و دووبارە نابێتەوە.

جگە لەو سیفەتە بەرزانەی لەناو دڵ و دەروونیان هەبووە لە بەزەیی و خۆشەویستی و ملکەچی و بەخشین و جیهادکردنی راست و دروست.

بە راستی پلە و پایەی هاوەڵایەتی زۆر بەرزە، با ماوەکەی چرکەیەکیش بێت، هیچ کردوەیەك ناگاتە پاداشتەکەی، پلە و پایەکان پێوانە ناکرێن، ئەمەش چاکە و فەزڵی خودایە بە ویستی خۆی دەیدات بە هەر کەسێك بیەوێت[٢].

سەبارەت بەوەی فەرمووی: **"هاوەڵەکانم"**، ئەوە چەند هاوڵێکی تایبەتن، کە ئەمانە دەگرێتەوە بەر لە رزگاکردنی مەککە موسڵمان بوون، ئەوانە ماوەیەکی دوور و درێژ لەگەڵیدا بوون و بەشداری جەنگیان لەگەڵیدا کردووە و کۆچیان کردووە و بەخشیویانە.

---

[١] بوخاری (٣٦٧٣) و موسلیم (٢٥٤١) گێراوەتیانەوە.

[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٣٩/١٦).

پێشینە یەکەمەکان (السابقون الأوائل) لە موهاجیر و ئەنسارییەکان باشترین جیلی هاوەڵەکانن.

بەڵگەش لەسەری، ئەم فەرموودەیەی رابردووە کە کەسی قسە لەگەڵ کراو یان گوێگرەکە خالیدی کوڕی وەلیدە و لەوێ ئامادە بووە.

ئیبن حەجەر دەڵێت : لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ سەرزەنشتی هاوەڵێك بكات كە قسەی گوتووە بە هاوەڵێکی تر بەر لەو موسڵمان بووە، ئەوا بە پلەی یەکەم ئەم جۆرە کەسانە لە پێشترن کە فەرموودەکە بیانگرێتەوە، ئەوانەی هاوەڵانی بەڕێزیان نەبینووە بەڵام قسەیان پێ دەڵێن [1].

جا ئەگەر ئەمە رێگری لێگرتن بێت لە خالیدی کوڕی وەلید و هاوشێوەکانی لەوانەی لە ئاشتەوایی حودەیبیە موسڵمان بوون، ئەی دەبێ حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێ کە هاوەڵی نەبوون و ئینجا قسە بەهاوەڵەکانی دەڵێن! !

پێشەوا نەوەوەی دەڵێت: بزانە جنێواندان بە هاوەڵەکان حەرامە و لە گوناهە گەورە و خراپەکانە، جا یەکسانە بەرامبەر ئەو هاوەڵانەی توشی فیتنە و شەڕکردن بوون یان نا، چونکە ئەوان هەر لە خۆڕا شەڕیان لەگەڵی یەکتری نەکردووە، بەڵکو موجتەهید بوونە، جنێودان بە هەریەکێکیان لە گوناهە گەورەکانە، رای ئێمە و رای زۆربەی زانایان ئەمەیە دەبێ تەمبی بکرێن بەڵام ناکوژرێن، زۆرێك لە مالیکییەکان گوتویانە: دەکوژرێ [2].

ئیبن کثیر دەڵێت: خوای گەورە هەواڵیداوە کە لە پێشینە یەکەمەکان خۆشبووە، ئەوانەی موهاجیر و ئەنسارِ بوون، لەو کەسانەش بە چاکە دوایان کەوتوون، قوڕ بەسەر ئەو کەسەی جنێویان پێ دەدات، یان رقی بەرامبەر هەندێکیان هەڵدەستێت، بەتایبەت گەورەیی هەموو هاوەڵان پاش پێغەمبەر ﷺ کە ئەبوبەکری راستۆگییە ﷺ، چونکە کۆمەڵی گومڕا لە رافیزەکان دوژمنایەتی باشترین هاوەڵ دەکەن و رقیان لێ دەبێتەوە و جنێوی پێ دەدەن، خو پەنامان بدات، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان گەمژەن و دڵەکانیان نەخۆشە [3].

---

(1) فتح الباری (٣٤/٧).

(2) شەرحی نەوەوی لە سەحیح موسلیم (٩٣/١٦).

(3) تفسیر ابن کثیر (٢٠٣/٤).

**پلە و پایەی هاوەڵە تایبەتییەکانی دەناسی و خەڵکیشی فێر دەکرد ئەو پلە و پایەی شایەنیانە پێیان بدەن:**

**ئەبو دەردا ﷛ دەڵێت لە نێوان ئەبوبەکر و عومەری ﷛ دەمەقاڵێیەك روویدا، ئەبوبەکر عومەری تورە کرد، عومەر بە تورەیەوە لەلای رۆی.**

**ئەبوبەکر شوێنی کەوت و داوای لێبوردنی لێکرد، بەڵام ئەو قەبوڵی نەکرد، تا دەرگای بە روودا داخست.**

**ئەبوبەکر چووە لای پێغەمبەر ﷺ.**

**ئەبو دەردا دەڵێت: من لای پێغەمبەر دانیشتبووم، کاتێك ئەبوبەکر هات و لایەکی جلەکانی هەڵکردبوو، تا چۆکەکانی بەدەرکەوت.**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "پێ دەچێت هاوەڵەکانت توشی دەمەقاڵێیەك بووبێت".**

**کە سەلامی کرد، گوتی: لە نێوان من و کوڕی خەتتابدا شتێك روویدا، بە پەلە چوومە بۆلای و داوای لێبوردنم لێکرد و پەشیمانیم نیشاندا، ئەو لێی نەبووریم و رازی نەبوو.**

**بۆیە بۆ لای تۆ هاتم.**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر.." سێ جار ئەمەی فەرموو.**

**پاشان عومەریش پەشیمان بووە، چوو بۆ لای ماڵی ئەبوبەکر و پرسیاری کرد کە ئایا ئەبوبەکر لە ماڵە؟**

**گوتیان: لە ماڵ نییە.**

**ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی کرد، دەموچاوی پێغەمبەر ﷺ سوور هەڵگەڕا.**

**تا ئەبوبەکر بەزەیی بە عومەر هاتەوە لەوەی نەوەك شتێك لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەربچێت و عومەر دڵگران بکات، بۆیە هاتە سەرچۆك و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا من ستەمکار بووم.**

**پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "خوای گەورە منی بۆ لای ئێوە نارد گوتتان درۆ دەکەی، ئەبو بەکر گوتی راست دەکەی، بەخۆی و ماڵەکەی خزمەتی منیان کرد، ئایا ئێوە واز لە هاوەڵەکەی من ناهێنن؟ ئایا ئێوەواز لە هاوەڵەی ئێمە ناهێنن؟".**

**جا لە دوای ئەم رووداوە چیتر ئەبوبەکر ئازار نەدرا [1].**

---

[1] بوخاری (٣٦٦١) گێڕاوەتیەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- گەورەیی ئەبوبەکر دەردەخات بەسەر هەموو هاوەڵەکانی تر.
- پیاوی چاك نابێت ئەو کەسە توڕە بکات، کە لەو چاکترە.
- توڕەبوون وێڕای ئەوەی کارێکی باش نییە، بەڵام سروشتی مرۆڤ وایە و مرۆڤەکان لەسەری ڕاهاتوون بەڵام ئەوەی خاوەن باوەڕێکی بەهێز بێت، شوێنەواری توڕەییەکە بە زوویی لەسەرەخۆی لا دەبات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴾ الأعراف: ٢٠١
- جگە لە پێغەمبەری هەر کەسێکی تر، هەرچەند پلەی بەرز و گەورەبێت، بێ گوناه (معصوم) نییە.
- سوننەتە داوای لێخۆشبوون بکرێت لەو کەسەی ستەمی لێکراوە.
- چۆك دەرکەوتن بە عەورەت دانانرێت [1].

**ڕەبیعەی ئەسلەمی ﷺ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا زەویەکی پێدام ئەبوبەکریش زەویەکی پێدام:**

هەموو خەڵك هاتن و ئێمەش لەبارەی دارخورمایەك جیاوازیمان هەبوو.

من گوتم: ئەوە لە زەوی منە.

ئەبوبەکریش گوتی: بەڵکو لە زەوی منە.

دەمەقاڵێەك کەوتە نێوانمان، ئەبوبەکر وشەیەکی گوت، پاشان لێی پەشیمان بوویەوە.

پێی گوتم: ئەی ڕەبیعە هەمان قسەم پێ بڵێوە تا ببێتەوە تۆڵە.

گوتم: واناکەم.

ئەبوبەکر گوتی: یان وا دەکەی یان پێغەمبەری خوا ئاگادار دەکەمەوە.

جا زەویەکەی ڕەتکردەوە و ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش دوای کەوتم.

هەندێك خەڵکی (ئەسلەم) هاتنەلام و پێیان گوتم: خوا لە ئەبوبەکر خۆش بێت، لەسەر چی پێغەمبەر ﷺ لە تۆ ئاگادار دەکاتەوە، لە کاتێکدا ئەوەی گوتی، گوتی؟

گوتم: ئایا نازانن ئەوە کێیە؟ ئەو ئەبوبەکری ڕاستگۆیە، ئەو هاوەڵی پێغەمبەر بووە لە ئەشکەوت، ئەو دەمڕاستی موسڵمانانە، نەکەن ئەو ئاوڕ بداتەوە و هەست بکات ئێوە من بەسەر ئەودا سەردەخەن، جا توڕە دەبێت و دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش بەهۆی ئەوە لە

[1] فتح الباری (٧/٢٦).

من تووڕە دەبێت، خوای گەورەش لەبەر تووڕەیی هەردووکیان تووڕە دەبێت، جا ئەو کاتە ڕەبیعە لەناو دەچێت.

گوتیان: جا چی دەڵێی؟

گوتم: بگەڕێنەوە.

ئەبوبەکر چووە لای پێغەمبەر و منیش بە تەنیا دوای کەوتم.

قسەکەی وەکو خۆی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەریش ﷺ سەری بەرزکردەوە و فەرمووی: **"لە نێوان تۆ و ئەبوبەکر چی هەیە؟"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە و ئەوە هەیە، وشەیەکی گوت پاشان پەشیمان بووەیەوە، پێی گوتم: ئەو قسەیەی پێم گوتی پێم بڵێوە، بۆ ئەوەی ببێتە تۆڵە، منیش ڕازی نەبووم.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"بەڵێ، پێی مەڵێوە، بەڵکو بڵێ خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر"**.

منیش گوتم: خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر.

ئینجا ئەبوبەکر بە گریانەوە ڕۆیشت [1].

## جیا لە هاوەڵانی تر، بە هەندێك شت تایبەتی دەکردن:

ئەبو سەعدی خودری ﷺ دەڵێت: لەو نەخۆشییەی پێغەمبەر ﷺ پێی وەفاتی کرد، وتارێکی بۆ داین و فەرمووی: **"خوای گەورە بەندەیەکی سەرپشك کردووە لە نێوان دونیا و ئەوەی لەلای خوا هەیە، ئەویش لای خوای هەڵبژارد"**.

ئەبوبەکر ﷺ گریا [2].

گوتی: بە دایك و باوکمانەوە فیدات بین.

منیش بەخۆمم گوت: چی ئەو پیرەمێردە دەگریێنێ، چی تێدایە ئەگەر خوای گەورە بەندەیەکی سەرپشك کردبێت لە نێوان دونیا و ئەوەی لەلای بێت، جا لای خوا هەڵبژاردبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەندەکە بوو، ئەبوبەکر لە هەمووان زاناتر بوو.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەی ئەبوبەکر مەگری، تۆ دەست پاکترین و ئەمینترین کەسی لە هاوەڵەکان، ئەگەر لە ئوممەتەکەم خۆشەویستێکم هەڵبژاردبایە، ئەوا ئەبوبەکرم**

---

[1] ئەحمەد (١٦١٤٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة/٣٢٥٨) بە "سەحیح"ی گێڕایەوە.

[2] واتە زۆر گریا، وەکو بڵێی ئەبوبەکر لەو ئاماژەیە تێگەیشت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەخۆشی مردنەکەی ئاماژەی بۆ کرد، جا زانی کە مەبەستی خۆیەتی بۆیە گریا. فتح الباری (١٢/٧).

**هەڵدەبژارد، بەڵام برایەتی ئیسلام و خۆشەویستی هەیە، هیچ دەرگایەکی مزگەوت مەهێڵنەوە تەنیا دەرگای ئەبوبەکر نەبێت"[١].**

لەم فەرموودەیەدا تایبەتمەندییەکی روون و ئاشکرا بۆ ئەبوبەکر هەیە.

عومەری کوڕی شەببە لە (أخبار المدينه) باسی کردووە، کە ئەو خانووەی رێگەی پێدرا دەرگای لێ دانەخرێت بۆ مەزگەوت، لە تەنیش مزگەوت بووە، هەر بە دەستی ئەبوبەکر بووە، تا پێویستی پێ بوو بۆ ئەوانەی وەکو وەفد دەهاتنە لای، کە فرۆشتی دایکی باوەڕداران حەفصە بە چوار هەزار درهەم لێی کڕی، هەر بە دەستی ئەو بوو تا خیلافەی عوسمان، ویستیان مزگەوت فراوان بکەن، داوایان لە حەفصە کرد پێیان بدات، بۆ ئەوەی مزگەوتی پێ فراوان بکەن، بەڵام رازی نەبوو، گوتی: ئەی چۆن بڕۆم بۆ مزگەوت، پێیان گوت ماڵێکت دەدەینێ فراوانتر لە ماڵەکەی خۆت، رێگەیەکیش بۆ بۆ مزگەوت بۆ دەکەینەوە، ئینجا رازی بوو[٢].

**لە سوودەکانی فەرموودەکە:**

- تایبەتمەندیەکی ئاشکرا بۆ ئەبوبەکری تێدایە، کە شایەن بوو بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بیکاتە خۆشەویستی خۆی.
- سوپاسگوزاری کەس چاکەکار و ئاماژەکردن بۆ سوپاسکردنی.
- مزگەوتەکان دەپارێزرێن لەو کون و کەلەبەرانەی تێیدایە بۆ چوونە ژوورەوە خەڵك، تەنیا لە دەرگا رەسمییەکان نەبێت مەگەر کاری زۆر پێویست هەبێت[٣].

**ئەوەندەی بەرگەی ئەوانی دەگرت، بەرگەی کەسانی تری نەدەگرت:**

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول مرد، پێغەمبەری خوا بانگ کرا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، جا کاتێك پێغەمبەری خوا هەڵسایەوە بچێت بۆ سەری، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نوێژ لەسەر کوڕی ئوبەی دەکەی، کە کاتێك فلانە رۆژ ئاوا و ئاوای گوت!!

وتەکانیم بۆ ژمارد[٤].

---

[١] بوخاری (٣٩٠٤) و موسلیم (٢٣٨٢) گێراوەتیانەوە.

[٢] فتح الباری (١٤/٧).

[٣] فتح الباری (١٤/٧)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥٢/١٥).

[٤] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە (عومەری کوڕی خەتتاب جلەکانی گرت و گوتی: نوێژی لەسەر دەکەیت، لە کاتێك ئەو دووڕووە و خوای گەورە قەدەغەی کردووە داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەی).

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنی کرد و فەرمووی: **"لێم دوورکەوە ئەی عومەر"**.

کاتێك زۆرم گوت لەسەری، فەرمووی: **"سەرپشك کراوم، منیش ئەوەم هەڵبژارد، ئەگەر بزانم زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوون سوودی دەبوایە، ئەوا زیاترم دەکرد"**.

دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر کرد و پاشان ڕۆیشت.

هێندەی پێ نەچوو تا ئەو ئایەتەی سورەتی (براءة) هاتە خوارەوە ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ **التوبة: ٨٤**

واتەی ئایەتەکە: (هیچ کات لەسەر هیچ کەس لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەراستی ئەوانە باوەڕیان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو و مردیشن لەکاتێکدا لە دین دەرچوو بوون).

عومەر دەڵێت: دواتر سەیرم بەخۆم هات، کە چۆن لەم ڕۆژەدا ئاوها بوێریم کرد ئەو قسانە بکەم لەگەڵ پێغەمبەردا، کە خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن [1].

جا دەبینی کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر قسەکانی ئارامی گرت، وێڕای ئەوەی پۆشاکەکی گرت و قسەی زۆر کرد، بەڵام ئەو بەزەردەخەنەوە ئاوڕی لێ دایەوە [2].

**سوودێك:**

خەتتابی دەڵێت: ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کردی، لە تەواوی سۆز و بەزەیی بووە بۆ ئەو کەسەی تەنیا یەك لای دینداری گرتووە، هەروەها بۆ ئەوەش بوو دڵی عەبدوڵڵای کوڕی ڕازی بکات، کە پیاوێکی باش بوو، هەوەها بۆ ئەوەش بووە تا دڵی هۆزی خەزرەج ڕازی بکات، چونکە برا گەورەیان بوو.

جا ئەگەر بە دەم داوای کوڕەکەی نەچووبایە و نوێژی لەسەر نەکردبایە، پێش ئەوەی ئەم کارە قەدەغە بکرێت، ئەو کات دەبووە مایەی شەرمەزاری بۆ کوڕەکەی، بۆیە باشترین کاری هەڵبژارد تا بە تەوای قەدەغەکرا، ئەویش چیتر نەیکرد [3].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

● ئەو فەرموودەیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە، کە ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەر ﷺ چەندە بەرزو جوان بووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەیزانی ئەو دووڕووە و چەند بە ئازارە، بەڵام ئەو

---

[1] بوخاری (١٣٦٦) و موسلیم (٢٤٠٠) گێراوەتیانەوە.
[2] فتح الباری (٨/٣٣٥).
[3] فتح الباری (٨/٣٣٦).

بە چاکەکردن رووبەرووی بووە، کراسەکەی خۆی بۆ کردە کفن و نوێژی لەسەر کرد و داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد، خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤

- حەرام بوونی نوێژکردن لەسەر ئەو کەسەی بە کافری مردووە و هەروەها دوعا بۆکردن و داوای لێخۆشبوون و هەڵسانەوە لەسەر گۆڕەکەی بە مەبەستی دوعاکردن بۆی.[1]

## لە کاروبارە تایبەتییەکانی پشتی بە هەندێکیان دەبەست:

لە کاروباری بەخشینەکان پشتی بە بیلای کوڕی رەباح دەبەست، کە یەکێك بووە لە پێشینە یەکەمەکانی ئیسلام.

عەبدوڵلای کوڕی هوزنی دەڵێت: بیلالی بانگبێژی پێغەمبەرم بینی لە حەلەب.

پێم گوت: ئەی بیلا پێم بڵێ بەخشینەکانی پێغەمبەر ﷺ چۆن بوو؟

گوتی: تەنیا من بە کاروباری بەخشییەکان هەڵدەستام تا وەفاتی کرد. ئەگەر یەکێك بهاتبایە موسڵمان بێت و بینبای بێ جل و بەرگە، فەرمانی بە من دەکرد بۆ ئەوەی قەرز وەربگرم، جا کراسێکم بۆ دەکڕی و دام دەپۆشی و تێرم دەکرد.

تا پیاوێك لە موشریکەکان هاتە پێشم و گوتی: ئەی بیلال من دەوڵەمەندم قەرز لە کەس وەرمەگرە لە من نەبێ.

منیش وام کرد.

رۆژێك دەست نوێژم هەڵگرت، پاشان هەڵسام بۆ ئەوەی بۆ نوێژ بانگ بدەم، موشریکەکە لەگەڵ کۆمەڵێك لە بازرگانەکان هاتە بەردەمم کاتێك منی بینی گوتی: ئەی حەبەشی.

گوتم: بەڵێ

بە روویەکی گرژ پێشوازی لێکردم و قسەیەکی زۆر رەقی پێ گوتم.

وتی: ئایا دەزانی سەری مانگ چەندی ماوە؟

گوتم: زۆری نەماوە.

گوتی: من لە جیاتی ئەو قەرزەی کە سەری مانگ مەوعیدمانە ئەوا دەتکەم بە بەندە، من ئەوەی پێم دای لەبەر خاتری تۆ نەبووە و لەبەر خاتری خاوەنەکەشت نەبووە، بەڵکو بۆ ئەوە بوو بتکەمە بەندە، بۆ ئەوەی وەکو پێشتر ببیە شوانی مەڕ.

منیش زۆر خەمم خوارد.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسیلم (١٥/١٦٧).

تا کە نوێژی عیشام کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە ناو خێزانەکەی، مۆڵەتم لێخواست بچمە لای، ئەویش مۆڵەتی پێدام.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو موشریکەی قەرزم لێ وەردەگرت، ئاوا و ئاوای پێ گوتم، نە تۆ شتێکت لەلایە بیدەتێ، نە منیش، ئەویش شەرمەزارم دەکا، مۆڵەتم بدە بچمە لای ئەو گەڕەکەی، کە تازە موسڵمان بوونە، تا خوای گەورە رزقێك بۆ پێغەمبەرەکەی دەنێری بۆ ئەوەی ئەو قەرزە بدەمەوە.

دەرچووم تا چوومە ماڵەوە شمشێر و دەفر و نەعل و قەڵغانەکەم لەلای سەری خۆم دانا.

بە دڵێکی بە خەمەوە، هەرکاتێك بڕێك نوستبام بە ئاگا دەهاتمەوە، سەرم دەردەهێنا گەر شەو بووایە دەنوستمەوە، تا بەرەبەیانی یەکەم هات، ویستم دەربچم، لە پڕ یەکێك هات و گوتی: ئەی بیلا وەڵامی پێغەمبەری خوا بدەرەوە، منیش خێرا بۆلای چووم.

بینیم چوار وشتر بە بارەوە وەستاوا.

مۆڵەتم لێ خواست.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: "**مۆژدەت لێ بێت، خوای گەورە بۆ داناوەی قەرزەکانت شتێکی بۆ ناردی**".

منیش سوپاسی خوای گەوەرم کرد.

پاشان فەرمووی: "**ئایا ئەو چوار وشترە بە بارەوە نابینیت؟**".

گوتم: بەڵێ

فەرمووی: "**سەرەکانی و ئەوەی لەسەر پشتیانە بۆ خۆت، ئەوانە جل و بەرگ و خواردەمەنیان هەڵگرتووە، پادشای (فدك) بەدیاری بۆ منی ناردووە، جاوەریان بگرە و قەزرەکەتی پێ بدەوە**".

منیش وام کرد، بارەکانم لەسەر پشتیان هێنایە خوارەوە، پاشان وشترەکانم بەستنەوە، دواتر چووم بۆ ئەوەی بۆ نوێژی بەیانی بانگ بدەم، بۆ لای بەقیع رۆیشتم، پەنجەم لەناو گوێم ناو هاوارم کرد و گوتم: هەرکەسێك قەرزی لەسەر پێغەمبەری خوایە با بێت.

جا بەردەوام بووم لە فرۆشتن و قەرز دانەوە، تا لەسەر رووی ئەم زەوییە کەس نەما قەرزی لەلای پێغەمبەری خوا بێت

هەتا دوو ئۆقیە یان ئۆقیە و نیوێکی لێ مایەوە.

پاشان رۆشتم بۆ مزگەوت، کە زۆربەی کاتی رۆژ رۆیشتبوو، پێغەمبەر ﷺ لەمزگەوت بوو بە تەنیا دانیشتبوو، سەلامم لێکرد.

فەرمووی: **"ئەو ماڵەی لەلات بوو چی لێهات، ئایا قەرزەکانت پێ دلوە؟"**.

گوتم: خوای گەورە ئەو قەرزەی لەسەر پێغەمبەرەکەی هەبوو دایەوە و هیچی لەسەر نەما.

فەرمووی: **"ئایا هیچ شتێکی لێ مایەوە؟"**.

گوتم: بەڵێ.

فەرمووی: **"بڕوانە، دەبێ ئەوە لە کۆڵە من بکەیتەوە، چونکە من ناچمەوە هیچ ماڵێکم، تا ئەو ماڵ و سامانە نەبەخشیت"**.

جا تا ئێوارە کەس نەهاتە لامان کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای کرد، بانگی کردم.

فەرمووی: **"چیت لە ماڵەکە کرد؟"**

منیش گوتم: هەر لەلامە و کەس بۆی نەهاتووە.

ئەم شەوە پێغەمبەری خوا لەمزگەوت مایەوە تاکو بەیانی، ڕۆژی دووەمیش هەر لەمزگەوت مایەوە.

لە کۆتا ڕۆژدا دوو میوان هاتن، منیش میوانداریم کردن و جل و بەرگ و خۆراکم پێ دان.

کە نوێژی عیشای کرد.

فەرمووی: **"چیت لە ماڵەکە کرد؟"**.

گوتم: خوای گەورە لە کۆڵی کردیەوە.

جا فەرمووی: **"الله أكبر"**، سوپاسی خوای گەورەی کرد، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەك بمرێت و ئەم ماڵەی لەلا بێت.

پاشان دوای کەوتم تا چووە لای خێزانەکانی، یەك لەدوای یەك سەلامی لێکردن، تا چووە ماڵەکەی خۆی.

ئا ئەمە بوو کەپرسیارت لێ کردم [1].

## پێغەمبەر ﷺ لە هاوەڵەکانی دەپرسێ گەر دیار نەبوونایە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ ﴾ الحجرات:٢

---

[1] ئەبوداود (٣٠٥٥) گێڕایەوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبي داود/ ٣٠٥٥) بە "سەحیح"ی داناوە.

ثابتی کوڕی قەیس لە ماڵەوە دانیشت و گوتی: من لە ئەهلی دۆزەخم.. نەیوست چیدیکە پێغەمبەر ﷺ ببینێت.

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە سەعدی کوڕی موعاز کرد و فەرمووی: **"بۆچی ثابت دیار نییە؟ ئایا نەخۆشە؟"**.

سەعد گوتی: دیار دەبیَ، نەمزانیووە نەخۆش بێت.

دەڵێت: سەعد هاتە لای ثابت و قسەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ گێڕایەوە.

ثابت گوتی: ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە، دەشزانن من لە هەمووتان دەنگم گەورەترە لەسەر پێغەمبەر ﷺ، کەواتە من لە ئەهلی ئاگرم.

سەعد ئەو قسەیەی ثابتی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵکو ئەو لە ئەهلی بەهەشتە**[1]**"**.

قورەی کوڕی ئیاس ﷺ دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر خوا ﷺ کوڕێکیشی لەگەڵ بوو، فەرمووی: **"خۆشت دەوێت"**، گوتی: خوا چەندی خۆش دەوێی منیش ئەوەندە ئەوم خۆش دەویَ.

جا منداڵەکە وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بە باوکی منداڵەکەی فەرموو: **"ئایا حەزناکەی بچیتە لای هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت ئەو کوڕەت لەویَ بێت و هەوڵ بدات دەرگاکانت بۆ بکاتەوە**[2]**"**.

## لە کاتە تەنگانە و ناخۆشییەکان زیاتر حاڵی هاوەڵەکانی دەپرسی:

زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئوحد منی نارد بۆلای سەعدی کوڕی ڕەبیع بۆ ئەوەی لێی بپرسم، پێی فەرمووم: **"ئەگەر بینیت سەلامی منی پیَ بگەینە، پێی بڵیَ، پێغەمبەری خوا لێت دەپرسێت، دەیەوێت بزانیَ چۆنیت؟"**.

منیش بە سەعدم گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامت لیَ دەکات و لێت دەپرسێت کە ئایا چۆنیت؟

گوتی: سەلام لە پێغەمبەری خوا و لە تۆش بێت.

---

[1] بوخاری (٣٦١٣) و موسلیم (١١٩) گێڕاوەتیانەوە.

[2] ئەحمەد (١٩٨٥) و النسائی (١٨٧٠) گێڕاوەتیانەوە، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە تایبەتە بۆ ئەو یان بۆ هەموومان، فەرمووی: **"بەڵکو بۆ هەمووتانە"**. ئەلبانی لە (أحكام الجنائز/١١١) بە "سەحیح"ی داناوە.

پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بۆنی بەهەشت دەکات.

بە ئەنسارییەکانی گەلەکەشم بڵێ، لەلای خوای پەروەردگار هیچ عوزرێکیان نییە، گەر کافرەکان بگەنە پێغەمبەری خوا ئەوانیش برژانگێك بە پێڵوی چاوەکانیان مابێت، ئینجا گیانی سپارد، ﷺ[1].

ئەمەش سەرقاڵبوون و گرنگیدانی پێغەمبەرە ﷺ بۆ هاوەڵەکانی و هەواڵپرسیانیانە بۆ ئەوەی بزانێت چیان بەسەر هاتووە و بۆچی دیارنین[2].

کە سەعد گوتی: "بۆنی بەهەشت دەکەم"، لەوانەیە مەبەستی راستەقینە نەبێت، رەنگ بێ بۆنێکی خۆشی کردبێ لە بۆنی ئاسایی دوور بێت، وای زانیووە کە بەهەشتە، یان لەوانەشە مەبەستی ئەوەبێ کە زۆر دڵنیایە، ئەوەی بۆی شاردراوەتەوە ئێستا بۆتە شتێکی هەستپێکراو لەلای[3].

## پێغەمبەر ﷺ دایك و باوكی دەكردنە فیدای هەندێكیان:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت: لە رۆژی ئوحد پێغەمبەر ﷺ تیرەکانی لەناو هەگبەکەی بۆ من دەرهێنا و فەرمووی: **"دایك و باوكم بە فیدات بێت، تیر بارانیان بكە[4]"**.

ئەم وشەیە لەلای عەرەبەکان بۆ دەستخۆشی بەکاردێت، واتە ئەگەر بکرابایە دایك و باوکم بکمە فیدات ئەوا وام دەکرد، چونکە ئەوان زۆر خۆشەویستن لەلام.

لە گێڕانەوەیەکی موسلیمیشدا هەر لە سەعدەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دایك و باوکی بۆ کۆکردنەوە، بە یەکجار پێی فەرمووە.

دەڵێت: پیاوێك لە بێ باوەڕەکان وەکو ئاگر بەربووە ناو موسڵمانان، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"تیربارانیان بكە، باوكم و دایكم فیدات بن"**.

جا تیرێکم بۆی دەرهێنا سەری پێوە نەمابوو، هاویشتم لە تەنگەم دا، کەوتە خوارەوە و عەورەتی دەرکەوت.

پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تا تەماشای ددانەکانیم کرد.

---

[1] بیهقی لە (دالائل النبوة ٣ /١٦٩) گێڕاویەتەوە، مالك لە (الموطأ ٨٨٤) لە یەحیای کوڕی سەعیدی گێڕاوەتەوە، ابن عبدالبر دەڵێت: "ئەم فەرمودەیەم لەبەر نییە، نەمدیووە تەنیا لەلایەن زانایانی بواری ژیاننامەی پێغەمبەر نەبێت، لەلای ئەوان فەرموودەیەکی (مشهور)ـە".

[2] المنتقى شرح الموطأ (٣/٦٨).

[3] سبل الهدى والرشاد فی سیرة خیر العباد (٤/٢٤٧).

[4] بوخاری (٤٠٥٥) و موسلیم (٢٤١٢) گێڕاوەتیانەوە

کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی وەك دڵخۆشییەك بە مردنی بێ باوەڕەکە نەك لەبەر ئەوەی عەوەڕەتی دەرکەوت [١].

عەبدوڵلای کوڕی زوبێر ﷺ دەڵێت: لە ڕۆژی خەندەق من و عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە لەو قەڵایە بووین کە ئافرەتانی تێدابوو، جارێك ئەو پشتی بۆ من نزم دەکردەوە بۆ ئەوەی تەماشایان بکەم، جارێکیش من، بۆ ئەوە تەماشایان بکات.

سەیرم کرد بینیم وا زوبێر لەسەر پشتی ئەسپەکە دەچێتە **لای یەهودییەکانی (بەنی قورەیزە)** دووجار یان سێ جار.

کاتێك گەڕامەوە پێم گوتم: باوکە بینیم تۆ دەچیتە لای ئەوان.

گوتی: ئایا منت بینی؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"کێ هەیە هەواڵی (بەنی قورەزیرەم) بۆ بێنێت؟"**.

منیش خێرا دەرچووم، کاتێك گەڕامەوە پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم: **"باوك و دایکم فیدات بن"** [٢].

نەوەوی گوتوویەتی: حەقیقەتی فیدا لەمەدا نییە، بەڵکو ئەمە وشەیەکی دەستخۆشییە، ڕاگەیاندی خۆشەویستی و گەورەیی پلەوپایەتی بۆی.

لەم فەرموودەیەدا تایبەتمەندی و گەورەییەك هەیە بۆ کوڕی زوبێر، چونکە لەو تەمەنە بچوکە توانی کارەکە زۆر بە وردی و سەرکەوتوانە ئەنجام بدا، کوڕی زوبەیر لە ڕۆژی کۆچکردندا لە مەدینە لە دایك بووە، جەنگی خەندەقیش لە سەر ڕای زۆربەی زانایان، لە ساڵی چوارەمی کۆچی ڕوویداوە، جا لەو کاتەی کارەکەی وەها بە تۆکمەیی و جوانی ئەنجام داوە تەمەنی لە خوار چوار ساڵاندا بووە [٣].

## پێغەمبەر ﷺ بە مردنیان خەمبار دەبوو و لەسەریان دەگریا:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: لە شەڕی موئتە پێغەمبەر ﷺ زەیدی کوڕی حاریسەی کردە سەرکردەی سوپا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"گەر زەید کوژرا، با جەعفەر بێتە سەرکردە، گەر جەعفەریش کوژرا، با عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە بێتی"**.

---

(١) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٥/١٥).

(٢) بوخاری (٣٧٢٠) و موسلیم (٢٤١٦) گێڕاوەتیانەوە

(٣) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٤/١٥).

عەبدوڵلا دەڵێت: من لەو شەڕە لەگەڵیاندا بووم، بە دوای جعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب گەڕاین، بینیمان لەنا کوژراوەکانە و نەوەدە و ئەوەندە نوکە تیر و ڕمی بەرکەوتووە [1].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە کاتی روودانی ئەم شەڕە وتارێکی خوێندەوە و فەرمووی: **"زەید ئاڵاکەی گرتە دەست، پاشان بریندار کرا، دوای ئەو جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب وەری گرت ئەویش کوژرا، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە وەری گرت تا ئەویش کوژرا...** چاوەکانی فرمێسکیان دەباراند .. **لە دوایدا خالیدی کوڕی وەلید وەری گرت بێ ئەوەی سەرکردە بێت، بەڵام سەرکەوتنەکە لەسەر دەستی ئەو بەدیهات [2]"**.

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام بینی سەری عەبدوڵڵای کوڕی مەعزونی ماچ دەکرد بە مردوویی، تا بینیم فرمێشك بەسەر کولمەکانیدا دێنەخوارەوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: چاوەکانی فرمێسکیان دەباراند [3].

موتەڵیبی کوڕی عەبدوڵلا دەڵێت: کاتێك عوسمانی کوڕی مەزعون مرد، تەرمەکەیان لە ماڵەوە هێنایە دەرەوە و بردیانە گۆڕستان و بەخاکیان سپارد، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە کەسێك کرد بەردێکی بۆ بێنێت، بەڵام نەیتوانی هەڵیبگرێت.

پێغەمبەر ﷺ بە خۆی بۆی هەڵسا و قۆڵ و باسکی بۆ هەڵکرد.

موتەڵیب دەڵێت: ئەوەی ئەمەی بۆ گێڕامەوە لە بارەی پێغەمبەری خوا دەیگوت: وەکو بڵێی سەیری سپایەتی قۆڵی پێغەمبەری خوام دەکرد، کاتێك قۆڵی هەڵکرد، پاشان بەردەکەی هەڵگرت و هێنای لەلای سەری داینا و فەرمووی: **"ئەمە بۆ ئەوەیە گۆڕی براکەمی پێ بناسمەوە، ئەو کەسەی وەفاتیش دەکات لە خزم و کەس و کاری خۆم لەلای ئەو بیشارمەوە [4]"**.

عوسمانی کوڕی مەزعون برای شیری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، هەردوو کۆچی ئەنجامداوە، بەشداری شەری بەدری کردووە، لە سەردەمی نەفامیدا ئارەق خواردنەوەی لەسەر خۆی حەرام کرد، ئەو یەکەمین کەسی موهاجیرەکانە لە مەدینە بمرێت لە مانگی

---

[1] بوخاری (٤٢٦١) گێراوەتیەوە.

[2] بوخاری (١٢٤٦) گێراوەتیەوە.

[3] ئەبو داود (٣١٦٣) و ترمزی (٩٨٩) و ابن ماجة (١٤٥٦) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (مختصر الشمائل ٢٨٠) بە "سەحیح"ی داناوە

[4] ئەبو داود (٣٢٠٦) گێراوەتیەوەە، ئەلبانی لە (أحکام الجنائز/ لا ١٥٥) بە "حەسەن"ی داناوە.

شەعبان، کە ٣٠ مانگ بەسەر هیجرەتدا تێپەڕی بوو. کەسێکی زۆر خواناس و دونیا نەویست و خۆپارێز بووە، یەکێکە لە هاوەڵە هەر گەورە وچاکەکان [(١)].

ئیبن قودامە دەڵێت: دورستە قەبر نیشان بکرێت بە بەردێك یان دارێك، ئیمامی ئەحمەد گوتوویەتی: بۆ ناسینەوە دروستە قەبر نیشانەیەکی لەلا دابندرێت، پێغەمبەر ﷺ قەبری عوسمانی کوڕی مەزعونی نیشان کرد [(٢)].

سوننەتەیشە خزمەکان لە جێگایەك کۆ بکرێنەوە، بەڵگەش فەرموودەکەیەتی کە فەرمووی: **"ئەوانەی دەمرن لە خزم و کەس و کاری خۆم لەلای ئەو بیشارمەوە"**. عوسمان برای بوو لە شیردا، دووەمین کەس لەو شوێنەدا بە خاکی سپارد ئیبراهیمی کوڕی بوو [(٣)].

**پێغەمبەر ﷺ راوێژی بە هاوەڵەکانی دەکرد، ئەمەش وەك کارکردن بە ئایەتی ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ﴾**

ئیبن بەتاڵ دەڵێت: راوێژکردن سوننەتێکە کەس نییە پێویستی پێی نەبێت، ئەگەر یەکێك هەبووایە پێویستی پێی نەبوایە ئەوا پێغەمبەری دەبوو، چونکە جوبریل رای ڕاستی لە ئاسمانەوە بۆ دەهێنا.

بەڵام بڕیاردانی کۆتایی و ئەنجامدانی دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوا، کەس تیایدا بەشداری ناکات، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ﴾ آل عمران: **١٥٩** عەزیمەتی بڕیاردانی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەو، داواشی لێکردووە بەشداربێت لە وەرگرتنی را لەگەڵ ئەوانی تردا [(٤)].

حەسەنی بەسری دەڵێت: ئەگەر کۆمەڵێك شتێکیان بەسەر هات، پاشان هەڵسان بە کۆبوونەوە و راوێژیان بەیەکتر کرد و رایان گۆڕیەوە، ئەوا خوای گەورە بۆ چاکترین رێگا و چارەسەر رێنماییان دەکات [(٥)].

شاعیر دەڵێت:

الرأي قبلَ شَجاعةِ الشُجعان ... هو أولٌ وهي المحلُّ الثاني

فإذا هما اجتمعا لنفس حرة ... بلغَت منَ العُلياْ كلَّ مكان

---

(١) سەیری ژیاننامەی بکە لە (الإصابة ٤/٤٦١).

(٢) المغنی (٢/١٩١).

(٣) مرقاة المفاتيح (٥/٤٥٧).

(٤) شرح ابن بطال على صحيح البخاري (٥/٣٣٤).

(٥) روضعة العقلاء (١/١٩٢) لابن حبان

## گوێی بۆ رایەکانیان دەگرت و وەڵامی پێشنیارەکانی دەدانەوە:

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، ئەبوبەکر و عومەر و چەند کەسێکی تر بووین.

پێغەمبەر ﷺ لەناومان هەڵسا و رۆیشت، زۆری پێچوو نەهاتەوە ناومان، ترساین لەوەی شتێکی بەسەر هاتبێت، شڵەژاین.

ئێمەش هەڵساین، من یەکەمین کەس بووم دەرچووم بۆ ئەوەی لە پێغەمبەری خوا بگەرێم، تا چوومە لای باخچەی ئەنسارییەك کە لە بەنی نەجار بوو.

لە چوار دەوری سوڕامەوە بۆ ئەوەی بزانم هیچ دەرگایەکی هەیە، بۆ چوونە ژوورەوە، هیچ دەرگایەکم نەدیتەوە.

بینیم جۆگەیەك لە بن دیوارەکە لەلای بیری (خاریجە)وە دەچێتەوە ناو بێستانەکە، جا خۆم وەك رێوی بچوك کردەوە، چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"تۆ ئەبو هورەیرەی؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"چ کارێکت هەیە؟"**.

گوتم: تۆ لەگەڵمان بوویت، رۆیشتیت و نەگەڕایتەوە لامان، ترساین لەوەی شتێکت بەسەر هاتبێت، من یەکەمین کەس بووم، کە دڵتەنگ بووم، بۆیە هاتمە لای ئەو باخچەیە، خۆم وەك رێوی بچوك کردەوە، ئەو خەڵکانەش لەدوامەوەن.

فەرمووی: **"ئەبو هورەیرە، ها ئەو نەعلانە بگرە، هەر کەسێکت دیت لە پشت ئەو باخچەوە گەواهی دا کە الله بێ هاوەڵە و دڵی لەسەر ئەمە دڵنیا و جێگیر بوو، ئەوا مژدەی بەهەشتی پێ بدە[1]"**.

یەکەمین کەس چاوم پێ کەوت، عومەر بوو، گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە ئەو نەعلانە چین؟

گوتم: ئەمانە نەعلەکانی پێغەمبەری خوان بە مندا رەوانەی کردووە، بۆ ئەوەی مژدەی چوونە بەهەشت بدەمە هەر کەسێك، کە لەنا دڵییەوە و بە دڵنیاییەوە گەواهی بدات الله بێ هاوەڵە.

---

[1] کە نەعلەکانی پێدا بۆ ئەوە بوو ببێتە نیشانەیەکی ئاشکرا، تا بزانن لەلای پێغەمبەرەوە هاتووە، هەروەها تا گەر لەبارەی پێغەمبەرەوە هەواڵیان پێ رابگەیێنێ لەناو دڵ و دەروونیان بچەسپێت. گومانی تێدا نییە کاری لەم جۆرە دڵنیا بەخشە، گەر چی هەواڵی پێغەمبەر، بێ ئەنجامدانی ئەم کارەش هەر قبوڵکراوە.

عومەر پاڵێکی بە سنگمەوە نا و بەربوومەوە و کەوتە سەر سمتەکانم، گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە برۆ بگەڕێوە.

بە گریانەوە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕامەوە.

عومەریش بە دوامەوە هات.

پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرمووم **"چیتە ئەبو هورەیرە؟"**.

گوتم: چاوم بە عومەر کەوت، ئەوەی پێت راگەیاندم هەواڵم پێدا، جا لە منی دا و بەربوومەوە تا کەوتمە سەر سمتەکانم، پێی گوتم بگەڕێوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەی عومەر چی والێکردی وا بکەی؟"**.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بە باوك و دایکەوە فیدات بم، ئایا تۆ ئەبو هورەیرەت ناردووە بۆ ئەوەی مژدەی بەهەشت بداتە ئەو کەسانەی گەواهی دەدەن الله تاك و تەنیا و بێ هاوەڵە؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: وا مەکە، من دەترسم خەڵکی پشت بەمە ببەستن، لێیان گەڕێ با کاروکردەوە بکەن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"دەلێیان گەڕێ"**[1].

دانی بە قسەی عومەر نا و پێشنیارەکەی قبوڵ کرد.

"ئەو کارەی عومەر لە گەڕانەوەی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ وەنەبی رەخنەگرتن بێت لە پێغەمبەر و رەتکردنەوەی فەرمانەکانی بێت، ئەو کاتێك ئەبو هورەیرەی بەم موژدەیە رەوانەکرد تەنیا بۆ دڵخۆشکردنی ئوممەتەکەی بووە، عومەریش پێی وابوو شاردنەوەی ئەم موژدەیە باشترە بۆیان، ئەمەش بۆ ئەوەی تەنیا پشت بەمە نەبەستن و کارکردن خێرترە لەو مژدە خێرایە. جا کاتێك ئەم پێشنیارەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لێی وەرگرت و دانی پێدانا"[2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دانیشتنی زانا لەگەڵ قوتابیەکانی بۆ ئەوەی فێریان بکات و وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە.
- ئەگەر بیەوێت باسی کۆمەڵێك بکات، کە ژمارەیان زۆر بێت، ئەوا باسی هەندێکیان دەکات، باس رێزارد و ناودارەکانیان دەکات، پاشان دەڵێت: بۆ ئەوانەی تریش.
- هاوەڵەکان زۆر ئاگایان لە پێغەمبەر ﷺ بووە و بە مافەکانی هەڵساون و نیگەران و دڵتەنگ دەبوون ئەگەر شتێکی بەسەردا بهاتبایە.

---

[1] موسلیم (٣١) گێڕاوەتیەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١/٢٣٨).

- گرنیگیدانی شوێنکەوتووان بە مافی پێشەوایەکەیان، هەوڵدانیان بۆ دابینکردنی بەرژەوەندەییەکانی و دوورخستنەوەی مەترسی لێی.
- دروستە بچیتە ناو موڵکی کەسێك بێ مۆڵەت، گەر بزانی پێی ناخۆش نییە، ئەمەش بە پێی ئەو خۆشەویستییەی لە نێوانیاندا هەیە، چونکە ئەبو هورەیرە چووە ناو بێستانەکە، پێغەمبەر ﷺ رەخنەی لێ نەگرت و دانی پێدانا. ئەمەش هەر تایبەت نییە بە چوونە ناو زەویەکەی، بەڵکو بۆی دروستە سوود لە کەلوپەلەکانی ببینێت و خواردنەکەی بخوات و بۆ ماڵەوەشی بباتەوە و سواری ئەسپەکەی ببێت، جگە لەم هەڵسوکەوتووانە، کە زانراوە نابێتە گرانی و نیگەرانی لەسەر خاوەنەکەی.
- ئەو ئیمانەی خاوەنەکەی رزگار دەکات لە مانەوەی هەتاهەتایی لەناو ئاگر، ئەوا دەبێت لەناو دڵ جێگیر بێت و بە زمانیش بگوترێ.
- دروستە هەندێك زانیاری بشاردرێتەوە، کە هیچ پێویستییەك بۆ گوتنیان نییە، ئەمەش وەك بەرژەوەندییەك یان ترسان لە روودانی مەترسییەك.
- ئامازەکردنی شوێنکەوتوو بۆ پێشەواکەی بە شتێك پێی باش و بەرژەوەندی بێت، پێشەواش رازی بێت لەسەر ئەو ئامازەیە ئەگەر پێی باش بوو هەروەها پاشگەزبوونەوە لەو فەرمانەی دەری کرد بەهۆیەوە.
- دروستە پیاو بە یەکێك بڵێ، بە دایك و باوکم فیدات بم[1].

## لە رۆژی بەدر پێغەمبەر ﷺ پێشنیاری هاوەڵێکی جێبەجێ کرد:

پێغەمبەر ﷺ گەیشتە بەدر و لەوێ دابەزی.

حەبابی کوڕی مونزیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو شوێنەی لێی دابەزی خوا بۆ تۆی هەڵبژاردووە، کە ناتوانین نە پێش بکەوین یان بچینە دواوە، یان بابەتەکە را و بۆچوون و فرِوفێڵی جەنگە؟

فەرمووی: "**بەڵکو را و بۆچوون و فرِوفێڵی جەنگە**".

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم شوێنە شوێنێکی باش نییە، بە خەڵکی بڵێ با هەڵسن تا دەگەینە ئەو ئاوەی نزیك دوژمنە، جا لەوێ دادەبەزین، پاشان جۆگە ئاوەکان تێك دەدەین و حەوزێکی لەسەر دروست دەکەین و پڕ ئاوی دەکەین، ئینجا شەڕیان لەگەڵ دەکەین، بەو حاڵە ئێمە ئاو دەخۆینەوە ئەوان نایخۆنەوە.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١/٢٣٨).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"تۆ رای خۆت دەربڕی"**.

پێغەمبەر ﷺ و خەڵکەکە هەڵسان، چوون تا گەیشتنە ئاوەکەی نزیك دوژمن، لەوێ دابەزین و فەرمانی کرد جۆگەکان تێك بدەن و حەوزێکی لەسەر بیرەکە دروست کرد و پڕ ئاویان کرد، پاشان چەند دەفرێکی ئاو خواردنەوەیان هەڵدا ناوی[1].

**پێغەمبەر ﷺ لە شەڕی ئوحد، لە رای خۆی هاتەخوارەوە و چووە سەر رای هاوەڵەکانی:**

عەبدوڵلای کوڕی عەباس ﷺ دەڵێت: لە رۆژی بەدر پێغەمبەر ﷺ **شمشێری (ذول الفقار)** وەك دەستکەوتی شەڕ وەرگرت، لە رۆژی ئوحدیش هەر بەو شمشێرە خەونی لەبارەی روودانی جەنگی ئوحد بینی.

کاتێك موشریکەکان لە رۆژی ئوحد هاتنە سەر پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ رای وابوو هەر لە مەدینە بمێنێتەوە و شەڕیان لەگەڵ بکات، خەڵکانێك کە بەشداری شەڕی بەدریان نەکرد بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا با بۆیان دەرچین و لە ئوحد لەگەڵیان بجەنگین، هیوامان وایە بگەینە ئەو پاداشتەی ئەهلی بەدر بەدەستیان هێناوە.

هەر بە پێغەمبەری خواوە ﷺ بوون، تا زرێ و بەرگی جەنگی لەبەر کرد، کاتێك بەرگی جەنگی لەبەر کرد، پەشیمان بوونەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا لە مەدینە بمێنەوە، با ڕا هەر ڕای خۆت بێت، فەرمووی: **"بۆ هیچ پێغەمبەرێك نییە جلوبەرگی جەنگ لەبەر بکات و دوایی لەبەری بکاتەوە، تا خوای گەورە حوکم لە نێوان خۆی و دوژمنەکەی دەکات.."**[2].

لە رووداوی (بوختان-إفك) پێغەمبەر ﷺ راوێژی بە هاوەڵەکان کرد، خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: کاتێك ئەوەی باسکرا لەبارەی منەوە، ئەوەی منیش زانیم، پێغەمبەر ﷺ لەبارەی منەوە هەڵسا و وتارێکیدا، دوو شایەدومانەکەی گوت و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی کرد بەوەی شایەنی بێت، پاشان فەرمووی: **"ئەی خەڵکینە رای خۆتانم پێ بڵێن سەبارەت بەو کەسەی خێزانەکەمی تاوانبار کردووە، سوێند بە الله هیچ خراپەیەکم لە خێزانەکەم نەدیووە، کەسێکیشان تاوانبار کردووە، سوێند بە الله هیچ کات خراپەیەکم لێ نەدیووە، ئەگەر هاتبێتە ماڵم ئەوا من لەوێبومە، ئەگەریش لە سەفەرێکدا دیار نەبام ئەویش دیار نەدەبوو.."**[3].

---

[1] السیرة النبویة (٣/١٦٧) لأبن هشام، سەنەدەکەی "زەعیفە".

[2] الحاکم (٢٥٨٨) گێراوەتیەوە، الذهبي بە سەحیحی داناوە، بوخاری بەشێکی داناوە بە ناونیشانی فەرمایشتی پەروەردگار (شاورهم فی الأمر).

[3] ترمذي (٣١٨٠) گێراوەتیەوە، دەقی ئەسڵی فەرموودەکە لە بوخاری (٤١٤١) و موسلیم (٢٧٧٠) هەیە.

**پێغەمبەر ﷺ گرنگی بە کاروباری هاوەڵەکانی دەدا، سکی بە حاڵی هەندێکیان دەسوتا و بەهۆیانەوە غەمبار دەبوو:**

بەڕاستی هاوەڵە بەڕێزەکانی بەرگەی زۆر لە ناخۆشی و مەینەتییەکانی ژیانیان گرتووە، بە تایبەتیش ئەوانەی لە پێش ئیسلامدا لە ژیانی خۆشدا دەژیان، ئەوە موسعەبی کوڕی عومەیرە ﷺ وازی لە دونیا هێنا و دایك و خزم و کەسی جێهێشت و بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد.

موحەمەدی کوڕی کەعبی قەرەزی دەڵێت: بۆیان گێڕامەوە کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب دەڵێت: لە رۆژێکی زۆر سارد و دژوار بەبرسیەتی لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتمەدەر، پارچە پێستێکی دڕاوم هەڵگرتەوە و ناوەڕاستەکەیم کردە ملی خۆم و ناوەندەکەشم لە ناوقەدم توند کرد، بە داوی دارخورما بەستەمەوە تا خۆمی پێ گەرم بکەمەوە.

من زۆر برسی بووم، ئەگەر لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ خواردن هەبوایە دەمخوارد.

جا دەرچووم بۆ ئەوەی شتێك بەدەست بێنم.

بەلای باخچەی جولەکەیەکدا رۆیشتم کە خەریکی ئاو هەڵێنجان بوو بە دۆلکەیەك، کە لەسەر چەرخێك دەیخولاندەوە و هەڵی دەدایە ناو ئاوەکە.

لە کەلێنی باخچەکە تەماشام کرد.

گوتی: ئەی ئەعرابی چیتە؟ رازیت لە جیاتی هەڵێنجانی هەر دۆلکە ئاوێك دەنکە خوارمایەکت بدەمێ؟

گوتم: بەڵێ، دەرگاکە بکەرەوە تا بێمە ژوورەوە.

دەرگاکەی کردەوە، منیش چوومە ژوورەوە و دۆلکەکەی پێدام.

هەر کاتێك دۆلکەیەکم هەڵدێنجا، دەنکە خورمایەکی پێ دەدام، تا ناو لەپی دەستم پڕ بوو، ئینجا دۆلکەکەم بەردا و گوتم بەسمە.

هەموویانم خواردن و پاشان هەندێك ئاویشم خواردەوە.

دواتر چوومە مزگەوت، بینیم وا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێیە.

کاتێك ئێمە دانیشتبوون لە مزگەوت، موسعەبی کوڕی عومەیر هات، عەبایەکی پینەکراوی لەبەر بوو[(١)].

(١) واتە: بە پێست پینەکرابوو، موسعەبی کوڕی عومەیر قورەیشی بوو، کۆچی کرد بۆلای پێغەمبەر، ئەو هەموو ناز و نیعمەت و ماڵ و سامانەی لە مەککە جێهێشت، یەکێکە لە گەورە هاوەڵەکانی ئەهلی (صوففە)

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی بینی، بۆی گریا، بۆ ئەو بارودۆخەی پێشتر لەسەری بوو لە ناز و نیعمەت و خۆشگوزەرانی، ئێستاش بەو حاڵە دژوارەوە دەیبینێت.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"چۆنە ئەگەر یەکێکتان بەیانی پۆشاکێك لەبەر بکات و ئێوارەش پۆشاکێکی تر[1]، لەبەردەمیدا قاپێك دابندرێت و یەکێکی تر هەڵبگیرێت وەك چۆن کەعبە دەپۆشرێت[2]، بە هەمان شێوە ماڵەکانی بپۆشێت[3]"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوکات حاڵمان زۆر باشتر دەبێت لەمڕۆ، پشتی خۆمانی لێ دەکەینەوە و خۆمان بۆ عیبادەت و پەرستن تەرخان دەکەین.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئێوە ئێستا زۆر باشترن لەو ڕۆژە"**.

**ئەگەر لەبەر بەرژەوەندییەکیش داواکانی ڕەت بکردبانەوە، بەڵام لەبەرامبەردا دڵی ڕازی دەکردن:**

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: ئەو بەخشینانەی پێغەمبەر ﷺ بە قورەیش و هۆزە عەرەبەکانی دا، ئەنسارییەکان هیچ کامێك لەو بەخشینانەیان بەر نەکەوت، جا شتێك لە دڵیان دروست بوو، تا بووە قسەوباس لەناویان، یەکێکیان گوتی: پێغەمبەر تازە چووە ناو گەلەکەی خۆی، سەعدی کوڕی عوبادە دەرچووە لای و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کۆمەڵە ئەنسارییە شتێکیان لە دڵدا دروستبووە بەرامبەر تۆ، بەهۆی ئەو دەستکەوتانەی بەسەر گەلەکەت و هۆزە عەرەبەکان دابەشت کردووە و ئەوانیش هیچیان وەرنەگرتووە.

فەرمووی: **"ئەی سەعد تۆش داوا دەکەی؟"**.

گوتی: من تەنیا یەکێکم لە گەلەکەم و دەمویست ئەمەت پێ ڕابگەیێنم.

فەرمووی: **"دە لەفلانە شوێن گەلەکەت کۆبکەرەوە بۆم"**.

دەڵێت: جا سەعد ڕۆیشت و گەلەکەی لەو شوێنە کۆکردەوە.

چەند پیاوێکی موهاجیر هاتن و مۆڵەتی دان و چوونە ژوورەوە، چەند کەسێکی تریش داوایان کرد بچن بەڵام ڕەتی کردنەوە.

---

یەکێکە لە هەرە هاوەڵە بەڕێز و بەرزەکان، لەنەفامیدا لە هەموو کەس زیاتر لە ناو ناز و نیعمەتی و ژیانی خۆشدا بوو، بەڵام کە موسڵمان بوو وازی لە دونیا هێنا.

[1] واتە حاڵتان چۆن دەبێت، ئەگەر ماڵ و سامانتان زۆر بوو، بە جۆرێك لە سەرەتای ڕۆژ پۆشاکێك لەبەر بکەن و کۆتاییەکەشی پۆشاکێکی تر، بکەونە ناو لەززەتی دونیا.

[2] ئەمە ئاماژەیەکە بۆ زۆری و جۆراوجۆری خواردنی سەرخوانەکان کە لەبەردەم خاوەن ناز و نیعمەتەکان دادەندرێت.

[3] واتە: ڕازاندنەوەتان بە جل و بەرگی جوان و گرانبەها وەك زیادەڕۆییەك لە نیعمەت.

کاتێك کۆبوونەوە و سەعد هاتە لای و گوتی: ئەوا ئەنسارییەکانم بۆت کۆکردەوە.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان و سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگاری کرد و پاشان فەرمووی: **"ئەی گەلی ئەنسار ئەوەی گوتووتانە پێم گەیشتووە، ئەو شتە چییە لەناو دڵتان دروست بووە؟ ئایا کە هاتم بۆ ناوتان گومڕا نەبوون، خوای گەورە هیدایەتی دان، هەژار نەبوون خوای گەورە دەوڵەمەندی کردن، دوژمنی یەکتری نەبوون خوای گەورە دڵەکانی لەگەڵ یەکدی ئاشت کردنەوە"**.

گوتیان: بەڵکو خوا و پێغەمبەرەکەی بەخشندەتر و باشترن.

فەرمووی: **"ئەی گەلی ئەنسار بۆچی وەڵامم نادەنەوە؟"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا بە چ وەڵامت بدەینەوە، چاکە و منەت و بەخشین هەر بۆ خوا و پێغەمبەرەکەیەتی.

فەرمووی: **"سوێند بە خوا ئەگەر بتانەوێ، دەڵێن و راستیش دەبێژن گەر بڵێن: کە هاتی بۆلامان بە درۆیان خستبوویەوە ئێمە باوەڕمان پێ کردی، دۆڕابووی ئێمە سەرمان خستی، دەرکراوبووی ئێمە لەباوەشمان گرتی، هەژاربووی ئێمە دەوڵەمەندمان کردی.**

**ئەی گەلی ئەنسار، ئایا لەبەرماڵێکی کەمی دونیا شتێکتان لەناو دڵەکانتان دروست کردووە، کە من ویستم بیدەمە کەسانێك تازە موسڵمان بوونە بۆ ئەوەی دڵەکانیان راگیر بکەم، ئێوەشم داوەتەوە دەست ئیسلامەکەتان؟**

**ئەی گەلی ئەنسار ئایا رازی نابن خەڵکی بە مەڕ و وشترێك بگەڕێنەوە، ئێوەش لەگەڵ خۆتان پێغەمبەری خوا ببەنەوە؟**

**سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، ئەگەر کۆچکردن نەبوایە ئەوا دەبووم بە یەکێك لە ئەنسارییەکان، ئەگەر خەڵکی هەمووی بەناو دۆڵێکدا بڕۆن و ئەنسارییەکانیش بە تەنیا بەناو دۆڵێکدا بڕۆن ئەوا رێگەی ئەنسارییەکان دەگرمەبەر.**

**خودایە لە ئەنسارییەکان خۆشببە، خودایە لەنەوەی ئەنسارییەکان خۆش ببە، خودایە لە نەوەی ئەنسارییەکان خۆشببە"**.

دەڵێت: جا خەڵکەکە گریان هەتا ڕیشیان بە فرمێسك تەڕبوو، گوتیان: بە دابەشکردنی پێغەمبەری خوا رازین.

پاشان پێغەمبەری خوا رۆیشت و ئێمەش پەرتەوازە بووین [1].

---

[1] ئەحمەد (١١٣٢٢) گێڕاوەتیەوە، الهیپمی دەڵێت: "رجال الرواية الأولى لأحمد رجالُ الصحيحِ غيرَ محمد بن إسحاق، وقد صرّح بالسماع"، مجمع الزوائد (١٠/٣٠). شعیب الارناووط بە "حەسەن"ی داناوە.

**پێغەمبەر ﷺ ئەو سیفەتە تایبەتیانەی هاوەڵەکانی هەیانبوو هەستی پێدەکرد و پێی دەزانین:**

پێغەمبەر ﷺ هەستی بەو سیفەت و خاسیەتە تایبەتانەی هاوەڵەکانی دەکرد، کە پێی لە یەکتری جیادەبوونەوە، هەر ئەویش فەرموویەتی: **"بە بەزەیی ترین کەس دەرهەق بە ئوممەتەکەم ئەبوبەکرە، توندترینیان لەسەر فەرمانی خوا عومەرە، بەشەرمترینیان عوسمانە، عەلی کوڕی ئەبوتالیبش زاناترنیانە لە دادگەری، لە هەموشیان زاناتر بە حەلال و حەرام موعازی کوڕی جەبەلە، زاناترینیان بە زانستی میرات زەیدی کوڕی سابیتە، خوێندەوارترینیان بۆ کتێبی خودا ئوبەی کوڕی کەعبە، بێگومان هەموو ئومەتێک ئەمیندارێکی هەیە، ئەمینداری ئەو ئوممەتەش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحە"**[1].

" **بە بەزەیی ترین کەس دەرهەق بە ئوممەتەکەم ئەبوبەکرە**" واتە: دڵنەرمەترینیانە، چونکە ئەو سروشتەکەی وەهایە کە لەگەڵ خەڵکیدا نەرم و بە بەزەییە.

" **توندترینیان لەسەر فەرمانی خوا عومەرە**". واتە: بە تینترینان لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانی خوا و موکڕترینیان لەسەری عومەر، وەسفکراوە بەوەی دینێکی بەهێزی هەیە، شەیتان بە ڕێگایەکدا ناڕوا عومەر پێیدا تێپەڕیبێت، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئای ئەی کوڕی خەتتاب، سوێند بە الله، شەیتان ئەگەر ببینێت تۆ ڕێگایەکت گرتۆتەبەر، ئەو بەو ڕێگایەدا ناڕوا و ڕێگایەکی تر دەگرێتە بەر"**[2].

" **بەشەرمترینیان عوسمانە**"، واتە شەرمکردن لەخوا و خەڵکی، شەرمنییەکەی گەیشتۆتە ئەو ئاستەی هەتا لە مەحرەمەکانیش شەرمی دەکرد، گەر تەنیاشبایە هەر شەرمی دەکرد، هێندە بە حەیا و شەرم بووە تا فریشتەکانی خوا شەرمیان لێ دەکرد.

"**عەلی کوڕی ئەبوتالیبش زاناترنیانە لە دادگەری**" واتە: لە هەموویان زاناتر بووە لە مەسەلەی حوکمکردن و کاروباری دادگا.

"**لە هەموشیان زاناتر بە حەلال و حەرام موعازی کوڕی جەبەلە**" واتە: چی حەلال و حەرامە لە حوکمەکان ئەو شارەزایە لێیان.

"**زاناترینیان بە زانستی میرات زەیدی کوڕی سابیتە**" واتە: زانستی میرات و دابەشکردنی و زانینی مەسەلە ئاڵۆز و قورسەکان.

"**خوێندەوارترینیان بۆ کتێبی خودا ئوبەی کوڕی کەعبە**" واتە: کارامەترینانیە بە خوێندنەوەی قورئان و لە هەموویان زیاتر قورئانی پیرۆزی لەبەرە.

---

[1] ترمذي (٣٧٩٠) ابن ماجە گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە ( السلسلة/ ١٢٢٤) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] بوخاری (٦٠٨٥) و موسلیم (٢٣٩٧) لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ گێراوەتیانەوە.

" **بێگومان هەموو ئوممەتێك ئەمیندارێکی هەیە، ئەمینداری ئەو ئوممەتەش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاحە**": واتە: جێگای متمانەیە و ناترسین لێی خیانەت بکات و زۆر توندە لەسەر پاراستنی ئەمانەت[1].

دەبینن پێغەمبەری خوا ﷺ هەر یەکێك لەو هاوەڵە گەورانەی بە سیفەتێکی تایبەت وەسف کردووە، ئەمەش وا دەگەیێنێت، کە هەندێکیان بڕێکی زیاتر لەو سیفەتەی تێدایە لەوانیتر، وەکو شەرمی عوسمان و دادگەری عەلی و ئەوانی تر[2].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: "**نە ئاسمان کەسێکی داپۆشیووە و نە زەویش کەسێکی هەڵگرتووە، ڕاستگۆتر لە ئەبوزەڕ، بە عیسای کوڕی مەریەم دەچێت**".

عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ ئەو سیفەتە دەزانیت و دانی پێ دەنێیت؟

فەرمووی: "**بەڵێ، ئێوەش بیزانن و دانی پێدا بنێن**"[3].

هەروەها فەرموویەتی: "**ئەگەر کەسێك حەز بکات سەیری عیسای کوڕی مەریەم بکات، با سەیری ئەبوزەڕ بکات**"[4].

**پێغەمبەر ﷺ ڕەچاوی سیفەتە تایبەتییەکانی هەر هاوەڵێکی دەکرد، بە پێی ئەو سیفەتانەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردن:**

وەك ئەوەی ڕەچاوەی سیفەتی غیرەتی کرد لە عومەر، هەروەکو لە فەرمودەی ئەبوهورەیرەدا هاتووە، کە دەڵێت: کاتێك ئێمە لە لای پێغەمبەر بووین، فەرمووی: "**کاتێك من نوستبووم، بینیم وا لە بەهەشتم، دەبینم وا ئافرەتێك لەلای کۆشکێکەوە دەستنوێژ هەڵدەگرێت.**

**گوتم: ئەو کۆشکە هی کێیە؟**

**گوتیان: هی عومەری کوڕی خەتتابە، ویستم بچمە ناویەوە بۆ ئەوەی سەیری بکەم، بەڵام غیرەتی تۆم بیرکەوتەوە عومەر، بۆیە پشتم تێکرد**".

عومەری دەستی کرد بە گریان و گوتی: ئایا چۆن گومانی وا بە تۆ دەبەم[5]؟

---

[1] فیض القدیر (١/٥٨٨، ٥٨٩).

[2] فتح الباری (١١/٤٤).

[3] ترمذي (٣٨٠٢) لە ئەبو زەر ﷺ گێراوتیەوە، ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

[4] ابن أبی شیبة (٣٢٩٣٣) لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕایەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع/٦٢٩٢) بە "سەحیح"ی داناوە.

[5] بوخاری (٣٢٤٢) و موسلیم (٢٣٩٥) گێراوەتیانەوە.

**ئەو سوودانەی لەم فەرمووده وەردەگرێت:**

- پێغەمبەر ﷺ رەچاوی سیفەتی هاوەڵەکانی دەکرد.
- فەزڵ و تایبەتمەندی عومەر دەردەکەوێت.
- حوکمدان بۆ هەر پیاوێك بەو سیفەتەی هەیەتی و لەسەریەتی [(١)].

هەروەها رەچاوی سیفەتی شەرمی عوسمانی دەکرد، **هەروەکو خاتوو عائیشە** ﵂ دەڵێت: رۆژێك پێغەمبەر ﷺ لەماڵەکەم پاڵی دابووە، **هەر دوو رانەکانی یان قاچەکانی بە** دیارەبوون.

ئەبوبەکر هات مۆڵەتی خواست، ئەویش مۆڵەتی پێدا بێ ئەوەی خۆی تێك بدات لەسەر ئەو بارەی لەسەری بوو، ئینجا دەستی بە قسەکردن کرد.

دوای ئەو عومەر هات مۆڵەتی خواست، ئەویش مۆڵەتی پێدا هەر وەکو خۆی بوو.

پاشان عوسمان هات، پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر دانیشت و خۆی پێچایەوە، ئینجا عوسمان هاتە ژوورەوە و ئینجا قسەی کرد.

کاتێك رۆیشت پێم گوت: ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە خۆت تێك نەدا، پاشان عومەر هات هەر خۆت تێك نەدا، تا عوسمان هاتەژوورەرە خۆت پێچاوە؟

فەرمووی: **"ئایا شەرم نەکەم لە پیاوێك فریشتەکان شەرمی لێ دەکەن [(٢)]"**.

ئەم فەرموودەیە: گەورەییەکی ئاشکرای تێدایە بۆ عوسمان، گەورەیی لەلای

**مژدەی سەرەنجەمای باشی پێ دەدان:**

هەروەکو لە فەرموودەی ئەنەسی کوڕی مالیکدا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان سەرکەوتە سەر چیای ئوحد، جا چیاکە لە ژێر پێیەکانیان لەرزی، فەرمووی: **"جێگیر بە ئەی ئوحد، تۆ تەنیا پێغەمبەرێك و راستگۆیەك و دوو شەهیدت لەسەرە [(٣)]"**.

واتە چیای ئوحد لەرزی لەبەر ئەوەی شانازی کرد، کە ئەو پیاوە باشانەی لەسەر پشتە، ئەوانیش پێغەمبەر و ئەبوبەکری راستگۆ و هەردوو شەهید عومەر و عوسمانە [(٤)].

---

[(١)] فتح الباري (٧/٤٥)، شرح ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (٩/٥٤٤).

[(٢)] موسلیم (٢٤٠١) گێراوەتیەوە.

[(٣)] بوخاری (٣٦٧٥) گێراوەتیەوە.

[(٤)] عون المعبود (١٠/١٦٨).

**مژدەی بەهەشتی پێدەدان و پلەوپایەی خۆیانی لە بەهەشت بۆ روون دەکردنەوە:**

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ رۆژێك لە ماڵەوە دەستنوێژێکی هەڵگرت، پاشان لە ماڵ هاتە دەرەوە و گوتی: من ئەمرۆ بۆ پێغەمبەری خوا تەرخان دەکەم و بە درێژایی ئەم رۆژە لەگەڵیدا دەبم.

جا هات بۆ مزگەوت و لە پێغەمبەری خوای پرسی.

گوتیان: بۆ ئەو شوێنە دەرچووە.

دەڵێت: منیش شوێن پێی کەوتم، تا چووە ناوچەی بیری (ئەریس) [1]، لەلای دەرگاکە دانیشتم، دەرگاکەی لە پەلکی دارخورمابوو، تا پێغەمبەری خوا سەرئاوی کرد و دەستنوێژی هەڵگرت.

چوومە لای و بینیم لەسەر بیری (ئەریس) لە ناوەڕاستەکەی دانیشتووە، قاچەکانی بەدیار خستبووە، شۆڕی کردبۆوە ناو بیرەکە.

سەلامم لێکرد، پاشان چوومە لای دەرگاکە دانیشتم و گوتم: ئەمرۆ دەبمە دەرگەوانی پێغەمبەری خوا.

ئەبوبەکر هات و پاڵی بە دەرگاکەوە نا و گوتم: ئەوە کێیە؟

گوتی: ئەبوبەکرم

گوتم: لەسەرەخۆ.

پاشان رۆیشتم و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئەبوبەکرە مۆڵەت دەخوازێت.

فەرمووی: **"مۆڵەتی پێ بدە و مژدەی بەهەشتیشی پێ بدە"**.

چوومە لای ئەبوبەکر و پێم گوت: وەرە ژوورەوە و پێغەمبەری خوا مژدەی بەهەشتت پێ دەدا.

ئەبوبەکر سوپاسی خوای پەروەردگار کرد.

ئەبوبەکر هاتە ژوورەوە و لەلای راستی پێغەمبەری خوا دانیشت لەسەر لێواری بیرەکە، پێیەکانی لەناو بیرەکە دانا و قاچەکانی بەدیارخست.

پاشان گەڕامەوە، دانیشتم، برایەکەشم جێهێشت بۆ ئەوەی دەستنوێژ هەڵبگرێت و پاشان دوام بکەوێت، گوتم: گەر خوا چاکەی بۆ فلانەکەس بوێت دەیهێنێ.

یەکێکی تر دەرگای جوڵاند و گوتم: کێیە؟

---

[1] کێڵگەیەکە لە مەدینە، نزیکە لە (قوبا) لەو بیرەدا ئەنگوستیلەی پێغەمبەر کەوتە ناویەوە، کە لەپەنجەی عوسماندا بوو.

گوتی: عومەری کوڕی خەتتاب.

گوتم: لەسەرەخۆ.

پاشان چومە لای پێغەمبەر و سەلامم لێکرد و گوتم: ئەوە عومەری کوڕی خەتتابە مۆڵەت دەخوازێت.

فەرمووی: **"مۆڵەتی پێ بدە و مژدەی بەهەشتیشی پێ بدە"**.

هاتمەوە دەرەوە و گوتم: وەرە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ مژدەی بەهەشتی پێدای.

ئەویش سوپاسی خوای پەروەردگاری کرد.

هاتە ژوورەوە و لەگەڵ پێغەمبەری خوا لەلای چەپی لەسەر لێواری بیرەکە دانیشت و پێیەکانی هاوێشتە ناو بیرەکە.

پاشان گەڕامەو و گوتم: ئەگەر خوای گەورە خێری بۆ فلانەکەس بوێ ئەوا دەیهێنێ.

یەکێکی تر دەرگاکەی جوڵاند و گوتم: کێیە؟

گوتی: عوسمانی کوڕی عەفانم

گوتم: لەسەرەخۆ، هاتمەوە لای پێغەمبەری خوا و هەواڵم پێدا.

فەرمووی: **"مۆڵەتی پێ بدە و مژدەی بەهەشتی پێ بدە و توشی مەینەتیەکیش دەبێت"**[1].

ئەویش سوپاسی خوای پەروەردگاری کرد، پاشان گوتی: خودا پشت و پەنامە.

چووە ژوورەوە و جێگا نەبوو لەسەر لێواری بیرەکە دابنیشێت، لەوبەری لەبەرامبەریدا دانیشت.

سەعدی کوڕی موسەیب دەڵێت: ئەمەم بە گۆڕەکانی خۆیان لێك داوەتەوە [2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دروستە لە ڕوودا ستایشی کەسێك بکەی، گەر دڵنیابووی لەوەی بەمە لەخۆبایی نابێت.
- گەورەیی ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان دەردەکەوێت، ئەوانە ئەهلی بەهەشتن و هەروەها گەورەیی ئەبو موسای ئەشعەری.

---

[1] ئەو مەینەتیەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بۆ کردووە، ئەوا ئەو مەینەتیە بوو کە توشی عوسمان هات لە دوایین ساتەکانی خیلافەتەکەی، کە لە ماڵەکەی خۆیدا شەهید کرا، پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی تر ڕوونتر باس دەکات، هەروەکو ئەحمەد (٥٩١٧) لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ باسی فتینەیەکی کرد، پیاوێك تێپەڕی و فەرمووی: **"ئەو پیاوە لەو ڕۆژەدا بە ستەم دەکوژرێ"**، دەڵێت: کە سەیرم کرد بینم ئەو پیاوە عوسمانە.... سەنەدەکەی "سەحیح"ـە، وەك الحافظ لە (الفتح ٣٨/٧) گێڕاوەتیەوە.

[2] مەبەستی کۆبوونەوەی هەردوو هاوەڵە لە بەخاکسپاردنیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، عوسمانیش بە تەنیا لە بەقیع نێژرا، بوخاری (٣٦٧٤) و موسلیم (٢٤٠٣) گێڕاوەتیانەوە.

- گوتنی خواپشت و پەنامە (والله المستعان) لەو حاڵەی عوسمان تێیدابووە.
- لەوانە موعجیزەیەکی ئاشکرای پێغەمبەر ﷺ کە هەواڵیدا عوسمان ئەو بەڵایەی بەسەر دێ، هەر سێکیشیان بەردەوامن لەسەر باوەڕ و ڕێگای دروست.

پێغەمبەر ﷺ مژدەی بە هەشتی بە هەندێکی تریشداوە، لە فەرموودەیەکدا ناوەکانی هێناون، کە ناسروان بە دە مژدە پێدراوەکان، دەفەرموێت: **"ئەبوبەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوسمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، تەڵحە لە بەهەشتە، زوبەیری کوڕی عەوام لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، سەعیدی کوڕی زەید لە بەهەشتە [1]"**.

هەروەها فەرموویەتی: **"حەسەن و حوسەین گەورەی گەنجانی بەهەشتن [2]"**.

هەروەها فەرموویەتی: **"بەهەشتیان پێ نیشان دام خێزانی ئەبو تەڵحەم لەوێ بینی و گوێشم لە دەنگێك بوو ئەویش بیلال بوو [3]"**.

لە ڕاستیدا ئەوانەی بە دەقی ئاشکرا مژدەی بەهەشتیان پێدراوە گەلێك زۆرن، ئێرە جێگای ژماردنیان نییە.

---

[1] ئەبو داود (٤٦٤٩) و ترمذي (٣٧٤٨) و ابن ماجة (١٣٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع/٤٠١٠) بە "سەحیح"ی داناوە

[2] ترمذي (٣٧٦٨) لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە

[3] بوخاری (٣٦٧٩) و موسلیم (٢٤٥٧) لە جابری کوڕی عەبدوڵلاوە ﷺ گێڕاوەتیانەوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خزمەتکار و کەنیزەکان:

پێغەمبەر ﷺ لە مامەڵەکردن لەگەڵ خزمەتکار و کەنیزە و کۆیلە ئازادکراوەکان باشترین مامەڵەی پێشەکەش کردووە، زۆر بە نەرمی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردوون و زۆر بە زەیی پێدا هاتوونەتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو ڕەوشتە جوانەی لەسەری بووە، هەروەها بۆ ئەوەی ببێتە هاندانێکیش بۆ ئوممەتەکەی تاوەکو لەو ڕەوشتە بەرزانە شوێن پێی ئەو هەڵبگرن.

### مامەڵەکردن لەگەڵ خزمەتکار و کۆیلەکان:

مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو کەسانەی خزمەتیان دەکرد، وەك مامەڵەی باوکێکی بە بەزەیی بوو دەرهەق بە کوڕەکەی، وەك برایەکی بەسۆز بوو بۆ براکەی، ئەو جیاوازی لە نێوان کۆیلە و کرێگرتە و خۆبەخش نەدەکرد، ئەمە زەیدی کوڕی حاریسەی والێکرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە دایك و باوك و عەشیرەتەکەی باشتر دابنێ.

زانایانی سیرە باسیان کردووە، کە سەعدی کچی سەعلەبە، دایکی زەیدی کوڕی حاریسە، سەردانی خزم و کەس و کاری کرد و زەیدیشی لەگەڵ بوو، چەند سوارێك هاتن بەسەر ماڵەکانی (بەنی مەعن)یان دادا، زەیدیان ڕفاند، کە هێشتا منداڵ بوو، بردیانە بازاڕی عوکاز و بۆ فرۆشتن دایانا، حەکیمی کوڕی حوزام بە چوارسە درهەم بۆ خەدیجەی پوری کڕی.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ خەدیجەی گواستەوە، بە دیاری پێشکەی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد.

باوکی زەید، کە ناوی حاریسەی کوڕی شەڕاحیلە، کاتێك زەیدی بزر کرد گوتی:

بكيتُ على زيدٍ ولم أدرِ ما فعلَ　　أحيٌّ، فيرجى أم أتي دونُ الأجلْ

فَوالله ما أدري، وإنـي لسـائل　　أغالك بعدي السّهلُ أم غالك

هەندێك لە هۆزی کەلب حەجیان کرد، زەیدیان بینی و ناسیانەوە، ئەویش ئەوانی ناسیەوە، گوتی: ئەم چەند دێرە شیعرە بە خزمەکانم بگەیەنن:

أحنُّ إلى أهلي، وإن كنتُ نائياً　　فإني قطينُ البيت عند المشاعرِ

فكفّوا منَ الوجدِ الذي قد شجاكم　　ولا تعملوا في الأرض نصّ الأباعر

**ئەوان چوونەوە و هەواڵەکەیان بە باوکی گەیاند، شوێنەکەیان بۆ وەسف کرد، حاریسە و کەعبی برای ڕۆیشتن، بۆ ئەوی بیکڕنەوە، هاتنە مەککە، پرسیاری پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد، گوتیان: لە مزگەوتە، ئەوانیش چوونە لای.**

پێیان گوت: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەی کوڕی برا گەورەی گەلەکەی، ئێوە دراوسێی خودان، کەسی دەستبەسەر ڕزگار دەکەن، برسی تێردەکەن، ئێمەش هاتووین داوای کوڕەکەمان بکەینەوە، کە ئێستا کۆیلەیە لەلای ئێوە، جا چاکەیەکمان لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی بیکڕینەوە.

فەرموو: **"لەمە باشترتان پێ بڵێم؟"**.

گوتیان: چی دی هەیە لەمە زیاتر؟

فەرمووی: **"بانگی بکەن، من سەرپشکی دەکەن، ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوا باشە، ئەگەریش منی هەڵبژارد ئەوا سوێند بە خوا دەستبەرداری نابم، مادام منی هەڵبژاردووە"**.

گوتیان: بەراستی زیاد لە دادگەریت نواند.

پێغەمبەر ﷺ بانگی زەیدی کرد، پێی فەرموو: **"ئەوانە کێنە؟"**.

گوتی: ئەوە جاریسەی کوڕی شەڕاحیلی باوکمە و ئەوەش کەعبی کوڕی شەڕاحیلی مامە.

فەرمووی: **"من تۆ سەرپشك دەکەم، ئەگەر دەتەوێ لەگەڵیان بچۆرەوە، ئەگەریش دەتەوێت لەگەڵ من بمێنەوە"**.

وتی: بەڵکو لەگەڵ تۆ دەمێنمەوە.

باوکی پێی گوت: ئەی زەید ئایا بەندایەتی بەسەر ئازادی و دایك و باوك و نیشتیمان و گەلەکەت هەڵدەبژێریت؟

گوتی: من لەو پیاوە شتێکم بینیوە قەت ناتوانم دەستبەردای بم.

لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ دەستی گرت و بردیە ناو کۆمەڵی قورەیش، فەرمووی: **"شاهێد بن، ئەمە کوڕمە و میراتگرە و میراتم دەبات"**.

ئینجا باوکی دڵی بە مە زۆر خۆش بوو، زەید بە کوڕی موحەممەد بانگ دەکرا، تا ئەم ئایەتە دابەزی [1]: واتە: ﴿ ٱدۡعُوهُمۡ لِأٓبَآئِهِمۡ ﴾ الأحزاب: ٥ (ئەم کوڕانە بەناوی باوکی خۆیانەوە ناویان بەرن و بانگیان بکەن)

---

[1] الطبقات الكبرى لابن سعد (٤٢/٣)، الإصابة فى معرفه الصحابة (٣٩٢/١)، الأخبار الموفقيات (ص ١٨٨).

**دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن مامەڵەی لەگەڵ خزمەتکار و کۆیلە و کەنیزەکان کردبێت، تا بەو ئاستە خۆشیان بوێت و مانەوەیان لەلای ئەو پێ باشتر بوو بێت لەچوونەوە لای کەس و کاریان:**

پێغەمبەری خوا ﷺ سڵی نەدەکرد لەگەڵ خزمەتکار یان کەنیزەکەی بڕوا بۆ هەر شوێنێك، تا کارەکەی بۆ جێبەجێ بکات.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کەنیزەیەکی مەدینە **پێغەمبەری خوای** ﷺ دەبرد بۆ هەر شوێنێك بیوستبایە [1].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کەنیزەیەك لە کەنیزەکانی مەدینە دەهات و دەستی لەناو دەستی پێغەمبەر ﷺ دادەنا، دەستی لە دەستی دەرنەدەهێنا تا دەیبرد بۆ ئەو شوێنەی خۆی بیوستیابە [2].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمە ئەو پەڕی خۆداماڵینە لە لوتبەرزی و خۆبەگەورەزانین، کە کەنیزەیەك بێت و دەستی بگرێت و دەستی بەرنەدا تا هەر چی بیەوێ بۆی جێبەجێ بکا [3].

**سوودێك:**

چۆن ئەم فەرموودەیە بگونجێنین لەگەڵ ئەو فەرموودەیەی دەڵێت پێغەمبەر ﷺ هەرگیز دەستی بە ئافرەتێکی نامەحرەم نەکەوتووە؟

زانیان بەچەند وەڵامێك وەڵامیان داوەتەوە:

١- مەبەست لە دەستگرتن، واتە لێی دانەبڕاوە و سەری بۆ داواکارییەکانی دانواندووە، ئەمەش رای ئیبن حەجەرە [4].

٢- کەنیزە حوکمی ئافرەتی لەسەر جێبەجێ نابێ، چونك کەنیزە دەکڕێ و دەفرۆشرێت، بۆیە کەنیزە خۆی داناپۆشێت تەنانەت لە نامەحرەمیش.

٣- لەوانەیە کەنیزەیەك بێت، کە هێشتا تەمەنی نەگەیشتبێتە بلوغ [5].

گێڕانەوەی ئیمام (ئەحمەد) ئاماژە بە خاڵی سێیەم دەکات.

---

[1] ئەحمەد (١١٥٣٠) گێڕاوەتیەوە، بوخاری (٦٠٧٢).

[2] ئەحمەد (١٢٣٦٩) و ابن ماجە (٤١٧٧) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (١٢٨٦).

[3] فتح الباری (١٠/٤٩٠).

[4] فتح الباری (١٠/٤٩٠).

[5] ئەمە وتەی (شیخ عبدالعزیز الراجحی)ـە، لە ماڵپەری ئیسلام وێب.

**پێغەمبەر ﷺ بێزی نەدەبۆوە لەگەڵ خزمەتکارەکەی نان بخوات، بەڵکو ئوممەتەکەشی لەسەر ئەمە هان دەدا:**

ئەبوهورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **"ئەگەر یەکێك لە ئێو خزمەتکارەکەی خواردنی بۆ هێنا، گەر لەگەڵ خۆشی داینەنیشاند، ئەوا با پارویەك یان دوو پاروە نانی بداتێ، چونکە خۆی خواردنەکەی لێناوە و بەرگەی ناخۆشییەکانی گرتووە"**[1].

لە موسلیمیش بەم شێوەیە هاتووە: **"ئەگەر خزمەتکار خواردنێکی بۆ یەکێکتان ئامادە کردبوو، پاشان بۆی هێنان، کە هەر خۆی بەرگەی گەرما و دوکەڵ و مەینەتییەکانی گرتووە، ئەوا با لەلای خۆیدا داینیشێنێت بۆ ئەوەی لەگەڵی بخوات، ئەگەریش خواردنەکە کەم بوو، ئەوا با پارووپەك یان دوو پارووی لە دەم بنێت"**.

النووی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە هانی رەوشتبەری و ناندانی خزمەتکاری تێدایە، چونکە بە خواردنەکە ماندوو بووە و بەرگەی گەرما و دوکەڵەکەی گرتووە و بۆنی کردووە و حەزی چوەتێ[2].

**فەرمانی بەو کەسانە دەکرد کە خزمەتکاریان هەیە، لە هەمان ئەو خواردنەیان پێ بدەن کە بەخۆیان دەیخۆن و هەمان ئەو بەرگەیان لەبەربکەن کە خۆیان لەبەری دەکەن:**

مەعروری کوڕی سوەید دەڵێت: لە (رەبەز)[3] چاوم بە ئەبو زەر کەوت. کە عەبایەکی لەبەردابوو، بەندەکەشی عەبایەکی لەبەر بوو، لەوبارەیەوە پرسیارم لێ کرد:

گوتی: من ئەو پیاوەم عەیبدار کرد بە دایکی[4].

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: **"ئەی ئەبو زەر ئایا عەیبدارت کرد بە دایکی؟! تۆ پیاوێکیت هێشتا دەماری نەفامیت لەناودا ماوە، خزمەتکارەکانتان براتانن، خوای پەروەردگار لەبەر دەستی ئێوەی داناون، هەر کەسێك برایەکی کەوتە ژێر دەستی، با لەو خواردنە بیداتێ کە**

---

[1] بوخاری (٥٤٦٠) و موسلیم (١٦٦٣) گێڕاویانەتەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣٥/١١).

[3] رەبەز گوندێکە لە گوندەکانی مەدینە بە دووری سێ رۆژ لە (ذات عرق)، لە ڕێگای حیجازە نزیکە.

[4] لە گێڕانەوەی بوخاریدا (٦٠٥٠) هاتووە: "دایکی عەرەب نەبوو، منیش عەیبدارم کرد".لە گێڕانەوەی البیهقی لە شعب الإیمان (٤٧٧٧٢) داهاتووە، پێم گوت: "ئەی کوڕی دایکە ڕەش"، یان گەتراوە گوتراوە ئەم پیاوە بیلال بووە.

**خۆی لێی دەخوات و لەو پۆشاکە بەرگی لەبەریکات کە خۆی لەبەری دەکات، زیاد لە هێزی خۆیان بارقورسیان مەکەن، ئەگەریش ئەمەتان کرد یارمەتیان بدەن**"[1].

نەوەوی دەڵێت: فەرمانکردن بە پێدانی نان و جلوبەرگی گەورەکە بە خزمەتکار، ئەوا بۆ سوننەتە نەوەك واجب، ئەمەش کۆڕای موسڵمانانە.

سەبارەت بە کاری ئەبو زەر، کە جلوبەرگی خۆی و خزمەتکارەکەی یەك جۆر بووە، ئەوا کاری بەم سوننەتە کردووە، بەڵام ئەوەی واجبە لەسەر گەورە، نەفەقەی خزمەتکارەکە دابین بکات، وەك خواردن و خواردنەوە و جلوبەرگ، ئەمەش بە گوێرەی شوێن و کەسەکان، جا یەکسانە ئەگەر لەمانە وەکو نەفەقەی گەورەکەی بێت یان لە خواروو یاخود لەسەرووی ئەمەوە بێت.

هەتا ئەگەر گەورە قرچۆکی و رەزیلی لەسەرخۆی کرد بە جۆرێك لە عادەتی هاوشێوەی خۆی چوە دەرێ، جا چ لەبەر دینداری بێ یان لەبەر قرچۆکی، ئەوا نابێت قرۆچکی و رەزیلی بەرامبەر بەندەکەی بکات، ئەگەریش شتێکی لێ گرتەوە ئەوا دەبێت بەندەکە رەزامەندی لەسەر دەربڕێت[2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- قەدەغەکردنی جنێودان بە بەندە و عەیبدارکردن بە دایکی.
- قەدەغەکردنی عەیبدارکردن و بەسوك سەیرکردنی باوك و دایکیان، چونکە ئەم کارانە لە رەوشتی نەفامینە.
- نابێت موسڵمان هیچ رەوشتێکی نەفامی تێدا بێت.
- هاندانی تێدایە لەسەر چاکەکردن لەگەڵ بەندە و خزمەتکار و نەرمی نواندن لەگەڵیان، ئەوانی دیش لە نمونەی کرێگرتە و کرێکار و ...هتد.
- خۆبەرزنەکردنەوە لەسەر موسڵمانان و بەکەم سەیر نەکردنیان.
- پارێزگاری کردن لە فەرمان بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە.
- وشەی برا بۆ بەندە بەکار بهێندرێت[3].

---

[1] بوخاری (٣٠) و موسلیم (١٦٦١) گێراویانەتەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣٣/١١)
[3] فتح الباری (١٧٥/٥)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣٣/١١).

**قەدەغەی کردووە شتێکیان لێ داوا بکرێت لەسەروی هێز و توانایان بێت:**

ئەبوهورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: "**نان و جلوبەرگی کۆیلە لەسەر گەورەکەیەتی بۆی دابین بکات، نابێت ئەرکباری بکات بە شتێك لە توانایدا نەبێت**[(١)]".

النووی دەڵێت: زانایان یەك ڕان لەسەر ئەوەی نابێت کۆیلە ئەرکی قورس بکرێت بە شتێك نەتوانێ ئەنجامی بدات، ئەگەریش هەر وایکرد دەبێ خۆی یان کەسێکی تر یارمەتی بدات[(٢)].

**ئەگەر یەکێك لە خزمەتکارەکانی نەخۆشبوایە، سەردانی دەکرد، تەنانەت گەر موسڵمانیش نەبوایە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: خزمەتکارێکی جولەکە خزمەتی پێغەمبەری خوای دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ سەردانی، لەلای سەری دانیشت، فەرمووی: "**موسڵمان بە**".

ئەویش سەیرێکی باوکی کرد کە لەلای بوو، باوکیشی گوتی: بە قسەی باوکی قاسم بکەن.

جا موسڵمان بوو.

پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە و فەرمووی: "**سوپاس بۆ خوا کە لە ئاگر ڕزگاری کرد**[(٣)]".

پێغەمبەر موکر بوو لەسەر سەردانی کردنی خزمەتکارەکەی و بانگکردنی و دەستگرتنی بۆ هەرچی خێرە.

**ئەگەر یەکێکیان بمردبا و ئامادەی ناشتنی نەبوایە، دەچووە سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەر دەکرد:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: ئافرەتێکی ڕەشتاڵە مزگەوتی پاك دەکردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان نەیبینی و پرسیاری لەبارەیەوە کرد، گوتیان: مرد.

فەرمووی: "**ئەدەبووایە ئاگادارتان بکردبامایەوە؟**".

ئەبو هورەیرە دەڵێت: وەك بڵێی بەهەندیان وەرنەگرت.

فەرمووی: "**گۆڕەکەیم نیشان بدەن**".

پیشانیان دا و ئەویش نوێژی لەسەر کرد، پاشان فەرمووی: "**بەڕاستی ئەو گۆڕانە پڕ تاریکایین بۆ خاوەنەکانیان، خوای گەورە بە هۆی نوێژکردنم لەسەریان ڕووناکیان دەکاتەوە**[(٤)]".

---

(١) موسلیم (١٦٦٢) گێڕاوەتیەوە.

(٢) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣٣٣/١١).

(٣) بوخاری (١٣٥٦) گێڕاوەتیەوە.

(٤) موسلیم (٩٥٦) گێڕاویەتیەوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: لەگەڵ هاوەڵەکانی دەرچوون و لەسەر گۆڕەکەی وەستان، (**الله أكبر**) ی لەسەر کرد و خەڵکیش لەدواوەی بوون و دوعای بۆ کرد و پاشان ڕۆیشت [1].

ئەم سەرکردە گەورەیە هیچ شتێك سەرقاڵی نەکرد بۆ ئەوەی لەو ئافرەتە بپرسێت کە مزگەوتی پاك دەکردەوە.

**چەند گەورە و بەڕێزە ئەم سەرکردەیە! چەند مامەڵەی جوانە ئەم خۆشەویستە!**

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- ئەوەی پێغەمبەری خوا لەسەری بوو لە ملکەچی و نەرمی نواندن لەگەڵ ئوممەتەکەی و هەڵسان بە مافەکانیان و گرنیگدان بە بەرژەوەندی دونیا و دوارۆژیان.
- گەورەیی پاککردنەوەی مزگەوت.
- پرسیارکردن لە خزمەتکار و هاوڕێ ئەگەر دیار نەبوونایە.
- پاداشتدانەوە بە دوعاکردن.
- هاندان بۆ ئامادەبوون لە مەراسیمی جەنازەی خەڵکی باش.
- بانگکردنی خەڵکی بۆ نوێژکردن لەسەر مردوو، بۆ ئەوانەی نوێژیان لەسەر مردووەکە نەکردووە.
- ڕاگەیاندنی هەواڵی مردن [2].

## دوعای بۆ خزمەتکارەکەی دەکرد:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاتەلامان کە تەنیا من و دایکم و (أم حرام)ی پورم بووین، فەرمووی "**هەڵسن تا نوێژتان بۆ بکەم**" -کاتی نوێژیش نەبوو- جا نوێژی بۆ کردین و دوعای بۆ ئەهلی ئەم ماڵە کرد لە دونیا و دوارۆژ.

دایکم گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم خزمەتکارە بچکۆڵەیش دوعای بۆ بکە.

ئەنەس دەڵێت: هەرچی دوعای خێرە بۆی کردم، لە کۆتایی ئەم دوعایەی بۆ کردم: "**پەروەردگارا ماڵ و منداڵی زۆر بکەی و بەرەکەت تێ بخەی**".

---

[1] ابن ماجة (١٥٣٣) لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح سنن ابن ماجة/ ١٢٤٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] فتح الباري (٥٥٣/١). شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٥/٧).

ئەنەس دەڵێت: لە ئەنسارییەکان لە هەموویان ماڵم زۆرترە، ئامینەی کچم بۆی گێڕامەوە کە تاوەکو هاتنی حەجاج بۆ بەسرە سەد و بیست لە نەوەکانم نێژراون[1].

## لە خزمەتکارەکانی دەپرسی و پرسیاری پێداویستییەکانیانی دەکرد:

زیادی کوڕی ئەبوزیاد خزمەتکاری بەنی مەخزوم، کە لە خزمەتکارێکی پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە خزمەتکارەکەی دەگوت: **"ئایا هیچ شتێکت پێویستە؟[2]"**.

## داوای لە خزمەتکارەکەی دەکرد هەرچییەکی دەوێت با داوای لێ بکات، جا داواکەی جێبەجێ دەکرد هەرچەند گەورەش بووایە:

ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمەی ﷺ دەڵێت: شەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، ئاوی دەستنوێژم بۆ هێنا، فەرمووی: **"داوا بکە"**.

گوتم: دەمەوێت لە بەهەشتدا لەگەڵ تۆ بم.

فەرمووی: **"هەر ئەم داوایە"**.

گوتم: بەڵێ هەر ئەمە.

فەرمووی: **"یارمەتی خۆت بدەم لەم کارە بە سوژدە بردنی زۆر[3]"**.

لە گێڕانەوەیەکی تردا کە ڕەبیعە گێڕاویەتیەوە دەڵێت: من خزمەتی پێغەمبەری خوام دەکرد، بە درێژایی ڕۆژ لە خزمەتی دابووم تا نوێژی عیشای دەکرد، جا لەبەر دەرگای دەوەستام تاوەکو دەچووە ماڵەوە، دەمگوت هەر لەبەر دەرگای دەبم بەڵکە کارێکی دەبێت تا بۆی جێبەجێ بکەم، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: **"سبحان الله، سبحان الله، سبحان الله وبحمده"**. تا بێزار دەبووم لە وەستان جا یان دەگەڕامەوە یان خەو بەسەرمدا زاڵ دەبوو لێی دەنوستم.

دەڵێت: جارێك بینی من زۆر ماندووم و خزمەتی دەکەم، پێی فەرمووم: **"ڕەبیعە شتێك داوا بکە تا بۆتی جێبەجێ بکەم"**.

دەڵێت: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا با بیرێکی لێ بکەمەوە ئینجا پێتی دەڵێم.

---

[1] بوخاری (١٩٨٢) و موسلیم (٦٦٠) گێڕاویانەتەوە.

[2] ئەحمەد (١٥٦٤)، ئەلبانی لە (صحیح الجامع/٤٨٣٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] موسلیم (٤٨٩) گێڕاوەتیەوە.

بیرم کردەوە زانیم کە دونیا کۆتایی پێ دێت و ئەو رزق و رۆزیەی هەمە بەشم دەکات و بۆم دێت، گوتم: داوای کاروبارێکی قیامەت لە پێغەمبەری خوا دەکەم، چونکە خوای گەورە پلەوپایەکی بەرزی پێداوە.

دەڵێت: هاتمەوە لای، فەرمووی: **"ها چیت کردەوە رەبیعە؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، داوا لە پەروەردگارت بکە گەردەنم لە ئاگر ئازاد بکات.

فەرمووی: **"رەبیعە کێی ئەمەی فێر کردووی؟"**

گوتم: سوێند بەو خوایەی تۆی بە هەق رەوانەکردووە، کەس فێری نەکردووم، بەڵام کاتێك فەرمووت: **"داوام لێ بکە تا بۆتی جێبەجێ بکەم"**، بینم کە تۆ پلە و پایەیەکی گەورەت لەلای پەروەردگارت هەیە، سەیری کاروباری خۆم کرد زانیم دونیا دەڕوا و کۆتایی پێ دێت، ئەوەی رزقە هەمە و بۆم دێت، گوتم داوای دوارۆژ لە پێغەمبەری خوا دەکەم.

پێغەمبەر خوا ﷺ ماوەکی زۆر بێ دەنگ بوو، پاشان پێی فەرمووم: **"من ئەوەت بۆ دەکەم، بەڵام زۆر سوژدە ببە"**[1].

**پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دەکرد هەر کە کارەکانیان تەوا کرد راستەوخۆ کرێیەکانیان پێ بدەن:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"کرێ بە کرێکار بدەن، بەر لەوەی ئارەقەی وشك بێتەوە"**[2].

واتە: پێویستە پەلە بکرێت لە کرێ پێدانی کرێکار هەر کە کارەکەی تەواو کرد[3].

**هۆشداری داوە لە ستەمکردن لە کرێکار و مافی پێنەدانیان:**

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"خوای گەورە فەرموویەتی: لە رۆژی دوایی من دوژمنی سێ کەسانم: پیاوێك سوێندی بە من خوارد بەڵێنێك جێبەجێ بکات بەڵام نەیگەیاندە سەر، پیاوێکیش یەکێکی ئازادی فرۆشت و نرخەکەی خوارد، پیاوێکیش کرێکارێکی بە کرێ گرت دوای تەواوبوونی کارەکەی کرێی پێ نەدا"**[4].

---

[1] ئەحمەد (١٦١٤٣) ئەلبانی بە لە (إرواء الغليل ٢/٢٠٩) بە "حەسەن"ی داناوە.
[2] ابن ماجة (٢٤٤٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٥/٣٢٠) بە "سەحیح"ی داناوە.
[3] حاشية السندي لە سنن ابن ماجة (٥/١٢٨).
[4] بوخاری (٢٢٢٧) گێڕاوەتیەوە.

ابن التين دەڵێت: خوای گەورە دوژمنی هەموو ستەمکارانە، بەڵام دەیەوێت زیاتر جەخت لەسەر ئەمانە بکاتەوە کە ناوی هێناون.

کە فەرمووی" **پیاوێکیش کرێکارێکی بە کرێ گرت دوای تەواوبوونی کارەکەی کرێی پێ نەدا**"، واتە سوودی لە کرێکارەکە بینووە بێ ئەوەی هیچی لەبەرامبەردا پێ بدات، ماف خواردووە، چونکە بێ پاداشت بەکاری هێناوە، وەك ئەوەی کردبێتیە بەندەی خۆی[1].

## پێغەمبەر ﷺ هۆشداری داوە لە تۆڵەسەندنەوە لە خزمەتکار و کۆیلە و کەنیزە:

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پیاوێك هات لەبەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دوو بەندەم هەیە، بە درۆم دەخەنەوە و خیانەتم لێ دەکەن و سەرپێچیم دەکەن، منیش جنێویان پێ دەدەم و لێیان دەدەم، ئایا من لەبارەی ئەوانەوە هیچم لەسەرە؟

فەرمووی: "**خیانەت و سەرپێچی و بەدرۆخستنەوەیان بۆت و سزای تۆ بۆیان هەموویان حیساب دەکرێن، ئەگەر سزایەکەت بە ئەندازەی گوناهەکانیان بوو، هیچت لەسەر نییە، ئەگەریش سزایەکت لە خوار گوناهەکانیان بوو، ئەوا فەزڵ و سەروەرییە بۆ تۆ، ئەگەریش سزایەکەت لەسەرووی گوناهەکانیان بوو ئەوا لە چاکەکانی تۆ بۆیان دەچێت**".

دەڵێت: پیاوەکە کەمێك دوورکەوتەوە و دەستی بە گریان کرد و هاواری دەکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا لە کتێبی خوا ئەم ئایەتەت نەخوێندۆتەوە:

﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَـٰسِبِينَ ﴾ الأنبياء: **٤٧** واتای ئایەتەکە: ( ئێمە پێوەر و تەرازووەکانی دادپەروەری لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، جا هیچ کەس بە هیچ شێوەیەك ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر بە قەدەر تۆوە خەرتەلەیەك دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بە وردی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین).

پیاوەکە گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا باشتر وایە من لەوانە دابڕێم، ئێوە شاهێد بن کە ئەوان هەموویان ئازادن[2].

---

[1] فتح الباري (٦/٣٤٩).

[2] ترمذي (٣١٦٥) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٢٢٩٠) بە "سەحیح"ی داناوە.

ئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێت :باوکی قاسم فەرمووی: **"ئەوەی بەندەکەی یان کەنیزەکەی تۆمەتبار بکا بە زینا، ئەوا لە ڕۆژی دواییدا حەددی لێ دەردەکرێ، مەگەر ئەو قسەی گوتبێتی ڕاست بێت[١]"**.

**گەر هەڵەیەکیان کرد، بە سوننەتی داناوە لێیان ببوردرێت، با دووبارەش بێتەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: **پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر و** گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا خزمەتکارێکم هەیە خراپە دەکات و ستەم دەکات، **ئایا لێی** بدەم؟ ((لە گێڕانەوەیەکی تر: تا چەند لە خزمەتکار ببورین؟)).

ئەویش بێ دەنگ بوو، پیاوەکە هەمان قسەی دووبارە کردەوە، **ئەویش هەر بێ دەنگ** بوو، تا لە جاری سێیەم فەرمووی: **"هەموو ڕۆژ حەفتا جار لێی ببورە[٢]"**.

لەوانەیە بێ دەنگی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوە بووبێت چاوەڕێی وەحی کردبێت، یان گوتراوە پرسیارەکە لەلای ناخۆش بووە، چونکە لێبوردن هەردەم بە ڕەهایی کارێکی سوننەتە، پێویست ناکات ژمارەیەکی دیاری کراوی بۆ دابندرێت[٣].

**فەرمانی کردووە بە نەرمی بانگی خزمەتکار بکرێت:**

بەزەیی پێغەمبەر ﷺ گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بە بەندە و کەنیزەك نەگوترێت (بەندەکەم، یان کەنیزەکەم)، بەڵکو ئەم دوو ناوەی بە دەستەواژەیەکی جوان و شیرین گۆڕیون، ئەویش پێیان بڵێن: کوڕەکەم، کچەکەم.

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"با یەکێکتان نەڵێت بەندەکەم، چونکە هەمووتان بەندەی خوان، بەڵکو با بڵێت: کوڕەکەم، کوڕەکەش بە خاوەنەکەی نەڵێت پەروەرینم، بەڵکو بڵێت: گەورەم[٤]"**.

لە بوخاریشدا هاتووە: **"با یەکێکتان نەڵێت: پەروەرێنت نان بدە، چرا بۆ پەروەرێنت داگریسێنە، ئاو بدە بە پەروەرێنت، بەڵکو با بڵێت گەورەم، با کەس نەڵێت: بەندەکەم یان کەنیزەکەم، بەڵکو با بڵێت: کوڕەکەم یان کچەکەم"**.

---

[١] بوخاری (٦٨٥٨) و موسلیم (١٦٦٠) گێڕاویانەتەوە.

[٢] ئەبو داود (٥١٦٤) و ترمزی (١٩٤٩) و ئەحمەد (٥٦٠٣) گێڕاویانەتەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة/ ٤٨٨) بە "سەحیح"ی داناوە

[٣] تحفة الأحوذي (٦٩/٦).

[٤] بوخاری (٢٥٥٢) و موسلیم (٢٢٤٩) گێڕاویانەتەوە.

پەسند نییە گەورە بڵێتە ئەو کەسەی لەبەر دەستی دایە، بەندەکەم کەنیزەکەم، بەڵکو با بڵێت کوڕەکەم کچەکەم، چونکە حەقیقەتی پەرستن تەنیا بۆ خوای پەروەردگارە، هەروەها چونکە گەورەییەکی تێدایە کە شایەن نییە دروستکراو بۆخۆی بەکاری بهێنێت.

**ئەگەر خزمەتکارەکەی بۆ کارێك ناردبا، ئەویش سستی بکردبا لە ئەنجامدانی، لێی توڕە نەدەبوو و گلەیی لێ نەدەکرد:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین رەوشتی هەبووە، رۆژێك منی نارد بۆ ئەنجامدانی کارێك، گوتم سوێند بەخوا ناچم، واشم نیشاندا کە دەمەوێ بچم و فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ بکەم.

دەرچووم تا بەلای چەند منداڵێکدا تێپەڕیم، لە بازاڕ یاریان دەکرد، لەپڕ پێغەمبەری خوا پشتی ملی گرتم.

سەیرم کرد پێدەکەنی و فەرمووی: **"ئەی ئونەیس [١] ئایا ئەو کارەت ئەنجامدا کە فەرمانم پێ کردبووی؟"**.

گوتم: بەڵێ وا دەچم ئەی پێغەمبەری خوا [٢].

**پێغەمبەر ﷺ زۆر لێبووردەبووە لەگەڵ خزمەتکارەکەی:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا هاتە مەدینە هیچ خزمەتکارێکی نەبوو، ئەبو تەڵحە دەستی منی گرت و بردمی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو ئەنەسە کوڕێکی زیرەکە، با خزمەتت بکات.

ئەنەس دەڵێت: لە سەفەردا و جگە لەسەفەریش هەر خزمەتم دەکرد [٣] (هەرگیز بە منی نەگوتەوە ئۆف).

هەر شتێکیشم ئەنجام بدابایە، هەرگیز نەیدەگوت بۆچی ئاوات کرد، ئەگەریش شتێکم ئەنجام نەدابایە هەرگیز نەیدەگوت بۆچی وەهات نەکرد؟

لە گێڕانەوەیەکی تردا: (هەر شتێکم واز لێبهێنایە نەیدەگوت: بۆچی وازت لێهێنا [٤])

---

[١] وەك دەربڕینی خۆشەویستی فەرموویەتی: (ئونەیس) کە بچوککراوەی (ئەنەسە) کە بەکوردی خۆمان دەگوترێت (ئەنەسۆکە)، بچوککردنەوەی ناو زۆرجار بۆ خۆشەویستی بەکاردێت. (و).

[٢] موسلیم (٢٣١٠) گێڕاوەتیەوە، پێشتر باسکراوە

[٣] لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: نۆ ساڵ، لە یەکێکی تردا دە ساڵ، ئەمەش وا هەڵگیراوە، کە ماوەکە نۆ ساڵ و چەند مانگێك بووە، هەندێك جار کەرتەکەی نەگوتووە و هەرندێك جاریش حیسابی کردووە (فتح الباری: ١٠/٤٦٠).

[٤] بوخاری (٢٧٦٨) و موسلیم (٢٣٠٩) گێڕاویانەتەوە.

بەڕاستی دە ساڵ ماوەیەکی درێژە، نە ڕۆژێکە و نە دووان، نە مانگێکە نە چەند مانگێك، مرۆڤ لەو تەمەندا بە چەندین گۆڕانکاریدا دەڕوات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشەدا ساتێك چییە گلەیی و گازندەی لێ نەکردووە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نیشاندانی ڕەوشتە نایابەکەی پێغەمبەر و نەرم و نیانی و لێبوردەییە زۆرەکەی.
- وازهێنان لە گلەیکردن لەو شتانەی ڕۆیشتوون، چونکە چارەسەری هەیە و دەکرێ سەر لەنوێ کارەکە بکاتەوە.
- دڵڕاگرتنی خزمەتکار بەوەی گلەیی لێنەکرێ، ئەمانە هەمووی لەو کاروبارانەن کە پەیوەندی بە لایەنی مرۆڤەوە هەیە، بەڵام ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە لایەنی شەرعییەوە هەیە، ئەوا لێبوردەیی بۆیان نانێردرێ، وەك لەبارەی فەرمان بە چاکە و قەدەغەی خراپەوە هەیە [1].

**بەرگری لە خزمەتکارەکەی دەکرد هەرچەند کەموکوڕیشی هەبوایە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دە ساڵان خزمەتی پێغەمبەری خوام کرد ﷺ هەر کەموکوڕییەکم لە ڕاپەڕاندنی کارەکان هەبوایە، هەرگیز گلەیی و گازندەی لێ نەدەکردم.

ئەگەریش لە ئەهل و بەیتی یەکێك گازندەی لێ بکردبام، ئەو دەیفەرموو: **"لێی گەڕێن، ئەگەر قەدەر وابووایە، کارەکە دەبوو [2]"**.

**فەرمانی دەکرد گەر کەسێك خزمەتکارێك یان بەندەیەکی لەلایە رای لێ نییە، ئەوا با لە کۆڵەخۆی بکاتەوە، ئەمەش نەوەکو ستەمی لێ بکات:**

ئەبو زەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەو بەندە و خزمەتکارانەی بە دڵتانە ئەوا لەوشتانە بیان دەنێ، کە خۆتان دەیخۆن و لەو شتە لەبەریان بکە کە خۆتان لەبەری دەکەن، ئەوانەشی بە دڵتان نین، بیانفرۆشن، دروستکراوی خوا ئازار مەدەن [3]"**.

---

[1] فتح الباری (١٠/٤٦٠)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/٧١).
[2] ئەحمەد (١٣٠٠٥)، ئەلبانی لە (صحیح الجامع/٥٢٧٥). بە "سەحیح"ی داناوە.
[3] ئەبو داود (٥١٦١) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٧/٢٣٥) بە "سەحیح"ی داناوە.

لەسەر ئەم فەرموودەیە، گەر کەسێك شوفێرێك یان خزمەتکارێکی هەیە، ڕای لێ نییە و لەگەڵی ناگونجێت، با دەستبەرداری بێت، نەوەك بکەوێتە ناو ئەوەی ستەمی لێ بکات و زیانی پێ بگەیەنێت.

**پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە خزمەتکارێکی نەداوە:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت هەرگیز پێغەمبەری ﷺ لە هیچ خزمەتکارێك و لەهیچ ئافرەتێك نەداوە، تەنانەت بە دەست لە هیچ کەسی نەداوە [١].

**لێدانیشی قەدەغەکرد:**

ئەبو مەسعودی بەدری ﵁ دەڵێت: بە قامچی لە خزمەتکارێکم دەدا، لە دواوە گوێم لە دەنگێك بوو دەیگوت: **"بزانەی ئەی ئەبو مەسعود"**، منیش چونکە توڕەبووم لە دەنگەکە تێنەگەیشتم.

دەڵێت: کاتێك لێم نزیك بووە بینیم ئەوە پێغەمبەری خوایە، دەیفەرموو: **"بزانە ئەی ئەبو مەسعود، بزانە ئەی ئەبو مەسعود"**.

منیش قامچییەکەم فڕێدا.

فەرمووی: **"ئەی ئەبو مەسعود خوا بە هێزترە لەسەر تۆ لەو هێزەی تۆ لەسەر ئەو خزمەتکارە هەتە"**.

گوتم: لەمە بەدواوە هەرگیز لە هیچ خزمەتکارێك نادەم [٢].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو لە پێناوی خودا ئازادە.

فەرمووی: **"گەر وات نەکردبایە، ئاگر پێت دەکەوتوو و دەیپێچایتەوە"**[٣].

النووی دەڵێت: ئەو فەرموودەیە هاندانی تێدایە بۆ نەرم مامەڵەکردن لەگەڵ بەندە و کەنیزە و خزمەتکار، بەکارهێنانی لێبوردەیی، شاردنەوەی توڕەیی، حوکم کردن لەگەڵی هەروەکو حوکمی خودا بۆسەر بەندەکانی [٤].

بەڕاستی نە ئازایەتییە و نە پیاوەتییە مرۆڤ ستەم لە خزمەتکار و کرێکار و ئەم جۆرە کەسانە بکا کە لەژێر دەستی دانە و بە زمان و دەستی ئازاریان بدا، یان لە ژێر ڕەحمەتی ئەو پێویستییانەی ئەوانی لە وڵاتی خۆیان هێناوەتە ئێرە سوکایەتیان پێ بکات، ئەگەر هێز و بازوو و دەسەڵاتت وای لێکردی ستەم لە خەڵکی بکەیت، ئەوا دەسەڵاتی خوای گەورە لەسەرت بە بیرە خۆت بێنەوە.

---

[١] موسلیم (٢٣٢٨) گێڕاوەتیەوە.

[٢] موسلیم (١٦٥٩) گێڕاوەتیەوە.

[٣] موسلیم (١٦٥٩) گێڕاوەتیەوە.

[٤] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/١٣٠).

بەڕاستی لە مامەڵەکردن لەگەڵ کرێکار و خزمەتکار و بێ هێزەکان، لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا ستەم گەیشتۆتە ترۆپك، وێنەکە دوورە لە دادگەری و مرۆڤایەتی، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەی ئازا و دلێر و پاڵەوان بووە، هەرگیز سوکایەتی بە کەس نەکردووە و لە کەسی نەداوە، مەگەر بە حەق نەبێ، خۆی زاڵ نەکردووە بەسەر ئەو بێ هێز و بێ چارانەی لە ژێر دەستی دابوونە وەك ئافرەت و خزمەتکارەکان.

**کەفارەتی لێدانی بەندەی کردۆتە ئازادکردنی:**

زازانی ئەبو عومەر دەڵێت: هاتمە لای ئیبن عومەر، کە بەندەیەکی ئازاد کردبوو، پارچە دارێك یان شتێکی لە زەوی هەڵگرتەوە، گوتی: پاداشتی ئازادکردنی ئەو بەندە بۆ من هەر بە ئەندازەی ئەوە بوو، بەڵام من گوێم لە پێغەمبەری خوابوو فەرمووی: **"ئەوەی لە بەندەکەی دا، با ئازادای بکات"**[(١)].

زانیان دەفەرموون: ئەوی لەم فەرمودەیدا وەردەگیرێت ئەوەیە، کە دەبێت بە نەرمی مامەڵە لەگەڵ ژێردەستەکان بکرێت و لێیان نەدرێت و ئازاریان لەسەر هەڵبگیرێت.

یەکدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە ئازادکردن بەم شێوەیە واجب نییە، بەڵکو سوننەتە، ئەمەش بەو هیوایەی گوناهەکەی نەمێنێت و ئەو ستەمەی لەسەر لابچێت[(٢)].

موعاویەی کوڕی سوەید دەڵێت: لە بەندەیەکی خۆم دا، ئینجا رامکرد، پاش نیوەڕۆ گەڕامەوە و نوێژم لە پشت باوکم کرد، باوکم من و ئەوی بانگ کرد وبە بەندەکەی گوت: تۆڵەی خۆتی لێ بکەوە.. بەڵام ئەو لێم خۆش بوو[(٣)].

پاشان گوتی: ئێمە وەکو کوڕانی موقرن لەسەردەمی پێغەمبەری خوا تەنیا یەك خزمەتکارمان هەبوو، جارێکیان یەکێکمان لێ دا، ئەمەیان بە پێغەمبەری خوا گەیاند، فەرمووی: **"رزگاری بکە"**.

گوتیان: تەنیا ئەو خزمەتکارەیان هەیە.

فەرمووی: **"با کاری پێ بکەن ئەگەر کاریان پێ نەما با رزگاری بکەن"**[(٤)].

کە گوتوویەتی: (تۆڵەی خۆتی لێ بکەوە)، ئەوا بۆ رازیکردنی دڵی خزمەتکارە لێدراوەکەیە، ئەگینا لێدان تۆڵە سەندنەوەی لەسەر نییە، بەڵکو ئەوەی پێویستە دەبێ تەمبێ بکرێ، بەڵام ئەم دەرفەتەی پێ بەخشی کە بتوانێ تۆڵەی لێ بکاتەوە.

---

(١) موسلیم (١٦٥٧) گێڕاویتیەوە.

(٢) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/١٢٧).

(٣) واتە: چی لێکردووی هەمان شتی لێ بکەوە.

(٤) موسلیم (١٦٥٨) گێڕاوەتیەوە.

ئەوەی لەم فەرموودەیەدا وەردەرگیرێت ئەوەیە: نەرمونیانی و بێ فیزی لەگەڵ خزمەتکار و بەندە بەکاربهێندرێ[١].

سەیر بکە: ئەمە لەلای کوڕەکە زانراوبووە گەر لە خزمەتکارەکەی بدا یان بە خراپ مامەڵەی لەگەڵ بکات باوکی لێی دەدا، بۆیە رای کردوو نەهاتەوە تا کاتی نوێژ نەبێت، بەڵکو ئەم کارە ببێتە مایەی تکا لای باوکی.

هیلالی کوڕی یەساف دەڵێت: پیرەمێردێك پەلەی کرد و لە خزمەتکارەکەی دا، سوەیدی کوڕی موقرن پێی گوت: هیچ جێگایەکت نەدیتەوە لێی بدەی تەنیا دەم و چاوی نەبێت؟ ئێمە لە کوڕانی موقرن حەوت کەس بووین، تەنیا یەك خزمەتکارمان هەبوو، ئەوەی لە هـەمووما‌ن بچوکتر بوو لە خزمەتکارەکەی دا، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین ررزگاری بکەین.[٢]

**دوایین وەسیەتی پێغەمبەر ﷺ پێش وەفاتی: وەسیەتکردن بوو بە نوێژ و خزمەتکار و بەندە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: وەسیەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لەوەفاتکردنی، کە غەرغەرەی دەکرد، فەرمووی: "**نوێژەکانتان، ئاگاتان لەو کەسانە بێت کە لەژێر دەستاندان**[٣]".

عەلی کوڕی ئەبوتالیب ﷺ دەڵێت: دواین فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو: "**نوێژەکانتان، نوێژەکانتان، لەخوا بترسن لەمەڕ ئەوانەی لە ژێر دەستاندان**[٤]".

"**لە خوا بترسن لەمەڕ ئەوانەی لە ژێر دەستاندان**"، مەبەستی پێیان چاکەکردنە لەگەڵ بەندەدا و سوککردنی کارەکانیانە، یان گوتراوە: مەبەستی زەکاتی دەستەکانە، کە دەبێ لێی دەربکرێ و بدرێتە ئەو کەسانەی شایستەن[٥].

ئەوەی زۆر دیارە لەمەڕ ئەوانەی لە ژێر دەستدان ئەوا بەندە و کەنیزە و خزمەتکارەکانن، بۆیە لەتەك نوێژ ناوی هێناون بۆ ئەوەی بزانرێ کە چۆن نوێژ واجبە ئەوهاش هەڵسان بەجێبەجێکردنی مافەکانیان واجبە، وەك ناندانیان و بەرگکردنیان، چۆن نوێژ نابێ وازی لێبهێندرێ ئاواش نابێت ئەو مافانە فەرامۆش بکرێن، هەندێك لە زانایان ئەو گیاندارانەش دەخەنە ناو ئەو بازنەیەیە کە لەژێر دەستی مرۆڤ دان[٦].

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/١٢٨).
[٢] موسلیم (١٦٥٨) گێڕاوەتیەوە.
[٣] ابن ماجة (٢٦٩٧) و گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ابن ماجة (٢١٨٣) بە "سەحیح"ی داناوە
[٤] ئەبو داود (٥١٥٦) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الادب المفرد/ ١١٨) بە "سەحیح"ی داناوە
[٥] النهایة (٤/٧٩٨).
[٦] عون المعبود (١٤/٤٤).

# بەشی سێیەم:

## مامەڵەکردنی پێغەمبەرﷺلەگەڵ چینە تایبەتەکانی ناو کۆمەڵگا

## بەشی سێیەم:

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ چەند چینێکی تایبەتی ناو کۆمەڵگا:

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاوەن پێداویستی تایبەت:

خوای پەروەردگار ﷻ دروستکراوەکانی خۆی دروستکردووە و لەمەڕ لاشە و ڕەنگ و توانستە جۆراوجۆرەکانیان جیاوازی خستۆتە نێوانیان، هەروەکو جیاوازی لە وێنە و شێوەیان دروستکردووە.

هی وایان تێدایە خوای گەورە بێ بەشی کردووە لە هەندێك نیعمەتی جەستەیی، کە داویەتی بە هەندێکی تر.

خەڵکانێکی زۆر دەچنە چوارچێوەی تاقیکراوەکان، وەك ئەو کەسەی چاوەکانی لە دەست داوە یان بیستن، یان ناتوانێت لایەکی جەستەی یان چەند لایەکی بجوڵێنێت.

یان ئەوەی بەشێکی لە ئەقڵی لە دەستداوە، وای لێکردووە بە مرۆڤێکی تەواو لە قەڵەم نەدرێت.

بەڕاستی کۆمەڵگا بەدەر نابێت لە کەسی نەخۆش و خاوەن پێداویستی تایبەت، بەڵای هەندێکیان سوکترە لە هەندێکی تر، چاولاوازی سوکترە لە کوێری، شەلەیی باشترە لە لەدەستدانی ئەندامێك، جا ئەوەی بەڵایەکەی سوکترە پەند وەردەگرێت لەوەی بەڵایەکەی توندترە، کەسی تەندروست باشیش پەند لە هەمووان وەردەگرێت.

پاشان هەر کەسێك لە ئێمە خوای گەورە بە چەند نیعمەت و بەخششێك بەهرەوەری کردووین، کە بەس خوا دەزانێ ژمەاریان چەندە، بۆیە سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو بار و شێوازێك، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴾ إبراهيم: ٣٤ واتە: (خۆ ئەگەر ناز و نیعمەت و بەخششەکانی خوا ژمارە بکەن، ناتوانن بیانژمێرن، بەڕاستی زۆربەی مرۆڤەکان زۆر ستەمکار و خوانەناس و سپڵەن).

هەتا ئەوانەی لەلایەن خوای گەورە توشی بەڵایەك بوونە و تاقیکراونەتەوە، ئەوا خوای گەورە بە شتێکی تر قەرەبوویان دەکاتەوە، بۆ نمونە نابیناکان زۆربەیان زیرەکی تیژ و لەبەرکردنێکی تۆکمە و گوێیەکی سوکیان هەیە.

**هەندێك لە کەسە نەزان و نەفامەکان دەڵێن گرینگیدان بەو کەسانەی خاوەن پێداویستی تایبەتن و چارەسەرکردنیان، سوودی چییە؟**

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەوە بیرکردنەوەی کەسانێکە کە باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی نەبێت، بیرکردنەوەی کەسانێکە چاوەڕێی هیچ نییە لە خوای پەروەردگار، بەڵکو ئەمە بیری کەسانێکە دوورن لە مرۆڤایەتی!

ئەوانەی بڕوایان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هەیە، دەزانن کە بوونی خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان لە نێوانمان، چەند حیکمەت و وانە و ئامۆژگاریەکی تێدایە، کە هەم سوودی بۆ خودی کەسە تاقیکراوەکە هەیە، هەم بۆ کەسە ساغەکەش.

بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێشەنگێکی نمونەییە، مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت کردووە.

### لەسەر ئارامگرتن هانیدەدان و مژدەی بەهەشتی پێ دەدان:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: **"خوای پەروەردگار ﷻ دەفەرموێت: گەر بەندەکەم بە لەدەستدانی هەردوو خۆشەویستەکەی (دوو چاوەکانی) تاقیکردەوە، پاشان ئارامی لەسەر گرت، ئەوە هەر بە چوونە بەهەشت پاداشتی دەدەمەوە"**[(1)].

چاوەکان خۆشەویسترین ئەندامن لای مرۆڤ، چونکە بە لەدەستدانیان خاوەنەکەیان خەمێکی زۆر دەخوات لەسەر بێ بەشبوونی بینینی ئەو شتە باشانەی دڵخۆشی دەکەن، یان بینینی شتی خراپ بۆ ئەوەی لێیان دووربکەوێتەوە.

لە گێڕانەوەیەکی تری فەرموودەکەدا هاتووە: **"ئەوەی هەر دوو خۆشەویستەکەم لێ سەندەوە و ئارامی گرت و چاوەڕێی پاداشتی کرد، ئەوا نزمتر لە بەهەشتی پێ نادەم"**[(2)].

مەبەستیش لەو ئارامییە ئەوەیە کە هەردەم لە خولیایدا بێت کە خوای میهرەبان پاداشتی دەداتەوە، نەك تەنیا ئارامییەکی ڕووت بێ نیەتی چاوەڕێی پاداشت.

تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکەی لە دونیادا مانای ئەوە نییە خوای گەورە ڕقی لێدەبێتەوە، بەڵکو ئەمەیان بۆ لابردنی ناخۆشیەکە کە لەسەری بووە یان بۆ سڕینەوەی گوناهە یان بۆ بەرزکردنەوەی پلەیەتی.

---

(1) بوخاری (٥٢٢١) گێڕاوەتیەوە.

(2) ترمذي (٢٣٢٥) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٨١٤٠) بە "سەحیح"ی داناوە.

ئەگەر بە رازیبوون و سینگفراوانییەوە پێشوازی لێکرد، دەگاتە مەبەستی خۆی، ئەگینا وەکو ئەوە لێ دێت کە لە فەرموودەی سەلماندا هاتووە **"بەڕاستی خوای گەورە نەخۆشکەوتنی باوەڕدار دەگێڕێت بە سڕینەوەی گوناهەکانی، نەخۆشکەوتنی خەڵکی گوناهباریش وەکو وشترێکە خاوەنەکەی بەستبێتیەوە پاشان بەڕەڵای بکات، نازانێ بۆ بەستراوەتەوە و بۆ چی بەڕەڵلا کراوە"**[1].

کە فەرمووی: **"بە بەهەشت پاداشتی دەدەمەوە"** ئەمە باشترین پاداشتدانەوە و قەرەبووکردنەوەیە، چونکە چێژوەرگرتن بە نەمانی دونیا دەڕوا، بەڵام چێژوەرگرتنی بەهەشت هەتا هەتاییە.

ئەمەش گشتگیرە بۆ هەموو کەسێك کە تووشی تاقیکردنەوە بێت بەو مەرجانەی باسکران[2].

ئیبن بەتاڵ دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئارامگرتن لەسەر بەلایەکان پاداشتەکەی بەهەشتە.

نیعمەتی بینین بۆ بەندە ئەگەرچی لەهەرە نیعمەتە گەورەکانی خوایە، بەڵام قەرەبووکردنەوەی بە بەهشت باشترە لەوەی لە دونیا هەیەتی، ئەمەش لەبەر ئەوەیە ماوەی چێژوەرگرتنی لە دونیا کاتییە و کۆتایی پێ دێت، بەڵام چێژوەرگرتنی لە بەهەشت کۆتایی پێ نایەت[3].

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"لە ڕۆژی دواییدا کەسە ساغەکان کاتێك پاداشتی ئەهلی بەلا دەبینن ئاوات دەخوازن کە پێستەکانیان لە دونیا بە گاز لێکرابایەوە"**[4].

## پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ دەکردن:

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بچوبایە لای نەخۆشێك یان نەخۆشێکیان هێنابە لای ئەم دوعایەی دەیفەرموو: **"أذهب البأس، ربَّ النَّاس، اشفِ وأنتَ الشافي، لا شفاءَ إلا شفاؤك، شفاءً لا يُغادر سَقماً"**.[5]

---

[1] بوخاری (الادب المفرد ٧٣٩) بە "موقوف" گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الادب المفرد/ ٣٧٩) بە "سەحیح"ی داناوە

[2] فتح الباری (١١٦/١٠).

[3] شرحی ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (٣٧٧/٩).

[4] ترمذي (٢٤٠٢) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٨١٧٧) بە "سەحیح"ی داناوە.

[5] بوخاری (٥٦٧٥) و موسلیم (٢١٩١) گێراویانەتەوە.

**واتە: ئەی پەروەردگاری خەڵك ئەم نەخۆشییە لاببە، شیفا بنێرە، هەر تـۆ شیفادەری، هیچ شیفایەك جگە لە شیفای تۆ بوونی نییە، شیفایەك بێت هیچ نەخۆشییەك باز نەدات.**

**سوودێك:**

**ابن حجر دەڵێت: ئیشکالێك لە هەیە لە دوعاکردن بۆ نەخۆش و چاکبوونەوەی... دەگوترێت مادام نەخۆشی کەفارەتی گوناهەکانە و پاداشتی پێ زیاد دەبێت، هەروەکو لە چەندین فەرموودەدا هاتووە، ئەی دوعاکردن بۆ چاکبوونەوەی بۆ؟**

لەوەڵامدا دەڵێین: **دوعاکردن عیبادەتە، هەرگیز پێچەوانەوەی پاداشت و کەفارەت نییە، چونکە ئەم دووانە لەگەڵ سەرەتایی هاتنی نەخۆشییەکە و ئارامگرتن لەسەری بەدەست دێن.**

**دوعاخواز لە نێوان دوو چاکەیە، یان ئەوەی دەیەوێت بە دەستی دێنێت، یان قەرەبوو دەکرێتە بە پێبەخشینی سوودێك یان رەتکردنەوەی ناخۆشییەك لەسەری، هەموو ئەمانەش لە چاکە و فەزڵی پەروەردگارە [1].**

**عەتائی کوڕی ئەبی رەباح دەڵێت: ئیبن عەباس پێی گوتم: ئایا ئافرەتێکی ئەهلی بەهشتت پێ نیشان بدەم؟**

**گوتم: بەڵێ.**

**گوتی: ئەو ئافرەتە هاتە لای پێغەمبەری و گوتی: من توشی پەرکەم دەبم. لەگەڵیشدا عەورەتم دەردەکەوێت، داوای چاکبوونەوەم لە خودا بۆ بکە!**

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "گەر دەتەوێ ئارام بگرە دەچیتە بەهەشت، ئەگەریش دەتەوێ داوا لە خوا دەکەم چاکت بکاتەوە".**

**گوتی: ئارام دەگرم.**

**پاشان گوتی: من عەورەتم دەردەکەوێت، داوا لە خوا بکە عەورەتم بە دیار نەکەوێت، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کرد [2].**

**کە گوتی: (توشی پەرکەم دەبم) پەرکەم دوو جۆری هەیە، یەکەمیان: لە کەموکوڕی کارەبایی دەماغ سەرهەڵدەدات، چەند هۆکارێکی هەیە، هەندێکیان زانراون هەندێکیان نەزانراو.**

---

[1] فتح الباری (١٠/١٣٢).

[2] بوخاری (٥٦٥٢) و موسلیم (٢٥٧٦) گێراویانەتەوە.

دووەم: هۆکارەکەی جنۆکەیە، کە وا لە مرۆڤ دەکات توشی پەرەکەم بێت، جا هەڵیدەستێنێتەوە و دایدەنیشێنێت و فڕێی دەدات و دەکەوێتە خوارەوە، ئەمە جگە لە چەند بارێکی سەیروسەمەرە.

گوتی: (من عەورەتم دەردەکەوێت): زۆر گرانە لەسەر نەفسی ئافرەت عەورەتی دەربکەوێت لەناو پیاوی بێگانە، چونکە لەوانەیە لە ڕێگا یان لە بازاڕ یان لەهەر شوێنێك توشی پەرکەم بێت، ئەو کەسەی توشی پەرکەم دەبێت ناتوانێ کات و شوێنی پەرکەمەکە دیاری بکات، خۆی پێ کۆنترۆڵ ناکرێ.

ئەو لەسەر ناخۆشییەکانی پەرکەمەکە ئارام دەگرێت، بەڵام ئارام ناگرێت لەسەر دەرکەوتنی عەورەتی، لەگەڵ ئەوەی عوزریشی هەیە، چونکە پەرکەم لە دەست ئەو دانییە، ئای چەندە بە شەرم و حیشمەت بووە!

گوتی: (ئارام دەگرم) ئەو دوو بژاردەی لەبەردەم بوو:

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ بکات و چاك ببێتەوە.

**دووەم:** ئارام بگرێت و بەهەشتی بە نیسب بێت.

جا مانەوەی نەخۆشییەکەی هەڵبژارد، بێ بیر لێکردنەوە و هەر بە سەلیقە و سروشتە پاکەکەی ئەو هەڵبژاردنەی کرد، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەهێزی باوەڕی و حەزکردنی بەو شتانەی لەلای خوا هەن.

ئەمە پێچەوانەی هەندێك خەڵکە، کە ئەگەر باس نیعمەت و خۆشییەکانی بەهەشتی بۆ بکرێ وەکو بڵێی بۆ ئەو باس ناکرێ و پەیوەندی بەو نییە و گرنگی پێ نادات..

ئیبن حەجەر دەڵێت: لەو فەرموودەیەدا گەورەیی و پاداشتی ئەو کەسەی تێدایە کە توشی پەرکەم دەبێت، ئارامگرتن لەسەر بەلاکانی دونیا بەهەشت دابین دەکات، وەرگرتنی ئازار و ناخۆشی باشترە لە وەرگرتنی روخسەت، ئەمە بۆ کەسێك کە زانی پێی دەکرێت و هێزی هەیە و چۆك نادات بەرامبەر وەرگرتنی ئەم ئازارە.

هەروەها چارەسەری بە دوعا و گەڕانەوە بۆ لای خوا زۆر کاریگەرترە لە چارەسەکردن بە دەرمان و دەرزی، هەڵچوونی جەستە بە دوعا باشترە لە وەرگرتنی دەرمان بەڵام بە دوو مەرج کارەکە سەر دەگرێ:

یەکەم: کەسە نەخۆشەکە نیازێکی ڕاست و دروستی هەبێت.

دووەم: کەسی چارەسەرکەر، هێزی رووتێکردنی بە پەروەردگار هەبێت، هێزی دڵی بە تەقوا و پشت بەستنی بەو زاتە پتەوبێت، خواش زاناترە [1].

عوسمانی کوڕی حەنیف ﷺ دەڵێت: پیاوێکی نابینا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: داوا لە خوا بکە چاکم بکاتەوە.

فەرمووی: **"ئەگەر دەتەوێ دوعات بۆ دەکەم، ئەگەریش نا ئارام بگرە، ئەمە باشترە بۆت"**.

گوتی: دوعام بۆ بکە.

دەڵێت: جا فەرمانی پێکرد دەستنوێژێك بگرێت و ئەم دوعایە بکات:

**"اللهم إني أسألك، وأتوَجَّهُ إليك بنبيِّك محمد نبيِّ الرحمة، إني توجَّهتُ بك إلى ربي في حاجتي هذه، لتقضي لي، اللهمَّ فشفِّعهُ فيَّ [2]"**

واتە: پەروەردگارا، لێت دەپاڕێمەوە، رووت تێدەکەم بە دوعا و تکای موحەممەدی پێغەمبەرە رەحمەتەکەت، من بۆ ئەم داوایە بە هۆی تۆوە روو لە پەروەردگار دەکەم، تا بۆمی جێبەجێ بکات، پەروەردگارا تکای ئەو بۆ من قبوڵ بکە.

**ئاگادارییەك:**

ئەم فەرموودەیە مانای ئەوەی تێدا نییە تەوەسول بە خودی پێغەمبەر بکرێت، بەڵکو تەوەسول بە دوعاکەی، شێخ الاسلام ابن تیمیە دەڵێت: ئەو نابینایە داوای لە پێغەمبەر کرد دوعای بۆ بکات، بە هەمان شێوەی هاوەڵەکان کە داوایان لێکردووە دوعا بکات بارانیان بۆ ببارێت، کە فەرموویەتی: **"وأتوَجَّهُ إليك بنبيِّك محمد نبيِّ الرحمة"**واتە رووت تێدەکەم بە دوعا و تکای موحەممەد، بۆیە لە کۆتایی فەرموودەکەدا هاتووە " **فشفِّعهُ فيَّ** " واتە تکاکەی بۆ من قبوڵ بکە [3].

**پێغەمبەر ﷺ رەچاوی هەست و سۆزی دەکردن و وشەی جوانی بۆ ناونانی هەڵدەبژاردن:**

جابیر کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"وەرن با بڕۆین لای ئەو بینەرەی لە (بەنی واقیفە)"**. کە پیاوێکی نابینا بوو [4].

سوفیان دەڵێت: بەنی واقیف گەڕەکێکی ئەنسارییەکان بوو [5].

---

[1] فتح الباري (١٠/١١٥).

[2] ترمذي (٣٥٧٨) وابن ماجة (١٣٨٥) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٨١٤٠) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة (٢/٣٠٠).

[4] البيقهي لە (الكبرى ٢١٣٧٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة/٥٢١) بە "سەحیح"ی داناوە.

[5] شعب الايمان (٩١٩٤).

پێغەمبەر ﷺ وشەیەکی جوانی هەڵبژارد و هەستی بریندار نەکرد.

**نهێنی ناوناوی کوێر بە بینەر:** تەحاوی دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا رامان بۆ ئەوەی لەسەر ئەو مانایەی پێغەمبەری خوا بوەستین، کە ناوی نا بە پیاوی بینەر، لە راستیشدا کوێر بوو نەیدەبینی، خوای گەورە لە کتێبکەی خۆی ناویّ کوێری هێناوە هەروەکو دەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ﴾ النور: ٦١ هەروەها دەفەرموێت: ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ ۝١ أَن جَاءَهُ الْأَعْمَىٰ﴾ عبس: ١- ٢ بینیمان کە خوای گەورە وشەی کوێری بەکارهێناوە بۆ جگە لەو مانایەش، هەروەکو دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ﴾ الحج: ٤٦ ئەمەش ئەوە دەگەینێت کە جاری وا هەیە کوێر پێی دەگوترێت بینەر، چونکە دڵی زیندووە و بە دڵ دەبینێت، ئەگەرچی بە چاو نابینێت.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە بەو ئەو کەسەی کوێرە بگوترێت بینەر، واتە دروستە بەو بینینە وەسف بکرێت کە لە دڵیدایە. پێغەمبەر ﷺ باسی ئەو پیاوەی کرد بە یەکێك لەو دوو شتە باشەکەی کە هەیەتی، گەرچی دەیتوانی بەوتریش ناوی ببردبا [(١)].

هەر نزیك لەمە: ناونانی ئەو کەسەی مار پێوەداوە بە "سەلامەت"، ئەمەش وەك بەخشینی گەشبینی بەچاك بوونەوە [(٢)].

هەروەها ناونانی بیابان بەسەرفرازی گەرچی شوێنی لەناوچوونە، ئەمەش وەك گەشبینییەك بۆ خاوەنەکی بەسەرفرازی و رزگاربوون [(٣)].

**بەردەوام هەوڵی دەدا ورەیان بەرز بکاتەوە، هەروەها بۆی روون دەکردنەوە کە جەستە پێوەری باشە نییە لە نێوان مرۆڤەکان:**

جارێکیان ئیبن مەسعود ﷺ دار سیواکی لەسەر درەختی (ئەراك) لێکردەوە، ئەو قاچەکانی زۆر باریك بوون، با قاچەکانی بە دەرخستن، خەڵکەکەش دەستیان کردە پێکەنین.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بە چ پێ دەکەنن؟"**.

گوتیان، ئەی پێغەمبەری خوا بە قاچە باریکەکانی پێدەکەنین.

---

(١) شرح مشكل الآثار (١٠/٢١٩).

(٢) الاشتقاق لابن دريد (١/٣٦).

(٣) سەیری: الزاهر في معاني كلمات الناس (١/٣٣١)ی ابن الانباری بکە.

فەرمووی: "**سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، قاچەکانی لەناو تەرازوو زۆر قورسترە لە کێوی ئوحد**"[١].

لاوازی و باریکی زیان بە عەبدوڵڵا ناگەیەنێت، خاوەنی ئەو دوو قاچە چەند چاکەیەکی هەیە، کە تای تەرازووەکەی قورس دەکەن، ئەو دوو شتی لەخۆ کۆکردبووە، **یەکەمیان:** ڕەوشتبەری، **دووەمیان:** دڵسۆزی.

عەبدولڕەحمانی کوڕی زەید دەڵێت: پرسیارمان لە حوزەیفەی یەمانی کرد کە چ پیاوێك لە ڕووی ڕەوشتەوە لە پێغەمبەری خوا دەچێت، بۆ ئەوەی شتی لێ وەربگرین.

گوتی: کەسێك نادۆزمەوە لەو بچێت لە ڕووی ڕەوشت و سیفات و ملکەچییەوە، تەنیا ئیبن ئوم عەبد نەبێت[٢]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود.

لە گێڕانەوەیەکی دی حوزەیفە دەڵێت: لە ڕووی ڕەوشت و سوننەت و ملکەچییەوە ئیبن مەسعود زۆر بە پێغەمبەری خوا دەچوو، هەتا لە ماڵی خۆشیدا خۆی لە ئێمە دەشاردەوە.

هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ دەیانزانی کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لە هەمووان زیاتر لە خوا نزیکە[٣].

پێوەری ڕاستیش لەلای خوا بە شێوە و شاکار نییە، بەڵکو بە دڵێکی بێگەرد و دڵسۆز و کردارە.

ئیبن مەسعود پیاوێکی لاواز و باریك بوو.

زەیدی کوڕی وەهب دەڵێت: من لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا دانیشتبووم، لەو دەمە ئیبن مەسعود هات، دانیشتوان لەبەر بچوکیەوە خەریك بوو بزریان دەکرد، عومەر کاتێك بینی کەوتە پێکەنین.

جا عومەر کە لەسەری وەستابوو، دەستی بە قسەکرد لەگەڵیدا، دەموچاوی دەگاشەیەوە، بە پێکەنینی دەخست، پاشان ڕۆیشت، عومەر چاوەکانی لەسەر هەڵنەبری تا بزر بوو، پاشان گوتی: ئەمە دۆڵێکە پڕە لە زانست[٤].

---

[١] ئەحمەد (٣٩٨١) ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٧٥٠) بە "سەحیح"ی داناوە.
[٢] بوخاری (٢٧٦٣) گێڕاوەتیەوە.
[٣] ترمذي (٣٨٠٧) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ٧٠٢٣) بە "سەحیح"ی داناوە
[٤] سير أعلام النبلاء (٤٣٦/١).

## سەردانی دەکردن و وەڵامی داواکانیانی دەدانەوە:

مەحمودی کوڕی ڕەبیعی ئەنساری دەگێڕێتەوە کە عەتبانی کوڕی مالیك، لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو، یەکێك بوو لەو ئەنسارییانەی بەشداری شەڕی بەدریان کردبوو، هاتە لای پێغەمبەر و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نابینام، پێش نوێژی بۆ قەومەکەم دەکەم، ئەگەر باران ببارێت ئەو دۆڵەی لە نێوانماندایە پڕ ئاو دەبێت، ناتوانم بچم بۆ مزگەوتەکەیان بۆ ئەوەی نوێژیان بۆ بکەم، دەمەوێت ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بێیتە ماڵەکەم و نوێژ بکەیت و ماڵەکەشم بکەمە جێگای نوێژکردن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"إن شاء الله وا دەکەم"**.

عەتبان دەڵێت: بۆ بەیانی کاتێك ڕۆژ بەرزبووە پێغەمبەری خوا و ئەبوبەکر ڕۆیشتن (موسلیم لە ریوایەتێکدا ئەوەی زیاد کردووە: ئەوەی خوا بیەوێت لەهاوەڵەکان لە گەڵیان بوو).

پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی خواست، منیش مۆڵەتم پێدا، دانەنیشت هەتا چووە ژوورەوە، پاشان فەرمووی: **"لە کوێی ماڵەکەت حەز دەکەیت نوێژ بکەم"**.

دەڵێت: ئاماژەی لایەکی ماڵەکەم بۆ کرد، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا و الله أکبری کرد، ئێمەش هەڵساین و لەدوای ریزمان بەست، دوو رکات نوێژی بۆ کردین، پاشان سەلامی دایەوە.

جا ئیزنمان نەدا و خواردنێکمان [1] بۆ دروستکرد.

دەڵێت: لەو کاتەدا چەند پیاوێکی ماڵەکە گەڕانەوە و کۆبوونەوە و گوتیان: کوا مالیکی کوڕی دوخەیشن، یان کوڕی دوخەیشن لە کوێیە؟

هەندێکیان گوتیان: ئەوە دووڕووە و خوا و پێغەمبەری خۆش ناوێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"وامەڵێ، ئایا نابینیت کە دەڵێت: لا إله إلا الله؟ کە مەبەست پێی رازیکردنی خودایە"**.

گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

گوتی: ئێمە وای دەبینن ئەو بۆلای دووڕووەکان دەچێت و بۆ ئەوان دڵسۆزە.

---

[1] ئە خواردنە ناوی (خەزیرە) بوو، خەزیرە جۆرێکە لە خواردن. ابن قتیبە دەڵێت: لە گۆشت دروست دەکرێت، پارچەی پارچەی بچوك دەکرێت و پاشان ئاوێکی زۆر بەسەردا دەکرێت، ئەگەر پێگەیشت و کوڵا ئارادی بەسەردا دەکرێت و پێی دەگوترێت (خەزیرە)، بەڵام ئەگەر گۆشتی لەگەڵ نەبوو ئەوا پێی دەگوترێت (عەصیدە). فتح الباری (١/٥٢١).

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڕاستی خوای گەورە ئاگری حەرام کردووە لەسەر کەسێك بڵێت لا إله إلا الله کە مەبەستی پێی ڕازیکردنی خودا بێت[1]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دروستە نابینا پێشنوێژی بکات.
- دروستە مرۆڤ هەواڵ لە بارەی خۆیەوە بدات، کە چییەتی، بەڵام بەبێ دەربڕینی گلەیی.
- چەند مزگەوتێك لە مەدینەدا هەبوونە بۆ کردنی نوێژی بە کۆمەڵ، جگە لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ
- باران و تاریکی عوزرن بۆ نەهاتنی نوێژی بە کۆمەڵ.
- کەسی زۆرباش وەڵامی بانگهێشت (دەعوەت)ی کەسی باش دەداتەوە.
- بۆهێنانەدی بەڵێن (إن شاء الله) بەکاربهێندرێت.
- هێنانەدی بەڵێن.
- شوێنێك لە ماڵ بۆ نوێژکردن دیاری بکرێت، نەك بکرێتە وەقف یا ناوی مزگەوتیشی لێ بندرێ.
- کردنی نوێژی سوننەت بە کۆمەڵ (جاروبار).
- بردنی هەندێك خەڵك لەلایەن سەردانیکار، گەر بزانێت کەسی بانگهێشتکەر پێی ناخۆش نییە.
- میوان نابێت پێش نوێژی بکات، بەڵام ئەگەر میوانەکە ئیمامی هەرە گەورە بوو یان خاوەنماڵ مۆڵەتی دا پێش نوێژی بکات ئەوا دروستە.
- خەڵکی ناوچەکە لەسەر پێشەوا یان زانا کۆك بن بۆ ئەوەی سوودی لێ ببینن، ئەگەر سەردانی ماڵی یەکێکیان کرد.
- پرسیارکردن لەبارەی کەسێك بێ عوزر نەهاتووە بۆ نوێژی بە کۆمەڵ.
- وتنی لا إله إلا الله بە بێ جێگیربوونی لەناو دڵ سوودی نییە.
- ئەو کەسەی لەسەر یەکتاپەرستی دەمرێت، بە هەتا هەتایی لەناو ئاگر نامێنێتەوە.
- ئەو کاروکردەوانەی تەنیا مەبەست پێیان ڕەزامەندی خوای پەروەردگار بێت، ئەوا دەبنە هۆی ڕزگاربوونی خاوەنەکەی گەر خوای میهرەبان وەریان بگرێت.

---

[1] بوخاری (٤١٥) و موسلیم (١٠٥٢) گێڕاویانەتەوە.

● ئەو کەسەی دووڕوویی دەخاتە پاڵ کەسێك، کە بەڕواڵەت ئیسلام نیشان دەدات بە بەڵگە، نە بە کافر نە فاسق دانانـدرێت، بەڵکو بەهۆی ئەو تەئویلەوە عوزری بۆ دەهێندرێتەوە [1].

**سودێك:**

دیاریکردنی شوێنێك لە ماڵەوە بۆ نوێژکردن ئایا پێچەوانەی فەرموودەی **عەبدولرەحمانی کوڕی شیبلە** ﷺ کە دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ **سێ شتی لێ قەدەغە کردین: قەدەغەی کرد لە نوێژکردنـدا وەك قەلەڕەش دەنوك لە زەوی بدەین، قەدەغەی کرد لەناو نوێژدا وەك گیاندار پاڵ بکەوی، قەدەغەی کرد پیاوێك شوێنێك بۆ نوێژکردن دیاری بکات هەوەکو بۆ وشتر جێگا دیاری دەکرێت** [2].

**وەڵام:** هیچ جۆرە پێچەوانەیەك لە نێوانیاندا نییە، دیاریکردنی جێگایەك لە ماڵ بۆ نوێژکردن دروستە، بەڵام لەناو مزگەوتدا شوێنێکی تایبەت دابندرێت بۆ نوێژکردن ئەمەیان دروست نییە، چونکە مزگەوت موڵکی خودایە و موڵکی هیچ کەسێك نییە.

پاشان ئەمە دەبێتە هۆی چەند گرفتێك، چونکە ئەو کەسەی شوێنێکی دیاری کراو بۆ خۆی لە مزگەوت تەرخان دەکات، ئەوا ئەگەر یەکێکی تر پێش ئەو هاتە ئەو شوێنە ئەوا توڕە دەبێت و لەوانەیە دەمەقاڵێیان لە نێواندا رووبدات و دەنگیان لەناو مزگەوت بەرز ببێتەوە، یان لەوانەیە لە کۆتاییدا لەیەکتریش بدەن!

### هەرچی خێر و باشی هەبووایە، پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانی دەدان:

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێکی نابینا (کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم بووە) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و گوتی: من کەسم نییە بمهێنێتە مزگەوت، داوای لە پێغەمبەری خوا کرد رێگەی پێ بدات لە ماڵەوە نوێژ بکات.

ئەویش رێگەی پێدا.

کاتێك رۆیشت، بانگی کردەوە، فەرمووی: **"ئایا گوێت لە بانگ دەبێت؟"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"کەواتە وەڵامی بدەرەوە"** [3].

---

[1] سەیری: فتح الباری (٥٢٣/١) بکە.

[2] ئەبو داود (٨٦٢) و النسائي (١١١٢) و ابن ماجة (١٤٢٩) گێڕاویانەتەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ١١٦٨) بە "حەسەن"ی داناوە

[3] موسلیم (٦٥٣) گێڕاوەتیەوە.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە بۆ واجبوونی نوێژی بە کۆمەڵ، چونکە گەر سوننەت بوایە، ڕێگەپێدان بۆ کەسی لاواز و خاوەن عوزر دەبوو، یان ئەوانەی وەکو کوڕی ئوم مەکتوم عوزریان هەیە [(١)].

ئیبن ڕەجەب دەڵێت: لەلای هەندێك ئیشکال دروست بووە لە نێوان فەرموودەی کوڕی ئوم مەکتوم و فەرمودەی عەتبانی کوڕی مالیك، کە ڕێگەی بە عوتباندا نوێژ لە ماڵەوە بکات بەڵام ڕێگەی بە کوڕی ئوم مەکتوم نەدا؟

دەگوترێت: ماڵی کوڕی ئوم مەکتوم نزیك بووە لە مزگەوت، بە پێچەوانەی عوتبان، هەر بۆیە لە هەندێك ڕێگەی گێڕانەوەی فەرموودەکەدا هاتووە، کە کوڕی ئوم مەکتوم گوێی لە قامەت دەبوو.

لەوانەشە عوتبان شوێنی نوێژکردنی پێغەمبەری لەم ماڵەکەی خۆی کردبێتە مزگەوت و بانگی لێدابێت و قامەتی تێدا کردبێت، پێش نوێژی بۆ ئەندامانی ماڵەکەی و بۆ ئەوانەی نزیك ماڵەکەی بوونە کردبێت، ئەو کات وا حیساب دەکرێت نوێژەکەی لە مزگەوت ئەنجام داوە، جا چ مزگەوتی کۆمەڵ بێت، یان ماڵێك کرابێتە مزگەوت و ببوێتە شوێنی نوێژی بە کۆمەڵ.

سەبارەت بە کوڕی ئوم مەکتوم مۆڵەتی لە پێغەمبەر خواست بە تەنیا لە ماڵەوە نوێژ بکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی پێ نەدا، ئەمە نزیکترین کۆکردنەوەیە لە نێوان هەردوو فەرموودەکەدا [(٢)]، خواش زاناترە.

هەروەها پەڕینەوەی عوتبان لە دۆڵەکە کە کەم بینا بوو، ئەوا بە کارێکی ئەستەم دادەندرێت، بەڵکو هەر نەدەکرا لەو دۆڵە پڕ ئاوەدا بپەڕێتەوە، بە پێچەوانەی حاڵی کوڕی ئوم مەکتوم، کە هاتنی بۆ مزگەوت ئاسانتر بوو.

## پێغەمبەر ﷺ پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکردن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئافرەتێك هەندێك کەموکوڕی لە عەقڵیدا هەبوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کارێکم بە تۆ هەیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**ئەی دایکی فڵان، سەیرکە چ ڕێگایەك هەڵدەبژێری تا پێداویستییەکەت تیایدا بۆ جێبەجێ بکەم**"، جا بە تەنیا لە ڕێگایەکدا لەگەڵی ڕۆیشت تا پێداویستییەکەی بۆ جێبەجێ کرد [(٣)].

---

(١) عون المعبود (٢/٢٥٧).

(٢) فتح الباری(٢/٣٩٢) لابن الباری.

(٣) موسلیم (٢٢٣٦) گێڕاوەتیەوە.

**النووی دەڵێت: (بە تەنیا لە ڕێگایەکدا لەگەڵی ڕۆیشت): واتە لە ڕێگەیەکی گشتیدا لەگەڵی وەستا، تا پێویستییەکانی بۆ جێبەجێ بکات و لەو تەنیایەدا پرسیاری لێ بکات.**

**وە نەبێت ئەمە بە خەلوە (تەنیایی) حیساب بکرێت، کە حەرامە و پێی دەگوترێت (تەنیابوون لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەم)، بەڵکو ئەم ڕێگایە ڕێگای هامۆشۆی خەڵك بووە و قەرەباڵغ بووە، ئەوان خەڵکیان دەدیت و خەڵکیش ئەوانی دەدیت، بەڵام گوێیان لە دەنگیان نەدەبوو، چونکە بابەتەکەی تایبەت بووە [1].**

**ئەمەش یەکێکە لە نەرمونیانی و ملکەچی پێغەمبەر ﷺ و ئارامگرتنی لەسەر پێداویستییەکانی کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت.**

## خوای گەورە گلەیی لە پێغەمبەر ﷺ کرد کاتێك پشتی لە پیاوە نابیناکە کرد:

**زۆرێك لە ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز باسیان کردەوە کە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ گفتوگۆی لەگەڵ چەند بەرپرسێکی قورەیشدا دەکرد و ئارەزووی دەکرد موسڵمان بوونایە، جا کاتێك ئەو سەرقاڵی قسەکردن بوو لەگەڵیاندا، کوڕی ئوم مەکتوم هات -کە دەمێك بوو موسڵمان ببوو- پرسیای لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد لە بارەی شتێك، زۆر موکڕ بوو لەسەر داواکەی، پێغەمبەریش ﷺ حەزی لێنەبوو لەو کاتە بپچڕێت و وەڵامی بداتەوە، چونکە خەریکی قسەکردن بوو لەگەڵ قورەیشییەکان، بۆیە خۆی بە ڕووی کوڕی ئوم مەکتومدا گرژ کرد و پشتی تێکرد و ڕووی لە قورەیشییەکان کرد.**

**ئینجا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتانەی دابەزاند:** ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ٢ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ﴾ عبس: ١-٣ **واتە ئەو ڕوی گرژ کرد و پشتی لە نابیناکە کرد کە بۆ لای هات، جا تۆ چوزانی بەڵکو هاتبێت دڵ و دەروونی پاك بکاتەوە.**

﴿أَوۡ يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ﴾ **واتە: یاخود ئامۆژگارییەك وەربگرێت و ئەو ئامۆژگاریە سودی پێ بگەیەنێت.**

﴿أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ٥ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ﴾ **واتە: بەڵام ئەوەی خۆی بێ نیاز نیشان دەدات و نایەوێت ڕێنوێی وەربگرێت، تۆ لەگەڵ ئەو کۆدەبیتەوە و گرنگی بەو دەدەیت.**

﴿وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ﴾ **واتە: جا تۆ هیچت لەسەر نییە گەر ئەو ئیمان نەهێنێت و خۆی پاك نەکاتەوە.**

---

[1] **شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/٨٣).**

﴿وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسْعَىٰ ۝٨ وَهُوَ يَخْشَىٰ﴾ واتە: بەڵام ئەوەی خۆی هاتۆتە لات و کۆشش دەکات تا شارەزای بێت لە ئایینی خوا.

﴿فَأَنتَ عَنْهُ تَلَهَّىٰ﴾ واتە: خۆتی لێ بێ ئاگا دەکەیت.

هەر لێرەوە خوای گەورە ﷻ فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە کەس بە بانگەواز و ئاگادارکردنەوە تایبەت نەکات. بەڵکو جیاوازی نەکات لە نێوان کەسی گەورە و بچوك و هەژار و دەوڵەمەند و پادشا و گەدا و پیاو و ژن.

پاشان خوای گەورە ﷻ بە ویستی خۆی ڕێنمویی ئەو کەسانە دەکات بۆ ڕێگا ڕاستەکەی، لەمەشدا حیکمەتێکی گەورە هەیە [(١)].

جا دوای ئەم ڕووداوە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر ڕێزی لێ دەگرت.

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: خوای گەورە ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰ﴾ لەبارەی کوڕی ئوم مەکتوم دابەزاند، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە.

لەلای پێغەمبەری خواش ﷺ چەند گەورە پیاوێك لە موشریکەکان دانیشتبوون، پێغەمبەری خوا باسی ئیسلامی بۆ دەکردن ڕووی لەو وەرگێڕا و ڕووی لە موشریکەکان کرد، ئەویش دەیگوت: ئایا ئەوەی من دەیڵێم هیچ شتێکی تێدا هەیە؟

فەرمووی: "نا"

جا ئەم سوڕەتە لەبەر ئەمەبوو کە دابەزی [(٢)].

## پێغەمبەر ﷺ ئاسانکاری بۆ دەکردن و ناخۆشی لەسەر هەڵدەگرتن:

زەیدی کوڕی سابت ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئایەتی (لا يستوي القاعدون من المؤمنين والمجاهدون في سبيل الله)ی خوێندەوە.

کوڕی ئوم مەکتوم هات، پێغەمبەر ﷺ هێشتا بۆ منی دەخوێندەوە.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم جیهادەم پێ بکرێ، دەیکەم.

ئەو پیاوێکی نابینا بوو.

جا خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەر ناردە خوارەوە، ئەو کات ڕانی لەسەر ڕانم بوو، هێند قورس بوو لەسەرم تا ترسام لەوەی ڕانم بشکێت، پاشان بەرە بەرە سووك بوو لەسەری، خوای گەورە ئەمەی دابەزاند: ﴿غَيْرُ أُوْلِى ٱلضَّرَرِ﴾ النساء: ٩٥ ئایەتەکە بەم

---

(١) تفسير ابن كثير (٥٦٨/٤).

(٢) ترمذي (٣٣٣١) گێراویەتیەوە ئەلبانی لە ( صحيح سنن الترمذي ٢٥٦١) بە "سەحیح"ی داناوە.

شـێوەیەی لێهـات: ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾.
واتە: ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران و (جەنگ ناکەن) مەگەر ئەوانەیان کە ناتەواون (کوێر، شەل، نەخۆش،... هتد) لەگەڵ ئەوانەدا کە جیهادو کۆشش دەکەن لە پێناوی خوادا بە ماڵ و سامان و خۆیان چوونیەك نین.

خوای پەروەردگار بەم ئایەتە حوکمی جیهادکردنی لەسەر خاوەن پێداویستی تایبەت سووك کرد فەرمووی: ﴿لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ الفتح: ١٧

فەریزەی جیهادی لە گۆڕەپانی شەڕدا لەسەر هەڵگرتن و بە هەڵگرتنی چەك یان دەرچوون بۆ گۆڕەپانی جەنگ ئەرکباری نەکردن.

**بەڵام ئەوەی خۆبەخشانە خۆی تەرخان بکات و بێتە گۆڕەپانی جیهاد، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێ نەدەکردن:**

چەند کەسێکی بە تەمەن لە بەنی سەلەمە دەگێڕنەوە، کە عەمری کوڕی جەموح پیاوێك بوو زۆر دەشەلی، چوار کوڕیشی هەبوون وەك شێر ئازا بوون و لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری جیهادیان دەکرد.

کە ڕۆژی ئوحد هات کوڕەکانی ویستیان ڕێی لێ بگرن و گوتیان: تۆ لە لایەن خواوە عوزرت هەیە.

هاتە لای پێغەمبەری خوا و گوتی: کوڕەکانم دەیانەوێ من بێ بەش بکەن لەو کارە خێرە، نایانەوێ لەگەڵ تۆدا دەربچم، سوێند بە خوا من دەمەوێ ئەوها بەم شەلەییە بچمە بەهەشت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**سەبارەت بە تۆ، لەلای خوای گەورە عوزرت هەیە، جیهادت لەسەر نییە**".

بە کوڕەکانیی فەرموو: "**ئێوەش ڕێگەی لێ مەگرن، بەڵکو خوای گەورە شەهادەی بە قسمەت دەکات**".

جا لەگەڵیدا دەرچوو و لە جەنگی ئوحددا کوژرا [1].

---

[1] رواه ابن إسحاق في السيرة كما في السيرة النبوية لابن هشام (٤/٤٠)، ورجاله ثقات، وقال الشيخ الالباني: "سنده حسن إن لم يكن مرسلا، وقد روي بعضه أحمد بسند صحيح"، تحيق فقه السرة (١/٢٦٠).

ئەبو قەتادە ﷺ دەڵێت: عەمری کوڕی جەموح (کە شەل بوو) هاتە لای پێغەمبەری خوا و گوتی: ئەگەر جەنگام لە پێناوی خودا تا کوژرام، ئایا لە بەهەشت بەپێی ساغ دەڕۆم؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵێ"**.

جا خۆی و برازایەکی و ئازادکراوێك کوژران، پێغەمبەر ﷺ بەلایدا تێپەڕی و فەرمووی: **"وەکو ئەوەیە کە دەتبینم بە پێی ساغت لە بەهەشت دەڕۆیت**[1]**"**.

**خوای گەورە ڕێگەی داوە کۆمەڵگا لەگەڵ ئەم کەسانە تێکەڵ بن و خواردنیان لەگەڵ بخۆن، بۆ ئەوەی دڵیان ڕازی بێت.**

گە ر خەڵکی خۆیان لەمانە پاراست و تێکەڵیان نەبوون و خواردن و خواردنەوەیان لەگەڵ نەخواردن، ئەوا توشی حاڵەتێکی دەروونی دژوار دەبن، بۆیە خوای گەورە کۆمەڵگای هانداوە تێکەڵیان بن، وەك دەفەرموێت: ﴿ لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا مِن بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ ﴾ النور:٦١

ئیبن جەریر دەڵێت: ئەهلی تەفسیر ڕای جیاوازیان لەسەر ئەم ئایەتە هەیە، کە بۆ چ مانایەك هاتۆتە خوار: هەندێك دەڵێن: ئەوئایەتە بۆ ئەمە هاتۆتە خوا تا ڕێگە بدات خەڵکی نان لەگەڵ نابیناکان بخۆن و تێکەڵیان بن، یان ئەوانەی وەك نابینان لە نمونەی شەل و نەخۆش، چونکە پێش ئەم ئایەتە نانیان لەگەڵ نەدەخواردن و لە خواردنی ئەوانیان نەدەخوارن، ئەمەش نەوەك بکەونە شتێك کە خوای گەورە قەدەغەی کردبێت، وەك فەرموویەتی[2]: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ ﴾ النساء: ٢٩

ضحاك دەڵێت: خەڵکی مەدینەش پێش ئەوەی پێغەمبەر ڕەوانە بکرێ، ئەوان نابینا و نەخۆشیان بەشداری خواردنەکانیان نەدەکردن، هەندێك دەڵێن: ئەمە لەبەر ئەوەیە ئەوان بێزیان لێ دەکردنەوە و زۆر بە پاك و خاوێنیان نەزانیوون.

هەندێکیش دەڵێن: نەخۆش بە گوێرەی پێویست ناتوانێت خواردن بخوات، شەلیش ناتوانێت ململانێ بکات لەسەر خوارد، نابیناش خواردنی باش نابینێت، جا خوای گەورە

[1] ئەحمەد (٢٢٦٠٦) بە سەنەدی "حەسەن" گێڕاوەتیەوە، الحافظ لە (الفتح ١٧٣/٣).
[2] تەفسیری ابن جریر (٢١٩/١٩).

ئەم ئایەتیە دابەزاند، ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ .... ﴾ واتە هیچتان لەسەر نییە ئەگەر نابینا و نەخۆش و شەل لەگەڵتان بخۆن و لەگەڵیان بخۆن [١].

### هەندێك كاری گرنگی پێ دەدان و بەرپرسیاریەتی پێ دەسپاردن:

لەوانە: ئەوەی لە شەڕی ئوحد روویدا، كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ راوێژی بە هاوەڵان كرد لەسەر ئەوەی ئایا دەرچن لە مەدینە یان لەناوی بمێننەوە بۆ شەڕكردن لەگەڵ موشریكەكان.

جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هەزار و هەندێك لە هاوەڵانی دەرچوون و عەبدوڵڵای كوڕی ئوم مەكتومی لە مەدینە جێهێشت بۆ ئەوەی پێش نوێژی بكات بۆ ئەوانەی لە مەدینە ماونەوە [٢].

پێغەمبەر ﷺ چەند جارێك عەبدوڵڵای كوڕی ئوم مەكتومی لە مەدینە داناوە، ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو جار عەبدوڵڵای كوڕی ئوم مەكتومی لە مەدینە لە جێگای خۆی دانا، بۆ ئەوەی پێش نوێژی بۆ خەڵك بكات، لە كاتێكدا نابینا بوو [٣].

**هەروەها پێغەمبەر ﷺ كوڕی ئوم مەكتومی راسپارد بۆ ئەوەی لە رەمەزاندا بانگی دووەم بدات:**

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بیلال بە شەو بانگ دەدات، جا بخۆن و بخۆنەوە تا گوێتان لە بانگی كوڕی ئوم مەكتوم دەبێت"**.

دەڵێت: ئەو پیاوێكی كوێر بوو، بانگی نەدەدا تا پێی نەگوترابایە كاتی بەیانییە، كاتی بەیانییە [٤].

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: كوڕی ئوم مەكتوم لە كاتێكدا كوێر بوو بانگی بۆ پێغەمبەری خوا دەدا [٥].

لە گێڕانەوەیەكی تردا: كوڕی ئوم مەكتوم بانگبێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، لە كاتێكدا ئەو نابینا بوو [٦].

---

[١] تەفسیری ابن جریر (٢١٩/١٩).

[٢] السیرة النبویة (٦٣/٢) ابن هشام

[٣] ئەحمەد (١١٩٣٥) و ئەبو داود (٢٩٣١)، ئەلبانی لە (الارواء) بە بە "سەحیح"ی داناوە (٥٣٠).

[٤] بوخاری (٦١٧) و موسلیم (١٠٩٢) گێڕاویانەتەوە.

[٥] موسلیم (٣٨١) گێڕاوەتیەوە.

[٦] ئەبو داود (٥٣٥) گێڕاوەتیەوە.

جا ڕابمێنە بۆ هێز و توانای کەسە خاوەن پێداویستییە تایبەتەکان، دەبینیت ئەو کوێرە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بانگ دەدات و پێشنوێژی دەکات و بەسەر خەڵکییەوە دەبێتە ئەمیر.

## هۆشداریداوە لە ئازاردانیان:

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی جنێو بە باوکی بدات، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی جنێو بە دایکی بدات، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی بۆ غەیری خوا ئاژەڵ سەرببڕێت، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی سنوری زەوییەکان دەگۆڕێت، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی نابینایەك لە ڕێگایەکدا گومڕا دەکات [(١)]، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی بچێتە لای ئاژەڵ، نەفرەت لێکراوە ئەو کەسەی کار بە کردەوی قەومی لوط دەکات [(٢)]".**

## پێغەمبەر ﷺ هەواڵیداوە کە سەرکەوتنی ئوممەت بەو جۆرە کەسانە دەبێت:

سەعد ﷺ وای دەبینی کە فەزڵی هەیە بەسەر ئەوانەی لەخوارە خۆیەوەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئێوە، کە سەردەخسترێن و ڕزق و ڕۆزی دەدەرێن، تەنیا بەهۆی ئەو بێچارە و لاوازنەن کە لەناوتان دان." [(٣)]**

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: **"ئەو ئوممەتە تەنیا بە هۆی لاوازەکانییەوە سەردەخستری، جا یان بە دوعاکەیان، یان بە نوێژ و دڵسۆزیەکەیانەوە [(٤)]".**

ئەبو دەردا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"یارمەتیم بدەن لە دۆزینەوەی لاواز و بێ چارەکانتان، ئێوە کە ڕزق دەدرێن و سەردەخسترێن تەنیا بە هۆی لاواز و بێچارەکانی نێوانتانە [(٥)]".**

---

(١) بەداخەوە ئێستا هەندێك گەنجی کەم عەقڵ دەبینین یاری و سوکایەتی بە نابیناکان دەکەن، ئەگەر نابینایەك بچێتە لایان بۆ ئەوەی ڕێگەی پێ نیشان بدەن، ئەوا ڕێگەی چەوتی پی نیشان دەدەن، بۆ ئەوەی پێ پێبکەنن و سوکایەتی پێ بکەن.

هەندێکیان دەستی نابینایەك دەگرێت بۆ ئەوەی لە شەقام بیپەڕێنێتەوە، پاشان لە ناوەڕاستی شەقام بەرامبەر ئۆتۆمبێلەکان جێی دەهێڵێت، شوفێرەکانیش ئاگاداری دەکەنەوە، ئەویش نازانێت کە لەبەرامبەر ئەو هەموو مەترسییە دایە، شوفێرەکانیش نازانن ئەو نابینایە، تا بۆیان دەردەکەوێت کوێرە و هیچ نابینێت.

(٢) ئەحمەد (١٨٧٨) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع/ ٥٨٩١) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٣) بوخاری (٢٨٩٦).

(٤) النسائی (٣١٧٨) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب/ ٦) بە "سەحیح"ی داناوە

(٥) ئەبو داود (٢٥٩٤) و ترمذي (١٧٠٢) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٧٧٩) بە "سەحیح"ی داناوە

جا لە راستیدا بوونی لاواز و هەژار و پەککەوتەکان لەناو کۆمەڵگای موسڵمانان، ئەوا رەحمەتێکی یەکجار گەورەیە، ئەوان دەرگایەکی گەورەن لە دەرگاکانی خێر، کە خوای گەورە بۆ بەندەکانی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی کێبڕکێ دروست ببێت لەچاکەکردن لە گەڵیاندا و یارمەتیدانیان، هەروەها بۆ ئەوەی دوعای ئەوانە ببێتە مایەی رەحمەت و سەرکەوتن و سەروەری بۆ مسوڵمانان.

## لێبوردەیی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نەفام و کەم عاقڵەکانیان:

لەم نمونەیەدا لێبوردەیی و نەرمونیانی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێت، کاتێك پێغەمبەر ﷺ خۆی و سوپاکەی بەرەو ئوحد کەوتەڕێ، بڕیاری دا بەناو کێڵگەی پیاوێکی دووڕووی کوێردا تێپەڕ ببێت، کە ناوی مەربەعی کوڕی قیظيّ بوو.

کاتێك پێغەمبەری خوا دیواری کێڵگەکەی تێپەڕاند، کابرا پێی گوت: ئەی موحەممەد، ئەگەر تۆ پێغەمبەر بیت رێگەت پێ نادەم بەناو باخچەکەمدا بڕۆیت، ئینجا مستە خۆڵێکی هەڵگرتەوە و گوتی: وەڵڵاهی ئەگەر بزانم ئەم چنگە خۆڵە تەنیا بە تۆ دەکەوێت ئەوا تێم دەگرتی.

ئەوانەی لەگەڵیدا بوون ویستیان بیکوژن.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویك **"لێی گەڕێن، ئەوە هەم دڵی کوێرە هەم چاوەکانی"**[1].

فەرمانی نەکرد بیکوژن، تەنانەت ئازاریشی بدەن، وێڕای ئەوەی لەوپەڕی هێزدا بوون و دەچوون بۆ جەنگ، بارودۆخیش ئاڵۆز و میزاجەکانیش گرژ بوون.

لە رەوشت و نەریتی جەنگاوەری موسڵمان نییە ستەم لەو کەسانە بکات کە خاوەن پێداویستی تایبەتن.

## پێغەمبەر ﷺ هانی ئوممەتەکەی داوە پەند لە حاڵیان وەربگرن و لە خوا بپاڕێنەوە لەو بەڵایە سەلامەتیان بکا:

پێغەمبەر ﷺ ئوممەتەکەی فێرکردووە لە کاتی بینینی خاوەن پێداویستی تایبەتەکان ئەوا سوپاسی خوا بکەن کە ئەوان تاقینەکراوەنەتەوە و جەستەیەکی تەندروستیان هەیە.

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەوەی کەسێکی بینی توشی بەڵایەك بووە، با بڵێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی منی سەلامەت کردووە لەو بەڵایەی تۆی پێ تاقیکردۆتەوە، فەزڵی بە من داوە بەسەر زۆرێك لە دروستکراوەکانی... ئەوا خوای گەورە لەو بەڵایە دەیپارێزێت"**[2].

---

[1] السیرة النبویة (٢/٢٤٤) لابن كثیر، السیرة النبویة (٣/٥٧) لابن هشام، زاد المعاد (٣/١٧٢).

[2] ترمذي (٣٤٣١) گێراوەتیەوەئەلبانی لە (صحیح سنن الترمذي ٣٤٣١) بە "سەحیح"ی داناوە

بەڕاستی سەلامەتی و لەشساغی باشتر و فراوانترە لە بەلا و نەهامەتی، چونکە بەلا دەبێتە مایەی دڵگرانی و گازندە دەربڕین و سەرەنجامیش دەبێتە فیتنە بۆ خاوەنەکەی، ئەوکات دەبێتە گرفتێکی ناخۆش و پڕمەینەتی، باوەڕداری بەهێزیش خۆشەویستترە لەلای خوا لە باوەڕداری لاواز.

کە فەرمووی: **"فەزڵی بە من داوە بەسەر زۆرێك لە دروستكراوەكانی"**، واتە فەزڵ پێدان لە دین و دونیا، لە دڵ و جەستە [١].

زانایان دەفەرموون: پێویستە ئەو زیکرە بە نهێنی بگوترێت و تەنیا خۆی گوێی لێ بێت و کەسە تاقیکراوەکە گوێی لێ نەبێت [٢].

بەڵام ئەگەر بەڵایەکە لە دین بوو، وەکو باوەڕدارێك فاسقێك لەسەر گوناه ببینێت، ئەوا ئەو کات زیکرەکەی لەبەرامبەریدا بە ئاشکرا دەڵێ، ئەمەش لە روانگەی سەرزەنشتکردن و قەدەغەکردنی ئەوخراپەیە.

## دەبێ بزانین، کە پەککەوتەیی راستەقینە ئەو کەسەیە کە بێ باوەڕە بە خوای گەورە:

چونکە خوای گەورە چاو و گوێ و دڵی بۆ دروست کردووە و بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بێنێت و بیپەرستێت و شوێن رێگا راستەکەی بکەوێت، بەڵام هەموو ئەوانەی لەکارخستووە، کوفری بەو خوایە کردووە کە دروستی کردووە و رێکی خستووە و چاو و گوێچکە و دڵی پێداوە ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ الأعراف: ١٧٩.

ئەمە حاڵی ئەو کافرەیە کە بیستن و بینین و دڵی لەکارخستووە، هیچ سوودی لێ نابینێت، تەنیا سوودبینینی ئاژەڵ نەبێت بە هەستەوەرەکانی، تەنیا وەك گیاندار مامەڵە لەگەڵ خواردن و خواردنەوە و جیماع دەکات.

بەڵام باوەڕدار سوودی لە هەستەکانی وەرگرتووە، عەقڵی بەکارهێناوە و لەو شتانەی بۆی دروستکراوە سەرفی کردووە.

پاشان کوێری راستەقینە ئەوە نییە یەکێك لە چاوەکانی لە دەست بدات، بەڵکو کوێری راستەقینە ئەو کوێرەیە روانین و بینینی دڵ لە دەست بدات، بێ باوەڕ بێت، وەك خوای گەورە

---

[١] تحفة الاحوذي (٩/٢٧٥).

[٢] فيض القدير للمناوى (٦/١٣٠).

دەفەرموێت: ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴾ الحج: ٤٦ واتە: (جا وەنەبێت چاوان کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کە وان لە سینەکاندا).

واتە: نابینایی زیانبەخەش لە دین، ئەو نابیناییەیە کە راستی نابینێت، تا ئەو رادەیەی کە چۆن کوێر شتە بەرجەستەکراوەکان نابینێت، ئەویش راستی نابینێت، بەلام کوێری چاو، تەنیا سوودێکی دونیا لە دەست[1].

إذ أبصرَ القلبُ المروءة والتُّقى فإنَّ عمى العينين ليس يضيرُ

**واتە** : گەر دڵ بینی تەقوا و پیاوەتی چییە ئەو کات کوێری چاو هیچ زیانی نییە.

ئەو کەسەی شەلە یان ئەندامێکی لەکار کەوتووە، ئەوا حاڵی باشتر و ژیانی چاکترە لە کەسێکی دیکە کە دوو قاچ و دەستی ساغی هەیە، بەڵام لە تورەیی خوای گەورە ﷻ بەکاریان دەهێنێت.

ئەگەر موسڵمانێك ئەندامێکی لە دەستداو و بەکاری نەهێنا لە گوناه، ئەوا باشترە لەو کەسەی ئەو ئەندامانەی هەیە و بەکاری دەهێنێت لە خزمەتکردنی شەیتان.

ئەگەر بێتو بەراوردێك بکەین لە نێوان کەسێك چاوی لە دەستداوە، یەکێکی دیش شەرەفی لەدەستداوە، هەروەها لە نێوان کەسێك دەستی یان قاچی لە دەستداوە، یەکێکی دیش کەرامەت و رەوشتی لە دەستداوە و دینی شێواوە، بەراستی جیاوازییەکی یەکجار گەورە دەبینین.

لە راستیدا ئەم بەراوردکارییە سوپاسگوزرای و رازی بوون بە فەرمانی خوا پێویستە، بەو پێیەی ئەو کەسەی توشی کەموکوڕی جەستەیی بووە لە کەموکوڕی دەروونی سەلامەتە.

کاتێك ئیبن عەباس ﵁ چاوی کوێر بوو، گوتی[2]:

إن يأخذ اللهُ من عينيّ نورهما ففي لساني وقلبي منهما نورٌ

قلبي ذكيٌّ، وعقلي غير ذي دخل وفي فمي صارمٌ كالسّيف مأثور

واتە:

گەر خوا بسێنێتەوە لێم رووناکی چاوم

بە روناکی زوبان و دڵەوە ماوم

دڵم زیرەکە و عەقڵم بێ عەیب و عار

خاوەن زوبانێکم وەك شمشێری هار

---

[1] تفسير السعدي (١/٥٤٠).

[2] أسد الغابة (٢/١٣١)، البداية والنهاية (٨/٣٣٦).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاوەن بەڵا و نەهامەتییەکان:

بەڕاستی حیکمەت و دانایی خودا وای خواستووە، ئەو ژیانە بەدەر نابێت لە مەینەتی و ناخۆشی، ئەمە چۆن وانییە لە کاتێکدا:

طَبعت على كَدرٍ، وأنت تُريدها صَفُواً مِن الأقذاء، والأكدار

**واتە :دونیا وا دروستکراوە، پڕبێت لە بەڵا و مەینەتی**

**تۆش دەتەوێت تێیدا نەبێت ناخۆشی و نەهامەتی**

ئەو کەسەی بیەوێت سەلامەتی و لەش ساغی هەردەم هاوڕێی بێت و تووشی ناخۆشی و نەخۆشی نەبێت، ئەوانە لە تەکلیف و خۆبەدەستەوەدان تێنەگەیشتوون.

مرۆڤ لەو دونیادا هەردەبێ تووشی بەڵا و نەهامەتی و ناخۆشی و مەینەتی و دەردەسەری بێت، جا چ لە ماڵی، یان لە جەسەتی، یان لە ماڵ و منداڵی.

بە سوودترین شت بۆ کەسی خاوەن بەڵام ئەوەیە کە ئاگری بەڵایەکەی بە ئاوی دڵنەوایی و سەرەخۆشی ئەهلی بەڵاکان بکوژێنێتەوە، بشزانێت لە هەموو ماڵێك بەڵا و ناخۆشی هەیە، گەر بگەڕێ کەسێك لە خەڵکی نابینێتەوە توشی بەڵایەك نەبووبێت، جا بە لەدەستدانی خۆشەویستێك، یان هاتنە پێشێی نەهامەتییەك.

فيوم علينا ويومٌ لَنا ويوم نساء، ويوم نسرٌ

واتە: **ڕۆژێك لەسەر ئێمەیە ڕۆژێکیش بۆ ئێمەیە**

**ڕۆژێك نیگەرانمان دەکات ڕۆژێکیش دڵخۆشمان دەکات.**

بۆیە پێویستە و گرینگە چەند هەڵوەستەیەك بکەین لەگەڵ ئەو هەڵسوکەوت و مامەڵانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ خاوەن بەڵا و نەهامەتییەکان کردوونی:

**پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، ئەو کەسەی خوای گەورە بیەوێت توشی خێری بکات، بە بەڵا و نەهامەتی تاقی دەکاتەوە:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەو کەسەی خوا بیەوێت توشی خێری بکات، ئەوا تاقی دەکاتەوە**[1]**"**.

**الباجي** دەڵێت: مەبەست لەمەدا ئەوەیە تووشی نەخۆشییەکی دەکات کە تەندروستی و لەش ساغی تێك بدات، ماڵی لێ دەستێنێتەوە بۆ ئەوەی کاریگەری لە دەوڵەمەندییەکی بکات، توشی دڵتەنگی دەکات بۆ ئەوەی خۆشییەکەی بشێوێنێت، جا ئەگەر ئارامی گرت

[1] بوخاری (٥٦٤٥) گێڕاویەتیەوە.

و چاوەڕێی پاداشتی لە خوا کرد، ئەوا دەبێتە هۆکارێك بۆ بە دەستهێنانی ئەو خێرەی کە خوا دەیەوێت پێی بدات [(١)].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"چەندە پاداشت زۆر و گەورە بێت، هێندەش بەلایەکە لەگەڵیدا گەورە دەبێت، ئەگەر خوای گەورە کەسانێکی خۆشویست ئەوا تاقیان دەکاتەوە، جا ئەو کەسەی ڕەزامەندی دەربڕی، ئەوا خوای گەورە لێی ڕازی دەبێت، ئەو کەسەشی ڕازی نەبێت و پێی نیگەران بێت، ئەوا خوای گەورە لێی ڕازی نابێت [(٢)]"**.

ئەو کەسەی ڕقی لە بەلایەکانی خوای گەورەیە و پێی قەڵس دەبێت و بە قەزا و قەدەری خوا ڕازی نابێت، ئەوا خوای گەورە لێی تورەیە و سزا و ئازارێکی بە ئێش چاوەڕێی دەکات، هەر کەسێکیش خراپەیەك بکات ئەوا سزا دەدەرێت.

مەبەست لەمەدا ئەوەیە: پێویستە مرۆڤ ئارام بگرێت لەسەر بەلایەکان کاتێك دێنە پێشی [(٣)].

**الهرويّ** دەڵێت: لەو چاکانەی کە زۆر نایابن، بریتییە لە شاردنەوەی بەلا، بە جۆرێك وا بکەی خەڵك نەزانن تۆ تووشی ئەو بەلایە هاتووی [(٤)].

هەندێك دەڵێن: کەسی هۆشمەند هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنی بەلا کارێك دەکا، کە کەسی نەفام پاش تێپەڕبوونی چەند ڕۆژێك بەسەر بەلایەکە ئینجا ئەو کارە دەکا، ئەو کەسەی ئارام نەگرێت وەکو ئارامی کەسانی بەڕێز، ئەوا وەکو گیانداران لەبیری دەچێت [(٥)].

أتصبرُ للبلوى عزاء وحسبةً     فتُؤجر، أم تسلو سلوَّ البهائم؟

ئایا ئارام دەگریت لەسەر بەلا و پاداشت بدرێیتەوە

یان وەك ئاژەڵان دەکەیت و لە بیرت دەچێتەوە؟

---

(١) المنقى شرح الموطأ (٤/٣٥٧).
(٢) الترمذي (٢٣٩٦) و ابن ماجة (٤٠٣١) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٢١١٠) بە "سەحیح"ی داناوە
(٣) تحفة الاحوذي (٧/٦٦).
(٤) تسلية أهل المصائب (لا ١٧) محمد بن محمد المنبجي.
(٥) تسلية أهل المصائب (لا ٢٩)

**پێغەمبەر ﷺ داوای لە کەسی توشبوو بە بەلا دەکرد ئارام بگرێت و چاوەڕێی پاداشت بکات، لەگەڵ ئەوەشدا بەشداری دڵتەنگییەکەی دەکرد و هەندێك جارش دەگریا:**

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێت: کچێکی پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی نارد بۆلای پێغەمبەر کە پێی بڵێ کوڕێکی وا لەسەرەمەرگ دایە.

ئەویش چووە لای، پێغەمبەریش ﷺ، سەلامی بۆ نارد و پێی فەرموو ئەمەی پێ بڵێ: **"إنّ للهَ ما أخذ، ولَهُ ما أعطىَ وكلّ شيءٍ عندَهُ بأجلٍ مُسمّى، فَلْتَصبِرْ ولْتَحتَسِبْ"**. واتە: هەرچی هەیە هی خوایە، هەر ئەو دەیبات و دەیبەخشێ، هەموو شتێك لەلای ئەو کاتی دیاریکراوە، ئارام بگرە و پاداشتەکەی لە خوا چاوەڕێ بکە.

ئوسامە دەڵێت: کچەکەی پێغەمبەر ﷺ سوێندی خوارد هەر دەبێ پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خۆی بێنێت، پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا و لەگەڵیدا سەعدی کوڕی عوبادە و موعازی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی سابیت و چەند هاوەڵێکی تری لەگەڵ خۆی برد.

منداڵەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزکردەوە، دەنگێکی لە سینەی دەهات، وەکو دەنگی ئەو ئاوە بوو کاتێك ڕوودەکرێتە گۆزەیەکی شکاوە.

چاوەکانی پێغەمبەر ﷺ پڕ فرمێسك بوون.

سەعد گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"ئەوە بەزەیی و ڕەحمەتە، خوای گەورە لە دڵی بەندەکانی دایناوە، خوای گەورە ڕەحم بە بەندە بەزەییەکانی دەکات**[1]".

**ڕاڤەی فەرموودەکە:**

**(إنّ للهَ ما أخذ)** ئەمە هانی ئارامگرتن و تەسلیم بوون بە قەزا و قەدەری خوای تێدایە، چونکە ئەو شتەی لێ سەندنەوە کە هی خۆی بووە و هی ئێوە نەبووە، شتێکی بردووە کە هی خۆی بووە، کەواتە غەمبار و دڵگران مەبن، هەروەکو کەسێك دڵگران نابێت کاتێك خاوەنی سپاردەیەك دێت و سپاردەکەی خۆی دەباتەوە.

**(ولَهُ ما أعطىَ)** ئەوەی بە ئێوەی بە خشیووە بە دەرنییە لە موڵکی، بەڵکو خوای گەورە ئەوەی بیەوێت دەیکات.

**(وكلّ شيءٍ عندَهُ بأجلٍ مُسمّى)** واتە: ئارامبگرن و دڵگران مەبن، چونکە ئەوەی بەسەرتان دێت کاتی تەواو بووە، نە پێش دەکەوێت و نە دوا دەکەوێت.

---

[1] بوخاری (١٢٨٤) و موسلیم (٩٢٣) گێڕاوەتیانەوە.

کە (سەعد گوتی: ئەوە چییە ئەی پێغەمبەری خوا؟) سەعد بۆیە ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر کرد، چونکە وای زانی هەموو گریانێك حەرامە و نابێت مرۆڤ بگرییێت، وا گومانی برد کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبیری چووە و بە بیری دێنێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کرد، کە بەتەنیا گریان و فرمێسك لە چاودا حەرام نییە و ناپەسەندیش نییە، بەڵکو رەحمەت و سۆز و بەزەییە، ئەوەی حەرامە جلدڕاندن یان لە خۆدان یان سەرلولکەیە لەگەڵ گریان [1].

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە

- دروستە کەسی باش بچێتە لای ئەو کەسەی گیان دەسپێرێت گەر داوای لێکرا، ئەمەش وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ داواکەیان.
- ئەو کەسەی توشی بەڵایەك هاتووە دەتوانێ سوێند بخوا بۆ ئەوەی کەسێکی باش بچێتە لای.
- دروستە بچێتە ماتەمینی و سەردانی نەخۆشی بە بێ مۆڵەت، بەڵام بۆ وەلیمە (دەعوتکردن) دروست نییە بێ مۆڵەت بچی.
- سوننەتە ئەوەی سوێندی لەسەر خواردووە جێبەجێی بکەی.
- فەرمان بکەی بۆ خاوەن بەڵا، کە ئارام بگرێت، پێش ئەوەی مردنەکە رووبدات، جا کاتێك روویدا بە دڵێکی رازی و پڕ باوەڕەوە پێشوازی لێبکات و بەرگەی خەم و ناخۆشی بگرێت.
- پێش خستنی سەلام بەر لە قسەکردن.
- سەردانی کردنی نەخۆش جا با نەخۆشەکە منداڵ بێت یان بچوك.
- دروستە شوێنکەوتوو پرسیار لە پێشەواکەی بکات لە شتێك پێی سەیرە و وا گومان دەبات دژیەکن.
- بەکارهێنانی ئادابی جوان لە پرسیارکردندا.
- بەزەیی هاتنەوە بە دروستکراوەکانی خوادا.
- ئاگادارکردنەوە لە دڵڕەقی و چاو قایمی.
- گریان بە بێ هاوار و نوزە نوز دروستە [2].

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦/٢٢٦).

[2] سەیری فتح الباری بکە (٣/١٥٨).

## فێری چۆنییەتی ئارامگرتنی دەکردن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێك تێپەڕی کە لەسەر گۆڕی کوڕێکی دەگریا.

پێی فەرمووی: "**لە خوا بترسە و ئارامگر بە**[1]".

ئافرەتەکە گوتی: لێم دوور کەوە، تۆ توشی ئەو بەڵایە نەبووی کە من توشی بوومە، نەیناسی کێیە[2].

پێیان گوت: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ[3].

پاشان چووە بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ، هیچ دەرگاوانێکی نەبینی.

بە پێغەمبەری گووت: نەمناسیت.

فەرمووی: "**بەڵکو ئارامگرتن دەبێت لە سەرەتای بەڵا و ناخۆشییەکە دابێت**[4]".

الخطابي دەڵێت:: ئەو ئارامگرتنەی خاوەنەکەی پێی جوان دەبێت، دەبێت لە کاتی سەرەتایی ڕوودانی بەڵایەکە بێت، نەوەك لە دوای ڕووداوەکە، چونکە هەر بەخۆی دوای تێپەڕینی کات سێبوری بۆ دێت[5]، بۆیە گوتراوە: هەموو شتێك لە بچکوکەوە دەست پێ دەکات و گەورە دەبێت، تەنیا بەڵا نەبێت لە گەورەوە دەست پێ دەکات، پاشان بچوك دەبێتەوە.

لا تجزعنّ إذا بُليتَ بشدةٍ ... إنّ الشدائدَ لا يدومُ مقامُها
كم شدة نامَ الفتى لورودها ... ما هبّ حتى أدبرت أيامها
فاصبر على نوبِ الزّمان، فإنها ... تمضي، ويبقى بردُها وسلامُها

واتە:

---

[1] لە گێڕانەوەیەی ئەبو نەعیمدا هاتووە "**ئەی بەندەی خوا لە خوا بترسە**"، قرطبي دەڵێت: ئەوەی ئاشکرایە ئەو ئافرەتە زیاد لە پێویست دەگریا و ناڵە و نوزەی دەهات یاخود شتی تر، بۆیە فەرمانی پێکرد لە خوا بترسێت. فتح الباری (١٤٩/٣).

[2] بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ کرد، چونکە نەیزانی پێغەمبەرە.

[3] لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاری (٧١٥٤) دا هاتووە: (پیاوێك بەلایدا تێپەڕی و پێی گوت ئەمە پێغەمبەری خوا بوو، گوتی: نەم ناسی) موسلیم بە زیادەیەك لە گێڕانەوەیەکی دەڵێت: ئافرەتەکە وەك مردووی لێهات. کە زانی ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، زۆر خەجاڵەت بوو و بە خۆیدا شکایەوە.

[4] بوخاری (١٢٨٣) و موسلیم (٩٢٦) گێڕاویەتیەوە.

[5] فتح الباری (١٥٠/٣).

دڵگـــران مەبـــە گـــەر بـــە بـــەڵا تاقکرایەتـــەوە

بەڵایـــــەکان کـــــاتی زۆریـــــان بـــــۆ نامێنێـــــتەوە

زۆر بەڵا هاتن بەڵام گوێی پێ نەدا خاوەنەکـــەی

زۆری پێنەچـــوو تـــا ڕۆیشـــت و تێپـــەڕی **ڕۆژگارەکـــەی**

لەســـــەر بەڵای ڕۆژگـــار ئارامـــگـــربە و خۆڕاگـــر

دەڕوا هەر ساردی و سەلامەتیەکەی دەمێنی **دوور لەئاگر**

سوودی وەڵامی ئافرەتەکە ئەوەیە: بە **فەرمانبەرداری هاتە خزمەت پێغەمبەر، کە تەقوا و ئارامگرتن بوو، هەروەها وەك داوای لێبوردنێك لەو قسەیە لە دەرەنجامی ئەو خەمەی تووشی هاتبوو کردبووی، ئەویش بۆی ڕوونکردەوە، کە پێویستە ئەو ئارامگرتنە لەسەرەتای ڕووداوەکە بێت، هەر ئەو جۆرە ئارامگرتنەشە کە پاداشتی لەسەرە** [1].

**"لە خوابترسە و ئارامگربە"**. پێدەچێت گریانەکەی لە حەدی خۆی زیاتر بووبێت، یاخود هاوارکردنی تێدابووە، چونکە گریانی ئاسایی گوناه نییە.

هەروەها وەڵامدانەوەی پێغەمبەر حەکیمانە بووە، پەیامێك بە کەسی پرسیارکەرەکە دەدات، ئەویش ئەو نییە داوای دەکات، بەڵکو ئاگاداری شتی گرنگتری دەکاتەوە [2]، وەك ئەوەی پێی بڵێت: واز لە داوای لێبوردن بێنە، من بۆ خۆم تووڕە نابم، بەڵکو لە پێناو خوا تووڕە دەبم، سەیری ئەو شتە بکە کە گرینگترە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نەرموونیانی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر کەسی نەزان، بێ فیزی و سەرەخۆشی کردن لە تازیەبار، قەبوڵکردنی داوای لێبوردن، فەرمان بە چاکەکردن و ڕێگری کردن لە خراپە لەگەڵ هەموو کەس.
- ئەگەر کەسێك بە ئەدەبێکی خراپ مامەڵەی لەگەڵ کەسێکی دیکە کرد، پێویستە داوای لێبوردنی لێبکات.
- نابێت کەسی دەسەڵاتدار یان دادوەر خەڵکانێك لەبەر دەرگا دابنێ و ڕێگری لە خەڵك بکەن و نەگەنە لای.

---

[1] فتح الباری (٣/١٥٠).

[2] سەیری الایضاع فی علوم البلاغە بکە (٢/١١٠).

- پێویستە هەر کەسێك فەرمانی چاکەکردنی پێکرا، قەبوڵی بکە، ئەگەرچی کەسی فەرماندەرکەش نەناسێت.
- ئارام نەگرتن و ناڕازی بوون لە قەدەغەکراوەکانە، چونکە فەرمانی لە خواترسان و ئارامگرتنی بە ئافرەتەکە کرد.
- دەبێت مرۆڤ لەسەر فەرمانکردن بە چاکە و قەدەغەکردن لە خراپە ئارام بگرێت و بەرگەی ئازارەکانی بگرێت [١].

## پاداشتی ئارامگرتن لەسەر بەڵای بۆ خاوەن بەڵاکە روون دەکردەوە:

قورەی کوڕی ئیاس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر دابنیشتابە، کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی لەگەڵیدا دادەنیشتن، لەوانە پیاوێك کوڕێکی بچوکی هەبوو لە پشتیەوە دەوەستا، ئەویش دەیهێنایە پێشەخۆی.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"ئایا زۆرت خۆش دەوێت؟"**.

گوتی: چەندە خوا تۆی خۆش دەوێت، منیش هێندە ئەوم خۆش دەوێت.

جا کوڕەکەی مرد و ئەویش بەم هۆیەوە چیدیکە نەهاتەوە مەجلیسی پێغەمبەر، نەوەك کوڕەکەی بیربکەوێتە و بەهۆیەوە غەمبار بێت.

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری پیاوەکەی کرد و فەرمووی: **"بۆچی فلانەکە کەس نابینم؟"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کوڕەی دەتبینی وەفاتی کرد.

رۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێی کەوت و پرسیاری کوڕەکەی کرد، ئەویش گوتی: مرد، پێغەمبەر ﷺ دڵی دایەوە، پاشان فەرمووی: **"ئەی فلان کامەیانت پێ خۆشترە، گەر لە ژیاندا بمابایەوە و بە درێژایی تەمەن چێژت لێ وەرگرتبایە، یان لە رۆژی دوایی بچیتە لای هەر دەرگایەکی بەهەشت ئەو پێشە تۆ لەوێ بێت و دەرگاکانیت بۆ بکاتەوە؟"**.

کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵکو حەزدەکەم پێش من لەلای دەرگای بەهەشت بێت و دەرگام بۆ بکاتەوە، ئەوەم لەلا خۆشترە.

فەرمووی: **"دەی ئەمە بۆ تۆیە"**.

پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەمە تایبەتە بۆ ئەو یان بۆ هەمووانە؟

فەرمووی: **"بەڵکو بۆ هەمووتانە"** [٢].

---

[١] فتح الباري (٣/١٥٠).

[٢] ئەحمەد (١٥١٦٨) و النسائي (٢٠٨٨) گێراویانەتەوە، ئەلباني لە (أحكام الجنائز) بە "سەحیح"ی داناوە (١٦٢).

ئەبوهورەیرە ﷜ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**خوای گەورە فەرموویەتی: ((هەر بەهەشت دەدەم بەو بەندە باوەڕدارەی خۆم، ئەگەر خۆشەویستێکی بێگەردم لێ سەندەوە، ئەویش چاوەڕێی پاداشتی کرد لەسەری))**".[1]

"**بێگەرد**"، خۆشەویستێکی پاکە، وەك منداڵ و برا، یان هەموو ئەولەی مرۆڤ خۆشیانی دەوێ.

"**چاوەڕێی پاداشتی کرد لەسەری**"، واتە: بە لە دەستدانی ئەو خۆشەویستییەی ئارامی گرت و چاوەڕێی پاداشتی لە خوای گەورە کرد[2].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**بەڕاستی خوای گەورە لە بە هەشت کەمتر ناداتە ئەو باوەڕدارەی ئەگەر خۆشەویستێکی بۆلای خۆی بردەوە، بە مەرجێك ئارامی لەسەر گرت و چاوەڕێی ئەو پاداشتەی کرد کە فەرمانی پێ کراوە**"[3].

موعازی کوڕی جەبەل ﷜ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: "**سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، منداڵی لەبارچوو (مردوو) بەو ریخۆڵەی بەناوکییەوە نوساوە دایکی خۆی رادەکێشێت بۆ بەهەشت، بە مەرجێك ئەگەر چاوەڕێی پاداشت بکات**"[4].

شورەیح دەڵێت: هەر کاتێك توشی بەڵایەك دەبم، چوار جار سوپاسی خوای لەسەر دەکەم:

**یەکەم**: سوپاسی دەکەم، کە بەڵایەکە هەر ئەوەندە بووە و گەورەتر نەبووە.

**دووەم**: سوپاسی دەکەم، وای لێکردم ئارام بگرم لەسەری.

**سێیەم**: سوپاسی دەکەم، کە سەر ڕاستی کردم بڵێم (**إنا لله وإنا إليه راجعون**)، بە هیوای ئەوەی پاداشت بەدەست بێنم.

**چوارەم**: سوپاسی دەکەم، کە بەڵایەکەی نەخستە ناو دینم[5].

## بۆی روون دەکردنەوە بەڵایەکان دەبنە مایەی رەشکردنەوەی گوناهەکان:

خاتوو عائیشە ﷝ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**هەر بەڵایەك توشی موسڵمانێك بێت، ئەوا خوای گەورە دەیکاتە مایەی رەشکردنەوەی گوناهەکانی، تەنانەت دڕکێکیش کە لە پێی رابچێت**"[6].

---

[1] بوخاری (٦٢٢٤) گێڕاویەتیەوە.

[2] فتح الباری (١١/٢٤٢).

[3] النسائی (١٨٧١) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز) بە "سەحیح"ی داناوە (٢٣).

[4] ابن ماجة (١٦٠٩) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع) بە "سەحیح"ی داناوە (٧٠٦٤).

[5] البيهقی لە (شعب الايمان ٩٩٨٠) گێڕاویەتیەوە.

[6] بوخاری (٥٦٤٠) و موسلیم (٢٥٧٢) گێڕاویانەتەوە

دایکی عەلاء رضي الله عنها دەڵێت: من کە نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆ سەردانم و فەرمووی: **"مژدە بێت ئەی دایك عەلاء، بەڕاستی خوای گەورە نەخۆشی موسڵمان دەکاتە مایەی لابردنی گوناهەکانی، هەرەکو چۆن ئاگر پیسی و چڵکی زێڕ و زیو لا دەبات**[1]".

مونزیر دەڵێت: دایکی عەلاء پوری حەکیمی کوڕی حوزامە، یەکێك بووە لەو ئافرەتانەی بەیعەتیان بە پێغەمبەر ﷺ دا[2].

**هەواڵێداوە هەر بەڵایەك توشی موسڵمان بێت، پاداشتی بۆ هەیە، هەرچەندە بەڵایەکە بچوك و سادەش بێت:**

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەوەی موسڵمان تووشی دەبێت لە ماندووبوون و خەم و دڵگرانی و ناڕەحەتی و ئازار و مەینەتی، تا درکێکیش کە لە پێی رادەچێت، ئەوا خوای گەورە بۆی دەکاتە مایەی لابردنی گوناهەکان**[3]".

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارێکی زۆری هەبوو، دەستم گەیاندە جەستەی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ زۆر بەسەختی توشی نەخۆشی بووی[4]؟

فەرمووی: **"بەڵێ، من بە ئەندازە دوو پیاو لە ئێوە ئازار دەکێشم"**.

گوتم: کەواتە دوو پاداشتیشت بۆ هەیە.

فەرمووی: **"بەڵێ ئەمە وەهایە، هەر موسڵمانێك تووشی ئازارێك بێت با ئازاری درکێك یان زیاتر بێت، ئەوا خوای گەورە گوناهەکانی هەڵدەوەرێنێت، هەروەکو چۆن درەخەت گەڵاکانی خۆی هەڵدەوەرێنێت**[5]".

**فێری دەکردن لەسەر بەڵا ئارام بگرن، بەڵێنی بەهەشتی پێدەدان گەر ئارامگربن:**

جابیری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنه پێغەمبەری خوا بەلای عەمار و خانەوادەکەی تێپەڕی، کە سزا دەدران، فەرمووی: "مژدەتان لێ بێت ئەی خانەوادەی عەمار و خانەوادەی یاسر (لە

---

[1] ئەبو داود (٢٦٨٨) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (السلسله الصحیحة/٧١٤) بە "سەحیح"ی داناوە
[2] الترغیب والترهیب (١٤٨/٤).
[3] بوخاری (٥٦٤٢) و موسلیم (٢٥٧٢) گێراویانەتەوە.
[4] لە دەقی فەرموودەکەدا هاتووە: الوعك: واتە: ئازاری تا. النهایة (٥٤٥٣).
[5] بوخاری (٥٦٤٨) و موسلیم (٢٥٧١) گێراویانەتەوە.

گێڕانەوەیەکی تر: ئارامبگرن ئەی خانەوادەی یاسر)، بەڕاستی وادەی ئێوە بەهەشتە [١]".

عەتائی کوڕی ئەبی رەباح دەڵێت: ئیبن عەباس پێی گوتم: ئایا ئافرەتێکی ئەهلی بەهشتت پێ نیشان بدەم؟

گوتم: بەڵێ.

گوتی: ئەو ئافرەتە هاتە لای پێغەمبەری و گوتی: من توشی پەرەکەم دەبم. لەگەڵیشدا عەورەتم دەردەکەوێت، داوای چاکبوونەوەم لە خودا بۆ بکە!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "ئەگەر دەتەوێ ئارام بگرە دەچیتە بەهەشت، ئەگەریش دەتەوێ داوا لە خوا دەکەم چاکت بکاتەوە".

گوتی: ئارام دەگرم.

پاشان گوتی: من عەورەتم دەردەکەوێت، داوا لە خوا بکە عەورەتم بە دیار نەکەوێت، پێغەمبەریش ﷺ دوعای بۆ کرد [٢].

ئەوەی لەم فەرموودەیەدا وەردەگیرێت ئەوەیە، کە ئارام گرتن لەسەر بەلاکان بە هەشت دابین دەکات [٣].

قد ينعم اللهُ بالبلوى وإنْ عظمَت ويبتلي الله بعض القوم بالنّعم

واتە: خوا نیعمەتی بەلا دەبەخشێت هەرچەندە گەورەش بێت ...گەلانێکیش بەبەلای نیعمەت تاقی دەکاتەوە.

**دڵدانەوەی خاوەن بەلای دەکرد و مژدەی بەهەشتی نەبڕاوە و پاداشتی زۆری پێ دەدا:**

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: ئافرەتێک هاتەلای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: پیاوەکان لە ئامۆژگاریەکانت بەهرەمەند بوون، وادەیەکیش بۆ ئێمە دابنێ، لەوەی خوا فێرکردووی فێرمان بکە.

فەرموو: "**لە فلانە رۆژ و فلانە رۆژ کۆببنەوە**".

جا کۆبوونەوە، پێغەمبەریش ﷺ هاتەلایان و ئەوەی خودا فێری کردبوو، فێری کردن، پاشان فەرمووی: "**هەر ئافرەتێك لە پێش خۆیدا سێ منداڵی بمرێت، ئەوا خوای گەورە بۆیانی دەکاتە پەرژینێك بۆ پاراستنیان لە ئاگر**".

ئافرەتێك: گوتی ئەی ئەگەر دووبێت، دووبێت، دووبێت؟

---

[١] الحاكم (٥٦٦٦) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (تخريج فقه السيرة/ ١٠٣) بە "سەحیح"ی داناوە.

[٢] بوخاری (٥٦٥٢) و موسلیم (٢٥٧٦) گێڕاویانەتەوە.

[٣] فتح الباری (١٠/١١٥).

**پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "دووبێت، دووبێت، دوبێت"[1].**

ئەبو حەسان دەڵێت: بە ئەبو هورەیرەم گوت: من دوو کوڕم مردوون، تۆ هیچ شتێکت لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بارەیەوە بیستووە دڵمان پێ خۆش بکەی لەبارەی مردووەکانمان؟

**گوتی: "بەڵێ، بچوکەکانیان (دەعامیص[2])ی بەهەشتن، یەکێکیان چاوی بە باوکی دەکەوێ، یان دایك و باوکی، جلکەی دەگرێت، یان دەستی دەگرێت، هەروەکو چۆن من لایەکی جلەکەت دەگرم، وازناهێنێت، تا خوای گەورە خۆی و باوکی دەخاتە بەهەشت"[3].**

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەگەر منداڵی یەکێك لە بەندەکانی خوا وەفاتی کرد، خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموێت: گیانی منداڵی بەندەکەی منتان کێشا؟**

**دەڵێن: بەڵێ.**

**دەفەرموێت: ئایا گیانی خۆشەویستەکەیتان کێشا؟**

**دەڵێن: بەڵێ.**

**دەفەرموێت: بەندەکەم چی گوت؟**

**دەڵێن: سوپاسی کردی و گوتی (إنا لله وإليه راجعون).**

**خوای گەورە دەفەرموێت: ماڵێك لە بەهەشت بۆ بەندەم دروست بکەن و ناوی بنێن ماڵی سوپاس (بيت الحمد)"[4].**

**هانی ئەو کەسانەی دەدا کە توشی بەلایەك بوونە، دڵی خۆیان بدەنەوە بەوانەی توشی بەلای گەورەتر دەبن، ئەویش لە دەستدانی پێغەمبەر ﷺ.**

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرگایەکی لە نێوان خۆی و خەڵکیدا کردووە، یان پەردەیەکی لادا بینی خەڵك لە دوای ئەبو بەکر نوێژ دەکەن.

جا سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر باشی حاڵیان، بەو هیوای لە دوای ئەو ئەبوبەکر بێتە جێنیشنی.

---

[1] بوخاری (١٠٢) و موسلیم (٢٦٣٤) گێراویانەتەوە.

[2] دەعامیص: کۆیی (دەعموصە)یە، گیاندارێکی بچوکە لەناو ئاو دەژی هەرگیز لێی جیا نابێتەوە، واتە چۆن ئەم گیاندارە لە ئاو جیانابێتەوە، ئەویش لە بەهەشت جیانابێتەوە، النهایە (١٢٠/٢).

[3] موسلیم (٢٦٣٥) گێراویەتیەوە.

[4] الترمذي (١٠٢١) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩٥) بە "سەحیح"ی داناوە.

فەرمووی: **"ئەی خەڵکینە، هەر یەکێك لە خەڵك یان لە باوەڕداران توشی بەڵایەك بێت، با دڵی خۆی خۆش بکات بە بەڵای لە دەستدانی من گەر توشی بێت، چونکە هیچ کەسێك لە ئوممەتم دوای من توشی بەڵایەك نابێت گەورەتر بێت لە بەڵای لەدەستدانی من [1]"**.

اصــبرْ لِكـلّ مُصـــيبةٍ ... واعلمْ بأنّ المـرءَ غيـرُ مخلّدِ
فإذا ذكرت مصيبةً تسلوبها ... فاذكر مصائبك بالنّبيّ محمد

بـۆ هەمـــوو بەڵایـــەك ئـارامگر بـــە و
بشزانە مـرۆڤ زینـــدوو نابێـــت و نـەمر
گەر ویستت دڵدانەوەی خۆت بکەی لەم بەڵایە
یادی بەڵای لەدەستدانی موحەممەد بکـە

## فێری دەکردن گەر توشی بەڵا بوون چی بڵێن:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ﴾ البقرة: ١٥٥-١٥٧

دایکی سەلەمە ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ فەرمووی: **"هەر موسڵمانێك تووشی بەڵایەك بێت و ئەوەی خوا فەرمانی پێکردووە بڵێت: إنا لله وإنا إليه راجعون، أللهمّ أجرني في مُصيبتي واخلُفْ لي خَيراً منها، إلا أخلفَ اللهُ له خيراً منها"**.

واتە: بڵێ: ئێمە موڵکی خوداین و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە، خودایە لەبری ئەو بەڵایەی بەسەرم هاتووە پاداشتم بدەوە و باشترم بۆ جێبهێڵە، ئەوا خوای گەورە شتی باشتری بۆ جێدەهێڵێت.

دایکی سەلەمە دەڵێت: کە باوکی سەلمە وفاتی کرد، گوتم کێ لە موسڵمانان باشتر دەبێت لە باوکی سەلەمە، یەکەم ماڵ بوو کە بۆلای پێغەمبەری خوا کۆچی کرد، پاشان من ئەو دوعایەم کرد، خوای گەورە پێغەمبەری پێدام [2].

---

[1] ابن ماجة (١٥٩٩) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٨٧٩) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] موسلیم (٩١٨) گێراویەتیەوە.

## قەدەغەی کردووە دوعا لە خۆیان بکەن لە کاتی توشبوونی بەلا:

دوعاکردن لە خۆت و ماڵ و منداڵ بە شێوەیەکی گشتی قەدەغەکراوە.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"دوعا لە خۆتان مەکەن، دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن، دوعا لە خزمەتکارەکانتان مەکەن، دوعا لە پارە و ماڵەکانتان مەکەن، نەوەك دوعایەکانتان بەبەر ئەو کاتە بکەوێت کە خوای گەورە دوعای تێدا قەبوڵ دەکات، دوایی قەبوڵ دەبێت[1]"**.

بە شێوەیەکی تایبەتیش دوعا لە خۆکردن قەدەغەکراوە لە کاتی هاتنی بەلا، دایکی سەلەمە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای باوکی سەلەمە، لە کاتی مردنیدا چاوەکانی کراوەبوون، دایخستن، پاشان فەرمووی: **"گەر گیان دەرچوو، چاوەکان دوای دەکەون"** ئینجا هاوارێك لە ماڵ و منداڵەکەی هەڵسا.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"تەنیا بە خێر دوعا لە خۆتان بکەن، چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەوەی دەیڵێن"**.

پاشان فەرمووی: **"خودایە لە ئەبو سەلەمە خۆش بە، پلەی بەرز بکەرەوە لەناو هیدایەتکراوەکان، ئەوەی جێی هێشتووە، بۆی بە چاکە بگێڕیت و لە ئێمە و ئەویش خۆشی بی ئەی پەروەردگاری هەموو جیهانیان، گۆڕەکەی بۆ فراوان و رووناك بکەوە[2]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- سوننەتە چاوی مردوو دابخەی، ئەمەش یەکدەنگی موسڵمانانی لەسەرە، حیکمەتیش لەمەدا ئەوەیە نەوەك گەر دانەپۆشری دیمەنی ناشیرین بێت.
- دوعاکردن بۆ مردوو لەو کاتەی دەمرێت و دوعاکردن بۆ ماڵ و خێزانەکی لە کاروباری دونیا و دوارۆژدا.

## نارازی بوون و شینکردن و هاتوهاواری قەدەغەکرد:

جابیری کوڕی عەتیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا هات سەردانی عەبدوڵڵای کوڕی سابتی کرد، بینی لە هۆش خۆی چووە، هاواری لە گوێیەکانی کرد، بەڵام وەڵامی نەدایەوە.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"إنا لله وإنا إليه راجعون"**، پاشان فەرمووی: **"ئەی باوکی رەبیع، ئاگامان لە تۆ نەما"**.

---

[1] موسلیم (٣٠١٤) گێڕاویەتیەوە.

[2] موسلیم (٩٢٠) گێڕاویەتیەوە.

ئافرەتەکانی هاواریان لێ هەڵسا و دەستیان کردە گریان.

جابریش دەستی کرد بە بێدەنگ کردنیان.

پێغەممبەر ﷺ فەرمووی: **"لێیان گەڕێ بابگرین، تا واجب دەبێ، ئینجا با کەس نەگرییێت".**

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چی واجب دەبێت؟

فەرمووی: **"ئەگەر مرد".**

کچەکەی بە باوکی گوت: سوێند بە خوا تۆ لەبەر ئەوەی خۆت بۆ جیهاد ئامادەکردبوو، هیوام وایە بە شەهید حیساب کرابی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"خوای گەورە پاداشتی بە ئەندازەی نیەتەکەی دەداتەوە، ئێوە کێ بە شەهید دادەنێن؟".**

گوتیان: کوژران لە پێناو خوا.

فەرموو: **"شەهیدەکان جگە لە کوژران لە پێناوی خوا، حەوت جۆرن: ئەوەی بە پەتا (تاعون) بمرێت شەهیدە، خنکاو شەهیدە، ئەوەی بەنەخۆشی گرێ لە بن باڵی بمرێ شەهیدە، ئەوەی بە ژانەسك بمرێت شەهیدە، سوتاو شەهیدە، ئەوەی دەکەوێتە ژێر پاشماوەی روخاو شەهیدە، ئافرەتی دووگیان بمرێت شەهیدە [1]".**

هەروەها فەرموویەتی: **"لە ئێمە نییە ئەو کەسەی لە دەموچاوی خۆی دەدات، جل دەدڕێنێت و بە هاواری سەردەمی نەفامی هاوار دەکات [2]".**

ئەبو مالیکی ئەشعەری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت **"چوار شت لەناو ئوممەتەکەم لە کاروباری نەفامین و وازی لێ ناهێنن: شانازی کردن بە بنەماڵە، تانەدان لە رەچەڵەك، داواکردن لە ئەستێرەکان بۆ باران بارین، شین و هاتوهاوار بۆ مردوو".**

هەروەها دەفەرموێت: **"ئەوەی شین و سەردولکە بکات بۆ مردوو، بەر لە مردنی تەوبە نەکات، لە رۆژی دواییدا رایدەگرن، پۆشاکێکی لە قەترانی لەبەر دەکەن، لەگەڵ کراسێك کە لە (جەرِب) دروستکراوە [3]".**

---

[1] المالك لە (الموطأ ٥٢٢) و النسائي (١٨٤٦) و ئەبو داود (٣١١١) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز/ لا٤٠) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] بوخاری (١٢٧٩) و موسلیم (١٠٣) لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێراویانەتەوە.

[3] **"سربال من قطران"**: واتە کراسێکی دروستکراوە لە مسی تواوە، **"درع من جرب"**، جۆرە کراسێکی ئافرەتانە، واتە کراسێکی دروستکراو لە (نەخۆشی گەڕی) لەسەری لەبەر دەکرێت، واتە: هەموو پێستی گەڕ دەبێت، گەروگولی و خورشت وەکو کراسەکە ئەندامەکانی لاشەی دەگرێتەوە و پێیوە دەنوسێت، ئینجا ئەو

## قەدەغەی دەکردن رقیان لە نەخۆشی ببێتەوە و قسەی پێ بڵێن:

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷛ دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای دایکی سائیب و پێی فەرموو: **"ئەی دایکی سائیب چیتە وا پەلە قاژە دەکەیت؟"**.

گوتی: تام لێیە، دەك خوای گەورە بەرەکەتی تێ نەخا.

فەرمووی: **"جنێو بە تا مەدە، چونکە گوناهەکانی نەوەی ئادەم خاوێن دەکاتەوە هەروەکو چۆن ئاگر پیسی ئاسن لادەبات"**[1].

چونکە ئاسان گەر بە ئاگر داخ بکرێت، پیس و ژەنگییەکەی نامێنێت و خاوێن دەبێتەوە، بە هەمان شێوەش نەخۆشی (تا) وا لە مرۆڤ دەکات.

ئیبن عەباس ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ئەعرابییەکی کرد و پێی فەرموو: **"لا بأس طهورٌ إن شاء الله"**، واتە — هیچ نییە پاکبوونەوەیە إن شاء الله.

گوتی: پاکبوونەوەی چی! نەخێر، بەڵکو تایەکی گەرم و بە ئێش لەسەر پیرێکی بێ هێز دەیبات بۆ گۆڕستان!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لەوە باشتر هەیە"**[2].

موعەممەر کە لە زەیدی ئەسلەم دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئەو ئەعرابییە دوایی بەم نەخۆشییە وەفاتی کرد[3].

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- ئاساییە پێشەوا سەردانی نەخۆشێك بکات لە خەڵکی خۆی، گەرچی با دەشتەکییەکی دڵڕەقیش بێت، هەروەها ئاساییە زانایەك سەردانی نەفامێك بکا، بۆ ئەوەی فێرە ئارام گرتنی بکات لەسەر ئازار، نەوەك ئەو ئازارە ببێتە قەزا و قەدەری خوا و سەرەنجام ببێتە هۆی ئەوەی خوای گەورە لێی رازی نەبێت.

---

ناوچانە بە (قەتران) وەك دەرمانێك بۆی تەداوی دەکرێن، بەڵام دەرمانەکە خراپترە لە دەردەکە، بە هۆی ئەوەی (قەتران) خۆی لە خۆیدا ماددەیەکی تێدایە گەرمی و ئاگر لە پێست خێراتر دەکات و بۆنی بۆگەن دەکات، رەنگی رەش دەکات، خەڵك بێزی لێ دەبێتەوە.... (الموسوعة الحديثة/ شروح الحديث) ماڵپەری (الدرر السنية).. (و).

[1] موسلیم (٢٥٧٥) گێڕاویەتیەوە.

[2] بوخاری (٣٦١٦) گێڕاویەتیەوە.

[3] شرح البخاری لإبن بطال (٤٧٣/١٧).

- سوننەت وایە قسە لەگەڵ نەخۆشدا بکرێت، بەو قسانەی دڵی دەداتەوە، وەك ئەوەی پێی بڵێ نەخۆش و ئازارەکانت دەبێتە مایەی خاوێن بوونەت لە گوناه و پلەت پێ بەرز دەبێتەوە و پاداشتت پێ زیاد دەبێت، نابێت بۆ وەسوەسەکانی شەیتان جێبهێڵدرێت و وای لێ بکات ناڕازی بێت، نەوەك خوای گەورە لەسەر ئەو ناڕازی بوونە و گومان خراپییە بیگرێت [(١)].

**ابن الجوزی** دەڵێت: زۆرێك لە خەڵك لە کاتی مردنی خۆشەویستانیان توشی ریسوایی بوونە، هەیانە جلەکانی خۆی دڕاندووە و هەیانە لەدەموچاوی خۆی داوە، هەشیانە ناڕازی بوونی دەربڕیووە!

پیاوێکی پیرم بینی تەمەنی نزیکەی هەشتا ساڵ دەبوو، زۆر پارێزگاری دەکرد لە نوێژی بە کۆمەڵ، ئەو پیاوە کوڕی کچەکەی مرد، گوتی: با کەس چیتر دوعا نەکات، چونکە خودا قەبوڵی ناکات.

پاشان گوتی: بەڕاستی خودا دژی ئێمەیە و لێناگەڕێ کوڕێکمان بۆ بمێنێ!!

ئینجا زانیم کە نوێژ و کردەوە خێرەکانی تەنیا عادەتێك بووە، لە خواناسین و باوەڕەوە سەرچاوەی نەگرتووە، ئا ئەوانەن کە خوای گەورە دەپەرستن لە شێنەیی [(٢)].

**قەدەغەی دەکرد کەسێك ئاواتی مردن بخوازێت بە هۆی ئەو نەخۆشی و بەڵایەی توشی بووە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"با کەس ئاواتی مردن نەخوازێت لەو ناخۆشییەی تووشی بووە، ئەگەر هەر وازی نەهێنا، با بڵێت خودایە ژیانم پێ ببەخشە ئەگەر ژیان بۆ من باشترە، ئەگەریش مردن باشترە بۆم ئەوا بمرێنە [(٣)]"**.

کە فەرمووی: **"لەو ناخۆشییەی توشی بووە"** هەندێك لە زانایانی سەلەف ئەم ناخۆشیەیان بە ناخۆشی دونیا لێك داوەتەوە، چونکە ناڕازی بوونە لەو قەزا و قەدەرەی بۆی بڕاوەتەوە.

بەڵام ئەگەر ناخۆشییەکەی لە بارەی دوارۆژییەوە توش بوو، ترسا لە دینەکەی، ئەو کات ئەم قەدەغەیە نایگرێتەوە [(٤)].

---

(١) فتح الباری (١٠/١١٩)، شرح البخاری لإن بطال (١٧/٤٧٣).
(٢) الثبات عند الممات (١/٤١).
(٣) بوخاری (٥٦٧١) و موسلیم (٢٦٨٠) گێراویانەتەوە.
(٤) فتح الباری (١٠/١٢٨).

النووی دەڵێت: لەم فەرمودەیەدا ئاماژەکراوە کە ئاوات خواستن بە مردن، لەبەر ناخۆشییەك کە توشی بووە ناپەسەندە، وەك هەژاری یان دوژمنداری، یان هەر ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی دونیا.

بەڵام ئەگەر ترسا لە فیتنەیەك توشی دینی بێت ئەو کات بە گوێری مانای ئەم فەرموودەیە هیواخواستنەکە ناپەسەند نییە [1].

هەندێك لە زانایانی سەلەف ئەم کارەیان کردووە: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لە دوایین ساتەکانی تەمەنیدا دەیگوت: خودایە تەمەنم گەورە بووە و هێزم لاواز بووە و گەلەکەم زۆر پەرت و بڵاو بووە، بۆلای خۆتم ببەوە بێ ئەوەی کەمتەرخەمییەك یان زیادەڕۆییەك ئەنجام بدەم [2].

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولرەحمان دەڵێت: سەردانی ئەبو هورەیرەم کرد و سەریم هێنایە ناو باوەشی خۆم، پاشان گوتم: خودایە شیفای ئەبو هورەیرە بدەی.

گوتی: خودایە مەیگەڕێنەوە.

پاشان گوتی: ئەی ئەبو سەلەمە ئەگەر دەتەوێ ئێستا بمری ئەوا بمرە.

گوتم: ئەی ئەبو هورەیرە ئێمە ژیانمان خۆش دەوێت.

گوتی: سوێند بەو کەسەی گیانی ئەبو هورەیرەی بە دەستە، ڕۆژگارێك بەسەر زانایاندا دێت مردنیان لەلا خۆشەویستر دەبێت لە زێری سوور، یەکێکیان بەلای گۆڕی برایەکەیدا دەڕوات و دەڵێت: بریا لە جێگای ئەو بام [3].

بەڕاشکاویش فەرموودەی ئیبن عەباس ﷺ ئاماژە بەمە دەکات، کە تیایدا هاتووە: **"پەروەردگارا.. ئەگەر ویستت بەندەکانت توشی فیتنەیەك بکەیت ئەوا بۆلای خۆتم ببەوە، بێ ئەوەی بە فیتنە تاقی بکرێمەوە"**[4].

## موسڵمانی فێردەکرد کە تەمەن درێژی بۆی خێرترە گەرچی بەخۆشی نەخۆش بێت:

تەمەن درێژی خێرە بۆ باوەڕدار، چونکە هەرکاتێك تەمەنی درێژ بوو کردەوەی باشی زۆر دەبێت.

ئەبوبەکر ﷺ دەڵێت: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا باشترین کەس کامەیە؟

---

(1) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٨/١٧).

(2) مالك لە (الموطأ/ ١٥٦٠) گێڕاویەتیەوە.

(3) الحاكم (٨٥٨١) گێڕاویەتیەوە، لەسەر مەرجی (الشیخین) بە "سەحیحی"ی داناوە.

(4) الترمذي (٣٢٣٣) گێڕاویەتییەوە ئەلبانی لە ( الإرواء ٦٨٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

فەرمووی: **"ئەو کەسەی تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی چاك بێت"**.

گوتی: ئەی خراپترین کەس کامەیە؟

فەرمووی: **"ئەوەی تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی خراپ بێت."**[1]

جا ئەگەر موسڵمانێك کەوتە ناو تەنگانەیەك، یان توشی نەخۆشییەك بوو ئەوا با داوای مردن نەکات، بۆ ئەوەی دانەبڕێت لە کردەوەی باش.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"با کەس لە ئێوە داوای مردن نەکات، ئەگەر چاکەکار بن و ئەوا لەوانەیە چاکەکانی زیاد بکات، ئەگەریش خراپەکار بوو، لەوانەیە تەوبە بکات و پەشیمان بێتەوە"**[2].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم فەرموودەیە وەکو بڵێی پێمان دەڵێت: ئەوەی چاکەکارە، با واز لە داواکردنی مردن بێنێت، بەردەوام بێت لەسەر کارە چاکەکانی و زیادکردنی.

ئەوەی خراپەکاریشە، با ئەویش واز لە داواکردنی مردن بێنێت، بۆ ئەوەی لەسەر ئەو کارە خراپانە نەمرێت و نەکەوێتە مەترسی[3].

**جاری واهەبوو رێگری دەکرد خاوەن بەڵام سەیری کوژراوەکان بکات، نەوەك توشی شۆك بێت:**

لەوانە: بەسەرهاتی لەگەڵ سەفییە پاش کوژرانی حەمزەی برای ﷺ.

عروە دەڵێت: زوبەیری باوکم ﷺ پێی راگەیاندم، لە رۆژی ئوحددا ئافرەتێك هات، تا نزیك بوو کوژراوەکان ببینێت،

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی نەکرد بیان بینێت[4]، فەرمووی: **"ئەو ئافرەتە..! ئەو ئافرەتە..!"**.

زوبەیر دەڵێت: کە تێرامام زانیم کە ئەو سەفیەی دایکمە، چووم بۆ لای، پێش ئەوەی بگاتە کوژراوکان پێی گەیشتم، مستێکی لە سینگم دا، ئافرەتێکی بەهێز بوو، گوتی: بوەستە دەنا لێت رازی نابم.

گوتم: پێغەمبەری خوا دەفەرموێ وا مەکە.

جا وەستا، دوو پۆشاکی دەرهێنا و گوتی: ئەو دوو پۆشاکەم بۆ حەمزەی برام هێناون، چونکە هەواڵم پێگەیشتووە کوژراوە، لەناو ئەو دوو پۆشاکە کفنی بکەن.

---

[1] الترمذي (٢٣٣٠) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە ( صحيح الجامع ٣٢٩٧) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] بوخاری (٧٢٣٥) و موسلیم (٢٦٨٢) گێراویانەتەوە.

[3] فتح الباری (٢٢٢/١٣).

[4] لە گێرانەوەی بەیهەقیدا (٢٨٩/٣) هاتووە، حەزی نەکرد حەمزە بەو حاڵەوە ببینێت، چونکە موشریکەکان جەستەیان شێواندبوو، پێغبەر ﷺ زوبەیری نارد تا رێگری لە ئافرەتەکە بکات.

ئێمەش دوو پۆشاکەکەمان هێنان، بۆ ئەوەی حەمزەی پێ کفن بکەین، لە تەنیشت حەمزە پیاوێکی ئەنساری کوژراو بوو، چی بە حەمزە کرابوو بەویش کرابوو، شەرممان کرد حەمزە لەناو دوو پۆشاک کفن بکەین و ئەنسارییەکەش بێ کفن بێت.

گوتمان: پۆشاکێك بۆ حەمزە و ئەوی تریش بۆ ئەنسارییەکە، جا پێوانەمان کرد بینیمان یەکێکیان گەورەترە لە وی دی، جا هەردووکمان کفن کرد لەسەر ئەو پۆشاکەی بۆی دەبوو [1].

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی ئوحدا هاتە سەر حەمزە، بینی جەستەکەی شێوێندراوە، فەرمووی: **"ئەگەر لەبەر سەفیە نەبێت کە شتێکی لە دڵ دروست دەبێ، ئەوا جێم دەهێشت تا دڕندەکان دەیانخوارد، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا لەناو سکیاندا حەشر بکرێت"**.

پاشان داوای کرد پۆشاکی (النمرة)ی کرد [2] بۆی بێنن، گەر سەریمان پێ داپۆشیبایە بە پۆشاکەکە قاچەکانی بەدەردەکەوت، ئەگەریش قاچەکانیمان داپۆشیبایە سەری بەدەردەکەوت، جا سەریان داپۆشی [3].

بۆیەش ویستی ئەمە بکات (جێبهێڵدرێت تا دڕندەکان دەیخۆن)، بۆ ئەوەی حەمزە پاداشتەکەی بە تەواوی دەست بکەوێت، جەستەکەی هەموو لە پێناو خوا بەکارهێنرابێت تا ڕۆژی دوایی، یان بۆ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە کە جەستەی ئەویان شێواندووە، بەڵام ئازاری پێ نەگەیشتووە بۆیە شاردنەوە و نەشاردنەوەی وەکو یەکە [4].

**پێغەمبەری ﷺ خوا دڵدانەوەی دەکردن و ئازاری لەسەر سووك دەکردن:**

ئەسمائی کچی عومەیس ﵂ خێزانی جەعفەر دەڵێت: کە جەعفەر و هاوەڵەکانی تووشی ئەو بەڵایە بوون، چوومە لای پێغەمبەری خوا، چل پێستەم خۆشکردبوو هەویرەکم شێلابوو، منداڵەکانم شووشتبوون، ڕوونم لە پرچیان دابوو خاوێنم کردبوونەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"کوڕەکانی جەعفەرم بۆ بێنن"**.

منیش بۆم هێنان، جا بۆنی کردن، چاوەکانی پڕ فرمێسك بوون.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ لە جێگای دایك و باوکمی، چی دەتگرێنێت، ئایا لەبارەی جەعفەر و هاوەڵەکانی هیچ هەواڵێکت پێگەیشتووە؟

---

[1] ئەحمەد (١٤٢١) گێراویەتیەوە، شعیب الأرناؤوط بە "حەسەن"ی داناوە

[2] ئەو پۆشاکە عەبایەك بووە لە سوف دروستکراوە و خەت خەت بووە.

[3] الترمذي (١٠١٦) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز/ لا ٦٠) بە "سەحیح"ی داناوە

[4] تحفة الأحوذي (٤/٨٣).

فەرمووی: "**بەڵێ، ئەمڕۆ ئەوان کوژران**".

پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆلای خێزانەکانی و پێی فەرموون: "**ئاگاتان لە ماڵ ومنداڵی جەعفەر نەبڕێت، لەوەی خواردنیان بۆ دروست بکەن ئەوان سەرقاڵن بە کاروباری خاوەنەکەیانەوە**"[1].

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێت: کاتێك هەواڵی کوژرانی جەعفەر هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**خواردن بۆ خانەوادەی جەعفەر دروست بکەن، چونکە ئەوان تووشی شتێك هاتوون سەرقاڵی کردوون**"[2].

موبارەکفوری دەڵێت: ئەو خەمەی توشی خانەوادەی جەعفەر بوو، رێگرییووە لەوەی خواردن دروست بکەن بۆ خۆیان، چونکە ئەگەر دروستیان بکردبایە توشی ناخۆشی زیاتر و خەمۆکی دەبوون.

الطيبي دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتە لەسەر خزم و کەس و دراوسێ خواردن بۆ خاوەن مردوو دروست بکەن[3].

**لەوانەیە کاروباری خاوەن بەڵاکانی بگرتبایە ئەستۆی خۆی:**

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سوپایەکی نارد زەیدی کوڕی حاریسەی کردە ئەمیر بەسەریانەوە، فەرمووی: "**ئەگەر زەید کوژرا یان شەهید بوو ئەوا جەعفەر بکەنە ئەمیر، ئەگەریش ئەو کوژرا یان شەهید بوو ئەوا ئەمیرتان عەبدوڵڵای کوڕی رەواحەیە**".

جا هەواڵیان گەیشتە لای پێغەمبەر ﷺ، هەڵسا چوو بۆ ناو خەڵك و وتاری دا و سوپاسی خوای کرد و فەرمووی: "**برایەکانتان رووبەرووی دوژمن بوونەوە و زەید ئاڵاکەی هەڵگرت، جەنگا تاوەکو کوژرا یان شەهید بوو، لە دوای ئەو جەعفەری کوڕی ئەبوتاڵیب ئاڵاکەی هەڵگرت ئەویش شەڕی کرد تا کوژرا یان شەهید بوو، پاشان عەبدوڵڵای کوڕی رەواحە ئاڵاکەیی هەڵگرت، ئەویش جەنگا تا کوژرا یان شەهید بوو، پاشان شێرێك لە شێرەکانی خودا، کە خالیدی کوڕی وەلیدە، ئاڵاکەی هەڵگرت و خوای گەورە لەسەر دەستی سەرکەوتنی بەخشی**".

---

[1] ئەحمەد (٢٦٥٤٦) گێراویەتەوە: وقال في مجمع الزوائد: (٦/٢٣٦): رواه أحمد، وفيه امرأتان لم أجد من وثقهما ولا جرحهما وبقية رجاله ثقات.

[2] ئەبو داود (٣١٣٢) و الترمذي (٩٩٨) و ابن ماجة (١٦١٠) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٠١٥) بە "سەحیح"ی داناوە

[3] تحفة الأحوذي (٤/٦٧).

جا پاش سێ ڕۆژ هاتە لای کەس و کاری جەعفەر فەرمووی: **"چیتر مەگرین بۆ جەعفەری برام، کوڕەکانیم بۆ بانگ بکەن."** [١]

دەڵێت: ئێمەیان هێنا کە وەك جوچکەی باڵندە وابووین.

فەرمووی: **"سەرتاشم بۆ بانگ بکەن"**.

جا سەرتاش هات و سەری تاشین [٢].

پاشان فەرمووی: **"سەبارەت بە موحەممەد ئەوا دەڵێی نوسخەی ماممان ئەبو تالیبە، عەبدوڵلاش لە شێوە و روخسار و رەوشت بە من دەچێت"**.

پاشان دەستی منی گرت و فەرمووی **"خودایە کەسێکی باش بکەیە سەرپەرشتی خێزانی جەعفەر و بەرەکەت بخەیتە ماڵی عەبدوڵلا"**. ئەمەی سێ جار فەرموو.

لەو دەمەدا دایکمان هات و باسی هەتیوی ئێمەی کرد، غەمباری بۆ دەربڕین.

فەرمووی: **"ئایا لە هەژاری لێیان دەترسیت، من لە دونیا و دوارۆژ خەمخۆریانم"** [٣].

## خەڵکی بۆ سەرپەرشتیکردنی بێوەژن و یەتیمان هان دەدا:

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"من لەگەڵ ئەو کەسەی سەرپەرشتی بێ باوکێك دەکات، لە بەهەشتدا ئاواین"**، ئاماژەی بۆ هەردوو پەنجەی شایەدوومان و ناوەند کرد [٤].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەوەی کاروباری بێوەژنەکان بەڕێوە دەبات و سەپەرشتیان دەکات، وەکو موجاهیدە لە پێناوی خوا-** وابزانم فەرمووی: **وەکو کەسێکە هەر شەونوێژ بکات و نەوەستێت، وەك ڕۆژووەوان وایە کە هەردەم بە ڕۆژوو بێ و نەیشکێنێ"** [٥].

## هەندێك ماڵ و سامانی دەدایە خاوەن بەلایەکان، بۆ ئەوەی ئازاری بەلاکەیان لەسەر سووك بکا:

لەوانە: پێدانی ماڵ بۆ هەندێك لە ئەهلی مەککە دوای فەتحکردنی تائیف، هەتا ئەنسارییەکان شێتیکان لەناو دڵ و دەروونیان دروست بوو:

---

[١] کوڕەکانی عەبدوڵلا و عەون و موحەممەد بوون.

[٢] بۆیە سەری تاشین چونکە دایکیان لەبەر غەمباری و دڵتەنگی بە هۆی شەهید بوونی مێردەکەی نەدەپڕژایە سەر شانەکردنی قژیان، جا بۆیە ویستی لە پیسی ئەسپێکان پاکیان بکاتەوە.

[٣] ئەحمەد (١٧٥٣) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز/ لا ١٦٦) بە "سەحیح"ی داناوە، پێشتر باسکراوە.

[٤] بوخاری (٥٥٤٦) گێڕاویەتیەوە.

[٥] بوخاری (٥٣٥٣) و موسلیم (٢٩٨٢) گێراویانەتەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەسێك لە ئەنسارییەکان کۆکردەوە، فەرمووی: **"قورەیش تازە موسڵمان بوونە و هێشتا نەفامییەتیان لەناو داماوە و توشی بەڵاهاتوو** (وەك کوژرانی خزمەکانیان و فەتحکردنی شارەکەیان) **من ویستم سارێژی برینەکەیان بکەم و دڵیان بە ئیسلام پەیوەست بکەم**"[1].

**دڵی ئەو کەسەی دەدایەوە کە هەمووماڵەکەی لە پێناو خوا لە دەستدا، وەك لە بەسەرهاتی سوهەیبی ڕومیدا هاتووە:**

سوهەیبی ڕومی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ **بۆ مەدینە کۆچی کرد و** ئەبوبەکریش کۆچی کرد، منیش ویستم بڕۆم، بەڵام چەند گەنجێکی قورەیشی ڕێگەیان لێ گرتم، نەیان هێشت بڕۆم، ئەم شەوە هەر نەنوستم و بەخەبەر بووم.

گوتیان: ئەمە سکی دێشی.

بەڵام سکم نەدەهێشا، ئەوان نوستن.

منیش دەرچوم، هەندێکیان شوێنم کەوتن بۆ ئەوەی بمگەڕێننەوە.

پێم گوتن: ئەگەر چەند ئۆقیەك زێڕتان پێ بدەم لێ دەگەڕێن بڕۆم؟

گوتیان: بەڵێ، جا لەگەڵیان گەڕامەوە مەککە.

گوتم: ژێر ئەو دەرگایە هەڵکەنن چەند ئۆقیەکی زێڕێکی تێدایە، بڕۆنە لای فڵانەکەسیش، چەند خشڵێکی لەلایە وەری بگرینەوە.

جا دەرچووم تا گەیشتم بە پێغەمبەری خوا لەقوبا پێش ئەوەی لەوێ بڕوا، کاتێك منی بینی فەرمووی: **"ئەی باوکی یەحیا بەڕاستی لە فرۆشتنەکەتدا قازانجت کرد"**.

گوتم: کەس پێش من نەگەیشتۆتە تۆ، ئەمە تەنیا جوبرل هەواڵی پێداوی.

خوای گەورە لەبارەی سوهەیب ئەم ئایەتی دابەزاند: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾[2] البقرة: ٢٠٧ واتە: (هەندێ خەڵك هەن خۆیان دەفرۆشن بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی بەخوا، خوای گەورەش بەسۆز و میهرەبانە بەرامبەر ئەو جۆرە بەندانەی).

---

[1] بوخاری (٤٣٣٤) گێڕاویەتیەوە.

[2] الحاكم (٥٧٠٦) گێڕاویەتیەوە. بە "سەحیح"ی داناوە، الذهبي ڕەزامەندی دەربڕیوە لەسەری.

### فەرمانی دەکرد یارمەتی ئەو کەسانە بدەن کە توشی زیانی ماددی هاتوون:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ لە فرۆشتنی بەروبوومەکەی تووشی زەرەر هات و بەو هۆیەوە قەرزێکی زۆری کەوتە سەر.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: "**خێری پێ بکەن**"، جا خەڵکی خێریان پێ کرد، بەڵام ئەو خێرە هێندە نەبوو بتوانێ قەرزەکانی پێ بداتەوە.

پێغەمبەر ﷺ بە خاوەن قەرزەکانی فەرموو: "**ئەوەی هەیەتی ئەوە ببەن، هەر ئەوەشتان بۆ هەیە**[١]".

مانای ئەوەیە: ئێستا هەر ئەمەتان بۆ هەیە، ناتوان زیاتر داوای لێ بکەن، چونکە ناتوانێت قەرزەکانی هەموو بداتەوە و نەبوونە، بەڵکو مۆڵەتی پێ بدەن هەتاوەکو گوزەرانی باش دەبێت[٢].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دڵدانەوەی کەسی پێویست و موحتاج، هانی خەڵك بدرێت خێر بەو کەسە بکەن کە قەرزدارە.
- یارمەتیدان لەسەر چاکە و خێر.
- ئەو کەسەی لەبەر هەژاری ناتوانێت قەرزەکەی بداتەوە ئەوا داوای لێ ناکرێت و زۆری لێ ناکرێت و ناخرێتە بەندینخانە.
- کەسی موفلیس هەمووماڵەکەی دەدرێتە خاوەن قەرزەکان و هیچی بۆ بەجێناهیڵدرێت، تەنیا پۆشاکەکەی و هاوشێوەی نەبێت[٣].

### بە موژدە پێدان، ئازاری بەڵاکانی لەسەر سووك دەکردن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دایکی رەبعی کچی بەرا، کە دەکاتە دایکی حاریسەی کوڕی سوراقە، هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا: ئایا لەبارەی حاریسەوە هەواڵم پێ نادەی، -حاریسە لە جەنگی بەدر بە تیرێك کوژرا، کە هاوێژەرەکەی نادیار بوو- ئەگەر لە بەهەشت بێت، ئەوا ئارام دەگرم، ئەگەر ئەوەش نەبێت ئەوا زۆری بۆ دەگریێم.

فەرمووی: "**ئەوە چیتە دەڵێی عەقڵت لە دەستداوە، خۆ ئەوە هەر بەهەشتێك نییە، بەڵکو چەند بە هەشتێکی زۆرە، ئەویش وا لە بەهەشتی فیردەوسە**[٤]".

---

[١] موسلیم (١٥٥٦) گێڕاویەتەوە.
[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/٢١٧).
[٣] سەیری: شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم بکە (١٠/٢١٨).
[٤] بوخاری (٦٥٧٦) گێڕاویەتیەوە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەمە پێش حەرامکردنی گریان و لەخۆدان بووە.. چونکە حەرامکردن گریان و لە خۆدان پاش شەڕی ئوحد بوو، ئەو بەسەرهاتەش دوای شەڕی بەدر بووە [1].

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: رۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ منی بینی، فەرمووی: **"ئەی جابر بۆ چی دەتبینم غەمگینی؟"**.

گوتم: باوکم لە شەڕی بەدر شەهید بوو، ماڵ و منداڵ و قەرزێکی زۆری جێهێشتووە.

فەرمووی: **"ئایا مژدەت پێ بدەم خوای گەورە چی بە باوکت داوە؟"**.

دەڵێت: گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"خوای پەروەردگار قسەی لەگەڵ هەر کەسێك کردبێت، لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵ کردووە، بەڵام باوکتی زیندوو کردەوە بێ بوونی پەردە قسەی لەگەڵ کردووە، پێی فەرموو: بەندەکەم دوام لێ بکە چیت دەوێت پێتی دەدەم.**

**گوتی: خوایە زیندووم بکەرەوە تا جارێکی تریش لە پێناو تۆدا بکوژرێم.**

**خوای گەورەش فەرمووی: من پێشتر بڕیارم داوە کە کەس بۆ دونیا ناگەڕێتەوە"**.

دەڵێت: جا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾ [2] آل عمران: ١٦٩

**ئاماژەی بە هەندێك خواردن بۆ دەکردن، کە لەوانەیە ئازاری بەلا لەسەریان سووك بکات:**

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: ئەگەر مردووێکیان لێ بمردبا، ئافرەتەکان بەم هۆیەوە کۆ دەبوونەوە، پاشان پەرت و بڵاو دەبوون، ئەگەر تەنیا خۆیان و خزمە نزیکەکانیان مابوونایەوە، ئەوا فەرمانی دەکرد تەلبینەیەك [3] لێ بندرێت، پاشان تێکوشیەك، دواتر تەلبینەکەیان لەسەر تێکۆشیەکە دەکرد، پاشان دەیگوت: لێی بخۆن، من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: **"تەلبینە دڵی نەخۆش سارێژ دەکات و هەندێك خەم و نیگەرانی لا دەبات"**.

واتە: دڵ ئاسودە دەکات و خەم لەسەری لادەبات و چالاکی دەکات.

سوننەتە خواردنی (تەلبینە) بۆ کەسی خەمبار دروست بکرێت [4].

---

[1] فتح الباری (٦/٢٧).

[2] الترمذي (٣٠١٠) و ابن ماجة (١٩٠) گێراویانەتەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٧٩٠٥) بە "سەحیح"ی داناوە

[3] تەلبینە: شلەیەکە لە ئاردی جۆ دروست دەکرێت.

[4] زاد المعاد (٤/١٢٠).

## چەند سوودێکی پزیشکی تەلبینە:

دکتۆر زەغلول نەجار دەڵێت: تەلبینە شلەی جۆیە، تینوویەتی لادەبات، بۆ میزکردن باشە، هەرسکردن سانا دەکات، بە سوود بۆ کۆکە و زبری قورگ و قورسی هەناسەدان و خاوێنکردنەوەی گەدە، هەروەها بە سوودە بۆ نەخۆشییەکانی میزەڕۆ و گورچیلە و دابەزاندنی گەرمی لەش، بە شێوەیەکی گشتی لاشە بەهێز دەکات [1].

لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە، کە جۆ کۆلیسترۆڵی خوێن دادەبەزێنێت و بە جۆرێك دەچێتە ناو جگەر و ناو شوێنی دروستکردنی کۆلیسترۆڵ.

گۆڤاری (لیبدن) لە ساڵی ١٩٨٥ راپۆرتێکی لەبارەی سوودەکانی جۆ و هەندێك لەو رووەکانەی چارەسەری کۆلیسترۆڵ دەکەن لە ناو خوێندا بڵاو کردەوە، لە راپۆرتەکەدا هاتووە: چەند کەسانێکی شارەزای بەشی کشتوکاڵ لە ئەمریکا هەڵسان بە ئەنجامدانی چەند لێکۆڵینەوەیەك لەسەر جۆ، دەرکەوتووە کە پێك دێت لە سێ توخم هەموویان هەڵدەستن بە دابەزینی کۆلیسترۆڵی زیانبەخش لە خوێن.

دکتۆر زەغول نەجار دەڵێت: لێکۆڵینەوە تازەکان دەریانخستووە، کە ئەو پێکهاتە کیمیاویانەی لەناو جۆدا هەیە، کاریگەریەکی ئەرێنی هەیە لەسەر کرداری گەیاندن لە نێوان خانە دەمارییەکانی مێشك، ئەمەش دەبێتە مایەی سووکردنی خەمۆکی و هێنانەدی رازیبوون و سینگفراوانی و دڵ ئارامی.

جۆرەکانی خەمکۆی ئەمڕۆ خۆیان لە کەموکوڕی ماددە کیمیاوییەکان لە جەستەی مرۆڤ دەبیننەوە.
چارەسەریەکەش لە بنەڕەتدا بەو خواردنانە دەبێت کە چارەسەری ئەم کەموڕموڕییە دەکەن، وەك شلەی جۆ، کە دەوڵەمەندە بەو پێکهاتە بە سوودانەی بۆ ئەم بارودۆخانە بەسوودن [2].

### سەردانی دەکردن و لە گوزەرانیانی دەپرسی و بەزەیی پێدا دەهاتنەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ نەدەچوو لای هیچ ئافرەتێك جگە لە خێزانەکانی خۆی، تەنیا دایکی سولیەم نەبێت، کە بەردەوام سەردانی دەکرد.
لەو بارەیە پرسیاری لێکرا، فەرمووی: **"من بەزەییم پێدا دێتەوە، چونکە برایەکەی لەگەڵمدا کوژرا"**[3].

(دایکی سولەیم) ناوی سەهلە، یان رومەیلە، یان مەلیکەی کچی مەلحانی ئەنسارییە ﷺ دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە، بە نازناوەکەی بەناوبانگە، لە ناوەکەیدا راجیایی هەیە.

---

[1] الاعجاز العلمي في السنة النبويه (٢/٩)، لە ماڵپەڕی دکتۆری ناوبراو.
[2] (المنهج) ماڵپەڕی فەرمی شێخ عوسمان الخميس (www.almanhaj.com).
[3] بوخاری (٢٨٤٤) و موسلیم (٢٤٥٥) گێراویانەتەوە.

براکەی حرامی کوڕی مەلحان لە شەڕی بیری (مەعونە)دا کوژرا، کە فەرمووی **"لەگەڵمدا"**. واتە: لەگەڵ سەربازەکانم، یان لەسەر فەرمانی من، یان بە گوێڕایەڵی من، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەشداری شەڕی بیری (مەعونە) نەکردووە، بەڵکو فەرمانی پێکردن بچنە ئەو شوێنە.

**لەو فەرموودەیەدا:** پاراستنی پەیمانی برایان و هاوەڵانی تێدایە، **هەروەها گرینگی دان** بە بەرژەوەندی کەس و کاریان دوای مردنیان دەردەکەوێت.

پێغەمبەر ﷺ بەسەردانەکانی دڵی دایکی سولەیمی دەدایەوە، **روونیشی دەکردەوە کە** براکەی لەگەڵ ئەودا کوژراوە.

هەروەها دەردەکەوێت ئەم هاوەڵە کە دوای مردنی خۆی، **پێغەمبەری خوای ﷺ** لەناو کەس و کاری خۆی جێهێشتووە، ئەمەش لە جوانی پەیمان پاراستنی **پێغەمبەری خوایە ﷺ**[1].

**تێبینی:** النووی دەڵێت: لە بەشی جیهاد ئەوەمان باسکرد، کە دایکی حرامی خوشکی دایکی سولەیم ئەوانە دوو پووری پێغەمبەری خوا بوون، نەزەرحەلال بوون، جا چ لە شیرپێدان، یان لە نەسەب، کە خەلوەتگرتن (تەنیابوون) لەگەڵیاندا حەلالە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە تایبەت دەچوە لایان، نە دەچوو لای هیچ ئافرەتێکی تر جگە لە خێزانەکانی نەبێت.

زانایان دەفەرموون: ئەوەی لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت ئەوەیە، کە دروستە نەزەرحەلاڵ بچێتە لای نەزەرحەلالەکەی، ئاماژەیەکیشی تێدایە کە نابێت پیاوی بێگانە بچێتە لای ئافرەتی بێگانە با پیاوی چاکیش بێت.

ئەو فەرمودانەمان لە پێشتر باس کرد، کە تەنیا بوون لەگەڵ ئافرەتی بێگانەدا حەرام دەکەن[2].

## فێری کردووین سەرەخۆشی لەیەکتری بکەین و هەست بە ئازاری خاوەن بەلایەکان بکەین:

عەمری کوڕی حەزم ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هەر باوەڕدارێك دڵی برایەکی خۆی بداتەوە لەبەلایەك و سەرەخۆشی لێ بکات، ئەوا خوای گەورە لە رۆژی دواییدا پۆشاك و خشڵی زێر و حورمەتی لەبەر دەکات"**[3].

---

[1] فتح الباري (٥١/٦).
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/١٦).
[3] ابن ماجة (١٦٠١) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح ابن ماجة ١٣٠١) بە "حەسەن"ی داناوە.

## هەروەها فێری کردووین لە ماتەمیندا چی بە یەکتری بڵێین:

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێت: کچێکی پێغەمبەر ﷺ بەدوای پێغەمبەری نارد بۆ ئەوەی بچێتە لای، چونکە کوڕێکی وا لە سەر مردنە.

ئەویش سەلامی بۆ نارد و فەرمووی: **"إنّ للهِ ما أخذ وله ما أعطى، وكُلُّ شيءٍ عِنده بأجل مُسمّى، فلتَصتبرْ، ولتحتسبْ."**[1]

## نوشتەی دەکرد بۆ ئەو هاوەڵانەی توشی نەخۆشییەک دەبوون:

یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید دەڵێت: شوێنەواری لێدانێکم دیت لە قاچی سەلەمە، گوتم: ئەی باوکی موسلیم، ئەو لێدانە چییە؟

گوتی: ئەوە لێدانێکە لە ڕۆژی خەیبەردا پێم کەوتووە تا خەڵکی گوتیان: سەلەمە بریندار بووە، جا چوومە لای پێغەمبەری خوا، سێ فووی بەسەرداکرد هەتاوەکو ئێستا ئازاری نەما[2].

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ هەندێك لە خانەوادەکەی دەکرد و دەستی ڕاستی بەسەردا دەهێنا و دەیگوت: **"اللهم ربَّ الناس، أذهِب البأس، اشفِهِ وأنت الشافي، لا شفاءَ إلا شفاؤك، شفاءً لا يُغادرُ سَقَما**[3]**"**.

موحەممەدی کوڕی حاتەب ﷺ دەڵێت: شلەیەك بەسەر دەستمدا ڕژا، سوتاندنی، دایکم منی بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە (ڕەحبە) بوو، لەبەرمە کە فەرمووی: **"أذهب البأس ربَّ الناس"**، زیاتریشی فەرموو: **"أنت الشافي، لا شافيَ إلا أنت**[4]**"**.

---

[1] بوخاری (١٢٨٤) و موسلیم (٩٢٣) گێراویانەتەوە، پێشتر باسکراوە.

[2] بوخاری (٤٢٠٦) گێڕاویەتیەوە.

[3] بوخاری (٥٧٤٣) و موسلیم (٢١٩١) گێراویانەتەوە،

[4] ابن حبان (٢٩٧٦) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (تحقيق موارد الضمآن ١١٨٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەژاران

هەژاری لە شەریعەتی ئیسلامدا واتە: کەموکوڕی لـە پێداویسـتییە بنەڕەتییـەکان، هـەر کەسێك بژێوییەکەی بەشی خۆی و خێزانەکەی نەکات ئەوا کەسێکی هەژارە [1].

**پێغەمبەری ﷺ خوا ئەوەی زیاد بووایە لە ماڵەکەی، دەیدایە هەژاران:**

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خـوا ﷺ لـە ماڵەکـەی خـۆی نەفەقـەی ماڵ و منداڵەکانی دەکێشا و زیادەکەی دەدایە هەژاران [2]".

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی خەیبەری کرد، بەشەکەی خۆی برد، کە پێـنج یـەك بوو، ئەوەی لێی خەرج کرد بۆ خێزانەکانی لێی خەرج کرد، زیادەکەشی دابەش کردە سەر هەژاران، عومەر دەڵێت: **سەبارەت بە خەیبەر، پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بە سـێ بـەش، دوو بۆ موسڵمانان و بەشێکیشی بۆ نەفەقەی خێزانەکانی، ئەوەی زیاد بوو لـە نەفەقـەی خێزانەکانی، دای بە هەژارانی موهاجیرەکان** [3].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ماڵی پێغەمبەر هەمووسەدەقەیە، تەنیا ئەوەی وەك نەفەقە دەیدات بە خێزانەکانی وەك جلوبەرگ و خواردن، سەبارەت بە میراتیش، میرات لە ئێمە ناگیرێت [4]".**

**پێغەمبەر ﷺ گەر هەژاری لە دەموچای هەندێك هاوەڵانی بدیبایە، پێی دڵگران دەبوو:**

جەریری کـوڕی عەبـدوڵڵا ﷺ دەڵێـت: لەبـەرە بـەیانێك ئێمـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ بووین، خەڵکێکی پێ خواس و رووت، جلێکی وەك پێسـتی پڵـنگ خـەت خـەتیان بەسـەر خۆیاندا هەڵکێشابوو، شمێرەکانیان لەخۆیان بەستبوو، زۆربەیان لە ئەهلی (مضـر) بـوون، بەڵکو هەموویان لە (مضر) بوو، کاتێك پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەوانی بـەو هەژارییـە بـینی، رەنگی دەموچاوی گۆڕا، چووە ژوورەوە، پاشان هاتـە دەرەوە، فـەرمانی بـە بـیلال کـرد بانگ بدات، جا بانگی دا و قامەتی کرد، پێغەمبـەری خـوا ﷺ نوێـژی کـرد و وتـارێکی دا و فـەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ﴾ تـا کۆتـایی ئایەتەکـە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا﴾ النساء: ١ هەروەها ئایەتی سورەتی حەشری خوێنـدەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ الحشر: ١٨

---

[1] مجموع الفتاوی (٢٨/٥٧٠).

[2] ئەبو داود (٢٩٧٥) و بوخاری (٢٩٠٤) و موسلیم (١٧٥٧) گێراویانەتەوە.

[3] ئەبو داود (٢٥٧٧) ئەلبانی لە (صحيح أبي داود ٢٩٦٧) بە "سەحیح"ی داناوە.

[4] ئەبو داود (٢٩٧٥) و بوخاری (٢٩٠٤) و موسلیم (١٧٥٧) گێراویانەتەوە.

ئینجا فەرمووی: **"با پیاوێك هەندێك لە دینارەکەی، یان درهەمەکەی، یان پۆشاکەکەی، ببەخشێت، یاخود رووبە گەنمێك یان رووبە جۆیەك"**. تا فەرمووی: **"تەنانەت با بە لەتە خورمایەکیش بێت"**.

دەڵێت: پیاوێکی ئەنساری هات کیسەیەکی لە دەستدابوو، لەبەر قورسیان نەیدەتوانی هەلی بگرێت، بەڵکو هەر نەیتوانی.

پاشان خەڵکی یەك لە دوای یەك هاتن خێریان کرد، هەتا دوو کۆمەڵەی گەورە لە خواردن و جلوبەرگ کۆکرایەوە، ئینج دەموچای پێغەمبەری خوم بینی وەك زێڕ گەشایەوە، ئینجا فەرمووی: **"هەر کەسێك کارێکی چاك لە ئیسلام دابهێنێت، ئەوا پاداشتی کارەکەی و پاداشتی ئەوانەشی دوای ئەو کاری پێ دەکەن بۆی دەنوسرێت، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە، هەرکەسێکیش کارێکی خراپ دابهێنێت، ئەوا گوناهی کارەکەی و گوناهی ئەوانەی دوایی ئەم کارە دەکەن بۆی دەنوسرێت، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهەکانی ئەوان کەم بێتەوە [1]"**.

النووی دەڵێت: هۆکاری دڵخۆشبوونی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی بە دەنگەوەهاتنی موسڵمانان بووە بۆ ملکەچی خوای پەروەردگار، هەروەها بەخشینیماڵیان لە پێناو خوا و جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەری خوا، کە لابردنی هەژارییە لەسەریان و بەزەیی هاتنەوەی موسڵمانانە بە یەکتری و هاریکاری کردنیانە لەسەر چاکە و تەقوا.

پێویستە لەسەر مرۆڤ هەر کە شتێکی هاوشێوەی ئەمەی بینی، دڵخۆش بێت و دڵخۆشبوونەکەی ئاشکرا بکات، دلخۆشبوونەکەشی بۆ ئەوە بێت کە باسمان کرد [2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە :**

- هاندان لەسەر دەستپێشخەریکردن بۆ چاکە و خێر، داهێنانی رێگای باش.
- هۆشداریدان و ئاگادارکردنەوە لە داهێنانی شتی پڕوپوچ و خراپ [3].

**سوننەتی چاك دوو جۆرە:**

**یەکەم:** سوننەتەکە خۆی لە شەرع هەبووبێت، دوایی کاری پێ نەکرابێت، پاشان یەکێك دی سەر لەنوێ کاری پێدەکاتەوە، هەروەکو نوێژی تەراویحی بە کۆمەڵ.

---

[1] موسلیم (١٠١٧) گێڕاوەتیەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٣/٧).
[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٤/٧).

**دووەم:** یان موسڵمانێك دەبێتە یەکەم کەس دەستپێشخەری بکات بە کارێك کە لە شەرع رێگە پێدراوە، هەروەکو حاڵی ئەو کەسەی دەستپێشخەری کرد بە بەخشین، پاشان خەڵکیش لە دوای ئەو دەستیان پێکرد و رەزامەندبوون لەسەر کارەکەی[١].

**پێغەمبەر ﷺ هەستی بە هەژاری و پێداویستی هەژاران دەکرد، بۆیە دڵی دەدانەوە و بانگهێشتی نا نخواردنی دەکردن:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: سوێند بەخوا من کەوتبوومە سەر زەوی لە برسان، لەبەر برسییەتی بەردم لە سکم بەستبوو[٢].

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گەر منت دەبینی کە لەبەرسان کەوتبوومە سەر زەوی لە نێوان مینبەر و حوجرەدا، لەهۆش خۆم چووم، هەر یەکێك دەهات پێی لە ملم دەنا و وای دەزانی من شێت بوومە، بەڵام تەنیا برسی بووم.

دەڵێت: رۆژێك لەسەر ئەو رێگایە دانیشتبووم کە خەڵك لێی دەردەچوون، ئەبوبەکر تێپەڕی، پرسیاری ئایەتێکم لە کتێبەکەی خوا لێکرد، بۆ ئەوە پرسیارم لێکرد کە تێرم بکات، بەڵام رۆشت و واینەکرد.

پاشان عومەر بەلامدا تێپەڕی، پرسیاری ئایەتێکم لە کتێبەکەی خوا لێکرد، بەهەمان شێوە بۆیە پرسیارم لێکرد تا تێرم بکا، بەڵام واینەکرد و چوو بۆ ماڵەکەی خۆی[٣].

کەمێك دوورکەوتمەوە، لەبەر برسێتی بەسەر دەمدا کەوتم، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر سەرم وەستاوە، پێدەکەنێ کاتێك منی بینی، جا دەستی گرتم و منی هەڵساندەوە زانی کێشەم چییە.

پاشان فەرمووی: **"ئەی باوکی هیر؟"**.

گوتم: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"دوام کەوە"**.

---

[١] شرح ریاض الصالحین (١/١٩٩) ابن عثیمن.

[٢] زانایان دەفەرموون: سوودی بەستنی بەرد لەسەر سك بۆ ئەوەیە کەسەکە بتوانێ خۆی رابگرێ، یان رێگری بکات لە شیبوونەوەی ئەو خواردنانەی لەناو سك دایە، چونکە بەردەکە بە ئەندازەی سکەکەیە، ئەوکات لاوازیەکەی کەمتر دەبێت، یان بۆ کەمبوونەوەی تینی برسیەتییەکەیە بە ساردی بەردەکە، (فتح الباری ١١/٢٨٤).

[٣] بەڵکو عوز بۆ ئەبوبەکر و عومەر هەیە، وا پێدەچێت بە رواڵەت لە پرسیارەکەی ئەبو هورەیرە تێگەیشتبن، یان زانیبێتیان مەبەستی چییە بەڵام لەو دەمەدا هیچیان نەبووە پێ بدەن.

دەڵێت: منیش دوای کەوتم، چووە ماڵەکەی خۆی، مۆڵەتم خواست بۆ چوونە ژوورەوە، ئەویش مۆڵەتی پێدام، جامێکی دیت شیری تێدابوو، فەرمووی: **"ئەو شیرەمان لە کوێ بوو؟"**.

گوتیان: فڵانەکەس بۆ ناردووین.

فەرمووی: **"ئەی باوکی هیر؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"برۆ بۆ لای ئەهلی صوففە [1] بۆلای من بانگیان بکە"**.

دەڵێت: ئەهلی صوففە ئیسلام بوون، ماڵ و منداڵیان نەبوو، خزم و کەسیشیان نەبوو، ئەگەر بەخشینێك بهاتبایە لێی نەدەخوارد و بۆیانی دەنارد، ئەگەریش دیارییەك بهاتبایە ئەوا بۆیانی دەنارد و خۆیشی لێی دەخوار و بەشداری پێ دەکردن.

ئەمە منی نیگەران کرد، گوتم: ئەم قومە شیرە چۆن بەشی ئەهلی صوففە دەکات؟!! من لە هەموویان لە پێشترم بەو قومە شیرە، بۆ ئەوەی هێز بێتەوە بەرم.

منیش نێردراوی ئەو بووم بۆ لایان، فەرمانم پێ دەکات جامە شیرەکە بگێڕم لەسەریان لەوانەیە بەشی من نەکات، من ئاواتەخواز بووم کەمێك لەو شیرەم بەربکەوێت!

هیچ چارەیەکیشم نەبوو ئەو کارە نەکەم، چونکە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بوو، بۆیە چوومە لایان و بانگم کردن.

جا ئەوان هاتن و مۆڵەتیان خواست، مۆڵەتی پێدان هەریەکەیان لە ماڵەکە شوێنێکی بۆخۆی دیاری کرد.

فەرمووی: **" ئەی باوکی هیر؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"ئەمە بگرە و پێیان بدە"**.

منیش جامەکەم بەدەست گرت و دامە پیاوێك خواردیەوە، تا تێر بوو، پاشان جامەکەی پێ دامەوە، منیش دەمدایە پیاوێکی تر، ئەویش تێری لێ دەخوارد، دواتر پێی دەدامەوە... ئا بەم شێوەیە تا گەیشتم بە پێغەمبەری خوا، کە ئەوان هەموویان تێریان خوارد.

---

[1] صوففە: شوێنێك بوو لە پاشکۆ و کۆتایی مزگەوتی پێغەمبەری خوا، بەر سێبەر بوو، دامەزرابوو بۆ نیشتەجێبوونی غەریبە و ئەو کەسانەی ماڵ و منداڵیان نییە، ژمارەیان بە گوێرەی ئەوانەی ژنیان دەهێنا یان دەمردن یان سەفەریان دەکرد زیاد و کەم دەبوو. (فتح الباري ٦/٥٩٥).

پێغەمبەری خوا ﷺ ی جامەکەی بەدەستگرت و لەسەر دەستی خۆی دانا و سەیرێکی منی کرد و پێکەنی و فەرمووی: " **ئەی باوکی هیڕ؟**".

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: "**تەنیا من و تۆ ماوینەتەوە**".

گوتم: راست دەکەی ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: "**دانیشە و بخۆرەوە**".

منیش دانیشتم و خواردمەوە.

فەرمووی: "**بخۆرەوە**".

منیش هەر خواردمەوە، هەربەردەوام دەیفەرموو "**بخۆرەوە**" تا گوتم: نەخێر سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق رەوانە کردووە هیچ شوێنێك نەماوە تێی بکەم.

فەرمووی: "**بمدەرەوە**"

منیش دامەوە دەستی، سوپاسی خوای گەورەی کرد و ناوی خوای لەسەر هێنا و ئەوەی مابووە خواردی.

دەڵێت: چاوم بە عومەر کەوتەوە، ئەوەی بەسەرم هات بۆم گێڕایەوە، پێم گوت: خوای گەورە لە تۆ باشتری پێدام بۆ ئەوەی خەمم لێ بخوات، سوێند بە خوا من پرسیاری ئایەتێکم لە کتێبی خوا لێکردی بەلام من شارەزاتر بووم لەتۆ لە تێگەیشتنی.

عومەر گوتی: سوێند بە خوا ئەگەر بمبردبایەوە ماڵەوە پێم خۆشتر بوو لەوەی چەند وشترێکی گرانبەهام هەبووایە [(١)].

جا پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەژار تێدەگەیشت و ئاگاداری نیشانەکانی هەژاری بوو کە لەسەر کەسی هەژار دەردەکەوێت، ئەوەی پێی بکرابایە یارمەتی دەدان.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- خزمەتکار ئەگەر ویستی شتێك بدا بە چەند کەسێك، ئەوا بە خۆی یەك بە یەك بەسەریان دەگەڕێ و دەیانداتێ و لێیان وەردەگرێتەوە، لێناگەڕێ میوانەکە خۆی بیدات بە هاوڕێکەی، چونکە ئەمە جۆرێك لە بێڕێزی تێدایە.
- موعجیزەیەکی گەورەی پێغەمبەری ﷺ تێدایە، کە بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی پێغەمبەرایەتی، ئەویش زۆربوونی خواردنە بە بەرەکەتی پێغەمبەر.

---

(١) بوخاری (٥٣٧٥)، (٦٤٥٢) و ترمذي (٢٤٧٧) گێراویانەتەوە

- دروستە لەخواردن تێربوون رووبدات تا دەگاتە ئەوپەڕی، ئەمەش لە وتەی ئەبو هورەیرە وەردەگیرێت کە گوتی: هیچ شوێنك نەماوە تێی بکەم، رازایبوونی پێغەمبەریش ﷺ لەسەر ئەمە.
- بەڵام نابێت تێربوون بکرێتە نەریت، چونکە دەبێتە مایەی تەمبەڵی لە بەندایەتیکردن و کارە خێرییەکان.
- شاردنەوەی پێداویستییەکان باشترە لە ئاشکراکردنی.
- دەستکراوەیی پێغەمبەر و قوربانیدان بە خۆی و خاوخێزانی و خزمەتکارەکەی تێدایە، ئەمەش لەبەر خاتری میوان.
- هەژاری هەندێك هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەر بەڕادەیەکی دژوار.
- گەورەیی ئەبو هورەیرە و شەرمکردنی لەوەی راستەوخۆ و ئاشکرا داواکارییەکەی بگەێنێت، هەروەها پێشخستنی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی لەسەر حەز و ئارەزوو و نەفسی، وێڕای ئەوەی زۆر پێویست بووە و حاڵیشی زۆر خراپ و دژوار بووە.
- کەسی بانگکراو گەر گەیشتە ماڵی بانگکەر، بێ مۆڵەت پێدان نابێت بچێتە ژوورەوە [1].

هەر ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: سێ رۆژم بەسەردا تێپەڕی هیچ خواردنێکم نەخوارد بوو، هەستام بۆ ئەوەی بچمە لای صوففە، هەر بەردەبوومەوە، مندالانیش دەیانگوت ئەبو هورەیرە شێت بووە.

دەڵێت: منیش پێم دەگوتن: بەڵکو ئێوە شێتن، تا گەیشتم بە صوففە.

لەوێ چاوم بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت، لەگەنێکی خواردنی تێکوشەی هێنابوو، ئەهلی صوففەی هەموو بانگ کرد، ئەوان دەستیان کرد بە خواردن مینش دەچوومە پێش لێیان بۆ ئەوەی بانگم بکەن، تا هەموو هەڵسان، لەناو لەگەنەکە هیچ نەمایەوە تەنیا چەند شتێك لە لێوارەکانی مایەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەمووی کۆکردەوە و بوو بە پاروویەك لەسەر پەنجەکانی خۆی دانا، پاشان پێی فەرمووم :" **بە ناوی خوا بیخۆ** ".

سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە بەردەوام لێم دەخوارد هەتا تێر بووم [2].

لە چیرۆکی ئیسلامبوون سەلمانی فارسیدا هاتووە، دەڵێت: چەند شتێکم لەلابوو کۆم کردبووە، کاتێك ئێوارەم کردەوە بردنم و رۆیشتم بۆلای پێغەمبەری خوا لە قوبا، چوومە

---

[1] فتح الباری (٢٨٩/١١).

[2] ابن حبان (٦٥٣٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعلیقات الحسان ٦٤٩٩) بە "زەعیف"ی داناوە.

لای و پێم گوت: پێم گەیشتووە تۆ پیاوێکی باشی، چەند کەسێکت لەگەڵدایە، کە غەریبەن و هەژارن، ئەمەش چەند شتێکە لەلام بۆ خێر هەڵم گرتووە، لە ئێوە شایەنتر کەسێکی تر نابینمەوە بیدەمێ.

دەڵێت: جا لێم نزیك کردەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویە هاوەڵەکانی **"بیخۆن"** بەڵام خۆی دەستی کێشایەوە و **لێی نەخوارد.**

گوتم: ئەمە یەکیان.

پاشان لەوێ ڕۆشتم، چەند شتێکمی ترم کۆکردەوە، **پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشتبوو بۆ** مەدینە، دواتر بردمە لای، گوتم: من بینم تۆ لە بەخشین ناخۆیت، **ئەمە دیاریەکە هێناومە** بۆت وەکو ڕێزلێنانێك.

جا پێغەمبەری خوا لێی خوارد و فەرمانی بە هاوەڵەکانی کرد، ئەوانیش لەگەڵیان خوارد.

دەڵێت: ئینجا گوتم: ئەمە دوو.. [1]

**پێغەمبەر ﷺ هەژارانی لە نێوان هاوەڵانی دابەش دەکرد بۆ ئەوەی نانیان پێ بدەن:**

ئیبن سیرین دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئێوارەی بکردبایەوە ئەهلی صوففەی دابەش دەکرد بەسەر هاوەڵەکانی، پیاو هەبوو پیاوێکی لەگەڵ خۆی دەبردەوە، هەیان بوو دووان هەشیان بوو سیان، هەت باسی ١٠ کەسی کرد [2].

حەسەن دەڵێت: ئەوەی مابایەوە پێغەمبەری خوا لەگەڵ خۆیدا دەیبردنەوەماڵەوە، لەوەی هەیانبوو خواردنی پێدەدان [3].

یەعیشی کوڕی تەخفەی غیفاری لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: باوکم یەکێك بوو لە هاوەڵانی صوففە، پێغەمبەری خوا فەرمانی بە هاوەڵانی کرد هەر پیاوێك یەکێك یان دووان لەگەڵ خۆیدا ببەنەوە، تا من پێنجەمینیان بووم مامەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"وەرن لەگەڵم"**.

ئێمەش لەگەڵی ڕۆیشتین بۆ ماڵی عائیشە، فەرمووی: **"ئەی عائیشە خواردنمان بدەرێ"**.

ئەویش خواردنی حەشیشەی [1] بۆ هێناین لێمان خوارد، دواتر خواردنی حەیسەی [2] بۆ هێناین، کە ئەندازەی باڵندەی قەتێیەك دەبوو، ئەویشمان خوارد.

---

[1] ئەحمەد (٢٣٢٢٥) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحە/٨٩٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] ابن أبی شيبە لە (المصنف ٢٧١٥٤) گێڕاوەتیەوە.

[3] البيهقی لە (شعب الايمان ١٠٣٣٣) گێڕاوەتیەوە.

پاشان فەرمووی: **"ئەی عائیشە ئاومان بدەری"**.

ئەویش گۆزەیەکی هێنا، لێمان خواردەوە، دوای ئەو جامێکی بچوکی هێنا کە شیری تێدابوو، ئەویشمان خواردەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەگەر حەزتان لێیە ئەم شەو بمێننەوە، ئەگەریش ناتانەوێ ئەوا بڕۆنەوە مزگەوت"**.

گوتمان: نا، بەڵکو دەچینە مزگەوت [3].

## هاوەڵەکانیشی لەسەر ئەم کارە هاندەدا:

عەبدولرەحمانی کوڕی ئەبوبەکری سدیق دەڵێت: ئەهلی صوففە کەسانێکی هەژار بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك فەرمووی: **"ئەوەی خواردنی دوو کەسی هەیە با کەسێك بباتەوە و بیکاتە سێ، ئەوەی خواردنی چوار کەسی هەیە با کەسێك بباتەوە و بیکاتە پێنج کەس"**.

پێغەمبەری خوا ﷺ دە کەسی بردەوە [4]، ئەبوبەکریش سێ کەسی بردەوە، ئێمەش بەخۆمان بریتی بووین لە: من و باوکم و دایکم و خێزانم، لەگەڵ خزمەتکارێکمان کە لە نێوان ماڵی ئێمە و ماڵی ئەبو بەکر بوو.

باوکم (ئەبوبەکر) عادەتی وابوو شەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی دەکرد، جا هاتە دەرەوە گوتی: ئەی عەبدولرەحمان تۆ میوانداری ئەو میوانانە بکە تا من دێمەوە.

دەڵێت: کاتێك ئێوارەمان کردەوە، خواردنمان بۆ هێنانە پێش.

بەڵام ئەوان دەستیان بۆ نەبرد، گوتیان تا خاوەن ماڵ نێتەوە خواردنمان لەگەڵ نەخوات ئێمە نایخۆین.

پێم گوتن: ئەو پیاوێکی توڕەیە، گەر ئێوە نەیخۆن دەترسم ئازارم بدات.

بەڵام ئەوان هەر ڕازی نەبوون و نەیانخوارد.

---

[1] حەشیشە خواردنێکە لە گەنم دروست دەکرێت، کەمێك دەهاڕدرێت و پاشان دەکوڵێندرێت و دوایی خورما یان گۆشتی تێدەکرێت.

[2] خواردنێکە لە خورما و کەشك و ڕۆن دروست دەکرێت.

[3] ئەبو داود (٥٠٤٠) و ابن ماجة (٧٥٢) گێڕاویانەتەوە، ئەلبانی لە (ضعيف الترغيب والترهيب ١٨٠١) بە "زەعیف"ی داناوە

[4] ئەمە لە سیفەتی بەرزی پێغەمبەرە ﷺ، کە لە هەموو کردوەکان بە خۆی باشترینیان ئەنجام دەدات، لە پێش هەموویانە لە سەخاوەت و دەستکراوەیی، ژمارەی ئەندامانی خێزانی پێغەمبەر ﷺ نزیکەی ژمارەی میوانەکان دەبوون لەم شەوە، بۆیە نیوەی خواردنەکەی پێشکەش کردن، شەرحی نەوەوی(٨/١٤).

عەبدولرەحمان دەڵێت: ئەبوبەکر لەلای پێغەمبەری خوا نانی ئێوارەی خوارد، پاشان لەلای مایەوە تا نوێژی عیشا کرا، پاشان نەهاتەوە تا پێغەمبەری خوا خەوی لێنەکەوت.

دواتر هاتەوە، خوا دەزانێت چەند شەو مابوو.

خێزانەکەی پێی گوت: چی نەیهێشت بەشداری نەکەی لەگەڵ میوانەکانت؟

گوتی: ئایا نانی ئێوارەت پێ نەداون؟

گوتی: ئەوان رازینەبوون تاوەکو تۆ نێیتەوە، هەوڵمان لەگەڵیاندا، بەڵام ئەوان زاڵبوون.

عەبدولرەحمان دەڵێت: من چووم خۆم شاردەوە.

گوتی: هەی خەپە، جنێوێکی دا و پاشان گوتی: هەی نەفام، سوێند لەسەرت دەخۆم ئەگەر گوێت لێمە وەرە بۆ لام.

دەڵێت: جا چووم، گوتم: سوێند بە خوا من هیچ خەتایەکم نییە، ئەوانە میوانی تۆن، پرسیاریان لێ بکە، من خواردنم بۆ هێنان بەڵام رازی نەبوون بیخۆن هەتا دێیەوە.

گوتیان: قسەکەی راستە.

گوتی: بۆچی میواندارییەکەمان قەبوڵ ناکەن، سوێند بە خوا ئەو کوڕە نابێت ئەم شەو لەگەڵ ئێمە نان بخوات.

گوتیان: سوێند بەخوا ئێمەش نان ناخۆین هەتا نان بەو نەدەی.

ئەبوبەکر گوتی: ئەمە کاری شەیتانە، جا بانگی کرد خواردنەکە بێنن، ناوی خوای لەسەر هێنا و خواردی و ئەوانیش خواردیان.

عەبدولرەحمان دەڵێت: سوێند بە خوا هەر پارویەکمان بخواردبایە لە ژێرەوە زیاد دەبوو، تا تێرمان خوارد، تا هێندە زۆر بوو لەوەی پێشتر زۆر زۆرتر بوو.

ئەبوبەکر سەیرێکی کرد، بینی خواردنەکە زۆر زیاترە لەوەی پێشتر.

بە خێزانەکەی گوت: ئەی خوشکی نەوەی فیراس ئەمە چییە؟

گوتی: ئەی گلێنەی چاوم ئێستا زیاترە لە پێشوو بە سێ قات.

پاشان هەڵیگرت و بردیە لای پێغەمبەری خوا.

پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان سوێندیان خوارد بە جێیان گەیاند، من سوێندم خوارد و بەجێم نەگەیاند.

فەرمووی: **"تۆ باشتری لەوان و سوێندەکەت بە جێگەیاندووە"**. (چونکە تۆ، ئەو سوێندەت خوارد و دوایی شکاندت ئەوا کارێکی باشت کرد، بەو شێوەیە تۆ باشتری لەوان).

عەبدولرەحمان دەڵێت: لە نێوان ئێمە و چەند کەسێك گرێ بەستێك هەبوو، کاتەکەی بەسەرچوو بوو، ژمارەیان دوانزە کەسبوو، لەگەڵ هەر پیاوێك لەو دوانزە کەسە چەند کەسێکی دی هاتن هەر خودا دەزانی ژماریان چەند بوو، ئەوان هەموو هاتن لە خوارنەکەیان خوارد.

سەرەنجام هەموو سوپاکە لەو لەگەنەیان خوارد، کە ئەبوبەکر بردیە لای پێغەمبەری خوا ﷺ[1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- سوننەتە لە جیاتی ئەوەی تێر لە خواردن بخۆی، زیادەکە بدەیتە هەژاران، بۆیە فەرمانی کرد ئەوەی خواردنی دوو کەسی هەیە با کەسی سێیەم بباتەوە، ئەوەی خواردنی چوار کەسی هەیە با کەسی پێنجەم بباتەوە.
- بەزەیی و نەرمی خوای میهرەبان لەگەڵ خۆشەویستەکانی دەردەکەوێت.
- گەورەیی پێشخستنی خەڵك لەسەر حیسابی خۆت، پێویستە ئەگەر میوانێکی زۆر هەبوون ئەوا خەڵکی لە نێوان خۆیان دابەشیان بکەن و هەریەکەی چەندی لە تواناداهەیە لەگەڵ خۆیان بیان باتەوە، لەسەر کەسی گەورە پێویستە فەرمان بە خەڵك بکات و خۆشی چەندی پێ دەکرێت لەگەڵ خۆیان بباتەوە.
- پەنابردنی هەژاران بۆ مزگەوت لە کاتی پێویست، بە مەرجێك پەشێوی لەسەر نوێژخوێنان دروست نەکەن.
- میوانداری کردن لەکاتی برسییەتیدا.
- دروستە ماڵ و منداڵ لەگەڵ میوان جێبهێڵێت، بە مەرجێك ئەوەی پێویستە بۆیان ئامادەکرابێت.
- ئافرەت دەتوانێت هەرچی بیەوێت بۆ میوان ئامادەی بکات با مۆڵەتی لە پیاوەکەی وەرنەگرتبێت.
- دروستە باوك قسە بە کوڕەکەی بڵێت بۆ تەمبێ کردن و پەروەردەکردن و راهێنانی لەسەر کاری خێر.
- دروستە سوێند بخورێت لەسەر وازهێنان لە کارێکی موباح.
- پیاوی راستگۆ دەتوانێت سوێند بخوات لەسەر ئەو هەولانەی دەیدات.
- دروستە سوێند بشکێندرێت.

---

[1] چیرۆکەکە کۆمەڵە ریوایەتێکە لە بوخاری (٦٠٢)، (٣٥٨١)، (٦١٤١)، وموسلیم (٢٠٧٥) و ئەحمەد (١٧١٤)دا هاتووە.

- بردنی ئەو خواردنەی بەرەکەتی تێکەوتووە بۆ لای کەسی گەورە.
- کارکردن بە گومانی بەهێز، چونکە ئەبوبەکر گومانی برد عەبدولرەحمان لە ئاست میوانەکانی کەمتەرخەم بووە، بۆیە هەر زوو قسەی پێگوت، کە خۆشی شاردەوە زیاتر، ئەمەی لەلا بەهێزتربوو.
- سیفەتی بەرزی پێغەمبەر ﷺ تیایدا دەردەکەوێت، کە لە هەموو کردەوەکان خۆی باشترینیانی ئەنجام دەدات، لە پێش هەموویانە لە سەخاوەت و دەستکراوەیی، ژمارەی ئەندامانی خێزانی پێغەمبەر ﷺ نزیکەی ژمارەی میوانەکان دەبوون لەم شەوە، بۆیە نیوەی خواردنەکەی پێشکەش کردن [١].

### **ئەوەی لەلای هەبووایە لە خواردن بەسەر هەژاران دابەشی دەکرد:**

میقدادی کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: من و دوو هاوەڵم هاتین، برسیەتی تەنگی پێهەڵچنیبووین و بینینی چاومان و هێزی بیستنی گوێچکەمانی نەهێشتبوو، دەچوینە میوانداری هەر کەسێك، هیچیان میوانداریان قبوڵ نەدەکردین [٢].

چوینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا زۆر زۆر برسیمانە، چوینە میوانی خەڵکی، بەڵام کەس وەڵامی نەداینەوە، بۆیە هاتینە لای تۆ.

ئەویش ئێمەی بردەوە بۆلای ماڵی خۆی، سێ بزنیان لە ماڵ هەبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەوانە بدۆشن و شیرەکەی دابەش بکەن لە نێوانمان"**.

دەڵێت: هەریەکەمان مەرێکی دەدۆشی بەشی خۆی دەخواردەوە، بەشی پێغەمبەریشمان دەدا.

جا کە شەو دەهات، سەلامی دەکرد، بە جۆرێك سەلامی دەکرد نوستووی هەڵنەدەستاند و واشی دەکرد بە ئاگا گوێی لێ بێت.

پاشان دەچوو بۆ مزگەوت نوێژی دەکرد، دواتر دەهاتە لای خواردنەوەکەی و بەشی خۆی دەخواردەوە.

شەو کاتێك من بەشەکەی خۆم خواردبۆوە، شەیتان هاتە لام و گوتی: موحەممەد دەچێتە لای ئەنسارییەکان و لەدەوری کۆ دەبوونەوە، لەلای ئەوان بەشی خۆی وەردەگرێت، هیچ پێویستی بەو قومە شیرە نییە، منیش بەشەکەی ئەوم خواردەوە.

---

[١] سەیری فتح الباری بکە (٦٠٠/٦) ابن رجب، فتح الباری (١٧٥/٤) ابن حجر، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨/١٤).

[٢] وا بەدەردەکەوێت لەم فەرموودەیە، ئەوانەی چوونە بۆیالان هەژار بوونە و هیچیان نەبووە بیاندەنێ.

کاتێك چوە ناوسکم، زانیم کە نەدەبووایە بیخۆمەوە، شەیتان پەشیمانی کردمەوە، گوتی: قوربەسەر ئەوە چیت کرد؟! ئایا بەشی موحەممەدت خواردەوە، کاتێك دێت بەشەکەی خۆی نابینێتەوە، ئینجا دوعات لێ دەکات و دەفەوتێیت و دونیا و قیامەتت لە کیس دەچێت.

منیش پارچە قوماشێکم لەبەر بوو، گەر پێیەکانم پێ داپۆشی بایە، سەرم بە دەردەکەوت، ئەگەریش سەرم پێ داپۆشیبایە، پێیەکانم دەردەکەوتن، وام لێ هات خەوم لێ نەدەکەوت.

بەڵام دوو هاوڵەکەم، نوستن و ئەوەی من کردم ئەوان نەیان کرد.

پێغەمبەر ﷺ هاتەوە وەکو جاران سەلامی کرد، پاشان چووە مزگەوت نوێژی کرد، دواتر هاتەوە لای خواردنەوەکەی و سەری هەڵدایەوە، بەڵام هیچی تێدا نەبینیەوە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە.

گوتم: ئێستا دوعام لێ دەکات و بە هیلاك دەچم.

فەرمووی: "**خودایە نان بدە ئەو کەسەی نانی پێدام، خواردنەوە بدە ئەو کەسەی خواردنەوەی پێدام!**".

منیش دەستم برد بۆ پارچە قوماشەکە و خۆم پێ داپۆشی، دواتر چەقۆیەکەم هەڵگرت و رۆشتم بۆ لای بزنەکان، بۆ ئەوەی بزانم کامەیان قەڵەوترە بۆ ئەوەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سەربیبڕم، بینیم هەموویان پڕ شیرین[1]، چووم جامێکم هەڵگرت، کە هی خێزانەکانی پێغەمبەر بوون ئەوان شیریان تێدا نەدەدۆشی، من دەستم بە دۆشین کرد تا کەف کرد، جا هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

فەرمووی: "**ئایە ئەم شەو خواردنەوەکەتان خواردەوە**".

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بیخۆرەوە، ئەویش خواردیە و پاشان دایەوە دەستم.

کاتێك زانیم پێغەمبەری ﷺ پێغەمبەری خوا تێری خواردەوە و بەبەر دوعاکەی کەوتم، هێندە پێکەنیم تا کەوتمە سەر زەوی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**میقداد تۆ خراپەیەکت کردووە چییە؟**".

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئاوا و ئاوام بەسەرهات.

---

[1] واتە شیرێکی زۆر لە گوانی کۆبۆتەوە، ئەویش یەکێکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر و شوێنەواری بەرەکەیەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەمە تەنیا رەحمەتێك بووە لەلایەن خوداوە، ئایا بۆ پێت نەگوتم، بۆ ئەوەی هەردوو هاوەڵەکان ئاگادار بکەینەوە و بۆ ئەوەی بەشداربوونایە لەم رەحمەتە"**.

دەڵێت: گوتم: سوێند بەو کەسەی بە حەق تۆی رەوانە کردووە، گرینگ نییە لەلام کێ ئەم رەحمەتی پێ بگات، مادام تۆ رەحمەتەکەت پێ گەیشت و منیش پێم گەیشت [1].

هەروەها لە چیرۆکی موسڵمان بوونی سەلمانی فارسی ﷺ کاتێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ خواردنێکی وەك دیاری هێنابوو، پێغەمبەریش ﷺ لێی خوارد و فەرمانی بە هاوەڵان کرد لێی بخۆن [2].

## ئەگەر هیچی نەبایە بیداتە هەژاران، دەینارده لای یەکێك لە هاوەڵەکانی:

ئەبوهورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: من زۆر ماندوو و برسیم.

ئەویش ناردی بۆلای یەکێك لە خێزانەکانی.. لە وەڵامدا گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق رەوانە کردووە، لەئاو زیاتر چیترمان نییە.

پاشان ناردی بۆلای یەکێکی تر، هەمان قسەی پێشووی گوتووە، تا هەموویان وەکو ئەویان گوت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"رەحمەتی خوا لەم کەسەی ئەم شەو ئەم میوانە دەباتەوە ماڵەوەی"**.

پیاوێك لە ئەنسارییەکان گوتی: من

رۆیشت بۆلای خێزانەکەی و پێی گوت: رێز لە میوانی پێغەمبەر بگرە و خزمەتی بکە.

ئافرەتەکەش گوتی: تەنیا خواردنی منداڵەکانم هەیە.

پیاوەکە گوتی: خواردنەکە حازر بکە، چرایەك داگیرسێنە، منداڵەکان گەر داوای نانی ئێوارەیان کرد بیانخەوێنە.

کە میوانەکە هاتە ژوورە و چراکە بکوژێنەوە وا نیشان بدە کە ئێمە لەگەڵی دەخۆین، هەر کە دەستی بۆ خواردن برد برۆ بۆلای چراکە و بیکوژێنەوە.

---

[1] موسلیم (٢٠٥٥) گێڕاوەتیەوە. پێشتر باسکراوە.

[2] ئەحمەد (٢٣٢٢٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٨٩٤) ب "حەسەن"ی داناوە. پێشتر باسکراوە.

جا خواردنەکەی ئامادەکرد و چراکەی دایگرساند، منداڵەکانی خەواند، پاشان هەڵسا وەکو بڵێی بیەوێت چراکە چاك بکات، تا کوژاندیەوە، وایان نیشان دا لەگەڵ ئەو نان دەخۆن، ئەم شەوە یان بە برسیەتی بردە سەر.

کاتێك بەیانی بووە رۆشت بۆلای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پێی فەرموو **"خوای گەورە ئەم شەو بە کارەکەتان پێکەنی"**.

خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾[1] الحشر: ٩ واتە: (حەز بە بەخشینی ماڵ ماڵ و سامانیان دەکەن، فەزڵی بەرامبەریان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە بەخۆیان هەژار و نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی رەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن).

ئیبن عەباس رضي الله عنه دەڵێت: دوو پیاو هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە هەردووکیان یەك کاریان هەبوو، یەکێکیان قسەی کرد، پێغەمبەری خوا بینی بۆنێکی ناخۆش لە دەمی دێت.

فەرموی: **"ئایا سیواك ناکەیت؟"**.

گوتی: با سیواك دەکەم، بەڵام ئەو سێ رۆژە نانم نەخواردووە.

جا فەرمانی بە پیاوێك کرد، ئەویش بردیەوەوە ماڵەوە و پێداویستییەکەی بۆ جێبەجێ کرد[2].

## لەگەڵیان دەژیا و تێکەڵیان دەبوو، تا لە ئارامگرتن و بەرگەگرتن ببێتە پێشەنگێك بۆیان:

سەماکی کوڕی حەرب دەڵێت: گوێم لە نوعمان بوو وتاری دەدا و دەیگوت: عومەری کوڕی خەتتاب باسی ئەوەی کرد کە خەڵك تووشی قاتوقوڕی هاتبوو، گوتی: پێغەمبەری خوام بینی بە درێژایی رۆژێك خورمایەکی خراپیش نەبوو گەدەی پێ پڕ بکا[3].

ئەبو حازم دەڵێت: بینیم ئەبو هورەیرە چەند جارێك ئاماژەی بە پەنجەی دەکرد و دەیگوت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە پێغەمبەری خوا و خانەوادەی سێ رۆژ لەسەر یەك تێر نانی گەنمیان نەخوارد تا لە دونیا چوونە دەرەوە[4].

---

[1] بوخاری (٣٧٩٩) و موسلیم (٢٠٥٤) گێراوەتیانەوە.

[2] ئەحمەد (٢٤٠٥) گێڕاوەتیەوە، الهیثمی لە (مجمع الزوائد ١٠/٣٢٤) دەڵێت: سەنەدەکەی "جید"ـە، ئەحمەد شاکر لە (تعلیق علی المسند ٤/١٣١) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] موسلیم (٢٩٧٨) گێڕاوەتیەوە.

[4] بوخاری (٥٣٧٤) و موسلیم (٢٩٧٦) گێڕاویانەتەوە.

خاتوو عائیشە رضي الله عنها بە عوروەی گوت: ئەی کوڕی خوشکم ئێمە تەماشای مانگی یەك شەوەمان دەکرد، بۆ مانگێکی تر تەماشامان دەکرد جارێکی تریش تەماشان دەکرد، لە ماوەی دوو مانگ سێ مانگی یەك شەوەمان بینی، لەو ماوەیەدا ئاگر لە ماڵەکانی پێغەمبەری خوا هەڵنەکرا.

گوتم: پورێ ئەی چیتان دەخوارد؟

گوتی: خورما و ئاو، بەڵام پێغەمبەر دراوسێیەکی ئەنساری هەبوو، چەند بزنێکی هەبوو لەشیرەکانی دەدایە پێغەمبەری خوا بۆ ئەوەی بیخواتەوە [1].

هەر خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، شتێك لە ماڵمدا نەبوو، کەسێك یان گیاندارێك بیخوات، تەنیا هەندێك جۆ نەبێت لەسەر رەفەی ماڵەکەم بوو، ماوەیەکی زۆرم لێم خوارد، تا ئەویش برا [2].

هەر خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە و دەڵێت: خاوخێزانی پێغەمبەر ﷺ لە دوو ژەمان یەکێکیان هەر خورمای لەگەڵدا بووە [3].

لە فەرموودەی جابیردا هاتووە لە بەسەرهاتی هەڵکەندنی خەندەق، دەڵێت: ئێمە لەو رۆژە خەندەقمان هەڵدەکەند، بەردێکی زۆر رەق بە دیار کەوت، هاتنە لای پێغەمبەر و گوتیان: بەردێکی زۆر رەق بەدیار کەوتووە لە خەندەقەکە.

فەرمووی: **"من وا شۆڕ دەبمەوە"**، بەردی لە سکی بەستابوو، سێ رۆژان هیچ شتێك نەبوو تامی بکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی دایە قازمەکە و لێی دا، جا ورد و خاش بوو [4].

ئەبو تەڵحە رضي الله عنه دەڵێت: گلەیی برسییەتیمان کرد لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، سکمان هەڵکرد هەریەکەمان بەردێکی لە سکی قایم کردبوو، پێغەمبەر ﷺ سکی خۆی هەڵکرد دوو بەردی لە سکی قایم کردبوو [5].

---

(١) بوخاری (٢٥٦٧) و موسلیم (٢٩٧٢) گێراویانەتەوە.

(٢) بوخاری (٣٠٩٧) و موسلیم (٢٩٧٣) گێراوەتیانەوە.

(٣) بوخاری (٦٤٥٥) و موسلیم (٢٩٧١) گێراویانەتەوە

(٤) بوخاری (٤١٠١) و موسلیم (٢٠٣٩) گێراویانەتەوە

(٥) ترمذي (٢٣٧١) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (ضعيف سنن ترمذي/ ٢٤٩٠) بە "زەعیف"ی داناوە

**لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لە مامەڵەکردن لەگەڵیان ئەمە بووە: دانیشتن لەگەڵیان و نزیکبوونەوە لێیان و خۆ بەگەورە نەزانین لەسەریان:**

عوسمانی کوڕی یەکمان –یەکێکە لە شوێنکەوتووانی تابعین– دەڵێت: موهاجیرەکان، کە زۆربوون لە مەدینە، هیچ خانوویەکیان نەبوو، هیچ شوێنێکیان نەبوو تیایدا بحەوێنەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەوانی بردە مزگەوت و ناوی نان ئەهلی صوففە، جا لەگەڵیان دادەنیشت و هۆگریان دەبوو[1].

ئەو دانیشتنانە لەگەڵیان دڵنەوایی و دڵدانەوە بووە بۆیان، هەروەها بەجێگەیاندنی فەرمانەکانی خوای گەورە بوو، کە دەفەرموێت: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا﴾ الكهف: ٢٨

سەعدی لە تەفسیری ئەم ئایەتە دەڵێت: خوای گەورە فەرمان بە پێغەمبەر و موسڵمانان دەکات، کە لەگەڵ بەندە باوەڕدارەکان ئارام بگرن، ئەوانەی ﴿ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾ واتە: ئەوانەی سەرەتای ڕۆژ و کۆتاییەکە یادی خوا دەکەن مەبەستیان تەنیا خوای پەروەردگارە، جا ئەمانەی بە بەندایەتیکردن و دڵسۆزی وەسف کردوونە، لەمەدا فەرمان هەیە هاوڕێیەتی ئەم جۆرە کەسە باشانە بکرێت، لەسەر هاوڕێیەتی و تێکەڵبوونیان ئارام بگیرێت، گەرچی با هەژاریش بن، چونکە لە هاوڕێیەتی ئەوانە چەند سودێك هەیە هەژمار ناکرێت.

﴿وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ﴾ چاودێریان بکە و چاویان لەسەر هەڵمەبڕە.

﴿تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ چونکە ئەمە زەرەری هەیە و سوودی نابەخشێت و بەرژەوەندی دین دەپچڕێنێت و وا دەکات دڵ پەیوەست بێت بە دونیاوە، بە هۆیە بیر و خولیاکان هەر لە چوارچێوە ئەودا بخولێنەوە، لە دڵیشدا حەزی دوارۆژ نامێنێ، بەڕاستی جوانی و ڕازاوەیی دونیا سیحر لە چاو و عەقڵ دەکات و سەرەقاڵی دەکات لەمەڕ یادکردنی خوا و ڕوو لە شەهەوات و چێژی دونیا دەکات، جا کاتەکانی بە فیڕۆ دەچن، گومڕا دەبێت، بە هۆیەوە ژیانی هەتا هەتایی لە دوارۆژ لە دەست دەدا و هەر پەشیمانی بۆ دەمێنێتەوە، بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا﴾ واتە: بە

[1] سنن البيهقي (٤١٣٥).

گوێی ئەو کەسە مەکە لە خوا بێ ئاگا بووە، خوای گەورەش سزای داوە بەوەی بێ ئاگای بکات لە یادی خۆی.

﴿وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ﴾: واتە دوای هەوا و ئارەزووەکانی کەوتووە، بە جۆرێك هەرچی حەزی لێبایە دەیکرد و هەوڵیدەدا بیکاتێ، ئەگەر چی با لە پێناویدا قوربانی بدابایە و خۆشی لەسەر دابنایە، ئەو کەسە ئارەزووەکانی خۆی کردۆتە خوای خۆی، هەروەکو پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أفرأيتَ مَنِ اتَّخذَ إلهَهُ هَواهُ وأضلَّه اللهُ بِغيرِ علمٍ﴾.

﴿وَكَانَ أَمْرُهُۥ﴾ واتە بەرژەوەندی دین و دونیای ﴿فُرُطًا﴾ واتە: فەوتاوە و لەکارخراوە، ئا ئەمانە خوای گەورە قەدەغەی کردوە بە گوێیان بکەی، چونکە بە گوێکردنی ئەوانە وا دەخوازێت بیانکەیتە پێشەنگ، چونکە ئەوانە بانگەشەی ئەو بەرنامەیە دەکەن کە هەیانە [١].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ﴾ الأنعام: ٥٢

سەعدی دەڵێت: ئەهلی چاکە و بەندایەتی و دڵسۆزی دوور مەخەرەوە لە خۆت و بچیت لەگەڵ کەسانی تر دابنیشیت، کە ئەهلی چاکە نین، لەگەڵ ئەو کەسانە دابنیشە کە خوای گەورە بە دڵسۆزی دەپەرستن و خۆیان ملکەچی خوا دەکەن و بە دوعا و پاڕانەوە،سەرەتا و کۆتایی رۆژ، کە مەبەستیان لەمەدا تەنیا خوایە و رەزامەندییەتی، هیچ مەبەستێکی دیکەیان نییە جگە لەو مەبەستە گەورەیە نەبێت.

ئەوانە شایەنی دەرکردن و پشت تێکردن نین، بەڵکو شایەنی خۆشەویستی و یارمەتیدانن، پێویستە لێیان نزیك ببیەوە، ئەوان ئەگەر چی هەژارن، بەڵام پاڵفتەکراوی خەڵقی خوان و بەڕێزن لەلای پەروەردگار، جا با لای خەڵك بێ نرخ بن.

﴿مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ﴾ واتە: هەریەکەیان حیسابێکی هەیە و هەریەکەیان کردەوەی باش یان خراپی هەیە، ﴿فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ واتە: ئەگەر دەریان بکەیت، پشتیان تێبکەیت، ئەوا دەبیت بە کەسێکی ستەمکار.

پێغەمبەر ﷺ زۆر بە پەرۆش و بە خێرایی ئەو فەرمانەی جێبەجێ کرد، ئەگەر لەگەڵ باوەڕدارە هەژارەکان دابنیشتبایە ئارامی لەسەریان دەگرت و مامەڵەی باشی لەگەڵدا

---

[١] تفسير السعدی (٤٧٥/١).

دەکردن و شانی بۆ شل دەکردن و ڕەوشتی جوان دەکرد لەگەڵیان و لێیان نزیك دەبووە، بەڵکو زۆربەی کاتی مەجلیسی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوان بووە [(1)].

هۆی دابەزینی ئەم ئایەت ئەوە بوو، کە کۆمەڵێك لە بەگزادەکانی عەرەب پێیان شەرم بوو بێنە ناو ئیسلامەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەژار و کۆیلەکانی لە دەوری خۆی کۆکردبووەوە و لە نمونەی وەك سوهەیب، بیلال، عەممار، خەبباب، سەلمان، ئیبن مەسعود و هاوشێوەکانیان، ﷺ ئەوان لەبەر هەژاری و کەمدەرامەرتی جلی وایان لەبەر بوو بۆنی ئارەقەی ناخۆشی لێ دەهات.

جا پلە و پایەب کۆمەڵایەتی ئەو هەژارانە ڕێگەی پێ نەدەدان لەگەڵ گەورە پیاوانی قورەیش دابنیشن!

جا ئەو گەورە پیاوانە داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئەوانە دەربکات بەڵام رازی نەبوو و ڕەتی کردەوە ﴿ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴾ هود: ٢٩ جا پێشنیاریان کرد کۆڕێکی تایبەت بۆ هەژاران دابنێت و کۆڕێکی تایبەتیش بۆ ئەوان هیچ لەو هەژارانەی لەخۆ نەگرتبێت، بۆ ئەوەی ئەو گەورە پیاوانە جیاواز بن و پلە و پایەیان لەو کۆمەڵگە نەفامییە دیار بێت!

پێغەمبەر ﷺ بە تەماحی ئیسلام بوونیان، ویستی وەڵامی داواکارییەکانیان بداتەوە، بەڵام فەرمانی خوای گەورە دابەزی کە پێی فەرمو: ﴿ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم ﴾ الأنعام: ٥٢

ئیبن مەسعود دەڵێت: کۆمەڵێك لە قورەیشییەکان بەلای پێغەمبەردا ڕۆیشتن کە سوهەیب و بیلال و عەمار و خەببای لەلابوو، لەگەڵ موسڵمانێکی تری هەژار.

گوتیان: ئەی موحەممەد ئایا بەمانە رازیت؟ ئایا ئەوانەن لەناو ئێمە خوا منەتی لەگەڵ کردوون و هەڵی بژاردوون؟ ئێمە شوێن ئەوان بکەوین؟ لەلای خۆت دەریان بکە، ئەگەر واتکرد لەوانەیە شوێنت بکەوین.

ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی [(2)]: ﴿ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم .... ﴾ الأنعام: ٥٢

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﷺ دەڵێت: لەگەڵ شەش کەسدا لەلای پێغەمبەری خوا بووین. موشریکەکان گوتیانە پێغەمبەر: ئەوانەی لەلاتن دەریان بکە با زمانیان بەسەرەمان درێژ نەبێت.

---

(1) تفسير السعدی (٢٥٧/١).

(2) تفسير الطبري (٣٧٤/١١).

ئەوانەش من و ئیبن مەسعود و پیاوێك لە هوزەیل و بیلال و دوو پیاوی تر بووین. کە ناوەکانیم نەدەزانی.
جا ئەوەی خوا ویستی لەسەر بێت کەوتە ناو دەروونی پێغەمبەری خوا و کەوتە بیرکردنەوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند [1]: ﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ ﴾الأنعام: ٥٢
یەکێك لە هەڵسوکەوتەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیان ئەوە بوو بۆ کاری خێر و کردەوە باشەکان رێنوێنی دەکردن، بەو کردەوانەی دەیانگەیێنێتە پلەوپایەی دەوڵەمەندەکان.
ئەبوهورەیرە ﷺ دەڵێت: کۆچکردووە هەژارەکان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان، دەوڵەمەندەکان (بەهۆی بەخشینەکانیان) پلەوپایەی بەرزیان بەدەستهێناوە و کەوتوونەتە ناو خۆشی هەتا هەتایی.
فەرمووی: "**چۆن؟**".
گوتیان: نوێژ دەکەن وەکو ئێمە، بەرۆژوو دەبن وەکو ئێمە، دەبەخشن کە ئێمە نابەخشین، بەندە رزگار دەکەن کە ئێمە نایکەین [2].
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**ئایا شتێکتان فێر بکەم بۆ ئەوەی بگەنە ئەوانەی لە پێشتانن، بە پێش ئەوانەش بکەن کە لە دواتانن، بە جۆرێك کەس لە ئێوە باشتر نەبێت مەگەر کەسێك وەك ئێوە بکات؟**".
گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.
فەرمووی: "**لە دوای نوێژەکانتان سی و سێ جار بڵێن: سبحان الله والحمد الله والله أکبر**".
پاشان کۆچکردووە هەژارەکان گەڕانەوە لای پێغەمبەری خوا و گوتیان: برا دەوڵەمەندەکانمان گوێیان لێ بوو لەوەی کردمان، جا ئەوانیش وەك ئێمەیان کرد.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**ئەمە فەزڵی خوایە بە کێی بیەوێت دەیدات**[3]".

---

[1] موسلیم (٢٤١٣) گێڕاوەتیەوە.
[2] لە گێڕانەوەی بوخاریدا هاتووە: ئەوان پارە و ماڵیان هەیە کە حەجی ماڵی خوای پێ دەکەن، عەمرەی پێ ئەنجام دەدەن، جیهادی پێ دەکەن و دەیبەخشن.
[3] بوخاری (٨٣٤) و موسلیم (٥٩٥) گێڕاویانەتەوە.

**داوای لە خوای پەروەردگار دەکرد، خۆشەویستی هەژار و کەمدەرامەتانی پێ ببەخشێت:**

لەناو نوێژدا دەیفەرموو: **"اللهمّ إنّي أسألُك فِعلَ الخَيرات، وتَرك المنكرات، وحُبَّ المساكين، وإذا أردت بعبادِك فِتنةً، فاقبضني إليك غير مَفتونٍ[1]"**.

واتە: خودایە من داوای کارە چاکەکانت لێ دەکەم، داوات لێدەکەم واز لە شتە خراپەکان بێنم، داوای پێبەخشینی خۆشەویستی هەژارانت لێ دەکەم، ئەگەر ویستت بەندەکانت تووشی فیتە و تاقیکردنەوەیەك بکەیت، ئەوا بێ ئەوەی بەو فیتنە و تاقیکردنەوەیە تێ بچم بۆلای خۆتم بگەڕێننەوە.

فەرمانی بە هاوەڵەکانیش دەکرد هەژارانیان خۆش وبێت و لێیان نزیك ببنەوە، ئەبو زەڕی غیفاری ﷺ دەڵێت: خۆشەویستەکەم فەرمانی بە حەوت شت پێکردووم **"فەرمانی پێکردوومە هەژارانم خۆش بوێت و لێیان نزیك ببمەوە، فەرمانی پێکردووم سەیری خوارەوەی خۆم بکەم و نەڕوانمە سەرەوەی خۆم، فەرمانی پێکردووم پەیوەندی خزمایەتی بگەێنم با لێم دووریش بن، فەرمانی پێکردووم داوای هیچ شتێك لە کەسم نەکەم، فەرمانی پێکردووم راستی بڵێم گەر چی تاڵیش بێت، فەرمانی پێکردوومە لەبەر خوا لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسم، فەرمانی پێکردووم زۆر وتەی (لاحول ولا قوة إلا بالله) بڵێمەوە، چونکە ئەوانە گەنجینەکن لە ژێر عەرشی پەروەردگار[2]"**.

**ئەحواڵی دەپرسین و پرسیاری لێ دەکرن:**

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حەنیف ﷺ دەڵێت: ئافرەتێکی هەژار نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ ئاگادارکرایەوە بە نەخۆشییەکەی، پێغەمبەری خوا نەریتی وابوو دەچووە سەردانی هەژاران و لێیانی دەپرسی.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەگەر مرد ئاگادارم بکەنەوە"**.

تەرەمەکەی بەشەو هێنرایە دەرەوە، حەزیان نەکرد پێغەمبەری خوا بە ئاگا بێنن.

کاتێك پێغەمبەری خوا بەیانی کردەوە، هەواڵی ئەو ئافرەتەیان پێدا فەرمووی: **"ئەی فەرمانم نەکرد لەبارەی ئاگادارم بکەنەوە؟"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا حەزمان نەکرد بەو شەوە تۆ لە ماڵەوە دەربێنین.

---

[1] ترمذي (٣٢٣٣) لە ئیبن عەباسەوە گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٦٨٤) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] ئەحمەد (٢٠٩٠٦) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة/٢١٦٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

**جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، خەڵکی لەسەر گۆڕی ئافرەتەکە ڕیز کرن، چوار (الله أکبر)ی لەسەر گوت**[١].

## گرینگی بە هەژارە نەبووەکان دەدا، لەوانە (ذو البجادين):

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: لە نیوەی شەودا هەڵسام، لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووم لە شەڕی تەبوك، لەلایەکی سوپاکەوە پارچە ئاگرێکم بینی، بە دوایدا ڕۆیشتم، بینیم وا پێغەمبەری خوا و ئەبوبەکر و عومەرن.

عەبدوڵڵای ذو البجادينی موزەنی مردبوو، گۆڕیان بۆ هەڵکەندبوو، **پێغەمبەری خوا لەناو** گۆڕەکەی بوو، ئەبوبەکر و عومەریش تەرمەکەیان دەدایە دەستی، **ئەویش دەیفەرموو:** **"براکەتان شۆڕ بکەنەوە بۆم"**، جا شۆڕیان کردەوە.

کاتێك ناشتی، فەرمووی: **"خودایە من ئەو ئێوارەیە لێی ڕازی بووم، تۆش لێی ڕازی بە"**.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: خۆزگە من خاوەنی ئەم گۆڕە بام[٢].

ئیبن هیشام دەڵێت: بۆیە ذو البجادين، چونکە ئەو کاتەی دەیویست بێت بۆ ناو ئیسلام، خزم و کەسەکانی ڕێگەیان لێ دەگرت و ئازاریان دەدا، تاوازیان لێ هێنا، کەو وازیان لێهێنا تەنیا (بجاد)ێکی لەبەر بوو. **بجاد:** پۆشاکێکی زبری ئەستوورە.

جا ڕای کرد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێك لێیان نزیك بووە، پۆشاکەکەی کردە دوو بەش، یەکێکی لە مل کرد و ئەوی تریشی لە خۆی ئاڵاند، ئینجا هاتە لای پێغەمبەری خوا، جا بۆیە پێ گوترا: ذو البجادين: واتە خاوەنی دوو بجاد[٣]

## پێداویستییەکانی بۆ جێبەجێ دەکردن:

ئەسمای کچی ئەبوبەکر ﷺ دەڵێت: زوبەیر منی هێنا، لەو دونیایەدا هیچ ماڵ و پارەیەکی نەبوو، تەنیا ئەسپەکەی نەبێت، من ئالیکم دەدا بە ئەسپەکەی و ئاوم بۆ دەهێنا.. هیچ کارێك لە کارەکانی خزمەتکاریم ئەوەندە لا قورس نەبوو، هێندەی بە خێوکردنی ئەو ئەسپە و ئالیك پێدانی نەبێت.

دەڵێت: پاشان دیلێکی جەنگیان بۆ پێغەمبەر هێنا، وەك خزمەتکارێك پێشکەشی زوبەیری کرد، ئەو بەخێوکردنی ئەسپەکەی لە کۆڵ کردمەوە[٤].

---

[١] المالك لە (الموطأ ٥٣١) و النسائی (١٩٠٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح سنن النسائی ١٩٠٧) بە "سەحیح"ی داناوە، بوخاری (٤٥٨) و موسلیم (٩٥٦) لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێراویانەتەوە.

[٢] السيرة النبوية (٢/٥٢٧) ابن هشام، وقال ابن حجر في الإصابة (٤/١٦٢): "رجاله ثقات إلا أن فيه انقطاعا".

[٣] السيرة النبوية (٢/٥٢٧) ابن هشام.

[٤] بوخاری (٤٨٢٣) و موسلیم (٢١٨٢) گێراویانەتەوە.

**ئاگاداربیەك:** لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: "هەتا ئەبوبەکر خزمەتکارێکی بۆ ناردم، بەخێوکردنی ئەسپەکەی لە کۆڵ کردمەوە، وەکو ئەوەی منی لە بەندایەتی رزگار کردبێت[1]".

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەو دوو ریوایەتە بەو شێوەیە کۆدەکرێنەوە، بەوەی کاتێك دیلە جەنگییەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا هێنا، یەکەم جار دای بە ئەبوبەکر وەك خزمەتکارێك، بۆ ئەوەی بۆ ئەسمائی کچی بنێرێت، جا راستی کردووە، کە پێغەمبەر پێی خشیووە، بەڵام لە رێگای ئەبوبەکرەوە گەیشتۆتە دەستی[2].

## لە پێداویستییەکانیانی دەپرسی تا بۆیان جێبەجێ بکات:

خزمەتکارێکی پێغەمبەر ﷺ کە یان پیاوە بووە یان ئافرەت دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو پرسیارانەی لە خزمەتکارەکەی دەکرد، دەیفەرموو: **"هیچ داواکاریەکت هەیە؟"**.

دەڵێت: تا رۆژێك خزمەتکارێك گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا داواکاریەکەم هەیە.

فەرمووی: **"چییە؟"**.

گوتی: شەفاعەتم بۆ بکە لە رۆژی دوایی.

فەرمووی: **"کێ ئەمەی پێ گوتی؟"**.

گوتی پەروەردگارم.

فەرمووی: **"کەواتە، زۆر سوژدە بۆ خوا ببە[3]"**.

**داوای لە خزمەتکارەکەی دەکرد هەرچی دەیەوێت با داوای بکا، وەڵامی داواکەی دەدایەوە هەرچەند گەورەش بوایە:**

رەبیعەی کوڕی ئەسلەمەی ﷺ دەڵێت: شەو لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەمامەوە، ئاوی دەستنوێژم بۆ دەهێنا، لەگەڵ ئەوەی پێویستی بووایە.

پێی دەفەرموو: **"داوا بکە"**.

گوتم: دەمەوێت لە بەهەشتدا لەگەڵ تۆ دابم.

فەرمووی: **"هەر ئەوە چیتر نا؟"**.

گوتم: هەر ئەوە.

فەرمووی: **"یارمەتی خۆت بدە بە زۆر سوژدە بردن[4]"**.

---

[1] بوخاری (٥٢٢٤) و موسلیم (٢١٨٢) گێڕاوەتیانەوە.

[2] فتح الباری (٩/٣٢٤).

[3] ئەحمەد (١٥٦٤٦) گێڕاویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع/ ٤٨٣٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

[4] موسلیم (٤٨٩) گێڕاوەتیەوە.

لە گێڕانەوەیەکی ترد کە ڕەبیعە گێڕاویەتیەوە دەڵێت: من خزمەتی پێغەمبەری خوام دەکرد، بە درێژایی ڕۆژ لە خزمەتی دابووم تا نوێژی عیشای دەکرد، جا لەبەر دەرگای دەوەستام تاوەکو دەچووە ماڵەوە، دەمگوت هەر لەبەر دەرگای دەبم بەڵکە کارێکی دەبێت تا بۆی جێبەجێ بکەم، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: **"سبحان الله، سبحان الله، سبحان الله وبحمده"**. تا بێزار دەبووم لە وەستان جا یان دەگەڕامەوە یان خەو بەسەرمدا زاڵ دەبوو لێی دەنوستم.

دەڵێت: کاتێك بینی من زۆر ماندوو و زۆر خزمەتی دەکەم، پێی فەرمووم: **"ڕەبیعە شتێك داوا بکە تا بۆتی جێبەجێ بکەم"**.

دەڵێت: منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا با بیرێکی لێ بکەمەوە ئینجا پێت دەڵێم.

بیرم کردەوە زانیم کە دونیا کۆتایی پێ دێت و ئەو ڕزق و ڕۆزیەی هەمە بەشم دەکات و بۆم دێت، گوتم: داوای کاروبارێکی قیامەت لە پێغەمبەری خوا دەکەم، چونکە خوای گەورە پلەوپایەکی بەرزی پێداوە.

دەڵێت: هاتمەوە لای فەرمووی: **"ها چیت کردەوە ڕەبیعە"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، داوا لە پەروەردگارت بکە گەردەنم لە ئاگر ئازاد بکات.

فەرمووی: **"ڕەبیعە کێی ئەمەی فێر کردووی؟"**

گوتم: سوێند بەو خوایەی تۆی بە هەق ڕەوانەکردووە، کەس فێری نەکردووم، بەڵام کاتێك فەرمووت: **"داوام لێ بکە تا بۆتی جێبەجێ بکەم"**، بینم کە تۆ پلە و پایەیەکی گەورەت لەلای پەروەردگارت هەیە، سەیری کاروباری خۆم کرد زانیم دونیا دەڕوا و کۆتایی پێ دێت، ئەوەی ڕزقە هەمەم و بۆم دێت، گوتم داوای دوارۆژ لە پێغەمبەری خوا دەکەم.

پێغەمبەر خوا ﷺ ماوەکی زۆر بێ دەنگ بوو، پاشان پێی فەرمووم: **"من ئەوەت بۆ دەکەم، بەڵام زۆر سوژدە ببە"**[1].

**دانی بە گەورەییان دادەنا و ڕێزی دەگرتن، کەسیانی لەبەر هەژاربوونیان بەکەم نەدەزانی:**

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﷺ دەڵێت پیاوێك بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی.

فەرمووی: **"چی دەڵێن لەبارەی ئەمەوە؟"**.

گوتیان: پیاوێکە لە گەورە پیاوانی موسڵمانان، شایەنی ئەوەیە گەر خوازبێنی کرد لێی مارە ببڕن، گەر تکای کرد لێی قەبوڵ بکرێت، گەر قسەی کرد گوێی لێ بگیرێت.

پاشان بێ دەنگ بوو، ئەم جارە پیاوێك لە موسڵمانە هەژارەکان تێپەڕی.

---

[1] ئەحمەد (١٦١٤٣) ئەلبانی بە لە (إرواء الغلیل ٢/٢٠٩) بە "حەسەن"ی داناوە، پێشتر باسکراوە.

فەرمووی: **"ئەی چی دەڵێن لەبارەی ئەمەوە؟"**.

گوتیان: پیاوێکە لە هەژارانی موسڵمانان، شایەنی ئەوەیە گەر خوازبێنی کرد لێی مارە نەبڕن، گەر تکای کرد لێ وەرنەگیرێت، گەر قسەی کرد گوێی بۆ نەگیرێت.

ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"نمونەی وەکو ئەم پیاوە خێرترە لە هەموو زەوی"**[(١)].

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم فەرموودەیە روونی دەکاتەوە، کە گەورەیی بەماڵی دونیا، هیچ نییە و بێ نرخە، بەڵکو ئەوەی نرخی هەیە دوارۆژە، ئەو کەسەی بەشی نییە لە دونیا یان لە دەستی داوە، ئەوا بە چاکەی رۆژی دوایی بۆی قەرەبوو دەکرێتەوە[(٢)].

ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی ئەبو زەڕ تۆ وای بۆ دەچی زۆری ماڵ دەوڵەمەندییە؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"دەوڵەمەندی، دەوڵەمەندی دڵە، هەژاریش هەژاری دڵە"**.

پاشان پرسیاری لێکردم سەبارەت بە پیاوێکی قوڕەیش و فەرمووی: **"ئایا فلانەکە دەناسیت؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"چۆنە بەلاتەوە و چۆن سەیری دەکەی؟"**.

گوتم: ئەگەر داوا بکات پێی دەدرێت، ئەگەریش هاتە شوێنێك دەبردرێتە ژوورەوە.

پاشان پرسیاری لێکردم لە بارەی پیاوێك لە ئەهلی صوففە و فەرمووی: **"ئایا فلانەکەس دەناسیت؟**.

گوتم: نەخێر سوێند بە خوا نایناسم، ئەی پێغەمبەر خوا.

دەڵێت: جا بەردەوام پێغەمبەری خوا ﷺ ستایش و سەنای کرد، سیفەتە باشەکانی باس کرد، گوتم: ئێستا ناسیم ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"چۆنە بەلاتەوە، چۆن سەیری دەکەی؟"**.

گوتم: پیاوێکی هەژارە لە ئەهلی صوففە.

فەرمووی: **"ئەمەیان باشترە لەلای خوا لەوەی پێشوتر گەر پڕی زەویش بێت"**.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا.. ئەوەی بەوە دەدرێت، بەویش نادرێت؟

---

(١) بوخاری (٥٠٩١) گێڕاوەتیەوە.

(٢) فتح الباری (٢٧٨/١١).

فەرمووی: **"ئەگەر خێرێکی بۆ هات ئەوا شایەنییەتی، ئەگەریش پێی نەدرا، ئەوا چاکەیەك بە دەست دێنێت"[1].**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"چەند کەسی قژ ئاڵۆز و خۆڵاوی و شڕ هەیە، خەڵك نرخی بۆ دانانێن، بەڵام گەر سوێند لەسەر خوا بخوات، ئەوا خوای پەروەردگار سوێندەکەی جێبەجێ دەکات، بەڕائی کوڕی مالیك یەکێکە لەوان"[2].**

**بە باسکردنی پلەو پایەی دوارۆژیان ورەی بەرز دەکردنەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا دەزانن کێ یەکەمین کەسە لە دروستکراوەکانی پەروەردگار دەچێتە بەهەشت؟".**

گوتیان: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن.

فەرمووی: **"یەکەمین کەس لە دروستکراوەکانی خوا کە دەچێتە بەهەشت، موهاجیرە هەژارەکانن، ئەوانەی کەلێنەکانیان پێ پڕ دەکرایەوە و دەبوونە پەرژین لە ڕوودانی شتی خراپ، یەکێکیان دەمرد هێشتا ئەو ئاواتەی هەیبوو بێتەدی نەدەهاتە دی.**

**خوای گەورە بەو فریشتانەی بیەوێت دەفەرموێت: بڕۆنە لایان و سەلامیان لێ بکەن.**

**فریشتەکان دەڵێن: ئێمە دانیشتووی ئاسمانین و باشترین دروستکراوەکانتین، ئایا فەرمانمان پێدەکەی بچینە لای ئەوانە و سەلامیان لێ بکەین؟**

**دەفەرموێت: ئەوان یەکێك بوون لە بەندەکانی من و تەنیا منیان دەپەرست هاوەڵیان بۆ بڕیار نەدەدام، کەلێنەکانیان پێ پڕ دەکراو و دەبوونە پەرژین بۆ هاتنی شتی خراپ، یەکێکیان دەمرد ئەو ئاواتەی هەیبوو بێتەدی بۆی نەدەهاتە دی.**

**لەو کاتەدا فریشتەکان دەچنە لایان، لە هەموو دەرگایەك بۆیان دەچنە ژوورەوە و دەڵێن: سَلامٌ عليكُم بِما صَبرتُم فَنِعم عقى الدار"[3].**

**مژدەی پێ دەدانن کە پێش دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشت بەجیاوازی کاتێکی زۆر:**

سەوبان ﷺ کەرزگارکراوێکی پێغەمبەری خوایە دەڵێت: من لەلای پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستابووم زانایەك لە زاناکانی جوولەکەکان هات و گوتی: ئەی موحەممەد سەلامت لێ بێت.. منیش پاڵێکم پێوەنا خەریك بوو لە هۆش خۆی بچێت.

---

[1] ابن حبان (٦٨٥) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب ٣٢٠٣) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] ترمذي (٣٨٥٤) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٤٥٧٣) بە "سەحیح"ی داناوە
[3] ئەحمەد (٦٥٢٤) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ٧٣٧٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

گوتی: بۆچی پاڵم پێوە دەنێی؟

گوتم: بۆ ناڵێی پێغەمبەری خوا؟

گوتی: ئێمە بەو ناوە بانگی دەکەین، کە خزم و کەسەکانی پێی بانگ دەکەن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڕاستی من ناوم موحەممەدە، خزم و کەسم هەر بەم ناوە بانگم دەکەن"**.

جولەکەکە گوتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"ئەگەر قسەم بۆ کردی سوودی دەبێت بۆت؟"**.

گوتی: بە گوێییەکان گوێ بۆ دەگرم.

پێغەمبەر ﷺ چیلکە دارێکی لە دەستبوو لەزەوی دەدا، فەرمووی: **"پرسیار بکە؟"**.

جولەکە گوتی: خەڵك لـە کـوێن کاتێـك زەوی و ئاسمانـەکان دەگـۆڕێن و وەکـو خۆیـان نامێنن؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لە پێش پردەکە لەناو تاریکاییەکدان"**.

گوتی: یەکەمین کەس کە دەپەڕێتەوە کێن؟

فەرمووی: **"موهاجیرە هەژارەکانن**[1]**"**.

ئەبو عەبدولرەحمانی حەبلی دەڵێت: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی کوڕی عاص بوو ؓ کاتێك پیاوێك پرسیاری لێکرد گوتی: ئایا ئێمە لە موهاجیرە هەژارەکان نین؟ عەبدوڵڵا پێی گوت: ئایا ئافرەتێك نییە لەگەڵێدا بژی؟

گوتی: بەڵێ.

عەبدوڵڵا گوتی: ئایا خانوێکت نییە لەناوی بحەوێیتەوە؟

گوتی: بەڵێ.

گوتی: کەواتە تۆ لە دەوڵەمەندەکانی.

گوتی: خزمەتکاریشم هەیە.

گوتی: کەواتە یەکێکی لە پادشاکان.

باوکی عەبـدولرەحمان دەڵێـت: سـێ کـەس هاتنـە لای عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمری کـوڕ عاص، منیش لەوێ بووم، گوتیان ئەی باوکی موحەممەد، سوێند بە خوا ئێمە نە بژێویـەك نە سوارییەك نە کەلوپەلێکی ژیانمان هەیە، ئەویش پێیانی گوت: ئەگـەر دەتانـەوێ وەرنـە لامان ئەوەی خـوا بکاتـە قسـمەت پێتـان دەدەیـن، ئەگـەریش دەتانـەوێ کاروبارەکانتـان

---

[1] موسلیم (٣١٥) گێڕاوەتیەوە.

دەبەینە لای سوڵتان، ئەگەریش دەتانەوێ ئارام بگرن، من گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو دەیفەرموو: **"بەڕاستی موهاجیرە هەژارەکان لە ڕۆژی دواییدا پێش دەوڵەمەندەکان بە چل ساڵ دەچنە بەهەشت"**.

گوتیان: ئارام دەگرین، داوای هیچ لە کەس ناکەین.

هەر عەبدوڵڵای کوڕی عەمر دەڵێت: پێغەمبەری خوا پێی فەرمووم: **"ئایا دەزانی یەکەمین کۆمەڵ کێن لە ئوممەتەکەم دەچنە بەهەشت؟"**.

گوتم: خوای و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

فەرمووی: **"موهاجیرەکان لە ڕۆژی دوایی دێنە بەر دەرگای بەهەشت، داوای کردنەوەی دەکەن، دەرگەوانی بەهەشت پێیان دەڵێت: ئایا حیسابتان لەگەڵ کرا؟ دەڵێن: لەسەر چی حیسابمان لەگەڵ بکرێت؟ بەڵکو شمشێرەکانمان لەسەر شانەکانمان بووە لە پێناوی خوا تا لەسەر ئەم حاڵە مردین"**.

فەرمووی: **"دەرگایان بۆ دەکرێتەوە، چل ساڵ لەناوی دەمێننەوە پێش ئەوەی خەڵکی تر بچێتە ناوی"[1]**.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"هەژارانی موسڵمانان بە نیو ڕۆژ بەر دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بە هەشت، کە دەکاتە پێنج سەد ساڵ"[2]**.

ئاگادارییەک: فەرموودەی ئیبن عەمر باس لەوە دەکات زوو چوونی هەژاران بۆ بەهەشت بە چل ساڵ دەبێت، فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەش باس لە زوو چوونە بەهەشتیان دەکات بە پێنج سەد ساڵ، کۆبوونەوەی هەردوو فەرموودەکە لە خاڵانەدایە:

١- هەژاری موهاجیرەکان بە ماوەی چل پایز پێش دەوڵەمەندی موهاجیرەکان دەچنە بەهەشت، بەڵام هەرچی هەژاری تر هەیە پێش هەموو دەوڵەمەندەکان دەچنە بەهەشت بە پێنج سەد ساڵ.

ابن حبان لە سەحیحەکەی بەشێکی بۆ فەرموودەکانی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ داناوە بە ناوی: "باسی فەزڵی خوای پەروەردگار ﷻ بۆ هەژارانی موهاجیر، بە چوونە بەهەشتیان بە ماوەیەکی دیاریکراو"[3].

---

[1] حاکم (٢٣٨٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٩٦) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] ترمذي (٢٣٥٤) گێراویەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٨٠٧٦) بە "سەحیح"ی داناوە
[3] صحيح ابن حبان (٢/٤٥٢).

بەشێکی بۆ فەرموودەکەی ئەبو هورەیرە ﷺ داناوە بە ناوی: "فەزڵی خوای پەروەردگار ﷻ بۆ هەژارانی ئارامگری ئەم ئوممەتە، بە چوونە بەهەشتیان پێش دەوڵەمەندەکانیان بە ماوەیەکی دیاریکراو [1]".

٢- البیهقی دەڵێت: جیاوازی ئەم گێڕانەوانە لە ماوەکان، گەر چی هەموو گێڕانەوەکان پارێزراون، دەگونجێ بە گوێرەی پلەوپایەی هەژاران بێت [2].

ابن القیم ﷺ دەڵێت: ماوەی زوو چوونە بەهەشت بە گوێرەی حاڵی هەژار و دەوڵەمەندەکانە، هەیانە چل ساڵ پێشتر دەچێت، هەشیانە پێنج سەد ساڵ، هەروەکو مانەوەی گوناهبارە یەکتاپەرستەکان لە ئاگر بەگوێر حاڵیان دەبێت، خواش زاناترە [3].

٣- پێنج سەد ساڵەکە بە گوێرەی چوونی یەکەم هەژارە بە بەراورد بە دواین دەوڵەمەند [4].

(٤)

هەر لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەر خوا ﷺ بووم، خۆر هەڵات، فەرمووی: **"ڕۆژی دوایی خوای گەورە قەومانێك دێنێت ڕووناکیان وەك ڕووناکی ئەم خۆرەیە"**.

ئەبوبەکر گوتی: ئایا ئەوانە ئێمەین ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"نەخێر، بۆ ئێوە خێرێکی زۆر هەیە، بەڵام ئەوانە هەژارانی موهاجیرەکانن، ئەوانەی لە هەموو لایەکی زەوییە حەشر دەکرێن"**.

ئینجا فەرمووی: **"بەهەشت بۆ غەریبان، بەهەشت بۆ غەریبان، بەهەشت بۆ غەریبان"**.

گوتیان: غەریبان کێنە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"مرۆڤانێکی ساڵحین کە لەناو کۆمەڵە خەڵکانێکی خراپ دان، ئەوانەی سەرپێچی خوا دەکەن زیاترن لەوانەی ملکەچی دەکەن [5]"**.

## هەواڵی پێدەدان، کە زۆرترینی ئەهلی بەهەشت لەوانن:

عومرانی کوڕی حصین ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: **"سەیری خەڵکی بەهەشتم کرد بینم زۆرترینی خەڵکی بەهەشت هەژارەکانن، سەیری ئاگرم کرد، بینم زۆرترین خەڵکی ئەوێش ئافرەتەکانن [1]"**.

---

(١) سەرچاوەی پێشوو (٤٥١/٢).

(٢) البعث والنشور (٤٢٦).

(٣) حادي الأرواح (٨١).

(٤) سەیری: النهاية فى الفتن والملاحم بكە (٢٧٣/١).

(٥) ئەحمەد (٧٠٣٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی دەڵێت: "صحيح لغيره"، (صحيح الترغيب والترهيب (٣١٨٨).

ئەمەش پاڵپشتییەکی دەروونییە بۆ هەژاران، ئەوانەی دونیا و ماڵ و سامانیان لە دەست چووە.

ابن بطال دەڵێت: مەبەست لە "**بینیم زۆرترین خەڵکی بەهەشت لە هەژارەکانن**"، گەورەکردن و فەزڵی هەژاران بەسەر دەوڵەمەندەکان نییە، بەڵکو واتای ئەوەیە: **هەژاران** لە دونیا ژمارەیان لە دەوڵەمەندان زیاترە، جا هەواڵی بەمە داوە، وەکو دەگوترێت: زۆرترینی خەڵکی دونیا هەژارانن وەکو هەواڵدان بە حاڵیان.

هەژارییەکە هۆکار نییە بۆ چوونیان بۆ بەهەشت، بەڵکو بە هۆی چاکبوونیان لەگەڵ ئەو حاڵەی تێیدانە چوونەتە بەهەشت، چونکە هەژار گەر باش نەبێت ناچێتە بەهەشت[٢].

لەبارەی ناشوکری ئافرەتان بەرامبەر پیاوەکانیانەوە (کفران العشیر) دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ روونی کردەوە، کە ئافرەتەکان کوفرەکەیان ئەوەیە پێشێلی مافی هاوسەرەکانیان کردووە، بێگومان ئەمەش باوەڕیان کەم دەکاتەوە، ئەمەش دەریدەخات باوەڕیان زیاد دەکات بە سوپاسکردنیان و ئەنجامدانی کاری باشە بۆ هاوسەرانیان و کەس و کاریان، بۆیە جەخت لەوە دەکاتەوە کار و کردەوە لە باوەڕەوەیە، هەروەها باوەڕ گوفتار و کردارە، بۆیە بە کاری باش زیاد دەبێت و بە کاری خراپیش کەم دەبێت.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەشی تێدایە،کە مرۆڤ بە هۆی نکۆڵیکردی فەزڵ و نیعمەتەکانی خوا و سوپاس نەکردنی سزا دەدرێت)[٣].

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**لەلای دەرگای بەهەشت وەستام، زۆربەی ئەوانەی چوونە ناوی هەژار بوون، کەسانی دەوڵەمەندەکانیش قەدەغەکرابوون لە چوونە بەهەشت، بەڵام ئەوانەی ئەهلی ئاگر بوون، فەرمان کرابوو بیانبەنە ناو ئاگر**[٤]".

ابن حجر دەڵێت: (قەدغەکراوبوون) واتە رێگەیان پێنەدراوە لەگەڵ هەژاران بچنە بەهەشت، ئەمەش لە پێناو ئەوەی لێپرسینەوەی ماڵ و سامانیان لەگەڵ بکرێت، هەروەها لە پردی (قنطرة) لەلای صراط، ئەو سزا و تۆڵەی لەسەریانە لێیان وەردەگیرێتەوە[٥].

---

[١] ئەحمەد (٧٠٣٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی دەڵێت: "صحيح لغيره"، (صحيح الترغيب و الترهيب ٣١٨٨).
[٢] شرح ابن بطال على صحيح البخاري (١٠/١٧٣).
[٣] شرح ابن بطال على صحيح البخاري (١/٨٩).
[٤] بوخاری (٥١٩٦) و موسلیم (٤٩١٩) گێڕاوەتیانەوە.
[٥] فتح الباری (١١/٤٢٠).

مالیکی کوڕی دینار، دەڵێت: لە گەشتێك دەگەڕامەوە، کاتێك گەیشتمە پردەکە، ئەوەی باج و گومرگ وەردەگرێت گوتی: کەس لە کەشتییەکە دانەبەزێت. منیش پۆشاکی خۆم گرت و لەخۆم ئاڵاند و خۆم فڕێدایە سەر زەوی.

پێی گوتم: بۆچی هاتیە خوارەوە؟

گوتم: من هیچم پێ نییە.

گوتی: مادام بڕۆ

لە دڵی خۆمدا گوتم: ڕۆژی دوایش بەم شێوەیە[1].

**داوای لێدەکردن ئامادەبن تا بە هۆی ئەوانەوە دوعاکانیان قبوڵ بێت:**

پێغەمبەر ﷺ هەژارانی خۆشدەویست، حەزی دەکرد لێی نزیك بن و لەگەڵی دابن.

ئەبو دەردا ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**بانگی بێ دەسەڵاتانم بۆ بکەن، چونکە ئێوە بە هۆی دوعاکانی ئەوان ڕزق دەدرێن و سەردەکەون**"[2].

"**بێ دەسەڵاتان**"، واتە: هەژارانی موسڵمانان، بە هۆی خراپی حاڵیان خەڵك بە بێ دەسەڵاتیان دەزانن.

"**سەردەکەون**"، واتە: بە هۆی ئەوان و بەرەکەتی دوعاکانیان بەسەر دوژمنەکانتان سەردەکەون.

سەعد ﷛ پێی وابوو فەزڵ و گەورەییەکی هەیە جیاواز لە خەڵکانی تر، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: "**ئێوە سەرناکەون و ڕزقتان پێ نابەخشرێت، تەنیا بە دوعای بێ دەسەڵاتەکانتان نەبێت**"[3].

لە ریوایەتێکی تردا: "**بەڵکو خوای پەروەردگار ئەم ئوممەتە بە هۆی کەسانی بێ دەسەڵات و بێ چارە سەردەخات، بە دوعاکانیان، نوێژەکانیان، دڵسۆزییەکانیان**"[4].

واتاکەی: بەندایەتی کردن و دوعای کەسانی هەژار و بێ دەسەڵات، زۆرترین دڵسۆزییان تێدایە بۆ پاککردنەوەی دڵەکانیان لە وابەستەبوون بە باقوبریقی دونیا، تەنیا یەك ئامانج و خەمیان هەیە، ئەمەش وایکردووە دوعاکانیان قبوڵ بێت و کردەوەکانیان پاك بێت[5].

---

[1] واتە هەژار لێپرسینەوەی ئاسانە، چونکە هیچ پارە و سامانێکی نییە لەسەری حیساب بکرێت: صفة الصفوة (٣/٢٧٧).

[2] ئەبو داود (٢٥٩٤) و ترمزی (١٧٠٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحه ٧٧٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] بوخاری (٢٨٩٤) گێراوەتیەوە.

[4] النسائی (٣١٧٨) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب ٦) بە "سەحیح"ی داناوە.

[5] سەیری فتح الباری (٦/٨٩) بکە، شەرحی ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (٦/٩٠)، عون المعبود (٧/٢٥٦).

**فەرمانی دەکرد ڕێزیان لێ بگیرێت:**

**یەکێك لەم شێوازانە: ڕێگری کردن لە پێدانی ئەو خواردنەی خەڵك حەزی پێ ناکات:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: بزنمژێك بە دیاری درایە پێغەمبەری خوا ﷺ، نەیخوارد.
گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا بیدەمە هەژاران؟
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەو شتەی خۆتان نایخۆن دەرخواردی خەڵکی مەدەن[١]"**.

ئەمەش جێبەجێکردنی فەرمایشتی خوای پەروەردگارە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴾ البقرة: ٢٦٧

واتای ئایەتەکە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: ببەخشن لە باشترین بەروبووم و بەرهەمێك کە بەدەستتان هێناوە و لەو بەروبوومانەی کە لە زەویدا بۆمان دەرهێناون و ڕواندوومانە، نەکەن نیازی بەخشینی شتی ناپوخت و بێ کەڵك بکەن و لەو ببەخشن، لەکاتێکدا خۆتان ئەو جۆرە شتانە وەرناگرن و پێی ڕازی نابن (ئەگەر بتاندرێتێ) مەگەر چاوی لێ بنوقێنن و بزانن کە خوا دەوڵەمەند و بێنیازە و شایستەی سوپاسە).

بەڕاێی کوڕی عازب ﵁ لەبارەی فەرمایشتی پەروەدگار ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ﴾ دەڵێت: ئەی خەڵکی ئەنسار ئەم ئایەتە لەبارەی ئێمەوە دابەزی.

ئێمە خاوەنی دارخورما بووین، هەر کەسێك بە گوێرەی زۆری و کەمی دار خورماکەی، خورمای دەهێنا، جا ئیواهەبوو هێشوویەك خورمای یان دوو هێشووی دەهێنا و لە مزگەوت هەڵی دەواسی.

ئەهلی (صوفە) کەسانێکی هەژاربوون، خواردنیان نەبوو، لە مزگەوت دەمانەوە، ئەگەر یەکێکیان برسی بوایە، دەچووە لای هێشووە خورمایەکە بە گۆچانەکەی لێ دەدا، ئینجا فەریکەخورما و خورمای گەیوو دەکەوتە خوارەوە ئەوانیش دەیانخوارد.

هەندێك لە خەڵکی، حەزیان لە خێر نەبوو، هێشوو خورمایەکیان دەهێنا کە خورمای خراپ و بۆگەنی تێدابوو، یاخود هێشووەکە شکابوو، هەڵی دەواسی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبۡتُمۡ وَمِمَّآ أَخۡرَجۡنَا لَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِۖ وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ وَلَسۡتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغۡمِضُواْ فِيهِۚ﴾

[١] ئەحمەد (٢٤٢١٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٤٢٦) بە "حەسەن"ی دناوە.

دەڵێت: ئەگەر یەکێك لە ئێوە دیارییەکی بۆ هات وەکو هەمان دیارییەکەی خۆی، وەری ناگرێت مەگەر بە چاو نوقان نەبێت، یان لەبەر شەرم وەریدەگرێت.

دەڵێت: لەمە بەدواوە هەر کەسێك لە ئێمە چ شتێکی باشی هەبایە ئەوی دەهێنا.

**هەڵوێستێك لە پیاوێکی سەلەفەوە:** مونزیری ثوری دەگێڕێتەوە: کە رەبیعی کوڕی خوثیم باشترین جۆری حەلوای دەدایە کەسێکی گێل، پێیان گوت: خۆ ئەو نازانێت چ دەخوات؟

گوتی: بەڵام خۆ خوای گەورە دەزانێت! [1]

## لەوانە: ڕێگری دەکرد لەوەی هەژاران بانگی داوەتی نا نخواردن نەکرێن:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**خراپترین خواردن خواردنی (داوەتە)، دەوڵەمەندەکان بانگ دەکرێن، هەژاران پشتگوێ دەخرێن، هەرکەسەك ئەوان بانگهێشت نەکات، بێگومان سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی کردووە**"[2].

**نەوەوی** دەڵێت: (واتای فەرموودەکە هەواڵدانە سەبارەت بەو ڕووداوانەی دوای ئەو ڕوودەدەن، بە لەبەرچاوگرتنی دەوڵەمەندان لە داوەتی نانخواردن و تایبەتکردنیان بۆ داوەتەکە و جیاکردنەوەیان بە پێدان و پێشکەشکردنی باشترین خواردن و دانانیان لە شوێنی سەرەوەی مەجلیس و چەندانی تر.. کە باوە لە داوەتکردن، پەنا بەخوا [3]).

ئەگەر بۆ داوەتکردن بانگکرای واجبە وەڵامی داواکە بدەیتەوە، بە مەرجێك داوەتەکە شتی بێ شەرعی تێدا نەبێت.

بەڵام بە داخەوە ئێستا دەبینن دەوڵەمەندەکان بۆ داوەتەکان بانگ دەکرێن، لە کاتێکدا ئەوان پێویستیان بە خواردن نییە، هەژارەکانیش پشتگوێ دەخرێن لە کاتێدا ئەوان لە خراپترین حاڵدان لە پێویستیان بە خواردن.

ئەی خاوەنی داوەت، خەڵکی هەژار لە بیر مەکە، با هەژارەکان بەشیان لە داوەتەکەت هەبێت.

---

[1] سير أعلام النبلاء (٢٩٠/٧).

[2] بوخاری (٥١٧٧) و موسلیم (١٤٣٢) گێراوەتیەوە، فەرموودەکە حوکمی "رفع"ی هەیە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٣٧/٩).

**هانی دەدان کەسایەتی خۆیان رابگرن و نەفس بەرز بن:**

پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کەسێك داوای شتێك یان پێویستییەکی لێ کردبایە دەیدایێ، تەنانەت گەر چەندبارەش بووبایەوە، بۆشی روون دەکردنەوە کە خۆراگرتنیان و داوانەکردنیان باشتر و چاکترە.

یەکێك لەو سیفەتانە خوای پەروەردگار لە کتێبەکەی خۆیدا پێی ستایشی باوەڕداران دەکات، (تعفف)ـە بە واتای نەفس بەرزی و خوڕاگری دێت، (العفة) بریتییە لە وازهێنان لەو شتانەی دروست نین و جوان نین بۆ مرۆڤ، هەروەها وازهێنان لە دواکردن لە خەڵك[1].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لِلْفُقَرَاءِ الَّذِينَ أُحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٧٣

واتای ئایەتەکە: بەخشینەکان بۆ ئەو هەژارانەی لە پێناوی خوادا لێبڕاون و ناتوانن بگەڕێن بە زەویدا و بازرگانی و کاسبی بکەن، ئەوەی نەیانناسێت، (ئەو هەژارانە ئەوەندە کەسایەتی خۆیان رادەگرن و نەفس بەرزن)، وادەزانێت دەوڵەمەندن، تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ (یا ئەی ئیماندار) بە ڕەنگ و ڕوخسار و سیمایاندا دەیانناسیت، داواناکەن لەخەڵکی بەزۆر شتی لێبسەنن و رووگیریان بکەن، هەر خێرێك ئەنجام بدەن ئەوە بێگومان خوا زانایە پێی).

**طبري** دەڵێت: ﴿يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أَغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ﴾ واتە: کەسی نەزان بە حاڵی ئەو هەژارانە، بە هۆی خۆگری و نەفس بەرزیان وادەزانێت ئەوان دەوڵەمەندن، هەروەها لەبەر دەست پانەکردنەوەیان لە بەردەم خەڵکی و ئارامگرتنیان لە خۆشی و ناخۆشیدا.

﴿تَعْرِفُهُم بِسِيمَاهُمْ﴾: واتە ئەی موحەممەد ﷺ بە هەندێ نیشانەی وەك خشوعی و بێ فیزی، یان خراپی جلوبەرگیان دەیانناسی.

﴿لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إِلْحَافًا﴾: واتا ئەوان بە زۆر داوای شت لە خەڵك ناکەن، بۆ نمونە دەگوترێ سواڵکەرەکە بەزۆر داوای شت دەکات، ئەگەر رووگیر بێت و ئیلحاح بکات.

---

[1] سەیری لسان العرب (٩/٢٥٣) بکە.

گەر گوترا: ئایا ئەو خەڵکەی لەم سورەتە باسکراون، داوا لەو خەڵکە دەکەن بەلام بەبێ زۆری لێکردن و ئیلحاحی؟

لەوەلامدا دەگوترێت: بەڵکو ئەوان لە بنەڕەتدا هەر داوا لە خەڵك ناکەن، چونکە خوای پەروەردگار ﷻ بە سیفەتی (التعفف — نەفسبەرزی) وەسفیان دەکات، بەڵکو تەنیا بە سیمای دەموچاویان دەناسرێنەوە، ئەگەر سواڵکردن کاری ئەوان بووایە، ئەوا هەرگیز ئەم نەفسبەرزییە لە سیفەتی ئەوان نەدەبوو.

واتای ستایشکردنیان بریتییە لەدوورخستنەوەی سیفەتی خراپە لێیان [1].

**پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانی خۆی لەسەر ئەم سیفەتە جوانە پەروەردە دەکردن،** حەکیمی کوڕی حەزام ﷺ دەڵێت: داوای شتم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێی دام.

داوام لێکردەووە، پێی دام، دیسان دوام لێکرد، پێی دام.

پاشان فەرمووی: **"ئەی حەکیم ماڵی ئەم دونیایە جوان و شیرینە، هەرکەسێك بە نەفسبەرزی پەیدایکات، بەرەکەتی تێدەکەوێت، هەرکەسێکیش بەداواکردن پەیدایکات بەرەکەتی تێناکەوێت، وەك ئەو کەسەیە کە دەخوات و تێرنابێت، دەستی بەخشەر چاکترە لە دەستی وەرگر".**

حەکیم دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەو کەسەی تۆ بە حەق ڕەوانەکردووە، لەمەودوا داوا لە کەس ناکەم، تا دونیا جێدەهێڵم.

ئەبوبەکر ﷺ بانگی حەکیمی دەکرد بۆ ئەوەی بەخششی پێبدا، ڕەتی کردەوە وەری بگرێت.

پاشان عومەر ﷺ بە هەمان شێوە بانگی کرد بۆ ئەوەی پێی ببەخشێت، ڕەتی کردەوە هیچی لێوەربگرێت.

عومەر فەرمووی: ئەی خەڵکی موسڵمان من دەتانکەمە شاهێد لەسەر حەکیم، من مافی خۆیم پێدا لەم دەسکەوتە، ڕەتی کردەوە وەرییبگرێت.

حەکیم هەتاوەکو وەفاتی کرد لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ دوای لە هیچ کەسێکی تر نەکرد [2].

**ئبین حەجەر** دەڵێت: (بەڵکو حەکیم بۆیە ڕەتی کردەوە بەخشش وەربگرێت، لە کاتێکدا مافی خۆی بوو، چونکە ترساوە گەر شتێك لە کەسێك وەربگرێت، ڕابێت لەسەر

---

[1] تفسیر الطبري (٥/٥٩٣٦٠٠)، بە کورکتراوەیی و دەستکارییەوە.

[2] بوخاری (١٤٧٢) و موسلیم (١٠٣٥) گێڕاوەتیانەوە.

وەرگرتن، ئەوکات سەردەکێشێت بۆ ئەو شتەی حەزی پێناکات، بۆیە وازی لەمە هێنا، وازی لەم شتە هێنا کە گومانی بۆ دروست دەکات بۆ ئەو شتەی گومانی بۆ دروست ناکات.

عومەریش بۆیە خەڵکی کردە شاهێد لەسەر ئەم بابەتە، بۆ ئەوەی ئەو کەسەی ئاگای لە ڕووداوەکە نییە، نەڵێت عومەر مافی حەکیمی نەدا).[1]

**گەر پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی نەبووایە بیداتە هەژاران، بە گوفتاری نەرم و جوان وەڵامی دەدانەوە، بە جوانترین شێوە داوای لێبوردنی دەکرد:**

وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَآ أَذًى وَٱللَّهُ غَنِىٌّ حَلِيمٌ ﴾ البقرة: ٢٦٣ واتای ئایەتەکە: (قسە و گوفتاری جوان و چاوپۆشیەك (لە هەڵە)، چاکترە لە بەخشینێك کە ئازاری بەدوادا بێت و منەت بکرێت، خوایش دەوڵەمەند و بێ نیازە و خۆڕاگر و لەسەرخۆیە).

ئەبو سەعیدی خودری ؓ دەڵێت: کۆمەڵە پیاوێکی ئەنساڕی داوای بەخششیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش پێی دان، دووبارە داوایان لێکردوە، ئەویش پێی دان، دیسان داوای لێکردووە، ئەویش پێی دان، تا ئەوەی هەیبوو نەیما.

ئینجا فەرمووی: **"هەرچی هەم بێت لە شتی باش، لێتان ناشارمەوە، هەرکەسێکیش خۆبگرێت لە داواکردن، خوای گەورە ڕووی دەپارێزێت و پێی دەبەخشێت، هەرکەسێکیش داوای ماڵ و سامان لە خوا بکات، خوای گەورە پێی دەدات، هەر کەسێکیش داوای ئارامگرتن بکات، خوای گەورە ئارامی پێ دەبەخشێت، هەر بەخششێك درابێتە کەسێك هێندەی ئارامگرتن، چاکتر و گەورەتر نەبووە"**[2].

هەر لەم بارەیەوە، **چیرۆکی** ئەوانەی لە جەنگی تەبوك هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لێکرد وڵاخیان پێ بدا بۆ سواربوون و جیهادکردن، پێغەمبەریش داوای لێبووردنی لێکردن چونکە هیچ وڵاخی نەبوو پێیان بدا.

خوای گەورە فەرمووی: ﴿ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ

---

[1] فتح الباری (٣/٣٣٦).
[2] بوخاری (٢٤٦٩) و موسلیم (١٠٥٣) گێڕاوەتیانەوە.

غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ
عَلَيْهِ تَوَلَّوا وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا مَا يُنفِقُونَ ﴾ التوبة: ٩١-٩٢

واتای هەردوو ئایەتەکە: (لاواز و نەخۆش و ئەوانەش کە خەرجییان دەست ناکەوێت، هیچ گوناه و گلەییەکیان لەسەر نیە (لە بەشداری نەکردنی غەزادا) کاتێك دڵسۆز بن بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی، لەسەر ئەو چاکەخواز و پاکانە هیچ جۆرە گلەیی و رەخنەیەك نییە، خوای گەورە لێخۆش بووە و میهرەبانیشە. (٩١) هەروەها گلەیی و رەخنە نییە لەسەر ئەو کەسانەی کە دێن بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی وڵاخی سواریان بۆ پەیدا بکەیت و بێن بۆ جیهاد، تۆش دەڵێت: هیچ شك نابەم تا بتاندەمێ بۆ سواری (ئیتر بە نائومێدی) گەڕانەوەو چاویان فرمێسکی لێ دەڕژا لە خەفەتدا ئەسرینی لێ دەباری چونکە هیچ شك نابەن ببیەخشن و خەرجی بکەن).

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەڵێت: لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئەشعرییەکان بۆ داواکردنی وڵاخ هاتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ.

فەرمووی: **"سوێند بە خوا لەسەر پشتی وڵاخ هەڵتانگرم، هیچم نییە پێداتان بدەم لە وڵاخ تا سواری بن"**.

دەڵێت: ماینەوە تا ئەوەندەی خوای گەورە ویستی، پاشان هەندێك وشتری بۆ هێنایین، فەرمانی پێکردین سێ وشتر هەڵبژێرین (تەمەنیان لە نێوان ٣ بۆ ١٠ساڵ، رەنگ سپی و قەڵەو).

کاتێك دەرچووین، هەندێکمان بە یەکتریمان گوت: خوای گەورە بەرەکەت ناخاتە ناومان، چونکە هاتینە لای پێغەمبەری خوا بۆ وڵاخ، سوێندی بۆ خواردین کە سوارمان ناکات، پاشان سواری کردین. چوونە لای و هەواڵەکەی پێدا.

ئەویش فەرمووی: **"من سوارم نەکردوون، بەڵکو خوای گەورە سواری کردوون، سوێند بە خوا گەر خوا ویستی لەسەربێت من سوێند ناخۆم، پاشانیش گەر شتێکی باشترم بینی، کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم و شتە باشەکە ئەنجام دەدەم**[1] ".

## پێویستیی هەژارانی دەخستە پێش پێویستی کەس و کارەکەی:

عەلی ﷺ دەڵێت: فاتیمە گلەیی لای پێغەمبەری خوا کرد لەبارەی ئەو دەستارەی هەیبوو، ئینجا کاتێك چووە لای داوای خزمەتکارێکی لێکرد، لە کاتی سەردانیدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ نەبوو، قسەکەی بۆ خاتوو عائیشە گێڕایەوە.

---

[1] بوخاری (٣١٣٣) و موسلیم (١٦٤٩) گێڕاوەتیانەوە.

که هاتەوە پێی راگەیاند.

عەلی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە لامان، ئەو کات لەناو جێگابووین، ویستمان هەڵبستینەوە، فەرمووی: **"لە جێگای خۆتان بن"**، هات لەلای خوارەوە لە نێوانمان دانیشت، تا فێنکایی پێیەکانی گەیشتە سینگم.

فەرمووی: **"ئایا شتێکتان پێ بڵێم لە خزمەتکار باشتر بێت؟، ئەگەر چوونە سەر جێگا، ئەوا سی و چوار جار بڵێن (الله أكبر) و سی و سێ جار بڵێن (الحمد الله) و سی و سێ جاریش بڵێن (سُبحان الله) ئەوا لە خزمەتکار بۆتان باشترە [1]"**.

لە گێڕانەوەی عەلیدا ﷺ هاتووە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"پێتان نادەم، ناهێڵم خەڵکی هەژاری (صوففە) سکیان لەبرسییەتی بکوشن"**. جارێکیان فەرمووی: **"خزمەتکار بە ئێوە بدەم و خەڵکی هەژاری (صوففە)ش سکیان لەبرسییەتی لول بدرێت [2]"**.

**موهەلەب** دەڵێت: (پێغەمبەری خوا ﷺ کچەکەی خۆی فێرە ئەو زیکرە کرد کە سوودی بۆ ئاخیرەت زیاترە، رێزی ئەهلی (صوففە)شی گرت، چونکە ئەو خەڵکە هەژارە خۆیان تەرخان کردبو بۆ گوێبیستبوونی زانست و سوننەت، وازیان لە سکی خۆیان هێنابوو، حەزیان لە بە دەستهێنانی ماڵ و منداڵ نەبوو، نەفسی خۆیان لە خوای گەورە کڕی بوو

**بە ئاماژەدان بۆ کاسبیکردن یارمەتی دەدان، هۆشداری پێدەدان لە دەست پانکردنەوە:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هەر کەسێك دەست لە خەڵك پان بکاتەوە، تەنیا بۆ زۆربوونی پارە و ماڵی، ئەوا بێگومان داوای پشکۆی ئاگری کردووە، جا هەر کەسێك حەز دەکات با پشکۆکە بچوك بکاتەوە یان زیادی بکات [4]"**.

هەر لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، گەر یەکێك لە ئێوە گوریسێك بەدەستەوە بگرێت و باوەشە دارێك بهێنێت، باشترە لەوەی دەست لە کەسێکی تر پان بکاتەوە، ئینجا یان بیداتێ یان ڕەتی بکاتەوە [5]"**.

پیشەی دارکردن سەرباری ئەوەی پیشەیەکی قورسە، لەوانەیە خەڵك بە پیشەیەکی کەم تەماشای بکات و قازانجێکی کەمیشی هەیە، هێشتا باشترە لە بێکاری و دەست پانکردنەوە لە خەڵك.

---

[1] بوخاری (٣١٣٣) و موسلیم (٢٧٢٧) گێڕاوەتیانەوە.
[2] ئەحمەد (٥٩٧) گێڕاوەتیەوە، ئەحمەد شاکر و الارناؤط بە "سەحیح"یان داناوە.
[3] فتح الباری (١١/١٢٤).
[4] موسلیم (١٠٤١) گێڕاوەتیەوە.
[5] بوخاری (١٤٧٠) و موسلیم (١٠٤٢) گێڕاوەتیانەوە.

**پێغەمبەری هانی کارکردنی داوە، ئاماژەی بە گەورەیی کاری باش کردووە:**

**کشتوکاڵ:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هیچ موسڵمانێك نییە نەمامێك بچێنێت، یان کشتوکاڵێك بکات، جا باڵندە یان مرۆڤ یان ئاژەڵێك لێی بخوات، ئەوا هەر چاکەی بۆ دەنوسرێ"**[1].

**نەوەوی** دەڵێت: ئەم فەرموودەیە گەورەیی چاندن و کشتوکاڵ دەردەخات، پاداشتی بکەرەکەی نەبڕاوەیەوە، تا ئەو کاتەی چاندن و کشتوکاڵەکەی مابێت، ئەوەشی لێی بەرهەم دێت هەتا ڕۆژی دوایی[2].

هەر لە ئەنەسەوە ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"گەر ڕۆژی دوایی هات، لە دەستی یەکێکتان شەتڵە نەمامێك هەبوو، گەر توانی بەر لەوەی هەڵبستێت شەتڵەکە بچێنێت، با بیچێنێت"**[3].

**پیشەسازی:**

میقدام ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"هیچ کەسێك خواردنێك ناخوات باشتربێت لە خواردنی دەستی خۆی، پێغەمبەری خوا داود ﷺ لە بەرهەمی دەستی خۆی دەیخوارد"**[4].

ابن حجر دەڵێت: حیکمەت لە باسکردنی داود بە تەنیا، لە خواردنی بەرهەمی دروستکراوی خۆی، لە کاتێکدا ئەو پێویستی بە کارکردن نەبووە، چونکە پادشای سەر زەوی بووە، وەك خوای پەروەردگار ئاماژەی بۆ دەکات.

بەڵکو ویستوویەتی خواردن بە ڕێگەیەکی دروست و باش بخوات، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ چیرۆکی ئەو پێغەمبەرەی کردۆتە بەڵگە بۆ بە دەستهێنانی خواردن لە بەرهەمی دەستی[5].

**بازرگانی:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَـٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ ﴾ النساء: **٢٩ واتای ئایەتەکە** (ئەی

---

(١) بوخاری (٢٣٢٠) و موسلیم (١٥٥٣) گێڕاوەتیانەوە.

(٢) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢١٣/١٠).

(٣) ئەحمەد (١٢٥٦٩) گێڕاوەتیەوە، و ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٤٢٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٤) بوخاری (١٩٦٦) گێڕاوەتیەوە.

(٥) فتح الباری (٣٠٦/٤).

ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ماڵ و سامانی یەکتر بەناحەق و بەبێ بەرامبەر مەخۆن لەنێوان خۆتاندا، مەگەر بازرگانیەك بێت و لەسەر رەزامەندی هەموولایەکتان بێت).

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: پێشتر (عەکاز و مەجنە و ذوالمجاز) لە سەردەمی نەفامیدا بازاڕ بوون، کاتێك ئیسلام هات، لە ترسی توشبوون بە گوناه لە مەراسیمی حەجدا وازیان لە بازاڕ و بازرگانی هێنا. ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ ﴾ البقرة: ١٩٨ واتە: (هیچ گوناهبار نابن ئەگەر لەکاتی حەجدا لە فەزڵی پەروەردگارتان، خۆتان بەهرەوەر بکەن)[١].

ئاگاداری: (في مواسم الحج): ئەمە خوێندنەوەی ئیبن عەباسە، خوێندنەوەیەکی شازە، حوکمەکەی لەلای زانایان حوکمی تەفسیرە[٢].

عروەی بارقی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دینارێکی پێدا بۆ ئەوەی مەڕێکی پێ بکڕێت، ئەویش دوو مەڕی پێ کڕی، یەکێکیانی بە دینارێك فرۆشت، ئینجا دینارێك و مەڕێکی هێنایەوە لای، ئەویش دوعای بەرەکەتی لە کڕین و فرۆشتندا بۆ کرد، فەرمووی: "**خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کڕین و فرۆشتنت**".

بۆیە تەنانەت خۆڵیشی کڕیبایە قازانجی لێ دەکرد[٣].

پێغەمبەران چەندان کار و پیشەیان کردووە، لەوانە:

**شوانی:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردووە، شوانی نەکردبێت**".

هاوەڵان فەرموویان: تۆش؟ فەرمووی: "**بەڵێ، من لە بەرامبەر چەند درهەمێك بۆ خەڵکی مەککە شوانیم کردووە**"[٤].

**ئاسنگەری:** خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ١٠ أَنِ ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ سبأ: ١٠-١١

---

[١] بوخاری (٤٥١٩) گێراوەتیەوە.
[٢] فح الباری (٣/٥٩٥).
[٣] بوخاری (٣٦٤٣) و ترمذي (١٢٥٨) گێڕاوەتیانەوە.
[٤] بوخاری (٢٢٦٢) گێراوەتیەوە.

واتای هەردوو ئایەتەکە: (سوێند بەخوا بەراستی ئێمە رێز و بایەخێکی زۆرمان بەخشی بە داود لەلایەن خۆمانەوە، (فەرمانمان داوە): ئەی کێوەکان و باڵندەکان تەسبیحات و سروودی ستایشی لەگەڵدا بڵێنەوە، هەروەها ئاسنیشمان بۆ نەرم کرد (١٠) هەروەها فەرمانمان پێدا کە: چەندەها کەلوپەلی جەنگی فراوان دروست بکە، ئەڵقە و تەنینەکانیشی بە رێکوپێکی رێك بخە و لە یەکیان تێهەڵکێش بکە، هەروەها فەرمانمان پێدان: کار و کردەوەی چاکە ئەنجام بدەن، دڵنیاش بن کە من بینام بەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن).

**دارتاشی:** ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"زەکەریا ﷺ دارتاش بووە."**[(١)]

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دارتاشی لە کەسایەتی پیاو کەم ناکاتەوە، بەڵکو پیشەیەکی گەورەیە.
- چاکە و پیاوەتی زەکەریا ﷺ دەردەخات، کە کاسب بووە لە بەرهەمی دەستی خۆی دەیخوارد.

بەم شێوەیە میراتگرانی پێغەمبەران لە زانایان و پیاوچاکان، نازناوەکانیان دەریدەخات کە خاوەن پیشە بوونە: لەنمونەی: البزّاز (کوتاڵ فرۆش)، الجصّاص (گەچ فرۆش)، الجزّار (گۆشت فرۆش)، الزجّاج (شوشەدروستکەر)، الحداد (ئاسنگەر)، الحذّاء (پێڵاو دروو) و چەندانی تر.

بەڵام تەمبەڵی و دانیشتنی بێکاری بە بێ هۆ، ئەمەیان زەمکراو و خراپە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ بەشێکی بۆ کەسی تەمبەڵ لە دەسکەوتی موسڵمانان دانەناوە، ئەمەش بۆ ئەوەی هانی ئەوانە بدات کە توانایان هەیە کار و کاسبی حەڵاڵ بکەن، فەرمووی: **"سەدەقە و زەکات بۆ کەسی دەوڵەمەند و کەسی بەهێز و جەستەساغ دروست نییە"**[(٢)].

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: بە ڕاستی من ڕقم لەو کەسەیە کاتێك دەیبینم دەستبەتاڵە، نە هیچی بۆ دونیا نە بۆ ئاخیرەتی هەیە[(٣)].

---

(١) موسلیم (٢٣٧٩) گێراوەتیەوە.

(٢) ترمذي (٦٥٢) و ابو داود (١٦٣٤) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٨٧٧) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٣) ابن أبی شیبة (٣٤٥٦٢) گێراویەتیەوە.

سوفیانی الثوری دەڵێت: پێویستە لەسەرت کاری پاڵەوانان بکەی، کاسبی حەڵاڵ و بەخشین بۆ ماڵ و منداڵ ئەنجام بدەی [١].

پەندێکی عەرەبی هەیە دەڵێت (احفر بيراً، وطمّ بيراً، ولا تعطل أجيرا) [٢]: واتە پێویستە گەنجان بە کاربخرێن و لێرابێن لە کاسبیکردن، پارە بە بێ بەرامبەر وەرنەگرن، تەنانەت ئەگەر ناچار بیت بەکاریانبخەیت بۆ کارێك سودیشی نەبێت، چونکە ڕاهێنانیان لەسەر کارکردن و جددیەت و وازهێنان لە بێکاری بە پیرۆزترین سوود دادەندرێت.

شاعر دەڵێت:

| | |
|---|---|
| اهـجـر النـــوم في طـــلبِ العـــلاءِ | وصلِ الصبحّ دائباً بالمساءِ |
| والتمــس بالمســير في كـلّ قـطـر | رتبـة العـــارفين والحـكـماء |
| إنّ أمضى الرّجالِ من كان مسهماً | نافذً في حشـاشـةِ الغـبراء |
| إنّمـــا الأرضُ الفضـــاءُ كتـــابٌ | فاقـرْوه معاشـرَ الأذكـــياء |

بۆی روونکردنەوە کە هەژاری راستەقینە کێیە؟ فەرمووی: **"هەژار ئەو کەسە نییە، لە دەوری خەڵك دەسوڕێتەوە و داوای لوقمەنانێك یان دوو لوقمەنان، یان داوای دەنکە خورمایەك یان دوو دەنکە خورما دەکات"**.

گوتیان: ئەی هەژار کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"ئەو کەسەیە کە دەوڵەمەندێك نابینێتەوە یارمەتی بدات، یان بە حاڵی بزانێت، پێ ببەخشێت، ناچێت خۆشی داوا لە خەڵك بکات [٣]"**.

واتە: هەژاری راستەقینە، کە شایەنی پێ بەخشینە، ئەوە نییە دەچێتە لای خەڵك، بەڵکو ئەو کەسەیە دەوڵەمەندێك نابینێتەوە یارمەتی بدات و بە حاڵی بزانێت، ئەمەش واتای وانییە کە ئەو کەسەی بە دەوری خەڵك دەسوڕێتەوە و داوا لە خەڵك دەکات هەژار نییە، بەڵکو هەژاری تەواو نییە [٤].

---

(١) حلية الاولياء (٣٨١/٦).

(٢) مجمع الامثال (٢٣٠/١)، مانای پەندەکە: بیرێك هەڵکەنە، بیرێك پڕبکەرەوە، بەڵام کرێکارێك بێکار مەکە (و)

(٣) بوخاری (١٤٧٦) و موسلیم (١٠٣٩) لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێڕاوەتیانەوە.

(٤) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٩/٧).

**لەگەڵ ئەوەشدا فەرمانی دەکرد بە هەژار ببەخشن، ئەگەر شتێکی کەمیش بێت:**

کەسی هەژار و نەدار مافیان هەیە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾ الذاريات: ١٩ هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ مَّعۡلُومٞ ٢٤ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾ المعارج: ٢٥-٢٦ واتە: (ئەوانەی کە بەشێکی دیاریکراو لە سامانیاندا هەیە (٢٤) بۆ هەژاری داواکار و بێ نەوای داوانەکەر).

السعدي دەڵێت: ئەو مافە واجبە، سوننەتیشە، بۆ ئەو هەژارانەی دوا لە خەڵك دەکەن، بۆ ئەوانەشی دوا ناکەن[1].

بۆیە پێغەمبەر ﷺ هانی بەخشینی بۆ هەژاران دەدا، تەنانەت گەر بە شتێکی کەمیش بێت، عەبدولرەحمانی کوڕی بەجید لە داپیری خۆی (دایکی بەجید) دەگێڕێتەوە، ئەو لەو ئافرەتانە بووە بەیعەتیان دایە پێغەمبەر ﷺ، دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا، هەژاران دێنە بەر دەرگام، شتێك نابینم پێیان بدەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"گەر هیچت نەبێت تەنیا سمێکی سوتاو، ئەوا پێیان بدە"**[2].

مەبەست لە **"سمی سوتاو"**، پێدانی شتێکی بچوکە بە هەژار، واتە هەژار ڕەت مەکەنەوە تا شتێکی دەدەنێ، تەنانەت ئەگەر شتێکی کەم بەهاش بوو وەك سمێکی سوتاو هەر پێی بدە[3].

لە گێڕانەوەیەکی عەمری کوڕی موعازی ئەنساری دەڵێت: هەژارێك لەبەر دەرگایماڵیان وەستا، داپیری پێی گوت: خورمای پێ بدەن.

گوتیان: ئاخر نیمانە.

گوتی: شۆربای پێ بدەن.

گوتیان: سەیرە.. دەتوانین شتێکی پێ بدەین کە نیمانە.

گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: **"هەژار ڕەت مەکەنەوە، گەر بە پێدانی سمی سوتاویش بێت"**[4].

---

[1] تەفسیری السعدي (١/٨٠٨).

[2] ئەبو داود (١٦٦٧) و ترمذي (٦٦٥) و النسائي (٢٥٧٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ١٤٤٠) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] تحفة الاحوذي (٣/٢٥٨).

[4] ئەحمەد (٢٥٥٠٧) گێڕاوەتیەوە.

**هەوڵی دەدا، هاوسەرگیری بۆ کەسانی باشیان بکات:**

ئەبو بەرزەی ئەسلەمەی ﷺ دەڵێت: ئەنسارییەکان گەر کچێك یان بێوەژنێکیان هەبووایە، بە شوویان نەدەدا تاوەکو پرسیان بە پێغەمبەر ﷺ نەکردبایە، کە ئایا پێویستی پێی هەیە یان نا؟

پێغەمبەری خوا ﷺ جارێکیان بە پیاوێکی ئەنسارِی گوت: **"کچەکەم بدەرێ"**.

گوتی: بەڵێ بەسەربەرزییەوە ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"بەڵکو من بۆ خۆم نامەوێت"**.

گوتی: ئەی بۆ کێ ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"بۆ جولەیبیب"**.

پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا با راوێژ بە دایکی بکەم.

چووە لای دایکی: گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ داخوازی کچەکەمانی کردووە.

دایکی گوتی: بێگومان بە چاوان.

گوتی: بۆ خۆی نییە، بەڵکو بۆ جولەیبیب داخوازی دەکات.

گوتی: جولەیبیب! جولەیبیب! جولەیبیب! سوێند بە خوا شووی پێ ناکات.

کاتێك ویستی بڕوات و بچێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی هەواڵی دایکەکەی پێ ڕابگەیێنێت، ئەو کات کیژۆڵەکە هەڵسا و گوتی: "کێ داخوازی منی کردووە لە ئێوە؟".

دایکی پێی ڕاگەیاند.

کیژۆڵەکە گوتی: ئایا داوای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەت دەکەنەوە؟

بمبەنە لای، بە دڵنیایی ئەو بەفیڕۆم نادات.

باوکی بردیە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی ڕاگەیاند و گوتی: ئەمە بۆ تۆ؟

ئەویش دایە جولەیبیب.

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ غەزایەك دەرچوو، کاتێك خوای گەورە دەسکەوتی شەڕی پێدان، بە هاوەڵانی فەرموو: **"کەسێکتان لە دەستداوە؟"**.

گوتیان: فڵانکەس و فڵانکەسمان لە دەستداوە.

فەرمووی: **"سەیریکەن، بزانن کەسی ترتان لە دەستداوە؟"**.

گوتیان: نەخێر

فەرمووی: **"بەڵام من جولەیبیبم لێ ون بووە"**.

گوتی: لەناو کوژراوەکان بەدوایدا بگەڕێن.

بەدوایدا گەڕان، لەناو حەوت کەسی کوژراو دۆزیانەوە کە هەموویانی کوشتبوو، پاشان کوشتبوویان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە خۆیەتی لەناو حەوت کەس دایە کە خۆی کوشتوونی و دواتر کوشتوویانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەری، ئینجا فەرمووی: "**حەوت کەسی کوشت و ئینجا کوشتوویانە، ئەو لە منە و منیش لەوم، ئەو لە منە و منیش لەوم**".

پاشان پێغەمبەری خوا لەسەر دەستی خۆی هەڵیگرت، گۆڕیان بۆ هەڵکەند، هیچ نەبوو لەسەری دابنێن، تەنیا دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبێت، پاشان لەناو گۆڕی دانا. باس نەکراوە کە شووشتویەتی.

ئیسحاقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحە بۆ ثابتی گێڕایەوە و گوتی: ئایا دەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ چ دوعایەکی بۆ خێزانەکەی کرد؟

فەرمووی: "**خوایەگیان خێری بەسەردابڕێژی، ژیانی ناخۆش نەکەی**".

ثابت گوتی: لە دوای ئەو هیچ ئافرەتێکی ئەنساری هێندەی ئەو دەستکراوە و بەخشەر نەبوو[1].

عەبدولموتەڵیبی کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: جارێکیان ڕەبیعەی کوڕی حارس (ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ) و عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیب گەیشتنە یەکتر، گوتیان: گەر ئەو دوو کوڕانەمان (موتەڵیبی کوڕی ڕەبیعە و فەزڵی کوڕی عەباس) بنێرینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، قسەی لەگەڵ بکەن بۆ ئەوەی لە سەدەقە و بەخشین یارمەتیان بدات، وەك چۆن دەدرێتە خەڵکی بدرێتە ئەوانیش، وەك خەڵك بەشیان هەبێت.

لە کاتێکدا ئەوان لەو حاڵەتدا بوون، عەلی کوڕی ئەبوتالیب هات و لەلایان وەستا، هەردووکیان بابەتەکیان بۆ گێڕایەوە.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب گوتی: ئەم کارە مەکەن، سوێند بەخوا ئەو نایکات.

ڕەبیعە کوڕی حارس دوورکەوتەوە و گوتی: سوێند بەخوا ئەم قسەیە ناکەیت تەنیا لەبەر حەسودی نەبێت لەسەر ئێمە، سوێند بەخوا بویتە زاوای پێغەمبەری خوا ﷺ کەچی ئێمە حەسودیمان پێت نەبرد.

عەلی گوتی: بیاننێرن.

چوون.

---

[1] ئەحمەد (١٩٨٢٥) گێڕاوەتیەوە، شعیب الارناؤوط دەڵێت: سەنەدەکەی لەسەر مەرجی موسلیم "سەحیح"ـە، یەکەم چیرۆکی غەزا لە سەحیحی موسلیم (٢٤٧٢).

عەلی کراسەکەی خۆی راخست و لەسەری پاڵکەوت، گوتی: من باوکی حەسەنم، سوێند بەخوا لەم جێگایە هەڵناستم تا کوڕەکانتان بە وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ داواکارییەکەتان نەگەڕێتەوە.

دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی نیوەڕۆی کرد، پێش ئەو چووینە ماڵەوە، لەلای ماڵەوەی وەستاین تا هات، گوێی گرتین و فەرمووی: **"ئەوەی لە دڵتاندایە دەریکەن"**. لەگەڵی چووینە ژوورەوە، ئەو رۆژە لەلای ماڵی زەینەبی کچی جەحش بوو.

یەکمان بەوی تری گوت: تۆ قسە بکە، پاشان یەکمان قسەی کرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ باشترین کەسی، باشترین کەسی لە گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی، وا تەمەنمان گەیشتۆتە ژنهێنان، هاتووین بۆ ئەوەی فەرمانی پێدانی هەندێك سەدەقە و بەخشیمان بۆ بکەی، وەك چۆن خەڵك بەشی هەیە و وەریدەگرێت.

ماوەیەکی درێژ بێ دەنگ بوو، تا ویستمان بۆی دووبارە بکەینەوە، زەینەب لە پشت حیجابەوە ئاماژەی بۆ کردین قسەی لەگەڵ نەکەین.

پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"سەدەقە بۆ خزم و کەس و کاری موحەممەد نابێت، چونکە بریتییە لە پیسی ماڵی خەڵك، بۆیە نە بۆ موحەممەد نە بۆ کەس و کاریشی نابێت...**

**بۆم بانگی مەحمیەی کوڕی جەزە بکەن"**، پیاوێکی بنەماڵەی بەنی ئەسەد بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کاروباری پێنجێکی سەدەقە و زەکات داینابوو لەگەڵ نەوفەلی کوڕی حارسی کوڕی عەبدولموتەلیب.

دەڵێت: هاتن، بە مەحمیەی فەرموو: **"کچەکەت بدە فەزڵی کوڕی عەباس، "**، ئەویش رازی بوو پێی بدا.

بە نەوفەلی کوڕی حارسیشی فەرموو: **"تۆش کچەکەت بدەم ئەم کوڕە"**، مەبەستی من بوو -راوی فەرموودەکە عەبدولموتەلیب-، ئەویش رازی بوو پێمی بدا.

بە مەحمیەی فەرموو: **"لە پێنجێك هێندە و هێندەیان پێ بدە"**[1].

**هەروەها ئەم بەخشندەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە چیرۆکی هاوسەرگیری بۆ ئەو گەنجەی مارەیی نەبوو بیداتە ئەو کچەی خۆی پێشکەش کردبوو.**

---

[1] موسلیم (١٠٧٢) گێراوەتیەوە، پێشتر باسکراوە.

سەهلی کوڕی سەعد ﷛ دەڵێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، هاتووم خۆم پێشکەشی تۆ کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کرد، پاشان سەیرێکی سەرەوەی کرد، دواتر سەری داگرت.

ئافرەتەکە کاتێك زانی پێغەمبەری نیازی بۆ خۆی نییە دانیشت.

پیاوێك لە هاوەڵان هەڵسا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر تۆی نیازت پێی نییە، بۆ من بیخوازە.

فەرمووی: "**هیچت هەیە؟**".

گوتی: نەخێر سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: "**بڕۆ لای کەسوکارت، بزانە هیچت بە دەست دەکەوێت؟**".

ڕۆیشت و گەڕایەوە، گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا هیچم دەست نەکەوت.

فەرمووی: "**داوای شتێك بکە، گەر گوستیلەیەکی ئاسنیش بێت**".

ڕۆیشت و پاشان گەڕایەوە، گوتی: نەخێر سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا تەنانەت گوستیلەی ئاسنیش، بەڵکو ئەوە پەشتەماڵەکەمە.

سەهل دەڵێت: کراسێکی تەواوی نەبوو، بەڵکو نیو کراسی هەبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**چ بە پەشتەماڵەکەت دەکەی؟ گەر تۆ لەبەری بکەی خێزانەکەت هیچی نابێت، گەر ئەویش لەبەری بکات، تۆ هیچت نابێت**".

پیاوەکە مایەوە تا مەجلیسەکە درێژەی کێشا، پاشان بێ ئومێد بوو هەڵسا، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وا مەجلیسەکە جێدەهێڵێت، بانگی کرد، کاتێك هات پێی فەرموو: "**چ دەزانی لە قورئان؟**".

گوتی: ئەو سوڕەتە و فلانە و فلانە سوڕەت و... ژماردی.

فەرمووی: "**ئایا لەبەر دەیانخوێنی؟**".

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: "**بڕۆ، بەو قورئانەی لەگەڵتە پێم دای**"[1].

---

[1] بوخاری (٥٠٣٠) و موسلیم (١٤٢٥) گێڕاوەتیانەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- بەڵگەی تێدایە کە دروستە ئافرەت خۆی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەم کارەش تەنیا بۆ ئەو دروستە نەوەك بۆ کەسی تر، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱمۡرَأَةً مُّؤۡمِنَةً إِن وَهَبَتۡ نَفۡسَهَا لِلنَّبِيِّ إِنۡ أَرَادَ ٱلنَّبِيُّ أَن يَسۡتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الأحزاب: ٥٠
- واتای ئایەتەکە: (هەر ئافرەتێکی بڕوادار ئەگەر ویستی خۆی پێشکەشی پێغەمبەر بکات و پێغەمبەریش ویستی مارەی بکات، کە ئەمەیان تایبەتی تۆیە (ئەی پێغەمبەر ﷺ نەك ئیمانداران).
- ئەو کەسەی دەیەوێت ئافرەتێك بخوازێت دروستە سەیری بکات و بیری لێ بکاتەوە.
- دروستە ئافرەت خۆی نیشانی پیاوێکی ساڵح بدات، بۆ ئەوەی بیخوازێت.
- دروستە ئەو کەسەی داوای شتێکی لێ دەکرێ، گەر نەیویست ئەنجامی بدات، بێ دەنگ بێت، بۆ ئەوەی کەسی داواکار لێی تێ بگات و بە ڕەتکردنەوەی شەرمەزاری نەکات، تەنیا ئەگەر کەسی داوکار تێنەگەیشت ئەو کات دروستە بە ڕاشکاوی پێی بڵێت.
- بەڵگەی تێدایە کە دروست نییە هاوسەرگیری ئەنجام بدرێت تەنیا بە بوونی مارەیی نەبێت، چونکە کێشە ناهێڵێت و سودی بۆ ئافرەت هەیە، بە جۆرێك گەر تەڵاق بەر لە گواستنەوەی ڕوویدا، نیوەی مارەیی وەردەگرێت، جا ئەگەر مارەیی دیاری نەکرا، ئەو کات پێویستە دیاری بە ئافرەتەکە بدرێت، گەر هاوسەرگیری بێ مارەیی کرا دروستە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ ﴾ البقرة: ٢٣٦
- واتای ئایەتەکە: (هیچ گوناهتان لەسەر نییە ئەگەر ژنانێك تەڵاق بدەن کە هێشتا نەچووبنە لایان، یاخود مارەیتان بۆ دیاری نەکرد بوون، پێویستە لەسەرتان هەندێك سامانیان بدەنێ، جا ئەوەی دەوڵەمەندە و زۆری هەیە و ئەوەی کە هەژار و کەم دەستە (هەرکەس) بەپێی توانای خۆی، ئەم دیاری و یارمەتیانە بەشێوەیەك بێت کە باو بێت و پەسەندی شەرع بێت).
- دروستە مارەیی کەم بێت یان زۆر بێت، بە گوێرەی ڕەزامەندی هەردوولا، چونکە گوستیلەی ئاسن ئەوپەڕی کەمی مارەییە.
- دروستە گوستیلەی ئاسن وەربگیرێت.

- دروستە سوێند بخورێت، تەنانەت گەر داوای سوێند خواردن نەکرابێت و پێویستیش نەبێت.
- دروستە هاوسەرگیری بۆ کەسی نەدار بکرێت.
- دروستە گەورەی خەڵك، سەیری بەرژەوەندی کەسەکان بکات، ڕێنوێنییەکەی ببێتە ئاسانکاری بۆیان.
- دورستە لەبەرامبەر فێرکردنی قورئان کرێ وەربگیرێت [1].

**هانیدەدان دەستەبەری ماددی لە نێوان خۆیاندا بکەن:**

ئەبو موسای ئەشعەری ؓ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەشعەرییەکان گەر خواردنیان لە شەڕدا ببڕابایە، یان خواردنی منداڵەکانیان لە مەدینە کەم بووایە، هەر چی لەلایان مابایەوە لە خواردن لەناو یەك کراس کۆیان دەکردەوە، پاشان لە نێوان خۆیان بە یەکسانی دابەشیان دەکرد، ئەوان لە منن و منیش لەوانم."** [2]

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- گەورەیی ئەشعرەییەکان دەردەخات.
- گەورەیی کاری خۆنەویستی و دڵنەوایی یەکتری، هەروەها گەورەیی تێکەڵاوکردنی خواردن لە سەفەردا و تێکەڵاوکردنی لە کاتی کەمبوونی و پاشان دابەشکردنی [3].

ئەمە بە پڕۆژەی (سندوقی هاوکاری) ئەمڕۆ دەچێت، یان نزیکە لێی، کە هەندێك لە هۆز و قەبیلە و خێزانەکان لە نێوان خۆیاندا دروستی دەکەن، کە هەر یەکەیان بە گوێرەی توانیان خۆیان بەشداری دەکەن، دواتر بۆ کەسانی پێویست سەرف دەکرێت.

**تێبینی:** لە زۆر لە وڵاتانی ئیسلامی (سندوقی دەستەبەری کۆمەڵایەتی) هەیە کە پاشکۆی دامەزراو و دەستە جۆراوجۆرەکانە.

بەڵام بە داخەوە بەپرسانی ئەم سندوقە هەڵدەستن پارەکەی دەخەنە نێو بانکی ریبایی، لەو ماڵە بە ریبایەدا یارمەتی کەسانی پێویست دەدەن!

بەراستی ترسیان لەسەرە فەرمایشتی خوای پەروەردگار لەسەریان جێبەجێ بێت: ﴿قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالًا ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا﴾ الكهف: ١٠٣-١٠٤

---

[1] سەیری (فتح الباری ٩/٢١٤)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩/٢١٤) بکە.
[2] بوخاری (٢٤٨٦) و موسلیم (٢٥٠٠) گێڕاوەتیەوە.
[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم(١٦/٦٢).

واتەی دوو ئایەتەکە: (ئـەی موحەممەد ﷺ پێیـان بڵـێ: ئایا هـەواڵی ئـەو کەسـانەتان بـدەمێ کـە لـە کـار و کردەوەیانـدا زۆر زەرەرمەنـد و خەسـارەتمەندن؟! (ئەوانـە) ئـەو کەسانەن کە هەوڵ و کۆششیان لەژیانی دنیادا، بەزایە و بەهەدەر چووە لە کاتێکدا وایـان دەزانی کە بەڕاستی کاری چاك دەکەن و کردەوەی ڕەوا ئەنجام دەدەن).

بني مسـجداً مـن غيرِ حـلِّهِ ... فصــار بحمــدِ الله غـيرَ موفـق

كمطعمة الأيتام من كد فرجها ... لـكِ الويـلُ لا تزنـي، ولا تتصـدّقي

**واتــە: مزگــەوتێکی دروســتکرد بــە پــارەی حــەرام، ســوپاس بــۆ خــوا سەرکەوتوونەبوو**

وەك ئەو ئافرەتەی بە پارەی داوێن پیسی منداڵە یەتیمەکانی بەخێو دەکـات هـاوار بـۆ تۆ، نە زینا بکە و نە خێر و بەخشینیش.

**بۆ دەربـازبوون لە هەژاری، بۆ هەندێك کاروبـار ڕێنوێنی دەکردن: لەوانە:**

- **پەیوەندی خزمایەتی:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خـوا ﷺ بـوو دەیفـەرموو: "**هـەر کەسێك حەز دەکات ڕزقی فراوان بێت و بەرەکـەتی تێبکـەوێت، تەمـەنی درێـژ بێـت، بـا پەیوەندی خزمایەتی بگەیێنێت**[1]".

**سوود:**

پرسیار لە شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە کرا لە بارەی ڕزق: ئایا زیاد و کەم دەبێت؟ ئایـا ڕزق بریتییە لەوەی کە بەندە دەیخوات یان هەیەتی؟

فەرمووی: ڕزق دوو جۆرە:

**یەکەمیان**: خوای گەورە بەندەکانی فێـر کـردووە کـە ئـەو ڕزقیـان پێـدەدات، ئەمـەیان نەگۆڕە.

**دووەمیان**: ئەوەی خوای گەورە نوسیویەتی و فریشتەکانی ئاگادار کردۆتەوە، ئەمەیان زیاد و کەم دەکات بە گوێرەی هۆکارەکان، خوای گەورە فەرمان بە فریشتەکان دەکات

ڕزق و ڕۆزی بۆ بنوسن، کاتێك پەیوەندی خزمایەتی دەگەیێنێت خوای گەورە بۆی زیـاد دەکات.

---

[1] بوخاری (٢٠٦٧) و موسلیم (٢٥٥٧) گێڕاوەتیانەوە.

ئەو هۆکارانەشی دەبنە هۆی دەسکەوتنی رزق و رۆزی، کۆمەڵێکن خوای گەورە دیاری کردوون، گەر وای دانابێت رزقی پێبەبەخشێت بە گوێرەی هەوڵ و تێکوشانی، ئەوکات هەوڵ و تێکۆشانی بۆ ئاسان دەکات، چونکە گەر قەدەری خوای گەورە وابێت ئەو رزقە تەنیا بە تێکوشان پەیدا ببێت، ئەوا جگە لە تێکۆشان و ماندووبوون نەبێت بە هیچی تر پەیدا نابێت، ئەگەر بێتو ئەو رزقەی خوای گەورە قەدەری وا دانابێت بێ ماندوو بوون و تێکۆشان پەیدا بێت، ئەوا بێ سەرئێشە و ماندووبوون دێتە پێش، وەك مردنێك، میراتگرەکانی بە بێ ماندووبوون بۆیان دێت.

تێکۆشان دوو جۆرە: تێکۆشانێك بۆ رزق دامەزراوە، وەك پیشەسازی و کشتوکاڵ و بازرگانی.

تێکۆشانێك بە دوعا و پشت بەستن بەخوا و چاکەکردن لەگەڵ دروستکراوەکانی، چونکە خوای گەورە لە یارمەتی بەندەکەی دایە، تا ئەو کاتەی بەندەکەی لە یارمەتی براکەی دابێت [1].

- **وازهێنان لە گوناه:**

ثوبان ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**پیاو بە هۆی ئەو گوناهەی توشی دەبێت، لە رزق بێ بەش دەبێت**"[2].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**ئەی کۆمەڵی موهاجیران، لە پێنج شت ئاگادارتان دەکەمەوە، ئەگەر پێی تاقیکرانەوە، پەنا دەگرم لە خوا کە توشی نەبن:**

**بەدڕەوشتی بەدەرناکەوتێت لەناو کۆمەڵێك تا ئەو کاتەی خۆیان ئاشکرای نەکەن، ئەوکات پەتای تاعون و ئازار و ناخۆشی لەناویان بڵاو دەبێتەوە بەجۆرێك ئەوانی پێشووتر نەیاندیبێت.**

**فێڵ لە پێوانە و تەرازوو ناکەن، تا لەبەرامبەردا توشی قاتوقوڕی و نەبوونی و زۆرداری دەسەڵات دەبن.**

**واز لە زەکات دان ناهێنن، تا لەبەرامبەردا توشی وشکەساڵی دەبن، گەر لەبەر ئاژەڵان نەبووایە باران نەدەباری.**

---

[1] مجموع الفتاوی (٥٤٠-٥٤١/٨).

[2] ابن ماجة (٩٠) گێراوەتیەوە، العراقی لە (مصباح الزجاجة ١٥/١) بە "حەسەن"ی داناوە، شعیب الارناؤوط لە (تحقیق ابن ماجة ٨٧٢)، الحاكم لە (المستدرك ١٨١٤) و المنذري لە (الترغیب والترهیب ٣٧٢٣) و بە "سەحیح"یان داناوە، ئەلبانی لە (ضعیق الجامع ١٤٥٢) بە "زەعیف"ی داناوە.

**پەیمانی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ناشکێنن، تا لەبەرامبەردا دوژمن بەسەریاندا زاڵ دەبێت و سەرەوەت و سامانیان دەخوات.**

**گەر دەسەلاتدارانیان حوکم بە کتێبی پەروەردگار نەکەن، لەبەرامبەردا خوای گەورە وا دەکات ناخۆشی بکەوێتە نێوانیان"[(١)].**

هەروەها ئیبن مەسعود ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"هەر کەسێك ریبا زۆر بخوات، لەبەرامبەردا توشی کەمی و نەداری دەبێت"[(٢)].**

- **ئەنجامدانی حەج و عەمرە:**

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت :**"حەج و عەمرە ئەنجام بدەن چونکە ئەو دووانە هەژاری و گوناه لا دەبەن، وەك چۆن موشەدەمەی ئاسنگەر پیسی ئاسن لادەبات"[(٣)].**

- **وازهێنان لە داواکردن لە خەڵك:**

ئەبو کەبشەی ئەنماری ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"سێ شت هەن من سوێندیان لەسەر دەخۆم، ماڵ و سامان بە بەخشین کەم نابێت، هەر بەندەیەك ستەمی لێکرا و ئارامی لەسەرگرت، لەبەرامبەردا خوای گەورە شکۆیی و سەربەرزی زیاد دەکات، هەر بەندەیەك دەرگای سواڵکردن و داواکردنی لە خەڵك بکاتەوە، لەبەرامبەردا خوای گەورە دەرگای هەژاری بەسەردا دەکاتەوە"[(٤)].**

- **پشتبەستن بە خوا لە داواکردنی رزق و رۆزی:**

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"گەر ئێوە بەڕاستی پشت بە خوا ببەستن، بە پشتبەستنی تەواو، بێگومان رزقتان پێ دەدات وەك چۆن رزقی باڵندە دەدات، کاتێك بەیانیان بە برسێتی دەڕوات و ئێواران بە تێری دەگەڕێتەوە"[(٥)].**

مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە کە دەبێت سەرەتا بە دڵنیایەوە فێرببین کە هیچ کەسێك رزق نادات جگە لە الله، کەس نابەخشێت و وەرناگرێتەوە تەنیا ئەو نەبێت، پاشان بە جوانی و بە پشتبەستن بەخواوە داوای رزق بکەن[(٦)].

---

(١) ابن ماجة (٤٠١٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٩٧٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٢) ابن ماجة (٢٢٧٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥٥١٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٣) النسائی (٢٢٧٩) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢٨٩٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٤) ترمذي (٢٣٢٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە "صحیح الجامع ٣٠٢٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٥) ترمذي (٢٣٤٤) و ابن ماجة (٤١٦٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥٢٥٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٦) تحفة الاحوذي (٧/٧).

**هێندە لە ململانێی ئوممەتەکەی لە دونیا دەترسا، هێندە لە هەژاربوونیان نەدەترسا:**

عەمری کوڕی عەوف ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو عوبەیدەی جەڕراحی بۆ وەرگرتنی سەرانە ناردە بەحرەین.

پێشووتر پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی بەحرەینی چاکساز کردبوو، عەلائی کوڕی حەزرەمیشی کردە ئەمیر لەسەریان.

ئەبو عوبەیدە بە پارەوپولی بەحرەین هاتەوە.

کاتێك ئەنسارییەکان گوێیان لە هەواڵی گەڕانەوەی ئەبو عوبەیدە بوو، بە کۆمەڵ هاتنە نوێژی بەیانی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، کاتێك نوێژی تەواو کرد، ڕێیان لێگرت.

پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئەوانی بینی زەردەخەنە گرتی.

پاشان فەرمووی: "**وابزانم ئێوە گوێتان لێبووە کە ئەبو عوبەیدە بە شتێکەوە گەڕاوەتەوە؟**".

گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: "**مژدەتان لێ بێت، ئومێد بخوازن بەو شتەی پێتان خۆشە، سوێند بەخوا لە هەژاربوونتان ناترسم، بەڵکو دەترسم دونیا بەسەرتان زاڵ بێت، وەك چۆن بەسەر ئەوانی پێش ئێوەدا زاڵ بوو، بەربەرەکانی لەسەر دەکەن، وەك چۆن ئەوان بەربەرەکانیان دەکرد، بە هیلاك دەچن وەك چۆن ئەوان بەهیلاك چوون**"[1].

**ابن بطال** دەڵێت: (ئەم فەرموودەیە زینەت و ڕازەویی دونیای تێدایە، پێویستە ئەو کەسەی چاوی پێدەکەوێت خۆی لە خراپییەکانی و تاقیکردنەوەکانی بپارێزێت، با دڵی بە باقوبریقی ئۆقرە نەگرێت، بەربەرەکانی خەڵکی لەسەر نەکات[2]).

ئەبو دەردا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان، لە کاتێکدا ئێمە باسی هەژاریمان دەکرد، لێی دەترساین، فەرمووی: "**ئایا لە هەژاری دەترسن؟ سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، توشی دونیا دەبن بە توشبوون، هیچ شتێك دڵتان لەسەر ڕاستی لانابات تەنیا ئەو نەبێت، سوێند بەخوا من ئێوەم لەسەر ڕێگایەکی ڕاست جێهێشتووە، شەو و ڕۆژی وەك یەکە**"[3].

---

[1] بوخاری (٤٠١٥) و موسلیم (٢٩٦١) گێڕاوەتیەوە.

[2] شەرحی ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (١٠/١٥٥).

[3] ابن ماجة (٥) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٩) بە "حەسەن"ی داناوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دەوڵەمەندان:

پێشتر تیشکمان خستە سەر لایەنەکانی مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هەژاران.

هەندێك جار لەو شتەی هەیبوو پێی دەبەخشین.

هەندێك جار لەگەڵ خۆی دەیبردنەوە ماڵەوە.

هەندێك جار داوای دەکرد خێریان پێ بکرێت.

هەندێك جار داوای لە هاوەڵانی دەکرد میوانداریان بکەن.

هەندێك جار دوعای بۆ دەکردن کە خوای گەورە لە فەزڵ و گەورەیی خۆی دەوڵەمەندیان بکات و کارئاسانیان بۆ بکات.

هەندێك جار فێرە ئارامگرتنی دەکردن و دڵی دەدانەوە، بە بیری دەهێنانەوە ئەم دونیایە دەڕوات و هەر رۆژی دوایی دەمێنێت.

هەندێك جار گەورەیی و پاداشتی هەژاری بۆ باس دەکردن، هەروەها گەورەیی ئارامگرتن لەسەر هەژاری بۆ ئەو کەسەی پێی تاقیکراوەتەوە

هەندێك جاریش بۆ کاسبیکردن و کارکردن هانیدەدان.

### بەڵام سەبارەت بەرا دەوڵەمەندەکانی:

ئەوان توێژێکی گرنگی کۆمەڵگان، رۆڵێکی کاریگەریان تیایدا هەیە.

چونکە ماڵ و سامان رۆڵی کاریگەریان لە ژیانی رۆژانەی کۆمەڵایەتی هەیە، بەڵکو ماڵ و سامان شاخوێنبەری ژیانی ماددیین.

الله دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴾ النساء: ٥

واتە: (ماڵ و سامانتان مەدەن بەکەم عەقڵ و پیاو خراپان، لەکاتێکدا خوا کردوویەتی بەهۆی ژیان و پایەداری و هەستانەوەتان، بەڵکو تەنها بەشیان بدەن بۆ خۆراك و پۆشاك، بەجوانی قسەی راست و دروستیان بۆ بکەن).

بە راستی خوای گەورە بە پێبەخشینی ماڵ و سامان منەتی لەگەڵ کردووین، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ﴾ الأعراف: ٢٦

واتە: (ئەی نەوەی ئادەم، ئێمە بەڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای ئەپۆشێت، هەروەها جل و بەرگی

جوانیش کە خۆتانی پێ برازێننەوە (بەڵام بیرتان نەچێت) کە پۆشاکی تەقوا و خواناسی چاکتر و خێردارتر و بەفەڕترە).

سوفیانی سەوری ﷀ دەڵێت: (گەر دە هەزار درهەم لە دوای خۆم جێبهێڵم و لەسەری حیساب بکرێم، پێم باشترە لەوەی پێویستم بە خەڵك بێت [1]).

دەوڵەمەند و هەژاران بە شوێن پێغەمبەر ﷺ کەوتوون، زۆرێك لە هاوەڵان دەوڵەمەند بوون، وەك ئەبوبەکر، عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف، عوسمانی کوڕی عەففان، سەعدی کوڕی رەبیع، ئەبو تەڵحە و چەندانی تر.

پێغەمبەری خوا چۆن مامەڵەی لەگەڵ کردوون؟

**شاهێدی فەزڵ و گەورەیی کەسانی باشی لەوان داوە بۆ خزمەتکردنی دین:**

ئەبو دەردا ﷛ دەڵێت: لە نێوان ئەبوبەکر و عومەر گفتوگۆیەك هەبوو، ئەبو بەکر عومەری توڕە کرد، عومەر بە توڕەیی لەلای رۆیشت.

ئەبوبەکر دوای کەوت و داوای لێکرد لێی ببورێت، ئەویش نەیکرد، تا دەرگای بەسەر رووودا داخست.

ئەبو بەکر هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەبو دەردا دەڵێت: من ئەو کات لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم، کاتێك ئەبوبەکر هات دامێنی کراسەکەی گرت تا چۆکەکانی دەرکەوتن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"هاوڕێکەتان توشی کێشەیەك بووە"**.

سەلامی کرد، گوتی: لە نێوان من و کوڕی خەتتاب شتێك روویداوە، پەلەم لێیکرد، پاشان پەشیمان بوومەوە، داوام لێکرد لێم خۆش بێت، بەڵام ڕەتی کردمەوە.

هاتمە لای تۆ.

فەرمووی: **"خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەبوبەکر، خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەبوبەکر، خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەبوبەکر"** سێ جار.

پاشان عومەر پەشیمان بووە، چووە ماڵی ئەبو بەکر پرسیاری کرد: ئەبو بەکر لە ماڵەوەیە؟

گوتیان: نەخێر.

ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سەلامی کرد، ڕووی پێغەمبەر ﷺ زەرد هەڵگەرا، تا ئەبوبەکر لێی ترسا، لەسەر چۆك دانیشت.

---

[1] حلية الأولياء (٦/٣٨١).

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بە خوا من ستەمم کرد، سوێند بەخوا من ستەمم کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوای گەورە منی بە حەق ڕەوانە کرد، هەمووتان گوتان درۆ دەکەی، تەنیا ئەبو بەکر گوتی ڕاست دەکەی، بە ماڵ و گیانی دڵی دامەوە، ئایا ئێوە واز لە هاوڕێکەم ناهێنن، ئایا ئێوە واز لە هاوڕێکەم ناهێنن؟"**.

لە دوای ئەمە هیچی تر ئازار نەدرا[1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هیچ ماڵ و سامانێك سوودی پێنەگەیاندووم هێندەی ماڵ و سامانی ئەبوبەکر"**.

ئەبوبەکر گریا و گوتی: من و ماڵ و سامانم بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا[2].

ئەمەش ئەوپەڕی شوێنکەوتن و بێ فیزی ئەبوبەکری ڕاستگۆیە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، خۆی وەکو بەندەیەك بۆ پێغەمبەر ﷺ نیشاندا.

ئەو دەڵێت: نەك تەنیا ماڵ و سامانم، بەڵکو خۆشم بۆ تۆم، ئەمەش سەیر نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نزیکترە لە باوەڕداران لە نەفسی خۆیان.

ئەمەش لە ڕەوشت جوانی ئەبوبەکری ڕاستگۆیە ﷺ، ماڵ و سامانی خۆی لە پێناو خودا بەخشی، بە گیانیش دڵی پێغەمبەری ﷺ دایەوە، پێغەمبەریش ﷺ هەستی بە چاکەی کردووە، بۆیە بۆ ئوممەتەکە باس لە چاکەکانی دەکات **" هیچ ماڵ و سامانێك سوودی پێنەگەیاندووم هێندەی ماڵ و سامانی ئەبوبەکر"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ڕەچاوکردنی ڕەوشت بەرزی شوێنکەوتن و بێ فیزی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ .
- لە ڕەوشت جوانییەکان: سوپاسکردنی خاوەن چاکە و دوعا بۆ کردنی[3].

عەبدلورەحمانی کوڕی سەمرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای (عسرە)ی ئامادەکرد، عوسمانی کوڕی عەففان بە هەزار دینار هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و خستیە کۆشی پێغەمبەرەوە ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ بە دەستی هەڵاوگێڕی دەکرد و دەیگوت: **"کوڕی عەففان لە دوای ئەم کارە توشی زیان نابێت"**، چەند جارێك ئەمەی فەرموو[1].

---

[1] بوخاری (٣٦٦١) گێڕاوەتیەوە.

[2] ترمذي (٣٦٦١) و ابن ماجە (٩٤) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥٨٠٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

[3] حاشیە السندی علی سنن ابن ماجة (١/٨٥)، التیسیر بشرح الجامع الصغیر (٢/٥٧).

**سەرباری سوود وەرگرتن لە پارەیان بۆ بانگەوازیکردن، کەچی حەزی دەکرد لە ماڵی تایبەتی خۆی ببەخشێت:**

لە چیرۆکی کۆچکردندا، عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کەم رۆژ هەبوو پێغەمبەری خوا سەردانی ماڵی ئەبوبەکری نەکردبا لە بەیانی یان ئێوارەکەی.

کاتێك ڕوخەستی کۆچکردنی بۆ دەرچوو، لە نیوەڕۆیێك هاتە سەردانمان، ئەبوبەکر گوتی: پێغەمبەری خوا هەرگیز لەم کاتە سەردانی نەکردووین، تەنیا بۆ کارێك نەبێت کە ڕوویداوە.

کاتێك هاتە ژوورەوە، بە ئەبوبەکری فەرموو: "**ئەوانەی لەلاتن بیانکە دەرەوە**".

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمانە کچەکانمن، واتە: عائیشە و ئەسما.

فەرمووی: "**دەزانی کە من ڕوخسەتی کۆچکردنم پێدراوە؟**".

گوتی: هاوڕێیەتی ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: "**هاوڕێیەتی**".

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، دوو وشترم هەیە بۆ دەرچوون ئامادەم کردوون، یەکێکیان ببە.

فەرمووی: "**بە پارە وەری دەگرم**"[(٢)].

ئیبن حجر دەڵێت: ئیبن ئیسحاق لە گێڕانەوەکەیدا ئەمەی زیادکردووە: فەرمووی: "**سواری وشترێك نابم هی من نەبێت**".

گوتی: ئەو بۆ تۆ.

فەرمووی: "**نەخێر، بەڵکو بەو نرخەی پێی دەفرۆشیت**"[(٣)].

لە فەرموودەی ئەسمای کچی ئەبوبەکر لەلای تەبەڕانی: فەرمووی: "**بە نرخەکەی ئەی ئەبوبەکر**".

ئەویش گوتی: بە نرخەکەی ئەگەر حەزبکەی.[(٤)]

**سوودێك:**

پرسیار لە ئەهلی زانست کرا: بۆچی قبوڵی نەکرد تەنیا بە نرخی کڕین نەبێت، لەکاتێکدا ئەبوبەکر لەمە زیاتری پێبەخشیوە و قبوڵی کردووە؟

---

(١) ترمذي (٣٧٠١) و ئەحمەد (٢٠١٠٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (تحقيق المشكاة ٦٠٦٤) بە "حەسەن"ی داناوە.

(٢) بوخاری (٢١٣٨) گێراوەتیەوە.

(٣) السيرة النبوية (١٣/٣)ی ئیبن هیشام، فتح الباری (٢٣٥/٧).

(٤) فتح الباری (٢٣٥/٧).

دەڵێین: ئەمە بۆ ئەوەیە کە کۆچکردنەکەی لە پێناو خودا بە گیان و ماڵی خۆی بێت، وەك حەزێکی خۆی ﷺ، لە پێناو هێنانەدی فەزڵ و گەورەیی کۆچکردن و کۆششکردنەکەی بە باشترین شێواز[١].

**سەردانی دەکردن و نانی دەخواردن و بۆ باشترین جۆری بەخشین رێنموونی دەکردن:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: ئەبو تەڵحە لە هەموو ئەنسارییەکانی مەدینە زیاتر خاوەنی دارخورما بوو، خۆشەویسترین ماڵیش لەلای باخی (بیرحا) بوو، کەوتبووە ڕووی پێشەوەی مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە ناوی و لە ئاوە سازگارەکەی دەخواردەوە.

ئەنەس دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ آل عمران: ٩٢ واتە: ( ئێوە هەرگیز ناگەنە پلەی چاکیی و چاکەکاریی هەتا لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت نەبەخشن).

ئەبو تەڵحە چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ خۆشەویسترین ماڵیش لای من (بیرحا)یە، ئەمەش ئەی بەخشمە خوای گەورە، داوای پاداشت لە خوای گەورە دەکەم، ئەی پێغەمبەری خوا چۆن خوای گەورە پێی خۆشە وای لێ بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بخ[٢]، ئەمەیە ماڵی قازانج، ئەمەیە ماڵی قازانج، بەڕاستی بیستم چیت گوت، من پێم باشە بیبەخشیە کەسانی نزیکت"**.

ئەبو تەڵحە گوتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا.

ئەبو تەڵحە لە نێوان خزمەکانی و ئامۆزاکانی دابەشی کرد، لەوانە: حەسسان و ئوبەی کوڕی کەعب[٣].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- جوانترە ئەو شتەی خۆشەویستە ببەخشرێت.
- راوێژی کەسانی خاوەن فەزڵ و زانست بکرێت لەسەر چۆنیەتی بەخشین.
- بەخشین بە کەسانی نزیك باشترە لە بەخشین بە کەسانی دوور، ئەگەر پێویست بن.

---

[١] الروض الأنف (١٣١/٤) بە کورتکراوەیی.

[٢] وشەیەکە بۆ ستایش و مەدحکردن بەکاردێت بە واتای (ئافەرین یان زۆرباشە) دێت، النهایة (٢/١)

[٣] بوخاری (١٤٦١) و موسلیم (٩٩٨) گێڕاوەتیەوە.

- ڕەچاوی مافی نزیکایەتی دەکرێت لە پەیوەندی خزمایەتی، تەنانەت گەر ئەو خزمایەتییە لە باپیرێکی دوور یەکتر بگرنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە ئەبوتەڵحە کرد بەخشینەکەی بداتە کەسانی نزیکی، ئەویش دایە ئوبەی کوڕی کەعب و حەسسانی کوڕی سابت، هەردووکیان لە باپیری حەوتەم لەگەڵی یەك دەگرنەوە.
- تەرخانکردنی باخچە و بێستان بۆ حەوانەوەی کەسانی خاوەن گەورەیی و زانست، دانیشتن لە ژێر سێبەری و خواردن لە بەرهەمی و کاتبەسەربردن تیایدا، ئەم کارە ئەگەر بە نیەتی حەساندنەوەی خەڵك لە ماندوویەتی و چالاکبوونەوەی بێت، باشە و سوننەتە و پاداشتی هەیە.
- دروستە لە ماڵی دۆست ئاو بخۆرێتەوە، گەر خۆیشی ئامادەنەبوو، بەلآم بزاندرێت خاوەن دەروون پاکە.
- ئەم فەرموودەیە فەزڵ و گەورەیی ئەبو تەڵحەی تێدایە، چونکە ئایەتەکە هانی بەخشین دەدات لە ماڵێکی خۆشەویست، ئەو بە بەخشینی ئەو ماڵەی لەلای زۆر خۆشەویست بوو، گەیشتە ئەو ئاستە، پێغەمبەریش ﷺ پشتڕاستی کردووە، سوپاسی خوای لەسەر کرد، پاشان فەرمانی پێکرد بیداتە کەس و کاری، نیشانەی ڕازیبوونی پێغەمبەریش ﷺ گوتنی وشەی "**بخ**"ـە [1].
- حەواندنەوەی نەفس بۆ بەندایەتیکردن مرۆڤ پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەچووە ناو بێستانی کەسانی دەوڵەمەند و لەژێر سێبەریان دادەنیشت و لە بەرهەمەکانیان دەخوارد.

**تێبینی:** بەخشین بە کەسانی نزیك گەر پێویست بن باشترە لە بەخشین بە کەسانی بێگانە، بەلآم هەندێك کەس بۆ خۆشدوویی و بۆ ڕواڵەت زەکات دەدەنە خزمەکانیان، بۆ نمونە خزمەکە حاڵی خراپ نییە و خواردنی خۆی هەیە، بەلآم خاوەن زەکات دەیەوێت زەکات هەر بەو بدات، لە کاتێکدا هەژارێکی نەدار هەیە، بەلآم لەبەر ئەوەی بێگانەیە هیچی پێ نادات، ئەمەش دروست نییە، چونکە دروست نییە لە زەکاتداندا لایەنگیری خزمایەتی بکرێت.

بەلآم ئەگەر خزمێکی هەژار هەبوو، لە هەمان کاتدا بێگانەیەکی هەژاریش هەبوو، کامەیان پێش دەخرێت؟

---

[1] فتح الباری (٣/٣٩٨)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٨/٨٦).

**وەڵام:** خزمە هەژارەکە پێش دەخرێت، بۆ ئەوەی پاداشتی بەخشینەکە و پاداشتی پەیوەندی خزمایەتییەکە بەیەکەوە کۆببنەوە.

سەلمانی کوڕی عامریش ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: "**بەخشین بە هەژار چاکەیە، بەخشین بە کەسانی نزیکیش دوو شتە، چاکە و خزمایەتییە**[1]".

سەردانی دەکردن و ئامۆژگاری دەکردن کەمتر لە سێیەك بکەنە وەسیەت:

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاوایدا سەردانیکردم، کە نەخۆشکەوتبووم بەڵام دواتر شیفام بۆهات و لە مردن گەڕامەوە.

ئەو کات گوتم: ئەی پێغەمبەری دەبینی کە ئازارم زۆرە، منیش خاوەن پارەم، جگە لە کچەکەم نەبێت هیچ میراتگرێکم نییە، دەتوانم دووبەش لە سێ بەشی ماڵەکەم ببەخشم؟

فەرمووی: "**نەخێر**".

گوتم: ئەی نیوەی ببەخشم؟

فەرمووی: "**نەخێر**".

گوتم: ئەی سێیەك؟

فەرمووی: "**سێیەك ئەی سەعد، سێیەك زۆرە، تۆ گەر وەچەکانت بە دەوڵەمەندی بە جێبهێڵی باشترە لەوەی هەژارین و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە، هەر شتێکیش لە پێناو خوا ببەخشی، پاداشتی لەلای خوایە، تەنانەت ئەو لوقمە نانەی لە دەمی خێزانەکەتی دەنێی**".

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا لە هاوەڵانم بە جێبمێنم[2].

فەرمووی: "**تۆ بەجێنامێنی، هەر کارێك بکەی مەبەستت ڕەزامەندی خوا بێت، ئەوا پلەیەك بەرز دەبیتەوە، بەڵکو تۆ بەجێمبێنی لەوانەیە خەڵکانێك سوودت لێ ببینن، و**

---

[1] ترمذي (٦٥٨) و ابن ماجه (١٨٤٤) و النسائي (٢٥٨٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء١٧٣٦) بە "حەسەن"ی داناوە

[2] واتە: لە مەککە بمێنمەوە لە دوای هاوەڵانم؟ ئەمەش وەك ترسێك لەوەی لە مەککە بمرێت، چونکە کۆچی لێکردبوو و لە پێناو خوا جێیهێشتبوو، ترسا کۆچەکەی عەیبدار بێت، چونکە پێیان ناخۆش بوو ئەو شوێنەی لە پێناو خوا جێیان هێشتووە بۆلای بگەڕێننەوە و لێی نیشتەجێبن، بۆیە سەعد ترسا لەوێ بمرێت. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧٨/١١).

**خەڵکانیش بە هۆی تۆ زیانیان پێ بگا**[١]**. خوایە گیان کۆچی هاوەڵانم تەواو بکە، مەیانگەڕێنەوە سەر حاڵی پێشوویان**[٢]**، سەعدی کوڕی خەولە داماوە".**

الزهری دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی پێ سووتاوە لە مەککە بمرێت[٣]. [٤]

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- سەردانیکردنی نەخۆش سوننەتە، بۆ کەسی پێشەوا سوننەتە وەکچۆن بۆ خەڵکی تریش سوننەتە.
- دروستە هەندێك شت لای نەخۆش باس بکرێت بە ئامانجی باشتربوونی، وەك دوعایەکی باش یان ئامۆژگاری و وەسییەتێك، یان پرسیارکردن لە حاڵی، لە حاڵێکدا ئەمە باش نییە ئەگەر ببوە هۆی توڕەبوون یان کەمکردنەوە لە پاداشتی نەخۆشییەکە.
- وەسیەتکردن بۆ بەخشینی زیاتر لە سێیەکی ماڵ حەرامە بۆ ئەو کەسەی میراتگری هەیە، هەموو زانایان لەسەر ئەمە کۆکن.
- هاندان لەسەر پەیوەندی خزمایەتی و چاکەکردن لەگەڵ کەسانی نزیك و بەزەیی هاتنەوە بە میراتگران.
- چاکەکردن لەگەڵ کەسی نزیك باشترە لە چاکەکردن لەگەڵ کەسی دوور.
- سوننەتە بەخشین لە ڕێگای خێردا.
- کارەکان بە نیەتەکانەوە بەستراونەتەوە، پاداشتی کار لەسەر بنەمای نیەتە.
- تەنانەت بەخشین بە خێزان و منداڵ ئەگەر لە پێناو خوا بێت پاداشتی هەیە.
- هەموو شتێکی ڕێگەپێدراو ئەگەر ئامانجی لێی ڕەزامەندی خوا بێت، بە عیبادەت حیسابە و پاداشتی هەیە، وەك خواردن بە نیازی بەهێزبوون بۆ پەرستنی خوای گەورە، نوستن بۆ حەوانەوە بۆ ئەوەی کاتێك هەڵدەستێت بۆ بەندایەتیکردن چوست و چالاك بێت، چێژوەرگرتن لە خێزانی بۆ ئەوەی خۆی لە حەرام بپارێزێ، مافی بدات و منداڵی ساڵحی لێ بێت.

---

[١] واتە: موسڵمانان بەهۆی تۆوە دەستکەوت و قازانجیان دەبێت بەوەی خوا گەورە لەسەر دەستی تۆ فەتحی وڵاتانی موشریك دەکات، هەروەها بێ باوەڕان لەسەر دەستی تۆ توشی زیان و لەناوچوون دەبن.

[٢] ئاماژەیەکی دوعای شیفای تێدایە بۆ سەعد، بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە ماڵە کۆچ بۆکردووەکە، کە مەدینەیە، بەهۆی نەخۆشی لەو شارە نەمێنێتەوە کە لێی کۆچکردووە کە مەککەیە.

[٣] بوخاری باس دەکات کە ناوبراو کۆچی کردوو و بەشداری بەدری کرد، پاشان گەڕایەوە مەککە و لەوێ وەفاتی کرد، هۆکاری کەساسی و داماوییەکەی بۆ کەوتنی کۆچەکەی دەگەڕێتەوە، بەهۆی گەڕانەوەی بە ئارەزووی خۆی بۆ مەککە و مردنی لەوێ. شەرحی نەوەوی(١١/ ٨٠).

[٤] بوخاری (١٢٩٦) و موسلیم (١٦٢٨) گێڕاوەتیانەوە

- باشی تەمەن درێژی بە هۆی زیادبوونی کاری باش.
- هاندان بۆ بە ئامانجگرتنی ڕەزامەندی خوا لە کاری چاکەدا[1].

**فەرمانی پێدەدان دادگەربن لە بەخشین بۆ منداڵەکانیان:**

هەندێك لە دایك و باوکان بەداخەوە زیاتر فەزڵی هەندێك منداڵ بەسەر هەندێکی تر دەدەن، ئەمەش ستەم و زوڵمە و پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە.

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە کە دایکی عەمرەی کچی ڕەواحە داوای لە باوکی کرد، هەندێك پارەی پێبدات بۆ کوڕەکەی، ساڵێك کەمتەرخەمی کرد، پاشان دایکی گوتی: ڕازی نابم تا نەچی پێغەمبەری خوا نەکەیتە شاهێد لەسەر ئەوەی داوتە بە کوڕەکەم.

دەڵێت: باوکم دەستی گرتم، ئەو کات هەرزەکار بووم، بردمیە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، دایکی ئەم کوڕە، کچی ڕەواحە، پێی خۆش بوو تۆ بکەمە شاهێد لەسەر ئەوەی بەخشیوومەتە ئەم کوڕەی.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی بەشیر تۆ منداڵی ترت هەیە جگە لەمە؟"**.

گوتی: بەڵێ

فەرمووی: **"ئایا هەمووانت وەك ئەو کوڕە پێداون؟"**.

گوتی: نەخێر

فەرمووی: **"دەی کەواتە من مەکە شاهێد، من لەسەر ستەم نابمە شاهێد"**[2].

لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێت: **"لە خوا بترسن، بەرامبەر منداڵەکانتان دادپەروەر بن"**. باوکم چووە ماڵەوە و بەخشینەکەی گەڕاندەوە.

لە ڕیوایەتی ئەبو داود (٢٥٤٢): **"ئەوان مافیان لەسەر تۆ هەیە کە دادپەروەر بی لەگەڵیان، تۆش مافت لەسەریان هەیە کە چاکەت لەگەڵ بکەن"**.

**بۆی ڕووندەکردنەوە،کە ماڵی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئەوەیە پێش مردنی لە پێناوی خوا بیبەخشێ، ئەوەی جێی دەهێڵێ لەناوچووە.**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"کامەتان ماڵی میراتگرانی لا خۆشەویستترە لەماڵی خۆی؟"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هەریەك لە ئێمە ماڵی خۆی لەلا خۆشەویسترە لە ماڵی میراتگرانی.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧٦/١١).

[2] بوخاری (٢٥٨٧) و موسلیم (١٦٢٣) گێڕاوەتیانەوە.

فەرمووی: **"ماڵی خۆی ئەو ماڵەیە پێشەخۆی دەیبەخشێ، ماڵی میراتگرانی ئەو ماڵەیە جێیدەهێڵێ"**.

واتە (ماڵی خۆی): ئەو ماڵەی پێش مردنی خۆی لە کاروباری خێردا سەرفی دەکات.

(ماڵی میراتگرانی): ئەو ماڵەی دوایدەخات و دوای مردنی خۆی جێیدەهێڵێت و لێی نابەخشێت.

**ابن بطال** دەڵێت: ئەم فەرموودەیە هاندانی تێدایە لە بەخشینی ماڵ پێش مردنی، بۆ ئەوەی لە ئاخیرەتدا سوودی بۆی هەبێت، چونکە هەر ماڵێك لە دوای مردن بە جێبهێڵدرێت دەبێتە موڵکی میراتگر، گەر لە کاری چاکە بەکاریبهێنێت ئەوا سوودی بۆ خۆی دەبێت، لە کاتێکدا ئەوەی بە کۆکردنەوەی ماندوو بووە لە ژیاندا نەماوە.

گەر گوترا: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەخشینی ماڵ لە رووی چاکەوە باشترە لە جێهێشتنی بۆ میراتگر، ئەمەش لەگەڵ فەرموودەیەکی تر لێکگیر دەبن کە دەفەرموێت: **"تۆ گەر منداڵەکانت بە دەوڵەمەندی جێبهێڵی باشترە لەوەی بە هەژاری جێیان بهێڵیت و دەست لە خەڵك پان بکەنەوە"**.

بەڵێ: هیچ دژیەك نییە، چونکە لەم فەرموودەیە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت سەعد هانبدات ماڵ بۆ منداڵەکانی جێبهێڵێت، چونکە سەعد لە کاتی نەخۆشکەوتنی دەیویست هەموو سەروەت و سامانی ببەخشێت، بۆیە پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێکرد سێیەکی ببەخشێت ئەوی تری بۆ منداڵەکانی جێبهێڵێت.

فەرموودەی ئیبن مەسعودیش بریتییە لە ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی لە کاتی لەش ساغیان، ئاگاداری ئەو کەسانە دەکات کە رەزیلی بە ماڵ و سامانیان دەکەن و لە رێگەی چاکە نایبەخشن، کە لە کۆتاییدا هەموو بە حازری دەبێتە موڵکی میراتگرەکەی، ئەو کات پاداشتی لە بەخشینی نامێنێت، ئەم فەرموودەیە داوا ناکات سەرجەم ماڵ ببەخشرێت تا ببێتە دژیەك لەگەڵ فەرموودەکەی سەعد.

فەرموودەکەی سەعد تایبەتە بەو کەسەی هەموو ماڵی یان زۆرینەی لە کاتی نەخۆشکەوتنی دەبەخشێت، بەڵام فەرموودەی ئیبن مەسعود تایبەتە بەو کەسەی لە کاتی لەش ساغی دەیبەخشێت[1].

عەبدوڵڵای کوڕی شەخیر ﷺ دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾

---

[1] شەرحی ابن بگال لە سەحیحی بوخاری (٢١٦/١٩).

**ئینجا فەرمووی: "ئەوەی ئادەم دەڵێت: ماڵم ماڵم.." فەرمووی: "ئەی ئەوەی ئادەم تۆ هیچ ماڵت هەیە؟ جگە لەوەی نەبێت خواردووتە و لەناچووە، لەبەرتکردووە و کۆنبووە، بەخشیوتە و پاداشتەکەی ماوە[(١)]".**

لە فەرموودەی ئەبو هورەیرە ئەمە زیادە: **"ئەوانی تر دەڕۆن و بۆ خەڵك جێدەمێنن[(٢)]".**

**شاعیر دەڵێت:**

| | |
|---|---|
| يـا كـانز الأمـوال سـوفَ يحوزهـا | زوجُ البنـات وزوجـة الأبنـاء |
| ولسـوف تُـترك في المقـابر مُفـردا | مـن غـير أهـل ولا أحمـاء |
| فاجعل لنفسـك من كنـوزك حـصـة | في سـاحة الأيتـام والفقراء. |

**واتە:**

ئەی کۆکەرەوەی ماڵ و سامان، پارەکەت دەبات

مێردی کچەکەت و خێزانی کوڕەکەت

بە تەنیا لە گۆڕ جێ دەهێڵدرێیت

بێ بوونی خۆشەویستان و کەسوکارەکەت

وا بکە لەو سامان و ماڵە بەشێکت هەبێت

لە بەخشین بە هەژار و بێ باوکانی وڵاتەکەت

## پێغەمبەر ﷺ لێی قەبوڵ نەدەکردن هەموو ماڵی خۆیان ببەخشن:

**بۆیە کاتێك کەعبی کوڕی مالیك ﷺ بە پێغەمبەری خوای گوت ﷺ: لە تەوبەکردنم بڕیارم داوە لە پێناو خوا و پێغەمبەرەکەی دەستبەرداری هەموو ماڵەکەم بم.**

**فەرمووی: "هەندێك لە ماڵەکەت بهێڵەوە، باشترە بۆت[(٣)]".**

(١) موسلیم (٢٩٨٥) گێڕاوەتیەوە.

(٢) موسلیم (٢٩٥٩) گێڕاوەتیەوە.

(٣) بوخاری (٢٧٥٨) و موسلیم (٢٧٦٩) گێڕاوەتیانەوە.

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: ئێمە لەلای پێغەمبەری خوا بووین ﷺ کاتێك پیاوێك هاتە بە هەندێك زێڕەوە کە بەقەد هێلکەیەك دەبوو هاتە خزمەتی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەم پەیداکردووە سەدەقەیە وەریگرە، جگە لەمە هیچی ترم نییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەتی کردووە، جارێکی تر پیاوەکە لە روکنی ئەیمەن (روکنی ئەیمنی کەعبە) هاتەوە لای هەمان قسەی کردەوە، دیسان ڕەتی کردەوە، ئەمجارەیان لە ڕوکنی چەپەوە هات، دیسان ڕەتی کردەوە، جارێکی دیکە لە دواوە هات، ئەمجارەیان پێغەمبەری خوا ﷺ لێی وەرگرت و بۆی هاویشت، گەر پێی کەوتبا ئازاری دەدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"یەکێك لە ئێوە دێت دەڵێت: ئەمە سەدەقەیە، پاشان دادەنیشێت و دەست لە خەڵك پان دەکاتەوە، باشترین بەخشین ئەوەیە بە دەوڵەمەندی بێت"**[1].

**لەوانەیە ڕێگەی بە هەندێکیان دابێت، ئەویش بە هۆی پشتبەستنیان بە خوا و ئارامگرتنیان لەسەر هەژاری و نەفس بەرزیان:**

زەیدی کوڕی ئەسلەم لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردن ببەخشین، منیش هەندێك ماڵم هەبوو.

گوتم: گەر ڕۆژێك پێش ئەبوبەکر بکەوم، ئەوا ئەمڕۆیە، نیوەی ماڵی خۆم هێنا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"چیت بۆ منداڵەکانت هێشتۆتەوە؟"**.

گوتم: بەقەدەر ئەمە.

ئەبوبەکر بە هەموو ماڵەکەیەوە هات.

بەویشی فەرمووی: **"ئەی ئەبوبەکر چیت بۆ منداڵەکانت هێشتۆتەوە؟"**.

گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەیم بۆ هێشتوونەتەوە.

گوتم: سوێند بەخوا هەرگیز لە هیچ شتێك پێشی ناکەوم[2].

(پێغەمبەر ﷺ بەخشینی هەموو ماڵی ئەبوبەکری ڕەت نەکردەوە، چونکە شارەزابوو بە نیەتە پاك و دەروونە بەهێزەکەی، نەدەترسا توشی فیتنە بێت و دەست لە خەڵك پان بکاتەوە، وەك چۆن دەترسا خەڵکی تر توشی بێت[3]).

---

(١) ئەبو داود (١٦٧٣) گێڕاوەتیەوەو حاکم (١٥٠٧) بە سەحیحی داناوە، ابن الملقن دەڵێت: "اسناده جید، لولا عنعنة ابن اسحاق"، البدر المنیر (٤١٦/٧)، ئەلبانی لە (الارواء ٨٩٨) بە "زەعیف"ی داناوە.

(٢) ترمذي (٣٦٧٥) و ئەبو داود (١٦٧٨) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی بە "حەسەن"ی داناوە.

(٣) شرح أبي داود للعيني (٤٣٢/٦).

**طبري** دەڵێت: (کۆمەڵی زانایان دەڵێن: هەرکەسێك هەمووماڵی ببەخشێت، دروستە بەو مەرجانە: تەندروستی جەستە و عەقڵی تەواوبێت، قەرزدار نەبێت، لە تەنگانەدا ئارام بگرێت، منداڵی نەبێت، گەر هەشی بێت ئەوانیش ئارام بگرن، ئەوکات بەخشینەکە دروستە، بەڵام گەر یەکێك لەو مەرجانەی لە دەستدا ناپەسەندە [1]).

## ڕێنوێنی دەکردن بەخششەکانی پەروەردگار لەسەریان دیار بێت:

لەشوکرانەکردنی ناز و نیعمەتەکانی خوا: دەرخستنیەتی و بەکارهێنانییەتی: وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ﴾ الضحى: ١١ واتە: (دەربارەی ناز و نیعمەتەکانی پەروەردگارت هەمیشە بدوێ و باسیان بکە لە جێی خۆیاندا بەکاریان بهێنە).

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هانی هاوەڵە دەوڵەمەندەکانی دەدا، بۆ ئەوەی ناز و نیعمەتەکانی خوا گەورە لەسەر خۆیان دەربخەن.

مالیکی کوڕی نەزلە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بینی کراسێکی کۆنم لەبەربوو، فەرمووی: **"ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟"**.

گوتم: بەڵێ

فەرمووی: **"چ ماڵ و سامانێك؟"**.

گوتم: لە هەموو ماڵێك، کە خوای گەورە ﷻ پێی بەخشیووم، وشتر، بەندە، ئەسپ، مەڕوماڵات.

فەرمووی: **"گەر خوای گەورە ماڵێکی پێداوی، با پێتەوە دیار بێت [2]"**. لە گێڕانەوەیەکی تر **"با ناز و نیعمەت و کەرامەتی خوا گەورە لەسەرت دیار بێت"**.

واتاکەی: جلوبەرگی نوێ لەبەرکە، بۆ ئەوەی خەڵك بزانێ دەوڵەمەندی، چونکە خوا گەورە جۆرەها ناز و نیعمەتی پێبەخشیووی [3].

عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکییەوە ئەویش لە باپیرییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوای گەورە پێی خۆشە شوێنەواری ناز و نیعمەتەکانی لەسەر بەندەکانی دیار بێت [1]"**.

---

[1] فتح الباري (٣/٢٥٩).

[2] ئەبو داود (٤٠٦٣)، ترمذي (٢٠٠٦) و النسائي (٥٢٢٣) و ئەحمەد (١٥٤٥٧) گێڕاویەتیانەو، ئەلبانی لە (غاية المرام ٧٥) بە "سەحیحی" داناوە.

[3] مرقاة المفاتيح (١٣/٩٩).

کەشخەیی لە دەرکەوتندا لە شوکرانە بژێری ناز و نیعمەتەکانی خوای گەورەیە لەسەرت، نەوەك لە زیادەڕۆیی و ئیسراف یاخود لە خۆبەگەورەزانین بێت لەسەر خەڵك.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەو کەسەی هێندەی گەردیلەیەك لوتبەرزی لە دڵ دابێت، ناچێتە بەهەشت"**.

کەسێك گوتی: پیاو حەز دەکات جلوبەرگ و پێڵاوی جوان بێت.

فەرمووی: **"خوای گەورە جوانە و جوانی خۆش دەوێت، بەڵکو لوتبەرزی سپڵەیی و شاردنەوەی حەق و بە سوك سەیرکردنی خەڵکە [٢]"**.

## ستایشی کارەچاکەکانیانی دەکرد، ئەمەش لە پێناو هاندانی زیاتریان:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هەر کەسێك دوو شت ببەخشێت [٣] لەپێناوی خوادا، لە ڕۆژی دوایی لە دەرگاکانی بەهەشت بانگ دەکرێت: ئەی بەندەی خوا، ئەمە خێرە.**

**ئەوەی ئەهلی نوێژکردن بێت، لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێت، ئەوەی ئەهلی جیهادکردن بێت، لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێت، ئەوەی ئەهلی ڕۆژوو بێت، لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێت، ئەوەی ئەهلی بەخشین بێت، لە دەرگای بەخشینەوە بانگ دەکرێت"**.

ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: بە دایك و باوکەوە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، کەس هەیە لە هەموو ئەو دەرگانەوە بەیەك جار بانگ بکرێت؟.

فەرمووی: **"بەڵێ، هیوادارم تۆ لەوان بیت [٤]"**.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە ڕۆژووە؟"**.

ئەبوبەکر گوتی: من

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە دوای جەنازەدا ڕۆیشتووە؟"**.

ئەبوبەکر گوتی: من

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"کێ لە ئێوە ئەمڕۆ هەژارێکی نان داوە؟"**.

---

[١] ترمذي (٢٨١٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ١٨٨٧) بە "حەسەن"ی داناوە.

[٢] موسلیم (٩١) گێراوەتیەوە.

٥ ئەو دوو شتە یا هەر جۆرە شتێك بێت بۆ بەخشین بشێت.(و)

[٤] بوخاری (١٨٩٧) و موسلیم (١٠٢٧) گێراوەتیانەوە.

ئەبوبەکر گوتی: من

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"کێ لە ئێوە ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێکی کردووە؟"**.

ئەبوبەکر گوتی: من

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەم شتانە لەهەر کەسێك کۆببنەوە، بێگومان دەبینە بەهەشتەوە"**[1].

عەبدلورەحمانی کوڕی سەمرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای (عوسرە)ی ئامادەکرد، عوسمانی کوڕی عەففان بە هەزار دینار هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پارەکەی خستە کۆشی پێغەمبەرەوە ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ بە دەستی هەڵاوگێڕی دەکرد و دەیگوت: **"کوڕی عەففان لە دوای ئەم کارە توشی زیان نابێت"**، چەند جارێك ئەمەی فەرموو[2].

ئەحنەف کوڕی قەیس دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بۆ حەجکردن دەرچووین، گەیشتینە مەدینە، ئێمە دەمانویست حەج بکەین، لە کاتێکدا ئێمە لە شوێنی حەوانەوەمان کەلوپەلمان دانا، لە ناکاو کەسێك هات و گوتی: خەڵکی لە مزگەوت کۆبوونەوەتەوە، دەترسێن.

ئێمەش دەرچووین دەبینین خەڵك لە دەوری چەند کەسێك کۆبوونەتەوە، کە عەلی و زوبێر و تەڵحە و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاسیان تێدایە... ئێمەش لەوێبووین کاتێك کتوپڕ عوسمان ﷺ هات سەری بە چەرچەفێکی زەرد داپۆشی بوو، گوتی: ئا لێرە ئەی سەعد؟ ئا لێرە ئەی تەڵحە، ئا لێرە ئەی سەعد؟

گوتیان: بەڵێ.

گوتی: سوێند بە الله ، کە هیچ خوایەکی تر جگە لەو نییە بە بیرتان دێنمەوە، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"کێ زەوی فلانەکەس دەکرێ، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت"**، بە بیست یان بیست و پێنج هەزار کریم، هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێم ڕاگەیاند، فەرمووی: **"بیدەرە مزگەوتمان، پاداشتەکەی بۆ تۆیە"**.

گوتیان: سوێند بەخوا بەڵێ بەبیرمانە.

---

[1] موسلیم (١٠٢٨) گێراوەتیەوە.

[2] ترمذي (٣٧٠١) و ئەحمەد (٢٠١٠٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (تحقيق المشكاة ٦٠٦٤) بە "حەسەن"ی داناوە.

گوتی: سوێند بە الله، کە هیچ خوایەکی تر جگە لەو نییە بە بیرتان دێنمەوە، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"کێ بیری -ڕوومە- دەکڕێ خوای گەورە لێی خۆش دەبێت"**.

من بەوەندە و ئەوەندە کڕیم، چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتم: "بەوەندە و ئەوەندە کڕیم".

فەرمووی: **"بیبەخشە بۆ ئاودانی موسڵمانان، پاداشتی بۆ تۆیە"**.

گوتیان: سوێند بەخوا بەڵێ بەبیرمانە.

گوتی: سوێند بە الله، کە هیچ خوایەکی تر جگە لەو نییە بە بیرتان دێنمەوە، ئایا دەزانن پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری خەڵکی کرد و گوتی: **"کێ ئەمانە پڕچەک دەکات، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت"**، واتە: سوپای (عوسرە)، من چەکدارم کردن تا دەگاتە پاشبەند و جڵەوی سواریان.

گوتیان: سوێند بەخوا بەڵێ بەبیرمانە.

ئینجا گوتی: خوایەگیان شاهێدبە، خوایەگیان شاهێد بە، خوایەگیان شاهێد بە [1].

**بە بازرگانیکردن لەگەڵ خوا ڕایدەهێنان، چونکە بەڕاستی بازرگانییەکی قازانجکەرە:**

بازرگانیکردن لەگەڵ خوا بە سوودترین بازرگانییە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴾ فاطر: ٢٩-٣٠

سەعدی دەڵێت: ﴿تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ﴾ واتە: هەرگیز توشی زیان نابن، باشترین و پیرۆزترین جۆری بازرگانییە، ئەویش ڕازیکردنی خوای پەروەردگار و دەسکەوتنی پاداشتی و ڕزگاربوونە لە سزا و توڕەبوونی [2].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا فلانەکەس دارخورمایەکی هەیە، دیواری باخچەی منی دەکەوێتە سەر، فەرمانی پێ بکە پێم بدات تاوەکو دیواری لەسەر دروست بکەم.

---

[1] النسائی (٣١٨٢)، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ٦٨٨١) بە "سەحیح"ی داناوە.
[2] تفسیر السعدی (٦٨٩/١).

پێغەمبەری خوا ﷺ بە کابرای فەرمووی: **"لە بەرامبەر دارخورمایەکی بەهەشت پێی بدە".**

کابرا ڕەتی کردەوە.

ئەبو دەحداح هات و پێی گوت: دارخورمایەکەتم پێ بفرۆشە لەبەرامبەردا باخێکی خورمات پێ دەدەم. ئەویش وایکرد.

هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من دارخورمایەکەم بەرامبەر پێدانی باخی خورما کڕی، پێی بدە، ئەوا من دامە تۆ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"چەند گەڵای هەیە، هەمووی بۆ ئەبو دەحداح بۆ بەهەشت چووە"** چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە.

دەڵێت: ئەبو دەحداح چووە لای خێزانی پێی گوت: ئەی دایکی دەحداح، بڕۆ دەرەوە لەم باخە، من لەبەرامبەر دارخورمایەکی بەهەشت فرۆشتم.

خێزانەکەی گوتی: فرۆشتنێکی بە قازانجە.[1]

### ناوی جوانی بۆ ئەهلی بازرگانیکردن هەڵدەبژارد و لەسەر بەخشین هانیدەدان:

قەیسی کوڕی ئەبو عەرزە ﷺ دەڵێت: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان دەگوترا (سِمْسار –واتە دەلاڵ)، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاماندا تێپەڕی ناوێکی باشتری لێناین فەرمووی: **"ئەی کۆمەڵی بازرگانان، فرۆشتن توشی قسەی چەوت و سوێند خواردنتان دەکات، بۆیە بازرگانییەکەتان تێکەڵاوی بەخشین بکەن[2]".**

**خطابي** دەڵێت: (سمسار) ناوێکی ئەعجەمییە، چونکە زۆربەی ئەوانەی کڕین و فرۆشتنیان دەکردن ئەعجەمی بوون، بۆیە ئەو ناوەیان لەوان وەرگرتووە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ وشەی (التجارة –بازرگانی) گۆڕی کە وشەیەکی عەرەبییە[3].

**(بازرگانییەکەتان تێکەڵاوی بەخشین کەن):** بۆی ڕوونکردنەوە کە زۆرجار بازرگانیکردن توشی قسەی زیادە و سوێندخواردن دەبێت، بۆیە پێی فەرموون، ئەو سوێندخواردن و قسەی زیادە تێکەڵاوی بەخشین بکەن، چونکە تووڕەیی خوای گەورە دەکوژێنێتەوە، چاکەکانیش خراپەکان وەلادەنێن[4].

---

[1] ئەحمەد (١٢٠٧٣) و ئەلبانی لە (السلسلة ٢٩٦٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

[2] ئەبو داود (٣٣٢٦) و ترمذي (١٢٠٨) و النسائی (٣٧٩٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ١٠١٦) بە "سەحیح"ی داناوە

[3] معالم السنن (١٣١/٢).

[4] مرقاة المفاتیح شرح مشكاه المصابیح (٢٨١/٩).

**لە بازاڕ دەچووە لایان، فەرمانی بە چاکە و ڕێگری خراپەی لێدەکردن:**

ڕوفاعە دەڵێت: لەگەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین، خەڵك خەریکی کڕین و فرۆشتن بوو، بانگی کردن: **"ئەی کۆمەڵی بازرگانان"**.

کاتێك سەریان بەرزکردەوە، پێی فەرموون: **"ڕۆژی دوایی بازرگانان وەکو پیاوی خراپەکار زیندوو دەکرێنەوە، جگە لەوانەی کە تەقوای خوایان هەیە و چاکە دەکەن و ڕاستی دەڵێن[1]"**.

(**جگە لەوانەی تەقوای خوایان هەیە.....**) مەبەستی لێی ئەو کەسەیە گوناهی گەورە و بچوك و ساختەیی و فروفێڵ ناکات و لەگەڵ خەڵکی باشە، یاخود ملکەچی فەرمانی خوا بووە[2].

**القاضي** دەڵێت: لە خووە خراپەکانی بازرگانی گزی و فروفێل کردنە لە مامەڵەکردن، **هەروەها** خۆبە فەتارەتدان بە بەکارهێنانی سوێندی درۆ ئەمەش بۆ ئەوەی تەنیا کاڵایەکە بفرۆشرێ، بۆیە حوکمی (خراپەکاری)ی بەسەردا سەپاندوونە، ئەوانەی خۆیان لە حەرام پاراستووە و سوێندیان بە دروستی بەکارهێناوە و ڕاستگۆ بوون، لەوانی تری جیاکردوونەتەوە[3].

**ڕێگری ساختەیی و گزی لێ دەکردن لە کڕین و فرۆشتندا:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای خواردنێك تێپەڕی، دەستی بردە ناوی، پەنجەکانی تەڕ بوون، فەرمووی: **"ئەمەی چییە ئەی خاوەنی خواردنەکە؟"**.

گوتی: بارانی پێکەوتووە ئەی پێغەمبەری خوا!

پێغەمبەر فەرمووی: **"نەدەکرا کردباتە سەرەوەی خواردنەکە بۆ ئەوەی خەڵك بیبینێت، هەرکەسێك گزی و فروفێل بکات لە من نییە[4]"**.

نەوەوی دەڵێت: (واتە لەو کەسە نییە کە لەسەر ڕێبازی منە و ڕێگەی زانست و کردەوەی منی گرتۆتەبەر، سوفیانی کوڕی عویەیینە خۆی لە تەفسیری ئەم فەرموودە

[1] ترمذي (١٢١٠) و ابن ماجه (٢١٤٦) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی دەڵێت: "صحيح لغيره"، صحيح لترغيب والترهيب (١٧٨٥).
[2] تحفة الاحوذي (٤/٣٣٦).
[3] تحفة الاحوذي (٤/٣٣٦).
[4] موسليم (١٠٢) گێراوەتیەوە.

دەپاراست، بەڵکو خۆی لە راڤەگرتنی دەگرت، بۆ ئەوەی فەرموودەکە خۆی کاریگەری قوڵتری لەسەر دەروونەکان هەبێت [١]).

ئەبوی هورێرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"گوانی وشتر و مەڕوماڵاتەکان مەبەستن [٢]، هەر کەسێك بیکڕێت دوای دۆشینی لەبەرامبەر دوو بژاردە دایە، گەر ویستی لای خۆی بیهێڵێتەوە یان گەر ویستی بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی [٣]"**.

نەوەوی دەڵێت: (بزانە گرتنەوەی شیری ئاژەڵ حەرامە، جا چ هی وشتر، یان مانگا، یان مەڕ، یان ئەسپ و هەرشتێکی تر بێت، چونکە فێل و گزییە، فرۆشتنەکە بە رواڵەت دروستە لەگەڵ ئەوەی حەرامە، کەسی کڕیار بۆی هەیە یان پێی رازی بێت یان بۆ خاوەنەکەی بگەڕێنێتەوە) [٤].

گەر هەر کەسێك لەوان چاکەیەکی لەگەڵ کردبایە، پێغەمبەر ﷺ پاداشتی دەدایەوە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساتێکدا دەرچوو، کە هەرگیز پێشتووتر لەو کاتەدانەدا دەرنەچووبوو چاوی بەکەسیش لەو کاتانەدا نەدەکەوت، ئەبوبەکر هاتە لای، پێی فەرموو: **"چی تۆی هێناوەتە دەر ئەی ئەبو بەکر؟"**.

گوتی: هاتووم تا پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم و سەیری رووی بکەم و سەلامی لێ بکەم.

زۆری پێنەچوو تا عومەریش هات، پێی فەرموو: **"چی تۆی هێناوەتە دەر ئەی عومەر؟"**.

گوتی: برسییەتی ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"منیش هەر ئەوەیە"**.

چوونە ماڵی ئەبو هەیسەمی ئەنساری، پیاوێك بوو دارخوورما و مەڕوماڵاتی زۆر بوو، هیچ خزمەتکارێکی نەبوو، خۆشی لەماڵ نەبوو، بە خێزانەکەیان گوت کوا پیاوەکەت؟

گوتی: رۆیشتووە ئاومان بۆ بێنێت.

زۆری پێنەچوو تا ئەبو هەیسەم بە دێمکەیەکی ئاو هاتەوە و داینا، پاشان بەخێرهاتنی پێغەمبەری ﷺ کرد و بە دایك و باوکی خۆی کردە قوربانی، دواتر ئەوانی بردە

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٩/١).

[٢] پێی دەگوترێت (المصراة): کە بریتییە لە نەدۆشین بۆ چەند رۆژێك تاوەکو شیر لە گوانی ئاژەڵەکە کۆ دەبێتەوە، بۆ ئەوەی کاتێك کڕیار دۆشی بە لێزمە شیری لێ بێتەخوارێ (النهاية: ٢٧/٣).

[٣] بوخاری (٢١٤٨) و موسلیم (١٥١٥) گێڕاوەتیانەوە.

[٤] شەرحی نەوەوی لە سەحیح موسلیم (١٦٢/١٠).

باچخەکەی. رایەخێکی بۆ راخستن، دواتر هێشووە خورمایەکی هێنا و داینا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: " **وازت لێهێنابایە تاوەکو پێدەگەیشت**".

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ویستم ئێوە بۆ خۆتان لێی بژار بکەن، واتە: خورمای گەیوو لە نەگەیوو بژار بکەن.

لێیان خوارد، لە ئاوەکەشیان خواردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەمە ئەو نیعمەتەیە کە رۆژی دوایی پرسیارتان لەبارەیەوە دەکرێت، سێبەری فێنك، خورمای گەیوو، ئاوی سارد**"، ئەبو هەیسەم رۆیشت بۆ ئەوەی خواردنیان بۆ ئامادە بکات، پێغەمبەری ﷺ فەرمووی: "**مەڕی بە شیر سەرمەبڕە**".

دەڵێت: کاریلە یان گیسکێکی بۆ سەربڕین.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "**خزمەتکارت هەیە؟**".

گوتی: نەخێر

فەرمووی: "**گەر بەدیل گیراومان بۆ هات، سەرێکمان لێ بدە**". دوو بەدیل گیراویان هێنایە لای پێغەمبەر، ئەبو هەیسەمیش هات، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو "**یەکێکیان هەڵبژێرە**".

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ بۆم هەڵبژێرە.

پێغەمبەر ﷺ فەرموو: "**کەسی راوێژکار ئەمینداره، ئەمەیان ببە، من بینیم نوێژ دەکات، لەگەڵی باش بە**".

ئەبو هەیسەم چووە لای خێزانەکەی، قسەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ گێڕایەوە، خێزانەکەی گوتی: تۆ ناگەیتە ئەو قسەیەی پێغەمبەری خوا کردوویەتی تاوەکو ئازادی نەکەی.

گوتی: ئەوە ئازادم کرد.

دوای گێڕانەوەی قسەکە بۆ پێغەمبەری خوا، فەرمووی: "**خوای پەروەردگار هیچ پێغەمبەر و خەلیفەیەکی رەوانە نەکردووە تەنیا لەگەڵیدا دوو جۆر پیاوی لەگەڵ داناون، جۆرێکیان پیاوی دڵسۆزبوون فەرمانیان بە چاکە پێدەکرد و رێگریان لە خراپە پێ دەکرد، جۆری دووەمیشان لە توشکردنی گیروگرفت کەمتەرخەمی ناکەن، هەر کەسێك لە جۆری پیاوی خراپ بپارێزرێت ئەوا بەراستی پارێزراوە**"[1].

[1] ترمذي (٢٣٦٩) بە درێژی گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ١٦٤١) بە "سەحیح"ی داناوە، موسلیم (٢٠٣٨) بێ چیرۆکی خزمەتکارەکە و بێ ناوهێنانی ئەبو هەیسەم گێراوەتیەوە، ئەم فەرموودەی لە بەشی شەشەم لەگەڵ هەندێك لە سوودەکانی باس کراوە.

## دوعای بەرەکەتداری بۆ دەکردن:

دوعای بەرەکەتداری بۆ ماڵ و سامانی عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف دەکرد، ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ عەبدولرەحمانی کوڕی عەوفی بینی بە جلی زەرد و بۆنخۆشەوە، پێی فەرموو: **"ئەمە چییە؟"**.

گوتی: ژنێکم مارەکردووە بە پێنج درهەمی زێڕ.

فەرمووی: **"خوای گەورە بەرەکەتداری بکات بۆت، گەر بە مەڕێکیش بێت دەعوەتێك بکە"**(1).

نەوەوی دەڵێت: **" بە مەڕێکیش بێت دەعوەتێك بکە "**، بەڵگەیە بۆ ئەوەی کەسی بە توانا نابێت لە مەڕێك کەمتر بکاتە وەلیمەی ژن گواستنەوە، قازی رای ئیجماعی زانایانی گواستۆتەوە کە سنورێك بۆ ئەمە نییە، بەڵکو بە هەر شتێك بێت دەعوەتەکە دروستە، موسلیم لە دەعوەتی گواستنەوەی (سەفییە)دا باس دەکات و دەڵێت: بێ گۆشت بووە، لە وەلیمەی زەینەب: (لە نان و گۆشت تێر بووین): بەهەموو ئەمانە دەعوەتەکە دروستە، بەڵام واباشترە بە گوێرەی توانای پیاوەکە بێت (2).

عەروەی بارقی دەگێڕێتەوەو دەڵێت، کالایەك بۆ پێغەمبەر ﷺ هات، ئەویش دینارێکی پێدام، فەرمووی: **"ئەم کالایە بگرە، بڕۆ مەڕێکی بۆمان پێبکڕە"**.

کالایەکەم هێنا و مامەڵەم پێکرد، دوو مەڕم پێ کڕی، لە ڕێگادا بووم پیاوێکم بینی، داوای کڕینی مەڕێکی کرد، مامەڵەم لەگەڵی کرد مەڕێکیانم بە دینارێك پێ فرۆشت، مەڕەکەی تر و دینارەکەم هێنایەوە و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە دینارەکەتان، ئەمەش مەڕەکەتان، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە.

ئەویش فەرمووی: **"خوایەگیان بەرەکەت بخە مامەڵەیەوە"**.

دەڵێت: بەراستی منت دەبینی کاتێك لەسەر زبڵخانەی کوفە دەوەستام، بەرلەوەی بچمەوە ماڵەوە چل هەزارم قازانج دەکرد (3).

## پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ مامەڵەکارانی کڕین و فرۆشتن دەکرد:

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوای گەورە رەحم بە پیاوێك بکات کە ئاسانکاری دەکات لە کاتی کڕین و فرۆشتن و داواکردنی مافەکەیدا"**(4).

---

(1) بوخاری (٥١٥٥) و موسلیم (١٤٢٧) گێڕاوەتیانەوە

(2) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩/٢١٧).

(3) بوخاری (٣٦٤٣) و ئەحمەد (١٨٨٧٣) گێڕاوەتیانەوە.

(4) بوخاری (٢٠٧٦) گێڕاوەتیەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- هاندانی تێدایە بۆ لێبوردەیی و ئاسانکاری لە مامەڵەدا، پابەندبوون بە ڕەوشتبەرزی و بێ مشتومڕی کردن.
- هاندانی تێدایە بۆ ئاسنکاری و فشار نەخستنە سەر خەڵکی بۆ داواکردنی ماف، لێبوردەیی لەگەڵیان [(١)].

پیی ڕاگەیاندوون کە خوای گەورە خۆشی دەوێن:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"خوای گەورە ئەو کەسەی خۆش دەوێت ئاسانکاری لە فرۆشتن و ئاسانکاری لە کڕین و ئاسانکاری لە داواکردنی مافی دەکات [(٢)]"**.

ڕایگەیاندووە کە ئەم جۆرە کارئاسانی و لێبوردەییە هۆکارە بۆ چوونە بەهەشت، عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"خوای گەورە پیاوێکی بردە بەهەشت کە ئاسانکار بووە لە کڕین و فرۆشتن و داواکردنی مافدا [(٣)]"**.

پێغەمبەر دوعای بۆ بەخشەر و زەکاتدەرەکان دەکرد:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا ﷺ دەگێڕێتەوە، کاتێک خەڵکانێك بەخشین و زەکاتی خۆیان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهێنا، دەیفەرموو: **"اللهم صلّ على آل فلان"**، باوکیشم بەخشینێکی بۆ هێنا، فەرمووی: **"الهم صلِّ على آل أبي أوفى"**.

الصلاة: لێرەدا بە واتای دوعا دێت، واتە: خوایە گیان ڕەحمەتیان بەسەردا ببارێنە، وەك لە **قورئاندا هاتووە:** ﴿ خُذْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ التوبة: ١٠٣

واتەی ئایەتەکە: ( لە هەندێ ماڵ و سامانی ئەو (ئیماندارانە) زەکات و خێر وەربگرە، چونکە دەبێتە هۆی خاوێن کردنەوەی ماڵەکەیان و پاککردنەوەی دڵ و دەروونیان و دۆعای داباریینی ڕەحمەت بکە بەسەریاندا و ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بکە، چونکە بەڕاستی دوعا و نوێژکردنی تۆ مایەی دڵنیایی و ئارامییە بۆیان، خوایش هەمیشە بیسەرو زانایە).

ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە سوننەتە زەکات وەرگر دوعا بۆ زەکاتدەر بکات [(٤)].

---

[(١)] فتح الباری (٤/٣٠٧).

[(٢)] ترمذي (١٣١٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ١٨٨٨) بە "سەحیح"ی داناوە.

[(٣)] ابن ماجة (٢٢٠١) و ئەحمەد (٤١٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢٤٣) بە "حەسەن"ی داناوە.

[(٤)] فتح الباری (٣/٣٦٢).

ئەوانەی نیشانەی لوتبەرزیان تێدا بەدی کرابایە تورە دەبوو:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەشتەکییەك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، جوببەیەکی دروستکراو لە سوف و چێنراو بە ئاوریشمی لەبەروو، گوتی: ئەم هاوڕێیەتان (مەبەستی پێغەمبەر بوو ﷺ)، دەیەوێت شوانی کوڕی شوان پایەبەرز بکات و سوارچاکی کوڕی سوارچاکیش نزم بکات.

پێغەمبەر ﷺ بە تورەییەوە هەڵسا، دامێنی جوببەکەی گرت و بۆلای خۆی راکێشا، فەرمووی: **"وا نابینم پۆشاکێکی کەسێکت لەبەربێت کە بە عەقڵ بیر نەکاتەوە"**، پاشان پێغەمبەری خوا گەڕایەوە و دانیشت.

ئینجا فەرمووی: **"نوح کاتێك لەسەرەمەرگ بوو بە کوڕەکەی فەرموو، من بە کورتی وەسیەتت دەکەم، فەرمانت بە دوو شت پێ دەکەم و رێگریت لە دووشت لێ دەکەم:**

**رێگریت لێ دەکەم لە هاوبەشی دانان و لوتبەرزی، فەرمانت پێ دەکەم بە لا إله إلا الله، چونکە گەر ئاسمان و زەوی و ئەوەی تێیاندایە بخرێتە لای تەرازوویەك و (لا إله إلا الله) بخرێتە لاکەی تر، بێگومان ئەم وشەیە قورستر دەبێت.**

**گەر ئاسمان و زەوی ئاڵقەیەك بن، (لا إله إلا الله) بخرێتە سەریان، بێگومان دەیانشێکێت.**

**فەرمانت پێ دەکەم بە سبحان الله وبحمده، چونکە ئەمە دوعای هەموو شتێکە، هەر بەویش هەموو شتێك رزق دەدرێت**[1]".

سەعیدی کوڕی ئەیمەن خزمەتکاری کەعبی کوڕی سور دەڵێت: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بۆ هاوەڵانی دەکرد، پیاوێکی هەژار هات، لەلای پیاوێکی دەوڵەمەند دانیشت، ئەویش کراسەکەی خۆی کەمێك هەڵکێشایەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەموچاوی گۆڕا، فەرمووی: **"ئەی فڵانەکەس ترسای دەوڵەمەندییەکەت بۆ ئەو بچێت، یان هەژارییەکەی ئەو بۆ تۆ بێت؟"**.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەوڵەمەندی خراپە؟

فەرمووی: **"بەڵێ، دەوڵەمەندییەکەت دەتباتە ئاگر، هەژارییەکەی ئەویش دەیباتە بەهەشت"**.

گوتی: چ شتێك رزگارم دەکات لێی؟

فەرمووی: **"دڵنەوایی بکە، پێی ببەخشە"**.

---

[1] ئەحمەد (٧٠٦١) گێراوەتیەوە، ئەلبیانی لە (الصحیحة ١٣٤) بە "سەحیح"ی داناوە.

گوتی: کەواتە وا دەکەم

پیاوە هەژارەکە گوتی: پێویستیم پێی نییە.

پێغەمبەر فەرمووی: "**داوای لێخۆشبوون و دوعا بۆ براکەت بکە** [(١)]".

## لەسەر زەکات نەدانیان تورە دەبوو:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری بۆ وەرگرتنی زەکات نارد، گوتیان: کوڕی جەمیل و خالیدی کوڕی وەلید و عەباسی مامی پێغەمبەری خوا ﷺ زەکات نادەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**سەبارەت بە کوڕی جەمیل عەیبی لێناگیرێ چونکە هەژاربوو خوای گەورە دەوڵەمەندی کرد، بەڵام ستەم لە خالیدی کوڕی وەلید دەکرێت، چەك و زرێی و سواری لە پێناو خوادا بەخشیووە، سەبارەت بە عەباسیش هی ئەو لەسەرە منە**".

پاشان گوتی: "**ئەی عومەر نازانی کە مام لە جێگای باوکدایە** [(٢)]".

نەوەوی دەڵێت: کە فەرمووی: "**هی ئەو لەسەر منە**"، واتە زەکاتی دوو ساڵم پێش وەخت لێوەرگرتووە.. ئەوانەشی دەڵێن نابێت زەکات پێشبخرێت، واتاکەی: من لە جیاتی ئەو دەیدەم

ئەبو عەبید و ئەوانی تر دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی لەسەر دواخستووە لەبەر ئەوەی پێویستی پێی هەبووە، تا ئەو کاتەی تواناى دەبێت.

بەڵام واتا راستەکە: پێشتر لێم وەرگرتووە، لە فەرموودەیەکی تردا جگە لە موسلیم هاتووە: "**ئێمە زەکاتی دوو ساڵمان پێشوەخت لێوەرگرتووە**" [(٣)].

## بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خراپەی دەوڵەمەندی خۆی بە خوا پاراستووە:

عائشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**خوایەگیان پەنات پێ دەگرم لە تەمەبەڵی و پیری، لە گوناه و قەرزداری، لە فیتنەی گۆڕ و سزای ناوگۆڕ، لە فیتنەی ئاگر و سزای ئاگر، لە فیتنەی دەوڵەمەندی، پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی هەژاری، پەنات پێ دەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەجال.**

---

(١) ئەحمەد لە (الزهد لا ٣٨) گێڕاوەیتەوە.

(٢) بوخاری (١٤٦٨) و موسلیم (٩٨٣) گێڕاوەتیانەوە.

(٣) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧/٥٧).

**خوایەگیان بە ئاوی بەفر و تەرزە گوناهەکانم بشۆرە، دڵم لە تاوان پاك بکەوە، وەك چۆن پۆشاکی سپی لە پیسی پاك دەبێتەوە، دوورم کەرەوە لە گوناهەکانم وەك چۆن رۆژهەڵات و رۆژئاوات لەیەکتر دوورخستۆتەوە**[1]".

نەوەوی دەڵێت: پەناگرتنی پێغەمبەر ﷺ بە خوای گەورە لە شەڕ و خراپەی دەوڵەمەندی و شەڕ و خراپەی هەژاری، چونکە هەردووکیان بریتین لە دوو حاڵەت کە ترسی فیتنەی پێوەیە، فیتنەی رازی نەبوون بە کەمی و ئارام نەگرتن لەسەر حەرامێك یان گومان لێکراوێك.

سەبارەت بە دەوڵەمەندی ترس هەیە لە خۆپەرستی و بەکەمزانین و لەسنوردەرچوون و رەزیلی بەماڵ و سامان، یاخود سەرفکردنی لە شتی بێسوود و شانازی پێوەکردن.

بەڵام تەمبەڵی، بریتییە لە چالاکنەبوونی نەفس بۆ کاری چاکە و کەمی حەزکردن بۆ چاکەکردن سەرباری بوونی توانا.

خطابي دەڵێت: ئەو هەژارییەی پێغەمبەری ﷺ پێگرتووە بریتییە لە هەژاری دەروون نەك هەژاری ماڵ وسامان، قازی دەڵێت: دەکرێت پەناگرتنەکە لە هەژاری ماڵ و سامان بێت، مەبەست لە (فیتنە)ی هەژاری بەرگەنەگرتن و کەم رازی بوونە بە هەژاری.

سەبارەت بە پەناگرتنی لە قەرزداری، پێغەمبەری خوا ﷺ روونیکردۆتەوە کە پیاو کاتێك قەرزدار دەبێت، درۆدەکات لە قسەکردندا، گفت دەدات بە جێی ناگەیێنێت، ماوەی قەرزەکە درێژ دەکاتەوە لەسەر خاوەن قەرزەکە بەو هۆیەوە دڵی پێی سەرقاڵ دەبێت، لەوانەیە بەر لەوەی قەرزەکە بداتەوە بمرێت، ئەوکات قەرزەکەی هەر لە ئەستۆ دەمێنێت[2].

## بۆی روون دەکردنەوە کە دەوڵەمەندی راستەقینە لە دڵدایە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت "**دەوڵەمەندی بریتی نییە لە زۆری ماڵ، بەڵکو دەوڵەمەندی بریتییە لە دەوڵەمەندی دڵ و دەروون**[3]".

**نەوەوی** لە واتای ئەم فەرموودەیە دەڵێت: دەوڵەمەندی باش دەوڵەمەندی نەفسە، کە بریتییە لە تێربوونی نەفس و کەمی حەزەکانی، نەوەك زۆری ماڵ و سامانی زۆر و

---

[1] بوخاری (٦٣٦٨) و موسلیم (٥٨٩) گێڕاوەتیانەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلم (٢٨/١٧).
[3] بوخاری (٦٤٤٦) و موسلیم (١٠٥١) گێڕاوەتیانەوە.

حەزکردن لە زیادبوون، چونکە هەر کەسێك حەزبکات زیادبکات و قەناعەتی بەوەندە نەبێت کە هەیەتی، پێی ناگوترێت دەوڵەمەندی[1].

ابن **بطال** لەبارەی ئەم فەرموودەیە دەڵێت: حەقیقەتی دەوڵەمەندی بریتی نییە لە زۆری ماڵ و سامان، چونکە زۆرێك لەوانەی خوای گەورە ماڵ و سامانی بەسەردا باراندوون قەناعەتیان بەوە نییە کە پێیان دراوە، هەوڵ بۆ زیادکردنی دەدەن، گوێ ناداتێ لە کوێ بۆی دێ، لەبەر زۆر داواکردنی وەك بڵێی هەژارە.

بەڵکو حەقیقەتی دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی نەفسە، کە بریتییە لە رازیبوون بەوەی پێیدراوە و قەناعەتی پێی هەیە، سوورنییە لەسەر زیادبوونی، زۆر پێداگیری بۆ ماڵ و سامان ناکات، وەك بڵێی دەوڵەمەندە[2].

ئەبوزەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووی: **"ئەی ئەبوزەر، پێت وایە زۆری ماڵ دەوڵەمەندییە؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"پێشت وایە کەمی ماڵ هەژارییە؟"**.

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"بەڵکو دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دڵە، هەژاریش هەژاری دڵە[3]"**.

گرنگی پەیوەندی نێوان دەوڵەمەندی و تەقوای بۆ روون دەکردنەوە:

عەبدوڵڵای کوڕی خوبەیب لە مامییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە مەجلیسێك بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەلامان و شوێنەواری ئاو بەسەر سەرییەوە دیاربوو.

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا دەبینین رووخۆشی.

فەرمووی: **"بەڵێ، سوپاس بۆ خۆ"**.

پاشان باسی دەوڵەمەندی بۆ کردین، فەرمووی: **"هیچ کێشەیەك نییە لە دەوڵەمەندی بۆ کەسێك کە لەخوا ترس بێت، لەش ساغی کەسێك لە خوا بترسێت باشترە بۆی لە دەوڵەمەندی، رووخۆشیش لە بەخششەکانی پەروەردگارە[4]"**.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤٠/٧).
[2] شەرحی ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (١٥٦/١٠).
[3] ابن حبان (٦٨٥) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الترغیب و الترهیب ٣٢٠٣) بە "سەحیح"ی داناوە.
[4] ابن ماجة (٢١٤١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە "سەحیح"ی داناوە.

دەوڵەمەندی بە بێ بوونی لەخواترسان خەسارەتمەندییە، چونکە بێ ئەوەی مافی خۆی بێت پارە کۆدەکاتەوە، بەبێ هۆش سەرفی دەکات، گەر لەگەڵ خاوەنەکەی تەقوا و لە خواترسان هەبوو ئەو کات خراپە دەڕوات و باشە بۆی دێت [1].

کە فەرمووی "**لەش ساغی کەسێك لە خوا بترسێت باشتر بۆی لە دەوڵەمەندی**" چونکە لەش ساغی یارمەتی بەندایەتیکردن دەدات و سامانێکی گەورەیە، لەبەرامبەردا نەخۆشی ڕێگریی و پەککەوتن و نەتوانینە، لەش ساغی لەگەڵ تەمەنێکی درێژ زۆر باشترە لە دەوڵەمەندی لەگەڵ نەخۆشی، نەتوانین وەك مردن وایە.

کە فەرمووشی"**سینگ فراوانی لە نیعمەتەکانی خودایە**"، واتە: ئەو سینگ فراوانییەی، کە سواپاسکردنی گەرەکە و دەوڵەمەندی و هەژاری لەلا وەك یەکە و ئارامگریشە .. ئەمانە هەموو لە کۆی ناز و نیعمەتەکانن [2].

---

[1] حاشیە السندی علی سنن ابن ماجة (٣٧٠/٤).

[2] مرقاة المفاتیح (٢٠١/١٥).

## مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کەسانی خانەدان و خاوەن خەسڵەتی جوان:

ڕەوشتبەرزی پێغەمبەر ﷺ لە چەند وێنەی جیادا و لەگەڵ چەند چین و توێژی جیاوازدا بەرجەستە دەبێت، جا گەر موسڵمان بن یان کافر، دەوڵەمەند بن یان هەژار، سەرۆك بن یان ژێردەستە.

کەسانی خانەدان و پیاوەتی و خەسڵەتی جوان جێگەیەکی تایبەتیان هەبووە لە مامەڵە و ڕێزگرتن لەلای پێغەمبەری خوا ﷺچونکە ئەو ماف بەهەموو خاوەن مافێك دەدات، پلەی کەسانی گەورە و بەڕێز دانابەزێنێت، بەڵکو پێگە و پلەیان لەناو هۆزەکانیان دەپارێزێت و لەو بارەیەشەوە فەرمان بە هاوەڵانی دەکات.

پێشەوا موسلیم لە کاتی قسەکردن لەبارەی پلەی راویەکانەوە دەڵێت: پلەی کەسی باڵا کەم ناکاتەوە، کەسێکیش خاوەن زانستێکی سادە بێت لە پلەی خۆی بەرزتری ناکاتەوە، ماف دەدایە هەموو خاوەن مافەکان، خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکەین بەگوێرەی پێگە و پایەیان [1].

### پێغەمبەر ﷺ پێگە و پایەی ئەوانی لەناو قەومەکەیان دەپاراست:

ئەبو سوفیان لە گەورەپیاوانی قورەیش بوو، دوای کوژرانی سەرکردەکانیان، ئەو بووە گەورەیان، لە جەنگی ئوحددا سەرکردەی قورەیش بوو، کاتێك موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی فەتحی مەککەدا ناوی بەرز ڕادەگرێت.

ئیبن عەباس ﵄ دەڵێت: لە ساڵی فەتحی مەککەدا، عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، ئەبو سوفیانی کوڕی حەربی لەگەڵ خۆی هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ موسڵمان بوو.

عەباس پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەبو سوفیان پیاوێکە شانازیکردنی خۆش دەوێت، گەر بکرێت شتێکی بۆ بکەی؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵێ، هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان پارێزراوە، هەر کەسێك دەرگا لەسەر خۆی دابخات پارێزراوە [2]"**.

---

[1] مقدمە صحیح مسلم (٢/١).

ئەم فەرموودەیەی پێشەوا موسلیم باسی کردووە، ئەبو داود (٤٨٤٢) گێراوەتیەوە، الحاکم لە (معرفة علوم الحدیث ٩٦/١) بە "سەحیح"ی داناوە، ابن صلاح لە (مقدمتە ص٣٠٧)، السخاوی فی المقصاد (١٨٠) بە "حەسەن"ی داناوە، ئەبو داود لە (سنن)ـەکەیدا و البیهقی لە (الشعب ١٠٩٩٩) و ئەلبانی لە (تحقیق الریاض الصالحین ٣٦٠) بە "زەعیف"ی داناوە. سەرباری هەموو ئەمە، واتاکەی "سەحیح"ـە.

[2] ئەبو داود (٣٠٢١) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح أبی داود ٣٠٢١) بە "حەسەن"ی داناوە.

ئەبو هورەیرە لە چیرۆکی فەتحی مەککەدا دەڵێت: (... پێغەمبەر ﷺ چووە سەر سەفا، ئەنسارییەکان هاتن و بەدەورەی سەفا سوڕانەوە.

ئەبو سوفیان هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کۆمەڵی قورەیش لەناوچوو، لەمڕۆ بەدواوە قورەیش نەما.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هەر کەسێك بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان پارێزراوە، هەر کەسێك چەك فڕێ بدات پارێزراوە، هەر کەسێك دەرگا لەسەر خۆی دابخات پارێزراوە [1]"**.

**نەوەوی** دەڵێت: (ئەم فەرموودەیە دڵدانەوە و ئاشتبوونەوەیە بۆ ئەبو سوفیان و پیشاندانی گەورەییەتی). [2]

عائذی کوڕی عەمڕ دەگێڕێتەوە کە ئەبو سوفیان لەگەڵ کۆمەڵێك هاتە لای سەلمان و سوهەیب و بیلال (ئەم هاتنەی ئەبو سوفیان لە کاتی ئاشتەوایی حودەیبییە بوو ئەو کات کافر بوو)، گوتیان: سوێند بە خوا هێشتا شمشێرەکانی خوا حەقی تەواوی خۆی لە دوژمنەکانی خوا وەرنەگرتووە.

ئەبوبەکر گوتی: ئەم قسەیە بە گەورە و سەرکردەی قورەیش دەڵێن؟!

چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا، ئەویش فەرمووی: **"ئەی ئەبو بەکر لەوانەیە تورەت کردبن، گەر تورەت کردبن، ئەوا تۆ خوای گەورەت تورە کردووە"**.

ئەبوبەکر چووە لایان و گوتی: ئەی برایان، من ئێوەم تورە کردووە؟

گوتیان: نەخێر، براکەم خوای گەورە لێت خۆش بێت [3].

پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی ئەبوبەکری ڕەتنەکردووە سەبارەت بە پاراستنی پێگە و پایەی گەورەی قورەیش، بەڵکو ڕێگری کرد لەوەی هاوەڵەکانی تورە کردبێت.

کاتێك سەعدی کوڕی مەعاز ﷺ گەورەی خەزرەج هات بۆ حوکمکردن لەسەر (بەنی قورەیزە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە خەڵکەکە کرد وەك ڕێزگرتن لەبەری هەڵسن.

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جولەکەکانی (بەنی قورەیزە) داوای حوکمی سەعدی کوڕی مەعازیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای دانارد، لەسەر پشتی گوێدرێژێك هێنایان.

کاتێك لە مزگەوت نزیك بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەنسارییەکانی فەرموو: **"بۆ گەورەکەتان هەڵسنەوە، یان بۆ باشترینەکەتان، دایبەزێنن"**.

---

[1] موسلیم (١٧٨٠) گێراوەتیەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢/١٢٧).
[3] موسلیم (٢٥٠٤) گێراوەتیەوە.

لە نزیك پێغەمبەر دانیشت[(١)].

ابن حجر ﷺ دەڵێت: (ئەم فەرموودەیە ڕێزگرتنی تێدایە بۆ خەڵکی بەڕێز).[(٢)]

ئەم جۆرە هەڵسانەوە لەبەر مرۆڤ، ناچێتە چوارچێوەی ئەو هەڵسانەوەی کە قەدەغەکراوە، چونکە هەڵسانەوە سێ جۆرە:

**یەکەمیان**: هەڵسانەوە بۆ پیاو: سوننەتە، ئەگەر ئەو کەسەی لەبەری هەڵسای شایەنی ئەم کارە بێت، بۆ نمونە کاتێك کەسێك دەچێتە شوێنێك لە ڕووی زانستەوە خاوەنی فەزڵ و گەورەیی بێت، یان لە دین، یان لە پارە، تۆش لەبەری هەڵسای بۆ ئەوەی پێی بگەی، ئەمەیان کارێکی سوننەتە، وەك دەفەرموێت: (**بۆ گەورەکەتان هەڵسن**). چونکە ئەمە ڕێزگرتنە بۆ کەسانی خاوەن فەزڵ و ڕێز. ڕێزگرتنی ئەم جۆرانەش لە جوانترین ئاداب و کردەوەیە.

**دووەمیان**: هەڵسانەوە وەك واجبێك لەسەر پیاو: ئەمەیان ڕێگەی پێنەدراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری لێکردووە، کاتێك هاوەڵەکانی بە پێوە نوێژیان دەکرد و ئەویش دانیشتبوو، فەرمووی: "**ئەوەی ئێوە کردتان هەمان کردەوەی فارس و ڕۆمەکانە، بە پێوە لەلای پادشاکانیان ڕادەوەستن و پادشاکانیش دادەنیشن، ئەمە مەکەن**[(٣)]".

**سێیەمیان**: هەڵسانەوە وەك ڕێزێك بۆ پیاو: وەك ئەوەی پیاوێك دێتەلامان و ئێمەش وەك ڕێزێك لەبەری هەڵدەستین، ئەمەیان هیچی تێدا نییە، بەڵام باشترە نەکرێت، چونکە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ کە حەزی نەدەکرد هاوەڵانی لەبەری هەڵبستن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە لایان، ئەوان لەبەری هەڵنەدەستان، لەکاتێکدا بەڕێزترین پێغەمبەرە، لە شوێنێکیش دادەنیشت کە ڕێزی دانیشتنەکە بە دانیشتنی ئەو کۆتایی بهاتبایە[(٤)].

---

(١) بوخاری (٣٠٤٣) و موسلیم (١٧٦٨) گێڕاوەتیانەوە.

(٢) فتح الباری (٤٩/١١).

(٣) موسلیم (٤١٣) لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا گێڕاوەتیەوە.

(٤) پوختەی (لقاء الباب المفوح لابن عثیمن( ٢٥/٥٩) بە دەستکارییەوە.

**پێغەمبەر ﷺ سووربوو لەسەر بانگهێشت کردنیان بۆ لای خوا، حەزی دەکرد سەرکردە و گەورەی قەومەکان موسڵمان بن، بۆ ئەوەی خەڵکانی تریش بە هۆیانەوە ببنە موسڵمان:**

لەوانە: سەرقاڵبوون بە بانگهێشتنی وەلیدی کوڕی موغیرە بۆ ئیسلام، کە لە گەورە پیاوانی قورەیش بوو.

هەر ئەوەش بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوم مەکتوم هاتەلای، مەشغوڵی وەلیدی کوڕی موغیرە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی لە ئوم مەکتوم کرد و ڕووی لە وەلید کرد.

خاتوو عائیشە دەڵێت: سوڕەتی ﴿عبس وتولّى﴾ (عبس: ١) لەبارەی ئوم مەکتومی نابینا دابەزی، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و هەر دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێنوێنیم بکە.

لەو کاتەدا لەلای پێغەمبەری خوا، گەورە پیاوانی قورەیش دانیشتبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی تێکرد و ڕووی لەوان کرد و پێی فەرموو: **"ئایا پێت وایە لەوەی دەیڵێم هیچ کێشەی هەبێت"**.

گوتی: نەخێر.

ئینجا ئەم سوڕەتە دابەزی [(١)].

**پێداگیری بۆ هیدایەتی خەڵك، بەتایبەت پیاو ماقوڵان:**

فەرموودەکەی: **"خوایە گیان ئیسلام بە یەکێك لەم دوو پیاوانە بە عیززەت بکەی، ئەبو جەهل، یان عومەڕی کوڕ خەتتاب"**.

دەڵێت: بەڵام عومەر لای خۆشەویستر بوو [(٢)].

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: "خوایە گیان ئیسلام بەتایبەت بە عومەڕی کوڕی خەتتاب بە عیزەت بکە [(٣)]".

هیچ دژیەکێك لە نێوان ئەم دوو فەرموودەیە نییە، ئەلبانی ﵀ دەڵێت: (دژیەك نییە، چونکە ئەگەرێك هەیە ئەم فەرموودەیەی لەسەرەتادا فەرموبێت، کاتێك سەرکێشی ئەبو جەهلی بینی لە دژایەتی کردنی، ئینجا دوعای تایبەتی بۆ عومەر کرد، خوای گەورەش

---

(١) ترمذي (٣٣٣١) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح سنن الترمذی ٢٦٥١) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٢) ترمذي (٣٣٣١) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵁ گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح سنن الترمذی ٢٩٠٧) بە "سەحیح"ی داناوە.

(٣) ابن حبان (٦٨٨٢) گێراوەتیەوە، الحاكم (٤٤٨٥) و الحافظ لە (الفتح ٤٨/٧) و ئەلبانی لە (الصحيحة ٣٢٢٥ ٣٢٢٥) بە "سەحیح"ی داناوە.

دوعاکەی قبوڵ کرد و دینەکەی خۆی پێ بە عیززەت کرد، وەك ئاشکرایە لە ژیاننامەکەی ، هەر ئەوەشە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود لەبارەیەوە دەڵێت: "لەوەتەی عومەر موسڵمان بووە، ئێمە بە عیززەت ماوینەتەوە"[1].

**لە دوای مردنی مامی، کاتێك بەڵا و نەهامەتییەکان لەلایەن قوڕەیشەوە لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ زیادی کرد،** بۆ شاری تائیف ڕۆیشت، بەڵکو بیگرنە خۆی و لەسەر قەومەکەی سەریخەن و بیپارێزن هەتاوەکو پەیامی خوای گەورە بڵاو دەکاتەوە.

ئەوانی بۆ لای خوای گەورە ﷻ بانگهێشتی کرد، هیچ کەسێکی لەوان نەبینی پشتیوانی بکات و سەرییبخات، بەڵکو بەتوندترین شێوە ئازاریان دا، ئەوەی قەومەکەی لەگەڵیان نەکردبوو، ئەوان لەگەڵیان کرد، دە ڕۆژ لەلایەن مایەوە، کەسێك نەما لە گەورە پیاوانی تائیف قسەی لەگەڵ نەکات[2].

ئەمەش بۆ ئەوەیە، چونکە ئەگەر گەورە پیاوان و پیاوماقوڵان وەڵامی بانگەوازەکەی بدەنەوە، لە دوای وان داروودەستە و خەڵکەکەشیان بە هەمان شێوە وەڵامی بانگەوازەکە دەدەنەوە. هەر لەو نمونانە: **بانگهێشتی توفەیلی کوڕی عەمری دۆسی** کرد، کە لە گەورە پیاوانی قەومەکی بوو.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەڵێت: دەنگوباس بڵاوبویەوە کە توفەیلی کوڕی عەمری دۆسی هاتۆتە مەککە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە مەککە بوو.

پیاوانی قوڕەیش چوونە لای -توفەیل پیاوێکی گەورە و شاعیرێکی زانا بوو- پێیان گوت: ئەی توفەیل تۆ هاتوویتە شارەکەمان، ئەم پیاوەش کە لەناوماندایە، بەڕاستی بێزاری کردووین، کۆمەڵی ئێمەی پەرتەوازە کردووە، کاروبارمانی تێکداوە، قسەکانی وەك سیحر وایە نێوانی باوك و کوڕ، نێوانی برایان، نێوان پیاو و خێزانەکەی تێك دەدا، دەترسین لە تۆ و قەومەکەت، گەر هاتەلات نەقسەی لەگەڵ بکە نە گوێی بۆ بگرە.

گوتی: سوێند بەخوا هێندە لەبن گوێیان خوێندم تا بڕیارم دا قسەیەك چییە لەو گوێم لێ نەبێت، هیچ قسەیەکیشی لەگەڵ نەکەم، کاتێك چوومە مزگەوت پارچە لۆکەیەکم خستە ناو گوێم، نەوەکو قسەیەکی ئەو بێتە ناوگوێم، نامەوێت گوێم لێی بێت.

دەڵێت: چوومە مزگەوت، بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاوە و نوێژ لە نزیك کەعبە دەکات، لێی نزیك بوومەوە، خوای گەورە ویستی گوێم لە هەندێك قسەکانی بێت.

---

[1] بوخاری (٣٨٦٣)، سەیری (الصحيحة ١٣/٢٨) بکە.
[2] زاد المعاد (٢٨/٣).

گوێم لە قسەیەکی جوان بوو، بە خۆمم گوت: دایکم بمرێت، سوێند بەخوا من پیاوێکی شاعیری زیرەکم، شتی جوان و ناشرین لام شاراوە نییە، ئەوە رێگریم لێ ناکات گوێ لەو پیاوە بگرم بزانم چی دەڵێت، گەر قسەی جوان بڵێت لێی وەردەگرم، گەر قسەی ناشرین بڵێت وازی لێ دەهێنم.

چاوەڕێم تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ چووە ماڵەوە، بەدوای کەوتم، کە چووە ژوورەوە، چوومە لای.

گوتم: ئەی موحەممەد، قەومەکەت قسەی وا و وایان پێ گوتوومە، سوێند بەخوا هێندە منیان ترساند لە تۆ تا بە پارچە لۆکەیەك گوێیەکانم گرت، بۆ ئەوەی گوێم لێت نەبێت، بەڵام خوا ویستی قسەکانت ببیستم، گوێم لە قسیەکی جوان بوو، کاری خۆتم پێ بڵێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئیسلامی پێ گوت، قورئانی بەسەردا خوێند، دەڵێت: سوێند بەخوا هەرگیز گوێم لە قسەیەك نەبووە لەمە جوانتر بێت، هیچ کارێکم نەبیستووە لە ئیسلام دادپەروەرتر بێت.

موسڵمان بووم و شادەی بە حەقم هێنا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا من کەسێکم، قەومەکەم گوێڕاڵیم دەکەن، ئەوا من دەگەڕێمەوە ناویان و بۆ ئیسلام بانگهێشتیان دەکەم، دوعا لە خوا بکا نیشانەیەکم پێ بدات بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات تا بتوانم بانگهێشتیان بکەم.

فەرمووی: **"خوایە گیان نیشانەیەکی پێ بدە"**.

گەڕامەوە بۆ قەومەکەم، تا گەیشتمە (الثنیة [1])، خەڵکەکە کۆببوونەوە لێی، ڕووناکییەك وەك چرا لەنێوان چاوەکانم دروست بوو. گوتم: خوایەگەیان ئەم ڕووناکییە بکەرە شوێنێکی تر جگە لە دەموچاوم، چونکە ترسام خەڵکەکە بڵێت ئەمە نیشانەیەکە لە دەموچاوی دروست بووە چونکە وازی لە دینی خۆی هێناوە.

نوورەکە هاتە سەری قامچیەکەم.

خەڵکەکە ئەم نوورەیان دەبینی کە وەك چرایەکی هەڵواسراو لە قامچیەکەم دیاربوو، منیش بۆلایان دابەزیم، تا چوومە ناویان.

کاتێك دابەزیمە لایان، باوکم هات، پیاوێکی بەتەمەن بوو، گوتم: لێی دوورکەوە باوکە، من لە تۆ نیم و تۆش لە من نی.

گوتی: بۆچی ئەی کوڕەکەم؟

---

[1] الثنیة: ڕێگای شاخ.

گوتم: موسڵمان بووم و چوومە سەر ئاینی موحەممەد ﷺ .

گوتی: ئەی کوڕەکەم، ئاینی تۆ ئاینی منیشە.

گوتم: بڕۆ خۆت بشۆ، جلەکانت پاك کەرەوە، ئینجا وەرە ئەوەی فێری بووم فێرت دەکەم.

چوو خۆی شۆرد و جلەکانی پاك کردەوە، ئیسلامم بۆ باس کرد، ئەویش موسڵمان بوو.

پاشان خێزانەکەم هات، پێم گوت: لێم دوورکەرەوە، من لە تۆ نیم و تۆش لە من نی.

گوتی: بۆچی، بەدایك و باوکەوە بە قوربانت بم.

گوتم: بوومەتە موسڵمان و چوومەتە سەر ئاینی موحەممەد ﷺ .

ئەویش گوتی: ئاینی تۆ ئاینی منیشە.

پێم گوت: بڕۆ خۆت بشۆ و جلەکانت پاك کەرەوە.

خۆی شۆرد و جلەکانی پاك کردەوە، ئیسلامم بۆ باس کرد، ئەویش موسڵمان بوو.

لە دواتردا بانگهێشتی قەومی (دەوسم) کرد بۆ ئیسلام، بەڵام خۆیان گنخاند.

پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە و پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، زیناکردن زاڵ بووە بەسەر دەوسدا، دوعایان بۆبکە .

فەرمووی: **"خوای گەیان هیدایەتی دەوس بدەی، بڕۆ ناو قومەکەت بانگیان بکە و لەگەڵیان نەرمونیان بە"**.

دەڵێت: هەر لە زەوی دەوس مامەوە و بانگهێشتی ئیسلامم دەکردن، تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینە کۆچی کرد، شەری بەدر و ئوحد و خەندەقیش تێپەڕی.

ئینجا خۆم و لەگەڵ ئەوانەی موسڵمان بووبوون لە قەومەکەم چووینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو کات پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر بوو، تا گەیشتمە مەدینە بەنزیکەی حەفتا یان هەشتا ماڵ لە خەڵکی دەوس.

دواتر خۆمان گەیاندە پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەیبەر، وەکو موسڵمانان بەشی ئێمەی دا لە دەسکەوتی جەنگ.

تا ئەو کاتەی خوای گەورە مەککەی بۆ فەتح کردین، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بمنێرە بۆ (ذي الكفين) کە بتی عەمرِی کوڕِ حیممەی لێیە بۆ ئەوەی بیسوتێنم.

توفەیل چووە شوێنەکە، ئاگری لەسەر کردەوە و دەیگوت:

يا ذا الكفين لست من عبادكَ    ميـلادي أقدم مـن مـيلادكَ

إني حشـوت النار في فؤادكَ

واتە: ئەی (ذا الكفين) من بەندەی تۆ نیم لەدایکبوونم کۆنترە لە هی تۆ من ئاگرم بەردایە دڵەکەت

ئینجا گەڕایەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، هەر لە مەدینە لەگەڵی مایەوە تا پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد [١].

## بانگهێشتکردنی پادشاکانی جیهان:

چونکە گەر پادشاکان موسڵمان بن، بێگومان لە دوای ئەوان دارودەستە و خەڵکەکەشیان موسڵمان دەبن.

لە کۆتاییەکانی ساڵی شەشەمی کۆچی، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە حودەیبییە گەڕایەوە، چەند نامەیەکی بۆ پادشاکان نوسی و تیایدا بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلامی [٢].

ئیبن هیشام دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند هاوەڵێکی خۆی وەك پەیامبەر ناردن، لەگەڵیاندا نامەی نوسراوی پێدان، تیایاندا بانگهێشتی ئیسلامی دەکردن.

دوحیەی کوڕی خەلیفەی کەلبی بۆ قەیسەڕی پادشای ڕۆم نارد.

عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی سەهمی بۆ کیسرای پادشای ڕۆم نارد.

عومەری کوڕی ئومەییەی زەمری بۆ نەجاشی پادشای حەبەش نارد.

حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە بۆ مقەوقیسی پادشای میسڕ نارد.... [٣]

لە چیرۆکی ئەبو سوفیان لەگەڵ هیرەقلی گەورەی ڕۆمدا هاتووە، هیرەقل بە ئەبو سوفیانی گوت: گەر ئەوەی تۆ دەیڵێی ڕاست بێت، بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە، من پێشتر زانیبووم ئەو هاتووە، بەڵام نەمدەزانی لە ئێوەیە، گەر من بزانم کە دڵسۆز دەبم بۆیی حەزم دەکرد ببینم، گەر لەلاشی بام پێیەکانیم دەشۆرد، دەسەڵاتی دەگاتە ئەو زەویەی لە ژێر پێم دایە.

گوتی: پاشان نوسراوەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ هێنا و خوێندیەوە:

---

[١] البيهقي له (دلائل النبوة ٥/٤٦٠) گێڕاوەتیەوە، وقال ابن كثير: هكذا ذكر محمد بن سحاق قصة الطفيل بن عمرو مرسلة بلا إسناد، ولخبره شاهد في الحديث الصحيح. السيرة النبوية لابن كثير (٢/٧٦).

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: توفەیلی کوڕی عەمری دەوسی و هاوەڵەکانی هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، خەڵکی دەوس یاخی و سەرکێش بووە، دوعایان لێ بکە، خەڵکەکە گوتیان تەواو دەوس لەناوچوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوایە گیان هیدایەتی دەوس بدەی و بیان هێنیتە لام"**.بوخاری (٢٩٧٣) و موسلیم (٢٥٢٤) گێڕاوەتیانەوە.

[٢] الرحيق المختوم (لا ٣٢٠).

[٣] السيرة النبوية (٢/٦٠٧) ابن هيشام.

**(بسم الله الرحمن الرحیم، لە موحەممەدی پێغەمبەری خوا بۆ هیرەقل گەورەی رۆم، سەلام لەو کەسەی بە دوای هیدایەت کەوتووە.**

**من بە بانگەوازی ئیسلام بانگهێشتت دەکەم، موسڵمان بە سەلامەت دەبیت، خوای گەورە دووجار پاداشتت دەداتەوە، گەر پشتی تێبکەیت ئەوا گوناهی ئەریسیەکانت[١] لەسەرە).[٢]**

## دڵخۆش دەبوو بە موسڵمانبوونیان:

ئیبن شەهابی زوهری دەڵێت: دایکی حەکیمی کچی حارسی کوڕی هیشام خێزانی عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل بوو، لە ساڵی رزگارکردنی مەککە موسڵمان بوو، هاوسەرەکەی عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل لەبەر ئیسلام هەڵات تاوەکو گەیشتە یەمەن.

دایکی حەکیمیش کۆچی کرد تاوەکو چووە یەمەن، بانگهێشتی هاوسەرەکەی کرد بۆ ئیسلام.

ئەویش موسڵمان بوو، هەر لەساڵی رزگارکردنی مەککە هاتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی، لە خۆشیان بە پەلە بۆلای چوو، عەباشی پێوەنەبوو، ئەویش بەیعەتی پێدا[٣].

باجی دەڵێت: کە دەڵێت (کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بینی لە خۆشیان بە پەلە بۆلای چووە، عەباشی پێوەنەبوو) ئەمە لە سووربوونی پێغەمبەرە ﷺ بۆ هاتنەناوەی خەڵك بۆ ئیسلام، .. بەتایبەت ئەگەر لە کەسانی خاوەن پلە و پایە بن، لە نمونەی عیکریمە لەناو قەومەکەی هەیبوو، چونکە لە گەورە پیاوانی هۆزی مەخزوم و سەرکردەیان بوو[٤].

هەروەها دڵخۆشبوو بە موسڵمانبوونی عەدی کوڕی حاتەمی تائی، کە گەورەی هۆزی (طَيء) بوو دوای مردنی باوکی.

عەدی کوڕی حاتەم ﷺ دەڵێت: هیچ کەسێك لەناو عەرەب نەبوو هێندەی من رقی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بێتەوە کاتێك گوێم لە ناوی دەبوو.

---

[١] واتای ئەریسییەکان: دەگوترێت (جوتیارن یان خەڵکی عەوامن) واتە تۆ بویتە رێگر لە گەیشتنی خێر بۆ ئەو کۆمەڵەیە، یاخود دەگوترێت پەیڕەوانی کەسێکن بەناوی (ئاریوس)، کە ئەنساری عیسان و یەکتاپەرستن.. سەرچاوە: واڵی د. عوسمان الخمیس لە یوتیوب: (معنى إثم الأريسيين؟). (و).

[٢] بوخاری (٧) و موسلیم (١٧٧٣) لە ابن عباسەوە ﷺ گێڕاوەتیانەوە.

[٣] مالك لە موطأ (١١٥٦) و عبدالرزاق لە المصنف (١٢٦٤٦) گێراوەتیەوە، نەوەوی دەڵێت (روي مرسلاً، ويجوز الاحتجاج به لشواهده).

[٤] المنتقى شرح الموطأ (٣/٣٤٦).

مـن پیـاوێکی مـاقولْ بـووم و مەسـیحی بـووم، لـە قەومەکـەی خـۆم (المربـاع [1])م وەردەگرت. من لەناو دڵی خۆم لەسەری دینێك بووم و پاشای قەومەکەشم بووم.

کاتێك گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، رقم لێ بووە، بـە غوڵامەکـەی خـۆمم گـوت کـە شوانی وشترەکانیشم بوو: کوڕە گوێبگرە، چ وشتری قەڵە و باش هەیە بـۆ بـارکردن لـەناو وشترەکانم بۆ ئامادە بکە، لـە نزیـك خۆمیـان دابـنێ، هـەر کاتێك گوێـت لـێ بـوو سوپای موحەممەد هات، ئاگادارم بکەرەوە.

ئەویش بۆی ئامادەکرد.

رۆژێکیان بەرەبەیان بوو، هاتەلام و گوتی: ئـەی عـەدی ئـەوەی کردووتـە بـۆ ئـەو رۆژە بیکەن، من چەند ئاڵایەکم بینی، پرسیم ئەوانە کێنە، گوتیان سوپای موحەممەدە.

گوتم: وشترەکانم بۆ نزیك بکەرەوە، بـۆی هێنـام، خـۆم و کەسـوکار و کوڕەکـەم سـوار بووین.

پاشان گوتم: دەچم لە شام خۆم دەگەینمە هەواداری ئاینەکەم و لەلایان نیشتەجێ دەبم.

کچێکی حاتەم بەجێما.

سـوارەکانی پێغەمبــەری خــوا ﷺ بـەدوام کـەوتن، کچـی حاتــەمیان گـرت، لەگـەڵ بەدیلگیراوانی تائی بردیانە لای پێغەمبەری خوا.

هەواڵی رۆیشتنی من بۆ شام گەیتشبووە لای پێغەمبەری خوا.

کچــی حاتــەمیان لــەناو حەســارێك [2] دانــا، کــە لەبــەر دەرگــای مزگــەوت بــوو بەدیلگیراوەکانیان تێدەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایدا تێپەڕی، ئـەویش بـۆی هەڵسـا، ئافرەتێك بوو خاوەن ڕەوشتێکی بەرز و قسەزان بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خـوا، بـاوکم مرد، براکەم بزر بوو، منـیش پیرێکـی پەککەوتـەم، هـیچ خزمـەتێکم پـێ ناکرێـت، چـاکەم لەگەڵ بکە، خوای گەورە چاکەت لەگەڵ بکات.

فەرمووی: **"براکەت کێیە؟"**.

گوتی: عەدی کوڕی حاتەم.

فەرمووی: **" لەبەر خوا و پێغەمبەرەکەی هەڵات ؟"**.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕویشت و جێیهێشتم.

---

[1] المرباع: چواریەکی غەنیمەتە، کە گەورەپیاوانی سەردەمی نەفامی لە خەڵکیان وەردەگرت. سەیری (النهایة ١٨٦/٢) بکە.

[2] حەساری دورستکراو لە دار، بۆ پاراستن لە سەرما و گەرما و با. سەیری (النهایە: ٢٧٠/١) بکە.

بەیانی هاتەوە، دیسان بەلامدا تێپەڕی، هەمان قسەی دوێنێم کردەوە، ئەویش هەمان وەڵامی دامەوە.

بۆ رۆژی دواتریش بەلامدا تێپەڕی، منیش لێی نائومێد بووبوم، پیاوێك لە دوای بوو ئاماژەیەکی بۆ کردم کە لەبەری هەڵسم و قسەی لەگەڵ بکەم، منیش هەڵسام و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، باوکم مرد، براکەم بزربوو، چاکەم لەگەڵ بکە، خوای گەورە چاکەت لەگەڵ بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەوا وام کرد، بەڵام بۆ دەرچوون پەلە مەکە، تا کەسێکی جێگەی متمانە لە قەومەکەت دەبینیەوە، بۆئەوەی بتگەیەنێتەوە وڵاتی خۆت، پاشان ئاگادارم بکەرەوە"**.

پرسیاری ئەو پیاوەم کرد، کە پێشتر ئاماژەی پێدا بۆ ئەوەی داوا لە پێغەمبەری خوا بکەم، گوتیان:عەلی کوری ئەبوتاڵی بوو ﷺ.

مامەوە تا کاروانێك لە (قەزاعە)ـەوە هات، چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوا کاروانێك لە قەومەکەی من هاتوون، لەلای منەوە جێگای متمانە و بڕوان.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەرگێك دایپۆشیم، سواری پشتی وڵاخی کردم، مەسرەفیشی پێدام.

لەگەڵیان رۆیشتم تا گەیشتمە شام.

عەدی دەڵێت: سوێند بەخوا من لەناو کەس و کاری خۆم دانیشتبووم، کاتێك سەیری کەژاوەیەکم کرد بۆلای ئێمە دەهات، گوتم: ئەوە کچی حاتمە، خۆیەتی خۆیەتی.

کاتێك وەستا، بە خێرایی بەسەرمدا گوتی: رێگر، ستەمکار، خۆت و منداڵەکانت رۆیشتی، پاشماوەی باوکیشت بەجێهێشت.

منیش گوتم: ئەی خوشکم، قسەی خێر بکە، سوێند بەخوا بیانوویەکم نییە، ڕاستە ئەوەم کرد کە دەیڵێی.

ئینجا دابەزی و لەلام دانیشت، ئافرەتێکی دووربین بوو، پێم گوت: چ دەبینی لە کاروباری ئەم پیاوە؟

گوتی: سوێند بەخوا دەبێت زوو پێی بگەی، گەر ئەم پیاوە پێغەمبەر بێت، ئەو کەسەی زوو پێی دەگات خاوەن چاکە و فەزڵە، گەر پادشاش بێت، هیچ کەسێکی خاوەن عیزەت لەلای زەلیل نابێت، تۆش هەر خۆتی[1].

---

[1] ئەم قسەیەی وەك هاندانێك کرد بۆ ئەوەی بچێتە لای پێغەمبەر ﷺ چونکە ئەو موسڵمان بوو بوو.

گوتم: سوێند بەخوا ئەمە رایەکی جوانە.

دەرچووم تا لە مەدینە گەیشتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەو لە مزگەوت بوو چوومە خزمەتی و سەلامم لێکرد، خەڵکەکە گوتیان: ئەمە عەدی کوڕی حاتەمە.

بێ پاسەوان و نوسراو هاتبووم.

کاتێك لێی نزیك بوومەوە دەستی گرتم، پێشتر گوتبووی: خۆزگە دەخوازم خوای گەورە دەستم بخاتە ناو دەستی. پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و منی لەگەڵ خۆی بردەوە ماڵەوە.

سوێند بەخوا منی لەگەڵ خۆی برد، کاتێك لە رێگا ئافرەتێکی پیری بێهێز رای گرت، بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵی وەستا لەبارەی داواکەی قسەی لەگەڵ کرد.

لە دڵی خۆمدا گوتم: سوێند بەخوا ئەمە پادشا نییە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ منی لەگەڵ خۆی برد، تا بردمیە ماڵەکەی، بالیفێکی گرت و بۆی هاویشتم و فەرمووی: "**لەسەر ئەمە دابنیشە**".

گوتم: بەڵکو تۆ لەسەری دابنیشە.

فەرمووی: "**بەڵکو تۆ**".

لەسەری دانیشتم، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر زەوی دانیشت.

لە دڵی خۆمدا گوتم: سوێند بە خوا ئەمە کاری پادشایان نییە.

پاشان فەرمووی: "**ئەی عەدی کوڕی حاتەم، موسڵمان بە، سەلامەت دەبیت**".

گوتم: من ئاینێکی ترم هەیە.

فەرمووی: "**ئەی عەدی کوڕی حاتەم، موسڵمان بە، سەلامەت دەبیت**".

گوتم: من ئاینێکی ترم هەیە.

فەرمووی: "**من لە تۆ شارەزاترم بە ئاینەکەت**".

گوتم: تۆ لە من شارەزارتی بە ئاینم؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

پاشان فەرمووی: "**ئێی.. ئەی عەدی کوڕی حاتەم، ئایا تۆ لە جەماعەتی رکوسیەکان نیت**[1]".

گوتم: بەڵێ.

فەرمووی: "**ئایا تۆ چواریەکی غەنیمەت لە قەومەکەت وەرناگریت؟**".

گوتم: بەڵێ.

---

[1] مەبەست لێی گروپێکی ئاینی مەسحییە.

فەرمووی: **"بەڵام ئەمە لە ئاینەکەی تۆ دا حەلاڵ نییە"**

گوتم: بە خوا راستە.. ئینجا زانیم کە پێغەمبەری نێردراوە، ئەوەی من خۆمی لێ نەزان دەکەم ئەو دەیزانێت.

عەدی دەڵێت: لەو کاتەی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، پیاوێك هاتە لای، سکاڵای هەژاری و نەداری کرد، پاشان یەکێکی تر هات سکاڵای نەبوونی مەسرەفی رێگای گەڕانەوەی کرد.

پاشان فەرمووی: **"عەدی لەوانەیە تۆ ئەوەی دەیبینی لە هەژاری خەڵکی ئەم ئایینە رێگریت لێ بکات لە چوونە ناوی، سوێند بە خوا، وایلێدێت ماڵ و سامانیان بەسەردا دەبارێت، تا کەسێك نامێنێت پارە وەربگرێت.**

**یاخود لەوانەیە زۆری دوژمنی ئەم ئایینە رێگریت لێ بکات لەچوونە ناوی، یان کەمی ژمارەی موسڵمانان، سوێند بەخوا وایلێدێت گوێت لێ دەبێت ئافرەت لە قادسیە دەردەچێت بە وشترەکەی خۆی سەردانی ئەم بەیتە دەکات بێ ئەوەی بترسێت** ".

لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەی رێگر و پیاوخراپانی (تائی) ئەو کات لە کوێن، کە خراپەکاریان لە هەموو وڵات بڵاوبۆتەوە؟

فەرمووی: **"یاخود لەوانەشە ئەمەش رێگریت لێ بکات کە دەبینی پادشا و سوڵتانەکان لەم ئاینیەدا نین، سوێند بەخوا گوێ لێ دەبێت کە کۆشکە سپییەکان لە زەوی بابل بەسەر ئەم ئاینەدا دەکرێتەوە"**.

دەڵێت: ئینجا موسڵمان بووم، دەموچاوی گەشایەوە.

عەدی دەڵێت: بینیم حاجی لە (حیرە) بۆ تەوافکردن دەچێتە (کەعبە) لە غەیری خوا نەبێت لە کەس ناترسێت، من لەوانەبووم کە گەنجینەکانی کسرای کوڕی هورمزمان فەتح کرد، گەر تەمەن درێژبایە ئەوەی ئەبولقاسم ﷺ باسی کردووە بە چاوەکانتان دەیبینن، سوێند بە خوا هی سێهەمیش دێت: ماڵ و سامان بەسەریاندا دەبارێت تاوەکو کەسێك نامێنێت وەری بگرێت [1].

---

[1] السيرة النبويه ابن هشام (٢/٥٨٠)، ابن كثير دەڵێت: ابن اسحاق بەم شێوەیە گێراوەتیەوە بێ ئیسناد و بێ شاهێد، الطبراني في المعجم الاوسط (٦/٣٥٩) بە سەنەدەوە گێراوەتیەوە، هەندێکی لە موسنەدی ئەحمەد (١٩٤٠٠) هاتەوە، الهيثمي لە مجمع الزوائد (٦/٣٠٦) دەڵێت: (پیاوەکانی هەموو دروستن، جگە لە عباد کوڕی حەبیش نەبێت، کە جێگای بروایە)، ئەحمد شاکر بە "سەحیح"ی داناوە، السهيلی دەڵێت (فەرموودەی موسڵمانبوونی عودەی کوڕی حاتەم سەحیحە سەیری الروض الأنف بکە (٧/٤٧٧).

## پێغەمبەر ڕێزی دەگرتن و پێشوازی لێدەکردن و گرنگی پێ دەدان

لە میسوەری کوڕی مەخرەمەوە ﷺ دەفەرموێت: (مەخرەمەی) باوکم پێ گوتم: کوڕم زانیوومە پێغەمبەر ﷺ پۆشاکی (أقبیە)[1]ی بۆ هاتووە و دابەشی دەکات، با بچینە لای.

چوین، پێغەمبەرمان ﷺ لەماڵەوە بینی.

باوکم پێی گوتم: کوڕم بانگی پێغەمبەرم ﷺ بۆ بکە.

ئەو کارەم پێ قورس بوو، گوتم بۆت بانگی پێغەمبەر ﷺ بکەم؟

گوتی: کوڕم خۆ ئەو کەسێکی زۆردار نییە.

بانگم کرد، هاتە دەرەوە، ئەو پۆشاکەی لەسەربوو کە لە حەریری ئاوزێڕ دروستکرابوو. فەرمووی: **"ئەی مەخرەمە ئەوەمان بۆتۆ شاردبۆوە"** جا پێیدا[2].

لە دەقی فەرموودەکەدا **"علیه قباء من دیباج[3]"** هاتووە. ئیبن حەجر دەفەرموێت دیارە حەریر بەکارهاتووە". دەگوترێ ئاساییە، چونکە دەکرێ پێش حەرامکردنی بێ، پێش دەچێ مەبەست لێی ئەوەبووە کە لەسەر شانی داینـاوە بۆ ئـەوەی مەخرەمە بی بینێت نەوەك لەبەری کردبێت.

دەڵێم: مەرج نییە مانایەکەی تەنیا لەسەر شان بۆ لێکبدرێتەوە، بەڵکو دەکرێ لێکبدرێتەوە بەوەی لەسەر دەستەکانی ڕایخستوە، وتەی "علیه" ش ئەو کات ئەو مانایە دەبەخشێت[4] لە ریوایەتی حاتەمدا هاتووە: " بە (قوبائەوە) هاتە دەرەوە، جا جوانییەکەی نیشاندا.

فەرمایشتی ﷺ **"ئەمەم بۆ شاردبۆوە"** ئەوە لە ڕوانگەی خۆشەویستی و هاوڕێیەتی بووە[5].

ئیبن **بطال** دەڵێت "ڕووخۆشی و لاواندنـەوە لـە ڕەوشـتی باوەڕدارانـە، کـە بریتییـە لـە باڵڕاخستن و نەرمینواندان و وازهێنان لە قسەی ڕەق بەرامبەر خەڵکی، ئەمەش بـەهێزترین هۆکارە بۆ خۆشەویستی و فڕێدانی ڕق و کینە"[6].

---

[1] (أقبیة) کۆیە، تاکەکەی (قباء)یە مەبەست لەو پۆشاکەیە کە لەسەر کراس و جلوبەرگی سەرەوە لەبەردەکری و لەناوەڕاست دەبەسترێتەوە. (و)

[2] بوخاری (٣٨٦٥) و موسلیم ریوایەتیان کردووە (١٠٥٨).

[3] دیباج واتە پۆشاکی دروستکراو لە حەریر.

[4] فتح الباری (١٠/٢٧٠)

[5] شەرحی نەوەوەی بۆ سەحیحی موسلیم (٧/١٤٨).

[6] شەرحی سەحیحی بوخاری بۆ ئیبن بطال (٩/٢٠٥)

لە فەرموودەکەدا هاتووە، پێغەمبەر ﷺ بێ فیز و نەرم و بەخشندە بوو بەرامبەر هاوەڵانی [1].

## هەروەها: باش گوێگرتنی پێغەمبەر ﷺ بۆ قسەکانیان

موحەمەدی کوڕی کەعبی القرظي دەڵێت: عوتەبی کوڕی رەبیعە کە گەورەی هۆزەکەی بوو، دەگێڕێتەوە رۆژێکیان لە یانەی قورەیش دانیشتبوو پێغەمبەریش ﷺ بەتەنیا لە مزگەوت دانیشتبوو. گوتی: ئەی خەڵکی قورەیش، ئایا هەڵبستم و بچم بۆلای موحەمەد و قسەی لەگەڵ بکەم، هەندێك شتی بخەمە بەردەست هەرچی بیەوێت دەیدەینێ و بەڵکو رازی بێت و وەری گرێت و وازمان لێ بێنیت؟

ئەمە لە کاتێکدا بوو، کە حەمزە موسڵمان ببوو، دەیان بینی ژمارەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەر زیاد دەبن.

گوتیان: بەڵێ ئەی ئەبو وەلید، برۆ بۆ لای و قسەی لەگەڵ بکە.

عوتبە هەڵسا، تا لای پێغەمبەر ﷺ دانیشت.

پێی گوت: ئەی کوڕی برام، تۆ دەزانی کە لەلای ئێمە و لەناو بنەماڵە و رەچەڵەکدا خاوەن شەرەف و پێگەیت، بەراستی تۆ شتێکی گەورەت هێناوەتە ناو نەتەوەکەی خۆت، کۆبوونەوەیانت پەرتەوازە کرد، خەونەکانیانت شێواند، خوا و دینەکانیانت عەیبدار کرد، باو باپیرانیشیانت بە کافر دانا.

گوێ بگرە من هەندێك شتت دەخەمە بەردەستت و بیریان لێ بکەرەوە، بەڵکو هەندێکیان وەربگری.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو **"بڵێ ئەی باوکی وەلید، گوێم لێتە"**

گوتی: کوڕی براکەم، ئەگەر تۆ بەم کارەت دەتەوێ پارە و سامانت دەستکەوێ، ئەوا بۆت کۆدەکەینەوە بە جۆرێك واتلێدەکەین لەهەمووومان ماڵت زیاتر دەبێت.

ئەگەر تۆ سەرۆکایەتی و گەورەییت دەوێ، ئەوا دەتکەینە گەورەمان، بە جۆرێك هیچ کارێك بێ تۆ ناکەین.

گەر موڵکیشیت دەوێت، ئەوا لەسەر خۆمان دەتکەینە خاوەن موڵك.

ئەگەر ئەوەی هێناوەتە پێت وایە (رەئیە) [1] و واتە جنۆکەیە و ناتوانی لە خۆتی دووربخەیتەوە، ئەوا پزیشکت بۆ بانگ دەکەین و ماڵ و پارەت لە پێناو سەرف دەکەین تا

---

[1] فتح الباری (١٠/٣١٥)

چاك دەبێتەوە، چونکە لەوانەیە مرۆڤ زۆرجار شوێنکەوتنی خۆی بەسەریدا زاڵ بێت تا چارەسەر وەرنەگرێت چاك نابێت.

عوتبە تا لە قسەکانی تەواو بوو پێغەمبەر ﷺ گوێ لێگرتبوو، فەرمووی **"ئایا تەواو بووی باوکی وەلید؟"**

گوتی: بەڵێ

فەرمووی: **"گوێم لێ بگرە"**.

گوتی: وا دەکەم.

فەرمووی: ﴿حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ﴾ فصلت: ١-٦

تەفسیری ئایەتەکە: حم * ئەم قورئانە دابەزێنراوە لەلایەن پەروەردگاری خاوەن بەزەیی و میهرەبانەوە * کتێبێکە" ئایەت و فەرمانەکانی بەش کراوە و جیاکراوەتەوە قورئانێکە بە عەرەبیەکی رەوان بۆ کەسانێك کە دەیزانن و شارەزاییان هەیە * هەر ئەم قورئانە مژدەبەخشە بەئیمانداران، ترسێنەری کافرانە، کەچی زۆربەی موشریکان پشتیان تێکرد و بەرهەڵستیان کردو نایبیستن.* وتیشیان: ئێمە دڵەکانمان داپۆشراوە لە ئاستی ئەم بەرنامەیەدا کە تۆ بانگی ئێمە دەکەیت بۆ لای، گوێشمان کەڕو قورسە لە ئاستیدا، لە نێوان ئێمە و تۆدا پەردە و بەربەست هەیە، تۆ هەوڵ و کۆششی خۆت بدە، بێگومان ئێمەش هەوڵ و کۆششی خۆمان دەدەین. * ئەی پێغەمبەر پێیان بڵێ: دڵنیابن کە من هەر بەشەرێکم وەك ئێوە، (جیاوازیەکە تەنها ئەوەیە): من وەحی ونیگام بۆ دەکرێت کە بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاك و تەنهایە، کەوابوو ئێوەش رووی تێ بکەن، بەڕاستی بیپەرستن " لە رێبازەکەی لامەدەن، داوای لێخۆشبوونی لێبکەن و چاك بزانن کە وەیل و سزای سەخت بۆ موشریك و هاوەڵگەران ئامادەیە".

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری خوێندەوە.

عوتبە گوێی بۆ شل کردبوو، دەستەکانی خستبووە پشتەوەو گوێ بۆ دەگرت.

---

(١) رئی: بە پەری (جنۆکەیەك) دەگوترێت.. گوایە غەیب پیشانی مرۆڤ دەدات، یاخود فێرە شیعری دەکات... (معجم الوسیط)

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ تا گەیشتەی ئایەتی (سەجدە) تەواوی کرد، سوژدەی برد.

عوتبە گەڕایەوە ناو هاوەڵەکانی، لەنێوان خۆیان دەیانگوت، سوێند بەخوا عوتبە بە ڕوویەك گەڕاوەتەوە کە ئەو ڕووە نەبوو پێی بوو.

کاتێك لایان دانیشت، گوتیان: ها باوکی وەلید چی بوو؟

گوتی: بەڕاستی من گوێم لە قسەیەك بوو، کە هەرگیز گوێم لێی نەبووە، سوێند بەخوا نە شیعر بوو نە جادوو بوو، ئەی خەڵکی قورەیش بە قسەی من بکەن، لەم پیاوە بگەڕێن، وەڵاهی لە وتەکانی ئەو کە گوێم لێ بوو هەواڵێکی گەورە هەیە، گەر عەرەب لەناویان برد ئەوا لەناچوونی بە دەستی ئێوە نابێت، ئەگەریش بەسەر عەرەب زاڵبوو، ئەوا موڵکی ئەو هی ئێوەیە، گەورەیی ئەو هی ئێوەیە، ئێوەش دەبنە بەختەوەرترین کەس.

گوتیان: وەڵاهی باوکی وەلید بە زمانەکەی خۆی سیحری لێکردووی.

گوتی: ئەمە رای منە، ئێوەش چیتان پێ باشە بیکەن[1].

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ دەفەرموێت: کاتێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دانیشتبوون، پیاوێك بە حوشترەوە هاتە ژوورەوە، وشترەکەی یخ کردوو پاشان بەستیەوە.

پاشان گوتی: کامەتان موحەممەدە؟ پێغەمبەریش ﷺ لەناویاندا پاڵکەوتبوو.

پێمان گوت: ئەم پیاوە سپییەی پاڵکەوتووە.

پیاوەکە پێی گوت: ئەی کوڕی عەبدولموتەڵیب

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"وا لەبەردەمتدام"**

پیاوەکە بە پێغەمبەری ﷺ گوت: من لەبارەی بابەتێك لەسەر تۆ زۆر توندم و پرسیارت لێ دەکەم.

فەرمووی: **"چیت دەوێت بپرسە"**.

گوتی: سوێندت دەدەم بە خواکەت، بە خوای ئەوانەی پێش تۆن، خوا تۆی بۆ هەموو خەڵکی ڕەوانە کردووە؟

فەرمووی: **"بە پشتیوانی خوا بەڵێ"**.

گوتی: سوێندت دەدەم بە خوا، خوا فەرمانی پێکردووی لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژ بکەین؟

فەرمووی: **"بە پشتیوانی خوا بەڵێ"**.

---

[1] بەیهەقی لە "الدلائل النبوة" گێراوەتیەوە(٢/٢٠٤)

**گوتی:** سوێندت دەدەم بە خوا، خوا فەرمانی پێکردووی لە ساڵێکدا مانگێك بە ڕۆژوو بین؟

فەرمووی: **"بە پشتیوانی خوا بەڵێ"**.

گوتی: سوێندت دەدەم بە خوا، خوا فەرمانی پێکردووی ئەو بەخشینە لە دەوڵەمەندەکانمان وەربگری و بیبەخشیە سەر هەژارانمان.

فەرمووی: **"بە پشتیوانی خوا بەڵێ"**.

پیاوەکە گوتی: ئەوا باوەڕم هێنا بەوەی کە تۆ پێی هاتووی، من نوێنەری هۆزی خۆمم، من ضمامي کوڕی سەعلەبەم برای بەنی سەعدی کوڕی بەکر[1].

**لێی دەبورین، بەرگەی دەگرتن، تەنانەت داوای لێخۆشبوونی بۆ هەڵەکانیان دەکرد:**

پێغەمبەر ﷺ هانیدەدان چاوپۆشی لەو جۆرە کەسانەی ناو موسڵمانان بکەن لەو هەڵانەی کەوتوونەتە ناوی، چونکە هەروەکو گوتراوە: سوار تا نەگلێ نا بێ بە سوار، زاناش تا هەڵە نەکات نابێتە زانا. وەك شاعیر دەڵێت:

**من ذا الذي ترضى سجاياه كلها     كفى المرء نبلاً ان تعد معايبه**

واتە: کێ هەیە خەڵك هەموو ڕەوشتەکانی بە دڵ بێت

بەسە گەورەیی بۆ مرۆڤ کە عەیبەکانی خۆی بژمێرێت.

لێخۆشبوون لەو توێژەی ناو کۆمەڵگەی موسڵمانان پەیڕەوێکی پێغەمبەرانەیە، عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموی **"أقيلوا ذوي الهيئات عثراتهم إلا الحدود[2]"**. واتە لە هەڵەی پیاو ماقوڵ و خانەدانان خۆشبن، تەنیا حەدد نەبێ.

**أقيلوا:** واتە لێی خۆشبن

**ذوي الهيئات:** کەسانی خاوەن پیاوەتی و خاوەن خەسڵەتی جوان. ئیبن مالك دەفەرموێت: الهيئە: مەبست لێی ئەو حاڵەتەیە کە مرۆڤ هەندێ خەسڵەتی جوانە کە لەسەریەتی.

**عثراتهم:** واتە هەڵەکانیان.

**إلا الحدود:** تەنیا بەزاندنی سنوری خوا نەبێت ئەوەی وادەکات "حەدد"ی لەسەر دەربکرێت[3].

ئیبن قەیم دەفەرموێت: مەبەست لەوانە ئەو کەسانەن، کە بە هۆی دەسەڵات و پێگە و پایەبەرزیان، لەناو خەڵکی خاوەن ڕێزن، خوای گەورە تایبەتی کردوونە بە ڕێزگرتنیان

---

[1] بوخاری گێراوەتیەوە(٦٦٣)

[2] ئەبو داود گێراوەتەیوە (٤٣٧٥) ئەلبانی لە "صحيح الجامع" ڕاستی کردۆتەوە (١١٨٥)

[3] عون المعبود (١٢/٢٥)

لەسەر قەوم و قیلەیان، ئەوەی لەوانە چاکەکارە و حاڵی داپۆشراوە و ناوبانگی هەیە لە خێر، هەتا سواری گلا بێت و شەیتان فریوی دابێت، ئەوا پەلەناکەین لەسەر زەنشتکردن و سزادانی، بەڵکو چاوپۆشیان لێدەکرێت تەنیا ئەگەر سنوربەزاندنی خوای تێدا بێت، ئەگەر ئەوەی تێدابوو ئەوا چۆن لەسەر شەریفێك جێبەجێ دەکرێت ئەوهاش لەسەر لاوازێك جێبەجێ دەکرێت."[1].

واتەی فەرموودەکە "سونەتە واز لە سزادانی ئەو جۆرە کەسانە بهێنی گەر کەوتنە ناو هەڵەیەك، تەنیا بەزاندنی سنورێك لە سنوورەکانی خوا گەورە نەبێت، ئەگەر گەیشتبێتە حاکم ئەوا واجبە جێبەجێ بکرێت لەسەری"[2].

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە سەعدی کوڕی عوبادەوە دەگێڕێتەوە: فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا پیاوێك، لەگەڵ خێزانەکەی پیاوێکی بینی، ئایا بیکوژێت؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"نەخێر"**

سەعد گوتی: بەڵێ سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕێزدار کردووە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"گوێبگرن لەوەی گەورەکەتان دەیڵێت"**[3]

لە ریوایەتێکی تری موسلیمدا، سەعدی کوڕی عوبادە دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا گەر پیاوێکم لەگەڵ خێزانەکەم بینی، دەستی لێ نەدەم تا چوار شاهێد دەهێنم؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵێ"**

گوتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی توی بەحەق ڕەوانە کردووە، من، پێش ئەمە بە شمشێر چارەسەری دەکەم.

**پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "گوێبگرن لەوەی گەورەکەتان دەیڵێت! بەراستی ئەو بە غیرەتە، منیش لەو بە غیرەتترم، خواش لە من بە بە غیرەتترە".**

قاری دەڵێت: ئەمە جۆرێك لە عوزر هێنانەوەی پێغەمبەرە ﷺ بۆ سەعد، واتە ئەوەی سەعد گوتی لەبەر غیرەت و پیاوەتییەکەی بووە[4].

سەبارەت بە گوتنی (نەخێر، سوێند بەو کەسەی توی بەحەق ڕەوانە کردووە، من پێش ئەمە بە شمشێر چارەسەری دەکەم).

---

[1] بدائع الفوائد (٦٦١/٣) بە دەستکارییەوە

[2] فەتواکانی (اللجنة الدائمة) (٥٦/٢٢)

[3] بوخاری (١٤٩٨) و موسلیم (١٤٩٨) گێراوەتیانەوە

[4] مراقاه المفاتیح (٢١٦٣/٥)

ئەلماوەردی و چەندانی تریش دەڵێن: ئەم قسەیە ڕەتکردنەوەی قسەی پێغەمبەر ﷺ نییە، هەروەها سەرپێچی سەعدیش نییە لە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو واتاکەی بریتییە لە ڕاگەیاندنی حاڵەتی ئەو مرۆڤە کاتێك پیاوێك لای خێزانەکەی دەبینێت، تورەیی دەستی بەسەردادەگرێت، ئەم کات پەنا بۆ شمشێر دەبات گەرچی تاوانیش دەکات[1].

ئەبو دەردا ﷺ دەفەرموێت: لە نێوان ئەبوبەکر و عومەر گفتوگۆیەك هەبوو، ئەبو بەکر عومەری تورەکرد، عومەر بە تورەیی ڕۆیشت.

ئەبوبەکر شوێنی کەوت و داوای کرد لێی خۆش بێت، نەیکرد، تا دەرگای ماڵەوەی بە ڕوویدا داخست.

ئەبو دەردا دەگێڕێتەوە: من لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووم، ئەبوبەکر هات و لایەکی پۆشاکەکەی خۆی هەڵکردبوو، تا چۆکەکانی دەرکەوتن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"هاوەڵەکەتان، تووشی دەمەقالیەك هاتووە"**.

سەلامی کرد، گوتی: لە نێوان من و کوڕی خەتتاب شتێك هەبوو، پەلەم کرد پاشان پەشیمان بوومە، داوام لێکرد لێم خۆش بێت، ڕەتی کردەوە، جا هاتوومەتە لای تۆ..

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر، خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر، خوای گەورە لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر**[2]".

ڕێزی دەگرتن و فەرمانی بە هاوەڵەکانیشی دەکرد ڕێزیان بگرن:

جابری کوڕی عەبدوڵا ﷺ دەفەرموێت: جەریری کوڕی عەبدوڵای بەجەلی (گەورەی هۆزەکەی بوو)، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانیش لەوێ بوون، خەڵکی ڕەزیلیان کرد لە دانیشتنەکەیان و کەس جێگای نەکردەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەسستی دایە جوببەکەی و دایە دەستی و فەرمووی **"لەسەری دانیشتە"**

جەریر وەری گرت و ماچی کرد و لەسەر چاوی خۆی داینا، گوتی: خوا ڕێزت لێ بنێ، وەك چۆن ڕێزت لێنام، پاشان خستییەوە سەر پشتی پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی **"هەر کەسێك بڕوای بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە، گەر کەسێکی بەخشندە و ڕێزداری هۆزێك هاتەلای، با ڕێزی لێبگرێ**[3]".

---

[1] شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم (١٣١/١٠)

[2] بوخاری گێراوەتەوە (٣٦٦١)

[3] الحاکم لە (المستدرك) (٧٧٩١) گێراوەتیەوە، دەڵێت: (الحدیث صحیح)، العراقی دەڵێت: سەنەدەکەی "جید"ـە.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت **"گەر کەسێکی ڕێزدار و بەخشندە هاتە لاتان ڕێزی بگرن"**[1].

**چاکەی لەگەڵ دەکردن، تەنانەت گەر لە کاتی بەدیلگرتنیاندا بوویێت، ئەمەش لە پێناو پاراستنی پێگەیان و حەزکردن لە موسڵمانبوونیان:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرمووێت: پێغەمبەر ﷺ دەستەیەکی ڕەوانەی نەجد کرد، دەستەکە پیاوێکیان لە نەوەی حەنیفە هێنابوو، نەیان دەزانی کێیە، تا هێنایانە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی **"دەزانن ئێوە کێتان هێناوە؟ ئەوە ثمامة کوڕی ئەثالی حەنەفیە (گەورەی خەڵکی یەمامەیە) ئەگەر چی دیلە مامەڵەی باشی لەگەڵ بکەن"**.

لە مزگەوت لەکۆڵەگەیەك لە کۆڵەگەکانی بەستیانەوە.

پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە ماڵەوە فەرمووی **"هەرچی هەتانە لە خواردن ئامادەی بکەن و بۆی بنێرن، فەرمانی کرد حوشترە شیردەرەکەی نیوەڕۆ و ئێواران شیری پێ بدات"**.

ثمامە ئاوڕی لەو شتانە نەدەدایەوە.

پێغەمبەر ﷺ چووە لای و پێی فەرموو **"چیت لایە ئەی ثمامە؟"**

گوتی: ئەی موحەممەد خێرێکم لایە، گەر بمکوژیت، ئەوا کەسێکی خاوەن خوێن دەکوژیت، گەر باشیش بیت، ئەوا لەگەڵ کەسێی سوپاسکەر باش دەبیت، گەر ماڵیشت دەوێت، ئەوا چەندت دەوێت داوای بکە.

پێغەمبەر ﷺ جێی هێشت تا بەیانی، دیسان پێی فەرموو **" چیت لایە ئەی ثمامە؟"**.

ئەویش هەمان وتەی بۆ دووبارە کردەوە.

پێغەمبەر ﷺ جێی هێشت تا ڕۆژی دواتر، دیسان هەمان وتەی ڕۆژی یەکەمی پێ فەرموو، (ثمامە)ش هەمان وتەی بۆ دووبارە کردەوە.

ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"ثمامە ئازاد بکەن"**

ڕۆیشتە دەرەوە تا چووە لای دارخورمایەك و خۆی شوشت، پاشان هاتەوە مزگەوت و گوتی: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده و رسوله.

ئەی موحەممەد، سوێند بەخوا هیچ ڕووێك لەسەر ئەم زەوییە هێندەی ڕووی تۆ لام ناشیرین نەبوو، بەڵام ئێستا ڕووت خۆشەویسترین ڕووە لەلام، هیچ دینێك هێندەی دینەکەی تۆ لام ناشیرین نەبوو، ئێستا دینەکەت خۆشەویسترینە لەلام، هیچ وڵاتێك هێندەی وڵاتی تۆ لای من ناخۆش نەبوو، ئێستا وڵاتەکەت خۆشترینە لە لام.

---

[1] ئیبن ماجە گێڕاوەتەوە (٣٧١٢) ئەلبانی لە سەحیحەکەیدا بە دروستی داناوە (١٢٠٥)

کۆمەڵە سوارەکەی تۆ منیان هێنا، ئێستا من دەمەوێت عەمرە بکەم، چی دەڵێیت؟
پێغەمبەر ﷺ مژدەی پێدا و فەرمانی کرد عەمرە بکات.
کاتێك گەیشتە مەککە، کەسێك پێی گوت: کافر بووی بە دینی باوباپیرانت؟
گوتی: نەخێر، بەڵکو باوەڕم بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، نەخێر سوێند بەخوا یەك دەنکە گەنمتان لە یەمامەوە بۆ نایەت، تاکو پێغەمبەر ﷺ فەرمان نەکات [1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- خۆشۆردن لەکاتی هاتنە ناو ئیسلامەوە.
- چاکەکردن ڕق و کینە ناهێڵێت و خۆشەویستی دەچەسپێنێت.
- کەسی بێ باوەڕ گەر ویستی کارێکی خێر بکات، پاشان موسڵمان بوو، ڕێگەی پێ دەدرێ بەردەوام بێت لەسەر کارە خێرەکەی.
- نەرمونیانی لەگەڵ ئەو بەندکراوانەی ئومێدی موسڵمانبوونیان لێ دەکرێت، گەر ئەمە لەبەرژەوەندی ئیسلامدا بوو، بەتایبەت گەر دوای موسڵمانبوونی خەڵکانێکی زۆر دوای بکەون [2].

کاتێك موسڵمان بوو، ئیسلامەتییەکی بە جۆرێکی باش کرد، خوای گەورە لەڕێگای ئەو سوودی بە ئیسلام گەیاند، کاتێك یەمامە دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسیلمە هەڵگەڕانەوە، کارێکی کرد جێگای دەستخۆشی بوو، بەوەی بووە وتاربێژ لەناویان و گوتی:
ئەی نەوەی حەنیفە! عەقڵەکانتان بۆ کوێ ون بووە؟ پاشان سەرەتای سورەتی (فصلت)ی خوێندەوە ﴿ حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢ كِتَٰبٌ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ﴾ فصلت: **١-٣**
ئینجا گوتی: ئەمە لە کوێیە لەگەڵ ئەمە: ئەی بۆقێك ئەی دوو بۆق، بقیڕێنە وەك چۆن دەقیڕێنی، نیوەت لە قوڕە، نیوەت لە ئاوە، خواردنەوە لێڵ ناکەی، ڕێگری لە ئاو ناکەی.. ئێمە نیوەی زەویمان هەیە، قوڕەیشیش نیوە، بەڵام قوڕەیش هۆزێکن ستەم دەکەن.....هتد. لەوانەی موسەیلەمە وڕێنەی تێدا دەکا. سێ هەزار کەس دوای کەوتن و هاتنەوە ناو موسڵمانان، بەمە موسەیلەمەی بێ هێز کرد [3].

---

[1] بوخاری (٤٣٧٢) و موسلیم (١٧٦٤) گێراوەتیانەوە، هەروەها (السیرة النبویة)ی ابن هشام (٦٣٨/٢).
[2] فتح الباری (٨٩/٨)
[3] (الروض الانف ٤١٨/٤)

## چاو پێکەوتنی لەگەڵ ڕەتنەدەکردنەوە:

جەریر ﷺ دەفەرموێت: لەوەتەی موسڵمان بوومە هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ لە دیتنی ڕێگری لێ نەکردووم، هەرکاتێك بینی بێتم زەردەخەنەی بەرامبەر کردووم، جارێکیان سکاڵای ئەوەم لاکرد کە من لەسەر ئەسپ خۆم پێناگیرێ و ناچەسپێم، بە دەست لە سینگی دام و فەرمووی **"اللّهمَ ثبّته و واجعلهُ هادياً و مهدياً [1]"** واتە خوایەگیان جێگیری بکە و بیکە ڕێنیشاندەر ڕێنیشانراو.

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- پیاو ماقوڵی ناو هۆزەکەی، خاوەن ڕێز و پێگەی خۆیەتی بەرامبەر ئەوانی تر، چونکە جەریر گەورەی هۆزەکەی بووە.
- بە زەردەخەنەوە پێشوازی خەڵکی بکەی ڕووخۆشی بەرامبەریان دەربڕی ئەمە لە ڕەوشتی پێغەمبەرە، ئەم کارەش خۆشەویستی دروست دەکات و پێچەوانەی خۆ بەگەورە زانینە.
- گەورەیی سوارچاکی و توندوتۆڵی لە سواربوونی ئەسپ، ئەمەش پێویستە پیاوی گەورە فێری بێت.
- هیچی تێدانییە کاتێك زانایەکی ئاینی یان پێشەوایەك گەر قسە لەگەڵ کەسێکی تر بکات، دەستی لەسەر دابنێت، بە دەست لە هەندێك جەستەی بدات، ئەمە لە خۆبەکەمزانینە و ڕامکردنی دەروونەکانە.
- بەرەکەتی دوعای پێغەمبەر چونکە لەو فەرمودەیەدا هاتووە، کە جارێکی تر لەسەر ئەسپ نەکەوتە خوارەوە [2].

## ستایشی ئەو خەسڵەتە جوانانەی دەکردن کە تیایان دابوو:

جەریر دەڵێت: کاتێك نزیك بوومە لە مەدینە، وشتری خۆم وەستاند، پاشان سندوقی جل و بەرگم کردەوە و پۆشاکێکی جوانم لەبەر کرد، دواتر هاتمە ناو مەدینە.

کاتێك چووم پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا، خەڵکەکە بە سەرنجێکی تیژەوە لێیان ڕوانیم.

بەو کەسەی لەتەنیشەخۆم دانیشتبوو پێم گوت: ئەی بەندەی خوا، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووم؟

---

[1] بوخاری (٣٠٣٦) و موسلیم (٢٤٧٥) گێراوەتیانەوە

[1] شرح ابن بطال علی صحیح البخاري(٥/١٩٤)

گوتی: بەڵێ، کەمێك پێش ئێستا بە جوانترین شێوە باسی کردی.

فەرمووی **"لەم دەرگایە، یان لەم ڕێگایەوە کەسێك دێتە لاتان، لە باشترین کەسی خاوەن بەرەکەتە، لەسەر ڕوویدا نیشانەی فریشتە هەیە [1]"**.

جەریر دەڵێت: سوپاسی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەوەی پێیداوم [2].

ئیبن ئیسحاق دەڵێت: شاندێکی (طيء) هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، لە نێوانیاندا (زيد الخيل)ی تێدابوو، کە گەورەیان بوو، کاتێك تەواو بوون، قسەی لەگەڵ کردن و ئیسلامی بۆ شی کردنەوە، بە باشترین شێوە موسڵمان بوون.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت **"هیچ پیاوێکم لە عەرەب بۆ وەسف نەکراوە لە چاکە، کە دیتوومە کەمتر لەوەی گوتراوە تێیدا بووە، تەنیا (زيد الخيل) نەبێت، ئەوەی هەی بووە لە سیفەتی چاکە هەمووی وەسف نەکراوە"**.

پاشان ناوی لێنا زەیدی خێر، دواتر زەوی (فيد) [3] و دووپارچە زەوی تری پێدا لەگەڵی، بۆشی نوسی.

جا لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لای هۆزەکەی ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"زەید لە نەخۆشی (تا)ی مەدینە ڕزگاری نابێت"**.

کاتێك گەیشتە لای ئاوێك لە ئاوی نەجد، پێی دەگوترا (فردە) توشی تا بوو، مرد، کاتێك هەستی کرد دەمرێت ئەم شیعرەی گوت:

أمرتحل قومي المشارق غدوة      [illegible] ببيت بفردة

ألا رب يوم لو مرضتُ لعادني      عوائد من لم يبر منهن يجهد

**واتەی شیعرەکە:** ئایا قەومەکەم بەم بەیانییە زووە کۆچ دەکەن،لە ناوچەی (فردە) بە تەنیا بەم حاڵە جێم دەهێڵن، خۆزگە ڕۆژێك بهاتبایە نەخۆش کەوتبام و کەسانێك سەردانیان بکردبام، گەرچی سەردانی وان بۆمن هیچ شیفای تێدا نییە.

بە ئەشجی عبدالقيسی فەرموو -کە نوێنەری هۆزی قەیس و گەورە و سەرکردەیان بوو- **"دوو خەسڵەتت تێدایە کە خوا خۆشی دەوێن: (الحلمُ) نەرمونیانی و (الأناة) لەسەرەخۆیی [4]"**.

---

[1] لەبەر جوانییەکەی، چونکە فریشتەکانیش بە جوانی وەسف دەکرێن، جەریر گەورەی هۆزەکەی بووە و کەسێکی ڕووح سوك و باڵابەرز و جوان بووە (عمدة القاري ٢/١٨٦).

[2] ئەحمەد ریوایەتی کردووە (١٨٦٩٨)، ئەلبانی لە سەحیحەکەی بە (سەحیحی) داناوە (٣١٩٣).

[3] ناوی شوێنێکە لە ڕۆژهەڵاتی (سلمی) یەکێکە لە شاخەکانی (طيء) هەر ئەوە کە (حمى فيد) پاڵدەدرێتە لای.

[4] موسلیم لە ئیبن عەباسەوە گێڕاوەتیەوە(١٧).

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێت: الحلمُ: واتا عەقڵ، الأناةُ: چەسپین و پەلە نەکردن

هۆکاری فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ لەم بارەیەوە ئەمەیە: ئەم شاندە کاتێک گەیشتنە مەدینە، چوونە لای پێغەمبەر ﷺ، أشج لای کەلوپەلەکانیان مایەوە و کۆی دەکردنەوە، وشترەکەی بەستەوە، جوانترین جلوبەرگی لەبەرکرد، پاشان چووە لای پێغەمبەر ﷺ. پێغەمبەریش ﷺ لەنزیك خۆی دانیشاند، پێی فەرموو **"لە تۆدا دوو خەسڵەت هەیە کە خوا خۆشی دەوێن: نەرمونیانی و لەسەرەخۆیی[1]"**.

**هەندێك جار پێغەمبەر ﷺ هانی داون و پارێزگاری لێکردوون:**

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە لای خەڵکی تائیف ڕۆیشت، کە بۆ ئەوە چووبوە لایان بۆ ئەوەی موسڵمان بن و سەری بخەن، بەڵام وەڵامیان نەدایەوە، ڕۆیشت بۆ (حراء)، پاشان بەداوای (أخنس ابن شریق)ی نارد بۆ ئەوە پەنای بدات، پێ گوت: من هاوپەیمانم و هاوپەیمانیش کەس داڵدە نادات.

ناردیە لای سوهەیلی کوڕی عەمر گوتی: نەوەی عامر لەسەر نەوەی کەعب کەس داڵدە نادەن.

ئەویش ناردیە لای (المطعم بن عدي) ئەویش وەڵامی داوەکەی دایەوە.

پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت و ئەو شەوە لای مایەوە، کاتێك بەیانی هات، خۆی و هەر شەش یان حەوت کوڕەکەی بە شمشێرەوە لەگەڵی دەرچوون و چوونە مزگەوت.

بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: تەواف بکە، ئەوانیش بە شمشێرەکانیانەوە لە تەواف پاسەوانیان دەکرد.

ئەبو سوفیان هاتە لای (مطعم) گوتی: تۆ پەنادەری یان پەیڕەوکاری؟

گوتی، نەخێر، پەنادەرم.

گوتی: کەواتە پاسەوانی مەکە.

لای دانیشت تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە تەوافەکەی تەواو بوو، کاتێك ڕۆیشت ئەوانیش لەگەڵی ڕۆیشتن، ئەبو سوفیان چوو بۆ لای ماڵەکەی خۆی.

چەند ڕۆژێك مایەوە، پاشان ڕوخسەتی پێدرا کۆچ بکات.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، پاش کەمێك مطعم بن عدي کۆچی دوایی کرد، حەسسانی کوڕی ثابت گوتی: سوێند بەخوا پێیدا هەڵدەڵێم:

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٩/١)

**گوتی:**

فلو كان مجد يخلد اليوم واحداً من الناس أبقى مجده اليوم مطعما

أجرت رسول الله منهم، فاصبوا عبداك ما لبّى ملبّ، وأحرما

فلو سئلتْ عنه معدّ بارها وقحطانُ أو باقي بقية جرهما

لقالوا: هو الموفي بخفرة جاره وذمته يوما إذا ما تذمما

فما تطلعُ الشمسُ المنيرةَ فوقهم على مثله منهم أعزّ، وأكرما

**واتەی شیعرەکە:** گەر ئەمڕۆ سەربەرزی کەس بە زیندوویی بمێنێتەوە، ئەوا سەربەرزی (مطعم)ـە کە دەمێنێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوای پەنادا و کەس زیانی پێ نەگەیاند، گەر لە (معد و قحطان) و هەموویان بپرسی، دەڵێن ئەو کەسێکە بە وەفایە بەرامبەر پاسەوانیکردنی هاوەڵەکەی، ڕۆژی پرشنگدار هەڵنەهاتووە تەنیا لەسەر نمونەی کەسێکی وەك ئەو بە عیززەت و بەڕێز نەبێت.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی بەدر بە بەدیلگیراوەکانی فەرموو **"گەر مطعم بن عدي زیندوویایە و لەبارەی ئەو کەسە پیسانەوە قسەی لەگەڵ کردبام، لەبەر خاتری ئەو ئازادم دەکردن[1]"**

## گەر کەسێکیان بانگهێشتی کردبا بۆ نانخواردن، بە پیل داواکەی دەچوو:

ئەنەسی کوڕی مالك ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هاتە لای سەعدی کوڕی عوبادە، ئەویش نان و ڕۆنی بۆ هێنا، جا خواردی، پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"أفطر عندكم الصائمون، وأكل طعامكم الأبرار، وصلتْ عليكم الملائكة**[2]**"**. واتە ڕۆژووگران ڕۆژوو لای ئێوە بشکێنن و کەسانی چاك خواردنەکەتان بخۆن و فریشتەکانیش سەڵاواتتان لەسەر لێبدەن.

**أفطر عندكم الصائمون:** بە واتای دوعاکردن بە خێر و بەرەکەت دێت، چونکە کردەوەی ڕۆژووگران بەڵگەیە لەسەر فراوانبوونی حاڵ و زۆربوونی خێر و بەرەکەت، چونکە ئەوەی بەرامبەر خۆی دەستەوسان بێت، بەرامبەر کەسی دی هەر دەستەوەستانە.

---

[1] بوخاری گێڕاوەتیەوە(٣١٣٩)

[2] ئەبو داود گێڕاوەتیەوە(٣٨٥٤) و ئەلبانی لە (صحيح الجامع) بە سەحیحی داناوە (١٢٢٦)

**وأكل طعامكم الأبرار:** واتە ڕۆژووگران، یان ئەوانەی ڕۆژوویان شکاند، واتای ئەم ڕستەیە لەوەی پێشوو گشتگیرترە.

**وصلتْ عليكم الملائكة"**.: واتە داوای لێخۆشبوونیان بۆ کردن.

لە سوودەکانی: باشترە بۆ کەسی ڕۆژووگر، گەر ئێوارە ڕۆژووی لای کەسێك شکاند، نزای بۆ بکات، ئەمەش بەپشت بەستن بەوەی ڕستەکە بۆ دوعایە نەوەك ڕستەیەکی خەبەری بێت.

پێغەمبەر ﷺ سەردانی دەکردن و خواردنی لە لا دەخواردن:

قەیسی کوڕی سەعد ﷺ، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵەوە سەردانی کردین:

فەرمووی: **"السلام عليكم ورحمه الله"**.

سەعد بە دەنگێکی نزم وەڵامی دایەوە (واتە بە جۆرێك پێغەمبەر ﷺ گوێ لێ نەبێت)

قەیس گوتی: گوتم: ڕوخسەت بە پێغەمبەری خوا ﷺ نادەی؟

وتی :لێی گەڕێ با زۆر سەلاممان لێبکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"السلام عليكم ورحمه الله"**.

سەعد بە دەنگێکی نزم وەڵامی دایەوە.

پاشان دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"السلام عليكم ورحمه الله"**.

پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە، سەعد دوای کەوت، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، بەراستی گوێم لە سڵاوکردنەکەت بوو، بە دەنگێکی نزم وەڵامم دەدایەوە، بۆ ئەوەی سەلامێکی زۆرمان لێ بکەی.

پاشان پێغەمبەر ﷺ لەگەڵی گەڕایەوە ماڵەوە، سەعد فەرمانی کرد شتێکی بۆ دانێن بۆ دەست شوشتن، ئەویش شوشتی، پاشان پەشتەماڵێکی بۆ هێنا کە [1] بۆیە کرابوو بە زەعفەران، ئەویش لەخۆی پێچایەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دەستەکانی بەرزکردەوە و فەرمووی **"خوایە سەڵاوات و ڕەحمەتی خۆت بەسەر بنەماڵەی سەعدی کوڕی عوبادە ببارێنە"**.

دوای نانخواردن، پێغەمبەر ﷺ ویستی بڕوا، سەعد گوێدرێژێکی بۆ هێنا، کە بە کوتاڵی قەدیفە کورتان کرابوو، پێغەمبەری خواش ﷺ سواری بوو.

سەعد گوتی: ئەی قەیس، هاوەڵایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکە.

قەیس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو **"سوار بە"**.

ڕەتم کردەوە، پاشان فەرمووی **"یان سوار بە، یان بڕۆ"**.

دەڵێت: ڕۆیشتم [1].

---

[1] الملحفة: بەرگێکە لەسەرەوەی جلوبەرگ دەپۆشرێت بۆ خۆپاراستن لە سەرما.

## گاڵتەی لەگەڵ دەکردن:

أسيد بن حضير – لە پیاوە هۆشمەند و ئەشرەفەکان بوو، خاوەن بڕیار بوو، یەکێك بوو لە دە پیاوە گەورەکەی شەوی عەقەبە، دەڵێت: کاتێك ئەو قسەی خۆشی بۆ خەڵکەکە دەکرد، وای دەکرد پێ بکەنن، پێغەمبەری خوا ﷺ چیلکە دارێکی لە کەمەری راکرد، أسيد گوتی: لێم گەڕێ با حەقی خۆمت لێ بکەمەوە.

فەرمووی: **" حەقی خۆت بکەوە".**

گوتی: تۆ کراست لەبەر بوو، من کراسم لەبەر نەبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی بڵند کرد، ئەویش ئامێزی خۆی لێداو سکی پێغەمبەری ماچکرد.. گوتی: بەراستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەم دەویست [٢].

## گرینگی تایبەتی بە نەخۆشەکانی دەدان و زۆر سەردانی دەکردن:

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: سەعدی کوڕی معاز (گەورەی ئەوس) لە شەڕی خەندەق بریندار بوو، پیاوێك لە قورەیش کە ناوی (حبان بن العرقه) بوو بە ڕمێك لێیدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مزگەوت خێوەتێکی بۆ هەڵدا، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە سەردانی بکات [٣].

ابوبکر بن العربی دەڵێت: زۆر سەردانی کردنی نەخۆش سوننەتە، وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ سەعد کردی، بەوەی خێوەتی لە مزگەوت بۆ دانا و زوو زوو سەردانی دەکرد [٤]"

بەخۆی سەرپەرشتی چارەسەرکردنی دەکرد: جابری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنه، دەڵێت: لە شەڕی (ئەحزاب) سەعدی کوڕی مەعاز بریندار کرا، شادەماری خوێنهێنەری دەستیان قرتاندبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئاگر بۆی کەوی کرد، دەستی هەڵاوسا، بڕیەوە، دیسان هەڵاوسا، بڕیەوە، ئەو جارە خوێنی لێهات، پێغەمبەر کاتێك ئەمەی بینی فەرمووی **"خوایە گیان لێرە دەرنەچم تا چاوم ئۆقرە دەگرێت بە لەناوچوونی خەڵکی قریظة "**.

---

[١] ئەحمەد (١٥٠٥) ئەبو داود (٥١٨٥) گێراوەتیانەوە. ابن حجر لە (الفتح ١١/١٧٠) دەڵێت (سنده جيد). ابن الملقن لە (البدر المنير – ٢/٢٥٦) سەندەکەی بە سەحیح داناوە، ابن كثير لە تەفسیرەکەی (٦/٣٧) دەڵێت (جيد قوى). ئەلبانی لە (ضعيف ابى داود – ٥١٨٥) بە (ضعيف)ی داناوە.

[٢] ئەبو داود گێراوەتیەوە(٥٢٢٤). ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[٣] بوخاری (٤٦٣) و موسلیم (١٧٦٩) گێراوەتیانەوە.

[٤] تحفة الأحوذي (٤/٣٨)

دەستی گرت، یەك دڵۆپە خوێن لە دەستی نەهات تا ئەو کاتەی لە حوکمدان بەسەر یەهودییەکان تەواو بوو.. کاتێکیش تەواو بوو دەماری دەستی تەقی و وەفاتی کرد [١].

**بە هەمان شێوە لەگەڵ گەورەی خەزرەج سەعدی کوڕی عوبادەش هەر ئاوای کرد:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، پیاوێك لە ئەنساریەکان هاتە لای، سەلامی لێکرد

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"ئەی برای ئەنساری، دەبێت سەعدی کوڕی عوبادەی برام چۆن بێت؟"**

ئەویش گوتی: باشە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"کێ لە ئێوە سەردانی دەکات؟"**.

جا خۆی هەڵسا و ئێمەش لەگەڵی هەڵساین، ئێمە نزیکەی دە پازدە کەسێك دەبووین، نە نەعلمان لەبەر بوو نە پێڵاو، نەسەرمان داپۆشرابوو نە پۆشاکی سەرەوەمان لەبەر بوو، بەم شێوەیە بە پێ بە رێگا خۆڵاوییەکە رۆیشتین تا گەیشتینە لای.

خەڵکەکەی کە لە دەوروبەری بوون کشانەوە [٢]، تا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و هاوەڵەکانی لێی نزیك بووە.

فەرمووی ﷺ **"ئایا وەفاتی کرد؟ [٣]"**.

وتیان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری ﷺ گریا، کاتێکیش خەڵکەکە گریانی پێغەمبەریان بینی گریان.

فەرمووی ﷺ **"ئایا گوێتان لێ نییە، خوای گەورە نە بە فرمێسکی چاو و نە بە نیگەرانی دڵ سزا نادات، بەڵکو بەهۆی -ئاماژەی بۆ زمانی کرد- ئەمە سزا دەدات یان رەحمی پێدە دەکات [٤]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- پرسیارکردن لە بارەی نەخۆش.
- سەردانی کردنی نەخۆش سوننەتە.

---

[١] ئەحمەد (١٤٣٥٩) و ترمذي (١٥٨٢) گێراوەتیانەوە. ئەلبانی لە (الاوراء - ١٢١٣) بە سەحیحی داناوە.

[٢] کشانەوەی خەڵکەکە وەك رێزێك بۆ شاندەکە و پێگەکەیان بووە، هەروەها بۆ حەسانەوەی نەخۆش لەو فشارە زۆرەی لەسەریەتی بە هۆی کۆبوونەوەی خەڵکی زۆر لەسەری.

[٣] واتای پرسیارکردنی تێدایە، واتە بەراستی لە دوونیا دەرچوو، وایزانی مرد بۆیە پرسیاری کرد (عمدة القاريء - ٨/١٠٤).

[٤] بوخاری (١٣٠٤) و موسلیم (٩٢٤) ریوایەتیان کردووە.

- سەردانی کەسی باشتر بۆ باش.
- سەردانی پێشەوا و دادوەر و زانا بۆ پەیڕەوکارانی.
- سەردانی پێشەوا و دادەور و زانا بەیاوەری هاوەڵەکانی بۆ لای نەخۆش.
- ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لەسەری بوون ﷺ، لە جێهێشتنی خۆشییەکانی دونیا و کەمکردنەوە لە گرنگییەکەی و گرینگی نەدان بە جلوبەرگی گرانبەها و ..هتد.
- بە پێخواسی ڕۆیشتن دروستە.

## پێغەمبەر ﷺ راوێژی پێ دەکردن و راوێژیشی لێ وەردەگرتن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك هەواڵی هاتنی کاروانەکەی ئەبو سوفیانی پێ گەیشت.

قسەی لەگەڵ ئەبوبەکر کرد، رازی نەبوو.

قسەی لەگەڵ عومەر کرد، ئەویش رازی نەبوو.

سەعدی کوڕی عوبادە هەڵسا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمەت دەوێت؟ سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بە دەستە، گەر فەرمانمان پێ بکەی بچینە ناو دەریا, دەچین،

گەر فەرمانمان پێ بکەی لە (برك الغماد [(١)]) لە جەرگیان بدەین وا دەکەین.

فەرمووی: ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی خەڵکی کرد، تا دەرچوون و لە نزیك بەدر دابەزین [(٢)].

زانایان دەفەرموون: پێغەمبەر ﷺ لەمەدا ویستوویەتی ئەنسارییەکان تاقی بکاتەوە، چونکە ئەوان لەسەر دەرچوون لەگەڵیدا بۆ شەڕ بەیعەتیان پێ نەدابوو، بەڵکو تەنیا بەیعەتیان لەسەر ئەمە پێدابوو کە بیپارێزن. کاتێکیش دەرچوون بۆ سەر کاروانی ئەبو سوفیان، ویستی بزانێ ئایا ئەوان لەسەری رازین، ئەوانیش بە جوانترین شێوە رازی بوون و بۆ هەموو شەڕێك ئامادەباشی خۆیان دەربڕی.

### لە سوودەکانی: راوێژکردن بە هاوڵان و کەسانی خاوەن ئەزموون [(٣)].

لە شەڕی خەندەق، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بەدوای سەعدی کوڕی مەعاز و سەعدی کوڕی عوبادە، بۆ ئەوەی راوێژیان پێ بکات، لەبارەی پێدانی بەرهەمی خورمای مەدینە بە

---

[(١)] ناوی شوێنێکە لە یەمەن. دەگوترێت ناوی شوێنێکە لە پشت مەککە بە ئەندازەی پێنج رێ شەو. (النهایة: ١٢١/١).

[(٢)] موسلیم گێراوەتیەوە(١٧٧٩).

[(٣)] شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم (١٢٤/١٢).

(عیینه کوڕی حصن)، ئەمەش دوای ئەوە بوو کە قوڕەیش بە دە هەزار کەس هاتبوون. (عینیه کوڕی حصن)یش لەگەڵ دارودەستەکەی لە غەتەفان، (حیي بن أخطب) چوو بۆ لای بەنی قورەیزە، لێیان نەگەڕا هەتا تووشی خیانەت و ستەمی کردن، ستەمەکە گەیشتە موسڵمانان و تەنگی پێهەڵچنین.

پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی سێیەکی بەرهەمی شاری مەدینە بداتە (عینیە کوڕی حصن) و دارودەستەکەی لە غەتەفان، بۆ ئەوەی بڕۆن و کۆمەڵەی (ئەحزاب) بێ هێز بن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای هەردوو سەعدەکەی نارد، بێ ئەوەی بە دوای ئەنسارییەکانی تردا بنێرێت، چونکە ئەو دووانەیان گەورەی هۆزەکەی خۆیان بوون، سەعدی کوڕی مەعاز گەورەی (ئەوس) بوو، سەعدی کوڕی عوبادەش گەورەی (خەزرەج) بوو، راوێژی پێکردن.

ئیبن قەیم ﷬ دەفەرموێت: کاتێك ئەم حاڵەتە بەسەر موسڵمانان درێژەی کێشا (گەمارۆدانی موسڵمانان لە رۆژی خەندەق) پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی ئاشتەوایی لەگەڵ (عینیة بن حصن) و (الحارث بن عوف) هەردوو سەرۆکی هۆزی (غطفان) بکات، بە پێدانی سێیەکی بەرهەمی مەدینە، لەبەرامبەردا خۆیان و هۆزەکانیان ئەوێ چۆڵ بکەن، لەسەر ئەم پرسەش دانوستان دەستی پێکرد.

بۆ ئەم کارە راوێژی بەرهەدوو سەعد کرد، ئەوانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەر خوای گەورە بەم شێوەیە فەرمانی پێکردی، ئەوا ئێمە ملکەچین و گوێڕایەڵین، بەڵام گەر لەبەر ئێمە ئەم کارە دەکەی، ئەوا ئێمە هیچ پێویستیمان پێی نییە.

بەڕاستی ئێمە و ئەو هۆزە (مەبەست یەهودییەکانە) لە گومڕایی و هاوڵ بۆ خوا پەیداکردن و بت پەرستیدا لەگەڵ یەك بووین، ئەو کات ئەوان یەك دەنکە خورمای ئێمەیان نەدەخوارد تەنیا بە میوانداری یان بەکڕین نەبێت، کاتێکیش خوای گەورە ئێمەی بە ئیسلام رێزدار کرد و رێنوێنی کردین و بە تۆ سەربەزی کردین، ئەو کات ماڵ و سامانمانیان بدەینێ؟

سوێند بەخوا جگە لە شمشێر نەبێت هیچی تریان پێ نادەین.

پێغەمبەرﷺ رای ئەوانی بە راست زانی و فەرمووی **"ئەم کارەم بۆ ئێوە کرد، کاتێك بینیم عەرەبەکان لە یەك کەوان تیرتان تێ دەگرن[1]"**.

ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب ﷺ هەمان کاری کرد.

[1] زاد المعاد (٣/٢٤٠). سەیری ژیانی پێغەمبەر بکە، ئیبن هیشام (٢/٢٢٣).

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دەفەرموێت: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ بۆ شام ڕۆیشت، تا گەیشتە (سرغ) لەوێ ئەمیری سەربازەکان عوبەیدەی جەڕاح و هاوەڵەکانی بینی، پێیان ڕاگەیاند کە پەتای (تاعون) لە زەوی شام بڵاوبۆتەوە.

ئیبن عەباس دەڵێت: عومەر گوتی بۆم بانگی کۆچەرەییە یەکەمەکان بکە، بانگم کردن ڕاوێژی پێکردن و پێی ڕاگەیاندن کە پەتا لە شام بڵاوبۆتەوە، ئەوانیش ڕای جیاوازیان هەبوو، هەندێکیان گوتیان: تۆ بۆ کارێك دەرچووی پێمان وانییە کە لێی بگەڕێیتەوە، بەشێکی تریش گوتیان: تۆ هەندێك خەڵك و هاوەڵانی پێغەمبەری خوات لەگەڵە پێمان باش نییە بیانبەیتە ناو ئەو پەتایە.

گوتی: بڕۆن

پاشان گوتی: ئەنسارییەکانم بۆ بانگ بکە، بانگم کردن، ڕاوێژی پێکردن، ئەوانیش هەمان ڕای کۆچەرییەکانیان هەبوو، بۆ دوو ڕا دابەش بوون، بەوانیشی گوت: بڕۆن.

پاشان گوتی: بانگی ئەوانە بکەن کە لێرەن لە پیر و گەورەکانی قورەیشی ڕۆژی (فتح)، بانگم کردن، هیچیان ناکۆك نەبوون لەسەری. گوتیان: پێمان باشە بەم خەڵکە بگەڕێیتەوە و نەیانبەیتە ناو ئەو پەتایە، عومەریش بانگی خەڵکی کرد و گوتی: من لەسەر پشتی وڵاخ بەیانی زوو گەشت دەکەم بەرەو مەدینە، ئێوەش وا بکەن.

ئەبو عوبەیدە پێی گوت: ئایا ئەمە ڕاکردن نییە لە قەدەری خوا؟

عومەر فەرمووی: خۆزگە کەسێکی تر جگە لە تۆ ئەم پرسیارەی دەکرد.

بەڵێ لە قەدەرێکی خوا بۆ قەدەرێکی تری خوا ڕادەکەین، ئەگەر وشترێکت هەبێت و بە دۆڵێکدا تێبپەڕی دوو لای هەبێت، لایەکیان سەوز و ئەوی تریان وشك، ئایا بە قەدەری خوا ناچیتە لایە سەوزەکە و بیلەوەڕێنێت، گەر لەلای وشکەکەش بیلەوەڕێنیت هەر بە قەدەری خوا نییە؟

دەڵێت: لەو کاتە عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف هات، کە پێشتر لەبەر هەندێك کار لەوێ نەبوو، فەرمووی: من لەم ڕووەوە زانستێکم پێیە، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی **"گەر بیستان لە زەویەك پەتا هەیە، مەچوونە ناوی، گەر لە زەوییەکیش ڕوویدا کە ئێوەی تێدان، لێی دەرمەچوون تا لێی ڕزگار بن"**.

دەڵێت: عومەر سوپاسی خوای کرد و پاشان ڕۆیشت [1].

[1] بوخاری (٥٧٢٩) و بوخاری (٢٢١٩) گێراوەتیانەوە.

**سوودێك:**

لە ڕێگاکانی خۆ پاراستن لە نەخۆشی درم بە پێی سوننەت: ڕێگریکردن لە دەرچوون لەناو ئەو زەوییەی پەتاکەی تێدایە یان چوونە ناوی.

ئەم ڕێوشوێنەش لە پزیشکی سەردەمدا بە (الحجر الصحی) واتە قەدەغەکردنی تەندروستی ناسراوە، ئەمەش ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی خۆپاراستن کە ئیسلام پێشووتر دایناوە.

ڕێگریکردن لە دەرچوون لە شوێنی پەتاکە، بریتییە لە (الحجر الصحی) واتە قەدەغەکردنی تەندروستی، بەڕاستی ئیسلام بە سەدان ساڵ پێش زانستی پزیشکی کەوتووە، هەروەها ڕێگریکردن لە چوونە ناو زەوی پیس بوو بە پەتا ئەمەش ڕێکارێکی خۆپارێزییە و پێشتر ئیسلام داینا وە[1].

**شتە جوانەکانی ئەو دەستە و کۆمەڵەیەی دەپاراست و لەسەری پاداشتی دەدانەوە:**

جبیر ابن مطعم ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە دیلەکانی بەدری فەرموو "**گەر مطعم بن عدي زیندووبایە و لەبارەی ئەو کەسە پیسانەوە قسەی لەگەڵ کردبام، لەبەر خاتری ئەو ئازادم دەکردن**[2]".

ئەمەش وەك پاداشت دانەوە بۆ ئەو چاکەیەی بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ کردی، دوای ئەوەی لە تائیف گەڕایەوە چووە ژێر پارێزبەندی مطعم بن عدي وەك لە پێشوتر باس کرا.

هەروەها پاداشتی صەفوانی کوڕی ئومەییەی دایەوە و دڵی رام کرد، دوای ئەوەی لە شەڕی حونەین قەڵغانەکانی لێوەرگرتبوو.

صەفوانی کوڕی ئومەییە ﷺ، خۆی دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەیبەر قەڵغانی لێوەرگرتبوو.

ئەویش گوتی: ئەی موحەمەد ئایا ئەمە بە زۆرە ؟

فەرمووی "**بەڵکو بە خواستنێکی زامنکراوە**".

دەڵێت: بەشێکی فەوتا، پێغەمبەر ﷺ نیشانیدا بۆ ئەوەی زامنەکە وەرگرێتەوە، گوتی: من ئەمڕۆ ئیسلامم دەوێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ[3].

---

[1] خۆپارێزی تەندروستی لە ئیسلام، توێژینەوەیەکی فەرموودەییە، دکتۆر علي بن جابر واد الشبیتي، گۆڤاری توێژینەوە ئیسلامییەکان (٣٧١/٧١-٣٧٣)

[2] بوخاری گێراوەتیەوە(٣١٣٩).

[3] ئەبو داود (٣٥٦٢) و ئەحمەد (١١٤٨٧٨) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الاوراء ١٥١٣) بە سەحیحی داناوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی حونەین قەرەبووی کردەوە، ئیبن شەهاب دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککەی کرد، پاشان لەگەڵ موسڵمانان بۆ شەڕی حونەین دەرچوو، خوای گەورە دینەکەی و موسڵمانانی سەرخست.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەد نیعمەتی لە نیعمەتەکانی ئەو ڕۆژە بە صەفوانی بەخشی، پاشان سەدی تر، پاشان سەدی تر.

ئیبن شەهاب دەڵێت: سەعیدی کوڕی موسەیب بۆی گێڕامەوە کە صفوان گوتی: سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دام لەوەی پێی دام، پێشووتر ئەو ناشیرنترین کەس بوو لەلام، بەردەوام بوو لە پێدانم تا لەبەرچاوم بووە خۆشەویسترین کەس[١].

هەروەها پاداشتی عەبدوڵڵای کوڕی سەلولی داوەتەوە... جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول، دوای ئەوەی چووە ناو قەبرەکەی، فەرمانی کرد دەری بهێنن، دەریانهێنا، لەسەر ئەژنۆکانی خۆی دانا هەندێك لە لیکی خۆی لێدا و کراسەکەی خۆی بەبەرداکرد، خوا دەزانێ، ئەم کارەش بۆ ئەوە بوو کە ئەو لە ڕۆژی بەدر کراسەکەی خۆی دایە عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ.

سوفیانی کوڕی عویەیینە دەڵێت، ئەبو هارون گوتی: پێغەمبەر ئەو کات دوو کراسی لەبەر بوو، کوڕی عەبدوڵڵا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کراسەت کە پێستی تۆی بەرکەوتوو، بەبەر باوکم بخە.

سوفیان دەڵێت: دەگوترێت پێغەمبەری خوا ﷺ کراسەکەی خۆی بۆیە بەبەرداکرد، وەك پاداشتێك لەبەرامبەر ئەم کارەی کردوویەتی[٢].

## پشتی پێ دەبەستن بۆ لەناوبردنی خراپە:

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﷺ، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم **"ئایا ڕزگارم ناکەی (یان دڵم ئاسوودە ناکەی) لە (الخلصة)"**.

**الخلصة:** خانوویەك بوو لە (خەثعەم)، ناونرابوو کەعبەی یەمانی[٣]، منیش خۆم و سەدوپەنجا سوارچاك لە (أحمس) دەرچووم بۆ ئەو شوێنە، ئەوان هاوڕێی ئەسپ بوون، منیش لەسەر پشتی ئەسپ جێگیر نەدەبووم.

---

[١] موسلیم گێراوەتیەوە(٢١١٣)

[٢] بوخاری (١٣٠٥) و موسلیم (٢٧٧٣) گێراوەتیانەوە.

[٣]ماڵێك بوو لە یەمەن، بتی تێدابوو دەیان پەرەست، شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم (٣٥/١٦).

پێغەمبەر ﷺ لە سینگی دام، تا جێی پەنجەکانی لە سینگم دەرچوو، فەرمووی **"خوایە گیان جێگیری بکەی و بیکەیتە ڕێنیشاندەر و ڕێنیشاندراو"**.

بۆلای ڕۆیشت و بتەکانی شکاندو ماڵەکەی سوتاند، پاشان نوێنەرێکی نادرە لای پێغەمبەری خوا ﷺ

نێردراوەکەی جەریر گوتی: سوێندی بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانەکردووە، نەهاتمە لات، تا ئەو شوێنەمان جێهێشت کە ببوە وشترێکی ڕەش [1].

دەڵێت: پێنج جار دوعای بەرەکەتی بۆ ئەسپەکانی ئەحمس کرد [2].

هۆکاری تایبەتکردنی جەریر بەم کارە، لەبەرئەوە بوو ئەو خەڵکی ئەو وڵاتە بوو، هەروەها لە گەورەکانی بوو [3].

هەروەها هەریەکە لە موغیرەی کوڕی شوعبە و ئەبو سوفیانی بۆ ڕووخانی (ڕەبە) راسپارد، (ڕەبە) بتێك بوو لە نزیك تائیف، قوربانی بۆ دەکرا وەك چۆن بۆ کەعبە دەکرا [4].

**دڵی خاوەن ئەو دەستە و کۆمەڵانەی ڕام دەکرد و بەخشینی بۆ زیاد دەکردن و بە پێش ئەوانەی دەخستن کە لەدوایان بوون:**

دوای جەنگی حونەین، دوای ئەوەی خوای گەورە دەسکەوتی بەخشییە پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەویش دەستکەوتی زۆری بەخشییە خاوەن ئەو دەستە و کۆمەڵانە و ئەوانەی تازە ببوونە موسڵمان.

رافع بن خدیج ﷺ، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەد حوشتری بەخشییە هەریەکە لە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب، صەفوانی کوڕی ئومەییە و عویەینەی کوڕی حصن و ئەقرەعی کوڕی حابس، هەروەها کەمتر لەوەشەی بەخشییە عەباسی کوڕی مەرداس، عەباسی کوڕی مەرداس لەسەر ئەم ڕووداوە شیعرێك دەڵێت:

أتجعل نهبي. ونهب العبيد ... بين عيينة، والأقرع

فما كان بدر، ولا حابس ... يفوقان مرداس في المجمع

وما كنتُ دون أمريء منهما ... ومن تخفض اليوم لا يرفع

---

[1] واتاکەی: وشترێکی سواقدراو بە قەتران بەهۆی گەڕی ڕەنگی ڕەش بووە، واتە لەبەر سوتاندنی شوێنەکە ڕەنگی ڕەش بووە، شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی بوخاری (١٦/٣٦).

[2] بوخاری (٣٠٢٠) و موسلیم (٢٤٧٦) گێڕاوەتیانەوە.

[3] فتح الباری (٨/٧٢)

[4] زاد المعاد (٣/٥٢٣)

**واتەی شیعرەکە:** ئایا بەخششی من و بەخششی عویەیینە و ئەقرەع وا دادەنێی، ئەوان و حابس لەکۆمەڵگا پێش مەرداس ناکەون، منیش هیچم لەوان کەمتر نییە، ئەوەی ئەمڕۆ نزم بێت ئەوا بەرز نابێتەوە.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی کردە سەدی تەواو[1].

**بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، ئەم جۆرە مامەڵەکردنەش کاریگەری لەسەریان هەبوو، هەندێکیان موسڵمان بوون، هەندێکیشان وازیان لە خراپەکاری هێنا.**

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ، دەفەرموێت: عەلی کاتێك لە مەدینە بوو، دەستکەوتێکی زێڕی بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕەوانە کرد، ئەویش دابەشی کرد لە نێوان أقرع بن حابس الحنظلي پاشان بۆ یەکێك لە نەوەکانی مجاش و لە نێوان عيينة بن بدر الفزاري و علقمة بن علاثة العامري، پاشان بۆ یەکێك لە نەوەی کلاب، هەروەها لە نێوان زيد الخيل الطائي و یەکێك لە نەوەکانی بنی نبهان، قورەیش و ئەنسارییەکان بەمە تووڕەبوون و گوتیان: دەبەخشێتە گەورە پیاوانی ئەهلی نەجد ئێمەش وەلا دەنێت.

فەرمووی **"بەڵکو دڵیان ڕام دەکەم"**.

پیاوێکی چاوبرسی هات، کە خاوەنی نێوچاوانێکی هەڵاوساو، ریشێکی چڕ و روومەتێکی زەق و سەرێکی تاشاو بوو، گوتی: ئەی موحەممەد لە خوا بترسە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"گەر من سەرپێچی خوا بکەم، ئەی کێ گوێڕایەڵی دەکات؟ خوا من بە ئەمیندار لەسەر زەوی دادەنێت کەچی ئێوە بە ئەمیندارم نازانن؟"**.

پیاوێك لەوێ ویستی بیکوژێ -دەگوترێ خالیدی کوڕی وەلید بووە- پێغەمبەری خوا ﷺ نەیهێشت.

کاتێك پیاوەکە ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"لە پشتی ئەمەوە کەسانێك دێن، قورئان دەخوێنن بەڵام لە قورگیان ناچێتە خوار، وەك چۆن تیر لە نێچیر دەردەچێت ئاوا لە ئیسلام دەردەچن، خەڵکی موسڵمان دەکوژن و واز لە بتپەرستان دەهێنن، گەر بیانبینم دەیانکوژم وەك کوشتنی قەومی عاد"**[2].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، خەڵکانێك لە ئەنسارییەکان، کاتێك خوای گەورە دەسکەوتەکانی شەڕی لە سامانی هوازن بە پێغەمبەر دا، بۆ هەریەکێك لە پیاوە

---

[1] موسلیم گێڕاوەتیەوە(١٧٥٧)

[2] بوخاری (٧٤٣٢) و موسیلم (١٠٦٤) گێڕاوەتیانەوە

**گەورەكانی قوڕەیش ١٠٠ وشتری دانا، بەشێك لە ئەنسارییەكان گوتیان: خـوایٚ گـەورە لـە پێغەمبەر ﷺ خۆش بێت، دەبەخشێتە قوڕەیش و ئەنسارییەكان وەلا دەنێت، لـە كاتێكـدا ئێستاش شمشێرەكانمان خوێنی ئەوانی لێ دەتكێ!**

پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەم قسەیە بەدوای ئەنسارییەكانی نارد و لە خێوەتی ئـەدم كۆیكردنـەوە، كـەس نـەما نەیـەت، هـەموویان لـەو شـوێنە كۆبوونـەوە، كـاتێكیش تـەواو كۆبوونــەوە پێغەمبــەری خــوا ﷺ هاتــە لایــان فــەرمووی "**هــەواڵێكی ئێــوەم پــێ ڕاگەیاندراوە؟**".

پیاوە عاقڵەكانیان گوتیان: خاوەن بڕیارەكان لە ئێمە هیچیان نـەگوتووە، بـەڵام ئـەو خەڵكەی تر كە تەمەنیان گەنجە گوتوویانە: خـوای گـەورە لـە پێغەمبـەر ﷺ خـۆش بێـت، دەبەخشێتە قوڕەیش و ئەنسارییەكان وەلا دەنێت، لە كاتێكدا ئێستاش شمشـێرەكانمان خوێنی ئەوانی لێ دەتكێ!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی "**من دەبەخشمە ئەو پیاوانەی تازە موسڵمان بوون، ئایا ڕازی نـابن خـەڵك بـە مـاڵ و سـامانیان بگەڕێنـەوە و ئێـوەش بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بگەڕێنەوە نێو ماڵتان؟ سوێند بەخوا ئەوەی ئێوە دەیبەن باشتر و چاكترە لەوەی ئەوان دەیبەن**".

گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ڕازین.

پێی فەرموون "**ئێوە لە دوای من ڕووداوێكی گەورە دەبینن، ئارام بگرن تا دەگەنە خوا و پێغەمبەرەكەی، من لەسەر حەوز چاوەڕێتانم**"، (موسلیم لە گێڕانەوەیەكی تردا ئـەوەی زیاد كردووە: گوتیان: ئارام دەگرین) ئەنس دەڵێت: ئارامامان نەگرت[1].

**لە سوودەكانی ئەم فەرموودەیە**:

● پێشەوا دەتوانێت پێنج یـەك ببەخشـێت، خـەڵكانێك پـێش هەنـدێكیان بخـات، یـەكێك لەوانە زۆری پێ ببەخشـێت، لـە پێنـاو بەرژەوەنـدی موسـڵمانان ببەخشـێت، دەكرێـت بـۆ مەبەستی بەرژەوەندییەك بیداتە دەوڵەمەندان.

● بەخشینی بۆ تازە موسڵمانان بووەكان، لە پێناو چەسپاندنیان لەسەر ئیسلام.

● خۆبەكەمزانینی پێغەمبەری خوا ﷺ.

[1] بوخاری (٣١٤٧) و موسلیم (١٠٥٩) گێڕاویەتیەوە.

- **ئیقامەی حوججە (بەڵگە هێنانەوە) لەسەر کەسی ناکۆکیکار، دەمکوتکردنی بە حەق لە کاتی بکات.**
- **رەوشتجوانی ئەنسارییەکان، وازهێنانیان بووە لە دەمەقاڵێ و زیادەڕۆیی کردن بە هۆی شەرمیانەوە، روونیان کردۆتەوە ئەوەی لەوان بڵاوبۆتەوە لە گەنجەکانیان بووە نەوەك لە پیرەکانیان.**
- **پلە و پایە بەرزیان، بەهۆی ئەوەی مەدحی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانی گرتەوە.**
- **گەورە بچوك ئاگادار دەکاتەوە لەو شتەی لێی بێ ئاگایە و رووی گومانی بۆ روون دەکاتەوە بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەر حەق.**
- **گلەیی کردن، بەزەیی هاتنەوە بە کەسی گلەیی لێکراو، رێگری کردن لە گلەییەکەی بە هێنانی بەڵگە لە کەسی گلەیی کار بۆی، پاشان داوای لێبوردن کردن و دان بەهەڵە دانان.**
- **لەم فەرموودەیە زانستێك لە زانستەکانی پێغەمبەری تێدایە، کە فەرموویەتی: "لە دوای من رووداوێکی گەورە دەبینن". ئەوەی فەرمووی روویدا.**
- **گەر کەسێك داوای مافی خۆی لە دونیا بکات، گلەیی لێ ناکرێت.**
- **لە کاتی روودانی کارێك، رێگە دراوە وتار بدرێت، جا یەکسانە کارەکە گشتی بێت یان تایبەت.**
- **دروستە وتارەکە تایبەت بێت بۆ هەندێك کەس.**
- **دڵدانەوەی ئەو کەسەی شتێکی لە دونیا لە دەستچووە بەوەی پاداشتی رۆژی دوایی دەست دەکەوێت.**
- **پێشخستنی لایەنی رۆژی دوایی لەسەر ژیانی دونیا، هەروەها ئارامگرتن لەبەرامبەر لە دەستچوونی دەسکەوتێکی دونیایی، بۆ ئەوەی بچێتە زەخیرەی قیامەتی، چونکە رۆژی دوایی باشترە و بەردەوامیشە.**

**لەبەرامبەردا.. هەرکاتێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ روون بویەوە، کە ئەو خاوەن دەستە و کۆمەڵانە خێریان تێدا نییە، بەهەمان شێوەی توندی خۆیان مامەڵەی لەگەڵ دەکردن.**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ، دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا لەلای کەعبە نوێژی دەکرد، قورەیش لە کۆبوونەوەی خۆیان دابوون.

کەسێك لەوان (کە ئەبو جەهل بووە) گوتی: ئایا ئەم ریابازە نابینن، کێتان دەچێت پیسایی ئاژەڵە سەربڕاوەکانی بنەماڵەی فلان بهێنێت پاشان بوەستێت تا دەچێتە سوژدە ئینجا لەسەر پشتیدا بیرێژێت.

بەدبەخترین کەس عوقبەی کوری أبي موعیط بوو، چوو هێنای، سەیری کرد پێغەمبەری خوا ﷺ سوژدەی برد، پیاسیەکەی لەسەر پشتی دانا.. منیش سەیر دەکەم و هیچم پێ نەدەکرا، گەر شتێکم پێ کرابا لەسەر پشتی پێغەمبەری خوام ﷺ لا دەدا [1].

دەستیان بە پێکەنین کرد خەریك بوو لەبەر زۆر پێکەنینان بەردەبوونەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ لە سوژدەدا بوو نەیدەتوانی سەری بەرزبکاتەوە.

کەسێك بەناوی (جوەیریە) بە خێرا بۆ لای فاتیمە رۆیشت، ئەو کاتە بچوك بوو، فاتیمەش بە راکردن هات، پێغەمبەر هەر لە سوژدەدا مابوویەوە تا لەسەر پشتی لایبرد، پاشان دەستی کردە قسە پێگوتنیان.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژی تەواو کرد، سەری بەرزکردەو و دوعای لێکردن و فەرمووی "**اللهم عليك بقريش، اللهم عليك بقريش، اللهم عليك بقريش**". واتە سێ جار فەرمووی خوایە گیان کافرەکانی قورەیش لەناو ببە.

دوعای پێغەمبەریان لەسەر قورس بوو، چونکە پێیان وابوو دوعاکردن لەو شوێنە رەت ناکرێتەوە.

پاشان ناوی ئەوانی یەك بە یەك هێنا "اللّهمّ عليك الملأ من قريش، اللهمّ عليك بأبي جهل، وعتبة بن ربيعة، وشيبة بن ربيعة، ووليد بن عتبة، وأميّة بن خلف، وعقبة بن أبي معيط، وعمارة بن الوليد".

عەبدوڵڵا دەفەرموێت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، مردنی ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ژماردنی، بە چاوی خۆم بینی لە بیرەکانی قەلیب [2] لە بەدر. تەنیا

---

[1] بۆیە ئەم قسەیەی کردووە، چونکە ئەو لە مەککە هۆزی نەبووەو بێ هێز بووە، هاوپەیمانەکانیشی کافر بوونە. فتح الباري (٦/٤١٥).

[2] القليب: ئەو بیرەیە کە چوارچێوەی نییە، وەك ریسواکردنێك ئەو کەسانەیان خستە ناوی،، هەروەها بۆ ئەوەی خەڵك بە بۆنیان بێزار نەبێت، وا دیارە بیرەکە ئاوێکی پاکی تێدا نەبووە.

ئومەییە نەبێت، پیاوێکی کەترە بوو، کاتێك بۆ بیرەکە رایان کێشا، بەر لەوەی بیخەنە بیرەکەوە پەلەکانی پچڕان [(١)].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نەرمونیانی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر ئەوانەی ئازاریان داوە، لە **گێرانەوەیەکی** (الطیالسي ٣٢٣) لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: نەمبینیوە دوعایان لێ بکات تەنیا ئەو رۆژە نەبێت.

- ئیبن حەجەر دەڵێت: بەهۆی ئەو سوکایەتییەیان بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی بەندایەتی کردنی، ئەوان شایەنی ئەو دوعایە بوون.

- بەهێزی کەسایەتی فاتیمە هەر لە بچوکییەوە، ئەمەش لەبەر ئەو پلەیەی هەیبووە لەناو قەومەکەی، بۆیە بەسەر رویاندا هاواری کردوو و قسەی پێگوتن، ئەوانیش گەورەی قورەیش بوون بەڵام بەهۆی گەورەیی پلەی فاتیمە وەڵامیان نەدایەوە.

- دروستە دوعا لە ستەمکار بکەیت.

- ئەنجامدانی کارێك بەراشکاوانە گەورەترە لە هۆکاری ئەنجامدان یان یارمەتیدان، چونکە لە گێڕانەوەکە دەڵێت "بەدبەختترینی خەڵکەکە" لە کاتێکدا ئەبو جەهلیش لەوێ بووە و بێ باوەڕتر بووە و لە هەموانیش زیاتر ئازاری پێغەمبەری داوە، بەڵام بەدبەختی لێرەدا تەنیا پەیوەندی بەم چیرۆکەوە هەیە، چونکە هەموویان بەشداربوون لەم پلانە و پێی رازی بوون، عوقبە بەتەنیان هەڵسا بە ئەنجامدانی، بۆیە لە هەموویان خراپتر و بەدبەختترە، ئەوان هەموویان لەشەڕ کوژران، تەنیا ئەو نەبێت بەبێ شەڕ کوژرا.

**ابن بطال** دەڵێت: "پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکرد خەڵك بێتە ناو ئیسلام، مادام چاوەڕێی وەڵامدانەوەیانی دەکرد، هیچ لە دوعاکردن لێیان پەلەی نەدەکرد، بەڵکو دوعای بۆ ئەو کەسانە دەکرد کە ئومێدی پێبوون بێنە ناو ئیسلام. ئەوانەشی ئومێدی پێ نەبوون و ترسی لە زیانیان هەبوو، دوعای لێ دەکردن، هەروەکو دوعای بەهیلاکچوونی لێکردن بە وشکە ساڵەکانی یوسف، هەروەها دوعای لە گەورە پیاوانی قورەیش کردووە، ئەمەش بە

[(١)] بوخاری (٢٤٠) و موسلیم (١٧٩٤) گێڕاوەتیانەوە.

هۆی زۆر دژایەتی کردنیان و ئازاردانیان، دوعاکەشی قبولْ بووە و لە شەڕی بەدر کوژران، هەروەکو چۆن بە شێکی زۆریشیان بە دوعای هیدایەتی ئەو بوونە ئیسلام"[1].

## هەندێك جار لە قسەکردن لەگەڵیان ڕەق بوو:

عوروە دەڵێت: بە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصم گوت: چ شتێکت زۆر بینیوە لەوەی بەسەر قورەیشدا هاتووە لەلایەن پێغەمبەری خوا، بەهۆی ئەو دوژمنایەتییەی دەیانکرد؟

گوتی: ڕۆژێکیان لایان ئامادەبووم، گەورە پیاوانیان لە حیجر کۆبوونەوە، باسی پێغەمبەری خویان کرد ﷺ.

گوتیان: قەت ئێمە هێندە ئاراممان نەگرتووە بەرامبەر ئەو پیاوە، خەونەکانی شێواندین، قسەی بە باوانمان گوت، ئاینەکەی عەیبدار کردین، کۆمەڵەکەی پەرتەوازە کرد، قسەی بە خواکانمان گوت، بەراستی ئێمە بۆ کارێکی گەورە ئاراممان لەسەری گرتووە.

ئەوان لەم حاڵەدا بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ لایان دەرکەوت، ڕۆیشت تا گەیشتە روکن، پاشان بەلایاندا تێپەری بۆ ئەوەی تەواف بە کەعبەدا بکات.

کاتێك بەلایاندا تێپەڕی توانجیان تێگرد.

گوتی: بەدەموچاوی زانیم هەستی پێکردووە، پاشان تێپەڕی، کاتێك بۆ جاری دووەم گەیشتەوە لایان دیسان توانجیان تێگرت، بە دەموچاوی زانیم هەستی پێکردووە.

بۆ جاری سێیەمیش بە هەمان شێوە بوو، ئینجا فەرمووی **"گوێتان لێیە ئەی خەڵکی قورەیش، سوێند بەو کەسەی گیانی موحەمەدی بە دەستە، بە سەربڕین بۆتان هاتووم"**.

خەڵکەکە قسەکەیان بە هەند وەرنەرگرت، تا هیچ لەو پیاوانە نەما وەك ئەوەی باڵندە لەسەر سەری بنیشێت، تەنانەت کامەیان پێشوتر لە بەرامبەری لە هەموویان توندوتیژتر بوو، بەنەرمی قسەی لەگەڵ دەکرد تا گوتی "بڕۆ ئەی باوکی قاسم، سوێند بە خوا تۆ نەفام نیت!".

پێغەمبەری خواش ﷺ ڕۆیشت.

بۆ بەیانی دیسان لە حیجر کۆبوونەوە و من لەگەڵیان بووم، هەندێکیان بە هەندێکی تریان گوت: باسی ئەوەتان کرد کە چی بەسەر هێناون، ئەوەی لەوەوە پێتان دەگات لەوەی پێتان ناخۆشە وازی لێ دەهێنن.

---

[1] شەرحی (ابن بطال) لە سەحیحی بوخاری (٩/١٤٩).

کاتێك ئەوان لەم قسانەدا بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرکەوت، هەموویان بەیەکەوە بۆی دەرچوون، چواردەوریان گرت و پێیان گوت: ئەوە تۆیت ئەمە و ئەمە دەڵێیت؟ لەوەی بۆیان دەگەڕایەوە لە عەیبدارکردنی خواکانیان و دینەکەیان.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی **"بەڵێ من وا دەڵێم"**.

گوتی: پیاوێکیانم بینی یەخەی کراسەکەی گرت، ئەبوبەکری سدیق ﷺ **هەڵسا و ڕێگری لێکرد و** به گریانەوە دەیگوت "ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت خوای من الله یە". **پاشان ڕۆیشت.**

بەراستی توندرین هەڵویستی قوڕەیشیم لە مەدا بینی سەبارەت بە **پێغەمبەری خوا**[1].

## دڵڕەقەکانی فێردەکرد چی بکەن:

ئەبی هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر خوا ﷺ **حەسەنی کوڕی عەلی** ماچ کرد، ئەو کات أقرع بن حابس التميمي لای دانیشتبوو، أقرع گوتی: من دە منداڵم هەیە تا ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەیرێکی کردوو پاشان فەرمووی "ئەوی بەزەیی بە کەس نەکات، بەزەیشی پێ ناکرێت[2]".

نەوەوی دەفەرموێت "زانایان دەڵێن: ئەمە گشتیگرە و بەزەیی بە منداڵ و بە هەموو خەڵك دەگرێتەوە[3]".

---

[1] ئەحمەد (٦٩٩٦) گێراوەتەوە، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان على صحيح ابن حبان ٢٨٧/٩) بە (حسن)ی داناوە.

[2] بوخاری (٥٩٩٧) و موسلیم (٢٣١٨) گێراوەتیانەوە

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧٧/١٥)

# مامەڵەی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ بەهرەداران

زۆرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ تایبەتمەندبوون بە پێگەیشتن و پێشکەوتن و ڕەسەنایەتی.
لەوانە هەندێکیان بەهرەداربوون لە شیعر وەك حەسانی کوری ثابت ﷺ.
هەندێکیان بەهرەداربوون لە فیقه و تێگەیشتن وەك ئیبن عەباس ﷺ.
هەندێکیان بەهرەداربوون لە دادوەری نێوان ناکۆکیکاران وەك عەلی و موعازی کوڕی جەبەل ﷺ.
هەندێکیان بەهرەداربوون لە توانای فێربوون و شارەزایی پەیداکردن لە پسپۆڕی وەك زەیدی کوڕی ثابت ﷺ.
هەندێکیان بەهرەداربوون لە لەبەرکردنی قورئان وەك ئەبو هورەیرە ﷺ.
هەندێکیان بەهرەداربوون لە زیرەکی سەربازی وەك خالیدی کوڕی وەلید ﷺ.
پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەوچاوی ئەو بەهرە و توانایانەی دەکرد کە هاوەڵە ڕەسەنەکانی هەیانبوو ﷺ.
بۆ هەر یەکێك جۆرێك مامەڵەی دەکرد کە گونجاو بێت لەگەڵ ئاست ئەو توانا و بەهرانەیان.
هەروەها هەر یەکێك لەوانە بۆ کارێکی ڕادەسپارد کە بگونجابایە لەگەڵ بەهرە و شارەزاییەکەی.
حەسانی کوڕی سابیتی ڕاسپارد بۆ وەڵامدانەوەی بێ باوەڕەکان بە شیعرەکانی:

خاتوو عائشە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد زەمی قورەیش بکەن، چونکە ئەمەیان لە تیربارانکردن لەسەریان قورسترە.
ناردی بۆ لای ئیبن ڕەواحە، گوتی زەمیان بکە، ئەویش زەمی کردن، بەڵام پێی ڕازی نەبوو.
ناردی بۆ لای کەعبی کوڕی مالیك.
پاشان ناردی بۆ لای حەسانی کوڕی ثابت، کاتێك هاتە لای، حەسان گوتی: ئێستا کاتی ئەوەیە بنێرن بۆ ئەو شێرە بە کلك شەڕ دەکات[1].
دواتر حەسسان زمانی دەرهێنا و جوڵاندی، گوتی "سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردوە، بە زمانم پارچە پارچەیان دەکەم وەك پارچە پارچەکردنی پێست".
پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی **"پەلە مەکە، ئەبو بەکر لە ڕەچەڵەکی قورەیش شارەزاترە، منیش ڕەچەڵەکم لەوانە تا ئەو ڕەچەڵەکی منت بۆ پوخت دەکاتەوە"**.
حەسان چووە لای، پاشان گەڕایەوە و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ڕەچەڵەکی تۆی بۆ پوخت کردمەوە، سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە، تۆ لەم بابەتە دەردەهێنم وەك چۆن موو لە هەویر دەردێت.

---

[1] مەبەست لە کلك لێرەدا زمانەکەیتی، خۆی بە شێر چواندووە، کاتێك تورە دەبێت بە کلکیش شەڕ دەکات، وەك چۆن حەسان کاتێك هەڵدەچێت بە زمانەکەی دەیکات و دەیجوڵێنێت، خۆی بە شێر و زمانیشی بە کلکی شێر چواندووە. شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم (٤٩/١٦).

**عائیشە فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا بووﷺ کە بە حەسانی دەگوت "بە راستی تا بە خوا و پێغەمبەرەکەی بنازی (روحی قودس) جوبرەئیل بەردەوام لەگەڵت دەبێت".**

**هەروەها عائیشە فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیگوت "حەسسان زەمی کردن، فشفی واشتفی"[1].**

**حەسسان گوتی:**

| | |
|---|---|
| هجوت محمداً فأجبتُ عنه | وعنــد الله في ذاك الجــزاء |
| هجوت محمداً برّاً حنيفاً | رســولَ الله شـيمته الوفـاء |
| فإنّ أبي، ووالده، وعرضي | لعرض محمد منكم وقـاء |
| ثكلتُ بنيتي إن لم تروها | تثير النقع من كنفي كداء |
| يبارين الاعنةَ مصعداتٍ | على اكتافها الأسلُ الظماءُ |
| تظل جيادنا متمطرات | تلطّمهنّ بالخمر النساء |
| فإنْ أعرضتم عنا اعتمرنا | وكان الفتحُ، وانكشف الغطاء |
| وإلا فاصبروا لضراب يوم | يعزّ الله فيه من يشاء |
| وقال الله قد أرسلتُ عبداً | يقولُ الحقَ ليس به خفاء |
| وقال الله قد يسرتُ جندا | هم الأنصار عرضتها اللقاء |
| لنا في كلّ يوم من معدَ | سبابٌ، أو قتالٌ، أو هجاء |
| فمن يهجو رسولَ الله منكم | ويمدحه وينصره، سواء |
| وجبريلٌ رسولَ الله فينا | وروح القدس ليس له كفاء |

**بەرائی کوڕی عازب ﷺ دەگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەسسانی فەرموو "زەمیان بکە، جوبرەئیل لەگەڵتە"[1].**

(1) واتە باوەڕداران شیفایان بۆ هات، ئەویش دڵی ئارام گرت بەو کارەی کردی لە پارچەکردنی بێ باوەڕەکان و شانازی کردن بە ئیسلام و موسڵمانان، شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم (٤٩/١٦).

سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێت: عومەر چووە مزگەوت، حەسان شیعری دەهۆنیەوە، گوتی: من شیعرم لەناو دەهۆنیەوە، لە کاتێکدا ئەوەی تێیدابوو لە تۆ باشتر بوو.

پاشان ئاوڕی بۆلای ئەبو هورەیرە دایەوە، پێی گوت: سوێندت دەدەم بە خوا، ئایا گوێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، کە دەیفەرموو **"لە جیاتی من وەڵام بدەوە، خوایە گەیان بە روحی قودس پاڵپشتی بکەی"**.

ئەویش گوتی: بەڵێ[2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دروستە لە مزگەوت شیعر بهۆندرێتەوە گەر شیعرەکە حەڵاڵ بێت، حەڵاڵیەکەی ئەوەیە، بۆ ستایشی ئیسلام و ئەهلەکەی هۆنرابێتەوە، یاخود بۆ هێرشکردن و جنێوی بێ باوەڕەکان و هاندان بۆ جەنگ لەگەڵیان یاخود ناشیرین کردنیان، ئەمەش لە شیعرەکانی حەسان دا هەبوو.
- دروستە دوعا بۆ ئەو کەسە بکرێ کە ئەو جۆرە شیعرە دەڵێت[3].

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ، دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەمرەکردن چووە مەککە، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە لەگەڵی دەڕۆیشت و دەیگوت:

خلّوا بني الكفار عن سبيله     اليوم نضربكم على تنزيله

ضرباً يزيلُ الهام عن مقيلة     ويذهلُ الخليل عن خليله

**واتەی شیعرەکە:** ئەی بێ باوەڕەکان لاچۆن لەسەر ڕێگاکەی، ئەمڕۆ لەسەر دابەزینی ئەو لێرەدا لێدانێکتان لێ دەدەین، کە سەر لەسەر لاشە لا ببات و هاوڕی ئاگای لە هاوڕێکەی خۆی نەمێنێت.

عومەر پێی فەرموو: ئەی کوڕی ڕەواحە لەبەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ و لە حەڕەمدا ئەم شیعرە دەڵێیت؟

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی **"لێی گەڕێ ئەی عومەر، بەڕاستی ئەم قسەیە لە تیر تێگرتن لەسەریان کاریگەترە"**[4].

---

(1) بوخاری (١٢١٣) و موسلیم (٢٤٨٦) گێراوەتیانەوە

(2) بوخاری (١٢١٢) و موسلیم (٢٤٨٥) گێراوەتیانەوە

(3) شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم (٤٦/١٦)

(4) ترمذي (٢٨٤٧) و النسائي (٢٨٧٣) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (مختصر الشمائل) (٢١٠)

## زەیدی کوڕی سابتی بۆ فێربوونی زمانی یەهودی راسپارد:

خاریجەی کوڕی زەید دەڵێت کە باوکی زەیدی کوڕی ثابت بۆی گێڕاوەتەوە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە، منیان ناردە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش پێم سەرسام بوو.

پێیان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم کوڕە لە نەوەکانی هۆزی (نەجارە، ئەوەی خوای گەورە بۆی دابەزاندووی، ١٠ تا ١٥ سورەتی لەبەرە.

پێی خوێندمەوە، منیش سوڕەتی (ق)م خوێندنەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە سەرسام بوو.

فەرمووی **"ئەی زەید، بۆ من، خۆت فێرە نوسینی یەهودی بکە، سوێند بەخوا بەڕاستی من ئەمین نیم لە نوسینی یەهودییەکان**[1]**"**.

زەید دەڵێت: پازدە شەو تێپەڕی نەکرد بەتەواوی فێری زمان و نوسینی یەهودی بووم. گەر نوسراوی هەبایە بۆم دەنوسی و گەر بۆشی هاتبا بۆم دەخوێندەوە[2].

ئەم فێربوونە خێرایە بەڵگەیە لەسەر زیرەکی و بلیمەتی، بەتایبەت لەو تەمەنە بچوکەیدا.

بۆیە ذهبي دەڵێت "باوکی زەید لە پێش کۆچکردن لە رۆژی بوعاث کوژرا، زەید بە بێ باوکي گەورە بوو یەکێك بوو لە زیرەکەکان[3]".

ابن کثیر دەڵێت "زەیدی کوری ثابت، یەکێك بوو لە زیرەکترینی خەڵکی، زمان و نوسینی یەهودی فێر بوو لە ماوەی پازدە رۆژ، لە نوێنەری کیسرا لەماوەی هەژدە رۆژ فێرە فارسی بوو، هەروەها فێری هەریەکە لە زمانەکانی حەبەشی و رۆمی بوو، لە خزمەتکاری پێغەمبەری خواش ﷺ فێری زمانی قیبتی بوو[4]".

هەر لەبەر ئەمەش بوو، کە پێغەمبەر خوا ﷺ کردیە یەکێك لە نوسەرەکانی وەحی: بەرای کوڕی عازب ﷺ دەڵێت، کاتێك ئایەتی (لا یستوي القاعدون من المؤمنین

[1] واتە نە لە نوسین، نە لە خوێندنەوە ئەمین نیم، دەترسم کاتێك بە یەهودییەك بڵێم نوسراوێکم بۆ یەهودیەکان بۆ بنوسە یان زیادی بکات یان کەم، یاخود گەر نوسراوێکیشم لای ئەوان بۆ هات، دەترسم یەهودیەك بە زیادی یان بە کەمی بۆم بخوێنێتەوە، (تحفة الأحوذي ٤١٣/٧)

[2] ترمذي (٢٧١٥) و ئەبو داود (٣٦٤٥) گێراوەتیەوە، بوخاری لە بەشی (الأحکام) بە (جزم)ی ریوایەت کردووە، ئەلبانیش لە (تحقیق المشکاة ٤٦٥٩) بە سەحیحی داناوە.

[3] سیرأعلام النبلاء (٤٢٧/٢).

[4] البدایة والنهایة (٣٣/٨).

والمجاهدون في سبيل الله) واتە ئەوانەی دانیشتوون لەگەڵ ئەوانە جیهاد دەکەن لە پێناو خوا چوون یەك نین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"بۆم بانگی زەید بکەن، با تەختەیەکی نوسین لەگەڵ قەڵەمێك، یان پارچە پێستێك لەگەڵ قەڵەمێك بێنێت"**.

پاشان فەرمووی **"بنوسە"**: (لا يستوى القاعدون)، ئەو کات لە پشت پێغەمبەری خوا ﷺ عەمری کوڕی أم مکتومی نابینا لەوێ بوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی چی فەرمان دەکەی، من پیاوێکی نابینام؟

راستەوخو لە شوێنیدا ئەم ئایەتە دابەزی﴿ لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴾ النساء: ٩٥

واتە: ئەوانەی دانیشتوون لە ئیمانداران و (جەنگ ناکەن) مەگەر ئەوانەیان کە ناتەواون (نابینا، شەل، نەخۆش،...هتد) لەگەڵ ئەوانەدا کە جیهاد دەکەن لە پێناوی خوادا بە ماڵ و سامان و خۆیان چوونیەك نین.

لەبەر ئەم سیفەتانەی لە زەید دابوون، بۆیە ئەبو بەکری سدیق ئەوی بۆ کۆکردنەوەی قورئان هەڵبژارد.

خۆی دەگێڕێتەوە ﷺ دەڵێت: ئەبو بەکر بەدوای داناردم و کوشتاری خەڵکی یەمامەی پێراگەیاندم، عومەریش لە لای دانیشتبوو، ئەبوبەکر گوتی: عومەر هاتە لام و پێی گوتم کوشتن لە شەڕی یەمامە زۆر بووە، دەترسم کوشتن بگاتە قورئان لەبەرەکان (حافیزەکان)، پێش ئەوەی کۆی بکەینەوە زۆرێك لەو قورئان لەبەرانەمان لە دەست بچن، بۆیە پێم باشە قورئان کۆ بکەینەوە.

ئەبو بەکر دەڵێت: بە عومەرم گوت: چۆن شتێك بکەم، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردبێت؟

عومەر گوتی: سوێند بەخوا ئەمە شتێکی باشە.

بەردەوام عومەر دەهاتە لام لەو بارەیەوە تا خوای گەورە سینگی بۆ ئەم کارە فراوان کردم و هەمان ڕای عومەرم لا دروست بوو.

زەید دەڵێت: ئەو کات عومەر لە مەجلیسەکە دانیشتبوو قسەی نەدەکرد، ئەبو بەکر پێی گوتم: تۆ پیاوێکی گەنج و عاقڵیت، تۆمەتباریشت ناکەین، تۆ وەحیت بۆ پێغەبمەری خوا ﷺ دەنوسی، بۆیە قورئان کۆ بکەرەوە.

زەید دەڵێت: سوێند بە خوا گەر رایسپاردبام بۆ گواستنەوەی شاخێك لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر هێندی کۆکردنەوەی قورئان لەسەرم قورس نەبوو، پێم گوت: چۆن شتێك دەکەن، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نەیکردووە؟

ئەبوبەکر گوتی: سوێند بەخوا ئەمە شتێکی باشە. بەردەوام دەچوومە لای، تا خوای گەورە سینگی منیشی بۆ ئەم کارە فراوان کرد وەك چۆن سینگی عومەر و ئەبوبەکریشی فراوان کرد، هەڵسام بە ئەنجامدانی و کۆکردنەوەی لە پارچە و لەوحی نوسین و پێست و سینگی پیاوان.. [1]
(١)

**سوودێك:**

عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب ﷺ دەفەرموێت: خاوەنی گەورەترین پاداشت لەبارەی قورئان ئەبوبەکرە، رەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر، یەکەم کەس بوو قورئانی لە نێوان دوو لەوحدا کۆکردەوە"[2].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی عەلی بۆ ئەبوبەکر ﷺ، بەڵگەیە لەسەر رێز و دانپیانان بە خیلافەتەکەی پێچەوانەی ئەوەی رافیزە و درۆزنەکان دەیڵێن.

**موعازی کوڕی جەبەلی بۆ دادوەری خەڵکی یەمەن راسپارد:**

لەبەر پێگەیشتن و تێگەیشتنی موعازی کوڕی جەبەل ﷺ، لە ناسینی حەرام و حەڵاڵ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەرکی دادوەریکردنی خەڵکی یەمەنی پێ سپارد.

ئەسوەدی کوڕی یەزید دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل لەیەمەن وەك ئەمیر و مامۆستا هاتە لامان، پرسیارمان لێکرد لە بارەی پیاوێك کە مردووە و لە دوای خۆی کچ و خوشکێکی بەجێماوە، ئەویش نیوەی دایە کچەکەوە و نیوەشی دایە خوشکەکەی[3].

کەسانێك لە خەڵکی حیمس لە هاوەڵانی موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕنەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ویستی موعاز بنێرێتە یەمەن پێی فەرموو **"گەر پرسێکی دادوەریت هاتەلات، چۆن حوکم دەکەیت؟"**.

گوتی: بە کتێبی خوا حوکم دەکەم

فەرمووی: **"گەر لە کتێبی خوا نەتدۆزیەوە؟"**.

گوتی: بە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) بوخاری (٤٦٧٩) گێراوەتیەوە

(٢) ئەبوبەکری کوڕی ئەبی داود لە (المصاحف ٤٩/١) گێڕاوەتیەوە، ئیبن حەجەر لە (فتح الباری ١٢/٢) بە (حسن)ی داناوە

(٣) بوخاری (٦٧٣٤) گێراوەتیەوە

فەرمووی **"گەر نە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا و نە لە کتێبی خوا نەتدۆزیەوە؟"**.

گوتی: بە رای خۆم ئیجتهاد دەکەم و لانادەم و زیادەڕۆیی ناکەم

پێغەمبەری خوا ﷺ لە سینگی دا و فەرمووی **"سوپاس بۆ خوا کە نوێنەری پێغەمبەری خوای سەرکەوتوو کرد تا پێغەمبەری خوا رازی بکات"**[1].

## موسعەبی کوڕی عومەیری بۆ بانگەواز ناردە مەدینە:

موسعەبی کوڕی عومەیری وەك مامۆستایەك هەڵبژارد بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم باڵوێزی ئەو، موسڵمانان فێری بنەماکان و رێنماییەکانی ئیسلام بکات، فێرە خوێندنەوەی قورئانیان بکات، بانگەوازی بۆ رێگەی ڕاست و دروستی پەروەدگار بکات، بۆیە بە مامۆستای قورئان ناونرابوو[2].

بەم شێوەیە شاری مەدینە فەتح کرا بەڵام بە شمشێر نا.

بەرائی کوڕی عازب ﷺ دەڵێت: یەکەم کەسێك، کە هاتبێتە لامان موسعەبی کوڕی عومەیر و ئیبن مەکتوم بوون، خەڵکیان فێرە خوێندنەوەی قورئان دەکرد[3].

## نەجیب زادەکانی بۆ ئەنجامدانی کارە قورسەکان هەڵدەبژارد:

عەلی راسپارد بۆ مانەوەی لە جێگای نوستنی خۆی لە کاتی کۆچکردن، کاتێك قورەیشەکان لە پەرلەمانی خۆیان (دار الندوة) کۆبوونەوە، یەکڕابوون لەسەر کوشتنی پێغەمبەر ﷺ و رزگاربوون لێی، خوای گەورەش لەم بارەیەوەی وەحی دابەزاندە سەری.

فەرمانی بە عەلی کوڕی ئەبو تالیب کرد ئەو شەوە لە جێگای نوستنی بمێنێتەوە، دوژمنەکانیش دەوری خانووەکەیان داوە چاوەڕێی کوشتنی دەکەن، عەلی ﷺ لە جێگای نوستنی پێغەمبەری خو ﷺ نوست، لە کاتێکدا ئەو دەیزانی ئەم کارە چ مەترسییەکی

---

[1] أبو داود (٣٥٩٢) و ترمذي (١٣٢٧) گێراوەتیانەوە، ابن القیم لە (إعلام الموقعین ١/١٥٥) بە سەحیحی داناوە. ابن کثیر دەڵێت: ئەمە فەرمودیەکی (حسن ومشهور)ـە، زانایانی ئیسلام لە چەسپاندنی بنەمای پێوانەکردن (قیاس) پشتی پێ دەبەستن، بوخاری و ترمذي ئەم فەرموودەیەیان بە (ضعیف) داناوە، ابن= الجوزی دەڵێت: گەر چی زانایان هەموویان لە کتێبەکانیان باسی دەکەن دروست نییە پشتی پێ ببەستن، تەنانەت گەر ماناکەشی دروست بێت، ئەلبانی دەڵێت (منکر)ـە. سەیری هەریەکە لەمانە بکە: التخلیص الحبیر (٤/٣٣٧)، العلل المتناهیة (٢/٢٧٣)، تحفة الطالب بمعرفة أحادیث مختصر ابن الحاجب (١/١٢٥) فتح الغفار الجامع لأحکام سنة نبینا المختار (٤م٢٠٥)، الضعیفة (٨٨١).

[2] سەیری ژیاننامەی پێغەمبەر ئیبن هیشام (١/٤٣٤) بکە.

[3] بوخاری (٤٦٧٩) گێراوەتیەوە

تێدایە، دەشیزانی دوژمنەکانی لە نێوان ئەو و پێغەمبەردا لە کاتی نوستندا جیاوازی ناکەن، بە گومانی ئەوەی ئەو کەسەی نوستووە پێغەمبەرە لەوانەیە بیکوژن.

کەس ناتوانێت ئەم کارە پڕ مەترسییە بکات تەنیا پیاوە پاڵەوانەکان نەبن، بۆیە هەڵبژاردنی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە سەر عەلی کوڕی ئەبی تالیب ﷺ بۆ راپەڕاندنی ئەم کارە قورسە، بۆیەش بەم کارە قورسەی ڕاسپارد چونکە ژیری و توانای پێشەوا عەلی دەزانی.

بە هەمان شێوە هەڵبژاردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ عەلی ﷺ بۆ هەڵگرتنی ئالا لە رۆژی خەیبەر.

لە شەڕی خەندەق حوزەیفەی کوڕی یەمانی ﷺ هەڵبژارد بۆ ئەوەی بچێتە ناو ریزەکانی دوژمن و هەواڵی ئەوانی بۆ بهێنێت.

ئیبراهیمی تەمیمی لە باوکی خۆیەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لای حوزەیفە بووین، پیاوێك گوتی: ئەی باوکی عەبدوڵڵا ئایا پێغەمبەری خواتان بینیووە و هاوەڵایەتیتان کردووە ؟

گوتی: بەڵی ئەی برازاکەم.

گوتی: سوێند بە خوا گەر ئێمە بینیبامان، نەمان دەهێشت لەسەر زەوی بڕوا، بەڵکو لەسەر شانی خۆمانمان دادەنا، شەڕ و تێکۆشانم بۆ دەکرد.

حوزەیفەش گوتی: تۆ ئەمەت دەکرد! سوێند بەخوا گەر ئێمەت دەبینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەندەق، ئەوکات بایەکی زۆر سارد و توند هەڵیکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکی شەودا نوێژی کرد، پاشان ئاوڕی دایەوە بۆلای ئێمە و فەرمووی "**ئایا کەسێکتان دەچێ هەواڵی دوژمنم بۆ بێنێت، خوای گەورە لە رۆژی دوایی دەیکاتە هاوڕێم؟**".

بێ دەنگ بووین، کەس لە ئێمە وەڵامی نەدایەوە.

پاشان نوێژی کرد و ئاوڕی دایەوە بۆ لامان و فەرمووی "**ئایا کەسێکتان دەچێ هەواڵی دوژمنم بۆ بێنێت، خوای گەورە لە رۆژی دوایی دەیکاتە هاوڕێم؟**".

بێ دەنگ بووین، کەس لە ئێمە وەڵامی نەدایەوە.

دیسان فەرمووی "**ئایا کەسێکتان دەچێ هەواڵی دوژمنم بۆ بێنێت، خوای گەورە لە رۆژی دوایی دەیکاتە هاوڕێم؟**".

هیچ یەکێك لە ئێمە لەبەر زۆری ترس و برسێتی و سەرماوە وەڵامی نەدایەوە.

دواتر فەرمووی "**هەڵسە ئەی حوزەیفە، هەواڵی ئەوانم بۆ بێنە**".

کاتێك بەناوی خۆم بانگی دەکردم، هەرگیز بۆ هەڵسانەوە هەستم بە ماندوویەتی نەدەکرد.

فەرمووی: **"هەڵسە ئەی حوزەیفە، بچۆرە ناو دوژمن، بزانە چی دەکەن، هیچ شتێك نەکەی تا هەواڵی ئەوانمان بۆ نەهێنیت"**.

کاتێك لەلای رۆیشتم، وەك ئەوە وا بوو بەناو گەرماودا تێپەڕ بم.( واتە هەستی بەسەرما نەدەکرد) تا چوومە لایان.

چوومە ناویان، هەڵکردنی با و سەربازانی خوا دەردێیکان بەسەر هێنابوون کەس بەسەری نەهاتبێت، هیچ شتێك نە مەنجەڵ و نە ئاگر و نە خانوو ئۆقرەی لەناویان نەدەگرت.

ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب هەڵسا و گوتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش، هەریەکێك لە ئێوە سەیری هاوڕێی تەنیشتی بکات.

حوزەیفە دەڵێت: دەستی پیاوێکی تەنیشتم گرت و پێم گوت: تۆ کێی؟

گوتی: من فلانی کوڕی فلانم

پاشان ئەبو سوفیان گوتی: ئەی کۆمەڵی قورەیش، وڵاخەکانمان بە هیلاك چوون، بەنی قورەیزە سەرپێچیان کردین، ئەوەی پێمان ناخۆشبوو توشی بووین، دەبینن ئەم بایەش چی لێکردین، سوێند بەخوا نە مەنجەڵ ئۆقرە دەگرێت، نە ئاگر گەرممان دەکاتەوە، نە ئەو خانوو و خێمانەش دەمان گرێتە خۆی، بڕۆن من دەڕۆم.

پاشان سواری وشترەکەی بوو، کە بەسترابووە، ئینجا لێیدا، هەر کە گوریسەکەی کردەوە لەسەر هەرسێ قاچ هەڵسا.

تیرەکەم خستە ناو کەوانەوە، ویستم تێی بگرم، بەڵام فەرمایشتی پێغەمبەری خوام ﷺ بیرکەوتوە **"هیچ شتێك نەکەی تا هەواڵی ئەوانمان بۆ نەهێنیت"**. گەر تێم بگرتبا دەمپێکا.

حوزەیفە دەڵێت: پاشان گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەتگوت وا هەر لەناو گەرماودا دەڕۆم.

کاتێك گەیشتمە لای، هەواڵی دوژمنم پێ ڕاگەیاند، دوای تەواوبوونم، ئینجا سەرمام بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو عەبایەی کە نوێژی لەسەر دەکرد، بەسەریدا دادام، تا بەیانی خەوم لێکەوت.

کاتێك بەیانیم کردەوە، پێی فەرمووم **"هەڵسە ئەی خەوتوو"**[(١)].

کاتێك حوزەیفە دەڵێ لەناو گەرماودا دەڕۆم: واتای وایە، ئەو هەستی بەو سەرما و بایە سارده نەکردووە کە خەڵك هەستی پێ دەکرد، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی دوعا و بەرەکەتی وەڵامدانەوەی داواکەی پێغەمبەر ﷺ لەسەری لابردووە.

ئەم ڕەحمەتە و گەرمایەش بەردەوام بووە لەگەڵی تا گەڕاوەتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، کاتێکیش گەڕاوەتەوە، وەك کەسێکی ئاسایی هەستی بەسەرما کردووە، ئەمەش بەڵگەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

(حمام) بێژەیەکی عەرەبییە، وشەکە لە (الحميم) هاتووە، بە واتای ئاوی گەرم[(٢)].

هەڵبژاردنی حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ، بۆ ئەم کارە قورس و پڕ مەترسییە، لەم کەش و هەوایە ناخۆش و لەم ساتە پڕ بەڵایە، لە ڕاستیدا هەڵبژاردنێك بوو لە زانیاری پێغەمبەری خوا ﷺ سەرچاوەی گرتبوو، بە هەبوونی زانیاری لەسەر توانا و لێهاتووی حوزەیفە ﷺ.

هەر چی خەسڵەتی جانفیدایی و سەرکێشی و شارەزایی هەیە لە ئەرکەکەی تێیدا کۆبۆتەوە، لە تاریکییەکی توند و سەرمایەکی زۆر وەك جانفیدایەك کە چوار دەوری بە مەترسی دەورە درابێت چووە ناو خەڵکی (ئەحزاب)، ئەو گوێی پێ نەدەدا، ئەو کەسێکی باوەڕ چەسپاوبوو، دڵ و دەروون پاك بوو، کەسایەتییەکی پتەوی هەبوو، ئەگەر کاتێکیش کاروبارەکان بەرەو قەیران چووبان شارەزابوو لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا، خێرا بوو لە دەستپێشخەریدا[(٣)]".

## پایە و پێگەیانی لەناو هاوەڵانی خۆیدا ئاشکرا دەکردن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ، دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەڕی ئوحددا شمشێرێکی بە دەست گرت و فەرمووی **"کێ ئەمەم لێ وەردەگرێ؟"**.

هەموو مرۆڤەکانی ئەوێ دەستیان درێژکرد، هەر یەکێك دەیگوت: من من.

فەرمووی **"کێ بە حەقی خۆی وەریدەگرێت؟"**.

خەڵکەکە بێ دەنگ بوون.

سەماکی کوڕی خەرشە (ئەبو دوجانە) گوتی: من بە حەقی خۆی وەریدەگرم.

---

(١) موسلیم (١٧٧٨) و ئەحمەد (٢٢٨٢٣) گێڕاوەتیانەوە، ئەم دەقە کۆکراوەی هەردوو ڕیوایەتەکانە.

(٢) شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم(١٤٦/١٢).

(٣) محمد رسول الله (١٩٧/٤)ی محمد صادق عرجون. بە دەستکارییەکی کەمەوە.

وەریگرت و سەری بێ باوەڕەکانی لەلاشە پێ جیا کردووە [1].

**لەسەر ئەو سیفەتە دیارانەی هەیانبوو، ستایشی دەکردن:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:

**بە بەزەیی ترین کەسی ئۆمەتی من، ئەبوبەکرە.**

**توندترینیان لەسەر دینی خوا عومەرە.**

**بەشەرمترینیان عوسمانە.**

**دادوەرترینیان عەلی کوڕی ئەبو تالیبە.**

**باشترینیان بۆ خوێندنەوەی قورئان ئوبەی کوڕی کەعبە.**

**شارەزاترینیان بە حەڵاڵ و حەڕام موعازی کوڕی جەبەلە.**

**زاناترینیان بە زانستی (فرائض) زەیدی کوڕی ثابیتە.**

**بۆ هەر ئۆمەتێك ئەمینداریك هەیە، ئەمینداری ئەم ئۆمەتەش ئەبو عوبەیدەی جەڕاحە** [2].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ هاتنیە حودەیبیە، ئێمە سەد و چل کەس دەبووین، پەنجا سەر مەڕمان پێ بوو کە ئاو نەدرابوو.

پێغەمبەری خوا لەسەر لێواری بیرەکە دانیشت، ئینجا یان دوعای لەسەر خوێند، یاخود فووی تێکرد، ئاوەکە زیادی کرد، خۆمان و مەڕ و ماڵاتەکەش ئاوی خواردەوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەیعەت پێدان لەژێر دارەکە بانگی کردین.

من یەکەم کەس بووم بەیعەتم پێدا، پاشان یەك یەکە بەیعەتیان پێدا.

تا نیوەی خەڵکەکە بەیعەتیان پێدا، ئینجا فەرمووی **"بەیعەت بدە ئەی سەلەمە"**.

گوتم: بە خوا یەکەم کەس بووم بەیعەتم پێدای ئەی پێغەمبەری خوا.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بەبێ چەك بینی، بۆیە زرێ و قەڵغانی پێدام.

پاشان بەیعەتم پێداوە دووبارە، تا لە دواین کەسدا دیسان فەرمووی **"ئایا بەیعەت نادەی ئەی سەلەمە"**.

گوتم: بەخوا لەسەرەتا و لە ناوەڕاستی خەڵکەکە بەیعەتم پێدای ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

فەرمووی **"ئەم جارەش"**.

بۆ جاری سێیەم بەیعەتم پێدا [1].

(١) موسلیم (٢٤٧٠) گێڕاویەتیەوە.

[2] ترمذي (٣٧٩١) و ئیبن ماجە (١٥٥) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٨٩٥) بە سەحیحی داناوە.

پاشان فەرمووی **"ئەی سەلەمە کوا ئەو قەڵغان و زرێیەی پێمدای؟"**.

گوتم:دامە عامیری مامم چونکە بینیم بی ّچەك بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی و فەرمووی **"تو وەك ئەو کەسە وای کە دەڵێت: خوایە گیان خۆشەویستێکم پێ بدەی لە خۆم خۆشەویستر بێت "**.

پاشان بێ باوەڕەکان بۆ ئاشتەوایی نوێنەریان ناردە لامان، تا هەندێکمان بۆ هەندێکی ترمان چووین و ئاشتەواییمان ئەنجامدا.

کاتێك ئێمە و خەڵکی مەککە ئاشتەواواییمان مۆر کرد، لەگەڵ یەکتری تێکەڵاو بووین، من چوومە لای دارێك، ژێرەکەیم لە دڕك پاککردەوە، لە ژێریدا پاڵکەوتم.

چوار لە بێ باوەڕەکانی خەڵکی مەککە هاتن، دەستیان بە قسەگوتن کرد بە پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش لێیان توڕەبووم و چوومە ژێر دارێکی تر.

ئەوانیش چەکەکانی خۆیان بە دارەکە هەڵواسی و پاڵکەوتن.

ئەوان لەو حاڵەتەدا دابوون، تا کەسێك لە خوارەوەی دۆڵەکە هاواری کرد: ئەی موهاجیرەکان ئیبن و زونەیم کوژرا..

دەستم دایە شمشێرەکەم، هێرشم کردە سەر چوار کەسەکە، کە لەخەودابوون، چەکەکانیانم وەکو دەسکێك بە دەستەوە گرت.

پاشان گوتم: سوێند بەو کەسەی ڕووی موحەممەدی ڕێزدار کردووە، هەر یەکێك لە ئێوە سەری بەرزبکاتەوە، لە نێوچەوانی دەدەم.

لێمخوڕین و بردمنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

عامڕی مامیشی پیاوێکی لە بنەماڵەی (العبلات) [2] هێنا. پێی دەگوترا موکرەز، لەسەر پشتی ئەسپێك کە داپۆشرابوو بە پۆشاکێکی پارێزەر لەچەك لەگەڵ حەفتا کەسی تر لە بێ باوەڕەکان.

**پێغەمبەری خوا ﷺ سەیریکردن و فەرمووی "لێیان گەڕێن، یەکەم خراپە هەر لەوانەوە، دووبارە گەڕانەوەش هەر لەوانە"**.

---

(1) ابن المنیر دەڵێت: حیکمەت لە دووبارەبوونەوەی بەیعەتی سەلەمە، ئەوەیە چونکە ئەو کەسێکی پێشەنگ بوو لە شەڕ، لە ڕوانگەی هۆشداری دان بووە. ابن حجر دەڵێت: لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت، چونکە ئەو بە سواری و بە پیادە شەڕ دەکات، بۆیە دەبێت بە گوێرەی سیفەتی شەڕکردنەکەی بەیعەت بدات. فتح الباری (١١٩/٦).

(2) العبلات: لە قورەیش بە أمیەی بچوك و براکانی نوفل و عەبدوڵلای کوڕی شەمس کوڕی عەبد مەناف دەگوترێت، نەسەبیان دەچێتە سەر دایکێك لە بەنی تەمیمی کە بە عەبلەی کچی عەبیدە ناسراوە. شەرحی نەوەی لە سەحیحی موسلیم (١٧٧/١٢).

پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان خۆش بوو، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ الفتح: ٢٤

واتە: هەر ئەو خوایە دەستی بێ باوەڕانی لە ئێوە بەستەوە (نەیهێشت بەگژتاندا بێن) دەستی ئێوەشی گرتەوە دژیان و (نەیهێشت جەنگ ببێت)، دوای ئەوەی ئێوەی زاڵ کرد بەسەریاندا لەناو جەرگەی مەککەدا، خوا هەمیشەو بەردەوام بینایە بەوەی کە دەیکەن.

پاشان بۆ گەڕانەوە بۆ مەدینە ڕۆیشتین، لە شوێنێك دابەزین، کە لە نێوان ئێمە و بنی لحیان شاخێك هەبوو. پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونی کرد بۆ ئەو کەسەی بەم شەوە دەچێتە سەر ئەم شاخە، ئەمەش وەك بنکەیەکی چاودێری دەبێت بۆ پێغەمبەر و هاوەڵانی.

سەلەمە دەڵێت: ئەمە شەوە دوو یان سێ جار سەرکەوتم.

پاشان بەرەو مەدینە ڕۆیشتین.

پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکەی خۆی نارد لەگەڵ ڕەباحی خزمەتکاری، منیش لەگەڵی بووم.

لەکاتی نیوەڕۆ بە ئەسپی تەڵحە لەگەڵی ڕۆیشتم، مێگەلەکەمان ئاو دەدا و دەمان لەوەڕاند و دیسان ئاومان دەدا و دەمان لەوەڕاندەوە، کاتێك بەیانیمان کردەوە، عەبدولرەحمانی فەزاری هێرشی کردە سەر وشتری پێغەمبەر و مەڕەکانی بردو شوانەکەشی کوشت.

گوتم: ئەی ڕەباح ئەم ئەسپە بگرە، بیگەینە تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا، بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕابگەیەنە کە بێ باوەڕەکان هێرشیان کردە سەر ماڵاتەکەی.

چوومە سەر تەپۆلکەیەك، ڕووم لە مەدینە کرد، سێ جار هاوارم کرد، بۆ ئەوەی گوێبیستم بن: گوتم: (یا صباحاه، یا صباحاه)[1].

پاشان بە شوێنی پێی دوژمن کەوتم، تیربارانم دەکردن و شیعرم دەهۆنیەوە و دەم گوت:

أنا ابـن الاكـوع　　　　والـيوم يـومُ الرَضـعِ[2]

---

[1] وشەیەکە لە کاتی ئاگادارکردنەوەی کەسێکی بێ ئاگا لە دوژمن بە کار دەهێندرێت، بۆیەش دەگوترێت (صباحاه) زۆربەی جار لە کاتی بەیانی ئەم هاوارە دەکرا، وەك ئەوەی بڵێن: ئاگادار بن دوژمن لە بەیانیدا هێرشتان دەکاتە سەر. هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ناوبراو دەنگێکی گەورەی هەبوو کە سنور بەزێن بووە. فتح الباری (٤٦١/٧).

[2] الرضع: مەبەست لێی سەرزەنشت کردنە، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی لەناوچوونی کەسی خراپە. واتا سەرەکییەکەی ئەوەیە: کەسێکی زۆر ڕەزیل هەر کاتێك ویستبای وشترەکەی بدۆشێ، ئەوا گوانەکانی دەمژی بۆ ئەوەی

بە دوای پیاوێکیان کەوتم، تیرێکم لە پشتیدا، تا سەری تیرەکە لە شانیدا بزربوو.

ئینجا گوتم:

خذها وأنا ابن الأكوع          واليوم يوم الرضع

سوێند بەخوا هەر تیرم تێدەگرتن، هەر کاتێك سوارێکیان بۆم گەڕابایەوە، دەچوومە لای دارێك لە ژێری دادەنیشتم، پاشام تیرم تێدەگرت، ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو، تا رێگای شاخەکە بەرتەسك بوویەوە، ئەوان چوون بەرەو لای بەرتەسکەکە، منیش چومە سەر شاخەکە، دەستمکردە بەرد تێگرتنیان.

بەردەوام بووم لە بەدوا کەوتنیان، تا هەرچی خوا دروستیکردووە لە وشتری پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویانم خستە پشتمەوەو منیان کردە نێوانی ئەوان وشترەکان.

پاشان هەر بەردەوام بووم لە بەرد تێگرتنیان، تا لە دوای خۆیان ٣٠ دانە پۆشاك و ٣٠ دانە رمیان فڕێدا، باری خۆیان سوك دەکرد.

هەرچی فڕێیان دەدا، نیشانەیەکم [1] لەسەری دادەنا بۆ ئەوەی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی بیزانن.

تا گەیشتنە گەروویەك، کەسێك هاتە لایان، کە فلانە کەسی کوڕی بەدری فەزاری بوو، دانیشتن و نانیان خوارد.

منیش لەسەر لوتکەی (قرن) [2] دانیشتم.

فەزالەی گوتی: ئەوەی دەیبینم کێیە؟

گوتیان: توشمان بە توشی ئەم کەسە توندە بووە. وەڵاهی لە درەنگانی شەوەوە ئێمە رۆیشتین ئەو تیر و بەرد بارانی کردین تا ئەوەی هەمانبوو لێی سەندین.

گوتی: چوار کەس لە ئێوە بۆی بچن.

چوار کەس لەوان بەسەر چیاکە کەوتن بۆلام هاتن.

کاتێك لێم نزیك بوونەوە، گوتم: ئایا دەمناسن؟

گوتیان: نەخێر، تۆ کێی؟

---

جیرانەکانی یان ئەوانەی بەوێدا تێپەڕ دەبن گوێیان لە دەنگی شیر نەبێ نەوەك داوای شیری لێ بکەن. ئەمە بە هەموو کەسێکی رەزیل دەگوترێت: فتح الباري (٧/٤٦٢)

[1] نیشانەکە بریتییە لە دانانی کۆمەڵە بەردێك لەسەری بۆ ئەوەی شوێنکەی پێ بزاندرێتەوە النهاية (١/٤٠)

[2] شاخێکی بچوکە. النهاية (٤/٥٤).

گوتم: من سەلەمەی کوڕی ئەکوەعم، سوێند بەو کەسەی موحەممەدی ﷺ ڕێزدار کردووە، داوای هەر کەسێکم کردبێت پێی گەیشتووم، هەر کەسێکیش داوای منی کردبێت بەمن نەگەیشتووە.

یەکێکیان گوتی: من دڵنیام

گەڕانەوە، شوێنی خۆم چۆڵ نەکرد، تا سوارچاکانی پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لەنێوان دارەکانەوە دێن، یەکەمیان ئەخرەمی ئەسەدی بوو، لەدوای ئەو ئەبو قەتادەی ئەنساری بوو، لەدوای ئەویش میقدادی کوڕی ئەسوەدی کەندی بوو.

جڵەوی ئەسپی ئەخرەمم گرت، ئەوانیش ڕۆیشتن.

گوتم: ئەی ئەخرەم ئاگاداریان بە، با داتنەبڕێنن تا دەگەیتە پێغەمبەری خوا و هاوەڵانی.

گوتی: ئەی سەلەمە، گەر تۆ باوەڕت بەخوا و ڕۆژی دوایی هەیە، دەزانی بە هەشت ڕاستە، ئاگر ڕاستە، ڕێگر مەبە لە نێوان من و شەهید بوون دا.

لێی گەڕام، ئەو و عەبدولرەحمان گەیشتنە یەکتری، ئەسپی عەبدولرەحمانی بریندار کرد، عەبدولرەحمانیش ئەوی بریندار کردوو دواتر کوشتی و سواری ئەسپەکەی بوو.

ئەبو قەتادە سوارچاکی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوای عەبدولرەحمان کەوت، لێیدا و کوشتی.

سوێند بەو کەسەی موحەممەدی ﷺ ڕێزدار کردووە، بە پێ بەدوایاندا ڕۆیشتم، تا هیچ یەکێك لە هاوەڵانی موحەممەد ﷺ لەدوای خۆم نەدیت، تەنانەت تۆزیشیان دیار نەما، دوژمنەکان ڕۆیشتن تا لە ڕۆژ ئاوابوون گەیشتنە شوێنێك ئاوی لێ بوو، پێ دەگوترا (ذو قرد) چونکە زۆر تینووبوون دەیانویست لێی بخۆنەوە، سەیریان کردم کە بەدوایاندا هاتووم، دەرم کردن، نەمهێشت یەك دڵۆپیشی لێ بخۆنەوە.

دەرچوون، تا گەیشتنە ڕێگای شاخ، بە دوایاندا ڕۆیشتم، گەیشتمە پیاوێك لەوان، بە تیرێك لەسەررووی شانیمدا. ئینجا گوتم:

خذها وأنا إبن الأكوع          واليوم يومُ الرَضع

گوتی: دایکت ڕۆ ڕۆت بۆ بکا، تۆ ئەوە نیت لە بەیانی زووە بە دوامان کەوتووی؟

گوتم:بەڵی ئەی دوژمن، لە بەیانییەوە بە دواتان کەوتووم.

دوو ئەسپیان لەو شێونە بە جێهێشت.

عامر گەیشتەلام جامێکی لە شیری تێکەڵ بە ئاوی بۆ هێنابووم، هەروەها کیسەیەکی لە پێست دروستکراو کە ئاوی تێدابوو، منیش دەستنوێژم پێ هەڵگرت و خواردمەوە.

پاشان هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەسەر ئەو ئاوە بوون کە دوژمنەکانم لەسەری دەرکردبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ وشترەکە و هەموو ئەو شتانەی لە دەستی بێ باوەڕەکان دەرمهێنابوو، هەموو چەکەکانیشی وەرگرت.

بیلال وشترەکەی سەر بڕی، جەرگ و دونگەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ سوور دەکردەوە.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دوژمنەکان ئێستا تینوون، منیش نەمهێشت لێی بخۆنەوە، لێم گەڕێ، سەد پیاو هەڵبـژێرم و بەدوایانـدا بچم، هیچ هەواڵنێرێك لەوان نەمێنێت نەمکوشتبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێ کەنی تا ددانەکانی لەبەر تیشکی ئاگر دەرکەوتن.

فەرمووی **"ئەی سەلەمە گەر لێت گەڕێم ئەمە دەکەی؟"**.

گوتم: بەڵێ، سوێند بەو کەسەی تۆی ڕێزدار کردووە.

فەرمووی **"ئەی کوڕی ئەکوەع، توانیت بیکەی، ببەخشە، ئێستا ئەوان لە زەوییەکانی غەتەفان بوونەتە میوان"**.

پیاوێك لە هۆزی غەتەفان هات و گوتی: فلانەکەس ئاژەڵی بۆ سەر بڕین، کاتێك ویستیان پێست لە ئاژەڵەکە بکەنەوە، تەپوتۆزێکیان لە دوور بینی، گوتیان: ئەوان هاتن، بە هەڵاتن ڕۆیشتن.

کاتێکیش بەیانیمان کردەوە پێغەمبەری خوا فەرمووی **"باشترینی سوارچاکی ئەمڕۆ ئەبو قەتادەیە، باشترین پیادەکانیشمان سەلەمەیە[1]"**.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پشکی لە دەستکەوت پێدام: پشکی سوارچاکی، پشکی پیادەڕۆیشتن، هەردووکی بۆ من جێی شانازی بوو[2].

دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ منی بەدوای خۆیدا لەسەر پشتی وشترێك بەرەو مەدینە ڕەوانە کرد.

کاتێك ئێمە دەڕۆیشتین، پیاوێك لە ئەنسارییەکان کە بە پێ دەڕۆیشت دەیگوت: کەسێك هەیە تا مەدینە پێشبڕکێم لەگەڵ بکات، کەس هەیە پێشبڕکێ بکات؟

ئەمەی دووبارە دەکردەوە.

---

[1] ئەم فەرموودە ئەوەی تێدایە کە ڕێگەدراوە ستایشی کەسانی ئازا و کەسانی خاوەن گەورەیی بکەی، بەتایبەت کاتێك کارێکی جوان ئەنجام دەدەن، ئەمەش دەستخۆشیە بۆ ئەوان و هاندانە بۆ کەسانی تر. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٢/١٢).

[2] نەوەوی دەڵێت: ئەوەی لەسەر پشکی پیادە پێی بەخشیووە زیادەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو شایەنی ئەو زیادەیەیە بەوەی ئەنجامی داوە لەو شەڕە.

گوتم: دەبێت رێز لە خانەدانێك بگیرێت و لە گەورەکەیش نەترسیت..

گوتی: نا، تەنیا گەر پێغەمبەری خوا ﷺ بێت.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بە دایك و باوکم قوربانت بم، رێگەم پێبدە پێشبڕکێی لەگەڵ بکەم.

فەرمووی **"گەر حەزت لێیە بیکە"**.

گوتم: بۆی دەچم.

خۆم لەسەر وشترەکە فرێدا، رامکرد، بۆ ماوەی بەرزاییەك یان دوو بەرزایی لە نێوان خۆم ئەو، خۆم دواخست، لەبەر ئەوەی نەوەك هەناسە سواری بمپچڕێنێت لە رێگاکە.

پاشان بە شوێنیدا رامکرد، تاکو پێی گەیشتم، دەستم لە شانی دا و گوتم:

وەڵاهی بە پێشت کەوتن

گوتی: منیش پێم وایە

پێشی کەوتم بەرەو مەدینە

سوێند بەخوا سێ شەو نەماینەوە تاکو بەرەو خەیبەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین.

عامری مامم شیعری دەهۆنیەوە و دەیگوت:

تـــالله لـــولا الله مـــا اهتـــديـــنا ولا تصـــدقنا ولا صـــلَينا

ونحن عن فضلك ما استغنينا فثبِّـــتِ الاقـــدامَ إن لاقينـــا

وأنـــــزلنْ الســـــكينةَ علينـــــا

واتە: سوێند بە الله گەر الله نەبایە، نە رێنوێنیمان وەردەگرت، نە دەمان بەخشی و نە نوێژمان دەکرد، ئێمە لە بەخششی تۆ تێر نەبووین، پێیەکانمان لەشەڕکردن بچەسپێنە، ئارامی خۆتمان بەسەردابەزێنە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی **"ئەمە کێیە؟"**.

گوتی: منم عامیر.

فەرمووی **"خوای گەورە لێت خۆش بێت"**.

هەر کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبوونی بۆ کەسێك تایبەت کردبێت، ئەو کەسە شەهید بووە.

عومەری کوڕی خەتتاب لەسەر پشتی وشترێك بانگی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا عامرمان بۆ بنێرە.

کاتێکیش گەیشتینە خەیبەر، گەورەکەیان مەرحەب هاتە دەرەوە و شمشێرەکەی بەرز کردەوە و دەیگوت:

قد علمت خيبرُ أني مرحب شاكي السلاح بطل مجرب

إذا الحروبُ أقبلتْ تلهبُ

واتە: خەیبەر دەزانێت من مەرحەبم چەکدار و پاڵەوانێکی ئەزموندارم

گەر شەڕ رووبدات من کڵپەی ئاگردارم

دەڵێت: عامری مامم بۆی دەرچوو گوتی:

علمتُ خيبر أني عامر شاكي السّلاح بطل مغامر

**واتە:** خەبیر زانیوویەتی من عامرم چەکدار و پاڵەوانێکی سەرکێشم.

هەردووکیان بە شمشێر لەیەکترياندا، شمشێری مەرحەب کەوتە ناو قەڵغانی عامیر، عامریش لە ژێرەوە لێیدەدا، بەڵام شمێشرەکەی بەرەو لای خۆی گەڕایەوە و بە شانێکی خۆی قرتاند و بەم هۆیەوە وەفاتی کرد.

دەرچووم، بینیم هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن: کردەوەی عامیر پوچەڵ بوویە، چونکە خۆی کوشت.

بەگریانەوە هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا کردەوەی عامیر پوچەڵ بۆتەوە؟

فەرمووی **"کێ ئەمەی گوتووە؟"**.

گوتم: هەندێك لە هاوەڵانت.

فەرمووی: **"ئەوەی ئەم قسەیەی کردووە درۆ دەکات، بەڵکو ئەو دوو پاداشتی بۆ هەیە –دوو پەنجەی بەیەکەوە بەرزکردەوە– بەراستی ئەو جددیە لە بەندایەتی و تێکۆشەریشە لە پێناوی خوا، کەم عەرەب هەیە ئەو سیفەتانەی ئەوی تێدا هەبێت[(١)]"**.

پاشان بۆ لای عەلی رەوانەی کردم، کە چاوی کوڵ بوو بوو فەرمووی **"ئەم ئاڵایە دەدەمە پیاوێك خوا و پێغەمبەری خۆش بوێت، یان خوا و پێغەمبەرەکەی خۆشیان بوێت"**.

چووم عەلیم هێنایە لای پێغەمبەر، چاوی بریندار بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ تفی لەچاوی کرد، چاوی چاك بوویەوە. ئاڵاکەی پێدا.

(١) لە دقە عەرەبییەکە هاتووە، إنه لجاهد مجاهد: جاهد بە واتای جۆش و خرۆشی لە کار و کردەوە لە بەندایەتی کردن، .مجاهد- تێکۆشەر لە پێناوی خوای گەورە، دەشگوترێ بە مەبەستی دڵنیایی دانە بۆیە هەردوو وشەی کۆکردۆتەوە. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢/١٦٩).

مەرحەب هاتە دەرەوە و گوتی:

قد علمت خيبر أني مرحب شاكي السلاح بطل مجرب

إذا الحروبُ أقبلتْ تلهبُ

عەلیش فەرمووی:

أنا الذي سمّتني أمي حيدرة [1] كليث غابات كريه المنظرة

أوفيهم بالصاع كيل السندرة

واتا: من ئەو کەسەم کە دایکم ناوی (حەیدەر)ی لێناوم

وەك شێری داراستان شێوە ترسناکم

بە پێوانەیەکی بێ شومار دوژمن دەکوژم.

لە سەری مەرحەبی داو کوشتی، بەم شێوەیە فەتحی خەیبەر لەسەر دەستی ئەو بوو [2].

ئەوەی دەفەرموێت: لەم فەرموودەیە چوار موعجیزەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە:

**یەکەمیان:** زۆربوونی ئاوی حودەیبییە

**دووەم:** چارەسەرکردنی چاوی عەلی ﷺ.

**سێیەم:** هەواڵدان بەوەی فەتحی خەیبەر لەسەر دەستی ئەو دەبێت

**چوارەم:** هەواڵدان لەبارەی ئەوەی بێ باوەڕەکان لە غەتەفان نان دەخۆن، ئەمانەش روویاندا [3].

## دانی بە هەڵێنجانە جوانەکانی دادەنان:

حەنەشی کوڕی موعتەمیر دەڵێت: عەلی ﷺ، لە یەمەن بوو، چاڵێکیان [4] بۆ راوکردنی شێر هەڵکەند، شێرێك کەوتە ناوی، ئەوان هەر چاوەڕێیان دەکرد، لەو کاتەدا پیاوێکیش کەوتە ناوی، دەستی بەپیاوێك تر گرت، ئەویش بە پیاوێکی تر، ئەویش بە پیاوێکی تر، تا ژمارەیان بووە چوار پیاو کەوتنە ناو چاڵەکە، شێرەکە برینداری کردن.

پیاوێك بە حەربەیەك خۆی بۆ هەڵدا و کوشتی، پیاوەکانیش بەهۆی کاریگەری برینەکەیان مردن.

---

[1] حەیدر: یەکێکە لەناوەکانی شێر، دایکی عەلی، یەکەم جار ناوی شێری لە عەلی نا، ئەمەش وەك ناوی باپیری دایکی (اسد بن هشام بن عبد مناف) ئەو کات ئەبو تالیب لە گەشت بوو، کاتێکیش گەڕایەوە ناوی عەلی لێنا. شەرحی نەوەوی بۆ سەحیحی موسلیم(١٢/١٨٥).

[2] موسلیم (١٨٠٧) گێراویەتیەوە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی بوخاری (١٢/١٨٥).

[4] چاڵێیکان بۆ راوکردنی شێر لێدەداو سەریان دادەپۆشی بۆ ئەوەی دیار نەبێت و بکەوێتە ناوی. النهاية (٢/٢٩٥)

دەڵێت: خەڵکەکە لەسەر ئەو بابەتە کەوتنە ناکۆکی و دەستیان دایە چەك.

عەلی ﷺ فەرمووی: دەتانەوێ شەڕ بکەن و لەکاتێکدا پێغەمبەری خواش ﷺ زیندووە، من لە نێوانتاندا دادوەری دەکەم، گەر پێی رازی بوون، ئەوە حوکمەکە جێگیر دەبێت، ئەگەر رازیش نەبوون، ئەوا هیچ ناکەن تا دەچنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی بەخۆی دادوەری لە نێوانتان بکات، هەر کەسێك دوای ئەمە دەستدرێژی بکات هیچ مافێکی نابێت، بڕۆن لەو هۆزانەی چاڵەکەیان هەڵکەندووە چواریەکی خوێن بایی و سێیەکی خوێن بایی و نیوەی خوێن بایی و خوێن بایی تەواو کۆ بکەنەوە. چواریەکەکە بدەنە کەسی یەکەمی کە کەوتۆتە ناو چاڵەکە، سێیەکەکەش بدەنە کەسی دووەم، نیوەکەش بدەنە کەسی سێیەم، خوێن باییە تەواوەکەش بدەنە کەسی چوارەم.

دەڵێت: هەندێکیان رازی بوون، هەندێکیان پێیان ناخۆش بوو، گازندەیان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزکردەوە، چوونە لای، لەو کاتەی ئەو لەلای مەقامی ئیبراهیم بوو، چیرۆکەکەیان بۆ گێڕایەوە.

فەرمووی **"من دادوەری لە نێوانتان دەکەم"**، دانیشت

پیاوێك هەڵسا و گوتی: عەلی دادوەری کردووە، شێوازی دادوەرییەکەی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە دروستی دانا [1].

ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە ئەم چوار کەسە کوژرابوون بە هەڵە، بەهۆی پاڵەپەستۆ و پاڵنانی ئەوانەی لەسەر چاڵەکە بوون، خوێن باییەکە لەسەر ئەوانەیە کە لەوێ لەسەر چاڵەکە بوون.

کەسی یەکەم کوژراوە بە هۆی پاڵپێوەنان، ئەو بکوژی سێ کەسەکەی ترە، بۆیە خوێن بایی کوژراوەکانی لەسەرە، واتە بەشێکی بۆ خۆی و سێ بەشەکەی تری بۆ سێ کوژراوەکە.

کەسی دووەم مافی سێیەکی خوێن بایی هەیە، دوو بەشەکی تر بدات بە دوو کەسەکەی بەراکێشان بۆ ناو چاڵەکە کوشتوونیەتی.

کەسی سێیەم، مافی نیوەی خوێن باییەکەی هەیە، نیوەکەی تریش بدات بەو کەسەی لە دوای خۆی بە راکێشان کوشتوویەتی.

بەڵام کەسی چوارەم مافی تەواوی خوێن بایی هەیە، چونکە کەسی نەکوشتووە.

ئیبن عەرەبی دەڵێت "ئەمە لە هەڵێنجانە هەرە جوانەکانە [1]".

---

[1] ئەحمەد (٥٧٤) گێراوەتیەوە. ئەلبانی لە سەحیحەکەی بە سەحیحی داناوە (٤٧٨/٢)

پێغەمبەری خوا ﷺ بایەخێکی لە رادەبەدەری بە عەبدوڵلای کوڕی عەباسی ئامۆزای دەدا، ئەمەش بەهۆی ئەو سیفەتانەی لە پێگەیشتن و ژیری تێیدا هەبوون.

عەبدوڵلای کوڕی عەباس ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی بە سینگی خۆیەوە ناو و فەرمووی "**خوایە گیان فێرە دانایی بکە**".

لە روایەتێکی تردا دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ چووە سەر ئاو، منیش ئاوی دەستنوێژم بۆ دانا، فەرمووی "**کێ ئەمەی لێرە داناوە؟**". ئەویش پێی گوت: من

فەرمووی "**خوایە لە دین شارەزای بکەی**[2]".

لە روایەتێکی تردا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خاتوو مەیمونە بوو، منیش لەشەو ئاوی دەستنوێژم بۆ دانا، خاتوو مەیمونە پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا عەبدوڵلای کوڕی عەباس ئەمەی بۆ داناوی.

ئەویش فەرمووی "**خوایە گیان لە دین شارەزای بکەی و فێری راڤەکردنی بکەی**[3]".

نەوەوی دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیە گەورەیی تێگەیشتن لە دینی تێدایە. هەروەها سوننەتە دوعای خێر بۆ مرۆڤێك بکەی کە کاری چاکەی کردووە.

هەروەها دوعاکەی پێغەمبەریش ﷺ قبوڵ بووە، بەو پێیەی عەبدوڵلا لە تێگەیشتن لە دین بووە زانایەکی هەرە پلە بەرز[4].

ابن المنیر دەڵێت: بۆنەو گونجانی دوعای تێگەیشتن لە دین بۆ ئیبن عەباس لەو ئاوەی داینا ئەوا ئەو لەبەردەم سێ کار دا بوو:

یان دەبا ئاوەکەی بۆ ببردبایە ئاودەست، یاخود دەبا لەبەر دەرگا دایینابا، بۆئەوەی لە نزیکەوە وەریبگرێت، یانیش هیچ کام لەمەی نەکردبا. هی دووەمیانی لەهەمووان پێ گونجاوتر بووە، چونکە لەیەکەم لەوانەیە لەسەر ئەو حاڵە ببینێت، سێیەمیش وادەخوازێت ئاو هێنان قورس بێت، بەڵام دووەمیان لە هەموویان ئاسانترە، هەڵبژاردنی کارەکەی بەڵگەیە لەسەر ژیری و زیرەکی، جا گونجاو بوو دوعای تێگەیشتن لە دینی بۆ بکات بۆ ئەوەی سوود بگەیەنێت، هەر واش ڕوویدا[5].

---

[1] أحکام القرآن (٤/٤٤) ابن العربی

[2] بوخاری (١٤٣) و موسلیم (٢٤٧٧) گێراوەتیانەوە

[3] ئەحمەد گێراوەتیەوە(٣٠٢٤).

[4] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٦/٣٧)

[5] فتح الباری (١/٢٣٢)

ئیبن عەباس ﷺ، لە کاتێکدا بە تەمەن لە هەموو هاوەڵەکان بچوکتر بوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە دیارترینی موفەسیرەکان بوو، پێش کۆچکردنی پێغەمبەر بەر لە سێ ساڵ لە دایك بووە، بەهۆی خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەر و خزمایەتی لەگەڵ مەیمونەی خێزانی پێغەمبەر، هەر لە منداڵییەوە هاوڕێیەتی پێغەمبەری ﷺ کردووە، چۆن وا دەرناچێت یەکێك پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کردبێت..!؟

کاتێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، ئەو تەمەنی سێزدە ساڵان بوو.

ئیبن مەسعود دەفەرموێت: باشترین موفەسیری قورئان ئیبن عەباسە [1]..

ئیبن عومەریش دەفەرموێت: زاناترین کەسە بەو ئایەتانەی خوای گەورە بەسەر موحەممەد دابەزاندووە [2].

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوای خۆی لەسەر وڵاخ سواری کردووە:

عەبدوڵڵا کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: ڕۆژێکیان لەدوای پێغەمبەر ﷺ سوار بوو بووم، فەرمووی **"ئەی کوڕە، من چەند وشەیەکت فێر دەکەم: خوا بپارێزە دەتپارێزێت، خوا بپارێزە لەلای خۆت دەیبینیەوە** (واتە: لە خۆشی خوات بە بیر بێت، ئەویش لە ناخۆشیدا تۆی بە بیر دەبێت) **گەر داوات کرد، تەنیا داوا لە خوا بکە، گەر داوای پشتیوانیشت کرد، تەنیا پشت بە خوا ببەستە.**

**بشزانە، گەر هەر هەموو ئوممەت کۆ ببنەوە و بیانەوێت سوودێکت پێ بگەیێنن، هیچ سوودت پێناگەیەنن تەنیا بە شتێك نەبێ، ئەویش کە خوای گەورە بۆی نوسیبیت، گەر کۆشببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن، هیچ زیانت پێ ناگەیێنن تەنیا بە شتێك نەبێ، ئەویش کە خوای گەورە بۆی نوسیبیت.**

**قەڵەمەکان بەرز بوونەوە و پەڕاوەکان وشك بوونەوە (بشزانە، بەڕاستی ئارام گرتن لەسەر شتێك کە پێت ناخۆشە خێرێکی زۆری تێدایە، سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتن دایە، دەربازبوون لەگەڵ ناخۆشیدایە، خۆشی لەگەڵ ناخۆشیدایە [3]"**.

بلیمەتی و ژیری لەو کەسە بە دەرکەوت، ئەمیری باوەڕداران عومەر ﷺ دەیناسی و لەلای خۆی نزیکی دەکردەوە.

---

[1] الحاكم لە (المستدرك ٦٢٩١) گێڕاوەتیەوە.

[2] الاجري لە (الشريعة ٢٢٧١/٥) گێڕاوەتیەوە.

[3] ترمذي (٢٥١٦) و ئەحمەد (٢٨٠٠) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە سەحیحەکەی خۆیدا (٢٣٨٢) بە سەحیحی داناوە.

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە: عومەر منی لەگەڵ پیاوە بە تەمەنەکانی بەدر دادەنیشاند [١]، پێ دەچوو هەندێك لە بەر دڵیان بێت، بڵێن: بۆچی ئەمە دێنێتە لامان، لەکاتێکدا ئێمە کوڕمان هێندەی ئەوە؟

ئەویش دەیگوت: ئەو ئەو کەسەیە ڕۆژێکدا دێت دەیناسن [٢].

ڕۆژێکیان بانگی کردن، منیشی بانگ کرد، بانگکردنی منی بۆ ئەوە بوو، کە ئەوەی لەمندا هەبووە پێیان پیشانبدا:

پێی گوتن: لەبارەی ئەم سورەتەوە چ دەڵێن: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ...﴾ النصر: ا تا کۆتایی سورەتەکە..

هەندێکیان گوتیان: فەرمانمان پێ دەکات، کاتێك سەردەکەوین و فەتحی خوا دێت، سوپاسی خوا بکەین، داوای لێخۆشبوونی لێ بکەین.

لە ریوایەتێکی تردا: گوتیان: فەتحی مەدائین و قەسرەکانە.

هەندێکی تریش گوتیان: نازانین

بەمنی گوت: ئەی کوڕی عەباس، تۆش ئەمە دەڵێی؟

گوتم: نەخێر

گوتی: ئەی چی دەڵێی؟

گوتم: ئەمە کاتی وەفاتی پێغەمبەرە ﷺ کە خوای گەورە بۆی دیاریکرد.﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ..﴾ مەبەست لێی فەتحی مەککەیە، ئەمە نیشانەی وەفاتکردنیەتی ﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾

عومەر فەرمووی: ئەوەی تۆ دەیزانی منیش هەر ئەوە دەزانم [٣].

لەم گێڕانەوەدا، لێهاتووی ئیبن عەباس و کاریگەری قبوڵبوونی دوعاکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ فێربوونی تەفسیری قورئان دەردەکەوێت.

نەوەوی دەفەرموێت: پێگەی ئیبن عەباس لە زانست و تێگەیشتنی دین و بیر تیژی ئاشکرایە، ئەمە وێڕای زۆر گەڕان و شارەزابوون لە ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە کەس نەیدەزانی، هەروەها وەرگرتنی زانست لەسەر دەستی گەورە هاوەڵان [١].

---

[١] عومەر گەر لەلای خەڵك دابنیشتبایە، عادەتی وابوو خەڵکی بە گوێرەی پێگەی خۆیان دەهاتنە لای، لەوانەیە لەگەڵ خەڵکی مەدینە هەندێکی تری کۆدەکردنەوە کە لەوانە نەبوون، بەڵام تایبەتمەندی ئەوانیان تێدا بوو.

[٢] ئاماژەی بە خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەدا، یان ئاماژەی بە زانیاری و زیرەکی ئەو دلوە فتح الباری (٨/٧٣٥).

[٣] بوخاری (٤٢٩٤) گێڕاوەتیەوە.

ڕۆژێك دادەنیشت، تەنیا باسی زانستی فیقهی دەکرد، ڕۆژێك تەنیا تەفسیر، ڕۆژێك تەنیا جیهادکردن، ڕۆژێکیش بۆ شیعر و ڕۆژێکیش بۆ مێژووی عەرەب[٢].

یەعقوب بە سەنەدێکی سەحیحەوە دەگێڕێتەوە، هەروەکو حافزی کوڕی حەجەر لە ئەبی وائیلەوە دەگێڕێتەوە: ئیبن عەباس ڕۆژێکیان سورەتی نوری خوێندەوە، پاشان دەستی بە تەفسیرکردنی کرد، پیاوێك گوتی: گەر دوژمن گوێی لەمە بێت موسڵمان دەبێت[٣].

موعجیزەیەك بووە بۆ لەبەرکردن، ئیبن ئەبی ڕەبیعە هونراوەیەکی خۆی بەسەردا خوێندەوە کە سەرەتاکەی ئەمەیە:

أمن آلِ نعمٍ أنت غادٍ فمبكر...

بە یەکەم جار لەبەری کرد، کە هەشتا دێڕ بوو[٤].

**لەو بەهرەدارانەی پێغەمبەر ﷺ بایەخی پێداون: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودە:**

ذهبي لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو لە یەکەمە پێشینەکان بووە، لە سەرکەوتووەکانی جیهان بووە[٥].

هەروەها دەڵێت: ئەو لە زانا زیرەکەکان ئەژمار دەکرا[٦].

شەقیقی کوڕی سەلەمە دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود وتارێکی بۆ داین، فەرمووی: سوێند بە خوا، حەفتا و هەندێك سورەتم لە دەمی پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە، سوێند بە خوا هاوڕێیانم دەیانزانی کە من لە هەموویان زاناتر بووم بە کتێبەکەی خوا، بەڵام باشترینیان نەبووم.

شەقیق دەڵێت: لە یەکێك لە بازنەکان دانیشتبووم و گوێم لێیان گرتبوو، بەڵام هیچ ڕەتدانەوەیکم گوێ لێ نەبوو پێچەوانەی قسەکانی بێت[٧].

پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکرد هەندێك قورئانی بەسەردا بخوێنێت، ئەویش سەرەتای سورەتی (النساء)ی بەسەردا خوێند.

---

(١) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم(٤/٢٩٠).
(٢) الاعلام للزركلي (٤/٩٥).
(٣) فتح الباری (٧/١٠٠).
(٤) الاعلام للزركلي (٤/٩٥)
(٥) سير أعلام النبلاء (١//٤٦١)
(٦) سير أعلام النبلاء (١//٤٦٢)
(٧) بوخاری (٥٠٠٠) و موسلیم (٢٤٦٢) گێراوەتیانەوە

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم **"بەسەرمدا بخوێننەوە"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرتدا بخوێنم، لە کاتێکدا بەسەر تۆدا دابەزیووە؟

فەرمووی **"بەڵێ"**.

سورەتی (النساء)م خوێند تا گەیشتمە ئەم ئایەتە ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾ النساء: ٤١ واتە: ئینجا دەبێت حاڵی ئەم خەڵکە چۆن بێت، کاتێك لە هەر میللەتێك، شایەتێکمان هێنا، تۆشمان هێنا ئەی موحەممەد ﷺ بە شایەت بەسەر ئەم خەڵکەوە.

فەرمووی **"ئێستا بەسە"**.

کاتێك ئاوڕم لێدایەوە، دەبینم فرمێسك لە چاوەکانی دەبارێت[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی وەرگرتنی قورئان، ڕێنماییەك دەردەکات، دەفەرموێت **"قورئان لە چوار کەس وەربگرن: لە کوڕی ئومی عبد – بە عەبدوڵڵا دەستی پێکرد– موعازی کوڕی جەبەل، ئوبەی کوڕی کەعب و سالمی خزمەتکاری ئەبو حوزەیفە[2]"**.

واتە لەوان فێر بن، دوو کەسی یەکەم لەو چوار کەسەی باسی کردن، موهاجیر بوون، دووەکەی تریش ئەنسارین، سالمی کوڕی مەعقەلیش خزمەتکاری ئەبو حوزەیفە بوو.

زانایان دەفەرموون: هۆکارەکەی ئەمەیە، کە ئەم کۆمەڵەیە لە هەموو کەس زیاتر وشەکانی قورئانیان بەڕێکی دەخوێند و کارامەتر بوون، گەرچی کەسانی تر هەبوون لە واتاکانی قورئان لەوان شارەزاتر بوون.

یان لەوانەیە هۆکارەکەی ئەمە بێت، کە ئەم چوارە خۆیان تەرخان کردووە لە وەرگرتنی قورئان ڕاستەو خۆ لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام هاوەڵانی دیکە لە یەکتریان وەردەگرت.

یاخود لەوانەشە ئەم چوار کەسە خۆیان تەرخان کردبێت کە خەڵك قورئانیان لێ وەربگرێت.

یان لەوانەشە پێغەمبەر ﷺ ویستبێتی توانا و پێشەنگی ئەم چوار کەسە لە دوای مردنی خۆی بە خەڵك ڕابگەیەنێت، کە ئەوانە لە کەسانی تر دامەزراوترن با قورئانیان لێ وەربگیرێت[3].

---

[1] بوخاری (٥٠٥٠) و موسلیم (٨٠٠) گێراوەتیانەوە

[2] بوخاری (٣٨٠٦) و موسلیم (٢٤٦٤) گێراوەتیانەوە

[3] شەرحی نەوەی لە سەحیحی موسلیم(١٦/١٨).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: ئەبوبەکر و عومەر موژدەیان پێدام، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **"هەر کەسێك حەزی لێیە قورئان بە پاراوی بخوێنێت وەك ئەوەی دابەزیووە، با لەسەر خوێندنەوەی کوڕی ئومی عبد بخوێنێتەوە"**[1]. واتا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود.

**لە بەهرەدارەکانی لەبەرکردنی قورئان: ئەبو هورەیرە ﷺ:**

ئەبو هورەیرە ﷺ، دەڵێت: ئێوە دەڵێن، کە ئەبو هورەیرە فەرموودەی زۆر لەبارەی پێغەمبەری ﷺ دەگێڕێتەوە، هەروەها دەڵێن، ئەی لەبارەی موهاجیر و ئەنسارەکان چی، کە وەك ئەبو هورەیرە فەرموودە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناگێڕنەوە؟

برایانم لە موهاجیرەکان سەرقاڵی کاسبی بوون لە بازاڕ، منیش بەردەوام هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوام ﷺ دەکرد، رازی بووم بەو پارووە نانەی سکی تێر دەکردم، گەر ئەوان لەوێ نەبان، من ئامادەییم هەبوو. گەر ئەوان لەبیریان چووبایە من لەبەرم دەکرد، برایانیشم لە ئەنسار سەرقاڵی کار و کەسابەت بوون، بەڵام من پیاوێکی هەژاربووم لە هەژارە بێ نەواکان، هەر کاتێك ئەوان لەبیریان بچووبایە من بە بیرم دەهاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکەدا لە بارەی ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: **"کەس کراسەکەی خۆی نەدەکردەوە تا لە وتەکانم تەواو دەبم، تەنیا ئەو کراسەکەی خۆی دەکردەوە و هەرچی من گوتبام ئەو لەبەری دەکرد"**.

منیش کراسەکەم کردەوە.

تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکەی تەواوبوو، ئینجا کراسەکەم لە ئامێزی خۆم گرت، هیچ شتێکم لە فەرموودەکەی ﷺ لەبیر نەچوو[2].

ذهبي دەڵێت: بەهرەی لەبەرکردنە لە ڕادەبەدەرەکەی ئەبو هورەیرە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر بووە[3].

ئەبو هورەیرە دەفەرموێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، من فەرموودەی زۆرم لە تۆ گوێ لێ دەبێت، بەڵام لەبیرم دەچێتەوە.

فەرمووی: **"کراسەکەت بکەوە"**.

کردمەوە.

بە هەردوو دەستەکانی شتێکی تێکرد، پاشان فەرمووی **"لە ئامێزی بگرە"**.

---

[1] ابن ماجة (١٣٨) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥٩٦١) بە سەحیحی داناوە.

[2] بوخاری (٢٠٤٧) و موسلیم (٢٤٩٢) گێراوەتیانەوە.

[3] سير اعلام النبلاء (٢/٢٩٤).

**لە ئامێزم گرت، لەدوای ئەوە هیچ شتێکم لەبیر نەدەچوو [١].**

**ئیبن حەجەر دەڵێت: باسی ئەو شتە ناکات، کە کردوتیە ناو کراسەکەی، وەك ئەوەی ئاماژەیەکی دیار بێت بۆ موعجیزە [٢].**

**هەر ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم دوو فەرموودەیەی باس کرا، گەورەییەکی ئاشکرای بۆ ئەبو هورەیرە تێدایە، هەروەها موعجیزەیەکی روونی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی تێدایە، چونکە لەبیرچوونەوە سیفەتێکی مرۆڤە، ئەبو هورەیرە خۆی دانی پێدادەنێت، کە زۆر لە بیرچوونەوەی هەبووە، بەڵام بە بەرەکەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کۆڵی بۆتەوە [٣].**

**پێغەمبەری خوا ﷺ جەختی زۆر لەسەر فێکردن دەکردەوە:** ئەبو هورەیرە ؓ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کێ لە رۆژی دوایی بەختەوەرترین کەس دەبێت بە شەفاعەتی تۆ؟

فەرمووی **"گومانم دەبرد، ئەی ئەبو هورەیرە کەس پێشی تۆ ئەم پرسیارەم لێ نەکات، ئەمەش بە هۆی سووربوونی تۆ لەسەر فەرموودە، بەختەوەرترین کەس بە شەفاعەتم لە رۆژی دوایی ئەو کەسەیە، کە بە دڵسۆزی لەناو دڵییەوە دەڵێت: لا إله إلا الله [٤]".**

## ئوبەی کوری کەعب ؓ.

وەك لە پێشتردا ئاماژەی پێکرا، پێغەمبەر ﷺ رێنوێنی دەکرد بەوەی قورئان لە چوار کەس وەربگیرێت، یەك لەوانە ئوبەی کوڕی کەعبە ؓ.

عومەری کوڕی خەتتاب ؓ دەفەرموێت: عەلی باشترین دادوەرمانە، ئوبەی باشترین قورئان خوێنمانە [٥].

پێغەمبەری خوا ﷺ رێنوێنی ئوبەی کردووە، کە لە کاتی لێ تێکچوون بوون یان لەبیرچوونەوەدا، قورئانی بە بیر بێنێتەوە.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ؓ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، قورئانی تێدا خوێند، لێی ئاڵۆز بوو، کاتێك تەواو بوو، بە ئوبەی فەرموو **"تۆ نوێژت لەگەڵمان کرد؟؟"**

گوتی: بەڵێ

---

[١] بوخاری گێراوەتیەوە(١١٩).
[٢] فتح الباري (٢١٥/١)
[٣] فتح الباري (٢١٥/١)
[٤] بوخاری گێراوەتیەوە(٩٩).
[٥] ئیمام ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٠٥٨١).

فەرمووی: **"چی وایکرد بەبیرم نەهێنییەوە؟ [١]"**

لـەم فەرموودیەدا:بەبیرهێنانـەوەی قورئـان بـۆ پێشـنوێژ رێگـەی پێدراوە،لـە کـاتی لەبیرچوونی ئایەتێکی قورئان لە نوێژە بە دەنگەکان، دەبێ بەبیرهێنانەوە بەخوێندنەوەی هەمان ئایەت بێت،لەکاتی لەبیرچوونی هەر روکنێك لە روکنەکانی نوێـژ بـە بیرهێنانەوەکـە بۆ پیاوان بە گوتنی وشەی سبحان الله دەبێت، بۆ ئافراتنیش بە لێدانی چەپەڵە [٢].

**هەر بۆیەش عومەر، ئوبەی بە پێشنوێژ بۆ نوێژی تەراویحی بە کۆمەڵ دەستنیشان کرد.**

عەبدولرەحمانی کوڕی عەبدولقاری دەڵێت: لەگەڵ عومەر کوڕی خەتاب ﷺ لە شـەوێکی رەمەزاندا دەرچووم بۆ مزگەوت، بینیمان خەڵکەکە هەریەکە و بە جیـا جیـا نوێـژ دەکـەن، هەندێك بەتەنیا نوێژ دەکەن، هەندێکیش بە کۆمەڵێکی کەم نوێژ دەکەن.

عومەر فەرمووی: من وا دەبینم، گەر ئەم خەڵکانەم لەسـەر یـەك پێشـنوێژ کـۆکردەوە، ئەمە کارێکی باش دەبێت.

پاشان بڕیاریدا، هەموویانی لە دوای ئوبەی کوڕی کەعب کۆ کردەوە، لە شـەوێکی تـردا لەگەڵیدا بۆ مزگەوت رۆیشتم، بینیمان خەڵك لەدوای پێشنوێژەکەیان نوێژ دەکەن.

عومەر فەرمووی: ئەمە باشترین (بیدعە) داهێنانـە، ئـەوەی دەخـەون لەسـەری باشـترە لەوەی هەڵدەستنەوە، مەبەستی کۆتایی شەوە، کە ئەو کات خەڵکەکە لەسەرەتای شـەوە نوێژیان دەکرد [٣].

تێبینی: هەندێك کەس بیدعە دەکەنە دوو جۆر، بیدعـەی بـاش (بدعـة حسـنة) بیدعـەی خراپ (بدعة سيئة)، بەڵگەشـیان بـۆ ئەمـە قسـەی پێشـەوا عومـەرە کـە فـەرمووی "ئەمـە باشترین بیدعەیـە". بـەڵام مەبەسـت لـەو بیدعەیـە (یـان داهێنانـە) بیدعـەی زمانەوانییـە، نەوەك بیدعەی دین، چونکە بیدعـەی دیـنی هـەمووی گومڕاییـە وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێت **"هەموو بیدعەیەك گومڕاییە، (هەموو گومڕاییەکیش لەناو ئاگرە) [٤]"**.

---

[١] ئەبوداود (٩٠٧) و ابن حبان (٢٢٤٢) گێراوەتیەوە. نەوەوی لە (المجموع ٤/٤٢١) بە سەحیحی داناوە. ئەلبانیش لە (صفة الصلاة ٢/٥٩٦).

[٢] نيل الاوطار (٢/٣٨٠)

[٣] بوخاری گێراوەتیەوە(٢٠١٠).

[٤] موسلیم (٨٦٧) و النسائي (١٥٧٨) گێراوەتیانەوە، زیادەکەش هی ئەوە، سەنەدەکەشیان سەحیحە.

**لە بەهرەدارانی ئەزموونی سەربازی: خالیدی کوڕی وەلید ؓ:**

ذهبي لەبارەیەوە دەڵێت: شمشێری خواو، سوارچاکی ئیسلام و، شێری ڕووبەڕووبوونەوەکان، پێشەوایەکی گەورەیە، ئەمیرێکی لێهاتووە، سەرکردەی موجاهیدانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە شمشێری خوا ناوی ناوە، **فەرموویەتی "خالیدی کوڕی وەلید شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خودا، خوای گەورە بۆ سەر بێ باوەڕەکان هەڵیکێشاوە [(1)]".**

فەتحی مەککە و جەنگی حونەینی بینی، لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بوو بە ئەمیر، شمشێر و قەلغانی لە پێناو خوادا بەکار هێنا، شەڕی دژی هەڵگەڕاوەکان و موسەیلەمە کرد، عێراقی ئازاد کرد، شەڕەکانی ناوچەی شامی بینی، بستێك لە جەستەی نەمابوو مۆری شەهیدبوونی پێوە نەبێت.

کارە چاکەکانی زۆرن، ئەبوبەکری سدیق لەسەر هەموو سەربازەکان کردیە ئەمیر، دیمەشقی گەمارۆ دا، خۆی و ئەبوعوبەیدە دیمەشقیان ڕزگار کرد.

شەست ساڵ ژیا، کۆمەڵە پاڵەوانێکی کوشت، لەسەر جێگای خۆی مرد، چاوی ترسنۆکەکان ئۆقرەیان نەگرت، لە ساڵی ٢١ی کۆچی لە شاری حیمس وەفاتی کرد.

ئەبو قەتادە ؓ سوارچاکی پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپای ئەمیرەکانی ڕەوانەکرد و فەرمووی **"زەیدی کوڕی حاریسە سەرکردەتانە، گەر زەید کوژرا، ئەوا جەعفەر، گەر جەعفەریش کوژرا ئەوا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی ئەنساری بێتە شوێنی".**

جەعفەر هەڵسا و گوتی: بە داك و باوکم بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا، من نا ترسم تاکو زەید لەسەرم بکەیتە ئەمیر.

فەرمووی: **"بڕۆ، تۆ نازانی کامەیان خێری تێدایە".**

سوپا ڕۆیشت، ماوەیەك مانەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەر، فەرمانی کرد بانگی خەڵك بکرێت: (الصلاة جامعة).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خێرێك هاتە کایەوە، دەتانەوێ هەواڵی سوپاکەتان پێ ڕابگەیێنم؟ ئەوان ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە دوژمن، زەید شەهید بوو، داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن".**

خەڵکەکە داوای لێخۆشبوونیان بۆ کرد.

---

[(1)] ابن عساكر (١٦/٢٤١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٣٢٠٨) بە سەحیحی داناوە.

فەرمووی **"پاشان جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ئاڵاکەی وەرگرت، شەڕی کرد تاکو شەهید بوو، شاهێدی دەدەم بە شەهیدبوونی، داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن".**

**پاشان عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی وەرگرت، پێیەکانی جێگر کردن، تاکو شەهید بوو، داوای لێخۆشبوونی بۆ بکەن.**

**دواتر خالیدی کوڕی وەلید ئاڵاکەی وەرگرت، هیچ ئەمیرێك نەما، بەخۆی خۆی کردە ئەمیر".**

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پەنجەی بەرزکردەوە و فەرمووی **"ئەی خوای گەورە، ئەو شمشێرێکە لە شمشێرەکانی تۆ، سەریخە، یان سوپا بەو سەربخە".**

لەو ڕۆژە بەدواوە خالیدی کوڕی وەلید ناونرا شمشێری خوا.

لە دوایدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"بڕۆن یارمەتی برایەکانتان بدەن، کەستان دوا نەکەوێت".**خەڵکەکە لە گەرماییەکی توندا بە پێی و سواری ڕۆیشتن [1].

**لە بەهرەداران لە ئازایەتی و نەترسان لە شەڕدا: موعازی کوڕی عەمرى کوڕی جەموح و موعازی کوڕی عەفرا:**

عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك من لە ڕیزی جەنگاوەران لە شەڕی بەدر وەستا بووم، سەیری لای ڕاست و چەپم کرد، دەبینم دوو گەنجی تازە پێگەیشتوو لە ئەنسارییەکان، ئومێدم دەخواست کە لەوان بەهێزتر بام.

یەکێکیان تەماشایەکی کردم و گوتی: مامە گیان ئایا ئەبو جەهل دەناسی؟

گوتم: بەڵێ، کوڕی خۆم چ کارت پێیە؟

گوتی: زانیومە ئەو جنێوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، گەر بیبینم نابێت سێبەرم سێبەری تێپەڕ بکات هەتاوەکو دەردەکەوێت کامەمان پەلەیەتی لە مردن.

سەرم لەمە سوڕما.

ئەوی تر سەیرێکی کردم و هەمان قسەی کرد.

دوا نەکەوتم تا سەیری ئەبو جەهلم کرد لە نێو خەڵکەکە دەسوڕایەوە، بە یەکێك لە گەنجەکانم گوت: ئەوە ئەو کەسەیە کە لێتان دەپرسی.

دەستی خۆیان پێشخست و لێیاندا تا کوشتیان.

پاشان چونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان ڕاگەیاند.

فەرمووی: **"کامەتان کوشتتان؟"**

هەر یەکەیان گوتی: من کوشتم

---

[1] ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢٢٠٤٥)، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز ٣٢/١) بە (حسن)ی داناوە.

فەرمووی: **"شمشێرەکانتان پاك نەکردۆتەوە؟"**
گوتیان: نەخێر
تەماشای شمشێرەکانیانی کرد و فەرمووی **"هەردووکتان کوشتووتانە، دەسکەوتەکەش بۆ موعازی کوڕی عەمڕی کوڕی جەموحە"**.
بڕیاری دا دەسکەوتەکە بۆ موعازی کوڕی عەمڕی کوڕی جەموح بێت.
ئەو دوو گەنجەش: موعازی کوڕی عەمڕی کوڕی جەموح و موعازی کوڕی عەفرا بوون [1].
ابن حجر دەڵێت: هەردوو پیاوەکە لە بریندارکردنیدا هاوبەش بوونە، بەڵام موعازی کوڕی عەمڕی کوڕی جەموح یەکەم جار بە شمشێرەکەی لێی داوە، بۆیە شایەنی دەسکەوتەکە بووە، کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی **"هەردووکتان کوشتووتانە"**. ئەمە بۆ دڵخۆشکردنی کەسی بەرامبەرە، بەوەی بەشداربووە لە کوشتنی، بەڵام کوشتنی بە ڕاستی کە پەیوەندی بە دەستکەوتەوە هەیە، بریتییە لە یەکەم لێدان، ئەوەش موعازی کوڕی جەموح ئەنجامیداوە بۆیە بڕیاری دەسکەوتی بۆ درا.
سەیرکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ هەردوو شمشێرەکان و دەرخستنی لە کالانەکانینان، بۆ ئەوەیە ببینێت کامەیان خوێنی زۆر پێوەیە، چەندە شمشێرەکە چۆتە قوڵایی جەستەی کوژراوەکە، ئەمەش لە پێناو بڕیاردان بۆ پێدانی دەسکەوت.
هەر بۆیەش یەکەمجار پرسیاری لێ کردن: **"ئایا شمشێرەکانتان پاك کردۆتەوە"**. چونکە گەر پاك کرابایەوە هیچ روون نەدەبۆوە.
هەروەها ئیبن مەسعود ﷺ لەسەری ئامادە بووە، سەری ئەبوجەهلی بردووە، ئەویش لەو ڕووداوە پەیوەندییەکی باشی هەیە [2].
نەوەوی دەڵێت: دەگوترێت هەر سێکیان بەشداربوونە لە کوشتنی، یەکەم لێدان لە موعازی کوڕی جەموح بووە، ئیبن مەسعودیش دوای ئەو هاتووە، هێشتا ژیانی لەبەردا ماوە، سەری لەلاشەی جیا کردۆتەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

پێویستە کەس گاڵتە بە کەسی تر نەکات، هەندێك کەس لەوانەیە بۆ هەڵسان بە کارێکی گەورە بچوك دیار بێت، بەڵام شایەنی ئەنجامدانی ئەم کارەیە، وەك ئەوەی بۆ دوو گەنجەکە ڕوویدا [3].

---
(1) بوخاری (٣١٤١) و موسلیم (١٧٥٢) گێڕاوەتیانەوە.
(2) فتح الباری (٢٤٨/٦)
(3) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦٣/١٢).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ناکۆکیکاران چۆن دادوەری لە نێوان دەکردن؟

هیچ کۆمەڵگەیەك، سەرباری باشی خەڵکەکەی و سووربوونی تاکەکانی لەسەر کاری خێر، بێ بەش نابێت لە ناکۆکی لەسەر لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی دونیا، یاخود بوونی ڕای جیاواز و هەندێك جاریش پێ هەڵخلیسکان بەرەو ڕێڕەوی شەیتان، ئەمانەش وادەکەن جۆرێك لە ناکۆکی و دادگایکردن دروست بێت.

لە کۆمەڵگەی موسڵمانیش وەك هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی تر، دژیەکی و ناکۆکی لە نێوان تاکەکانیدا هەبووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە گەڕانەوەی حەق بۆ خاوەنەکەی دادوەری لە نێوان ناکۆکیکاران دەکرد، هەروەها ئاشتەوایشی لە نێواندا دەکردن، یادی خوای بە بیر دەهێنانەوە، هۆشداری دەدانێ لەوەی کەس مافی براکەی خۆی نەخوات و لایەنی خراپە نەگرێت، فێری دەکردن فەزڵی یەکتری لە بیر نەکەن، بانگەوازی ڕەگەزپەرستی سەردەمی نەفامی لەلا ناشیرن دەکردن، هەموو کۆمەڵگەی موسڵمانانی لەسەر سیفەتی باش پەروەردە کرد.

مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ناکۆکیکاراندا، مامەڵەیەکی حەکیمانە و دادپەروەرانە بووە، کۆتایی بە ناکۆکیەکانیان دەهێنا، بە پشتیوانی خوا لەسەر هەندێك لەو هەڵوێستانە دەوەستین.

### هەوڵی دەدا یەکەم جار ناکۆکیکاران ئاشت بکاتەوە، گەر بە وازهێنانیش بێت لە هەندێك ماف:

کەعبی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، کە لە مزگەوت داوای قەرزێکی خۆی کردووە لە إبن أبی حەدرەد کە قەرزاری بووە، دەنگیان بەرز بووەیە تا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خۆی گوێی لێ بووە.

ئەویش بەرەو لایان هات، تا پەردەی ماڵەکەی خۆی لابرد و بانگی کرد **"ئەی کەعب"**.

گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"ئەوەندە لە قەرزەکەی خۆت خۆش ببە"** بە دەست ئاماژەی نیوەی بۆ کرد.

گوتی: ئەوا کردم ئەی پێغەمبەری خوا.

پاشان بە ابن حدردی فەرموو: **"هەڵسە مافەکەی بدەوە"**[1].

---

[1] بوخاری (٤٥٧) و موسلیم (١٥٥٨) گێراوەتیانەوە.

ابن الجوزی دەڵێت: فەرمانەکەی پێغەمبەر ﷺ لەروانگەی راوێژکردن بووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی گەر دادوەر بەرژەوەندی لەمەدا بینی، وا لە ناکۆکیکاران بکات تا ئاشت ببنەوە، ئینجا حوکمیان لەنێواندا بکات (١).

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- بەکارهێنانی هێما یان ئاماژەیەك گەر تێگەیشت.
- شەفاعەتکردن بۆ وازهێنان لە بەشێکی مافی خاوەن مافەکە.
- ئاماژەیەکی تێدایە بۆ دادوەر بۆ ئاشتەواییکردن لە نێوان دوو کەس و ناوەندگیری لە نێوانیاندا.
- قبوڵکردنی شەفاعەت لەلایەن خاوەن ماف.
- دروستە پەردەی سەر دەرگای ماڵ هەڵبدرێتەوە.
- دروستە داوای وەرگرتنەوەی قەرز لە مزگەوت بکرێت (٢).

**بۆ ئاشتەوایی بانگی دەکردن و بۆی ڕوون دەکردنەوە کە کارێکی باشە:**

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوەو، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نزیك دەرگا گوێی لە دەنگێکی بەرزی دوو ناکۆکیکار بوو، یەکێکیان داوای دەکرد قەرزی بۆ دابەزێنێت و لە هەندێکیدا نەرمی بنوێنێت.

ئەویش دەیگوت: وەڵاهی نایکەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ رۆیشتە لایان و فەرمووی: **"کوا ئەوکەسەی سوێند بە خوا دەخوات کارێکی باش نەکات؟"**.

گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو چی پێ خۆشە وا دەکەم (٣).

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- هاندان بۆ نەرمی نواندن بەرامبەر قەرزدار، چاکەکردن بە وازهێنان لە هەندێکیدا.
- سەرزەنشتکردن لەسەر سوێند خواردن بۆ نەکردنی کارێکی باش، واباشترە ئەو کەسەی سوێند دەخوات بەوەی کارێکی باش نەکات، با سوێندەکەی بشکێنێت و پاشان کەفارەتەکەی بدات.

---

(١) كشف المشكل من حديث الصحيحين (٣٨٧/١)

(٢) فتح الباری (٥٢٢/١)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم(٢٢/١٠).

(٣) بوخاری (١٧٠٥) و موسلیم (١٥٥٧) گێراوەتیانەوە.

- شەفاعەتی تێدایە بۆ خاوەن ماف.
- قبوڵبوونی شەفاعەت خێری تێدایە [١].

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە کە خەڵکی (قباء) شەڕیان کرد، تاکو بە بەرد بەربوونە گیانی یەکتری، پێغەمبەری خوایان ﷺ ئاگادار کردەوە.

فەرمووی: **"با بچین ئاشتەوایی لە نێوانیادا بکەین [٢]"**.

**گەر نەیتوانی ئاشتەوایی لە نێوانیاندا بکات، بە پێی شەرع حوکمی لەسەر دەدان:**

عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر ﷺ دەڵێت: پیاوێکی ئەنساری لەلای پێغەمبەری ﷺ لەبارەی ئاودان لە زەوی (الحرة) [٣] بە گژ زوبێر داچوو، کە لەو ئاوە هەردووکیان باخی خورماکانیان پێ ئاو دەدا [٤].

لەلای پێغەمبەر ﷺ بووە ناکۆکیان.

پێغەمبەری ﷺ بە زوبێری فەرموو: **"ئاودانی خۆت بکە، پاشان ئاوەکە بۆ دراوسێکەت بنێرە"**.

ئەنسارییەکە توڕەبوو و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر ئەوەی کوڕی پورتە [٥]؟

ڕەنگی دەموچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا.

پاشان فەرمووی **"ئەی زوبێر ئاودانی خۆت بکە، پاشان ئاوەکە گل بدەوە تاکو بەتەواوی تێر ئاو دەبێت"**.

زوبێر گوتی: سوێند بەخوا من وا دەزانم ئەم ئایەتە لەم بارەیەوە دابەزی﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ﴾ النساء: ٦٥ [٦] واتە: نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لاف بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن.

---

[١] فتح الباری (٣٠٨/٥)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٢٠/١٠).

[٢] بوخاری (٢٦٩٣) و موسلیم (٤٢١) گێراوەتیانەوە.

[٣] الحرة: زەویەکە لە پشت شاری مەدینە، بەردی ڕەشی گەورەی لێیە. النهایة (٤٥٦/٢)، (٣٦٥/١)

[٤] ئاوەکە پێش ئەوەی بگاتە زەوی ئەنسارییەکە، بە زەوی زوبێردا دەڕۆیشت، ئەویش لای خۆی گلی دەدایەوە بۆ ئاودانی تەواوی زەرییەکەی، پاشان بۆ زەوی دراوسێکەی دەنارد، ئەنسارییەکەش داوای کرد زوو ئاوەکە ڕەوانە بکات، ئەویش ڕەتی کردەوە. فتح الباری (٣٦/٥).

[٥] واتە بۆیە یەکەمجار حوکمتدا ئاوەکە بۆ ئەو بێت، چونکە کوڕە پورتە. شەرحی نەوەوی (١٠٨/١٥).

[٦] بوخاری (٢٣٦٠) و موسلیم (٢٣٥٧) گێراوەتیانەوە

ابن عبدالبر دەڵێت: واتای ئەم فەرموودەیە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەیەکی دایە زوبێر بەو دڵفراوانیەی هەیەتی بەرامبەر ئەنسارییەکە، کاتێکیش ئەو کەسە سیفەتی بێکەڵکی تێدابوو، تەواوی مافەکەی بە حوکمدانێکی ئاشکرا گەڕاندوە بۆ زوبێر[1]".

نەوەوی دەڵێت: زوبێر خاوەنی زەوی یەکەم بوو، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو، هەندێك ئاودان بکە، کەمتر لە مافی خۆت، پاشان بینێرە بۆ ئەو، چونکە هەروەها دەیزانی زوبێر بەمە رازی دەبێت و چاکە لەگەڵ دراوسێکەی دەکات، بەڵام کاتێك دراوسێکەی ئەو قسەیەی کرد، داوای لە زوبێر کرد تەواوی مافی خۆی بستێنێ[2].

**لە سوودەکانی فەرموودەکە:**

- ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ئاشتەوایی و فەرمانکردن پێی.
- پێویستە کەسی دادوەر، مافی هەریەکە لە ناکۆکیکاران بەتەواوی بزانێت، بۆ ئەوەی کاتێك زانی ئاشتبوونەوە قبوڵ ناکەن و رازی نابن، فەرمان بە پێدانی ماف بە خاوەن ماف بدات.
- جۆرێك لە سەرکۆنەکردنی تێدایە بۆ ئەو کەسەی ڕەوشتێکی ناشیرین یان بێکەڵکی بەرامبەر پێشەوا یان دادوەر نیشان دەدا، هەروەها سزادانی.

**لە سوێندخواردنی بە درۆ دەیترساندن:**

وائیلی کوڕی حیجر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لای پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، دوو پیاو ناکۆکیان هەبوو لەسەر زەوییەك هاتنە لای، یەکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کەسە لە سەردەمی نەفامییەوە دەستی گرتووە بەسەر زەویەکەم.

فەرمووی: "**بەڵگەکەت**".

گوتی: هیچ بەڵگەم نییە.

فەرمووی: "**سوێندی ئەو**"

گوتی: کەواتە زەویەکە دەبات[3].

فەرمووی: "**هیچت بۆ نییە تەنیا ئەمە نەبێت**".

کاتێك پیاوەکە هەڵسا سوێند بخوا: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**هەر کەسێك زەوی کەسێکی تر داگیربکات، لە ڕۆژی دوایی خوای گەورە بەتوڕەییەوە دەیبینێت**"[4].

---

[1] التمهيد (٤٠٩/١٧).

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٨/١٥).

[3] واتە: گەر مانەوەی زەویەکە بۆ ئەو بە سوێند خواردن بەستراوەتە ئەوا زەویەکە بۆ ئەو دەبێت.

[4] موسلیم (١٣٩) گێڕاوەتیەوە.

لە رجائی کوڕی حەیوە و عەرسی کوڕی عەمیرە لە عودەی باوکییانەوە دەگێڕنەوە: پیاوێك لە هۆزی کەندە کە پێی دەگوترا امرؤ قەیسی کوڕی عابس، ناکۆکیەکی لەگەڵ پیاوێك لە حضرموت هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ.

داوای لە کەسی حەزرەمی کرد بەڵگە بێنێت، هیچ بەڵگەیەکی نەبوو، داوای لە امرؤ القیس کرد سوێند بخوات.

کەسی حضرەمی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر بە سوێند خواردن لەگەڵی بکەی، ئەوا سوێند بەخوا زەویەکەم رۆیشت.

پێغەمبەریش خواش ﷺ فەرمووی: **"هەر کەسێك بە درۆ سوێند بخوا، بۆ ئەوەیماڵێك لەبراکەی زەوت بکات، رۆژی دوایی خوای گەورە بە تووڕەییەوە دەیبینێت"**.

رەجا ء دەڵێت: پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾ آل عمران: **٧٧**

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە پەیمانی خوا و سوێندەکانیان بەنرخێکی کەم دەفرۆشن، ئەوانە لە دوارۆژدا هیچ بەشێکیان نابێت (لە سۆزو میهرەبانی خوا)، هەروەها لە رۆژی قیامەتدا خوا نایاندوێنێت و تەماشایان ناکات) خاوێنیان ناکات و سزای پڕ ئێش و ئازاریش بۆیان ئامادەیە.

امرؤ القیس گوتی: چی بۆ ئەو کەسە هەیە گەر وازی لێبهێنێت؟

فەرمووی **"بەهەشت"**.

گوتی: شاهێد بە من هەمووم بۆ ئەو جێهێشت [1].

**لە سوودەکانی فەرموودەکە:**

- توندی نواندن بەرامبەر ئەو کەسەی سوێند بە درۆ دەخوات، بۆ ئەوەی ماف موسڵمانێك زەوت بکات، هەروەها ترساندنی کەسی سوێندخۆر بە درۆ.
- ئامۆژگاری دادوەر پێویستە بۆ کەسێك گەر بیەوێت سوێند بە درۆ بخوات، بۆ ئەوەی بەو ئامۆژگارییە بگەڕێتەوە سەر ڕاستی.

[1] ئەحمەد (١٧٢٦٣) گێڕاوەتیەوە، شعیب الارناوگ بە سەحیحی داناوە.

**بۆی ڕوون دەکردنەوە، کە ئەو بەگوێرەی ڕوکەش حوکم دەکات:**

دایکی سەلەمە، خێزانی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەر لە ماڵەوە گوێ لە دەنگی ناکۆکییەك بوو، بۆلایان چووە، فەرمووی: **"بەڵکو من مرۆڤم، کێشەیەك دێتەلام، لەوانەیە هەندێکتان لە هەندێکی ترتان قسەزانتر و ڕەوانبێژتر بن، وادەزانم کە ئەو ڕاستگۆیە و حوکمی بۆ دەدەم، هەر کەسێکیش لەسەر خواردنی مافی موسڵمانێك حوکمم بۆ دا، با بازانێت ئەمە پارچەیەکە لە ئاگر، ئینجا یان با وەریبگرێت یان با وازیلێبهێنێت**[1]".

ئەوەوی دەفەرموێت: فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت **"بەڵکو من مرۆڤم"**، واتاکەی ئاگاداریکردنەوەیەکە لە حاڵەتی مرۆڤایەتی ئەو، بەوەی مرۆڤ هیچ لە غەیب و دیوی ناوەوەی شتەکان نازانێت، تەنیا گەر خوای گەورە نیشانی بدات، بۆیە ئەوەی بۆ خەڵکی ئاسایی بێت لە حوکمدان لەسەر هەشتێك بۆ وانیش ئاساییە، چونکە ئەو حوکم بە ڕووااڵەتی شتەکان دەدات، خواش بە پەنهانەکان شارەزاییە.

بۆیە لەسەر بوونی بەڵگە و سوێند خواردن و ئەو شتانەی کە دیارن حوکم دەدات، لەوانەشە دیوی شاراوە شتێکی تر بێت، بەڵام ئەویش هەر وەکو مرۆڤێك بە حوکمدانی ڕووی دەرەوەی شتەکان ئەرکبارکراوە[2].

**حوکمدانی بە ڕووکەش، بۆ کەسی ناڕەوا حەڵاڵ ناکات مافی کەسی تر بخوات:**

دایکی سەلەمە ﵂ دەفەرموێت: من لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم، دوو پیاوی ناکۆکیکار لەسەر میراتی چەند شتێکی کۆن هاتنە لای[3]. پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی **"بەڵکو من مرۆڤم، ئێوەش ناکۆکییەکەتان هێناوەتە لام، لەوانەشە هەندێکتان لە هەندێکی ترتان زیرەکتر بێت لە هێنانی بەڵگەکەی، منیش بە گوێرەی ئەوەی گوێم لێ دەبێت حوکم دەکەم، گەر هەرکەسێکیش لەسەر خواردنی مافی براکەی حوکمم بۆی دابێت، با وەری نەگرێت، چونکە بەراستی من پارچەیەك لە ئاگری بۆ بڕیار دەدەم"**.

هەردوو پیاوەکە دەستیانکردە گریان، هەریەکەیان گوتیان: ئەو حەقەی خۆم هەمە با بۆ هاوڕێکەم بێت.

---

[1] بوخاری (٢٤٥٨) و موسلیم (١٧١٣) گێراوەتیانەوە

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٥/١٢).

[3] لە گێڕانەوەی ئەبی داود (٣٥٨٤) دا هاتووە: دوو پیاو هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ لەسەر میراتێك ناکۆکیان هەبوو، هیچ کامێکیشان بەڵگەیان نەبوو، تەنیا داواکردن نەبێت.

پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: **"أما إذا فعلتم ما فعلتما، فاقتسما و توخّيا الحق، ثم استهما، ثم تحالا"**[١]

**فاقتسما و توخيا الحق:** واتە ئەو شتەی ناکۆکیکتان لەسەر هەیە بە دادپەروەری بیکەنە دوو بەش.

**ثم استهما:** واتە گەر لەسەر وەرگرتنی ئەو دوو بەشەش ناکۆك بوون، تیروپشك بکەن بۆ ئەوەی دەرکەوێت کامە پشکە بەر کێ دەکەوێت، هەر یەکێکتان لە تیروپشك کامە بەشەی بەرکەوت با وەریگرێت.

**ثم تحالا:** واتە با هەریەکێکیشتان گەردەنی براکەی ئازا بکات لە وەرگرتنی پشکەکەی.

نەوەوی دەفەرموێت: لەم فەرموودەیەدا بەڵگەیەکی تێدایە بۆ مەزهەبەکانی مالیکی، شافعی، ئەحمەد و تەواوی زانایانی ئیسلام و هاوەڵان و تابیعینەکان و ئەوانەشی لە دوایان دێن... بەوەی حوکمدانی دادوەر هەرگیز دیووی شاراوە حەڵاڵ ناکات، هیچ حەرامێکیش حەڵاڵ ناکات.

گەر دوو شاهێدی ساختە شاهێدی لە وەرگرتنی پارە و ماڵ لە دژی کەسێك بدەن و دادوەریش حوکمیدا، ئەم ماڵە بۆ کەسی حوکم بۆ دراو هەرگیز حەڵاڵ نابێت.

گەر شاهێدیاندا بە کوشتن، کەسی خاوەن کوژراو، کە زانی شاهێدەکان درۆ دەکەن، بۆی نییە کەسەکە بکوژێتەوە یان خوێنبایی لێوەربگرێت.

گەر شاهێدیاندا خێزانەکەی تەڵاق داوە و دادوەریش حوکمی تەڵاقی دەرکرد، ئەو کەسەی دەزانێ شاهێدەکان درۆ دەکەن، هەرگیز بۆی نییە خێزانەکەی بخوازێت[٢].

**هیچ کاتێك حوکمی بەسەر داواکراو نەدەدا، تەنیا بە دانپێدانان یان بە بەڵگە نەبایە:**

وائیلی کوڕی حیجر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم، پیاوێك هات، یەکێکی تری بە پەتێك بەدوای خۆی رادەکێشا.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە برامی کوشتووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا کوشتووتە؟"**.

گوتی: گەر دانی پێدانەنێت، بەڵگەی لەسەر دێنم.

کابراش گوتی: بەڵێ کوشتوومە.

فەرمووی: **"چۆن کوشتت؟"**.

---

[١] ئەحمەد (٢٦٧٦٠) و ئەبو داود (٣٥٨٣) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء ) بە (حسن)ی داناوە.

[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦/١٢).

گوتی: من و ئەو بە گۆچانێك لە درەختێکمان دەدا [(١)]. جنێوی پێدام و تورەی کردم، بە داس لەلا سەرێکم دا و کوشتم.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو **"هیچ شتێکت هەیە، لە جیاتی خۆت بیدەی؟"**.

گوتی: هیچماڵێکم نییە، تەنیا پۆشاك و داسەکەم نەبێت.

پێی فەرموو: **"پێت وایە کەسوکارت دەتکڕنەوە؟"**.

گوتی: من لەلای کەس و کاری لەمانە بێ نرخترم.

پێغەمبەر پەتەکەی بۆ برای کوژراوکە هەڵدا و فەرمووی **"ها بگرە هاوەڵەکەت"**.

پیاوەکە لەگەڵ خۆی بوو، کاتێك بزر بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"گەر بیکوژێت، ئەویش وەك ئەو وایە [(٢)]"**.

پیاوەکە گەڕایەوە و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان گێڕامەوە کە فەرمووتە **"گەر بیکوژێت، ئەویش وەك ئەو وایە"**. بەفەرمانی تۆ هێناومە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: **"ئایا ناتەوێت، گوناهی خۆت و گوناهی براکەت هەڵبگریت؟ [(٣)]"**.

گوتی:بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"گەر وا بکەی، ئەو شتەت دەبێت"**.

کابرا پەتەکەی فڕێدا و ئازای کرد [(٤)].

## هەر حوکمێك پێچەوانەی شەرعی خوا بێت، ڕەتی کردۆتەوە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: دوو پیاو لای پێغەمبەری خوا ﷺ ناکۆکیان هەبوو.

یەکێکیان گوتی: بە کتێبی خوای گەورە حوکم لە نێوانماندا بکە.

ئەوی تریش کە لەو تێگەیشتووتر بوو: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا، بە کێتبی خوای گەورە حوکم لە نێوانماندا بکە، بەڵام روخستەم بدەم یەکەمجار من قسە بکەم.

---

(١) لە درەختمان دەدا و گەڵاکەی دەکەوتە خوارەوەو وەك عەلەف کۆمان دەکردەوە. شەرحی نەوەوی (١١/١٧٢)

(٢) واتای وایە هیچ کامێك لە کوژراو و بکوژ فەزڵی بەسەر ئەوی تردا نییە، چونکە مافی خۆی لێ سەندووە، بە پێچەوانەی ئەوەی، گەر لێی خۆش بیا، ئەو کات فەزڵ و منەت و پاداشتی رۆژی دوایی و ستایشی خەلکی لەدونیا بۆ هەبوو. شەرحی نەوەوی) (١١/١٧٣).

(٣) نەوەوی دەفەرموێت: لەوانەیە لەم رووداوەدا وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتبێت لەبارەی ئەو پیاوە، واتای وایە: گەر لێی خۆش بێت، لێخۆشبوونەکە دەبێتە هۆکاری هەڵوەرینی گوناهی خۆت و براکەت.

(٤) موسلیم گێراوەتیەوە(١٦٨٠).

فەرمووی: **"قسە بکە"**.

گوتی: کوڕەکەم لای ئەم کابرایە کرێکار بوو، زینای لەگەڵ خێزانەکەی کردووە، پێی ڕاگەیاندووم کە کوڕەکەم ڕەجمی لەسەرە، منیش ١٠٠ حوشترم و جارییەکەم وەك فدیە داوە پێی.

پاشان من پرسیارم لە خەڵکی زانا کردووە، پێیان گوتووم، کە پێویستە کوڕەکەم ١٠٠ جەڵدی لێبدرێت و ساڵێك دووربخرێتەوە، خێزانی ئەم کابرایەش ڕەجم بکرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، بەڕاستی بە کتێبەکەی پەروەردگار دادوەری لە نێوانتاندا دەکەم، سەبارەت بە ماڵات و جاریەکەت بۆ خۆت دەگەڕێتەوە، دەبێ کوڕەکەشت ١٠٠ جەڵدی لێبدرێت و ساڵێك دووربخرێتەوە. سەبارەت بە تۆش، بڕۆ لای خێزانەکەت، گەر دانی پێدانا، ڕەجمی بکە"**.

گوتی: گەڕایەوە لای خێزانەکەی، ئەویش دانی پێدانا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی ڕەجمکردنی پێکردو ڕەجم کرا.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

• صولحی دامەزراو لەسەر ناشەرعی ڕەت دەکرێتەوە، ماڵی وەرگیراویش لەسەری دەگەڕێتەوە.

ئیبن دقیق العبد دەڵێت: بەمە لاوازی بیانووی هەندێك کەس ڕوون دەبێتەوە، کە پاساو لەلای کەسی زانا دەهێننەوە بەوەی هەردوولا لە گرێبەستێکی بێ بنەما ڕازی بوون و هەریەکەیان ڕووخستەی ئەوی تری داوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە، کە ڕوخستەدان بەستراوەتەوە بە گرێبەستی شەرعی[1].

**ناکۆکیکارانی لەسەر ئەنجامدانی ساختەیی هۆشیار دەکردەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"هەر کەسێك تکا بکات لە سنورێك لە سنورەکانی خوا، ئەوا دژایەتی خوای کردووە، هەر کەسێکیش لەسەر بنەمای پوچ و ساختەیی ناکۆکی بکات و بشزانێت، ئەوا تا مردنی لەتوڕەیی خوای گەورە دەمێنێتەوە، هەر کەسێکیش قسەیەك بە بڕوادارێك بڵێت و ئەو قسەیەی تێدا نەبێت، خوای گەورە لە (ردغة الخبال) نیشتەجێی دەکات، تا لەوەی گوتوویەتی پاشگەز دەبێتەوە "**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مەبەست لە (ردغة الخبال) چییە؟

---

[1] فتح الباري (١٢/١٤٢).

فەرمووی: **"کێم و زوخاو و خوێنی خەڵکی ناو ئاگرە [1]"**.

ابن رجب دەڵێت: هەر کەسێك لە کاتی ناکۆکیکدا –ئینجا ناکۆکییەکە لە دین بێت یان لە دونیا – توانای هەبێت و بە ساختە سەربکەوێت و وا لە خەڵك بگەێنێت، کە ئەو ڕاستە، ڕاستیش لاواز بکات و بە ناڕاست نیشانی بدات، ئەمە لە قێزەونترین حەڕامەکانە و، لە پیسترین نیشانەکانی دووڕووییە [2].

## هەرچی لەلای بایە دەییەخشی تەنیا لە پێناو ئاشتکردنەوەی ناکۆکیکاران، ململانێ و ناکۆکی نەدەهێشت:

سەهلی کوڕی ئەبو حثمة دەگێڕێتەوە کە مەحیسەی کوڕی مەسعود و عەبدوڵلای کوڕی سەهل پێش ڕووداوی خەیبەر، لە برسێتیەك کە توشیان هاتبوو، دەرچوون، جا لەناو دار خورمایەکان لەیەك جیابوونەوە، دەستدرێژی کرایە سەر عەبدوڵلای کوڕی سەهل و ملی شکێندرا، لە نزیك بیرێك فرێدرا، هاوڕێکانی بەدوای گەڕان، دۆزیانەوە و پاشان بەخاکیان سپارد.

لە پاشان برای کوژراوەکە عەبدولڕەحمان و هەردوو کوڕە مامەکەی حوەیسە، لەگەڵ مەحیسە هاتنە لای پێغەمبەرﷺ، عەبدولڕەحمان بەتەمەن لە هەموویان بچوکتربوو بەڵام لەبەر ئەوەی خاوەن خوێن بوو دەستی کرد بە قسەکردن لەبارەی براکەی.

پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرمووی: **"گەورەکە، گەورەکە"**، یاخود فەرمووی **"با گەورەکە دەست پێ بکات"**.

عەبدولڕەحمان هێواش بوویەوە، حوەیسە قسەی کرد، پاشان مەحیسە قسەی کرد، دواتر عەبدولڕەحمان قسەی کرد.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە عەبدوڵلای کوڕی سەهلمان بە کوژراوی لەلای بیرێك لە بیرەکانی نزیك خەیبەر دۆزیەوە، لەوێش جگە لە یەهود هیچ دوژمنێکی ترمان نییە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: **"کێ تۆمەتبار دەکەن؟"**.

گوتیان: یەهود تۆمەتبار دەکەین.

پێغەمبەر ﷺ نامەیەکی بۆ یەهودییەکان نوسی، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە: ئەمان کوشتووە.

---

[1] ابوداود (٣٥٩٧) و ابن ماجة (٣٣٧٧) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء – ٢٣١٨) بە سەحیحی داناوە.

[2] جامع العلوم والحکم (٢/٤٨٦)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا پەنجا جار سوێند دەخۆن کە یەهود ئەوی کوشتووە؟"**

لە روایەتێکی موسلیمدا هاتووە: **"هەر یەکێك لە ئێوە پەنجا جار لەسەر پیاوێکی ئەوان سوێند بخوات، ئینجا جڵەوەکەتان تەسلیم بکرێت[1]"**.

لە ریوایەتی ئەحمەددا هاتووە (١٥٦٦٤) **"ناوی بکوژەکەتان دەهێنن، پاشان پەنجا جار سوێند لەسەری دەخۆن، ئینجا تەسلیمتانی دەکەین"**.

لە ریوایەتی بەیهەقیدا هاتووە (١٦٨٦٨) **"ئایا پەنجا جار سوێند دەخۆن، ئینجا خوێنی بکوژەکەتان حەڵاڵ بکەن؟"**.

گوتیان: شتێکمان نەدیتبێت، چۆن سوێندی لەسەر دەخۆین؟ شتێك نەزانین سوێندی لەسەر ناخۆین و ناشزانین کێ کوشتوویەتی، بەڵام ئەوەی ئێمە دەڵێین کە یەهودییەکان دوژمنمانن و لەنزیك ئەوانیش کوژراوە.

فەرمووی: **"گەر ئەوان پەنجا جار سوێند بخۆن کە نەیاکوشتووە، لە خوێنی هاورێکەتان بێ بەری دەبن"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە سوێندی ئەوان قبوڵ ناکەین، ئەوان کوفریان هەیە، کە گەورەترە لە سوێند خواردن لەسەر تاوانێك.

پێغەمبەر پێی ناخۆش بوو، خوێنی ئەم پیاوە بە فیڕۆ بڕوات، خوێنەکەی دا بەو ١٠٠ وشترەی لەلای بوو.

سەهل دەڵێت: هەرگیز لەبیرم ناچێت کە سواری وشترێکی گەنجی سور بووم لەو وشترانە، لە کاتێکدا لێم دەخوڕی لوشکێکی لێدام[2]".

نەوەوی دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە ئەم خوێنەی داوە لە پێناو کۆتایهێنان بە ناکۆکییەکە و ئاشتی کردنەوە، چونکە کەس و کاری کوژراو هیچیان بۆ نییە جگە لە سوێند خواردن، یاخود کەسی داواکراو سوێند بدەن، لە هەردوو باریشدا ئەوان نارازی بوون و لەبەرامبەر کوژرانی هاورێکەیان دڵیان شکابوو، پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی بە پێدانی ئەم خوێنباییە دڵیان چاك بکاتەوە و ناکۆکییەکە کۆتایی پێبهێنێت و ئاشتیان بکاتەوە.

---

[1] مەبەست لە جڵەو لێرەدا ئەو پەتەیە کە لە ملی کوژراو دەکرێ و دەدرێتە دەست کەسوکاری کوژراوەکە، شەرحی نەوەی (١٤٩/١١).

[2] بوخاری (٢٧٠٢) و موسلیم (١٦٦٩) گێراوەتیانەوە

**پێغەمبەر ﷺ لە کاتی دادوەریکردندا لەنێوان ناکۆکیکاراندا، ئەمە رێگر نەبوو لەوەی دڵ و دەروونی خەڵك خۆش بکات:**

لە چیرۆکی حودەیبیە پێغەمبەر ﷺ ئاشتەوایی لەگەڵ خەڵکی مەککەدا کرد، کە ساڵی داهاتوو بۆ ماوەی سێ رۆژ بچنە ناوی، بۆ ساڵی داهاتوو پێغەمبەر ﷺ بە عومرەکردن چووە مەککە.

کاتێك چووە ناوی، ماوەکەش تەواو بوو، چوونە لای عەلی و گوتیان: بە هاوەڵەکەت بڵێ با بچێتە دەرەوە، وا کاتەکە کۆتایی پێ هات.

پێغەمبەر ﷺ کە دەرچوو، کچەکەی حەمزە بە دوای کەوت و بانگی کرد: مامە! مامە! [1]

عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ﷺ وەریگرت، بە فاتیمەی گوت: کچی مامت بگرە.

عەلی دەڵێت: کاتێك گەیشتنە مەدینە، من و جەعفەر و زەیدی کوڕی حاریسە لەبارەی ئەو کچەوە کەوتینە ململانێ [2] [3].

جەفعەر گوتی: کچی مامە و پوری لای منە، واتە: ئەسمای کچی عەمیس.

زەید گوتی: کچی برامە.

منیش گوتم: من هێناومە، کچی مامە، کچی پێغەمبەری خواش ﷺ لای منە، ئەو شایەنترە.

پێغەمبەر ﷺ حوکمی بۆ پوری دا [4].

---

[1] وەك رێزێك بۆ پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە بانگی کرد، چونکە ئامۆزای بووە، یاخود لەبەر ئەوە بووە کە حەمزە برای شیری بووە. الفتح (٥٠٥/٧).

[2] واتە: لای کێتان دەمێنێتەوە، هەریەك لەوانە دەیەوێت لەژێر کەفالەتی بێت، بۆ ئەوەی پاداشتی بەخێوکردنی بێ باوکێك وەربگرێت، کەواتە ململانێکە لەسەر کەفالەتکردن (بەخێوکردن) بووە، نەوەك لەسەر دایەنی بێت، چونکە کاتی دایەنی بەسەرچووە کاتی دایەنی پێش حەوت ساڵیدایە، بەڵام دوای ئەو ساڵە پێویستی بە دایەن نابێت، بەڵام لەبەر ئەوەی بێ باوك بووە، هەریەك لەو سێ کەسە هەوڵ دەدەن کەفالەت و بەخێوکردنی بکەوێتە ئەستۆی ئەو. شرح عمدة الاحکام (٨/٦٥) ی ابن جبرین.

[3] لە گێرانەوەی ابن سعد لە (الطبقات ٢٦/٤)دا هاتووە، هەریەك لە عەلی و جەعفەر و زەیدی کوڕی حاریسە کەوتنە ناکۆکی تا دەنگیان بەرزبوویەوە، پێغەمبەر ﷺ بەدەنگی ئەوان لە خەو هەڵساو و فەرمووی: وەرن با دادوەری لە نێوانتان بکەم.

[4] هەر یەکێك لەو سێ کەسە شتێکی هاوبەشیان هەبووە: زەید بۆ برایەتی، عەلیش لەبەر ئەوەی ئامۆزای بوو،لەگەڵ خێزانەکەی هەڵیگرت، جەعفەریش لەبەر ئەوەی ئامۆزای بووە، هەروەها پوریشی لای بووە، پێگەی جەعفەر بەهێزترە لەوانی تر بە هۆی خزمایەتی پیاو و ژنەکە بۆ کچەکە. فتح الباری (٥٠٦/٧).

فەرمووی: **"پور لە شوێنی دایکە [(١)]"**.

هەروەها فەرمووی: **"بەڵام تۆ ئەی جەعفەر زۆر بەمن دەچی، تۆ ئەی عەلی لە منی و منیش لە تۆم، تۆش ئەی زید برامانی و لە خۆمانی [(٢)]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- گەورەکردنی پەیوەندی خزمایەتی، بە جۆرێك کە گەورەکان بۆ گەیشتن بەو خزمایەتیەدا دەکەونە ململانێ.
- دادوەر بەڵگەی حوکمکردنەکەی بۆ خەڵکەکەی روون دەکاتەوە، هەر یەکیش لەوانەی ناکۆکیان هەیە بەڵگەی خۆیان دەخەنەڕوو.
- پێشەوا ئەحمەد دەفەرموێت: گەر بەخێوکەری ژن شووی بە خزمێکی منداڵە بەخێوکراوەکە کرد، گەر منداڵە بەخێوکراوەکە کچ بێت ئەوا مافی بەخێوکردنی لێ لاناچێت. ئەمەش بە پێی بەڵگەی ئەم فەرموودەیە.
- کێبڕکێی هاوەڵان ﷺ لەسەر ئەنجامدانی کاری باش و پێشبڕکێکردن، هەریەك لەوانە مکوڕە لەسەر ئەوەی بۆ ئەو کارە باشە لە پێشەوە بێت. هەروەها دەیەوێت پاداشتی بەخێوکردنی منداڵێکی بێ باوکی بەر بکەوێت [(٣)].

سەرباری حوکمی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەعفەر، بەڵام بە فەرمایشتەکەی هەمووانی رازی کرد.

ابن حجر دەڵێت: سەرباری بڕیاردانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جەعفەر و روونکردنەوەی بڕیارەکەی، دڵدانەوەی بۆ هەمووانیش تێدایە [(٤)].

ابن دقیق دەڵێت: ئەوەی فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ لە قسەی خۆش بۆ دڵدانەوی ئەوان ئەوا لە ڕەوشتە بەرزەکانییەتی.

---

(١) ئەمەش بەهۆی نزیکی لێی و سۆز و میهرەبانی بۆ منداڵەکە، خالەت بۆ پەروەردەکردن لەم دایەنەدا پێش پلك دەکەوێت، چونکە ئەو کاتە سەفیەی کچی عەبدولموتەڵیب مابوو، ئەگەر پلك پێشخرا لەگەل ئەوەی نزیك ترین میرات گرە لەئافرەتانی پشت،ئەوا پێش خستنی لەسەر ئەوانیتر لەپێشترە، لێرەشدا دەردەکەوێت خزمی دایك پێش خزمی باوك دەکەوێت. فتح الباري (٧/٥٠٦).

(٢) (تۆ برامانی) واتە لە ئیمانەوە (تۆ مەولامانی) ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو ئازادی کردووە،(مەولا)ی هۆزێکیش یەکێکە لەوان. بوخاری گێراوەتیەوە(٢٧٠٠).

(٣) فتح الباري (٧/٥٠٧)، شەرحی (عمدة الاحكام ٨/٦٥)ی ابن جرير.

(٤) فتح الباري (٧/٥٠).

لەوانەیە بڵێیت: ئەوەی بۆ عەلی و زەید باسی کردووە، هۆکارەکەی دیارە، چونکە ئەوان نە گەیشتن بە ئامانجیان، جا بێبەشبوونیان لەو مەبەستەی دەیانویست گونجاوە بۆ دڵ چاکردنەوەیان و دڵدانەوەیان.

بەڵام جەعفەر، ئەوەی ویستی لە وەرگرتنی ئەم کچە بە دەستی گەیشت، چۆن گونجاوە بۆ ئەو دڵدانەوەیەی بۆ گوترا؟

بەم شێوەیە وەڵام دەدرێتەوە: کچەکە بۆتە ماف پوری، کاتێك درایە جەعفەر لەبەر پوری کچەکە بووە، نەوەك لەبەر خودی خۆی، چونکە لەڕاستیدا ئەو بەو سیفەتە حوکمی بۆ نەدراوە، بۆیە ئەو دڵدانەوەی بۆی گوترا گونجاوە بۆی[1].

## کاتێك گوێ لە قسەیەکی سەیری ناکۆکیکاران بووایە پێ دەکەنی:

عیکریمە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕوفاعە خێزانەکەی تەڵاقدا، لە پاشان ئافرەتەکە بووە خێزانی عەبدولرەحمانی کوڕی زوبێری القرظي.

عائیشە دەفەرموێت: ئافرەتەکە هات سەرپۆشێکی سەوزی لەسەر بوو، سکاڵای خۆی لەبارەی هاوسەرەکەی لەلا کرد –واتە لای عائیشە– سەوزایی پێستی خۆی پیشاندا[2].

کاتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئافرەتانیش پشتی یەکتر دەگرن[3]، عائیشە فەرمووی: ناخۆشیم نەدیووە لە ئافرەتانی بڕوادار لەوەی ئەو ئافرەتە بینیوویەتی، پێستەکەی لە سەرپۆشەکە سەوزتر بوو.

عائیشە دەفەرموێت: خێزانەکەی قرظي هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ منیش لای دانیشتبووم، ئەبوبەکریشی لەلا بوو.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پێشتر لای ڕوفاعە بووم، تەڵاقیدام، ماوەی تەڵاقدانەکەم تەواو بوو، شووم بە عەبدولرەحمانی کوڕی زوبێر کرد، سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی لایەتی وەك ئەو پەڕۆکە نەدووراو وایە[4].

دەستی کردە بەرکی حیجابەکەی پەڕۆکێکی دەرهێنا.

خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص لە دەرگا وەستابوو، چاوەڕێی ڕووخستەی دەکرد، گوتی: ئەی ئەبوبەکر ئایا گوێت لەم ئافرەتە نییە بە ئاشکرا چی بە پێغەمبەر ﷺ دەڵێت.

---

[1] إحكام الاحكام (٢١٦/١)

[2] واتە: لێدانی پیاوێك بۆ خێزانەکەی.

[3] ئەم ڕستەیە قسەی عیکریمەیە لە گێڕانەوەی فەرموودەکەدا.

[4] لایەکی پەڕۆکەکەیە کە نەچنراوە، ویستوویەتی بیچوێنێت بەم پەڕۆکەی نەدووراوە بەهۆی خاوی و ڕەقنەبوونی. الفتح (٤٦٥/٩).

سوێند بەخوا، جگە لە زەردەخەنە هیچی دیکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بەدی نەکرا [1].

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"یان دەتەوێت بگەڕێیتەوە لای روفاعە، تاکو هەنگوینی ئەو تام بکەی [2] و ئەویش هەنگوێنی تۆ تام بکات".**

دەڵێت: پیاوەکەی زانی کە خێزانەکەی هاتۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، هاتە خزمەتی دوو کوڕی لەگەڵ بوو کە لەو ئافرەتە نەبوون، گوتی: سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ درۆ دەکات، من بە کاری دەهێنم وەك بەکارهێنانی پێستەی خۆشکراو [3]، بەڵام ئەو یاخییە و روفاعەی دەوێت.

فەرمووی: **"ئەمانە کوڕی تۆن؟"**

پیاوەکە گوتی: بەڵێ

فەرمووی: **"ئەمە دەڵێی، قەسەم بەخوا، چەند بێچووی قەلەڕەش بە قەلەڕەش دەچێت، ئەم منداڵانە زیاتر لەوە بە باوکیان دەچن" [4].**

## گوێی لە ناکۆکیکاران دەگرت، تەنانەت گەر یەکێکیان موسڵمانیش نەبێت:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەفەرموێت: کاتێك یەهودییەك کاڵایەکی خۆی بۆ فرۆشتن دانابوو، نرخێکیان پێدا، بە نرخەکە رازی نەبوو، گوتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی موسای بەسەر تەواوی مرۆڤایەتی هەڵبژاردووە.

پیاوێکی ئەنساری گوێی لێ بوو، زللەیەکی لێدا، گوتی: تۆ دەڵێی سوێند بەو کەسەی موسای ﷺ لەسەر تەواوی مرۆڤایەتی هەڵبژاردووە، لە کاتێکیشدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوماندایە.

یەهودییەکە چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی باوکی قاسم، من مافی پاراستن و پەیمانم هەیە، فلانەکەس لێیدام.

---

[1] زانایان دەڵێن: زەردەخەنەکە لەبەر سەیری بە ئاشکرا قسەکردنی ئافرەتەکەیە لەوەی ئافرەتان شەرم لێی دەکەن لەبارەیەوە بە ئاشکرا قسەبکەن، یاخود لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت کە حەزی بۆ هاوسەری یەکەمی چووە و رقی لە دووەم بۆتەوە. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/٤).

[2] هەنگوین لەم فەرموودەیە ئاماژەیەکە بۆ سەرجێی کردن، تامەکە بە تامی هەنگوین و شیرینی چواندووە، لەم فەرموودەیەدا ئافرەتی تەڵاقدراو بۆ پیاوەکەی حەڵاڵ نابێتەوە، تاوەکو شوو بە پیاوێکی تر دەکات، تا لەگەڵی دەژی و ئەویش تەڵاقی دەدا و تا ماوەکەی تەواو دەبێت، ئینجا بۆپیاوی یەکەم حەلال دەبێتەوە، بەڵام بە تەنیا گرێبەستی مارەیی، پاشان تەڵاقی بدا، ئەوا بۆ هاوسەری یەکەمی حەلال نابێت. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/٣).

[3] ئەمە ئاماژەیەکە بۆ تەواوی هێزی سەرجێیکردن، ئاماژەیەکی سەرنجڕاکێشە لە رەوانبێژیدا، کە لە زمانی عەرەبیدا بەهێزترە لە واتا راستەقینەکەی. عمدة القاري (٣١/٤٧٧)

[4] بوخاری (٥٨٢٥) و موسلیم (١٤٣٣) گێڕاوەتیانەوە.

پێغەمبەری خوا بە ئەنسارییەکەی فەرموو: **"بۆ لێتدا؟"**.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، گوتی سوێند بەو کەسەی موسای ﷺ لەسەر تەواوی مرۆڤایەتی هەڵبژرادووە، لە کاتێکیشدا تۆ لە ناوماندای.

پێغەمبەری خوا ﷺ تووڕەبوو، تا تووڕەبوونەکەی بەسەر دەموچاوی پیرۆزیدا دیار کەوت، ئینجا فەرمووی: **"پێغەمبەران بەسەر یەکتریدا گەورە مەکەن، لەو رۆژەی فوو دەکرێت بە (صور) دا، هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر کەسێك خوا ویستی لەسەر مردنی نەبێت، دواتر فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوە، موسی ﷺ دەستی بەعەرش گرتووە، نازانم ئەو لەو کەسانە بووە کە مردووە و پێشی من زیندوو بۆتەوە، یاخود لەوانە بووە کە خوا جیاکردوونەتەوە"**[1].

**پێغەمبەر ﷺ دادوەریکردنێکی زۆری هەبووە، کە حوکمیداوە لە نێوان ناکۆکیکاران و خاوەن کێشەکان:**

- دادوەری کردووە، کە لە گەنجینەی دۆزراوەدا پێنجێك زەکاتە[2].
- دادوەری کردووە، لە کاتی کڕین و فرۆشتنی خورمای بەبەرهەم، بەرهەمی دارخورماکە بۆ ئەو کەسەیە کە بەرهەمەکەی خزمەتکردووە، تەنیا ئەگەر کڕیارەکە مەرجی لەسەردابنێت[3].
- دادوەری کردووە، کە لە فرۆشتنی کۆیلەدا، ماڵی کۆیلەکە بۆ خاوەنەکەیەتی، تەنیا ئەگەر کڕیارەکە مەرجی لەسەر دابنێت[4].
- دادوەری کردووە، کە منداڵی لە دایك بوو (جا بە زەواجی شەرعی بێت یان لە دایکبوونی زینابێت)، بۆ خاوەنی ماڵەکەیە کە باوکەکەیە، کەسی زیناکەریش هیچ شتێکی بۆ نییە[5].
- دادوەری کردووە بە (شوفعە) لە نێوان هاوبەشەکاندا، واتە یەکێك لە هاوبەشەکان بەشی خۆی لە ماڵەکە بفرۆشێت، بێ ئەوەی هاوبەشەکەی تر ئاگای لێ بێت، ئەو هاوبەشە مافی گەڕاندنەوەی ماڵەکەی لە کڕیارەکە هەیە، هەرچەندە پێشی خۆش نەبێ[6].

---

[1] بوخاری (٢٤١١) و موسلیم (٢٣٧٣) گێراوەتیانەوە.

[2] بوخاری (١٤٩٩) و موسلیم (١٧٠١) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێراوەتیانەوە.

[3] بوخاری (٢٣٧٩) و موسلیم (١٥٤٣) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێراوەتیانەوە.

[4] بەشێکە لە فەرموودەی پێشووتر.

[5] بوخاری (٢٠٥٣) و موسلیم (١٤٥٧) لە خاتوو عائیشەی دایکی باوەڕداران گێراوەتیانەوە.

[6] بوخاری (٢٢١٤) و موسلیم (١٦٠٨) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێرایتیانەوە.

• دادوەری کرد بۆ مالیکی کوڕی الهذلي، لە پێدانی میراتی ئەو ئافرەتەی، کە بە دەستی ئافرەتێکی تر کوژرا [١].

• دادوەری کردووە بۆ فیدیەی کوشتنی کۆرپە، بە کۆیلەیەکی تازە پێگەیشتوو، یان کۆیلەیەکی ئافرەت [٢].

• دادوەری کردووە کە دەبێت بۆشایەك یان شوێنێکی فراوان لە نێوان ماڵەکان جێبهێلدرێت، خەڵکەکەش مەبەستیان دروستکردنی خانوو نەبێت لێی، ئەم شوێنە بۆ رێگای هاتوچۆ جێدەهلێدرێت کە رووبەرەکەی دەبێت حەوت باڵ بێت [٣].

• دادوەری کردووە، کە نابێت ئافرەت بێ رووخسەت وەرگرتنی هاوسەرەکەی هیچ لە ماڵی هاوسەرەکەی ببەخشێت [٤].

• دادوەری کردووە، کە بەشی میراتی هەر دوو داپیرە (دایکی باوك، دایکی دایك) شەش یەکە واتا وەك یەکن [٥].

• دادوەری کردووە، هەر کەسێك زەویەك زەوت بکات بێ روخسەتی خاوەنەکەی و بیچێنێت، هیچ مافێکی لە بەرهەمەکەی بۆ نییە، بەڵکو بۆ خاوەنەکەیەتی [٦].

---

[١] بوخاری (٦٧٤٠) و موسلیم (١٦٨١) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێرایتیانەوە

[٢] بەشێکە لە فەرموودەی پێشووتر.

[٣] لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ: پێغەمبەری خوا ﷺ دادوەری کرد بە بەجێهێشتنی حەوت باڵ، لە نێوان ئەوانەی ناکۆکیان هەیە لەسەر رێگا. بوخاری (٢٤٧٣) و موسلیم (١٦١٣) گێراوەتیانەوە.

[٤] ئەبو داود (٣٥٦٥) و ترمذي (٦٧٠) و ابن ماجة (٢٢٩٥)، لە ئەبوی ئومامەوە ﷺ گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە صحیح الجامع ١٧٨٩) بە "سەحیح"ی داناوە.

[٥] عبدالله بن أحمد لە (زائد المسند ٢٢٢٧٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء: ١٦٨١) بە "زەعیف"ی داناوە.

[٦] ئەبو داود (٣٠٧٣) و ترمذي (١٣٧٨) لە سەعیدی کوڕی زەیدەوە گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء ١٥٢٠) بە "سەحیح"ی داناوە. هەروەها سەری کتێبی (سبل الهدى والرشاد في سيرة خير العباد) (٢٢١/٩) بکە.

# بەشی چوارەم:

## مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو چینەی مامەڵەیەکی تایبەتیان پێویست بووە

## بەشی چوارەم:

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو چین و توێژەی مامەڵەیەکی تایبەتیان پێویست بووە

### مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسڵمانە تازەکان:

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە پەرۆش و سوور بووە لەسەر هیدایەتدانی خەڵك، تا ئەوەی خوای گەورە پێی دەفەرموێت: ﴿ لَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفۡسَكَ أَلَّا يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴾ الشعراء: ٣ واتە: خەریکیت لە خەفەتدا خۆت دەفەوتێنیت کاتێك دەبینیت خوانەناسان باوەڕ ناهێنن. هەروەها دەفەرموێت﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٌ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ الكهف: ٦ واتە: جا تۆ لەوانەیە لە خەم و پەژارەدا لە سەرەنجامی رەشی ئەوانەی کە باوەڕ بەم قورئان و فەرموودەیە ناهێنن خۆت لەناو بەریت و لە داخ و خەفەتدا بمریت.

تەبەری دەڵێت: خوای گەورە دەیەوێت بەو یادکردنە پێی بڵێت، خەریکە ئەی موحەممەد لە سەرەنجامی ئەو قەوم و هۆزە، خۆت دەکوژیت، کاتێك پێیان گوتی: ئێمە باوەڕت پێ ناهێنین تا کانیاومان لە زەوی بۆ نەتەقێنیت، ئەمەش وەك یاخیبوونێکیان بەرامبەر پەروەردگاریان، کە باوەڕ بەو کتێبە ناهێنن کە من بەسەر تۆم دابەزاندووە، بەوەی بەراستی دابنێن کە لای پەروەردگاریانەوەیە، خەریکە خۆت بە هیلاك دەدەیت بەهۆی نیگەرانی و داخ و خەفەت خواردنت لە بەرامبەر پشتکردنیان لە تۆ و لەوەی بۆت هێناوەن و لەوەی باوەڕناهێنن [1].

خوای پەروەردگار خۆی وەسفی دەکات بەوەی سووڕ و پێداگیرە لەسەر هیدایەتدانی خەڵك: دەفەرموێت: ﴿ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ التوبة: ١٢٨ . واتە: (ئەی خەڵکینە) سوێند بەخوا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ رەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بەبەڵاو ناخۆشی، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان.

---

[1] تەفسیری تەبەری (١٥/١٩٤).

﴿ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ ﴾ واتە: ئەوەی لەسەرتان قورس و ناخۆشە لە توشبوون بە بەڵا و ناخۆشی لەسەر ئەویش ناخۆشە.

﴿ حَرِيصٌ رَسُولٌ ﴾ باشەی بۆ ئێوە پێ خۆشە، هەوڵیش دەدات ئەو باشییەتان پێ بگات، بە پەرۆش و ڕشتە لەسەر هیدایەتدانتان، خراپە و ناخۆشی بۆ ئێوە پێ ناخۆشە، هەوڵیش دەدات لێتانی دوور بکاتەوە.

﴿ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ واتە: زۆر دڵسۆز و میهرەبانە بە ئیمانداران، لە دایك و باوکی خۆیان بە سۆزترە بۆیان [1].

پێغەمبەری خوا ﷺ حاڵەتی پەرۆشی خۆیمان لە پێناو رزگارکردنی خەڵك لە سزای خوای گەورە بۆ وێنا دەکات و دەفەرموێت: **"نمونەی من و نمونەی خەڵك، وەك ئەو پیاوە وایە ئاگرێك دەکاتەوە، کاتێك دەوروبەری خۆی ڕووناك دەکاتەوە، پەپولە و زیندەوەرەکان دەیانەوێت بچنە ناو ئاگر، جا دەکەونە ناوی، ئەویش دەستدەکات بەدەرهێنانیان بەڵام بەسەریدا زاڵ دەبن و خۆیان فڕێدەدەنە ناوی، منیش پەخەی کراسەکانتان دەگرم بۆ ئەوەی نەکەونە ناوی، ئەوانیش هەرخۆیان فڕێدەدەنە ناوی [2]"**.

ابن حجر رحمه الله دەڵێت: لەم فەرمودەیەدا سۆز و میهرەبانی و پەرۆشی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ رزگاربوونی ئۆممەتەکەی دەردەکەوێت وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبە: **١٢٨**. [3]

## چەندجار چاوەکانی لە پێناوی ئۆممەتەکەی پڕ فرمێسك بووە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنه دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی خوای پەروەردگاری لە بارەی ئیبراهیم خوێندەوە: ﴿ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِي فَإِنَّهُۥ مِنِّي ۖ وَمَنْ عَصَانِي فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ إبراهيم: **٣٦**

واتە: پەروەردگارا، بەڕاستی ئەو بتانە زۆر کەسیان گومڕا کرد، زۆر خەڵکیان سەرلێشێواو کرد، جا ئەوەی شوێنی من بکەوێت و بەگوێی من بکات، ئەوە بێگومان لە پەیڕەوانی منە، ئەوەش کە لێم یاخی دەبێت، ئەوە بێگومان تۆ زۆر لێخۆش بوو میهرەبانیت.

---

[1] تەفسیری سەعدی (٣٥٦/١).

[2] بوخاری (٦٤٨٣) و موسلیم (٢٢٨٤) لە ئەبو هورەیرە گێڕاوەتیانەوە

[3] فتح الباری (٣١٨/١١).

﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ المائدة: ١١٨ واتـە: جـا ئەگەر ئەشکەنجەیان بدەیت (لەسـەر لادان و تاوانیـان)، ئـەوە بەراسـتی بەنـدەی خـۆتن و ئەگەر لێشیان خۆش ببیت، ئەوە بەراستی تۆ خۆت خوایەکی باڵادەست و دانایت.

دەستەکانی بەرز کردەوە و فەرمووی: **"اللهم أمتي أمتي"** گریا.

خوای گەورە ﷻ فەرمووی: **ئەی جبریل برۆ لای موحەممەد –خوا زاناترە– لێی بپرسە بۆ دەگریێ؟**

جوبریل ﷺ هاتە خزمەتی و لێی پرسی، پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی گێڕایەوە.

خوای گەورە ﷻ فەرمووی: **ئەی جبریل برۆ لای موحەمـەد پێـی بڵـێ: ئێمـە لـەبارەی ئوممەتەکەت رازیت دەکەین و نیگەرانت ناکەین.** [(١)]

## به موسڵمانبوونی کەسێك رووی دەگەشایەوە و دڵخۆش دەبوو:

لــە چــیرۆکی موســڵمانبوونی عــەدی کــوڕی حاتەمــدا هــاتووە: کاتێــك هاتــە خزمــەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ، لە خۆشیان راستەوخۆ بۆی چوو، جوببەشی لەبەر نەبوو، تا بەیعەتی پێدا [(٢)].

بە تێڕامان لە ژیان و سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ دەبینین رێنمویی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ موسڵمانە تازەکان –لە هەموو قۆناغەکاندا– جوانترین و تەواوترین رێنموییە.

بـا هەنـدێك لـەو وێنـە جوانانـە و رێنوێنـە پاکانـە نمـایش بکـەین و لەسـەر هەنـدێك لـە واتاکـانی فەرمایشـتی پـەروەردگار بوەسـتین کـە دەفـەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧ واتە: ئەی موحەممەد ئێمە تۆمان رەوانە نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە رەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو جیهانەکان.

## دوعای هیدایەتی دەکرد بۆ ئەوانەی چاوەڕێی خێری لێ دەکردن، بۆ ئەوەی بێنە ناو ئیسلام:

ئەبو ئەلحەسەنی کوڕی بطال ﷺ دەڵێت:

پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی دەکـرد خـەڵك بێنـە نـاو ئیسـلام، هـەروەها دوعـای بـۆ ئـەو کەسانە دەکرد،کە ئومێدی پێیـان هـەبوو دوای موسـڵمانبوونیان بگەڕێنـەوە سـەر حـەق، لەسەر دوعا کەشی زۆرانێك هیدایەتیان وەرگرت [(٣)].

---

[(١)] موسلیم (٢٠٢) گێڕاوەتیەوە.

[(٢)] مالك لە (الموطأ ١١٥٦) و عبدالرزاق لە (المنصف ١٢٦٤٦) گێڕاوەتیانەوە.

[(٣)] شەرحی (ابن بطال) لە سەحیحی بوخاری (١٤٩/٩). بە کورکتراوەیی.

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوایە گیان ئیسلام بە عززەت بکەی بە یەکێك لە دوو پیاوانە: بە ئەبو جەهل، یان بە عومەری کوڕ خەتتاب".**

دەڵێت: لەو دوانەش عومەر لای خۆشەویستر بوو[1].

ئەمە لەسەرەتادا بوو، پاشان عومەری تایبەت کردووە بە دوعا، عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **"خوایە گیان ئیسلام بە تایبەت بە عومەری کوڕی خەتتاب سەرفراز بکە[2]".**

راستەوخۆ دوای دوعاکەی پێغەمبەر ﷺ عومەر موسڵمان بووە.

ئەمە لە کاتێکدا بوو،کە خەڵکانێکی زۆر لە موسڵمانبوونی عومەر بێ ئومێد بوو بوون، تەنانەت یەکێك لەوان دەیگوت: عومەر موسڵمان نابێت، تا گوێدرێژەکەی خەتتاب موسڵمان نەبێت.

بۆیە دوعای پێغەمبەر ﷺ کاریگەری گەورەی لەسەر موسڵمانبوونی عومەر هەبوو.

## هەروەها دوعای مسوڵمان بوونی بۆ دایکی ئەبو هورەیرە کرد:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: دایکم بێ باوەڕ بوو، بانگهێشتم دەکرد بۆ ئیسلام، رۆژێك بانگهێشتم کرد، بەڵام ئەو قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەر ﷺ گوت.

بەگریانەوە هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ .

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا من بەردەوام بانگهێشتی دایکم دەکەم بۆ ئیسلام، بەڵام ئەو رەتی دەکاتەوە، ئەمرۆش بانگهێشتم کرد، بەڵام قسەی پێگوتی کە پێم ناخۆش بوو، توخوا داوا لە خوای پەروەردگار بکە دایکی ئەبو هورەیرە هیدایەت بدرێت.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"خوایە گیان دایکی ئەبو هورەیرە هیدایەت بدەی".**

بە مزگێنی دوعای پێغەمبەر ﷺ چوومەوە.

کاتێك هاتمەوە، گەیشتمە نزیك دەرگا، دەبینم داخراوە، دایکم گوێی لە دەنگی پێم بوو، گوتی: لە شوێنی خۆت بوەستە ئەبو هورەیرە.

گوێم لە دەنگی ئاوڕشتن بوو... ئەبو هورەیرە دەڵێت: خۆی شوشت و پۆشاکی لەبەر کرد و سەرپۆشی کردەسەری و دەرگای کردەوە.

---

[1] ترمذي (٣٦٨١) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (سنن الترمذي – ٢٩٠٧) بە سەحیحی داناوە.

[2] ابن حبان (٦٨٨٢) گێراوەتیەوە، الحاكم (٤٤٨٥) بە سەحیحی داناوە، ذهبي و حافظ لە (الفتح ٤٨/٧) و الالبانی لە (الصحیحة ٦٨٨٢).

پاشان گوتی: ئەی ئەبوهورەیرە أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

بە گریانی خۆشییەوە گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، مژدە بێت، پەروەردگار دوعاکەی قبوڵ کردی، دایکی ئەبوهورەیرە هیدایەتی وەرگرت.

سوپاس و ستایشی پەروەردگارم کرد.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، دوعامان بۆ بکە من و دایکم لەلای بەندە باوەڕدارەکان خۆشەویست بین و ئەوانیش لای ئێمە خۆشەویست بن.

پێغەمبەریش فەرمووی: **"خوایە گیان ئەو بەندە و دایکی، لای بەندە باوەڕدارەکان خۆشەویست بکە، باوەڕدارنیش لای ئەوان خوشەویست بکە"**.

ئەبوهورێرە دەڵێت: هیچ باوەڕدارێك نەبوو بمبینێت یان گوێی لێم بوو بێت، ئەو هەر منی خۆشویستووە[1].

### هەروەها دوعای موسڵمانبوونی بۆ هۆزی دەوس کردووە:

وەك ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەڵێت: طوفەیلی کوری عەمر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: هۆزی دەوس بەهیلاکچوونە، یاخی بوونە و ئیسلامیان ناوێت، دوعایان لێ بکە.

خەڵکەکە وا گومانیان برد دوعایان لێ دەکات.

فەرمووی: **"خوایە گیان هیدایەتی دەوس بدەی و بیانهێنی[2]"**.

بوخاری لە سەحیحەکەی، بەشێکی لەسەر ئەمە ناوە (دوعای هیدایەتدان بۆ بێ باوەڕەکان بۆ ئەوەی دڵەکانیان پەیوەست بن بە دینەوە)

الحافظ دەڵێت: وشەی (لیتألفهم- واتە: پەیوەستبوونی دڵەکانیان بە دین) لە تێگەیشتنی دانەرە، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ جیاوازیکردن لە نێوان هەردوو باردا، چونکە پێغەمبەری ﷺ هەندێکجار دوعای لێ دەکردن، هەندێك جاریش دوعای بۆ دەکردن.

لە باری یەکەمدا: کاتێك توندوتیژی و ئازاردانیان زیادی دەکرد، باری دووەمیش: کاتێك لە رق و کینیان ئەمین دەبوو، ئومێدی پەیوەستبوونیانی بۆ دەخواستن، وەك ئەوەی لە هۆزی دەوس روویدا[3].

---

[1] موسلیم (٢٤٩١) گێراوەتیەوە.

[2] بوخاری (٢٩٣٧) و موسلیم (٢٥٢٤) گێراوەتیانەوە.

[3] فتح الباری (١٠٨/٦).

## دڵخۆش دەبوو بە موسڵمانبوونیان و سوپاسی خوای لەسەر دەکرد:

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: خزمەتکارێکی یەهودی، خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، نەخۆش کەوت، پێغەمبەر ﷺ سەردانی کرد و لەلای سەری دانیشت، پێی فەرموو: **"موسڵمان بە"**.

سەیرێکی باوکی کرد، کە لای دانیشتبوو، ئەویش پێی گوت: بە قسەی باوکی قاسم بکە، جا موسڵمان بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە دەرەوە و فەرمووی: **"سوپاس بۆ ئەو خوایەی (بەهۆی منەوە) لە ئاگر رزگاری کرد"**[1].

پێشتریش دڵخۆشی پێغەمبەر ﷺ بە موسڵمانبوونی عەدی کوڕی حاتەم و عیکریمەی کوڕی ئەبو جەهل باس کراوە.

## لەوانەی دڵی پێ خۆش دەبوو:

لە حویطبی کوڕی عبدالعزی دەگێڕێنەوە کە دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی رزگارکردنی مەککە هاتە مەککە، زۆر ترسام، لە ماڵ دەرچووم، منداڵەکانم هەر یەکەی لە شوێنێکی پارێزراو دانا.

چوومە لای باخچەی عەوف، لەوێ بووم، کاتێك ئەبو زەری غیفاریم بینی، پێشوتریش لە نێوانماندا دۆستایەتی هەبوو، کاتێك بینیم لە دەستی هەڵاتم.

گوتی: باوکی موحەممەد

گوتم: بەڵێ

گوتی: چیتە؟

گوتم: ترس.

گوتی: هیچ ترسێکت لەسەر نییە، تۆ لە پاراستنی خوای ﷻ دای.

گەڕامەوە بۆی و سەلامم لێکرد.

گوتی: بڕۆ ماڵەوەت.

گوتم: بۆ دەتوانم بچمەوە ماڵەوە؟ سوێند بەخوا نەمدەزانی کە بە زیندوویەتی دەچمەوە ماڵەوە تا نەمکوژن، یان بێنە سەر ماڵم بیانکوژم، منداڵەکانیشم هەر یەکە و لە شوێنێکدان.

گوتی: بڕۆ منداڵەکان لە یەك شوێن کۆ بکەرەوە، منیش هەتا ماڵەوە لەگەڵت دێم.

لەگەڵم هات، لە رێگادا هاواری دەکرد، حویطب پارێزراوە و هەڵنایەت.

---

[1] بوخاری (١٣٥٦) و أبو داود (٣٠٩٥) گێڕاوەتیانەوە، زیادەکە هی أبو داودە.

پاشان ئەبو زەر چووە لای پێغەمبەر و ئەمەی پێ ڕاگەیاند، ئەویش فەرمووی: **"ئەی هەموو خەڵك پارێزاو نییە؟ تەنیا ئەوانەی من فەرمانی کوشتنم بۆ دەرکردوون؟"**

گوتی: دڵنیا بووم، منداڵەکانم هێنانەوەماڵەوە، پاشان ئەبو زەر گەڕایەوە لام.

پێی گوتم: ئەی باوکی موحەمەد تاکەی؟ بۆ کوێ؟ لە زۆر شوێندا تۆ پێشەنگ بووی، خێری زۆرت لە دەستچووە، خێری زۆریش ماوە، بڕۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بە، سەلامەت دەبیت.

پێغەمبەری خواش ﷺ لە هەموو خەڵك باشترە، لەهەموویان نەرم و نیانترە، شەڕەفی ئەو شەڕەفی تۆیە، گەورەیی ئەو گەورەیی تۆیە.

منیش گوتم: لەگەڵ تۆ دێم.

لەگەڵی ڕۆیشتم تا گەیشتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە شوێنێك بوو بەناوی بطحاء ئەبوبەکر و عومەریش ﷺ لای بوون، لەلای سەری وەستام و سەلامم لێکرد، وەڵامی سەلامی دامەوە، گوتم: أشهد أن لا إله الله وأشهد أنك رسولُ الله. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"سوپاس بۆ ئەو خوایەی هیدایەتی دای"**.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە موسڵمانبوونم دڵخۆش بوو، لە پاشاندا لە شەڕەکانی حونەین و تائیف لەگەڵیدا بەشداربووم، لە دەسکەوتەکانی حونەین ١٠٠ حوشتری پێدام[١].

## ڕێنوێنی دەکردن بۆ خۆشوشتن دوای موسڵمانبوونیان:

قەیسی کوڕی عاصم ﷺ دەگێڕێتەوە کە موسڵمان بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد بە ئاو و سیدر خۆی بشوات[٢].

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە ثمامەی کوڕی أثال موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو: **"بڕۆن بیبەنە لای دیواری نەوەی فلان، پێی بڵێن خۆی بشوات[٣]"**.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر پێویستبوونی خۆشوشتن لەکاتی موسڵمانبووندا، هەندێك لە زانایان ئەمە لەلایان واجبە، زۆربەشیان بە سوننەتی دادەنێن.

ترمذی دەڵێت: زانایان بۆ پیاو بە سوننەتی دادەنێن، کە دوای موسڵمانبوونی خۆی و جلەکانی بشوات[٤].

---

[١] المستدرك على الصحيحين للحاكم (٦١٣٠).

[٢] أبو داود (٣٥٥) و ترمذي (٥٥٠) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە(الارواء) بە سەحیحی داناوە (١٢٨).

[٣] ئەحمەد (٧٩٧٧) گێڕاوەتیەوە، لە(الارواء) بە سەحیحی داناوە (١/١٦٤).

[٤] سنن الترمذي (٢/٥٠٢)، تحفة الأحوذي (٢/١٤٠).

**فێری حوکمە شەرعییەکانی دەکردن، فەرمانی پێ دەکردن دەستبەرداری پیسییەکانی نەفامی بن:**

ئەبو مالکی ئەشجەعەی لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەر کەسێك موسڵمان بووایە، پێغەمبەر ﷺ فێرە نوێژی دەکرد، پاشان فێری دەکرد ئەم چەند وشەیە بڵێت: **"خوایە گیان، لێم خۆش بی، رەحمم پێ بکەی، هیدایەتم بدەی، سەلامەتم بکەی، رزقم پێ ببخەشی"**[1].

عەثیمی کوڕی کلیب لە باوکییەوە، ئەویش لە باپیرییەوە، دەگێڕێتەوە: کە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: موسڵمان بووم.
پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: **"موی بێ باوەڕی لەخۆت لاببە و خۆت سوننەت بکە"**[2].

**موسڵمانبوونی لە پێش هەموو کارێکی دیکەوە دادەنا:**

بەرراء ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێکی دەمامکدار بە ئاسن[3] هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، جەنگ بکەم یان موسڵمان بم.
فەرمووی: **"موسڵمان بە، پاشان جەنگ بکە"**.
موسڵمان بوو، پاشان شەڕی کرد تا کوژرا.
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"کردەوەیەکی کەمی کرد، پاداشتێکی گەورەی وەرگرت"**[4].

لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێت: کە پاداشتی گەورە بە ئەنجامدانی کارێکی ئاسان بە هۆی بەخشندەیی خوای گەورە بە دەست دەکەوێت[5].

دەگوترێت ئەم پیاوە عەمری کوڕی ثابتي وەقش بووە.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بۆیان باسکردووم، پیاوێك چوتە بەهەشت هەرگیز نوێژێك چییە نەیکردووە.

خەڵکەکە نەیان ناسی و پرسیاریان کرد: ئەو کەسە کێیە؟

دەڵێت: ئوصەیرمی کوڕی عبدالاشهل:یان عەمری کوڕی ثابتي وەقش.

حصین دەڵێت: بە مەحمودی کوڕی لوبەیدم گوت: حاڵی ئوصەیرم چۆن بوو؟

---

(١) موسلیم (٢٦٩٧) گێراوەتیەوە.
(٢) أبو داود (٣٥٦) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە(الارواء) بە سەحیحی داناوە (٧٩)
(٤) ئەمە ئاماژەیەکە لە پێچانی دەم وچاوی خۆی بە ئامێری جەنگ.
(٤) بوخاری (٦/٢٥) گێراوەتیەوە.
(٥) فتح الباری (٦/٢٥).

گوتی: پێشووتر ئیسلامی ڕەت دەکردەوە، کاتێك شەڕی ئوحد هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ئوحد، ئیسلامی بۆ ڕوون بۆوە، موسڵمان بوو.
دەستی کردە شمشێرەکەی، تا هات و چووە ڕیزی خەڵکەکە، شەڕی کرد، تاوەکو بە بریندار کەوت.

ئینجا پیاوانی نەوەی عبدالاشهل دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی کوژراوەکانیان، تاگەیشتنە سەری، گوتیان، بەڕاستی ئەمە ئوصەیرمە، بۆچی هاتووە، ئێمە بەجێمان هێشت ئەو بێ باوەڕ بوو.

لێیان پرسی بۆچی هاتووی: سۆزت بۆ خزمکانت هەبووە یان ئارەزووت بۆ ئیسلامە؟

گوتی: بەڵکو ئارەزوو و مەبستم ئیسلامە، باوەڕم بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێنا، پاشان دەستمکردە شمشێرەکەم و بەیانی زوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووم، شەڕم کرد تا بریندار بووم.

زۆری پێنەچوو تا لەناو دەستیان مرد، بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسیان کرد، فەرمووی: "**بەڕاستی ئەو لە ئەهلی بەهشتە** [1]".

## کەسانێکی لەگەڵ تازە موسڵمانەکان دەنار بۆ ئەوەی فێری کاروباری دینیان بکات:

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نوێنەری هەریەکە لە هۆزەکانی (رعل، ذکوان، عصیة و بنو لحیان) هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ڕایانگەیاند کە موسڵمان بوونە، داوای یارمەتیان کرد بۆ هۆزەکانی خۆیان.

پێغەمبەری خوا بە حەفتا کەسی ئەنساری یارمەتی بۆ ناردن.

ئەنەس دەڵێت: ئێمە ناومان نابوون مامۆستایانی قورئان، بە ڕۆژ داریان کۆدەکردەوە و دەیانفرۆشت و بە پارەکە یارمەتی هەژارانیان دەدا، بە شەویش نوێژیان دەکرد و قورئانیان فێرە خەڵك دەکرد [2].

مهلب دەڵێت: سوننەتی پێغەمبەرە، یارمەتی بۆ شوێنی پێویست بنێرێت، بەوەی لەلایەتی، پێشەوایانی دوای خۆشی کاریان لەسەر ئەم بەرنامەیە کردووە [3].

---

[1] ئەحمەد (٢٣١٢٣) گێراوەتیەوە، ابن حجر لە (الاصابة) بە (حسن)ی داناوە ٥٠١/٤.
[2] بوخاری (٣٠٦٤) و موسلیم (٦٧٧) گێراوەتیانەوە.
[3] شەرحی (ابن بطال) لە سەحیحی بوخاری (٢٩٠/٩)

**بە پەرۆش بووە بۆ جێگیربوونیان لەسەر دین، هەرشتێك لە دین ساردی بکردبانەوە، لێی دوور دەکردنەوە:**

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە ئایا دیـواری دەوری کەعبـە بەشێکە لە کەعبە؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتم: بۆچی نەیانخۆستۆتە ناو کەعبە؟

فەرمووی: **"قەومەکەت پارەی ئەم کارەیان نەبووە"**.

گوتم: ئەی بۆچی دەرگاکە بەرزە؟

فـەرمووی: **"خەڵکەکـە وایـان لێکـردووە، بۆئـەوەی هـەر کەسـێکی بیانـەوێت بیبنـە ژوورەوە و هەر کەسێکیشیان نەوێت رێگریان لێ بکەن"**.

پاشان فەرمووی: **"ئەی عائیشە، گەر خەڵکەکەت نزیك نەبوونایە لە سەردەمی نەفامی، فەرمانم دەکرد کەعبە تێك بدەن، ئەو بەشەی لە دەرەویە دەمخستەوە ناوی، دەرگاشـم نەوی دەکردەوە، دوو دەرگاشم بۆ دەکرد، دەرگایەك لە رۆژهەڵات و دەرگایەك لە رۆژئاوا، دەمگەیندەوە سەر بناغەی ئیبراهیم**[1] ﵇**"**.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: **"گەر خەڵکەکەت پـەیمانیان نـوێ نەبووایـە، دەترسـێم دڵیان هەڵگەڕێتەوە.."**.

لەوانەیە تێکدانی کەعبە توشی دوودڵیان بکا، بەهۆی هێنانی شتێکی نوێ بۆناو ئاینیان لەوانەیە شەیتان توشی وەسوەسەیان بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەویست ئەوان دڵیان پەیوەست و جێگیر بێت لەسەر ئیسلام، دەترسا بە تێکدانی کەعبە دڵیان لەمە بڕنجێت، پێی باشتربوو واز لەم کارە بهێنێت.

فەرمان پێکردن بە خەڵکەکە بەوەی تەواف بەدەوری هەموو کەعبە بکەن سەلامەترە بۆ حاڵی خەڵکەکە و بۆ چاکسازی دینیان، خۆ پارچەکانی تری کەعبە بۆ لای یەك بهێندرێنەوە و دروست کردنەوەی سەر لەنوێ نە واجبە و نە روکنی شەریعەتە، ئەوەی پێویستە خەڵکەکە تەواوف بکەن بە هەموو کەعبە، ئەم کارەش چۆن کراوە دەکرێ هەر ئەوها بێت[2].

---

[1] بوخاری (١٥٨٣) و موسلیم (١٣٣٣) گێراوەتیانەوە.

[2] المنتقى شرح الموطأ (٢/٢٨٢).

**لەسوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نەکردنی هەندێك کاری بژاردە، ئەمەش لەبەر ترسی حاڵی نەبوونی هەندێك خەڵك لەو کارە بژاردانە.
- بەرپرس واز لەو شتانە بهێنێت کە لەوانەیە خەڵك نکوڵیان لێ بکات، یان زیانی دین و دونیای لێ دروست بێت.
- پەیوەستکردنی دڵیان بە دین، کارێکی واجبە.
- کاری گرنگتر پێشبخرێت، مەبەست لە گرنگتر وەلانانی خراپەکاری و هێنانی چاکەکارییە، ئەمە لە کاتێکدا گەر هەردوو کارەکە لەیەکتری گیربوون، پێویستە خراپە دوور بخرێتەوە، هەر کاتێکیش لە دووربوونی خراپە دڵنیابوون، ئەو کات باشترە کاری چاکە و بەرژەوەندی ئەنجام بدرێت.
- گفتوگۆی پیاو لەگەڵ خێزانەکەی لە کاروباری گشتیدا.
- پەرۆشی هاوەڵان لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ.

**سوودێك:**

ابن کثیر ﷫ دەفەرموێت: ئیبن زوبێر لەسەر هەمان شێوەی، کە عائیشەی پوری هەواڵی پێدابوو، بنیاتی ناوە، خوای گەورە پاداشتی بداتەوە.

کاتێك لە ساڵی حەفتا و سێ حەجاجی کوڕی یوسف بەسەریدا زاڵ بوو، دیواری باکوری تێکدا و دیوارەکەی وەکو جاران هێنایەوە دەرەوە، بەردەڕەشەکەش کە شکابوو، خستیە ناو دیواری کەعبە، دەرگاکەشی بەرز کردەوە، دەرگای رۆژئاواشی داخست، بەم شێوەیە ماوەتەوە تا ئێستا

ئەم کارەی بە فەرمانی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان ئەنجامدا، ئەویش فەرموودەکەی پێ نەگەیشتبوو، کاتێکیش فەرموودەکە پێگەیشت، گوتی: گەر ئەم فەرموودەیەم پێ بگەیشتبایە، هەر لەسەر بونیادی کوڕی زوبێر دەمهێشتەوە و دەستکاریمان نەدەکرد.

ئیبن مەنسور ویستی لەسەر هەمان شێوەی ئیبن زوبێر بونیادی بنێتەوە، لەمەدا راوێژی بە مالیکی کوڕی ئەنەس کرد، ئەویش گوتی: من پێم خۆش نییە پادشاکان بە گوێرەی رای خۆیان یاری بە دروستکردنی بکەن، ئەمە بەپێی بۆچوونی ئیبن زوبێر بوو،

ئەمەش بەپێی بۆچوونی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، یان یەکێکی تر بۆچوونێکی تری هەیە، خوای پەروەردگاریش ﷻ زاناترە [1].

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷛ دەگێڕێتەوە، کە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی گوتی: سوێند بەخوا بگەڕێینەوە مەدینە، ئەوەی دەسەڵاتدار و بەڕێز و پیاو ماقووڵە دەبێت، بێ ڕێز و بێدەسەڵاتەکان لە شار دەربکات. ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ، عومەر هەڵسا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێم پێ بدە لە ملی ئەم دووڕووە بدەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"وازی لێ بێنە، با نەڵێن موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت"** [2].

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷛ دەگێڕێتەوە، دەڵێت: پیاوێك لە (جەعرانە) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لە (حونەین) گەڕابوونەوە، لەناو جلی بیلال زیووی تێدابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەریدەهێنا و دەیبەخشییە خەڵك، یەکێك گوتی: ئەی موحەممەد دادپەوەر بە.

فەرمووی: **"هاوار بۆ تۆ! گەر من دادپەوەر نەبم کێ دادپەروەرە؟ گەر من داد پەروەری نەکەم، بەراستی لە ناودەچی و نائومێد دەبی"**.

عومەری کوڕی خەتتاب ﷛ فەرمووی: لێم گەڕێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم دووڕووە بکوژم، ئەویش فەرمووی: **"پەنا بەخوا دەگرم، خەڵك بڵێن من هاوەڵانی خۆم دەکوژم"**.

نەوەوی ﷫ دەڵێت: لەمەدا نەرمونیانی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێت.

لەم فەرموودەیەدا ئەوەی تێدایە، کە هەندێك کار نەکرێت و ئارام لەسەر هەندێك خراپە بگیرێت، ئەمەش نەوەك لەسەر ئەم خراپەیە شتی گەورەتر دروست بێت.

پێغەمبەر ﷺ دڵی خەڵکی بۆلای یەکتر پەیوەست دەکرد، لەسەر قسەی ڕەقی دەشتەکی و دووڕووەکان ئارامی دەگرت، ئەمەش لە پێناو بەهێزکردنی دەسەڵاتی موسڵمانان و تەواوکردنی بانگەوازی ئیسلام و دامەزراندنی باوەڕ لە دڵی تازە موسڵمانبووەکان، هەروەها ڕاکێشانی دڵی خەڵکانی تر بۆ ئیسلام، بۆ ئەم مەبەستەش ماڵ و سامانی زۆری پێ دەدان.

---

[1] البداية والنهاية (٢٧٥/٨).

[2] بوخاری (٤٩٠٥) و موسلیم (٢٥٨٤) گێڕاوەتیانەوە.

قازی دەڵێت: زانایان جیاوازیان لەسەر ئەوەی ئایا حوکمی چاوپۆشین لەو کەسانە لە ئێستادا ماوە، شەڕیان لەگەڵ ناکرێت، یاخود ئەمە لەگەڵ هاتنی ئیسلام و دابەزینی ئەم ئایەتە نەسخ بۆوە ﴿ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡۚ ﴾ التوبة: ٧٣ واتە: دژی کافرو دووڕووەکان بجەنگە و تیژ بکۆشە.

دەگوترێت: گەر دووڕووییان دەرنەخەن، ئەو کات لێیان دەبوردرێ، گەر دەریانخست دەکوژرێن [1].

کەسی دووڕوو گەر بێ باوەڕیی و دووڕووییەکەی دەرنەخات، لە حوکمی دونیادا وەك بێ باوەڕ مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت، بەڵکو مامەڵەی موسڵمانانی لەگەڵ دەکرێت، ماڵ و خوێنی بە ڕاگەیاندنی موسڵمانبوونی حەرام دەکرێت، ئەمەش ئەو قەڵغانەیە کە خوای گەورە لە قورئان باسی کردووە: ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ المنافقون: ٢

واتە: ئەوانە سوێندی درۆیان کردووە بە قەڵغانی خۆیان و بەو هۆیەوە بەربەستی خەڵکیان کردووە لە ڕێبازی خوا، بەڕاستی ئەوەی ئەوان دەیانکرد، کارێکی زۆر ناپەسەندو نابەجێ بوو.

پێشەوا شافیعی ﷺ دەفەرموێت: لەبارەی کوشتن-خوا زاناترە- واتە وازهێنان لە کوشتنیان، بەردەوامیش بەوەی دەریانخستووە هەر حوکمی باوەڕیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

بەم پێیەش خوای گەورە بە زانینی نهێنیان و پێچەوانەی ئاشکراکردنی باوەڕیان شوێنی هەرە خوارەوەی لەناو ئاگر بۆ داناوون [2].

ابن کثیر دەڵێت: بۆیە ضحاکی کوری مزاحم بەم شێویە دەیخوێندەوە "اتخذوا إيمانهم جُنةً"، واتە باوەڕهێنانی ئاشکرایان دەکردە قەڵغانی خۆیان بۆ خۆپاراستن لە کوشتن، جمهوری قورئان خوێنانیش بە ﴿أَيۡمَٰنَهُمۡ﴾ دەخوێننەوە، واتە سوێند خواردنیان [3].

دووڕووەکان سەرباری بە هێزی بێ باوەڕیان، حوکمی هەڵگەڕاوەکانیان لەسەر جێبەجێ نابێت، بەڵکو لە دونیادا حوکمی موسڵمانیان لەسەر جێبەجێ دەبێت.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣٩/١٦).

[2] أحكام القرآن (٢٩٩٣٠٠/١).

[3] تەفسیری ابن کثیر (١٥٠/٨).

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە کاتێکدا ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، دەسکەوتی دابەش دەکرد، پیاوێکی نەوەی تەمیم هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا دادپەروەر بە، فەرمووی: **"هاوار بۆ تۆ! گەر من دادپەروەر نەبم کێ دادپەروەرە؟ گەر من داد پەروەری نەکەم، بەراستی لە ناودەچی و نائومێد دەبی"**.

عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا روخستەم بدە لە ملی بدەم، فەرمووی: **"لێی گەڕێ، کۆمەڵە کەسانێکی هاوەڵی پەیدا دەبن، هەر کەسێك لە ئێوە نوێژ و رۆژووی خۆی لەبەرچاو دەکەوێت لەبەر نوێژ و رۆژی ئەوان، قورئان دەخوێنن لە گەروویان تێپەڕ ناکات، وەك چۆن تیر لە لاشەی نێچیر دەردەرچێت، بەم شێوەیە لە دین دەردەچن"**[1].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"فەرمانم پێ نەکراوە دڵی خەڵکی کون بکەم و سینگیان شەق بکەم"**[2].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"پەنا بەخوا دەگرم، خەڵك بڵێن من هاوەڵانی خۆم دەکوژم"**[3].

ئیبن حەجەر دەڵێت: فەرمایشتی کە دەڵێت **"هاوەڵانێکی پەیدا دەبن..."** ئەوەی دیارە هۆکاری وازهێنان لە کوشتنی بەهۆی ئەوەیە کەسانێك بەو سیفەتانە لەو پەیدا دەبن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیێنێت دەست لە کوشتنی هەڵبگیرێت لەگەڵ ئەوەی دژایەتی بۆ پێغەمبەری ﷺ ئاشکرا کردووە، بەڵکو وەك بوخاری بۆی چووە لەبەر پەیوەستکردنی دڵەکانیان بووە بە دین، وەسفی کردوون کە لە دینداری زیادەڕۆیی دەکەن، گەر روخسەتی کوشتنی بدابان، دەبووە هۆی دوورکەوتنەوەی هەندێك خەڵك لە هاتنە ناو ئیسلام[4].

**هەر یەکێك لەوان موسڵمان بوایە دڵیانی بە پێدانی سامان و مامەڵەی جوان پەیوەست دەکرد بە دین:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەر داوایەك لە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هاتنە ناو ئیسلام کرابێت، پێی بەخشیووە.

پیاوێك هاتە خزمەتی، ئەویش مێگەلە مەڕێکی بەقەد نێوان دوو چیا پێدا، گەڕایەوە ناو هۆزەکەی خۆی و گوتی: ئەی هۆزەکەم موسڵمان بن، چونکە بەڕاستی موحەمەد بەخششێك دەبەخشێت کە هەرگیز لە هەژاری ناترسێت[5].

---

[1] بوخاری (٣٦١٠) و موسلیم (١٠٦٤) گێراوەتیانەوە.

[2] بوخاری (٤٥٥١) و موسلیم (١٠٦٤) گێراوەتیانەوە.

[3] موسلیم (١٠٦٣) لە جابری کوڕی عبەدوڵلا گێراوەتیەوە.

[4] فتح الباری (١٢/٢٩٣).

[5] موسلیم (٢٣١٢) گێراوەتیەوە.

ئەنەس دەڵێت: گەر پیاوێك لە پێناو ماڵی دونیا ببوایە موسڵمان، هەر کە موسڵمان دەبوو، ئیسلام لەلای لە هەموو دونیا و ئەوەشی لە دونیادا هەیە خۆشەویستر دەبوو[١].

مەبەست لەمە: سەرەتا موسڵمانبوونی خۆی بە ماڵی دونیا دەردەخست، نەوەك بە دڵی، بەڵام پاشان بە بەرەکەتی پێغەمبەر ﷺ و نوری ئیسلام، زۆر لەسەر ئەم حاڵە نەدەمایەوە تاوەکو خوای گەورە سینگی بۆ باوەڕی راستەقینە دەکردەوە، باوەڕ دەچووە ناو دڵی، ئەو کات باوەڕ لە لای لە دونیا و ئەوەی لە دونیادا هەیە خۆشەویستر دەبوو[٢].

بۆیە دەیبەخشییە ئەو کەسانەی دوودڵبوونایە یان باوەڕیان لاواز بووایە، وەك دەفەرموێت ﷺ **"بۆئەوەی دڵیان پەیوەست بکەم، دەبەخشمە قورەیش، چونکە ئەوان هێشتا لە سەردەمی نەفامی نزیکن[٣]".**

**گەر ترسی هەبووایە ئازار بدرێن، فەرمانی پێدەکردن موسڵمانبوونی خۆیان بشارنەوە:**

ئەبوزەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من پیاوێك بووم لە هۆزی (غیفار)، پێیان راگەیاندین کە کەسێك پەیدابووە لە مەککە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات.

بە براکەم گوت: برۆ لای ئەو پیاوە و قسەی لەگەڵ بکە و هەواڵەکەشم بۆ بێنەوە.

رۆیشت، ئەوی بینی و گەڕایەوە.

گوتم: ها چیت لایە؟

گوتی: سوێند بەخوا پیاوێکم بینی فەرمانی بە چاکە دەکرد و رێگری لە خراپە دەکرد.

پێم گوت: دڵم تەواو بە قسەکانت ئاوی نەخواردۆتەوە.

تورەگەیەك و گۆچانێکم بە دەستگرت و بەرەو مەککە رۆیشتم، وامکرد کە نایناسم، پێشم خۆش نەبوو پرسیار لەبارەیەوە بکەم و ئاوی زەمزەم بخۆمەوە و لەمزگەوت دابینششم.

عەلی بەلامدا تێپەڕی و گوتی: پێی دەچێ ئەم پیاوە غەریبە بێت.

گوتم: بەڵێ.

گوتی: وەرە لەگەڵم بۆ ماڵەوە.

لەگەڵی رۆیشتم، پرسیاری لەبارەی هیچ شتێك لێنەکردم و منیش هیچم پێ نەگوت.

---

[١] موسلیم (٢٣١٢) گێراوەتیەوە.

[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢١/٨).

[٣] بوخاری (٣١٤٦) و موسلیم (١٠٥٩) گێراوەتیانەوە.

کاتێك بەیانیم کردەوە، زوو بەرەو مزگەوت ڕۆیشتم، لەبارەی ئەو پرسیارم نەکرد و کەسیش هیچی پێ نەگوتم.

عەلی دیسان بەلامدا تێپەڕی و گوتی: ئێستا کاتی ئەوەیە ئەم پیاوە ماڵی خۆی پێ بزانێتەوە [1].

گوتم: نەخێر

گوتی: لەگەڵم وەرە.

لەگەڵی ڕۆیشتم، پرسیاری لەبارەی هیچ شتێك لێنەکردم و منیش هیچم پێ نەگوت.

تا ڕۆژی سێیەم بەم شێوەیە بوو، عەلی بەهەمان شێوە گەڕایەوە، لەگەڵی ڕۆیشتم، ئەمجارە گوتی: ئایا لەبارەی خۆت هیچم پێ ناڵێیت کە چی تۆی هێناوەتە ئەم شارە؟

پێم گوت: گەر هەواڵم بشاریتەوە، بۆت باس دەکەم.

گوتی: وا دەکەم.

پێم گوت: پێمان ڕاگەیاندراوە پیاوێك لێرە بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکات، براکەم نارد تا قسەی لەگەڵ بکات، گەڕایەوە لام، بەڵام دڵم ئاوی نەخواردەوە، ویستم بەخۆم بیبینم.

گوتی: بەڕاستی تۆ ڕێگات ڕاست کردووە، لەسەر حەقی، ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ گەر بەیانیت کردەوە بەدوامدا وەرە، تا بەدوای مندا دێیتە ژوورەوە، گەر کەسێکم بینی مەترسی لەسەر تۆ هەیە، من جیا دەبمەوە دەچمە لای دیوارەکە خۆم بە نەعلەکە دەخافڵێنم، تۆش بڕۆ. ڕۆیشت و منیش لەگەڵی ڕۆیشتم، ئەو چووە ژوورە و منیش لەگەڵی چوومە ژوورە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ.

پێم گوت: ئیسلامم بۆ باس بکە.

بۆی باس کردم و لە شوێنی خۆم موسڵمان بووم [2].

پێی فەرمووم: **"ئەی ئەبو ذەر، ئەم بابەتە بشارەوە، بگەڕێوە شارەکەی خۆت، هەر کاتێك زانیت ئێمە ئاشکرابووین، وەرەوە"**.

گوتم: سوێند بەو کەسەی تۆ بە حەق ڕەوانە کردووە، لەناویاندا هاوار دەکەم [3].

---

[1] واتە: ئەو ماڵە بناسێتەوە کە وەك ماڵی خۆیەتی، مەبەست لە میوانداریکردنیەتی.

[2] وەك ئەوەی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی زانی بێت، کاتێك نیشانەکان هاتبنە دی لە هاتنە ناو ئیسلام دوو دڵ نەبووە.

[3] مەبەست ئەوەیە، دەنگی لە نێوان بێ باوەڕەکان بەرز دەکاتەوە، چونکە زانی کە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر شاردنەوەی دینەکەی، واجب نەبووە، بەڵکو ترسی لەسەر ئەو هەبوە، ئەویش پێی ڕاگەیاندووە کە ئەو هێزی هەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕێگای پێدا.

**هاتە مزگەوت و قورەیشەکانیش لەوێ بوون، گوتی: ئەی خەڵکی قورەیش، من شایەدی دەدەم هیچ خوایەك نییە جگە لە الله، شاهێدیش دەدەم موحەممەد بەندە و نێردراوی خوایە.**

**گوتیان: بڕۆن بە گژ ئەم هەرزەکارە.. ئەم لە ڕێ لادەرە.**

**بۆم هاتن، ویستیان بمکوژن.**

**عەباس منی گرت، عەلیش هات، ڕووی تێکردن و گوتی: هاوار بۆ ئێوە، پیاوێك لە نەوەی غیفار دەکوژن، لە کاتێکدا ڕێگای بازرگانی و بازاڕتان بەسەر غیفارەوەیە.**

**لێم گەڕان.**

**کاتێك بەیانی هاتەوە، گەڕامەوە هەمان شوێن و هەمان قسەی دوێنم دووبارە کردەوە.**

**گوتیان: بڕۆن بە گژ ئەم لە ڕێ لادەرە.**

**دیسان بۆم هاتن، بە هەمان شێوەیە عەلی و عەباس هاتن و هەمان قسەیان کردەوە [1].**

**فەرمانی بە عەمرِی کوڕی عەبسە کرد موسڵمان بوونی خۆی بشارێتەوە و بگەڕێتەوە ناو هۆزەکەی:**

**عەمرِی کوڕی عەبسەی سەلەمی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من کاتێك لە نەفامیدا بووم، وا گومانم دەبرد خەڵك لە گومڕاییدان، لەسەر هیچ شتێك نینن و بتەکان دەپەرستن.**

**گوێم لێ بوو کەسێك هەیە لە مەککە هەندێك هەواڵی لایە.**

**بە سواری وڵاخ چوومە لای، پێغەمبەر خوا ﷺ لەبەر ئازاردان و هێرشکردنە سەری خۆی شاردبوویەوە.**

**هێواش و لەسەرخۆ بووم تا لە مەککە چوومە خزمەتی.**

**پێم گوت: تۆ کێی؟**

**فەرمووی: "من پێغەمبەرم"**

**گوتم: پێغەمبەر چییە؟**

**فەرمووی: "خوا ڕەوانەی کردووم".**

**گوتم: بۆچی ڕەوانەی کردووە؟**

**فەرمووی: بۆ گەیاندنی پەیوەندی خزمایەتی و شکاندنی بتەکان و یەکتاپەرستی کە هیچ هاوبەشێکی نییە".**

**پێم گوت: کێ لەم بارەیەوە لەگەڵتە؟**

**فەرمووی: "ئازاد و بەندە".**

---

[1] بوخاری (٣٥٢٢) و موسلیم (٢٤٧٣) گێڕاوەتیانەوە.

ئینجا ئەوکات ئەبوبەکر و بیلالی لەگەڵی بوون کە بڕوایان پێ هێنابوو.

گوتم: من لەگەڵت دەبم.

فەرمووی: **"ئەمڕۆ ناتوانی بیکەی، حاڵی من و حاڵی ئەو خەڵکە نابینی کە لەگەڵمن، بەڵام بڕۆ ناو هۆزەکەت، هەر کاتێك بیستت ئێمە دینەکەمان ئاشکرا کردووە، وەرەوە لامان"**.

گەڕامەوە ناو قەومەکەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مەدینە، منیش هەر لەناو قەومەکەمدا بووم، بەدوای هەواڵەکاندا دەگەڕام، هەر کەسێك لە مەدینەوە هاتبا پرسیارم لێ دەکرد، تا کەسانێکی خەڵکی مەدینە هاتنە لام.

پێم گوت: ئەو پیاوەی هاتۆتە مەدینە چی کردووە؟

گوتیان: خەڵك بە پەلە بۆلای دەچن، خەڵکەکە ویستیان بیکوژن بەڵام نەیانتوانی.

چوومە مەدینە و چوومە خزمەتی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەمناسیەوە؟

فەرمووی: **"بەڵێ تۆ ئەو کەسەی لە مەککە هاتیە لام"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوەی خوای گەورە فێری تۆی کردووە و من نایزانم فێرم بکە؟ لەبارەی نوێژەوە فێرم بکە.

فەرمووی: **"نوێژی بەیانی بکە، پاشان نوێژ مەکە تاوەکو ڕۆژ هەڵدێت و بەرز دەبێتەوە، چونکە کاتێك هەڵدێت لەنێوان دوو قۆچی شەیتانەوە هەڵ دێت، ئەو کات بێ باوەڕەکان سوژدەی بۆ دەبەن.**

**پاشان نوێژ بکە، نوێژی ئەوکات شاهێدی بۆ دراوە و فریشتەکان ئامادەی دەبن[1]، تاوەکو سێبەر وەك ڕم ڕاست دەبێتەوە[2].**

**ئەوکات لە نوێژکردن بوەستە، چونکە ئەو کات ئاگری جەهەننەم خۆش دەبێت.**

**کاتێك سێبەر تێپەڕی، نوێژ بکە، چونکە نوێژی ئەوکات شاهێدی بۆ دراوە و فریشتەکان ئامادەی دەبن، هەتا نوێژی عەسر دەکەی.**

**لەدوای عەسر نوێژ مەکە، تا ڕۆژ ئاوا دەبێت، چونکە ڕۆژ لە نێوان دوو قۆچی شەیتان ئاوا دەبێت، ئەوکات بێ باوەڕەکان سوژدەی بۆ دەبەن.**

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، لەبارەی دەستنوێژ قسەم بۆ بکە؟

---

[1] واتە: فریشتەکان ئامادەییان لە نوێژەکە هەیە، زۆر نزیکە لە قبوڵبوون و بەدەستهێنانی رەحمەت.

[2] واتە: نە بەلای ڕۆژئاوا نە بەلای ڕۆژهەڵات خوار نەبۆتەوە، لەو حاڵەتەدا لە ناوەڕستدا وەستاوە.

**فەرمووی: "هەریەکێك لە ئێوە دەستنوێژ بگرێت، غەرغەرە بکات و ئاو لە لوتی وەربدات و بە لوت هەڵیمژێ، گوناهەکانی روو لە دەم و لوتی هەڵدەوەرێت.**

**گەر دەموچاوی بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێکردووە بشوات، ئەوا گوناهەکانی لە لێواری ریشەکەی هەڵدەوەرێت.**

**دواتر کە دەستەکانی تا ئانیشکی دەشوات، گوناهەکانی لەگەڵ ئاو لە پەنجەکانی هەڵدەوەرێت.**

**دواتر کە سەری مەسح کرد، گوناهەکانی سەری لە تاڵەکانی قژی هەڵدەوەرێت.**

**دواتر کە پێیەکانی تا گۆزینگی دەشوات، گوناهی قاچەکانی لەگەڵ ئاو لە پەنجەکانی هەڵدەوەرێت.**

**گەر هەڵسا نوێژ بکا، سوپاس و ستایشی خوای کرد بە سیفەتە جوانەکانی، دڵی تەرخانکرد بۆ خوا، ئەوا گوناهەکانی لێ لا دەچێت و وەك ئەو رۆژەی لێدێت کە لەدایك بووە ".**

**مژدەی لێخۆشبوون لە گوناهی رابردووی پێ دەدان، هەروەها ئیسلام پێشە خۆی رەش دەکاتەوە:**

حەبیبی کوڕی ئەبو ئەوس دەڵێت: عەمڕی کوڕی عاص بۆی گێڕامەوە و گوتی: کاتێك لەشەری خەندەق تەواو بووین، پیاوانێکم لە قورەیش کۆکردنەوە ئەوانەی پێگەی منیان دەزانی و گوێیان لە من دەگرت.

پێم گوتن: سوێند بەخوا دەزانن کە من رۆژ بە رۆژ پێگەی موحەممەد دەبینم هەر بەرز دەبێتەوە، من شتێك لەو دەبینم کە ئێوە نایبینن.

گوتیان: چی دەبینی؟

گوتی: پێم وایە پەیوەندی بە نەجاشی بکەین، لەلای بمێنینەوە، گەر موحەممەد بەسەرماندا زاڵ بوو ئەوکات ئێمە لای نەجاشین، چونکە ئێمە لەژێر دەستی ئەو بین بۆ ئێمە باشترە نەوەك لە ژێر دەستی موحەممەد بین.

گەر قەومی ئێمەش زاڵ بوو بەسەریان، ئێمەش زانیمان، ئەوکات جگە لە هەواڵی خێر هیچی دیکەمان بۆ نایێت.

گوتیان: بەڕاستی ئەمە ڕایەکی باشە؟

پێم گوتن: ئەوەی پێویستە بیکەینە دیاری بۆ ئەو بۆم کۆبکەنەوە، باشترین شت بکرێتە دیاری بۆ ئەو پێستی خۆشکراوە.

پێستێکی زۆرمان بۆ کۆکردەوە، دەرچووین تا گەیشتینە لای.

سوێند بەخوا ئێمە هەر لای ئەو بووین، کاتێك عەمڕی کوڕی ئوممەیەی زەمەڕی هات، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەبەستی هەواڵ زانین لەبارەی جەعفەر و هاوەڵانی ناردبووی.

گوتی: هاتە لای لە ژوورەوە، پاشان ڕۆیشت.

بە هاوەڵانم گوت: ئەمە عەمڕی کوڕی ئوممەیەیە، گەر بچمە لای نەجاشی، داوام لێکرد پێم بدات، کە پێی دام، لە ملی دەدەم، گەر ئەم کارەم کرد، ئەو کات قوڕەیش دەزانن کە من چیم کردووە، کاتێك نێردەی موحەممەد دەکوژم.

چوومە لای وەك هەموو جاران سوژدەم بۆ برد.

گوتی: سڵاو هاوڕێکەم، ئایا هیچ دیارییەکت لە وڵاتی خۆت بۆ هێناوم؟

گوتم: بەڵێ ئەی پادشام، کۆمەڵێکی زۆرم لە پێستی خۆشکراوم بۆ هێناوی.

بۆم برد، زۆر لای جوانبوو.

پێم گوت: ئەی پادشام، ئێستا کەسێك لەلای تۆ دەرچوو، نێردەی دوژمنی ئێمەیە، پێم بدە تا بیکوژم، چونکە بەڕاستی ئەو پیاوە باش و شەڕفمەندەکانی ئێمەی کوشتووە.

توڕەبوو، پاشان بە دەستی لێدانێکی لە لوتیدا، وام گومانم برد لوتی شکا، گەر زەوی شەق بووبایە لەترسی ئەو دەچوومە ناوی.

پاشان گوتم: ئەی پادشام، گەر زانیبام پێت ناخۆشە هەرگیز ئەو داوایەم نەدەکرد.

گوتی: دەتەوێت کەسێکت پێ بدەم، کە نێردەی پیاوێکە ئەو شەریعەتە گەورەیەی هێناوە کە موسا هێنابووی بۆ ئەوەی بیکوژی.

گوتم: ئەی پادشام، ئەمە بەم شێوەیە یە؟

گوتی: چیتە ئەی عەمڕ، ملکەچی من بکە و پەیڕەوی ئەو بکە، سوێند بەخوا ئەو لەسەر حەقە، بەسەر ئەو کەسانەشدا زاڵ دەبێت کە دژایەتی دەکەن، وەك چۆن موسا بەسەر فیرعەون و دار و دەستەکەی زاڵ بوو.

گوتم: دەستت بێنە موبایەعەت بکەم لەسەر ئیسلام.

گوتی: بەڵێ، دەستی درێژکرد و موبایەعەم لەسەر ئیسلام کرد.

پاشان گەڕامەوە ناو هاوەڵانم، ڕایەکەم گۆڕا بوو، موسڵمانبوونم لە هاوەڵانم شاردەوە.

دواتر بە مەبەستی موسڵمانبوون گەڕامەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ.

لە ڕێگا خالیدی کوڕی وەلیدم بینی، لە مەککەوە دەهات، ئەم ڕووداوە پێش فەتحی مەککە بوو.

گوتم: ئەی باوکی سلێمان بۆ کوێ؟

گوتی: بەڕاستی کارەکە زۆر ڕوون بۆتەوە، سوێند بەخوا ئەو پیاوە پێغەمبەرە و دەچم موسڵمان دەبم، ئیتر تا کەی؟

گوتم: سوێند بەخوا منیش بۆ هیچ نەهاتووم تەنیا بۆ ئەوەی موسڵمان بم.
چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا خالید چووە لای موسڵمان بوو بەیعەتی پێدا.
منیش نزیك بوومە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بۆ من درێژ کرد.
گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتت پێ دەدەم بە مەرجێك لە گوناهەکانی پێشووترم خۆش بیت.
فەرمووی: **"ئەی عەمر بەیعەت بدە، بەڕاستی ئیسلام ئەوەی پێش خۆی ڕەش دەکاتەوە، کۆچکردنیش پێشە خۆی ڕەش دەکاتەوە"**.
عەمر دەڵێت: سوێند بەخوا من لە هەموو کەس بە شەرمتر بووم لەبەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ، چاوەکانم لە دیتنی پێغەمبەر خوا تێر نەدەبوو، لەبەر شەرمکردن لێی، نەمتوانی زۆر تەماشای بکام تاوەکو گەڕایەوە خزمەت پەروەردگاری.

**مژدەی پێ دەدان ئەو کارە چاکانەی لەسەردەمی نەفامی دەیانکرد پاداشتی لەسەر وەردەگرن:**

عورووەی کوڕی زوبێر دەگێڕێتەوە کە حەکیمی کوڕی حوزام ﷺ لەسەردەمی نەفامیدا ١٠٠ بەندەی ڕزگارکرد و ١٠٠ بارە وشتری بەخشی بوو، کاتێکیش موسڵمان بوو، سەد بەندەی ڕزگارکرد و سەد بارە وشتریشی بەخشی.
دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئەو شتانەی کردوومە لە سەردەمی نەفامی کردوومە، ئایا پاداشتی بۆ من تێدایە؟
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لەسەر ئەو کارە چاکانەی رابردووت موسڵمان بوویت[1]"**.
ابن رجب دەڵێت: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە چاکەی بێ باوەڕ کاتێك موسڵمان دەبێت، پاداشتی لەسەر وەردەگرێت[2].
نەوەوی دەڵێت: ابن بطال و بەشێك لە لێکۆڵەرەوان وای بۆ دەچن ئەم فەرموودەیە بە ڕواڵەتەکەی وەردەگیرێت، گەر بێ باوەڕ موسڵمان بێت و لەسەر ئیسلام بمرێت، ئەوا بۆ کارە چاکەکانی سەردەمی بێ باوەڕی پاداشتی چاکە وەردەگرێت.
بەڵام سەبارەت بە وتەی شەرع ناسان کە گوتویانە (هەر عیبادەتێك بێ باوەڕ بیکات دروست نییە، گەر موسڵمانیش بوو پشتی پێ نابەسترێت): مەبەستیان لەمەدا ئەوەیە کە لە ئەحکامی دونیا پشتی پێ نابەسترێت، باسی ئەوە ناکات کە لە ڕۆژی دوایی پاداشتی لەسەر وەرناگرێت.

---

[1] بوخاری (١٤٣٦) و موسلیم (١٢١) گێراوەتیانەوە.
[2] جامع العلوم والحكم (١٣/١٤).

## لەسەر بابەتەکانی یەکتاپەرستی کەمتەرخەمی لەگەڵ نەدەکردن:

شاندێك لە نەوەی سەقیف هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، لە نێوانیاندا کەنانەی کوڕی عەبدی یالیل هەبوو کە ئەو کات سەرکردەیان بوو، هەروەها عوسمانی کوڕی ئەبو عاصی کوڕی بیشر لەگەڵیان بوو کە لە هەموویان بچوکتر بوو، کاتێك بینیبوویان مەککە فەتح کراوە و تەواوی عەرەب موسڵمان بوونە، بۆ دادوەری و ئاشتەوایی هاتن.

شاندەکە مانەوە و یەکە یەکە دەچوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش بانگهێشتی ئیسلامی دەکردن.

کوڕی عەبد یالیل پێی گوت: ئایا تۆ دادوەریمان بۆ دەکەی تا دەگەڕێینەوە ناو خەڵك و هۆزەکەمان؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بەڵێ، گەر ئێوە موسڵمان بن، دادوەریتان بۆ دەکەم، گەرنا هیچ داوەریتان نییە و هیچ ئاشتەواییەکیش لە نێوانماندا نییە"**.

کوڕی عەبد یالیل گوتی: لەبارەی زینا؟ ئێمە قەومێکین لە غەریبیداین و دەبێ بیکەین، کەسێك لە ئێمە توانای ئارامگرتنی لەسەر تەنایی نییە.

فەرمووی: **"ئەمە لەو شتانەیە کە خوای پەروەردگار لەسەر موسڵمانان حەرامی کردووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت:** ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴾ الإسراء: ٣٢ واتە: هەرگیز نەکەن توخنی زینا بکەون و لێی نزیك ببنەوە، چونکە ئەوە بەڕاستی گوناهو تاوان و هەڵە و ڕێچکەیەکی زۆر ناقۆڵیە.

گوتی: ئەی ڕیبا؟

**فەرمووی: " ڕیبا حەڕامە"**.

گوتی: دەنا پارەکانمان هەمووی سووە.

فەرمووی: **"سەرمایەکانتان بۆ خۆتانە**، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ البقرة: ٢٧٨. واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، پارێزکارو خواناس بن و واز لە پاشماوەی سوو بهێنن ئەگەر ئیماندارن.

گوتی: ئەی لەبارەی عەرەق؟ ئەوە شەربەتی تربێیەکانمانە و دەبێ بیخۆینەوە.

فەرمووی: **"خوای گەورە حەرامی کردووە"**. ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ المائدة: ٩٠ **واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە دڵنیابن کە عەرەق و قومار و گۆشتی مالاتی سەربڕاو بۆ غەیری خوا لەو شوێنانەی کە خەڵك بەپیرۆزی داناوە نەك ئیسلام، بورج و حەرام و حەلاڵ زانین بەهۆی هەڵدانی زارەوە ئەمانە هەرپیسن و لەکاروکردەوەی شەیتانن، کەواتە ئێوەش خۆتانی لێ دوور بگرن و خۆتانی لێ بپارێزن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی بەدەست بهێنن.**

کۆمەڵەکە هەڵسان، لەگەڵ یەکتر کۆبوونەوە، کوڕی عەبد یالیل گوتی: **هاوار بۆ تان، بە حەڕامکردنی ئەو سێ شتانە دەچینەوە ناو هۆزەکەمان، سوێند بەخوا نەوەی سەقیف هەرگیز لەسەر نەخواردنی عەرەق و نەکردنی زینا ئارام ناگرێت.**

سوفیانی کوڕی عەبدوڵلا گوتی: ئەی پیاو گەر خوا ویستی لەسەر بێت ئارام دەگریت، ئەو پیاوانەی لەگەڵی بوون وەك ئەو بوون، بەڵام ئارامیان گرت و ئەوەی لەسەری بوون وازیان لێ هێنا، ئێمە پێشتر ترسمان هەبوو ئەو کەسە بە زۆرداری دەستی بەسەر ئەو ناوچەیە داگیرکردووە، ئێمەش لە شوێنێکی دوور لە قەڵایەك دەژین، ئیسلامیش لە دەوروبەرمان بڵاو ببۆوە، سوێند بەخوا گەر لە قەڵاکانمان بۆ مانگێك بمێنینەوە ئەوا لە برسان دەمرین، جگە لە ئیسلامیش هیچی ترمان لێ دیار نییە، لەو ڕۆژەش دەترساین کە بەسەر مەککەدا هاتووە!

پێغەمبەر خوا ﷺ خواردنی بۆ دەناردن، ئەوان هیچیان لێ نەدەخوارد تاکو دەیانبینی پێغەمبەری خوا ﷺ لێی دەخوارد، تاوەکو موسڵمان بوون.

گوتیان: ئەی لە بارەی بتی ڕەببە؟

فەرمووی: **"بیڕوخێنن".**

گوتیان: وای! ئەگەر ڕەببە بزانێت کە ئێمە ڕووخاندوومانە، کەسوکارمان دەکوژێت.

عومەر کوڕی خەتتاب ﷺ فەرمووی: هاوار بۆ تۆ کوڕی عەبد یالیل، ڕببە بەردێکە نازانێت کێ پەرستوویەتی و کێ نەی پەرستووە.

کوڕی عەبد یالیل گوتی: ئێمە نەهاتینە لای تۆ ئەی عومەر.

جا موسڵمان بوون و ئاشتەواییەکە تەواو بوو، کاتێك ئاشتەواییکە بەتەواوی ئەنجامدرا، داوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، بۆ ماوەی سێ ساڵ واز لە ڕەببە بهێنێت و نەیروخێنێت.

ڕازی نەبوو.

گوتیان: دوو ساڵ.

ڕازی نەبوو.

گوتیان: ساڵێك.

ڕازی نەبوو.

گوتیان: تەنیا یەك مانگ.

ڕازی نەبوو هیچ ماوەیەکیان پێ بدات.

ئەوان بۆیە ئەم داوایەیان کرد، ترسیان هەبوو لە نەزانەکانی ناو هۆزەکەیان لە ئافرەت و گەنجەکانیان، پێیان ناخۆش بوو بە ڕووخاندنی ترس بخەنە دڵی خەڵکەکانیان.

داوایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد سەبارەت بە ڕوخاندنی بتەکانیان بواریان بدات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"کەسێکتان بۆ دەنێرم کە بەس بێت بۆ ڕوخاندنی"**.

داوایان لێ کرد پێش نێردەکەی ئەو بگەڕێنەوە.. کاتێکیش گەیشتنە ناو قەومەکەیان، لێیان پرسین چیتانە؟

نیگەرانیان نیشاندا، وا نیشانیان دا کە ئەوان لەلایەن پیاوێکی تووڕە و توندەوە هاتوون کە شمشێری دەرکردووە، چۆن بیەوێت وا حوکم دەکات، هەموو عەرەبەکانی بێزار کردووە، سوو و زینا و عەرەقی حەرام کردووە، فەرمانی ڕووخاندنی ڕەببەی دەرکردووە.

هۆزی سەقیف لەم قسانە هەڵاتن، گوتیان: هەرگیز ملکەچی ئەمە نابین.

گوتی: چەك بێنن و ئامادەبن بۆ شەڕکردن.. نزیکەی دوو تا سێ ڕۆژ مانەوە.

پاشان خوای گەورە ترسی خستە دڵیانەوە، گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوە، گوتیان: بگەڕێنەوە لای و شەرت لەسەر داواکارییەکانی بکەن و ئاشتەوایی لەگەڵ بکەن.

گوتیان: ئێمە وامان کردووە، بینوومانە کە لە خواترسترین و بەوەفاترین و میهرەبانترین و ڕاستگۆترینی خەڵکە، بە هۆی ئەوەوە بەرەکەتەمان بۆ هاتووە و ئاشتەواییمان لەگەڵ کردووە.

خەڵکەکە گوتیان: ئەی بۆچی سەرەتا لە ئێمەتان شاردبۆوە؟

گوتیان: ویستمان خوای پەروەردگار لوتبەرزی شەیتانتان لە دڵ دەربهێنێت.

جا موسڵمان بوون.

چەند ڕۆژێك مانەوە، پاشان نێردەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان، خالیدی کوڕی وەلیدی کردە ئەمیر بەسەریانەوە، لەگەڵیشدا موغیرەی کوڕی شوعبەی نارد.

خەڵکی سەقیف لە ژن و پیاو و گەنج هەموو کۆبوونەوە.

پێیان وابوو ئەم بتە ناشکێت، بەڵکو لێ ناگەڕێت بشکێندرێت.

موغیرەی کوڕی شوعبە دەستیدایە پاچەکە و بە هاوەڵانی گوت: واتان لێ دەکەم بە سەقیف پێ بکەنن.

بە پاچەکە لێیدا، موغیرە خۆی کەواند.

خەڵکی تائیف هەموویان بە یەك دەنگ هاواریان کرد و دڵیان خۆش بوو و گوتیان: خوا موغیرە لەناوببات، ڕەببە ئەوی کوشت، بەوانیتریان گوت: کێ دەیەوێت با نزیك بێتەوە.

موغیرە دیسان هەڵسایەوە. گوتی: ئەی خەڵکی سەقیف، پێشتر عەرەب دەیگوت هیچ عەرەبێك هێندەی سەقیف عاقڵ نییە، ئێستاش هیچ عەرەبێك هێندەی ئێوە نەفام نییە، هاوار بۆ ئێوە چیتانە؟ لات و عوزا و ڕببە چیە؟ بەردێکە وەك بەردەکانی تر، نازانێت کێ پەرستوویەتی و کێش نەیپەرستووە.

پاشان لە دەرگاکەی دا و شکاندی.

پاشان چووە سەر دیوارەکە و پیاوەکانیش لەگەڵی چوونە سەری، بەرد بە بەرد ڕوخاندیان، تا لەگەڵ زەوی یەکسانیان کرد.

خزمەتکارەکانی بتەکە گوتیان: ئەگەر تەواو تا بنەغاکەی هاتن، بناغەی زەویەکە تورە دەبێت و بە زەوی ڕۆدەچن.

کاتێك موغیرە گوێی لەمە بوو، بە خالیدی گوت: لێم گەڕێ چاڵێك لە بناغەکەی هەڵکەنم.

چاڵیان هەڵکەند، تاوەکو خۆڵی ژێرەویان دەرهێنا.

بەم شێوەیە سەقیف بێ دەنگ بوون.

گەڕانەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ،ماڵەکانی بۆ دابەش کردن، ئەوانیش لەسەر گەورەبوونی دینەکەیان سەرکەوتنی پێغەمبەرەکەیان سوپاسی خوایان کرد [(١)].

**لەوانەیە لە هەندێکیانی قبوڵ کردبێت کە واز لە بەشێکی ئەرکە دینییەکان بهێنن، ئەمەش لە پێناو بەرژەوندی و پێ بە پێ هاتنە ناو دین.**

هەندێکجار پێغەمبەر ﷺ نەرم دەبوو لەگەڵیان، لەبەرامبەر وازهێنان لە هەندێك ماف ئیسلام لێی دەبوورین و موسڵمانبوونی لێ قبوڵ دەکردن، کاتێکیش هاتبانە ناو ئیسلام، ئارەزوویان دەچووە ئەو دینە، ئەو کات هەموو ئەرك و مافەکانیان ئەنجام دەدا [(٢)].

وەهبی کوڕی مونبەه دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەبارەی بەیعەتدانی هۆزی سەقیف پرسیارم لە جابر کرد؟

---

(١) دلائل النبوة للبیهقی (٣٨٦/٥)، ژیانی پێغەمبەر ابن کثیر (٦٢/٤)، زاد المعاد (٥٢١/٣).

(٢) فتح الباری لابن رجب (١٢/٤).

گوتی: مەرجیان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دانا، بەوەی نە دەبەخشن و نە جیهادیش دەکەن، بەڵام ئەو دواتر گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی **"گەر موسڵمان بوون، ئەو کات دەبەخشن و جیهادیش دەکەن**[1]".

ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: "موسڵمان بوون بە مەرجی پوچەڵ دروستە، پاشان بە شەریعەتی ئیسلام پابەند دەکرێت[2]".

ئەنەسی کوڕی مالیك ؓ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: **"موسڵمان ببە"**.

گوتی: خۆم وا دەبینم کە بەدڵم نییە.

فەرمووی: **"موسڵمان ببە گەر بەدڵیشت نەبێت**[3]".

نەسری کوڕی عاصم لە پیاوێکەوە دەگێڕێتەوە کە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و موسڵمان بوو بەو مەرجەی تەنیا دوو نوێژ بکات، ئەویش لێی قبوڵ کرد[4].

پێغەمبەر ﷺ وازهێنانی هەندێك لە واجباتەکان لەو کەسانە قبوڵ کردووە، ئەمەش لە روانگەی پلە پلەی هاتنە ناو دین و پەیوەستی بوونی دڵەکانیان، چونکە لەوانەیە هەندێك لە بێ باوەڕان بە راست و دورستی لە دینی ئیسلام نەگەن، یان هەندێك شتیان لەسەر گران بێت، بۆیە موسڵمانبوونیان وەك سەرەتایەك لێ قبوڵ دەکرا، پاشان رێیان نیشان دەدرا و ئامۆژگاری دەکران و فەرمانی تەواوی ئەرکە شەرعییەکانی بەسەر دا دەکرا.

ئەمەش وەك تەماعێك گەر هاتە ناو ئیسلام و باوەڕ لە دڵی جێگیر بوو، بە پابەند دەبێت بە تەواوی ئەرکە شەرعییەکان، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆزی سەقیفی فەرموو: **"گەر موسڵمان بوون، ئەو کات دەبەخشن و جیهادیش دەکەن**[5]".

ئیبن تەیمیە لەبارەی ئەو فەرموودەیە و ئەوانی تریش، بەشێکی لە کتێبەکەی خۆی ناوناوە بەناوی (بەشی دروستبوونی موسڵمانبوون لەسەر هەندێك مەرجی پوچەڵ).

شەوکانی دەفەرموێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی تێدایە لەوەی بەیعەتدان بە کەسی بێ باوەڕ و قبوڵکردنی موسڵمانبوونی دروستە، تەنانەت گەر مەرجێکی بێ بنەما و

---

(1) ئەبو داود (٣٠٢٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحەکەیدا (١٨٨٨) بە سەحیحی داناوە.

(2) جامع العلوم والحكم (٢٢٩/١)

(3) ئیمام ئەحمەد (١١٦٥٠) گێراوەتیەوە. ئەلبانی لە سەحیحەکەیدا (١٤٥٤) بە سەحیحی داناوە.

(4) ئەحمەد (١٩٧٧) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الثمر المستطاب) (٣) بە سەحیحی داناوە.

(5) ئەبو داود (٣٠٢٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحەکەیدا (١٨٨٨) بە سەحیحی داناوە.

پوچەڵیشی دانا، هەروەها دروستە موسڵمانبوون لە کەسێك وەربگیرێت گەر بە دڵیشی نەبێت [(١)].

بەرژوەندی موسڵمانبوونی ئەگەر بە نیوەچڵیش بێت باشترە لە مانەوەی لەسەر بێ باوەڕیەکی تەواو.

الحافظ ابن رجب دەڵێت: ئەوەی کە ئاشکرایە، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا دوو شەهادەتەکەی لەو کەسە وەردەگرت کە دەهاتە لای و دەیوست موسڵمان بێت، بەمەش خوێنی دەپاراست و دەیکردە موسڵمان.

هەر کەسێك ویستبای موسڵمان بێت، مەرجی ئەوەی لەسەر دادەنا پابەندبێت بە نوێژ و زەکات.

بەڵکو لێی دەگێڕنەوە کە موسڵمانبوونی لە هۆزێك قبوڵکرد، لە کاتێکدا مەرجیان دانا کە زەکات نەدەن [(٢)].

**تێبینی:** ئەوەی باس کرا، لەبارەی بێ باوەڕێکە کە دەیەوێت موسڵمان بێت، بەڵام گەر موسڵمانێك هات و گوتی من بە گوێرەی ئەو فەرموودەیە تەنیا دوو نوێژ دەکەم، لێی قبوڵ ناکرێت.

**لەبەرامبەردا لە هەندێکیانی ئەو مەرجە قبوڵ نەدەکرد، چونکە دەیزانی توانای وەرگرتنیان هەیە:**

کوڕی خصاصیە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی بەیعەتی پێ بدەم.

مەرجی لەسەر دانام کە شاهێدی بدەم هیچ خوایەك نییە جگە لە الله، موحەممەدیش بەندە و نێردراوی ئەوە و نوێژ بکەم و زەکات بدەم و حەج بکەم و رۆژی رەمەزان بگرم و لە پێناو خودا جیهاد بکەم.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا توانای دووانم نییە، ئەوانیش جیهاد و بەخشینە، چونکە خەڵکەکە پێیان وایە هەر کەسێك لە جیهاد هەڵبێت، ئەوا بەر تووڕەیی خوای گەورە کەوتووە، منیش دەترسم کاتێك بچمە شەڕ، دەروونم بترسێت و رقم لە مردن بێتەوە.

---

(١) نیل الاوطار (٦/٨).

(٢) جامع العلوم والحکم (٢٢٨/١).

سەبارەت بە زەکات و بەخشینیش، سوێند بەخوا جگە لە هەندێك دەسکەوت و ئاژەڵ کە بارهەڵگر و شیری منداڵەکانمی لەسەرە، هیچی ترم نییە.

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی قوچاند و پاشان جوڵاندنی، فەرمووی: **"نە جیهاد و نە بەخشین؟ کەواتە ناچیتە بەهەشت"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتت پێ دەدەم.

لەسەر هەموو ئەوانە بەیعەتم پێدا [1].

ابن الأثير دەڵێت: فەرموودەکەی بەشیری کوڕی حصاصیە کاتێك باسی شەریعەتەکانی ئیسلامی بۆکرا، ئەوەی بۆ هۆزی (سەقیف) قبوڵی کرد، بۆ بەشیر قبوڵی نەکردە، وەك ئەوەی رێگەی بە بەشیر نەدابێت، چونکە زانیویەتی گەر پێی بڵێت بەشیر وەری بگرە ئەوا وەری دەگرێت.

بەڵام سەقیف ئەو کات وەری نەدەگرت، ئەوان کۆمەڵێك بوون و بەشیر بە تەنیا بووە، ویستوویەتی دڵیان پەیوەست بکات و پێ بە پێ بیانخاتە ناو ئیسلام [2].

### دڵنەوایی دەکردن و هاوەڵانیشی هاندەدان فێریان بکەن:

عوروە دەگێڕێتەوە کاتێك بێ باوەڕان لە شەڕی بەدر گەڕانەوە مەککە، ئەوەی خوای گەورە لێی کوشتن، لێی کوشتن.

عومەیری کوڕی وەهب لە ماڵەوە هاتە لای سەفوانی کوڕی ئومەیە.

سەفوان گوتی: دوای کوژراوانی بەدر نەفرەتی خوا لەو ژیانە.

عومەیر گوتی: راستە سوێند بەخوا، ژیان هیچ خۆشی تێدا نەماوە، گەر قەرزدار نەبام و منداڵەکانیشم هەژار نەبان، بە بیانوی کوڕەکەم [3] دەچوومە لای موحەممەد و دەمکوشت، دەڵێم هاتوومە لای ئەو کوڕەم کە بەندکراوە.

سەفوان بەم قسەیە دڵخۆش بوو، گوتی: قەرزەکان بۆ من لێگەڕێ، منداڵەکانیشت وەك منداڵەکانی خۆم بەخێو دەکەم.

سەفوان شمشێری خۆی پێدا و شمشێرەکەی بۆ تیژ و ژەهراوی کرد و بە سوارێك رەوانی کرد.

---

[1] ئیمامی ئەحمەد (٢١٤٤٥) و الحاكم (٢٤٢١) گێراوەتیانەوە، الذهبي بە سەحیحی داناوە.

[2] النهاية في غريب الاثر (٣/٤٧٦).

[3] کوڕەکەی بەناو وەهب لە بەندکراوانی بەدر بوو.

عومەیر بە سەفوانی گوت: چەند شەوێك بۆم بێدەنگ بە.

عومەیر ڕۆیشت تا گەیشتە مەدینە، لە دەرگای مزگەوت دابەزی، ئاژەڵەکەی بەستەوە، شمشێرەکەی بەرەو پێغەمبەری خوا بە دەست گرت.

عومەری کوڕی خەتتاب کە لە نێوان کۆمەڵێکی ئەنسار دابوو، باسی شەڕی بەدریان دەکرد و سوپاسی خوایان دەکرد، سەیری ئەوی کرد.

کاتێك عومەڕ عومەیری کوڕی وەهبی بینی شمشێری پێیە، لێی ترسا، گوتی: ئەمە سەگێکە، دوژمنی خوایە!

عومەر چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت: ئەمە عومەیری کوڕی وەهبە، هاتۆتە مزگەوت و چەکی پێیە، ئەو کەسێکی خراپەکار و ستەمکارە، لێی دڵنیا مەبە.

فەرمووی: **"بۆم بهێنە ژوورەوە"**.

عومەر عومەیری بردە ژوورەوە، فەرمانی بە هاوەڵان کرد بچنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گەر عومەیر هاتە ژوورەوە، پاسەوانی بکەن.

عومەر و عومەیری کوڕی وەهب هەردووکیان چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، عومەری کوڕی خەتتاب شمشێری پێ بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عومەری فەرموو: **"بڕۆ دواوە"**.

کاتێك عومەیر نزیك بوویەوە، سڵاوی لێکرد، گوتی بەیانیت باش، ئەمە سڵاوێکی سەردەمی نەفامی بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"خوای پەروەردگار ﷻ لەبری سڵاوەکەی تۆ بە سەلامکردن ڕێزی لێناوین، ئەمەش سڵاوی ئەهلی بەهەشتە"**.

عومەیر گوتی: ئەمەی تۆ نوێیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوای گەورە بە باشتر بۆی گۆڕیوین، چی تۆی هێناوەتە ئێرە ئەی عومەیر؟"**.

گوتی: بەندکراوێکم لاتانە بۆ ئەوە هاتووم، بمبەنە لای، ئێوە خزم و کەسن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو شمشێرە چییە پێتە؟"**.

عومەیر گوتی: نەفرەتی خوا لە شمشێر، هیچ سوودی بە ئێمە نەگەیاند.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بە ڕاستی پێم بڵێ بۆچی هاتووی"**.

گوتی: جگە بۆ ئەو بەندکراوە نەبێت، بۆ هیچی تر نەهاتووم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی لەماڵەوە چ مەرجێکت بۆ سەفوانی کوڕی ئومەیە دانا؟"**، عومەیر ترسا،

گوتی: چ مەرجێکم بۆ دانابوو؟

فەرمووی: **"لە پێناو کوشتنی مندا، نانداني منداڵەکانت و قەرزەکانت خستۆتە ئەستۆی ئەو، خوای گەورەش رێگرە لە نێوان تۆ و ئەوەی دەیکەی"**.

عومەیر گوتی: شاهێدی دەدەم تۆ نێردراوی خوای و هیچ خوایەکیش نییە جگە لە الله. ئەی پێغەمبەری خوا پێشتر بڕوامان بە وەحی نەدەکرد، باوەڕمان بەوە نەدەکرد کە لە ئاسمانەوە بۆت دێت. ئەو قسەیەی لە ماڵەوە لە نێوان من و سەفوان روویدا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، هیچ کەسێك لە نێوانماندا نەبووە، خوای گەورەش هەواڵی ئەوەی پێداوی، بۆیە باوەڕم بە خوا و پێغەمبەرەکەی هێنا، سوپاس بۆ خوا کە منی بۆ ئەو پلەیە هێنا.

کاتێك خوا هیدایەتی دا، موسڵمانان دڵیان خۆش بوو.

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ بە عومەیری فەرموو: بەڕاستی ئەو کاتەی دەرکەوتی بەرازێك لای من لە تۆ خۆشەویستر بوو، ئەمڕۆش لە چاوەکانم لام خۆشەویستری.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"دانیشە، دڵنەوایت دەکەین"**.

فەرمووی: **"براکەتان فێرە قورئان بکەن"**.

بەندکراوەکەشی بۆ ئازاد کرد.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بەهەموو توانای خۆم تێکۆشانم دەکرد بۆ کوژاندنەوەی نوری خوا، سوپاس بۆ خوا کە منی هێنایە ئەو جێگایە، روخسەتم بدە بگەڕێمەوە ناو قورەیش و بۆ ئیسلام بانگیان بکەم، بەڵکو خوای گەورەی هیدایەتیان بدات و لە لەناوچوون رزگاریان بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ روخستەی پێدا و گەڕایەوە مەککە.

سەفوان لە دانیشتنەکانی قورەیش دەیگوت: مژدەتان بە سەرکەوتنێك بۆ دێت کە رووداوی بەدرتان لە بیر دەباتەوە. هەر کەسێك لە مەدینەوە دەهات لێی دەپرسین کە ئایا هیچ روویداوە؟ ئومێدی دەخواست قسەکەی عومەیر بێتەدی.

تا کاتێك پیاوێك لە خەڵکی مەدینە هات، سەفوان لەبارەی عومەیر لێی پرسی، گوتی: موسڵمان بووە، بێ باوەڕەکان کاتێك پێی گەیشتن گوتیان لە دینی باو باپیرانی لایداوە.

سەفوان گوتی: هیچی تر مەسرەفی ناکەم، بە یەك وشەش قسەی لەگەڵ ناکەم.

عومەیر هاتە لایان و بانگهێشتی ئیسلامی کردن و ئامۆژگاری کردن، خەڵکانێکی زۆر لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بوون [1].

---

[1] تەبەڕانی لە (الکبیر – ١٣٥٨٦) و بەیهەقی لە (الدلائل – ١٠٠٩) گێراوەتیەوە. هەیسەمی دەڵێت: تەبەرانی گێراوەتیەوەو سەندەکەی (جید). مجمع الزوائد (٨/٢٨٦).

**فەرمانی پێ دەکردن ئەوەی فێری بوونە بە ناو هۆز و خەڵکەکانیان بڵاوی بکەنەوە:**

مالیکی کوڕی حویەریس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە کۆمەڵێك گەنج بووین هاتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، نزیکەی بیست شەوێك لەلای مایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی بە سۆز و نەرمونیان بوو.

هەستی کرد کە ئێمە غەریبی کەسوکارانمان دەکەین.

کاتێك ئەو شەوق و حەزەی ئێمەی بۆ کەسوکارەکانمان بینی، پێی گوتین کە چیمان بە جێهێشتووە، ئێمەش پێمان گوت.

فەرمووی: **"کە گەڕانەوە ناو قەومەکانتان، فێریان بکەن، فەرمانی نوێژکردنیان پێ بکەن، فێریان بکەن کە ئەو نوێژە لە فڵانە کاتە بکەن، کە کاتی نوێژیش هات، یەکێك لە ئێوە بانگیان بۆ بدات و با گەورەکەتان پێش نوێژی بکات [1]"**.

**هەر کەسێك موسڵمان بوایە، داوای لێ دەکرد واز لەو کارانە بێنێت کە پێچەوانەوەی شەرعن:**

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە غەیلانی کوڕی سەلەمەی سەقەفی موسڵمان بوو، لە سەردەمی نەفامیدا خاوەن ١٠ خێزان بوو، هەموویان لەگەڵی موسڵمان بوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"چواریان لێ هەڵبژێرە"**.

لە سەردەمی عومەردا خێزانەکانی تەڵاق دا و ماڵەکەشی لەنێوان کوڕەکانی دابەش کرد.

ئەم هەواڵە گەیشتە عومەر، فەرمووی: وابزانم شەیتان هەواڵی مردنی خۆتی فڕێ داوەتەوە ناو دڵت، گوایە زۆرت نەماوە لە ژیاندا.

سوێند بەخوا ئافرەتەکانت دەگەڕێنیتەوە، ماڵەکەشت دەگەڕێنیتەوە، ئەگینا ئافرەتەکان لە میراتەکەت بەشدار پێ دەکەم و فەرمان دەکەم کوڕەکەشت وەك گۆڕی ئەبی ڕەغال ڕەجم بکرێت [2].

ئەبو ڕەغال باوکی ثقیفة و ڕەچەڵکی لە ثمودە، ئەم حەرەمە پارێزگاری لێدەکرد، کاتێك لەوێ چووە دەرێ خۆی و قەومەکەی تووشی نیقمەت هاتن، جا هەر لە شوێنی قەومەکەی نێژرا.

ضحاکی کوڕی فەیرۆز لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا من موسڵمان بووم و دوو خوشکیشم لەلایە .

فەرمووی **"یەکێك لەو دووانە بەکەیفی خۆت تەلاق بدە"** [3].

---

[1] بوخاری (٦٣١) و موسلیم (٦٧٤) گێراوەتیانەوە.

[2] ترمذي (١١٢٨) و ابن ماجة (١٩٥٣) و ئەحمەد (٤٦١٧) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (١٨٨٣).

[1] رواه أبو داود (٢٢٤٣) وترمذي (١١٢٩) وابن ماجة (١٩٥١)، وحسنه الالبانى فى التعليقات الحسان(٤١٤٣)

## فەرمانی بە پیرەکانیان دەکرد، پیرییان بگۆڕن و بۆیاغی بکەن:

جـابری کـوڕی عەبـدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: لـە ڕۆژی فـەتحی مەککـە ئـەبو قوحافەیان هێنا، سـەر و ریشـی وەك ڕووەکـی ثغـام[1] سـپی بـوو. فـەرمانی پێکـرد، یـان فەرمانی بە خێزانی کرد و فەرمووی "**ئەمە بە شتێکی تر بگۆڕن**[2]".

## هەر کەسێك نەزری بەندایەتیەکی کردبا، فەرمانی پێدەکرد دوای موسڵمانبوونی تەواوی بکات:.

ئـیبن و عومــەر دەگێڕێتــەوە کــە عومــەر ﷺ گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، مـن لـە سەردەمی نەفامیدا نەزرم کردبوو، شەوێك لە مزگەوتی حەڕام بمێنمەوە.

فەرمووی: "**نەزرەکەی خۆت بهێنەدی**".

ابن حجر دەڵێـت: لـەم فەرموودەیـە پابەنـدبوون بـە جێبـەجێکردنی نـەزری بـۆ هـەموو کەسێك تێدایە، تەنانەت گەر پێش ئیسلامیش کردبێتی[3].

کاتێکیش ثمامة ی کـوڕی أثـال موسـڵمان بـوو، بـە پێغەمبـەری ﷺ گـوت: سـوارەکانت منیان هێنا، منیش دەمەویست عومرە بکەم، ئێستا رای تۆ چییە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێدا[4] و فەرمانی پێدا عومرەکەی خۆی بکات.

کاتێکیش گەیشتە مەککە، کەسێك پێی گوت: لە دینی باوباپیرانت لاتداوە؟

گوتی: نەخێر، بەڵکو لەگەڵ موحەممەدی پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بوومە[5].

الحافظ ﷺ دەفەرموێت: بێ باوەڕ گەر ویستی کارێکی بـاش بکـات، پاشـان موسـڵمان بوو، بۆی هەیە بەردەوامی بدات بە کارە خێرەکەی[6].

فەرمانی بە ئەنجامدانی عەمرە پێکرد، چونکە عەمرە کردن لـە هـەموو کاتێکـدا سـوننەتە، بەتایبەت بۆ کەسێکی وا پاك کە تازە موسڵمان بووە، بەبێ ترس چۆتە مەککـە، تـەواف و سەعی خۆی کردووە، موسڵمانیەتی خۆی ئاشکرا کردووە و ئەوانی توڕە کردووە[7].

---

[1] الثغام أو الثغامة: ڕووەکێکی گوڵ سپیە، بۆ نمونە هێنانەوەی کەسانی پیر بەکاردەهێندرێت، یاخود دەگوترێت دارێکی سپیە وەك بەفر. النهایة: (٢١٤/١).

[2] موسلیم (٢١٠٢) گێراوەتیەوە.

[3] بوخاری (٢٠٣٥) و موسلیم (١٦٥٦) گێراوەتیانەوە.

[4] واتە: مژدەی ئەوەی پێدا کە لەو خێرە گەورەیەی لە ئیسلام بە دەسکەوتووە، یاخود مژدەی پێدا لە ڕەشبوونەوەی گوناهەکانی پێشتوو.

[5] بوخاری (١٢١٣) و موسلیم (٢٤٨٦) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێراوەتیانەوە

[6] فتح الباری (٨٨/٨).

[7] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٨٩/١٢).

## ئەو باڵوێزانەی حەزیان لێبوو موسڵمان بن، لەلای خۆی بەندی نەدەکردن:

ئەبی رافع – قبتی بوو– دەگێڕێتەوە و دەڵێت: قورەیشییەکان منیان وەك نێردەیەك نارده لای پێغەمبەری خوا ﷺ، کاتێك پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، خۆشەویستی ئیسلامم کەوتە دڵەوە.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا من هەرگیز ناگەڕێمەوە لایان!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"من پەیمان ناشکێنم، نێردراویش بەند ناکەم، بەڵکو بۆ لایان بگەڕێوە، ئەگەر ئەوەی ئێستاش لە دڵتە، هەر لە دڵت مایەوە، ئینجا بگەڕێیەوە لای من".**

گوتی: رۆیشتم، پاشان هاتمەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمان بووم [١].

ئەو فەرموودەیە ئەوەی تێدایە: کە رەچاوی پەیمان بەستن لەگەڵ بێ باوەڕ دەکرێت، وەك چۆن لەگەڵ موسڵمان دەکرێت [٢].

طیبی دەڵێت: مەبەست لە پەیمان لێرەدا، ئەو نەریتە باوەی نێوان خەڵکە، کە نێردە نابێت توشی ناخۆشی بێت، چونکە هاتوچۆی نێردەکان لەنێوان لایەنەکان لە بەرژەوەندی هەموو لایەکدایە، گەر بەندیان کرد، یان توشی ناخۆشیان کرد، دەبێتە هۆکارێك بۆ بچڕانی پەیوندی نێوان دوو لایەنی دژبەیەك بێگومان لەم کارەشدا جۆرێك لە ئاژاوە گێڕی و خراپەکاری هەیە کە کەسی عاقڵ لێی بێ ئاگا نییە [٣].

ئیبن قەیم دەڵێت: لە سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ: ئەو نێردەی دێتە لای گەر موسڵمانیش بوو، لای خۆی گلی ناداتەوە و رێگری گەڕانەوەی بۆ ناو هۆزەکەی لێناکات، بەڵکو بۆیانی دەگەڕێنێتەوە.

ئەبو داود دەڵێت: ئەمە لە کاتێکدا روویدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەرجی ئەوەی بۆ دانابوون، هەر کەسێك هاتە لایان گەر موسڵمانیش بوو بۆیان بگەڕێنێتەوە، بەڵام ئەمە بۆ ئەمڕۆ دروست نییە [٤].

---

[١] ئەبو داود (٢٧٥٨) گێراوەتیەوە، لە زنجیرە سەحیحەکەیدا بە (سەحیحی) داناوە(٧٠٢).
[٢] عون المعبود (٢٠٣/٦).
[٣] فیض القدیر (٢٥/٣).
[٤] زاد المعاد (١٢٦/٣).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوانەی پرسیاری شەرعییەکان دەکرد:

ئاشکرایە کە بابەتی فەتوا بابەتێکی گرینگە، چونکە بە هۆیەوە کاروباری دین و میللەت و و سنوری خوای پەروەردگار دەپارێزرێت.

"گەر واژۆکردن لە بری پادشا و سەرۆکەکان، پلەیەکی بەرز و گەورە بێت و پێگەکەی جێگای رێز بێت، کە گەورەترین پۆستی خاوەن شکۆکانە، ئەی دەبی واژۆکردن لە بری پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان چۆن بێت؟!

بەڕاستی جێگای خۆیەتی ئەوەی لەو پۆستەدا بێت، تەواوی پێداویستییەکانی بۆ ئامادە بکات، خۆی بۆ لێبڕاو بکات، هەروەها پێویستە ئاستی ئەو پێگەیە بزانێت، کە لێیەتی.

یەکەمین کەس کە ئەو پۆستە پیرۆزەی وەرگرت، گەورەی هەموو پێغەمبەران، پێشەوای لەخواترسان، کۆتا پێغەمبەران، بەندە و نێردراوی خوا، ئەمینداری وەحی، باڵوێزی پەروەدگار لە نێوان خۆی و بەندەکانی، هەر ئەو لە رێگەی وەحییەوە فەتوای لەباتی پەروەردگار دەدا [1]".

بەڕاستی ئەوەی یارمەتی تێگەیشتن لە دین دەدات و بەرپێی قوتابیانی زانست رۆشن دەکات بە پێگەی فەتوا و حوکمەکان: ئەوا زانینی شێوازی پێغەمبەرە لەگەڵ پرسیارکەر.

### ناسینی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پرسیارکەران و فەتوا وەرگران:

رووداوەکان زۆرن کە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای فەتوادانی لێکراوە، چونکە لە کاتی تەنگانەدا هەر ئەو پەناگە و قەڵای ئوممەت بووە.

بۆیە دەبینین لە قورئان ئاماژەیەکی زۆر هەن لەبارەی پرسیاری هاوەڵان و داوای فەتواکردنیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴾ البقرة: ٢١٥، واتە: لە تۆ دەپرسن -ئەی پێغەمبەر ﷺ- کە چی ببەخشن و بەکێی ببەخشن؟

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ﴾ البقرة: ٢١٧، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی جەنگ لە مانگی حەرامدا.

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ﴾ البقرة: ٢١٩ واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی عەرەق و قومار.

---

[1] إعلام الموقعين (١/١٩).

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ﴾ البقرة: ٢٢٠ واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هەتیوان (کە چۆن بن بۆیان)؟

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴾ البقرة: ٢٢٢ واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (سوڕی مانگانەی ئافرەت).

﴿ وَيَسْتَفْتُونَكَ فِى ٱلنِّسَآءِ ﴾ النساء: ١٢٧ واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی ئەوەی کەپێویستە پیاوان ئەنجامی بدەن بەرامبەر بە ژنان

﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَـٰلَةِ ﴾ النساء: ١٧٦ واتە: داوای فتوات لێدەکەن دەربارەی (کلالە) کە بریتییە: لە کەسێك باوك و نەوەی نەبێت، تۆش بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە لەو بارەیەوە.

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ﴾ الأنفال: ١ واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی دەسکەوتەکان.

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ ﴾ الكهف: ٨٣ واتە: دەربارەی (ذو القرنین) یش پرسیارت لێ دەکەن،

﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴾ الأعراف: ١٨٧ واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی قیامەت: کەی بەرپا دەبێت؟

مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەوانەی پرسیاریان لێ کردووە چۆن بووە، ئەو ڕێگا و پەیڕەوە و ڕێبازەی لەو مامەڵەکردنەدا بەکاری دەهێنا چی بووە لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا، بە جیاوازی حاڵیان و ئەو واقیعەی تێیدا بوونە؟

**پێغەمبەر ﷺ ڕەچاوی حاڵی پرسیارکەرانی دەکرد، هەر کەسەو بە گوێرەی حاڵەتی خۆی فەتوای بۆ دەدان:**

ئیبن مەسعود ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسی، چ کارێك باشترین کارە؟

فەرمووی: **"نوێژ لە کاتی خۆیدا"**.

گوتم: پاشان چی؟

فەرموو: **"پاشان چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك"**.

گوتم: پاشان چی؟

فەرموو: "**جیهادکردن لە پێناو خوا**[١]".

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، کە چ کارێك باشترین کارە؟

فەرمووی: "**باوەڕ بە خوا و پێغەمبەرەکەی**".

گوترا: پاشان چی.

فەرمووی: "**جیهادکردن لە پێناو خوا**"

گوترا: پاشان چی.

فەرمووی: "**حەجی مەبرور**[٢]".

ئەبی ئومامە دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لە بارەی باشترین کردەوە؟

فەرمووی: "**ڕۆژوو بگرە، چونکە هیچ شتێك ناگاتە ئەو**[٣]".

کاتێك پرسیاری لێکراوە چ کردەوەیەك خۆشەویسترە لای پەروەردگار؟

فەرموویەتی: "**کردەوەیەك بەردەوامی هەبێت، گەر چی کەمیش بێت**[٤]".

هەروەها کاتێك پرسیاری لێکراوە: چ ئیسلامێك باشترینە؟، فەرموویەتی: "**ئەو کەسەی موسڵمانان لە دەست و زمانی ئەمین بن**[٥]".

پرسیاری لێکراوە: چ ئیسلامێك باشترە؟

فەرموویەتی: "**خواردن بدەیتە هەژاران، سڵاو لەو کەسانە بکەیت کە دەمیان ناسیت و نایان ناسیت**[٦]".

ئەوەی جێی سەرنجە لەو فەرموودانە ئەوەیە وەڵامەکە جیاوازی هەیە لە کاتێکدا پرسیارەکە لەبارەی یەك شتە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەرەنجامی ئەوەی زانایان پێ گەیشتوون لەبارەی ئەو فەرموودەیە، ئەوەیە وەڵامەکان لەبارەی پرسیاری (باشترین کردەوە) جیاوازیان هەیە، بە گوێرەی جیاوازی حاڵەتی پرسیارکاران، چونکە ئەو زاناتر بووە بەهەموو کەسێك کە چیان پێویستە، یاخود حەزیان لە چییە، یاخود چ شتێك بۆیان گونجاوە.

---

[١] بوخاری (٢٧٨٧) و موسلیم (٨٥) گێڕاوەتیانەوە.

[٢] بوخاری (٢٦) و موسلیم (٨٣) گێڕاوەتیانەوە، مەبرور: وات لەسەر سوننەتی پێغەمبەر کرابێت و گوناهی تێدا نەکرابێت (و).

[٣] النسائي گێڕاوەتیەوە(٢٢٢٠) ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[٤] موسلیم لە عائیشە گێڕاوەتیەوە ﷺ (٧٨٢).

[٥] بوخاری (١١) و موسلیم (٤٢) لە ئەبو موسای ئەشعەریان ﷺ گێڕاوەتەوە.

[٦] بوخاری (٢٨) و موسلیم (٣٩) لە عەبدوڵلای کوڕی عەمریان گێڕاوەتەوە.

یان لەوانەیە جیاوازییەکان پەیوەندی هەبێت بە جیاوازی کاتەکان، لەوانەیە ئەو کات ئەمە باشترین کردەوە بێت، جیهادکردن لەسەرەتای ئیسلامەتییەوە باشترین کردەوە بووە، چونکە هۆکاری چەسپاندن و جێبەجێکردنی ئەو دینە بووە.

دەقەکان زۆرن کە باس لەوە دەکەن نوێژ کردن لە بەخشین چاکترە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە کاتی بە هاناوەچوونی هەژاران ئەو کات بەخشین باشترە... [1]

**هەروەها پرسیاری لە بارەی باشترین جیهاد لێکراوە، وەڵامەکان جیاوازیان هەبووە:**

عەبدوڵڵای کوڕی حەبەشی الخثعمي دەگێڕێتەوە،پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا: چ جیهادێك باشترینە؟ فەرمووی: **"ئەو کەسەی بە ماڵ و گیان جیهاد بکات لە دژی بێ باوەڕان [2]"**.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ئەی پێغەمبەری خوا، دەبینین جیهادکردن باشترین کردەوەیە، ئەی ئێمە جیهاد نەکەین؟ فەرمووی: **"نەخێر، بەڵکو باشترین جیهاد حەجێکی قبوڵکراوە [3]"**.

لە گێڕاونەوەیەکی تردا: **"لەسەر ئافرەتان جیهادێك پێویستە، کە شەڕی تێدا نییە، ئەویش حەج و عەمرەیە [4]"**.

تارِیقی کوڕی شەهاب دەگێڕێتەوە، پیاوێك پێی لەسەر ئەسپ دانابوو، لە پێغەمبەری خوای ﷺ پرسی: چ جیهادێك باشترینە؟ فەرمووی: **"گوتنی وشەیەکی حەق لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار [5]"**.

**هەروەها پرسیاری لێکراوە لەبارەی ئەو کردەوەی بەهۆیەوە پێی دەچیە بەهەشت، وەڵامەکانی جیاوازیان هەبوو:**

ئەبو ئەیوب ﵁ دەگێڕێتەوە، پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: کارێکم پێ بڵێ بمباتە بەهەشت؟

خەڵکەکە گوتیان: چیەتی چیەتی؟

---

[1] فتح الباری (٢/٩).

[2] ئەبو داود (١٤٤٩) و النسائی (٢٤٧٩) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[3] حج مبرور: بوخاری گێراوەتیەوە(١٥٢٠).

[4] ئیبن ماجة (٢٩٠١) و ئەحمەد (٢٤٧٩٤) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (٩٨١).

[5] النسائی گێراوەتیەوە(٤٢٠٩)، ئەلبانی لە (صحیح النسائی) بە سەحیحی داناوە (٤٢٠٩).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"پێویستییەکی هەیە و پرسیاری لەبارەیەوە دەکا.. خوا بپەرستە و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە، نوێژ بکە، زەکات بدە، پەیوەندی خزمایەتی بکەیەنە[1]".**

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: من لە گەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، ڕۆژێکیان لە کاتی ڕۆیشتندا زۆر لێی نزیك بووم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکم پێ بڵێ بمباتە بەهەشت و لە ئاگر دوورم بخاتەوە.

فەرمووی: **"بەڕاستی لە بارەی شتێکی گەورەوە پرسیارت لێکردم، ئاسانە بۆ ئەو کەسەی خوا بۆی ئاسان بکات، خوا بپەرستە و هاوبەشی بۆ بڕیار مەدە، نوێژ بکە، زەکات بدە، ڕۆژووی ڕەمەزان بگرە، حەجی ماڵی خوا بکە".**

پاشان فەرمووی: **"دەتەوێت دەرگای کاری خێرت نیشان بدەم؟ ڕۆژوو پارێزگارە، بەخشین گوناهەکان دەکوژێنێتەوە وەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە. هەروەها نوێژی کەسێك لە ناوەڕاستی شەودا..** پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە. ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ .... ﴾ تا گەیشتە ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ السجدة: ١٦- ١٧ واتە: بەنوێژ و خواپەرستی بەشێکی شەو بەراکشان لە جێگەی گەرم ونەرما دەبەنە سەر ...

پاشان فەرمووی: **"دەتەوێت سەر و پایە و لوتکەی هەموو ئەو کردەوانەت پێ بڵێم؟".**

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"سەرکارەکە ئیسلامە، پایەکەی نوێژە و لوتکەکەشی جیهادە".**

فەرمووی: **"دەتەوێت پێت بڵێم پوختەی هەموو ئەوشتانە چییە؟".**

گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

بە دەست زمانی گرت و فەرموو: **"ئەمەت بگرە".**

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لەبارەی ئەو قسانەی دەیکەین حیسابمان لەگەڵ دەکرێت؟.

فەرمووی: **"دایکت ڕۆ ڕۆت بۆبکات ئەی موعاز، ئەی هەر بە بەرهەمی زمان نییە مرۆڤەکان لەسەر ڕوو یان لەسەر لوتیان فڕێدەدرێنە ناو ئاگر؟[2]".**

ئەبو زەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ کردەوەیەك باشترینە[3]؟

---

[1] بوخاری (١٣٩٦) و موسلیم (١٣) گێراوەتیانەوە.

[2] ترمذي (٢٦١٥) و ابن ماجة (٣٩٧٣) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع) بە سەحیحی داناوە (٥١٣٦).

[3] لە گێرانەوەی ئیبن حبان (٣٧٤) دا هاتووە: گوتم: کردەوەیەکم پێ بڵێ، گەر بەندە بیکات پێی بچێتە بەهەشت.

فەرمووی: **"باوەڕ بە خوا و جیهادکردن لە پێناویدا"**.

دەڵێت: گوتم: چ ئازادکردنێك باشترینە؟

فەرمووی: **"ئەوەی لای خاوەنەکەی بەبەهایە و نرخەکەی لە هەمووان زیاترە"**.

دەڵێت: گوتم: گەر نەیکەم؟

فەرمووی: **"یارمەتی پیشەکارێك بدەی، یان فێری پیشەیەکی بکەی [1]"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا گەر لە هەندێك کاردا توانام نەبوو؟

فەرموو: **"خراپەت بەرامبەر خەڵك نەبێت، ئەمە چاکەیەکە بۆ نەفسی خۆت[2]"**.

ئەبو شورەیح ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم پێ بڵێ بەهەشتم بۆ مسۆگەر بکات.

فەرمووی: **"قسەی باش، سەلام کردن، نانداني هەژاران [3]"**.

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم پێ بڵێ بمباتە بەهەشتەوە.

فەرمووی: **"ئازار لەسەر رێگای خەڵك لابدە، ئەمە بۆ تۆ چاکەیە [4]"**.

**هەروەها لەبارەی ئامۆژگاری کردن پرسیاری لێکراوە، وەڵامەکانی جیاوازیان هەبووە:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئامۆژگاریم بکە. فەرمووی: **"توڕە مەبە"**، چەند جارێك ئەمەی دووبارە کردەوە **"توڕە مەبە [5]"**.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من دەمەوێت گەشت بکەم، وەسیەتێکم پێ بڵێ.

فەرمووی: **"پێویستە لەسەرت لە خوا بترسیت، لە هەر بەرزایی و نشێوێکدا الله أکبر بڵێی"**.

---

[1] مەبەست لەوە ئەوەیە: یارمەتی کەسێکی نەشارەزا بدەی یان فێری بکەی کە هیچ پیشەیەکی نییە بۆئەوەی کاسبی پێبەوە بکات. النهایة (٢/٢٦).

[2] بوخاری (٢٥١٨) و موسلیم (٨٤) گێراوەتیانەوە.

[3] ابن حبان (٥٠٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعلیقات الحسان) بە سەحیحی داناوە (٢/١٤).

[4] بوخاری لە (الادب المفرد) گێراوەتیەوە(٢٢٨). ئەحمەد (١٦٢٩٦)، ئەلبانی لە (صحیح الادب المفرد) بە سەحیحی داناوە (١٦٨).

[5] بوخاری (٦١١٦) گێراوەتیەوە.

کاتێك پیاوەکە ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"خوایە گیان زەوی بۆ لول بدە و گەشتەکەی بۆ ئاسان بکە"**[1].

سەلیمی کوڕی جابری هوجەیمی ﷺ دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، خۆی بە چاکەتێك داپۆشی بوو، لێواری چاکەتەکەی لە سەرەوەی پێیەکانی بوو، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا وەسیەتێکم پێ بڵێ.

فەرمووی: **"ترسی خوات هەبێت، هیچ کارێکی چاکە بە کەم مەزانە، تەنانەت گەر سەتڵەکەت لە جامی ئاوخۆرێك بەتاڵ بکەی، کاتێك قسە لەگەڵ براکەت دەکەیت، با زەردەخەنە لەسەر لێوەکانت بێت.**

**ئاگاداریە با پۆشاکەکەت لە خوار گۆزینگت درێژ نەبێتەوە، ئەمە لە لوتبەرزییە و خوای گەورە خۆشی ناوێت.**

**گەر کەسێك عەیبداری کردی بە شتێك، کە دەیزانی لە تۆدا هەیە، تۆ بەو شتە عەیبداری مەکەوە کە دەزانی تێیدایە، لێی گەڕێ، گوناهی خۆی لەسەر خۆی، تۆش پاداشتت بۆ هەیە، هەرگیز قسەی ناشیرین بە کەس مەڵێ"**.

دەڵێت: لە دوای ئەمە هەرگیز قسەی ناشیرینم نەگوتووە، نە بە مرۆڤ نە ئاژەڵ[2].

## بۆ کەسی پرسیارکەر، باشترینی هەڵدەبژارد و بۆی ڕوون دەکردنەوە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە دۆڵێکدا تێپەڕی، ئاوێکی سازگاری لێ بوو، سازگارییەکەی سەرنجی ڕاکێشا.

گوتی: پێم باشە لە خەڵك دابڕێم و لەو دۆڵە نیشتەجێ بم و نەڕۆم تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوخستەم دەدات. ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، ئەویش فەرمووی: **"ئەمە مەکە، پێگەی هەریەکێك لە ئێوە لە تێکۆشان لە پێناو خوای گەورە، لە نوێژی حەفتا ساڵی ماڵەوەتان باشترە، ئایا ناتانەوێت خوای پەروەردگار لێتان خۆش بێت و بتانباتە بەهەشت؟ لە پێناو خودا جیهاد بکەن، هەر کەسێك لە پێناو خوا بکوژرێت، بەهەشت بۆی مسۆگەر دەبێت"**[3].

عیمرانی کوڕی حەصین ﷺ دەگێڕێتەوە کە لەبارەی نوێژی پیاو بە دانیشتنەوە پرسیاری لە پیغەمبەری خوا ﷺ کرد؟

---

[1] ترمذي (٣٤٤٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة) بە سەحیحی داناوە (١٧٣٠).

[2] ابن حبان (٥١١) گێراوەتیەوە. ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ١٩/٢) دەڵێت: سەحیحە.

[3] ترمذي (١٦٥٠) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الترغيب والترهيب ١٣٠١) بە (حسن)ی داناوە.

فەرمووی: **"کەسێك بە پێوە نوێژ بکات، ئەمە باشترینە، کەسێکیش بە دانیشتنەوە نوێژ بکات نیوەی پاداشتی کەسە وەستاوەکەی هەیە، کەسێکیش بە پاڵکەوتنەوە نوێژ بکات، نیوەی پاداشتی کەسی دانیشتووی هەیە"**[1].

فەرموودەکەی **"کەسێك بە پێوە نوێژ بکات، ئەمە باشترینە"**، زانایان ئەم فەرموودەیە بە نوێژی سوننەت دەبەستنەوە، چونکە وشەی "باشترین" ئاماژەیەکە بۆ دروستبوونی دانیشتن، بەڵام لە نوێژی واجبدا ناکرێت بە دانیشتنەوە نوێژ بکرێت، لە کاتێك توانای وەستانی هەبێت[2].

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی خەتتاب لە شەڕی خەیبەر زەویەکی وەرگرت، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکرد فەرمانێکی لەبارەیەوە پێ بکات، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من زەوەیەکم لە خەیبەر دەسکەوتووە، لە ژیانی خۆمدا هیچ شتێکی گرانبەهای لەو شێوەیەم دەستنەکەوتووە، تۆ چ فەرمانێکم پێ دەکەی؟

فەرمووی: **"گەر بتەوێت سوودەکەی دەکەیتە وەقف و دەیبەخشی"**.

دەڵێت: عومەر بەو جۆرە سوودەکەی بەخشی، کە نەدەفرۆشرێت، نە دەکرێتە دیاری، نە دەبێتە میرات، بەڵکو بۆ هەژاران، خزمان، بەندەکان، جیهادکردن لە پێناوی خوا و بۆ رێبواران و میوانانە، ئەو کەسەی سەرپەشتی دەکات گوناهی نییە بە چاکە لێی بخوات و بیداتە خەڵکیش نانی خەڵکانیش بدات بەڵام بەو مەرجەی دەوڵەمەند نەبن[3].

## رێنموویی کەسی پرسیارکەری دەکرد بۆ ئەوشتەی گونجاوە:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە کە کەسێکی دەشتەکی لەبارەی کۆچکردنەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: **"ئەوە چیتە، کۆچکردن کارێکی قورسە، ئایا وشترت هەیە؟"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"زەکاتی لێ دەردەکەی"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"هیچی لێ دەبەخشی"**.

گوتی: بەڵێ.

---

(1) بوخاری (١١١٥) گێراوەتیەوە.

(2) حاشية السندي على سنن بان ماجة (١/٣٧٠).

(3) بوخاری (٢٧٣٧) و موسلیم (١٦٣٣) گێراوەتیانەوە.

فەرمووی: **"لە ڕۆژی ئاودانی شیر دەدیتە خەڵك"**.

گوتی: بەڵێ

فەرمووی: **"بڕۆ لە پشت دێیەکەت کاربکە، خوای گەورە هیچ کردەوەیەك لە چاکەکانت کەم ناکاتەوە[1]"**.

زانایان دەڵێن: ئەو کۆچکردنەی دەشتەکییە ئەعرابیەکە پرسیاری لەبارەیەوە کردووە، مەبەست لێی هاوەڵایەتیکردنی پێغەمبەرە لە مەدینە و جێهێشتنی کەسوکار و نیشتیمانیەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ ترسی هەبووە توانای ئەمەی نەبێت، نەتوانێت مافی تەواوی کۆچکردنەکە بدات و پەشیمان بێتەوە، پێی فەرمووە، ئەو کۆچەی تۆ پرسیاری لەبارەیەوە دەکەی کارێکی قورسە، بەڵام لە نیشتیمانی خۆت کاری چاکە بکە، یان لە هەر شوێنێك بیت، خوای گەورە هیچ کردەوەیەك لە چاکەکانت کەم ناکاتەوە[2].

**لەوانەیە پرسیاری لێکرابێت، بێ دەنگ بوو بێت، ئەمەش لەترسی ئەوەی نەوەك وەڵامەکە ئەرکی قورسی تێدا بێت.**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: **"ئەی خەڵکینە، خوای پەروەردگار حەجی لەسەرتان فەرزکردووە، حەج بکەن"**.

پیاوێك گوتی: ئایا هەموو ساڵێك، ئەی پێغەمبەری خوا؟

بێ دەنگ بوو، تا سێ جار لێی دووبارە کردەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"گەر گوتبام بەڵێ، واجب دەبوو، نەشتان دەتوانی"**.

پاشان فەرمووی: **"ئەوەی بۆم بەجێهێشتوون بەستانە، ئەوانەی پێش ئێوە بەهۆی زۆر پرسیارکردنیان و رای جیاوازیان لەسەر پێغەمبەرەکانیان فەوتان، ئەوەی فەرمانم پێکردن بە پێی تواناتان بیکەن، هەر شتێکیش قەدەغەم کرد، وازی لێبێنن[3]"**.

## گەر پرسیارەکە سوودی نەبووایە، وەڵامێکی حەکیمانەی دەدایەوە:

شێوازی حەکیمانە ئەوەیە: کەسی پرسیارکەر شتێك وەردەگرێت جیاوازترە لەوەی دەیەوێت، پرسیارەکەی دادەبەزێت بۆ ئاستی شتێکی تر، ئەمەش وەك ئاگادارکردنەوەیەك، کە ئەو وەڵامە لە پرسیارەکە لە پێشتر و گرنگترە[4].

---

[1] بوخاری (١٤٥٢) و موسلیم (١٨٦٥) گێڕاوەتیانەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩/١٣).

[3] موسلیم گێڕاوەتیەوە(١٣٣٧)، بوخاری تەخریجی کردوە (٧٢٨٨).

[4] سەیری (الایضاح في علوم البلاغة) (١١٠/٢). بکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی پرسیارکەر و فەتواوەرگری بەرەو بە سوودترینی دین و دونیا ئاراستە دەکرد، یاخود ڕێنوێنی دەکرد بەرەوە پرسیارێکی بە سوودتر کە پێویستە پرسیاری لەبارەیەوە بکات.

لەوبارەیەوە، فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ﴾ البقرة: ١٨٩

پرسیاریان کرد، بۆ چی مانگ لەسەرەتا و کۆتایی بەو شێوەیەیە، کاتێك ئەم پرسیارە هیچ سوودێکی نییە، خوای پەروەردگار باس لە حیکمەتەکەی دەکات: ﴿قُلْ هِيَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ﴾ البقرة: ١٨٩

واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی نوێ بوونەوەی مانگەکان، پێیان بڵێ ئەوە بۆ دیاریکردنی کاتەکانە بۆ خەڵکی و بۆ زانینی کاتی حەج .

کەسی پرسیارکەری بۆ شتێکی دیکە ئاراستەکرد، وەك ئاگادارکردنەوەیەك کە گرنگ ئەوەیە پرسیار لە شتێك بکەن سوودی دونیا و ڕۆژی دواییان هەبێت، ئەویش ئەوەیە، کە زانینی شێوازی مانگ بەو شێوەیە تاوەکو کاتەکانی مامەڵە و بەندایەتیکردنی وەك حەج و ڕۆژ لەسەر دیار بێت، بۆیە بابەتەی پرسیارکراوەکە بۆ بابەتێکی بە سوودتر گۆڕدرا [1].

کاتێکیش پرسیاریان لە شتێکی کەم بایەخ کردبا، وەڵامی پرسیاری ئەوانی بە شتێکی سوودبەخش دەدانەوە، دەیبردن بەرەو سودێکی تر، ئەمەش نزیکە لە فەرمایشتی پەروەردگار ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ﴾ البقرة: ٢١٥ واتە: لە تۆ دەپرسن (ئەی پێغەمبەر ﷺ) کەچی ببەخشن ؟ پێیان بڵێ: هەر خێرێك دەکەن سەرەتا دایك و باوکتان فەرامۆش مەکەن، هەروەها خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و نەداریش.

پرسیارەکە لەبارەی جۆری بەخشین بوو، وەڵامەکەش باسی ئەو کەسە دەکا کە دروستە پێی ببەخشرێ، چونکە گرنگترە [2].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك من و پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرەوەی مزگەوت بووین، پیاوێکی دەشتەکیمان بینی کە لەسێبەری دەروازەی مزگەوت وەستابوو.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کەی ڕۆژی دوایی دێت؟

---

[1] التحرير و التنوير (٥٣٥/١).
[2] فتح الباری (١٨٦/٥).

فەرمووی: **"هاوار بۆ تۆ، چیت بۆ ئامادە کردووە؟"**.

پیاوەکە وەك ئەوەی بێ دەنگ بێت، پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا نە نوێژی زۆر، نە رۆژووی زۆر، نە بەخشینی زۆرم بۆ ئامادەکردووە، بەڵکو خوا و پێغەمبەرەکەیم خۆش دەوێت.

فەرمووی: **"لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبیت کە خۆشت دەوێت"**.

گوتمان: ئێمەش بەوشێوەیە؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

لەو رۆژەدا زۆر دڵخۆش بووین.

ئەنەس دەڵێت: من پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر و عومەرم خۆش دەوێت، گەرچی کردەوەی ئەوانم نەکردووە، بەڵام ئومێدم وایە بەو خۆشەویستییەی بۆیانم هەیە لەگەڵیاندا بم[1].

طیبي رحمه الله دەڵێت: رێگای حیکمەتی لەگەڵ کەسی پرسیارکەر گرتۆتەبەر، چونکە پرسیاری لەبارەی کاتی رۆژی دوایی لێ دەکات، ئەو بە فەرموودەی خۆی وەڵامی دەداتەوە **"چیت بۆ ئامادەکردووە؟"**، واتە: ئەوەی بۆتۆ گرینگە و پێوستە بایەخی پێبدەی کردنی کاری چاکە، ئەمە بە سوودترە بۆ تۆ، نەوەك کاتی هاتنی رۆژی دوایی[2].

بورەیدە دەگێرێتەوە، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لە بەهەشت ئەسپ هەیە؟

فەرمووی: **"گەر خوای گەورە بتباتە بە هەشت، لەسەر پشتی ئەسپێك لە یاقوتی سور بۆ هەر شوێنێك بتەوێت لە بەهەشت دەتگوازێتەوە"**.

پیاوێك پرسیاری لێکرد: ئەی پێغەمبەری خوا، لە بەهەشت وشتر هەیە؟

ئەو وەڵامەی پێشووتری بۆ ئەو نەبوو.

فەرمووی: **"گەر خوای گەورە بتباتە بەهەشت، هەرچی نەفست پێی خۆش بێت و چاوت حەزی لێ بکات لێیەتی"[3]**.

قازی رحمه الله دەڵێت: مەزندەی قسەکە: گەر خوای گەورە تۆی بردە بەهەشت، ئەو ئەسپەی دەتەوێت سواری بیت، بۆت دەبێت.

واتە: هەر شتێك نەفس حەزی بۆی بچێت، لە بەهەشت دەیبینێتەوە، تەنانەت گەر بتەوێت سواری پشتی ئەسپێك بیت بەم سیفاتەنە دەیدۆزێتەوە و دەتوانی بەکاری بهێنیت، ئەو کارەت بۆ دەکات کە ئەسپی ئاسایی نایکات.

---

[1] بوخاری (٧١٥٣) و موسلیم (٢٣٩) گێراوەتیانەوە.

[2] عمده القاری (٢٢/١٩٦).

[3] ترمذي گێراوەتیەوە(٢٥٤٣)، ئەلبانی دەڵێت: "حسن لغیره"، (صحیح الترغیب والترهیب) (٣٧٥٦).

طيبي ﷺ دەڵێت: ئەمە نزیکە لەشێوازی حەکیمانە، پیاوەکە پرسیاری کردووە لە ئەسپی ئاسایی دونیا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەوەی لە بەهەشتە وەڵامی داوەتەوە: واتە: واز لەوە بێنە کە پرسیارت لەبارەیەوە کردووە، تۆ بەو ئەسپەی وەسفت بۆ کراوە، بەستە [1].

## گەر بینیبای پرسیارکەر پێویستی بە حیکمەتێك هەیە، بۆی روون دەکردەوە، تەنانەت گەر پرسیارشی لەبارەیەوە نەکردبا:

ئەمەش بۆ گشتاندنی سوودەکەی، یان کەسەکە پێویستی پێیەتی، یان بە هەر هۆیەکی تر بێت.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بە کەشتی بەسەر دەریادا دەڕۆین، ئاوێکی کەممان پێیە، گەر دەستنوێژی پێ بگرین، تینو دەبین، ئایا دەکرێ لە ئاوی دەریا دەستنوێژ بگرین؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئاوەکەی پاکە و گۆشتی مردووەکانیشی حەڵاڵە [2]"**.

رافعي دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ زانیوویەتی خەریکە بابەتی خاوێنی ئاوەکە لای کەسی پرسیارکەرەکە نارۆشن دەبێت، ترسا لەوەی بابەتی حەڵاڵی و حەرامی گۆشتەکەشی لەلایان نارۆشن بێت، چونکە دەریاوان توشی ئەمە دەبێت، راستەوخۆ دوای وەڵامی پرسیارەکەی، حوکمی خواردنی مردووەکەشی بۆ روون کردۆتەوە [3].

ابن العربي دەڵێت: ئەمە لایەنی باشی فەتوادانە، کە وەمەڵاکە بە مەبەستی سوودگەیاندن تێر و تەسەلتربێت لە پرسیارەکە، هەروەها زانستێکی تریش روون دەکاتەوە کە پرسیاری لێیەوە نەکراوە، چونکە ئەو کەسەی خاوێنی ئاوەکەی لا روون نییە، هەڵبەتە حەرامبوونی مردووەکانی زیاتر لا روون نییە [4].

## لەوانەیە روونکردنەوەی زیاتری بۆ ئەو بابەتە هەبووبێت، کە گرفت لە تێگەیشتنی هەبێت:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە و، کە دەفەرموێت: **" ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی یەك گەردیلە لوتبەرزی لە دڵدا بێت، "**.

پیاوێك گوتی: پیاو حەزی لێیە پۆشاکەکەی جوان بێت، نەعلەکانی جوان بێت.

---

[1] تحفة الاحوذي (٧/٢١٤).

[2] ابوداود (٨٣)، وترمذي (٦٩)، والنسائي (٣٣٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە.

[3] تحفة الاحوذي (١/١٨٨).

[4] فيض القدير (٣/٢١٥).

فەرمووی: **"خوای گەورە جوانە و جوانی خۆش دەوێت، لوتبەرزی رەتکردنەوەی ڕاستییە و خۆبەگەورە زانینە و بەکەم سەیرکردنی خەڵکە [(١)]"**.

وشەی (نەخێر) لێرەدا بۆ کەسی پرسیارەکە بەس بوو، بەڵام بۆی روونکردەوە کە حەزکردن لە پۆشاك و نەعلی جوان کارێکی ڕێگەپێدراوە لە شەرع.

جگە لەمە رووی راستەقینەی لوتبەرزی بۆ روونکردەوە، کە بریتییە لە رەتکردنەوەی حەق و بەکەم سەیرکردنی خەڵك.

ئەم دوو سوودە زیادەیەکە لەو پرسیارەی پیاوەکە کردی.

**لەوانەیە روونکردنەوە زیادەکە بە مەبەستی هاندان بوو بێت بۆ کاری چاکە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئافرەتێك منداڵێکی بەرزکردەوە و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە حەجکردنی بۆ هەیە؟

فەرمووی: **"بەڵێ، تۆش پاداشتەکە وەردەگریت"**.

**داوای روونکردنەوەی زیاتری لە کەسی پرسیارکەر دەکرد، بۆ ئەوەی زانیاری تەواوی لەسەر رووداوەکە هەبایە، ئەمەش لە پێناو ئەوەی فەتوادانەکە هاوتا بێت لەگەڵ رووداوەکە:**

نوعمانی کوڕی بەشیری کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دایکم داوای لە بابم کرد، هەندێك لە میرات لەماڵەکەی بە من بدات، پاشان پێیدام.

دایکم گوتی: رازی نابم تاوەکو پێغەمبەر ﷺ نەکەیتە شاهێد.

من منداڵم بووم، باوکم دەستی گرتم و بردمیە خزمەت پێغەمبەر ﷺ

گوتی: دایکی ئەمە –کچی رەواحە– داوای کردووە هەندێك میرات بدەمە ئەم کوڕەم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"هیچ منداڵی ترت هەیە، جگە لەمە؟"**.

گوتی: بەڵێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا میراتت بە هەموویان داوە، بە هەمان بڕی بەو منداڵەت داوە؟"**.

گوتی: نەخێر.

فەرمووی: **"کەواتە من مەکە شاهێد، بەڕاستی من شاهێدی نادەم لەسەر ستەم [(٢)]"**.

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: **"ئەوان مافیان هەیە لەسەر تۆ، کە دادپەروەری بکەی لە نێوانیان، وەك چۆن تۆش مافت لەسەریان هەیە چاکەت لەگەڵ بکەن [(٣)]"**.

---

(١) موسلیم گێڕاوەتیەوە(٩١).

(٢) بوخاری (٢٦٥٠) و موسلیم (١٦٢٣) گێڕاوەتیانەوە.

(٣) ابو داود (٣٥٤٢).

پێغەمبەر داوای وردەکاری زیاتری لێ دەکات **"هیچ منداڵی ترت هەیە، جگە لەمە؟"**، پاشان لێی پرسی: **"ئایا میراتت بە هەموویان داوە، بە هەمان بڕی بەو منداڵەت داوە؟"**.

پاشان حوکمدانەکەی بۆ روونکردۆتەوە **"کەواتە من مەکە شاهێد، بەڕاستی من شاهێدی نادەم لەسەر ستەم "**.

ثابتي کوڕی ضحاك دەگێڕێتەوە: پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ نەزری لەخۆی گرتبوو وشترێك لە (بوانە) [1] سەربیبڕێت، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: من نەزرم کردووە وشترێك لە بوانە سەرببڕم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئایا هیچ بتێکی لە بتەکانی سەردەمی نەفامی لێیە؟"**.

گوتیان نەخێر.

فەرمووی: **"ئایا هیچ جەژنیان هەیە لەوێ؟"**.

گوتیان: نەخێر.

فەرمووی: **"نەزرەکەت بکە، چونکە بزانە هیچ نەزرێك لەسەر سەرپێچیکردنی خوای گەورە ناکرێت، هیچ نەزرێکیش لەوە ناکرێت کە ئادەمیزاد توانای ئەنجامدانی نەبێت"**.

کاتێك ویستوویەتی لەو شوێنە نەزرەکە بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای زانیاری زیاتری کردووە، چونکە ئەم بابەتە پێویستی بە وردەکاری هەیە، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، بۆچی ئەم پیاوە (بوانە)ی هەڵبژاردووە بۆ سەربڕینی وشترەکەی، چونکە لەوانەیە لەو شوێنە جەژن هەبێت، یان لەوانەیە بتێك لە بتەکانی سەردەمی نەفامی هەبێت و لەوێ بپەرسترێت، ئەم پرسیارانەش روونی دەکەنەوە، گەر هەر یەکێك لەمانە بوونی هەبووایە، دروست نەدەبوو سەربڕینی لێ بکرابایە [2].

**هەندێك جار داوای لە کەسی پرسیارکەر دەکرد، راستەوخۆ کارێك بکات، ئەم کارە دەبووە وەڵام بۆ پرسیارەکەی:**

ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، وتاری دەدا و دەیفەرموو: **"نابێت ئافرەت بێ مەحرەم سەفەر بکات"**.

پیاوێك هەڵسا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خێزانەکەی من بۆ کارێك دەرچووە، لە کاتێکدا من لە فڵانە جیهاد بووم.

---

[1] بوانە: گردێکە لەپشت کانییەکی ئاو. دەگوترێت: شوێنێکە لە نێوان شام و دیاربەکر، یان دەگوترێت: خواروی مەککە لە یەلەملەم (معجم البلدان ١/٥٠٥).

[2] ابو داود گێراوەتیەوە(٢٣١٣)، ئەلبانی لە (تحقیق المشکاة) بە سەحیحی داناوە (٣٤٣٧).

فەرمووی: **"ئێستا برۆ لەگەڵ خێزانەکەت حەج بکە [1]"**.

فەرمانکردن بەو پیاوە کە راستەوخۆ بگاتە خێزانەکەی، ئەمە وەڵامە بۆ پرسیارەکە: مەزەندەی وەمەڵامەکە ئەمەیە: دروست نییە خێزانەکەت بەبێ مەحرەمم سەفەر بکات.

**بە ژماردنی حەرامەکان، حەڵاڵەکانی بۆ کەسی پرسیارکەر دیاری دەکرد:**

ئیبن عومەر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك پرسیاری لێکرد، ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە چی لەبەربکات؟

فەرمووی: **"نە کراس لە بەربکات، نە مەندیل، نە شەرواڵ، نە کراسێکی بە کڵاو، نە کراسێك بە رەنگ و بۆن کرابێت، گەر نەعلی نەبوو، با خوفف لەبەر بکات و بەڵام بیانبڕێت تاوەکو ژێر گوزینگی بێت [2]"**.

لەم فەرموودەیەدا پرسیاری لێکراوە، کە چی لەبەر بکات، ئەو وەڵامی داوەتەوە کە چی لەبەرنەکات، چونکە ئەوانەی لەبەریان ناکات دیاری دەکرێن و دەژمێردرێن، ئەوانەشی لەبەریان دەکات دیاری ناکرێن.

نەوەوی دەفەرموێت: زانایان دەڵێن: ئەم وەڵامدانەوەیە لە جوانکارییەکانی زمانەوانییە، چونکە ئەو شتانەی لەبەریان ناکات دیاریکراون و ئاماژەی بۆ کردن، بەڵام ئەو شتانە دروستە لەبەریان بکات دیاری کراو نین، فەرمووی: ئەمە لەبەر مەکە، واتە جگە لەمانە لەبەربکە [3].

**هەندێك جار وەڵامێکی گشتگیری دەدایەوە و وردەکارییەکانی جێدەهێشت:**

ئەبو موسای ئەشعەری دەگێڕێتەوە و کە پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! پیاو شەڕ دەکات لە پێناو دەسکەوت، پیاوێکیش شەڕ دەکات بۆ ئەوەی باس بکرێت، یەکێکی دیش شەڕ دەکات بۆ ئەوەی پێگەکەی دیار بێت، کامەیان لە پێناوی خوایە؟

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: **"ئەو کەسەی شەڕ بکات بۆ ئەوەی وشەی خوای گەورە بەرز بێت، ئەمەیان لە پێناوی خوای گەورەیە [4]"**.

حافظ دەڵێت: ئەمە لە قسە کورتەرەوەکانیتی، چونکە بە وشەیەکی گشتگیر وەڵامی داوەتەوە، کە واتای پرسیارەکەی بە زیادەوە لە خۆ گرتووە [5].

---

[1] التمهيد لشرح كتاب التوحيد (١/١٥٥)، شيخ صالح آل الشيخ.

[2] بوخاری (١٣١) و موسلیم (١١٧٧) گێڕاوەتیانەوە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٨/٧٣).

[4] بوخاری (١٢٣) و موسلیم (١٩٠٤) گێڕاوەتیانەوە.

[5] فتح الباری (١/١٩٧).

هەروەها دەڵێت: وەڵامدانەوەکەش لە لوتکەی کورتبڕی و ڕەوانبێژی دایە، چونکە گەر وەڵامی دابایەوە و فەرمووبای، هیچ یەکێك لەمانە لە پێناو خوا نییە، ئەو کات وای لێدەهات، کە جگە لەو سێیە ئەوی تر هەمووی لە پێناوی خوایە، بەڵام بە وشەیەکی گشتگیر، لە ماهییەتی شەڕکردن بۆ ماهییەتی حاڵی شەڕکەر وەڵامەکەی لاداوە، جا وەڵامەکەی بە زیادەوە داوەتەوە. [1].

**ابن بطال** دەڵێت: بەڵکو پێغەمبەر ﷺ لە خودی وشەی وەڵامدانەوەکە لایدا، چونکە لەوانەیە هەندێکجار توڕەیی و دەرماگیری لە پێناو خوا بێت، بەڵام لەوانە لایدا بەرەو وشەیەکی گشتگیر تر، کە ناروونی ڕەواندەوە و تێگەیشتنی زیاتر کرد [2].

ئەبو موسای ئەشعرەی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ من و موعازی کوڕی جەبەلی ناردە یەمەن، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، لە وڵاتی ئێمە خواردنەوەیەك لە جۆ دروست دەکرێت، پێی دەگوترێت ئاوی جۆ، خواردنەوەیەکی تریش لە هەنگوین دروست دەکرێت، پێی دەگوترێت ئاوی هەنگوین، ئایا بیانخۆینەوە؟

فەرمووی: **"هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە"**.

**ئەوەی لە پرسیاری کەسانی دەشتەکی و نامۆکان بەرگەی دەگرت، بۆ کەسانی تر بەرگەی نەدەگرت.**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: وازمان هێنابوو پرسیار لە شتێکی ناپێویست لە پێغەمبەر ﷺ بکەین، پێمان سەیربوو کاتێك پیاوێك لە خەڵکی دەشتەوە دەهات و پرسیاری لێ دەکرد و ئێمەش گوێمان لێی دەبوو.

کاتێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دانیشتبووین، پیاوێك بە وشترەوە هاتە ژوورەوە، وشترەکەی یخ کردوو و پاشان بەستیەوە.

ئینجا گوتی: کامەتان موحەممەدە؟ پێغەمبەریش ﷺ لەناویاندا پاڵکەوتبوو.

پێمان گوت: ئەم پیاوە سپییەی پاڵکەوتووە.

پیاوەکە پێی گوت: ئەی کوڕی عەبدولموتەلیب

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی **"بلێ وەڵامت دەدەمەوە"**

پیاوەکە بە پێغەمبەری ﷺ گوت: من لەبارەی بابەتێك لەسەر تۆ زۆر توندم و پرسیارت لێ دەکەم.

فەرمووی: **"چیت دەوێت بپرسە"**.

---

[1] فتح الباري (٤٠٦/٨).

[2] شەری سەحیحی بوخاری (٢٠٣/١) ابن بطال.

پیاوەکە گوتی: ئەی موحەممەد، نێردراوی تۆ هاتە لامان، وای پێگوتین کە تۆ دەڵێیت من نێردراوی خوام؟

فەرمووی: "**ڕاستی گوتووە**".

پیاوەکە گوتی: کێ ئاسمانی دروستکردووە؟

فەرمووی: "**الله**".

پیاوەکە گوتی: کێ زەوی دروستکردووە؟

فەرمووی: "**الله**".

پیاوەکە گوتی: ئەی کێ ئەم شاخانەی لە زەوی چەقاندووە و ئەو شتانەی لێداناون؟

فەرمووی: "**الله**".

گوتی: سوێندت دەدەم بەوەی ئاسمان و زەوی دروستکردووە و شاخەکانی چەقاندوون، خوا تۆی ڕەوانە کردووە؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژمان لەسەرە؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: سوێندت دەدەم بەوە تۆی ڕەوانە کردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێ کردووی؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە زەکاتی ماڵ و سامانمان لەسەر واجبە؟

فەرمووی "**بەڵێ**".

گوتی: سوێندت دەدەم بەوە تۆی ڕەوانە کردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێ کردووی؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزانمان لەسەر واجبە؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: سوێندت دەدەم بەوە تۆی ڕەوانە کردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێ کردووی؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە واجبە لەسەر ئەو کەسەی توانای هەیە حەجی ماڵی خوا بکات؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

گوتی: سوێندت دەدەم بەوە تۆی ڕەوانە کردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێ کردووی؟

فەرمووی: "**بەڵێ**".

پاشان ڕووی وەرگێڕا و گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ڕاوەنە کردووە، نە زیاتر لەمە دەکەم نە کەمتر.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"گەر ڕاست بکات، بە دڵنیاییەوە دەچێتە بەهەشت"**[(١)].

نەوەوی دەڵێت: ئەمە لە جوانی پرسیاری ئەم پیاوە و شێوازی ئێسک سوکی و پەروەردەکەیەتی، سەرەتا لەبارەی دروستکاری بونەوەر پرسیاری کردووە، پاشان سوێندی بەو زاتە خوارد کە باوەڕی پێیەتی وەك نێردراوی ئەو زاتە.

کاتێك لە پرسیارکردن لەبارەی خواوە وەستاو، دەستیکرد بە سوێند خواردن پێی، ئەم ڕیزبەندییەش پێوستی بە عاقڵێکی پێگەیشتوو هەیە، کە باوەڕی لە قۆناغی دڵنیایی و دانپێدانان تێپەڕیەوە.

قازی عیاض دەڵێت: پێ دەچێت ئەم پیاوە دوای موسڵمان بوونەوە هاتبێت، هاتووە تاوەکو باوەڕەکەی بە قسەکردنی ڕووبەڕوو لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ جێگیرتر بێت، خواش زاناترە[(٢)].

**لەوانەیە هەندێ کجار پشتی لە پرسیارکەرەکە کردبێت، ئەمەش وەك ئاگادارکردنەوەی لەسەر ئەدەبی قسەکردن:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەی بۆ خەڵك دەکرد، پیاوێکی دەشتەکی هات و گوتی: کەی ڕۆژی دواییە دێت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو لە قسەکردنی.

هەندێکیان گوتیان: گوێی لەو قسەیە بوو، بەڵام پێی خۆش نەبووە.

هەندێکیشیان گوتیان: بەڵکو گوێی لێ نەبووە.[(٣)]

تا قسەکانی تەواوکرد، فەرمووی: **"کوا ئەو کەسەی پرسیاری لە ڕۆژی دوایی کرد؟"**.

گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"گەر ڕاسپاردە (ئەمانەت) لە دەستچوو، چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بکە"**.

گوتی: چۆن ڕاسپاردە لە دەست دەچێت؟

---

(١) بوخاری (٦٣) و موسلیم (١٢) گێڕاوەتیانەوە.

(٢) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١/١٧١).

(٣) ئەم دوودڵیە لەوەوە هاتووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی لە پرسیاری کابرایەکە نەداوەتەوە، لەوانەیە هۆکارەکەش ئەم دوو حاڵە نەبێت، بەڵکو لەوانەیە بۆ ئەوە بێت تا دوای بخات بۆ دوای تەواوبوونی قسەکانی. فتح الباری (١/١٤٣).

فەرمووی: **"گەر کاروبارەکان خرانە بەردەستی کەسێك کە شیاو نەبوو، ئەوا چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بکە [(١)]".**

بوخاری لە سەحیحی خۆی (١٤٢/١) بەشێکی داناوە بە ناونیشانی (کەسێك پرسیار لەبارەی زانستێك دەکات، ئەویش سەرگەرمی قسەکردنە، قسەکانی خۆی تەواو دەکات، پاشان وەڵامی پرسیارەکەرەکە دەکاتەوە).

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ئاماژەدانێکە بۆ ئەدەبی زانا و زانست وەرگر، زاناکە وازیهێناوە لە سەرزەنشت کردنی پرسیارکەر، بەڵکو بە شێوازی پشت تێکردن فێرە ئادابی کردووە، پاشان گەڕاوەتەوە سەری و دڵی نەرم بووە، چونکە لە خەڵکانی ئەعرابی دەشتەکەی کەسانی وای تێدایە خاوەن هەڵس و کەوتێکی ڕەقە.
- بایەخدان بە وەڵامی پرسیاری کەسی پرسیارکەر، تەنانەت گەر پرسیارەکە لەو ئاستەشدا نەبێت.
- سەبارەت بە زانستوەرگرەکە، پێویستە کەسی پرسیارکەر، پرسیار لە کەسێك نەکات کە بەکارێکی تر سەرقاڵە، چونکە ماف یەکەم لە پێشتوترە.
- پەندوەرگرتن لە هەڵەی زمان.
- داوای ڕوونکردنەوەی زیاتر لە زانا بکرێت، گەر لە وەڵامەکە تێنەگەیشت، تاوەکو ڕوون دەبێتەوە، وەك دەشتەکییەکە گوتی: چۆن لە دەستدەچێت؟.
- ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی زانست بریتییە لە پرسیار و وەڵام، وەکو گوتراوە: باش پرسیارکردن نیوەی زانستە.

هەریەکە لە مالیك و ئەحمەد و چەند زانایەکی تر، والەتی ئەم فەرموودەیەیان وەرگرتووە و گوتوویانە: وتار بۆ پرسیارکردن ناپچڕێنین، بەڵکو کاتێك تەواو دەبین وەڵامی دەدەینەوە.

جمهوری زانایان وردەکاریان داوەتە ئەم بابەتە، دەڵێن گەر لەناو واجبەکانی وتارەکە بێت، وەڵامەکەی دوادەخرێت، گەر لەناو واجبەکانیش نەبێت، وەڵام دەدەرێتەوە.

واتە گەر لەو کارانەی گرینگ بوو لە دین، بەتایبەت گەر پەیوەندیدار بوو پرسیارکەر، ئەو کات باشترە درێژەی پێ بدرێت و سوننەتە وەڵامی بدرێتەوە و پاشان وتارەکە تەواو بکرێت، گەر پێچەوانەی ئەمەش بوو دوادەخرێت [(١)].

---

[(١)] بوخاری گێراوەتیەوە(٥٩).

ئەبو روفاعە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاوێك هاتووە پرسیار لەبارەی دینەوە دەکات، نازانێت دینی چییە؟

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وتارەکەی جێهێشت و رووی لە من کرد، کورسییەکی هێنا، وامزانی پایەکانی لە ئاسنن.

لەسەری دانیشت و ئەوەی خوا فێرە کردبوو، فێری منی کرد، پاشان گەڕایەوە وەتارەکەی تەواو کرد [٢].

نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرمودەیە دەستپێشخەری تێدایە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارکەرەکە و پێشخستنی کاری گرنگتر، لەوانەیە پرسیارکەرەکە پرسیاری لەبارەی باوەڕ و پایەکانی ئیمان کردبێت.

بۆیە زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی، گەر کەسێك هات و پرسیاری لەسەر چۆنییەتی موسڵمان بوون کرد، واجبە وەڵامی بدرێتەوە و بە زوویی فێربکرێت.

دانیشتنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر کورسی، بەڵگەیە بۆ ئەوەی خەڵکەکە گوێیان لە قسەکانی بێت و بیبینن.

پێ دەچێت، وتاری پێغەمبەر، وتاری هەینی نەبووبێت، بۆیە بەم شێوەیە دوور و درێژە پچراندوویەتی، لەوانەشە وتاری هەینی بووبێت و پچڕاندبێتی، یان ماوەی دابڕانەکە زۆر نەبوو بێت [٣].

**لەوانەیە پێغەمبەر ﷺ بە کردار وەڵامی پرسیاری دابێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی کەسەکە بە چاوی خۆی وەڵامەکە ببینێت.**

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لە بارەی کاتی نوێژی بەیانی لێکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو.

بۆ بەیانی، نوێژی بەیانی لەسەرەتای بەیانی کرد، پاشان بۆ رۆژی دواتر نوێژی بەیانی کەمێك لە کاتی خۆی دواخست، ئینجا فەرمووی: **"کوا ئەوەی پرسیاری لە کاتی نوێژی بەیانی دەکرد؟"**.

گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"لە نێوان ئەم دووکاتەدایە"**.

---

[١] فتح الباری (١/١٤٢).

[٢] موسلیم گێراوەتیەوە(٨٧٦).

[٣] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦/١٦٦).

**الباجي** دەڵێت: پێدەچێت بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامەکەی دواخستبێت، تاوەکو بە کردار ئەنجامی بدات، ئەمەش لە پێناو روونکردنەوەی زیاتر، چونکە ئەم رێگایە بۆ تێگەیشتن نزیکترە [1].

**وەڵامی پرسیاری ئافرەتانی دەدایەوە، تەنانەت لەو بابەتانەی شەرمیان دەکرد، سەرزەنشتی ئەوانەشی دەکرد، کە رێگریان لە پرسیارکردن لێ دەکردن:**

دایکی سەلەمە دەڵێت: دایکی سولەیم هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خوای میهرەبان شەرم لە راستی ناکات، ئایا ئافرەت لەکاتی بینینی خەو (شەیتانی) خۆشۆردنی لەسەر پێویستە؟

عائیشە فەرمووی: ئەی دایکی سولەیم،ماڵت ئاوابێ، ئافرەتانت شەرمەزار کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عائیشەی فەرموو: **"بەڵکو تۆ ماڵت ئاوا... بەڵێ کاتێك ئاوی بینی با خۆی بشوا"**.

دایکی سولەیم دەم و چاوی خۆی داپۆشی و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئافرەت ئەو خەوە دەبینێت؟

فەرمووی: **"بەڵێ، ماڵت ئاوا ئەی چۆن کورپەکەی پێی دەچێت"**.

شەرم کردن رێگر نییە لە داواکردنی راستییەکان، ئەو شەرمەی رێگرە لە داواکردنی زانست بە سوود نییە، بەڵام گەر شەرم کردنەکە لە روانگەی رێز و شکۆ بێت، ئەمە کارێکی باشە، وەك ئەوەی دایکی سولەیم کردی و دەم و چاوی داپۆشی [2].

هیچ شەرعێك شەرمکردنەکی نەهێناوە رێگر بێت لە فەرمانکردن بە چاکە و رێگری کردن لە خراپە و حوکمدان بە حەق و هەستان پێی [3].

**لەگەڵ ئەوەی وەڵامی پرسیاری ئافرەتانی دەدایەوە، شەرم رێگەی لێ نەدەگرت وەڵامیان نەداتەوە:**

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە ئافرەتێك لەبارەی خۆشۆردنی ئافرەتان لە بێ نوێژیدا پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، فەرمانی پێکرد چۆن خۆی بشوات، فەرمووی: **"پارچە قوماشێك [4] بە بۆنی میسك بگرە و خۆتی پێ پاك بکەرەوە"**.

---

[1] النسائي (٥٤٤) و احمد (١١٧٠٩) لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ گێڕاوەتیانەوە. ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (٢٤٩).

[2] شەرحی ابن بطال لە سەحیحی بوخاری (١/٢٢٣).

[3] المنتقی شرح الموطأ (٧/٢١٣).

[4] قوشامەکە: سوف یان لۆکە یان پێستە سوق لەسەرە، مەبەست لە بەکارهێنانی بۆنی خۆش بۆ نەهێشتنی بۆنی ناخۆشە، فتح الباری ١/٤١٦).

گوتی: چۆن خۆم پاك بکەمەوە؟

فەرمووی: **خۆتی پێ پاك بکەوە.**

گوتی: چۆن؟

فەرمووی: **" سبحان الله خۆتی پێ پاك بکەوە ئیدی"** جا لەشەرمان خۆیی دا پەنایەك.

عائیشە رضی الله عنها دەڵێت: بۆلای خۆم راکێشا، زانیم پێغەمبەر ﷺ مەبەستی چییە، پێم گوت: بەدوای شوێنی خوێنەکە دەچیت و پاکی دەکەیتەوە (١).

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- باشترە ئافرەت لە کاتی خۆشۆردنی لە بێنوێژیدا، هەندێك لە بۆنی خۆش یان میسك لەناو لۆکەیەك یان هاوشێوەی لەشوێنی خوێنەکە دابنێت.
- وتنی سُبحان الله لەکاتی سەرسام بووندا، واتە چۆن ئەم بابەتە ڕوونە، دەشاردرێتەوە کە تێگەیشتن لێی ئەوەندە پێویستی بە بیکردنەوە نییە.
- باشترە لەو بابەتانەی شەرمیان لێ دەکرێت، ئاماژە بەکاربهێندرێت.
- ئەمەش ڕێگەیەکی شەرعییە، کە کینایە بە کاربهێندرێت لەمەڕ عەورەت، تەنیا لە کاتی پێویست نەبێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَـٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ ﴾ النساء: ١٦

﴿ أُحِلَّ لَكُمۡ لَيۡلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمۡۚ ﴾ البقرة: ١٨٧ واتە: (لە شەوگاری ڕەمەزاندا تێکەڵ بوونتان لەگەڵ هاوسەرانتاندا حەڵاڵکراوە)

﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ﴾ البقرة: ٢٢٣ واتە(ژنانی هاوسەرتان کێڵگەنە بۆتان)

- بە تەنیا ئاماژەدان و هێماکردن بۆ ئەو بابەتانەی شەرمیان لێدەکرێت.
- دروستە ئافرەت لەو بابەتانەی شەرمیان لێ دەکات، پرسیار لە کەسی زانا بکات.
- دووبارە کردنەوەی وەڵام بۆ ئەوەی کەسی پرسیارکەر تێی بگات.
- ڕوون کردنەوەی وەڵامی زانا، گەر وەڵامەکە بۆ کەسی پرسیارکەر ئاشکرا نەبوو.
- لەو کاروبارانەی شەرمیان تێدایە، تەنیا ئاماژەکردن و وشەی ناڕاستەخۆ بەکار دەهێندرێت.

---

(١) بوخاری (٣١٤) و موسلیم (٣٣٢) گێراوەتیانەوە.

- ڕاڤەکردنی وتەی زانا بە ئامادەبوونی خۆی، بۆ کەسێك کە وەڵامەکەی لا ڕوون نییە، گەر زانی زانایەکە بەم ڕاڤەکردنە ڕازییە.
- قسە وەرگرتن لە کەسی باش بە ئامادەبوونی کەسی باشتر.
- ئەگەر شتێك بە موفتی نیشاندرا و پێی ڕازی بوو، تەنانەت گەر نەشیگوت "بەڵێ" هەر دروستە.
- مەرج نییە کەسی گوێگر، لە هەموو ئەوە تێبگات کە گوێی لێدەبێت.
- نەرمونیانی لەگەڵ فێرخواز، بیانوو هێنانەوە بۆ ئەو کەسەی تێ ناگات.
- پێویستە مرۆڤ عەیبەکانی داپۆشێت، گەرچی ئەم شتەش لەم کارانەبوو کە ئافرەت حەزی لێیەتی و لەسەری ڕاهاتووە، وەك بۆنخۆشکردن بۆ لابردنی بۆنی ناخۆش
- جوانی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ و شەرم و نەرمونیانی [1].

**بۆ ئەوەی ڕوون بێتەوە، بە شێوازی حەکیمانە نمونەی واقیعی بۆ کەسی پرسیارکەر دەهێنایەوە:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، منداڵێکی ڕەش پێستم بووە، منیشی نکوڵی لێ دەکەم.

فەرمووی: **"ئایا وشترت هەیە؟"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"ڕەنگەکانیان چییە؟"**.

گوتی: سوور.

فەرمووی: **"ئایا ڕەنگی ماشوبرنجی تێدایە [2]"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"لە کوێوە هاتووە؟ [3]"**.

گوتی: لەوانەیە لە یەکێك لە ڕەچەڵەکی گوازرابێتەوە [4].

فەرمووی: **" کوڕەکەشت هەر ئەوها یەکێك لە ڕەچەڵەکەکانی بۆ گوازرایەتەوە [5]"**.

---

[1] سەیری: فتح الباری (١/٤١٦)، شەرحی سنن ابی داود (٢/١١١)ی عەیینی بکە.

[2] وشەی (الاورق من الابل) بەکارهاتووە، مەبەستی لێی ڕەنگی سپی لەناو ڕەنگی ڕەش، یان دەگوترێت سپی و ڕەش وەکو دوکەڵی ڕوەکی ڕەمپ. لسان العرب (١٠/٣٧٦٩).

[3] واتە: ئەو ڕەنگە جیاوازەی لە کوێ هێناوە بۆ ئەوەی لێی جیاواز بێت، ئایا نێرەیەکی تر بووە، کە ڕەنگی جیاواز بووە، یان بەهۆیەکی تر بووە؟

[4] واتە: لەوانەیە ئەو ڕەنگە لە ڕەچەڵەکی پێشووتری هەبووبێت و بۆ خۆی ڕاکێشاوە.

[5] بوخاری (٥٣٠٩) و موسلیم (١٥٠٠) گێڕاوەتیانەوە.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەم پیاوە نەهاتووە بوختان بە خێزانەکەی بکات، بەڵکو هاتووە پرسیار لەبارەی حوکمی بکات، کە گومانی لا دروست کردووە، کاتێکیش نمونەی بۆ هێنراوەتەوە و تێکەیشتووە[1]".

**لە سوودەکانی فەرموودەکە:**

- پێشخستنی حوکمی سەرجێی نێوان پیاو و ئافرەت، لەبەرامبەر بوونی گومان، منداڵەکە دەدرێتە پاڵ باوکی، تەنانەت با رەنگی لەرەنگی باوکی نەچێت، **هەتا با باوکەکە** سپی بێت و منداڵەکەش ڕەش بێت.
- تەنیا بەهۆی جیاوازی ڕەنگ، ناکرێت منداڵ ڕەت بکرێتەوە.
- دەست گرتن بە رەچەڵەك.
- سەرزەنشتکردنی گومان بردنی خراپ.
- چەسپاندنی پێوانەکردن و بایەخدان بە بابەتی لەیەکچوون.
- نمونە هێنانەوە، پێچواندنی نەزانراو بە زانراو، ئەمەش بۆتێگەیاندنی کەسی پرسیارکەر[2].

## بەڵگەی بە قورئانی پیرۆز دەهێنایەوە:

ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نوێژم لە مزگەوت دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردم، وەڵامم نەدایەوە، پاشان گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، لەناو نوێژدا بووم.

فەرمووی: "ئەی خوای گەورە نافەرموێت ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ﴾ الأنفال: ٢٤ واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە بچن کاتێك بانگتان دەکات کە دەتانژێنێتەوە و ژیان بەخشە.

پاشان پێی فەرمووم: "**بەر لەوەی لە مزگەوت بچیتە دەرەوە، سورەتێکت فێر دەکەم، گەورەترین سورەتە لە قورئان**".

پاشان دەستی گرتم، کاتێك ویستی دەربچێت، پێم گوت: ئەی نەت فەرموو سورەتێکت فێر دەکەم گەورەترین سورەتە لە قورئان؟ فەرمووی: ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ الفاتحة: ٢، **ئەمە بریتیە لە(سبع المثاني) و ئەو قورئانە گەورەیە، کە بۆم دابەزیووە**[3]".

---

[1] فتح الباري (٩/٤٤٤).
[2] فتح الباري (٩/٤٤٤)، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/١٣٤).
[3] بوخاری گێراوەتیەوە(٤٤٧٤).

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوا گەورە دروستکراوەکانی دروستکرد، کاتێك تەواو بوو، رەحم هەڵسا و گوتی: ئێرە شوێنی پەناگرتنە لە پچڕانی پەیوەندی.**

**فەرمووی: بەڵێ، ئایا رازی نابی، هەر کەسێك تۆ بگەیەنێت، بیگەیەنم، هەر کەسێکیش تۆ بپچڕێنێت بیپچڕێنم؟ "**

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"ئەمەش بۆ تۆ"**.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی، گەر ویستان ئەوە بخوێننەوە ﴿ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴾ محمد: ٢٢-٢٣ [1] واتە: ئایا ئێوە بەتەمان ئەگەر لە غەزا پشت هەڵبکەن یاخود دەسەڵاتتان کەوتە دەست، تۆوی ئاژاوەو فەساد و تاوان لە زەویدا بچێنن و هەرچی پەیوەندی خزمایەتیش هەیە بیپچڕێنن و لە ناوی بەرن، ئەو جۆرە کەسانە ئەوانەن کە خوا نەفرینی لێ کردوون و کەڕی کردوون و کوێرایی هێناوە بەسەر چاویاندا.

## بۆ باوەڕپێهێنانی کەسی پرسیارکەر، بەڵگەی عەقڵی دەهێنایەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە،کە پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن کەسی بێ باوەڕ لەسەر روو حەشر دەکرێت؟

فەرمووی: **"هەر ئەو زاتەی وای لێکردووە لە دونیا لەسەر دوو پێ بڕوات، تواناشی هەیە لە رۆژی دوایی وای لێ بکات لەسەر روو بڕوات"**.

قەتادە گوتی: بەڵێ سوێند بە عزەتی پەروەردگارمان [2].

الحافظ دەڵێت: حیکمەت لە حەشکردنی بێ باوەڕ لەسەر روو، سزایەکە بەرامبەر سوژدە نەبردنی لە دونیادا بۆ پەروەردگار، بۆیە لە رۆژی دوایی لەسەر روو رادەکێشرێت، ئەمەش وەك سوکردنێك، بەجۆرێك دەم و چاوی شوێنی دەست و قاچەکانی گرتۆتەوە لە پاراستنی شتە ئازار پێگەنەرەکان [3].

---

[1] بوخاری (٥٩٨٧) و موسلیم (٢٥٥٤) گێراوەتیانەوە.

[2] بوخاری (٤٧٦٠) و موسلیم (٢٨٠٦) گێراوەتیانەوە.

[3] فتح الباری (٣٨٣/١١).

ئیبن عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە،کە ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: من دایکم مردووە، مانگێك ڕۆژووگرتنی لەسەرە.

فەرمووی: **"ئایا ئەگەر قەرزی لەسەربایە بۆت دەدایەوە؟"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"قەرزی خودا لەهەموو قەرزەکان لە پێشترە بۆ دانەوەی[1]"**.

عەتائی کوڕی یەسار ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا روخسەتی چوونە ژوورە لە دایکم وەربگرم؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

پیاوەکە گوتی: من لەماڵەوە لە گەڵیدام.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"رووخسەتی لێ وەربگرە"**.

پیاوەکە گوتی: ئاخر من خزمەتکاریمە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"روخسەتی لێ وەربگرە، حەزەدەکەی بە رووتی بیبنیت؟"**.

گوتی: نەخێر

فەرمووی: **"دەی کەواتە روخسەتی لێ وەربگرە[2]"**.

الباجی دەڵێت: پیاو دەبێ رووخسەتی چوونەژوورە لە دایك و مەحرەمەکانی وەربگرێت، لە هەموو ئەوانەی کە بۆی جائیز نییە سەیری عەورەتیان بکات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەو کەسەی فەرموو، کە پرسیاری روخسەت وەرگرتن بۆ چوونە لای دایکی لێ کردبوو، پێی فەرموو: "دەتەوێت بە رووتی ببینیت؟".... واتای وایە –خوا باشتر دەزانێت– گەر روخستەتی لێ وەرنەگیرێت، کتوپڕ دەچێتە ژوورە و لەوانەیە بە رووتی ببینێت، بەڵام خێزان کە دەتوانێت سەیری عەورەتی بکات، بۆی هەیە بێ روخسەت وەرگرتن بچێتە ژوورەوە[3].

ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گەنجێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا رووخستم بدە زینا بکەم.. خەڵکەکە بۆلای هاتن و سەرزەنشتیان کرد، پێیان گوت: بێ دەنگ بە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"نزیك بەرەوە"**، لێی نزیك بوویەوە.

---

[1] بوخاری (١٩٥٣) و موسلیم (١١٤٨) گێراوەتیانەوە.

[2] مالیك لە (الموطأ) لە عطا دەگێڕێتەوە، ابن عبدالبر دەڵێت: "سەحیحە". التمهید (٢٢٩/١٦).

[3] المنتقی شرح الموطأ (٢٨٤/٧).

فەرمووی: **"ئایا ئەمەت بۆ دایکت پێ خۆشە؟ "**.

گوتی: نەخێر سوێند بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ دایکیان پێیان خۆش نییە"**،... پێی فەرموو: **"ئەی بۆ کچەکەت پێت خۆشە؟"**.

گوتی: نەخێر سوێند بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ کچەکانیان پێیان خۆش نییە"**.. پێی فەرموو: **"ئەی بۆ خوشکت؟"**.

گوتی: نەخێر سوێند بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ خوشکەکانیان پێیان خۆش نییە"**.. پێی فەرموو: **"ئەی بۆ پورت؟"**.

گوتی: نەخێر سوێند بەخوا، خوا بمکاتە قوربانت.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ پورەکانیان پێیان خۆش نییە"**.

پاشان دەستی خستە سەری و فەرمووی: **"ئەی خوای پەروەردگار لە گوناهەکانی خۆش ببە، دڵی پاك بکەرەوە، داوێنی بپارێزە"**، لە دوای ئەمە ئەو گەنجە ئاوڕی بۆ هیچ شتێك نەدەدایەوە [1].

**ئەو پرسیارانەی پێ خۆش نەبوو کە سوودیان نەبوو، هەروەها ڕقی لە زیادەڕۆیی پرسیارکردن دەبوویەوە:**

ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت لەبارەی ئەو شتانەی پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆشبوو، پرسیاری لێکرا، کاتێك زۆر قسەی کرد، تورەبوو، پاشان بە خەڵکی فەرموو: **"هەر چی پێتان خۆشە پرسیارم لێ بکەن، هەر چی پرسیارم لێ بکەن بۆتانی روون دەکەمەوە"**.

پیاوێك گوتی: باوکم کێیە [2]؟

فەرمووی: **"باوکت حوزافەیە"**.

یەکێکی تر هەڵساو گوتی: ئەی باوکی من کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: **"باوکت سالمە، خزمەتکاری شەیبەیە"**.

---

[1] ئەحمەد گێراوەتیەوە(٢١٧٠٨)، ئەلبانی لە سەحیحەکەیدا بە سەحیحی داناوە (٣٧٠).

[2] گەر کەسێك ناکۆکییەکی هەبایە، بەناوی کەسێکی تر جگە لەباوکی بانگ دەکرا.

دوای روون بوونەوەی راستییەکان، ئەنەس دەڵێت: تەماشای راست و چەپم دەکرد، دەبینم هەموو پیاوێك سەری خۆی خستۆتە ناو کراسەکەی و دەگرییێت، کاتێك عومەر ئەوەی بینی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە تەوبە دەکەین لەو هەموو پرسیارەی کردمان و بۆلای خوای پەروەردگار دەگەڕێینەوە [(١)].

لە گێڕانەوەی بوخاریدا (٩٣) دا هاتووە، کە عومەر چۆکی دادا و گوتی: رازین پەروەردگار خوامان بێت، ئیسلام دینمان بێت، موحەممەد پێغەمبەرمان بێت، پاشان بێ دەنگ بوون.

قەتادە ئەم فەرموودە لەگەڵ ئەم ئایەتە باس دەکات ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴾ المائدة: ١٠١

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار مەکەن لە هەندێك شت، ئەگەر بۆتان ئاشکرا بکرێت سەغڵەتتان دەکات.

موغیرەی کوڕی شوعبە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: **"خوای گەورە سێ شتی بۆ ئێوە پێ ناخۆشە: قسەوقسەلۆك، بەزایەدانی پارە و سامان، زۆر پرسیارکردن"**[(٢)].

ابن عبدالبر دەڵێت: زۆربەی زانایان پێیان وایە مەبەست لەو زۆر پرسیارکردنە لە بارەی دۆسیەی کۆمەڵایەتی و لە دایکبوونەکان و هەڵەکانە"[(٣)].

ئەبو هورەیرە ؓ دەگێڕێتەوە ،کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت **"لە رەوشتی موسڵمانانەی مرۆڤ، وازهێنانە لەو شتەی پەیوەندی بەوەوە نییە"**.

**لە وەڵامدانەوەدا دەنگی بەرزدەکردەوە بۆ ئەوەی کەسی پرسیارکەر گوێی لێبێت:**

سەفوانی کوڕی عەسالی ئەلمورادی ؓ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لە گەشتێکدا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، لەخزمەتی دابووین کاتێك عەرەبێکی دەشتەکی بە دەنگێکی گەورە هاواری کرد: ئەی موحەممەد.

پێغەمبەری خوا ﷺ وەك دەنگی ئەو وەڵامی دایەوە **"ها ئەوەتا"**.

پێمان گوت: چیتە تۆ، دەنگت نزم کەوە، تۆ لای پێغەمبەری خوای ﷺ و رێگریت لەمە لێکراوە.

گوتی: سوێند بەخوا، دەنگم نزم ناکەمەوە.

---

(١) بوخاری (٩٢) و موسلیم (٢٣٦٠) گێراوەتیانەوە.

(٢) بوخاری (١٤٧٧) و موسلیم (٥٩٣) گێراوەتیانەوە.

(٣) فتح الباری (١٣/٢٧٠)

گوتی: مرۆڤ حەزی لێیە بکاتە خەڵکی خۆی و لەگەڵیاندابێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"مرۆڤ رۆژی دوایی لەگەڵ ئەوانەی خۆشی دەوێت حەشر دەکرێت[1]"**.

## خۆی لە فەتوای خەڵەتێنەر دەپاراست:

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە ، کە لە رۆژی فەتح کردنی مەککە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: **"خوا و پێغەمبەرەکەی، بت و فرۆشتنی عارەق و خواردنی گۆشتی مردوو و بەرازیان، حەرام کردووە"**.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی لەبارەی بەزی مردوو؟ کەشتییەکانی پێ بۆیە دەکرێت، پێستەکانی پێ چەور دەکرێت و خەڵك چرای پێ دادەگیرسێنێت.

فەرمووی: **"نەخێر، ئەوە حەرامە"**.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا فەرمووی: **"نەفرەتی خوا لە یەهود، کاتێك خوای گەورە بەزی لێ حەرام کردن، تواندیانەوە و پاشان فرۆشتیان و پارەکەیان دەخوارد[2]"**.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو هەڵەی یەهود کردی، ئێوە نەیکەن، بە بچوکترین فێڵ، حەرامەکانی خوای گەورەیان حەڵاڵ دەکرد[3]"**.

خوای پەروەردگار لە کتێبە پیرۆزەکەیدا لەبارەی فێڵکردن لە شەرع هۆشداریمان پێ دەدات، چیرۆکی نەوەی ئیسرائیلمان بۆ دەگێڕێتەوە، ﴿ وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ إِذْ يَعْدُونَ فِى ٱلسَّبْتِ إِذْ تَأْتِيهِمْ حِيتَانُهُمْ يَوْمَ سَبْتِهِمْ شُرَّعًا وَيَوْمَ لَا يَسْبِتُونَ لَا تَأْتِيهِمْ كَذَٰلِكَ نَبْلُوهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٣﴾ وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِّنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا ٱللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا۟ مَعْذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُوا۟ مَا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦٓ أَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذْنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ بِعَذَابٍۭ بَـِٔيسٍۭ بِمَا كَانُوا۟ يَفْسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴾ الأعراف: ١٦٣-١٦٦

---

[1] ترمذي گێڕاوەتیەوە (٣٥٣٥)، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ١٣١٨) بە (حسن صحيح)ی داناوە.

[2] بوخاری (٢٢٣٦) و موسلیم (١٥٨١) گێڕاوەتیانەوە.

[3] ابن بطة لە (إبطال الحيل) گێڕاوەتیەوە(٤٧/١). ئیبن تەیمیە لە (مجموع الفتاوى) (٢٩/٢٩). ئیبن قەیم لە حاشییەی سونەنی ئەبو داود (٢٤٤/٩) بە حەسەنیان داناوە، ابن کپیر لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت ئیسنادەکەی "جید"ە. ئەلبانی لەو بارەیەدا قسەی جیاوازە لە "الضعيفة"دا دەڵێت: وەك الحافڤ و ابن کپیر لە تەفسیرەیەکدا دەڵێت ئیسنادەکەی (جيده)". (٦٠٨/١)، لە کتێبی (غاية المرام) بە زەعیفی داناوە (١١).

واتە: پرسیار لە جووەکان بکە دەربارەی ئەو شارەی کە لەسەر قەراغی دەریا بوو، لەکاتێکدا ئەوان لە رۆژی شەممەدا سنووریان دەشکاند (کە بڕیار بوو رۆژی شەممە تەرخان بێت تەنها بۆ خواپەرستی) کاتێك لە رۆژی شەممەکەیاندا ماسیە گەورەکانیان بەسەر ئاوەوە بۆ دەهاتن، ئەو رۆژەش کە شەممەیان نەدەبوو ماسیەکانیان بۆ نە دەهات، ئا بەو شێوەیە بەهۆی یاخی بوون و لادانیانەوە تاقیمان کردنەوە (١٦٣) دیارە کە هەندێك لەو جولەکانە فەرمانی خوایان شکاندووە، بەهەر فێڵێك بووە راوی خۆیان کردوە، بۆیە دەستەیەك لە پیاو چاکانیان کەوتوونەتە ئامۆژگاری کردنی دەست درێژکاران) کەچی کاتێکیش دەستەیەك لەوان وتیان: بۆچی ئامۆژگاری کەسانێك دەکەن کە خوا هەر لەناویەریانە، یان سزادەریانە بەسزایەکی توند(لە وەڵامیاندا) وتیان: ئاخر بابەلگەیەکی دڵسۆزی و غەمخۆری بێت بۆ لای پەروەردگارتان و بەو هیوایە ئەوان لە خوا بترسن (١٦٤) جا کاتێك فەرامۆشیان کرد ئەوەی ئامۆژگاریان پێی کرابوو، ئێمەش ئەوانەی کە قەدەغەی خراپەیان دەکرد رزگارمان کردن و ئەوانەش کە ستەمیان کردو هەوڵیاندا بۆ کردنی ئەوکارە ناڕەوایە، بەسزایەکی سەخت گیرۆدەمان کردن، بەهۆی ئەوەی لە سنوور دەرچوو بوون (١٦٥) جا کاتێك هەر سەرکەشیان کرد لەوەی کە قەدەغە کرابوو لێیان، ئێمەش پێمان وتن: ببنە کۆمەڵە مەیمونێکی سووك و ریسواو دوور لە رەحمی خوا (١٦٦).

ابن کثیر دەڵێت: ئەوان قەومێك بوون، فێڵیان کرد لە سنووربەزاندنی حەرامکراوەکانی خوا، دەستیان گرت بە هۆکارە دیارەکان، کە لە بنەڕەتدا واتای دەستگرتن بوو بە حەرام[1].

سەعدی دەڵێت: لە راوکردندا فێڵیان کرد، چاڵیان هەڵدەکەناند و تۆڕیان لەناو دادەنا، کاتێك رۆژی شەممە دەهات، ماسییەکان دەکەوتنە ناو چاڵ و تۆڕەکە، ئەو رۆژە دەستیان بۆیان نەدەبرد، کە رۆژی یەکشەممە دەهات دەیان برد[2].

## ئەو پرسیارانەی پێ ناخۆش بوون، کە لەبارەی رووداوێك دەکران روویان نەدابوو:

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت عوەیمری عەجلانی هاتە لای عاسمی کوڕی عودەی ئەنساری پێی گوت: ئەی عاسم گەر کەسێك پیاوێکی لەلای خێزانەکەی بینی، ئایا دەیکوژێت، دەیکوژنەوە، یان چی دەکات؟ ئەی عاسم ئەم پرسیارەم بۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکە.

---

[1] تەفسیری ابن کثیر (٣/٤٩٣).
[2] تەفسیری سەعدی (١/٣٠٦).

عاسم پرسیاری ئەمەی لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ ئەم پرسیارانەی پێی ناخۆش بوو و رەخنەی لەسەر ئەمە لێگرت.

هەتا عاسم ئەوەی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ لێبوو زۆر لەلای ناخۆش بوو.
کاتێك گەڕایەوە ناو کەس و کاری، عوەیمر هاتە لای و گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چی پێگوتی؟

عاسم گوتی: هیچ شتێکی باشت بۆ من نەهێناوم، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی تۆ پرسیارت لێکردبوو پێی ناخۆش بوو.

عوەیمر گوتی: نەخێر سوێند بەخوا، وازناهێنم تا خۆم پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەم.

عوەیمر هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەناو خەڵکدا بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا گەر کەسێك پیاوێکی لەلای خێزانەکەی بینی، ئەگەر دەیکوژێت، دەیکوژنەوە، یان چی بکات[1]؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"لەبارەی تۆ و خێزانەکەت، قورئان دابەزیووە، بڕۆ بیهێنە"**، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی نەفرین خواردن (ملاعنە)ی پێکردن(لە مزگەوت)، بەو شێوەی خوای پەروەردگار لە قورئاندا ناوی لێناوە.

پاشان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا گەر بیهێڵمەوە، ستەمم لێکردووە (لە گێڕاوەیەکی تردا: درۆم لەگەڵ کردووە)، لێی جیابویەوەو (سێ بە سێ تەڵاقیدا)، بەر لەوەی پێغەمبەر فەرمانی پێ بکات

کوڕی شیهاب دەڵێت: دوای ڕووداوی نێوان ئەو دووانە، جیابوونەوە لە نێوان ژن و مێردی نەفرینکەر بوو بە سوننەت، ئافرەتەکە دووگیان بوو، کوڕەکەی بۆ دایکی بانگ دەکرا، پاشان سوننەت وابوو، کە دایکەکە میراتی لێ دەگرت و ئەویش میراتی لە دایکی دەگرت وەك ئەوەی خوای پەروەردگار بۆی داناوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"چاوەڕێ بکە، گەر ئافرەتەکە منداڵێکی رەش و چاوڕەش و ران گەورە و پڕ گۆشتی بوو، ئەوا عوەیمر لەبەرامبەریدا راستی گوتووە.**

---

[1] لە گێڕانەوەی موسلیم دا هاتووە: ئایا گەر کەسێك پیاوێکی لای خێزانەکەی بینی، گەر قسە بکات، ئەوا قسەی لەبارەی کارێکی گەورە کردووە، گەر بێ دەنگ بێت، ئەوا لەسەر ئەوە بێ دەنگ دەبێت.
هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا هاتووە: گەر قسە بکات، جەڵدی لێ دەدەن، گەر بکوژێت، دەیکوژنەوە، گە ر بێ دەنگ بێت، لەسەر توڕەیی و رەق بێ دەنگ بووە.
هەر لە گێڕانەوەی موسلیمدا: گوتی: ئەوەی پرسیارم لێکردووی، بەسەر خۆمدا هاتووە.

**گەر منداڵێکی سور و سپی بوو، کورت و بچوك بوو، ئەوا عوەیمر لەبەرامبەریدا درۆی کردووە"**

منداڵەکە لە دایك بوو، بەو شێوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی کرد لە راستگۆیی عوەیمر، پاشان منداڵەکە بۆ دایکی گەڕایەوە [1].

نەوەوی دەڵێت: مەبەست لە (پێغەمبەر ئەمەی پێ ناخۆش بوو و رەخنەی لێگرت)، باش نییە پرسیار لەبارەی شتێك بکرێت کە پێویست نەکات، یاخود زیان بە ئابڕووی موسڵمانێکی پیاو یان ئافرەت بگەیێنێت، یان بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندەی ئابڕوچوونێك.

بەڵام گەر بابەتەکە لەوانەبوو پێویستی پێی هەبوو لەکاروباری دیندا و بەڕاستی روویدابوو، ئەو کات هیچ کەراهەتێکی تێدا نییە.

موسڵمانان پرسیاریان لەبارەی حوکمی رووداوێك لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، ئەویش وەڵامی دەدانەوە.

پرسیاری عاسمیش کە کردی، لەبارە چیرۆکێك بوو، رووی نەدابوو و هیچ پێویستیشی پێی نەبوو، جۆرێکیش لە ناشیرینی بۆ موسڵمانی ئافرەت و پیاوی تێدابوو، هەروەها زمان درێژی جوولەکەکان و دووڕووەکانیش بۆ ئەوەی قسە لەسەر ئابڕوی موسڵمانان و ئیسلامدا بکەن [2].

## پیاوچاکانی سەلەفیش پەیڕەوی ئەو سوننەتەی پێغەمبەریان کردووە:

مەسروق دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەبارەی بابەتێك، پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب کرد.

پێی گوتم: روویداوە؟

گوتم: نەخێر.

گوتی: بوارم پێ بدە، تاوەکو روودەدات [3].

خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابت دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەبارەی شتێك پرسیار لە زەیدی کوڕی ثابت کرا گوتی: روویداوە؟

گوترا: نەخێر. گوتی: لێی گەڕێ تاوەکو روودەدا [4]؟

---

[1] بوخاری (٤٧٤٥) و موسلیم (١٤٩٢) گێراوەتیانەوە

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/١٢٠).

[3] ابن بطة لە (الابانة ٣١٦) ابن عبدالبر لە جامع بیان العلم وفضله (٢٠٥٧). گێراوەتیەوە.

[4] ابن بطة لە (الابانة ٣١٨) گێراوەتیەوە.

**بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارانەی دەدایەوە، کە پێشبینی رووداني دەکردن، یان چاوەڕێی دەکرد، چونکە وەکو واقیع وابوون:**

کە پێی ناخۆشبووە پرسیاری لەبارەی شتێك لێبکرێت، کە روونەداوە، چونکە جۆرێك بووە لە زۆری لە خۆکردن، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کەسانە نەبووە کە شت هەڵبەستێت و زۆری لە خۆی بکات، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴾ ص: ٨٦ واتە: تۆش ئەی پێغەمبەر بەو خەڵکە بڵێ: من هیچ پاداشت و خەڵاتێکم لە ئێوە ناوێت، من لەو کەسانەش نیم کە شت هەڵبەستم و زۆر لە خۆ بکەم.

بەڵام ئەوەی پێشبینی دەکرێ رووبدات، پرسیارکردن لەبارەیەوە گرنگە، ئەمەش بۆ ئەوەی هەڵسوکەوتی شەرع بزانین لە کاتی روودانیدا.

حوزەیفەی کوڕی یەمان ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: خەڵك پرسیاریان لەبارەی چاکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، من پرسیاری خراپەم لێدەکرد، لەترسی ئەوەی نەوەك توشم بێت.

گوتم :ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە پێشتر لە نەفامی و خراپەدا بووین، خوای گەورە ئەم خێرەی بۆ ناردین، ئایا دوای ئەم باشییە خراپە هەیە؟

فەرمووی: **"بەڵێ".**

گوتم: ئایا دوای ئەم خراپەیەش باش هەیە؟

فەرمووی: **"بەڵێ، بەڵام دوکەڵاوییە".**

گوتم: دوکەڵەکەی چییە؟

فەرمووی: **"خەڵکانێکن دەستیان بە غەیری سوننەتی منەوە گرتووە، رێگایەکەی تریان گرتووە، کردەوەکانیان دەناسی".**

گوتم: ئایا لەدوای ئەم باشییە، خراپە هەیە؟

فەرمووی **"بەڵێ، بانگخوازێکن لەبەر دەرگای دۆزەخ وەستاون، هەرکەسێك وەڵامیان بداتەوە فرێی دەدەنە ناوی".**

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانەمان بۆ وەسف بکە.

فەرمووی: **"بەڵێ، ئەوان خەڵکانێکن لە ئێمەن، بە زمانی ئێمەش قسە دەکەن".**

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چی بکەم گەر ئەمەم بینی؟

فەرمووی: **"دەست بە کۆمەڵی موسڵمانان و پێشەواکەی بگرە".**

گوتم: ئەی ئەگەر نە کۆمەڵیان هەبوو نە پێشەوا؟

فەرمووی: **"واز لەو کۆمەڵانە هەموو بهێنە، سەرباری قورسی و توندی زەمانە، لەسەر ئەو ڕێبازە بمێنەوە تا مردن دەتگاتێ"**[1].

رافعی کوڕی خدیج ﷺ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە بەیانی دەگەینە دوژمن، هیچ چەقوشمان پێ نییە؟ چی بکەین بۆ سەربڕینی ئاژەڵ؟

فەرمووی: **"پەلە بکە و نیشانم بدە، هەر شتێك خوێنی لێهێنا و ناوی خوای لەسەر گوترا ئەوا بیخۆ، بەڵام بە نینۆك و ددان نا، پێت بڵێم بۆ چی؟ ددان ئێسکە، نینۆکیش چەقۆی حەبەشییەکانە[2]"**.

**هەواڵی ڕوودانی هەندێك سەرپێچی بە هاوەڵانی دەدا، بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەن و ئەویش فێری دەکردن کە چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکەن:**

ئەبو زەڕی غیفاری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم **"چی دەکەی، گەر سەرکردەکانت نوێژیان لە کاتی خۆی دوادەخست، یان نوێژیان لە کاتی خۆیدا دەمراند؟"**.

گوتم: فەرمانی چیم پێ دەکەی؟

فەرمووی: **"نوێژەکانت لە کاتی خۆیدا بکە، ئەگەر گەیشتیە ئەوانیش لەگەڵیان نوێژ بکە، بۆتۆ دەبێتە سوننەت"**[3].

پێشەوا نەوەوی دەفەرموێت: واتای (نوێژەکانیان دەمراند) نوێژەکانیان دوادەخست، وەکو ئەو مردووەیان لێ دەکرد کە گیانی دەرچووە.

مەبەستیش لە دواخستنی، واتە لە کاتی هەڵبژێدراوی، نەوەك لە هەموو کاتەکە، چونکە ئەوەی لە سەرکردەکانی پێشوو و داهاتوو گوازراوەتەوە، دواخستنە لە کاتی هەڵبژێدراوی، پێویستە ئەم هەواڵانە واقیع چۆنە ئەوها هەڵبگیرێن[4].

### گەر پرسیارێکی لێکرابا زانیاری نەبایە، وەڵامی کەسەکەی نەدەدایەوە:

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر بە پێیان هاتنە سەردانم،

---

[1] بوخاری (٣٦٠٦) و موسلیم (١٨٤٧) گێراوەتیانەوە.

[2] بوخاری (٢٤٨٨) و موسلیم (١٩٦٨) گێراوەتیانەوە.

[3] موسلیم (٦٤٨) گێراوەتیەوە.

[4] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤٧/٥).

لــەهۆش خــۆم چــووم، پاشــان دەســتنوێژێکی شوشــت و ئــاوی دەســتنوێژەکەی بەسەرداکردم.

بە ئاگاهاتمەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ماڵەکەم دابەش بکەم؟ من چەند خوشکێکم هەیە.

هیچ وەڵامی نەدامەوە، پاشان چووە دەرەوە و جێی هێشتم.

تاوەکو ئایەتی میرات دابەزی ﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴾ النساء: ١٧٦ [١] واتە: "ئەی موحەممەد ﷺ داوای فتوات لێدەکەن دەربارەی (کلالە) کە بریتییە: لە کەسێك باوك و نەوەی نەبێت، تۆش بڵێ: خوا وەڵامتان دەداتەوە لەو بارەیەوە، ئەگەر کەسێك (پیاوێك) وەفاتی کرد و منداڵی نەبوو، هەر تەنها خوشکێکی هەبوو ئەوە نیوەی سامانەکەی بۆ ئەوە (نیوەکەی تریشی دەخرێتە دارایی گشتییەوە ئەگەر هەبێت و ئەگەر نەبوو لە بەرژەوەندیەکی گشتیدا بەکاردەهێنرێت، بەڵام ئەگەر مردووەکە ئافرەت بوو) ئەوا براکەی هەموو میراتیەکەی دەبات، ئەگەر ئافرەتەکە منداڵی لە دوا بەجێ نەمابوو، (خۆ ئەگەر پیاوە مردووەکە) دوو خوشکی لە دوا بەجێ مابوو، ئەوە دووبەش لە سێ بەشی ئەوەی بەجێی هێشتووە بۆ ئەوان دەبێت، خۆ ئەگەر میراتگران پیاوان و ئافرەتان بوون هەموویشیان لە خوشك و برا پێك هاتبوون ئەوە بۆ نێرینەیەکیان ئەندازەی بەشی دوو مێینە هەیە، خوای گەورە ئەم شتانەتان بۆ روون دەکاتەوە نەوەکو سەرگەردان ببن، خوای گەورەش بە هەموو شتێك زانایە."

الكلالة: ئەو مردووەی منداڵ و باوکی نییە میراتی لێ بگرن، ئەمەش قسەی تێکڕای زانایانی زمانە.

گوتراوە: تەنیا منداڵی نییە.

دەشگوترێ: ئەو کەسەیە کە دایك و باوك میراتی لێ ناگرن [٢].

---

[١] بوخاری (١٩٤) و موسلیم (١٦١٦) گێڕاوەتیانەوە.

[٢] عون المعبود (٦٧/٨).

بوخاری رحمه الله، بەشێکی تایبەت کردووە بەم فەرموودەیە بەناوی: (ئەو پرسیارەی لە پێغەمبەر ﷺ دەکرا، هێشتا وەحی دانەبەزیبوو، دەیفەرموو **"نازانم"** یاخود وەڵامی نەدەدایەوە تاوەکو وەحی دادەبەزی).

**لەوانەیە پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدانەوە بێ دەنگ بوو بێت، وەك چاوەڕوانی دابەزینی وەحی:**

صفوانی کوڕی یەعلا لە باوکییەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا بووین، پیاوێك لە (جەعرانە)وە هاتە خزمەتی، جوببەیەکی لەبەربوو، شوێنەواری خەلوقی [1] لەسەر بوو.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئیحرامم بە عومرە بەستووە، لە عومرەکەم فەرمانی چیم پێ دەکەی ؟

بێ دەنگ بوو و نەگەڕایەوە سەری، خوای گەورە وەحی دابەزاندە سەر پێغەمبەر ﷺ، هەر کاتێك وەحی دابەزیبایە سەری، عومەر دایدەپۆشی.

یەعلا دەڵێت: حەزم لێ بوو لە کاتی دابەزینی وەحی، پێغەمبەری خوا ﷺ ببینم.

عومەر فەرمووی: وەرە، حەزت لێیە پێغبەمبەری خوا ﷺ ببینی لە کاتی دابەزینی وەحی لەسەری.

گوتم: بەڵێ.

عومەر لایەکی کراسەکەی لابرد، سەیرم کرد، جۆرە دەنگیکێ لێوە دەهات [2].

کاتێك تەواو بوو فەرمووی **"کوا ئەو کەسەی پرسیاری لەبارەی عەمرە کرد؟ جوببەکەت داکەنە، شوێنەواری بۆنەکەش بشۆ، وەك چۆن حەج دەکەی، بەو شێوەیەش عومرەکەت بکە"** [3].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- بەڵگەیە بۆ ئەو ڕێسا دیارەی، کە دەڵێت: دادوەر یان زانا کاتێك حوکمی بابەتێکی نەزانی، با وەڵام نەداتەوە، تا فێر دەبێ.
- حەرامبوونی بۆن لەخۆدان بۆ کەسی عومرەکار لەسەرەتا تا کۆتایی.
- لەبەرکردنی جلوبەرگ و بۆن لەخۆدان وەك چۆن لە حەج حەرامە، لە عومرەشدا حەرامە.

---

[3] خەلوق بۆنێکی خۆشە زەعفەرانی لەگەڵ تێکەڵ دەکرێت.

[2] دەنگی کەسێکی نوستووە وەك ئەوەی قسە لەگەڵ خۆی بکات.

[3] بوخاری (١٧٨٩) و موسلیم (١١٨٠) گێراوەتیانەوە.

- کەسێك بۆنی لە خۆدابوو، ئینجا یان بە نەزانین یان بە لەبیرچوونەوە بێت، هەر کاتێك زانی پێویستە لای ببات.
- هەر کەسێك بە نەزانین یان بە لەبیرچوونەوە بۆنی لەخۆدابێت، کەفارەتی لەسەر نییە.
- ئەو حوکمانەی لە قورئان دانین، وەحی نین[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرى کوڕی عاص دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێکی دەشتەکی وشکی چاوقایم، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کۆچکردن بۆلای تۆ چۆنە: لە هەر لە شوێنی بێت، یان بۆ زەوییەکی دیاریکراو؟ یان بۆ قەومێکی تایبەت، یان گەر مردی دەپچڕێ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان فەرمووی: **"کوا ئەو کەسەی پرسیاری لەبارەی کۆچکردنەوە کرد؟"**.

گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا:

فەرمووی: **"گەر نوێژت کرد و زەکاتتدا، ئەوە تۆ کۆچەری، تەنانەت گەر لە حەزرەمەوتیش بمری"**[2].

پاشان پیاوێك هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی لەبارەی جل و بەرگی خەڵکی بەهەشت، ئایا دەچندرێت، یان لە بەرهەمی بەهەشت لێدەکرێتەوە؟

خەڵکەکە لە پرسیاری دەشتەکییەکە سەریان سوڕما.

**فەرمووی: "بۆچی پێتان سەیرە، پیاوێکی نەزان پرسیار لە زانایەك بکات؟"**.

کەمێك بێ دەنگ بوو، پاشان فەرمووی : **"کوا ئەو کەسەی پرسیاری لەبارەی جل و بەرگی بەهەشت دەکرد؟"**.

گوتی: منم.

فەرموو: **"بەڵکو لە بەروبوومی بەهەشت لێدەکرێتەوە و دروست دەکرێت"**.

### هەندێك جار، کەسی پرسیارکەری بۆ شتێکی بە سوودتر ئاراستە دەکرد:

وەڵامی دایەوە : **"هاوار بۆت، چیت بۆ ئامادەکردووە؟"** پێشووتر ئاماژە بەو فەرموودەیە کراوە.

### پێغەمبەر ﷺ رازی دەبوو، کەسی پرسیارکەر چەند جارێك سەردانی بکاتەوە:

خەولەی کچی ثعلبة رضي الله عنها دەگێڕێتەوە و دەڵێت: سوێند بەخوا لەسەر من و ئەوسی کوڕی صامت خوای پەروەردەگار ﷻ سەرەتای سوڕەتی موجادەلەی دابەزاند.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧٨/٨).
[2] مەبەست لێی زەوی یەمامەیە.

دەڵێت من لای هاوسەرەکەم بووم، ئەو پیاوێکی پیری خراپ بوو. ڕۆژێکیان هاتەژوورەوە، منیش بۆ شتێك چوومە لای، توڕەبوو گوتی: تۆ بۆ من وەك پشتی دایکم وای.

دەڵێت، پاشان ڕۆیشت بۆ لای قەومەکەی، دوای کەمێك هاتەوە ژوورەوە، ئەو جارەی منی دەویست.

دەڵێت، منیش پێم گوت: نەخێر سوێند بەو کەسەی نەفسی خەولەی بەدەستە، تۆ بۆ من ناشێیت، ئەوەی گوتت گوتت، تا خوا و پێغەمبەرەکەی حوکم لەنێوانماندا نەکەن.

دەڵێت: داوای لێکردم، منیش ڕەتم کردەوە، بەسەریدا زاڵبووم، وەك چۆن ژنێك بەسەر پیاوێکی بەساڵاچووی بێ توانا زاڵ دەبێت و لەخۆمم دوورخستەوە.

دەڵێت: پاشان چوومە لای هاوسێکانم، کراسێکم لێ وەرگرتن، دواتر چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای دانیشتم، ئەوەی لە مێردەکەم توشی بووم، بۆم گێڕایەوە، سکاڵای هەڵسوکەوتی خراپییەکەیم لای پێغەمبەری ﷺ کرد.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی خەولە، ئامۆزاکەت پیاوێکی پیری گەورەیە، لەبارەی ئەوەوە لە خوا بترسە".**

دەڵێت، سوێند بەخوا شوێنەکەم جێنەهێشت تا قورئان لەبارەمەوە دانەبەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ حالی نیگەران بوو، پاشان حالەتەکەی لەسەر ڕۆیشت، فەرمووی: **"ئەی خەولە، سوێند بەخوا، خوای پەروەردگار لەبارەی تۆ و هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاند"**، پاشان بەسەریدا خوێندمەوە ﴿ قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِى تُجَٰدِلُكَ فِى زَوْجِهَا وَتَشْتَكِىٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴾ تا دەگاتە ﴿ وَلِلْكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ المجادلة:١-٤ واتە (ئەی موحەممەد ﷺ بێگومان خوا وتووێژی ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات بیستی و وەریگرت دەربارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆیشی بۆلای خوا دەبات، خوایش گوێی لە گفتوگۆکەتان بوو، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم **"فەرمانی پێ بکە، با بەندەیەك ئازاد بکات"**

دەڵێت، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندەی نییە بەندەی پێ ئازاد بکات.

فەرمووی: **"با دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێت".**

دەڵێت، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بەساڵاچووە و توانای ڕۆژووی نییە.

فەرمووی: **"با شەست کەسی هەژار بە خورما نان بدات".**

دەڵێت، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەشی نییە.

دەڵێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"دەی کەواتەوە ئێمە بە بەشێك لە بەخشینی خورماکە یارمەتی دەدەین"**.

دەڵێت، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا منیش بە بەشێکی تر یارمەتی دەدەم.

فەرمووی: **"تەواوە، باشت کرد، بڕۆ لە جیاتی ئەو ببەخشە، لەگەڵ ئامۆزاکەشت باش بە"**.

دەڵێت، منیش وام کرد [(١)].

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: سوپاس بۆ ئەو خوایەی توانای بیستنی هەموو دەنگێکی هەیە، خەولە هات سکاڵای لە مێردەکەی دەکرد لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش قسەکانی لا دەشاردمەوە، منیش لە سوچێکی ماڵەوە بووم [(٢)].

**پێغەمبەر ﷺ هەرگیز لە کەسی پرسیارکەر بێزار نەدەبوو، تەنانەت گەر پرسیاری زۆرشی بکردبایە مادام سوودی بۆی هەبووە:**

أبي كثير السحيمي لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێت: پرسیارم لە ئەبو زەر کرد و گوتم: کارێکم پێ بڵێ، گەر بەندە بیکات پێی بچێتە بەهەشت.

گوتی: پرسیاری ئەمەم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، فەرمووی: **"باوەڕ بەخوا بێنێت"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ باوەڕدا کردار هەیە.

فەرمووی: **" لەوەی خوای گەورە پێ بەخشیووە، بەشێکی دەبەخشێ"**.

گوتم: ئەی گەر نەیبوو، هیچی نەبوو؟

فەرمووی: **"بە زمانی قسەی چاك بکات"**.

گوتم: گەر زمانی گیرا بێت، نەتوانێت قسە بکات؟

فەرمووی: **"یارمەتی کەسێکی ستەملێکراو بدات"**.

گوتم: گەر بێهێز بێت و توانای ئەمەی نەبێت؟

فەرمووی: **"کارێك بۆ کەسێکی نەزان بکات"**.

گوتم: گەر خۆی کەسێکی نەزان بێت؟

ئاوڕی دایەوە لای، فەرمووی: **"تۆ ناتەوێ هیچ کارێکی باش لە هاوڕێکەتدا هەبێت؟ با واز لە ئازاردانی خەڵك بهێنێت "**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا بەڕاستی ئەم کارە سانایە.

---

(١) ئەحمەد (٢٦٧٧٤) و ئەبو داود (٢٢١٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (٢٠٨٧).

(٢) النسائي (٣٤٦٠) ئیبن ماجە (١٨٨) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (٢٧٦).

فەرموو: **"سوێند بەوەی نەفسی منی بەدەستە، هەر بەندەیەك كارێك بكات و مەبەستی پێی خوای گەورە بێت، ئەم كارە رۆژی دوایی دەستی دەگرێت و دەیباتە بەهەشت"**[(١)].

الحافظ دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا جوانی گەڕانەوەوەی لە پرسیار تێدایە، هەروەها ئارامگرتنی زانا و مامۆستا لەسەر قوتابی و ئەوەی فەتوای بۆ دەدات و نەرمی نواندن بەرامبەری و، بەرگە گرتنی پرسیاری زۆر[(٢)].

## لە كاتی وتاردانا لەسەر مینبەر، وەڵامی پرسیاری داوەتەوە:

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك لەبارەی خواردنی گۆشتی بزنمژە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، ئەویش لەسەر مینبەر بوو.

فەرمووی: **"نەدەیخۆم و نەحەرامیشی دەكەم"**[(٣)].

ئەوەی لەم فەرموودەیەدا هەیە: حەلالی خواردنی گۆشتی بزنمژە، چونكە گەر حەرامی نەكرد واتە حەڵاڵە، چونكە بنچینە لە هەموو شتێكدا حەڵاڵییە، نەخواردنەكەی بەڵگەی حەرامبوونی نییە، لەوانەیە پێویستی پێ نەبووبێت یان لەبەر هۆكارێكی تر بێت[(٤)].

پێغەمبەر ﷺ وەك حەز، حەز لە خواردنی ناكات، بەڵام بە شەرعیش حەرامی ناكات.

## لەوانەیە فەرمانی بە كەسی پرسیاركەر كردبێت، خۆی بەدوور بگرێت.

عوقبەی كوڕی حارث ﷺ دەگێڕێتەوە، كە كچێك لە كچەكانی ئەبو ئیهابی كوڕی عزیزی خواست، ئافرەتێك هاتەلای و گوتی: من شیرم داوەتە هەردووكیان: عوقبە و ئەو ژنەی هێناویەتی.

عوقبە پێی گوت: من نەمزانیووە شیرت پێداوم، هیچ خەبەریشت نەداومەتێ[(٥)]!

كەسێكی ناردە لای بنەماڵەی ئەبو ئیهاب و پرسیاری لێكردن.

گوتیان: نەمانزانیووە شیری دابێتە كچەكەمان.

چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە، پرسیاری لێكرد، پشتی تێكرد و زەردەخەنە گرتی.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"چۆن خۆ ئەوەی گوتراوە گوتراوە؟"**[(٦)].

---

(١) ابن حبان (٣٧٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە، التعليقات الحسان (٣٩٤/١) لە بوخاریدا (٢٥٨١) لە موسلیم (٨٤).

(٢) فتح الباري (١٤٩/٥).

(٣) بوخاری (٥٥٣٦) و موسلیم (١٩٤٣) گێراوەتیانەوە.

(٤) طرح التثريب (٣/٦).

(٥) واتە پێش ئەو رووداوە، وەك ئەوەی تۆمەتباری بكات.

(٦) واتە چۆن دەچیتە لای و لەلای دەمێنیتەوە، لە كاتێكدا گوتراوە خوشكتە لەشیر، ئەمە لە پیاوەتی و دینداریەوە دوورە؟ فيض القدير (٥٩/٥).

عوقبە لێی جیابویەوەو، ژنێکی تری هێنا [1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

پێویستە مرۆڤ خۆی بە دووربگرێت لە بابەتی تۆمەت و گومان، تەنانەت گەر خۆشی کەسێکی پاك و بێ تاوان بێت.

لەم بارەیەوە گوتراوە:

قد قيل ذالك صدقا أو كذبا　　　فما أعتذارك عن قول اذا قيلا

**واتە:** ئەمە وا گوتراوە گەر راست بێت یان درۆ بێت، عوزرت چییە لە قسەییەك گەر گوترا بێت.

ئەمەش لەلای زۆرانێك هەڵگیراوە لەسەر، دەست گرتن بە خۆپارێزی (إحتیاط) [2].

ابن بطال دەڵێت: کۆمەڵی زانایان دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەتوای بە دوورگرتن لە شوبهە بۆداوە، فەرمانیشی کردوە خۆی لە گومان بە دوور بگرێت لەترسی چوون بەرەو فەرجێك کە بەڵگەیەك لەسەری هەیە کە ئافرەتەکە شیری پێداون بەڵام ئەوەندە بڕاوەو بەهێز نەبوو [3].

**هەندێك جار وەڵامی پرسیارکەری نەدەدایەوە گەر زۆر دووبارەی کردبایەوە، ئومێدی وابوو خۆی بێ دەنگ بێت، نەوەك بێ دەنگی بکات:**

وائیلی کوڕی حضرمي دەگێڕێتەوە و دەڵێت: سەلمەی کوڕی یەزیدی جەعفی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، گەر دەسەڵاتدارەکانمان هاتنەسەرمان و داوای مافی خۆیان کرد، هیچ مافێکیشیان نەدەدایە ئێمە، بە چی فەرمانمان پێ دەکەی؟

پێغەمبەری پشتی تێکرد.

پرسیارەکەی دووبارە کردەوە، پشتی تێکرد.

بۆجاری سێیەم پرسیاری کرد:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"إسمعوا وأطيعوا، فإنّما عليهم ما حُمّلوا وعليكم ما حُمّلتم"**[4].

(إسمعوا وأطيعوا) واتە: گوێبگرن و ملکەچ بن.

---

[1] بوخاری گێراوەتیەوە(٨٨).

[2] مرقاة المفاتيح (١/١٠).

[3] عمدة القاري (١٠٢/٢).

[4] موسلیم گێراوەتیەوە(١٨٤٦)

(فإنما عليهم ما حُمّلوا) واتە: ئەوان دادپەروەری و پێدانی مافی خەڵکیان لەسەر شانە.

(وعليكم ما حُمّلتم) واتە: ئێوەش ملکچەی و ئارامگرتن لەسەر بەلاتان لەسەر شانە [1].

(پێغەمبەر ﷺ پشتی تێکرد، وەك ئەوەی دووبارەبوونەوەی ئەو پرسیارە و ئەو بابەتەی پێناخۆش بێت، بەڵام پرسیارکەرەکە دووبارەی کردەوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی دا مافەکانیان بدەین، ئەوەی لەسەر شانیانە ئەوەی لەسەرشانمانە.

ئێمە ئەرکی گوێگرتن و ملکەچیمان لەسەر شان هەڵگرتووە، ئەوانیش ئەرکی حوکمردن بە دادپەروەری و ستەم نەکردنیان هەڵگرتووە، هەروەها ئەرکی پاراستنی سنورەکانی خوای گەورە و جێبەجێکردنی شەریعەتی خوا لەسەر زەوی و جیهادکردنی دوژمنانی.

ئەمانە ئەو ئەرکانەن پێویستن لەسەریان بیکەن، گەر بیکەن ئەمە داواکراوەکەیە، گەر نەشیان کرد، ئێمە ناڵێین لەبەر ئەوەی ئێوە ئەرکی سەرشانتان ئەنجام نەداوە، بۆیە ئێمەش ئەرکی خۆمان بەرامبەرتان ئەنجام نادەین، بەڵکو پێویستە ئێمە مافی سەرشانمان جێبەجێ بکەین، گوێیان لێ دەگرین و ملکەچ دەبین، بۆ جیهادکردن لەگەڵیان دەچینە دەرەوە، لە وتاری هەینی و بۆنەکان و کاتەکانی تر نوێژیان لەدوا دەکەین) [2].

**پێغەمبەرﷺ هۆکاری حوکمدانەکەی روون دەکردەوە، ئەمەش بۆ ئامادەسازی دەروونی پرسیارکەر بۆ ئەوەی حوکمەکە وەربگرێت:**

لە قورئاندا هۆکاری حوکمەکان روونکراوەتەوە، بۆ ئەوەی باوەڕدار بە بێ گرفت پەیڕەوەی بکات. بۆنمونە پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ﴾ البقرة: ٢٢٢ واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (عادەتی مانگانەی ئافرەت) پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاك دەبنەوە.

پەروەردگار فەرمان بە پێغەمبەرەکەی دەکات، بەر لە حوکمدان، هۆکاری حوکمدانەکە بۆ خەڵك روون بکاتەوە.

پێغەمبەرﷺ دەروونی کەسی پرسیارکەری بۆ وەرگرتنی حوکمەکە ئامادە دەکرد، بە هۆکاری جۆراوجۆر ئامادەسازی بۆ حوکمدان و بڕواپێهێنانی دەکرد.

---

[1] تحفة الأحوذي (٦/٣٦٨).

[2] شرح رياض الصالحين للعثيمين (٣/٦٦٦).

ئەمەش لە باشترین ڕێگاکانی فەتوادانە، بە جۆرێك دەروونی کەسی پرسیارکەری بۆ وەرگرتنی حوکمەکە ئامادە دەکرد. وەك فەرمایشتی پەروەردگار ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥ واتە: نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانەی (لاف بڕوا لێدەدەن) بڕوا ناهێنن هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوودەدا لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەك دروست ببێت بەرامبەر ئەوەی کە داوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بەتەواویی تەسلیم بن و ڕازیی بن.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پرسیاری لێکرا سەبارەت بە فرۆشتنی خورما بە ڕوتاب.

بەوانەی لە دەوری بوون، فەرمووی: **"ئایا ڕوتاب کە وشك بوو کەم دەکات؟"**.

گوتیان: بەڵێ.

پێغەمبەر نەهی لەم کارە کرد [1].

ابن القیم دەڵێت: هەرکەسێك سەرنج لە فەتواکانی پێغەمبەر ﷺ بدات، کە فەرمایشتەکانی خۆی لە خۆیدا بەڵگەی لەگەڵە، دەبینێت لە حیکمەتی حوکمدانەکان و ڕووی مەشروعیەتی جۆرێك لە گشتگیری تێدایە.

بەم شێوەیە، کاتێك پرسیاری لەبارەی ڕوتابی تەڕ کرد، فەرمووی: **" ئایا ڕوتاب کاتێك وشك بوو کەم دەکات؟"**.

فەرموویان: بەڵێ.

قەدەغەی کرد.

ئاشکرایە، ئەو دەیزانی بە وشکبوونەوە کێشی کەم دەکات، بەم جۆرە هۆکاری حەرامکردنەکەی بۆ ڕوونکردنەوە [2].

قاضی ﷺ دەڵێت: مەبەست لە پرسیارکردن، نەزانینی مەسەلەکە نییە، چونکە بابەتەکە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، بەڵکو هۆشیارکردنەوەکە لەسەر هێنانەدی مەرجی

---

[1] ابو داود (٣٣٥٩) و ترمذي (١٢٢٥) و النسائی (٤٥٤٥) و ابن ماجة (٢٢٦٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانیش لە (الارواء / ١٣٥٢) بە سەحیحی داناوە.

[2] إعلام الموقعين (١٢٣/٤).

هاوشێوە بوونە لەکاتی وشکبووندا. هەر ئەوەند بەس نیە هاووێنەیی روتاب و خورما لەسەر تەراتیەکەی،هەروەها ئەگەر وا دامانئا وشك بێت چونکە ئەمانە ئەگەرن .[١]

باجی دەڵێت: لای هیچ کەسێك شاراوە نییە، کە روتاب بە وشکبوونەوە کێشی کەم دەبێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ویستوویەتی لەبارەی هۆکاری حەرامکردنەکە هۆشیاریان بکاتەوە، ویستوویەتی فێریان بکات کە هەموویان لەبارەی هۆکاری حەرامکردنەکە کۆکن[٢].

عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت، ڕۆژێك دڵم خۆشبوو و ماچێکم کرد لە کاتێکدا بە ڕۆژووش بووم، چومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێم گوت، ئەمرۆ کارێکی خراپم کردووە، ماچی خێزانم کردووە و بەڕۆژووش بووم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا گەر بەڕۆژوو بیت و ئاو لەدەمت وەربکەیت، چی دەبێت؟".**

گوتم: هیچ.

فەرمووی: **"کەواتە ئەمەش وایە".**

واتە: گەر ئاوی لە دەم وەردا و پاشان فرێیدا، ئایا ئەمە زیان بە ڕۆژووەکە دەگەیێنێت؟ گوتی: نەخێر

مازری دەڵێت: ئەمە لە جوانی زانستی فیقهییە، چونکە ئاو لەدەم وەرکردن ڕۆژوو ناشکێنێت، چونکە سەرەتای خواردنەوە و کلیلی خواردنەوەیە، هەروەك چۆن ماچکردن سەرەتایی سەرجێیکردن و کلیلەکەیەتی.

ئاو ڕۆژ بەتاڵ دەکات، وەك چۆن سەرجێی کردنیش بەتاڵی دەکاتەوە، بەڵام وەك روون بۆتەوە سەرەتای ئاوخواردنەوە ڕۆژوو بەتاڵ ناکات بەهەمان شێوە سەرجێی کردنیش.اهـ[٣]

نەوەوی دەڵێت: ماچ لە کاتی بە ڕۆژووبووندا، بۆ کەسێك حەرام نییە ئارەزووی نەجوڵێت، بەڵام باشترە نەیکات، بەڵام بۆ کەسێك ئارەزووی بجوڵێت حەرامە، دەگوترێت مەکروهە.

بەڵام بە گشتی ناکۆکی لەسەر ئەوە نییە کە ڕۆژوو بە تاڵ ناکات، تەنیا ئەگەر نەبێتە هۆکاری هاتنی ئاو[٤].

رافعی کوڕی خدیج ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە سبەی دەگەینە دوژمن، چەقۆمان پێ نییە.

---

[١] عون المعبود (١٥١/٩)
[٢] المنتقى شرح الموطأ (٢٤٣/٤)
[٣] فتح الباری (١٥٢/٤).
[٤] سەیری: شەرحی نەوەوی بکە لە سەحیحی موسلیم (٢١٥/٢).

فەرمووی ﷺ **"پەلە بکە، یان دەستت سوك بکە، هەرچی خوێن فیشقە پێ بکات و ناوی خوای لەسەر هێنرابێ ئەوە بخۆ، بەڵام بە ددان و نینۆك نا، با پێت بڵێم: کە ددان ئێسکە و نینۆکیش چەقۆی حەبەشییەکان بووە"** [١].

(هۆکاری قەدەغەکردنی سەر بڕینی بەو دوو شتە روونکردۆتەوە، کە یەکێکیان ئێسکە، ئەمە هۆشیارکردنەوەیە کە نابێت بە ئێسك سەربڕێت، یان لەبەر پیسی هەندێکیەتی، یاخود لەبەر ئەوەیە لەسەر جنۆکە باوەڕدارەکان پیس دەبێت.

جۆری دووەمیش لەبەر ئەوەیە کە چەقۆی حەبەشییەکانە، لێرەدا سەربڕینەکە پێچواندانە بە سەربڕینی کافرەکان) [٢].

عەبدوڵڵای کوڕی مغفلی المزنی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری ﷺ خوا نەهی لە بەردهاویشتن بە پەنجە (الخذف) [٣] کردووە، و فەرموویەتی **"ئەم جۆرە کارە، نە نێچیر دەکوژێت و نە دوژمن دەشکێنێت، بە ڵکو ددان دەشکێنێت و چاو کوێر دەکات"** [٤].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ڕێگریکردن لە بەرد هاویشتن بە پەنجە، چونکە هیچ قازانجێکی تێدانییە، بەڵکو مەترسی هەیە.
- هەر شتێك سوودی هەبێت بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمن یان بۆ ڕاوکردن ڕێگەی پێدراوە.

یەعلای کوڕی ئومەیە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شەڕی تەبوکم کرد، سواری وشترێکی گەنج بووم، کە بۆ کارەکانم زۆر باش بوو.

کرێکارێکم بە کرێ گرت، شەڕی لەگەڵ پیاوێك کرد، یەکێکیان ئەوی تری گەزت، دەستی لە دەمی ڕاپرچکاند، دوو ددانەکانی پێشەوەی کەوتن.

بۆ وەرگرتنەوە مافی خۆی هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مافی پێنەدا، پێی فەرموو: **"ئایا خۆی دەستی دێنێتە ناو دەمت، تا بیشکێنیت بە ددانەکانت، وەك چۆن ئاژەڵ دەیشکێنێت؟"** [٥].

---

[١] بوخاری (٢٤٨٨) و موسلیم (١٩٦٨) گێراوەتیانەوە.

[٢] إعلام الموقعين (١٢٤/٤).

[٣] بریتییە لە هاویشتنی بەرد بە دوو پەنجەی شایەدمان، یان دار لاستیکێك بەردی بهاوێیە ناو بە هەردوو پەنجەی گەورە و شایەدمان بهاوێژیت. النهاية (١٦/٢).

[٤] بوخاری (٤٨٤٢) و موسلیم (١٩٥٤) گێراوەتیانەوە.

[٥] بوخاری (٢٢٦٦) و موسلیم (١٦٧٤) گێراوەتیانەوە.

(ئەمە جوانترین هۆکار هێنانەوە و ڕوونترینیەتی، کاتێك کەسی گازگر پڕ دەداتە گازلێگیراوەکە، دەتوانێت وەڵامی بداتەوە، ئەویش بە دەرهێنانی دەستی لەناو دەمی کەسەکە.

تەنانەت گەر ئەم کارە بووە هۆی کەوتنی ددانەکانیشی، ئەوکات کەوتنەکەی کارێکە شەرع مۆڵەتی پێداوە و کابراش مافی وەرگرتنی خوێنی نییە) [1]

## لە کاتی فەتوادانداا، رەچاوی حاڵەتی کەسی پرسیارکەری دەکرد:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك لە بارەی بەرکەوتن [2] بە خێزانەکەی لە کاتی بەرۆژووبوندا پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش روخسەتی پێدا، یەکێکی تر هات هەمان پرسیاری لیّ کرد، رێگەی پێنەدا.

ئەوەی روخسەتی پێدا، کەسێکی پیربوو، بەڵام ئەوەی روخستەی پێنەدا کەسێکی گەنج بوو [3].

لێرەدا رەچاوکردنی پێغەمبەر ﷺ دەبیندرێت لە جیاوازیکردن لە نێوان پیر و گەنجدا لە کاتی حوکمکردندا.

(زانایان ئەم بۆچوونەیان لەم حوکمە دەرهێناوە: ماچکردن و دەستلێدان و هاوشێوەکانیان بۆ کەسی گەنج حەرامە، یان هەرشتێك ئارەزووی بجوڵێنێت، ئەمەش لەترسی کەوتنە ناو حەرام، بەڵام گەر ئەو ترسەی نەبوو، رێگری لیّ ناکرێت) [4]

نەوەوی دەفەرموێت: هیچ ناکۆکییەك لەوەدا نییە کە رۆژوو بەتاڵ ناکات تەنیا ئەگەر بە ماچەکە مەنی بێتە خوارە [5].

## هاوەڵەکانیش بە هەمان شێوەیان کردووە:

سەعدی کوڕی عوبیدە دەگێڕێتەوە،کە پیاوێك هاتە لای ئیبن عەباس ﷺ پێی گوت: ئایا گەر کەسێك موسڵمانێك بکوژێت، تۆبەی بۆ هەیە؟

فەرمووی: نەخێر، تەنیا ئاگری بۆ هەیە.

---

[1] اعلام الموقعین (٤/١٢٤).

[2] بەریەکەوتن لێرەدا، مانای دەستلێدان واتا بەریەککەوتنی هەردوو پێست دەگەیێنێت.

[3] ئەبو داود (٢٣٨٧) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبو داود (٢٠٦٥) بە سەحیحی داناوە.

[4] مجموع فتاوی ابن باز (١٥/٣١٥).

[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧/٢١٥).

کاتێك پیاوەکە ڕۆیشت، ئەوانەی دەورووبەری بە ئیبن عەباسیان گوت: تۆ بەو شێوەیە فەتوات بۆ ئێمە نەداوە، تۆ فەتوات بۆ ئێمە داوە گەر کەسێك موسڵمانێك بکوژێت تۆبەی قەبوڵکراوی بۆ هەیە، ئەوەی ئەمڕۆ چی؟

فەرمووی: من وای دەبینم کەسێکی توڕە و توندە، دەیەوێت موسڵمانێك بکوژێت.

دەڵێت: بە دوایدا گەڕان، بینیان ڕاستە [1].

**داوای وردەکاری و ڕوونکردنەوەی لە کەسی پرسیارکەر دەکرد لەبارەی پرسیارەکەی:**

ئەبو موسای ئەشعەری دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ منی نارده یەمەن. پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوێ خواردنەوەی لێیە، چی بخۆمەوە و چی نەخۆمەوە.

فەرمووی: **"ئەو خواردنەوانە چینە؟"**.

گوتم: ناویان بەتع و مەزرە.

فەرمووی: **ئەمانە چینە؟**

گوتم: بەتع ئاوی هەنگوینە، مەزریش ئاوی جۆ یان گەنمە.

فەرمووی: **سەرخۆشت دەکات؟**

گوتم: بەڵێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"شتی سەرخۆشکەر مەخۆرەوە، من هەموو شتێکی سەرخۆشکەرم حەرام کردووە"** [2].

**داوای خستنەڕووی وێنەیەکی پرسیارلێکراوەکەی دەکرد، ئەمەش تا ڕوونی بکاتەوە ئەوەی دروستە کامەیە و ئەوەشی نادروستە کامەیە:**

عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی نەفامیدا نوشتەمان دەکرد، گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا ڕات چییە لەبارەی ئەمە؟

فەرمووی: **"پیشانم بدەن، هیچی تێدانیە گەر نوشتەکانت شیرکی تێدا نەبێت"** [3].

جابری کوڕی عەبدوڵلا ؓ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی لە نوشتەکرن کرد، بنەماڵەی عەمری کوڕی حەزم هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێیان فەرموو: ئەی

---

[1] ابن ابي شيبة (٢٧٧٥٣) گێڕاوەتیەوە.

[2] النسائي (٥٦٠٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە الصحيح الجامع (٧٣٣٣) بە سەحیحی داناوە، ئەسڵی فەرموودەکە لە بوخاری(٤٣٤٣) و موسلیم (١٧٣٣) دایە.

[3] موسلیم (٢٢٠٠) گێڕاوەتیەوە.

پێغەمبەری خوا ئێمە پێشووتر نوشتەمان هەبوو بۆ خۆپاراستن لە دوپشك، تۆش نەهیت لەم کارە کردووە.

فەرمووی: نوشتەکانتان پیشانم بدەن، پاشان فەرمووی: **"هیچی وای تێدا نابینم، هەر کەسێکتان بتوانێت سوود بە براکەی بگەیێنێت، با بیکات**[1]**"**.

نەوەوی دەڵێت: کاتێك گوتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا تۆ نەهیت لە نوشتە کردووە) زانایان بە چەند جۆرێك وەڵامیان داوەتەوە:

**یەکەمیان:** سەرەتا قەدەغەی کردووە، پاشان نەسخی کردۆتەوە، روخستەی پێداوە و ئەنجامیشی داوە، شەرعیش رێگە پێدانەکەی جێگیر کرد.

**دووەمیان:** قەدەغە کردن لەجۆرە نوشتەیەکی نەزاندراو بووە، وەك باسکرا.

**سێیەمیان:** قەدەغە کردن بۆ خەڵکانێك بووە کە بۆچوونیان وابووە ئەم شتە سوود دەگەیێنێت، وەك لە سەردەمی نەفامی وای بۆ دەچوون[2].

ئیبن حەجەر دەڵێت: زانایان کۆکن لەسەر دروستبوونی نوشتە بە سێ مەرج: دەبێت بە فەرمایشتی خوا و ناو و سیفەتەکانی بێت، دەبێت بە زمانی عەرەبی یان واتەکەی روون بێت. دەبێت بڕواشی وابێت خودی نوشتەکە سوود ناگەیێنێت، بەڵکو خوای پەروەردگار وا دەکات سوودی هەبێت[3].

## کامەیان سووکتر و ئاسانتربووایە بە گوێرەی توانا بۆی هەڵدەبژاردن:

عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ لە شوێنی (رمی الجمرات) بینی، کە دوعای دەکرد.

پیاوێك لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا من پێش ئەوەی (رەمی جەمەرات) بکەم، قوربانیم کرد.

فەرمووی: **" رەمی جەمرات بکە ئاساییە"**.

یەکێکی تر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێش ئەوەی قوربانی بکەم سەرم چاکرد.

فەرمووی: **"قوربانی بکە ئاساییە"**.

---

[1] موسلیم (٢١٩٩) گێراوەتیەوە

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/١٦٨).

[3] فتح الباری (١٠/١٩٥).

هەر پرسیارێکی لەبارەی پێشخستن و دواخستنی کارێك لێکرابایە دەیفەرموو **"بیکە ئاسایییە"**[١].

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە پیاوێك ڕۆژی فەتحی مەککە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من نەزرم بۆ خوا کردووە، گەر پەروەردگار مەککەی بۆت ئازاد کرد، لە قودس دوو رکات نوێژ بکەم.

فەرمووی: **"لێرە بیکە"**.

پاشان بۆی دووبارە کردەوە.

فەرمووی: **"لێرە بیکە"**.

بۆ جاری سێیەم لیێ دووبارە کردووە.

فەرمووی: **"بە خۆت باشتر دەزانی"**.

بەم شێوەیە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاسانکاری بووە، وەك پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴾ الأعلى: ٨

واتە: وتە و کارە باشەکانت بۆ ئاسان دەکەین، شەرعێکی ئاسان و لێبووردە و ڕاست و دادگەرو، دوور لە خوارخێچی و قورسی و ناخۆشی[٢].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: **"بەڕاستی دین ئاسانە، هەرکەسێك زیادەڕۆیی تێدا بکات، تیاچووە"**[٣].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **"من بە ئایینی لێبووردەیی ڕەوانەکراوم"**[٤].

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان هەڵبژاردنی دووکاردا سەرپشك بکرابا، تەنیا ئاسانەکەی هەڵبژاردووە، گەر گوناهی تێدا نەبووایە، گەر گوناهیشی تێدابووایە خەڵکی لیێ دوور دەکردەووە[٥].

---

[١] بوخاری (١٢٤) و موسلیم (١٣٠٦) گێراوەتیانەوە.

[٢] تەفسیری ئیبن کپیر (٣٧٢/٨)

[٣] بوخاری (٣٩) و موسلیم (٢٨١٦) گێراوەتیانەوە.

[٤] ئەحمەد (٢١٧٨٨) لە ئەبی ئومامە گێراوەتیەوە. ئەلبانی لە سەحیحەکەی خۆی (٤٢٣/٦) بە شاهێدەکانیەوە دایناوە.

[٥] بوخاری (٣٥٦٠) و موسلیم (٢٣٢٧) گێراوەتیانەوە.

**ئاسانەکەی بۆ هەڵدەبژاردن:**

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"ئەو شەوەی شەوڕەویم پێکرا، پێغەمبەر موسام بینی، پیاوێکی نە لاواز نە قەڵەو بوو، قژی لوس و چەورکراو بوو، (وەك ئەوەی لە پیاوانی خاوەن کەرامەت دوور لە پیسی بێت)، عیسام بینی، پیاوێکی مامناوەند و ڕەنگ سوور بوو، وەك ئەوەی تازە لە گەرماو هاتبێتەدەر، منیش زیاتر لە کوڕەکانی ئیبراهیم ﷺ دەچم.**

**پاشان دوو پەرداخیان بۆ هێنام، یەکێکیان ئارەق بوو، ئەوی تریان شیر بوو، پێم گوترا: کامەیانت دەوێت بیخۆرەوە.**

**شیرەکەم وەرگرت و خواردمەوە، گوترا: فیترەتت هەڵبژارد، گەر ئارەقت هەڵبژاردبا، ئومەتەکەت سەرلێشێواو دەبوو".**

**ڕوخسەتی بە کەسانی خاوەن پێویستی دەدا و لە حوکمی گشتیدا هەلاوێری بۆ دەکردن:**

قاسمی کوڕی موحەممەد لە عائیشەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: لە شەوی موزدەلیفە سەودە ڕوخسەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت کە پێش ئەو دەربچێت، بەر لەوەی قەرەباڵغی خەڵك دروست بێت، قاسم دەڵێت: ئەو ئافرەتێکی قورس بوو، دەڵێت: ڕوخسەتی پێدا، ئەویش دەرچوو، ئێمەش تا بەیانی هات ماینەوە، پاشان وەك ئەو دەرچووین.

گەر ڕوخسەتم لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتبا، وەك ئەوەی سەودە وەریگرت، بە ڕوخسەتی ئەو دەربچووبام، لە هەموو شتێك لام خۆشەویستر بوو[1].

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: عەباسی کوڕی عەبدولوتەڵیب ﷺ بە مەبەستی ئاوادان داوای وەرگرتنی ڕوخسەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد شەوانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە، ئەویش ڕوخسەتی پێدا[2].

**ڕازی دەبوو، کاتێك کەسی پرسیارکەر وەك کارئاسانی داوای هەلاوێریکی دەکرد:**

عەبدوڵلای ئیبن عەباس ﷺ لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: **"خوای پەروەردگار مەککەی کردۆتە حەرەم، بۆ کەسی تری پێشووی منی حەلال نەکردووە، بۆ کەسی تریش دوای من نابێت، بۆ من تەنیا کاتێك (کاتژمێرێك) حەلاڵ کراوە، ڕووەکی وشك**

---

(1) بوخاری (١٦٨٠) و موسلیم (١٢٩٠) گێڕاوەتیانەوە.

(2) بوخاری (١٦٣٤) و موسلیم (١٣١٥) گێڕاوەتیانەوە.

**و تەڕی هەڵناکەندرێ، دارەکەی نابڕدرێت، ڕاوی دەرنـاکرێن و ڕاونـاکرێن، شـتی ونبـووی هەڵناگیرێتەوە، تەنیا ئەگەر بزاندرێت هی کێیە"**.

عەباس فەرمووی: "ئەی پێغەمبەری خوا تەنیا (ئیذخیر) نەبێت، بۆ صیاغەو گۆڕەکانمان.

فەرموو: **"تەنیا (ئیذخیر) نەبێت"**[1].

نەوەوی دەڵێت: کاتێك فەرمووی **"تەنیا** (ئیذخیر) **نەبێت"** ئەمە وا هـەڵگیراوە کـە لـەم کاتەدا وەحی بۆ دابەزیووە، بـۆ هـەڵاوێکردنی ئـەم رووەکـە و تایبـەتی کردنـی لـە گشـت، یاخود پێشووتر وەحی بـۆ دابـەزیووە کـە ئەگـەر کەسـێك داوای هـەڵاوێکردنێکی کـرد، تـۆ رازی ببە و بۆی هەڵاوێر بکە، یاخود لە هەموو شتەکان ئیجتیهادی کردوە، خوا زاناترە[2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ئەم فەرموودەیە تایبەتمەندی پێغەمبەری خوای تیادا روونکراوەتەوە.
- دروستە بۆ بەرژەوەندی شەرعی، داوا لە زانا بکرێت.
- گەورە و بەرزی پێگەی عەباس لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئاشکرا دەکات.
- بایەخپێـدانی پێغەمبــەر ﷺ بــە مەککــە، بــەو پێیــەی شــوێنی لــە دایکبــوونی و گەورەبوونیەتی.
- هەڵگرتنی حوکمی کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینـە، لەبەرامبـەردا هێشـتنەوەی ئـەو حوکمە لە وڵاتی کافردا تا رۆژی دوایی[3].

**گەر ڕێگە پێدانێك بۆ کەسی پرسیارکەر نەبووایە، داوای لێدەکرد خۆراگری و عەزیمەتی هەبێت:**

ئیبن مـەکتوم ﷺ دەگێڕێتـەوە، کـە پرسـیاری لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد و پێـی گـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا، مـن کەسـێکی نابینـام، مـاڵیکم هەیـە دوورە، کەسـێکی رێپیشاندەرم هەیە گونجاو نییە بۆم، ئایا روخسەت هەیە لە ماڵەوە نوێژەکانم بکەم؟

فەرمووی: **"ئایا گوێت لە بانگ دەبێت؟"**.

گوتم: بەڵێ

فەرمووی: **"هیچ روخسەتێك بۆتۆ نابینم"**[4].

---

[1] بوخاری (١٣٤٩) و موسلیم (١٣٥٣) گێراوەتیانەوە. الإذخر: رووەکێکی بۆن خۆشە

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٧/٩).

[3] فتح الباری (٥٠/٤).

[4] ابو داود (٥٥٢) و النسائی (٨٥١) و ابن ماجة (٧٩٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە سەحیحی (أبی داود ٥٦١) بە سەحیحی داناوە، موسلیم (٦٥٣) گێراوەتیەوە.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر واجبوونی نوێژی بە کۆمەڵ، گەر روخسەتدانێك هەبایە، ئەوا کەسانی خاوەن پێداویستی تایبەت لە پێشترن بۆ نەهاتنی نوێژی بە کۆمەڵ، ئەوانەی وەك نمونەی ئیبن مەکتومن [١].

## کەسی پرسیارکەری بۆ بەدیلێکی رێگە پێدراو رێنوێنی دەکرد:

لە زانستی کەسی فەتوادەر ئەوەیە، کاتێك کەسێك پرسیاری لێ دەکات لەباری شتێك و ئەویش لێی قەدەغە دەکات، لە کاتێکدا پرسیارکەرەکە زۆر پێویستی پێی هەیە، لە تێگەیشتن و زانستی فەتوادەر ئەوەیە رێگەیەکی جێگرەوەی بۆ پیشان بدات، بۆ ئەوەی کاتێك دەرگای شتە قەدەغەکراوەکەی لەسەر دادەخات، دەرگاری حەڵاڵی بۆ بکاتەوە.

ئەمەش لە نمونەی پزیشکێکی ئامۆژگاریکارە، کاتێك نەخۆشەکە لە شتە زیانبەخشەکان ئاگادار دەکاتەوە، لەبەرامبەردا شتە سوودبەخشەکانی بۆ روون دەکاتەوە.

فەیروزی دەیلەمی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا زانیوتە ئێمە کێین و لە کوێین، ئایا بۆ لای کێ دەچین؟

فەرمووی: **"بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی"**.

پێمان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە خاوەنی رەزی ترێین، خوای پەروەردگار ﷻ شەرابی حەرام کردووە، ئێمە چی لەو میوەیە بکەین.

فەرمووی: **"بیکەنە مێوژ"**.

گوتمان: چی لە مێوژ بکەین؟

فەرمووی: **"ئاوەکەی [٢] بکەنە سەر خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارانتان و بیخۆنەوە"**.

گوتم: ئایا دوای نەخەین تا توند دەبێت (تا دەبێتە شەراب و سەرخۆشکەر)؟

فەرمووی: **"مەیخەنە ناو گۆزە، بیخەنە ناو مەشکە، چونکە ئەو کات گەر دواشبکەوێت دەبێتە سرکە"** [٣].

کاتێك هاوەڵەکە گوتی: (دەزانی ئێمە کێین؟) مەبەست لێی: هۆزە.

هەروەها کە گوتی: (ئێمە لە لەکوێوە هاتووین؟) مەبەست لێی: وڵاتە

---

[١] عون المعبود (٢/١٨٠).

[٢] مێوژ یان خورما دەخرێتە ناو ئاو، بەر لەوەی ببێتە سەرخۆشکەر، ئاوەکەی دەخورێتەوە.

[٣] ئەبو داود (٣٧١٠) و النسائی (٥٧٣٦) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ١٤٧٧) بە سەحیحی داناوە.

کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :**"بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی"**، ڕەنگە مەبەست لێی ئەوە بێت، کە ئەوان لەسەر ڕێبازی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەڕۆن و پابەندن بەو پەیامەی لەوانەوە هاتووە.

ئیبن عەباس ﷺ هەمان کاری کرد، سەعیدی کوڕی ئەبی حەسەن دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لای ئیبن عەباس ﷺ بووم، پیاوێك هاتەلای، پێی گوت: ئەی ئیبن عەباس، من پیاوێکم بژێوی ژیانم لەسەر دەستی خۆمە، من ئەم وێنانە و شێوانە دروست دەکەم.

ئیبن عەباس ﷺ فەرمووی: تەنیا ئەوەی گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، ئەوەت بۆ دەڵێم، گوێم لێی بوو کە فەرمووی: **"هەر کەسێك وێنەیەك یان شێوەیەك دروست بکات، خوای گەورە سزای دەدات تاوەکو ڕوحی بەبەردا بکات، هەرگیزیش ناتوانێت ڕوحی بەبەردا بکات"**.

پیاوەکە توشی کۆکەیەکی توند بوو، ڕەنگی زەرد بوو.

پێی فەرموو: ئەمە چیتە، گەر قەدەغەم کردی لەسەر دروست نەکردنی ئەمانە، ئەوا وێنەی دار و درەخت و هەرشتێك کە گیانی لەبەر نەبێت بیکێشە [1].

## ڕووی دەکردە پەروەردگار بۆ ئەوەی ئیلهامی بکات بە وەڵامی ڕاست:

پێویستە فەتوادەری سەرکەوتوو، کاتێك بابەتێکی بۆ دێت، بە دڵەوە ڕووی لە پەروەردگاری ئیلهام بەخشی ڕاستییەکان و فێرکاری خێر و ڕێنوونی دڵەکان بکات، بۆ ئەوەی ئیلهامی وەڵامی دروستی پێ ببەخشێت و دەرگای ڕاستی بەرڕوودا بکاتەوە، چونکە هەر کاتێك لەم دەرگایە بدات، ئەوا بێگومان لە دەرگای سەرکەوتنی داوە.

کاتێك پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی و گوتی: ئەگەر کەسێك پیاوێکی لەگەڵ خێزانەکەی بینی، قسەی لەبارەوە بکات جەڵدی لێ دەدەن، گەر بیکوژێت دەیکوژنەوە، گەر بێدەنگیش بێت، ئەوا لەسەر ڕق و توڕەیی بێ دەنگ بووە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی **"اللهمّ افتح"**. بەردەوام بوو لەو دوعایە، تا ئایەتی (لیعان) دابەزی [2].

مەبەست لە فەرموودەی **"اللهمّ افتح"**، واتای: حوکمی ئەم بابەتەمان بۆ ڕوون بکەرەوە [3].

صەیرەمی و ئەوانی تریش لەبارەی ئادابی فەتوادانەوە دەڵێن: گەر ویستی فەتوا بدات،

---

[1] بوخاری (٢٢٢٥) و موسلیم (٢١١٠) گێراوەتیانەوە.

[2] موسلیم (١٤٩٥) لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ گێراوەتیەوە

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/١٢٨).

پێویستە لە پەروەردگار بپارێتەوە [(١)].

لە دوعایەکانی پێغەمبەر ﷺ، ئەبو سەلەمەی کوڕی عبدالرحمن کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانم پرسی، کاتێک پێغەمبەر ﷺ شەو نوێژ دەکات، بە چ شتێك نوێژەکەی دەست پێ دەکات؟

فەرمووی: کاتێك بۆ شەونوێژ هەڵدەستێت، نوێژەکانی بەم دوعایە دەست پێدەکات **"اللهمّ ربّ جبرائيل، وميكائيلَ، وإسرافيلَ، فاطرَ السماوات والارض، عالِم الغيب والشّهادة، أنت تحكمُ بينَ عبادكَ فيما كانوا فيه يختلفون، اهدني لما اختلف فيه من الحق بإذنك إنك تهدي من تشاءُ إلى صراطٍ مُستقيم"**. [(٢)]

**دڵ نەرم بووە بەرامبەر کەسی پرسیارکەر، ئەو کەسەی بە تۆبەکردنەوە لە گوناهێك یان هەڵەیەك هاتبایە لای لێی تووڕە نەدەبوو:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: بە هیلاکچووم ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"چ بە هیلاکی دای؟"**

گوتی: چوومەتە لای خێزانەکەم لە رەمەزان.

فەرمووی: **"ئایا هیچ شتێکت هەیە بۆ ئەوەی بەندەیەکی پێ رزگار بکەی؟"**.

گوتی: نەخێر

فەرمووی: **"ئایا دەتوانی دووم مانگ لەسەر یەك بە رۆژوو بیت؟"**.

گوتی: نەخێر

فەرمووی: **"ئایا توانای ناندانی شەست هەژارت هەیە؟"**.

گوتی: نەخێر

پاشان دانیشت، پێغەمبەر ﷺ (عرق) [(٣)]ێکی هێنا، خورمای تێدابوو، فەرمووی **"لێی ببەخشە"**.

کابرا گوتی: لە ئێمە هەژار تر هەیە؟ کەسێك نیە لە ئێمە زیاتر پێویستی بەمە بێت.

---

[(١)] آداب الفتوى والمفتي والمستفتي (٤٩/١). للنووی.

[(١)] موسلیم (٧٧٠) گێڕاویەتیەوە.

[(١)] (عرق) قاپێکی گەورەیە، جێگای ١٥ صاعی دەبێتەوە، کە شەست مستی تێدایە بۆ شەست هەژار، شەرحی نەوەوی(٢٢٦/٧).

پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی تا ددانە پیرۆزەکانی دەرکەوتن، پاشان فەرمووی: **"بڕۆ، خواردنی کەسوکارتی پێ بدە"**[1].

ئیبن حەجەر دەڵێت: سەربارى ئەوەی دانی بە گوناهەکەی دانا، بەڵام پێغەمبەر ﷺ سزای نەدا، چونکە هاتنی بەشێوەی پرسیارکەر نیشانەی تۆبە و پەشیمانبوونەوەیەتی، چونکە گەر سزا بدرابدایە، دەبووە هۆیەك بۆ وازهێنان لە پرسیارکردنی، ئەمەش کارێکی نابەجێیە، بۆیە دەخوازرێت کە سزا نەدرێت[2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نەرمینواندن لەگەڵ فێرخواز، هێمنی و لەسەرخۆیی لە فێرکردن، پەیوەستکردنی دڵ بە دینەوە.
- یارمەتیدانی یەکتری لە بەندایەتی کردن، هەوڵدان بۆ رزگارکردنی موسڵمان.

هۆکاری پێکەنینی پێغەمبەری ﷺ لە جیاوازی حاڵەتی پیاوەکە بووە، سەرەتا بە ترسەوە هات، هەرچی بتوانێت لە پێناوی رزگار کردنی خۆی بیکات، بەڵام کاتێك زانی روخسەتی پێدراوە، حەزی چووە ئەو کەفارەتەی پێی دراوە بیخوات.

دەشگوترێت لە حاڵی پیاوەکە پێکەنی، لە شێوازی قسەکردنی و نەرمینواندن لە قسەکردندان و بەجوانی پاڕانەوەی بۆ ئەوەی بگات بە مەبەستەکەی[3].

سەلەمەی کوڕی صخری ئەنساری ﷺ دەگێڕێتەوە، من پیاوێك بووم لە هاتنم بۆلای ئافرەت هیچ کەسێك وەك من نەبوو، کاتێك رەمەزان هات، (ظهار)م لە خێزانەکەم کرد، تا رەمەزان دەڕوا نەوەك بکەومە ناو گوناهەوە، لەترسی ئەوەی کە من بە شەو دەچمە لای نەوەك بەڕۆژیش بەردەوام بم لەسەری، منیش بەبێ ئەو ناتوانم، لە شەوێك کە ئەو خزمەتی دەکردم، شوێنێکی بۆم دەرکەوت، منیش چوومە لای( واتە دوای ظهار کردنەکە).

بەیانی چوومە لای خزمەکانم، هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاندن، پێم گوتن، وەرن لەگەڵم بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و هەواڵی خۆمی پێ بدەم.

گوتیان: نەخێر سوێند بەخوا ئێمە ئەمە ناکەین، دەترسێین قورئان بەسەرماندا دابەزێت، یاخود پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکمان لەبارەوە بکا، وەك شەرم لەسەرمان بمێنێتەوە، بەڵام تۆ خۆت برۆ، چیت دەوێت بیکە.

---

[1] بوخاری (١٩٣٦) و موسلیم (١١١١) گێڕاوەتیانەوە.
[2] فتح الباری (٤/١٦٥).
[3] فتح الباری (٤/١٧١) بە دەستکاریەوە.

دەڵێت: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا، هەواڵی خۆم پێ ڕاگەیاند.

فەرمووی: **"تۆ ئەمەت کردووە؟"**

گوتم: من ئەمەم کردووە.

فەرمووی: **"تۆ ئەمەت کردووە؟"**.

گوتم: من ئەمەم کردووە.

فەرمووی: **"تۆ ئەمەت کردووە؟"**.

گوتم: من ئەمەم کردووە، بە حوکمی خوا حوکمم لەسەر بدە، من ئارام دەگرم.

فەرمووی: **"بەندەیەك ئازاد بکە"**.

شەقێکم لە ملی خۆم دا، گوتم: نەخێر، سوێند بەوکەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردووە، توانای ئەمەم نییە.

گوتی: **"دوومانگ بە ڕۆژوو ببە"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەر خوا، ئەوەی توشم بووە، هەر لەبەر ڕۆژووی ڕەمەزان توشم بووە.

فەرمووی: **"شەست هەژار نان بدە"**.

گوتم: سوێند بەو کەسەی تۆی بەحەق ڕەوانە کردووە، ئەو شەومان بەڕێکرد، خواردنی ئێوارەمان نەبوو.

فەرمووی: **"بچۆ لای خاوەنی بەخشین لە هۆزی (زریق) پێی بڵێ لە جیاتت ببەخشێت، لەجیاتی تۆ بیداتە شەست هەژار، ئەوەشی مایەوە بۆ خۆت و ماڵ و منداڵت"**.

دەڵێت: گەڕامەوە ناو هۆزەکەم، پێم گوتم، لە ئێوە هەر قیچکە تەنگی و خراپی بڕیارم بینی، لە پێغەمبەری خواش دڵفراوانی و بەرەکەتم بینی، فەرمانی لە بەخشینی ئێوە بۆ کردم، ئەوانیش بۆیان بەخشیم [1].

**بۆ دڵنەوایی کەسی پرسیارکەر، بابەتەکەی لەسەرخۆی تاقیدەکردەوە، دڵنیایی دەکردەوە کە خۆی پێشەنگە:**

عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە ودەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کارێکی ئەنجام دا، ڕوخستەی ئەنجامدانیشی دا، کەسانێك لەم کارە خۆیان بەدوور گرت، ئەم هەواڵە گەیشتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش وتارێکی دا و سوپاسی خوای کرد، پاشان فەرمووی: **"ئەم**

---

[1] ئەبو داود (٢٢١٣) و ترمذي (٣٢٩٩) و ابن ماجة (٢٠٦٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٢٠٩١) بە سەحیحی داناوە.

**خەڵکانە چیانە، خۆیان لە شتێك دوور دەگرن کە من کردوومە، سوێند بەخوا من لەوان زاناترم بە خوای پەروەردگار و لەوان زیاتر ترسم لێی هەیە".**

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت **"ئەم خەڵکانە چیانە، خۆیان لەشتێك بە دوور دەگرن کە روخسەتی بۆ من تێدایە؟ سوێند بەخوا من لەوان زاناترم بە خوای پەروەردگار و لەوان زیاتر ترسم لێی هەیە".**

ئەم فەرموودەیە: هاندانە بۆ پەیرەوکردنی رێبازی پێغەمبەر ﷺ و نەهیکردنە لە رۆچوون لە بەندایەتیکردن، هەروەها لۆمەیە بۆ ئەوانەی خۆیان بەدووردەخەن لە کارێکی رێگەپێدار و تەنیا لەبەر ئەوەی گومانی تێدا هەیە.

خۆ نزیکردنەوە لە پەروەردگار ﷻ و ترسان لێی، بە گوێرەی ئەم کارە دەبێت کە خۆی فەرمانی پێکردووە، نەك بە گوێرەی بۆچوونی خەڵك و ئەرك قورسکردن کە فەرمانی پێنەدراوە[1].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت، سێ کەس هاتنەماڵی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاریان لەبارەی چۆنیەتی بەندایەتیکردنی پێغەمبەری خواوە ﷺ کرد، کاتێك پێیان راگەێندرا، وەك ئەوەی پێیان وابێت بەندایەتییەکی کەمە، گوتیان: ئێمە لە کوێ و پێغەمبەری خوا ﷺ لە کوێ، پەروەردگار لە گوناهەکانی پێش و دواتریشی خۆش بووە.

یەکێکیان گوتی: من شەو هەر شەونوێژ دەکەم، ئەوی تریان گوتی: من هەموو رۆژێك بە رۆژ دەبم و هیچ رۆژێك ناشکێنم، سێیەمیان گوتی: منیش خۆم لە ئافرەت دووردەگرم و هەرگیز خێزان پێکناهێنم، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان و پێی فەرموون: **"ئەوە ئێوەن وا دەڵێن؟ سوێند بە خوا من لە هەمووتان زیاتر لە پەروەردگار دەترسم و تەقواشم زیاترە، بەڵام بە رۆژوو دەبم و دەیشکێنم، نوێژ دەکەم و دەخەوم، خێزانیش پێك دەهێنم، ئەوەی لە سوننەتی من لابدات لە من نییە"[2].**

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی فەتحی مەککە لە رەمەزاندا بۆ مەککە دەرچوو تا گەیشتە (کراع الغمیم)، دەڵێت: خەڵکەکە بە رۆژوو بوون، هەندێکیان بە پیادە و هەندێکیشیان بە سواری.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/١٠٧).

[2] بوخاری (٥٠٦٣) و موسلیم (١٤٠١) گێڕاوەتیانەوە.

پێی ڕاگەیندرا: خەڵکەکە ڕۆژووەکەیان لەسەر گران بووە، تەماشای تۆ دەکەن بزانن چی دەکەی.

داوای پەرداخێك ئاوی کرد، بەرزی کردەوە تا خەڵك بینی بۆ لای دەمی پیرۆزی هێنا، پاشان خواردیەوە، هەندێك لە خەڵکی ڕۆژوویان شکاند، هەندێکیش ڕۆژووەکەیان نەشکاند، بە پێغەمبەری خوا گوترا کە هەندێك لە خەڵکەکە هەر بە ڕۆژوونە، فەرمووی: **"ئەوانە سەرپێچیکارن، ئەوانە سەرپێچیکارن"**[1].

**نەوەوی** دەفەرموێت: فەرموودەی **"ئەوانە سەرپێچیکاران"**، پەیوەندیدارە بەو کەسەی ڕۆژوگرتن زیانی پێ دەگەیەنێت، یان فەرمانیان بە شکاندن پێکراوە بۆ بەرژەوەندی ڕێگەپێدانی شکانەکە، بەڵام پێچەوانەی واجەکەیان کرد.

لەسەر هەردوو بۆچوون، کەسی ڕێبوار گەر ڕۆژووەکەی زیانی پێ نەگەیەنێت، لە ڕۆژووەکەی گوناهبار نابێت، ئەمەش بە پێی بەڵگەی قسەی جابیر، کە دەڵێت "خەڵکەکە ڕۆژووەکەیان لەسەرگران بووە"[2].

## هەندێك جار دڵی کەسی پرسیارکەری بە پێدانی دیاری خۆش دەکرد، بۆ ئەوەی بزانێت، کە بە پرسیارەکەی دڵگران نەبووە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ؓ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: یەهودییەکان ئەگەر ئافرەت توشی سوڕی مانگانە بووایە، خواردنی دەستیان نەدەخوارد، لەماڵەوە لەگەڵی دانەدەنیشتن، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ﴾ البقرة: ٢٢٢ تا کۆتایی ئایەتەکە، واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (سوڕی مانگانەی ئافرەت) پێیان بڵێ: ئەوە ئازار و زەرەرە، کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون....

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هەموو شتێك بکەن، تەنیا سەرجێی نەبێت"**.

ئەم قسەیە گەیشتە یەهودییەکان، گوتیان، ئەم پیاوە هیچ شتێك نیە پێچەوانەی ئێمەی تێدا نەکات.

ئوسەیدی کوڕی حضیر و عبادی کوڕی بشر هاتن و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا یەهودییەکان واو وا دەڵێن، ئایا ئێمە لەگەڵ ئافرەتەکانمان جیماع نەکەین؟

---

[1] موسلیم(١١١٤) گێڕاوەتیەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧/٢٣٣).

ڕەنگی دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕا، تا وامان زانی لێیان تووڕە بووە، چوونە دەرەوە، شیرێك وەك دیاری هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوایدا ناردن و پێی دان، جا زانیان، کە تووڕە نەبووە [1].

(زانیان کە تووڕە نەبووە)، چونکە ئەوان عوزریان هەبوو، بەهۆی نیەت پاکی لەو قسەیەی کردیان، یان تووڕەبوونەکە بەردەوام نەبوو و نەما [2].

## ئەگەر ئەو شتەی پرسیاری لەبارەیەوە دەکرا، حەڵاڵ بووایە، وەریدەگرت، ئەمەش بۆ دڵنیایی کردنەوەی حەڵاڵییەکەی:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە، کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشت بوون، بەلای ئاوەدانییەکی عەرەبدا تێپەڕین، داوای میواندایان لێکردن، بەڵام میوانداریان نەکردن، پێیان گوتن، ئایا کەسێك لە ئێوە هەیە نوشتە بکات، چونکە گەورەی هۆزەکەمان بریندارە و مار پێوەی داوە؟

یەکێك لە هاوەڵان گوتی: بەڵێ.

هاتە لای و نوشتەی بە سورەتی فاتیحە بۆ کرد، پیاوەکە شیفای بۆ هات، مێگەلە مەڕێکی پێدا، بەڵام هاوەڵەکە ڕەتی کردەوە و گوتی: وەری ناگرم تا لای پێغەمبەر ﷺ باسی دەکەم.

هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و باسەکەی بۆ گێڕاوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا جگە لە سورەتی فاتیحە بە هیچی تر نوشتەم نەکردووە. پێغەمبەر زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: **"چۆن زانیت ئەمە نوشتەیە؟"**.

پاشان فەرمووی: **"لێیان وەربگرن، پشکێکیش بۆ من دابنێن"**.

ئەوەوی دەڵێت: کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"پشکێکیش بۆ من دابنێن"** بۆ دڵخۆشکردنی ئەوان بووە، هەروەها بۆ دڵنیاکردنەوەی کە ئەمە حەڵاڵە و گومانی تێدا نییە.

### لە سوودەکانی فەرموودەکە:

- مرۆڤ گەر کارێکی لەسەر خۆی فەرزکرد، پێویستە ئەنجامی بدا، چونکە ئەبو سەعید ویستی نوشتە بکات و سەرقەڵەمانە بۆ خۆی و هاوەڵەکانی بێت، پێغەمبەری خواش فەرمانی پێکرد بۆ بەڵێنەکەی بە وەفا بێت.
- بەشداریکردن لە دیاری، ئەگەر بنچینەکەی زانراو بێت.

---

[1] موسلیم (٣٠٢) گێڕاوەتیەوە.

[2] مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح (٢٤٥/٢)

- دروستە داوای دیاری بکرێت بۆ ئەو کەسەی حەزی لێیە و وەڵام دەداتەوە.
- دروستە گەر شتێك رووکەشەکەی حەلال بوو وەریبگرێت، گەر گومانێکیشی تێدابوو، وازی لێبهێنێت.
- ئیجتیهادکردن لە کاتی نەبوونی دەقێك، شکۆو گەورەیی قورئان لەسینگی هاوەڵان بەتایبەت سورەتی فاتیحە.
- ئەو رزق و رۆزیەی دابەشکراوەو لەدەستی کەسێك دایە ناتوانێت قەدەغەی بکات بۆ ئەوەی دابەشی کردوە، چونکە ئەم هاوەڵانە رێگریان لێکرا میوانداری بکرێن، بەڵام خوای گەورە بەشی ئەوانی دانابوو، خاوەن ماڵ رێگری لێکردن، پێوەدانی مار بووە هۆکارێك تاوەکو ئەوان بەشی خۆیان وەربگرن.
- حیکمەتێکی گەورەی تێدایە، گەورەی ئەو قەومەی رێگری لێکردن توشی سزا بوو، لە عادەتی خەڵکی وایە گوێڕایەڵی گەورەیان بن، جا کە گەورەیان پێشەنگ بوو لە رێگری لێکردنیان تایبەت کرا بە سزا جگە لەوانی دی، ئەمەش وەك پاداشتێکی پڕ بە پێست.
- حیکمەتێکی تریش: ویستی وەڵامدانەوە لەلایەن ئەو کەسەی داوای شیفای لێدەکرێت با زۆریش بن،چونکە ئەوەی مار پێوە دابوو ئەگەر کەسێکی ئاسایی بووایە ئەوەندە لەلایان جێگای بایەخ نەدەبوو گرینگیان پێنەدەدا [1].

جابری کوڕی عەبدولا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە رەوانەکرد بۆ دەستبە سەرداگرتنی کاروانێکی قورەیش، ئەبو عوبەیدەی کردە ئەمیرمان، کیسەیەکی لە خورما پێداین، لەمە زیاتر هیچی ترمان پێ نەبوو، ئەبو عوبەیدە دەنك دەنك پێی دەداین.

دەڵێت: گوتم: چۆن دەتان خوارد؟

گوتی: وەك منداڵ دەمانمژی، پاشان ئاومان لەسەر دەخواردەوە، لە بەیانی تا شەو بەسمان بوو، بە گۆچانەکانمان لە گەڵای دارمان دەدا، بە ئاو تەڕمان دەکرد و دەمان خوارد.

دەڵێت: چوینە سەر کەناری دەریا، شتێکی گەورەمان بۆ دەرکەوت، کە نزیك بوویەنەوە بینیمان نەهەنگ بوو.

دەڵێت: ئەبو عوبەیدە گوتی: مردووە، پاشان گوتی: نەخێر، ئێمە نێردراوی پێغەمبەری خواین ﷺ و لە پێناو خودا هاتووینە دەرەوە، ئێستاش ناچارین بیخۆین.

---
[1] فتح الباري (٤/٤٥٨)

بۆماوەی مانگێك لەسەری ماینەوە، سێ سەد کەس دەبووین.

دەڵێت: گەر ئێمەت دەبینی کاتێك بە گۆزە رۆنمان لە چاڵایی چاوەکانی دەردەهێنا، پارچەی گۆشتی بە قەد گاجوتێکمان لێ دەکردەوە.

ئەبو عوبەیدە سێزدە کەسی بردو لە چاڵایی چاوەکانی دانیشتن، پەراسوویەکی لە پەراسووەکانی دەرهێنا و چەقاندی، گەورەترین حوشتری ئێمە بەژێریدا تێپەڕی، زادی خۆمان لە گۆشتی ئامادەکراو [1] بۆ گەشت لێ پڕکرد.

کاتێك هاتینەوە مەدینە، چوینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆمان گێڕایەوە.

فەرمووی: **"ئەمە رزقێك بووە خوای پەروەردگار بۆتانی ناردووە، ئایا هیچتان پێ ماوە پێمانی بدەن؟"**.

دەڵێت: هەندێکمان بۆ پێغەمبەری خوا نارد، ئەویش خواردی [2].

## پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی پرسیاری ناموسڵمانانیشی دەدایەوە:

ثوبانی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووم، زانایەکی یەهودی هات.

گوتی: السلام علیك ئەی موحەممەد.

پاڵێکم پێوەنا خەریك بوو بەربیمەوە.

گوتی: بۆ پاڵم پێوەدنێی؟

گوتم: ئەی نابێ بڵێی پێغەمبەری خوا.

یەهودییەکە گوتی: ئێمە بەو ناوە بانگی دەکەین، کە کەس و کاری ناویان ناوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"من ناوم موحەممەدە، ئەو ناوەی کەسوکارم لێیان ناوم"**.

یەهودییەکە گوتی: هاتوومە لات بۆ پرسیارێك.

فەرمووی: **"ئایا هیچ سوودی بۆت دەبێت، گەر وەڵامت بدەمەوە؟"**

گوتی: بە گوێیەکانم گوێت لێ دەگرم.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە دارێك هێڵێکی لە زەوی دروستکرد [3] پاشان فەرمووی: **"بپرسە"**.

---

[1] گۆشتێکە کەمێك دەکوڵێندرێت بەڵام پێناگات، پاشان بۆ گەشت هەڵدەگیرێت.

[2] بوخاری (٢٤٨٣) و موسلیم (١٩٣٥) گێراوەتیانەوە

[3] هێڵێکی بە دار لە زەوی دورستکرد، ئەمە کاریگەری لەسەر کەسەکە دەبێت، ئەمە کاری بیرمەندانە. شەرحی نەوەوی (٣/٢٢٦).

یەهودییەکە گوتی: کاتێك زەوی و ئاسمانەکان دەگۆڕدرێن، مرۆڤ ئەوکات لە کوێیە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەوان لە تاریکی پردن[1]"**.

گوتی: کێ یەکەم کەسە بەسەریدا دەپەڕێتەوە.

فەرمووی: **"هەژارانی موهاجیرەکان"**.

یەهودییەکە گوتی: چیان پێ دەدرێت کاتێك دەچنە بەهەشتەوە؟

فەرمووی: **"جەرگی نەهەنگ"**.

گوتی: ئەی خواردنیان چییە؟

فەرمووی: **"گاجوتی بەهەشتیان بۆ سەردەبڕدرێت کە لەهەموو لایەکەوە دەخورێت"**.

گوتی: ئەی خواردنەوەیان؟

فەرمووی: **"لە کانیاوێك ناوی سەلسەبیلە"**.

یەهودییەکە گوتی: راستت فەرموو، بەراستی تۆ پێغەمبەری.

پاشان رۆیشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بەڕاستی پرسیاری لەبارەی شتێك لێکردم، کە هیچ زانیاریم لەبارەی نەبوو، تا پەروەردگار بۆی ناردم[2]"**.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەبدوڵای کوڕی سەلام هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە، پرسیاری لەبارەی هەندێك شت لێکرد.

گوتی: من پرسیارت لەبارەی سێ شت لێ دەکەم، کەس نایانزانێت تەنیا پێغەمبەر نەبێت، یەکەم نیشانەی رۆژی دوایی چییە؟ یەکەم خواردنی ئەهلی بەهەشت چییە؟ منداڵ بۆ بە دایکی یان باوکی دەچێت؟

فەرمووی: **"یەکەم نیشانەی رۆژی دوایی ئاگرێکە لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا خەڵك دەمازوا.**

**یەکەم خواردنی ئەهلی بەهەشت بریتییە لە جەرگی نەهەنگ، منداڵیش گەر ئاوی پیاوەکە پێش ئاوی ئافرەتەکە کەوت، منداڵەکە بە پیاوەکە دەچێت، گەر ئاوی ئافرەتەکە پێش ئاوی پیاوەکە کەوت، منداڵەکە بە ئافرەتەکە دەچێت.**

گوتی: أشهد أن لا إله إلا الله وأنّك رسولُ الله[3].

---

[1] پردی صیراط.

[2] موسلیم گێراوەتیەوە(٣١٥).

[3] بوخاری گێراوەتیەوە(٣٩٣٨).

موغەیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك چومە نەجران لێیان پرسیم و گوتیان: ئایا ئێوە ناخوێننەوە ﴿ يَـٰٓأُخۡتَ هَـٰرُونَ ﴾ مريم: ٢٨، لە کاتێکدا نێوان عیسا و موسا زۆر بووە [1]؟

نەمزانی وەڵامیان بدەمەوە.

کاتێك هاتمەوە مەدینە، چومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو پرسیارەم لێکرد؟

فەرمووی: **"پێت گوتبان، ئەوان منداڵەکانیان بە ناوی پێغەمبەران و پیاوچاکانی پێش خۆیان دەکرد [2]".**

واتە: ئەو هارونەی لە فەرمایشتی پەروەردگار ﴿ يَـٰٓأُخۡتَ هَـٰرُونَ ﴾ هاتووە، پێغەمبەر هارونی برای موسا نییە، بەڵکو مەبەست لێی پیاوێکی ترە بەناوی هارونەوە ناونراوە، چونکە ئەوان ناوی منداڵەکانیان بە ناوی پێغەمبەران و پیاوچاکانی پێش خۆیان دەکرد [3].

## پێغەمبەر ﷺ وەڵامی پرسیاری پەرییەکانی دەدایەوە:

عامیر دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پرسیارم لە عەلقەمە کرد، ئایا ئیبن مەسعود لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە لە شەوی پەرییەکان (الجنّ)؟

عەلقەمە گوتی: من پرسیارم لە ئیبن مەسعود کرد، گوتم: ئایا کەس لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە لە شەوی پەرییەکان (الجنّ)؟، گوتی: نەخێر، بەڵام شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا بووین لە مەککە، ناکاوێك پێغەمبەرمان ون کرد، لە نێوان دۆڵ و شیوەکاندا بەدوایدا گەڕاین، دەمانگوت فڕیووە یان رفێندراوە.

ئەم شەوە لە ناخۆشترین شەو ماینەوە.

کاتێك بەیانیمان کردەوە و بینیمان وا لەبەرامبەر حیراوە دێت.

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆمان لێ بزربوو، بەدوات گەڕاین، نەماندۆزیتەوە، ئەم شەوە لە ناخۆشترین شەو ماینەوە.

فەرمووی: **"بانگخوازێکی پەرییەکان هاتە لام، لەگەڵی رۆیشتم، قورئانم بەسەردا خوێندن".**

ئێمەی لەگەڵ خۆی برد، شوێنەواری ئەوان و شوێنی ئاگرکردنەوەکانیانی پێ نیشان داین.

---

(١) واتە: لەبەر ماوەی زۆری نێوانیان، ناکرێت مەریم خوشکی هارونی برای موسا بێت.

(٢) موسلیم گێراوەتیەوە(٢١٣٥).

(٣) تحفة الاحوذي (٤٧٧/٨).

جنۆکەکان لەبارەی خواردنەوە پرسیاریان کرد، ئەویش فەرمووی: **"بۆ ئێوە هەیە، هەر ئێسکێك بکەوێتە بەردەستان و ناوی خوای لەسەر هێندرابێت، گۆشتی زیاتر پێوەیە، پشقلیش ئالیکە بۆ ئاژەڵەکانتان".**

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"لە کاتی سەرئاودا خۆتان بەمانە پاك مەکەنەوە، چونکە خواردنی براکانتانە"**[١]..

(بۆ ئێوە هەیە هەر ئێسکێك ناوی خوای لەسەر هاتبێت): زانایان دەفەرموون، ئەم رستەیە بۆ باوەڕدارانی پەرییەکانە، بەڵام بۆ ئەوانی تر، لە فەرموودەی تردا هاتووە، خواردنەکانیان ئەو شتانەن کە ناوی خوایان لەسەر نەهاتووە.[٢]

---

[١] موسلیم گێراوەتیەوە(٤٥٠)

[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٤/١٧٠).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ عەرەبە دەشتەکییەکان:

لە کەمالی ڕەوشتی ئەو ﷺ جوان مامەڵەکردن بووە لەگەڵ ئەو چینەی کە لەنێو خەڵکیدا بە تەبیعەت توندی ناسراون، چەندان هەڵوێستی گەورە و جوانی لەگەڵ ئەعرابیە دەشتەکییەکان هەبووە، ئەوانەی بە قسە و کردەوەی توند ناسراون. پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ﴾ التوبة: ٩٧ واتە: زۆربەی عەرەبە کۆچەری و دێهاتی و بیابان نشینەکان (لە عەرەبە شارنشینەکان) دڵ ڕەقترن لە بارەی کوفر و دووڕووییەوە (چونکە دوورن لە سەرچاوەکانی زانست و مەدەنیەتەوە)، شایستەترن ئەو سنوورانە نەزانن کە: خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی.

لەگەڵ ئەو تووڕەیی و توندییەی هەیانبووە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە سۆز و نەرمونیانی لەگەڵیان جوڵاوەتەوە وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴾ آل عمران: ١٥٩

واتە: ئەی ﷺ موحەممەد بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تووڕە و قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورە و داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە، لە کارو پێشهاتدا پرس و رایان پێبکە، (دوای مەشۆرەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارتدا (کارێك ئەنجام بدەیت، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا ببەستە، چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن.

ئاشکرایە ئەعرابییەکان خەڵکی دەشت و بیابان بوون کە بە وشك و ڕەقی ناسراون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێت **"من بدا جفا**[(١)]**"**.

لە (النهاية ١/٢٨١) دەڵێت: واتە هەرکەسێك لە دەشت نیشتەجێ بێت، هەڵسوکەوتی توند دەبێت، ئەمەش بە هۆی کەمی تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵك: الجفاء: واتە تەبیعەت توندی.

---

[(١)] ئەحمە (٨٦١٩) لە ئەبو هورەیرە گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٦١٢٣) بە سەحیحی داناوە.

هەر کەسێك لە دەشت بژیت، ئەو توند و رەقییە دەبێتە میراتی، تەنانەت توندی و رەقی لە وشەکانیدا دیارە، بە پێچەوانەوەی ئەوانەی لە شار نیشتەجێن، هەست دەکەی وشەکانیان بەراورد بە کەسی دەشتەکی نەرمتر و جوانترن.

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغْرَمًا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَ ۚ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ ٱلْأَعْرَابِ مَن يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِ ۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرْبَةٌ لَّهُمْ ۚ سَيُدْخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ التوبة: ٩٨-٩٩

واتە: لەو عەرەبە بیابان نشینانە، کەسانێکیان هەیە کە ئەوەی دەیبەخشێت بەسەرانە و غەرامەی دەزانێت چاوەڕێی ئەوە دەکەن چەندەها بەڵاو ناخۆشی بێتە سەرتان، یاخوا مەینەتی خراپ بەسەر ئەواندا بێت، خوایش هەمیشە بیسەرە (بە گوفتاریان)، زانایە (بە نیەتیان). لەو عەرەبە بیابان نشینانە کەسانی تریان هەیە کە ئیمان و باوەڕ بەخواو بەرۆژی دوایی ئەهێنن و ئەوەی خەرجی دەکەن و دەیبەخشن بەچەندەها هەنگاوی نزیك بوونەوەی لای خوای دادەنێن و بۆ ئەوەی بەهرەمەند بن لە چەندەها دۆعای خێری پێغەمبەر، ئاگاداربن بەراستی ئەو بەخشینەیان مایەی سەرفرازی و نزیك بوونەوەیانە لە خواوە، سەرئەنجام خوا دەیانخاتە ژێر سایەی رەحمەتیەوە، بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْأَعْرَابِ مُنَٰفِقُونَ ۖ وَمِنْ أَهْلِ ٱلْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا۟ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴾ التوبة: ١٠١

واتە: لەو ناوچانەی دەووروبەرتان هەندێ عەرەبی بیابان نشینی دووڕوو هەن و هەندێ لە دانیشتوانی شار (المدینە) راهاتوون لەسەر دووڕووی و زرنگن لەو بارەیەوە، تۆ (ئەی پێغەمبەر ﷺ)نایانناسیت، بەڵکو ئێمە دەیانناسین، لەمەودوا ئەوانە هەر لە دنیادا دووجار ئازاریان دەدەین، پاشان دەبرێنەوە بەرەو سزاو ئازارێکی زۆر سەخت و دژوار.

## بۆیە لەناویاندا باوەڕدار و دووڕوو هەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز رازی نەدەبوو بۆ هاوەڵانی، ئەوانەی لە دەشت و بیابانەوە هاتبان و لە مەدینە نیشتەجێ بووبان، جارێکی تر بگەڕێنەوە دەشت، ئەم کارەشی لە گوناهە گەورەکان ئەژمار دەکرد.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: "سوو خۆر، بریکارەکەی، نوسەری سوو ئەگەر بزانن ئەمە سووە، ئەو کەسەی دەست و دەم و چاوی خەڵك دەکوتێت، ئەو کەسەش بۆ جوانی خۆی دەکوتێت، ئەو کەسەی زەکات نادات، ئەعرابیەکی دەشتەکەی دوای کۆچکردنی بگەڕێتەوە دەشت، ئەمانە هەموویان لەسەر زمانی موحەممەد ﷺ لە ڕۆژی دوایدا نەفرین لێکراون[1]".

بەڵام ئەم بڕیارە بۆ هەندێك بارودۆخی جیاواز، ڕێگەی پێدراوە.

سەلمەی کوڕی ئەکوەع چووە لای حەجاج، پێی گوت: ئەی کوڕی ئەکوەع لە دینی خۆت هەڵگەڕایتەوە و بویتەوە ئەعرابی؟

ئەویش گوتی: نەخێر، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەشت ڕێگەی پێداوم[2].

**سەرباری توندی و توڕەییان، ئەو بە سۆز و نەرمونیان بوو لەگەڵیان، شێوازی نەرمی لە ئامۆژگاری و ڕێنیشاندان لەگەڵ بەکار دەهێنان:**

ئەمەش زۆر بە ڕوونی لە شێوازی مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ دیارە، لەگەڵ ئەو ئەعرابیەی میزی لە مزگەوت کرد.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دانیشتبووین، ئەعرابیەك هات، میزی لەناو مزگەوت کرد، هاوەڵانی پێغەمبەر گوتیان: بوەستە بوەستە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"مەیپچڕێنن، وازی لێبێنن"**.

لێی گەڕان تاوەکو تەواو بوو.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کرد، پاشان پێی فەرموو: **"مزگەوتەکان ناشێن بۆ میزکردن و یان بەم شێوە پیس بکرێن، بەڵکو شوێنێکن بۆ یادی خوای پەروەردگار و نوێژکردن و قورئان خوێندن"**.

دەڵێت: فەرمانی بە پیاوێك کرد هەندێك ئاو بێنێت بە شوێنەکەدا بکات[3].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەعرابیەك هاتە مزگەوت، پێغەمبەری خواش ﷺ دانیشتبوو، نوێژی کرد، کاتێك تەواو بوو، گوتی: خوایە ڕەحم بە من و موحەممەد بکەی، ڕەحم بەکەسی تر نەکەی.

---

[1] النسائي (٥١٠٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی دەڵێت: (صحیح لغیره) التعلیقات الحسان (٣٢٤١).

[2] بوخاری (٧٠٨٧) و موسلیم (١٨٦٢) گێراوەتیانەوە. بوخاری بەشێکی بەو بابەتە ناوناوە (باب التعرب في الفتنة).

[3] بوخاری (٢١٩) و موسلیم (٢٨٥) گێراوەتیانەوە.

پێغەمبەر ئاوڕی لێدا یەوەو فەرمووی: **"بەڕاستی شتێکی فراوانت تەسك کردووە"**.

زۆری پێنەچوو راستەوخۆ میزی لەناو مزگەوت کرد، خەڵکەکە بە پەلە بۆلای چوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هەندێك ئاوی بەسەردا بڕێژن"**.

پاشان فەرمووی: **"ئێوە رەوانەکراون بۆ ئەوەی ئاسانکار بن، نەك زەحمەتکار بن"**[1].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ئەعرابیەکە دوای ئەوەی تێگەیشت، گوتی: بە دایك و بابمەوە بە قوربانت بم.. پێغەمبەری خوا ﷺ سەرزەنشتی نەکرد و قسەی ناشیرینی پێ نەگوت، بەڵکو فەرمووی: **"لە مزگەوتەکان میزناکرێت، بەڵکو بۆ یادکردنەوەی پەروەردگار و نوێژکردن بونیاد نراون"**، پاشان فەرمانی کرد هەندێك ئاو برژێندرێت بەسەر شوێنەواری میزەکە[2].

**. لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نەرمونیانی لەگەڵ کەسی نەزان و فێرکردنی بە بێ توندوتیژی و ئازاردانی، بەتایبەت ئەگەر سەرپێچییەکەی بە گاڵتەکردن یان بە عینادی نەبوو، هەروەها کەسێکیش بوو پێویستی بە نەرمونیانی هەبوو.
- میهرەبانی و ڕەوشت جوانی پێغەمبەر ﷺ
- لادانی یەکێك لە دوو زیانەکان، بە گوێرەی کەمی زیانەکەی، بە بەڵگەی فەرموودەکەی ﷺ (وازی لێبێنن).. زانایان دەڵێن، ئەم فەرموودەیە (وازی لێبێنن) لەبەر دوو بەرژەوەندی بووە:
- **یەکەمیان:** ئەگەر میزکردنەکەی لەسەر ببڕایە زیانی پێ دەگەیاند، لە کاتێکدا پیسکردنەکە روویداوە، بۆیە مەزەندەی زیادکردنی پیسییەکە لە پێشترە لە زیانگەیاندن بە کەسەکە.
- **دووەمیان:** پیسکردنەکە لە بەشێکی بچووکی مزگەوتەکە روویدا، ئەگەر خەڵکەکە چوویانە سەری، دەبووە هۆی پیسبوونی جلوبەرگ و لاشەی و بەشێکی گەورەتری مزگەوتەکە.
- خۆپاراستن لە پیسی کارێکە لە دەروونی هاوەڵان چەسپاوە، بۆیە لەبەردەم پێغەمبەر ﷺ یەکسەر ئەم کارەیان رەتکردەوە، بێ ئەوەی مۆڵەتی لێوەربگرن، چونکە فەرمانکردن بە چاکە و رێگری کردن لە خراپە لە دڵیان چەسپاوە.

---

[1] بوخاری (٢٢٠) و موسلیم (١٤٧) گێراوەتیانەوە.

[2] ابن ماجە (٥٢٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح سنن ابن ماجە ٥٢٩) بە سەحیحی داناوە.

- دەستپێشخەری بۆ نەهێشتنی خراپیەکان کاتێك رێگرەکە نەما، ئەمەش کاتێك لە میز کردنەکە تەواو بوو ئاویان بە شوێنی پیساییەکەدا کرد.
- ئەو ئاوەی پیسایی پێ شوراوەو کەوتۆتە سەر زەوی ئەوە پاکە، ئەوەی نەکەوتبێتە سەرزەوی ئەویش پاشکۆی ئەوە،چونکە ئەو تەڕاتیەی مایتەوە لەسەر زەوی ئەوە تەراتی شوشتنی پیساییەکەیە، جا ئەگەر نەزانرا خۆڵەکە گوازرایتەوەو، زانیمان، کە مەبەست پاککردنەوەیە،ئەوا حوکم دەدرێت بە پاکی تەراتیەکە، جا، کە پاك بوو ئەوەی لێشی جیادەبێتەوە ئەوەش حوکمی پاکی بۆ دەدرێت، چونکە جیاوازی لەنێوانیاندا نییە
- پیرۆز ڕاگرتنی مزگەوت و پاراستنی لە پیسبوون.
- زەوی بە رشتنی ئاو بەسەریدا پاك دەبێتەوە، پێویست ناکات چاڵ هەڵبکەندرێت.

## بە لێبوردەیی و چاکە وەڵامی توڕەیی و خراپەکانیانی دەدایەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشتم، پۆشاکێکی نەجرانی [1]لەبەربوو، کە لێواری ئەستور بوو.

ئەعرابیەك هاتە لای، بە توندی پێغەمبەری بۆلای خۆی ڕاکێشا، تا پۆشاکەکەی دڕا و لێوارەکەی لە ملی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ گیربوو، تەماشی گەردەنی پێغەمبەرم کرد، لەبەر توند ڕاکێشانی بینم شوێنەواری لێواری پۆشاکەکەی پێوە دیاربوو.

پاشان گوتی: ئەی موحەممەد، لەو پارەیەی،کە هی خوایە لەلاتە هەندێکم پێ بدە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوڕی لێدایەوەو پێکەنی، پاشان فەرمانی کرد پێی بدرێت [2].

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- نیشاندانی کەمالی ڕەوشت جوانی و نەرمونیانی و لێبوردەیی پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەها ئارامگرتنی لەسەر ئازاردان لە جەستە و لە ماڵ. لێخۆشبوون لە توندی کەسێك،کە دەیەوێت دڵی بە ئیسلامەوە ببەستێەوە، با کاربەدەستەکانیش ئەو بکەنە پێشەنگی خۆیان لە لێبوردەیی و چاوپۆشین و پاڵنان بەوەی باشترینە.
- بەرگەگرتنی کەسی نەزان
- وەڵامدانەوەی خراپە بە چاکە، بەخشین بە کەسێك کە دڵی پەیوەست بکەی.
- لێبووردن لە ئەنجامدەری خراپە. بە هۆی نەزانینیەکەی سزای لەسە رنییە.
- دروستە پێکەنین بەرامبەر کارێك بێت، کە لە عادەتدا شتێکی سەیر بێت.

---

[1] مەبەست پۆشاکی ناوچەی نجرانە، وڵاتێکە دەکەوێتە نێوان حیجاز و یەمەن.

[2] بوخاری (٣١٤٩) و موسلیم (١٠٥٧) گێراوەتیانەوە.

**هەر لە نەرمونیانی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر ئەعرابییە دەشتەکییەکان:**

ئەبو موسا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، کە لە جعرانە لە نێوان مەککە و مەدینە دابەزیبوو، بیلالیشی لەگەڵ بوو.

ئەعرابیەکە هاتە خزمەت پێغەمبەر و گوتی: ئایا ئەو بەڵێنەی بە منت داوە جێبەجێی ناکەی[1]؟

پێغەمبەریش فەرمووی: **"مژدەت لێ بێت"**.

ئەعرابیەکە گوتی: بەراستی زۆرت بەسەرداکردم لەوەی بڵێی مژدەت لێ بێت.

بە توڕەیی چووە لای ئەبو موسا و بیلال، پێی گوتن: **" مژدەکەی ڕەت کردەوە ئێوە وەڵامی بدەنەوە و قبوڵی بکەن"**.

ئەوانیش گوتیان: قبوڵمان کرد.

پاشان پێغەمبەر ﷺ داوای جامە ئاوێکی کرد، دەست و دەموچاوی شوشت و ئاوی لە دەمی وەرکرد، پاشان فەرمووی: **"لێی بخۆنەوە و دەم و چاو و ملی خۆتانی پێ بشۆن، مژدە بدەن"**.

جامەکەیان گرت و وایان کرد، دایکی سەلمە لە پشت پەردەوە داوای لێکردن بەرماوەکەی بدەنە دایکیان، ئەوانیش بەرماوەکەیان دایە دایکیان و بەشی کۆمەلێکی تریشی کرد[2].

قرطبي دەفەرموێت: قسەی ئەعرابیەکە،کە گوتی: بەراستی زۆرت بەسەرداکردم لەوەی بڵێی مژدەت لێ بێت.

قسەیەکی رەق و نەزانانە بووە بە حاڵی پێغەمبەر ﷺ و بەو مژدەیەی پێیداوە، گەر وەری بگرتبایە، بەڵام پشتی تێکرد و نەیویست، بۆ یەکێکی تر چوو، کە قبوڵی کرد.

بشری: هەواڵێکە دڵ خۆش دەکات، بۆیە بەم ناوە ناونراوە چونکە خۆشی دەخاتە سەر جەستەی مژدەپێدراوەکە، لە بنچینەدا بۆ خێر بەکاردێت، ئەگەر فراوانیشی بکەیت بۆ شەریش بەکاردێت.

[1] دەگونجی بەڵێنەکە تایبەت بێت و دەشگونجێ گشتی بێت، داواکەی بۆ ئەوە بووە، کە پەلە بکات لە پێدانی بەشەکەی لە غەنیمە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کاتەی لە جەعرانە بووە، فەرمانی کرد غەنیمەکان کۆ بکرێتەوە، دوای ئەوە بەلەشکرەکەی رویکردە تائیف، پاشان گەڕایەوە بۆ جەعرانە و غەنیمەکانی دابەشکرد، بەشێکی زۆر لەوانەی تازە ئیسلام بووبوون، بەشەکەی خۆیان درەنگ وەردەگرت ئاوا مامەڵەیان دەکرد.

[2] بوخاری (٤٣٢٨) و موسلیم (٥٠٣) گێراوەتیانەوە.

فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە گوتی **"مژدەت لێ بێت"**، جۆری مژدەکەی دیاری نەکرد، چونکە ویستی مژدەی خێری بە گشتی پێ بدات کە سوودی بۆ دونیا و دواڕۆژی هەبێت.

کاتێك نەیویست، ئەو مژدەیە بۆ کەسێکی تر چوو، کە ڕێزی دەزانێت، قبوڵی کرد و لەو مژدانە خێری گەورەی دەست کەوت.

کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ دەموچاوی خۆی بە ئاوەکە شوشت و ئاوی دەمی تێکرد و فەرمانی کرد بیخۆنەوە و مەسحی پێ بکەن، بۆ گەیاندنی خێرەکە بووە بۆ ئەو دووانە [1].

**لەو کەسە دەبورێت کە هەوڵی کوشتنیدا:**

جابری کوری عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: کە پێش ناوچەی نەجد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای کرد، کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەڕێکەوت، ئەویش لەگەڵی بەڕێکەوت، لە دۆڵێکی پڕ لە داری بە دڕك توشی گەرمای توندی نیوەڕۆ بوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزی و خەڵکەکەش بڵاوەیان کرد و بۆ سێبەر چوونە ژێر دارەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر دارێکی چڕوپڕ دانیشت و شمشێرەکەی بە دارەکە هەڵواسی.

جابر دەڵێت: کەمێك نوستین، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردین، چووینە خزمەتی، بینیمان ئەعرابیەك لەلای دانیشتووە [2].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو کابرایە شمشێرەکەی هەڵکێشا و منیش نوستبووم، بە ئاگاهاتم، بینم شمشێری لە دەستە".**

**پێی گوتم: لێم دەترسێی؟**

**گوتم: نەخێر**

**پێی گوتم: کێ لە بەردەستم ڕزگارت دەکات؟**

**گوتم: الله سێ جار، شمێرەکەی خستەوە کالانەکەی.**

**ئەوە دەبینن ئێستا دانیشتووە** [3].

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ سزای نەدا [4].

---

[1] المفهم (٦/٤٤٨).

[2] وەك لە گێرانەوەی حاکمدا هاتووە، ئەو پیاوە غورثي کوڕی حارث بووە.

[3] ئەعرابیەکە کاتێك ئەو دامەزراوەیە گەورەیەی بینی، زانی دەستی پێناگات و ڕاستیەکەی بۆ دەرکەوت، چەکەکەی فرێدا خۆیدا و بەدەستیەوە.(فتح الباری ٧/٤٢٧).

[4] بوخاری (٢٩١٠) و موسلیم (٨٤٣) گێراوەتیانەوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: شمشێرەکەی لە دەستی کەوتە خوارەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵیگرتەوە، ئینجا پێی فەرموو: **"کێ تۆ لەدەستم رزگارت دەکات؟"**.

ئەعرابیەکە گوتی: ببە بەباشترین وەرگر.

پێی فەرموو: **"شاهێدی ددەی هیچ خوایەك نییە جگە لە الله، منیش پێغەمبەری خودام؟"**

گوتی: بەڵێنت پێ دەدەم کە شەڕت لەگەڵ نەکەم، لەگەڵ ئەو قەومەش نابم کە شەڕت لەگەڵ دەکەن.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ رێگەی پێ دا بڕوا، گەڕایەوە ناو هۆزەکەی پێ گوتن: لەلای باشترین کەسەوە هاتوومەتەوە لاتان [1].

پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆی زۆر حەزکردنی لە پەیوەستکردنی دڵی بێ باوەڕەکان و ئیسلام بوونیان، چاکەی لەگەڵ ئەو ئەعرابییە کردووە و سزای نەداوە، بەڵکو لێی خۆش بوو.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- سەرکردە واز لە سزادانی ئەو کەسە بهێنێت کە مامەڵەی رەقی لەگەڵ کردووە، ئەگەر ویستیشی لێی خۆش ببێت.
- پیشاندانی ئارامگرتنی پێغەمبەر ﷺ و نەرمونیانی و لێخۆشبوونی لە کەسی نەزان.
- پیشاندانی ئازایەتی و خۆڕاگری و دامەزراوەیی پێغەمبەری خوا ﷺ، هەروەها دڵنیابوونی لەوەی پەروەردگار خۆی و دینەکەی سەر دەخا [2].

**لەبەرامبەری زۆر پرسیارکردنیان، ئارامی دەگرت و وەڵامی دەدانەوە:**

زۆرن ئەوانەی پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەکرد، هاوەڵە بەڕێزەکان ﷺ رێزی پێغەمبەریان دەگرت و شەرمیان لێ دەکرد، پرسیاریان لە شتێك نەدەکرد،کە بێ دەنگی لێکرابێت، ئەمەش لەترسی ئەوەی نەوەك ئەو شتە حەرام بکرێت، لە ئەنجامدا کەسی پرسیارکەر دەبێتە هۆی حەرامبونی و گوناهباریش دەبێت.

دڵخۆش دەبوون بە هاتنی ئەعرابیەکان بۆ مەدینە کاتێك پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد، ئەویش وەڵامی دەدانەوە، هاوەڵە بەڕێزەکانیش سوودیان لێ دەبینی.

نەواسی کوڕی سەمعان ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: بۆ ماوەی ساڵێك لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە مامەوە، هیچ شتێك نەبوو رێگری کۆچکردنم لێ بکات تەنیا

---

[1] الحاكم (٤٣٢٢) گێراوەتیەوە، لەسەر مەرجی (الشيخين) بە سەحیحی داناوە، الذهبي رەزامەندی لەسەر دەربڕیووە، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ٢٨٧٢) بە سەحیحی داناوە.

[2] شەرحی سەحیحی بوخاری ابن بطال (١٠١/٥).

پرسیارکردن نەبێت، هەر کەسێك لە ئێمە گەر کۆچی کردبا، هیچ پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەکرد [1].

واتە: ئەو وەکو سەردانیکارێك لە مەدینە ماوەتەوە، ئەوەی ڕێگری لێکردووە لە کۆچکردن و نیشتەجێبوون لە مەدینە تەنیا حەزی پرسیارکردن بووە لە کاروباری دین، ئەم کارەی ڕێگەی پێدراوە بۆ ئەوانەی کاری پەلەیان هەیە، نەك کۆچکردووەکان، هەرکاتێکیش کەسێکی غەریب لە ئەعرابیەکان یان کەسانی تر هاتبان، کۆچکردووەکان دڵیان خۆش دەبوو بە پرسیارەکانیان و سوودیان لە وەڵامەکی وەردەگرت.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: وازمان هێنابوو پرسیار لە شتێکی ناپێویست لە پێغەمبەر ﷺ بکەین، پێمان سەیربوو کاتێك پیاوێك لە خەڵکی دەشتەوە دەهات و پرسیاری لێ دەکرد و ئێمەش گوێمان لێی دەبوو.

کاتێك ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دانیشتبووین، پیاوێك بە وشترەوە هاتە ژوورەوە، وشترەکەی یخ کردوو و پاشان بەستیەوە.

پاشان گوتی: کامەتان موحەممەدە؟ پێغەمبەریش ﷺ لەناویاندا پاڵکەوتبوو.

پێمان گوت: ئەم پیاوە سپییەی پاڵکەوتووە.

پیاوەکە پێی گوت: ئەی کوڕی عەبدولموتەڵیب

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی "**بڵێ وەڵامت دەدەمەوە**"

پیاوەکە بە پێغەمبەری ﷺ گوت: من لەبارەی بابەتێك لەسەر تۆ زۆر توندم و پرسیارت لێ دەکەم.

فەرمووی: "**چیت دەوێت بپرسە**".

پیاوەکە گوتی: ئەی موحەممەد، نێردراوی تۆ هاتە لامان، وای پێگوتین کە تۆ دەڵێیت من نێردراوی خوام؟

فەرمووی: "**ڕاستی گوتووە**".

پیاوەکە گوتی: کێ ئاسمانی دروستکردووە؟

فەرمووی: "**الله**".

پیاوەکە گوتی: کێ زەوی دروستکردووە؟

فەرمووی: "**الله**".

پیاوەکە گوتی: ئەی کێ ئەم شاخانە لە زەوی چەقاندووە و ئەو شتانەی لێداناون؟

---

[1] موسیلم (٢٥٥٣) گێراوەتیەوە.

فەرمووی: **"الله"**.

گوتی: سوێندت دەدەم بەوەی ئاسمان و زەوی دروستکردووە و شاخەکانی چەقاندوون، خوا تۆی رەوانە کردووە؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە لە شەو و رۆژێکدا پێنج نوێژمان لەسەرە؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: سوێنددت دەدەم بەوەی تۆی رەوانەکردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێکردووی؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە زەکاتی ماڵ و سامانمان لەسەر واجبە؟

فەرمووی **"بەڵێ"**.

گوتی: سوێنددت دەدەم بەوە تۆی رەوانەکردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێکردووی؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە رۆژووگرتنی مانگی رەمەزانمان لەسەر واجبە؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: سوێنددت دەدەم بەوە تۆی رەوانەکردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێکردووی؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: نێردراوەکەت دەڵێت کە واجبە لەسەر ئەو کەسەی توانای هەیە حەجی ماڵی خوا بکات؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

گوتی: سوێنددت دەدەم بەوەی تۆی رەوانەکردووە، خوا فەرمانی ئەمەی پێکردووی؟

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

پاشان رووی وەرگێڕا و گوتی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق راوەنە کردووە، نە لەمە زیاتر دەکەم نە کەمتر.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"گەر راست بڵێت، بە دڵنیاییەوە دەچێتە بەهەشت[1]"**.

[1] بوخاری (٦٣٣) و موسلیم (١٢) گێراوەتیانەوە. پێشتریش باسکراوە.

**پێغەمبەر ﷺ بەرگەی قسە پێڕینی ئەوانی دەگرت، لەوانەشە بۆیە وەڵامەکەی دواخستبێت بۆ ئەوەی لە قسەکانی تەواو بێت:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ قسەی بۆ خەڵك دەکرد، پیاوێکی دەشتەکی هات و گوتی: کەی ڕۆژی دواییە؟

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام بوو لە قسەکردنی.

هەندێکیان گوتیان: گوێی لەو قسەیە بوو، بەڵام پێی خۆش نەبووە.

هەندێکیش گوتیان: بەڵکو گوێی لێ نەبووە.

تا قسەکانی تەواوکرد، فەرمووی: **"کوا ئەو کەسەی پرسیاری لە ڕۆژی دوایی کرد؟"**.

گوتی: ئەوەتام ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"گەر ڕاسپاردە (ئەمانەت) لە دەستچوو، چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بکە"**.

گوتی: چۆن ڕاسپاردە لە دەست دەچێت؟

فەرمووی: **"گەر کاروبارەکان خرانە بەردەستی کەسێك کە شیاو نەبوو، چاوەڕێی ڕۆژی دوایی بکە[1]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- پێویستە کەسی پرسیارکەر فێر بکرێت، بە بەڵگەی فەرموودەکە (**کوا ئەوەی پرسیارکەرەی کرد؟**) پاشان وەڵام دانەوەی.
- لە ئادابەکانی کەسی زانستوەرگر ئەوەیە ئەگەر زاناکە سەرقاڵی قسەکردن بێت نابێت پرسیاری لێ بکات، چونکە ئەو خەڵکەی قسەیان بۆ دەکات، مافیان زیاترە لەو کەسەی دواتر پرسیار دەکات
- نەرمونیانی لەگەڵ کەسی پرسیارکەر، تەنانەت گەر شێوازی پرسیارەکەی توندیش بێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پرسیارەکەی سەرزەنشتی نەکرد.
- دروستە بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوە، پرسیاری زیاتر لە زانا بکرێت، بە بەڵگەی فەرمودەکە (چۆن لە دەست دەچێت؟).

**بەرگەی دەنگ بەرزی و هاوارکردنیانی دەگرت لە پرسیارکردن:**

ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: ئەعرابیەك هاواری لەسەر پێغەمبەری خوای ﷺ کرد و گوتی: چی دەڵێی لەبارەی بزنمشك؟

---

[1] بوخاری گێڕاوەتیەوە(٥٩).

فەرمووی: **"نەدەیخۆم و نەحەرامیشی دەکەم"**[1].

ئیبن عومەر ﷺ دەفەرموێت: ئەعرابیەك بە هاوارکردن بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەو کەسەی لە ئیحرام دایە چ ئاژەڵێك دەکوژێت؟ ئەویش فەرمووی: **"قەلەڕەش، باشوکە، مشك، سەگی گازگر و دوپشك"**[2].

پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلْحُجُرَٰتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ الحجرات: ٤ واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە دەرەوەی ژوورەکان بانگت لێ دەکەن، ئەوانە زۆربەیان نەفامن و ژیری وەرناگرن (چونکە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی دروستیان لەو بوارەدا ڕەچاو نەکردووە).

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ لەبارەی ئەو ئایەتەوە دەڵێت: پیاوێك هەڵسا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سوپاسکردنم چاکەیە و زەمکردنم خراپەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەمە بۆ پەروەردەگار ئەوهایە"**.

مەبەست لە قسەی پیاوەکە، مەدحکردنی خۆی و دەرخستنی گەورەییەکەیتی، واتە گەر ستایشی پیاوێك بکەی ئەمە کارێکی باش و چاکە، گەر زەمیشی بکەی، ئەمە کارێکی ناشیرن و خراپە.

پێغەمبەریش کە فەرمووی " **ئەمە بۆ پەروەردەگار ئەوهایە** ". واتە ئەوەی ستایشکردنی باش و زەمکردنی خراپە، ئەوە پەروەردگارە.

## نمونەی بۆ دەهێناوە بۆ ئەوەی لێی تێبگەن:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، منداڵێکی ڕەشپێستم بووە، منیشی نکۆڵی لێ دەکەم.

فەرمووی: **"ئایا وشترت هەیە؟"**.

گوتی: بەڵێ.

فەرمووی: **"ڕەنگەکانیان چییە؟"**.

گوتی: سوور.

فەرمووی: **"ئایا ڕەنگی ماشوبرنجی تێدایە"**[3].

---

[1] ئەحمەد (٥٥٠٥) گێڕاوەتیەوە، شعیب الارناؤوط دەڵێت: (سەندەکەی بە مەرجی دوو شێخەکە سەحیحە) أ.هـ بوخاری (٥٥٣٦) و موسلیم (١٩٤٣) گێڕاوەتیانەوە. بەبێ هاوارکردنی ئەعرابییەکە.

[2] مستخرج أبی عوانة (٣٦٢/٤)، موسلیم (١١٩٩) گێڕاوەتیەوە بە هاوارکردنی ئەعرابیەکە.

[3] وشەی (الاورق من الابل) بەکارهاتووە، مەبەستی لێی ڕەنگی سپی لەناو ڕەنگی ڕەش، یان دەگوترێت سپی و ڕەش وەکو دوکەڵی رووەکی(رمث). لسان العرب (٣٧٦٩/١٠).

گوتی: بەڵێ.
فەرمووی: **"لە کوێوە هاتووە؟"**.
گوتی: لەوانەیە رەنگی یەکێك لە رەچەڵەکی بێت. (واتە: لەوانەیە لە رەچەڵەکی باوباپیرانی یەکێك بەو رەنگە هەبوو بێت و رەنگە بۆ ئەو هاتبێت).
فەرمووی: **"دەی کەواتە کوڕەکەت لەوانەیە ئەو رەنگەی لە رەچەڵەکەی بۆ گوازرابێتەوە"**[1].

**لەگەڵیان دادەنیشت و پێدەکەنی و قسەی بۆ دەکردن، وەك میوان دەهاتنە لای، رێزی لێ دەگرتن:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی دەکرد، -پیاوێکی دەشتەکی لەلابوو- فەرمووی **"پیاوێك لە ئەهلی بەهەشت داوا لە پەروەردگار دەکا روخسەتەی بدا بۆ ئەوەی کشتوکاڵ بکات، پەروەردگاریش پێی دەفەرموێت: ئەی هەرچی بتەوێت لێرە نیتە؟"**.
**کابرا دەڵێت: بەڵی، بەلام حەزم لە کشتوکاڵ و چاندنە.**
**فەرمووی: دەستیپێکرد و تۆی چاندن و گەورەبوو و دووریەوە، بەرهەمەکەی وەکو شاخێکی لێهات[2].**
**پەروەردگار فەرمووی: دە بیگرە ئەی نەوەی ئادەم، هیچ شتێك تۆ تێر ناکات"**.
ئەعرابیەکە گوتی: سوێند بەخوا ئەو کەسە یان قورەیشییە یان ئەنسارییە، چونکە ئەوان خاوەنی کشتوکاڵن، بەلام ئێمە پیاوی کشتوکاڵداری نین!
پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی[3].
واتە پێکەنینەکەی لەبەر ژیری دەشتەکییەکە و وەڵامە جوانەکەی بوو[4].
ثوبان خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: میوانێکی دەشتەکیمان هات، پێغەمبەری خوا ﷺ بەرامبەر ماڵەکانی داینیشاند.
بۆی باسدەکرد چۆن خەڵك بە ئیسلام دڵخۆش بوونە، چۆن هۆگری نوێژکردن بوونە، بەردەوام بوو لەو قسانەی تا بینم رووی پیرۆزی پێغەمبەر گەشایەوە.
تاوەکو بووە نیوەڕۆ، کاتی نان خواردن هات، بانگی کردم، بە نهێنی پێی گوتم: **"بچۆ بۆ ماڵی عائیشە، پێی بڵێ، پێغەمبەری خوا میوانی هەیە"**.

---

[1] بوخاری (٥٣٠٩) و موسلیم (١٥٠٠) گێراوەتیانەوە.
[2] واتە: روخسەتی چاندی پێدا، تۆی چاند، لە نێوان چاندن و گەورەبوونی کشتوکاڵەکە کات نەبوو، واتە چاندن و گەورەبوون و دروێنە و کۆکردنەوە و هەموو کارەکە لە چاو تروکانێکدا بوو. فتح الباری (٥/٢٧).
[3] بوخاری (٢٣٤٨) گێراوەتیەوە.
[4] مرقاة المفاتیح (٩/٣٦٠٠).

عائیشە فەرمووی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە دینی حەق ڕەوانە کردووە، لە ماڵمان شتێك نییە تا کەسێك بیخوات.

ناردمیە لای خێزانەکانی تر، بە هەمان شێوەی عائیشە داوای لێبوردنیان کرد، تا بینم دەموچاوی پێغەمبەری خوا ﷺ گرژ بوو.

دەشتەکیەکە کەسێکی عاقڵ و ژیر بوو، بەردەوام بوو لە قسەکانی تا گوتی: **ئێمەی خەڵکی دەشت، کەسانێکی سەخی و بە قەناعەتین، وەکو خەڵکی شار نین، کەمێك خورما لەگەڵ قومە شیرێك بۆ ئێمە بەسە، ئەوە هەموو شتێکە.**

لەو کاتە بزنێکی خۆمان بەوێدا تێپەڕی کە دۆشرابوو، ئێمە پێمان دەگوت (ثمراء) پێغەمبەری خوا ﷺ بەناوی خۆی بانگی کرد، **"ثمرا، ثمرا"**.

بەرەو ڕووی پێغەمبەری هات و مرلندنی، پێیەکانی گرت و دەستی بە گولەکانیدا هێنا و فەرمووی: **"بسم الله"**.

گواننەکانی پڕبوون، داوای قاپێکی کرد، بۆم هێنا، دۆشی و فەرمووی: **" بسم الله "** قاپەکە پڕ بوو.

پاشان فەرمووی: **"بەناوی خوا پێی بدە"**.

دامە دەست میوانەکە، قومێکی گەورەی لێدا، ویستی دایبنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"جارێکی تر"**، میوانەکە دووبارەی کردەوە.

ویستی دایبنێتەوە، دیسان پێی فەرموو **"جارێکی تر"** سێبارەی کردەوە تا تێر بوو، بەوەی خوا ویستی لەسەر بێت.

دیسان دۆشیەوە و فەرمووی: **"بسم الله"** قاپەکەی پڕکرد، فەرمووی **"ئەمە بگەێنە دەست عائیشە، چەندی دەیەوێت با بیخواتەوە"**.

داوتر گەڕامەوە، دیسان دۆشیەوە و فەرمووی **"بسم الله"** قاپەکەی پڕکرد، منی ناردە لای خێزانەکانی تر، هەر خێزانێکی خواردبایەوە و دەینا‌ردمە لای ئەوی تریان، هەموو جارێش دەیگوت **"بسم الله"** تا هەموویان تەواو بوون.

پاشان گەڕامەوە لای.

فەرمووی: **"بۆمی بەرز بکەرەوە"**، بۆم بەرزکردەوە، فەرمووی: **"بسم الله"** ئەوەندەی ویستی خواردیەوە، پاشان دایە دەستم، ڕاستەوخۆ خستمە سەر زارم، ئەوەی خواردمەوە لە هەنگوین شیرنتر بوو، لە میسك بۆن خۆشتربوو، فەرمووی: **"پەروەرگارا، بۆ خاوەنەکەی بەرەکەتی بخەسەر"**، واتە: بزنەکە [1].

---

[1] الآجري لە (کتاب الشریعة ١٠٤٨) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحەکەی خۆی (١٩٧٧) بە سەحیحی داناوە.

## ستایشی ئەهلی راستگۆیی و ئەهلی جیهادی لەوان دەکرد:

شەدادی کوڕی هاد ﷺ دەگێڕێتەوە پیاوێکی ئەعرابی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بڕوای پێهێنا و دوای کەوت، پاشان گوتی: لەگەڵت کۆچ دەکەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوی راسپاردە هەندێك لە هاوەڵەکانی، کاتێك جەنگ هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك دەسکەوتی دابەشکرد، بەشی ئەو ئەعرابیەی بە هاوەڵەکانی دا، کاتێك ئەعرابیەکە هات، پێیاندا، گوتی: ئەمە چییە؟

گوتیان: پێغەمبەر ﷺ بۆی داناوی، وەریبگرە. چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەمە چییە؟

فەرمووی: **"بۆ تۆم داناوە"**.

گوتی: من بۆ ئەوە بەدوات نەکەوتووم، بەڵکو بۆ ئەوە بە دواتکەوتم تا بە تیرێك لێرەم بدرێت، –ئاماژەی بە تیرێك کرد بۆ ملی– بمرم و بچمە بەهەشت.

فەرمووی: **"گەر لەگەڵ پەروەردگار راست بکەی، ئەویش راست دەبێت لەگەڵت"**.

کەمێك مانەوە، پاشان چوون بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمن، پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەری، وەك چۆن ئاماژەی پێکردبوو، تیرەکەی پێ کەوتبوو.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەمە خۆیەتی؟"**.

گوتیان: بەڵێ.

فەرمووی: **"راستی کرد لەگەڵ پەروەردگار، ئەویش راستی بۆ هێنا"**.

پاشان بە جوببەکەی خۆی کفنی کرد، نوێژی لەسەرکرد، کاتێك لە نوێژ کردن لەسەری تەواو بوو فەرمووی: **"پەورەردگارا، ئەمە بەندەی خۆتە لە پێناو تۆ کۆچی کرد، شەهید بوو، من شاهێدی بۆ دەدەم"**[1].

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: کە موعاز لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی عیشای دەکرد، پاشان دەچووە لای هاوەلەکانی ترو نوێژی بۆ دەکردن.

جارێکیان گەڕایەوە و نوێژی بۆ کردن، گەنجێك لە دوای ئەو نوێژی کرد، کاتێك نوێژەکەی درێژکردەوە، گەنجەکە نوێژی بڕی و نوێژ خۆی کردوو چووە دەرەوە و گوریسی وشترەکەی گرت و رۆیشت، ئەمەیان بۆ موعاز گێڕایەوە، ئەویش گوتی: بەڕاستی ئەمە دووڕوویییە، بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێم: موعاز ئەوەی روویدا بۆی گێڕایەوە.

---

[1] النسائی (١٩٥٣) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (أحکام الجنائز ٦١) بە سەحیحی داناوە.

گەنجەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو کاتێك نوێژ لەدوای تۆ دەکا، زۆری پێ دەچێت، پاشان دێتە لای ئێمە، نوێژەکەی درێژ دەکاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی موعاز ئایا تۆ فیتنەچیت؟"**.

بە گەنجەکەشی گوت: **"ئەی کوڕی برام کاتێك نوێژی دەکەی، چ دەکەی؟"**.

گوتی: سورەتی فاتیحە دەخوێنم، داوای بەهەشت لە پەروەردگارم دەکەم و پەنای پێدەگرم لە ئاگر، من نازانم تۆ و موعاز لە نوێژەکانتان چی دەڵێن.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"من و مەعازیش لە نێوان ئەو دووشتە داین، یان بۆ ئەو دوو شتە دەچین؟"**.

گەنجەکە گوتی: بەڵام موعاز ئەو کاتە دەزانێت کە دوژمن هات .

دەڵێت: هەواڵیان دا کە دوژمن نزیك بۆتەوە: چوونە شەڕ، گەنجەکە شەهید بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەمە بە موعازی گوت: **"ناکۆکیکارەی من و تۆ چیکرد؟"**.

موعاز گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ خودا راستی کرد، من دۆرم کرد، شەهید بوو. [1]

## لەگەڵ هەندێکیان لەسەر وشتر پێشبڕکێی دەکرد:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی هەبوو ناوی غضباء بوو، هیچ وشترێکی تر بە پێشی نەدەکەوت.

ئەعرابیەك لەسەر پشتی وشترێکی گەنج هات، پێشبڕکێی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، بە پێشی کەوت، موسڵمانان ئەمەیان پێ ناخۆش بوو، گوتیان: بە پێشت غضباء کەوت.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ رووی هاوەڵانی بینی کە پێیان ناخۆش بوو، وەك دڵدانەوەیان فەرمووی: **"بەڕاستی پەروەردگار لەسەرخۆی فەرزکردەوە، هەر شتێك لە دونیا بەرزبێتەوە، پەروەردگار نزمی دەکاتەوە [2]"**.

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- هاندان بۆ خۆبەکەمزانین و بێفیزی.
- بەکارهێنانی وشتر بۆ سواربوون و پێشبڕکێ کردن.

---

[1] ابن خزیمة (١٦٣٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی دەڵێت: (سەنەدەکەی باشە)، سیفەتی پێغەمبەری خوا ﷺ (لا ١٠٦). هەر یەکە لە بوخاری (٧٠٥) و موسلیم (٤٦٥) بە کورتی گێراوەتیانەوە.

[2] بوخاری (٢٨٧٢) گێراوەتیەوە.

- ڕەوشت جوانی پێغەمبەر ﷺ و بێفیزی، چونکە ڕازی بوو ئەعرابیەك پێشبڕکێی لەگەڵ بکات.
- بەکەم سەیرکردنی دونیا، وەك ئاماژەکردنێك بەوەی هەر شتێك لە دونیا بەرزبێتەوە، دەبێت نزم بێتەوە [1].

**نەرم دەبوو لەگەڵیان ئەگەر بابەتەکە پەیوەندی هەبووایە بە مافی تایبەتی خۆی، بەڵام ئەگەر پەیوەندی بە مافی خودا هەبووایە، دەیوەستاندن لەلای سنورەکانی شەرع و حوکمەکانی:**

موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەگێڕێتەوە، دوو ژنی هەوێی یەکتر شەڕیان لەگەڵ یەکتری کرد، یەکێکیان بە داری خێوەت لەوی تریانیدا کوشتی (دووگیان بوو، منداڵی ناو سکی کوشت).

پێغەمبەری خوا ﷺ حوکمی خوێنبایی خستە سەر ئەستۆی کەس و کاری بکوژەکە، فیدیەی ئەو منداڵەی لە سکی دایە بەندەیەکە [2].

ئەعرابیەکە گوتی: سزام دەدەی بە کەسێك نە دەخوات و نە دەخواتەوە، نە قسە دەکات و نە لە دایك بووە، نمونەی ئەم شتە بە فیڕۆ دەچێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"أسجعٌ كسجعِ الجاهلية"** واتە: ئەمە قسەکردنە شێوازی سەردەمی نەفامییە [3]. حوکمیدا بۆ ئەوەی لەناوسکیەتی بە ڕزگار کردنی بەندەیەك [4].

زانایان دەڵێن: زەمکردنی (سجع) لێرەدا لە بەر دوو هۆکارە:

**یەکەمیان:** ئەم سەجعە پێچەوانەی حوکمی شەرعە و دەیەوێت پۆچەڵی بکاتەوە.

**دووەمیان:** جۆرێکە لە قورسی قسەکردن و خۆنواندن، ئەم دوو جۆرە لە سەجع باشن نیە.

بەڵام ئەو سەجعەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەندێك کاتدا قسەی پێکردووە و ئاشکرایە لە فەرمودەکانیدا، لەم جۆرەیان نییە، چونکە نە پێچەوانەی حوکمی شەرعە، نە خۆنواندنیشە، بەڵکو لە جۆری ڕێگەپێدرا و باشە [5].

---

[1] فتح الباری (٦/٤٧).

[2] واتە: بەندەیەکی پیاو یان ژن، کە دەکاتە نیوەی دەیەکی خوێنبایی، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە بە دار لێی داوە، ئەگەری زۆرە مەبەست لێی کوشتن نەبووبێت، وەك نیمچە ئەنقەست ئەژمار دەکرێت، تۆڵەکردنەوەی لەسەر نییە، خوێنبایی لەسەر تاوانکار نییە. شەرحی نەوەوی (١١/١٧٧١٧٦).

[3] واتە: ئەعرابییەکە بە شێوازی (سجع) واتە بە کێش و سەروا قسەی کردووە، پێغەمبەریش ڕەتی کردۆتەوە. (و).

[4] بوخاری (١٢١٣) و موسلیم (٢٤٨٦) گێڕاوەتیانەوە. هەروەها النسائی (٤٨٢٣) گێڕاوەتیەوەو دەقەکە هی ئەوە.

[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١/١٧٨).

بۆیە نمونەی بە کاهینەکان هێناوەتەوە، چونکە ئەوان قسە پڕو پووچەکانیان بە سەجع دەڕازاندەوە و دڵەکانیان نەرم دەکرد و بۆلای خۆیان را دەکێشا [1].

**سزای نەدەدان، چونکە فەرمانی پێکرابوو لەگەڵ نەزانەکان لێبوردە بێت.**

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەعرابییەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کراسێکی بەنرخی پێچراو لە ئاوریشم لەبەر بوو، گوتی: ئەم هاوەڵەتان [2] دەیەوێت شوانی کوڕی شوان بەرز بکاتەوە و خانەدانی کوڕی خانەدانیش نزم بکاتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و کراسی ئەعرابیەکەی گرت و بۆلای خۆی راکێشا و فەرمووی: "**دەبینم جلێکت لەبەردایە کەسی عاقڵ لەبەری ناکات**".

پاشان فەرمووی: "**کاتێك نوح ﷺ لەسەرەمەرگ بوو، دوو کوڕەکانی بانگکردن، فەرمووی: من راسپاردەیەکم بۆ ئێوە هەیە، فەرمانتان بە دوو شت پێ دەکەم و قەدەغەی دوو شتیشتان دەکەم، ئەوەی کە قەدەغەی دەکەم هاوبەشی و خۆبەگەورە زانینە، فەرمانیشتان پێ دەکەم بە لا إلە إلا الله، چونکە گەر ئاسمانەکان و زەوی لەتای تەرازوویەك و (لا إله إلا الله) ش لە تایەکەی تر دابندرێت، هێشتا ئەو وشەیە قورسترە.**

**ئەگەر ئاسمان و زەویش ئەڵقەیەك بن و (لا إله إلا الله) لەسەری دابندرێت، دەیشکێنێت.**

**فەرمانتان پێ دەکەم بە (سبحان الله وبحمده) چونکە ئەمە دوعای هەموو شتێکە، هەر بەمەش هەموو شتێك رزق دەدرێت** [3].

**قبوڵی نەدەکرد لە بەیعەتپێدانی ئیسلام و کۆچکردن دەستهەڵبگرن:**

جابی کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە ئەعرابیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئیسلام بەیعەتی پێدا.

ئەعرابیەکە توشی گرانەتا هات، هاتەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی موحەممەد لەو بەیعەتی لە نێوانمان دایە بۆمی بەتاڵ بکەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ رەتیکردەوە.

دووبارە هاتەوە و هەمان داوای لێکرد.

رەتیکردەوە.

---

[1] لسان العرب (٣٦٣/١٣).

[2] مەبەستی پێغەمبەر بووە ﷺ.

[3] ئەحمەد (٧٠٦١) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحەکەی خۆی (١٣٤) بە سەحیحی داناوە.

بۆ جاری سێیەم هەمان داوای لێکرد.

رەتیکردەوە، ئەعرابیەکە رۆیشت [1].

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"شاری مەدینە وەك کورەی ئاسنگەر وایە، شتی پیس فڕێدەدا و شتی جوان دروست دەکات [2]"**.

زانایان دەفەرموون: بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەیعەتەکەی هەڵنەوەشاندە، چونکە دروست نییە بۆ کەسێك موسڵمان بێت، پاشان ئیسلام جێبهێڵێت، هەروەها دروست نییە بۆ ئەو کەسەی بۆلای پێغەمبەر ﷺ کۆچیکردووە، کۆچکردنەکەی جێبهێڵێت بگەڕێتەوە نیشتیمانەکەی، ئەو ئەعرابییە هەردووکی کردبوو، کۆچیکردبوو، هەروەها بەیعەتی بە پێغەمبەریش ﷺ دابوو.

**واتای فەرموودەکە**: ئەوەی لە مەدینە دەردەچێت، باوەڕی تەواو نییە، ئەوەی باوەڕی تەواو بێت لێی دەمێنێتەوە [3].

**ابن المنير** دەفەرموێت: ئەم فەرمودەیە لە روکەشدا زەمکردنی تێدایە بۆ ئەو کەسەی لە مەدینە دەچێتە دەرەوە، ئەمە کێشەیە، چونکە هاوەڵانێکی زۆر لە مەدینە چوونە دەرەوەو لە شوێنی تر نیشتەجێبوون، لەدوای ئەوانیش خەڵکانی تر وایان کردووە.

**وەڵام**: ئەم زەمکردنە بۆ کەسێکە بە رقبەرایەتی بیەوێت لە مەدینە دووربکەوێتەوە، وەك ئەو ئەعرابیە کردی، بەڵام ئەوانەی ئاماژەیان پێکراوە، بۆ ئامانجی دیاریکراو چوونە دەرەوە، وەك بڵاوکردنەوەی زانست، فەتحکردنی وڵاتی بێ باوەڕان و جیهادکردن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوان فەزڵ و گەورەیی مەدینە و دانیشتوانەکەیان دەزانی [4].

## لەسەر تەماشاکردنی ماڵی نامەحرەم بەبێ روخسەت، سەرزەنشتی دەکردن:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ئەعرابیەك هاتە بەردەم دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی خستە بەرامبەر کونی دەرگاکە، پێغەمبەری خوا ﷺ بینی، دارێك یان ئاسنێکی بۆ لا درێژکرد ویستی لە چاوی بدات.

کاتێك هەستی بەمەکرد، چاوی گەڕاندە دواوە.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: **"گەر چاوت لە جێگای خۆی هێشتبایەوە، چاوم دەردەهێنانی [5]"**.

---

[1] واتە لە مەدینە گەڕایەوە دەشت.

[2] بوخاری (١٨٨٣) و موسلیم (١٣٨٣) گێڕاوەتیانەوە.

[3] تحفة الأحوذي (٢٨٩/١٠).

[4] فتح الباری (٢٠٠/١٣).

[5] النسائی (٤٨٥٨) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

سەهلی کوڕیش سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، پیاوێك لە دەرەوە بە دزی سەیری یەکێك لە ماڵەکانی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ سەری شانە دەکرد.

فەرمووی: **"گەر زانیبام تۆ سەیردەکەی، بە شتێك لە چاوەکانم دەدای، بەڕاستی روخسەت وەرگرتن بۆ خاتری چاو داندراوە [1]"**.

**نەوەوی** دەفەرموێت: واتا: روخسەت وەرگرتن رێگەپێدراوە و فەرمانپێکراوە، چونکە روخسەت وەرگرتن بۆ ئەوەیە کە چاو نەکەوێتە سەر شتی حەرام، دروست نییە بۆ کەسێك بێ روخسەت سەیری ماڵی کەسێك بکات، نەبادا چاوەکانی بکەوێتە سەر ئافرەتی نامەحرەم.

**لەم فەرمودەیەدا:** دروستە بە شتێکی سوك لەچاوی ئەو کەسە بدرێت سەیری ماڵی خەڵکی دەکات، تەنانەت گەر بەو شتە چاویشی کوێر بێت، **هیچ قەرەبووشی نییە**، ئەو ماڵەی سەیر دەکات لەوانەیە ئافرەتی نامەحرەمی هەر تێدانەبێت [2].

**سەردانی نەخۆشییەکانی دەکردن و دوعای بۆ دەکردن:**

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ سەردانی ئەعرابیەکی نەخۆشی کرد:

دەڵێت: هەر کاتێك پێغەمبەر ﷺ سەردانی نەخۆشی بکردبا: ئەم دوعایەی دەخوێند **"لا بأس طهورٌ إن شاء الله"**، واتە پشتیوان بە خوا هیچ ترسی نابێت، پاککەرەوەی گوناهەکانە.

بۆ ئەعرابیەکە فەرمووی: **"لا بأس طهور إن شاء الله"**.

دەڵێت: ئەعرابیەکە گوتی: پاککەرەوەی گوناهی چی! بەڵکو ئەوە گرانەتایەکی قورسە لەسەر پیاوێکی پیر، بۆ گۆڕستان دەیبات.

پێغەمبەریش فەرمووی: **"( فنعم إذا ) باشتریش [3]"**.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: " بەیانی نەگەیشتە ئێوارە، مرد [4]".

واتە: بەویستی خوا گەورە دەبێتە پاککەرەوەی گوناهەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ (ان شاء الله)ی بەکارهێنا، چونکە رستەیەکی خەبەرییە، نەك رستەیەکی دوعا، چونکە

[1] بوخاری (٥٩٢٤) و موسلیم (٢١٥٦) گێڕاوەتیانەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣٧/١٤).

[3] بوخاری (٣٦١٦) گێڕاوەتیەوە.

[4] طبرانی (٧٢١٣) لە شرحبیل گێڕاوەتیەوە، هیثمی دەڵێت: (کەسێکی تێدایە کە نایناسم) مجمع الزوائد (٣٩/٣).

پێویستە مرۆڤ لە دوعاکردن بڕوای تەواوی پێی هەبێت، نابێت بڵێت (ان شئت) واتە ئەگەر ویستت.

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهیکردووە مرۆڤ ئەم دوعایە بڵێت (خوایەگیان لێم خۆشبە ئەگەر ویستت، رەحمم پێ بکە ئەگەر ویستت) [1]

ئەمە مەڵێ، چونکە پەروەردگار کەس ناچاری ناکات، گەر بیەوێت لێت خۆش دەبێت و ئەگەریش بیەوێت نە لێت خۆش دەبێت و نە رەحمەت پێ دەکات. گەر لە پەروەردگار پاڕایتەوە مەڵێ گەر ویستت.

بەڵام لە فەرمودەی پێغەمبەر (إن شاء الله) هەیە، چونکە ئەمە جۆرێکە لەگەشبینی و رستەیەکی خەبەرییە، کە دەفەرموێت: (لا بأس)، وەك ئەوەی بوونی مەترسی و ناخۆشی لێ دووربگرێت.

لە پاشانیش دەفەرموێت (إن شاء الله) چونکە هەموو کاروکردەوەیەك بە ویستی پەروەردگارە [2].

**"فنعم إذا"**، (فائەکە) پەیوندیدارە بە وشەیەکی بزر، واتەکەی: گەر تۆ رەتی بکەیتەوە بەڵێ، واتە: بەڵی وەك ئەوەی پێتوایە.

### لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:

- پێویستە ئەو کەسەی سەردانی نەخۆش دەکات بڵێت: (لا بأس طهور إن شاء الله)
- هیچ تێدا نییە، گەر پێشەوا سەردانی نەخۆشی خەڵکی خۆی بکات، تەنانەت گەر ئەعرابیەکی قسەڕەقیش بێت، هەروەها زانا سەردانی نەخۆشی نەزان بکات، بۆ ئەوەی فێری بکات و لە سوودەکانی ئاگاداری بکاتەوە، فەرمانی ئارامگرتنی پێ بکات، بۆ ئەوەی لە قەدەری پەروەردگار تووڕە نەبێت، نەبادا تووڕەیی پەروەردگاری بەسەردا بێت، دڵدانەوەی بکات، یان هەر شتێکی تر دڵی خۆی و کەسوکارەکەی پێ خۆش بێت بیکات.
- پێویستە کەسی نەخۆش ئامۆژگاری بە دڵفراوانییەوە وەربگرێت، وەڵامی جوانی کەسەکە بداتەوە [3].

---

[1] بوخاری (١٢١٣) و موسلیم (٢٤٨٦) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێراوەتیانەوە.

[2] شرح رياض الصالحين (٤/٤٨٤) ابن عثيمن.

[3] سەیری فتح الباري (١٠/١١٩)، شرح رياض الصالحين (٤/٤٨٤٨) ابن عثيمن بكە.

## دیارییەکانی لێ وەردەگرتن و پاداشتی دەدانەوە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پیاوێك لە خەڵکی دەشت ناوی (زاهر)[1] بوو، لە دەشتەوە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ دەهێنا، کاتێکیش ویستبای بگەڕابایەوە، پێغەمبەر ﷺ پاداشتی دەدایەوە.

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: **"إن زاهراً باديتنا، ونحن حاضروه"**.

واتە: **(باديتنا)** زاهیر خەڵکی دەشتە، لە بەروبوومەکانی دەشت دیاریمان بۆ دێنێت، یاخود گەر شتێکمان لە دەشت پێویست بێت، بۆمان دێنێت و پێویست ناکات بۆ ئەو شتە دەربچین.

**(ونحن حاضروه)**: ئەویش هەر شتێکی پێویست بێت لە شار، بۆی ئامادە دەکەین، یاخود لەبەر مەبەستی تێکەڵاوی ئێمە نەبێت، نایێتە شار[2].

پێغەمبەر ﷺ ئەو پیاوەی خۆشدەویست، پیاوێکی دەموچاو ناشیرین بوو[3]. ڕۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ لە بازاڕ بۆ ڕۆیشتە لای، کە خەریکی فرۆشتنی کەلوپەلی بوو، پێغەمبەر ﷺ لە دواوە گرتی، ئەو پێغەمبەری نەبینی.

پیاوەکە گوتی: بەرمدە تۆ کێی؟

کاتێك ئاوڕی دایەوە، بینی پێغەمبەری خوایە ﷺ ڕاستەوخۆ پشتی بە سینگی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ لکاند.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: **"کێ ئەم بەندەیە دەکڕێت؟"**[4].

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بەخوا دەمبینی من هیچ نرخێکم نیە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵام تۆ لای پەروەردگار بێ نرخ نیت"**، یان فەرمووی: **"بەڵکو تۆ لای پەروەردگار گرانبەهای"**.

لە سوودی ئەم فەرمودەیە: ڕەوشت جوانی پەیوەندیدارە بە جوانی دیوی ناوەوەی مرۆڤ، وەك لەم فەرمودەدا هاتووە **"پەروەردگار سەیری وێنەکانتان و سەیری ماڵ و سامانتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵەکانتان و کردەوەکانتان دەکات[5]"**.

---

(1) زاهری کوڕی حرام بوو، دەشتەکی بوو، لە پیاوە ئازاکان بووە.

(2) فيض القدير (٢/٤٥٢).

(3) لە دەقی فەرمودەکە هاتووە (كان رجلا دميما) واتە پیاوێکی ناشیرین بووە، بەڵام خاوەن ڕەوشتێکی جوان بووە.

(4) ئەمە لە میزاجی جوانی پێغەمبەرە ﷺ، کە جگە لە حەق قسەی تر ناکات، کاتێك بەو پیاوەی گوت بەندە، بەو پێیەی هەموو مرۆڤەکان بەندەی پەروەردگارن.

(5) موسلیم (٢٥٦٤) لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ گێڕاوەتیەوە، جمع الوسائل في شرح الشمائل (٢/٢٩)ی قاری.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە ئەعرابیەك وشترێکی گەنجی بە دیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا. پێغەمبەریش قەرەبووی کردەوە بە حەوت دانە وشتری گەنجی مێ، بەڵام پێی ناخۆش بوو[1].

ئەمە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ، سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و پاشان فەرمووی: **"پیاوێك لە عەرەب دیارییەك دەداتە من، منیش بەو توانایەی هەمە قەرەبووی دەکەمەوە، بەڵام پێی رازی نابێ و لێم تورە دەبێت، من بڕیارم داوە جگە لە قورەیشی یان ئەنساڕی یان ثقفي یان دۆسی دیاری لەکەسی تر وەرنەگرم"**[2].

تەورەبەشتی دەفەرموێت: پێی ناخۆش بووە دیاری لە کەسێك وەربگرێت نیەتی وابێت لەپێدانی دیاریەکەی داوای زیاتر بکات، ئەوانەی باسی کردوونە، لەبەر ئەوەیە، کە کەسانی بەخشندە و دەست کراوە و نەفس بەرزن، داوای قەرەبوو ناکەنەوە[3].

**لەوانەیە هەندێکیان ئازاریان دابێت، بەڵام ئارامی گرتووە و بەرگەی ئازارەکەی گرتووە:**

عەماری کوڕی خوزەیمە لە مامیەوە،کە یەکێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەسپێکی لە ئەعرابیەك کڕی، داوای لێکرد بە دوای دابێت تا پارەکەی بداتێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ کەمێك لە ڕۆیشتن پەلەی کرد، ئەعرابیەکە دوای کەوت.

کۆمەڵە پیاوێك هاتنە بەردەم ئەعرابیەکە و مامەڵەی ئەسپەکەیان لەگەڵ کرد، نەیاندەزانی، کە پێغەمبەر ﷺ ئەم ئەسپەی کڕیووە، هەندێکیان پارەی زیاتریان لەو نرخە پێدا،کە بە پێغەمبەری فرۆشتبوو.

ئەعرابیەکە هاواری پێغەمبەری خوای ﷺ کرد و گوتی: ئەگەر ئەم ئەسپە دەکڕی ئەگەر نا دەیفرۆشم!

پێغەمبەر ﷺ کاتێك گوێی لە هاواری ئەعرابیەکە بوو فەرمووی: **"ئەی نەتفرۆشتۆتە من؟"**.

ئەعرابیەکە گوتی: نا بەخوا، پێم نەفرۆشتی!

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بەڵێ، فرۆشتۆتە من"**.

خەڵکەکەش گوێیان لە پێغەمبەر ﷺ و ئەعرابیەکە بوو. ئەعرابیەکە گوتی: **شاهێدێك بێنە کە پێم فرۆشتبێت.**

---

[1] ئەعرابیەکە پێ رازی نەبوو، چونکە بەرامبەر سەخاوەتی پێغەمبەر ﷺ تەمای زیاتری هەبووە.

[2] ترمذي (٣٩٤٥) و ئەبوداود (٣٤٣٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢١١٩) بە سەحیحی داناوە.

[3] تحفة الاحوذي(١٠/٣٠٨).

خوزەیمەی کوڕی ثابت گوتی: من شاهێدم،کە فرۆشتۆتە ئەو.

پێغەمبەر ﷺ چووە لای خوزەیمەی و پێی فەرموو: **"بە چی شاهێدی دەدەی؟"**.

گوتی: بە راستگۆیت ئەی پێغەمبەری خوا. بۆیە پێغەمبەر شاهێدی خوزەیمەی بە شاهێدی دوو پیاو هەژمار دەکرد [١].

کاریگەری ئەو دوشاهێدیە لە ساتی کۆکردنەوەی قورئان دەرکەوت: خاریجەی کوڕی زەید دەگێڕێتەوە، کە زەیدی کوڕی ثابت ﷺ گوتی: پەڕێکم لە قورئان دەنوسی، ئایەتێکم لە سورەتی ئەحزاب لەبیرچوو بوو، کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ گوێ لێ بوو بوو دەیخوێندەوە، نەمدۆزیەوە تەنیا لای خوزیمەی کوڕی ثابتی ئەنساری نەبێت، کە پێغەمبەری خوا ﷺ شاهێدی دانەکەی کردبووە دوو شاهێدی، ئایەتەکەش ئەمە بوو ﴿مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ﴾ الأحزاب: ٢٣ [٢].

**لەوانەیە هەندێکیان قسەی ناخۆشیان بەرامبەر کردبێت، بەڵام بەرگەی گرتووە:**

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ئەعرابییەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داوای قەرزێکی دەکرد کە پێی دابوو، قسەی توندی لەگەڵ کرد، پێ گوت: لەسەرت توند دەکەم تا ئەو قەرزەم نەدەیتەوە.

هاوەڵانی پێی هەڵشاخان و گوتیان: ئەوە چیتە، دەزانی لەگەڵ کێ قسان دەکەی؟

گوتی: من داوای مافی خۆم دەکەم.

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: **"دەبێ ئێوە لەگەڵ خاوەن ماف بن!"**.

پاشان ناردیە لای خەولەی کچی قەیس پێی فەرموو: **"ئەگەر خورمات هەیە، بە قەرز بماندەیتێ تاوەکو خورمای ئێمە دەگا، ئینجا دەتدەینەوە"**.

ئەویش گوتی: بەڵی، بە بابمەوە بە قوربانتم بم ئەی پێغەمبەری خوا.

لێی قەرز کردوو دایەوە ئەعرابیەکە و دەرخواردیشیدا [٣].

ئینجا گوتی: مافەکەت گەڕاندمەوە، خوای گەورە مافت بداتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەمانە لە خەڵکە باشەکانن، هیچ ئومەتێکیش پیرۆز نابێت، تا کەسی بێهێز مافی خۆی بێ سەرئێشە وەرنەگرێتەوە"**[١].

---

[١] ئەحمەد (٢١٣٧٦) و ئەبو داود (٣٦٠٧) و النسائي (٤٦٤٧) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (١٢٨٦).

[٢] بوخاری (٢٨٠٧) گێراوەتیەوە.

[٣] واتە سەرباری پێدانی مافی خۆی، بۆ خواردنیش پێیدا.

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئاژەڵێکی بۆ سەربڕین لە بەرامبەر کۆڵێک خورمای عەجوە، کە لە ئەعرابیەکی کڕی.

پێغەمبەر ﷺ هێنایەوە ماڵ، ئینجا گەڕا بۆ ئەوەی خورمایەکەی بداتێ، بەڵام نەیدۆزیەوە.

پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرەوە گوتی: **"ئەی بەندەی خوا، ئێمە ئەم ئاژەڵەمان بە کۆڵێک خورمای عەجوە لێکڕی، بەڵام بەدوای گەڕاین و نەماندۆزیەوە"**.

ئەعرابیەکە گوتی:ئای لەو غەدرە ! !

عائشیە دەفەرموێت: خەڵك گوێیان لێ بوو، گوتیان: ئەی خوا بتگرێت، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ غەدر دەکات؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"لێی گەڕێن، خاوەن ماف قسەی هەیە"**.

دووبارەی کردەوە و فەرمووی: **"ئەی بەندەی خوا، ئێمە ئەم ئاژەڵەمان بە کۆڵێک خورمای عەجوە لێکڕی، بەڵام بەدوای گەڕاین و نەماندۆزیەوە"**.

ئەعرابیەکە گوتی: ئای لەو غەدرە ! !

دیسان خەڵکەکە پێیان گوت: خوا بتگرێت، ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ غەدر دەکات؟!

فەرمووی: **"لێی گەڕێن، خاوەن ماف قسەی هەیە"**.

بۆ جاری سێهەم پێی فەرموو.

کاتێك زانی تێ ناگات، بە پیاوێك لە هاوەڵانی فەرموو، بڕۆ لای خوەیلەی کچی حەکیمی کوڕی ئومەییە، پێی بڵێ **"پێغەمبەری خوا پێت دەڵێت: ئەگەر کۆڵێك خورمای عەجوەی هەیە، بە قەرز پێمان بدات تا بەویستی پەروەردگار پێی دەدەینەوە"**.

چووە لای خوەیلە، پاشان گەڕایەوە لای پێغەمبەر و گوتی: خوەیلە گوتی بەڵێ هەمە ئەی پێغەمبەری خوا، یەکێك بنێرە وەریبگرێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوەکەی فەرموو: **"بیبە لەگەڵ خۆت، حەقەکەی پێ بدە"**.

لەگەڵ خۆی بردو حەقەکەی پێدا.

ئەعرابیەکە بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕی کە لە نێوان هاوەڵانی دانیشتبوو پێغەمبەری پێی فەرموو**"خوا پاداشتت داتەوە، پەیمانت بردە سەر"**.

---

[1] ابن ماجة (٢٤٢٦) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢٤٢١) بە سەحیحی داناوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەمانە لە بەندە باشەکانی پەروەردگارن لە رۆژی دوایی، کەسانی بەوەفا و باشن[١]"**.

**لەوانەیە سەرزەنشتی کردبن لەسەر هەندێك کردەوە و توندیان:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەر خوا ﷺ حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، ئەو کات ئەقرەعی کوڕی حابسی تەمیمی لەوێ دانیشتبوو.

ئەقرەع گوتی: من دە کوڕم هەیە، هیچ ماچم نەکردووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەیرێکی کرد و پاشان فەرمووی: **"هەر کەسێك رەحم بەکەس نەکات، رەحمی پێ ناکرێت[٢]"**.

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: ئەعرابیەك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئایا ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟ ئێمە ماچیان ناکەین.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"من بۆ تۆ چیم پێ دەکرێت، لە کاتێك پەروەردگار رەحمی لە دڵت دەرهێنابێت[٣]"**.

---

[١] ئەحمەد (٢٥٧٨٠) گێڕاوەتیەوە، هیثمی دەڵێت: سەندەکەی سەحیحە، (مجمع الزوائد ٤/٢٤٨). الأرنؤوط بە حەسەنی داناوە.

[٢] بوخاری (٥٩٩٧) و موسلیم (٢٣١٨) گێڕاوەتیانەوە.

[٣] بوخاری (٥٩٩٨) و موسلیم (٢٣١٧) گێڕاوەتیانەوە

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ سەرپێچیکار و گوناهباران:

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ باشترین کەس بووینە لە بە گەورە راگرتنی سنوورەکانی پەروەردگار و ترسان لێی.

ئەوان گوناه و تاوانیان بە گەورە دەزانی و خۆیان لێ بەدووردەگرت، لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵگەکەیان بێ بەش نەبووە لە هەڵخلیسکانەکانی شەیتان و نەفس، بەشێکیان کەوتوونەتە ناو سەرپێچی و گوناه، بەتایبەت،کە ئەوان نزیك بوون لە سەردەمی نەفامی.

بەڵام زوو دەگەڕانەوە و تۆبەیان دەکرد، تەنانەت ئەگەر ئەم کارە ببووایە هۆی لەناوچوونی ڕۆح و پێشکەشکردنی باشترین شت لە پێناو دەربازبوون لە سزای پەروەردگار لە رۆژی دوایی.

پێویستە لەسەر مەنهەجی پێغەمبەری خوا ﷺ بوەستین لە مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو سەرپێچیکار و گوناهبارەکانەی سەردەمی ئەودا. پەروەردگار فەرمانی بە سەرپێچیکاران کردووە، بچنە لای پێغەمبەر بۆ ئەوەی داوای لێخۆشبوونیان لە پەروەردگار بۆ بکات ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ النساء: ٦٤

واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە بەڕاستی کاتێك ستەمیان لە خۆیان کرد (بە لادان لە شەریعەت) بهاتنایە بۆ لای تۆ و داوای لێخۆشبوونیان لە خوای گەورە بکردایە، پێغەمبەریش داوای لێخۆشبوونی بۆ بکردنایە، ئەوە بێگومان ئەو کاتە دەیانزانی کە خوا تۆبە و پەشیمانی وەرگرەو میهرەبان و دلۆڤانە.

ئەوان نایێنە لات بۆ ئەوەی تۆ ئەی موحەممەد لێیان خۆش بی، بەڵکو بۆ ئەوەی لە پەروەردگار داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەی.

**پێغەمبەر ﷺ بە سۆز و میهرەبان بوو لەگەڵیان، بە نەریتی بەزەیی و نەرمونیانی لەگەڵیان دەجوڵایەوە، ناشرینی تاوانەکەی بۆ ڕووندەکردنەوە، هەندێك گفتوگۆی عەقڵی لەگەڵ دەکردن:**

ئەبی ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە کە گەنجێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، روخسەتم پێ بدە زینا بکەم.

خەڵکەکە لێی هاتنەدەنگ، سەرزەنشتیان کرد و گوتیان: بەسە وازبێنە.

فەرمووی: **"لێم نزیك ببەوە"**، لێی نزیك بوویەوە.

دانیشت، پێ فەرمووی: **"ئەم کارەت بۆ دایکت پێ خۆشە؟"**.

گوتی: سوێند بەخوا نەخێر، خوا بمکاتە قوربانی تۆ.

فەرمووی: **"خەڵکیش ئەم کارەیان بۆ دایکیان پێ خۆش نییە"**، فەرمووی **"ئەی بۆ کچەکەت پێت خۆشە؟"**.

گوتی: سوێند بەخوا نەخێر، خوا بمکاتە قوربانی تۆ.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ کچەکانیان پێیان خۆش نییە"**.، فەرمووی: **"ئەی بۆ خوشکت پێت خۆشە؟"**.

گوتی: سوێند بەخوا نەخێر، خوا بمکاتە قوربانی تۆ.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ خوشکەکانیان پێیان خۆش نییە"**، فەرمووی: **"ئەی بۆ پورت؟"**.

گوتی: سوێند بەخوا نەخێر، خوا بمکاتە قوربانی تۆ.

فەرمووی: **"خەڵکیش بۆ پوریان پێیان خۆش نییە"**.

گوتی: پاشان دەستی لەسەر دانا و فەرمووی: **"پەروەردگارا لە گوناهی خۆش بە، دڵی پاککەرەوە، داوێنی بپارێزە"**، لەدوای ئەمە ئەم گەنجە ئاوڕی بۆ هیچ شتێك نەدەدایەوە [1].

وەك چۆن قەدەغەکراوت هەیە، خەڵکیش قەدەغەکراوەی هەیە، ئەوەشی زینای لەگەڵ دەکرێت –بێگومان– خوشك یان دایك یان پوری ئەو خەڵکەیە، گەر بۆ خۆت پێت خۆش بێت، ئەوە کەم وکورتیە، گەر بۆ خۆت پێت خۆش نییە، ئەی چۆن بۆ خەڵك پێت خۆشە؟

بەم شێوەیە پێغەمبەر ﷺ (ناشیرینی زیانکردنی) لە چاوی خەڵکەوە بە بەڵگە بۆ هێنایەوە، چونکە ئەوان بۆ دایك و کچ و قەدەغەکراوەکانیان پێیان خۆش نییە، وەك چۆن پێت خۆشە مامەڵەت لەگەڵ بکرێت، بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکە، هەرچیشی پێت ناخۆش بوو بۆ خۆت لەگەڵ خەڵکی مەیکە.

ئەگەر بڕوا پێهێنانی عەقڵی لەگەڵ ترسی پەروەردگار و سزا بۆ کەسی تاوانبار هاوشان بکرێت، ئەوکات ڕێگریکردن بۆ تاوانەکە بەهێزتر دەبێت.

بەم شێوەیە گەنجەکە وازی لە ئارەزووە قەدەغەکراوەکانی هێنا، بە قەناعەتەوە رقی لە زینا بۆوە، گەر هەموو گەنجێك ئەم فەرمودەیە لەبەرامبەر حەزەکانی خۆی جێبەجێ بکات، کەسیان زینا ناکەن، چونکە کەسیان رازی نابێت لەگەڵ کەس و کاریان بکرێت [2].

---

[1] ئەحمەد (٢١٧٠٨) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة) بە سەحیحی داناوە (٣٧٠).
[2] شرح الأربعين النووية (١١/٣٦) للشيخ عطية سالم.

پێغەمبەر ﷺ بە هەموو نەرمونیانێك و میهرەبانییەك مامەڵەی لەگەڵ کردوون، چۆن وا نییە، ئەوەتا پەروەردگار هەواڵی ئەوەمان پێ ڕادەگەیێنێت ﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ﴾ آل عمران: ١٥٩ واتە: ئەی موحەمەد ﷺ بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمن بویت لەگەڵیاندا، خۆ ئەگەر تووڕە و قسە ڕەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێبکە و لێیان ببورەو داوای لێخۆش بوونیان بۆ بکە، لە کارو پێشهاتدا پرس و ڕایان پێبکە.

ئەمە شاهێدیەکی پەروەردگارە بۆ پێغەمبەرەکەی، کە ڕەحم بە تەواوی خەڵکی دەکات، گەورە و بچوکییان، چاك و خراپیان، نێر و مێیان.

ابن کثیر لە بارەی ﴿ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ ﴾ دەفەرموێت: واتە ئەگەر قسەکانت ناشیرین و دڵت ڕەق بوایە، لە دەورت دەڕۆیشتن و بە تەنیا دەیانهێشتیەوە، بەڵام پەروەردگار لە دەوری تۆ کۆیکردوونەتەوە، بۆیە لەگەڵبوونی تۆ بۆیان هۆگربوونی دڵەکانیانە.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵁ دەڵێت کە نیشانە و سیفەتی پێغەمبەری خوای ﷺ لە کتێبە کۆنەکان دۆزیەوەتەوە: ئەو (قسە ڕەق نییە، دڵڕەق نییە، کەسێکی بازاڕی نییە، پاداشتی خراپە بە خراپە ناداتەوە، بەڵکو لێخۆشبوو لێبوردەیە.

## پێغەمبەر ﷺ بۆ کاری باش ڕێنمویی دەکردن کە گوناهەکانیان ڕەش دەکاتەوە، ئەمەش هۆکار دەبوو بۆ قبوڵبوونی تۆبەکانیان:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﵁ دەفەرموێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لە دووری شار من چوومەتە لای ئافرەتێك، بەڵام بێ ئەوەی سەرجێی لەگەڵ بکەم[1]، ئێستاش ئەوەتام لێرە، چۆنت دەوێت حوکمم لەسەر بدە.

عومەر پێی گوت: بەڕاستی پەروەردگار تۆی پۆشی، ئەگەر خۆت خۆت پۆشیبایە!!

پێغەمبەری ﷺ هیچ وەڵامی نەدایەوە.

پیاوەکە هەڵسا و ڕۆیشت.

پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بە دوادا نارد و ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴾ هود: ١١٤ واتەی

---

[1] واتە: چێژی لێوەرگرت بە ئامێزلێدان و ماچکردن و هەموو جۆرێکی چێژ وەرگرتن، تەنیا سەرجێی نەبێت.

ئایەتەکە: نوێژ بەچاکی ئەنجام بدە لە هەردوو سەری ڕۆژەوە (کە نیوەڕۆ و عەسرە) و لە سێ کاتەکەی شەویشدا کە (مەغریب و عیشاو بەیانی) یە، نزیکن لە(ئەمسەرو ئەوسەری ڕۆژەوە) بەڕاستی کردەوە چاکەکان کردارە خراپەکان لادەبەن و گوناهەکان دەشۆنەوە، ئەوە ئامۆژگاری و بیرخەرەوەیە بۆ ئەوانەی یادی خوا دەکەن.

پیاوێك لەو مەجلیسەکە هەڵسایەوە و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە تایبەتە بۆ ئەو کەسە؟

فەرمووی: **"بەڵکو بۆ تەواوی خەڵکییە**[1]**"**.

لە گێڕانەوەیەکی تری بوخاریدا هاتووە **"بەڵکو بۆ تەواوی ئۆمەتەکەمە"**.

﴿ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ واتە: ئەو پێنج نوێژە و ئەوەی پەیوەندیان پێیوە هەیە لە سوننەتەکان،ئەوا لە گەورەترینی چاکەکانن، ئەمە سەرباری ئەوەی چاکەن و لە خوای پەروەردگار نزیکت دەکاتەوە و پاداشتی پێ وەردەگری، لە هەمانکاتدا خراپەکان لادەبات و ڕەشیان دەکاتەوە.

مەبەست پێیان: گوناهە بچوکەکانە، هەروەك فەرمودە سەحیحەکانی پێغەمبەر بەستایتیەوە: **"پێنج نوێژەکە، جومعە بۆ جومعە، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، گوناهەکانی نێوانیان ڕەش دەکەنەوە، ئەگەر خۆی لە گوناهە گەورەکان پاراست"**[2].

هەروەها ئایەتێکی سورەتی نیسائیش ئەمەی بەستۆتەوە، کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾ النساء: ٣١ واتەی ئایەتەکە: ئەگەر خۆتان بپارێزن لەو تاوانە گەورانەی قەدەغە کراوە لێتان، ئەوە لە گوناهەکانی ترتان چاوپۆشی دەکەین و دەتانخەینە جێیەکی خۆش و سازگارو ڕێزدارەوە (کە بەهەشتی بەرینە))

مەزهەبی مورجیئە دەستیان بە واتای رووکەشەکەی ئەم ئایەتە﴿ إِنَّ ٱلْحَسَنَـٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾ گرتووە، دەڵێن: چاکەکان هەموو گوناه و تاوانەکان ڕەش دەکاتەوە، گوناهەکە بچوك بێت یان گەورە، بەڵام جمهوری زانایان واتای ئەم ئایەتەیان بە فەرموودەی سەحیح بەستۆتەوە.

---

[1] بوخاری (٥٢٦) و موسلیم (٢٧٦٣) گێراوەتیانەوە.

[2] موسلیم (٢٣٣) لە ئەبو هورەیرە گێراوەتیەوە.

ئەم فەرمودەیە کراوەتە بەڵگە،کە حەد دەرکردن لەسەر دەستلێدان و ماچکردن و شتی هاوشێوە نییە، ئەم سزایە لەسەر کەسێك نییە کە ئەم کارەی کردبێت و پاشان تۆبەی کردبێت [1].

**خۆی لە سزادان بە دووردەگرت، فەرمانی بە کەسی گوناهبار دەکرد خۆی داپۆشی، لە نێوان خۆی و خوایدا تۆبە بکات:**

زیاتر لە کەسێك هاتوونەتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو تاوان و گوناهەی کردوویانە داوایان کردووە سزایان بدات (حەدیان لێ دەربکات)، پێغەمبەریش ﷺ لەسەرەتای هەموو بابەتێك ویستوویەتی بەڕێیان بکات، گەر سووربوونی لەوان بینی، ئەوکات سزای لەسەر جێبەجێ دەکرن.

بەریدەی کوڕی حصیب ﷺ دەڵێت: ماعیزی کوڕی مالیك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پاکم بکەرەوە.

فەرمووی: **"ئەمە چیتە! بگەڕێوە، داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە و تۆبە بکە"**.

دەڵێت: کەمێك دوورکەوتەوە و پاشان گەڕایەوە.

دووبارە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پاکم بکەرەوە.

پێغەمبەریش دووبارەی پێی فەرموو: **"ئەمە چیتە! بگەڕێوە، داوای لێخۆشبوون لە خوا بکە و تۆبە بکە"**.

دەڵێت: کەمێك دوورکەوتەوە و پاشان گەڕایەوە و بۆ جاری سێیەم گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پاکم بکەرەوە.

ئەم جارەش هەمان وەڵامی دایەوە.

تا بۆ جاری چوارەم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"لە چی پاکت بکەمەوە؟"**.

گوتی: لە زینا.

پرسیاری لە خەڵکەکە کرد: **"ئایا ئەمە شێتە؟"**.

گوتیان: هیچی نییە.

فەرمووی: **"ئایا شەرابی خواردۆتەوە؟"**.

پیاوێك هەڵسا و بۆنی دەمی کرد، هیچ بۆنی شەرابی هەست پێ نەکرد.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"ئایا زینات کردووە؟"**.

گوتی: بەڵێ

---

[1] فتح الباری (٨/٣٥٧).

فەرمووی: **"بەڵكو لەوانەیە ماچت کردبێت، یان سەیرت کردبێت؟"**.

گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"ئایا خێزانداری؟"**

گوتی: بەڵێ.

ئەو کات فەرمانی رەجمکردنی دەرکرد.

دەڵێت: بردمانە شوێنێك بە ناوی بقیع الغرقد، نە بەستمانەوە و نە چاڵمان بۆ هەڵکەند.

بە ئێسك و کەستەك و قوڕی رەق رەجممان کرد.

هەڵات، بە دوای کەوتین، تا گەیشتە تەنیشت حەررە، بۆمان ڕاوەستا، ئەمجارە بە بەردی گەورە رەجممان کرد، تاکو مرد.

ئەمەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ باسکرد، کە ئەو پیاوە ئەو کاتەی هەستی بە لێدانی بەرد و مردن کرد هەڵات.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی **"لێی گەڕابان، بەڵكو تۆبەی دەکرد و پەروەردگاریش قبوڵی دەکرد"**.

خەڵك ئەو کات بوونە دوو گروپ، یەکێکیان دەیگوت: بەڕاستی گوناهەکانی دەوری دان و خۆی بە هیلاك برد.

یەکێکی تریان دەیگوت: هیچ تۆبەیەك لە تۆبەی ماعیز باشتر نەبووە، خۆی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و دەستی لەناو دەستی ناو پێی گوتی: بە بەرد بمکوژە.

دەڵێت: بەم شێوەیە ماوەی دوو یان سێ رۆژ بەسەر رووداوەکە تێپەڕی

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان، کە دانیشتبوون، سڵاوی کرد و پاشان دانیشت.

فەرمووی: **"داوای لێخۆشبوون بۆ ماعیزی کوڕی مالیك بکەن"**.

دەڵێت: گوتیان: خوای گەورە لە ماعیزی کوڕی مالیك خۆش بێت.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا فەرمووی ﷺ **"بەڕاستی ئەو تۆبەیەکی کرد، گەر دابەش بکرابایە سەر ئوممەتێك بەشی دەکرد"**.

دەڵێت: دواتر ئافرەتێکی غامیدی لە ئەزد هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا پاکم بکەرەوە.

فەرمووی: **"ئەوە چیتە، بگەڕێوە، داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار بکە و تۆبە بکە"**.

ئافرەتەکە گوتی: دەبینم رەتم دەکەیەوە، وەك چۆن پێشتر ماعیزی کوڕی مالیکت رەتکردەوە.

فەرمووی: **"تۆ چیتە؟"**.

گوتی کە ئەو بە زینا دووگیان بووە.

فەرمووی: **"تۆ؟"**.

گوتی: بەڵێ.

پێی فەرموو: **"برۆ، تاوەکو زگەکەت دادەنێیت"**.

دەڵێت: پیاوێکی ئەنساڕی کەفالەتی کرد تاوەکو منداڵەکەی بوو.

دەڵێت: پاشان هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: غامدیەکە منداڵەکەی بوو.

فەرمووی: **"رەجمی ناکەین، ئینجا منداڵەکەی بەو بچوکییە بەجێبهێڵین و کەس نەبێت بە خێوی بکات"**.

پیاوێکی ئەنساڕی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من بە خێوی دەکەم.

دەڵێت: رەجمی کرد [1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:**

- ستایشێکی گەورەی ماعیزی کوڕی مالیکی تێدایە، سەرباری تۆبەکردنی، لە پێناو پاکبوونەوەی بەردەوام بوو لە داواکردنی سزادانی، لە دانپێدانانەکەی خۆی پەشیمان نەبوویەوە، وێڕای ئەوەی سروشتی مرۆڤ وایە گەر بزانێت گیانی دەکەوێتە مەترسی و مردن لەسەر دانپێدانانەکەی بەردەوام نابێت، بەڵام ئەو بەهێزەوە بەردەوام بوو لەسەری، بە بێ ناچارکردن دانی پێدانا بۆ سزادانی، لەگەڵ ئەوەی دەیتوانی بە تۆبەکردن رێگەیەکی سەلامەت هەڵبژێرێت.
- بەڵگەی تێدایە کە تاوانی گەورە بە تۆبەکردن نامێنێت.
- باشترە ئەو کەسەی کەوتۆتە ناو گوناه دەستپێشخەری بکات بۆ تۆبەکردن، کەسیش ئاگادار نەکاتەوە، بە نیعمەتی داپۆشینی پەروەردگار خۆی داپۆشێ، گەر ویستی کەسێك لەم کارە ئاگادار بکاتەوە، دەبێت ئەم کەسە فەرمانی تۆبەکردنی پێ بدات و بابەتەکەشی بۆ پەردەپۆش بکات.
- باشترە کەسێك گەر ئاگاداری ئەمە بوو، کەسە گوناهبارەکە بپۆشێت، ئاشکرای نەکات و بابەتەکە بۆ لای پێشەوا یان حاکم بەرز نەکاتەوە.
- ابن العربی دەڵێت: ئەمە بۆ کەسێکە، کە ئاشکرای نەکردووە. بەڵام ئەگەر خۆی بە خراپەکارییەکە هەڵدەدایەوە و ئاشکرای کرد، پێم باشە بۆ خەڵك ئاشکرا بکرێت و سزا بدرێت، بۆ ئەوەی خۆی و کەسانی تری وەك ئەو شەرمەزار بکرێن.

---

[1] موسلیم (١٦٩٥) گێڕاوەتیەوە.

- دڵنیابوون لە مسەلەی خوێن رشتنی موسولمان و زیادەڕۆیی لە پاراسنی هەروەکو کە لەم چیرۆکەدا چەند جارێك رەتی دەکاتەوەو ئاماژەدان بەگەڕانەوەی وەرگرتنی دەعواکەی ئەگەر ئەمەی بەزۆرە ملیّ پیّ کرابێت، یان هەڵەیەك لەبارەی زیناوە یان بەرکەوتنێك بەبێ فەرج یان شتی تری هاوشێوە.
- ڕەوایی دانپێدانان بە کاری خراپەکاری لە لای پێشەواو، لەناو مزگەوت و دەربڕین بەراشکاوی لەناوی بەوەی شەرم دەیگرێت لەو بێژانە دەری ببڕێت لەجۆرەها وتەی خراپەو خراپەکاری ئەمەش لەبەر ئەو پێداویستیەی ئەو حالەتە دەیەوێت
- هاوارکردن بە دەنگێکی بەرز و پشت تێکردنی پێشەوا یان حاکم بۆ کەسێك کە دانیناوە بە تاوانێك لەوانەیە بێتە هۆی سزادانی، ئەمەش بە ئەگەری ئەوەی لەوانەیە ئەم کارە بە شێوازێکی تر تەفسیر بکرێت و پێویستی بە سزادان نەبێت، پرسیارکردنی لەبارەی مەرجەکانیشی هەر بۆ ئەم مەبەستە بووە.
- دانپێدانانی کەسی شێت ڕتکراوەیە.
- دانپێدانانی کەسی سەرخۆش هیچی لەسەر نییە، ئەمەش بە بەڵگەی فەرموودەی (بۆنی دەمی بکەن).
- هاندانی کەسی دانپێدانەر بۆ گەڕانەوە، گەر بگەڕێتەوە قبولّ دەبێت.
- دروستە پێشەوا یان حاکم کەسێکی تر بکاتە وەکیلی خۆی بۆ سزادان.
- دروستە کەسی دانپێدانەر لە ئاکامەکانی سزدانەکەی ئاگادار بکرێتەوە.
- سزادان واجب نابێت تەنیا لە کاتی بوونی دانپێدانانی ئاشکرا، بۆ ئەو کەسەشی کە شاهێدی زینایە، دەبێت بڵێت چوونە ناوەی هەردوو ئەندامەکەم بینی، بە تەنیا بڵێت من شاهێدی دەدەم ئەو زینای کردووە بەس نییە.
- ئەو کەسەی دانیناوە بە زینا نابێت بەند بکرێت تاوەکو بابەتەکە جێگیر دەبێت، ئافرەتی دووگیانیش تاوەکو زگەکەی دادەنێت.
- پێویستە پرسیار بکرێت لەو حاڵەتەی کە حوکمەکان دەگۆڕدرێن بە گۆڕینی، ئەمەش بە بەبەڵگەی وتەی (ئایا خێزانداری؟).
- کەسی دانپێدانەر گەر بڕیاری گەڕانەوەی دا، جێدەهێڵدرێت، گەرنا رەجم دەکرێت.
- ئافرەتی دووگیان سزا نادرێت تاوەکو سکەکەی دادەدنێت/ جا ئەگەر دووگیانییەکەی لە زینا بوو یان نا، ئەمەش یەکدەنگی لەسەرە لە پێناو نەکوشتنی منداڵەکە، تەنانەت گەر سزادانەکەی جەڵد بێت، دیسان بە کۆی دەنگ لەسەری جێبەجێ ناکرێت تاوەکو زگەکە دانەنێت.

- ئافرەتی خێزاندار وەکو پیاوی خێزاندار گەر زینای کرد رەجم دەکرێت.
- ئـەوەی سـزای کەوتـە سـەر، دووگیـان بـوو، لەسـەری جێبـەجێ نابێـت تـاوەکو زگەکـەی دادەنێـت، پاشـان سـزا نادرێـت تـاوەکو شـیر دەداتـە منداڵەکـەی، یـان بـە شیری کەسێکی تر[1].

**لەوانەیە هەندێك جارواری هێنابێت لە پرسیارکردن لە جۆری تاوانەکە، ئەمەش لە پێناو دا پۆشینی:**

ئەبو ئومامە ﷺ دەفەرموێت: لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوت دانیشتبوو، ئێمـەش لـە خزمـەتی دانیشـتبووین، پیاوێـك هـات و گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا مـن سـنورێکم بەزاندووە، سزام بدە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بێ دەنگ بوو، پرسیاریشی لێ نەکرد.

دووبارە گەڕایەوە و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من سنورێکم بەزاندووە، سزام بدە.

بێ دەنگ بوو.

نوێژ ئەنجامدرا.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەرچوو، پیاوەکە دوای کەوت، منـیش دوای پێغەمبـەر ﷺ کـەوتم بۆ ئەوەی بزانم چۆن وەڵامی ئەم پیاوە دەداتەوە.

پیاوەکـە گەیشـتە پێغەمبـەر دیسـان گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا مـن سـنورێکم بەزاندووە، سزام بدە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا کاتێك لە ماڵ دەرچوویت، دەستنوێژت بە جوانی گرتبوو؟"**.

گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"پاشان نوێژت لەگەڵ ئێمە ئەنجامدا؟"**.

گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: **"ئـەوا پـەروەردگار لـە تاوانەکـەت خۆشـبوو"**، یـان فەرمووی: **"لە سنور بەزاندنەکەت"**[2].

---

[1] سەیری: فتح الباري (١٢/١٢٥) بکە. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/٢٠١).

[2] بوخاری (١٢١٣) و موسلیم (٢٤٨٦) گێڕاوەتیانەوە. بوخاری باسێکی بەو ناوە کردووە (باسی: گەر کەسێك دان بەتاوان دابنێت و رِوونی نەکاتەوە، ئایا بۆ ئیمام دروستە بیپۆشێ؟".

ئیبن حەجەر دەفەرموێت: بوخاری بەو شێوەیە باسی کردووە، کە کەسێك دان بەتاوان دابنێت بەڵام روونی نەکاتەوە، پێویست ناکات لەسەر حاکم و پێشەوا سزای بدات، گەر تۆبەی کرد [1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:**

- حاکم یان پێشەوا جۆری تاوانەکە ئاشکرا ناکات، بەڵکو هەر چۆنێك بێت دووری دەخاتەوە، ئەم پیاوە کارەکەی ئاشکرا نەکردووە، کە پێویست بکات سزای لەسەر وەربگرێت، لەوانەیە توشی گوناهێکی بچوك بێت وا گومانی بردێت کە گەورەیە و سزای لەسەرە، پێغەمبەریش ﷺ ئاشکرای نەکرد، چونکە تەنیا بە گریمانە سزادان واجب نابێت.

بۆیە پرسیاری لێنەکرد بۆ ئەوەی داپۆشێت، لە سزادانەکەی پەشیمانی و گەڕانەوە دەبینێت.

زانایان پێیان باشە ئەو کەسەی دانی بەگوناه داناوە، ئاگادار بکرێتەوە بۆ گەڕانەوە و پەشیمان بوونەوە، یان بە ئاماژەپێکردنێك، یان بە شتێکی روونتر بۆ ئەوەی لە سزادانەکەی دووربکەوێتەوە [2].

ئیبن قەیم وای داناوە، گەر کەسی سەرپێچیکار بەر لەوەی توانای سزادانی هەبێت، تۆبەی کرد، ئەوکات سزای لەسەر لا دەچێت [3].

هەر ئەو ﷺ دەفەرموێت: دەگوترێت: ماعیز بە تۆبەوە هات، غامدیەیش هەر بە تۆبەوە هات، بەڵام سزا دران؟

دەگوترێت: گومانی تێدانیە کە ئەو دووانە بە تۆبەکردنەوە هاتبوون، گومانیشی تێدانیە کە سزا دران، رایەکەی تر پشت بەبەڵگەی ئەو دووانە دەبەستن.

لەم بارەیەوە پرسیارم لە شێخمان کرد: وەڵامی دامەوە، کە ناوەرۆکەکەی ئەمەیە: سزادان پاکبوونەوەیە،تۆبەش پاکبوونەوەیە هەردووکیان پاکبوونەوەیان بە سزادان هەڵبژارد بەسەر پاکبوونەوەی بە تۆبەکردن بە تەنیا.

رازی نەبوون و وتیان تەنیا دەبێت بە سزادان پاك ببینەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ رێنوێنی کردن کە دەتوانن پاکبوونەوە بە تۆبەکردن بەسەر سزادان هەڵبژێرن، لەبارەی

---

[1] فتح الباری (١٢/١٣٤).
[2] فتح الباری (١٢/١٣٤).
[3] إعلام الموقعین (٣/١٧).

ماعیزەوە فەرمووی: " **لێیگەڕابان، تۆبەی بکردبایە، پەروەردگاریش لێی قبوڵ دەکرد**".
گەر سزادان دوای تۆبەکردن دیاری بکرابایە، دروست نەبوو وازی لێ بهێنن.

بەڵکو حاکم یان پێشەوا سەرپشکە یان وازی لێهێنێت وەك بەو هاوەڵەی فەرموو کە دانی نابوو بە گوناهەکەی "**برۆ پەروەردگار لە تاوانەکەت خۆش بووە**".یان سزای بدات وەك چۆن لەسەر ماعیز و غامیدیە سزا جێبەجێکرا کە خۆیان هەڵیان بژاردبوو، رەتیان کردووە بە جگە لە سزادان پاك ببنەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ چەند جارێك ئەوانی رەتدەکردەوە، بەڵام ئەوان لەسەر وەگرتنی سزاکە سوور بوون.

ئەمەش پێڕەوێکی مامناوەندە لە نێوان هەردوو ئەو رایانەی کە یەکیان دەڵێت: هەرگیز نابێت دوای تۆبەکردن سزا بدرێت، لە نێوان رای دووەمیش کە دەڵێت: هەرگیز تۆبەکردن نابێتە هۆی لابردنی سزا، گەر بەناو سوننەتدا بگەڕێی جگە لەم رایە مامناوەندییە هیچی دیکە نابینینەوە، خواش زاناترە [١].

نزیك لەمە، فەرمودەی عەلقەمەی کوڕی وائیلی کندیە،کە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە،کە ئافرەتێك لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژکردن دەرچوو، لە رێگادا پیاوێکی توشبوو داپۆشی و [٢]، کاری خۆی لەگەڵ کرد.

ئافرەتەکە هاواری کرد.

پیاوەکە هەڵات.

پیاوێك بەلایدا تێپەڕی، بە پیاوەکەی گوت: ئەم پیاوە ئاوا و ئاوای لەگەڵ کردم.

پیاوەکە بە دوای کەوت.

ئافرەتەکە بەلای کۆمەڵێك لە موهاجیرەکان تێپەڕی و گوتی: ئەم پیاوە ئاوا و ئاوای لەگەڵ کردم.

ئەوانیش بە دوای رۆیشتن، چوون پیاوی دووەمیان هێنا کە بە دوای پیاوی یەکەم رۆیشتبوو.

هێنانیانە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئافرەتەکە گوتی: ئا ئەمە بوو.

پیاوەکە گوتی: بەڵکو من ئەوبووم کە بە هاناتەوە هاتم، پیاوەکەی تر هەڵات.

خەڵکەکەش هەواڵیاندا بەوەی ئەویان دیت هەڵدەهات.

گوتی: بەڵکو من بە هانای چووم، ئەم جەماعەتەش منیان هێناوە.

---

[١] اعلام الموقعين (٢/٦٠-٦١).

[٢] واتە: بە کراسەکەی خۆی داپۆشی و جیماعی لەگەڵ کرد.

ئافرەتەکە گوتی: درۆ دەکەی، ئەمە بوو کە وای لێکردم.

کاتێك فەرمانی کرد رەجم بکرێت، ئەو پیاوەی کە وای لێکردبوو هەڵسایەوە و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من وام لێکرد.

پێغەمبەریش بە ئافرەتەکەی فەرموو: **"برۆ پەروەردەگار لەگوناهەکەت خۆش بووە"**.

قسەیەکی جوانی بە پیاوەکەش گوت.

گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا رەجمی ناکەی؟

فەرمووی: **"بەڕاستی ئەو تۆبەیەکی کردووە، گەر بەسەر هەموو خەڵکی مەدینەی دابەشبکەی، بەشیان دەکات[1]"**.

## ئیشکالێك و وەڵامەکەی:

ئیشکالیەتەکە لەمەیە، ئەو کەسەی بەهانای چوو، بە دانپێدانان لەسەری نەچەسپاوە زینای کردووە، بەڵگەشی لەسەر نەبووە، چۆن رەجم دەکرێت؟

ئەم ئیشکالە چەند وەڵامێکی هەیە:

- پێغەمبەر ﷺ نزیك بوویەوە لە دەرکردنی فەرمانی رەجمکردن، بەڵام فەرمانی دەرنەکرد: العظیم آبادی دەڵێت: (ئاشکرایە کە ئەمە بە رووکەشی ئیشکالی دروست کردووە، چونکە فەرمانکردن بە رەجم بە بێ بوونی دانپێدانان یان بەبێ بوونی بەڵگە روونادات، قسەی ئافرەتەکەش بە بەڵگە ناشێت، بەڵکو لەوانەیە مەبەست لەمە، قسەی ئەو کەسە بێت کە فەرمودەکە دەگێڕێتەوە وەك ئاماژەیەك بۆ رووە دیارەکەی بابەتەکە).
- ئەم سزادانە لەسەر حەدد دەکردنە بە پیسبوونی ئاشکرا.

ئیبن قەیم دەفەرموێت: ئەمە وەکو سزادانە لەسەر پیسی ئاشکرا، ئەو بینی ئەم پیاوە هەڵدێت لەناو خەڵکەکە، دانیشی بەوە ناوە کە لەلای ئافرەتەکە بووە، دەشڵێت،کە ئەو بە هانای چووە.

ئافرەتەکەش دەڵێت: ئەم پیاوە خۆیەتی، ئەمانە پیسی ئاشکران، هاوەڵانیش حەددی زینا و ئارەقیان دەرکردووە، بەو پیسیەی کە وەکو ئەمەیە، یان نزیك لەمە، ئەویش سکپڕی و بۆنە[2].

---

[1] ترمذي (٣٩٤٥) و ئەبوداود (٣٤٣٧) و ئەحمەد (٢٦٦٩٨) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٩٠٠) بە سەحیحی داناوە.

[2] حاشية ابن القيم مع عون المعبود (١٢/١٦٥).

• لەوانەیە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بۆ سەرزەنشتکردنی کردبێت نەك بۆ رەجم کردنی، بەیهەقی دەڵێت پاش ئەوەی ریوایەتی کردوە، کە (کاتێك فەرمانی کرد، پیاوەکەی تر هەڵسایەوە)، دەڵێت: لەسەر بنەمای ئەم گێڕانەوەیە دەکرێت فەرمانی کردبێت سەرزەنشت بکرێت [1].

• لەوانەیە خەڵکەکە شاهێدیان لەسەر دابێت زینای کردووە، لەمەشدا هەڵەیان کردووە [2].

• ئەم فەرمودەیە لاوازە، مەدارەکەی لەسەر سەمماکی کوڕی حەربە، نەسائی دەڵێت: سماك گەر بەتەنیا بنچینەیەك بگێڕێتەوە نابێتە بەڵگە، چونکە ئەو چیان بۆ بگۆتبایە ئەوەی دەگوت [3].

بەیهەقیش ئاماژە بە لاوازی فەرموودەکە دەکات و دەڵێت: لە نمونەی دانپێدانانەکەی ماعیز و جوهەینە و غامدییە بینراوە، هیچیان حەددیان لەسەر لانەچووە، فەرمودەکانیشیان زۆرتر و دیارترن، خواش زاناترە [4].

## گەر سزای لەسەر کەسێك جێبەجێ بکردبایە کە تاوانی کردووە، توندوتیژ نەدەبوو لەگەڵی، رێگریشی دەکرد قسەی ناشیرینی پێ بگوترێت یان نەفرەتی لێ بکرێت:

بەریدەی کوڕی حەصیب ﷺ دوای باسکردنی چیرۆکی ماعیز- دەگێڕێتەوە و دەڵێت: غامدیە هات و گوتی ئەی پێغەمبەری خوا، من زینام کردووە، پاکم بکەرەوە، ئەویش رەتی کردەوە.

بۆ بەیانی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا رەتم مەکەرەوە، وەك چۆن ماعیزت رەتکردەوە، سوێند بە خوا من دووگیانم.

فەرمووی: **"بەڵام ئێستا نا، بڕۆ تاوەکو سکەکەت دادەنێیت".**

کاتێك سکەکەی دانا، خۆی و منداڵەکەی هات و گوتی: ئەوەتا من سککەم دانا.

فەرمووی: **"بڕۆ شیری پێ بدە، تاوەکو لە شیری دەکەیەوە".**

کاتێك لە شیری کردەوە، خۆی و منداڵەکە هاتنەوە، لە دەستی منداڵەکە پارچە نانێك هەبوو. گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە شیرم کردۆتەوە ئەوەتا نان دەخوات، منداڵەکە

---

[1] سنن البيهقي (٨/٢٨٤).
[2] سنن البيهقي (٨/٢٨٤).
[3] الاحاديث المختارة (١٢/٢٠). تهذيب التهذيب (٤/٢٣٤).
[4] سنن البيهقي (٨/٢٨٤).

درایە پیاوێك لە موسڵمانان، پاشان فەرمانی بۆ دەرکرد، چاڵیکان بۆ هەڵکەند تاوەکو سینگی قوڵ بوو، فەرمانی بە خەڵکەکە کرد، ئەوانیش رەجمیان کرد.

خالیدی کوڕی وەلید چووە پێشەوە و بەردێکی لە دەستگرت و لەسەریدا، خوێن فیچقەی کردو هەندێك بە جلەکانی کەوت، جنێوێکی پێدا، پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەو جنێوەی بوو، فەرمووی: **"بوەستە ئەی خالید، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەو تۆبەیەکی کرد، گەر ئەو کەسەی پارە بە ناحەق لە خەڵك وەردەگرێت ئەو تۆبەیەی بکردبایە، خوای پەروەردگار لێ خۆشی دەبوو".**

پاشان نوێژی لەسەرکرد و بە خاکی سپارد [١].

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئەم زیادەیە هەیە: عومەر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژی لەسەر دەکەی لە کاتێکدا زینای کردووە.

فەرمووی: **"بە ڕاستی ئەو تۆبەیەکی کردووە، گەر دابەشی بکەی بەسەر حەفتا کەسی خەڵکی مەدینە، بەشیان دەکات، ئایا هیچ تۆبەیەکت لەوە باشتر دیووە، کە بە خۆی بێت و گیانی خۆی تەسلیمی پەروەردگار بکات لە پێناو پاکبوونەوە"** [٢].

**لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:**

- بەڕاستی باج و گومرگ و پارە وەرگرتن قێزەونترین تاوان و گوناهە، ئەمەش لەبەر زۆری داوای خەڵك بۆی و ستەمەکردنیان لە ئاستی، هەروەها چەندبارە داواکردنی و پێشێلکردنی مافی خەڵکی و بردنی پارە و سامانی خەڵك بە ناحەق و سەرف کرنی لە شتێکی بێهودە.
- بەڵگەی تێدایە، کە پێشەوا و خەڵکانی موسڵمان نوێژ لەسەر کەسی رەجم کراو دەکەن، وەك چۆن نوێژ لەسەر کەسانیتر دەکەن.
- نەمانی گوناهی گەورە بە تۆبەکردن [٣].

**سوودێك:**

نەوەوی دەفەرموێت: گەر بگوترێت، ماعیز و غامدیە بۆ وایانکرد، کە قەناعەتیان بە تۆبەکردن نەبوو، ئەگەر چی تۆبەکردن گوناه ڕەش دەکاتەوە، بەڵکو سووربوون لەسەر دانپێدانان و رەجم کردنیان هەڵبژارد؟

---

[١] موسلیم گێراوەتیەوە(١٦٩٥).

[٢] موسلیم گێراوەتیەوە(١٦٩٦). لە عمرانی کوڕی حصین ﷺ

[٣] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/١٩٩).

**وەڵام:** بەدەستهێنانی پاکبوونەوە بە دەرکردنی حەدد و نەمانی گوناه، دڵنیاییە، بە تایبەت گەر ئەو حەدد دەرکردنە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمانی پێکرابێت.

بەڵام تۆبەکردن، لەوانەیە ترس هەبێت لەوەی تۆبەکردنەکە ڕاست نەبێت، یاخود یەکێك لە مەرجەکانی تێدا نەبێت، ئەو کات گوناه و تاوانەکە لەسەری دەمێنێتەوە، بۆیە ویستویانە پاکبوونەوەکە بە ڕێگەیەکی دڵنیا بەڕێوە بچێت، نەوەك پەنا ببنە بەر حاڵێك کە گومانی تێدابێت، پەروەردگار زاناترە [1].

## ئیشکالێك و وەڵام:

**ئیشکال:** لەم گێڕانەوەیەدا، پێغەمبەر ﷺ رەجمی نەکردووە، تا ئەو کاتەی منداڵەکەی لە شیر کردۆتەوە، لە فەرمودەکەی پێشوتردا، پیاوێك لە ئەنسارییەکان شیرپێدانی منداڵەکەی خستە ئەستۆی خۆی، ئەو کات پێغەمبەر ﷺ ڕاستەوخۆ فەرمانی ڕەجمکردنی دەرکرد.

**وەڵام:** نەوەوی دەفەرموێت: (هەردوو گێڕانەوەکە لە ڕواڵەتداك جیاوازیان هەیە، گێڕانەوەی دووەم ڕوونترە، کە دەڵێت ڕەجمکردنەکەی دوای لێکردنەوەی منداڵەکە لە شیرو فێرکردنی خواردن بووە، بەڵام لە فەرمودەی یەکەمدا دەردەکەوێت ڕاستەوخۆ دوای لە دایکبوونی ڕەجمی کردووە.

پێویستە فەرمودەی یەکەم بە پێی فەرمودەی دووەم لێکدانەوەی بۆ بکرێت، چونکە بابەتەکە یەك شتە، هەردوو گێڕانەوەکەش دروستن (سەحیحن)، فەرمودەی دووەم ڕوونە و پێویستی بە لێکدانەوە نییە، بەڵام یەکەمیان ڕوون نییە، بۆیە پێویستە لێکدانەوەی بۆ بکرێت، لە گێڕانەوەی یەکەمدا هاتووە (پیاوێك لە ئەنسارییەکان هەڵسا و گوتی: من شیری پێ دەدەم)، ئەم قسەیەی گوتووە لە دوای لێکردنەوەی لە شیرپێدان، مەبەستی لە شیرپێدان لەخۆگرتن و پەروەردەکردنی بووە، بە مەجازی وشەی (شیرپێدانی) بەکارهێنیاوە [2].

## قەدەغەی کردووە قسەی ناشیرین بەو کەسە بگوترێت کە لەسەر خواردنەوەی شەراب جەڵدی لێدەدرێت، وای داناوە ئەم کارە لەوانەیە ببێتە یارمەتیدانی شەیتان بۆ کەسی سەرپێچیکارەکە:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کەسێکی سەرخۆشیان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ، ئەویش فەرمانی لێدانی دەکرد، هەندێك لە ئێمە بە دەست لێیدەدا، هەندێکمان بە نەعلی لێیدەدا، هەندێکی ترمان بە کراسەکەی خۆی لێیدەدا، کاتێك ڕۆیشت.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/١٩٩).

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/٢٠٢).

پیاوێك گوتی: ئەمە چی بوو، خوا گەورە ریسوای بکات.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"مەبنە یارمەتیدەری شەیتان لەسەر براکەتان [١]"**.

لە گێڕانەوەیەکی تردا، ئەمەی زیادکردووە **"بەڵکو بڵێن: پەروەردگار لێی خۆش بە، رەحمی پێ بکە [٢]"**.

ئیبن حەجەردەڵێت: (مەبەست لە یارمەتیدەری شەیتان ئەوەیە: کە شەتیان دەیەوێت لە رێگەی پاکبوونەوەی کەسەکە لە گوناهەکەی توشی ریسوایی ببێت، ئەگەر خەڵکەکە دوعای ریسوای لێ بکەن، ئەوکات ویستی شەیتان دێتە دی).

لە سوودی ئەم فەرمودەیە ئەوەیە، رێگرتن لە دوعا لە کەسی سەرپێچیکار و بە دوور کەوتنەوەی لە رەحمی پەروەردگار وەك نەفرینکردن [٣].

نزیك لەمە، ئەبو قیلاب، دەگێڕێتەوە کە ئەبو دەردا ﷺ بە لای پیاوێکدا تێپەڕی کە توشی گوناهێك ببوو، خەڵك قسەی ناشیرینیان پێ دەگوت.

گوتی: ئایا گەر ئەم پیاوە لە بیرێك بوایە، دەرتان نەدەهێنا؟

گوتیان: بەڵێ.

گوتی: قسەی خراپ بە براکەتان مەڵێن، سوپاسی خوا بکەن کە ئێوەی لەم گوناهە پاراستووە.

گوتیان: ئایا تۆ رقت لێ نابێتەوە؟

گوتی: من رقم لە کردەوەکەی دەبێتەوە، گەر واز لەم کردەوە بهێنێت، ئەوا برای منە [٤].

**قەدەغەی کردووە دوعای خراپ لە کەسانێکی دیاریکراو لەوان بکرێت لە نمونەی نەفرین کردن و شتی تر:**

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ ناوی عەبدوڵڵا بوو، نازناوی گوێدرێژیان لێنابوو، ئەو پیاوە پێغەمبەری خوای ﷺ دەخستە پێکەنین، پێغەمبەر ﷺ لەسەر خواردنەوەی شەراب جەڵدی لێدابوو، رۆژێکیان هێنایان، فەرمانی جەڵد لێدانی بۆ دەکرد.

پیاوێك لەناو خەڵکەکە گوتی: پەروەردگارا نەفرینی لێ بکە، ئەوا چەند جارە ئەم کارە دەکات.

---

[١] بوخاری گێراوەتیەوە(٦٧٨١).

[٢] ئەبو داود گێراوەتیەوە(٤٤٧٨). ئەلبانی لە (تحقيق المشكاة – ٣٦٢١) بە سەحیحی داناوە.

[٣] فتح الباري (٦٧/١٢). بەکورتی.

[٤] ئەبو داود لە زوهد گێراوەتیەوە(٢٣٢)، عبدالرزاق لە المنصف (٢٠٢٦٧). ئەبو نعیم لە الحلية (٢٢٥/١).

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: **"نەفرینی لێ مەکەن، سوێند بە پەروەرگار ئەوەی زانیبێتم لێی ئەوەیە، کە خوا و پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت"** [١].

**لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:**

- هیچ دژیەك نییە لە نێوان سەرپێچیکردن و بوونی خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر لە دڵی کەسی سەرپێچیکار، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی داوە، کە ئەم پیاوە سەرباری ئەو کارەی ئەنجامداوە، خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت.

لەوانەشە ئەوە بێت،کە بەردەوام بوونی ئەو خۆشەویستیە لە دڵی کەسی سەرپێچیکار بەسترابێتەوە بە پەشیمان بوونەوەی لە تاوانەکەی و حەد لێدەرکردنی، ئەوکات گوناهەکەی لەسەر لادەچێت، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی، کە ترس هەیە بە دووبارە بوونەوەی ئەو گوناهە، مۆر لە دڵی بدرێت و گوناهەکە خۆشەویستیەکەی لێ بستێنێت، داوای لێخۆش بوون لەخوای گەورە دەکەین [٢].

شێخی ئیسلام دەفەرموێت: (پێغەمبەر ﷺ نەهیکردووە نەفرەت لەو کەسە دیاریکراوە بکرێت، کە زۆر شەراب دەخواتەوە، روونیشی کردتۆتەوە بە هۆی ئەوەی خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت، وێرای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەهایی نەفرەتی لە کەسی سەرخۆش کردووە.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دروستە بە ڕەهایی نەفرەت لە کەسی دیاریکراو بکرێت، بەڵام دروست نییە نەفرەت لە کەسی دیاریکراو بکرێت کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆش دەوێت.

بێگومان دبێت هەموو باوەڕداران خوا و پێغەمبەریان خۆش بوێت [٣]

هەر لەبارەی ئەمە ئەگەر گوترا: ڕووی کۆکردنەوەی نێوان ئەو فەرمودەیە و فەرمودەی ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ چییە، کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئارەق نەفرەتی لە ١٠ کەس کردووە: ئەوەی دیگوشێت و ئەوەی بۆی دەگوشرێت، ئەو کەسەی دەیخواتەوە، ئەو کەسەی باری دەکا، ئەو کەسەی بۆی باردەکرێت، شۆفێرەکەی، فرۆشیارەکەی، بخۆری نرخەکەی، کڕیارەکەی و ئەوەی بۆی دەکڕدرێت.

---

[١] بوخاری گێراوەتیەوە(٦٧٨٠).
[٢] فتح الباری (٧٨/١٢).
[٣] منهاج السنة النبوية (٥٩٦٦٧٠/٤).

**وەڵام**: فەرمودەی ناوبراو لەبارەی نەفرەت کردنی کەسێکی دیاریکراوە، کە دروست نییە، بەڵام فەرمودەی ئەنەسی کوڕی مالیك لە بارەی نەفرەت کردنە لە جنسی شەڕاب خۆر بە شێوەیەکی گشتی، کە ئەمەیان دروستە [١].

**لەوانەیە لەسەرزەنەشتکردنی ئەو کەسەی کەوتبێتە ناو تاوان توند بێت، بەتایبەت گەر ئەو کەسە خۆشەویست بایە لای:**

مەعروی کوڕی سوەید دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئەبوزەرم بینی لەرەبەزە [٢]، پۆشاکێکی لەبەربوو، غولامەکەشی هەمان پۆشاکی لەبەربوو. پرسیارم لەبارەیەوە لێکرد، گوتی: من جنێوم بە پیاوێك دا، بە دایکی عەیبدارم کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی ئەبازەر، بە دایکی عەییداری دەکەی؟ بەڕاستی تۆ پیاوێکی خەسڵەتی نەفامیت تێدایە [٣].**

**براێانتان، یارمەتیدەرتانن، پەروەردگار ئەوانی لەژێر دەستی ئێوە دلناوە، هەر کەسێك برایەکی لە ژێر دەست دابێت، با لە خواردنی خۆی خواردنی بداتێ، لە پۆشاکی خۆی بیپۆشێ، شتێکیان پێ مەسپێرن کە نەتوانن بیکەن، گەر پێشتان سپاردن یارمەتیان بدەن [٤]".**

ئیبن حەجەر دەفەرموێت :( بۆیە سەرزەنشتی کرد پێگەیەکی گەورەی لەلای پێغەمبەر ﷺ هەبوو، ئەمەش وەك هۆشداریدانێك بۆ دووبارە نەبوونەوەی، تەنانەت گەر عوزرێکیشی هەبێت لە عوزرەکان، بەڵام کەوتنە ناو گوناه لە نمونەی ئەو هاوەڵانە کارەکە گەورەتر دەکات بە بەراورد بە کەسێکی تر). [٥]

**لەوانەیە لەسەر کەسی گوناهکار توند بووبێت، چەند بارەی دەکردەوە لەسەری، بۆ ئەوەی مەترسیی گوناهەکەی بۆ روونبکاتەوە:**

ئوسامەی کوڕی زەید ﵁ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی نارده حەرقە [٦].

بۆ بەیانی رووبەرووی دوژمن بوینەوە، بەسەریاندا زاڵبووین.

من و پیاوێکی ئەنساری بەدوای یەکێك لەوان کەوتین، کاتێك گەیشتینە سەرسەری، گوتی: لا إله إلا الله.

---

[١] ترمذي (١٢٩٥) و ابن ماجة (٣٣٨١) گێراوەتیانەوە. ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[٢] گوندێکە نزیکەی سێ رۆژ ڕێ لە مەدینە دوورە، لەسەر ڕێگەی حیجازە. معجم البلدان (٣/٢٤).

[٣] واتە: ئەم گوزارشتە لە ڕەوشتی سەردەمی نەفامییە، خەسڵەتی ئەوانت تێدایە.

[٤] بوخاری (٣٠) و موسلیم (١٦٦١) گێراوەتیانەوە.

[٥] فتح الباری (١/٨٥).

[٦] ناوچەیەکە دەگەوێتە (جهينة)، واتا: سوتان، بۆیە ئەو ناوەی لێندراوە، بەهۆی ئەو شەڕەی لە نێوان ئەوان و (بني مرة بن ذبيان) روویداوە، واتە بەتیربارانکردنیان و زۆر کوشتنیان سوتاندنیان.

ئەنسارییەکە وازی لێهێنا، بەڵام من بە ڕمەکەم لێمدا و کوشتم.

کاتێك گەڕاینەوە، ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت.

فەرمووی: **"ئەی ئوسامە، دوای ئەوەی گوتی: لا إله إلا الله ئینجا کوشتت؟ ڕۆژی دوایی چۆن وەڵامی لا إله إلا الله دەدەیتەوە"**.

گوتم: لە ترسی چەك ئەم قسەی گوت.

فەرمووی: **"ئایا دڵت شەق کرد، بۆ ئەوەی بزانی بە دڵ وایگوت یان نا؟"**.

بەردەوام ئەمەی دووبارە دەکردەوە، تا وای لێهات ئومێد بخوازم پێش ئەو ڕۆژە موسڵمان نەبووبام[1].

نەوەوی دەفەرموێت: (ئەم فەرمودەیە بەڵگەیەکی شەرعی ناسراوی لە فیقە و ئسولّ تێدایە، کە دەڵێت: حوکمەکان (لەدونیا) کاری پێدەکرێت لە شتە ئاشکراکان، پەروەردگاریش خاوەنی نهێنییەکانە.

کە دەڵێت: (ئومێدم دەخواست ئەو ڕۆژە موسڵمان نەبووبام)، واتە پێشوتر موسڵمان نەبووبام، بەڵکو لە ئێستاوە موسڵمان بوومایە، بۆ ئەوەی گوناهی پێشوتری ڕەشبکردبامەوە، ئەم قسەیەی، کە کردووە لەبەر گەورەیی ئەو گوناهە بووە، کە تێی کەوتووە[2].

قرطبي دەفەرموێت: (ئاماژەیەکە بۆ بچوکردنەوەی ئەو هەموو کردەوە چاکەی پێشوتر هەیبووە لەبەرامبەر ئەو کارەی کردوویەتی، ئەمەش بە هۆی ئەو ئینکارە توندەی گوێی لێبوو، ئەوەی گوتیشی بۆ زیدەڕۆیی بووە[3]).

ابن التين دەفەرمويت: (ئەم لۆمەکردنە جۆرێك لە فێرکردن و ئامۆژگاری تێدایە، بۆ ئەوەی کەس هەڵنەستی بە کوشتنی کەسێکی تر کە وشەی یەکتاپەرستی گوتووە).

خطابي دەفەرموێت (لەوانەیە ئوسامە تەئویلی ئەم ئایەتەی پەروەردگاری کردبێت ﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَـٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا ﴾ غافر: ٨٥

بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ گلەیی لەسەر لابرد و هیچ خوێنبایی و شتی تری لەسەر واجب نەکرد)[4].

ابن بطال دەفەرموێت (ئەم چیرۆکە بووە هۆی ئەوەی کە ئوسامە سوێند بخوات لەدوای ئەمە شەڕ لەگەڵ هیچ موسڵمانێك نەکات)[5].

---

(1) بوخاری (٤٢٦٩) و موسلیم (٩٦) گێراوەتیانەوە.

(2) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٧/٢).

(3) فتح الباری (١٩٦/١٢).

(4) فتح الباری (١٩٦/١٢).

(5) فتح الباری (١٩٦/١٢).

**ناشیرینی گوناهەکەی بۆ کەسی سەرپێچیکار بۆ ڕووندەکردەوە، بۆ ئەوەی تۆبەبکات و جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە سەری:**

عائیشە ﵂ دەفەرموێت: بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت: بەستە لە صەفییە کەئاوا و ئاوایە واتە: باڵای کورتە.

فەرمووی: **"عائیشە بەڕاستی وشەیەکت گوت، گەر لەگەڵ ئاوی دەریا تێکەڵ بکرێت، پیسی دەکرد"**[1].

واتا: گەر ئەم غەیبتکردنە تێکەڵی دەریا بکرێت، سەرباری زۆری ئاوەکەی دەیگۆڕێت، ئەی چی گەر کردەوە کەم و پیسەکان تێکەڵی بکرێت[2].

**هەندێك جار پێغەمبەر ﷺ بۆ ماوەیەك لە کەسی سەرپێچیکار دووردەکەوتەوە، تا پەروەردگار حوکمی خۆی بەرسەردا جێبەجێ دەکرد یاخود تۆبەیانی قبوڵ دەکرد.**

ئەمەیان بە ڕوونی لە چیرۆکی سێ بەجێماوەکانی (المخلفون)ی شەڕی تبوك دیارە

کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: ... کاتێك زانیم پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی و کاروانەکەی لە تبوك گەڕانەوە، توشی دڵتەنگی بووم، بیرم کردەوە درۆیەك بکەم، گوتم: سبەینی چۆن لە تورەیی دەربچم؟

بۆ ئەم کارە پەنام بۆ هەندێك کەسی خەڵکی خۆم برد کە خاوەن ڕا بوون.

پاشان ئەم کارە پوچەڵەم لێ دووركەوتەوە، زانیم کە هیچ شتێك لەو ڕزگارم ناکات، بڕیارمدا ڕاستی بڵێم.

بۆ بەیانی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت، هەر کاتێك لە گەشتێك گەڕابایەوە، سەرەتا دەچووە مزگەوت، دوو ڕکات نوێژ دەکرد، پاشان خەڵك لەلای دادەنیشتن.

کاتێك نوێژەکەی کرد، بەجێماوەکان (المخلفون) ئەوانەی بۆ شەڕی تبوك نەچووبوون، هاتنەلای و بیانویان بۆ دەهێنایەوە و داوای لێبوردنیان دەکرد و سوێندیان بۆ دەخوارد... ئەوان ژمارەیان هەشتا و هەندێك دەبوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووە ئاشکرایەکەی لێ وەرگرتن، داوای لێخۆشبوونی بۆ کردن، ڕووە شاراوەکانیشی سپاردە پەروەردگار، ئەوانیش بەیعەتیان پێدا.

تا من چووم، سەلامم لێکرد، زەردەخەنەیەکی تورەیی کرد و پاشان فەرمووی: **"وەرە"**.

---

[1] ترمذي (٢٥٠٢) و ئەبوداود (٤٨٧٥) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥١٤٠) بە سەحیحی داناوە.

[2] تحفة الاحوذي (١٧/٧).

چوومە لای تا لەبەردەمی دانیشتم.

پێی فەرمووم: **"چی وایکرد دوابکەوی؟ ئایا وشترت نەکڕی بوو بۆ سواربوون"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، سوێند بە خوا گەر من لەلای خەڵکی تر لە ئەهلی دونیا دانیشتبام، دەمتوانی بە باسکردنی بیانوێك خۆم لە تورەیت رزگار بکەم، بەڕاستی زمانێکی پاراوم پێدراوە.

بەڵام سوێند بەخوا زانیم، گەر ئەمڕۆ درۆیەکت لەگەڵ بکەم کە تۆ لێم رازی بی، زۆر نزیکە پەروەردەگار حاڵی منت بۆ روون بکاتەوە و لێم تورە ببی، گەر قسەی راستیشت لەگەڵ بکەم، لێم تورە دەبی، بەڵام ئومێدم وایە پەروەردگار عاقیبەتێکی باشم بۆ بێنێت، سوێند بە پەروەردگار هیچ بیانوییێکم نییە، ئەو کاتەی لە تۆ دواکەوتم زۆر بە هێزم بووم و خاوەن ماڵێکی زۆر بووم.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بەڕاستی ئەمەیان راستی گوت، بڕۆ، تا ئەو کاتەی پەروەردگار حوکمت لەسەر دەکات"**.

کە هەڵسام، خەڵکانێکی لە بەنی سەلەمە دوام کەوتن.

پێیان گوتم: بەڕاستی نەتتوای بیانوییێك لەلای پێغەمبەر ﷺ بهێنێتەوە، وەك ئەو بەجێماوانەی پێشوتر کردیان، سوێند بەخوا ئەوان بەردەوام لۆمەیان دەکردم، تا واملێهات بمەوێت بگەڕێمەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و درۆی لەگەڵ بکەم.

پاشان پێم گوتن: ئایا کەسی تر وەکو منی لێ بەسەرهاتووە؟

گوتیان: بەڵێ، دوو کەسی تریش وەکو تۆن، هەمان قسەی تۆیان کرد.

ئەوەی بەتۆش گوترا، بە وانیش گوترا.

گوتم: ئەوان کێن؟

گوتیان: مەرارەی کوڕی رەبیعەی عامری، و هیلالی کوڕی ئومەیەی واقیفی.

باسی دوو پیاوی چاکیان بۆ کردم، کە بەشداری جەنگی بەدریان کردووە، ئەوان بۆ من پێشەنگن.

دەڵێت: لە نێوان هەموو ئەوانەی دواکەوتبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ رێگری لە خەڵکەکە کرد قسە لەگەڵ ئەو سێ کەسەمان بکەن.

خەڵك خۆی لێمان بە دوورگرت، بەرامبەر ئێمە گۆڕان، ئەو زەویەی پێشوتر دەمناسی لەپێش چاومان گۆڕا، ئێمە بۆ ماوەی پەنجا شەو لەو حاڵەداماینەوە.

دوو هاوڕێکەی ترم، لە ماڵەمەوە دەستیان بە پاڕانەوە و گریان کرد.

بەڵام من، گەنجترین و بە هێزترینی خەڵکی بووم، دەهاتمە دەرەوە و نوێژی بە کۆمەڵم دەکرد، دەچوومە بازار، بەڵام کەس قسەی لەگەڵ نەدەکردم، لە دوای نوێژەکان دەچوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامم لێ دەکرد، لە دڵی خۆم دەمگوت، ئایا لێوەکانی بە وەڵامدانەوەی سەلامەکەم جولا یان نا؟

پاشان لە نزیك ئەو نوێژم دەکرد، بە تیلەچاو سەیرم دەکرد، کاتێك نوێژم تەواو دەکرد رووم لەو دەکرد، هەر کاتێك رووم تێکردبا ئەو رووی لێ وەردەگێڕام.

ئەم حاڵەتە ناخۆشەم لەسەر بەردەوام بوو، رۆیشتم تا چومە ناو باخی ئەبو قەتادە، ئەو ئامۆزام بوو، خۆشەویسترین کەسیشم بوو، سەلامم لێکرد، سوێند بەخوا وەڵامی نەدامەوە.

گوتم: ئەی ئەبو قەتادە، سوێندت دەدەم بە پەروەردگار، ئایا دەزانی کە من خوا و پێغەمبەرەکەیەم خۆش دەوێت؟

بێ دەنگ بوو، دووبارە سوێندمدا، بێ دەنگ بوو، دیسان سوێندمدا.

گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن.

چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك، رۆیشتم تا لە دیواری باخەکە تێپەڕیم.

دەڵێت:کاتێك من لەناو بازاڕی مەدینە دەڕۆیشتم، جوتیارێك لە جوتیارەکانی شام کە خواردنی بۆ فرۆشتن هێنابوو، دەیگوت: کێ کەعبی کوڕی مالیکم پێ پیشان دەدا؟

خەڵکەکە ئاماژەیان بۆ من کرد، تا گەیشتە لام، نوسراوێکی لەلایەن پادشای غەسان بۆ هێنابووم.

لێی نوسرا بوو: پێم گەیشتووە کە هاوڕێکەت پشتی تێکردووی، هەرگیز خوا تۆی لە شوێنێك دانەناوە کە سوکایەتیت پێ بکرێت و چاکەی تۆی تێدا بزر بێت، خۆت بگەێنە لامان، ئێمە دڵنەوایت دەکەین.

دوای ئەوەی خوێندمەوە، گوتم: ئەمەش هەر لەو تاقیکردنەوانەیە، خستمە ناو تەندورو سوتاندم.

تا چل شەو لە پەنجا شەوەکە تێپەڕی، دابەزینی وەحی دواکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ کەسێکی ناردە لام.

پێی گوتم: کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانت پێ دەکات لە خێزانەکەشت دووربکەویتەوە.

گوتم: تەڵاقی بدەم، یان چی بکەم؟

گوتی: نەخێر، بەڵکو خۆتی لێ دووربکەرەوە.

دەڵێت بەهەمان شێوەی من، بە دوو هاوەڵەکەی تریشی گوت.

بە خێزانەکەم گوت: برۆ لای ماڵی باوکت، لەلایەن بمێنەوە، تا ئەو کاتەی پەروەردگار من لەو بابەتە یەکلایی دەکاتەوە.

دوای ئەمە دە شەوی تر مامەوە، پەنجا شەو بەسەر کاتی نەهی کردن لە قسەکردن لەگەڵمان تێپەڕی.

پاشان لە بەیانی ڕۆژی پەنجاهەمیندا، نوێژی بەیانیم لەسەربانی یەکێك لە ماڵەکانی خۆم کرد، لە کاتێکدا من لەو حاڵەتەدا دانیشتبووم، کە پەروەردگار ﷻ لە قورئان باسی دەکا، کە خۆمان لەخۆمان بێزاربووین، زەوی بەو فراوانییەوە لێمان تەنگ بوو، گوێم لە دەنگی کەسێك بوو لەسەر بەرزاییەك هاواری کرد: ئەی کەعبی کوڕی مالیك مژدەت لێ بێت.

ڕاستەوخۆ کەوتمە سوژدە بردن، سوژدەی شوکر، زانیم کاتی خەم و خەفەت ڕەوینەوەو کاتی دڵخۆشییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی ئاگادار کردەوە لە پاکبوونەوەمان لەلایەن پەروەردگار.

کەعب دەڵێت: کاتێك سەلامم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، بە دەموچاوێکی پڕ لە خۆشی فەرمووی: **"مژدەت لێ بێت بە خۆشترین ڕۆژ لە ڕۆژەکانی ژیانت"**.

دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو موژدەیە لەلایەن تۆیە یان لەلایەن پەروەردگارەوەیە؟

فەرمووی: **"بەڵکو لەلایەن پەروەردگارەوەیە، کە ئەم ئایەتەی** دابەزندووە ﴿وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ التوبة: ١١٨ [1]

واتە: (پەروەردگار تۆبەی ئەو سێ کەسەشی وەرگرت کە (لە غەزای تەبووك) دواخران دوای ئەوەی کە زەوی چەندە فراوانە لێیان تەنگ بۆوە، خۆیشیان لە خۆیان بێزار بوون، دڵنیاش بوون کە هیچ پەنایەك نیە (لەخەشم و قینی خوا بیانپارێزێت) جگە لەوەی خۆیان بدەنە پەنای ئەو زاتە، پاشان تۆبەی لێ وەرگرتن، تا تۆبە بکەن، بەڕاستی هەرخوا تۆبە وەرگرو میهرەبانە).

---

[1] بوخاری (٤٤١٨) و موسلیم (٢٧٦٩) گێڕاوەتیانەوە.

چیرۆکی کەعبی کوڕی مالیك بەناوبانگ و دیارە لە بابەتی پشتتێکردنی پێغەمبەر و هاوەڵانی، ئەمەش وەك فێرکردنیان و پەروەردەکردنیان لەسەر ملکەچ بوونیان بۆ خواو پێغەمبەرەکەی، بۆ ئەوەی لە هەموو بوارێکدان چیتر بە جێنەمێنن، پەندو ئامۆژگارییشە بۆ کەسانی تر.

## پێی ناخۆش بوو، پرسی حەد دەرکردنی بۆ بەرزبکرێتەوە:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: یەکەم پیاوێك کە دەستی بڕابێت لە ئیسلام، پیاوێك بوو هێنایانە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە دزی کردووە.

وەك ئەوەی رووی پێغەمبەری خوا ﷺ لە خەفەتباریان خۆڵەمێشی بوو.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، دەبینین دەستبڕینت پێ ناخۆشە.

فەرمووی: **"چ شتێك رێ لە من دەگرێت، لە کاتێکدا ئێوە هاوکارانی شەیتان بن لەسەر هاورێکەتان، پەروەردگار ﷻ لێبوردەیە و لێبوردەیی خۆش دەوێت، کەسی حاکمیش هەر کاتێك سزایەکی بۆ هات دەبێت جێبەجێی بکات**، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ النور: ٢٢ [(١)]

واتای ئایەتەکە: (لێبووردەبن و چاوپۆشی بکەن، مەگەر حەز ناکەن خوا لێتان خۆش ببێت، خوایش هەمیشە لێخۆشبوو میهرەبانە).

## هەرگیز دەستی لە سزادانی سەرپێچیکاران هەڵنەدەگرت، تەنانەت گەر خۆشەویسترین کەسیش داوای لێکردبا:

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت: کاروباری ئافرەتێکی مەخزومی کە دزی کردبوو، لای قورەیشییەکان گرینگ بوو، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی دەستبڕینی دەرکرد.

گوتیان: کێ قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەیەوە دەکات.

گوتیان: کەس جورئەتی قسەکردن لەسەر ئەو بابەتە ناکات، تەنیا ئوسامەی کوڕی زەید نەبێت کە خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ .

ئوسامە لەوبارەیەوە قسەی لەگەڵ کرد.

رەنگی دەموچاوی پێغەمبەر ﷺ گۆڕا، فەرمووی: **"ئایا لەبارەی سنورێك لە سنورەکانی پەروەردگار تکا دەکەی"**.

---

(١) ئەحمەد گێراوەتیەوە(٣٩٦٧)، ئەلبانی لە (السلسلة ١٣٦٧) بە (حسن)ی داناوە.

ئوسامەی پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە.

کاتێك ئێوارە هات، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا وتارێکی فەرموو: سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد، پاشان فەرمووی: **"ئەوانەی پێش ئێوە بۆیە بە هیلاك چوون، چونکە گەر کەسێکی خانەدان دزی کردبایە وازیان لێ دەهێنا، بەڵام گەر کەسێکی لاواز دزی کردبایە سزایان لەسەر جێبەجێ دەکرد، سوێند بەخوا گەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات دەستی دەبڕم"**.

پاشان فەرمانی بەو ئافرەتەکرد کە دزی کردبوو، دەستەکانیان بڕی.

عائیشە فەرمووی: تۆبەیەکی باشی کرد، پاشان شووی کرد، دواتر دەهاتە لام، منیش دواکارییەکانیم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەرزدەکردەوە [1].

لە گێڕاونەوەیەکی تردا ئافرەتەکە دەڵێت: ئایا ئەی پێغەمبەری خوا تۆبە بۆ من هەیە؟ ئەویش فەرمووی: **"تۆ ئەمڕۆ لەبەرامبەر ئەو گوناهەتدا، وەك ئەوەیە تازە لە دایك بوویت"**[2].

**لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:**

- قەدەغەکردنی تکا لە حەدد، ئەگەر بابەتەکە گەیشتبێتە لای حاکم.
- ئەبو عومەری کوڕی عبدالبر دەڵێت: هیچ شتێکی پێچەوانە لەوە نابینم، کە تکاکردنی کەس و کاری گوناهبار کارێکی جوانە، بەڵام بە مەرجێك بابەتەکە نەگەیشتبێتە لای دەسەڵات، هەر کاتێکیش گەیشتە لای دەسەڵات دەبێت سزاکەی لەسەر جێبەجێ بکات.
- وازهێنان لە دواکاری خۆشەویستان سەبارەت بە جێبەجێکردنی حەدد لەسەر کەسێك کە واجب بێت، تەنانەت گەر منداڵی بێت، یان کەسێکی زۆر نزیکی بێت، هەر کەسێکیش ئەو داوایە بکات ڕەتدەکرێتەوە [3].

**لە حەد لێدەرکردندا ڕەچاوی حاڵەتی کەسانی نەخۆش و لاوازی دەکرد. دەرچەی شەرعی بۆ دەدۆزینەوە.**

سەعیدی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە دەگێڕێتەوە: پیاوێك نەخۆش کەوت تا زۆر لاواز بوو، تەنیا چەرم و گۆشتی لێ مایەوە، جارییەك هاتە لای، زینای لەگەڵ کرد.

کاتێك کەسانێك بۆ سەردانیکردن هاتنە لای، هەواڵەکەی پێ دان و گوتی: لەم بارەویەوە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، کە من لەگەڵ جارییەك سەرجێیم کرد.

---

[1] بوخاری (٤٣٠٤) و موسلیم (١٦٨٨) گێڕاوەتیانەوە.

[2] ئەحمەد گێڕاوەتیەوە(٦٦١٩). لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر. ئەحمەد شاکر سەنەدەکەی بە سەحیح داناوە. شعیب الأرناؤوط بە (لاوازی) داناوە.

[3] فتح الباری (١٢/٩٥).

بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ باسکرد.

ئەویش فەرمووی: **"سەد جەڵدی لێ بدەن"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، هیچ کەسێکمان نەبینووە هێندەی ئەو نەخۆش بێت، گەر سەد جەڵدی لێ بدەین دەمرێت، گەر بیهێنینە لای تۆ، ئێسکەکانی لێك دەبێتەوە، تەنیا چەرم و ئێسکی لێ ماوەتەوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد پارچەی دارێکی خورمای بۆ ببەن کە سەد لاسکی پێوەیە، بەیەکجار لێی بدەن [1].

لێدانی ئەو پیاوە بەو پارچە دارەی کە سەد لاسکی پێوەیە، لە جیاتی ئەوەی سەد جەڵدی لێ بدەن، ئەمە رەچاوکردنی حاڵی لاوازی نەخۆشەکەیە، چونکە بەرگەی لێدانی زۆر ناگرێت، وەك لە کەسێکی ئاسایی دەدرێت.

**ابن الهمام** دەڵێت: گەر کەسێکی نەخۆش زینای کرد، خێزانداریش بوو، دەبێت رەجم بکرێت، چونکە شایەنی کوشتنە، نزیکترین رێگەش بۆ ئەمە رەجمکردنییەتی.

بەڵام گەر نەخۆشەکە خێزاندار نەبوو، جەڵدی لێنادرێت تاوەکو چاك دەبێتەوە، چونکە لەوانەیە لێدانەکەی ببێتە هۆی لەناوچوونی، کە شایەنی نییە.

بەڵام گەر زانرا نەخۆشییەکەی لەوانەیە چاك نەبێتەوە، وەك سیل یان لاوازی جەستە، ئەو کات بە یەك لێدان بە پارچەدارێکی سەد لاسکی لێی دەدرێت، پێویستە هەموو لاسکەکان بگەنە جەستەکەی، بۆیە دەگوترێت دەبێت لاسکەکان بڵاوبن [2].

**ابن القیم دەڵێت:** ئەو کەسەی حەددی لەسەرە، گەر کەسێکی نەخۆش بوو و عوزری هەبوو، پێویستە سەد لاسکی بۆ کۆبکرێتەوە یان سەد قامچی بۆ کۆبکرێتەوە بە یەك لێدان لێی بدرێت [3].

**گەر کەسێك بە نەزانین گوناهێکی کردبا، یان بە هەڵە، هەرگیز لەگەڵی توند نەدەبوو بەڵکو بە نەرمونیانی فێری دەکرد و سزای نەدەدا:**

موعاویەی کوڕی حەکەمی سەلەمی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: کاتێك من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژم دەکرد، پیاوێك لەناو نوێژدا پشمی.

منیش گوتم: یرحمك الله.

---

[1] ئەبوداود (٤٤٧٢) و ابن ماجة (٢٥٧٤) گێڕاوەتیانەوە. ئەلبانی لە (الصحیحة ٢٩٨٦) بەسەحیحی داناوە.

[2] فتح القدیر (٥/٢٤٥).

[3] إغاثة اللهفان (٢/٩٨).

خەڵکەکە بە چاوێکی سەیرەوە تەماشایان کردم.

منیش گوتم: ئەمە چیتانە بەم شێوەیە سەیرم دەکەن؟

ئەوانیش شەقیان لە ڕانەکانی خۆیاندا [١].

کاتێك زانیم بێ دەنگم دەکەن، منیش بێ دەنگ بووم.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ نوێژەکەی تەواوکرد، بە دایك و باوکەوە بە قوربانی بم، هەرگیز پێشی ئەو و دواتریش مامۆستای لەو شێوەیەم نەبینووە، خاوەنی جوانترین فێرکردن بێت، سوێند بەخوا پێم هەڵنەشاخا، لێشی نەدام، سەرزەنشتیشی نەکردم.

فەرمووی: **"دروست نییە هیچ قسەیەك لە نوێژدا بکرێت، نوێژکردن برییتە لە تەسبیح و تەکبیر و قورئان خوێندنەوە [٢]"**.

ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر حاڵی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەوشتبەرزی کە پەروەردگار شاهێدی بۆ داوە، لە نەرمونیانی نواندن لەگەڵ کەسی نەزان، سۆز و میهرەبانی بۆ ئوممەتەکەی [٣].

**لەوانەیە خراپەی لابردبایە لە دەستی کەسێك، کاتێك زانیبای کەسەکە پێی تێك ناچێت:**

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گوستیلەیەکی زێڕی لە دەستی پیاوێك بینی، لە دەستی کردەوە و فڕێیدا.

فەرمووی: **"یەك لە ئێوە دەست دەداتە خەڵوزێکی ئاگر، پاشان لە دەستی دەکات؟"**.

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا گوستیلەکەی فڕێدا، بە پیاوەکەیان گوت: گوستیلەکەت وەرگرە و سوودی لێ ببینە.

گوتی: سوێند بە خوا وەری ناگرمەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فڕێیدابێت [٤].

**نەوەوی** دەفەرموێت: ئەم فەرمودەیە گوێڕایەڵی لە ڕادەبەدەری فەرمانی پێغەمبەری خواو ﷺ دوور کەوتنەوە لە قەدغەکراوەکانی تێدایە، ڕوخسەت نەدان لەناوی بە تەئویلە لاوازەکان.

پاشان ئەم پیاوە ئەو گوستیلەیەی واز لێهێنا وەك حەلاڵێك بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت هەڵیبگرنەوە لە هەژاران یان کەسانی تر، ئەو کات دروستە بۆ هەرکەسێك هەڵیبگرێتەوە، هەر کەسێکیش هەڵیگرتەوە دروستە بەکاری بهێنێت.

---

[١] بە دەست لەڕانیان دا، بۆ ئەوەی بێ دەنگی بکەن، دەگوترێت ئەمە بەر لەوە بووە (سبحان الله) لە نوێژدا دابندرێت.

[٢] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٥٣٧).

[٣] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٥/٢٠).

[٤] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٢٠٩٠).

ئەگەر خاوەنەکەشی هەڵیبگرتبایەوە حەرام نەبوو هەڵیبگرێتەوەو، دەیتوانی بەکاریبهێنێت وەك فرۆشتن.

بەڵام لەبەر دیندارییەکەی ویستوویەتی بیکاتە بەخشین بۆ کەسێکی هەژار، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەکارهێنانی قەدەغە نەکرد، بەڵکو تەنیا لەبەرکردنی قەدەغەکرد.[1]

هەر لەوبارەیەوە، ئەبو ثعلبة الخشني رضي الله عنه دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گوستیلەیەکی زێڕی لە پەنجەم بینی، بە چیلکە دارێك لە دەستی بوو لە دەستی دەدا.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئاگای لێبڕا، گوستیلەکەی لێکردەوە و فڕێیدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەیری کرد، گوستیلەکەی لە پەنجەی نەبینی، فەرموی: **"دەبینم، ئازارماندا‌وی و سزامانداوی"**[2].

ابن حیبان لە سەحیحەکەی خۆیدا (٥٣٨/١) بەشێکی بەو ناوە کردووە (دروستە بێ قسەکردن کەسێك لە کاری نەشیاو بە دەست ئاگادار بکەیتەوە).

## لەوانەیە هەندێك جار بە پشتێکردن وازی هێنابێت:

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە نەجران هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوستیەلەیەکی زێڕی لە دەست بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی تێکرد و فەرمووی: **"تۆ هاتویتە لام، لە کاتێکدا لە دەستتدا خەڵوزی ئاگر هەیە"**[3].

## زۆرجار لە کاتی ڕەتکردنەوەی شتێکدا دەیفەرموو ( ئەم خەڵکە چیانە )، ناوی کەسی نەدەهێنا:

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ئافرەتێك بەناوی بەریرە هاتەلای دوای لێکرد یارمەتی بدات لە ئازادکردنی، پێی فەرموو: گەر حەزبکەی من نرخەکەت دەدەمە کەسوکارت وەلائەکە بۆ من دەبێت، کەس و کاریشی ڕەتیانکردەوە و گوتیان: گەر بتەوێت ئێمە رزگاری دەکەین، وەلائەکەی بۆ ئێمە دەبێت.

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات، بۆی باسکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"بیکڕە و ئازادی بکە، چونکە وەلاء بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی دەکات"**.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦٦/١٤).

[2] النسائي (٥١٩٠) و أحمد (١٧٢٩٥) گێراوەتیانەوە. ئەلبانی لە (التعليقات الحسن ٣٠٣) بە سەحیحی داناوە.

[3] النسائي گێراوەتیەوە(٥١٨٨). ئەلبانی لە (صحيحي الترغيب والترهيب ٢/٢٢٦) بە سەحیحی داناوە.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا سەر مینبەر و فەرمووی: **"ئەم خەڵکە چیانە، هەندێك مەرج دادەنێن کە لە کتێبی پەروەردگاردا نییە؟! هەر کەسێك مەرجێك دابنێت لە کتێبی پەروەردگاردا نەبێت، هیچی بۆ نییە، با سەد مەرجیش دابنێت"** (١).

ئەبو حەمیدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بۆ وەرگرتنی زەکاتی بەنی سلیم رەوانەکرد کە ناوی (ابن اللتبية) بوو.

کاتێك هات فەرمانی کرد حیسابیان لەگەڵ بکرێت و لێیان وەربگیرێت.

کابرا دەیگوت: ئەمە بۆ ئێوە، ئەمەش دیارییە بۆ من.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"گەر راستگۆیت، بۆ لە ماڵی بابت یان داکت دانەنیشتی، تا ئەم دیارییانەت بۆ هاتبان"**.

پاشان وتارێکی بۆ فەرموین، دوای ستایشی پەروەردگار فەرمووی:

**"ئەو کەسەی ئێمە بۆ وەرگرتنی زەکات دەینێرین چیەتی، کاتێك دێتەوە دەڵێت: ئەمە بۆ ئێوەیە، ئەمەش دیارییە بۆ من، بۆ لە ماڵی بابی یان دایکی دانانیشێت، بزانێت ئەم دیارییەی بۆ دێت یان نا؟ سوێند بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بە دەستە، هەر کەسێك لە ئێوە نادادی یان خیانەتێك بکات، رۆژی دوایی لەسەر پشتی خۆی هەڵیدەگرێت، جا ئەگەر وشترێکی بۆ بێت ناڵەناڵی بێت، یان مانگایەکی بۆ بێت بۆڕەی بێت، یان مەڕێکی بۆ بێت بارەی بێت"**.

پاشان دەستەکانی بەرزکردەوە تا سپایتی ژێر باڵی دەرکەوت، فەرمووی: **"پەروەردگارا من گەیاندم، پەروەردگارا من گەیاندم"**، بۆ سێ جار (٢).

عائیشە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ هەر جارێك هەواڵی کەسێکی پێگەیشبا، نەیدەفەرموو: ئەم کەسە چییەتی، بەڵکو دەیفەرموو: **"ئەم خەڵکانە چیانە ئاوا و ئاوا دەڵێن"** (٣).

**ابن القيم** دەفەرموێت: (هەرگیز پێغەمبەر ﷺ رووبەرووی کەسێك نەدەبۆوە کە پێی ناخۆش بووایە، بەڵکو دەیفەرموو: ئەمە خەڵکە چیانە وا دەڵێن وا دەکەن؟) (٤).

---

(١) بوخاری (٤٥٦) و موسلیم (١٥٠٤) گێراوەتیانەوە.

(٢) بوخاری (٢٥٩٧) و موسلیم (١٨٣٢) گێراوەتیانەوە.

(٣) ئەبو داود گێراوەتیەوە(٤٧٨٨). ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

(٤) زاد المهاجر إلى ربه(ص٦٧).

**لەوانەیە بەرامبەر هەندێکیان تورە بووایە و لە قسەکردن توند بوایە لەگەڵیان:**

**عومرانی کوڕی حصین ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پیاوێکی ئەنساری لە کاتی مردنی وەسیەتی کرد، ٦ بەندەی هەبوو، هەمووی ئازادکرد، جگە لەم بەندانەش هیچ ماڵی دیکەی نەبوو.**

**کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ، تورە بوو، قسەی توندی لەبارەوە فەرموو.**

پاشان فەرمووی: **"بەڕاستی ویستم نوێژی لەسەر نەکەم"**. [1]

پاشان بانگی بەندەکانی کرد، کردینە سێ بەش، تیروپشکی لە نێواندا کردن، دووانی ئازادکردن، چواریشی هێشتنەوە [2].

**سزای هەندێك لە گوهناهبارانی دەدا، کە لەکاتی مردنیان نوێژی لەسەر نەدەکردن، ئەمەش وەك پەندو ئامۆژگاری بۆ کەسانی تر:**

جابری کوڕی سەمرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك نەخۆش کەوت، کەسواکاری هاواریان کرد کە مرد، دراوسێکەی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی گوت: ئەو پیاوە مرد.

فەرمووی: **"چۆن زانیت؟"**.

گوتی: کەس و کاری هاواریان کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو نەمردووە"**.

دەڵێت: گەڕایەوە سەری و هاواریان بەسەریدا کرد.

دووبارە هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: ئەو مرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەو نەمردووە"**.

دیسان گەڕایەوە، هاواریان بەسەریدا کرد.

خێزانی پیاوەکە [3]، گوتی: برۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی رابگەێنە.

پیاوەکە گوتی: نەفرەتی خوای لێ بێت.

پاشان پیاوەکە رۆیشت بینی بە ئاسنێکی تیژ سەری خۆی بڕیووە.

پاشان چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاند کەوا مردوە.

فەرمووی: "چۆن زانیت؟".

---

[1] ئەمە پەیوەندیدارە تەنیا بە پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ویستوویەتی نوێژی لەسەر نەکات. وەك سەرزەنشتکردنێك و ئامۆژگاریەك بۆ کەسانیتر کە هەمان کار دەکەن، بەڵام سەبارەت بە نوێژەکە، ئەوا هەر دەبا هاوەڵان بیکەن، شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١/١٤٠).

[2] موسلیم (١٦٦٨) و النسائي (١٩٥٨) گێراوەتیانەوە. دەستەواژەی (بەڕاستی ویستم نوێژی لەسەر نەکەم) تەنیا لەلای النسائي هەیە. ئەلبانی لە (تحقيق المشكاة ٣٣٩٠) بە سەحیحی داناوە.

[3] خێزانی پیاوە نەخۆشەکە.

گوتی: بینم کە بە پارچە ئاسنێکی تیژ سەری خۆی بڕی.
فەرمووی: "بەچاوی خۆت بینیت؟".
گوتی: بەڵێ.
فەرمووی: "دەی کەواتە من نوێژی لەسەر ناکەم" [١].

ئەبو عیسای ترمزی دەفەرموێت: (زانایان لەم بارەیەوە رای جیاوازیان هەیە، هەندێکیان دەڵێن: نوێژ لەسەر هەر کەسێك دەکرێت کە ئەهلی قیبلە بێت و خۆی کوشتبێت. ئەمە رای پوری و ئیسحاقە.

بەڵام ئەحمەد دەفەرموێت: پێشەوا نوێژ لەسەر کەسی خۆکوژ ناکات، بەڵکو کەسێکی تر نوێژی لەسەر دەکات [٢].

بیهقی دەفەرموێت: (لە ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی الحنظلی بۆمان گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە ئەم قسەیەی فەرمووە کە نوێژی لەسەر ناکات، بۆ ئەوەی خەڵکی تر هۆشیار بکاتەوە هەمان تاوان ئەنجام نەدەن) [٣].

خگابی دەفەرموێت: (نوێژ نەکردن لەسەری، واتای سزادان دێت بۆ ئەو کەسە، هەروەها ئامۆژگاری و هۆشداریدانێکە بۆ خەڵکانی تر) [٤].

شیخ الاسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: (هەر کەسێك بێ دینی خۆی ئاشکرا کردبێت، وەك تاوانباری گوناهە گەورەکان، ئەم جۆرە کەسانە پێویستە هەندێك لە موسڵمانان نوێژیان لەسەر بکەن.

بەڵام گەر کەسێك نەیویست نوێژیان لەسەر بکات، لەبەر ئەم کارەی کردوویانە، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر خۆکوژ و خیانەتکار و قەرزداری بێ وەعد نەکردووە، هەروەها وەك چۆن سەلەف نوێژیان لەسەر ئەهلی بیدعە نەکردووە، وەك دەستگرتنێك بەم سوننەتە، ئەمە کارێکی باشە [٥].

زەیدی کوڕی خالیدی الجهنی ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێك لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی خەیبەر وەفاتی کرد، بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ باس کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئێوە نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن"**.

---

[١] ئەبو داود (٣١٨٥)، موسلیم (٩٧٨) و ترمذي (١٠٦٨) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز – لا٨٤) بە سەحیحی داناوە.
[٢] سنن الترمذي (٣٧٢/٢)
[٣] السنن الكبرى (١٩/٤).
[٤] عون المعبود (٣٢٨/٨).
[٥] مجموع الفتاوى (٢٨٦/٢٤).

ڕەنگی دەم و چاوی خەڵکەکە بەم قسەیە گۆڕا.

فەرمووی: **"هاوڕێکەتان لە ڕێگەی پەروەردگاردا خیانەتی لە غەنیمەت کردووە".**

کەلوپەلەکەیمان پشکنی، مێروەکمان لە مێروەکانی یەهود دۆزیەوە کە دوو دەرهەمی نەدەکرد[(١)].

ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە کە هەر کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەر تەرمێك بانگ بکرابایە، پرسیاری لەبارەیەوە دەکرد.

گەر ستایشی بە چاکە کرابایە، نوێژی لەسەر دەکرد.

گەر بە خراپە باس کرابایە، بە کەس و کاری دەگوت: **(ئێوە بۆ خۆتان بیکەن)**، خۆی نوێژی لەسەر نەدەکرد[(٢)].

ابن حبان دەفەرموێت: نوێژ نەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەم جۆرە کەسانەی باسمان کردن، بە مەبەستی فێرکردنی ئۆممەتەکەی بووە، بۆ ئەوەی ئەوانیش هەمان جۆرە تاوان ئەنجام نەدەن، چونکە نوێژ دروست نییە لەسەر کەسێك بکرێت وەك ئەو کەسەی تاوانی کردبێت،کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر نەکردووە[(٣)].

---

[(١)] ئەبو داود (٣٦٠٧) و النسائی (٤٦٤٧) و ئیبن ماجە (١٩٥٩) گێڕاوەتیانەوە، الحاكم لەسەر مەرجی هەردوو شێخ بە سەحیحی داناوە (٢٥٨٢). الذهبي ڕەزامەندی لەسەر دەربڕیووە. ئەلبانی لە (الارواء) بە لاوازی داناوە (٧٢٦).

[(٢)] ئەحمەد گێڕاوەتیەوە(٢٢٠٤٩). ئەلبانی لە (التعلیقات الحسان – ٣٠٤٦) بە سەحیحی داناوە.

[(٣)] صحیح ابن حبان (٥/٦٤).

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دوو ڕووەکان:

پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ هەموو چین و توێژێك کردووە، هەر یەکەیان بە گوێرەی ئەو حاڵەت و شێوازەی لەگەڵیان دەگونجێت. ئەو توێژەی، کە پێویستە لەسەریان بوەستین، بۆ ئەوەی ببینین چۆن پێغەمبەر ﷺ مامەڵەی لەگەڵ کردوون، توێژی (دوو ڕووەکان)ـە، ئەوانەی باوەڕهێنانیان ئاشکرا کردووە و بێ باوەڕیان شاردۆتەوە.

### لە دیارترین سیفەتەکانیان:

### بانگەشەی باوەڕهێنان بە درۆ:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴾ البقرة: ٨ واتە:( لەناو خەڵکیدا کەسانێك هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هێناوە (لە ڕاستیدا ئەوانە درۆ دەکەن) ئەوانە هەمیشە باوەڕدار نین).

### فرو فێل:

دەفەرموێت: ﴿ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴾ البقرة: ٩ واتە: (ئەوانە (بەخەیاڵی خۆیان وادەزانن) خوا و ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە باوەڕداری ڕاستەقینەن! کەچی جگە لە خۆیان کەسیان پێ ناخەڵەتێت، بەڵام هەست ناکەن و فام ناکەنەوە و بیرناکەنەوە).

### بڵاوکردنەوەی خراپەکاری لە زەویدا:

﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ﴿١١﴾ ﴾ البقرة: ١١
﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٠٥﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴾ البقرة:

### تەمەبەڵیکردن لە بەندایەتی کردندا:

پەروەرەدگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ النساء: ١٤٢

واتە: (بەڕاستی دووڕووەکان (وا دەزانن) فێڵ لە خوا دەکەن (لەکاتێکدا) ئەو زاتە فێڵەکانیان پووچ دەکاتەوە، هەر کاتێکیش (بۆ ریاو ڕووپامایی) هەڵدەستن بۆ نوێژ، زۆر

بەلەش گرانیی و تەمەڵیی هەڵدەستن، ئەوانە ریایی و روپامایی بۆ خەڵکی دەکەن، زۆر کەم یادی خوا دەکەن).

## گاڵتەکردن بە باوەڕداران:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ ءَامَنُوا قَالُوا ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوْا إِلَى شَيَاطِينِهِمْ قَالُوا إِنَّا مَعَكُمْ إِنَّمَا نَحْنُ مُسْتَهْزِءُونَ ﴾ البقرة: ١٤

واتە: (کاتێك (دوو ڕووەکان) دەگەن بەوانەی باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئێمە ئیمانداریین و باوەڕمان هێناوە ! !، کەچی کاتێك بە تەنها دەمێننەوە لە لای شەیتانە گەورە و فێڵبازەکانیان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە لەگەڵ ئێوەین، بێگومان ئێمە تەنها گاڵتەیان پێدەکەین و پێیان رادەبوێرین ! !)

﴿ الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ سَخِرَ اللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ التوبة: ٧٩ واتە: ( ئەو بێ باوەڕانەی کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خێر کردندا بەویستی خۆیان لە ڕێگەی خوادا و پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دەگرن کە بێجگە لە ڕەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەوێت، ئینجا هەر گاڵتەشیان پێدەکەن، ئەوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێت و ریسوایان دەکات، بەهۆی ئەو گاڵتە کردنەیانەوە و سزای بە ئێش و ئازاریش بەشیانە)

## دژایەتیکردنی باوەڕداران رق لێبوونەوەیان و پیلان گێڕان دژیان:

خودا دەفەرموێت: ﴿ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ ﴾ آل عمران: ١١٨

واتە: (بەئاشکرا رق وکینە لە دەم و دویاندا دیارە، ئەوەی لە سینەیاندا شاردویانەتەوە زۆر گەورەترە لەوەی کە دەریدەخەن).

﴿ إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِن تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴾ آل عمران: ١٢٠ ﴿ الَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ اللَّهِ قَالُوا أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ وَإِن كَانَ لِلْكَافِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوا أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ فَاللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَن يَجْعَلَ اللَّهُ لِلْكَافِرِينَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴾ النساء: ١٤١ ( ئەوانەی کە خۆیان بۆ ئێوە مەڵاسداوە چاوەڕوانی

بەسەرهاتتان دەکەن، ئەگەر سەرکەوتنێکتان لەلایەن خواوە دەست بکەوێت دەڵێن: ئەی ئێمە لەگەڵتاندا نەبووین؟! خۆ ئەگەر کافرەکان بەشێکیان ببێت لە سەرکەوتن، دووڕووەکان دەڵێن: ئایا ئێمە لەسەر ئێوەمان نەدەکردەوە و، نەمانهێشت ئیمانداران زیانتان پێبگەیەنن، ئینجا خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەریی دەکات لە نێوانتاندا دڵنیابن هەرگیز خوا نایەڵێت بێ باوەڕان بەسەر ئیمانداراندا دەست ڕۆیشتوو بن و ریشەکەنیان بکەن.)

## لایەنگیری و پشتیوانی کافرەکان:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ بَشِّرِ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ١٣٨ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَيَبۡتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلۡعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ النساء:١٣٨

واتە:( ئەی پێغەمبەرﷺ مژدە بە دووڕووەکان بدە کە بەڕاستی سزایەکی بەئێشیان بۆ ئامادە کراوە) ( ئەو دووڕووانەی کە بێ باوەڕەکان دەکەنە پشتیوان و یارویاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران، ئایا دەیانەوێت عیززەت و دەسەلاَت و سەربەرزیان لای ئەوان دەست بکەوێت؟ (ئەوانە بەهەڵەدا چوون) چونکە بەڕاستی عیزەت و بالآدەستی و سەربەرزیی هەر هەمووی بۆ خوایە).

هــەروەها دەفــەرموێت ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدًا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾ الحشـر: ا(ئایـا سـەرنجت نـەداوە لەوانـەی کـە دووڕوو بـوون و بـەبرا بێباوەڕەکانیـان لـە خـاوەن کتێـب دەڵـێن: ئەگـەر ئێـوە دەربکـرێن ئێمـەش لەگەڵتانـدا دەردەچین، هەرگیز دژی ئێوە بەقسەی کەس ناکەین، خۆ ئەگەر جەنگتان دژ بکرێت ئێمە پشتیوانیتان لێ دەکەین، بەمەرجێك" خوا خۆی شایەتە کە ئەوانە بێگومان درۆزنن)

## رازیبوون بە حوکم کردنی ستەمکار و وازهێنان لە شەریعەت:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٧ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ٤٨ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ٤٩ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾ النور: ٤٧ – ٥٠ واتـەی ئایەتـەکان: ( (دووڕووەکان) تەنها بەزمان دەڵێن: ئێمەش باوەڕمان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرو فەرمانبەرداریشین، کەچی

لەوەودوا دەستەیەکیان روو وەردەگێڕن و درۆ دەکەن، ئا ئەوانە ئیماندار نین (٤٧) ئەوانە کاتێك بانگ دەکرێن بۆ لای بەرنامەی خوا و پێغەمبەرەکەی تا فەرمانڕەوا بێت لەنێوانیاندا، خێرا دەستەیەکیان پشت هەڵدەکەن و ناڕەزایی دەردەبڕن (٤٨) خۆ ئەگەر شەرع حەقەکە بەوان بدات ئەوە بەملکەچی و فەرمانبەردارییەوە دێن بۆ لای (٤٩) ئایا ئەوانە لە دڵەکانیاندا نەخۆشی کوفرو خوانەناسی هەیە؟ یاخود گومانیان هەیە؟ یاخود دەترسن لەوەی کە خوا و پێغەمبەری ستەمیان لێ بکات؟! نەخێر وانییە، ئا ئەوانە هەر خۆیان ستەمکارن (٥٠)

هەروەها دەفەرموێت ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴾ النساء: ٦٠-٦٣ (ئایا نەتڕوانیووەتە ئەو (دووڕووانەی) لاف ئەوە لێ دەدەن گوایە بەڕاستی باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ رەوانەکراوە و بەوەش کە پێش تۆ رەوانەکراوە (بۆ پێغەمبەران)! کەچی دەیانەوێت رووبکەنە زۆردارو جادووگەرو خوانەناسان تا دادوەریان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لەکاتێکدا بە ڕاستی فەرمانیان پێدراوە کە باوەڕیان بە (تاغوت) نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت گومڕایان بکات بەگومڕاییەکی دوورو بێسنوور (٦٠) کاتێکیش پێیان بوترێ: وەرن بۆ لای ئەو (قورئانەی) کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە و بۆ لای پێغەمبەرەکەی کەچی دەبینی دووڕووەکان پشتت تێدەکەن و رووت لێ وەردەگێڕن بەتەواوی (٦١) ئاخۆ ئەوانە حاڵیان چۆن بێت کاتێك بەهۆی رەفتاری نادروستیانەوە بەڵایەك دووچاریان دەبێت، کەچی لەوەودوا هاوار بۆ تۆ دەهێنن و سوێند بەخوا دەخۆن: لەو کارەماندا مەبەستمان تەنها چاکەکاریی و ریکخستن و ئاشتی بوو (٦٢) ئا ئەوانە کەسانێکن خوا دەزانێت چی لە دڵ و دەروونیاندا حەشاردراوە، کەواتە رەفتاری ئەوانە پشتگوێ بخە ئامۆژگاریان بکە و قسەی بەپێزو بەتوێکڵی وایان پێ بڵێ کە بەقوڵایی دەروونیاندا بچێتە خوارەوە و بیانهەژێنێت.(٦٣).

## خۆبەگەورەزانین بەرامبەر تۆبەکردن و داوای لێخۆشبوون:

پــــەروەردگار دەفــــەرموێت: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ ٱللَّهِ لَوَّوْاْ رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ﴾ المنافقون: ٥

واتە: (کاتێك پێیان بوترێت وەرن پێغەمبـەری خـوا، داوای لێخۆشـبوونتان بـۆ دەکـات، سەر بادەدەن و لووت بەرزی دەکەن، دەیانبینیت روو وەردەگێرن و بەرهەڵسـتی دەکـەن، لەکاتێکدا ئەوانە خۆیان لا گەورە دەبێت و خۆ بەزلزانن).

## حەزکردن بە بڵاوبوونەوەی بەدڕەوشتی لە نێوان باوەڕداران:

پــــەروەردگار دەفــــەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النور: ١٩

واتە: (بەڕاستی ئەوانـەی حـەز دەکـەن زینـا و تـاوان لـەناو ئەوانـەدا باوەڕیـان هێنـاوە بڵاوبێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهـان بۆیـان ئامادەیـە و خـوا خـۆی چاك دەزانێت و ئێوە نایزانن.)

## دژایەتیکردنی ئابوری باوەڕداران:

پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُواْ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّواْ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴾ المنافقون: ٧

واتە: (کەسانێك لەوان بە خەڵکی دەڵێن: ماڵ و سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کـە لـە دەوری پێغەمبەری خوادان، تا بـڵاوەی لـێ بکـەن!! (ئـەی نـازانن) هەرچـی گەنجینـەکان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر خوا خاوەنیانە، بەڵام دووڕووەکان ئەم راستییە تێناگەن و لە نهێنییەکان سەردەرناکەن).

## فەرمانکردن بە خراپە و ڕێگری کردن لە چاکە:

پــــەروەردگار دەفــــەرموێت: ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾ التوبة: ٦٧

دووڕووەکان ترسناکترین توێژن کە هەڕەشە لە ئوممەت دەکەن، ئەمەش بە هۆی تێکەڵیان لەگەڵ موسڵمانان و زانینی خاڵە بەهێز و لاوازەکانیان. هەروەکو ئیبن القیم لە بارەی دووڕوویی دەفەرموێت (دەردی بێ دەرمانی ناوەوەی مرۆڤە) [1].

هەندێك کەس وادەزانێت کە ئەم جۆرە کەسانە لە سەردەمانی زوو هەبوون و ئێستا نەماون، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە هەڵەیە، بەڵکو تا ڕۆژی دوایی لە هەموو کاتێکدا دەمێنن، وەك شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت (دووڕووەکان تا ئێستاش ماون، تاوەکو ڕۆژی دوایش دەمێنن) [2].

موسڵمانەکان تا دوای کۆچکردن بەرەو مەدینە، نەیاندەزانی دوو ڕوویی چییە، پێشتر لە مەککە باو نەبوو، چونکە موسڵمانان لە مەککە دەسەڵاتیان نەبوو، ئەو کات دەسەڵات و هێز هی موشکریکەکان بوو، بۆیە هیچ پێویستی نەدەکرد کە کەسی موشریك عەقیدەی خۆی بشارێتەوە.

لە مەدینە دوای ئەوەی موسڵمانەکان دەسەڵاتیان زیاد بوو، دوو ڕوویی دەرکەوت، دووڕووەکان باوەڕهێنانیان بە ئیسلام ئاشکرا دەکرد و بێ باوەڕییان دەشاردەوە، ئەمەش وەك ترسنۆکی و فێلکردن، سەرکردەیان عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو، پێش کۆچکردنی پێغەمبەر دەیویست سەکردایەتی هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج بگرێتە دەست، کاتێك ئەمەی لە دەستدا، بە دووڕوویی هاتە ناو ئیسلام.

ئیبن سەلول بەردەوام بوو لە پیشاندانی ئیسلام و شاردنەوەی ڕق و کینە و شیرك و فێڵ، چاوەڕیی هەلێکی دەکرد بۆ زیانگەیاندن بە ئیسلام. تا ئەو کاتەی مرد لە دانانی پیلان دژی موسڵمانان هەرگیز درێغی نەدەکرد.

سەرباری هەموو ئەمانە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەرمونیان بوو لەگەڵی، بە ئامانجی ڕاکێشانی دڵی بەرەو ئیسلام، بە سۆز و میهرەبانییەوە مامەڵەی لەگەل دەکرد.

## دەرکەوتنی یەکەم هەڵوێستی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بەرامبەر ئیسلام:

ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنه دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەر خوا ﷺ سواری پشتی گوێدرێژێك بوو، کە گوێدرێژەکە کورتانێکی لەسەر بوو، لەسەر کورتانەکەش پارەچە قوماشێکی قەدیفەی (فدکیە) [3] هەبوو. ئوسامەی لە دوای خۆی سوار کرد، سەردانی

---

[1] مدارج السالکین (١/٣٥٤).
[2] مجموع الفتاوی (٧/٢١٢).
[3] واتا دروستکراوی گوندی (فدکیە) فتح الباری (١٠/١٢٢).

سەعدی کوڕی عوبادەی کوڕی حارسی خەزرەجی دەکرد، ئەمەش پێش ڕووداوی جەنگی بەدر بوو.

بەلای مەجلیسێکدا تێپەڕی کە موسڵمان و موشریك و یەهودی تێدا بوو، لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی، ئەمەش بەرلەوەی عەبدوڵڵا ئیسلام بێت [1]. هەر لەو مەجلیسەدا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی لێبوو.

کاتێك تەپوتۆزی گوێدرێژەکە گەیشتە مەجلیسەکە، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بە کراسەکەی لوتی خۆی گرت و گوتی: تەپوتۆزمان لەسەر مەکە.

پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی لێکردن [2]، وەستا، پاشان بۆلای پەروەردگار بانگی کردن و قورئانی بەسەردا خوێندن.

عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی گوتی: ئەی پیاو، شتێکی باشە گەر ئەوەی دەیڵێیت ڕاست بێت، ئازارمان مەدە لە مەجلیسەکانمان، بگەڕێوە شوێنی خۆت، بڕۆ بۆ ئەو کەسە بیخوێنەوە کە تۆی بۆلای ئێمە ناردووە.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە گوتی: لەلامان بمێنەرەوە، بەڕاستی ئەمەمان پێ خۆشە.

موسڵمان و موشریك و یەهودییەکان دەستیان کردە شەڕە جنێو، تا خەریك بوو بەگژیەکدا بچن.

لە گێڕانەوەیەکی تردا (کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووە لایان، عەبدوڵڵا گوتی: بڕۆ لێمان دووربکەوە، وەڵاهی بۆنی گوێدرێژەکەت ئازاری دام).

پیاوێك لە ئەنسارییەکان گوتی: وەڵاهی گوێدرێژی پێغەمبەری خوا ﷺ لە تۆ بۆن خۆشترە.

پیاوێك لە عەبدوڵڵا توڕە بوو، قسەی پێگوت، هاوەڵی هەردووکیان لەیەکتر توڕە بوون، بە لقی دارخورماو بە دەست و بە نەعل لەیەکتریان دا.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوام ئارامی دەکردنەوە [3].

پاشان سواری گوێدرێژەکەی بۆوە تا چووە لای سەعدی کوڕی عوبادە، پێی فەرموو: **"ئەی سەعد، ئایا گوێت لێ نەبوو ئەبو حەباب [1] چی گوت، مەبەست لێی (عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی) یە، فەرمووی: ئاوا و ئاوا دەڵێت"**.

---

[1] واتا پێش ئەوەی ئیسلامەتی ئاشکرا بکات.

[2] لەم فەرمودەیەدا دەردەکەوێت، دروستە سەلام لە کەسانێك بکرێن کە موسڵمان و کافرن. شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢/١٥٨).

[3] بوخاری (٢٦٩٩) و موسلیم (١٧٩٩) گێڕاوەتیانەوە. لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ.

سەعد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لێی ببورە و لێی خۆش ببە، سوێند بەخوا، پەروەردگار ئەوەی پێبەخشیووی کە پێی بەخشیووی، بەڕاستی خەڵکی ئەم (بحیرە)[٢] هەموویان رازین لەسەر ئەوەی تۆ پادشایان بیت.

هەر کە بە چاوی خۆی ئەوەی بینی کە پێت بەخشراوە، حەسودی پێ بردووە، بۆیە ئەوەی کرد،کە کردوویەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ لێی خۆش بوو، بەردەوام پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی وەك چۆن پەروەردگار فەرمانی ئارامگرتنی پێداون، لە موشریکەکان و ئەهلی کیتاب خۆش دەبوون.

وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ لَتُبْلَوُنَّ فِيٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾ آل عمران: ١٨٦

واتای ئایەتەکە: سوێند بێت بێگومان تاقی دەکرێنەوە لەماڵ و دارایی و خۆیشتاندا هەروەها سوێند بێت لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان و لە موشریك و هاوەڵگەرانەوە ئازارێکی زۆر دەبیسن (ئەوەندە بوختان و قسەی نابەجێتان بۆ هەڵدەبەستن، وەك ئازار بەرگوێتان بکەوێت وایە)، بەڵام ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن و لە خوا بترسن (لە سنوور دەرنەچن)، بەڕاستی ئەو هەڵوێستە لەکارە پەسەند و کردەوە پایەدارەکانە).

پێغەمبەر ﷺ بەوەی پەروەردگار فەرمانی پێکردووە، بەردەوام لێبووردە بووە، تا ئەو کاتەی خوای گەورە روخسەتی لەبارەوە داون[٣].

لێخۆشبوونی پێغەمبەر ﷺ لە زۆربەی موشریك و یەهودییەکان و لێبوردەیی لەگەڵ دووڕووەکان لە ژیاننامەی و فەرمودەکانی زۆر روون و ئاشکرایە.

لەم فەرمودەیەی باسکرا، نەرمونیانی پێغەمبەر ﷺ دەردەکەوێت، هیچ توڕە نەبوو کاتێك لەلایەن سەرکردەی دووڕووەکان ئەم قسەیەی پێ گوترا (تەپوتۆزمان بەسەردا مەکە) لوتی خۆی بە کراسەکەی گرت، زۆر بە ناشیرینی هەڵسوکەوتی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کرد کاتێك بەم شێوازە بانگی کرد گوتی "ئەی پیاو".

---

[١] پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نازناوەی لێناوە، ئینجا یان بەو ناوە ناوبانگی هەبووە، یان بۆ بەرژەوەندی دڵنەرمکردنی.

[٢] بە گوند یان بە شارێك دەگوترێت، لێرەدا مەبەست لێی مەدینەیە.

[٣] بوخاری (١٦٥٤) و موسلیم (١٧٩٨) گێراوەتیانەوە. مەبەست لە (تا پەروەردگار روخسەتی لەبارەیەوە پێداون)، واتا شەڕکردن لەگەڵیان.

پێغەمبەرﷺ بە نەرمونیانی وەڵامی ئەم قسە ناشیرنانەی دایەوە و هیچ تورە نەبوو، بەڵکو لێی خۆش بوو.

نەوەوی دەفەرموێت: (ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەو نەرمونیانەی پێغەمبەر ﷺ هەیەتی، هەروەها لە لێخۆشبوون و ئارامگرتن لەسەر ئازار لەپێناوی خوای گەورە، لە پەروەردگار دەپاڕایەوە تا دڵنیان نەرم بکات)[1].

پێغەمبەر لەسەرەتای بانگەوازدا، لەلایەن پەروەردگارەوە داوای لێکراوە کە لێبوردە و نەرمونیان بێت ﴿ فَاعْفُوا وَاصْفَحُوا ﴾ البقرة: ١٠٩

واتە: (ئێوە لێیان ببورن و لێیان مەگرن و چاوپۆشییان لێ بکەن، تا خواکاری خۆی ئەنجام دەدات و ویستی خۆی جێبەجێ دەکات).

﴿ فَاصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِينَ ﴾ الحجر: ٩٤واتە: ( هەر فەرمانێکت پێدراوە (ئەی محەمەد ﷺ) ئەنجامی بدەو گوێ مەدە بە بوختان و رەفتاری موشریك و هاوەڵگەران).

لەسەرەتا رێنمایی بەو شێوەیە بوو، کە بە چەك رووبەروویان نەبنەوە، تا ئەو کاتەی موسڵمانان بە هێز دەبن و دەتوان بەرەنگاریان ببنەوە.

## کاتێك موسڵمانان بە هێزبوون لەدوای جەنگی بەدر، کوڕی سەلول و زۆرێك لە موشریکەکان بە دووڕوویی هاتنە ناو ئیسلام:

ئوسامەی کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی بەدری کرد، خوای گەورە بەهۆیەوە زۆرێك لە سەرکردەی کافر[2] و قورەیشەکانی کوشت،پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بە سەرکەوتوویی و بە دەسکەوتەوە گەڕانەوە کە بەندکراوەکانی سەرکردەی کافر و قورەیشییەکانیان لەگەڵ بوون، کوڕی سەلول و ئەو موشریکانەی لەگەڵیان بوون گوتیان: بەڕاستی ئەمە کارێکە ئیتر دەرکەوت، بەیعەت بدەنە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئیسلام موسڵمان بن[3].

ئەمەش لەبەر ترس و تۆقینیان بووە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە دووڕووەکان لەگەڵ دەرکەوتنی هێزی موسڵمانان، خراپەکاری خۆیان دەشارنەوە، لە کاتی بێهزبوونی موسڵمانانیش دووڕوویی و خراپەکاری خۆیان ئاشکرا دەکەن.

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥٩/١٢).
[2] ئەوان لە خانەدانەکان و گەورە و سەرۆکەکانیان بوون. النهاية ( ٥٥/٠٣).
[3] بوخاری گێراوەتیەوە(٤٥٦٦).

سەرباری ڕاگەیاندنی موسڵمان بوونیان، بەڵام شەڕانگێزی و دوژمنایەتیان بەرامبەر ئیسلام هەر نەگۆڕدرا، بەردەوام چاوەڕوانی کارەساتێکیان دەکرد بەسەر موسڵمانان بێت، بۆ ئەوەی ئەم هەڵە بقۆزنەوەو لەناویان ببەن.

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: موهاجیرەکان هیچ کەسێکی دووڕوویان تێدا نەبوو، بەڵکو دووڕوویی لەناوی هەندێك لە ئەنسارییەکان دابوو کە هاتنە ناو ئیسلام، ئەمەش لەبەر ئەوە بوو کە ئەنسارییەکان خەڵکی مەدینە بوون، کاتێك خەڵکە بەڕێزەکانیان و خەڵکانی تر موسڵمان بوون و ئیسلام بە عیززەت بوو، ئەوان هیچیان بۆ نەمایەوە دەبوایە موسڵمان بوونی خۆیان بە دووڕوویی ئاشکرا بکەن.

بەڵام خەڵکی مەککە، سەرکردەو گەورەکانیان کافر بوون، کەس لەوان باوەڕی نەدەهێنا، تەنیا کەسێك نەبایە کە بە دڵ و ڕوکەش باوەڕی هێنابایە، چونکە کەسێك موسڵمان بووایە ئەشکەنجە دەدرا، لەبەرامبەردا دووڕووەکان موسڵمان دەبوون بۆ بەرژەندی دونیایان، بەڵام ئەوانەی مەککە لەسەر موسڵمان بوونیان لە دونیا ئازار دەدران[1].

**عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و دووڕووەکانی تر، بە هاوکاری یەهودییەکان خەریکی پیلانڕێژی بوون دژی موسڵمانان:**

ئەمەیان لە کاتی چوونە پاڵ یەهودییەکانی بەنی قەینوقاع زۆر بە ڕوونی بە دەردەکەوێت، ئەو یەهودیانەی پەیمانییان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شکاند، بەوەی کەس نابێت دەست درێژی بکاتە سەر ئەویتر.

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس رضي الله عنه دەگێڕێتەوە،کە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەر قورەیشدا لە جەنگی بەدر سەرکەوت، گەڕایەوە مەدینە، یەهودییەکانی لە بازاڕی بەنی قەینوقاع کۆکردەوە، فەرمووی: **"ئەی کۆمەڵی یەهودییەکان، بەر لەوەی توشی ئەوە بن کە قورەیشەکان تۆشی بوون، موسڵمان بن[2]".**

گوتیان: ئەی موحەممەد، لەخۆت بایی مەبە، بەوەی چەند کەسێکت لە قورەیش کوشتووە، کە کەسانی نەزان و بێ ئەزموون بوون و شەڕ نازانن، گەر تۆ شەڕمان لەگەڵ بکەی، دەزانی ئێمە کێین، هەر گیز توشی کەسێکی وەکو ئێمە نابیتەوە.

---

[1] الفتاوی الکبری (٣/٤٥٠).

[2] لە گێڕاونەوەیکی تردا: (ئێوە زانیوتانە کە من پێغەمبەری نێردراوم، لە کتێبەکانی خۆتان دۆزیوتانەوە، خوای گەورە پەیمانی بۆ داون. السیرة النبویة لابن اسحاق (١/٣١٣).

پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ ۚ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ﴾ آل عمران: ١٢

واتای ئایەتەکە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەوانەی کە بڕوایان نەهێناوە: سەرئەنجام تێکدەشکێن و ژێردەست دەخرێن (لە دنیادا، لە ڕۆژی دوایشدا) کۆ دەکرێنەوە و ڕاپێچ دەکرێن بۆ ناو دۆزەلا کە ناخۆشترین جێگەیە.

ئیبن هیشام لە کوڕی عەون محەمەدی کوڕی عەبدوڵڵای ثقفي دەگێڕێتەوە،کە ئافرەتێك کاڵایەکی هێنا و لە بازاڕی بەنی قەینوقاع فرۆشتی، لەلای دوکاندارێك دانیشت تا کارەکەی جێبەجێ بکات، یەهودییەکان ویستیان نیقابی لەسەر ڕووی لابدەن و دەموچاوی دەربخەن، ئەویش ڕێگری لێکردن، دوکاندارەکە دامێنی کراسەکەی لە پشتی ئافرەتەکە گرێدا، کاتێك هەڵسا، شوێنی شەرمی دەرکەوت، ئەوان پێی پێکەنین، ئافرەتەکەش هاواری کرد.

پیاوێك لە موسڵمانان پەلاماری دوکاندارەکەی داو کوشتی، دوکاندارەکە یەهودی بوو، یەهودییەکانیش پەلاماری موسڵمانەکەیاندا و کوشتیان.

موسڵمانان لەو ڕووداوە تووڕەبوون، شەڕ لە نێوان ئەوان و بەنی قەینوقاع ڕوویدا [1].

ئەم کارەیان وایکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆ بخاتە سەر قەڵاکەیان و فشاریان بخاتە سەر، تا ڕازای بوون بە حوکمی.

ئیبن و ئیسحاق دەڵێت: عاصمی کوڕی عومەری کوڕی قەتادە بۆی گێڕامەوە: ( پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆی دان، تا ڕازیبوون بە حکومکردنی، کاتێك خوای گەورە دەسەڵاتی دایە پێغەمبەر، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول هاتە لای و گوتی: ئەی موحەممەد لەگەڵ پشتیوانانم باش بە، چونکە ئەوان هاوپەیمانی خەزرجەییەکان بوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی نەدایەوە.

دیسان گوتی: ئەی موحەممەد لەگەڵ پشتیوانانم باش بە.

پشتی تێکرد.

دەستی خستە سەر قەڵغانی سەر سینگی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"وازم لێ بێنە"**. پێغەمبەری خوا ﷺ تووڕە بوو تا دەم و چاوی لە تووڕەییان ڕەش هەڵگەڕا.

پاشان فەرموی: **"ئەمە چیتە، وازم لێ بینە"**.

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام (٤٨/٢).

گـوتی: نـا بـەخوای وازت لێنـاهێنم، تـا لەگـەڵ پشـتیوانانم بـاش نـەبی، چوارسـەد جـەنگاوەری بـێ قـەڵغان، سـێ سـەدی بـە قـەڵغانیش، منیـان لـە عـەرەب و لـە عەجـەم پاراسـتووە، دەتـەوێت بـە یـەکجار هـەموویان لـەناو ببـەی، سـوێند بـەخوا مـن دەترسـم کارەسات رووبدا، دواتر کێ من بپارێزێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەوان با بۆ تۆ بن"**[1].

عەبدوڵڵای کوڕی سەلول تا ئەو کاتە لەناو قەومەکـەی خـاوەن پێگـە بـوو، پێغەمبـەری خوا ﷺ تکاکەی لەبارەی بنی قەینوقاع قەبوڵ کرد، بـەوەی یەهودییـەکان شـاری مەدینـە جێ بهێڵێن، ماڵ و سامانیان لەگەڵ خۆیان ببەن، تەنیا چەکەکانیان نەبێت.

**کاتێك پێغەمبەر ﷺ بۆ جەنگی ئوحد دەرچوو، دووڕووەکان خۆیـان لەشـەڕکردن دزیەوە، سێیەکی سوپاکە گەڕایەوە، لەگەڵ ئەمەشدا پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی سزا نەدا:**

زەیدی کوڕی ثابت ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ جـەنگی ئوحـد دەرچـوو، خەڵکانێك، کە لەگەڵی دەرچووبوون گەڕانـەوە، ئـەوکات هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ لـەبارەی ئەو خەڵکانە بوونە دوو کۆمەڵ: کۆمەڵێکیان دەیـانگوت: شـەڕیان لەگـەڵ دەکـەین، ئـەوی تریان دەیانگوت: شەڕیان لەگەڵ ناکەین.

ئـەم ئایەتـە دابـەزی ﴿ فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا ﴾ النساء: **٨٨**[2]

کە دەفەرموێت (خەڵکانێك کە لەگەڵی دەرچوون گەڕانەوە) مەبەست لێـی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاوەڵەکانیەتی. ئەمە زۆر بە ئاشکرا لـە گێڕانـەوەی موسـای کـوڕی عوقبـە دەردەکـەوێت: لەسـەرەتا عەبـدوڵڵای کـوڕی ئوبـەی هـەمان رای پێغەمبـەری ﷺ هـەبوو لـەبارەی مانـەوە لـە مەدینـە و دەرنەچـوون. بـەڵام کاتێـك خـەڵکانێکی تـر ئامـاژەی دەرچوونیان بۆ کرد، پێغەمبەر ﷺ قسەی ئەوانی وەرگرت و دەرچوو، ئەو کات عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاوەڵەکانی گوتیان: موحەممەد ملکەچـی وان بـوو، سەرپێچـی مـنی کـرد، ئێمە لەبەرچی خۆمان بکوژین؟ بەسێیەکی سوپاکە گەڕایەوە.

ئیبن ئیسحاق لە گێڕانەوەکەیدا دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی حـەرام، بـاوکی جابر، کە ئەویش خەزرەجی بوو، لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی سـەلول گەڕایـەوە، پێـی گـوتن:

---

[1] السيرة النبوية لابن هشام (٤٨/٢). إسناده حسن، لكنه مرسل.

[2] بوخاری (٤٠٥٠) و موسلیم (٢٧٧٦) گێڕاوەتیانەوە.

بگەڕێنەوە، گوێیان پێنەدا، گوتی: ئەی دوژمنانی خوا، خـوای گـەورە دوورتـان بخاتـەوە، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی لە ئێوە بێ نیاز دەکات [1].

واتای ئایەتەکە: ئەی کۆمەڵی باوەڕداران، ئێوە چیتانە لـەبارەی دووڕووەکـان بوونەتـە دوو گروپ: گروپێك بەرگریان لێدەکەن، گروپەکەی دیکەیان لێ جیا دەبنەوە و دژایەتیان دەکەن، خوای گەورە ڕێگری لەو گروپە کرد کە بەرگریان لێ دەکەن. داوای لە بـاوەڕداران کرد لەسەر یەك پەیڕەو بن لە دوورکەوتنەوە و بەریبوون لێیان.

﴿وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم﴾ واتا: لە کوفری و بێ باوەڕی خۆیان ڕۆیان دەچوێنێت، بەهۆی ئەوەی بە کردارە خراپەکانیان بە دەستیان هێناوە [2].

ڕاستە دووڕووەکان، بەهۆی کاریگەریان لەسـەر کەسانی لاوازو کشاندنەوەی سێیەکی سـوپاکە، ئـەو سـوپایەی بـۆ بـەرەنگار بوونـەوەی موشـریکەکان دەرچـوو بـوو، موسڵمانەکانیان لە ناخۆشترین بارودۆخدا جێهێشـت، بـۆ نەفسـی خۆیـان بەڵگـەیان بـەبێ بایـەخترین هۆکـار دەهێنایـەوە، ئـەوان وا پیشـانیان دەدا کـە شـەڕ ڕوونـادات، سـەرباری ئەوەی دەیانزانی شەڕەکە هیچ بوارێکی تێدا نەماوە کە ڕوودەدات.

ئەوەی بووە هۆی ئەوەی نەچنە پاڵ کەتیبەی موسڵمانان، بێ باوەڕی و دووڕووییان بوو، وەك چۆن پەروەردگار بۆمان ڕوون دەکاتەوە ﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴾ آل عمران: ١٦٧

واتای ئایەتەکە: ( دووڕوویی و نالەباریی دوو ڕووەکانیش دەربخات، کاتێك پێیان وترا: وەرن بجەنگن لە پێناوی خوادا، یان (هیچ نـەبێت) بـەرگری لـە خۆتـان و مـاڵ و منـداڵتان بکەن، وتیان: ئەگەر بمانزانیایە شەڕو جـەنگ بـەرپا دەبێـت ئـەوە شـوێنتان دەکـەوتین و دەجەنگاین، ئەوانە ئەو ڕۆژە لە کوفرەوە نزیکترن تا لە ئیمان، بەدەمیان شتێك دەڵێن کە لە دڵ و دەروونیاندا نییە، خوایش زانایە بەوەی کە دەیشارنەوە...)

سەرباری ئەو کارەی کردیان، پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو تاوانـە گەورەیـە سـزای نـەدان، تاوانێك کە بووە هۆی بێهێزی موسڵمانان.

---

[1] السيرة النبوية لان هشام (٢/٦٤)، فتح الباري (٧/٣٥٦).
[2] تفسير الخازن (١/٤٠٧) تحفة الأحوذي (٨/٣٠٤).

**لە پێناو بەرژەوەندی ئیسلام، پێغەمبەری خوا ﷺ شەڕی لەگەڵ نەکردوون:**

پێغەمبەر ﷺ بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی بانگخوازی، هیچ کەسێکی لە دووڕووەکان نەکوشت، لەوانەی تێکەڵی کۆمەڵگە دەبوون، لە بەرژەوەندییەکان: داخستنی ڕێگاکانی دوورکەوتنەوە لە بانگەوازی ئیسلام.

فەرمودەی جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ بەڵگەیە لەسەر ئەمە: کە دەڵێت: ئێمە لە جەنگێك بووین [1]، پیاوێك لەموهاجیرەکان بە دەست شەقێکی لە پشتەوەی پیاوێکی ئەنسارپەکیدا. ئەنسارییەکە گوتی: ئەنسارییەکان هاوارە..!!

موهاجیرەکەش گوتی: موهاجیرەکان هاوارە..!! [2].

پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەمە بوو، فەرمووی: **"ئەم بانگەوازییە نەفامییە چییە؟"**.

گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاوێکی موهاجیری لە پیاوێکی ئەنسارپیدا.

فەرمووی: **"وازی لێبێنن، ئەمە بۆگەنە"**.

عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی گوێی لەمە بوو: گوتی: وایانکرد!! بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدار و بەڕێز و پیاوماقووڵە، ئەوە دەر بکات لە شار کە بێ ڕێز و بێ دەسەڵاتە [3].

ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر ﷺ.

عومەر هەڵسا و گوتی: ئە پێغەمبەر خوا لێم گەڕێ گەردەنی ئەم دووڕووە بپەڕێنم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لێگەڕێ، با خەڵك نەڵێت موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت"** [4].

ئیبن ئیسحاق ئەمەی زیاد کردووە: فەرمووی: نەخێر، بەڵام ڕوخسەتیان بدەن بڕۆن [1]، لە ساتێکدا ڕۆیشتن کە کاتی ڕۆیشتن نەبوو، ئوسەیدی کوڕی حضیر پرسیاری لە بارەی

---

[1] جەنگی (بنی المطلق) بوو.

[2] سەرباری ئەوەی ئەم دەستەواژەیە ئیسلامییە (موهاجیری و ئەنساری)، بەڵام بە هەڵە بەکار هاتووە، بۆیە پێغەمبەر ڕەتیکردۆتەوە.

[3] لە ڕیوایەتی عبدالرزاق لە مەعمەرەوە، ئەویش لە قەتادەوە (بە مورسەلی) دەڵێت: هەموو دووڕووەکان چوونە لای عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی پێیان گوت: تۆ پێشتر ئومێدت دەخواست و کارت پێ دەکرا، ئێستا وات لێهاتووە نە سوودت هەیە نە زیان، ئینجا گوتی: گەر بگەڕێینەوە مەدینە دەبێت کەسی بەڕێز و بەدەسەڵات کەسی بێ ڕێز لەشار دەربکات. سەنەدی ئەم فەرمودەیە وەك ئیبن حەجەر لە (فتح ٦٤٩/٨)دا دەڵێت: (مرسل= جید)ـە،

لە گێڕانەوەی ئیبن ئیسحاقدا هاتووە: عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی گوتی: بەڕاستی ئەم کارەیان کردووە؟ لە شاری خۆمان بەسەرماندا زاڵ دەبن؟ سوێند بەخوا ئەو قوڕەیشیانە هاوشانی ئێمە نەبوون بەڵام وەك دەگوترێت: سەگەکەت قەڵەو بکەی دەتخوا. السيرة النبوية لابن هشام (٣٣٥٩/٤).

[4] بوخاری (٣٥١٨) و موسلیم (٢٥٨٤) گێڕاوەتیانەوە.

ئەمەوە لێکرد، ئەویش پێی ڕاگەیاند، ئوسەید گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بە عیزەتی ئەوان سەرشۆڕن.

هەروەها فەرمووی: "**بەڵکو نەرمونیان دەبین لەگەڵی، بە باشی هاوەڵایەتی دەکەین تا ئەوەندەی لەگەڵمانە**"[2].

لە گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە: کوڕەکەی عەبدوڵڵا بە باوکی گوت: سوێند بە خوا ناچینەوە مەدینە تا دانی پێدانەنێی کە تۆ سەرشۆڕی و پێغەمبەری خوا بەڕێز و بەعیزەتە، ئەویش وای کرد[3].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی دانی پێدانا کە خۆی سەرشۆڕە و پێغەمبەری خوا ﷺ بە عیزەت و بەڕێزە.

نەوەوەی ﷺ لەبارەی ئەم فەرمودەیە دەڵێت: بەڵگەی نەرم نواندنی پێغەمبەر ی ﷺ تێدایە.

هەروەها وازهێنان لە هەندێك کاروباری بژاردەو ئارامگرتن لەسەر هەندێك خراپە، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەك لە دەرەنجامیدا خراپەکاری گەورەتر رووبدات.

پێغەمبەر ﷺ دڵی خەڵکی پەیوەست دەکرد بە دین، ئارامی لەسەر رەقی و بێ تەبیعەتی ئەعرابی و دووڕووەکان دەگرت، ئەمەش لە پێناو بەهێزبوونی موسڵمانان و بانگەوازی ئیسلام، بەم پێیەش ئیمان دەچووە دڵی ئەو جۆرە کەسانە و خەڵکانی تریش ئارەزووی ئیسلامیان دەکرد، هەروەها پارەی زۆریشی پێ دەبەخشین.

لەبەر ئەم هۆیانە و ئاشکراکردنی ئیسلامەتیان بۆیە دوو ڕووەکانی نەدەکوشت، ئەو حوکمی بە رووە ئاشکرایەکەوە دەکرد، پەروەردگاریش کاروباری نهێنییەکانیان لە ئەستۆ دەگرێت، چونکە ئەوان بە هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ ئەژمار دەکران و جیهادیان لەگەڵ دەکرد، جا یان لەبەر هۆی رەگەزپەرستی یان بۆ دونیا یان بەهۆی چەند تاکێکی عەشیرەتەکانیان،کە لەگەڵی بوون[4].

---

[1] حیکمەتی دیاری فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بە رۆیشتنیان لە کاتێکی نا ئاساییدا، ئەمەیە: گەر ئەم هەواڵە لەناو سوپادا بڵاوبێتەوە دەبێتە هۆی تێکچوونی بیروهۆشی سەربازان، سەریان بۆ قسە و دەمەقاڵی بێ مانا دەکێشێ، کە دەرەنجامەکەی نەخوازراوە، رۆیشتنی سوپاکەش بەردەوام بوو بە شەو و رۆژ، دوای خەوتنیان، خەوێکی قوڵ وایکرد شوێنەواری فیتنەکە نەمێنێت. غزوە بنی المصطلق (١/١٩٠).

[2] السیرة النبویة لابن هشام (٢/٢٩١).

[3] ترمذي (١٥٨٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح ترمذي ٣٣١٥) بە سەحیحی داناوە.

[4] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٦/١٣٩).

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت: سێیەمین –واتە لەو بەڵگانەی لەسەر بنچینەی (سد الذرائع –ڕێگە گرتن لە هۆکارەکان)، پێغەمبەر ﷺ لەبەر بەرژەوەندی دەستی هەڵدەگرت لە کوشتنی دووڕووەکان، نەوەك ئەم کارە ببێتە ڕێگەخۆشکەرێك بۆ قسەی خەڵکی بڵێن موحەممەد ﷺ هاوەڵانی خۆی دەکوژێت، چونکە ئەم قسەیە ئەوانەی هاتوونەتە ناو ئیسلام لە ئیسلامیان دووردەخاتەوە یان ئەوانەی هێشتا نەهاتوونەتە ناوی، ئەم دوورخستنەوەیەش حەرامە [1].

**بنەمای حوکمکردنی لەگەڵ دوو ڕووەکان: جێبەجێکردنی حوکمی ئاشکرای ئیسلام لەسەریان، مادام موسڵمانیەتی خۆیان ئاشکرا کردووە.**

لە حوکمەکانی دونیا بە هەمان مامەڵەی موسڵمانان، مامەڵەی لەگەڵ کردوون، هیچ جیاوازی لە نێوان ئەوان و موسڵمانان لە حوکمە ئاشکراکان نەکردووە.

**شافیعی** ؒ دەڵێت: هەر کەسێك دوای کوفر، ئیمان ئاشکرا بکات، هەمان حوکمی موسڵمانی دەبێت لە میرات و مارەکردن و حوکمەکانی تر [2].

شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێت: ئەو ئیمانە ئاشکرایەی وادەکات حوکمی دونیایان لەسەر جێبەجێ ببێت، پێویستی بە ئیمانی ناوەوەی مرۆڤ ناکات، ئەو دووڕووانەی دەڵێن باوەڕمان بە خوا و بە ڕۆژی دوایی هێناوە، کەچی ئەوان بێ باوەڕن، لە ڕووە ئاشکراکەوە ئەوان باوەڕدارن و نوێژ لەگەڵ خەڵك دەکەن، حەج و غەزا دەکەن، لەگەڵ موسڵمانان ژن لە یەکتر دەخوازن و میراتیان لە یەکتر وەردەگرن، بە هەمان شێوەی دوو ڕووەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ.

پێغەمبەر ﷺ ئەو حوکمەی بۆ دووڕووەکانی دەدا، بۆ کافرەکان ئەوانەی کوفریان ئاشکرا کردووە، نەدەدا، تەنانەت لە مارەیی و میرات وەگرتنیشدا.

کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول –کە لە دیارترینی دووڕووەکان بوو– مرد، عەبدوڵڵای کوڕی کە لە باوەڕدارە باشەکان بوو، میراتی لە باوکی وەگرت، هەموویان کە دەمردن میراتگرە باوەڕدارەکان میراتیان لێ دەگرتن.

گەرچی ئەمان دووڕوون و لە ڕۆژی دوایی لە (درك الاسفل) دان، بەڵام میراتیان دەگرت و میراتیان لێ وەردەگیرا، لە ڕووی ماف و ئەرکەوە بە هەمان شێوەی مسوڵمان بوون [3].

---

[1] إقامة الدليل على إبطال التحليل (٣/٤٧١).
[2] الأم (٦/١٦٦).
[3] مجموع الفتاوى (٧/٢١٠). بە کورتکراوەیی.

ئەو دووڕووانە مادام بەڵگەیەکیان لەسەر نییە کە کوفر و دووڕوویی ناوەوەیان ئاشکرا بکات، هەمان مامەڵەی موسڵمانیان لەگەڵ دەکرێت، بەڵام گەر ئەو دووڕوویی و کوفرەیان بە بەڵگەی بەردەست لێ ئاشکرا بوو، ئەو کات مامەڵەی بێ باوەڕانیان لەگەڵ دەکرێت و حوکمی هەڵگەڕانەوەیان لە دین لەسەر جێبەجێ دەکرێت.

بۆیە هەڵەیەکی گەورەیە لەوەی هەندێك کەس دەڵێن دەبێت ئازادی تەواو بدرێتە هەرچی دووڕووی خراپەکار و شەیتانی سەرکەش هەیە، بە بیانوی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە سزادانی دووڕووەکان هەڵگرتووە!

دیارە لای ئەوان شاراوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیە ئەم کارەی کردووە، چونکە لە سەردەمی ئەودا دووڕووەکان دووڕوویی خۆیان شاردۆتەوە، ئەوەشی دەردەچوو لە زمانەکانیان بەڵگەی روون و ئاشکرا نەبوو لەسەریان، ئەوا بە سوێندی درۆیین حاشایان لێ دەکرد، وەك پەروەردگار دەفەرموێت ﴿ اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً ﴾ المنافقون: ٢ واتە ئەوانە سوێندی درۆیان کردووە بە قەڵغانی خۆیان لە کوشتن. ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ ﴾ التوبة: ٧٤ واتە: (دوو ڕووەکان) سوێند بەخوا دەخۆن کە قسەیەکی نابەجێیان نەکردووە، کەچی سوێند بەخوا بەراستی ئەوانە درۆ دەکەن، بەڵکو گوفتاری کوفرو بێباوەڕی هات بەدەمیاندا.

یان نەتوانراوە حوکمیان بەسەردا جێبەجێ بکرێت ئەویش لە ترسی هەڵاتنی خەڵك لە ئیسلام و هەڵگەڕانەوەی خەڵکانی تر.

## پێغەمبەر ﷺ بۆ پەیوەستکردنی دڵەکانیان بەدین، سوێندخواردن و عوزریانی قبوڵ دەکرد:

زەید ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەفەرێك دەرچووین، خەڵکەکە لەم سەفەرەدا توشی نەهامەتی و نەبوونی هاتن، گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی بوو دەیگوت: هیچ شتێك مەبەخشنە ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر دان، بۆ ئەوەی لێی هەڵگەڕێنەوە، گەر بگەڕێینەوەوە مەدینەش دەبێت ئەو کەسەی خاوەن ڕێزە بێ ڕێزەکان لە شار دەربکات.

زەیدی کوڕی ئەرقەم دەڵێت: ئەم قسەیەم لای مام[1] گێڕایەوە، ئەویش لای پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، بانگی کردم و بۆم گێڕایەوە.

---

[1] مەبەست لە مامی سەعدی کوڕی عوبادەیە نەوەك مامی راستەقینەی، چونکە گەورەی هۆزی خەزرەج بوو.

پێغەمبەر ﷺ بەدوای عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی و هاوڕێکانی نارد، سوێندیان خوارد کە ئەم قسەیان نەگوتووە، پێغەمبەری خوا ﷺ منی بە درۆخستەوە ئەوانیش بەراستگۆ، توشی خەم و خەفتێك بووم کە هەرگیز توشی نەبوو بووم لە ژیانم، لەماڵەوە دانیشتم [١].
مامم پێی گوتم: تەنیا ئەوەت دەویست پێغەمبەر ﷺ بە درۆزنت دابنێت و لێت توڕە بێت [٢]؟

ئەم قسەیە زۆر کاریگەری لە دەروونم کرد، تا پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُوا۟ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴾ المنافقون: ١ تا دەگاتە کۆتایی سورەتەکە، ئەم ئایەتانەشی تێدایە ﴿ هُمُ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا۟ عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا۟ ۗ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٧﴾ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ المنافقون: ٧-٨

واتای ئایەتەکانی ٧ و ٨: (ئەوانە کەسانێکن دەڵێن بە خەڵکی: ماڵ و سامان مەبەخشن بەو کەسانەی کە لە دەوری پێغەمبەری خوادان، تا بڵاوەی لێ بکەن! ! هەرچی گەنجینەکان هەیە لە ئاسمانەکان و زەویدا هەر خوا خاوەنیانە، بەڵام دووڕوەکان ئەم راستییە تێناگەن و لە نهێنیەکان سەردەرناکەن (٧) ئەو دووڕووانە دەڵێن: سوێند بەخوا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە دەبێت ئەوەی کە دەسەڵاتدارو بەڕێز و پیاوماقووڵە، ئەوە دەر بکات لە شار کە بێ ڕێزو بێدەسەڵاتە، ئەو دووڕووانە نازانن کە: عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خواو پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە).

زەید دەڵێت: دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوایدا ناردم، ئەم ئایەتانەی بەسەردا خوێندمەوە، فەرمووی: **"ئەی زەید پەروەدگار تۆی بە راستگۆ بەدانا [٣]"**.

---

[١] لە گێڕانەوەیەکی تردا: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: "بەڵکو لەوانەیە گوێت بەهەڵە تێگەیشتبێت، یان هاوشێوەی ئەو قسەیەی بۆ دروست کردبیت"، مغازي الواقدي (٢/٤١٧)، بەڵکو بە درۆخستنەوەی گەورەی هۆزێك و بە راستگۆ دانانی منداڵێك لەو قۆناغەدا لای زۆربەی خەڵك قبوڵ کراو نییە.

[٢] لە گێڕانەوەی ئەحمەددا (١٨٧٩٩) هاتووە: چومەوە ماڵەوەو بە دڵتەنگی و خەمۆکییەوە خەوتم.

[٣] لە گێڕانەوەی تردا هاتووە: کاتێك من لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشتم، سەرم لەبەر خەمبارییەوە داخستبوو، هاتەلام، گوێی جوڵاندم و بە رووومدا پێکەنی، هێندە بەو زەردەخەنە و پێکەنینەی پێغەمبەر ﷺ دڵخۆش بووم، گەر لەبەرامبەر فرۆشتنی ئەم زەردەخەنە و پێکەنینە، زیندوویی هەتاهەتایی دونیایان پێدابام نەمدەفرۆشت. پاشان ئەبوبەکر هاتە لام و پێی گوتم: پێغەمبەر ﷺ چی پێ گوتی؟ گوتم: هیچی پێ نەگوتم تەنیا گوێی جوڵاندم و بەڕوومدا پێکەنی.

دەڵێت: پاشان پێغەمبەر ﷺ بەدوایدا ناردن بۆ ئەوەی داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکات، بەڵام ئەوان رەتیان کردەوە و پشتیان تێکرد [1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- پشت تێکردن لە هەڵەی سەرکردەی هۆزەکان، وەرگرتنی بیانووەکانیان، بڕواهێنان بە سوێند خواردنیان، لە پێناو هەڵنەهاتنی دارودەستەکەی و پەیوەستکردنی دڵەکانیان، گەرچی نیشانەکان ئاماژەی پێچەوانەوەی قسەکانیان بن.
- دروستە هەر کەسێك گوێ لە وتەیەکی مەترسیدار بوو بیگوازێتەوە بۆ لایەنی پەیوەندیدار و لایەنی بەرپرس و وەلی ئەمر، ئەم جۆرە قسە گواستنەوەی پێی ناگوترێت (نەمیمە)، چونکە لەوانەیە پشت تێکردنی ببێتە هۆی روودانی خراپەکاری گەورە. وەك زەیدی کوڕی ئەرقەم قسەی دوو ڕووەکانی بۆ پێغەمبەر ﷺ گواستەوە [2].

**پێغەمبەر ﷺ هەموو رۆژانی هەینی، بە مەبەستی سەرزەنشتکردن و ئاگادارکردنەوەیان سورەتی (المنافقون)ی دەخوێندەوە:**

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ؓ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیانی رۆژانی هەینی سورەتی (سجدة) و (الانسان)ی دەخوێندەوە، لە نوێژی هەینیشدا سورەتی (الجمعة) و (المنافقون)ی دەخوێندەوە [3].

ئیمامی نەوەوەی دەڵێت: زانایان دەفەرمون: حیکمەت لە خوێندن سورەتی (الجمعة) لەوەدایە کە ئەو سورەتە باس لە واجیبوونی نوێژی هەینی و حوکمەکانی تر دەکات، هەروەها هاندانی تێدایە بۆ پشت بەستن بە پەروەردگار و یادکردنەوە.

سەبارەت بە سورەتی (المنافقون) مەبەست لێی سەرزەنشتکردنی ئەو کەسانەیە کە ئامادەی نوێژی جومعە دەبوون، هەروەها هۆشداریدانیان بۆ تەوبەکردن، چونکە ئەوان لە هیچ شتێکدا کۆنەدەبوونەوە، هێندەی لەو نوێژدا کۆدەبوونەوە [4].

---

(1) بوخاری (٤٩٠٠) و موسلیم (٢٧٧٢) و ترمذي (٢٧٧٢) گێراوەتیانەوە.
(2) فتح الباری (٨/٦٤٦).
(3) موسلیم گێراوەتیەوە(٨٧٩).
(4) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦/١٦٧).

**سەرباری لێبوردن و نەرمینواندنی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر کوڕی سەلول، بەلام کاتێك ئازاردانی گەیشتە (ئالوبەیت)، پێغەمبەر داوای لە قەومەکەی کرد ڕێگری لێ بکەن:**

دووڕووەکان دوای ئەوەی لە غەزای (بني المطلق) لە هەوڵی یەکەمیان لە پیلانداناn شکستیان هێنا، ئەم جارەیان پرسی بوختانیان جوڵاند.

ئەوەی گوناهی بوختانی لە ئەستۆیە عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلولی دووڕووە، کە پەروەردگار لە بارەیەوە فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ لِكُلِّ ٱمْرِيٍٕ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النور: ١١

**واتای ئایەتەکە**: بێگومان ئەوانەی بوختانەکەیان هەڵبەست دەستەیەك بوون لە خۆتان (یاخود واخۆیان نیشان دەدا کە لەخۆتانن) وامەزانن کە ئەو بوختانە شەڕو خراپ بوو بۆتان، بەڵکو خێر بوو بۆتان (تا ئیمانداران لە دووڕووەکان جیابێتەوە، ئیماندارانی دڵپاك وریا ببنەوە)، بێگومان تاوانی هەرکەس لەو بوختانچیانە لەگەردنی خۆیدایەتی، ئەو کەسەش سەرۆك و گەورە و هەڵبەستی بوختانەکەیە، سزایەکی سەخت و گەورە بۆی ئامادەیە.

چونکە ئەو پیاوە یەکەم کەس بوو قسەی لەسەر بوختانەکە کرد، فتیلی ئاگرەکەی خۆش کرد، هاوشێوەکانی لە پیسی و دووڕوویی لەماڵەکەی کۆدەکردەوە، هەواڵەکەی بڵاودەکردەوە و لەگەڵ دارودەستەکەی دەیانگووتەوە.

دوای ئەوەی هەواڵەکە لەلایەن ئەوانەوە بڵاوبوویەوە، خەڵکی لەوان گوێیان لێ بوو، کاریگەری لە باوەڕداران کرد و هەڵێخلیسکاندن، ئەوانیش وەك دووڕووەکان قسەیان لەسەری دەکرد، بێ ئەوی بیری لێ بکەنەوە کە کوڕی سەلول لە پشت ڕووداوەکەیەوە.

کاتێك هەواڵەکە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی توشی بێزاری و دڵتەنگی کرد، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا وتاری بۆ هاوەڵانی دا و فەرمووی: **"کێ پشتیوانم دەکات و سەرم دەخات بەرامبەر پیاوێك ئازاری کەس و کاری منی داوە، سوێند بە خوا جگە لە باشە هیچی ترم لە کەسوکارم نەزانیووە، باسی پیاوێکیش دەکەن کە جگە لە باشە هیچی ترم لێ نەزانیووە، ئەو پیاوە هەرگیز نەچۆتەوە لای خێزانەکانم تەنیا لەگەڵ من نەبێت"**.

سەعدی کوڕی موعاز گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا سوێند بە خوا من پشتیوانیت دەکەم، گەر ئەو پیاوە لە (ئەوس) بێت لە گەردەنی دەدەین، گەر لە برایانمان بێت لە (خەزرەج) چی فەرمانمان پێ بکەی ئەنجامی دەدەین.

خاتوو عائیشە گوتی: سەعدی کوڕی عوبادە کە گەورەی (خەزرەج) بوو، پیاوێکی باش بوو، بەڵام دەماری نەفامی تورەی کرد، هەڵسا و بە سەعدی کوڕی موعازی گوت: سوێند بە خوا درۆت کرد، ناتوانی بیکوژی.. ئینجا ئوسەیدی کوڕی حضیر کە ئامۆزای سەعدی کوڕی موعاز بوو بە سەعدی کوڕی عوبادی گوتی: بەڵکو تۆ درۆت کرد، ئێمە بە دڵنیایی دەیکوژین، تۆش دووڕوویی و موجامەلەی دووڕووەکان دەکەی.

هەردوولا گەرم بوون، خەریکبوو دەست بکەنە شەڕکردن و پێغەمبەری خواش ﷺ هەر لەسەر مینبەر بوو، ئینجا دابەزی و هێوری کردنەوە، ئەوانیش بێ دەنگ بوون و پێغەمبەریش ﷺ بێ دەنگ بوو[1].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دەرماگیری بۆ کەسی خراپ، دەرچوونە لە بازنەی چاکەکاری و باشی.
- کۆتایی هێنان بە ناکۆکی و هێورکردنەوەی کاریگەرییەکانی فیتنە و داخستنی ئەو ڕێگایانەی دەبنە هۆی کێشە نانەوە.
- هەڵبژاردنی کەمترین زیان، ئەویش بە نەهێشتنی زیانە گەورەکە و بەرگەگرتنی ئازار.
- دوورخستنەوەی ئەو کەسەی دژایەتی پێغەمبەر ﷺ دەکات، تەنانەت ئەگەر کەسێکی نزیکیش بێت.
- هەر کەسێك ئازاری پێغەمبەر ﷺ بدات بەزمان یان بەکردار دەکوژرێت، چونکە سەعدی کوڕی موعاز ئەم بڕیارەی داو پێغەمبەریش ﷺ ڕەتی نەکردەوە[2].

دووڕووەکان بەردەوام لە هەوڵی چاندنی دووبەرەکی دابوون لە نێوان کۆمەڵەی موسڵمانان و تێکدانی نێوانیان، هەندێك جار ئەم کارەیان بە ساردکردنەوەی موسڵمانان لە جیهادکردن دەکرد، وەك جەنگی ئوحد، لەو کاتەی سێیەکی سوپاکەیان گەڕاندەوە، هەندێك جاریش بە وروژاندنی دەمارگیری نەفامی هۆزایەتی وەك ئەوەی لە جەنگی (بني المصطلق) کردیان، یاخود بە ناشیرین کردنی ئەهلی باوەڕ و چاکە، وەك ئەم کارەی بەرامبەر دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشەی داوێن پاك ﵂ کرد.

لە هەموو ئەمانەدا پێغەمبەر ﷺ بە حیکمەت و دانایی مامەڵەی لەگەڵ دەکردن، بە ئامانجی هیدایەت وەرگرتنیان و گەڕانەوەیان بۆ حەق، لە زۆریشیان خۆش دەبوو.

---

[1] بوخاری (٢٦٦١) و موسلیم (٢٧٧٠) گێڕاوەتیەوە.

[2] سەیری فتح الباری (٤٨٠/٨) بکە.

**کاتێك پێغەمبەر سوپای ئامادەکرد بۆ غەزای تەبوك و شەڕی ڕۆمەکان، زۆرێك لە دووڕووەکان هاتن و داوایان کرد ڕوخسەتی مانەوەیان پێ بدات:**

ئەم ڕووداوە لە مانگی ڕەجەب لە ساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو، گوزەرانی خەڵك خراپ بوو، وڵات لە قات و قوڕی دابوو، لەو کاتەدا بەروبوم پێ دەگەیشت، خەڵك لە بەر پێگەیشتنی بەروبومیان حەزیان لە شوێنی خۆیان بوو، پێیان ناخۆش بوو لەم حاڵەتەدا دەربچن.

پێغەمبەر ﷺ گەر ویستبای بۆ غەزایەك دەربچێت، ئاماژەی بەکاردەهێنا [1]، تەنیا بۆ غەزای تەبوك نەبێت ئەویش لەبەر دووری شوێنەکە و بارودۆخی سەختی کاتەکە.

زۆرێك لە دووڕووەکان هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و داوایان کرد ڕووخستەیان پێبدات کە دەرنەچن بۆ ئەم غەزایە، بیانووی پڕوپوچیان دەهێنایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ بیانووەکانی قبوڵ کردن و ڕووخسەتی پێدان.

ئەوانەی داوای ڕووخسەتیان کرد، عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول و جەدی کوڕی قەیس بوو.

کۆمەڵێك لە دووڕووەکان بە یەکتریان دەگوت: بەم گەرمایە دەرنەچن... خوای گەورە ریسوای کردن و سەرزەنشتی پێغەمبەری کرد لەسەر ڕووخست پێدانیان.

﴿ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓاْ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُواْ لَا تَنفِرُواْ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُواْ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُواْ قَلِيلًا وَلْيَبْكُواْ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴾ التوبة: ٨١-٨٢

واتای هەردوو ئایەتەکە: ((دوو ڕووەکان) ئەوانەیکە بەجێهێڵران لەناو مەدینەدا شادمان بوون بەدانیشتنیان و دواکەوتنیان لە پێغەمبەر و نەچوونیان بۆ غەزا، حەزیان نەکرد جیهاد و تێکۆشان بە خۆیان و ماڵیان لە پێناوی خوادا بکەن و بە ئیماندارانیان وت: لەم گەرمایەدا دەرمەچن بۆ جیهاد، ئەی محەمەد ﷺ پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەڵا بەتینتر و بەهێزترە لەگەرمیدا ئەگەر تێ بگەن و بیرو هۆشیان بخەنەکار (٨١) جا (وازیان لێ بهێنە) باکەمێك پێبکەنن (لە دنیادا) و دەبێت زۆر بگرین (لە قیامەتدا) لە پاداشتی ئەو کارو کردەوەیەی دەیکەن.

[1] واتە: بۆ نمونە گەر ویستبای بۆ غەزا دەربچێت بەرەو ڕۆژهەڵات، پرسیاری لە بەرەی ڕۆژئاوا دەکرد، خۆی بۆ سەفەرەکە ئامادە دەکرد، کەسێك دیتبای وای دەزانی بەرەو ڕۆژئاوا دەچێت. فتح الباری (٦/١٥٩) بە کورتکراوەیی.

هەروەها پەروەردەگار لەبارەیانەوە دەفەرمویت: ﴿ لَوۡ كَانَ عَرَضٗا قَرِيبٗا وَسَفَرٗا قَاصِدٗا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾ التوبة: ٤٢

واتە: گەر دەرچوونیان بۆ بە دەستهێنانی دەسکەوتێکی دونیایی و دەسکەوتێکی ئاسان بووایە یاخود ﴿وَسَفَرٗا قَاصِدٗا﴾ گەشتێکی نزیك بووایە، ﴿لَّٱتَّبَعُوكَ﴾ شوێنت دەکەوتن بە هۆی ئاسانی گەشتەکە بەڵام ﴿وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُ﴾ ڕێگەی دوور و پڕمەینەت بۆ ئەوان زەحمەتە، گەشتەکەیان لەسەر قورس بووە، بۆیە تەمبەڵیان کرد بەرامبەری.

﴿وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ﴾ واتە: سوێند دەخۆن کە بۆ دواکەوتنیان لە شەڕ بیانوویان هەیە، دەڵێن: ئەگەر بمان توانیبایە لەگەڵ ئێوە دەردەچووین و شەڕمان دەکرد.

﴿يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ﴾ واتە: بە درۆ و دانیشتینان خۆیان لەناو دەبەن، ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ پەروەردگاریش دەزانێت ئەمانە درۆزنن.

**پاشان پەروەردگار لەسەر ئەو پەلەکردنە بۆ وەرگرتنی بیانووەکان، سەرزەنشتی پێغەمبەری ﷺ کرد:**

فەرمووی: ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴾ التوبة: ٤٣

واتە: پەروەردگار لەسەر ئەم کارەی کردت لێت خۆش بوو ﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾ بۆ مۆڵەتت پێدان دوابکەون ﴿حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾ هەتا بەچاکی بۆت دەربکەوێت، کێ ڕاستگۆیە لە داواکردنی ڕوخستەی دواکەوتن، کێش درۆزن و دووڕووە شایەنی ئەو رووخسەتە نییە[1].

کاتێك داوای رووخسەتیان کرد، وازت لێهێنابان، رووخسەتی مانەوەت بە کەسیان نەدابا، تا بۆت روون ببێتەوە کامەیان ڕاستگۆیە لە ملکەچبوونت کامەشیان درۆزنە، چونکە ئەوان سووربوون لەسەر دواکەوتن لەشەڕ تەنانەت گەر تۆ رووخسەتیشت پێنەدابان[2].

---

[1] تفسير السعدي (٣٣٨/١).

[2] تفسير ابن كثير (١٣٩/٤).

**لەو شەڕەدا، ژمارەیەکی کەم لە دووڕووەکان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچوون، ویستیان لە ڕێگەی گەڕانەوە تیرۆری بکەن، بەڵام پەروەردگار ئەوی لە دەستیان پاراست:**

ژمارەی ئەوانەی بۆ شەڕەکە دەرچوون پازدە پیاو دەبوون، لە نێوان یەکتری ڕێککەوتبوون گەر شەو پێغەمبەر ﷺ بە ڕێگای شاخدا هات، لەسەر پشتی سوارەکە هەڵی بدەنە خوارەوە.

ئەبو طفیل دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تبوك گەڕایەوە، فەرمانی بە کەسێك کرد هاوار بکات و بڵێت: پێغەمبەر خوا ﷺ ڕێگەی عەقەبەی[1]ی گرتۆتە بەر، کەس ئەم ڕێگەیە نەگرێتەبەر.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی وڵاخەکە بوو، حوزەیفە لە پێشەوە وڵاخەکەی لێ دەخوڕی، عەماریش لە دواوەی وڵاخەکە بوو، کۆمەڵێکی دەمامکدار لە دواوە هاتن، عەماریان نەدیت کە وڵاخەکەی لە دواوە لێ دەخوڕی، بۆیە عەمار دەستی کرد بە لێدانی دەمامکدارەکان.

پێغەمبەر ﷺ بە حوزەیفەی گوت: **"بوەستە، بوەسە"** تا پێغەمبەر ﷺ دابەزی.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ دابەزی، عەماریش گەڕایەوە.

فەرمووی: **"ئەی عەمار، ئەو خەڵکانەت ناسین؟"**.

گوتی: وڵاخەکانیم ناسین، بەڵام کەسەکانی سەر پشتیان دەمامکدار بوون.

فەرمووی: **"دەتزانی چیان دەویست؟"**.

گوتی: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن.

فەرمووی: **"ویستیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پشتی وڵاخەکە هەڵبدەنە خوارەوە"**.

پێغەمبەری خوا ﷺ بیانووی سێ کەسی لەوان قبوڵ کرد، کە گوتیان: سوێند بە خوا گوێمان لە کەس نەبووە هاواربکات کە بەو ڕێگەیەدا مەچوون، نەشمانزانی ئەو کۆمەڵە چیان دەویست.

عەمار گوتی: شاهێدی دەدەم دوازدە کەسەکەی تر دوژمنی خوا و پێغەمبەرەکەینە لە ژیانی دونیا و لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەش[2].

---

[1] (عقبة) واتە: ڕێگای شاخ و بەردەڵان.

[2] ئەحمەد لە موسندەکەی گێڕاوەتیەوە(٢٣٢٨٠)، قال الهيثمي في (المجمع ٦/١٩٥) "رجاله رجال الصحيح"، وقال الأرناؤوط "إسناده قوي على شرط مسلم"، وأصل هذه القصة في صحيح مسلم (٢٧٧٩) مختصرة.

ئەم ئایەتە لەبارەی ئەو چەند کەسەوە دابەزی ﴿ وَهَمُّواْ بِمَا لَمْ يَنَالُواْ ﴾ التوبة: ٧٤ واتە: خەریکی (پیلان) و نەخشەیەك بوون بەڵام بۆیان نەلواو پێی نەگەیشتن.

**نەوەوەی دەڵێت:** (ئەم عەقەبەیە هەمان ئەو عەقەبەیە ناسراوە نییە کە لە مینایە، ئەو شوێنەی ئەنسارییەکان ﷺ بەیعەتیان دایە پێغەمبەر خوا، بەڵکو ئەم عەقەبەیە کەوتۆتە سەر ڕێگای تەبوك دوورووەکان ڕێککەوتن لەسەر زیان گەیاندن بە پێغەمبەر ﷺ بەڵام پەروەردگار پاراستی)[١].

ابن الاثیر دەڵێت: ( هەندێك کەس کە زانیاریان نییە، وا گومان دەبەن کە کۆمەڵی عەقبەی باسکراو لەو فەرموودەیە هاوەڵانی عەقەبەن ئەوانەی کە لەسەرەتای ئیسلام بەیعەتیان دایە پێغەمبەر ﷺ، حاشا لەوانە.

بەڵکو ئەو گروپە ڕێگریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کاتێك لە غەزای تەبوك گەڕایەوە و بەسەر شاخەکە کەوت، کەسێك هاواری کرد **"کەس بەسەر شاخەکەدا نەچێت، کەس بەسەر شاخەکەدا نەچێت"**، کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووە سەر شاخەکە، گروپە دەمامکدارەکە چوونە سەریان، ویستیان خراپەیەکی بەسەر بێنن، بەڵام پەروەردگار توانای نەدان)[٢].

## پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی لەو تاوانبارە دەمامکدارانە کرد:

حوزەیفە ﷺ دەڵێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لە ئومەتی من[٣]، دوازدە دووڕوو هەن، ناچنە بە هەشت و بۆنیشی ناکەن، تا ئەو کاتە وشتر نەچێت بە کونی دەرزی دا، هەشت لەوانە (الدبیلە) دەرحەقیان دێت، ئاگرێکە لەشانیانەوە دروست دەبێت و لە سینگیان دەردەچێت[٤]"**.

**(فی أصحابی)** واتە خۆیان خزاندۆتە ناو هاوەڵان لە ڕاستیشدا لەوان نین، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ ﴾ التوبة: ١٠١

**(اثنا عشر منافقا)** ئەو دوازدە کەسە بوون کە بە دەمامکداری هاتن بۆ زیان گەیاندن بە پێغەمبەر خوا ﷺ بەڵام خوای پەروەردگار پاراستنی و ناوەکانیشی پێدان[٥].

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٦/١٧).

[٢] جامع الاصول من أحادیث الرسول (٩٣٠٦/١).

[٣] لە گێڕانەوەیەکی تردا: لە هاوەڵانی من.

[٤] موسلیم گێڕاوەتیەوە(٢٧٧٩).

[٥] فیض القدیر (٤٥٤/٤).

(تکفیکهم) واتە: خراپەکەی خۆیان پاڵیان دەنێت.

**(يظهر في اكتافهم)** واتە: دومەڵێکی گەرم لە شانیان دروست دەبێت، شوێنەواری ئەو گەرمییە توندە لە سینگیان دەردەچێت، وەك بڵێسەی ئاگر وایە [١].

واتە: پەروەدگار هەشت لەو دووڕووانە بەم نەخۆشییە لە دونیا لەناو دەبات [٢].

**پێغەمبەر ﷺ ناوی ئەو دوازدە دووڕووەی بە حوزەیفە دا، جگە لە حوزەیفە بە کەسێکی تری نەگوتووە:**

شێخی ئیسلام دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبوك وەك چۆن داوای لە خەڵك کرد، دوای لەوانیش کرد خۆیان بۆ غەزایەکە ئامادە بکەن، هەندێکیان لەگەڵی دەرچوون و هەندێکی تریش بە جێمان.

بەشێك لەوانەی لەگەڵی دەرچوون، پیلانیان گێڕا لە ڕێگادا بیکوژن، ویستیان پەتی پشتێنی وشترەکەی بکەنەوە بۆ ئەوەی بکەوێتە ناو دۆڵەکە، وەحی بۆ هات، ئەویش ناوەکانی بە نهێنی بە حوزەیفە گوت، بۆیە وەك چۆن لە فەرمودەی سەحیحدا هاتووە بە حوزەیفە دەگوترێت خاوەن نهێنی کە جگە لەو کەسی تر نایزانێ [٣].

عوروەی کوڕی زوبێر ﷺ دەڵێت: پێیان گەیشت کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك غەزای تەبوکی کرد، لەسەر پشتی وشترەکە دابەزی وەحی بۆ هات، وشترەکەش یخ بوو، وشترەکە هەڵسا و جڵەوەکەی لە دوای خۆی رادەکێشا، تا حوزەیفەی کوڕی یەمان وشترەکەی بینی، جڵەوەکەی گرت و لێی خوڕی، تا پێغەمبەری خوای ﷺ بینی دانیشتبوو، پاشان وشترەکەی لەلای ئەو یخ کرد، خۆشی لەلای دانیشت، تا ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ هەڵسا، ئەویش بۆلای هات.

فەرمووی: **"ئەمە کێیە؟"**.

گوتی: حوزەیفەی کوڕی یەمان.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"من هەندێك نهێنیت پێ دەڵێتم، تۆ لای کەس باسی نەکەی، من نەهیم کردووە نوێژ لەسەر فلان و فلان بکەم"**، کۆمەڵێك بوون لە دوو ڕووەکان. نەزانراوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ جگە لە حوزەیفە ئەم نهێنیەی لای کەسی تر درکاندبێت.

---

[١] مرقاة المفاتيح (٣٨١٦/٩).

[٢] المفهم (٣٣٤/٧).

[٣] مجموع الفتاوى (٢١١/٧).

کاتێکیش پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد، عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ لەسەردەمی خەلافەتیدا، گەر کەسێك مردبا، وا گومانی دەبرد لەو کۆمەڵەیەن، بۆیە دەستی حوزەیفەی دەگرت بۆ نوێژ کردن لەسەری، گەر حوزەیفە لەگەڵی ڕۆیشتبا نوێژی لەسەر دەکرد، گەر حوزەیفە دەستی لە دەستی راپچرکاندبا و نەچووبا لەگەڵی، عومەریش رەتی دەکردەوە نوێژی لەسەر بکا، عومەر ﷺ فەرمانی دەدا کەسێکی تر نوێژی لەسەر بکا [1].

هەندێك کەس وا گومان دەبات کە پێغەمبەر ﷺ ناوی سەرجەم دوو ڕووەکانی بە حوزەیفە گوتووە، ئەمە راست نییە، چونکە پێغەمبەر ﷺ خۆیشی سەرجەم دووڕووەکانی نەدەناسی، گەر هەندێکیانی بە چاوەکانیان و هەندێکیانی بە نیشانەکانیان دەناسی. بەڵکو پێغەمبەر ﷺ تەنیا ناوی ئەو گروپەی بە حوزیفە داوە کە ویستیان بیکوژن.

پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَمِمَّنْ حَوْلَكُم مِّنَ الْأَعْرَابِ مُنَافِقُونَ ۖ وَمِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ ۖ مَرَدُوا عَلَى النِّفَاقِ لَا تَعْلَمُهُمْ ۖ نَحْنُ نَعْلَمُهُمْ ۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيْنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٍ﴾ التوبة: ١٠١

واتەی ئایەتەکە: ( لەو ناوچانەی دەوروبەرتان هەندێ عەرەبی بیابان نشینی دووڕوو هەن و هەندێ لە دانیشتوانی شار (المدینە) راهاتوون لەسەر دووڕوویی و زرنگن لەو بارەیەوە، تۆ (ئەی پێغەمبەر) نایانناسیت، بەڵکو ئێمە دەیانناسین، لەمەودوا ئەوانە هەر لە دنیادا دووجار ئازاریان دەدەین، پاشان دەبرێنەوە بەرەو سزاو ئازارێکی زۆر سەخت و دژوار).

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەیناسیوون، گەرچی نیشانەکانی بۆ باس کراوە، وەك پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ﴾ محمد: ٣٠

واتەی ئایەتەکە (خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوانەمان پیشان دەدایت، ئەوکاتە بەروالەت دەتناسینەوە، سوێند بەخوا لە شێواز و ناوەرۆکی قسە و گوفتاریاندا دەیانناسیتەوە، خوا خۆیشی ئاگا و زانایە بە کاروکردەوەکانتان).

ئەو تەنیا دەیناسین لە رێگەی بەرجەستەبوونی هەندێك نیشانە و سیفەت کە پێیەوە ناسراو بوون، بەشێکی لەوانە دەناسی کە رۆژانە لەگەڵیان تێکەڵ دەبوو.

---

[1] بیهقی گێراوەتیەوە(السنن الکبری ١٧٢٩٧).

**هەندێك لەو كارانەی دووڕووەكان لەم شەڕەدا كردیان: گاڵتەكردن بوو بە باوەڕداران:**

پێغەمبەر ﷺ زۆر بە توندی بەرامبەر ئەم گاڵتەكردنە وەستایەوە:

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پیاوێك لە غەزای تەبوك لە مەجلیسێكدا گوتی: هەرگیز كەسم وەك ئەو قورئان خوێنانە نەدیووە، تەنیا سكیان بە خواردن پڕ دەكەن، خەریكی درۆكردنن، لە رووبەڕوو بوونەوەی دوژمنیش ترسنۆكن [1]،

پیاوێكیش لەو مەجلیسە گوتی: درۆ دەكەی تۆ كەسێكی دووڕووی، دەبێت ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ بگەیێنم.

ئەم هەواڵەی گەیاندە پێغەمبەر و قورئان دابەزی.

عەبدوڵڵا دەڵێت: من ئەم پیاوەم بینی پەتی سكی وشتری پێغەمبەری خوا ﷺ گرتبوو دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە تەنیا دەمەتەقێ و گەمە و گاڵتەمان دەكرد [2].

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: **"ئایا ئێوە بە خوا و ئایەت و فەرمانەكانی و پێغەمبەرەكەی گاڵتەتان دەكرد؟ [3]"**.

پەروەردگاریش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴾ التوبة: ٦٥-٦٦.

گاڵتەكردن بە دینی خوای گەورە لە نیشانەی دوو ڕووەكانن.

گاڵتەكردن بە خوا و ئایەت و پێغەمبەرەكەی كوفرێكە خاوەنەكەی لە دین دەردەچوێنێت، چونكە ئەسڵ لە دیندا لەسەر بنەمای بە پیرۆزدانانی پەروەردگار و بەگەورەزانینی ئاین و پێغەمبەرەكەی دامەزراوە، هەر گاڵتەكردنێك بەم شتانە پێچەوانە و بەتاڵكردنەوەی ئەم (ئەسڵە)یە).

بۆیە دوای ئەم ڕووداوە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و داوای لێبوردنیان لە قسەكانیان كرد، پێغەمبەری خواش ﷺ بە فەرمایشی پەروەردگار قسەی دەكرد: ﴿قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾ التوبة: ٦٦ : ٦٥ واتەی ئایەتەكە: ئەی

---

[1] ئەم سیفەتانە لە بنەڕەتدا سیفەتی دووڕووەكانن، نەك باوەڕداران. (شرح رياض الصالحين ٢/١٠١) لابن عثيمين.

[2] لە گێرانەوەیەكی تردا دەڵێت: ئەمە تەنیا قسەی ڕێگایە، ماندوێتی ڕێگە لەبیرخۆمان دەبەینەوە.

[3] طبری لە تەفسیرەكەی گێراوەتیەوە(١٦٩١٢)، ئەحمەد شاكر دەڵێت: سەنەدەكەی سەحیحە.

پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرەکەی گاڵتەتان دەکرد؟! (٦٥) پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین (بەهۆی کاری نابەجێیەوە) چونکە بەڕاستی ئەوان تاوانبارو تاوانکار بوون.

لەوانەیە کەسێك بڵێت قسەی ئەم کەسانە بریتی نییە لە گاڵتەکردنی ڕاستەوخۆ بە ئاین، بەڵکو تەنیا گاڵتەکردنە بە کەسەکان.

دەڵێین: ئەمە گاڵتەکردن نییە تەنیا بە کەسەکان، لەبەر خودی کەسەکان یان لەبەر هۆز و قەبیلەیان، بەڵکو گاڵتەکردنەکە لەبەر دینیان بووە، ئەمەش بە بەڵگەی قسەکەیان کە گوتیان: (لە نمونەی ئەو قورئان خوێنانەمان نەدیووە) سورەتی (التوبة) ناونراوە بە ئابڕووبەر، چونکە ئابڕووی دوو ڕووەکانی برد، نهێنیەکانی ئاشکرا کردن، پیلان و ئامانج و قسەکان و ڕێگاکانیان بۆ ڕوخاندنی کۆمەڵگای موسڵمانان بە دیارخست.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: سەبارەت بە سورەتی تەوبە پرسیارم لە ئیبن عەباس کرد:

فەرمووی: (سورەتی تەوبە ئابڕووبەرە، بەردەوام بوو لە دابەزاین بەرامبەریان، تا واگومانیان برد کەسێکیان نەماوە لەم سورەتە باسی نەکرابێت). [1]

## لەو سیاسەتانەی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دووڕووەکان دەیگرتەبەر: ڕوخاندنی شوێنی کۆبوونەوەیان بووە:

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ١٠٧ لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ ﴾ التوبة: ١٠٧ـ١٠٨

﴿وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا﴾: واتە: زیانگەیاندن بە موسڵمان و بە خودی مزگەوتەکەی لێی کۆدەبنەوە.

﴿وَكُفۡرٗا﴾: مەبەستیان کوفرە.

[1] بوخاری گێڕاوەتیەوە(٤٨٨٢).

﴿وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾: واتە: بۆ ئەوەی نێوانی موسڵمانان تێك بدەن و پارچە پارچەیان بکەن.

﴿وَإِرۡصَادٗا﴾ واتە: وەك شوێنی خۆئامەدەکردن

﴿لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ﴾ واتە: یارمەتیدان بۆ ئەوانەی دژایەتی خوا و پێغەمەرەکەی دەکەن، ئەوانەی دژایەتیان لە پێشوتردا دەرکەوتووە، لە نمونەی ئەبو عامیری راهب، ئەو کەسەی چووە لای موشریکەکان بۆ ئەوەی لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ یارمەتیان بدات، کاتێکیش ئەوەی دەیویست لای ئەوان دەستی نەکەوت، چووە لای قەیسەری رۆم بە بڕوای خۆی سەری دەخات، ئەم نەفرەت لێکراوە لە رێگادا مرد، نەگەیشتە ئەو پەیمانەی کە لەگەڵ دووڕووەکان دایبوو.

﴿وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ﴾واتە: سوێندیش دەخۆن مەبەستیان لە بونیاندنانی ئەم مزگەوتە جگە لە یارمەتیدانی کەسانی بێهێز و هەژار نەبێت هیچی تر نەبووە.

﴿وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ﴾ واتە: شاهێدی خوای گەورە لەسەر درۆکردنیان گەورەترە لە سوێند خواردنیان.

﴿لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ﴾ واتە: فەرمان بە پێغەمبەر دەکات، کە هەرگیز نوێژ لەم مزگەوتە نەکا، کە بۆ زیانگەیاندن بە موسڵمانان دروستکراوە، چونکە پەروەردگارت زیاترت پێ دەدات و بۆ ئەو مزگەوتە ناچار نیت.

﴿لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ﴾ واتە: ئەو مزگەوتەی لەسەر بنەمانی دڵسۆزی دینداری بۆ پەروەردگار و ئەنجامدانی پەرستشەکانی بونیادنراوە، کە مزگەوتی قوبایە لەو مزگەوتەدا ئیسلام دەرکەوت.

﴿أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ﴾ واتە: ئەو مزگەوتە پیرۆزترە و شایەنترە کە بەندایەتی پەروەرگادری تێدا ئەنجام بدەنی، چونکە مزگەوتەکە و خەڵکەکەی پیرۆزترن، بۆیە پەروەردگار ستایشی خەڵکەکەی دەکات..

﴿فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ﴾ واتە: ئەو مزگەوتە پیاوانێکی تێدایە کە حەزدەکەن لە گوناه و پیسی پاك ببنەوە.

﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ﴾ واتە: پەروەردگار کەسانی پاکی خۆش دەوێت، پاك و خاوێنی مەعنەوی لە هاوبەشی دانان و رەوشتی خراپ، هەروەها پاکوخاوێنی جەستەیش لە لابردنی پیسی و خەوشی جەستە [1].

## لەم ئایەتانە چەند سودێکی گشتی هەنە:

**لەوانە:** بونیادنانی مزگەوتێك بە ئامانجی زیانگەیاندن بە مزگەوتێکی دیکەی نزیك لەو، گوایە شوێنێکی پیرۆزە، پێویستە مزگەوتە زیانبەخشەکە بڕوخێت.

**لەوانە:** کردەوە گەر چی باشیش بێت، بە نیەت دەگۆردرێت و، دەبێتە پێچەوانە، وەك ئەو کەسانەی مزگەوتیان بە نیەتی زیانگەیاندن دروست کرد.

**لەوانە:** هەر حاڵەتێك ببێتە هۆی دروستبوونی دووبەرەکی لە نێوان موسڵمانان، بە تاوان ئەژمار دەکرێت، پێویستە وازی لێبهێندرێت.

بە پێچەوانەوەش هەر حاڵەتێك ببێتە هۆی یەکگرتنی موسڵمانان و پەیوەست کردنی دڵەکانیان بە یەکتری، پێویستە پەیڕەوی بکرێت و هان بدرێت، چونکە پەروەردگار هۆکاری دروستکردنی ئەو مزگەوتەی روونکردۆتەوە کە مەبەستەکەی دووبەرەکی بووە، بۆیە نەهیکردن لێی واجبە.

**لەوانە:** نەهیکردن لە نوێژکردن لە شوێنی گوناه و تاوان، هەروەها دوورکەوتنەوە لێی.

**لەوانە:** تاوان کاریگەری خراپی لەسەر شوێن هەیە، هەروەك تاوانی دووڕووەکان کاریگەری لە مزگەوتی زیانگەیاندن هەبوو، نەهی کراوە لە نوێژکردن تیایدا، لەبەرامبەردا بەندایەتیکردنیش کاریگەری باشی لەسەر شوێن دەبێت، وەك چۆن کاریگەری لەسەری مزگەوتی قوبا هەبوو. کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ﴾ التوبة ١٠٧.

هەربۆیەش مزگەوتی قوبا خاوەنی فەزڵ و گەورەییەکە، کە مزگەوتی تر نییەتی، پێغەمبەریش ﷺ هەموو رۆژانی شەممە سەردانی قوبای دەکرد و نوێژی تیادا ئەنجامدەدا [2]، هەروەها هانی نوێژکردنیشی تیایدا داوە [3].

**لەو شتانەی باس کران، چوار یاسای گرنگ سوودیان لێ وەردەگیرێت:**

---

[1] تفسیر السعدی (٣٥١/١).

[2] بوخاری (١١٩٢) و أبو داود (١٣٩٩) گێراوەتیانەوە.

[3] ترمذی لە أسیدی کوڕی حضیر، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێراوەتیەوەکە فەرموویەتی: "**نوێژکردن لە مزگەوتی قوباو هاوتای ئەنجامدانی عەمرەیەکە**". ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

**لەوانە:** هەر کارێك یان شوێنێك زیان بە موسڵمانان بگەیەنێت، یاخود تاوانی تێدابێت، چونکە تاوان بەشێکە لە کوفر، یاخود کارەکە ببێتە هۆی جیاکاری لە نێوان باوەڕداران و یارمەتیدان بۆ ئەو کەسانەی دژایەتی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن، ئەم جۆرە شوێنە حەرام کراوە و قەدەغەکراوە.

**لەوانە** : هەرکارێك لە دەرەنجامی سەرپێچیکردنی خوای پەروەدەگار دروست بێت، بەردەوام خاوەنەکەی لە پەروەدگار دووردەخاتەوە وەك ئەوە وایە لەسەر گوناه کردن بەرەوام بێت تا ئەو کاتەی ئەم کارە لادەبات و تۆبەی لیٚ دەکات بە جۆرێك دڵی بپچڕێت لە پەشیمانی و داخ.

**لەوانە:** گەر مزگەوتی قوبا مزگەوتێك بێت لەسەر بنەمانی تەقوا دروستکرابێت، ئەوا مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ کە بە دەستی پیرۆزی دروستکراوە و پەروەدگار هەڵی بژاردووە، بێگومان لە پێشترە.

**لەوانە:** ئەو کارەی بونیاتنراوە لەسەر بنەمانی دڵسۆزی و شوێن کەوتن، ئەو کارەیە کە لەسەر تەقوا دروست کراوە و بکەرەکەی دەگەیەنێتە بەهەشت.

لەبەرامبەریشدا کاری بونیاتنراو لەسەر نیەتی خراپ و بیدعە و گومڕایی، ئەو کارە دامەزراوە لەسەر لێواری کەندەڵانێکی بێهێز و رووخاو لەگەڵ خۆیدا خاوەنەکەی دەخاتە دۆزەخ، پەرورەدگاریش هیدایەتی خەڵکانی ستەمکار نادات [1].

ابن کثیر دەڵێت: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەیە: پیش هاتنی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینە پیاوێك لە خەزرەج هەبوو ناوی ئەبو عامیری راهیب بوو، لەسەردەمی نەفامیدا نەسڕانی بوو، زانستی ئەهلی کیتابی خوێندبوو، جۆرە بەندایەتی کردنێکی لە نەفامیدا هەبوو، خاوەن پێگەیەکی بەرز بوو لەناو هۆزی خەزرەج.

کاتێکیش پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، خەڵکی موسڵمان لیٚ کۆبوونەوە و ئیسلام دەسەڵاتێکی بەهێزی وەرگرت، خوای گەورەش لە جەنگی بەدر سەری خستن، نیەتی خراپ و دژایەتی ئەبو عامیر دەرکەوت، بەرەو کافرانی مەککە هەڵات، لە جەنگی دژی پێغەمبەری خوا یارمەتیدان.

ئەوانەی کۆك بوون لەگەڵی، کۆبوونەوە، لە جەنگی ئوحد هاتن، ئەوەی بۆ موسڵمانان روویدا، پەروەردگار دڵەکانی بۆ تەقوا و خواناسین زاخاودان، سەرەنجامیش هەر بۆ باوەڕدارن بوو.

---

[1] تفسير السعدى (١/٣٥١).

ئەم پیاوە فاسقە چەند چاڵێکی لە نێوان هەردوولا هەڵکەند، پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە یەکێکیان و لەو ڕۆژەدا بریندار بوو، دەموچاوی بریندار بوو، ددانەکانی خوارەوەی شکان و سەری پیرۆزی بریندار بوو ﷺ.

ئەبو عامیر لەسەرەتای شەڕەکەدا هاتە لای هۆزەکەی خۆی لە ئەنسارییەکان، قسەی بۆ کردن، داوای پشتیوانی لێکردن بۆ سەرخستنی.

کاتێك ئەوان نیەتی قسەکانی ئەبو عامریان ناسی گوتیان: ئەی فاسق خوای گەورە هیچ نیعمەتێکت بەسەردا نەبارێنێت، ئەی دوژمنی خوا... ئەنسارییەکان لێیان داو قسەیان پێ گوت. ئەویش هەڵات و گوتی: بەڕاستی قەومەکەم لە دوای من توشی خراپە هاتوون.

پێش هەڵاتنی لە مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگهێشتی کرد بۆ ئیسلام، هەندێك لە قورئانی بەسەردا خوێند، بەڵام ڕەتیکردەوە موسڵمان بێت و یاخی بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای لێکرد کە بە تەنیایی و لە دوورە دەستی بمرێت، ئەم دوعایەش لەسەری قبوڵ بوو.

دوای تەواوبوونی ئوحد، بینی کاروباری پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەبەرزبوونەوە دایە، ئەمجارەیان چووە لای هیرەقلی پادشای ڕۆم بۆ ئەوەی بەسەر پێغەمبەردا سەری بخات، ئەویش بەڵێنی پێداو لەلای نیشتەجێ بوو، ئەبو عامیر نامەیەکی بۆ هەندێك لە قەومەکەی کە دووڕوو بوون نوسی، بەڵێنی و ئومێدی پێدان بەوەی لەگەڵ سوپایەك دەگەڕێتەوەو شەڕ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەکات و بەسەریدا زاڵ دەبێت و دەیگەڕێنێتەوە ئەو شوێنەی کە لێی بووە.

داوای لێکردن شوێنێك بۆ خۆیان دروست بکەن، بۆ ئەوەی ببێتە پەناگە بۆ خۆیان، یان ببێتە کەمینێك بۆ ئەو کاتەی دەگەڕێتەوە.

ئەوانیش دەستیان کرد بە دروستکردنی مزگەوتێك لە نزیك قوباء پێش دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ بەرەو تبوك تەواویان کرد.

هاتن و دوایان لە پێغەمبەر ﷺ کرد بێت و لە مزگەوتەکەیان نوێژ بکات، ئەمەش بۆ ئەوەی نوێژەکەی پێغەمبەر ﷺ بکەنە بەڵگەیەك بۆ بڕواپێکردن و دامەزراندنی، هەروەها باسی ئەوەشیان کرد ئەوان ئەو مزگەوتەیان بۆ یارمەتیدانی هەژاران و خەڵکانی بێ لانە لە شەوانی زستانە دروست کردووە.

خوای گەورە پێغەمبەری لە نوێژکردن تیایدا پاراست، فەرمووی: "**من ئێستا لەسەر سەفەرم، بەڵام کاتێك گەڕامەوە ان شاء الله**".

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە تەبوك بەرەو مەدینە گەڕایەوە، تەنیا ڕۆژێك مابوو بگاتە مەدینە، جوبریل دابەزی و هەواڵی مزگەوتی ضیراری پێ دا، نیەتەی ئەوانیشی بۆ روونکردەوە و ئەو نیەتەی لەسەریان دروستکردووە بۆ کوفر و دووبەرەکی نێوان کۆمەڵی باوەڕداران لە مزگەوتەکەیان مزگەوتی قوباء، کە لەیەکەم ڕۆژدا لەسەر بنەمای تەقوا دروست بووە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەر لە هاتنەوە بۆ مەدینە کەسانێکی نارده سەر ئەو مزگەوتە بۆ ئەوەی بیڕوخێنن، پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ ﴾ [1] التوبة: ١٠٨

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: (دوکەڵم لەسەر مزگەوتی ضیرار بینی کاتێك روخا) [2].

## مردنی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە غەزای تەبوك گەڕایەوە، کوڕی سەلول مرد [3]، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد، بە کراسەکەی خۆشی کفنی کرد، ئەمە سەرباری ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ و باوەڕداران.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کاتێك باوکی مرد، هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، پێی گوت: کراسەکەتم بدێ بۆ ئەوەی کفنی پێ بکەم، نوێژی لەسەر بکە و داوای لێخۆش بوونی بۆ بکە.

پێغەمبەریش ﷺ کراسەکەی خۆی پێدا و فەرمووی: **"کاتێك تەواو بوون، ئاگادارم بکەنەوە"**.

پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لایان، کاتێك عەبدوڵلای کوڕی ئوبەیان خستبۆوە ناو گۆڕەکەی، فەرمانی کرد بیهێننە دەرەوە، لەسەر چۆکەکانی خۆی دانا، لیکی دەمی خۆی تێکەڵی لیکەکەی کرد.

عومەر دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نوێژ لەسەر کوڕی ئوبەی دەکەی، کە ئەو لەو ڕۆژەدا واو وای گوت؟ قسەکانی ئەوم دووبارە کردەوە.

پێغەمبەریش ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: **"لێم دووریکەرەوە ئەی عومەر"**.

---

[1] تفسير ابن كثير (٤/١٨٥).

[2] حاکم گێڕاوەتیەوە(٨٧٦٣)، ذهبي بە سەحیحی داناوە.

[3] هەر لەو کاتەی لە تەبوك دەرچووبوون ئەو مرد، ئەمەش لە مانگی (ذي القعدة)ی ساڵی نۆی کۆچی روویدا.

کاتێك زۆریم لەسەری کرد فەرمووی: **"هەڵبژاردن خرایە بەردەمم، من ئەوەم هەڵبژارد، بزانم ئەگەر زیاتر لە حەفتا جار داوای لێخۆشبوونم بۆ کردبا لێی خۆش دەبوو، زیاترم دەکرد".**

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەرکرد و پاشان ڕۆیشت.

زۆری پێنەچوو تاوەکوو دوو ئایەت لە بابەتی (بێ بەریبوونی خوای گەورە) لە سورەتی التوبة دابەزی: ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴾ التوبة: ٨٤

واتای ئایەتەکە: هیچ کات لەسەر هیچ کەس لەو دووڕووانە نوێژ نەکەی کە مرد، لەسەر گۆڕەکەشی مەوەستە، چونکە بەراستی ئەوانە باوەڕیان بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی نەبوو و مردیشن لەکاتێکدا لە دین دەرچوو بوون.

عومەر دەڵێت: سەرم سوڕما لەو جورئەتەی ئەوکات بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ هەمبوو، خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن [1].

ئیبن حەجەر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بە قسەی عومەری نەکرد و نوێژی لەسەر کرد، ئەمەش بەپێی ڕووە دیارەکەی حوکمی ئیسلام، هەروەها لەبەر ڕێزگرتن بۆ کوڕەکەی و بەرژوەندی ئەوانەی تازە ئیسلام بووبوون، هەروەها لەپێناو وەلانانی خراپەکاری [2].

خطابی دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەم کارەی لەگەڵ کوڕی ئوبەی کرد، بۆ تەواوکردنی سۆزداری بەرامبەر ئەو کەسەی بەسادەیی هاتۆتە ناو دین، هەروەها بۆ دڵنەوایی کردنی عەبدوڵڵای کوڕی کە پیاوێکی باش بوو، بۆ دڵ ڕامکردنی قەومەکەی لە خەزرەج. ئەگەر هاتبا و داوای کوڕەکەی ڕەتکردبایە و نوێژی لەسەر نەکردبایە، بەر لە دابەزینی ئایەتی ڕەتکردنەکەوەکە، ئەوکات دەبووە نەنگی لەسەر کوڕەکەی، هەروەها عەیبێك دەبوو بۆ قەومەکەی، بۆیە باشترین هەڵبژاردنی لە نێوان ئەم دووانەدا هەڵبژارد، تا ئەو کاتەی ڕێگری لێکرا ئەویش وازی لێهێنا [3].

دەگوترێت: بۆیە کراسەکەی خۆی پێدا، وەك پاداشتێك بۆ عەبدوڵڵای دووڕوو، لەبەرامبەر ئەو کارەی کردی، ئەو کاتەی کراسەکەی خۆی کردە بەر ئیمامی عەباس کە لە

---

[1] بوخاری (١٢٦٩) و موسلیم (٢٧٧٤) گێڕاوەتیانەوە.
[2] فتح الباری (٨/٣٣٦).
[3] فتح الباری (٨/٣٣٦).

ڕۆژی بەدر بە دیل گیرابوو، سوفیانی کوڕی عوەیینە دەڵێت: باس لەوە دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ کراسەکەی خۆی بەبەرداکرد وەك پاداشتێك بەرامبەر کارەکەی کردبووی [١].

نەوەوەی ﷺ دەڵێت: لەم فەرمودەیەدا یەکێك لە گەورەترین ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ باس کراوە، بێگومان دووڕووەکەی ناسیووەو لەو ئازارای بە دەستی ئەو بینوییانە، لەبەرامبەردا بە ڕەوشتی جوان مامەڵەی لەگەڵ کردووە، کراسەکەی خۆی بۆ کردە کفن، نوێژیشی لەسەرکرد، داوای لێخۆش بوونی بۆ کرد، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾ القلم: ٤.

شێخی ئیسلامیش دەڵێت: هەر کەسێك ئیسلامبوونی خۆی ئاشکرا بکات، حوکمە ئاشکراکانی ئیسلامی بەسەر جێبەجێ دەبێت، لە حوکمەکانی ژن هێنان و میرات و ئەوانی تر، بەڵام هەر کەسێك دووڕوویی یان بێ باوەڕیی لێ زانرا، ئەو کات دروست نییە بۆ ئەو کەسەی ئەمە بزانێت نوێژی لەسەر بکات، ئەگەر چی مردووەکە بە ئاشکرا ئیسلام بووبێت، چونکە پەروەدگار نەهی کردووە نوێژ لەسەر دووڕووەکان بکرێت، بەڵام هەر کەسێك لەم حاڵەتە دڵنیا نەبێت، دروستە نوێژی لەسەر بکات، ئەگەر بە ئاشکرا ئیسلام بووبێت [٢].

### هەندێك لە دووڕووەکان تۆبەیان کرد، لەوانە: جەلاسی کوڕی سوەید:

ئەو لەو کەسانە بوو کە لە جەنگی تەبوك دواکەوت، خەڵکیشی لە دەرچوون بۆ شەڕ سارد دەکردەوە، عومەیری کوڕی سەعید منداڵێکی بێ باوك بوو، خۆی و دایکی لەلای ئەو بوون، کەفالەتی کردبوون و لەگەڵییان باش بوو.

گوێی لێ بوو دەیگوت: سوێند بەخوا گەر موحەممەد ڕاستگۆ بێت، ئێمە لە گوێدرێژ خراپترین!

عومەیر پێی گوت: ئەی جەلاس، تۆ خۆشەویسترین کەسی لەلام، لە هەموو خەڵك زیاتر چاکەت بەسەرمەوەیە، زۆرم پێ ناخۆشە خراپە و ناخۆشیت بەسەر بێت، سوێند بەخوا قسەیەکت کرد، دوو ڕێگات لەبەردەمە گەر ئاشکرای بکەی ئابورت دەبات، گەر بیشاریتەوە بە هیلاکت دەبات، یەکێکیان سوکترە لەوی تریان!

قسەی جەلاسی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە، ئەویش جەلاسی بانگ کرد، لەبارەی قسەکەی عومەیر پرسیاری لێ کرد، جەلاسیش بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی بە خوا خوارد و گوتی: بەراستی عومەیر درۆی بەدەممەوە کردووە، من ئەم قسەیم نەکردووە.

---

[١] بوخاری (١٣٥٠) گێڕاوەتیەوە.

[٢] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/١٦٧).

عومەیر گووتی: بەڵێ، سوێند بەخوا وات گوت، تۆبە بکە، با خوای پەروەردگار قورئان دانەبەزێنێت و لەگەڵ ئەو قسەی کردووتە من لەگەڵ تۆ دابنێت.

لەم ساتەدا وەحی بۆ پێغەمبەر ﷺ دابەزی، هەموویان بێ دەنگ بوون و کەس نەدەجولا.

هەر خۆشیان بەم شێوەیە بوون کە لەکاتی دابەزینی وەحیدا کەس جوڵەی نەدەکرد.

پاشان وەحی لەسەر لاچوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ﴿ يَحْلِفُونَ بِاللَّهِ مَا قَالُوا وَلَقَدْ قَالُوا كَلِمَةَ الْكُفْرِ وَكَفَرُوا بَعْدَ إِسْلَامِهِمْ وَهَمُّوا بِمَا لَمْ يَنَالُوا ۚ وَمَا نَقَمُوا إِلَّا أَنْ أَغْنَاهُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ مِنْ فَضْلِهِ ۚ فَإِنْ يَتُوبُوا يَكُ خَيْرًا لَهُمْ ۖ وَإِنْ يَتَوَلَّوْا يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِي الْأَرْضِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ التوبة: ٧٤

واتەی ئایەتەکە: (سوێند بەخوا دەخۆن کە قسەیەکی نابەجێیان نەکردووە، کەچی سوێند بەخوا بەراستی ئەوانە درۆ دەکەن، بەڵکو گوفتاری کوفر و بێباوەڕی هات بەدەمیاندا، ئەوانە دوای موسڵمان بوونیان بێ باوەڕ بوونەوە، خەریکی (پیلان)و نەخشەیەك بوون بەڵام بۆیان نەلواو پێی نەگەیشتن، هیچ شتێك ئەوانی تووڕە نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئیماندارانیان دەوڵەمەند و بەهرەوەر کرد لە فەزڵ و زیادە ڕێزی خۆی، جا ئەو دووڕووانە ئەگەر تەوبە بکەن و لە ڕەفتاری نادروستیان پاشگەز ببنەوە ئەوە چاکترە بۆیان، خۆ ئەگەر پشت هەڵکەن، ئەوە بێگومان خوا سزای بە ئازاریان دەدات لە دنیاو قیامەتدا، کەسیش یار و یاوەر و پشتیوانیان نابێت لە زەویدا).

جەلاسی گوتی: بەراستی من وام گوت، وا پەروەردگار تۆبەی بۆ هێنامە پێش، منیش تەوبە دەکەم.

دانی بە گوناهەکەی دانا، تۆبەیەکی باشی کرد، ئەو چاکە و خێرەشی لەگەڵ عومەیر دەکرد وازی لێ نەهێنا.

عوروە دەڵێت: لە دوای ئەم ڕوودلوە عومەیر هەر لە پلەوپایە بەرزیدا مایەوە، تاوەکو وەفاتی کرد[1].

لە مەراسیلی ئیبن سیریندا هاتووە دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی عومەیری گرت و فەرمووی: **"ئەی غولام، گوێیەکانت کاری باشیان کرد، پەروەردگاریش تۆی بەراستگۆ دانا[1]"**.

---

[1] ئەم چیرۆکە ابن جرير الطبري (١٤/٣٦١) گێڕاوەتیەوە، عبدالرزاق لە المصنف (١٨٣٠) لە عوروەی کوڕی زوبێر گێڕاوەتیەوە، ابن عبدالبر دەڵێت: "ئەم چیرۆکە لە تەفسیرەکان باسکراوە"، الاستيعاب (١/٧٩).

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ عومەیری کوڕی سەعیدی کردە والی شاری حیمس، عومەیر لە شام وەفاتی کرد، عومەر دەیفەرموو: "حەزم لێ بوو پیاوێکم وەکو عومەیر هەبووایە، بۆ ئەوەی کاروباری موسڵمانانی پێ بسپێرم[2]".

## پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئازاری دووڕووەکان ئارامی دەگرت:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود دەڵێت: لە ڕۆژی حونەین، پێغەمبەر ﷺ بە دابەشکردنی دەسکەوتی شەڕ، ڕێزی لە هەندێك کەس گرت، سەد وشتری بەخشییە ئەقرەعی کوڕی عابس، هەمان ژمارەیشی بەخشییە عویەینە، لەو ڕۆژەدا ڕێزی لە خەڵکانێکی تری ئەشرەفەکانی عەرەب گرت، لە دەسکەوتەکانی شەڕی پێ بەخشین.

پیاوێك گوتی: سوێند بەخوا ئەم دابەشکردنە دادپەروەرانە نییە و مەبەست لێی ڕەزامەندی خوا نییە.

عەبدوڵڵا دەڵێت: گوتم سوێند بەخوا هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ دەدەم.

چوومە لای و هەواڵم پێیدا.

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر توڕەبوو، ڕەنگی دەم و چاوی سوور هەڵگرا، تا وام لێهات خۆزگە بخوازم ئەم قسەیەم نەکردبایە، فەرمووی: **"گەر خوا و پێغەمبەرەکەی دادپەروەری نەکەن، ئەی کێ دەیکات؟"**.

پاشان فەرمووی: **"خوای گەورە ڕەحم بە موسا بکات، زۆر زیاتر لەمە ئازار درا بەڵام ئارامی گرت[3]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرمودەیە:**

- خۆلادان لە کەسی نەفام، لێخۆشبوون لە کەسی ئازار دەرو، نەجیب زادەکانی پێشو بکرێنە پێشەنگ.
- پێغەمبەر ﷺ بە هەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵ دوو ڕووەکانی تردا کردووە، ئەوانەی ئازاریان داوە، لەوان گوێی لە قسەی ناشیرین و ناخۆش بووە، بەڵام لە پێناو ڕامکردنیان و دڵنەرمکردنیان ئارامی لەسەر گرتوون، ئەمەش نەوەکو خەڵك واباس بکات پێغەمبەر هاوەڵانی خۆی دەکوژێت.

---

[1] عبدالرزاق (١٨٣٠٤) گێڕاوەتیەوە.
[2] أسد الغابة (٨٧٣/١).
[3] بوخاری (٣٤٠٥) و موسلیم (١٠٦٢) گێڕاوەتیانەوە.

• خەڵکی باش ئەو قسانەیان پێ ناخۆشە، کە لەبارەیانەوە دەکرێت و لەوانیش دوورە، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئارامی و نەرموونیانی وەری دەگرن، هەروەك چۆن پێغەمبەر ﷺ ئەم کاری کردووە و موسا ﷺ ی کردۆتە پێشەنگی خۆی .

## ڕێنمویی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر دووڕووەکان زیاتر جەختی لە ئاشکراکردنی سیفەت و کردووەکانی کردووە، نەوەك ناوەکانیان:

وەکو لە پێشووتر باسکرا، ناوی هەندێك لە دووڕووەکان لەلایەن پێغەمبەر ﷺ نەناسراو بوون، بەڵام ئاشکرا نەبوونی ناوەکانیان مانای ئاشکرا نەبوونی نیشانە و سیفەتەکانیان ناگەیێنێت، بەڵکو ئەوان بۆ پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی یان بە ناوەکانیان یان بە سیفەتەکانیان ناسراو بوون.

پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَـٰلَكُمْ﴾ محمد: ٣٠

حافظ ابن کثیر دەڵێت: پەروەردگار دەفەرموێت: ئەگەر بمان ویستبایە ئەی موحەممەد ئەو کەسانەمان پیشان دەدایت، ئەو کات بە چاوەکانی خۆت دەتانیسنەوە، بەڵام پەرورەدگار ئەمەی لەگەڵ تەواوی دووڕووەکان نەکردووە، ئەمەش لە پێناو داپۆشینی دروستکراوەکانی، هەڵگرتنی نهێنییەکان بۆ جیهانی تایبەتی خۆی.

﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ﴾ واتە: لەوەی بەدیار دەکەوێت لە قسەکانیان،کە بەڵگەن لەسەر مەبەستەکانیان، قسەکەر دەناسرێتەوە کە سەر بە کامە کۆمەڵەیە هەر بەمانای قسەکانی، ئەمە مەبەست لە (لحن القول) [١].

## هاوەڵاکان گەر خودی دووڕووەکان نەناسن، بەڵام بە سیفەتەکانیان دەیانناسن:

لەم بارەیەوە قسەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ هەیە،کە باس لە نوێژی بە کۆمەڵ دەکات و دەڵێت: "بەڕاستی ئێمەت دەبینی،کە کەس لە نوێژ دوانەدەکەوت تەنیا کەسی دووڕوو نەبێت، کە دووڕووەکەی ئاشکرا بێت" [٢].

قسەی کەعبی کوڕی مالیك ﷺ،کە باس لە چیرۆکی دواکەوتنی لە جەنگی تەبوك دەکات و دەڵێت: "دوای دەرچوونی پێغەمبەر ﷺ من هاتمە ناو خەڵك، جگە لە کەسانێك

---

[١] تفسیر ابن کثیر (٣٢١/٧).

[٢] موسلیم (٦٥٤) گێراوەتیەوە.

نەبێت،کە نیشانەی دووڕوویيان هەبوو یان کەسانێکی بی هێز،کە خوای گەورە روخسەتی پێدابوون، کەسی ترم نەدەبینی، ئەمە دڵی تەنگ کردم[1]".

ئەمەش ئاشکرایە، کە هاوەڵانیش بە سیفەت و هەڵوێست و (لحن القول) دوو ڕووەکانیان ناسیووە، ئەمەش لە حیکمەتەکانی خوای پەروەردگارە،کە بابەتەکە بەسترابێتەوە بە نیشانەو سیفەتەکان بۆ ئەوەی بڕوادار خۆی لێیان بپارێزێت و لە هەموو کات و شوێنیکیش لێیان بترسێت.

ئەوەی سەرنجی سیفەتی دووڕووەکان بدات لە سورەتەکانی (التوبة، المنافقين، النور، البقرة، النساء و الأحزاب) هەمان ئەو سیفەتانە لە زۆرێك لە نوسەر و ڕۆژنامەنوس و ئەکتەرەکان دەبینی،کە ئێستا بە ئاشکرا قسان دەکەن، لە نوسین و لێداون و کردەوەکانیان هەمان قسەی دوو ڕووەکانی پێشوو دەبینین﴿ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ﴾.

**پێغەمبەر ﷺ سیفەتەکانی باس دەکردن، بۆ ئەوەی خەڵك بیانناسێت و خۆیان لێ بەدووربگرێت:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**هیچ نوێژێك هێندەی نوێژی بەیانی و عیشا لەسەر دووڕووەکان قورس نییە، گەر زانیبایان چ لەو دوو نوێژەدا هەیە بۆ دەیهاتن گەر بە گاگۆڵەش بووایە**[2]".

ئیبن رەجەب دەڵێت: ئەم دوو نوێژە بۆیە قورسترە لەسەر دووڕووەکان لە نوێژەکانی تر، چونکە دووڕووەکان وەك پەروەردگار وەسفی کردوون﴿ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَىٰ يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾النساء: ١٤٢

(يُرآءونَ) المرائي: ئەو کەسەیە ئەگەر خەڵك ببینێت چالاك دەبێت، ئەگەر کەسیش نەی بینێت کارەکەی لەسەر قورس دەبێت.

پێغەمبەر ﷺ ئەم دوو نوێژەی لە تاریکیدا دەکرد، زۆربەی جار بەیانیانی لە کۆتایی تاریکیی شەو دەکرد و عیشاشی دوادەخست، ئەو کات لەمزگەوت هیچ چرایەك نەبوو، تەنیا ئەوانەی بڕواداربوون بە ئامانجی پاداشت بەشداری نوێژەکەیان دەکرد، دووڕووەکان نەدەچوون، وایان دەزانی ئەم کارە لەلای پێغەمبەر ئاشکرا نابێت[3].

---

[1] بوخاری (٤٤١٨) و موسلیم (٢٧٦٩) گێراوەتیانەوە.
[2] بوخاری (٦٥٧) و موسلیم (٦٥١) گێراوەتیانەوە.
[3] فتح الباری ابن رجب (٢٣/٥).

## لە سیفەتەکانیان: دواخستنی نوێژ بۆ دواین کاتەکانی

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: **"ئەمە نوێژی دووڕووە، دادەنیشێت چاودێری خۆر دەکات تا ئەو کاتەی دەگاتە نێوان دوو قۆچی شەیتان، ئینجا هەڵدەستێت چوار دەنووك لەزەوی دەدات، زۆر بەکەمی نەبێت هیچ یادی خوا ناکات"**[1].

"نێوان دوو قۆچی شەیتان"، دەگوترێت: مەبەست لێی حەقیقەت و رواڵەتی بێژەکەیە،مەبەست لێی شەیتانە لە کاتی خۆر ئاوابوون و هەڵهاتنی بە دووقۆچەکانی دێتە بەرامبەری، چونکە کافرەکان ئەو کات سوژدەی بۆ دەبەن، ئەویش قۆچەکانی دەخاتە نێوانی، بۆ ئەوەی ئەوانەی سوژدەی بۆ دەبەن، لەوێنەی سوژدە دابن بۆ ئەو، ئەمەش وادێنێتە ئەندێشەی خۆیو داردەستەکەی ئەوان سوژدە بۆ ئەو دەبەن.

هەروەها دەگوترێت، ئەمە بەمەجازی گوتراوە، مەبەست لە قۆچەکانی، بەرزی و دەسەڵاتی و دەست بەسەراگرتنی خۆی و یارمەتی دەرانیەتی، واتا دواخستنی بە هۆی جوانکردنی شەیتان بووە، وەك چۆن خاوەن قۆچ پاڵ بە شتێکەوە دەنێت، ئەویش بە هەمان شت پاڵ بە نوێژەکەوە دەنێت، بۆچوونی یەکەم دروستترە[2].

## لە سیفەتەکانیان: درۆکردن و پەیمان شکاندن و ناپاکی کردن:

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **"نیشانەی دووڕوویی سێ شتن: ئەگەر قسە بکا درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنی شتێکیدا دەیشکێنێت، ئەگەر سپاردەیەکی لەلا بێت ناپاکی تێدا دەکات"**[3].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: **"چوار سیفەت هەن، هەر کەسێکی تیایدا هەبێت ئەوە دووڕووە یان نیشانەی دووڕوویی تێدایە تا وازیان لێ نەهێنێت: ئەگەر قسە بکات درۆ دەکات، ئەگەر بەڵێنی دا دەیشکێنێت، ئەگەر پەیمانیدا ناپاکی تێدا دەکات، ئەگەر ناکۆکییەك بکات لە سنور لادەدات"**[4].

---

[1] بوخاری (٣٣) و موسلیم (٥٩) گێراوەتیانەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٤/٥).
[3] بوخاری (٣٣) و موسلیم (٥٩) گێراوەتیانەوە.
[4] بوخاری (٢٤٥٩) و موسلیم (٦٨) گێراوەتیانەوە.

**لە سیفەتەکانیان: لە هیچ کامیاندا جوانی چاکەکاری و تێگەیشتن لە دین کۆنابێتەوە:**

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی "**دوو نیشانە هەن،کە لە دووڕوودا کۆنابنەوە: نە جوانی چاکەکاری و نە تێگەیشتن لە دین**"[1].

**جوانی چاکەکاری**: واتە: گەڕان بەدوای ڕێگای باش، خۆ جوانکردن بە بەرگی سالحان، لەگەڵ خۆپاککردنەوە لە عەیبی دیار و نادیار.

**تێگەیشتن لە دین**: دروستی تێگەیشتن لە دین کە ترس و تەقوای لێ بەدی دێت، بەڵام ئەوەی چەند لایەنێك بخوێنێت تەنیا بۆ ئەوەی خۆی پێ گەورە بکات و نانی پێ بخوات، ئەو کەسە ناگاتە پلەو پایەی گەورەیی، چونکە تێگەیشتنەکەی لە زمان نەپەڕیوەتەوە ناو دڵ[2].

**لە سیفەتەکانیان: دوودڵی و شوێنکەوتنی ناشیرن**

ئیبن عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "**نمونەی دووڕوو وەکو نمونەی مەڕێکی سەرلێشواو (عائرة) وایە لە نێوان دوو مێگەل، جارێکیان دەچێتە لای ئەو، جارێکیش دەچێتە لای ئەم**"[3].

سندی دەڵێت: (**العائرە**): واتە دوودڵ لە نێوان دوو مێگەل، بەدوای بەران دادەگەڕێت، لەگەڵ هیچ کامیشیان ئۆقرە ناگرێت.دووڕوو بە ڕووە ئاشکراکەی لەگەڵ باوەڕدارن دایە، بە ڕووە نادیارەکەش لەگەڵ موشریکەکان دایە، بۆیە وەك ئەم مەڕەی لێهاتووە، هەروەها بەڵگەشە لەسەر لێسەندنەوەی سیفەتی پیاوەتی لە کەسی دووڕوو.

سیفەتە ناشرینەکانی دووڕوو زۆرن، سورەتی (التوبة) پڕیەتی لە ئابوڕووبردنیان و باسکردنی سیفەتەکانیان، کە پەروەدگار بۆ باوەڕدارانی ئاشکرا کردووە لە پێناو خۆپاراستنیان.

**پێغەمبەر ﷺ لە ئازاردانی باوەڕداران و عەیبدارکردنیان هۆشداری پێ دەدان:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ چووە سەر مینبەر، بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد و فەرمووی: "**ئەی ئەو کۆمەڵەی بە زمان باوەڕتان هێناوە،باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتان، موسڵمانان ئازار مەدەن، عەیبدارایان مەکەن، بە دوای کەم و کوڕییان**

---

[1] ترمذي (٢٦٨٤) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٣٢٢٩) بە سەحیحی داناوە.
[2] تحفة الأحوذي (٣٧٨/٧).
[3] موسلیم (٢٧٨٤) گێراوەتیەوە.

**مەکەون، چونکە هەر کەسێك بە دوای کەم و کوڕی برا موسڵمانی بکەوێت، خوای گەورە ئابڕوی دەبات ئەگەر لەناو ماڵی خۆشی دابێت[1]".**

واتە ئەگەر لەناو ماڵی خۆیدا بێت و خۆی لە خەڵك حەشار دابێت، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ النور: ١٩

واتەی ئایەتەکە: (بەڕاستی ئەوانەی حەز دەکەن زینا و تاوان لەناو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بڵاوبێتەوە، سزای پڕ ئێش و ئازار لەم جیهان و لەو جیهان بۆیان ئامادەیە و خوا خۆی چاك دەزانێت ئێوە نایزان).

## لە نمونەی ئازادارانیان بۆ هاوەڵان:

ئەبو مەسعودی بەدری دەڵێت: ئێمە ژیانمان لەسەر بەخشین بوو، هەر لەو بەخشینەش ئێمە دەمان بەخشی.

دەڵێت: ئەبو عەقیل نیو جامی بەخشی، پیاوێکی تر هات لەو زیاتری بەخشی.

دووڕووەکان گوتیان: خوای گەورە دەوڵەمەندترە لەو جۆرە بەخشینانە، ئەوەی دواین کەسیش تەنیا بۆ ریایی ئەمەی کردووە، راستەوخۆ ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ التوبة: ٧٩

واتەی ئایەتەکە: (ئەو بێ باوەڕانەی کە پلار دەگرنە ئەو ئیماندارانەی کە زیادە بەخشن لە خێر کردندا بەویستی خۆیان لە رێگەی خوادا و پلاریش لە ئیماندارانی هەژار دەگرن کە بێجگە لە رەنجی شانی خۆیان هیچی تریان دەست ناکەوێت، ئینجا هەر گاڵتەشیان پێدەکەن، ئەوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێت و ریسوایان دەکات، بەهۆی ئەو گاڵتە کردنەیانەوە و سزای بە ئێش و ئازاریش بەشیانە).

ئەوان وا قسەیان کرد کە ئەو کەسەی کەمی بەخشی، ئەوا پەروەردگار دەوڵەمەندە و پێویستی پێی نییە، لەبارەی ئەو کەسەشی کە زۆری بەخشی گوتیان ریابازە.

بەم جۆرە دووڕووەکان نەریتیان تۆمەتبارکرنی باوەڕدارانە بە ساختەیی و بوختان کرد، بەردەوام گومانیان هەیە، تانە و تەشەر دەدەن لە نیەتی هەموو ئەوانەی هەڵدەستن

[1] ترمذي (٢٠٣٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٧٩٨٥) بە سەحیحی داناوە.

بەکارێکی باش، تۆمەتباریان دەکەن کە گوایا نیـەتی تریـان لەپشـت ئـەم کـارەوە هەیـە، هەروەکو ئێستا دەبینین لە زۆرێك لە رۆژنامەکان تانە و تەشـەر لـەو کەسـانە دەدەن، کـە کاری باشە دەکەن، چونکە دووڕووەکان نە کاری باشیان خۆش دەوێت، نەئەو کەسەشیان خۆش دەوێت، کە بـە کـاری باشـە هەڵدەستێت، بۆیـە بـەردەوام گومانیـان لـە کەسـەکان هەیە، جا ئەگەر ئەم کارە لە مزگەوت بێت یان لە قوتابخانە یان لە دەزگایەکی حکومی.

**لەوانەشە پێغەمبەر ﷺ هەندێکیانی ریسواکردبێت و ئاشکرای کردبن، لە پێناو خۆپاراستن لێیان:**

عائشە ﵂ دەڵێت: رۆژێکیـان پێغەمبـەر ﷺ هاتـەلام و فـەرمووی: **"ئـەی عائیشـە مـن واگومان نابەم کە فلان و فلان هیچ لە دین بزانن"**.

لەیسی کوڕی سەعد دەڵێت: ئەوان دوو کەس بوون لە دووڕووەکان [1].

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﵁ دەگێڕێتەوە،کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە سـەفەرێك گەڕایـەوە، لـە کاتی نزیکبوونەوەی لە مەدینە بایەکی توند هەڵیکرد خەریك بوو لەبەر تووندی خەڵکەکەی لولبدا، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەم بایە بۆ مردنی دووڕوویەك هەڵیکرد** [2]**"**.

کاتێك گەیشتینەوە مەدینە، دووڕوویەکی گەورە لە دووڕووەکان مردبوو [3].

لەو رۆژەدا زەیدی کـوڕی رەفاعـە مرد،کـە لـە دووڕووەکـانی یـەهود بـوو، هـەروەها لـە گەورە پیاوانی (بنی قینقاع) بوو کە بە ئاشکرا موسڵمان ببوو.

سەلەمەی کوڕی ئـەکوەع دەڵێـت: لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـەردانی نەخۆشـێکی تادارمان کرد، دەستم لەسەری دانا، گوتم: سوێند بەخوا کەسم وەکو ئـەو پیـاوە نـەدیووە هێندە گەرم بێت.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"پێتان بڵێم کێ لەمانە گـەرمترە لـە رۆژی دوایـی ؟ ئـەم دوو پیاوە سوارەی رۆیشتن"**. دوو پیاو بوون لە هاوەڵانی [4].

نەوەوی دەڵێت: (بۆیە پێیانی گوتووە هاوەڵ، لەبـەر ئاشـکراکردنی موسـڵمانبوونیان و هاوەڵایەتیان، نەوەك فەزڵ و گەورەیی هاوەڵایەتی ئەوان بگرێتەوە) [5].

---

[1] بوخاری (٦٠٦٨) گێراوەتیەوە.
[2] واتە: وەك سزایەك بۆیو، نیشانەیەك بۆ مردنی و، حەسانەوەی وڵات و خەڵك بەمردنی.
[3] موسلیم (٢٧٨٢) گێراوەتیەوە.
[4] موسلیم (٢٧٨٣) گێراوەتیەوە.
[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٧/١٢٨).

هەر لەوانە، ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: چووینە خەیبەر، پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی لەوانەی لەگەڵی بوون فەرمووی، کە بانگەشەی ئیسلامبوونی دەکرد، فەرمووی: **"ئەمە لە ئەهلی ئاگرە"**.

کاتێك شەڕ روویدا، ئەم پیاوە شەڕێکی قورسی کرد، تا برینەکانەکانی زۆر بوون.

گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو کەسەی پێت گوت کە ئەهلی ئاگرە، ئەمڕۆ شەڕێکی زۆر سەختی کرد، مردیش.

فەرمووی ﷺ **"بۆ ئاگرە"**.

دەڵێت: خەریك بوو هەندێك خەڵك گومانی بۆ دروست دەبوو، هەر لەو بەینەدا، گوترا ئەم پیاوە نەمردووە، بەڵام برینی قورسی هەیە.

تا ئەو کاتەی شەو هات، ئارامی لەسەر برینەکانی نەگرت، تاوەکو خۆی کوشت.

هەواڵەکە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت و فەرمووی: **"الله أکبر، شاهێدی دەدەم کە من بەندە و نێردراوی پەروەردگارم"**.

پاشان فەرمانی بە بیلال کرد کە بە خەڵك بڵێت **"جگە لە موسڵمان کەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە، پەروەردگار پاڵپشتی ئەم دینە دەکات بە پیاوی خراپەکار[1]"**.

**بە ئاشکرا قسەی لەگەڵ هەندێکیان کردووە و نیشانەی دووڕوویی و فێڵبازییەکەی پێ گوتوون:**

ئیبن عەباس ﷺ دەڵێت: رۆژێکیان پێغەمبەر لە سێبەری ماڵەکەی دانیشتبوو، کە خەریك بوو سێبەرەکە بچووك دەبوویەوە.

بە هاوەڵانی فەرموو: **"پیاوێك دێتە لاتان بە چاوی شەیتان سەیرتان دەکات، گەر بینیتان قسەی لەگەڵ مەکەن"**.

پیاوی چاو شین هات.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەوی بینی بانگی کرد و پێی فەرموو: **"لەسەر چی تۆ و هاوڕێکانت قسە بەمن دەڵێن؟"**.

گوتی: ئەگەر دەتەوێت بانگیان دەکەم.

دەڵێت: رۆیشت، ئەوانی هێنا، دەستیان بە سوێند خواردن کرد کە ئەوان قسەیان نەکردووە، پەروەردگار ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ أَلَآ إِنَّهُمْ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴾ المجادلة: ١٨.[1]

---

[1] بوخاری (٤٢٠٤) و موسلیم (١١١) گێراوەتیانەوە.

واتای ئایەتەکە: ( لەو رۆژەدا کە خوا هەموویان زیندوو دەکاتەوە، دەست دەکەنەوە بە سوێند خواردن هەروەك بۆ ئێوە سوێندیان دەخوارد، لە کاتێکدا وادەزانن کە رزگاریان دەبێت و شتێکیان دەست دەکەوێت! ! ئاگاداربن کە بەراستی هەر ئەوان درۆزنن).

**پێغەمبەر ﷺ رێگری لە هاوەڵانی دەگرت کە رێز لە دووڕووەکان بگرن و بەگەورەیان بزانن:**

عەبدوڵڵای کوڕی بەریدە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"هەرگیز بە دووڕوو مەڵێ گەورە، گەر گەورەبێت، ئەوا ئێوە خوای گەورەتان ﷻ تووڕە کردووە"**[٢].

واتە: ئێوە بۆیە پەروەردگار تووڕە دەکەن، چونکە کەسێك بە گەورە و پیرۆز دادەنێن کە شایەنی ئەو گەورەو پیرۆزەییە نییە.

یان دەگوترێ واتای ئەوەیە گەر گەورەی ئێوە بێت، ئەوا پێویستە ملکەچی بن، گەر ملکەچیشی بن ئەو کات پەروەردگارتان تووڕە دەکەن[٣].

ئیبن الاثیر دەڵێت: (بە کەسی دووڕوو مەڵێن گەورە، گەر گەورەی ئێوە بێت کە دووڕووە، ئەوە حاڵتان لەخوار حاڵی ئەو دەبێت، پەروەردەگاریش رازی نابێت ئەمە بۆ ئێوە بێت)[٤].

**بەرپرسیارییەتی بە هیچ کامێکیان نەدەدا:**

پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ دووڕووەکان ژیاوە وەك چۆن لەگەڵ تەواوی موسڵمانەکان ژیاوە، بەڵام بۆ مەبەستی پێسباردنی بەرژوەندی گشتی لە هیچ کامێکیان دڵنیا نەبووە، نە کاری کۆکردنەوەی پارە، نە پێدانی بەرپرسیارەتی شەڕ یان بەرپرسیاریەتی دادوەری نێوان خەڵکی، یان پێش نوێژی یان هەر پۆستێکی تری پێ نەسپاردوون.

هۆکاری ئەمەش ئەوە بووە، کە ئەوان بێ باوەڕبوون بەرامبەر پەروەردگار و پێغەمبەرەکەی، دژایەتی ئەوان و باوەڕدارانیان دەکرد، جگە لەمەش لە دەستدانی دەستپاکی،کە گەورەترین بنەمای وەرگرتنی دەسەڵاتی موسڵمانانە.

---

[١] ئەحمەد (٣٢٦٧) گێراوەتیەوە، ابن کثیر لە تەفسیرەکەی (٥٣/٨) دەڵێت "سەنەدەکەی باشە"، شێخ ئەحمەد شاکر سەنەدەکەی بەسەحیح داناوە.

[٢] ئەبو داود (٤٩٧٧) گێراوەتیەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[٣] عون المعبود (٣٠٠٩/٧).

[٤] النهایة (٤١٨/٢).

## دووڕووەکانی ئەمڕۆ خراپترن و گەندەڵترن:

ئەبو وائیل لە حوزەیفەی یەمان دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: **"دوو ڕووەکانی ئەمڕۆ لەوانەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خراپترن، ئەوان پێشتر دەیانشاردەوە، بەڵام ئەوانەی ئەمڕۆ ئاشکرای دەکەن"**[(١)].

ابن بطال دەڵێت: بۆیە خراپترن، چونکە ئەوانەی پێشتوو قسەکانیان دەشاردەوەو، خراپەیان نەدەگەیشتە کەسی بەرامبەر[(٢)].

ابن التین دەڵێت: مەبەستی ئەوەیە، کە ئەوانە خراپییان ئاشکرا دەکەن، ئەوانەی پێشوو نەیاندەکرد، تەنیا ئەوەنەبێت کە کوفری خۆیان ئاشکرا نەکردووە، بەڵکو پیسییەکە لە دەمیان دێتەدەرەوە و بەخۆشیان دەزانن[(٣)].

ابن حجر بەڵگە لەسەر قسەی ابن بطال دێنێتەوە[(٤)]، کە لە بەزارەوە لە ڕێگەی عاصمی کوڕی ئوبەی دەگێڕێتەوە و دەڵێت:بە حوزەیفەم گوتم: ئایا دووڕووی ئەمڕۆ خراپترە لەوەی لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ هەبووە؟

دەڵێت: دەستێکیٚ لە نێوچاوانی خۆی داو گوتی: ئۆف.. ئەمڕۆ ئاشکرایە، ئەوانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دەیانشاردەوە".

هەرگیز ئومەتی ئیسلام نە لەرابردوو نە لە ئێستا و نە لە داهاتووش بەهیچ شتێك توشی بەلا نەهاتووە هێندەی توشهاتنیان بە دووڕوویی و دووڕووەکان، دووڕووەکان گەورەترین ترسناکی و بەردەوامیترین بەلان لەسەر ئیسلام و موسڵمانان بەبەراورد بە برایانی کافریان.

چونکە ئەوانە لە خۆمانن، بەزمانی خۆمان قسە دەکەن، دروشمەکانمان دەزانن، خۆشیان بە ئیسلام دەردەخەن، خۆیان بە کۆمەڵی ئێمە دەزانن، لەگەڵ ئەمەشدا هەرگیز لە پیلان و فرتوفێڵدا سڵ ناکەن، یارمەتی دوژمنەکانمان دەدەن و زیاتر لە موسڵمانان پشتیوانیان دەکەن، بۆیە خوای پەروەردگار، پێغەمبەر و باوەڕدارانی لە مەترسی و زیانەکانیانی ئاگادار کردۆتەوە، ئەویش بە هۆشیاربوونەوە بەرامبەریان.

بەڵگەش لەسەر ئەمە قسەکردن لەسەر دووڕوو دووڕووەکان لە حەڤدە سورەتی مەدەنیدا لە قورئاندا هاتووە، تا ابن القیم ﷺ دەڵێت: "خەریکە قورئان هەموو لەبارەی ئەوانەوە بێت"[(٥)].

---

(١) بوخاری (٧١١٣) گێراوەتیەوە.

(٢) شەرحی سەحیحی بوخاری (٥٧/١٠) ابن بطال.

(٣) فتح البتاری (٧٤/١٣).

(٤) مسند البزار (٢٩٠٠).

(٥) مدارج السالکین (٣٥٨/١).

پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئوممەتەکەی خۆی ترسی لەوانە هەبوو، لە عومەری کوڕی خەتتابەوە رضي الله عنه پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"مەترسیترین شت کە من لەسەر ئوممەتەکەم لێی دەترسێتم، بوونی هەرچی زانای دووڕوو و زمان لوسە**[1]**"**.

مناوی رحمه الله دەڵێت: "هەر چی زانای دووڕووی زمان لوس"، واتە: کەسێکی زانا بە زانست، قسەزان، بەڵام نەفام بە دڵ و کردار، عەقیدە پڕوپوچ، هەڵخەڵەتێنەری خەڵك بە قاڕاندنی و زمانزانییەکەی و شارەزایی لە قسەکردندا[2].

ابن القيم رحمه الله دەڵێت: بەڵای دووڕووەکان بۆ موسڵمانەکان یەکجار قورسە، چونکە ئەوان بە موسڵمان حیسابن، بەڵام دوژمنی راستەقینەن، دژایەتی خۆیان لە قوڵایی دڵیان دەربێنن، کەسی نەزان وا دەزانێت ئەمە زانست و چاکەیە، لە کاتێکدا لوتکەی نەفامی و گەندەڵییە، ئاخ لەوانە چەند شوێنی ئیسلامیان رووخاندووە؟ چەند قەڵایان لە بنەڕەتەوە هەڵتەکاندووە؟ چەند چرای زانستیان خامۆش کردوە؟ ئێستاشی لەگەڵ بێت ئیسلام و موسڵمانان لە میحنەت و بەڵای ئەوان دان، ئێستاشی لەگەڵ بێت بەردەوام توشی گروپ لە دوای گروپ دەبن، وا نیشان دەدەن کە گوایا چاکسازن، بەڵام (بەڕاستی هەر ئەوانەن تۆوی خراپە دەچێنن، بەڵام هەستی پێناکەن)[3] البقرة: ١٢

---

[1] ئەحمەد (١٤٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ٨٠) بە سەحیحی داناوە.

[2] التيسير بشرح الجامع الصغير (٥٢/١).

[3] مدارج السالكين (٣٣٥٥/١).

## بەشی پێنجەم:

# مامەڵەی پێغەمبەر لەگەڵ چەند چین و توێژێکی گشتی

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئافرەتان

مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئافرەتاندا بە نەرمونیانی و بەزەیی و سۆزەوە ناسراوە، ئەمەش لەبەر ئەو رەوشت بەرزەی و میهرەبانییە بەرامبەر خەڵکی هەیبووە،کە پەروەردگار پێی بەخشیبوو، ئەمەش لەبەر زانینی بە لاوازیان و کەمی بێچارەییان.

### ئامۆژگاری ئۆمەتەکەی دەکات لەگەڵ ئافرەتان باش بن:

عەمری کوڕی ئەحوەص ﷺ دەگێڕێتەوە،کە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری حەجی ماڵئاوایی کردووە، کە سەرەتا سوپاسی خوای کرد و ئامۆژگاری خەڵکی کرد، پاشان فەرمووی: **"ألا واستوصوا بالنِّساء خيراً**[(١)]".

واتە: نەرمونیان بن لەگەڵیان، بە جوانی لەگەڵیان بژین[(٢)].

### پێغەمبەر ﷺ ئافرەتان بە هاوشانی پیاوان ئەژمار دەکات:

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"إنما النِّساءُ شقائقُ الرِّجال**[(٣)]".

واتە: هاوشان و هاوتای پیاوانن لە رەوشت و رەفتاریان، وەك ئەوەی پارچەیەك بن لەوان[(٤)].

ئەوان هاو وێنەو هاوتای پیاوانن، یەکسانن لەگەڵیان لەبەرامبەر ئەو شتانەی پەروەردگار لەسەری واجب کردوون، جگە لەو شتانەی وەحی لەسەریانی سووك کردووە، وەك واجب نەبوونی نوێژی هەینی و جیهادکردن لەسەریان، یان بەزیادکردنی واجبێك وەك حیجاب.

---

(١) ترمذي (١١٦٣) و ابن ماجة (١٨٥١) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٢٠٣٠) بە سەحیحی داناوە.

(٢) فتح الباری (٣٦٨/٦).

(٣) ترمذي (١١٣) و ئەبوداود (٢٣٦) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ١٩٨٣) بە سەحیحی داناوە.

(٤) النهایة (٤٩٢/٢).

**دایکی عەمارەی ئەنساری ﵂ هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: هەر چی دەبینم بۆ پیاوانە، نابینم ئافرەتان بە شتێك باسیان بکرێت.**

**ئەم ئایەتە دابەزی:** ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب: ٣٥ [1]

**خوای پەروەردگار دە پلەی هاوشانی پیاوان بۆ باس کردوون و لەگەڵ پیاوان ستایشی پێ کردوون.**

## وەك پیاوان، بەیعەتی هاتنە ناو ئیسلامی پێدەدان، بەڵام تۆقەی لەگەڵ نەدەکردن:

**خوای پەروەردگا فەرمانی بە بەیعەت پێدان داوە، دەفەرموێت:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ الممتحنة: ١٢

**واتەی ئایەتەکە:** **ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات و پەیمانیان پێدایت کە: هیچ جۆرە هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، ڕۆڵەکانی خۆیان نەکوژن، هیچ جۆرە بوختانێك نەکەن لەنێوان دەست و پێی خۆیاندا و فەرمانبەردارت بن لە هەموو چاکەیەکداو یاخی نەبن لێت، جا ئەوە تۆ پەیمانیان لەگەڵ ببەستە و لە خوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە).**

**سعدی دەڵێت: ئەم مەرجەی لەم ئایەتانەدا باس کراون، پێیان دەگوترێت (بەیعەتدانی ئافرەتان)، ئەوانەی بەیعەتیاندا بە ئەنجامدانی واجباتە هاوبەشەکانی پیاوان و ئافرەتان لە هەموو کاتەکان. بەڵام پیاوان بە گوێرەی حاڵەت و پلەکانیان، واجباتەکان لەسەریان جیاوازە.**

---

[1] ترمذي (٣٢١١)، ئەلبانی لە (صحیح ترمذي ١٩٨٣) بە سەحیحی داناوە.

دایکی عەمارەی ئەنساری ؓ هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: هەر چی دەبینم بۆ پیاوانە، نابینم ئافرەتان بە شتێك باسیان بکرێت.

ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾الأحزاب: ٣٥ (1)

خوای پەروەردگار دە پلەی هاوشانی پیاوان بۆ باس کردوون و لەگەڵ پیاوان ستایشی پێ کردوون.

## وەك پیاوان، بەیعەتی هاتنە ناو ئیسلامی پێدەدان، بەڵام تۆقەی لەگەڵ نەدەکردن:

خوای پەروەردگا فەرمانی بە بەیعەت پێدان داوە، دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ الممتحنة: ١٢

**واتەی ئایەتەکە:** ئەی پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات و پەیمانیان پێدایت کە: هیچ جۆرە هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، زینا نەکەن، ڕۆڵەکانی خۆیان نەکوژن، هیچ جۆرە بوختانێك نەکەن لەنێوان دەست و پێی خۆیاندا و فەرمانبەردارت بن لە هەموو چاکەیەکداو یاخی نەبن لێت، جا ئەوە تۆ پەیمانیان لەگەڵ ببەستە و لە خوا داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە).

سعدی دەڵێت: ئەم مەرجەی لەم ئایەتانەدا باس کراون، پێیان دەگوترێت (بەیعەتدانی ئافرەتان)، ئەوانەی بەیعەتیاندا بە ئەنجامدانی واجباتە هاوبەشەکانی پیاوان و ئافرەتان لە هەموو کاتەکان. بەڵام پیاوان بە گوێرەی حاڵەت و پلەکانیان، واجباتەکان لەسەریان جیاوازە.

---

(1) ترمذي (٣٢١١)، ئەلبانی لە (صحيح ترمذي ١٩٨٣) بە سەحیحی داناوە.

پێغەمبەر ﷺ ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردبا ئەنجامی دەدا، هەر ئافرەتێك هاتبا و پابەندبایە بەم مەرجانە، بەیعەتی پێ دەدان، دڵنەوایی دەکردن، لە پەروەردگار داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکردن لە کەمتەرخەمییەکانیان و لەگەڵ گرۆی باوەڕداران ئەژماری دەکردن.

﴿يُشْرِكْنَ بِٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ واتە: تەنیا خوای گەورە بەپەرستن.

﴿وَلَا يَزْنِينَ﴾ واتە: زینا نەکەن، ئەو دیاردە ئەو کات لە نێو ئافرەتە لەشفرۆشەکان باو بوو.

﴿وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ﴾ واتە: ڕۆڵەکانی خۆیان نەکوژن: وەك پێشوتر ئافرەتانی سەردەمی نەفامی ئەنجامیان دەدا.

﴿وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَٰنٍ يَفْتَرِينَهُۥ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ﴾ البُهتان: بوختان هەڵبەستن بۆ کەسێك، جا ئەو بوختانەی دەیکەن پەیوەندی بە خودی خۆیان یان بە خێزانەکانیان هەبێت، یان بە هەر کەسێکی ترەوە.

﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِى مَعْرُوفٍ﴾ واتە: سەرپێچی هیچ فەرمانێك نەکەن کە تۆ فەرمانیان پێ دەکەی، چونکە فەرمانی تۆ جگە لە کاری چاکە هیچی تر نییە، بۆ نمونە ملکەچ بوونیان لە نەهیکردن لە هاتوهاوارکردن، جل دڕاندن، ڕووشاندنی دەم و چاو، دوعاکردن بە دوعای نەفامی

﴿فَبَايِعْهُنَّ﴾ واتە: ئەگەر پابەندبوون بەسەرجەم مەرجەکان، ئینجا پەیمانیان لەگەڵ ببەستەو لێ وەربگرە.

﴿وَٱسْتَغْفِرْ لَهُنَّ ٱللَّهَ﴾ واتە: داوای لێخۆشبوونیان لە پەروەردگار بۆ بکە لە کەمتەرخەمیان، هەروەها بۆ دڵنەوایی کردنیان.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: خوای پەروەردگار زۆر لێخۆشبووە بۆ سەرپێچی کاران، زۆر چاکەکاریشە بۆ گونهبارانی تۆبەکاران، ڕەحمەتی ئەو هەموو شتێك و سەرجەم دروستکراوانی دەگرێتەوە [1].

ئومیمەی کچی ڕەقیقە ﵂ دەڵێت لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئافرەتانی ئەنسار هاتینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بۆ مەبەستی پەیمان بەستن لەگەڵی.

---

[1] تفسير السعدي (١/٨٥٧).

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتت پێ دەدەین، بەوەی هاوبەشی بۆ خوا پەیدا نەکەین، دزی نەکەین، زینا نەکەین، بوختان نەکەین، لە هیچ فەرمانێکتدا سەرپێچیت نەکەین.

فەرمووی: **"لەوەی لە تواناتاندا هەیە و دەیتوانن"**.

گوتمان: خوا و پێغەمبەرەکەی لە ئێمە زاناترن، دەستت بێنە، تا بەیعەتت پێ بدەین ئەی پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"من تۆقە لەگەڵ ئافرەتدا ناکەم، قسەی من بۆ سەد ئافرەت، هەمان شێوەیە بۆ یەك ئافرەت"**[(١)].

بەیعەتدان، واتە پەیمان بەستن، سوودی یەکجار زۆرە، ئەویش بریتییە لە پابەندبوونی کەسی بەیعەتدار بەو پەیمانەی دەیبەستێت، بەردەوام ئەو پەیمانەی لەبیرە و دەیپارێزێت.

ئەو ئافرەتە باوەڕدارانەی کۆچیان دەکرد بۆلای، تاقی دەکردنەوە:

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: ئەو ئافرەتە باوەڕدارانەی کۆچیان بۆلای پێغەمبەر ﷺ دەکرد، تاقی دەکردنەوە، وەك فەرمایشتی پەروەردگار: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتُ مُهَٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ﴾ الممتحنة: ١٠

واتای ئایەتەکە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆ لاتان تاقیان بکەنەوە و بەوردیی پرسیاریان لێ بکەن سەبارەت بەکۆچ و هۆی هاتنەکەیان).

عائیشە دەڵێت: هەر کەسێك مەرجەکانی لێهاتبایە دی، ئەوا لەو تاقیکردنەوەیە دەردەچوو.

کاتێك ئافرەتان پابەند دەبوون بە پەیمان بەستنەکە، پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموون: **"بڕۆن، ئەوا بەیعەتم لێ وەرگرتن"**.

نا سوێند بەخوا، هەرگیز دەستی پێغەمبەر ﷺ بە دەستی هیچ ئافرەتێك نەکەوتووە، تەنیا بە قسە بەیعەتی لێ وەرگرتوون.

---

(١) النسائي (٤١٨١) و ترمذي (١٥٩٧) و ابن ماجة (٢٨٧٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (السلسة الصحيحة ٥٢٩) بە سەحیحی داناوە.

سوێند بە خوا، پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکی لەگەڵ ئافرەتان نەکردووە تەنیا ئەوەی خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردبوو، کە بە قسە پێ دەفەرموون: **"ئەوا بەیعەتم لێ وەرگرتن**[1]**"**.

واتە: بە قسە ئەمەی لەگەڵ دەکردن، نەوەك بە تۆقە لەگەڵ کردن، وەك چۆن بەیعەتدانی پیاوان وا باو بوو بە تۆقەکردن بێت[2].

## بە نەرموونیانی مامەڵەی لەگەڵ ئافرەتان دەکرد:

لەبەر ئەو بێ هێزیی و ناسکییەی لە ئافرەتاندا هەبوو، مامەڵەی نەرم و بە سۆز و خۆشەویستییەوە لەگەڵ دەکردن، پێی دەگوتن: (القوارير)، واتە: شوشە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە هەندێك سەفەردا گەنجێکی رەشتاڵەی لەگەڵ خۆی دەبرد، ناوی (ئەنجەشە) بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو. وڵاخی ئافرەتەکانی لێ دەخوڕی.

پێغەمبەر ﷺ پێی دەفەرموو: **"ئەی ئەنجەشە، هێواش بە لەگەڵ شوشەکان"**.

ئەبو قەلابە دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ وشەیەکی درکاند، گەر یەکێك لە ئێوە کردبای، عەیبدارتان دەکرد[3].

لە دەقی (موسنەدی ئەحمەد ١٢٣٥٠)دا هاتووە: **"ئەی ئەنجەشە، هاوار بۆ تۆ، نەرمونیان بە لەگەڵ شوشەکان"**. واتە: لەگەڵ ئافرەتان.

پێغەمبەر ﷺ ئافرەتانی بە (قوارير) چواندووە، (قوارير) کۆیە، تاکەکە (قارورە) بە واتای شوشە دێت، بۆیە ئەو ناوەی لێندراوە چونکە خواردنەوە لە ناویدا ئارام دەگرێت.

ئافرتان لە رووی ناسکی و نەرمونیانی و لاوازی جەستەیان بە شووشە دەچن[4].

زانایان لەرووی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەنجەشە **(نەمونیان بە لەگەڵ شوشەکان)** رای جیاوازیان هەیە:

دەگوترێت: ئەنجەشە دەنگێکی خۆشی هەبووە، بەگۆرانی وشترکانی دەهاژوا، هەندێك لە شیعر و سرودی دەگوت، دڵنیا نەبووە لەوەی نەوەك توشی فیتنەیەکیان بکات و ئەم گۆرانی و سەردولکەیە بچێتە دڵەکانیان، بۆیە فەرمانی پێکرد وازی لێبێنێت.

---

[1] بوخاری (٢٧١٣) و موسلیم (١٨٦٦) گێراوەتیانەوە.
[2] فتح الباري (٨/٦٣٦).
[3] بوخاری (٦١٤٩) و موسلیم (٢٣٢٣) گێراوەتیانەوە.
[4] فتح الباري (١٠/٥٤٥).

دەگوترێت: مەبەست لە نەرمونیانیە لە لێخوڕین، چونکە وشتر گەر گوێی لە دەنگی گۆرانی وشترەوان بێت خێرا دەبێت لە ڕۆیشتن، ئەو کات سوارەکان ناڕەحەت دەبن و ماندوویان دەکات، بۆیە نەهی کرد لەم کارە، چونکە ئافرەتان لە کاتی جوڵەی زۆر بێزار دەبن، مەترسی هەیە کە زیانیان بەربکەوێت و بەربببنەوە.

**قرطبي** لە (المفهم) هەر دوو ڕایەکەی بە دروست زانیوە: دەڵێت: (لەبەر کاریگەربوونی خێرایان و خۆنەگرتنیان بە شوشەی چواندوونە، ترسی هەبوو لێیان لەبەر خێرا ڕۆیشتن بکەونە خوارەوە یان لەبەر جوولەی زۆر ئازار بچێژن. یان ترسا لەوەی بەهۆی گوێ لێبوونی سرودەکە توشی فیتنە ببن). [1]

**پێغەمبەر ﷺ بەهۆی ئەو تایبەتمەندییە باشانەی هەیانبووە، ستایشی ئافرەتانی قورەیشی دەکرد:**

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەرەوە ﷺ دەفەرموێت: **"باشترینی ئەو ئافرەتەی سواری وشتر دەبێت، ئافرەتی باشی قورەیشە، بەزەییترینە بۆ منداڵەکەی هەر لە بچوکییەوە، پارێزەری ماڵ و سامانی هاوسەرەکەیەتی"**[2].

ئەوەی وەسفکراوە بە سیفەتی باش، ئافرەتانی قورەیشە نەوەك تەواوی ئافرەتان.

(بە زەییترینە بۆ منداڵەکەی هەر لە بچوکییەوە): واتە: بەزەیی زۆرە، ئەویش ئەو ئافرەتەیە گەر منداڵەکەی بێ باوك بن، لەسەریان دەمێنێتەوە و هاوسەرگیری ناکاتەوە، چونکە گەر هاوسەرگیری کرد ئەوکات ئافرەتێکی بەبەزەیی نییە.

(پارێزەری ماڵ و سامانی هاوسەرەکەیەتی): پارێزەرترینە بۆ ماڵی هاوسەرەکەی و دەستپاکە تیایدا، هەروەها وازهێنان لە بە فیڕۆدان[3].

**مهلب** دەڵێت: (لەم فەرموودەیەدا، پەسەندێتی ئافرەتانی قورەیشی بەسەر ئافرەتانی تری عەرەبدا هەیە، ئەویش لەبەر دوو واتا:

**یەکەمیان:** بەزەییان بەرامبەر منداڵ، بایەخ پێدانی و بەباشی پەروەردەکردنیان.

**دووەمیان:** پاراستنی ماڵ وسامانی هاوسەر[4].

---

[1] فتح الباری (١٠/٥٦٤)، المفهم من تخليص كتاب مسلم (١٩/٤٣).
[2] بوخاری (٥٠٨٢) و موسلیم (٢٥٧٢) گێڕاوەتیانەوە.
[3] فتح الباری (٩/١٢٥).
[4] شەرحی سەحیحی بوخاری (ابن بطال) (٧/٥٤٤).

**بایەخی بەفێرکردنی ئافرەتان دەدا، رۆژێکی بۆ تەرخان دەکردن بۆ ئەوەی فێریان بکات و ئامۆژگاریان بکات:**

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پیاوان هەموو ئامۆژگاری تۆیان برد، رۆژێکمان لەکاتی خۆت بۆ دیاری بکە، دێینە لات و لەو زانستەی پەروەردگار فێری کردووی، فێرمان بکە.

رۆژێکیان کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان، لە زانستی خوای گەورە فێری کردن و ئامۆژگاری کردن.

لەو ئامۆژگاریانەی کردنی فەرمووی "**هەر ئافرەتێك پێش مردنی خۆی، سێ لە منداڵەکانی پێش بکەون بۆ مردنی، تەمەنیان نەگەیشتبێتە گوناهکردن، ئەوا بۆی دەبێتە پەرژینێك بۆ پاراستنی لە ئاگر**"، ئافرەتێك لەوان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر دووان بن؟ بۆ دووجار ئەم قسەیەی دوبارە کردووە.

تا فەرمووی: "**دووان، دووان، دووان**[١]".

لەم فەرموودەیەدا، سووربوونی ئافرەتی هاوەڵان پیشاندەدا، بۆ فێربوونی کاروباری دین، بوخاری لە سەحیحەکەی خۆی بەشێکی ناوناوە "بەشی ئامۆژگاری پێشەوا بۆ ئافرەتان و فێرکردنیان".

"**تەمەنیان نە گەیشتبێتە گوناهکردن**": واتە بەر لەوەی بگەنە تەمەنی خۆناسین بمرن، چونکە گوناه لە دوای تەمەنی خۆناسین دەنوسرێت.

نهێنیەکەش وەکو بڵێی ئەو منداڵانە هێشتا نەگەیشتوونە ئەو تەمەنەی ئەزیەتی دایك و باوکیان بدەن سەرپێچیان بکەن، بۆیە خەم خواردن لێیان زۆرترە [٢].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- سوربوون و ویستی ئافرەتانی هاوەڵان لەسەر فێربوونی کاروباری دین دەردەخات.
- منداڵی موسڵمانان لە بەهەشتە.
- هەر کەسێك دوو منداڵی بمرێت، لە ئاگر دەیپارێزن [٣].
- پێویستە لەسەر کەسی ئامۆژگاریکار رەچاوی باری دەروونی ئامۆژگاری وەرگر بکات، وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کردی، ئەو دەزانێت منداڵ چ پێگەیەکی لە دڵی دایکی هەیە،

---

[١] بوخاری (١٠٢) و موسلیم (٢٦٣٤) گێراوەتیانەوە.
[٢] فتح الباری (١/١٩٦).
[٣] فتح الباری (١/١٩٦).

بۆیە ئەو پاداشتە گەورەیەی پێشاندان کە لە دوای لە دەستدانیان بە دەستی دەهێنن، ئەمەش لە پێناو دڵنەوایی کردنیان.

## پێغەمبەر ﷺ سووربوو لەسەر ئامۆژگاریکردنی ئافرەتان و بەبیرهێنانەوەیان:

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: لە رۆژی جەژن ئامادەی نوێژم بووم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، بەر لەوتاردان نوێژی کرد بەبێ بانگدان و قامەتکردن، پاشان خۆی بە بیلال گرت و هەڵسایە سەر پێ، فەرمانی بە لە خواترسین کرد و هانیدا بۆ گوێڕایەڵی خواو، ئامۆژگاری خەڵکی کردو بەبیری هێنانەوە.

پاشان رۆیشت تا گەیشتە لای ئافرەتان، ئامۆژگاری کردن و پێی فەرموون: "**ببەخشن، چونکە ئێوە زۆرترین سوتەمەنی دۆزەخن**".

ئافرەتێکی رەنگ ئەسمەر لە ناوەڕاستی ئافرەتان دانیشتبوو، هەڵساو و گوتی: بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟

فەرمووی: "**چونکە ئێوە گلەیی و گازەندەتان زۆرە، چاکەی هاوسەرەکانتان لەبەرچاو نییە**"[1].

دەڵێت: ئافرەتان دەستیان بە بەخشین کرد، لە خشڵ و مۆری خۆیان لە گوارە و خەزێم و گوستیلە، دەیانخستە ناو پۆشاکی بیلال[2].

پێغەمبەر ﷺ کاتێك بینی ئافرەتان گوێیان لە وتارەکە نەبووە، چونکە خەڵکەکە زۆر بوون، هەروەها لەبەر ئەوەی رێزی ئافرەتان لە دواوەی ریزی پیاوان بوو، چووە لایان و ئامۆژگاری کردن ئەمەش وەکو ئەنجامدانی ئەرکێك لە مافی پەروەردە و فێرکردنیان.

نەوەوی دەڵێت: (واباشە گەر ئافرەتان گوێیان لێ نەبوو، دوای تەواوبوون بچێتە لایان و ئامۆژگاریان بکات، ئەگەر بێتوو ئەم کارە خراپەکاری بەدوا نێت)[3].

بەڵام ئێستا بە هۆی بوونی بڵندگۆ، پێویست ناکات وتاربێژ بچێتە شوێنی ئافرەتان.

---

[1] واتە: واتە ناشکوری کردن بەرامبەر مافی هاوسەر و چاکەکانیان، چاکەی پیاوەکانیان دەشارنەوە و سکاڵا و گلەییەکانیان ئاشکرا دەکەن، لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: "**گەر چاکەی هەموو دونیا لەگەڵ یەکێکیان بکەی، بەڵام یەك شتی لە تۆ بینی، دەڵێت: هەرگیز خێرم لە تۆ نەدیووە**". بوخاری (٢٩) و موسلیم (٩٠٧) لە عەبدوڵلای کوڕی عەباسەوە.

[2] موسلیم (٨٨٥) گێراوەتیەوە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٧٤/٦).

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- سوننەتە ئامۆژگاری ئافرەتان بکرێت و حوکمە شەرعییەکانیان بۆ روون بکرێتەوە و ئەرکەکانیان بەبیر بهێندرێتەوە.
- **ابن جريج** دەڵێت: بە عطائم گوت: ئایا دروستە بۆ پێشەوا ئێستا دوای تەواوبوون لە وتاردان بێتە لای ئافرەتان و وتاریان بۆ بدا.
- گوتی: ئەمە ئەرکێکە لەسەریان، بۆچی جێبەجێی ناکەن؟ [1].
- ئەم فەرموودەیە نەرمونیانی پێغەمبەری ﷺ تێدایە لە ئامۆژگاریکردنی ئافرەتان، نە تورە بوو نە توندوتیژ بوو.

ئیبن حەجەر دەڵێت: ئەو دەست پێشخەرییەی ئافرەتان کردیان لە بەخشینی خشڵ و مۆری گرانبەها لەلایەن، سەرباری تەنگی باری ئابووری ئەو کات، بەڵگەیە لەسەر پلەو پایە بەرزیان لە دین و سووربوونیان لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ و لێیان رازی بوو [2].

**پیاوێك پارەیەکی کەمی بەخشی، خوای پەروەردگار لێی قەبوڵکرد و بەرەکەتی خستەناو و زۆر زیاتر بوو!**

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"درهەمێك پێش سەد هەزار درهەم کەوت"**.

گوتیان: چۆن؟

فەرمووی: **"پیاوێك تەنیا دوو درهەمی هەبوو، یەکێکیانی بەخشی، پیاوێکی تریش چووە ماڵەوە لە ماڵ و سامانە بەرفراوانەکەی سەد هەزار درهەمی بەخشی"**.

**پێغەمبەر ﷺ هانی ئافرەتانی دەدا لەسەر بەخشین:**

زەینەبی خێزانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەی کۆمەڵی ئافرەتان، ببەخشن، تەنانەت گەر لە خشڵەکانیشتان بێت"**.

دەڵێت: گەڕامەوە لای عەبدوڵلا پێم گوت: تۆ پیاوێکی دەستکورتی، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمانی پێکردین ببەخشین، بچۆ لای، لێی بپرسە، ئەگەر دروست بێت ببەخشمە [3]، تۆ ئەگەر نا دەیبەخشمە کەسێکی تر.

دەڵێت: عەبدوڵلا گوتی: بەڵکو تۆ برۆ لای [4].

---

[1] بوخاری (٩١٦) و موسلیم (٨٨٥) گێراوەتیانەوە.

[2] فتح الباری (٤٩٦/٢).

[3] لە گێڕانەوەی نسائی (٢٥٨٣) دا هاتووە: دەتوانم بەخشینەکەم بدەمە تۆ و برازاکەم کە بێ باوکە.

[4] وەك ئەوەی شەرم بکات پرسیار بکات لەبارەی ئەوەی خێزانەکەی پێی ببەخشێت.

دەڵێت: چووم، ئافرەتێکی ئەنساریم بینی لەلای دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ وەستابوو، داواکارییەکەی هەمان داوکاری من بوو، گوتی: پێغەمبەری خوا گەورەیی و ترسی لەسەر دیار بوو.

دەڵێت: بیلال هاتە دەرەوە بۆ لامان، پێمان گوت: برۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی بڵێ دوو ئافرەت لەبەر دەرگا وەستاون و پرسیارت لێ دەکەن: ئایا دروستە خێر ببەخشنە هاوسەرەکانیان و ببەخشنە بێ باوکان؟ پێی مەڵێ ئێمە کێین؟

دەڵێت: بیلال چووە ژوورەوە پرسیاری لێکرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: **"ئەو دووانە کێنە؟"**.

گوتی: ئافرەتێکی ئەنساری و زەینەبن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "کامە زەینەب؟".

گوتی: خێزانی عەبدوڵلا.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"ئەوان دوو پاداشتیان هەیە، پاداشتی نزیکایەتی، پاداشتی بەخشینەکە"**[1].

**سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- هاندانی تێدایە بۆ بەخشین بە کەسە نزیکەکان.
- هاندانی تێدایە بۆ پەیوەندی خزمایەتی.
- دروستە ئافرەت ماڵی خۆی بە بێ روخسەتی هاوسەرەکەی ببەخشێت.
- ئامۆژگاری ئافرەتان دەکات، هاندانی بەخێوکەر لە کاری باش لە ئافرەتان و پیاوان.
- قسەکردن لەگەڵ ئافرەتی بێگانە لە کاتی دڵنیابوون لە روونەدانی فیتنە.
- ترساندان بە هۆی گرتنی گوناهەکان،ئەوەی پێشبینی دەکرێت بەو هۆیەوە لە سزادان
- فەتوای زانا بە ئامادەبوونی کەسی زاناتر لەو.
- داواکردنی بەرزبوونەوە لەبەرگە گرتنی زانست [2].
- دروستە کەسی پرسیارکەر ناوی خۆی نەڵێت، وەك خێزانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود گوتی: "ناوی ئێمەی پێ مەڵێ".

---

[1] بوخاری (١٤٦٦) و موسلیم (١٠٠٠) گێراوەتیانەوە.
[2] فتح الباری (٣/٣٣٠).

## زۆرترینی ئەوانەی دەیانبەخشی، ئافرەتان بوون:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا لە رۆژانی جەژنی قوربان و جەژنی رەمەزان دەهاتە دەرەوە، دەستی بە نوێژ دەکرد، دوای تەواوبوونی نوێژ و سەلامدانەوەی، هەڵدەستا و دەچووە لای خەڵکەکە کە لە شوێنی نوێژیان دانیشتبوون، هەر کەسێك پێویستییەکی هەبایە بۆ خەڵکەکەی باس دەکرد، یان هەر شتێکی تر هەبایە فەرمانی پێ دەکردن.

دەیفەرموو: "**ببەخشن، ببەخشن، ببەخشن**"، زۆرترینی ئەوانەی دەیانبەخشی ئافرەتان بوون [1].

## هانیدەدان زۆر یادی خوای پەروەردگار بکەن:

خاتوو یەسیرە ﷺ لە ئافرەتانی موهاجیر بوو، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموویین: "**عليكُنّ بالتسبيحِ، والتّهليل، والتّقديس، واعقدنَ بالأنامِلِ، فإنهنّ مسؤولاتٌ مستنطقاتٌ، ولا تغفلنَ فتنسينَ الرحمة**"[2].

واتای فەرموودەکە:

(**عليكن**): واتە پێویستە لەسەرتان

(**بالتسبيح**): گوتنی: سُبحان الله.

(**والتّهليل**): گوتنی: لا إله إلا الله

(**والتقديس**): گوتنی: سُبحان الملك القدوس، یان سبوحٌ قدوس ربُ الملائكه والروح.

(**واعقدنَ بالأنامل**): واتە: ژمارەی تەسبیحاتەکە بە پەنجەکان ئەژمار بکەن، یان بە گرێیەکان یان بەسەرە پەنجەکان.

(**الأنامل**) واتە پەنجەکان، وشەیەکی کۆیە، تاکەکەی (**أُنملة**)یە، واتە یەك پەنجە، ئەو شوێنەیە کە نینۆکی تێدایە [3].

دەکرێ مەبەست لە گرێیەکان، هەر سەرە پەنجەکان بێت، یاخود پەنجەکان بە تەواوی بێت، یان مەبەست لێی گرێی جومگەی پەنجەکانە، واتا پەنجەی گەورە لەسەر جومگەی پەنجەکان دابنێت.

---

[1] بوخاری (٣٠٤) و موسلیم (٨٨٩) گێراوەتیانەوە.

[2] ترمذي (٣٥٨٣) و ئەبوداود (١٥٠٥) و ئەحمەد (٢٦٥٤٩) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٤٠٨٧) بە سەحیحی داناوە

[3] تحفة الاحوذي (٣١/١٠)

یاخود مەبەست لێی داخستنی پەنجە لەگەڵ هەر تەسبیحەیەك پاشان کردنەوەی [١].

کەواتە دوو جۆرە ژماردن هەیە: هەرکەسێك پەنجەی گەورە لەسەر سەرەپەنجەکان دابنێت، هەروەها هەر کەسێکیش سەرەپەنجەکان لەناوەی بەرەی دەست دابنێت، بۆیە بابەتەکە لەم رووەوە فراوانە.

طيبي دەڵێت: (پێغەمبەر ﷺ هانیدەدان بە سەرەپەنجەکانیان ئەو وشانە بژمێرن، ئەمەش بۆ ئەوەی گوناهەکانیان بوەرێت.

(**فإنهنّ مسئولاتٌ**): واتە: رۆژی دوایی پرسیاریان لێ دەکرێت کە چییان بە دەستهێناوە و لە چیدا بەکار هێنراون.

(**مُستنطقاتٌ**): واتە: قسە دەکەن، شاهێدن بۆ خاوەنەکەی یان شاهێدی لەسەری دەدەن، ﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ النور: ٢٤

(**ولا تغفلن**): واتە: بێ ئاگامەبن، واز لەیادی خودا مەهێنن.

(**فتنسينَ الرحمة**): القاری دەڵێت: مەبەست لە لەبیرچوونی رەحمەت لەبیرچوونی هۆکارەکانییەتی، واتە: واز لە یادی خوا مەهێنن، چونکە گەر وازتان لە یادکرن هێنا، ئەو کات لە پاداشتەکەی بێ بەش دەبن، وەك ئەوەی واز لە رەحمەتی خوا بهێنن.

واتە: با لە ئێوە بێ ئاگایی رووندەدات، چونکە ئەو کات لە پەروەدگاریش رەحمەت روونادات [٢].

## ئەو دوعایەی سوودی بۆیان هەبوایە فێری دەکردن:

لەو ئافرەتە گەورانەی ئیسلام کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەروەردەی کردن: ئەسمای کچی عەمیسە رضي الله عنها بەراستی ئەو ئافرەتە کەسایەتییەکی زانستی و بانگخوازی کاریگەر بووە، ئامۆژگاریکاری پیاوان و ئافرەتان بووە، پیاوان بە کۆمەڵ دەچوونە لای بۆ ئەوەی گوێیان لە وتارە کاریگەرەکەی بێت لەمەڕ گەورەیی کۆچکردن بۆ حەبەشە (بەم نزیکانە دێت).

ئەسمای کچی عەمیس رضي الله عنها دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: "**وشەیەکت فێربکەم، لە کاتی ناخۆشیدا یان لەناو ناخۆشیدا بیلێیت: الله الله لا أُشركُ به شيئاً**" [٣].

---

[١] ابن العلان له (الفتحوحات الربانية ٣/٢٥٠).

[٢] تحفة الاحوذي (٣١/١٠)

[٣] ئەبوداود (١٥٢٥) و ابن ماجة (٣٨٨٢) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبی داود ١٣٦٤) بە سەحیحی داناوە.

ئافرەتان زۆرجاران توشی ناخۆشی دەبن، لە کاتی دووگیانی و دانانی سك، یان لە کاتی بوونی هاوسەری خراپ، یان منداڵی خراپ و چەندانی تر.

پێویستە لەسەر ئافرەت پارێزگاری لەم زیکرە گەورەیە بکات، کە خوای پەروەردگار بە هۆیەوە ناخۆشییەکەی لەسەر لادەبات.

لە پێغەمبەرەوە ﷺ جێگیربووە کە لە کاتی بوونی ناخۆشیدا دەیفەرموو: **"لا إله إلا الله العظيمُ الحليم، لا إله إلا الله ربُّ العرشِ العظيم، لا إله إلا الله ربُّ السمواتِ وربُّ الأرض وربُّ العرش الكريم**[1]".

ئەمە فەرموودەیەکی گەورەیە پێویستە گرنگی پێ بدەین و لە کاتی ناخۆشیی و نەهامەتییەکاندا زۆر دووبارەی بکەینەوە.

طبري دەڵێت: پیاوانی سەلەف ئەم دوعایەیان دەکرد و ناویان نابوو دوعای ناخۆشی[2].

## هانیدەدان لە بۆنەکان و کارە خێرەکاندا ئامادەبن:

دایکی عطية رضي الله عنها دەڵێت:پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکردین کە ئافرەتی حەیزدار و کچی گەنج و کچی ماڵەوە لە ڕۆژانی جەژن بچینە دەرەوە، بۆ بەشداربوون لە شادیی و خێر و دوعای کۆمەڵی موسڵمانان، ئافرەتی حەیزداریش نەچێتە مزگەوت.

ئافرەتێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا یەکێك لە ئێمە حیجابی نییە.

فەرمووی: **"با هی خوشکێکی تر لەبەر بکات**[3]".

واتە: لە خوشێکی تر وەربگرێت کە پێویستی پێی نییە[4].

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- سوننەتە ئافرەتان لە جەژنەکان بچنە دەرەوە، جا ئەگەر ئافرەتی گەنج بن یاخود نا.
- لە فەرموودەی دایکی عطية باس لە هۆکاری حوکمی چوونە دەرەوە کراوە، ئەویش بەشداریکردنیانە لە خێر و دوعای موسڵمانان و هیواخواستن بۆ ئەویە بەبەر بەرەکەتی ئەو ڕۆژە پیرۆزە بکەون.
- ئافرەتی حەزیدار نابێت پشت لە یادی خوا بکات، یان پشت لە شوێنی خێر بکات، وەك مەجلیسی عیلم و یادی خوا، تەنیا مزگەوت نەبێت.

---

[1] بوخاری (٦٣٤٦) و موسلیم (٢٧٣٠) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباس گێڕاوەتیانەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٤٧/١٧).
[3] بوخاری (٣٥١) و موسلیم (٨٩٠) گێڕاوەتیانەوە.
[4] فتح الباری (٤٢٤/١).

- وشەی (العواتق) لە فەرموودەکە واتای: کچی گەنج یان سەرەتای تەمەنی گەنجییەتی.
- یان دەگوترێت: ئەو کچەی،کە گەورەش بووە و مێردی نەکردووەو لە دایك و باوکی دوورنەکەوتۆتەوە [١].
- وشەی (ذوات الخدور) (خدر) لایەکی ماڵە پەردەیەکی پێدادەدرێت بۆ ئەوەی ئەو کچەی مێردی نەکردوە لێی دابنیشێت [٢].

## ئافرەتان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشداریان لە نوێژی هەینی دەکرد:

دایکی هیشام، کچی حاریسەی کوڕی نوعمان دەڵێت: **هیچم لە سوڕەتی (ق) لەبەر نەکرد، تەنیا ئەوەی پێغەمبەر ﷺ نەبێت کە هەموو هەینییەك لە وتاریدا دەیفەرموو.**

دەڵێت: تەندوری نانی ئێمە و تەندوری پێغەمبەر ﷺ یەك بوو [٣].

زانایان دەڵێن: هۆکاری هەڵبژاردنی سورەتی (ق) بۆ ئەوەیە، کە باسی مردن و زیندوبوونەوە و ئامۆژگاری بەهێزی تێدایە.

کە دەڵێت: "تەندوری نانی ئێمە و تەندوری پێغەمبەر ﷺ یەك بوو"، ئاماژەیەکە بۆ زانینی حاڵی ماڵی پێغەمبەر بە هۆی نزیکی لە ماڵەوەیان [٤].

## بەشداریان دەکرد لە نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوت:

خاتوو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: (**ئێمەی ئافرەتانی بڕوادار، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەشداری نوێژی بەیانیمان دەکرد، داپۆشراوبووین بە پۆشاك، پاشان دوای تەواوبوونی نوێژ دەگەڕاینەوە ماڵەوە، کەس ئەوانی لە تاریکیدا نەدەناسی** [٥]).

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- ڕێگەپێدراوە ئافرەتان بەشداری نوێژی بە کۆمەڵ لە مزگەوت بکەن لە کاتی شەو و ڕۆژدا، بەڵام نوێژی ڕۆژ لە پێشترە، چونکە شەو زیاتر کاتی گومانە لە ڕۆژ، بەڵام تەنیا ئەگەر دڵنیایی هەبوو لەوەی ترس و فیتنەیان لەسەر نییە.
- سوننەتە نوێژی بەیانی لەسەرەتای کاتیدا، بکرێت [٦].

---

[١] النهاية (٣/١٧٩).
[٢] النهاية (٣/١٣).
[٣] موسلیم (٨٧٣) گێراوەتیەوە.
[٤] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦/١٦١).
[٥] بوخاری (٣٧٢) و موسلیم (٦٤٥) گێراوەتیانەوە.
[٦] فتح الباری (٢/٥٦).

**قەدەغەی دەکرد پیاوەکان ڕێگری لە ئافرەتەکانیان بکەن لە چوونە مزگەوت:**

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەفەرموێت: یەکێك لە خێزانەکانی عومەر بەشداری نوێژی بە کۆمەڵی لە بەیانی و عیشا لە مزگەوت دەکرد.

پێی گوترا: بۆچی دەچیتە دەرەوە، کاتێك دەزانی کە عومەر ئەمەی پێناخۆشە؟

گوتی: ئەی چ شتێك وای لێکردووە ڕێگریم لێ نەکات؟

گوتی: فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت "**ڕێگری هاتنی مزگەوت لە ئافرەتان مەکەن**[1]".

**ڕێگری لێدەکردن لە کاتی چوونەدەرەوە بۆ مزگەوت یان بۆ شوێنی تر، خۆیان بۆنخۆش بکەن:**

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: "**ڕێگری لە هاتنی ئافرەتان بۆ مزگەوت مەکەن، با بێنە دەرەوە بەڵام با بۆن لەخۆیان نەدەن**[2]".

عظیم ئابادی دەڵێت: (فەرمانی ئەوەی پێکردوون کە بۆنیان خۆش نەکەن، وەك لە گێڕانەوەی موسلیم لە زەینەبەوە هاتەوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە، کە نەوەك بەو بۆنە هەستی پیاوان بجوڵێنن.

هەر پەیوەندیدار بە بۆن خۆشی، لە ڕووی واتاییەوە ئەمانە دەگرێتەوە: جوڵاندنی ئارەزوو وەك جلوبەرگی جوان، خۆ جوان کردن بە کاڵای گرانبەها)[3].

زەینەبی خێزانی عەبدوڵلای کوڕی مەسعود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموویین: "**گەر یەکێك لە ئێوە چووە مزگەوت، با بە بۆن خۆشی نەڕوات**[4]".

لە ئەبو هورێرە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**هەر ئافرەتێك خۆی بە بوخور بۆنخۆش بکات، با لەگەڵ ئێمە لە عیشا ئامادە نەبێت**[5]".

لە ئەبو موساوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**هەر ئافرەتێك خۆی بۆنخۆش کردبێت، بەلای خەڵکدا تێپەر ببێت، ئەوا ئەو ئافرەتە ئاواو ئاوایە**[6]".

---

[1] بوخاری (٩٠٠) و موسلیم (٤٤٢) گێراوەتیانەوە.
[2] ئەبو داود (٥٦٥) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٥١٥) بە سەحیحی داناوە.
[3] عون المعبود (١٩٢/٢).
[4] موسلیم (٤٤٣) گێراوەتیەوە.
[5] موسلیم (٤٤٤) گێراوەتیتەوە.
[6] ترمذي (٤١٧٣) و ئەبوداود (٢٧٨٦) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

(چونکە، بەو بۆنە خۆشەیان ئارەزووی پیاوان دەجوڵێنن، وایان لێدەکەن سەیریان بکەن، هەر کەسێکیش سەیری ئافرەت بکات بە چاوەکانی زینای کردووە، ئافرەتەکەش هۆکارە بۆ زینای چاوەکانی بۆیە گوناهبارە). [1]

## لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، نوێژکردنی ئافرەت لەماڵەوەی باشترە:

لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئافرەتان لە مزگەوتەکان قەدەغە مەکەن، ماڵەکانیان بۆ ئەوان باشترە [2]"**.

(باشی نوێژکردنیان لە ماڵ: پاراستنیانە لە فیتنە، ئەم بابەتەش جەختی لەسەر دەکرێتەوە دوای ئەوەی ئافرەتان ڕووتبوونەوەو خۆ جوان کردنیان داهێنا، پاشان ئەوەی خاتوو عائیشە گوتی ئەوا گوتی). [3]

## سەردانی ئافرەتانی دەکرد، حاڵی ئەوانەی دەپرسین کە نەدەهاتنە مەراسیمەکان:

عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ لە حەجکردن گەڕایەوە، بە دایکی سینانی ئەنساڕی فەرموو: **"چی وایکرد لەگەڵ ئێمە حەج نەکەی؟"**.

دایکی سینان گوتی: "دوو وشترمان هەیە، باوکی فلان –واتە هاوسەرەکەی– و کوڕەکەمان لەسەر پشتی یەکێکیان چوون بۆ حەج، ئەوی تریش ماوەتەوە خزمەتکارەکەمان ئاودانی پێ دەکات".

ئینجا پێغەمبەر فەرمووی: **"عەمرەکردنێك لە ڕەمەزان، وەك حەجکردنێك وایە لەگەڵ من [4]"**.

دایکی مەعقەل دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ حاجی ماڵئاوایی کرد، وشترێکمان هەبوو، باوکی مەعقەل لە پێناو خوا بەخشی، توشی ناخۆشی بووین و باوکی مەعقەل مرد.

پێغەمبەر ﷺ دەرچوو، کاتێك تەواوبوو لە حەج، فەرمووی: **"ئەی دایکی مەعقەل، چی وایکرد لەگەڵمان دەرنەچی؟"**.

گوتی: خۆمان ئامادەکردبوو، باوکی مەعقەل مرد، یەك وشترمان هەبوو کە حەجمان پێی دەکرد، باوکی مەعقەل وەسیەتی کرد لە پێناو خوا بیبەخشین.

---

[1] تحفة الاحوذي (٨/٥٨).

[2] ئەبو داود (٥٦٧) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبو داود (٥٧٦) بە بەسەحیحی داناوە.

[3] فتح الباری (٢/٣٤٩)، مەبەستی حافظ لە قسەی عائیشە، ئەوەیە کە عائیشە دەفەرموێت: "ئەگەر پێغەمبەر ﷺ ئەمەی دیتبایە لەوەی ئافرەتان داینهێناوە، ڕێگری لێ دەکردن لەچوونە مزگەوت، وەك چۆن ئافرەتانی بەنی ئیسرائیل قەدەغەکران". بوخاری (٨٦٩) و موسلیم (٤٤٥) گێڕاوەتیانەوە.

[4] بوخاری (١٨٦٣) و موسلیم (١٢٥٦) گێڕاوەتیانەوە.

فەرمووی: **"بریا حەجت پێ بکردبایە، چونکە حەجکردنیش لە پێناوی خوای گەورەیە، بەڵام گەر ئەم حەجەشت لەگەڵ ئێمە لە دەستچوو، لە رەمەزاندا عەمرە بکە، چونکە وەك ئەوە وایە حەجێکت کردبێت** [1]".

(فێری کرد، عەمرەکردنێك لە مانگی رەمەزان هەمان پاداشتی حەجکردنی هەیە، نەك لە رووی لەسەر لاچوونی فەریزەی حەج، چونکە ئیجماعی زانایان لەسەر ئەوەیە عەمرە شوێنی حەجی فەرز ناگرێتەوە) [2].

بۆ نمونە: پیاوێك نەخۆش کەوت، نەزری لە خۆی گرت، گەر خوای گەورە شیفای بدات، خەتمێکی قورئان دەکات، کاتێك خوای گەورە شیفایدا، سێ جار سورەتی (الاخلاص) خوێندەوە، بە پشت بەستن بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا کە دەفەرموێت: **"سێیەکی قورئانە** [3]"، ئایا ئەمە بەسە؟

**وەڵام:** نەخێر بەس نییە، چونکە سورەتی (الاخلاص) سێیەکی قورئانە لە رووی پاداشتەوە، بەڵام شوێنی خوێندنەوەی هەموو قورئان ناگرێتەوە.

فەرمایشتی (**حەجکردنیش لە پێناوی خوای گەورەیە**): ئیمامی ئەحمەد و ئەوانی تر بە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە دروستە پارەی زەکات بدرێتە کەسێك کە پارەی سەفەرەی حەجی فەرزی نەبێت.

**رەچاوی حاڵی ئافرەتانی دەکرد، لە شوێنی نوێژکردن چاوەڕێی دەکرد، تاوەکو ئافرەتان دەچوونە دەرەوە، نەوەك تێکەڵاوی پیاوان بن:**

دایکی سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك سەلامی بدایەوە، ئافرەتان دوای سەلامدانەوەی هەڵدەستان، ئەویش پێش ئەوەی هەڵبستێت لە شوێنی خۆی کەمێك دەمایەوە.

زوهری دەڵێت: سوێند بەخوا وا دەبینم، مانەوەی لە شوێنی خۆی بۆ ئەوە بووە تاوەکو ئافرەتان دەڕۆن، پێش ئەوەی کەسێك بیانبینێت [4].

دایکی سەلەمە، خێزانی پێغەمبەر دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سەلامی دەدایەوە، ئافرەتان دەڕۆیشتن، بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ بڕوا، ئەوان دەگەیشتنەوە ماڵەوە [5].

---

[1] ئەبو داود (١٩٨٩) و ترمزی (٩٣٩) و ابن ماجە (٢٩٩٣) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبی داود (١٧٣٦) بە سەحیحی داناوە.

[2] فتح الباری (٣/٦٠٤).

[3] بوخاری (٦٦٤٣) لە ئەبو سەعید ﵁ گێراوەتیەوە، موسلیم (٨١١) لە ئەبو دەردا ﵁ گێراوەتیەوە.

[4] بوخاری (٨٣٧) گێراوەتیەوە.

[5] بوخاری (٨٥٠) گێراوەتیەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- ئیمام رەچاوی حاڵی نوێژخوێنان بکات.
- خۆپاراستن لەو شتانەی دەبنە هۆی روودانی شتێکی قەدەغەکراو.
- دوورکەوتنەوە لە شوێنی گومان لێکراو.
- ناپەسندی تێکەڵاوبوونی ئافرەتان لەگەڵ پیاوان لە رێگادا، ئەمە چ جای ماڵەکان.
- ئافرەتان لە نوێژی بە کۆمەڵ لەگەڵیدا ئامادە دەبوون [1].

**بۆ ئەوەی تێکەڵاوی پیاوان نەبن، پێغەمبەرﷺ داوای لێدەکردن لە ریزەکانی کۆتایی نوێژ بکەن:**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"باشترین رێزی پیاوان یەکەمینیانە، خراپترینی ریزیان دواهەمینە، باشترین رێزی ئافرەتان دواوەیە، خراپترینی رێزیان یەکەمینیانە [2]"**.

نەوەوی دەڵێت: (مەبەست لە رێزی نوێژی ئافرەتان، ئەوانەن کە لەگەڵ پیاوان نوێژ دەکەن، بەڵام گەر بە جیا نوێژیان کرد، ئەو کات بە هەمان شێوەی پیاوان، باشترین رێزی نوێژ یەکەمە و خراپترین رێزی دواوەیە.

بەڵام بۆیە رێزی نوێژی دواوەی ئافرەتانی بە باش داناوە، نەوەك تێکەڵاوی و دیتن رووبدات، دڵەکانیان بچێتە سەر جوڵەی پیاوەکان و گوێیان لە قسەکانیان بێت، بە پێچەوانەوەشە رێزی یەکەمی ئافرەتانی بە باش دانەناوە [3] )

**بەڵکو پێغەمبەر ﷺ دەرگایەکی تایبەتی بۆ ئافرەتانی لە مزگەوت تەرخان کردبوو:**

نافیع لە کوڕی عومەرەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"با ئەو دەرگایە بۆ ئافرەتان جێبهێڵین"**.

نافیع دەڵێت: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر تاوەکو مرد بەو دەرگایەدا تێپەڕ نەبوو [4].

لەم فەرموودەیدا بەڵگە هەیە ئافرەتان لە مزگەوت لەگەڵ پیاوان تێکەڵ نابن، بەڵکو لەلایەکی مزگەوت دەبن و نوێژ لە دوای ئیمام بە کۆمەڵ دەکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر توندترین کەس بووە لە جێبەجێکردنی سوننەت، هەرگیز بە دەرگای ئافرەتان تێپەڕ نەبوو تاوەکو وەفاتی کرد [5].

---

[1] فتح الباري (٢/٣٣٦).

[2] موسلیم (٤٤٠) گێڕاوەتیەوە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٤/١٥٩).

[4] ئەبوداو (٤٦٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبو داود (٤٨٣) بە سەحیحی داناوە.

[5] عون المعبود (٢/٩٢).

## ڕێگری دەکرد ئافرەتان لە ڕێگادا لەگەڵ پیاوان تێکەڵ بن:

ئەبو ئوسەیدی ئەنساری ﷺ دەڵێت گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لە دەرەوەی مزگەوت، پیاوان لە ڕێگادا تێکەڵی ئافرەتان دەبوون، بە ئافرەتانی فەرموو: **"خۆتان دوابخەن، بۆتان نییە مافی ڕێگا بخۆن، پێویستە لەسەرتان لە لێواری ڕێگاکان بڕۆن"**.

لەدوای ئەمە ئافرەتان بە دیوارەوە دەلکان، تا ئەو رادەیەی لەبەر زۆر نزیکی لە دیوار پۆشاکەکانیان بە دیوارەوە دەنوسا [(١)].

## داوای لە ئافرەتان دەکرد ڕەنگی دەستیان بە خەنە بگۆڕن:

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: ئافرەتێك دەستی بۆ پێغەمبەر ﷺ درێژکرد بۆ ئەوەی نوسراوێکی پێ بدات، پێغەمبەریش دەستی خۆی کێشایەوە، ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ویستم ئەم نوسراوەت پێ بدەم بەڵام وەرت نەگرت؟ فەرمووی: **"من نەمزانی ئەم دەستە هی ئافرەتە یان هی پیاوە؟"**، گوتی: بەڵکو دەستی ئافرەتە، فەرمووی: **"ئەگەر ئافرەت بای، نینۆکەکانت بە خەنە ڕەنگ دەکرد [(٢)]"**.

ابن حجر دەڵێت: "بۆیە فەرمانی خەنەی پێکردووە، بۆ ئەوەی پێستەکەی داپۆشێت، ڕەنگ کردنی دەست بەخەنە سوننەتە بۆ ئافرەتان بۆ جیاکردنەوەی پێستی لەگەڵ پێستی پیاوان [(٣)]".

## پێغەمبەرﷺ کاتێك گوێ لە دەنگی گریانی منداڵ دەبوو، نوێژەکانی کورت دەکردەوە ئەمەش وەك بەزەیی هاتنەوە بەو ئافرەتانەی لەدواوەی نوێژ دەکەن:

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ﷺ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"کاتێك دەچمە ناو نوێژ، دەمەوێ نوێژەکە درێژ بکەمەوە، بەڵام گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت، لەبەر نیگەرانی دایکەکە و سەرقاڵبوونی دڵی بەو منداڵە، نوێژەکە کورت دەکەمەوە [(٤)]"**.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- نەرمونیانی و بەزەیی هاتنەوە بە تەواوی نوێژخوێنان و ڕەچاوکردنی حاڵەتیان، شتێکیان بۆ نەکرێت کە گران بێت لەسەریان.
- دروستە ئافرەتان لەگەڵ پیاوان لە مزگەوتدا نوێژ بکەن.

---

(١) ئەبود داود (٥٢٧٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیح الجامع ٩٢٩) بە سەحیحی داناوە.

(٢) ئەبود داود (٤١٦٦) و النسائی (٥٠٨٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی بە حەسەنی داناوە.

(٣) فیض القدیر (٥/٣٣٠).

(٤) بوخاری (٧٠٩) و موسلیم (٤٦٩) گێراوەتیانەوە.

- دروستە منداڵیش بێتە مزگەوت، بەڵام باشترە مزگەوت بە پاکی رابگرێت بۆ ئەو منداڵانەی لە پیسییان دڵنیا نین [١].

زانایانی لیژنە دەڵێن: (ئەگەر منداڵەکە پیسی و خاوێنی خۆی لێك جیادەکردەوە، دروستە بێتە مزگەوت بە مەبەستی لێراهاتنی لە نوێژکردنی بە کۆمەڵ، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە، کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"لە تەمەنی حەوت ساڵی فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن نوێژبکەن، لە تەمەنی دە ساڵیدا لێیان بدەن و جێگای نوستنیان جیابکەنەوە [٢]"**.

بەڵام ئەگەر منداڵەکە پیسی و خاوێنی خۆی لێك جیا نەدەکردەوە، باشترە نەیەتە مزگەوت، چونکە نازانی نوێژ و جەماعەت چییە، لەوانەشە ببێتە هۆی ئازاردانی نوێژخوێنان). [٣]

**لە بەزەییهاتنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئافرەتان: نیگەران و خەفەتبار بوو بۆ ئەو ئافرەتەی مزگەوتی خاوێن دەکردەوە. بە خاکیان سپارد بێ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات:**

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: ئافرەتێکی رەشتاڵە لە مزگەوت دەمایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژێکیان نەیبینی و پرسیاری لەبارەیەوە کرد، گوتیان: مرد.

فەرمووی: **"نەدەبووایە ئاگادارتان بکردبامایەوە؟"**.

ئەبو هورەیرە دەڵێت: وەك ئەوەی کاروباریان بەهەند وەرنەگرتبێت.

فەرمووی: **"گۆڕەکەیم نیشان بدەن"**.

پیشانیاندا و ئەویش نوێژی لەسەر کرد [٤].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- گەورەیی پاککردنەوەی مزگەوت.
- پاداشتدانەوە بە دوعاکردن.
- هاندان لەسەر ئامادەبوون لە مەراسیمی جەنازەی خەڵکی باش.
- بانگکردنی خەڵکی بۆ نوێژکردن لەسەر مردوو، بۆ ئەوانەی نوێژیان لەسەر مردووەکە نەکردووە.

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٤/١٨٧).
[٢] ئەبوداود (٤٥٤) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە ﷺ گێراوەتیەوە، ئەلبانی بە سەحیح داناوە.
[٣] فتاوي اللجنة الدائمة (٥/٢٦٣).
[٤] بوخاری (٤٥٨) و موسلیم (٩٥٦) گێراوەتیانەوە.

- راگەیاندنی هەواڵی مردن [١].
- پرسیارکردن لە خزمەتکار و هاوڕێ ئەگەر دیار نەبوو.

## پێغەمبەر ﷺ دڵی ئەو ئافرەتانەی دەدایەوە کە کەسانێك دڵیان شکاندبوون:

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هەواڵی کۆچی پێغەمبەرمان بۆ مەدینە پێگەیشت، ئێمەش لە یەمەن بووین، ویستمان کۆچ بکەین بۆ لای، من و براکانم بووین، من لە هەموویان بچوکتر بووم، یەکیان (ئەبو بەردە) ئەو دیکەیان (ئەبو رەهەم) بوو، هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەك خزمی دی کە ژمارەمان نزیکەی پەنجاو سێ یان پەنجاو دوو کەس دەبوو.

سواری کەشتی بووین، کەشتییەکەمان چووە لای نەجاشی لە حەبەشە، لەوێ جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب و هاوەڵانیمان بینی.

جەعفەر پێی گوتین: پێغەمبەر ﷺ ئێمەی بۆ ئێرە رەوانە کردووە، فەرمانی پێکردووین لێرە بمێنینەوە، ئێوەش لەگەڵمان بن.

لەگەڵی ماینەوە تا بەیەکەوە گەڕاینەوە مەدینە، کاتی هاتنەوەمان هاوکات بوو لەگەڵ فەتحی قەڵای خەیبەر لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، ئێمەشی لە دابەشکردنی دەسکەوتەکانی ئەم شەڕە بەشدارکرد.

تەنیا دەسکەوتەکانی دابەشکردە سەر ئەوانەی بەشداریان لەفەتحی خەیبەریان کردبوو، لەگەڵ هاوەڵانی کەشتییەکە و جەعفەرو هاوەڵانەی، بەشی ئەوانەشی دا.

خەڵکانێك هەبوو بە ئێمەیان دەگوت (واتە بە خەڵکی کەشتییەکەیان دەگوت): ئێمە پێش ئێوە کەوتین لە کۆچکردن.

ئەسمای کچی عومەیس، لەوانە بوو لەگەڵمان گەڕابۆوە مەدینە، سەردانی حەفصەی خێزانی پێغەمبەری ﷺ کرد، ئەو ئافرەتە بوو لەگەڵ هاوەڵان کۆچی حەبەشی کردبوو.

عومەری کوڕی خەتتاب سەردانی حەفصەی کچی کرد، ئەسماش لەوێ بوو، عومەر کاتێك ئەسمای بینی گوتی: ئەمە کێیە؟

حەفصە گوتی: ئەسمای کچی عومەیسە.

عومەر گوتی: ئەمە ئەو حەبەشیەیە ؟ ئەمە ئەو دەریایەیە [٢]؟

ئەسما گوتی: بەڵێ.

---

[١] فتح الباری (٥٥٣/١).

[٢] بە هۆی نیشتەجێبوونی لە حەبەشە و سواربوونی کەشتی دەریایە.

عومەر گوتی: ئێمە بۆ کۆچکردن پێش ئێوە کەوتین، ئێمە شایەنترین بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئێوە.

ئەسما توڕە بوو، گوتی: بەخوا نەخێر، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دابوون، برسییەکانی نان دەدان، نەفامەکانی ئامۆژگاری دەکرد، بەڵام ئێمە لە پێناو خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە ماڵی دوورە دەست و بێ باوەڕان بووین لە حەبەشە [1]، سوێند بەخوا نە نان دەخۆم نە ئاویش دەخۆمەوە تا ئەو قسەیەی کردت لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ نەگێڕمەوە ئێمە ئازار دەدراین و دەترسێندراین .

ئەمە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەگێڕمەوە، نە درۆ دەکەم و نەلادەدەم و نە زیادیش دەکەم.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ هات، ئەسما پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، عومەر ئاواو ئاوا دەڵێت.

فەرمووی: **"ئەی تۆ چیت پێگوت"**.

گوتی: منیش واو وام پێگوت.

فەرمووی: **"ئەو لە ئێوە زیاتر شایەنتر نییە بە من، ئەو و هاوەڵان یەك کۆچیان بۆ هەیە، ئێوەی خەڵکی کەشتییەکە دوو کۆچتان بۆ هەیە"**.

گوتی: دوا ئەمە بینیم ئەبو موسا و خەڵکی کەشتییەکە بە کۆمەڵ دەهاتنە لام، پرسیاری ئەم فەرموودەییان لێ دەکردم، هیچ شتێك لە دونیا هێندەی ئەو قسەیەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی کردن لەلایان دڵخۆشکەرتر و گەورەتر نەبوو.

ئەسما دەڵێت: ئەبو موسا بەردەوام ئەم فەرموودەیەی بە من دووبارە دەکردەوە [2].

**مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئافرەتان لەسەر بنەمامی بەزەیی و نەرمونیانی بووە:**

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ دەڵێت: عومەڕی کوڕی خەتتاب ﷺ داوای روخسەتی چوونە ژوورەوەی لە پێغەمبەر ﷺ خواست، ئەو کات هەندێك ئافرەت لەلای دانیشتبوون، دەنگیان بەسەر دەنگی پێغەمبەر ﷺ بەرزکردبۆوە [3] و پرسیاری زۆریان لێدەکرد و داوای وەڵام و فەتوای زۆریان دەکرد.

کاتێك عومەر داوای روخسەتی کرد، خۆیان بە حیجاب داپۆشی.

---

[1] چونکە هەموویان کافر بوون جگە لە نەجاشی نەبێت، موسڵمان بوونی لە قەومەکەی خۆی شاردبۆوە،شەرحی نەوەوی(١٦/٦٥).

[2] بوخاری (٤٢٣١) و موسلیم (٢٥٠٣) گێراوەتیانەوە.

[3] پێدەچێت هۆکاری دەنگ بەرزیان بە هۆی کۆبوونەوەیان بێت، نەوەك دەنگی یەك ئافرەتێکیان بەسەر دەنگی پێغەمبەر ﷺ بەرز بێتەوە (شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم ١٥/١٦٤).

پێغەمبەر ﷺ رووخسەتی پێدا، ئەویش هاتە ژوورەوە، پێغەمبەر ﷺ پێدەکەنی.
عومەر فەرمووی: خوای گەورە دڵت خۆشکات، بە دایك و باوکەوە بە قوربانت بم.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"سەیرم بەوانە دێت کە لەلای منن، کاتێك گوێیان لە دەنگی تۆ بوو، یەکسەر خۆیان داپۆشی".**
عومەر فەرمووی:ئەی پێغەمبەری خوا تۆ شایەنتری کە شەرمت لێ بکەن.
پاشان رووی لە ئافرەتەکان کرد و پێی گوتن: ئەی دوژمنانی نەفسی خۆتان، شەرم لە من دەکەن بەڵام لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناکەن!
گوتیان: تۆ کەسێکی تورە و وتوندتری لە پێغەمبەری خوا ﷺ [1].
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"لەسەرخۆ ئەی کوڕی خەتتاب، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، شەیتان هەر رێگەیەك ببینێت تۆی لێی، ئەو رێگەیەکی تری دەگرێتە بەر"[2].**
ئەو فەرموودەیە لە روکەشدا ئەو واتایەی دەگەێنێت: هەر کاتێك شەیتان ببینێت عومەر بە رێگەیەکدا دەڕوات، لە ترسی عومەر ئەو رێگایە بە جێ دەهێڵێت و دەچێتە رێگایەکی تر، ئەمەش لەبەر ترسی زۆری لە هەیبەتی عومەر نەوەك شتێکی لێ بکات.
هەروەها ئەو فەرموودەیە گەورەیی نەرمونیانی و بەزەیی پیشان دەدات، بە جۆرێك نەبێتە هۆی لە دەستدانی مافێکی شەریعەت، پەروەدگار لە وەسفی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ الحجر: ٨٨ واتە: (باڵی بەزەیی و میهرەبانی بۆ باوەڕدان نەوی بکە).
هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ ﴾ آل عمران: ١٥٩واتە: (خۆ ئەگەر تورە و قسە رەق و بێ بەزەیی بوویتایە، ئەوە هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد)....
﴿ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾ التوبة: ١٢٨ واتە: (پێغەمبەر زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان)[3].

---

[1] زانایان دەفەرموون: مەبەست لەم وشەی (افطل) بۆ بەراوردکردنی چاکەکەیان نییە، بەڵکو بە مانای تورەو توندی دێت، پێغەمبەر ﷺ بە ناخۆشی رووبەرووی کەسیان نەدەبۆوە، تەنیا ئەگەر لەمافێك لە مافەکانی خوا گەورە نەبووایە، بەڵام عومەر زیادەرۆیی دەکرد لە سەرزەنشتکردن لەبارەی شتە ناپەسندەکان بەرەهایی، پێداگری دەکرد لە بەجێهێنانی سوننەتەکان، بۆیە ئافرەتان ئەمەیان گوتووە (فتح الباری (٤٧/٧).
[2] بوخاری (٣٦٨٣) و موسلیم (٢٣٩٧) گێراوەتیانەوە.
[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٦٥/١٥).

## بەرامبەر بێوەژنان بە بەزەیی بوو:

بەراستی پێغەمبەر ﷺ بە تەواوی رەحمەت و بەزەیی پێشوازی لێ دەکردن، هەرگیز بەرامبەر ئافرەتی بێوەژن لوتبەرز و بە فیز نەبووە.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ یادی خوای گەورەی زۆر دەکرد، گوفتاری نابەجێی نەبوو، نوێژی درێژ دەکرد، وتاری کورت بوو، هەرگیز پێی ناشیرن نەبوو گەر لەگەڵ بێوەژنان و هەژاران رێ بکات و پێداویستییەکانیان جێبەجێ بکات [١].

## فەزڵ و گەورەیی یارمەتیدانی ئافرەتی بێوەژنی روون دەکردەوە:

دەفەرموێت ﷺ: **"کەسی یارمەتیدەری بێوەژن و هەژار وەك موجاهیدی رێگای خوای گەورە وایە، یاخود وەك ئەو کەسەیە بە رۆژ بە رۆژووە و شەوانیش شەو نوێژ دەکات [٢]"**.

نەوەوی دەڵێت: (مەبەست لە یارمەتیدەریان، کاسبیان بۆ بکات و پێداویستیان بۆ دابین بکات، مەبەستیش لە بێوەژن ئەو ئافرەتەیە پیاوی نەبێت، جا ئەگەر شووی کردبێت یاخود نا، دەشگوترێت، ئەو ئافرەتەیە لە پیاوەکەی جیا بوبێتەوە).

**ابن قتيبة** دەڵێت: بۆیە پێی گوتراوە (أرملة) چونکە توشی ( إرمال) دەبێت،کە بە مانای هەژاری دێت، ئافرەت بە هۆی لەدەستدانی هاوسەرەکەیەوە تووشی هەژاری دەبێت [٣].

## لە بەجێگەیاندنی پێویستییەکانیان پەلەی دەکرد:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پێویستییەکەم بە تۆ هەیە.

پێی فەرموو: **"ئەی دایکی فلان، سەیرکە کامە رێگایەت پێ باشە من لەوێ بم تا پێویستییەکەت جێبەجێ بکەم"**.

لە رێگادا لەگەڵی رۆیشت تاوەکو پێویستییەکەی کۆتایی پێهات [٤].

ئەمەش لە بێ فێزی پێغەمبەر ﷺ و نەرمنواندنیەتی بەرامبەر جێبەجێ کردنی پێداویستی ئافرەت.

---

[١] النسائی (١٤١٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيح الجامع ٥٠٠٥) بە سەحیحی داناوە.

[٢] بوخاری (٥٣٥٣) و موسلیم (٢٩٨٢) لە ئەبو هورەیرە ﷺ گێراوەتیەوە.

[٣] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١٢/١٨).

[٤] موسلیم (٢٣٢٦) گێراوەتیەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دەرکەوتنی پێغەمبەر بۆ خەڵك و نزیکی لێیان، بۆ ئەوەی ماف بداتە خاون ماف، ڕێگا نیشان بدات بۆ ئەوانەی داوای ڕێگانیشاندان دەکەن، ئەمەش لە پێناوی ئەوەی موسڵمانان سەیری بکەن و شوێن پێی هەڵبگرن، هەر ئەمەش پێویستە لەسەر دەسەڵاتەدار.
- ئارامگرتنی پێغەمبەرە ﷺ لەبەرامبەر بەرژەوەندی موسڵمانان.
- وەڵامدانەوەی پێغەمبەری ﷺ تێدایە بۆ ئەو کەسەی پێویستی هەیە.
- بێ فیزی پێغەمبەر ﷺ دەردەخات لەبەرامبەر وەستانی لەگەڵ ئافرەتێکی بێ چارە [1].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەفەرموێت: گەر بێتو ئۆمەتێك لە ئافرەتانی خەڵکی مەدینە هاتبان و دەستی پێغەمبەریان ﷺ گرتبا لەگەڵیان دەردەچوو بۆ هەر شوێنێك ویستبایان [2].

**ابن حجر** دەڵێت: (گوزارەشت کردن بە (دەستگرتن) ئاماژەیە بۆ لوتکەی جوان مامەڵەکردن تەنانەت گەر پێویستییەکانیان لە دەرەوەی شاری مەدینەش هەبایە بۆی جێبەجێ دەکردن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بێ فیزی و بەریبوونی ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە هەمووی جۆرە لوتبەرزیەك [3]).

سەبارت بە رووی کۆکردنەوە لەنێوان ئەم فەرموودەیە و لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەستی لە دەستی ئافرەت نەداوە: دەگوترێ:

١. مەبەست لە دەستگرتن: ابن حجر دەڵێت: واتە لەگەڵیدا بووە، کە هاوڕێیەتی و بەرێدا ڕۆیشتن دەگەیێنێت.

٢. کەنیزەك حوکمی ئافرەتی نییە، کەنیزە دەکڕدرێ و دەفرۆشرێت، بۆیە کەنیزە خۆی داناپۆشێت تەنانەت لە بێگانەش.

٣. لەوانەیە کچێکی بچوك بوبێت، ئەم ڕایە لە هەموویان نزیکترە، واتە: نەگەیشتۆتە تەمەنی باڵغ بوون. ئەمەش ڕای شێخ عبدالعزیز الراجحییە [4].

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٢/١٥) بە پوختکراوەیی.

[2] ئەحمەد (١١٥٣٠) گێراوەتیەوە، بوخاری (٦٠٧٢) بە (معلق)ی داناوە.

[3] فتح الباري (٤٩٠/١٠).

[4] إسلام وێب.

**چاکەی لەگەڵ دەکردن و ڕێزی دەگرتن، بەتایبەت ئەوانە چاکەی پێشوتریان بەسەردا هەبووە:**

وەك ثوەیبەی شیرپێدەری کە ڕزگارکراوی ئەبو لەهەبی کوڕی عەبدلموتەڵیب بوو، پێغەمبەر ﷺ پێش حەلیمەی سەعدیە شیری ئەوی خواردووە، کە دەکاتە یەکەم شیرپێدەری پێغەمبەر ﷺ، لەگەڵ کوڕەکەی خۆی کە ناوی مەسروح بوو شیری پێداوە، بەر لەویش شیری بە حەمزەی مامی داوە، لە دوای ئەویش شیری بە ئەبو سەلمەی کوڕی عەبدولئەسەد داوە [1].

ئیبن و سەعد دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە مەککە بوو، سەردانی ثویبەی شیرپێدەری دەکرد، خەدیجەش ڕێزی لێدەگرت، چونکە ثویبە موڵکی ئەبو لەهەب بوو، داوای لێکرد پێی بفرۆشێت بەڵام ڕەتی کردەوە.

کاتێك پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئەبو لەهەب ئازادی کرد، پێغەمبەریش ﷺ جلوبەرگ و دیاری بۆ دەنارد [2].

ئیبن حەجەر دەڵێت: (ڕای جیاواز لەسەر موسڵمان بوونی هەیە.. ئەوەی لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە، ئەوەیە کە ڕێزی لێ دەگرت، دوای هاوسەرگیری لەگەڵ خەدیجە دەچووە لای، پاشانیش لە مەدینەوە دیاری بۆ دەنارد، تا لە دوای فەتحی خەیبەر وەفاتی کرد، کوڕەکەشی مرد) [3].

هەروەها دایکی ئەیمەن، دایەنی پێغەمبەر ﷺ، ناوی بەرەکەی کچی ثعلبە ی کوڕی عەمڕی کوڕی حصنی کوڕی مالیکی کوڕی سەلەمەی کوڕی عەمڕی کوڕی نوعمانە، وەکو دایکی پێغەمبەر ﷺ وابوو [4].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پیاوێك چەند دارە خورمای لە زەوییەکانی دایە پێغەمبەر ﷺ، تا ئەو کاتەی قریظة و النضیر فەتح کرا، ئینجا ئەوەی پێیدابوو بۆی گەڕاندەوە.

ئەنەس دەڵێت: کەسوکارم منیان ڕەوانەی لای پێغەمبەر ﷺ کرد، بۆ ئەوەی پرسیاری لێ بکەم کە ئایا چی داوەتە کەسوکارەکەی؟

---

[1] أسد الغابة (٨/١).
[2] الإصابة فی تمییز الصحابة (٥٤٨/٧).
[3] فتح الباری (١٤٥/٩).
[4] سەیری: الاصابة (٢٩١/١٤)، مێژووی دیمەشق (٣٠٢/٤) بکە.

پێغەمبەر ﷺ دابووی بە دایکی ئەیمەن، چوومە لای پێغەمبەر ﷺ دایکی ئەیمەن هات، کراسەکەی خستە ملم، گوتی: سوێند بەخوا نایاندەمەوە، پێشتر بە منیان داوە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەی دایکی ئەیمەن، وازی لێبێنە، ئەوە و ئەوەت بۆ هەیە"**.

ئەو هەر دەیگوت: نەخێر، سوێند بە خوایەی کە تاك و تەنیایە.

پێغەمبەریش ﷺ بۆی زیادکرد تا گەیشتە دە ئەوەندەی لەلای بوو، یان نزیکەی دە ئەوەندە [1].

نەوەوی دەڵێت: سەبارەت بە چیرۆکی دایکی ئەیمەن، کە (رەتی کردەوە بە خششەکە بگەڕێنێتەوە، تا دە ئەوەندەی وەرنەگرت)، بۆیە وایکرد چونکە وا گومانی بردووە ئەم بەخششە هەتا هەتایی بووە و لە بنچینەوە بۆتە موڵکی خۆی.

پێغەمبەریش ﷺ ویستوویەتی لە گەڕاندنەوەی ئەم موڵکەدا دڵی خۆش بکات، هەر بۆی زیاد کرد تا رازی بوو، هەموو ئەم بەخشینەش لەلایەن پێغەمبەر ﷺ وەك رێزگرتنێك بووە بۆ ئەو ئافرەتە لەبەرامبەر دایەنی و پەروەردەکردنیدا [2].

نەوەوی دەڵێت: (زانایان دەڵێن: کاتێك موهاجیرەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەنسارییەکان بە پێدانی باخ و داری بەبەر یارمەتیاندان، هەندێك لە موهاجیرەکان وەك دیارییەك وەریان گرت، هەندێکیشیان بە مەرج وەریان گرت بەو مەرجەی کار لە باخ و زەوییەکان بکەن، بە نیوەی بەرهەم، چونکە نەیانویست وەك دیاری وەریبگرن، ئەمەش لەبەر نەفس بەرزییان و نەوەك ببنە بارگرانی، ئەم کارەش واتای ئاودانی دەگەیێنێت.

کاتێکیش خەیبەریان بۆ فەتح کرا، موهاجیرەکان بەو بەشەی وەریانگرت دەوڵەمەند بوون و پێویستیان بە بەخشینی ئەنسارییەکان نەما و بۆیان گەڕاندنەوە [3].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: ئەبوبەکر ﷺ دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ بە عومەری گوت: برۆ با بچین سەردانی دایکی ئەیمەن بکەین، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ سەردانی دەکرد.

کاتێك سەردانیان کرد، دایکی ئەیمەن گریا.

پێیان گوت: بۆ دەگریت؟ ئەوەی لەلای پەروەردگارە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ.

گوتی: بۆ ئەوە ناگریم، دەزانم ئەوەی لەلای پەروەردگارە باشترە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، بەڵام بۆ ئەوەی دەگریێم لەبەر ئەوەی وەحی پچڕا لە ئاسمان.

جا هەردووکیانی گریاند [4].

---

[1] بوخاری (٤١٢٠) و موسلیم (١٧٧١) گێڕاوەتیانەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠١/٢٢).

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩٩/١٢).

[4] موسلیم (٢٤٤٥) گێڕاوەتیەوە.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- فەزڵ و گەورەیی سەردانی کردنی کەسانی باش.
- دروستە کەسی گەورە سەردانی لە خۆی بچوکتر بکات.
- دروستە مرۆڤ سەردانی ئەو کەسە بکات، کە هاوڕێیەکەی سەردانی دەکرد.
- دروستە کۆمەڵە پیاوێك سەردانی ئافرەتی چاك بکەن و گوێی لە قسەکانی بگرن.
- لە سەردانیکردندا دروستە کەسی زانا و کەسی گەورە هاوڕێبن لەو سەردانەدا.
- گریان بە هۆی لە دەستدانی کەسانی ساڵیح و خۆشەویست، ئەگەر چی ئەو کەسە ساڵیحە چووبێتە پلەوپایەی گەورەتر[1].

**دەستە خوشکی خێزانەکانی بە چاکە لەگەڵ کردن جیا دەکردنەوە:**

خاتوو عائیشە دەڵێت: هەرگیز غیرەم بەرامبەر هیچ لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ نەکردووە، هێندەی غیرەم بەرامبەر خەدیجە هەبووە، گەرچی ئەوم نەبینیبوو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی دەکرد، ئاژەڵی بۆ سەردەبڕی و پارچەکانیشی بەسەر دەستە خوشکەکانی دابەش دەکرد.

پێم دەگوت: وەك ئەوەی جگە لە خەدیجە هیچ ئافرەتێکی تر لەم دونیایەدا نەبێت.

دەیفەرموو: **"ئەو ئاواو ئاواو بوو، لەو منداڵم هەبوو"**[2].

خاتوو عائیشە ﷺ دەڵێت: پیرەژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش پێی فەرموو: تۆ کێی؟ گوتی: من جوثامەی موزەنیمە، فەرمووی: **"بەڵکو تۆ حەسسانەی موزەنی، حاڵ و گوزەرانتان چۆنە، تەندروستیتان باشە؟"**

گوتی: دایکم و باوکم فیدات بێت زۆر باشین.

کە رۆیشت گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن وا پێشوازیت لەو پیرەژنە کردو رووت دایێ؟ فەرمووی: **"ئەی عائیشە ئەوە لەسەردەمی خەدیجەوە دەهاتە لامان، رێزلێنان و بە ئەمەکیش لە باوەڕەوەیە"**[3].

**دوای مردنی هاوەڵانی، پەیمان پارێز بووە بەرامبەر کەس و کاریان:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ جگە لە لە خێزانەکانی نەبێت نەدەچووە لای هیچ ئافرەتێك، تەنیا دایکی سولەیم نەبێت، سەردانی دەکرد.

---

[1] سەیری: شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠/١٦).

[2] بوخاری (٣٨١٨) و موسلیم (٢٤٣٥) گێراوەتیانەوە.

[3] حاکم لە مستدرك (١٧/١). ئەلبانی لە (الصحیحة ٢١٦) بە سەحیحی داناوە. (پێشتر باسکراوە)

لەبارەی ئەمەوە پرسیاریان لێکرد، ئەویش فەرمووی: **"من بەزەییم پێدا دێتەوە، براکەی لەگەڵ من کوژرا [1]"**.

دایکی سولیەم کچی مەلحانی ئەنساری بوو ﷺ رای جیاواز لەسەر ناوەکەی هەیە، دایکی ئەنەسی کوڕی مالیکە ﷺ هاوەڵی ناسراوی پێغەمبەرە ﷺ.

(براکەی)، ناوی حەرامی کوڕی مەلحانە، لە شەڕی بیری مەعونە کوژرا.

لەم فەرموودەیەدا: پەیمان پارێزی بەرامبەر برایان و هاوەڵانی تێدایە، هەروەها جێبەجێکردنی بەرژەندیی کەس و کاریان تێدایە دوای مردنیان.

پێغەمبەر ﷺ بەم سەردانەی دڵنەوایی دایکی سولەیمی کرد، هۆکارەکەشی بەمە روونکردەوە کە براکەی لەگەڵیدا کوژراوە، ئەو داوای لەپێغەمبەر کرد پاش مردنی خەم خۆری خانەوادەکەی بێت،پێغەمبەریش بووە باشترین خەم خۆریان، ئەمەش لە پەیمان پارێزی پێغەمبەرە ﷺ.

**لە روانگەی بەزەیی هاتنەوە، پرسیاری حاڵی ئافرەتانی لە خێزانەکانی خۆی دەکرد:**

خاتوو عائیشە ﷺ دەفەرموێت: چوومە لای خوەیلەی کچی حەکیم، لای عوسمانی کوڕی مظعون بوو.

پێغەمبەر ﷺ خراپی جل و بەرگی ئەو ئافرەتەی بینی، بەمنی فەرموو: **"بۆچی جلوبەرگی خوەیلە ئاوایە؟"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئافرەتێکە پیاوی نییە، هاوسەرەکە بەرۆژ بەرۆژوو بێت و شەوانیش شەو نوێژ بکات، وەك ئەوەیە هاوسەری نەبێت، خۆی پشتگوێ خستووەو خۆی لەدەست داوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە دوای عوسمانی کوڕی معظون ی نارد، ئەویش هاتە لای.

پێی فەرموو: **"ئەی عوسمان، لە سوننەتی من لادەدەی؟!"**.

گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵکو سوننەتی تۆم دەوێت.

فەرمووی: **"من دەخەوم و نوێژیش دەکەم، بەرۆژووش دەبم و بێ رۆژووش دەبم، هاوسەرگیریش دەکەم، لەخوا بترسە ئەی عوسمان، کەسوکارت مافیان بەسەرتەوە هەیە، میوانەکانت مافیان بەسەرتەوە هەیە، نەفسی خۆت مافی بەسەرتەوە هەیە، هەندێك جار بە رۆژووبە بە هەندێکجاریش بە رۆژوو مەبە، نوێژیش بکە و بخەوە [2]"**.

---

[1] بوخاری (٢٨٤٤) و موسلیم (٢٤٥٥) گێراوەتیانەوە.

[2] ئەبو داود (١٣٦٩) و ئەحمەد (٢٥٧٧٦) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٧٤٦) بە سەحیحی داناوە.

**"کەسوکارت مافیان بەسەرتەوە هەیە"**، خطابي دەڵێت: (گەر نەفسی خۆی ماندوو کرد، هێزی نامێنێت، ناتوانێت پێویستی کەس و کاری جێبەجێ بکات.

**"میوانەکانت مافیان بەسەرتەوە هەیە"**، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسێك ڕۆژووی سوننەت بگرێت، گەر میوانێکی هات باشترە ڕۆژووەکەی بشکێنێت و نانی لەگەڵ بخوات، ئەوە خۆشەویستی میواندارییەکەی زیاتر دەکات، هەروەها جۆرێکیشە لە ڕێزگرتن[1]).

## چاکەی ئافرەت و کەسوکارەکەی دەپاراست و چاکەی لەگەڵ دەکردن:

عومرای کوڕی حصین ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین لە سەفەرێکدا، بە شەو ڕۆیشتین، تا گەیشتە کۆتایی شەو، کەوتینە خەوێك، خەوی هیچ سەفەرێك هێندەی ئەو خەوە خۆش نەبوو.

گەرمایی ڕۆژ لە خەوی هەڵساندین، یەکەم کەس لە ئێمە بە ئاگاهات ئەبوبەکر بوو، پاشان فلان، پاشان فلان، پاشان کەسی چوارەم عومەری کوڕی خەتتاب بوو.

بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ گەر نوستبا، کەس بە ئاگای نەدەهێنا تاوەکو خۆی بە ئاگا دەهاتەوە، چونکە ئێمە نەماندەزانی چی بۆ ڕوودەدا لە خەو[2].

کاتێك عومەر بە ئاگا هات و بینی خەڵك توشی چی بوون، پیاوێکی چوارشانە و بەهێز و دەنگ گەورە بوو.

تەکبیری لێدا و دەنگی خۆی بەرزکردەوە، بەردەوام بوو تا بەدەنگەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە ئاگا هێنا، کاتێك بە ئاگا هات، خەڵك سکاڵای حاڵی خۆیان بۆ کرد، فەرمووی: **"کێشە نییە، بڕۆن[3]"**.

بەسواری ئاژەڵەکان ڕۆیشتن، زۆر دوور نەکەوتبوونەوە، دابەزین، داوای کرد دەست نوێژ بگرن، خۆی دەست نوێژی گرت، بانگی نوێژ درا، نوێژی بۆ خەڵکەکە کرد، کاتێك لە نوێژ تەواو بوو، دەبینی پیاوێك بە تەنیا دانیشتووە و نوێژی لەگەڵ خەڵکەکە نەکرد، فەرمووی: **"چی وایکرد ئەی فلان نوێژ لەگەڵ خەڵکەکە نەکەی؟"**.

گوتی: توشی جەنابەت بووم و ئاویش نییە.

فەرمووی: **"پێویستە بە خۆڵ تەیەمموم بکەی، ئەوەندە بەستە"**.

---

[1] عون المعبود (٤/١٧٠).

[2] خۆیان بەدوور دەگرت پێغەمبەر ﷺ بە ئاگا بێنن، ئەمەش پێشبینیان دەکرد لەخەودا وەحی بۆ دابەزێت، دەترسان کاتێك لە خەوی هەڵبستێنن وەحی بپچڕێنن، لەبەر ئەمە بە ئاگایان نەدەهێنا.

[3] دڵنەوایی تێدایە بۆ هاوەڵان بەهۆی ئەو خەمەی لەبەرامبەر لە دەستچوونی نوێژ خواردیان، بە واتایەی گوناهیان لەسەر نییە گەر بە ئەنقسەت نەیان کردبێت.

پاشان پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت، خەڵك لەبەر تینوبوون هاواریان گەیاندە پێغەمبەر، دابەزی و بانگی فلانکەسی [1] کرد، بانگی عەلیشی کرد، فەرمووی: بڕۆن ئاو پەیدا بکەن.. لە کاتێکدا ئێمە دەڕۆیشتن، ناکاوێك ئافرەتێکمان بینی هەردوو پێیەکانی لەنێوان کوندەی ئاوی حوشترەکەی درێژ کردبوو.

پێمان گوت: کوا ئاو؟

گوتی: زۆر دوورە، ئاو نییە.

گوتمان: ئەی نێوان ماڵت و نێوان ئاو چەند دوورە؟

گوتی: ماوەی ڕۆیشتنی شەو و ڕۆژێك.

پێیان گوت: کەواتە بڕۆ.

گوتی: بۆ کوێ؟

پێیان گوت: بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ.

گوتی: ئەوەی پێی دەگوترێت لە دین دەرچوو؟

گوتیان: هەر ئەوەی کە مەبەستتە، بڕۆ.

هێنایانە لای پێغەمبەر ﷺ ڕووداوەکەیان بۆ گێڕایەوە، ئەویش هەمان قسەی گێڕایەوە، پێشی ڕاگەیاند کە هاوسەرەکەی مردووە و دوو منداڵی بێ باوکی هەیە.

فەرمووی لە وشترەکەی بیهێننە خوارەوە، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد پەرداخێکی بۆ بێنن، دەمی دوو کوندەکەی کردەوە و ئاوی تێکرد.

بانگی خەڵکەکە کرا، وەرن ئاو بخۆنەوە، وەرن ئاو بخۆنەوە.

ئێمە چل پیاوی تینوو بووین، تێرئاو بووین، هەرچی کوندە ئاویشمان لەلابوو پڕ ئاومان کرد، تا خەریك بوو لەبەر پڕ ئاوی بتەقێت، بەڵام وشترەکانمان ئاو نەدا.

دوایین کەس ئاوی وەرگرت ئەو پیاوە بوو کە توشی جەنابەت بوو بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووی: **"بڕۆ خۆتی پێ بشۆ"**.

ئافرەتەکەش وەستابوو تەماشای ئەو دیمەنەی دەکرد.

سوێند بەخوا کە جەماعەت تەواو بوون، لەبەرچاومان وادەرکەوت کە کوندەکان لە پێشوتر پڕترن.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"بۆی کۆ بکەنەوە"**.

---

[1] عومرانی کوڕی حصینە.

ئاردو عەجەوەو کەشکیان بۆ کۆکردەوە، تا خواردنێکی زۆری بۆ کۆکرایەوە، خستیانە ناو پارچە قوماشێك، ئافرەتەکەیان سواری وشترەکە کرد و خواردنەکەشیان لە پێشەوە دانا.

پێی فەرموو: "**بڕۆ ئەم خواردنە بدە منداڵەکانت، بشزانە ئێمە هیچمان لە ئاوی تۆ کەم نەکردۆتەوە، بەڵکو ئەوە خوای گەورە بوو ئێمەی ئاودا**".

گەیشتەوە ناو کەسوکارەکەی، کە ماوەیەك بوو دابڕابوو، گوتیان: چییە ئەی فلانەکەس بۆ دواکەوتی؟

گوتی: شتێکی سەیروسەمەرە، دوو پیاو گەیشتنە من، منیان بردە لای ئەو کەسەی پێی دەگوترێت لەدین دەرچوو، ئاوا و ئاوای کرد. سوێند بەخوا یان ئەو پیاوە لە سیحربازترین کەسەکانە لە نێوان ئەمە و ئەمە، بە دوو پەنجەی ئاماژەی بۆ ئاسمان و زەوی کرد، یان ئەوەتا بەڕاستی پێغەمبەری خوایە.

دوای ئەمە موسڵمانەکان هێرشیان دەکردە سەر بێ باوەڕکانی دەوروبەری هۆزی ئافرەتەکە، بەڵام نەدەچوونە سەر هۆز و کەس و کاری ئافرەتەکە.

تا ڕۆژێکیان ئافرەتەکە بە کەس و کاری گوت: پێم وانییە ئەو خەڵکە هەر ئاوا لە خۆڕا وازیان لە ئێوە هێنابێت، بڕۆن ببنە ئیسلام؟

بە قسەیان کردو چوونە ناو ئیسلام [1].

پێغەمبەر ﷺ چاکە و مافی ئەو ئافرەتەی پاراست کە چاکەی لەگەڵ کردبوون، چاکەی بەرامبەر خۆی و کەسوکارەکەی دایەوە.

العینی دەڵێت: "پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی ئەو ئافرەتەی لەناوی کەس و کاری خۆی و وڵاتی خۆی پاراست "

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- هەر کەسێك نوێژی بچێت، دەتوانێت ئەو کاتەی بە بیری هاتەوە ئەنجامی بدات، ئەگەر کاتەکەشی بەسەرچوو بوو.
- ئەگەر پێویستی بەئاو زۆر بوو، لە هەر جێگایەك ئاو بینرا، پێویستییەکەی لێ جێبەجێ دەکرێت و قەرەبووی خاوەنەکەشی دەکرێتەوە، وەك چۆن ئافرەتەکە قەرەبوو کرایەوە.

---

[1] بوخاری (٣٤٤) و موسلیم (٦٨٢) گێڕاوەتیانەوە.

- موعجیزەی پێغەمبەرایەتی تێدایە، سوپایەك لە پیاوان ئاویان خواردەوەو دەستنوێژیان هەڵگرت، ئەو کەسەی غوسلی لەسەر بوو خۆی پێشۆرد، سەرباری ئەمانە کەچی دوو کوندە ئاوەکە هەر بە پڕی مایەوە.
- ڕەوچاو کردنی ماف بێ باوەڕ و پاراستنی مافەکەی وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر ئەو ئافرەتە و کەس و کاری کردی.
- هەروەها ڕەچاوی مافی ئافرەتەکەی لەناو هۆز و کەس و کاری کرد، گەرچی ئافرەتەکە پلەو پایەی لەهەموویان کەمتر بووە، بەڵام ئەم هۆزە هێرشی نەکرایە سەر لە پێناو موسڵمان بوونی ئافرەتەکە و هۆزەکە و هەروەها دڵخۆش کردنیان..
- ئەم فەرموودەیە ئەندازەی سوودوەرگرتن لە ڕاکێشانی دڵەکان بۆ ئیسلام نیشان دەدات، چونکە هێرش نەکردنە سەریان بە ئامانجی پەیوەستکردنی دڵەکانیان بووە بە ئیسلام، هۆزەکەش ڕێزی ئەو هەڵوێستەیان گرت و ڕێزی ئەمەیان زانی بۆیە وەك ڕەچاوکردنی ئەم مافە چوونە ناو ئیسلام [1]

**گەر هەڵەی لەیەکێکیان بدیتبایە، بە نەرمونیان و هێواشی قەدەغەی دەکرد:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بەلای ئافرەتێك تێپەڕی کە لەسەر گۆڕی کوڕێکی دەگریا.

پێی فەرمووی: **"لە خوا بترسە و ئارام بگرە"**.

ئافرەتەکە گوتی: لێم دوور کەوە، تۆ وەك من توشی ئەو بەڵایە نەبووی، نەیناسی.

پێیان گوت: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ... شتێك تووشی هات وەك مردووی لێکرد [2].

پاشان چووە بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ، هیچ دەرگاوانێکی نەبینی.

بە پێغەمبەری گووت: نەمناسی.

فەرمووی: **" ئارامگرتن دەبێت لە سەرەتای بەڵا و ناخۆشییەکە دابێت [3]"**.

واتە: ئەو ئارامگرتنەی خاوەنەکەی پێی جوان دەبێت، دەبێت لە کاتی سەرەتای ڕوودانی بەڵایەکە بێت، نەوەك لە دوای ڕووداوەکە، چونکە بەهۆی تێپەڕینی کات سێبوری دێت.

---

[1] شەرحی سەحیحی بوخاری (٤٨٧/١) ابن بطال.
[2] واتە : لەپەرێشانی ئەوەی بەسەری هات کاتێك زانی پێغەمبەرە ﷺ زۆر ترساو شەرم دایگرت.
[3] بوخاری (١٢٨٣) و موسلیم (٩٢٦) گێڕاوەتیانەوە.

سوودی وەڵامی ئافرەتەکە ئەوەیە: ئەو بە مل کەچی هات بۆ فەرمانەکەی پێغەمبەر کە فەرمانی بە تەقوا و ئارامگرتن پێکرد، هەروەها وەك داوای لێبوردنێك لەو قسەیەی،کە لە ئەنجامی خەمەوە کردبووی، ئەویش بۆی روونکردەوە کە پێویستە ئەو ئارامگرتنە لەسەرەتای رووداوەکە بێت، هەر ئەو جۆرە ئارامگرتنەشە پاداشتی لەسەرە [١].

**"لە خوابترسە و ئارام بگرە"**. پێدەچێت گریانەکەی لە حەدی خۆی زیاتر بووبێت، یاخود هاوارکردنی تێدابووە، چونکە گریانی ئاسایی گوناھ نییە.

هەروەها وەڵامدانەوەی پێغەمبەر حەکیمانە بووە، پەیامێکی داوە بە کەسی داواکار، ئەویش ئەو شتە نییە داوای دەکات، بەڵکو ئاگاداری شتی گرنگتری دەکاتەوە [٢].

وەك ئەوەی پێی بڵێت: واز لە داوای لێبوردن بێنە، من بۆ خۆم تورە نابم، بەڵکو لە پێناو خوا تورە دەبەم، فەتوا دان بۆ ئەو شتەی گرنتگترە.

### لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- نەرموونیانی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر کەسی نەزان، بێ فیزی و سەرەخۆشی کردن لە تازیەبار، قەبوڵکردنی داوای لێبوردن، فەرمان بە چاکەکردن و رێگری کردن لە خراپە لەگەڵ هەموو کەس.
- پێویستە دەسەڵاتدار و دادوەر هەرگیز خۆی لە خەڵکی بە دوور نەگرێت.
- پێویستە هەر کەسێك فەرمانی چاکەکردنی پێکرا، قەبوڵی بکات، ئەگەر چی کەسی فەرماندەرەکەش نەناسێت.
- ئارام نەگرتن لە شتە قەدەغەکراوەکانە، لەبەر فەرمان کردنی بۆ ئافرەتەکە بە تەقوا و ئارامگرتن.
- لە کاتی ئامۆژگاری کردن و بڵاوکردنەوەی دین،پێویستە بەرگەی ناخۆشیەکانی بگیرێت [٣].

## رێگری لە پیاوان کردووە لە ئافرەتان بدەن:

ئیاسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زباب دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: **"لە ئافرەتان مەدەن"**، عومەر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئافرەتان لە پیاوانیان یاخی بوونە. رووخسەتیدا لێیان بدەن [٤].

---

[١] فتح الباری (٣/١٥٠).

[٢] سەیری الایضاع في علوم البلاغة بکە (٢/١١٠).

[٣] فتح الباری (٣/١٥٠).

[٤] واتە لێدانەکە لە سنوری شەرع بێت، نە ئێسك بشکێنێت، نە پێست شین بکات، نە لێدانی کوشتن بێت، لەگەڵ بەدوورگرتنی دەموچاو.... هتد.

لەم بارەیەوە ئافرەتێکی زۆر سکاڵایان گەیاندە ماڵی پێغەمبەر، سکاڵایان لە مێردەکانیان هەبوو.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئافرەتانێکی زۆر هاتوونەتە لای کەس و کاری موحەممەد، سکاڵایان لە مێردەکانیان هەیە، ئەو پیاوانە لە باشەکانی ئێوە نین**[1]".

واتە ئەو پیاوانەی لە خێزانەکانیان دەدەن لە باشەکانی ئێوە نین، بەڵکو باشترین کەس ئەوەیە کە لێیان ناداو بەرگەی ناخۆشییەکانییان دەگرێت.

بۆیە بەرگەگرتن و ئارامگرتن لەسەر خراپی رەوشتیان و لێنەدانیان باشترین و چاکترینە[2].

**فەرمانی بەچاکە دەکرد ئەگەر ئافرەتێك گوناهێکی کردبا و پاشان تۆبەی لیٚ کردبا:**

عومرانی کوڕی حصین ﷺ دەڵێت: ئافرەتێکی خەڵکی جوهەینە کە دووگیان بوو هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا حەددێکم بەزاندووە و لەسەرم جێبەجێی بکە.

پێغەمبەر ﷺ بانگی سەرپەرشتیاری کرد و پێی فەرموو: **"لەگەڵی باش بە، گەر سکەکەی دانا، بیهێنەوە لام"**، ئەویش وایکرد.

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە بەردباران کردنی کرد، پۆشاکەکەیان تیٚ ئالاند (نەوەك عەورەتی دەربکەوێت)، فەرمانی بۆ دەکرد، بەردباران کرا، پاشان نوێژی لەسەر کرد.

عومەر پێی گوت: نوێژ دەکەی لەسەری لە کاتێکدا زینای کردووە.

فەرمووی: **"بەراستی ئەو تۆبەیەکی کرد، گەر بەسەر حەفتا کەسی شاری مەدینە دابەش بکرێت بەشیانی دەکرد، ئایا کەست بینووە باشتربێت لەوەی لە پێناوی خوای پەروەردگار بەخۆی هات** (خۆی رادەست کرد)[3]".

کاتێك بە سەرپەرشتیاری ئافرەتەکەی فەرموو: **"لەگەڵی باش بە، گەر سکەکەی دانا، بیهێنەوە لام"**، ئەم چاکە کردنە دوو هۆکاری هەیە:

یەکەمیان: ترسی لە کەس و کاری هەبوو، بە هۆی توشبوونیان بە شەرمەزاری ئازاری ئافرەتەکە بدەن، بەم شێوەیە هۆشداری ئەمەی پێدان.

دووەم: فەرمانی بەزەیی و سۆزی بۆ دەکرد، هانی چاکەکردنی دا لەگەڵی، رێگری کرد قسەی ئازاردەری پیٚ بگوترێت[4].

---

[1] ئەبو داود (٢١٤٦) و ابن ماجة (١٩٨٥) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبی داود (١٨٦٣) بە سەحیحی داناوە.

[2] عون المعبود (١٣٠/٦).

[3] موسلیم (١٦٩٦) گێڕاوەتیەوە.

[4] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٠٥/١١).

خاتوو عائیشە ﵂ لەبارەی چیرۆکی ئافرەتە مەخزومییەکەی دزی کرد دەڵێت: تەوبەیەکی باشی کرد، پاشان هاوسەرگیری کرد، دواتر سەردانی منی دەکرد و منیش پێویستییەکانم بە پێغەمبەر ﷺ دەگوت[1].

لە گێڕانەوەیەکی تردا ئافرەتەکە دەڵێت: ئایا تەوبە بۆ من هەیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: " **تۆ ئەمڕۆ لە گوناهەکانت پاك بوویتەوە، وەك ئەو ڕۆژەی کە تازە لە دایك بووی**[2] ".

## دیاری لە ئافرەتان وەردەگرت:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ هاوسەرگیری کرد و چووە لای خێزانی.

دایکی سولەیم پێی گوتم: ئەگەر دیارییەکمان دابایە پێغەمبەرﷺ؟

پیم گوت: وا بکە.

هەندێك خورما و چەوری و پەنیری هێنا، شۆربایەکەی لێدروست کرد و خستیە ناو قاپێك.

گوتی: ئەنەس بڕۆ بیبە بۆ پێغەمبەر ﷺ و پێی بڵێ: دایکم سەلامت لێ دەکات و ئەمەی بۆ ناردی، پێشی بڵێ: ئەگەر چی کەمیشە ئەی پێغەمبەری خوا.

چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێم فەرموو: دایکم سەلامت لێ دەکا، دەڵێت، ئەمە کەمیشە بۆ تۆ ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: "**دایبنێ**".

پاشان فەرمووی: "**بڕۆ بانگی فلان و فلان و فلان بکە و هەرچی بینیت بانگی بکە**"، ناوی هەندێك پیاوی هێنا.

هەر چی ناوی هێنا و هەرچی دیتم بانگم بکرد.

گەڕامەوە دەبینم ماڵ پڕبووە لە خەڵکی.

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: "**ئەی ئەنەس قاپەکە بێنە**".

بینیم پێغەمبەر ﷺ دەستی لەسەر شۆربایەکە دانا و هەندێك دوعای لەسەر خوێند، پاشان دە کەس دە کەس بانگی خەڵکەکەی کرد،

فەرمووی: "**با دە کەس دە کەس بێن، هەر کەسێك لە دوای ئەوی تر دێت با لێی بخوات**".

---

[1] بوخاری (٤٣٠٣) و موسلیم (١٦٨٨) گێڕاوەتیەوە.

[2] ئەحمەد (٦٦١٩) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە ﵁ گێڕاوەتیەوە، ئەحمەد شاکر سەندەکەی بە سەحیح داناوە، شعیب الاناروؤط بە زەعیفی داناوە.

دەڵێت: خواردیان تا تێریا خوارد، کۆمەڵێك چوونە دەرەوە و کۆمەڵێکی دی هاتن، تا هەموو خواردیان.

پاشان فەرمووی: **"ئەی ئەنس هەڵی گرە"**.

دەڵێت: منیش هەڵم گرتەوە، نازانم ئەو کاتەی دامنابوو زیاتر بوو یان کە هەڵمگرتەوە [(١)].

لەم فەرموودەیە موعجیزەی ئاشکرای پێغەمبەری خوای ﷺ تێدایە لەبارەی زۆربوونی خواردن.

سەهل ﷺ دەڵێت: ئافرەتێك کراسێکی هێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دامێنی دووررابوو [(٢)].

گوتی: بە دەستەکانی خۆم دووریمە، هاتووم بۆ ئەوەی لەبەر تۆی بکەم.

پێغەمبەر ﷺ پێویستی پێی هەبوو، لێی وەرگرت، لەبەری کرد، کە هاتە لای ئێمە، فلان کەس پێی جوان بوو، گوتی: چەند جوانە، لەبەر منی بکە.

فەرمووی: **"بەڵێ"**.

لە مەجلیسەکە دانیشت، تا مەجلیسەکە تەواو بوو، پاشان گەڕایەوە و کراسەکەی لولدا و بۆی نارد.

خەڵکەکە پێیان گوت: کارێکی باشت نەکرد، پێغەمبەر ﷺ خۆی پێویستی پێی هەبوو لەبەری کردبوو، داواشتکرد، دەشزانی پێغەمبەر داوی کەس رەت ناکاتەوە.

گوتی: سوێند بەخوا داوام نەکردووە بۆ ئەوەی لەبەری بکەم، بەڵکو بۆ ئەوە داوام کردووە تا ببێتە کفنم.

سەهل دەڵێت: جا بووە کفنی [(٣)].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- رەوشت جوانی و بەخشندەیی پێغەمبەر ﷺ و وەرگرتنی دیاری تێدایە.
- دروستە کەسێك ئەو شتەی لەبەر هاوڕێکەی دەیبینێت پێی جوان بێت، جا یان لەبەر ئەوە بێت نرخەکەی بزانێت، یان پێی بدات، بەڵام بە جۆرێك کارەکە گونجاو بێت.
- دروستە نکۆڵی شتێك بکەیت ئەگەر ئاشکرا پێچەوانەی ئەدەب بوو، با مونکەرەکەش نەگاتە پلەی حەرام بوون.
- دروستە پێشوەختە شتێك ئامادە بکرێت پێش ئەوەی پێویستی پێی هەبێت [(٤)].

---

(١) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩/٢٣٢).
(٢) وەك ئەوەی بڵێت نوێیە و دامێنی کراسەکە نەدڕاوە و لەبەریش نەکراوە.
(٣) بوخاری (١٢٧٧) گێراوەتیەوە.
(٤) فتح الباری (٣/١٤٤).

**لەوانەیە هەندێك ئافرەتان داوەتی نان خواردنیان بکردبایە، ئەویش وەڵامی داواکەی دەدانەوە:**

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: دایکی سولیەم داوەتی پێغەمبەری ﷺ کرد، بۆ خواردنێك کە خۆی ئامادەی کردبوو، ئەویش لێی خوارد، پاشان فەرمووی: **"هەڵسن، با نوێژتان بۆ بکەم"**.

ئەنەس دەڵێت: هەڵسام چووم حەسیرێك بێنم، لەبەر زۆر راخستنی رەش ببوو، هەندێك ئاوم بەسەردا کرد [١].

پێغەمبەر ﷺ بۆ نوێژ وەستا، من و بێ باوکەکە [٢] لە دوای وەستاین، پیرەژنەکەش لەدوامان، پێغەمبەری خوا ﷺ دوو رکاتی بۆ کردین، پاشان رۆیشت [٣].

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- وەڵامدانەوەی بانگهێشتی نان خواردن، تەنانەت ئەگەر بوك گواستنەوەش نەبوو، یان داواتکەرەکە ئافرەت بوو، بەمەرجی دڵنیابوون لە روونەدانی فیتنە.
- دروستە نوێژی سوننەت بە کۆمەڵ لەماڵەوە بکرێت، وەك ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ویستی فێرە شێوازی نوێژکردنیان بکات، بەتایبەت ئافرەتەکە، چونکە لەبەر دووری لەوانەیە هەندێك شت بۆی روون نەبێت.
- پاککردنەوەی شوێنی نوێژکردن، وەستانی منداڵ و پیاو لە یەك رێز، ئافرەتیش لە رێزی دواوە تەنانەت ئەگەر بەتەنێ بێت.

**سەردانی ئافرەتی نەخۆشی دەکرد:**

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەردانی دایکی سائیب، فەرمووی: **"چیتە دایکی سائیب دەلەرزیت؟"**.

گوتی: گرانەتا، خوای گەورە بەرەکەتی نەخاتە ناو.

فەرمووی: **"قسە بە گرانەتا مەڵێ، چونکە گوناهەکانی ئادەمیزاد لادەبات، وەك چۆن ئاگر ئاسن خاوێن دەکاتەوە [٤]"**.

---

[١] لەبەر کۆنی و زۆر بەکارهێنانی رەش بووە، ئاوی بۆیە بەسەردا کردووە بۆ ئەوەی نەرم بێتەوە و تۆزی لەسەر لاچێت، حەسیرەکە لە پەلکی دارخورما دروستکرابوو – وەك لە گێڕانەوەی تردا هاتووە .

[٢] سەعدی حەمیری بوو کە خزمەتکاری پێغەمبەر ﷺ بووە.

[٣] بوخاری (٣٨٠) و موسلیم (٦٥٨) گێڕاوەتیانەوە.

[٤] موسلیم (٢٥٧٥) گێڕاوەتیەوە.

ئاسن ئەگەر لەسەر ئاگر دابندرێت، پیسایی لەسەر دەڕوات، ساف دەبێت، بەهەمان شێوە گرانەتا وا لە مرۆڤ دەکات.

دایکی عەلا دەڵێت: کە نەخۆش بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم، فەرمووی: **"مژدەت لێ بێ ئەی دایکی عەلا، خوای پەروەردەگار گوناهی موسڵمان بەهۆی نەخۆشییەکەی لادەبات، وەك چۆن ئاگر پیسی زێڕ و زیوو لادەبات [1]"**.

منذري دەڵێت: دایکی عەلا پوری حەکیمی کوڕی حوزامە، لە ئافرەتە بەیعەتدەرەکان بوو [2].

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهل دەڵێت: ئافرەتێکی خەڵکی عەوالی نەخۆش کەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین کەس بوو بۆ سەردانی کردنی نەخۆش، فەرمووی: **"ئەگەر مرد، ئاگادارم بکەنەوە"**،

لە شەودا مرد، بە خاکیان سپارد، پێغەمبەر ﷺ ئاگادار نەبوو، کاتێك بەیانی هات پرسیاری لەبارەیەوە کرد.

گوتیان: پێمان باش نەبوو بە شەو ئاگادارت بکەینەوە.

چووە سەر گۆڕەکەی، نوێژی لەسەر کرد و چوار تەکبیری لێدا [3].

ابن عبدالبر دەڵێت: (ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە بۆ سەردانیکردنی ئافرەتی نەخۆش، تەنانەت گەر کەسی مەحرەمیشی لەلا نەبوو، بەبڕوای من دەبێت ئەو ئافرەتە بە تەمەن بێت، بەڵام گەر گەنج بوو پێویست ناکات، تەنها پرسیاری لەبارەیەوە بکات و سەیری نەکات [4]).

**هەندێك لە ئافرەتان داوای دوعاکردنیان لێ کردووە، ئەویش داواکانی جێبەجێ دەکردن:**

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سەردانی دایکی سولەیمی کرد، ئەویش خوارما و کەرەی بۆ هێنا.

فەرمووی: **"خوارما و کەرەکە بگەڕێننەوە شوێنی خۆی، من بە ڕۆژووم"**، پاشان چووە سوچێکیماڵەکە و نوێژێکی سوننەتی کرد، دوعای بۆ دایکی سولەیم و ماڵەکەی کرد.

دایکی سولەیم گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دوعایەکی تایبەتم دەوێت.

فەرمووی: **"چییە؟"**.

---

[1] ئەبو داود (٣٠٩٢) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (السلسلة الصحيحة ٧١٤) بە سەحیحی داناوە.

[2] الترغيب والترهيب (١٤٨/٤).

[3] النسائی (١٩٠٧) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح النسائي ١٩٨١) بە سەحیحی داناوە، بوخاری (٤٥٨) و موسلیم (٩٥٦) لە ئەبو هورەیرەوە گێراویەتیەوە. (پێشووتر باسکراوە).

[4] التمهيد (٢٥٥/٦).

گوتی: ئەنەسی خزمەتکارت، دوعای بۆ بکە.

هیچ شتێکی باشی لە دونیا و ئاخیرەت لەبیرنەکرد کە دوعای بۆ نەکردبێت، فەرمووی: **"خوایە گیان ماڵ و منداڵی پێ ببەخشە و بەرەکەتی بخە ناو"**[١].

ئەنەس دەڵێت: من لە هەموو ئەنسارییەکان دەوڵەمەندتر بووم، کچەکەم ئەمینە بۆی باس کردم، تا سەردەمی چوونی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی بۆ بەسەرە نزیکەی سەد و بیست کوڕ و نەوەم بە خاك سپێردراون[٢].

ئەنەس دوای ئەمە تا ساڵی حەفتا و سێ کۆچی ژیا، کە نزیك بوو لە تەمەنی سەد ساڵی.

لە موسلیمدا (٢٤٨١) هاتووە، ( ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سێ دوعای بۆ کردم، دووانم لە دونیا دیتن، ئومێدم وایە سێیەم لە ڕۆژی دوایی ببینم).

سائیبی کوڕی یەزید دەڵێت: پورم منی لەگەڵ خۆی برد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا کوڕی براکەم نەخۆشە.

دەستی بەسەردا هێنام و دوعای بەرەکەتی بۆ کردم، پاشان دەستنوێژی گرت و منیش لە ئاوی دەستنوێژەکەیم خواردەوە.

پاشان چوومە پشتی وەستام و سەیری مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد لە نێوان دوو شانەکانی وەك هێلکەی باڵندە وابوو[٣].

## ناوی هەندێك لە ئافرەتانی دەگۆڕی:

ئیبن عومەرﷺ دەڵێت: عومەر کچێکی هەبوو ناوی عاصیە بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی گۆڕی بۆ جەمیلە[٤].

ناوی جوثامەی مەزنی گۆڕی بۆ حەسانە – وەك لە پێشوتر باسکرا –

نەوەوی دەڵێت: (واتای ئەم فەرموودەیە گۆڕینی ناوی ناشیرین و خراپە بۆ ناوی باش، لە فەرموودەی تریش لە پێغەمبەر ﷺ جێگیر بووە کە ناوی کۆمەڵێك لە هاوەڵانی گۆڕیوە)[٥].

---

[١] لە گێڕانەوەی ابن سعد لە (الطبقات ١٤/٧) دا هاتووە: (خوایە گیان ماڵی و منداڵی زۆر بکە، تەمەنی درێژ بکە، لە گوناهەکانی خۆشببە). الحافظ بە سەحیحی داناوە لە (الفتح ٢٢٩/٤).

[٢] بوخاری (١٨٤٦) گێڕاوەتیەوە.

[٣] بوخاری (١٨٣) گێڕاوەتیەوە.

[٤] موسلیم (٣٩٨٨) گێڕاوەتیەوە.

[٥] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی مسولیم (١٢٠/١٤).

ناوی بەڕەی گۆڕی بۆ زەینەب: موحەممەدی کوڕی عەمڕی کوڕی عطاء دەڵێت: کچەکەم ناونابوو بەڕە واتە: چاکە، زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە پێی گوتم: پێغەمبەر ﷺ نەهی لەم ناوە کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خۆتان بە چاکە مەزانن، خوایە گەورە دەزانێت کێ لە ئێوە ئەهلی چاکەیە"**.

گوتیان: ناوی چی لێ بنێین؟

فەرمووی: **"ناوی بنێن زەینەب"**[(١)].

**هەروەکو ناوی کۆمەڵێك لە هاوەڵانیشی گۆڕیووە:**

ناوی عاصی گۆڕی بۆ موطیع[(٢)]: عەبدوڵڵای کوڕی مطیع لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: هیچ کەسێك لەوانەی ناویان عاصی لە بوو قورەیش موسڵمان نەبوون تەنیا موطیع نەبێت، کە ناوی عاصی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی نا موطیع[(٣)]".

ناوی حەزەنی گۆڕی بۆ سەهل[(٤)]:

کوڕی موسەییب لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە باوکی چووە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش پێی فەرموو: **"ناوت چییە؟"**،

گوتی: حەزن.

فەرمووی: **"تۆ سەهلی"**.

گوتی: ناوێك ناگۆڕم کە باوکم ناوی لێناوم.

کوڕی موسەییب دەڵێت: ڕەوشت ڕەقی و توندوتیژی لەناومان نەبڕا[(٥)].

ناوی (أصرم)ی گۆڕی بۆ (زەرعە):

ئوسامەی کوڕی ئەخەدری ﷺ دەڵێت: پیاوێك ناوی ئەصرەم بوو، لەگەڵ خەڵکانێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: **"ناوت چییە؟"**.

گوتی: ئەصرەم

فەرموو: **"بەڵکو تۆ زەرعەی"**[(٦)]،

---

(١) موسلیم (٢١٤٢) گێراوەتیەوە.

(٢) (عاصی): واتە یاخی. (مطیع): واتە گوێرایەڵ. وەرگێڕ

(٣) موسلیم (١٧٨٢) گێراوەتیەوە.

(٤) (الحزن) واتە شوێنێکی ڕەق و زبر، (سهل) واتە دەشت. النهایة(١/٣٨٠).

(٥) بوخاری (٦١٩٠) گێراوەتیەوە.

(٦) ئەبو داود (٤٩٥٤) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (تخریج المشکاة ٤٧٧٥) بە سەحیحی داناوە.

ئا بەم شێوەیە پێویستە مرۆڤ سووربێت لەسەر ناونانی منداڵەکانی بە ناوی باش، ئەو ناوانە دووربخاتەوە کە شایەنی ناولێنان نین.

## هەندێك جار گاڵتەی لەگەڵ ئافرەتانی بە تەمەن دەکرد:

حەسەن دەڵێت: پیرەژنێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە بچمە بەهەشت.

ئەویش فەرمووی: **"ئەی دایکی فڵان، پیرەژن ناچنە ناو بەهەشت"**.

دەڵێت: بە گریانەوە ڕۆیشت، پێغەمبەری فەرمووی: **"پێی بڵێن، ناچێتە بەهەشت بە پیری، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ ٣٥ فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا ٣٦ عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴾ الواقعة: ٣٥-٣٧ [1]

واتای ئایەتەکە: (ئەو حۆریانەمان بەتایبەت بۆ دروست کردوون - کردوومانن بەحۆریانی هەمیشە کیژ - هاوسەرەکانیان زۆرخۆش دەوێت و هەموویان هاو تەمەنن).

گاڵتەی لەگەڵ کردووە بە ئامانجی فێرکردنی، کە بەو ڕوخسار و شێوەیە ناچێتە بەهەشت، بەڵکو دەگەڕێتەوە تەمەنی سی و سێساڵی.

## بە مەبەستی ئاشتەوایی نێوان دوو هاوسەر، تکای لە هەندێك ئافرەت کردووە:

کاتێك بەریرە ئازاد کرا، هاوسەرەکەی بەندە بووە، جیابوونەوەی لە هاوسەرەکەی هەڵبژارد [2]، پێغەمبەری خوا ﷺ تکای کرد لەلای، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە لای، گوتی: هیچ پێویستیم پێی نییە.

ئیبن عەبباس دەڵێت: پیاوی بەریرە بەندە بوو، پێیان دەگوت موغیث، من دەمبینی کە سەیری دەکرد و بەدوای دەسوڕایەوە و فرمێسکەکانی بەسەر ریشیدا دەهاتە خوارەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەبباسی فەرموو: **"ئایا سەرت سوڕنامێنی لە خۆشەویستی موغیث بۆ بەریرە و ڕقی بەریرە بۆ موغیث؟"**،

پێغەمبەر ﷺ بە بەریرەی فەرموو: **"گەر بگەڕێیتەوە لای [3]"**.

---

[1] ترمذي لە الشمائل (لا ١٩٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٩٨٧)، بە سەحیحی داناوە.

[2] چونکە ئافرەت کاتێك ئازاد دەکرێت، پیاوەکەشی هەر بەندەیە، دەتوانێت لە نێوان مانەوە لەگەڵی و جیابوونەوە یەکێکیان هەڵبژێرێت.

[3] لە نسائی (٥٣٣٢) دا هاتووە: گەر بگەڕێیتەو لای، ئەو باوکی منداڵەکانتە.

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە فەرمانە پێم دەکەی؟

فەرمووی: **"بەڵکو من تەنیا تکایەکە دەیکەم"**.

گوتی: هیچ پێویستیم بەو نییە [١].

واتە: ئەگەر لەسەرم پێویست نەکەی، ئەوا من گەڕانەوە بۆ لای هەڵنابژێرم.

**لە کاروباری هاوسەرگیری ئامۆژگاری دەکردن، بەڵکو ڕێگەی هاوسەرگیری باشی پیشان دەدان:**

فاتیمەی کچی قەیس دەڵێت کە هاوسەرەکەی تەڵاقی سێ بە سێی دا، پێغەمبەر ﷺ خانوو و نەفەقەی بۆ دیاری نەکرد.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو **"گەر ماوەکەت تەواو بوو ئاگادارم بکەوە"**.

کاتێك عیددەم تەواو بوو، پێم ڕاگەیاند کە مەعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان و ئەبو جەهم داوایان کردووم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەبو جەهەم پیاوێکە بەردەوام گۆچانی بەسەر شانەوەیە [٢]، موعاویەش هەژارە و هیچ ماڵ و سامانی نییە، شوو بە ئوسامەی کوڕی زەید بکە"**.

دەڵێت: پێم ناخۆش بوو، پاشان فەرمووی: **"شوو بە ئوسامە بکە"**.

دەڵێت: ئوسامە، ئوسامە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بۆ تۆ باشترە"**.

دەڵێت: شووم پێکرد، خوای پەروەردگار خێر و بەرەکەی زۆری پێداین، دڵ خۆش بووم [٣].

نەوەوی دەڵێت: (بۆیە ئامۆژگاری لەبارەی ئوسامە بۆ کردووە، چونکە بە هۆی ئەو دین و گەورەییە و بەخشندەیی و ڕەوشتە جوانەی هەیبووە، ئافرەتەکەش بۆیە پێی ناخۆش بووە، چونکە ئەو خزمەتکار بووە، هەروەها ڕەش پێست بووە، پێغەمبەر ﷺ دووبارەی کردەوە بۆ ئەوەی هانی بدات هاوسەرگیری لەگەڵ بکات، چونکە زانیویەتی بەرژەوەندی ئەوی تێدایە، بۆیە دەڵێت: خوای گەورە خێر و بەرەکەتی زۆری پێدام و دڵ خۆش بووم) [٤]

---

[١] بوخاری (٥٢٨٣) گێراوەتیەوە.

[٢] واتە زۆر لە ئافرەتان دەدات.

[٣] موسلیم (١٤٨٠) گێراوەتیەوە.

[٤] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٩٨/١٠).

ابن عیثمین دەڵێت:( کە باسی سیفەتی ئەو دوو پیاوەی کردووە، لە روانگەی ئامۆژگاری کردن بووە، نەوەك لە روانگەی باسکردنی کەم و کوڕیان، ئەم دوو بابەتەش لێك جیاوازیان.

بۆیە گەر کەسێك هاتە لات و راوێژی پێ کردیت و گوتی: زانست لە فلان کەس وەربگرم؟، تۆش دەزانی فلانە کەس خاوەن مەنهەجێکی لاڕێبووە، بۆیە هیچی تێدا نییە پێی بڵێت: زانست لەو وەرمەگرە.

وەك ئەو کەسەی عەقیدەکەی شتێکی تێدایە یان بیرەکەی یان مەنهەجەکەی، تۆش دەترسێی کاریگەری لەسەر ئەو کەسە هەبێت کە هاتۆتە لات و راوێژت پێ دەکات، پێویستە لەسەرت بۆی ڕوون بکەیتەوەو پێی بڵێی: زانست لە لای فلان وەرمەگرە، چونکە واو وایە). [1]

## بۆ هاوەڵانی خۆی ئافرەتی باشی خواستووە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ داخوازی ئافرەتێکی ئەنساڕی کرد لە باوکی بۆ جولەیبیب.

باوکی گوتی: تا روخسەت لە دایکی وەردەگرم.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"ئەمە کارێکی باشە"**.

دەڵێت: پیاوەکە چووە لای خێزانی و بۆی باس کرد.

دایکەکە گوتی: نا بەخوا، پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی نەدیتەوە جگە لە جولەیبیب نەبێت، ئێمە کچی خۆمان نەدایە فلان و فلان!

کچەکە لە ژووری خۆی گوێی لەو قسانە بوو.

پیاوەکە ویستی ئەم هەواڵە بداتە پێغەمبەر ﷺ.

کچەکە گوتی: دەتانەوێ رەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەنەوە، ئەگەر ئەو پێی رازییە، لێی مارەکەن.

وەك ئەوەی لە قسەی دایك و باوکی دەربچێت.

گوتیان: راست دەڵێی.

باوکی چووە لای پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: ئەگەر تۆ لەم پیاوە رازیت، ئێمەش پێی رازین.

فەرمووی: **"بەڕاستی من پێی رازیم"**، هاوسەرگیری لەگەڵ کرد.

---

[1] شرح رياض الصالحين (١١٠/٦)

پاشان خەڵکی مەدینە توشی شەڕ بوون، جولەیبیبیش چوو بۆ شەڕەکە، خەڵکەکە بینیان لە نێوان چەند کەسێکی بێ باوەڕ کوژراوەو، ئەوانیشی کوشتبوو.

ئەنەس دەڵێت: دواتر ئەو ئافرەتەم بینی، کەس لە بێوەژنان ئەوەندەی ئەو لە مەدینە داوای نەدەکرا[1].

## هیچ ئافرەتێکی مارە نەدەکرد، تەنیا دوای ڕەزامەندی نەبووایە:

عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە پیاوێکی فەرموو: **"ئایا ڕازیت فلان ئافرەتت بۆ داخواز بکەم"**.

گوتی: بەڵێ.

بە ئافرەتەکەی فەرموو: **"ئایا تۆ ڕازی هاوسەرگیری لەگەڵ فلانەکەس بکەی"**.

ئافرەتەکە گوتی: بەڵێ.

هاوسەرگیریان کرد، پیاوەکە چووە لای، نە مارەییە ئافرەتەکەی دا، نە هیچیشی پێدا.

ئەو پیاوە لەوانەبوو کە ئامادەی حودەیبیبیە بوو، ئەوانەی بەشداری حودەیبیبیەیان کردبوو بەشێکیان لە خەیبەر هەبوو، لە سەرە مەرگ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فلانە ئافرەتی کردە هاوسەرم، منیش نە مارەییم پێدا، نەهیچشیم دا پێی، ئێستا ئێوە دەکەمە شاهێد من ئەو بەشەی لە خەیبەر وەرمگرت پێی دەدەم.

ئافرەتەکە بەشەکەی وەرگرت و بە سەد هەزار فرۆشتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"باشترین مارەیی ئاسانترینیانە"**[2].

واتە: مەسروف هەرزان بێت، ئاسانترین بێت بۆ مارەکردن، بەڵگە بەمە دەهێندرێتەوەیە لەسەر پیرۆزی ئافرەتەکە و بەرەکەتەکەی، چونکە هاوسەرگیری خۆشەویستییەکە لە نێوان هەردوو هاوسەر، بۆیە ئەگەر مارەییەکە ئاسان بوو، بەرەکەتی دەبێت، لە ئاسانی مارەیی: تێچووی کەم بێت، وازهێنان لە زیادەڕۆیی، هەروەها هەموو ئەوانەی پەیوەست بێت لە پرۆسەی هاوسەرگیریدا وەکو داوەتکردن و شتی تر[3].

---

[1] ئەحمەد (١١٩٤٤) گێراوەتیەوە، شعیب الارناؤوط دەڵێت: لەسەر مەرجی دوو شێخەکە سەنەدەکەی سەحیحیە.

[2] ئەبو داود (٢١١٧) گێراوەتیەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[3] فیض القدیر (٤٨٢/٣)

## ئەو مارەیەی ڕەتدەکردەوە، کە باوکەکە بێ ڕوخسەتی ئافرەتەکە کردبووی:

خەنسای کچی کوڕی خذامی ئەنساری ﵂ دەڵێت: باوکی ئەوی دا بەشو بێوەژن بوو، ئەویش پێی ناخۆش بوو، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش مارەکردنەکەی ڕەتکردەوە [1].

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نابێت ئافرەتی بێوەژن بێ ڕوخسەتی ئەو بە شوو بدرێت، بۆیە ئەگەر باوکەکە ئەم کارەی بە بێ ڕوخسەتی کچەکەی کرد، ڕەتدەکرێتەوە [2].

## گوێی لە سکاڵا و گلەییەکانیانی دەگرتن:

خەولەی کچی سەعلەبە ﵂، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: سوێند بەخوا لەسەر من و ئەوسی کوڕی صامیت خوای پەروەردەگار ﷻ سەرەتای سوڕەتی موجادەلەی دابەزاند.

دەڵێت من لای هاوسەرەکەم بووم، پیاوێکی بەساڵاچوو و هەڵسوکەوت خراپ بوو. ڕۆژێکیان هاتەژوورەوە، منیش بۆ شتێك چوومە لای، تورەبوو گوتی: تۆ بۆ من وەك پشتی دایکم وای.

دەڵێت، پاشان دەرچوو و چووە لای قەومەکەی، دوای کەمێك هاتە ژوورەوە، دیاربوو منی دەویست.

دەڵێت، منیش پێم گوت: نەخێر سوێند بەو کەسەی نەفسی خەولەی بەدەستە، تۆ بۆ من ناشێیت، ئەوەی گوتت گوتت، تا خوا و پێغەمبەرەکەی حوکم لەنێوانماندا نەکەن.

دەڵێت: داوای لێکردم، منیش ڕەتم کردەوە، بەسەریدا زاڵبووم، وەك ژنێك بەسەر پیاوێکی بەساڵاچووی بێ توانا زاڵ دەبێت و لەخۆمم دوورخستەوە.

دەڵێت: پاشان چوومە لای هاوسێکانم، کراسێکم لێ وەرگرتن، دواتر چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای دانیشتم، ئەوەی لە مێردەکەم توشی بووم، بۆم گێڕایەوە، سکاڵای هەڵسوکەوتە خراپەکەم کرد لە لای پێغەمبەر ﷺ.

دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەی خوەیلە، ئامۆزاکەت پیاوێکی پیر و گەورەیە، لەبارەی ئەوەوە لە خوا بترسە"**.

دەڵێت، سوێند بەخوا شوێنەکەم جێنەهێشت تا قورئان لەبارەمەوە دانەبەزی، پێغەمبەری خوا ئەوەی بەسەری هات لەکاتی دابەزینی وەحی بەسەری هات، پاشان لەسەری لاچوو،

---

[1] بوخاری (٥١٢٩) گێڕاوەتیەوە.

[2] عون المعبود شرح سنن ابی داود (٦/٩٠).

فەرمووی: **"ئەی خوەیلە، سوێند بەخوا، خوای پەروەردگار لەبارەی تۆ و هاوسەرەکەت قورئانی دابەزاند"**، پاشان بەسەریدا خوێندمەوە ﴿ قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴾ تا دەگاتە ﴿ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ المجادلة: ١-٤ واتە (ئەی موحەممەد ﷺ بێگومان خوا بیستی و وەریگرت وتووێژی ئەو ئافرەتەی کە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکات دەربارەی هاوسەرەکەی، سکاڵای خۆیشی بۆلای خوا دەبات، خوایش گوێی لە گفتوگۆکەتان بوو، بەڕاستی خوا بیسەرو بینایە.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم **"فەرمانی پێ بکە، با بەندەیەك ئازاد بکات"**

دەڵێت، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەندەی نییە بەندەی پێ ئازاد بکات.

فەرمووی: **"با دوو مانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بێت"**.

دەڵێت، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەو بەساڵاچووە و توانای ڕۆژووی نییە.

فەرمووی: **"با خورما بە شەست کەسی هەژار بدات"**.

دەڵێت، گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەشی نییە.

دەڵێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"دەی کەواتەوە ئێمە بە بەشێك لە بەخشینی خورماکە یارمەتی دەدەین"**.

دەڵێت، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا منیش بە بەشێکی تر یارمەتی دەدەم.

فەرمووی: **"تەواوە، باشت کرد، بڕۆ لە جیاتی ئەو ببەخشە، لەگەڵ ئامۆزاکەشت باش بە"**.

دەڵێت، منیش وام کرد [1].

**ڕێگەی دەدا ئافرەتان بەشداری شەڕ بکەن، بۆ تیمارکردنی برینداران و ئامادەکردنی خواردن:**

ڕەبیعی کچی موعەوید ﵂ دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری شەڕمان دەکرد، خەڵکمان ئاو دەدا، خزمەتمان دەکردن، بریندار و کوژراوەکانمان دەگەڕاندەوە مەدینە [2].

لە گێڕانەوەیەکی تردا (ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، خەڵکمان ئاو دەدا، بریندار و کوژراوەکانمان دەگەڕاندەوە مەدینە).

---

[1] ئەحمەد (٢٦٧٧٤) و ئەبو داود (٢٢١٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (٢٠٨٧)پێشوتر باسکراوە

[2] بوخاری (٢٦٧٠) گێڕاوەتیەوە.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەچووە شەڕ، دایکی سولەیم و هەندێك ئافرەتانی تری ئەنساڕی لە شەڕ بەشداری پێ دەکرد، ئاویان دەدایە خەڵکەکە و برینداره‌کانیان تیمار دەکرد [١].

هەر لە ئەنسەوە ﷺ دەڵێت: عائیشەی کچی ئەبوبەکر و دایکی سولەیم لە شەڕی ئوحد بینی، خۆیان هەڵکردبوو کوندەی ئاویان بە شاندا دەدا و لە دەمی بریندار و خەڵکەکە بەتاڵیان دەکرد، پاشان دەگەڕانەوە پڕیان دەکردەوە، دووبارە لە دەمی خەڵکی بریندار بەتاڵیان دەکردەوە [٢].

دایکی عەطیەی ئەنساڕی دەڵێت: لە حەوت شەڕ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداریم کردووە، لە دوایان دەڕۆیشتم، خواردنم بۆ ئامادە دەکردن و برینداره‌کانم ئاو دەدا و یارمەتی نەخۆشەکانم دەدا [٣].

نەوەوی دەڵێت: لەم فەرموودەیە دەرچوونی ئافرەتی بۆ شەڕ تێدایە، سوود لێوەگرتنیان بۆ مەبەستی ئاودان و تیمارکردن و کاری تر، تیمارکردنەکە بۆ هاسەرەکانیان و کەسانی مەحرەمی خۆیان دەبێت، ئەوەی مەحرەمیان نەبێت، نابێت دەستیان پێ بکەوتێت تەنیا لە شوێنی پێویست نەبێت [٤].

ابن حجر دەڵێت: حوکمی ئەم کارە ئەمەیە، دروستە لە کاتی پێویست پیاوی بێگانە تیمار بکەن، ئەندازەکەشی بە گوێرەی تیمارەکەیە لە دیتن و دەست لێدانی دیاری دەکرێت [٥].

مەحمودی کوڕی لوبەید دەڵێت: کاتێك دەستی سەعد لە شەڕی خەندەق بریندار بوو، برینەکەی لەسەر قورس بوو، بردیانە لای ئافرەتێك پێی دەگوترا: ڕەفیدە، تیماری برینداره‌کانی دەکرد.

پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك دەچووە لای پێی دەفەرمووی: **"چۆن ئێوارەت کردەوە؟"**، کە بەیانیش دەبوو **"چۆن بەیانیت کردەوە؟"**،

ئەویش وەڵامی دەدایەوە [٦].

---

[١] موسلیم (١٨١٠) گێراوەتیەوە.

[٢] بوخاری (٣٨١١) و موسلیم (٤٠٦٤) گێراوەتیانەوە.

[٣] موسلیم (٣٣٨٠) گێراوەتیەوە.

[٤] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٨٨/١٢).

[٥] فتح الباری (١٣٦/١٠).

[٦] بوخاری لە (الادب المفرد ١١٢٩) گێراوەتیەوە، الحافظ ابن حجر لە (الاصابة ١١١٧٥) هەروەها ئەلبانی لە (صحیح الادب المفرد ٨٦٣) بە سەحیحیان داناوە.

**ئاگاداری:**

هەندێك لە بانگخوازانی ئازادی ئافرەت، ئەم فەرموودەیە بە نمونە دێننەوە بۆ کارکردنی ئافرەت بە گشتی، ئەم بەڵگە هێنانەوە پوچەڵە، کارکردنی ئافرەت لە تیمارکردنی بریندارانی و گواستنەوەیان بۆ نەخۆشخانە لە کوێ و کارکردنی وەك سکرتێر لە نوسینگەدا لە کوێ؟

کارکردنی یەکەم لە چوارچێوەی خوێن و لاشەی مردوو دایە، هیچ بوارێك بۆ دروستبوونی ئارەزوو یان ڕوودانی فیتنە نییە، ئایا ئەمە یەکسانە لەگەڵ کارکردنی ئافرەتێکی گەنجی جوان لەگەڵ پیاوان، کە تێکەڵاویان دەبێت و گفتوگیان لەگەڵ دەکات؟!

**کوشتنی ئافرەتانی لە شەڕدا قەدەغەکرد:**

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺدەڵێت: ئافرەتێکی کوژراو لە شەڕێك لە شەڕەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دۆزرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەوە کوشتنی ئافرەت و منداڵی قەدەغەکرد [1].

(زانایان کۆکن لەسەر کارکردن بەم فەرمودەیە، قەدەغەیە ئافرەت و منداڵ بکوژرێت ئەگەر شەڕکەر نەبن) [2].

**پێغەمبەری خواﷺ سووربوو لەسەر پەروەردەکردنی ئافرەتان، بۆ ئەوەی ببنە نمونەی باڵا بۆ کەسانی تر:**

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"خوای گەورە پرسیار لە هەموو بەرپرسێك دەکات لەوەی پێی سپێردراوە، ئایا پاراستوویەتی یان لە دەستی داوە؟ تەنانەت پرسیار لە پیاو دەکرێت لەبارەی ماڵ ومنداڵی [3]".**

پیاو بەرپرسە بەرامبەر فێرکردنی هاوسەرەکەی و ڕێنیشاندانی بەرەو ڕێگای دروست. خراپەکاری لەلایەن زۆرێك لە ژیانی ئافرەتان کە بڵاودەبێتەوە، تەنیا بە هۆی کەمتەرخەمی پیاوانەوەیە لە فێرکردنیان بۆ کاروباری دینیان.

---

[1] بوخاری (٣٠١٥) و موسلیم (١٧٤٤) گێراوەتیانەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٧٤٤).

[3] النسائی لە (السنن الکبری ٩١٧٤) لە ئەنەسەوە ﷺ گێراوەتیەوە، بوخاری (٨٩٣) و موسلیم (١٨٢٩) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گێراوەتیانەوە.

- پێغەمبەر ﷺ خێزانەکانی خۆی لەسەر پەرستن و نزیکبوونەوە لە خوا پەروەردە دەکرد.
- کاتێك دە ڕۆژی کۆتایی ڕەمەزان دەهات، بۆ شەونوێژ و بەندایەتیکردن بە ئاگای دەهێنان.
- لەسەر دڵسۆزی لەپەرستندا پەروەردەی دەکردن.
- فێری دەکردن پەنابگرن بە خوایە.
- فێری زیکری بە سوودی دەکردن، وەك زیکری بەیانیان و ئێواران.
- فێری باشترین و ئاسانترین پەرستنی دەکردن.
- فێری دەکردن لە پەرستندا میانگیربن، نەك توندکردن لەسەر گیانی خۆیان.
- ئامۆژگاری خێزانەکانی دەکرد بۆ بەخشین لە ڕێگەی چاکە.
- لەسەر قسەی باش پەروەردەی دەکردن، قسەی خراپیشی لێ قەدەغە دەکردن، تەنانەت لەگەڵ نا موسڵمانانیش.

پێشتر ئەم بابەتە بە درێژی باسکراوە، لە (بەشی یەکەم: مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خێزانەکانی".

گەر بەم ئادابە جوانانە پەروەردە ببن، دەبنە نمونەی چاك بۆ ئەوانی تر لە ئافرەتانی باوەڕداران، پەروەردگاریش دەفەرموێت:﴿ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴾ الأحزاب: ٣٤

واتای ئایەتەکە: (هەرچی لە ماڵەکانتاندا دەخوێنرێتەوە لە قورئان و فەرموودە یادی بگرن و فەرامۆشی مەکەن و باسی بکەن بۆ خەڵکی، بەڕاستی خوا هەمیشە و بەردەوام بە لوتف ووردبین و بەئاگایە).

# مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بە ساڵاچووان

سوننەتی خوا بەسەر مرۆڤ سەپێندراوە، کە دەبێت لە گەشتی دونیایدا بە قۆناخی جیاجیا گوزەر بکات، بە لاوازی لە دایك دەبێت، پاشان گەنجێتیەکی بەهێز، لە کۆتایشدا دەگاتە پیرێتی لاواز.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ﴾ الروم: ٥٤ **واتە: (خوا ئەو** زاتەیە ئێوەی بەلاوازی دروست کردووە، ئەوسا خوا هێز و دەسەلاتێکت پێ دەبەخشێت، دوای هێزو توانایی دووبارە نۆرەی لاوازی و پیری دێت، بێگومان ئەو خوایە هەرچی بوێت دروستی دەکات).

ئیسلام سوورە لەسەر بایەخدان بە قۆناغی پیری، کردویەتییە وێستگەی رێزلێنان و بەتەنگەوە هاتنی، چونکە خاوەنی ئەم قۆناغە بە لاوازی وەسف دەکرێت، پێویستی بە کەسێکە خزمەتی بکات و کاروبارەکانی جێبەجێ بکات، بۆیە قۆناغێکی هەستیارە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"پەروەردگارا پەنادەگرم بە تۆ لە لاوازی، لە تەمبەڵی، لە ترسنۆکی و لە پیری"**[(١)].

هەروەها دەفەرموێت: **"پەروەردگارا پەنادەگرم بە تۆ لەوەی بگەمە لاوازترین تەمەن"**[(٢)].

مەبەست لە لاوازترین تەمەن، کەنەفتی و کەمبوونی هێزە، چونکە مرۆڤ لەو تەمەنە هێزە ئاشکرا و نادیارەکانی کەم دەبێت، تەنانەت هێزە عەقڵییەکانیشی کەم دەبێت، مرۆڤ لە بیری دەچێت چی کردووە[(٣)].

نەوەوی دەڵێت: (پەناگرتنی لە پیری، کە مەبەست لێی گەیشتنە بە لاوازترین تەمەن، وەك لە هەردوو فەرموودەدا باسی کردووە، هۆکارەکەی بۆ ئەوەیە، کە جۆرێك لە سەرلێشوانی تێدایە، هەروەها لە دەستدانی عەقڵ و هەستەوەرەکان و تێکەیشتن، تێکچوونی هەندێك لە دیمەنەکانی مرۆڤ، نەتوانینی ئەنجامدانی هەندێك لە پەرستشەکان و سادەکاری کردن لە هەندێکیان[(٤)]).

---

(١) بوخاری (٢٨٢٣) و موسلیم (٢٧٠٦) لە ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گێراوەتیانەوە.
(٢) بوخاری (٢٨٢٢) لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص ﷺ گێراوەتیەوە.
(٣) تفسیر السعدی (٤٤٤/١) بە دەستکارییەوە.
(٤) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٩/١٧).

پێغەمبەری خوا ﷺ مامەڵەی تایبەتی لەگەڵی پیر و بەساڵاچوان کردووەو بایەخی تایبەتی بە چاوێریکردنیان داوە، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەن ڕەوشتێکی جوان بووە لەگەڵ هەموو خەڵکی، بەڵام لەگەڵ کەسانی بێهێزی وەك منداڵ و ئافرەت و پیرەکان بە سۆزترین کەس بووە.

**پێغەمبەر ﷺ پیاوی بە تەمەنی بە باشترین کەس داناوە، گەر کردەوەی چاك بێت.**

ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێت: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کێ باشترین کەسە؟

فەرمووی: **"ئەو کەسەی تەمەنی درێژ بێت و کرەوی چاك بێت"**.

گوتی: ئەدی کێ خراپترین کەسە؟

فەرمووی: **"ئەو کەسەی تەمەنی درێژ بێت و کردەوەی خراپ بێت**[1]**"**.

طیبي ﷺ دەڵێت: کات وەك سەرمایەی بازرگان وایە، پێویستە هەر کەسێك لەوەی هەیەتی بازرگانی پێوە بکات، هەر کاتێك سەرمایەکەی زۆر بوو، قازانجی زۆر دەبێت، هەر کەسێك سودی لە تەمەن وەرگرت و کاری چاکی کرد، ئەوە براوە و سەرفرازە، هەر کەسێك سەرمایەی خۆی لەناو بیات و قازانج نەکات، کەوتۆتە ناو زەرەرێکی گەورە و ئاشکرا).[2]

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: **"هیچ کەسێك هێندەی ئەو باوەڕدارە لای خوای پەروەردەگار گەورە و بەڕێز نییە، کە تەمەنی خۆی لە ئیسلام بەڕێکردبێت لە تەسبیحات و الله اکبر و لا اله الا الله "**.[3]

هەروەها فەرموویەتی: **"باشترینتان، ئەوەیە کە تەمەن درێژترینتانە و کردەوەشی لە هەمووتان باشتر بێت "**.[4]

## ئۆمەتەکەی هاندەدا لەسەر ڕێزگرتنی بەساڵاچوان:

ئەبو موسای ئەشعەری ﷺ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی **"إنَ من إجلال الله: إكرامَ ذي الشيبة المسلم، و حاملِ القرآن غيرِ الغالي فيه والجافي عنه، وإكرامَ ذي السلطان المقسط**[5]**"**.

**"إنّ من إجلال الله"** واتە: لە بەرز و پیرۆز ڕاگرتنی خوای گەورە.

---

[1] ترمذي (٢٣٢٠) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە(صحیح الجامع ٣٢٩٧) بە سەحیحی داناوە.

[2] تحفة الاحوذي (٥١٢/٦).

[3] ئەحمەد (١٤٠٤) لە تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٥٣٧١) بە سەحیحی داناوە.

[4] الحاكم (١٢٥٥) لە جابری کوڕی عەبدوڵڵا گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٣٢٦٣) بە سەحیحی داناوە.

[5] ئەبو داود (٤٨٤٣) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٢١٩٩) بە سەحیحی داناوە.

"**إكرام ذي الشيبة المسلم**" واتە: ڕێزگرتنی کەسی بەتەمەنە لە ئیسلام، ئەویش بە ڕێزلێنان و نەرمونیانی و بە سۆز بوونە لەگەڵی.

ئەم کردەوەی بە پیرۆز ڕاگرتنی خوای گەورە ئەژمار کردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێگە گەورەیەی بەساڵاچووان لەلای خوای گەورە هەیانە، هەروەها لەبەر ئەو تەمەنەی لە ئیسلامدا بەڕێی کردووە و ئەو مافەی لەسەر کەسانی دیکە هەیەتی.

ئەمە جگە لەوەی مافی ئەو توێژە لە ناو کۆمەڵگا دیاردەکات، چونکە شەرع ئەم مافەی پێداوە.

"**حامل القرآن**"، واتە: ڕێزگرتنی قورئان خوێن و لەبەرکەرانی و موفەسیرانی.

"**غير الغالي فيه**"، واتە: جگە لەوانە نەبێت کە سنوری کارکردن بە قورئانیان بەزاندووە، بەدوای لایەنە شاراوەکانی کەوتووە و واتاکانی لەلا ئاڵۆز بووە.

"**غير الجافي عنه**"، جگە لەوانە نەبێت کە دوورکەوتوونەتەوە لێی، پشتیان لە خوێندنەوە و تێگەیشتنی واتاکان و کار پێکردن پێی کردووە.

"**وإكرام ذي السلطان المقسط**"، واتە ڕێزگرتن لە دەسەڵاتداری دادپەروەر [1].

پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیە هەرسێ جۆر (بەساڵاچووان و هەڵگرانی قورئان و دەسەڵاتدارانی) بە یەکەوە بەستۆتەوە، بەساڵاچووی پێش هەردووکیان خستووە، وەك ئەوەی بڵێت: ڕێز لە کەسی بەساڵاچوو بگرن، وەك چۆن ڕێز لە دەسەڵات و هەڵگرانی قورئان دەگری، هەروەها کەسی بەساڵاچووی بە هەمان شێوەی هەڵگری قورئان بە گەورە داناوە.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پیاوێکی پیر هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، خەڵکەکە لە ڕێگە بۆ کردنەوەی خاوەخاویان کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: "**لە ئێمە نییە ئەو کەسەی بەزەیی بە بچوکمان نێت و ڕێز لە گەورەکانمان نەگرێت**[2]".

لە گێڕانەوەیەکی تردا:"**هەر کەسێك بەزەیی بە بچوکمان نەکات و دان بە مافی گەورەکانمان نەنێت، لە ئێمە نییە**[3]".

"**لە ئێمە نییە**"، واتە: لەسەر ڕێگەی ئێمە نییە، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ بەریبوون، بەو پێیەی پێغەمبەر ﷺ خۆی لێ بەریکردووە لەکۆمەڵەی ئەو بێت، واتە ئەو کەسە موسڵمان

---

[1] عون المعبود (١٣٢/١٣).

[2] ترمذي (١٩١٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە(الصحيحة ٢١٩٦) بە سەحیحی داناوە.

[3] ئەبو داود (٤٩٤٣) لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٦٥٤٠) بە سەحیحی داناوە.

نییە ڕێز لە گەورە نەگرێت، لە کۆمەڵگەی موسڵمانانیش شتی وانییە کەسێك ڕێز لە پیر و بەساڵاچووان نەگرێت.

**"دان بە مافی گەورەکانمان نەنێت"**، واتە ئەوەی پێویستە بۆی لە ڕێزلێنان و بەگەورەدانان.

فەرموودەی **"ڕێزی گەورەکانمان"** ڕەوانبێژترە لە قسەی "ڕێزی گەورە"، واتە دەستدرێژی کردن بۆ سەر کەسی بەتەمەن و پیر، جا بە قسە یان بە کردەوە یان بە ئاماژە بێت، لەراستیدا ئەوە دەستدرێژیە بۆ سەر خودی پێغەمبەری خوا ﷺ کە مرۆڤی بەتەمەن و بەساڵاچووی گەڕاندۆتەوە لای خۆی کە فەرموویەتی **"گەورەکانمان"**.

## بۆیە هاوەڵان قەدر و ڕێزی پیاوانی بەتەمەنیان دەزانی:

ابن کثیر لە تەڵحەی کوڕی عەبدوڵڵاوە دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: عومەر لە شەوێکی تارێك چووە ماڵێك، کاتێك بەیانی هات، من چوومە ماڵەکە، دەبینم پیرەژنێکی نابینای لێیە دانیشتووە.

پێم گوت: ئەم پیاوە بۆچی دێتە لات؟

گوتی: بۆ ماوەی ئەوەندە ڕۆژە بەڵێنی پێداوم، بەوەشتەی بۆ من باشە دێتەلام، ئازاریشم لەسەر لادەبات[1].

ئەو نمونە پڕشنگدارانەی مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی بە ساڵاچوو و چاودێریکرنیان، دیوی قێزەونی کۆمەڵگەی ناموسڵمان نیشان دەدات، بەو پێیە ناوە ناوە هەواڵی ئەوانەمان پێ دەگات،کە چی بەسەر هەندێك بەساڵاچوان دێت و بۆماوەی چەند لە شوێنی تەنیایی جێدەهێڵدرێن.

یەکێك لە ڕاپۆرتەکان ئاماژە بەوە دەکات مافی کەسی بەساڵاچوو لە زۆربەی جیهان پێشێل دەکرێت، ئەو توێژە بە هۆی پشت گوێ خستنیان و هەژاریان دەناڵێنن، ژمارەیەکی زۆر لەوانە بژێوی ڕۆژانەیان نییە.

لە ڕاپۆرتێکدا لە ژێر ناونیشانی "حاڵی بەساڵاچووان لە ساڵی ٢٠٠٢"، کە ٣٢ وڵاتی گرتۆتەوە، ئاماژە بەوە دەکات کە بەساڵاچووان بێ بەشن لە چاودێری تەندروستی و فێربوون، دەسەڵات و بەرپرسان خۆیان لەم بابەتە شاردۆتەوە، بەساڵاچووان گۆشەگیرن لە کۆمەڵگە.

---

[1] البداية والنهاية (١٥٣/٧).

یەکێك لە ئامادەکارانی ئەم راپۆرتە دەڵێت: "وەك ئەوەی گەر تۆ بگەیتە تەمەنی شەست ساڵی مامەڵەی مرۆڤت لەگەڵ ناکەن".

تەنانەت کەسانێکی دڵ ڕەق دوادەکەن بەساڵاچووانانیان لە کۆڵ بێتەوە، بە بیانوی ئەوەی هیچ سوودیان نییە!

ئەوەی کێشەکەی ئاڵۆزتر کردووە ئەوەیە،کە ژمارەی بە ساڵاچووان ساڵانە لە زیادبوون دایە.

سەرژمێری ساڵانەی بەساڵاچووان: سەرژمێری دانیشتووان ئاماژە بەوە دەکات،کە لە سەدەی بیست ژمارەی بە ساڵاچووان لە سەرجەم جیهان زیادی کردوە، رێژەکە لە ساڵی ١٤٠٠ ك/١٩٨٠ ز گەیشتۆتە ٣٧٦ ملیۆن کەس لە جیهان.

ژمارەکە گەیشتە ٤٢٧ ملیۆن کەس بۆ ساڵی ١٤١٠ ك/١٩٩٠ ز، کە نزیکەی ٨,٨٪ ژمارەی دانیشتوانی جیهان پێك دێنێت، بۆ ساڵی ١٤٢٠ ك/ ٢٠٠٠ ز ژمارەی بەساڵاچووان گەیشتە ٥٩٠ ملیۆن کەس.

پێشبینی دەکرێت ئەم ژمارە بۆ ساڵی ١٤٤٠ ك/٢٠٢٠ ز بگاتە ملیارێك و ١١٧ ملیۆن کەس، کە دەکاتە نزیکەی ٢٥٪ ژمارەی دانیشتووان [1].

ئێستا کۆمەڵگەی ئەوروپا بەرەو پیری دەچێت، بە هۆی کەمی ژمارەی لە دایکبوون و مردنی زۆر، بۆیە دەبینن گەنجیان کەمە، ئەمەش بە پێچەوانەی کۆمەڵگەی موسڵمانان، کە دەبینن رێژەی گەنجانی زۆرە بە هۆی زۆری رێژەی لە دایکبوون.

بە ساڵاچووان کاتێك ئازاردانی منداڵەکانیان و کەمتەرخەمی کۆمەڵگە دەبینن دەڵێن: بۆچی منداڵمان ببێت لە کاتێکدا ئەوە پاداشتی کۆتاییمان بێت لەلایەن منداڵەکانمان؟ سەگەکان بۆ ئێمە لە وان بەوەفاترن، پەروەردەکردنی سەگ لە بەخێوکردنی منداڵێکی خراپ وسەرپێچیکار باشترە!

لە بایەخ پێدانیان بۆ سەگ و بە خێوکردنی شتی سەیرو سەمەرە دەبینین.

لە رۆژئاوا نەخۆشخانە و ئوتێل و پۆشاکی تایبەت بە سەگان هەیە، منداڵی مرۆڤیش فەرامۆش دەکەن بۆ ئەوەی برسیەتی و نەخۆشی بیان کوژێت!

بە فەزڵی خوای گەورە بە ساڵاچووانی کۆمەڵگاکانمان -تەنیا هەندێکیان نەبێت- خاوەنی رێزوحورمەتن، ئەمەش لەژێر رۆشنایی رێنماییە جوانەکانی ئیسلامە، کە هانی رێزگرتن و چاکەکردن لەگەڵیان دەدات.

بە ساڵاچووی ئێمە کاتێك دەچێتە نەخۆشخانە، دەبینی کوڕەکان سرە دەگرن بۆ خزمەتکردن و سەردانیکردنی، بەڵکو بۆ ساتێکیش بە جێی ناهێڵن.

---

[1] لە ماڵپەری (Http:// fac.kusu.eDus.sa/assaLManea/pubLcaions)

## ڕێزی تەمەن و بێ توانایی دەگرتن، دەستپێشخەری دەکرد بۆ سەردانی کردنیان:

کاتێك پێغەمبەر ﷺ مەککەی فەتح کرد و چووە ناو مزگەوتی حەرام، ئەبو بەکر ئەبو قوحافەی باوکی لەگەڵ خۆی هێنا، کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەوی بینی فەرمووی: **"نە دەکرا ئەو پیاوە پیرەت لەماڵەوە بەجێ هێشتبا و بۆ ئەوەی خۆم سەردانیم بکردبا"**.

ئەبوبەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو شایەنترە لەوەی بێتە لای جەنابت نەك تۆ بچیتە لای.

لە بەردەمی دانیشت و دەستی بەسەر سینگی داهێناو و پێی فەرموو: **"موسڵمان بە"**، ئەویش موسڵمان بوو[1].

لەم فەرموودەیەدا چەند لایەنێکی ڕێزگرتنی پێغەمبەری ﷺ بۆ ئەو پیاوە پیرە تێدایە، لەوانە:

ئەو ویستی خۆی سەردانی بکات، کاتێکیش هات لەبەردەمی خۆی داینا، ئەمەش تەواوی ڕێزگرتنە، دواتر دەستی بەسەر سینگی داهێنا.

## بە جوانی پێشوازی لێ دەکردن:

پێشوتر چیرۆکی پێشوازی لەو پیرەژنمان باس کرد کە دەستە خوشکی خەدیجە بوو، کاتێك چووە لای پێی فەرموو: **"ئێوە چۆنن، حاڵتان چۆنە، لە دوای ئێمە چیتان لێهات؟"**.

خاتوو عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا بەم پێشوازییە جوانە ڕێزت لەم پیرەژنە گرت!

فەرمووی: **"ئەی عائیشە، ئەمە لەسەر دەمی خەدیجە دەهاتە لامان، بە وەفاداری بوون لە باوەڕەوەیە[2]"**.

زۆر بەجوانی پێشوازی لێکرد و پرسیاری حاڵیانی لێکرد، ئەم جۆرە مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەم پیرەژنە بەتەمەن دەرخەری ئەو ڕەوشتە بەرزە و مامەڵە جوانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەرییەتی.

## گاڵتەی لەگەڵ دەکردن:

بەر لە ئێستا فەرموودەی ئەم پیرەژنە باسکرا،کە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە خوای گەورە بمباتە بەهەشت.

فەرمووی: **"ئەی دایکی فلان، پیرەژن ناچێتە بەهەشت"**.

---

[1] ئەحمەد (٢٧٠٠١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعلقيات الحسان ٧١٦٤) بە "حەسەنی" داناوە.

[2] الحاكم لە (المستدرك ٤٠) بە سەحیحی داناوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢١٦) بە سەحیحی داناوە.

فـەرمووی: "پێـی رابگەیـەنن، مەبەسـت ئەوەیـە بـە پـیری ناچـێتە بەهەشـت، وەك خـــوای گـــەورە دەفـــەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنشَأۡنَٰهُنَّ إِنشَآءٗ (٣٥) فَجَعَلۡنَٰهُنَّ أَبۡكَارًا (٣٦) عُرُبًا أَتۡرَابٗا ﴾ الواقعة: ٣٥–٣٧ [1]

**مژدەی رەحمەتی پەروەردگاری پێدەدان و نائومێدی نەدەکردن:**

عەمری کوڕی عەبەسە دەڵێت: پیاوێکی بە تەمەن بە گۆچانێك دەڕۆیشت هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ .

گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من چەند گوناهێکم هەیە، ئایا خـوای گـەورە لـێم خـۆش دەبێت؟

فەرمووی: " **شاهێدی نادەی کە هیچ خوایەك نییە جگە لە الله**".

گوتی: بەڵێ، شاهێدیش دەدەم کە تۆ پێغەمبەری خوای.

فەرمووی: "**بە دڵنیایی خوای گەورە لە گوناهەکەت خۆش بووە** [2]".

لە گێڕانەوەیەکی تردا: پیاوەکە بە گوتنی "الله أکبر، الله أکبر" هاتەدەرەوە [3].

**لـە راسـپاردەکانی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ هـاوەڵانی لـە کـاتی شـەڕدا: مرۆڤـی بـە تەمـەن نەکوژرێت، تەنیا ئەگەر یارمەتیدەری شەڕ بێت:**

بەریدەی کوڕی حەصیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك فەوجێکی ناردبا پێـی دەفەرموون: "**هیچ مرۆڤێکی بە تەمەن نەکوژن** [4]".

طحاوي دەڵێت: قەدەغەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لـە کوشـتنی مرۆڤـی بـە تەمـەن لـە شەڕدا، فەرمانێکی جێگیرە بۆ ئەوانەی یارمەتیدەری شەڕ نین و هیچ بـە شـداریکردنێکیان تێدا نییە.

لە فەرموودەی دورەید [5] بۆ ئەو پیرانـەی کـە یارمەتیـدەری شـەڕ بـوون وەك دورەید، کوشـتنیان لــە حاڵــەتی شــەڕدا ئاســاییە، تەنانــەت ئەگــەر شــەڕیش نەکــەن، چــونکە یارمەتیدەری ئەوان بۆ شەڕەکە زۆر گەورەترە لە شەڕکردنیان،چونکە لەوانەیە شەڕ بە بێ ئەوان هەر گەرم نەبێت و نەچێتە سەر، ئەگەر ئەمەش ئەوها بوو ئەوا دەکوژرێن))

---

[1] ترمذی لە شمائل (لا ١٩٩) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٢٩٨٧)، بە سەحیحی داناوە.

[2] ئەحمەد (١٨٩٣٩) گێراوەتیەوە، أرناؤوط دەڵێت: فەرموودەیەکی سەحیحیە بە شاهێدەکانیەوە

[3] ابن ابی الدینا لە (فی حسن الظن بالله ( ١٤٤) گێراوەتیەوە.

[4] طحاوي لە (شرح معانی الآثار ٥١٨٤) گێراوەتیەوەو ئاماژەی بە سەحیحی کردووە.

[5] واتە: ئەو شەڕەی دورەیدی تیایدا کوژرا، کە پیاوێکی بە تەمەن بوو.

بەڵگەش لەسەر ئەمە قسەی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە فەرموودەی رەباحی برای حەنزەلە لەبارەی ئافرەتێکی کوژراوەوە فەرمووی: "**خۆ ئەمە شەڕی نەدەکرد**[1]"، واتە: ناکوژرێت چونکە شەڕ ناکات، ئەگەر شەڕیشی کرد دەکوژرێت و هۆکاری نەکوشتنی لەسەر هەڵدەگیرێت.

لەکوژرانی دورەیدی کوڕی صەممە بۆ ئەو هۆکارەی باس کرا، بەڵگەیە بۆ کوژرانی ئافرەتی تەکبیرکەری شەڕ وەك ئەو پیاوە پیرەی بە پیلان دانان کاروباری شەڕ هەڵدەسوڕێنێ، ئەوەی کە باسمان کرد پێویستە واتای ئەم فەرموودانە ئەوها روون بکرێتەوە[2].

## لە زۆربەی کاروباردا پێشی دەخستن:

لەوانە پێش خستنیان لە قسەکردندا: وەك چیرۆکی ئەو پیاوەی لە شەڕی خەیبەر کوژرا، دوو پیاوی خزمی هاتن بۆ ئەوەی لەبارەی کوژراوەکە قسە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن: عەبدولرەحمانی کوڕی سەهل و موحەیسە و حوەیسەی هەردوو کوڕی مەسعود چوونە لای پێغەمبەر ﷺ، عەبدولرەحمان دەستی بە قسەکردن کرد، ئەویش فەرمووی: "**گەورەکە، گەورەکە**"، چونکە عەبدولرەحمان لە هەموویان گەنجتر بوو، بێ دەنگبوو، ئینجا دووەکەی تر قسەیان کرد[3].

کە فەرمویەتی :"**گەورەکە، گەورەکە**"، واتە با کەسە گەورەکە دەست پێبکات[4].

هەروەها پێش خستنیان بۆ ئاوخواردنەوە: ئەبو یەعلا لە کوڕی ئیبن عەباسەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك ئاویان بۆ هێنابا، دەیفەرموو: "**لە گەورە دەست پێ بکەن**"، یان دەیفەرموو: "**لە گەورەکانەوە**[5]".

## پێش خستنیان لە پێش نوێژی کردن:

ئەبو مەسعودی ئەنساری ؓ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموویـن: "**کامەیان قورئان خوێندنی باشترە با ئەو پێش نوێژی بکات، گەر قورئانیان وەك یەك بوو با ئەو**

---

[1] ئەبو داود (٢٦٦٩) و ابن ماجە (٢٨٤٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٧٠١) بە سەحیحی داناوە.
[2] شرح معانی الآثار ( ٣/٢٢٤).
[3] بوخاری (٣١٧٣) و موسلیم (١٦٦٩) گێڕاوەتیانەوە.
[4] فتح الباری (١/١٧٧).
[5] ئەبو یەعلا (٢٤٢٥) گێڕاوەتیەوە، ابن حجر دەڵێت "سەنەدەی بەهێزە"، فتح الباری (١٠/٨٧).

**کەسەی زووتر کۆچی کردووە پێش بکەوێت، گەر لە کۆچکردنیش وەك یەك بن، با بە تەمەنترینیان پێش بکەوێت[1]"**.

## پێش خستنیان بۆ زوو سەلامکردن لێیان:

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"بچوك سەلام لە گەورە دەکات، ئەو کەسەی لە ڕێگا دەڕوات سەلام لە دانیشتوو دەکات، ژمارەی کەم سەلام لە ژمارە زۆرەکان دەکەن[2]"**.

## پێش خستنیان لە بەخشین:

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"لە خەو بینیم، سیواکم دەکرد، دوو پیاو سەرنجیان ڕاکێشام، یەکیان لەوی تریان گەورەتر بوو، سیواکەکەم دایە بچوکەکەیان، پێم گوترا: گەورەکە، منیش دامە گەورەکەیان[3]"**.

ابن بطال دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا پێش خستنی پیاوی بە تەمەن بۆ سیواکی تێدایە، هەروەها پێویستە پیاوی بە تەمەن لە خواردن و خواردنەوە و قسەکردن و ڕۆیشتن و لە هەموو پێگەیەك پێش بخرێت، ئەمەش بە پشت بەستن بە بەڵگەی سیواکەکە، هەروەها بە بەڵگەی فەرمایشی پێغەمبەر ﷺ کاتێك بە هەردوو برای حوەسیە و مەحیسەی فەرموو: **"گەورەکە، گەورەکە"**، مەبەستی ئەوەبوو گەورەتر قسە بکات، ئەمەش لە ئەدەبی ئیسلامە.

مهلب دەڵێت: پێش خستنی کەسی بە تەمەن لە هەموو شتێك لەپێش ترە، ئەگەر مەجلیسەکە ڕێك نەبوون، بەلام ئەگەر ڕێك بوون سوننەتە کەسی دەستە ڕاست پێش بخرێت، دەستە ڕاست لە سەرۆك و زانا، وەك لە فەرموودەی خواردنەوەی شیر دا هاتووە[4].

ابن حجر دەڵێت :ئەمە صەحیحە[5].

سەهلی کوڕی سەعدی ساعدی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنەوەیەکی هێنا، لێی خواردەوە، لەلای ڕاستی گەنجێك هەبوو، لەلای چەپیشی پیاوێکی پیر هەبوو.

بە گەنجەکەی فەرموو: **"ڕوخستەم پێ دەدەی، لەوانەوە دەست پێ بکەم"**.

---

[1] موسلیم (٦٧٣) گێراوەتیەوە.
[2] بوخاری (٦٢٣١) و موسلیم (٢١٦٠) گێراوەتیەوە.
[3] موسلیم (٢٢٧١) گێراوەتیەوە.
[4] شەرحی سەحیحی بوخاری ابن بطال (١/٣٦٤).
[5] فتح الباری (١/٣٥٧).

گەنجەکە گوتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، بەشی خۆم لە تۆ نادەمە کەس.
پێغەمبەری خوا ﷺ دایە دەستی [1].

نەوەوی دەڵێت: ئەم وتەی پێغەمبەر بۆ کەمەندکێشکردنی دڵی پیرە پیاوەکان و نیشاندانی خۆشەویستی و رێزلێنانیانە، هەروەها دەرخستنی سوننەتی دەستپێکردنە لەلای راستەوە، واتە کەسی لای راست شایەنترە، نادرێتە کەسێکی تر بێ روخسەتی لای راست، ئاساییە روخسەتی لێوەربگیرێت [2].

پێش خستنی کەسی بە تەمەن تایبەتە، تەنیا ئەگەر کەسێکی تر لەو رووەوە شایەنتر نەبێت.

ئەم فەرموودانە بۆمان روون دەکاتەوە،کە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ کەسی بە تەمەنی پێش کەسانی بچوکتر خستووە، بە تایبەت ئەگەر شایەنتر بێت، یان زانست و زانیاری لە کەسانی تەمەن بچوک زیاتر بێت.

هەروەها ئاماژەیەکیشە بۆ رێزلێنان لە کەسی بە تەمەن و بێ رێزی نەکردن بەرامبەریان، چونکە کاتێك کەسێکی بچوك پێش کەسێکی گەورە دەکەوێت، کەسە گەورەکە نیگەران دەبێت، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە کەسی بە تەمەن پێش بخرێت.

## زۆرێك لە حوکمە شەرعییەکانی لەسەر سوك دەکردن:

### لەوانە: رێگەدان بە حەجکردن بە شێوەی نوێنەرایەتی کردن بۆ کەسێك نەتوانێت بەخۆی حەج بکات:

ئیبن عەباسؓ دەڵێت: ئافرەتێك لە خەثعەم هات و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، حەج فەرزی خوایە لەسەر بەندەکانی، باوکیشم پیاوێکی بە تەمەنە، ناتوانێت لەسەر پشتی وڵاخ بوەستێت، دەتوانم لە جیاتی حەج بکەم؟
فەرمووی: **"بەڵێ"**.

### لەوانە: عەفو کردنی لە رۆژوو بە هۆی لاوازی و کەفارەت لەجیاتدانی:

لە فەرموودەی خەولەی کچی ثەعلەبە کاتێك ئەوسی کوری صامیتی پیاوی ظیهاری لێکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"پێی بڵێ با بەندەیەك رزگار بکا"**.

ئافرەتەکە گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەر پارەی نییە بەندەی پێ ئازدا بکات.

[1] بوخاری (٣٢١٩) و موسلیم (٢٠٣٠) گێراوەتیانەوە.
[2] شەرحی سەحیحی موسلیم (٢٠١/١٣).

فەرمووی: **"با دوو مانگ بە ڕۆژوو بێت"**.

گوتی: سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ئەو پیاوێکی پیرەو توانای ڕۆژوو گرتنی نییە.

فەرمووی: **"با خورما بداتە شەست هەژار "**.

گوتی: گوتم سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری ئەمەشی نییە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"دەی کەواتە ئێمە بە بەشێك لە بەخشینی خورماکە یارمەتی دەدەین"**.

ئافرەتەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا منیش بە بەشێکی تر یارمەتی دەدەم.

فەرمووی: **"تەواوە، باشت کرد، بڕۆ لە جیاتی ئەو ببەخشە، لەگەڵ ئامۆزاکەشت باش بە"**.

دەڵێت، منیش وام کرد [١].

**لەوانە:** فەرمانکردنی پێغەمبەر ﷺ بە پێش نوێژ خوێنەکان نوێژەکانیان سوك بکەن وەك ڕەچاوکردنی حاڵی ئەو کەسە پیرانەی لە دوای نوێژ دەکەن:

لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەری خوا دەفەرموێت: **"گەر کەسێك لە ئێوە نوێژی بۆ خەڵك کرد، با نوێژەکە کورت بکات، چونکە لەناو خەڵکی نوێژخوێن کەسانی لاواز و نەخۆش و بە تەمەن هەیە، گەر کەسێکیشتان بە تەنیا نوێژی کرد با بە ئارەزووی خۆی درێژی بکاتەوە [٢]"**.

**لەبەر نزیك بوونەوەی ئەجەلیان، یادی خوای گەورەی بەبیر دەهێننانەوە:**

کەسی بە تەمەن لە مردن نزیکە، پێویستە لەسەری تۆبە بکات و خۆی بۆ دیداری پەروەردگار ئامادە بکات، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُ﴾ فاطر: **٣٧**

واتای ئایەتەکە: (ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیربکاتەوە ؟! بێدارکەرەوەشتان بۆ هات).

ئیبن عەباس دەڵێت: "مەبەست لێی پیرییە [٣]".

---

[١] ئەحمەد (٢٦٧٧٤) و ئەبو داود (٢٢١٤) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء) بە سەحیحی داناوە (٢٠٨٧) پێشوتر باسکراوە .

[٢] بوخاری (٦٧١) و موسلیم (٤٦٨) گێڕاوەتیانەوە.

[٣] تەفسیری ابن کثیر (٦/٤٩٣)، بوخاری لە سەحیحەکە لەبەشی (الرقاق) بە (تعلیق)ی داناوە.

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"خوای گەورە بیانوی ئەو کەسەی نەهێشت کە تەمەنی درێژکردەوە تا گەشیتە شەست ساڵی**[1]".

"نەهێشتنی بیانوو"، واتە ئەو کەسە هیچ بیانوییەکی نییە بڵێ: ئەگەر تەمەنم ئەوەندە درێژ بووایە ئەوەی فەرمانم پێ کرابایە دەمکرد.

بەو پێیەی ئەو کەسە هیچ بیانووی بۆ بەجێ نەگەیاندنی فەرمانەکان نییە، لە کاتێکدا بەو تەمەنەی هەیبوو دەیتوانی بیکات، ئەو کات هیچی بۆ نییە تەنیا داوای لێخۆشبوون و گوێڕایەڵی و ئامادەسازی بۆ دوارۆژ نەبێت[2].

ابن بطال دەڵێت: گلەیی بۆ نەهێشت، واتا هیچ بیانوو و گلییەك دوای ئەمە نییە، چونکە شەست ساڵی نزیکە لە کۆتایی تەمەنی، دەکاتە ساڵی گەڕانەوە و مل کەچ بوون بۆ خوای پەروەردگار و چاوەڕوانی دیداری خوا.

ئەمە ئاگاداریە دوای بیانوو نەهێشتن، خودا وەك میهرێك بۆ بەندەکانی کردویوتی کە لە نەفامی بەرەو زانینی بردونەو، ئاگاداری دوای ئاگاداری بۆ ناردوون، سزای نەداون مەگەر کاتێك هەموو بەڵگەکانیان لەسەر چەسپا بوو بێت و عوزریان نەما بێت.[3]

**لە بەرامبەر چێژی دونیا و کۆکردنەوەی پارە هۆشداری پێ دەدان:**

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"دڵی مرۆڤی بە تەمەن لەسەر خۆشەویستی دوو شت هەر گەنجە ئەوانیش: چێژی دونیا و زۆری پارە**[4]".

لە بوخاریدا هاتووە: **"هێشتا دڵی مرۆڤی بە تەمەن گەنجە لەسەر دوو شت: خۆشەویستی دونیا و ئومێد درێژی"**.

واتا: دڵی کەسی بە تەمەن خۆشەویستییەکی بە هێزی بۆ ماڵ هەیە وەك هێزی گەنج لە گەنجییەتی[5].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"یَهرمُ ابنُ آدم، وتشبُّ منه اثنتان: الحرص على المالِ والحرصُ على العمر**[6]".

**"یهرمُ ابن آدم"**، واتە ئادەمیزاد پیر یان لاواز دەبێت.

---

[1] بوخاری (٦٠٥٦) گێڕاویەتییەوە.
[2] فتح الباری (١١/٢٤٠).
[3] شەرحی سەحیحی بوخاری ابن بطال (١٠/١٥٣).
[4] بوخاری (٦٤٣٠) و موسیلیم (١٠٤٦) گێڕاوەتیانەوە.
[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٧/١٣٨).
[6] بوخاری (٦٤٢١) و موسلیم (١٠٤٧) گێڕاوەتیەوە.

**"يشبُ منه اثنتان"** دوو شت لە رەوشتی ئەو بە هێز دەبن یان گەشە دەکەن.
**"الحرص على المال"**، واتە تەماعی کۆکردنەوەی پارە و سامان.
**"الحرص على العمر"**، واتە تەماعی تەمەندرێژی [١].

قرطبي دەڵێت: لەم فەرموودەیەدا خراپی چێژی تەمەندرێژی و کۆکردنەوەی پارە و سامان نیشان دەدات، بەو پێیەی ئەمە لە کارە جوانەکانی نییە.

حیکمەتیش لە باسکردنی تەنیا ئەم دوو شتە، چونکە خۆشەویسترین شت لای ئادەمیزاد مانەوەیە لە ژیاندا، حەز دەکات تەمەنی درێژ بێت، پارە وسامانی خۆش دەوێت، ئەمەشیان گەورەترین هۆکارە بۆ ئەوەی بە تەندروستییەکی باش ژیانە درێژەکەی تیایدا بەڕێ بکات، هەر کاتێك هەستی کرد ئەمە کەم دەبێت، خۆشەویستی و ئارەزووی بۆ بەردەوامبوونی زیاتر دەبێت [٢].

## هەڕەشەی سزای پیاوی بە تەمەن لەوانی تر گەورەترە:

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێت: **"سێ کەس لە رۆژی دوایی خوای گەورە نە دەیاندوێنێت، نە پاکیان دەکاتەوە، نە تەماشایان دەکات، سزای بە ئێشیان بۆ هەیە، ئەوانیش: پیری زیناکەر، دەسەڵاتدارێکی درۆزن، هەژارێکی لوت بەرز [٣]"**.

لەم فەرموودەیەدا هەڕەشەی توند بۆ پیری زیناکەر و دەسەڵاتداری درۆزن و هەژاری لوت بەرز هەیە.

هۆکارەکەی: هەر یەك لەمانە ئەو تاوانانەی باسکراون کردوویانە بێ ئەوەی پێویستیان پێی هەبێت، بیانووی ئەنجامدانیشی کەمە، ئەگەر چی هیچ کەسێك بیانووی نییە بۆ کردنی گوناه و بیانوەکەی لێ وەرناگیرێت، بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانە هیچ پێویستییەکی یەکجار گرنگیان نییە کە وایان لێ بکات بە ناچاری ئەنجامی بدەن و گاڵتە بە سنووری خوای گەورە بکەن، تەنیا مەبەستیان ئەنجامدانی گوناهە نەوەك هیچی تر [٤].

---

[١] تحفة الأحوذي (٦/٥٢٠).
[٢] فتح الباری (١١/٢٤١).
[٣] موسلیم (١٠٧) گێراوەتیەوە.
[٤] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢/١١٧).

## ڕێگری لێ دەکردن نیشانەی پیری لەسەریان لاببەن:

عەمرى كوڕى شوعەيب لە باوكييەوە ئەويش لە باپيريەوە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەرى خوا ﷺ ڕێگرى دەكرد لە لابردنى مووسى سپى، دەيفەرموو: "**ئەمە نورى موسڵمانە**[1]".
لە گێڕانەوەيەكى تردا: "**مووى سپى لامەبەن، هەر موسڵمانێك ئەگەر موويەكى لە ناو ئيسلام سپى كردبێت، ئەو مووە بۆى دەبێتە نورێك لە ڕۆژى دواييدا**".
لە گێڕانەوەيەكى تردا: "**خواى گەورە بە هۆى ئەو مووە سپييە چاكەيەكى بۆ دەنوسێت و گوناهێكى بۆ دەوەرێنێت**[2]".

ئەبو هورەيرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە دەفەرموێت: "**مووى سپى لامەبەن، چونكە نورە لە ڕۆژى دوايى، هەر كەسێكيش موويەك لەناو ئيسلامدا سپى بكات، خواى گەورە بە هۆيەوە چاكەيەكى بۆ دەنوسێت و گوناهێكى بۆ دەوەرێنێت و پلەيەكيش بەرزى دەكاتەوە**[3]".

## بەڵام هانيدەدان لەسەر گۆڕانكارى لە پيريدا:

جابرى كوڕى عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: لە ڕۆژى فەتحى مەككەدا، ئەبو قوحافەيان هێنا، سەرو ڕيشى وەك بەفر سپى بوو، فەرمانى بە ئافرەتەكانى كردو فەرمووى: "**ئەمە بە شتێكى تر بگۆڕن**[4]".

نەوەوى دەڵێت: (گۆڕينى ڕەنگى مووى پيرى پياو و ئافرەت بۆ ڕەنگى زەرد يان سوور ڕێگە پێدراوە، بەڵام گۆڕينى بۆ ڕەش ڕێگە پێدراو نييە، ئەويش لەبەر فەرموودەى پێغەمبەر،كە فەرموويەتى: "**خۆتان لە ڕەنگى ڕەش بپارێزن**[5]".

ئەبو هورەيرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە دەفەرموێت:: "**يەهودى و مەسيحييەكان بۆياغ ناكەن، ئێوە پێچەوانەى ئەوان بكەن**[6]".

مەبەستى لە ڕەنگ كردنى ڕيش و سەرە، ئەمەش پێچەوانەوەى ئەو ڕێگرييە نييە، كە ڕێگرى لە لابردنى نيشانەى پيرى دەكات، چونكە ڕەنگ كردن واتاى لابردن نايەت.

---

[1] ترمذي (٢٨٢١) و النسائي (٥٠٦٨) و ابن ماجة (٣٧٢١) گێڕاوەتيانەوە، ئەلبانى دەڵێت: سەحيحە، (صحيح الترغيب والترهيب ٢٠٩١).

[2] ئەبو داود (٤٢٠٢) گێڕاوەتيەوەئەلبانى لە (صحيح الجامع ٧٤٦٣، ٥٧٦٠) بە سەحيحى داناوە.

[3] ابن حبان (٢٩٨٥) گێڕاوەتيەوە ئەلبانى لە (التعليقات الحسان ٣٢٩) دەڵێت: "حسن صحيح".

[4] موسليم (٣٩٢٤) گێڕاوەتيەوە.

[5] شەرحى نەوەوى لە سەحيحى موسليم (٨٠/١٤).

[6] بوخارى (٣٤٦٢) و موسليم (٢١٠٣) گێڕاوەتيانەوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ منداڵان

پێغەمبەر ﷺ بایەخی زۆری بە منداڵان دەدا، هانیدەدا لەسەر بەزەیی و سۆز و میهرەبانی لەگەڵیاندا، هەر ئەوە دەفەرموێت: " **لە ئێمە نییە ئەو کەسەی بەزەیی بە بچوکەکانمان نەیەتەوە،** "[1].

**بەزەیی بە منداڵ دەهاتەوە تەنانەت گەر لە دایك بووی زینا بووایە:**

کاتێك ئەو ئافرەتە غامدیەی زینای کردبوو هاتە لای، گەڕاندیەوە تاوەکو منداڵەکەی لەدایك دەبێت، کاتێکیش لە دایك بوو هاتەوە لای پێی فەرموو: "**بەرد باران ناکرێت و لەبەر منداڵە بچوکەکەی لێی دەگەڕێین چونکە کەس نییە بەخێوی بکات**".

پیاوێك لە ئەنسارییەکان هەڵسا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا با بەخێوکردنی لەسەر من بێت[2].

**لە هیداتەی پێغەمبەر بۆ منداڵان: پیرۆزکردنیان و پەنجە هێنان بە مەلاشوویان و دوعا بۆکردنیان:**

منداڵیان دەهێنایە لای پێغەمبەر ﷺ، پیرۆزی دەکردن، پەنجەی بە مەلاشویاندا دەهێنا و دوعای بۆ دەکردن، هاوەڵان ﷺ گەر منداڵیان بووبایە، بۆ داواکردنی پیرۆزی دەیانهێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ .

ئەسمای کچی ئەبوبەکر ﷺ کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر لە سکی بوو، دەڵێت: نزیکبووم لە حاڵەتی لە دایکبوون، چوومە شاری مەدینە، لە قوباء دابەزیم، لەوێ عەبدوڵڵا لە دایك بوو.

پاشان چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ منداڵەکەم لەناو کۆشی دانا، داوای کرد دەنکە خورمایەکی بۆ بێنن، خورمایەکەی جووی، پاشان خستیە ناو دەمی منداڵەکە، یەکەم شتێك چووبێتە ناو دەمی منداڵەکەم لیکی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، پاشان خورمایەکەی بە مەلاشوودا هێنا، دواتر دوعای بەرەکەتی بۆ کرد، ئەمە یەکەم منداڵی لە دایك بووی ئیسلام بوو دوای کۆچکردن[3].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: کاتێك عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو تەڵحەی ئەنساری لە دایك بوو، بردمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، کە خەریکی سواقدانی وشترەکەی بوو.

---

(1) ترمذي (١٩٢٠) لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە ﷺ گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥٤٤٤) بە سەحیحی داناوە.

(2) موسلیم (١٦٩٥) گێراوەتیەوە.

(3) بوخاری (٣٦١٩) گێراوەتیەوە.

پێی فەرمووم: **"ئایا خورمات پێیە؟"**.

گوتم: بەڵێ، خورماکەی لێ وەرگرتم و خستییە دەمی، جووی پاشان دەمی منداڵەکەی کردەوە و خورما جوراوەکەی خستە دەمییەوە، منداڵەکە زمانی بە خورماکە دەجوڵاند.

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"سەیری حەزی ئەنساڕی بۆ خورما بکە"**. ناوی عەبدوڵڵای لێنا [(١)].

یان بە واتای **"خورما لای ئەنساڕی خۆشە** [(٢)]**"**.

## ناوی جوانی بۆ هەڵدەبژاردن:

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ دەڵێت: کاتێك منذری کوڕی ئەبو ئەسید لە دایك بوو، هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، لەسەر رانی پیرۆزی دانا، ئەبو ئەسیدیش دانیشتبوو.

پێغەمبەر ﷺ بە شتێك سەرقاڵ بوو کە لەبەر دەستی دابوو، داوایان لە ئەبو ئەسید کرد منداڵەکەی لاببات، ئەویش لەسەر رانی پێغەمبەری ﷺ هەڵگرت.

پێغەمبەر بە ئاگاهات و فەرمووی: **"کوا منداڵەکە؟"**.

ئەبو ئەسید گوتی: بردمانەوە ماڵەوە ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"ناوی چییە؟"**.

گوتی: فڵان

فەرمووی: **"بەڵکو من ناوی دەنێنم مُنذر"**، لەو رۆژەوە ناوی مُنذری لێنرا [(٣)].

نەوەوی دەڵێت: (هۆکاری ناونانی بە مونذیر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ئامۆزایەکی باوکی هەبوو بە ناوی مونذیری کوڕی عەمر لە جەنگی بیری مەعونە شەهید بوو، کە سەرکردەیان بوو، ئەویش گەشبین بووە پێی بەو ئومێدەی جێگەی ئەو بگرێتەوە). [(٤)]

ئەبو موسا ﷺ دەڵێت: منداڵێکمان بوو، بردمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ناوی نا ئیبراهیم، خورمای بە مەڵاشوودا هێنا، دوعای بەرەکەتی بۆ کرد و دایەوە دەستم [(٥)].

لەم فەرموودەیەدا ناونانی منداڵی بە ناوی پێغەمبەران ﷺ تیادایە، سەبارەت بە فەرموودەکەی، کە فەرمویەتی: **"خۆشەویسترین ناو لەلایەن پەروەردگار ناوی عەبدوڵڵا و**

---

(١) موسلیم (٢١١٤) گێڕاوەتیەوە.

(٢) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٣/١٤).

(٣) بوخاری (٦١٩١) و موسلیم (٢١٤٩) گێڕاوەتیانەوە.

(٤) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٢٨/١٤).

(٥) بوخاری (٥٤٦٧) و موسلیم (٢١٤٥) گێڕاوەتیانەوە.

**عەبدولرەحمانە**"، رێگری نییە جگە لەم دووانە لە ناو نان بە ناوی تر، هەر بۆیە ناوی لە منداڵەکەی ئەبو ئەسید نا موندیر[١].

## لەناو کۆش و لەسەر رانی خۆی دایدەنان، بەرگەی ناخۆشییەکانی دەگرتن:

خاتوو عائیشەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە منداڵیان دەهێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش دوعای بەرەکەتی بۆ دەکردن و دەستی بە مەلاشوودا دەهێنان، جارێکیان منداڵێکیان هێنایە لای، میزی پێداکرد، داوای ئاوی کرد، ئاوەکەی بەسەر شوێنەکە داکرد و نەیشوشت[٢].

دایکی قەیسی کچی محصن ﷺ، دەگێڕێتەوە،کە منداڵێکی بچوکی خۆی کە هێشتا خواردنی نەدەخوارد هێنایە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش لەسەر کۆشی خۆی دانا، منداڵەکە میزی بە کراسەکەی داکرد، پێغەمبەر داوای ئاوی کرد و پرژاندیە سەر شوێنەکە و نەیشوشت[٣].

ئەم فەرموودەیە: نەرمونیانی و ئارامگرتنی بەرامبەر ئەو شتانە تیادایە، کە لە منداڵی بچوك دەردەچێت، ناکرێت هیچ کاردانەوەیەکیان بەرامبەر بکرێت چونکە هیچیان لەسەر نییە[٤].

## یاری و گاڵتەی لەگەڵ دەکردن:

دایکی خالیدی کچی خالید ﷺ دەڵێت: پۆشاکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، لەناویدا کراسێکی سوف رەش هەبوو، فەرمووی: "**چ کەسێکتان پێ باشە ئەم کراسەی لەبەر بکەین؟**"، خەڵکەکە بێ دەنگ بوون.

فەرمووی: دایکی خالیدم بۆ بێنن، هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەویش بە دەستەکانی خۆی لەبەری کرد.

دەڵێت: سەیری کراسەکەی دەکرد و ئاماژەی بۆ من دەکرد و بە زمانی حەبەشە فەرمووی: "**ئەی دایکی خالید ئەمە جوانە، ئەی دایکی خالید ئەمە جوانە**"[٥].

دایکی خالید لەگەڵ کەس و کارەکەی لە کۆچی حەبەشدا بوو، بۆیە پێغەمبەر بە زمانی حەبەشە گاڵتەی لەگەڵ کرد.

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/١٢٦).

[٢] بوخاری (٥٤٦٨) و موسلیم (٢٨٦) گێڕاوەتیانەوە.

[٣] بوخاری (٢٢٣) و موسلیم (٢٨٧) گێڕاوەتیانەوە.

[٤] فتح الباری (١٠/٤٣٤).

[٥] بوخاری (٥٨٤٥) گێڕاوەتیەوە.

فەرمووی: "**أبلي و أخلقي**" واتە "**کۆنی بکەی و بیدڕێنی**"، ئەم قسەیە لەناو عەرەب دوعایەکە بۆ تەمەندرێژی کەسی بەرامبەر دەگوترێت، واتە هێندە تەمەنی درێژ بێت تاوەکو کراسەکە کۆن دەبێت و دەدڕێت.

خلیل دەڵێت مانای "**کۆنی بکە و بیدڕێنە**"، واتە بژی و جل و بەرگت کۆن بکە و بیدڕێنە [1].

بوخاری دەڵێت: (هیچ ئافرەتێك هێندەی ئەو ئافرەتە نەژیا). [2]

## لە گاڵتە و قسەخۆشەکانی بۆ منداڵان:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ یاری لەگەڵ زەینەبی کچی أم سەلمە دەکرد و چەند جارێك پێی دەگوت: "**زەینەبۆکە.. زەینەبۆکە..**" [3].

**ابن القیم** دەڵێت: زەینەب، کە چووە لای پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر ﷺدەم و چاوی دەشوشت، هەندێك ئاوی بە دەم و چاویدا کرد ئاوی گەنجیەتی لە دەم و چاوی هەرمابوو هەتا پیربوو) [4].

جارێکیان مەحمودی کوڕی رەبیع لەلای پێغەمبەر وەستابوو، کە تەمەنی پێنج ساڵ دەبوو، پێغەمبەر ﷺ وەك گاڵتەکردنێك هەندێك ئاوی پەقرەجێکی بە دەمی پرژاندە دەموچاوی.

مەحمود کوڕی رەبیع خۆی دەڵێت: (ئاو پرژاندنی دەمی پێغەمبەرم ﷺ بەبیر دێت کە پرژاندیە دەموچاوم، ئەو کاتە تەمەنم پێنج ساڵ بوو) [5].

لە بەرەکەتی ئەم کارە، کاتێك گەورە بوو هیچ شتێکی لە دیتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبیر نەمابوو، تەنیا ئەو ئاو پرژاندنە نەبێت، بۆیە بە هاوەڵی پێغەمبەر ئەژمار کراوە.

پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەم کارەی لەگەڵ مەحمود کرد، یان بۆ گاڵتەکردن، یان بۆ بەرەکەتداری، وەك چۆن لەگەڵ منداڵی هاوەڵانی کردووە.

ئەم فەرموودەیە چەند سوودێکی تێدایە، لەوانە: ئامادەبوونی منداڵان لە مەجلیسی پیاواندا، سەردانی کردنی پێشەوا بۆ ماڵی هاوەڵانی و گاڵتە و یاری کردن لەگەڵ منداڵەکانیان [6].

---

[1] فتح الباری (١٠/٢٨٠).

[2] فتح الباری (٦/١٨٤).

[3] الضیاء لە (المختارة ١٧٣٣) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٢١٤١) بە سەحیحی داناوە.

[4] حاشیة ابن القیم علی سنن ابی داود (١/١٢٢)، الاستیعاب (٤/١٨٥٥) ابن عبدالبر.

[5] بوخاری (٧٧) گێراوەتیەوە.

[6] فتح الباری (١/١٧٣).

## لەوانە: گاڵتەکردنی لەگەڵ منداڵی ساوا:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەنی جوانترین رەوەشت بووە، برایەکەم هەبوو پێیان دەگوت: ئەبو عومەیر، ساواو شیرەخۆر بوو، کە پێغەمبەر ﷺ دەهات پێ دەفەرموو: **"ئەی باوکی عومەیر نوغەیر چی کرد"**[1].

نوغەیر: باڵندەیەك بوو منداڵەکە یاری لەگەڵ دەکرد.

**لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- دروستە کەسێك منداڵێك ناوبنێت یان نازناوی لێ بنێت با منداڵی خۆشی نەبێت.
- نازناوی بۆ منداڵ درۆ نییە.
- دروستە گاڵتەبکرێت بە شتێك گوناه نەبێت.
- دروستە هەندێك ناو بچوك بکرێتەوە.
- دروستە منداڵ یاری بە چۆلەکە بکات و بەخێوکەرەکەی رێگەی پێ بدات.
- سەجع بۆ قسەکردن دابندرێت بەبێ زۆری لەخۆ کردن.
- قسەی خۆش لەگەڵ منداڵان و دڵدانەوەیان.
- دەرخستنی رەوشتی جوانی پێغەمبەر ﷺ و خاکڕۆیی و بێفیزی.
- سەردانی کردنی خزم وکەسوکار، چونکە أم سەلیم دایکی ئەبو عومەیر لە مەحرەمەکانی پێغەمبەر بووە ﷺ[2].

## گاڵتەی لەگەڵ ئەنەسی کوڕی مالیك دەکرد:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ پێی دەگوتم **"ئەی خاوەن دوو گوێ"**، واتە گاڵتەی لەگەڵ دەکرد[3].

ئەم قسەیە لە روانگەی گاڵتەکردنی پێغەمبەر ﷺ و رەوشت جوانیتی[4].

## لە گاڵتەکردن لەگەڵیان: پێشبڕکێی دەکرد لە نێوانیان:

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆرجار عەبدوڵلا و عوبەیدوڵلای کوڕەکانی عەباسی ریز دەکردن، پاشان پێی دەفەرموون: **"هەر کەسێك یەکەم جار بگاتە لام، ئەوە و ئەوەی بۆ هەیە"**.

---

[1] بوخاری (٦٢٠٣) و موسلیم (٢١٥٠) گێڕاوەتیانەوە.
[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/١٢٩).
[3] ترمذي (١٩٩٢) و ئەبوداود (٥٠٠٢) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٧٩٠٩) بە سەحیحی داناوە.
[4] تحفە الاحوذی (٦/١٠٨).

دەڵێت: ئەوانیش پێشبڕکێیان دەکرد، دەکەوتنە سەر سینگ و سەری، ئەویش دەیگرتن و ماچی دەکردن [١].

## کاتێك بەلایاندا تێپەڕبوو بایە، سەلامی لێدەکردن:

ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای کۆمەڵە منداڵێکدا تێپەڕبوو یاریان دەکرد، سەلامی لێکردن [٢].

هەر لە ئەنەسەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام منیش لەگەڵ منداڵان یاریم دەکرد، سەلامی لێکردم [٣].

پێغەمبەری خوا بەم هەڵس و کەوتەی خۆشی و کامەرانی دەخستە دڵی ئەم تازە پێگەیشتووانە، پاڵپشتییەکی مەعنەوی پێ دەدان بۆ ئەوەی لە گفتوگۆکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ کەسانی گەورە لێ ڕابێن، ئەمەش لە حیکمەتەکانی ئەو بووە ﷺ.

## دەستی بەسەری منداڵاندا دەهێنا:

پێغەمبەری خوا ﷺ یاری لەگەڵ منداڵان دەکرد، دەستی بەسەریدا دەهێنان، هەستیان بە سۆز و میهرەبانی دەکرد.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی ئەنسارییەکانی دەکرد کاتێك دەگەیشتەماڵیان، منداڵەکانیان دەورەیان لە پێغەمبەر دەدا ئەویش سڵاوی لێ دەکردن و دەستی بەسەریاندا دەهێنا و دوعای بۆ دەکردن [٤].

عەبدوڵلای کوڕی هیشام دەگێڕێتەوە،کە بە پێغەمبەر گەیشتووە،دەڵێت، دایکی زەینەبەی کچی حەمید لەگەڵ خۆی بردوویتیە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوتووە: ئەی پێغەمبەری خوا بەیعەتی لێ وەربگرە.

ئەویش فەرمووی: **"هێشتا بچوکە"**، دەستی بەسەریدا هێنا و دوعای بۆ کرد [٥].

---

[١] ئەحمەد (١٨٣٩) گێڕاوەتیەوە، لە (مجمع الزوائد ٢٨٥/٩) دەڵێت سەندەکەی "حەسەنە"، ئەلبانی لە (فەرموودە زەعیفەکان ٦٥٤٧) بە زەعیفی داناوە.

[٢] بوخاری (٦٢٤٧) و موسلیم (٢١٦٨) و ئەبوداود (٥٢٠٢) گێڕاوەتیانەوە.

[٣] موسلیم (٢٤٨٢) گێڕاوەتیەوە.

[٤] النسائی لە (سنن الکبری ٨٣٤٠) و الطحاوي لە (شرح مشکل الآثار ١٥٧٧) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (التعلیقات الحسان ٤٦٠) بە سەحیحی داناوە.

[٥] بوخاری (٢٥٠٢) گێڕاوەتیەوە.

## هەروەها دەستی بە پرووەتی منداڵدا دەهێنا:

جابری کوڕی سەمرە ﷺ دەڵێت: نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، پاشان چووە لای کەس و کاری، منیش لەگەڵی چووم، دوو منداڵ پێشوازیان لێکرد، ئەویش یەك یەکە دەستی بە پرووەتیدا دەهێنان.

دەڵێت: دەستی بە پرووەتی منیشدا هێنا.

دەڵێت: بۆنێکی هێند خۆشم لە دەستی کرد، وەك ئەوەی لەناو جوعبەی بۆن فرۆشەکان هاتبێتە دەرەوە[1].

نەوەوی دەڵێت: (دەست پێداهێنانی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان، لە ڕەوشت جوانی و سۆز و میهرەبانی پێغەمبەرە بۆیان).[2]

## منداڵی ماچ دەکرد:

خاتووو عائیشە ﷺ دەڵێت: خەڵکانێك لە ئەعرابییەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتیان: ئێوە منداڵەکانتان ماچ دەکەن؟

ئەوانیش گوتیان: بەڵێ.

ئەعرابیەکان گوتیان: بەڵام وەڵاهی ئێمە ماچیان ناکەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**من چی بکەم، لە کاتێکدا خوای گەورە سۆز و میهرەبانی لە ئێوە ستاندبێتەوە**"[3].

## دیاری دەدایە منداڵان:

ئەگەر دیاری کاریگەری جوانی لەسەر دەروونی مرۆڤ بە گشتی هەبێت، ئەوا لەسەر دەروونی منداڵ کاریگەرییەکەی زیاترە و گەورەترە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ دیاری پێدەدان و دڵی خۆش دەکردن.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: نۆبەرەی بەروبوومیان دەهێنایە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش دەیفەرموو: **خوایە گیان بەرەکەت بخەیتە شارەکەمان و بەروبوومان و مشت و قاپەکانمان، بەرەکەت لە دوای بەرەکەت**.. پاشان دەیدایە ئەو بچوکانەی لەوێ ئامادە بوون[4].

---

[1] موسلیم (٢٣٢٩) گێڕاوەتیەوە.

[2] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٥/٨٥).

[3] بوخاری (٥٩٩٨) و موسلیم (٢٣١٧) گێڕاوەتیانەوە.

[4] موسلیم (١٣٧٣) گێڕاوەتیەوە.

نەوەوی دەڵێت: (لەم فەرموودەیەدا رەوشت جوان و تەواوی میهرەبانی و سۆزی پێغەمبەری ﷺ تێدایە، هەروەها نەرم و نیانی لەگەڵ گەورە و بچوك، پێدانیشی بە منداڵان بە تایبەت، چونکە ئەوان زۆر حەزیان لێیەتی و سوورن لەسەری [1]).

پێشتریش فەرموودەی دایکی خالید باس کرا، کاتێك جل و بەرگیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، فەرمووی: پێتان باشە ئەم پۆشاکە لەبەر کێ بکەین؟ خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، ئینجا فەرمووی: دایکی خالیدم بۆ بێنن، هێنایانە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە دەستی خۆی لەبەری کرد [2].

## پێغەمبەر ﷺ سووربوو لەسەر فێرکردن و پەروەردکردنی منداڵان:

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس رضي الله عنه دەڵێت: رۆژێك لە دوای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووم، فەرمووی: **"ئەی کوڕە، من چەند وشەیەکت فێر دەکەم: خوا بپارێزە دەتپارێزێت، خوا بپارێزە لەبەردەمی خۆت دەیبینی** (واتە:ئەگەر لە کاتی خۆشی لەبیرت بێت، لە کاتی ناخۆشی تۆی لەبیرە)، **گەر داوات کرد تەنیا داوا لەو خوا بکە، ئەگەر پشتت بەست، تەنیا پشت بە خوا ببەستە، بشزانە ئەگەر هەموو ئۆمەت کۆببێتەوە بۆ ئەوەی سوودێکت پێ بگەێنن، هیچیان پێ ناکرێت تەنیا ئەوەی خوای گەورە بۆتی نوسیوە، هەموو ئۆمەتیش کۆببێتەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەێنن، هیچیان پێ ناکرێت تەنیا ئەوەی خوای گەورە بۆتی نوسیوە.**

**قەڵەمەکان هەڵگیران و پەڕاوەکان وشك بوون (بشزانە ئارامگرتن لەسەر ئەو شتەی لات ناخۆشە پاداشتێکی یەکجار گەورەی هەیە، سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتن دایە، لەگەڵ ناخۆشیدا خۆشی هەیە).** [3]

## فێرە قورئان و باوەڕ و یەکتا پەرستی دەکردن:

جوندبی کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەڵێت ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین، تەمەنمان لە نزیك باڵغ بوون بوو، بەر لە فێربوونی قورئان، باوەڕی فێرکردین، پاشان قورئانی فێرکردین، باوەڕیشی زیاد کردین [4].

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیح موسلیم (٩/١٤٦).
[2] بوخاری (٥٨٤٨) لە دایکی خالیدەوە گێراوەتیەوە
[3] ترمذي (٢٥١٦) و ئەحمەد (٢٨٠٠) گێراوەتیانەوە، ئەلبانی لە ( الصحیحة ٢٣٨٢) بە سەحیحی داناوە.
[4] ابن ماجة (٦١) گێراوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح سنن ابن ماجە ٦١) بە سەحیحی داناوە.

## فێرکردنی منداڵەکان بە جوانترین ڕەفتار:

مامەڵەی لەگەڵ منداڵان تەنیا بە یاری و گاڵتە و ماچ کردن نەوەستاوە، بەڵکو سەری کێشاوەتە سەر پەروەردەی بە سوودو ئاراستەکردنی دروستیان.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: **"کوڕی خۆم، گەر چوویتە لای کەس و کارت سەرەتا سەلامیان لێ بکە، بەمە بەرەکەت بۆ تۆو کەسوکارت دەبێت"**[1].

## فێرکردنی منداڵان بۆ ئادابی نان خواردن:

عەمری کوڕی ئەبو سەلمە دەڵێت: جارێکیان من بچوك بووم لە ماڵی پێغەمبەر ﷺ بووم، دەستم لەناو قاپی خواردن وەردەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: **"ئەی بچکۆڵ، ناوی خوا بڵێ، بە دەستی ڕاست بخۆ، ئەوەی لەبەردەمتە بخۆ"**، لەمە بەدواوە هەر ئەوە بووە شێوازی نان خواردنم[2].

## گەر یەکێك هەڵەی بکردبایە، بە نەرم و نیانی ڕێنوێنی دەکرد:

پێغەمبەر ﷺ بە شێوازێکی پەروەردەی جوان مامەڵەی لەگەڵ هەڵەدا دەکرد، بە جۆرێك گونجاو بووایە لەگەڵ تەمەنی بچوکی کەسەکە.

ئەبو ڕافعیی کوڕی عەمری غیفاری دەڵێت: من بچوك بووم، بەردم لە خورمای ئەنساریەکان دەگرت، منیان گرت و بردمیانە لای پێغەمبەر ﷺ.

فەرمووی: **"ئەی بچکۆڵ بۆچی بەرد لە خورما دەگری؟"**.

گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەبەر برسییەتی.

فەرمووی: **"چیتر بەردی تێ مەگرە، تەنیا ئەوەی خۆی کەوتبێتە خوارەوە"**.

پاشان دەستی بەسەریدا هێناو فەرمووی: **"خوای گەورە تێرت بکات و ئاوت بدات"**[3].

---

[1] ترمذي (٢٦٨) گێراوەتیەوە، دەڵێت: " حديث حسنٌ غريبٌ صحيحٌ "، ئەلبانی لە کتێبی (ضعيف الترمذي ٢٦٩٨) بە زەعیفی داناوە، لە کتێبی (صحيح الترغيب و الترهيب ١٦٠٨) دەڵێت: "حسن لغيره".

[2] بوخاری (٥٣٧٦) و موسلیم (٢٠٢٢) گێراوەتیەوە.

[3] الترمذي (١٢٨٨) و ئەحمەد (١٩٨٣٠) گێراوەتیانەوە، ئەحمەد دەڵێت: "حديث حسنٌ غريبٌ صحيحٌ" حافظ ابن حجر لە کتێبی (الامتاع بالاربعين المتباينة السماع ص٣٩) بە حەسەنی داناوە، الارناؤط دەڵێت: "محتمل للتحسين"، ئەلبانی لە کتێبی (الارواء ٢٥١٨) بە زەعیفی داناوە.

**لە کاتی گفتوگۆکردن لەگەڵیان، پێغەمبەرﷺ گوزارشتی نەرمی لەگەڵ بەکاردەهێنان، لە پێناو راکێشانی دڵەکانیان:**

بە جوانترین ناو یان نازناو یان سیفەت بانگی منداڵەکانی دەکرد.

هەندێك جار بانگی منداڵی دەکرد و دەیفەرموو: **"ئەی غولام، من هەندێك وشەت فێر دەکەم"**، **"ئەی غولام** – واتە: بچکۆل – **ناوی خوا بهێنە و بە دەستی راست بخۆ"**.

هەندێك جاریش وشەی **"کوڕی خۆم"**، وەك ئەوەی بە ئەنەسی فەرموو کاتێك ئایەتی حیجاب دابەزی **"وراءك يا بني"**[1].

بە منداڵەکانی جەعفەری ئامۆزای ئەبو تالیبی فەرموو: **"بانگی برازاکانم بکە**[2]**"**.

هەندێك جاری تر بە نازناو بانگی دەکردن، بە منداڵی بچوکی دەگوت: **"ئەی باوکی عومەیر"**، پێشتر باسکرا.

ئەمە لە کوێ، ئەو مامەڵە رەق و توندەی ئەمڕۆ لە کوێ، کە منداڵانی بچوکی ئێستا توشی دەبن؟

## ڕاهێنانی منداڵ بۆ هەڵگرتنی بەرپرسیاریەتی:

فێری دەکردن بەرپرسیاریەتی هەڵبگرن، چونکە ئەوان نەوە و پیاوانی دواڕۆژن.

ئەنەس دەڵێت: کاتێك من لەگەڵ منداڵەکان یاریم دەکرد، پێغەمبەر ﷺ هاتە لام، سەلامی لێ کردین، منی بۆ کارێك رەوانە کرد، درەنگ چوومە لای دایکم، کاتێك گەڕامەوە ماڵەوە، دایکم گوتی: چیت لێهات؟

گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کارێك رەوانەی کردم.

گوتی: کارەکەی چی بوو؟

گوتم: ئەمە نهێنییە.

گوتی: نهێنی پێغەمبەری خوا لای کەس باس مەکە.

دوای ماوەیەك یەکێك لە هاوەڵان داوای کرد ئەو نهێنییەی پێ بڵێ، ئەنەس گوتی: سوێند بە خوا، ئەگەر بۆ کەسم باسکردبا، بۆ تۆم باس دەکرد[3].

لە گێڕانەوەیەکی تردا: ئەنەس دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نهێنییەکی پێی گوتم، بە هیچ کەسم نەگوت، دایکی سولەیم داوای لێکردم، پێم نەگوت[4].

---

[1] ئەحمەد (١١٩٥٨) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٩٥٧) بە سەحیحی داناوە.

[2] ئەحمەد (١٧٥٣) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (أحكام الجنائز لا ١٦) بە سەحیحی داناوە.

[3] موسلیم (٢٤٨٣) گێڕاوەتیەوە.

[4] بوخاری (٦٢٨٩) گێڕاوەتیەوە.

ابن حجر دەڵێت: (بەشێك لە زانایان دەڵێن: ئەم نهێنییە تایبەت بووە بە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ، چونکە ئەگەر پەیوەندی بە زانست بووایە، ئەنەس لە کەسی نەدەشاردەوە). [١]

## لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- رەوشت جوانی و بێ فیزی پێغەمبەر ﷺ، سەرەرای گەورەیی و پلە بەرزی، سلاو لە مندالان دەکات، لە کاتێکدا لە بازاڕ یاری دەکەن.
- سوننەتە بۆ مرۆڤ سلاو لە هەر کەسێك بکات کە بەلای تێپەڕ دەبێت، تەنانەت ئەگەر مندالیش بێت.
- دروستە مندالّ بۆ کارێك رەوانە بکرێت، بەلام بە مەرجێك ئەمانەت پارێزارو بێت.
- دروست نییە مرۆڤ نهێنی کەسێك بۆ کەسی تر باس بکات، تەنانەت بۆ دایك و باوکیشی.
- هەروەها پەروەردەکردنی جوانی دایکی سولەیم بۆ منداڵەکەی لەم فەرموودەیە دایە کاتێك گوتی: "نهێنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە کەس مەڵێ"، سەرباری ئەوەی کوڕەکەی نهێنی بەو نەگووت، بەلام ئەم قسەیەی کرد بۆ پشتیوانی کردنی لەم هەڵوێستەی [٢].

### رێزگرتن لە کەسایەتی مندالّ:

ئەم بابەتە لە گرنگترین ئەو شتانەیە کە مندالّ بەردەوام پێویستی پێی هەیە، بەلام دایك وباوك لێی بێ ئاگان.

پێغەمبەر ﷺ هەستی بە پێگە و کەسایەتی منداڵی تازە پێگەیشتوو دەکرد، دەیزانی لە زۆرشتان ئەوان وەکو گەورەکانن و مافی چاودێری کردنیان هەیە.

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی دەڵێت: خواردنەوەیەکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، لێی خواردەوە، لە دەستە راستی منداڵێکی تازە پێگەیشتوو هەبوو، لە دەستە چەپیشی چەند پیرە پیاوێك هەبوون.

بە منداڵەکەی فەرموو: "**روخسەتم پێ دەدەی بیدەمە ئەمانە؟**".

منداڵەکە گوتی: نا سوێند بەخوا، بەشی خۆم لە تۆ نادەمە هیچ کەسێك.

پێغەمبەری خوا دایە دەستی [٣].

---

[١] فتح الباري (٨٢/١١).
[٢] شەرحی (رياض الصالحين ٤١/٤ ٤٢) ی ابن عثيمن بە کورتکراوەیی.
[٣] بوخاری (٢٤٥١) و موسلیم (٢٠٣١) گێڕاوەتیانەوە.

ڕێزگرتنی کەسایەتی منداڵ، لە دەروونیدا کەسایەتی پشت بەستوو بە خۆی لێ دروست دەبێت، هەست بە ئاسوودەیی دەکات، بەهرەکانی گەشە دەکەن، لەبەرامبەردا گەر بە بێ ڕێزێ مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و بە کەم سەیر بکرێت، دەبێتە هۆی دروست بوونی گرێی دەروونی و پەشۆکاوی.

## جەختی لە ڕاستی گوتن و درۆنەکردن لەگەڵیان دەکردەوە:

عەبدوڵڵای کوڕی عامیر ﷺ دەڵێت: ڕۆژێکیان دایکم بانگی کردم، پێغەمبەری خواش ﷺ لە ماڵمان دانیشتبوو.

پێی گوتم: وەرە ئەمەت پێ بدەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"دەتەوێ چی پێ بدەی؟"**.

دایکم گوتی: خورمای پێ دەدەم.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: **"بەڵام ئەگەر هیچی پێ نەدەی، ئەوا بە درۆ لەسەرت دەنوسرێت**[1]".

(لەم فەرموودەیەدا: ئەوەی بە منداڵان دەگوترێت، لە کاتی گریانیان لە چەند وشەیەکی پێکەنیناوی یان درۆیەك لەوەی شتیان پێ بدرێت، یان ترساندنیان، حەرامە و بە درۆ ئەژمار دەکرێت)[2].

منداڵ بە درۆکردن لەگەڵیدا، بڕوای بەرامبەر دایك و باوکی لە دەست دەدات، گوێیان پێ نادات، لە درۆکردنیشدا لاساییان دەکاتەوە، چونکە سروشتی منداڵ وایە چاو لە ڕەفتاری گەورەکان دەکاتەوە و لاساییان دەکاتەوە.

بۆیە پێویستە ڕەچاوی ڕاست گۆیی لەگەڵیان بکرێت، لە کاتی یاری کردن، یان گێڕانەوەی چیرۆکی کورت و درێژ، چونکە درۆکردن ناشیرینترین ڕەوشتە، چونکە بە ئاسانی لە ڕەفتاری منداڵ جێگیر دەبێت و بە زەحمەت چارەسەر دەبێت.

شاعیر دەڵێت:

يَنشـأُ ناشـي الفـتيان فـينـا    عـلـى مـا كـان عـوّده أبـوه

واتە: منداڵ لە نێوانمان گەورە دەبێت   بە هەمان ئەو شێوەیەی باوکی فێری کردووە

لە کۆتاییدا دەڵێین: مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵ بە نەرم و نیانی و ڕێزگرتنیان، دەیانکاتە گەنجێکی بی عەیب و بێ نەخۆشی، وایان لێ دەکات پشت بەخۆیان ببەستن، خۆشەویستی ئەوانی تر و گونجان و برایەتی لە دڵیان دروست دەکات، مامەڵەیان لەگەڵ دەورووبەر دەبێتە مامەڵەیەکی نەرم و نیان و سۆز و میهرەبان بە هەمان ئەو شێوەیەی بە بچوکی مامەڵەیان لەگەڵ کراوە.

---

[1] ئەبو داود (٤٩٩١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.

[2] عون المعبود (١٣/٢٢٩).

## بەشی شەشەم:

# مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جگە لە مرۆڤ

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ جنۆکەکان (پەرییەکان)

پێغەمبەر ﷺ نێردراوی گرۆی ئادەمیزاد و پەرییەکانە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ الأنبياء: ١٠٧

هەروەها دەفەرموێت: ﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡفُرۡقَانَ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦ لِيَكُونَ لِلۡعَٰلَمِينَ نَذِيرًا﴾ الفرقان:١ واتە: ( بەرز و پیرۆز و پاك و بڵندە ئەو زاتەی کە قورئانی دابەزاندووە تا ببێتە جیاکەرەوەی راست و ناراست، بۆ سەر بەندەی خۆی تا ببێتە هوشیارکەرەوە و بێدارکەرەوەی دانیشتوانی جیهان لە هەموو سەردەمێکدا).

طحاوي رحمه الله دەفەرموێت: (ئەو نێردراوە بۆ تەواوی جنۆکەکان و هەموو دروستکراوەکان بەراستی و نور و رووناکی)[1].

### زۆرێك لە جنۆکەکان وەڵامی بانگەوازی پێغەمبەریان ﷺ داوەتەوە:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ١ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا﴾ الجن: ١-٢ واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ پێیان بڵێ: وەحی و نیگام پێڕاگەیەنراوە کە بەراستی دەستەیەك لە پەریان گوێیان گرتووە بۆ خوێندنەوەی قورئان و جا کە تەواو بووە وتویانە: بەڕاستی ئێمە خوێندنەوەیەکی سەرسوڕهێنەرمان بیست (١) هیدایەت دەدات بۆ رێبازی ژیری و تێگەیشتن، ئێمەش باوەڕمان پێکردو هەرگیز کەس ناکەینە شەریك و هاوەڵ بۆ پەروەردگارمان).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْۖ فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوۡاْ إِلَىٰ قَوۡمِهِم مُّنذِرِينَ ٢٩ قَالُواْ يَٰقَوۡمَنَآ إِنَّا سَمِعۡنَا كِتَٰبًا

---

[1] العقيده الطحاوية لەگەڵ شەرحەکەی (١/١٢٥).

أُنزِلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلۡحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٣٠ يَٰقَوۡمَنَآ أَجِيبُواْ
دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾ الأحقاف: ٢٩–٣١

واتە: (یادی ئەوەش بکە کاتێك ئێمە دەستەیەك پەریمان لادایە لای تۆ، تا گوێ لە قورئان بگرن، ئەوسا ئامادەبوون و بەیەکتریان وت: گوێ بگرن و بێ دەنگ بن، کاتێك قورئان خوێندنەکە تەواو بوو، پەریەکان گەڕانەوە بۆ ناو هۆز و قەومەکەیان و دەستیان کرد بە ئاگادارکردنەوەو بانگکردنیان بۆ پەیرەویکردنی ئەم ئاینە نوێیە (٢٩) وتیان: ئەی هۆز و گەلی ئێمە! باوەڕ بکەن گوێمان لە کتێبێك بوو کە لە دوای موسا نێردراوە، سەلمێنەری پەیام و کتێبەکانی پێش خۆیەتی و رێکە لەگەڵیاندا و رێنموویی و هیدایەت دەدات بۆ حەق و راستە شەقامی راست و دروستیش (٣٠) ئەی خزمینە!! بچن بەدەم بانگخوازی خواوە و ئیمان و باوەڕی پێبهێنن، ئەو کاتە لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت و لە سزای بە ئێش و ئازار دەتانپارێزێت).

## قورئان خوێندنی پێغەمبەر لەسەر جنۆکەکان:

عەلقەمە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پرسیارم لە ئیبن مەسعود کرد و گوتم: ئایا کەس لە ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شەوی جنۆکەکانی بینی؟ گوتی: نەخێر، بەڵام ئەو شەوە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر بووین، لەلامان بزربوو، لەناو دۆڵ و شیوەکان بەدوای گەڕاین، گوتمان لەوانەیە: رفێندرا بێت یان کوژرا بێت.

گوتی: ناخۆشترین شەو بوو بەسەرماندا هاتبێت، کاتێك بەیانی هاتەوە لەلای (حراء)ەوە دەهات.

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا تۆمان لێ بزر بوو، بەدوات گەڕاین، بەڵام نەمان دۆزیتەوە، بە ناخۆشترین شەودا تێپەڕین.

فەرمووی: **"بانگخوازێکی پەرییەکان (جنۆکەکان) هات، لەگەڵی رۆیشتم و قورئانم بەسەردا خوێندن"**.

دەڵێت: ئێمەی لەگەڵ خۆی بردە شوێنەکە، شوێنەواری و جێگەی ئاگرکردنەوەکانمان بینی، جنۆکەکان پرسیاریان لەبارەی خواردن لێکرد، ئەویش پێی فەرمووی: **" هەر ئێسکێك ناوی الله لەسەر گوترابێت بکەوێتە بەردەستان گۆشتی زیاتر پێوەیە، هەروەها پشقل ئالیکی ئاژەڵەکانتانە"**.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: **"بەم دووانە ( واتە : ئێسك و قشپل) خۆتانی پیێ پاك مەكەنەوە، چونكە خواردنی برایەكانتانە[١]"**.

ستایشی دەكردن لە باش گوێگرتنیان بۆ قورئان:

جابری كوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ هاوەڵانی دەرچوو، سورەتی (الرحمن) لەسەرەتاوە تا كۆتایی بەسەردا خوێندنەوە، بێ دەنگبوون، ئینجا فەرمووی: **"شەوی جنۆكەكان، ئەم سورەتەم بەسەردا خوێندنەوە، لە ئێوە باشتر كاردانەوەیان بەرامبەری هەبوو، هەر جارێك گەیشتمبایە ئایەتی** ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ **دەیانگوت: نەخێر، پەروەردگارا بە هیچ شتێك لە ناز و نیعمەتەكانت درۆ ناكەین، سوپاس بۆ تۆ[٢]"**.

بایەخی بە خواردنی جنۆكە باوەڕدارەكان دەدا:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە كە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ مەسینەیەكی بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن و پێویستیەكەی هەڵگرتبوو، لە كاتێكدا ئەو لە دوای دەڕۆیشت، پێغەمبەر فەرمووی: **"ئەمە كێیە؟"**.

گوتی: من ئەبو هورەیرەم.

فەرمووی: **"هەندێك بەردم پێ بدە، خۆمی پێ پاك بكەمەوە، بەڵام ئێسك و تەرسی ئاژەڵم بۆ نەهێنی"**.

هەندێك بەردم لە دامێنی كراسەكەم هەڵگرت و بۆم هێنا و لەلام دانا، پاشان ڕۆیشتم، كە تەواو بوو، ڕۆیشتم و گوتم: بابەتی ئێسك و تەرسی ئاژەڵ چییە؟.

فەرمووی: **"ئەو دووانە خواردنی جنۆكەكانن، شاندێكی جنۆكەی (نصیبین) هاتن، باشترین جنۆكە بوون، پرسیاری خواردنیان لێكردم، داوام لە خوا بۆ كردن بەلای هیچ ئێسك و تەرسێكدا تێپەڕ نەبن تەنیا ببێتە خواردنیان بۆیان[٣]"**.

هۆشداری داوە لە ئازاردانی جنۆكەی باوەڕدار:

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"لە شاری مەدینە كۆمەڵە جنۆكەیەك هەن موسڵمان بوون، گەر هیچتان لەوان بینی، ئاگاداریان بكەنەوە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ، گەر لە دوای ئەمە دەركەوتنەوە، بیان كوژن چونكە ئەوانە شەیتانن[٤]"**.

---

[١] موسلیم (٤٥٠) گێڕاوەتیەوە.
[٢] ترمذي (٣٢٩١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة ٢١٥٠) دەڵێت "حەسەنە"، ئەوانی تر بە زەعیفیان داناوە.
[٣] بوخاری (٣٨٦٠) گێڕاوەتیەوە.
[٤] موسلیم (٢٢٣٦) گێڕاوەتیەوە.

نەوەوی دەڵێت: (زانایان دەڵێن: واتاکەی ئەوەیە: ئەگەر بەو ئاگادارکردنەوەیە نەڕۆیشتن، دەزانن ئەوانە لە ئاوەدن کردنەوەی ماڵەکان نین لەوانە نین،کە موسڵمان بوونە، بەڵکو ئەوە شەیتانە، ئەو کات کوشتنیان حەرام نییە، بیان کوژن، خوای گەورە بواری تۆڵەکردنیان ناداتەوە، بە پێچەوانەی ئەوانەی موسڵمان بوونە [1])

شێخی ئیسلام ئیبین تەیمییە دەڵێت: (چونکە کوشتنی جنۆکە بە ناحەق دروست نییە، هەر وەکو چۆن دروست نییە مرۆڤ بە ناحەق بکوژرێت، بۆیە ستەم کردن لە هەموو حاڵەتێکدا حەرامە، بۆ هیچ کەسێك نییە ستەم لە کەسێکی تر بکات تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە کافریش بێت، پەروەردەگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ المائدة: ٨

واتە: (رق و دوژمنایەتی هیچ کەس و هیچ لایەك هەڵتان نەنێت کە لە دادپەروەریی لابدەن، دادپەروەربن، ئەوە نزیکترە لە تەقواو خواناسیەوە، دەی کەواتە لەخوا ترس و پارێزگاربن، چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو کارو کردەوەیەی دەیکەن) [2].

### بۆ خۆپاراستن لە شەیتان پەنای بە خوای پەروەردگار دەکرد:

ئەبو دەردا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا و گوێمان لێ بوو دەیفەرموو: **"پەنا بەخو دەگرم لە تۆ"**، پاشان فەرمووی: **"بە نەفرینی خوا نەفرینت لێ دەکەم"**، سێ جار ئەمەی فەرموو، دەستی درێژ کرد وەك ئەوەی شتێك بگرێت.

کاتێك لە نوێژ تەواو بوو، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا، گوێمان لێ بوو لە نوێژ قسەیەکت دەکرد، کە پێشتر گوێمان لەم قسەیەت نەبووە، بینیشمان دەستت درێژ کرد.

فەرمووی: **"ئیبلیسی دوژمنی خوا بە بە پارچەیەك ئاگر هات بۆ ئەوەی بیکاتە دەم و چاوم، سێ جار پێم گوت: پەنا بەخوا دەگرم لە تۆ، پاشان سێ جار پێم گوت: بە نەفرینی خوا نەفرینت لێ دەکەم، بۆ سێیەم جار نەما، ویستم بیگرم، سوێند بەخوا ئەگەر دوعای برامان سولەیمان نەبووایە، کۆت و بەند دەکرا و منداڵانی مەدینە یاریان پێ دەکرد"**[3].

---

(١) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/٢٣٦).

(٢) مجموع الفتاوی (١٩/٤٤).

(٣) موسلیم (٥٤٢) گێراوەتیەوە.

## مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئاژەڵان:

خـوای پـەروەردگار مرۆڤـی دروسـتکردووە و ڕێـزی لـێ گرتـووە، بـۆ مەبەسـتی بەجێگەیانـدنی پێویسـتییەکانی گیانلەبـەرانی بـۆ ڕام کـردووە، سـوودی لـە گۆشـت و شیرەکەی وەرگرتووە، لە بەروبوومی پێست و خورییەکەی پۆشـاکی لـێ دروسـتکردووە و هەندێکیان بۆ جوانکاری و خۆشی خۆی بەکارهێناوە.

پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٥ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ٦ وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٧ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ النحل: ٥-٨

واتـە: (ماڵاتیشـی دروسـتکردووە بـۆ خزمـەتی ئێـوە، کـە گـەرمیتان پـێ دەبەخشـێت، هەروەها جۆرەها سوودی تری لێ وەردەگرن لە شـیر و گۆشتەکەشـی دەخـۆن (٥) کاتێـك ماڵاتـەکان دەهێننـەوە لـە ئێوارانـدا لـە بەرەبەیانەکانیشـدا کـە لـە مـاڵ دەریـان دەکـەن، دیمەنێکی جوانتان بۆ دەنوێنن (٦) هەنـدێك لـەو ماڵاتانـە بـارو کـەل و پـەلی سـەنگینتان هەڵدەگرن بۆ وڵات و شوێنێك کە ئێوە دوای زەحمەت و ماندوو بـوونێکی زۆر نـەبێت پێـی نەدەگەیشـتن، بەڕاسـتی پـەروەردگارتان زاتێکـی زۆر بەسـۆزو میهرەبانـە (٧) هـەروەها چـەندەها جـۆری ئەسـپ و مـاین و هێسـترو گوێدرێـژی بـۆ بـەدیهێناون تـا بـۆ سـواری و گواستنەوە بەکاری بهێنن، سەرەڕای دیمەنی قەشـەنگیان و شـتی تـریش دروسـت دەکـات کە ئێستە ئێوە نایزانن (ئەم ئامازە قورئانیە، هەموو هۆیـەکانی گواسـتنەوەی ئاسمـانی و دەریایی و زەمینی دەگرێتەوە کە ئادەمیزاد پـەی پـێ بـردووە و پـەی پێـدەبات، چـونکە ئادەمیزاد خۆی و زانیاری و زانستەکەی و کەرەسـتە خاوەکـان، هـەر هـەمووی بەخششـی خوای بەدیهێنـەری تواناو زانایە).

خوای پەروەردگار پێغەمبەری ﷺ بۆ ڕەحمەتی هەموو جیهانیان ڕەوانـە کـردووە، ئـەو ڕەحمەتـەش تـەنیا تایبـەت نییـە بـە مـرۆڤ، بـەڵکو مـرۆڤ و جنۆکـە و ئـاژەڵان و سـەرجەم دروستکراوەکان دەگرێتەوە.

## پێغەمبەرﷺ چەند ئاژەڵێکی سواری لە ئەسپ و ماین و هێستر هەبووە و ناوی لێنابوون:

ئیبن قەیم ﷺ دەفەرموێت: لەو ئەسپانە یەکێکیان ناوی (سەکب)ـە، دەگوترێت یەکەم ئەسپ بووە کە هەیبووە، نێوچەوان و قاچەکانی سپی بوو، ڕەنگیشی لە نێوان ڕەش و سووردا بووە.

یەکێکی تر ئەسپی (مورتجەز)ـە، کە ڕەنگی خۆڵەمێشی بوو خوزەیمەی کوڕی ثابیت بینیویەتی.

ئەسپەکانی تری (لەحیف، لەزاز، زەرب، سەبحە و وەرد) ئەمە ئەو حەوتەن کە ڕای زانایانی لەسەرە، کە زانای پێشەوا عەبدوڵڵای کوڕی ئیسحاقی کوڕی جەماعەتی شافعی لە یەك دێڕە شیعردا کۆی کردۆتەوە:

والخيلُ سَكبٌ لَحيف سَبحةٌ ظربٌ لَزازٌ مُرتجزٌ وردٌ لها أسرارٌ

سەبارەت بە هێستر، ئەمانەی هەبوو: دەلدەل، کە ڕەنگی ڕەش و سپی بوو، کە پادشای میسر مقەوقیس پێشکەشی کردبوو.

ماینێکی تر پێیان دەگوت: فضة کە فەروەی جوزامی پێشکەشی کردبوو.

یەکێکی تری ڕەنگ ڕەش و سپی هاوەڵێکی تر پێشکەشی کردبوو.

سەبارەت بە گوێدرێژ: عەفیری هەبوو، ئەویش ڕەنگی ڕەش و سپی بوو، مقەوقیسی پادشای قیبتییەکان پێشکەشی کردبوو.

گوێدرێژێکی تریش فەروەی جوزامی پێشکەشی کردبوو.

دەگوترێت کە سەعدی کوڕی عوبادە گوێدرێژێکی پێشکەشی پێغەمبەر ﷺ کرد ئەویش سواری بوو.

لە وشترەکان: (قصواء) دەگوترێت ئەو وشترە بووە کە لەسەر پشتیدا کۆچی کردووە.

ئەوانی تر (الغضباء و الجدعاء) الغضب: واتە وشتری گوێبڕاو، والجدع: وشتری لوتبڕاو. بەڵام ئەم وشترانە پێغەمبەر نە گوێیان بڕاو بوو، نە لوت، بەڵکو تەنیا ئەو ناوەیان لێنراوە، دەگوترێت: پێ دەچوو گوێی کەمێك بڕابێت، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە.

بەڵام ئایا (الغضباء و الجدعاء) ناوی یەك وشترە، یان دوو وشترن؟ ڕای جیاواز لەسەر ئەمە هەیە.

(الغضباء): ئەو وشترە بووە کە لە کێبڕکێ دوا نەدەکەوت، جارێك ئەعرابییەك بە سواری وشترێك هات، بە پێشی کەوت، ئەمە لەسەر موسڵمانان قورس بوو، گوتیان: بە پێش (الغضباء) کەوت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"خوای گەورە کردوویتیە ماف لەسەر خۆی، هەر شتێك لە دونیا بەرز بێتەوە، بێگومان نزمی دەکاتەوە**[(١)]**"**.

لە ڕۆژی بەدر، وشترێکی بە غەنیمەت گرت، کە وشتری ئەبو جەهل بوو، ئەڵقەیەکی زیووی لە لوتی دابوو، لە ڕۆژی حودەیبیە کردییە دیاری بۆ ئەوەی بێ باوەڕکان توڕە بکات[(٢)].

خاوەنی سەد سەر مەڕ بوو، نەیدەویست زیاد بێت، هەر کاتێك شوانەکە پێی ڕاگەیاندبا بەرخێك لە دایك بووە، لە جێگایدا مەڕێکی سەر دەبری.

هەروەها حەوت بزنی هەبوو، کە دایکی ئەیمەن بۆی دەلەوەڕاندن[(٣)].

لەقیتی کوڕی سەبرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: چوینە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام لە ماڵەوە نەبوو، خاتوو عائیشەی دایکی باوەڕدارانمان بینی.

دەڵێت: خاتوو عائیشە خواردنی خەزیرەی[(٤)] بۆ ئامادەکردین و خورمای بۆ هێناین.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە و فەرمووی: **"هیچتان بۆ کراوە؟"**.

گوتمان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا.

دەڵێت: لەو کاتەی ئێمە دانیشتبووین لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ، شوانەکە مەڕەکانی بردە هەوێزێ، بەرخێکی بە بارە بارەی پێبوو.

فەرمووی: **"چ لە دایك بووە ئەی فڵان کەس؟"**.

گوتی: بەرخێك.

فەرمووی: **"لە شوێنی ئەودا مەڕێکمان بۆ سەر ببڕە"**.

پاشان فەرمووی: **"وا مەزانن لەبەر تۆ سەرمان بڕی، ئێمە سەد سەر مەڕمان هەیە، نامانەوێ لەمە زیاتر بێت، گەر بەرخێك لە دایك بێت، لە جێگایدا مەڕێك سەر دەبڕین**[(٥)]**"**..

---

(١) بوخاری (٦٠٢٠) گێڕاوەتیەوە- پێشتر باسکراوە

(٢) ئەبو داود (١٧٤٩) و ابن ماجة (٣١٠٠) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبوداود (١٥٣٥) بە "حسن"ی داناوە.

(٣) زاد المعاد (١٢٨/١).

(٤) خەزیرە: جۆرە خواردنێکە لە ئارد و گۆشت پێك هاتووە، سەرەتا گۆشتەکە ورد دەکرێت و ئاوی بەسەردا دەکرێت، کاتێك گۆشتەکە پێگەیشت، ئەو کات ئاردەکەی بەسەردادەکرێت، ئەگەر ئەو خواردنە گۆشتی لەگەڵ تێکەڵ نەکرێت پێی دەگوترێت عەصیدە.

(٥) ئەبو داود (١٤٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی بەسەحیحی داناوە.

## ئەسپی خۆش دەویست و قەدری دەگرت:

**مەعقەلی کوڕی یەسار ﷺ دەڵێت: هیچ شتێك هێندەی ئەسپ لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویست تر نەبووە.**

پاشان فەرمووی: **خوایە گیان ببورە، بەڵکو ئافرەت**[1].

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بینرا کە دەموچاوی ئەسپی بە کراسەکەی خۆی دەسڕیەوە، لەبارەی ئەمەوە پرسیای لێکرا.

فەرمووی: "**ئەم شەو لەبارەی ئەسپەوە گلەییم لێکراوە**[2]".

ئەلباجی دەڵێت: (سڕینەوەی دەم و چاوی ئەسپەکە بە کراسەکەی وەك ڕێز لێنانێك لە ئەسپ بووە، هەروەها وەك زیاد چاو لێ بوون و چاکەکردن لەگەڵیدا بووە.

کاتێك پرسیاری لێکراوە، چونکە پێشوتر ئەم جۆرە کارەی لێ نەبینراوە، فەرمووی: "**ئەم شەو لەبارەی ئەسپەوە گلەییم لێکراوە**"، دەکرێ ئەمەش هەر لە ڕوانگەی زیاد چاو لێبوون و چاکەکردن بووبێت لەگەڵ ئەو ئاژەڵە، بەو پێیەی خوای گەورە تایبەتی کردووە بۆ کاری خێر، هاوکارە لە بە دەست هێنانی پاداشت و دەسکەوت).[3]

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پەرچەمی ئەسپی بە پەنجەکانی لول دەدا، دەیفەرموو: "**خێر و چاکە بە نێوچەوانی ئەسپ بەسراوەتەوە تا ڕۆژی دوایی، لە پاداشت و دەسکەوت**[4]".

مەبەستی ئەم فەرموودەیە: سوننەتە ئەسپ بۆ جیهاد کردن و دژایەتی کردنی دوژمنانی خوا ئامادە بکرێت، خێر و چاکەکەشی تا ڕۆژی دوایی هەر دەمێنێت[5].

### ڕقی لە ئەسپی پێ سپی دەبوویەوە.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەو دەڵێت:پێغەمبەری خوا ڕقی لە (شکال)ی ئەسپ دەبوویەوە[6].

---

[1] ئەحمەد (١٩٨٠١) گێڕاوەتیەوە، شعیب الارنؤوط دەڵێت: "حسن لغیره"، ئەلبانی لە کتێبی "ضعیف الترغیب والترهیب ٨٠٢" بە زەعیفی داناوە.

[2] مالك لە (الموطأ ١٠١٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحیحة بە ژمارە ٣١٨٧) بە سەحیحی داناوە.

[3] المنتقى شرح الموطأ (٣/٢١٦).

[4] موسلیم (١٨٧٢) گێڕاوەتیەوە.

[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣/١٦).

[6] موسلیم (١٣/١٦) گێڕاوەتیەوە.

الشكال: واتە خوارەوەی پێیەکی راستی و دەستێکی چەپی رەنگ سپی بێت، یاخود دەستی راست و پێی چەپی.

ئەبو عوبێد و زانایانی بواری زمانەوانی دەڵێن: مەبەست لە (شکال) ئەوەیە: خوارەوەی سێ پەلی سپی بێت و ئەوی تریان رەنگێکی تر، چونکە بە ئەسپی پێ بەستراو دەچێت.

دەگوترێت واتای تری هەیە.

دەگوترێت: لەوانەیە ئەو ئەسپەی تاقی کردبێتەوە، رەسەنایەتی تێدا نەبووبێت [(١)].

**بەزەیی بە پشیلە دەهاتەوە و خواردن و ئاوی پێ دەدا:**

خاتوو عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قاپێکی بۆ پشیلە دانا، ئەویش لێی خواردەوە، پاشان لە بەرماوەکەی دەست نوێژی هەڵگرت [(٢)].

لە گێڕانەوەیەکی تر خاتوو عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئەمە پیس نییە، ئەوان لەوانەن کە بە دەورتان دەسوڕێنەوە"**. دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ئاوەکەی دەست نوێژی هەڵگرت [(٣)].

کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیك، کە لەلای ئەبو قەتادە بوو، دەگێڕێتەوە و دەڵێت: جارێکیان ئەبو قەتادە هاتە لام، منیش ئاوم بە دەستدا دەکرد بۆ دەست نوێژ.

دەڵێت: لەو کاتە پشیلەیەك هات ئاوی دەخواردەوە، ئەویش قاپەکەی بۆ خوار کردەوە تا تێر ئاو بوو.

کەبشە دەڵێت: زانی کە من تەماشای دەکەم.

گوتی: ئەی کچی برام، پێت سەیرە.

گوتم: بەڵێ.

گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **" ئەمە پیس نییە،ئەوان لەوانەن کە بە دەورتان دەسوڕێنەوە "**[(٤)].

---

[(١)] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٣/١٩).

[(٢)] الطبراني لە (الاوسط ٧٩٤٩) گێڕاوەتیەوە، شێخی ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٤٩٥٨) بە سەحیحی داناوە.

[(٣)] ئەبو داود (٧٦) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە سەحیحی ئەبو داود (٩٦) بە سەحیحی داناوە.

[(٤)] ئەبو داود (٧٥) و ترمذي (٩٢) و ابن ماجة (٣٦٧) و النسائی (٨٦) گێڕاوەتیانەوە، ئەلبانی لە (الارواء ١٧٣) بە سەحیحی داناوە.

لە دەقی فەرموودەکە (الطوافون عليكم والطوافات) هاتووە، البغوی دەڵێت: (لەوانەیە بە خزمەتکاری ماڵەکانی چواندبێت، ئەوانەی بۆ خزمەتکردن بەدەوری خاوەن ماڵەکان دەسوڕێنەوە،وەك وتەی خوای گەورە﴿ طَوَّٰفُونَ عَلَيۡكُم ﴾ النور: ٥٨

لەوانەشە بەوانەی چواندبێت کە بۆ پێویستییەکانیان دەسوڕێنەوە، واتە پاداشتی یارمەتیدانیان هەمان پاداشتی یارمەتیدانی کەسانی خاوەن پێویستییە [1]).

**قەدەغەی دەکرد، ئاژەڵ زیاد لە توانی خۆی لێی باربکرێت، یان برسی بکرێت و ئازار بدرێت:**

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکردم لە دوای بڕۆم، چووە ناو حەساری پیاوێکی ئەنساڕی، وشترێکی لێ بوو، کاتێك پێغەمبەری بینی هەست وسۆزی جوڵا و چاوەکانی پڕ ئاو بوون.

پێغەمبەر ﷺ چووە لای و دەستی بەسەر سەریدا هێناو، بێ دەنگ بوو.

فەرمووی: **"کێ خاوەنی ئەم وشترەیە، ئەم وشترە هی کێیە؟"**.

گەنجێکی ئەنساڕی هات و گوتی: هی منە ئەی پێغەمبەری خوا.

فەرمووی: **"ئایا لەبارەی ئەو ئاژەڵە لە خوا ناترسی کە پێی داوی، سکاڵا لای من دەکات کە برسی و ماندووی دەکەی؟** [2]".

سەهلی کوڕی حەنزەلە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای وشترێکدا تێپەڕی، کە سکی بە پشتییەوە نوسابۆوە، فەرمووی: **"لەبارەی ئاژەڵە بەستەزمانەکان لە خوا بترسن، بە باشی بەکاریان بهێنن و بەباشی خواردنیان پێ بدەن** [3]".

**علقمی** دەڵێت: واتە لە خوا بترسێن لەو ئاژەڵانە کە ناتوانن قسە بکەن و باسی خۆیان بکەن لە برسی و تینوویی و ماندبووندا.

موعازی کوڕی ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای خەڵکانێدا تێپەڕی، کە لەسەر پشتی ئاژەڵەکانیان بوون، ئاژەڵەکانیش وەستابوون.

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون: **"گەر سواری پشتیان دەبن با ساغ بن**(واتە: ماندوو کەنەفت نەبن)**، کە دادەبەزن با ساغ بن، ئاژەڵەکان مەکەنە کورسی و لە ڕێگا و بازاڕەکان**

[1] شرح السنة (٢/٧٠) بە کورتکراوی.
[2] ئەبو داود (٢٥٤٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبي داود ٢٢٩٧) بە سەحیحی داناوە.
[3] ئەبو داود (٢٥٤٨) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٣) بە سەحیحی داناوە.

**لەسەری دابنیشن و دەمە تەقێ بکەن، لەوانەیە ئاژەڵێك باشتر بێت لەو کەسەی لەسەر پشتییەتی، چونکە ئەو زیاتر یادی خوای گەورە دەکات**[١]".

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: "**نەکەن پشتی ئاژەڵەکان بکەنە مینبەر، خوای پەروەردگار ئەوانی بۆ ئێوە رام کردووە، هەڵتان دەگرن بۆ وڵات و شوێنێك کە ئێوە دوای زەحمەت و ماندوو بوونێکی زۆر نەبێت پێی ناگەن، زەویشی بۆ داناون کاروبارەکانتان لەسەری جێبەجێ بکەن**[٢]".

فەرمانی کردووە لەگەڵیان نەرمونیان بن:

شورەیحی کوڕی هانیئ دەڵێت: خاتوو عائیشە سواری وشترێك بوو، وشترەکە هەندێك زەحمەت بوو، عائیشە ویستی بە زۆر بیوەستێنێت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: "**نەرمونیان بە**[٣]".

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**گەر لە کاتی بوونی سەوزایدا گەشتتان کرد، لێ بگەڕێن وشترەکە مافی خۆی لە زەوی بخوات، ئەگەریش لە کاتی وشکیدا گەشتتان کرد، پەلە بکەن لە رۆیشتن، گەر شەو درەنگ نوستن، لەسەر رێگا مەخەون، چونکە شەوانە ئەوێ دەبێتە شوێنی ئاژەڵ و زیندەوەرەکان**[٤]".

**واتای فەرموودەکە**: هانی نەرم و نیانی لەگەڵ ئاژەڵان دەدات و رەچاوی بەرژەوەندییان دەکات، گەر لە کاتی بوونی سەوزاییدا گەشتیان کرد، با بە هێواشی بڕۆن، لێ بگەڕێن بە رۆژ بلەوەڕێن یان لە کاتی رۆیشتندا، لەو کاتەدا مافی خۆی لە زەوی دەخوات کە لێی دەلەوەڕێت.

بەڵام گەر لە کاتی وشکیدا رۆیشتن، با لە رۆیشتندا پەلە بکەن، بۆ ئەوەی بگەنە شوێنی مەبست و ئاژەڵەکەش وزەو توانای لەبەردا مابێت، با بە هێواشی نەڕۆن لەبەر ئەوەی ئاژەڵەکە توشی زیان دەبێت، چونکە هیچ نابینێت لێی بخوات، بێ هێز دەبێت و لەوانەیە بوەستێت.

---

[١] ئەحمەد (١٥٢١٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٩٠٨) بە سەحیحی داناوە.
[٢] ئەبو داود (٢٥٦٧) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٢) بە سەحیحی داناوە.
[٣] موسلیم (٢٥٩٤) گێڕاوەتیەوە.
[٤] موسلیم (١٩٢٦) گێڕاوەتیەوە.

فێرکردنی چۆنیەتی نوستنی شەوانەش، جۆرێکە لە ئادابی گەشتکردن و مانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنوێنی کردووە، چونکە زیندەوەرە زیانبەخشەکان و ئاژەڵە ژەهراوەیی و دڕندەکان لەبەر ئاسانی بەسەر ڕێگاکاندا دەڕۆن، هەرچی بە دەستیان بکەوێت لە خواردن دەیخۆن، گەر مرۆڤ لەو شوێنە بخەوێت، لەوانەیە یەکێك لەوانە بۆلای بچێت کە زیان بەخشە و ئازاری دەدا، بۆیە پێویستە لەسەر ڕێگاکان دوور بن [1].

## هەواڵی داوە، کە مرۆڤ بە هۆی ئازاردنی ئاژەڵ دەچێتە دۆزەخەوە:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**ئافرەتێك بە هۆی پشیلەیەکەوە سزا درا، پشیلەکەی داکرد تاوەکو مرد، بە هۆیەوە چووە ناو ئاگر، نە خواردن و خواردنەوەی پێدا، نە هێشتی بە خۆی بچێت لە بەرووبوومی زەوی بخوا** [2]".

نەوەوی دەڵێت: ئەم فەرموودەیە بەڵگەی حەرام کردنی کوشتنی پیشیلەی تێدایە، هەروەها حەرامە پشیلە بەند بکرێت نە خواردن و نەخواردنەوەی پێ نەدرێت [3].

## هەواڵی داوە، نەرم و نیان بوون لەگەڵ ئاژەڵان، هۆکارە بۆ چوونە بەهەشت و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوا:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**پیاوێك بە ڕێگادا ڕۆیشت، تینوو بوو، چووە ناو بیرێك و ئاوی لێ خواردەوە، کاتێك هاتە دەرەوە بینی سەگێك هەناسە بڕکێیەتی و لەبەر زۆر تینوویی وا خۆڵەکە دەخوات، گوتی: ئەویش وەك منی لێهاتووە، پێڵاوەکەی پڕ ئاو کرد و بە دەمی خۆی گرتی** [4]**، پاشان سەگەکەی ئاودا تا تینوویەتی شکا، سوپاسی خوای کرد ئەویش لێی خۆشی بوو**".

گوتیان: ئەی پێغەمبەری، ئایا ئێمە لەسەر ئاژەڵەکان پاداشت وەردەگرین؟

فەرمووی: "**بەڵکو بە هۆی هەموو خاوەن جەرگێکی تەڕ پاداشت هەیە** [5]".

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٦٩/١٣).

[2] بوخاری (٣٤٨٢) و موسلیم (٢٢٤٢) گێڕاوەتیانەوە.

[3] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٤٠/١٤).

[4] پێڵاوەکەی بەدەمی گرت، چونکە بە دەستەکانی لە بیرەکە دەهاتە سەرەوە، چونکە سەرکەوتن لەناو بیر کارێکی قورسە. فتح الباري (٤١/٥).

[5] بوخاری (٢٣٦٣) و موسلیم (٢٢٤٤) گێڕاوەتیانەوە.

واتە: چاکەکردن لەگەڵ هەموو ئاژەڵێکی زیندوو، بە ئاوپێدان یان هەر شتێکی تر، پاداشت هەیە، بۆیە بە زیندوو دەڵێت خاوەن جەرگی تەڕ، چونکە مردوو جەستە و جەرگی وشك دەبێت.

داودی دەڵێت: واتە لە هەموو جەرگێکی تەڕ پاداشت هەیە، ئەمەش سەرجەم ئاژەڵان دەگرێتەوە.

نەوەوی دەڵێت: (ئەو گشتاندنە، تایبەتە بەو ئاژەڵە ڕێز لێگیراوانەی کە فەرمانی کوشتنیان دەرنەکراوە، پاداشتەکە بە هۆی ئاو و خواردن پێدان و چاکەکە لەگەڵ کردنیان وەردەگیرێت، تەنانەت ئەگەر ئاژەڵەکەماڵی بێت یان نا، هی خۆی بێت یان هی کەسێکی تر). [1]

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **"سەگێك بە دەوری بیرە ئاوێك دەخولایەوە، خەریك بوو تینوویەتی دەیکوشت، ئافرەتێکی داوێن پیس لە داوێن پیسەکانی بەنی ئیسرائیل بینی، پێڵاوەکەی داکەند و ئاوی پێدا سەگەکە، خوای گەورە بە هۆیەوە لێی خۆش بوو"[2].**

### هەواڵی داوە پێدانی خواردن بە ئاژەڵان پاداشتی هەیە:

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"هیچ موسڵمانێك نییە، نەمامێك بچێنێت، یان کشتوکاڵێك بکات، ئینجا باڵندە یان مرۆڤ یان ئاژەڵ لێی بخوات، ئەوا تەنیا لەو کارەیدا چاکەی بۆ هەیە"[3].**

### ڕێگری دەگرت، بەچکەی باڵندە لە دایکی داببڕێت:

ئیبن مەسعود دەڵێت: ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتێکدا بووین، بۆ پێویستییەك دەرچوو، باڵندەیەکمان بینی (وەك چۆلەکەیەك) دوو بەچکەی لەگەڵدابوو، بەچکەکانیمان برد.

باڵندەکە هات و باڵەکەی لێك دەدا و لە زەوی نزیك دەبوویەوە.

پێغەمبەر ﷺ هاتەوە و فەرمووی: **"کێ منداڵەکەی لێستاندووە؟ منداڵەکەی بۆ بگەڕێننەوە".**

هەروەها شارە مێروولەیەکی بینی کە ئاگرمان تێبەردابوو، فەرمووی: **"کێ ئاگری لەمە بەرداوە؟".**

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/٢٤١).

[2] بوخاری (٣٤٦٧) و موسلیم (٢٢٤٥) گێڕاوەتیانەوە.

[3] بوخاری (٢٣٢٠) و موسلیم (١٥٥٣) گێڕاوەتیانەوە.

گوتمان: ئێمە.

فەرمووی: **"نابێت کەس کەسی تر بە ئاگر سزا بدات، تەنیا خوای ئاگر نەبێت [١]"**.

**خطابي** دەڵێت: لەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە سوتاندنی ماڵی زەردەواڵە مەکروهە، بەڵام مێروولە بیانووی کەمترە، چونکە بێ سوتاندن دەتوانرێ زیانەکەی لابرێت.

دەڵێت: مێروولە دوو جۆرە، جۆرێکیان زیان بەخەشە، لادانی زیانەکەی دروستە، جۆرێکی تریان زیانی نییە، کە پێ درێژە، ئەمەیان کوشتنی دروست نییە [٢].

## تیر و بەرد تێگرتنی لە ئاژەڵان قەدەغە دەکرد:

هیشامی کوڕی زەید دەڵێت: لەگەڵ ئەنەس چووینە لای حەکەمی کوڕی ئەیوب، بینمان کۆمەڵە منداڵێك مریشکێکیان داناوە و بەردی تێدەگرن.

ئەنەس گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ رێگری کردووە ئاژەڵ ببەسترێتەوە [٣].

واتە: ببەسترێتەوە تا مردنی.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە کە چۆتە لای یەحیای کوڕی سەعید، منداڵێکی ئەو ماڵە مریشکێکی بەستبۆوەو بەردی تێدەگرێت.

عەبدوڵلا چووە لای تاوەکو مریشکەکەی کردەوە، پاشان گوتی: رێگری لە منداڵەکەتان بکەن کە ئەم باڵندەیە بکوژێت، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە رێگری کردووە لەوەی هەر ئاژەڵێك ببەسترێتەوەو لێی بدرێت تا دەمرێت [٤].

لە گێڕانەوەی سەعیدی کوڕی جوبەیردا دەڵێت: ئیبن عومەر بەلای دوو مێرد منداڵی قورەیش تێپەڕی کە باڵندەیەکیان دانابوو تیریان تێدەگرت، وایان دانابوو هەر تیرێك گەر بەر باڵندەکە نەکەوێت ببێتە هی خاوەن باڵندەکە، کاتێك ئیبن عومەریان بینی بڵاوەیان لێکرد.

ئیبن عومەر فەرمووی: کێ ئەمەی کردووە؟ نەفرەتی خوا لەو کەسەی ئەمەی کردووە. پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی لەو کەسە کردووە شتێکی روح لەبەر بکاتە نیشانە [٥].

---

[١] ئەبو داود (٢٦٧٥) و ئەلبانی لە (الصحيحة ٤٨٧) بە سەحیحی داناوە.

[٢] عون المعبود (٧/٢٤٠).

[٣] بوخاری (٥٥١٣) و موسلیم (١٩٩٥٦) گێڕاوەتیانەوە.

[٤] بوخاری (٥٥١٤) گێڕاوەتیەوە.

[٥] بوخاری (٥٥١٥) و موسلیم (١٩٨٥) گێڕاوەتیانەوە.

لە گێڕانەوەیەکی تردا: "**نەفرەتی خوا لەو کەسەی ئاژەڵ بشێوێنێ**[(١)]".

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: "**هەر شتێك روحی لەبەر بوو، مەیکەنە نیشانە**[(٢)]".

نەوەوی دەڵێت: واتە: (ئاژەڵی زیندوو مەکەنە نیشانە و شتی تێبگرن، وەك چۆن پێستە و شتی تر دەکرێتە نیشانە، ئەم ڕێگری کردنە بە واتای حەرام کردن دێت، بۆیە پێغەمبەر ﷺ کە لە گێڕانەوەی ئیبن عومەردا هاتووە دەفەرموێت: "**نەفرەتی خوا لەو کەسەی ئەم کارەی کردووە**"، چونکە ئەم کارە ئازاردانی ئاژەڵانە و لەناو بردنیانە، تێکدانی هەست و بیرکردنەوەیانە، یاخود زیان بە سوودەکەی دەگەێنێت ئەگەر ئاژەڵەکە سوودبەخش بێت).[(٣)]

**قەدەغەکردووە ئاژەڵ نێوچەوانی داغ بکرێت یان لە دەم و چاوی بدرێت:**

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای گوێدرێژێکدا تێپەڕی کە نێوچەوانی داغ کرابوو، فەرمووی: "**نەفرەتی خوا لەوەی داغی کردووە**[(٤)]".

لە گێڕانەوەیەکی تردا دەفەرموێت: "**ئایا من پێم ڕانەگەیاندن،کە نەفرەتم لەو کەسە کردووە، کە نێوچەوانی ئاژەڵ داغ بکات، یان لە دەم و چاوی بدا**[(٥)]".

نەوەوی دەڵێت: لێدان لە دەم و چاو، ڕێگری لێکراوە بۆ هەموو گیانلەبەرێك لە مرۆڤ و گوێدرێژ و ئەسپ و وشتر و مەڕ و ئەوانی تر، بەڵام بۆ مرۆڤ توندترە، چونکە دەم و چاو شوێنی کۆکەرەوەی جوانییەکانە، لەگەڵ ئەوەی ناسکە و شوێنەواری لێدان لەسەری دەردەکەوێت، لەوانەیە ناشیرینی بکات و هەستەوەرەکانی تێك بدات.

بەڵام داغ کردن ڕای ئیجماعی لەسەرە،کە ڕێگری لێکراوە، وەك ئەوەی باسکرا.

سەبارەت بە مرۆڤ، لەبەر کەرامەتی، داغ کردنی حەرامە، هەروەها لەبەر ئەوەی پێویستی پێی نییە، دروست نییە سزا بدرێت.

بەڵام گیانداران، کۆمەڵێك لە زانایان دەڵێن: ناپەسەندە، لە زانایان بەغەوی دەڵێت: دروست نییە. ئاماژەشی بۆ حەرام کردنەکەی کردووە، چونکە پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لە

---

(١) نسائی (٤٤٤٢) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح الجامع ٥١١٣) بە سەحیحی داناوە.

(٢) موسلیم (١٩٥٧) گێڕاوەتیەوە.

(٣) شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٨/١٣).

(٤) موسلیم (٢١١٧) گێڕاوەتیەوە.

(٥) ئەبو داود (٢٥٦٤) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحيح أبي داود ٢٣١٠) بە سەحیحی داناوە.

بکەرەکەی کردووە، نەفرەت کردنیش واتە حەرام کردن، بەڵام داغ کردنی ئاژەڵان جگە لە دەم و چاویان بە بێ بوونی ناکۆکی دروستە.

ئەم کارە لە بەرهەمی زەکات و جیزیە دروستە، بۆ کاری تر دروست نییە و ڕێگری لێکراوە.

زانایانی زمانەوانی دەڵێن: داغ کردن شوێنەواری سوتانەوەیە [١].

## هەروەها قەدەغەی کردووە جەستەی ئاژەڵ بشێوێنن:

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای خەڵکانێکدا تێپەڕی کە تیریان دەگرتە بەرانێك، ئەمەی پێ ناخۆش بوو، فەرمووی: "**جەستەی ئاژەڵەکان مەشێوێنن**"[٢].

شێواندنی جەستە، بە لێك کردنەوەی پەلێك یان ئەندامێکی دەبێت، یان مردوو بشێوندرێت واتە لوتی یان گوێی یان ئەندامێکی تری ببڕدرێت [٣].

## خەساندنی ئاژەڵی قەدەغەکردووە، تەنیا بۆ پێویستی نەبێت:

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ڕێگری کردووە لە خەساندنی ئەسپ و ئاژەڵ [٤].

خەساندن: بڕین یان لێکردنەوەی گونەکانە [٥].

قرطبي دەڵێت: (خەساندن لە ئاژەڵان بەبێ بوونی هیچ بەرژوەندییەك قەدەغەکراوە، وەك بەرژوەندی خۆش کردنی گۆشت یان لابردنی زیان لە گۆشتەکە). [٦]

واتە ئەو ئاژەڵەی لە خەساندنی سوود هەیە، دروستە بخەسێندرێت.

لە خاتوو عائیشە و ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستبای قوربانی بکات، دوو بەرانی گەورە و قەڵەو و بە قۆچ و ڕەش و سپی و گون بڕاوی دەکڕی، یەکێکیانی لەجیاتی ئۆمەتەکەی سەربڕی بۆ ئەوانەی شاهێدی یەکتاپەرستی دەدەن، شاهێدیش بۆ ئەوە دەدەن، کە پەیامەکەی گەیاندووە، بەرانی دووەمیش لەجیاتی خۆی ﷺ و بنەماڵەکەی سەربڕی [٧].

---

[١] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤/٩٧).
[٢] نسائي (٤٤٤٩) ئەلبانی بە سەحیحی داناوە.
[٣] النهاية (٤/٢٩٤).
[٤] ئەحمەد (٤٧٥٥)، ئەلبانی لە (صحيح الجامع بەژمارە ٦٩٥٦) بە سەحیحی داناوە.
[٥] غريب الحديث لابن الجوز (٢/٤٥٣).
[٦] المفهم لما أشكل من تلخيص كتاب مسلم (١٢/١٢٧).
[٧] ابن ماجة (٣١٢٢) ئەلبانی لە (صحيح سنن ابن ماجة ٣١٢٢) بە سەحیحی داناوە.

## ڕێگری دەکرد لە کوشتنی ئەو گیاندارانەی زیانیان نییە:

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کوشتنی چوار جۆر گیانداری قەدەغەی کردووە ئەوانیش: مێرووله، هەنگ، پەپوسلێمانکە و (صرد [1])ـە [2].

بەڵام مێرووله ناکوژرێت تەنیا زیان بەخشەکەی نەبێت.

هەنگیش سوودی هەیە لە دروستکردنی هەنگوین و شەمیّ.

پەپوسلێمانکە و "الصرد" بەهۆی حەرامی گۆشتیانە، دەگوترێت: پەپوسلێمانکە بۆنی ناخۆشە، واتە بۆتە ئەو گیانلەبەرەی لەبەر خواردنی پیسایی بۆنی ناخۆش بووە.

(الصرد)یش بە هۆی ئەوەی عەرەب پێی وایە باڵندەیەکی شوومە، ڕێگری لە کوشتنی کردووە، بۆ ئەوەی ئەو بۆچوونە لە بیرکردنەوەیان لاببات [3].

## فەرمانی کوشتنی ئەو گیاندارنەی دەرکردووە کە زیانیان هەیە:

خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"پێنج گیانلەبەر هەنە، زیان بەخشن، لە کاتی ئیحرامی و بێ ئیحرامیدا دەکوژرێن، ئەوانیش: قەلەڕەش، کۆلارە، سەگی کازکر، دوپشك و مشك [4]"**.

لە گێڕانەوەی موسلیمدا لە شوێنی "دووپشك"، "مار" هاتووە.

نەوەوی دەڵێت: هەموو زانایان هاوڕان لەسەر حەلال بوونی کوشتنی ئەو گیانلەبەرانە لە حاڵەتی ئیحرام و لە حاڵەتی ئاساییدا، لە دەقی فەرموودەکە وشەی (فسق) بەرامبەر ئەو گیانلەبەرانە بەکارهاتووە، کە وشەی (فسق) لە زمانی عەرەبیدا بە واتای دەرچوون دێت، دەگوترێت (پیاوی فاسق) بە هۆی دەرچوونی لە فەرمانی پەروەردگار، بەو گیانلەبەرانە دەگوترێت (فاسق) بە هۆی دەرچوونیان لەسەر ڕێگای زۆربەی گیانلەبەرانی تر بە ئازاردن و بڵاوکردنەوەی خراپە.

**"الغراب الاقبع"**، واتە ئەوەی پشت و سکی سپییە [5].

---

[1] باڵندەیەکە لە چۆلەکە گەورەترە، سەر و دەنوکی گەورەیە، پەڕی زۆرە، نیوەی سپی و نیوەکەی تری رەشە. النهایة (٢١/٣).

[2] ئەبو داود (٥٢٦٧) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (الارواء ٢٤٩٠) بە سەحیحی داناوە.

[3] سەیری: مرقاة المفاتیح (٢٦٨١/٧)، الموسوعة الفقهیة (٢٨٣/١٧).

[4] بوخاری (١٨٢٩) و موسلیم (١١٩٨) گێڕاوەتیانەوە.

[5] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١١٣/٨) بە کورتکراوەیی.

سەعدی کوڕی ئەبوی وەقاس ﷺ دەگێڕێتەو کە پێغەمبەری خوا فەرمانی بە کوشتنی مارمێلکە کردووە، ناوی ناوە (فاسقۆکە) [1].

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"ئەوەی بە یەکەم لێدان مارمێلکە بکوژێت، ئەوەندە و ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە، ئەوەی بە دووەم جار بیکوژێت، ئەوەندە و ئەوەندە چاکەی هەیە کەمتر لە هی یەکەم، ئەوەی بۆ سێیەم جاریش بیکوژێت ئەوەندە و ئەوەندە چاکەی بۆ هەیە بەڵام کەمتر لە هی دووەم [2]".**

دایکی شریك ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا فەرمانی بە کوشتنی (مارمێلکە) کردووە، فەرموویەتی **"ئەو فوی لە ئاگری ئیبراهیم ﷺ کردووە [3]".**

نەوەوی دەڵێت: (زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی مارمێلکە لە زیندەوەرە زیان بەخشەکانە، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کوشتنی داوە، هانی کوشتنیشی داوە، چونکە لە زیان بەخشەکانە). [4]

## ڕیگری کردووە ئاژەڵ لە پێناو گاڵتەکردن بکوژرێت:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"هەر کەسێك چۆلەکەیەك بە بێ مافی بکوژێت، خوای گەورە لە رۆژی دوایی لێپرسینەوەی لەبارەیەوە لەگەڵ دەکات".**

پرسیان: مافی چییە؟

فەرمووی: **"سەری ببڕێت و بیخوات [5]".**

## هانیدەدان بەزەییان بێتەوە بە ئاژەڵان:

ئەبو ئومامە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"هەر کەسێك بەزەیی هەبێت، تەنانەت بە چۆلەکەیەکی سەربڕاویش، خوای گەورە لە رۆژی دوایی بەزەیی پێدادێتەوە [6]".**

---

[1] بوخاری (٣٣٠٦) و موسلیم (٢٢٣٨) گێڕاوەتیانەوە.
[2] موسلیم (٢٢٤٠) گێڕاوەتیەوە.
[3] بوخاری (٣٣٥٩) و موسلیم (٢٢٣٧) گێڕاوەتیانەوە.
[4] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (٢٣٦/١٤).
[5] النسائی (٤٤٤٥) گێڕاوەتیەوە، حاکم (٧٥٧٤) ذهبي بە سەحیحیان داناوە، ئەلبانی بە "زەعیف"ی داناوە.
[6] طبراني لە (الکبیر ٧٩١٥) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (صحیح الجامع ٦٢٦١) بە سەحیحی داناوە.

موعاوییەی کوڕی قوڕە لـە باوکییـەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: پیاوێـك بـە پێغەمبـەری گـوت: مـن مـەڕ سـەردەبڕم و بـەزەییم پێـدا دێتـەوە، یـان گـوتی: مـن بـەزەییم بـە مـەڕ دێتەوە،کە سەری دەبڕم.

فەرمووی: **"مەڕیش گەر بەزەییت پێدابێتەوە، خوای گەورە بە بەزەیی دەبێت لەگەڵت"**[1].

## ڕێگری کردووە لە جنێودان و نەفرەتکردن لە ئاژەڵ، بە تایبەت کەڵەشێر:

زەیدی کوڕی خالید ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **"جنێو بە کەڵەشێر مەدەن، چونکە ئەو بۆ کاتی نوێژ ئاگادارتان دەکاتەوە"**[2].

واتە: هەڵسان بۆ شـەونوێژ بـە هـۆی بانگـدانی، بۆیـە هـەر شـتێك یارمەتیـدەر بێـت بـۆ ئەنجامدانی بەندایەتیکردن شایەنی ستایش کردنە نەك زەمکردن.

مناوی دەڵێت: عادەتی وایە بەر لە کاتی بانگدانی بەیانی، یان لە کاتی ڕۆژهەڵاتن چەند جارێك بانگ دەدات، داهێنانێکی خۆڕسکە خوای گەورە لەسەری لێی ڕاهێناوە.

**حەلیمی** دەڵێت: لەو فەرموودەیـە ئـەوەی وەردەگیرێـت ئەمەیـە: هـەر شـتێك سـوودی هەبێت ناکرێت قسەی ناشیرینی پێ بگوترێت و سوکایەتی پێ بکرێت، بەڵکو دەبێت ڕێـزی بگیرێت و چاکەی لەگەڵ بکرێت[3].

عیمرانی کوڕی حەصین دەڵێت: لـە کاتێکدا لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە گەشـتێك بووین، ئافرەتێك لەسەر پشتی وشترێك بوو، لێی توڕەبوو، نەفرەتی لێکرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەمە بوو، فەرمووی: **"ئەوەی لێی بارکراوە لێ وەربگرنەوە، لێی گەڕێن بڕوا، چونکە ئەو وشترە نەفرین کراوە"**.

عیمران دەڵێت: وەك ئەوەی من دەمبینی وشتر لە ناو خەڵکی دەڕۆیشت کـەس ڕێگـری لێ نەدەکرد[4].

ئەبو بەرزەی ئەسلەمەی ﷺ دەڵێـت: لـە کاتێکـدا کچێك لەسـەر وشـترێك بـوو، هەنـدێك کەلوپەلی خەڵکی لەسەر بوو، کاتێك پێغەمبەری ﷺ بینی، ئارامی لێـبڕا، ئافرەتەکـە پێـی گوت: حەچچە، نەفرەتی خوات لێ بێت.

پێغەمبەری خوا فەرمووی: **"وشترێك نەفرەتی لێکرابێت، هاوڕێیەتیمان ناکات"**.

---

(1) ئەحمەد (١٥١٦٥)، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٦) بە سەحیحی داناوە.

(2) ئەبو داود (٥١٠١) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (التعليقات الحسان ٥٧٠١) بە سەحیحی داناوە.

(3) عون المعبود (١٤/٥).

(4) موسلیم (٢٥٩٥٩) گێڕاوەتیەوە.

نەوەوی دەڵێت: (بۆیە ئەم قسەیەی کردووە، وەك سەرزەنشت کردنێکی ئافرەتەکە و کەسانی تر، چونکە پێشتر نەفرەتکردنی لە وشتر و ئاژەڵانی تر قەدەغەکردووە، ئافرەتەکە سزا درا بە بەرەڵڵا کردنی وشترەکە، مەبەستیش لێرەدا هاوڕێیەتیکردنی پێغەمبەر لەگەڵ ئەو وشترەدا قەدەغەیە، ئەگینا فرۆشتن و سەربڕین و سواربوونی بۆ گەشتی تر – کە پێغەمبەر ﷺ لەگەڵیدا نەبێت– و بۆ کاروباری تر، وەك چۆن پێشتر دروست بوو، دوای نەفرەتەکەشی هەر دروستە، چونکە شەرع تەنیا رێگەی لە هاوڕێیەتیکردن کردووە، ئەگینا بۆ هەموو کاروبارەکانی تر وەکو خۆیەتی).[1]

## فەرمانی دەکرد، گەر کەسێك نیازی سەربڕینی مەڕی هەیە، با مەڕێکی بێ شیر سەرببڕێت:

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە کە پیاوێکی ئەنساری هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، چەقووەکەی تیژ دەکرد بۆ سەربڕینی مەڕێك بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: "**ئاگاداریە شیردەر نەبێت**"[2].

## فەرمانی دەکرد، لە کاتی سەربڕین نەرمونیان بن:

شەدادی کوڕی ئەوس ﷺ دەڵێت: دووشتم لە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرکردووە کە دەفەرموێت: "**خوای گەورە چاکەی لەسەر هەموو شتێك فەرزکردووە، گەر کوشتنتان ئەنجامدا بە جوانی ئەنجامی بدەن، ئەگەر سەربڕینتان کرد بە جوانی ئەنجامی بدەن، هەریەك لە ئێوە با چەقووەکەی تیژ بکات، سەربڕاوەکەی ئاسودە بکات**"[3].

نەوەوی دەڵێت: مەبەست لە "**سەربڕاوەکەی ئاسودە بکات**"، واتە: چەقووەکەی تیژبکات، بە توندی لێی بخشێنێت، واباشترە لەبەردەمی ئاژەڵەکە چەقووەکە تیژ نەکرێت، یان ئاژەڵێکی تر لەبەردەم یەکێکی تر سەرنەبڕێت، بەدوای خۆی رانەکێشێت.

مەبەست لە "**بە جوانی کوشتن ئەنجام بدەن**"، سەرجەم کوشتنەکان دەگرێتەوە لە سەربڕین و کوشتن بە تۆڵەکردنەوە و جێبەجێ کردنی سزای شەرعی کوشتن و هتد. ئەمە فەرموودەیە لە کۆکەرەوەکانی رێساکانی ئیسلامە[4].

---

[1] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٤٨/١٦).

[2] موسلیم (٢٠٣٨) گێڕاوەتیەوە–پێشتر بە درێژی باسکراوە

[3] موسلیم (١٩٥٥) گێڕاوەتیەوە.

[4] شەرحی نەوەوی لە سەحیحی موسلیم (١٠٧/١٣).

ئیبن عەباس  دەگێڕێتەوە پیاوێك مەڕێکی بۆ سەربڕین درێژ کردبوو، لەو کاتەشدا چەقووەکەی تیژ دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"ئایا دەتەوێ دووجار بیکوژی؟ نەدەکرا بەر لە درێژکردنی چەقووەکەت تیژکردبا** [١]".

## قەدەغەی کردووە، ماین لە گوێ درێژ چاك بکرێت:

عەلی کوڕی ئەبو تالیب  دەڵێت: هێسترێك پێشکەشی پێغەمبەری خوا ﷺ کرا، سواری پشتی بوو.. عەلی گوتی: ئەگەر ماین لە گوێ درێژی نێر چاك بکەین، هەمان جۆری هێسترمان دەبێت.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **"بەڵکو ئەوانە ئەم کارە دەکەن نەزانن** [٢]".

دەگوترێت: هۆکاری ناپەسەندی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی چونکە شتی بە بایەخ بە شتی کەم بایەخ دەگۆڕێتەوە.

خطابي دەڵێت: دەکرێت واتەکەی –خوا باشتر دەزانێت– ئەوە بێت: ئەگەر ماین لە گوێ درێژی نێر چاك بکرێت، ژمارەی ئەسپ و ماین کەم دەبێت و ڕەچەڵەکی دەبڕێتەوە و سوودەکەی دەوەستێت، ماین و ئەسپ بۆ بار و غارغارێن و جیهادکردن و بەدەست هێنانی دەسکەوت بەکاردێت و گۆشتەکەشی دەخورێت، لەگەڵ چەندان سوودی تر، بەڵام کاتێك هێستر لەو پرۆسەیە دروست دەبێت ئەو سوودانەی نابێت، بۆیە باشترە ئەسپ و ماین ڕەچەڵەکیان زۆرتر بێت بۆ ئەوەی سوودیان لێ وەربگیرێت.

## ئاژەڵان شاهێدی پێغەمبەرایەتی دەدەن:

ئەبو سەعیدی خودری  دەڵێت: گورگێك پەلاماری مەڕێکی دا، بردی، شوانەکە بە دوای کەوت و لێ ستاندەوە، گورگەکە لەسەر کلکی هەڵتروکا گوتی: ئایا لە خوا ناترسێیت، رزقێکم لێ دەستێنیتەوە، کە خوای گەورە پێی بەخشیووم؟

شوانکە گوتی: ئای لەو سەیرو سەمەرەیە.. گورگێکی دانیشتوو قسەم لەگەڵ دەکات وەك مرۆڤ!

گورگەکە گوتی: دەتەوێت لەوە سەیرترت پێ رابگەیێنم؟ موحەممەد ﷺ لە یەثریبە، هەواڵی ڕووداوەکانی رابردوو بە خەڵکی رادەگەیێنێت.

دەڵێت: شوانکە مەڕەکانی لێخوڕی تا گەیتشە مەدینە، مەڕەکانی لە شوێنێك مۆڵدان، پاشان چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند.

---

[١] حاکم (٧٥٦٣) گێڕاوەتیەوە، لەسەر مەرجی بوخاری بە سەحیحی داناوە، ئەلبانی لە (الصحيحة ٢٤) بە سەحیحی دلناوە.

[٢] ئەبو داود (٢٥٦٥) و نسائی (٣٥٨٠) گێڕاوەتیانەوە. ئەلبانی لە (صحيح أبي داود ٢٣١١) بە سەحیحی داناوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی نوێژی بە کۆمەڵی کرد و فەرمووی: الصلاة جامعة.

پاشان بە شوانەکەی فەرموو: "**هەواڵەکەیان پێ ڕابگەینە**".

هەواڵی پێ ڕاگەیاندن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "**ڕاستی گوت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ڕۆژی دوایی نایێت، تاوەکو گیانداری دڕندە قسە لەگەڵ مرۆڤ دەکات، سەری قامچی و لاچکی نەعلەکانی قسە لەگەڵ پیاو دەکەن، هەر دوو ڕانی قسەی لەگەڵ دەکەن کە خانەوادەکەی چییان لەپاش ئەو داهێناوە**).

## شێرێك لە پێناو خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ یارمەتی کەشتییەك دەدات:

لە کەشتیوانی خزمەتکاری پێغەمبەرەوە ﷺ دەڵێت: بە سواری کەشتییەك چوینە دەریا، کەشتیەکە شکا، سواری پارچە تەختەیەك بووم، فڕێی دامە شوێنێکی چڕوپڕ لە داروبار، شێرێکی لێ بوو، هیچ چارم نەما بەرامبەری، گوتم: ئەی باوکی حاریس[١] من خزمەتکاری پێغەمبەری خوام ﷺ. سەری نزم کرد، لابالێکی هەڵتەکاند، وەك ئاماژەیەك بۆ من، بەردەوام بەم شێوەیە ڕێگەی پێ نیشاندام تا منی گەیاندە سەر ڕێگا، کاتێك منی گەیاندە شوێنی مەبەست، بۆڵاندی، پێم وابوو خواحافیزی لێکردم[٢].

لە گێڕانەوەیەکی تر لە کوڕی مونکەدیرەوە دەڵێت: کەشتی خزمەتکارەکەی پێغەمبەر ﷺ لە زەوی ڕۆمدا ڕێگای لێ بزر بوو، یاخود بەدیل گیرا، خزمەتکارەکە لە ترسی سوپای دوژمن هەڵات، توشی شێرێك بوو.

گوتی: ئەی باوکی حاریس، من خزمەت کاری پێغەمبەرم ﷺ ئاوا و ئاوام لێ بەسەرهاتووە.

شێرەکە کلکی جوڵاند تا هەڵسا، گوێی لە هەر دەنگێك بایە بەرەو لای دەچوو، پاشان بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن تا گەیشتە سوپاکە، پاشان گەڕایەوە[٣].

---

[١] (باوکی حارس): لە زمانی عەرەبی نازناوی شێرە. (و).

[٢] حاکم (٤٢٣٥) گێڕاوەتیەوەبە سەحیحی داناوە، ذهبي هاوڕایە لەگەڵی.

[٣] عبدالرزاق لە (المنصف ٢٠٥٤٤) گێڕاوەتیەوە. ئەبو نەعیم لە (الحلية ١٣٠/٩) گێڕاوەتیەوە، ئەلبانی لە (تحقیق المشكاة ٥٩٤٩) گێڕاوەتیەوە.

# ناوەرۆک



(( ئەمڕۆ بۆ موسڵمانان شوێنکەوتنی پێغەمبەر زۆر پێویستە، بەتایبەت
کە ئەمڕۆ دوژمنانی ئیسلام گومان گەلێکیان ناوەتە ناو ئیسلام،
موسڵمانانیان بەئارەزووبازی تەفرەداوە بۆ ئەوەی ڕێگری بکەن
لەئایینی خوا.

بۆیە لەم کتێبەدا ویستومانە لەبارەی پێغەمبەرەوە بدوێین
لەمەڕ پێشەوایەتی و دادوەریی و چاکسازی و مامۆستایەتی و
پەروەردەکەیەوە، هەروەها وەک باوکێک و بەڕێوەبەرێک و
پێشەوایەک و سەرکردەیەک و کرێکارێک..

ئەمە و جگە لەمانەش لەلایەنەکانی کەسایەتی، کە لەمەدا پشتمان
بەستووە بەفەرموودە ڕاستەقینەکانی پێغەمبەر و بەرچاومان بەو
فەرموودانە ڕووناک کردۆتەوە.))

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

چاپی یەکەم

1442-2021